فەرهەنگی سیاسیی

# ئارەش


ئامادەکردنی:

زاهیر محەممەدی            یاسین حاجی زادە

Rojhalat Printing

چاپخانەی ڕۆژهەڵات

Tel: ٠٧٥٠٤٤٩٢٥٦١

Email: h.daneshfar@yahoo.com

**ناوی کتێب:** قامووسی سیاسیی ئارەش

**وەرگێڕانی لە فارسییەوە:** زامیر محەممەدی، یاسین حاجی زادە

**بەرگ و دیزاینی ناوەوە:** ئاگری باڵەکی

**تایپ:** چنوور ئەکبەر پوور

**سەرپەرشتی چاپ:** ئەمرۆ مەحموود

**نرخ:** ١٢٠٠٠

ژمارەی سپاردن (٦١٨) ی ساڵی ٢٠٠٦دراوەتێ

چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە –هەولێر

# پێرست

# پێشەکی وەرگێڕەکان

خوێنەرانی بەڕێز:

وەرگێرانی قامووس بە پێچەوانەی وەرگێرانی بابەتەکانی دیکە، کارێکی ئەستەمە. چوونکە لە راستیدا ئەو قامووسە تایبەت بەو زمانە داڕێژراوە و ئەو چەمک و زاراوانە شی دەکاتەوە کە لەو زمانەدا کەڵکیان لێ وەردەگیردرێ. بۆیە یەکەم ئاستەنگ لە بەردەم وەرگێرانی قامووسدا، وەرگێرانی خوودی چەمک و زاراوەکانە. ئەوە کێشەیەکی گەورەی بەردەم ئێمەش بوو. بۆیە ناچار بووین هێندێک زاراوە داتاشین. بۆ داتاشینی ئەو چەمک و زاراوانەش زیاتر پشتمان بە زمانی فارسی بەستووە، چوونکە زیاتر لە زمانی کوردی نزیکترە و لە هێندێک حاڵەتیشدا پشتمان بە هاوواتا ئینگلیزییەکان بەستووە. تا ئەو جێگایەی کە لە تواناماندا بووە و بەسەریدا زاڵ بووین، هەوڵمانداوە بە زمانێکی ساکار، بەرگێکی خۆماڵییانە بەبەر وەرگێرانە کوردییەکەدا بکەین.

لە لایەکی دیکەشەوە، چوونکە قامووس تەنیا تایبەت بە بوارێک نیە، ئەرکێکی زیاتر دەخاتە ئەستۆی وەرگێر. لەم حاڵەتانەشدا هەوڵمان داوە لەگەڵ پاراستنی نێوەرۆک و واتای رستەو زاراوەکان، بە شێوەیەکی ساکار دایانرێژینەوە.

هێندێک زاراوەمان وەرنەگێراوەتەوە. چوونکە نووسەری قامووسەکە لە پێوەندی لەگەڵ هێندێک چەمک و زاراوە، بە جێگای ئەوەی واتاکەیان بۆ خۆێنەر روون کاتەوە، زیاتر شیکردوونەوە و، شیکردنەوەکەش بەپێی بیروبۆچوونی خۆی بووە. ئەو چەمک و زاراوانەش یان تایبەت بە ولاتی

ئێران بوون یان تایبەت بە ئایدۆلۆژییا و سیاسەت و لێکدانەوەکانی حکومەتی ئەو وڵاتە بوون. لە هێندێک شوێندا کە دەبوایە نووسەر بێلایەنانە شتەکانی نووسیبایەن، لایەنگری لە بیروبۆچوونێکی تایبەتی کردووە و لە راستیدا بە لایەنگریکردن لە راڤە و خوێندنەویەکی تایبەتی، هێندێک چەمکی روون کردۆتەوە کە ئەو راڤە و خوێندنەوانە لە چوارچێوەی سنوورەکانی حکومەتی ئیسلامی ئێران تێ ناپەڕن. بەڵام سەرەرای ئەوەش لە زۆر شوێندا وەک پاراستنی مافی نووسەر، شتەکانمان وەک خۆیان وەرگێراوەتەوە. هەڵبەت ئەوە نابێ ببێ بە بریارێک و بە تەواوەتی کەسایەتیی نووسەری پێ بخەینە ژێر پرسیارەوە. قامووسی ئارەش سەرجەم، قامووسێکی دەوڵەمەندی زمانی فارسیە .

### ئەی سی ئان
### *ASEAN (Association Of South East Asian Nations)*

" یەکیەتیی نەتەوەکانی باشووری رۆژهەلاتی ئاسیا" کە بە کورتی" ئەی سیّ ئان"ی پیّ دەگوتریّ؛ لە سالّی ۱۹٦۷ بەمەبەستی گەشەپیّدان بە هاوکارییە سیاسی و ئابوورییەکانی نیّوان ولاّتانی غەیرە کۆمۆنیست دامەزرا. ئەم ریّکخراوە خاوەنی سکرتاریایەکی هەمیشەییە کە لە جاکارتای پایتەختی ئەندەنۆسیا دایە. هەروەها ئەی سیّ ئان خاوەنی یازدە کۆمیتەیە کە لە بوارەکانی بازرگانی، گواستنەوە و گەیاندن، پیّوەندییەکان، کشت و کالّ، زانستەکان، دارایی و کولتوور چالاکی دەکەن. ئەندامانی ئەم یەکیەتیە بریتین لە : ئەندەنۆسیا، برۆنئی (لە ۷ کانوونی دووهەمی ۱۹۸٤)، سەنگاپوور، فیلیپین، مالیزیا و ڤیتنام(لە ۱۹۹٥).

### ئەفریکانێر — *Afrikaner*

ئەفریکانێر یان بوئێر(Boer) بە خەلّکی سپی پێستی ئەفریقی زمانی ولاّتی ئەفریقیای باشوور دەگوتریّ کە نەوەی کۆچپەرە هۆلّەندی، ئەلّمانی و فەرەنسەییەکانن و، بەرلە سالّی ۱۸۰٦، واتە بەر لە داگیرکردنی ئەفریقیای باشوور لە لایەن بەریتانیەکان، هاتوونەتە ئەم ولاّتە.

### Agreement ئەگریمێنت

زاراوەیەکی فەرەنسیە بە واتای رازیبوون و رێگاپێدانە.

لە عورفی دیپلۆماتێکدا بەو مانایە دێ، کە کاتێک ولاتێک بیهەوێ بالۆیزێک بۆ ولاتێکی دیکە بنێرێ، دەبێ سەرەتا پێخۆشبوونی ئەو ولاتە لە هەناردنی ئەو بالۆیزە، وەدەست بێنێ. ئەگەر ولاتی خانەخوێ نارازی بێ، ناچار نیە هۆکاری نارازیبوونی خۆی بۆ ولاتی بەرامبەر روون کاتەوە.

### ئەلمان، ئەلمانی بەرزتر لە هەمووان Deutschland, Deutschland Uber Alles

شێعرێکی هۆفمەن فۆن فالێزر لێبنە کە لە سالی ١٨٤١ هۆنیویەتیەوە و، لەگەل مۆسیقای هایدین لە سالی ١٩٢٣دا، بوو بە سروودی نیشتمانی ئەلمانیا .

برگەی یەکەمی ئەم سرووده سەبارەت ئەلمانیای گەورەیە، لە " چۆمی ولاتی فەرەنسا" وە بگرە تا دەگاتە " لیتوانی "؛ لە " ولاتی ئیتالیاوە تا دەگاتە چەند بەشێک لە دانیمارک". برگەکانی دوو و سێی ئەم سرووده لە باری " شەرەف، یەکسانی و ئازادی" لە هەموو جیهان دایە کە لە سەردەمی حکوومەتی "رایخی سێهەم" ، ئەو برگانەیان قرتاند.

### ئەلمان راپەرە Deutschland Erwache (Germany Awake)

یەکێک لە دروشمە بەهێزەکانی سەردەمی حکومەتی نازییەکان بوو کە کەلکی زۆری لێ وەرگیرا، بۆ ئەوەی گرێ دەروونیەکانی رێککەوتننامەی ڤێرسای کوێر بکاتەوە.

### Opportunism ئۆپۆرتۆنیزم / هەلپەرستی

لە زاراوەی لاتینی Opportunus وەرگیراوە.

هەلپەرەستی لە گۆرەپانی سیاسەتدا، هەلسووکەوتێکی سازشکارانەیە کە لەگەل هەل و مەرج و بارودۆخی زالدا، بە مەبەستی وەدیهاتنی بەرژەوەندی بە ئامانجێکی تایبەتی و، بێ گوێدان بە کەم و کورییە باوەکانە، هەرچەندە کە لەگەل بنەما و بیروبۆچوونە سەرەتاییەکانیشدا نەگونجێ.

هەلپەرستی بەمانا نێگەتیڤەکەی، لە ژێر پێ نانی ئامانجەکان و بنەما ئایدۆلۆژییە تاکەکەسییەکان، لە پێناوی بەرژەوەندییە تایبەتیەکانە.

## Etatisme ئێتاتیزم

زاراوەیەکی فەرەنسیە کە بەشێوازی راستەقینەی ئابووریی دەوڵەتی دەگوترێ. ئەم قوتابخانەیە پێشنیاری بە ئاراستەدابردن و رێبەرایەتیکردنی ئابوورییەکی بەرنامە دارێژراو دەکا، بەلام هەتاکوو سنووری سۆسیالیزمێکی تەواو دەوڵەتی ناچێتە پێش .

## Etats Generaux ئێتاژنیرۆ

زاراوەیەکی فەرەنسیە بە واتای ئەنجوومەنی گشتیە.

لە رژێمی کۆندا هەتا بەر لە شۆڕشی مەزنی فەرەنسا، ئەو وڵاتە خاوەنی دوو ئەنجوومەن یان پەرلەمان بوو؛ یەکیان ئەنجوومەنی هەرێم و ئەویتریان ئەنجوومەنی گشتی ( ئێتاژینرۆ) بوو. ئەنجوومەنی هەرێم لە هەرێمەکانی فەرەنسا پێک دەهات و تایبەت بە هەمان هەرێم بوو، بەلام ئەنجوومەنی گشتی لە پایتەخت پێک دەهات. بەهەر دوو ئەنجوومەنەکەیان دەگووت: ئەنجوومەنی چینایەتی.

## Autoritarianism ئۆتۆریتاریانیزم

جۆرێک لە سیستەمی حکومەتیە کە لەو سیستەمەدا، ئازادییە تاکەکەسیەکان هەم لە بواری تیۆری و هەم لە بواری پراکتیکیەوە و، هەم لە رواڵەتدا و هەم لە ناخدا، بە تەواوەتی بکەونە ژێر رەنگدانەوەی دەسەلاتی دەوڵەت. رژێمی دیکتاتۆر یەکێک لە شێوە توندڕەوەکانی ئەم جۆرە حکومەتەیە.

## Autocracy ئۆتۆکراسی

بە رژێم یان بە سیستەمێک دەگوترێ کە ئەم تایبەتمەندییانەی خوارەوەی هەبێ:

١. زاڵبوونی بە ئاشکرای کەسێک لە سەرەوەی هیەرەمی ( هیرارکیەت) دەسەلات دا.

٢. نەبوونی یاسا یان نەریتێک کە بەسەر ئەرک و کردەوەکانی دەسەلاتداردا چاوەدێری بکا.

٣. بێ سنووربوونی دەسەلاتی دەسەلاتدار لە پراکتیکدا.

### ئۆتۆنۆمی / خودمختاری — Autonomy

ئەم زاراوەیە بە واتای ئازادبوون و رزگاربوون لەهەر جۆرە زۆر و چەوساندنەوەیەکی دەرەکیە.

### ئیتیۆپیانیزم — Ethiopianism

*زاراوەیەکە کە ئەو بزووتنەوانە لە خۆ دەگرێ:*

*١ ــ بزووتنەوە نیمچە ناسیۆنالیستەکان بەبیروبۆچوونی گەڕانەوەی مەسیح لە نێو رەش پێستەکانی ئەمریکادا؛*

*٢ ــ بزووتنەوەی دروستکردنی کلیسا گشتییەکان لە نیۆ رەش پێستەکانی ئەمەریکادا؛*

*٣ ــ کلیسای سەربەخۆی رەش پێستەکانی ئەفریقی کە لە مەسیحیەت جیابوونەوە.*

### ئیخوانولموسلمین — Moslem Brotherhood

ئیخوانولموسلمین حیزبێک (یان بە واتایەکی وردتر بزووتنەوەیەک ) بوو کەلە ساڵی ١٩٢٩ لە لایان " حەسەن ئەلبەنا" لە میسر دامەزرا و، ئامانجەکەشی پیرەویکردن لە بیروباوەڕە ئیسلامیەکان بە شێوازی سەدەی هەشتەم واتە سەرەتای سەرهەڵدانی ئیسلامە. ئەم بزووتنەوە لە نێو موسوڵمانانەدا لایەنگرێکی زۆری پەیدا کردووە و، لە کۆتایی شەڕی دووهەمی جیهانی نزیک بە دوو میلیۆن ئەندامی هەبوو و کاریگەرییەکی بەرچاوی لە سەر حکومەتە عەرەبیەکان و بەتایبەتی لەسەر دەوڵەتی میسردا هەبوو . لایەنگرانی ئیخوانولموسلمین، سەرۆک وەزیری میسریان کە لە ساڵی ١٩٤٨دا بزوتنەوەکەیانی بە نایاسایی لە قەڵەم دابوو، تیرۆر کردو؛ بەدوای ئەمەش دا" حەسەن ئەلبەنا" کوژرا، بەڵام حکومەتی وەفد مۆڵەتی بە ئیخوانولموسلمین دا کە چالاکی بکەن. ئیخوانولموسلمین لە سەرەتادا پشتیوانی لە شۆرشی ١٩٥١ ی میسر کرد بەڵام دواتر لەگەڵ هەوڵی میسر بۆ پێکهێنانی پێوەندییەکی نزیکتر لەگەڵ رۆژئاوادا دژایەتیان کرد. لە ساڵی ١٩٥٤دا ئیخوانولموسلمین هەوڵی ئەوەیاندا کە ناسر، سەرۆک کۆماری میسر لە نێو بەرن، بەڵام نەیانتوانی سەرکەوتن بەدەست بێنن و، ناسر ئیخوانولموسلمینی هەڵوەشاندەوە، دەستی بەسەر سامانەکەیان

داگرت. دوای ئەو رووداوە، بنکە و ناوەندی ئیخوانولموسلمین لە قاهیرەوە بۆ دیمەشق گوازرایەوە و، بوو بە رێکخراوێکی نهێنی.

کۆمەڵەی ئیخوانولموسلمین کە لە ساڵی ١٩٢٨دا لە ئیسماعیلیە دامەزرا بوو، لە ١٩٤٨دا بۆ ماوەیەک هەڵوەشایەوە، بەڵام دواتر دەستی بە چالاکیەکانی کردەوە. ئەو کۆمەڵەیە لە ساڵی ١٩٥٤دا، واتە دوای هەوڵدان بۆ لە نێوبردنی ناسر، سەرۆک کۆماری میسر، بە نایاسایی لەقەڵەم درا.

هەرچەندە کە دەوڵەتی " عەبدولناسر " لە بەرامبەر ئیخواندا راوەستا و سەرکوتی کردن، بەڵام دروشمە سیاسیەکانی ئەوانی پەسند کردو بە ناوی خۆی کردن. ئەم فێڵ و تەکتیکە (کە ئەمڕۆکە زۆربەی وڵاتە عەرەبیەکانی رۆژهەڵاتی نێوەڕاست کەڵکی لێ وەردەگرن) بنەمای بانگەشەی کۆمەڵەکەی وەک تەنیا دەنگی " ویژدانی میسر" لە رزۆک کردو، سەیر لەوەدایە کە بەرگری دەوڵەتی میسر لە سیاسەتی سۆسیالیستیی خۆی لە بەرامبەر کەسایەتیە ئاینیە نەیارەکاندا، زیاتر لە سەر بنەمای بیروباوەڕەکانی مستەفا سەباعی، سەرکردەی کۆچکردووی ئیخوانی سووریا، بوو کە لە کتێبەکەیدا بەناوی سۆسیالیزمی ئیسلامی هەوڵی داوە تاکوو ئیسلام و سۆسیالیزم تێکەڵ بکا.

### ئۆردوگا زۆرە ملییەکان ***Concentration Camps***ئەم

زاراوەیە بەو ناوەندە دەگوترێ کە بۆ دەستبەسەرکردنی گیراوە سیاسییەکان، گرووپەکانی کەمینە رەگەزی و نەتەوەییەکان و تاقمی هاوشێوەی ئەو گرووپانە کەڵکی لێ وەردەگیردرێ. ئەو کاتە کە شەڕی بۆئێرەکان بەرەو کۆتایی دەرۆیی، بەرپرسانی ئەو وڵاتە بۆ بڕینی پێوەندییە هەواڵگرییەکان و خۆراکی مارێتزە بوئێرییەکان، خەڵکی ئاسایی یان رەوانەی ئەو ئۆردوگا زۆرەملێیانە دەکرد. بەڕێوەبەرییەکی گەندەڵ و لاواز و هەروەها نەبوونی خزمەتگووزاری تەندروستی، گرفتێکی زۆری بۆ کار بەدەستان نابۆوە.

ئەم زاراوەیەی سەرەوە دواتر بە ئۆردوگای ئەڵمانیای نازی و یەکیەتیی سۆڤیەت دەگوترا کە ئامانجیان لە نێوبردنی دوژمنان و نەیارانی سیاسیی دەوڵەت لە رێگای کاری زۆرەملێ بوو . ئۆردوگاکانی زۆرەملێی ئەڵمانیای نازی لە ریزی دڕندانەترین ناوەندەکانی کاری زۆرەملێ دا بوو.

لەو ئۆردوگایەدا چەندین میلیۆن کەس بە هۆی تووشبوون بە نەخۆشیە مالۆیرانکەرەکان یان بە هۆی برسیەتی گیانی خۆیان لە دەست دا.

### ئەورووپای رۆژهەلاّت — Eastern Europe

بە تاقمێک لەو ولاّتانە دەگوترێ کە ئەندامی رێککەوتننامەی فەرشۆ وکۆمکۆن بوون (پۆلەندا، یەکیەتی سۆڤیەت، ئەلمانیای رۆژهەلاّت، چیکسلۆڤاکیا، هەنگاریا، بولگاریا و رۆمانی). ولاّتانی کۆمۆنیست بەلاّم بێ لایەن واتە یۆگوسلاڤیا و ئەلبانیاش بەبەشێک لە ئەورووپای رۆژهەلاّت دادەنران.

### ئێس . ئەی . — S.A.(Sturmabteilung)

بە لایەنگرانی حیزبی نازی دەگوترێ کە لە سالّی ١٩٢١ لە میونیخ، لە لایەن "ئەرنێست رۆهم" دامەزرا. ئەم کەسانە بە " کراس قاوەیی"ەکانیش ناوبانگیان دەرکردبوو.

ئێس . ئەی ، لە سەردەمی گەشەسەندنی خۆیدا بەدەسەلاّتێکی ئەو تۆگەیشت کە دەسەلاّتدارانی حیزبی نازی ناچار بوون چالاکییەکانیان بەرتەسک بکەنەوە و لە ئەنجامدا قلّت و بریان تێ بخەن و، هێزەکانی ئێس. ئێس، لە زنجیرە چالاکیەک بە ناوی " شەری چەقۆ درێژەکان" (حوزەیرانی ١٩٣٤)، ناوەندەکانی کراس قاوەییەکانیان تێک شکاند و کۆتایی یان بە چالاکیەکانی ئەوان هێنا.

### ئێس. ئێس. چەکدار — Armed SS

ئەو زاراوەیە بە یەکە شەرکەرەکانی "ئێس. ئێس." ی ئەلمانیای نازی دەگوترا.

### ستارت(وتووێژەکان بەمەبەستی کەمکردنەوەی چەک و چۆلە ستراتیژییەکان — START( Strategic Arms Readution Tolks)

ئەم وتووێژانە لە سالّی ١٩٨٢ لە نێوان ئەمەریکا و سۆڤیەت بەمەبەستی کەمکردنەوەی چەک و چۆلە ستراتیژییەکانی دوو ولاّت دەستیان پێکرد و، سەرەنجام دوای تێپەرینی ٩ سالّ، گرێبەستێک بە ناوی ستارتی ـ١،لە ٣١ی تەمموزی ١٩٩١ لە نێوان بۆش، سەرۆک کۆماری

ئەمەریکا (١٩٩٣-١٩٨٩) و گۆرباچۆف، سەرۆک کۆماری یەکیەتیی سۆڤیەت ( ١٩٩١-١٩٨٥) و لە مۆسکۆدا مۆر کرا.

بەپێی ئەو ڕێککەوتننامە، سۆڤیەت بەڵێنی دا کە ژمارەی کلاّوەی مووشەکە دوور هاوێژەکانی خۆی لە ١١/٠١٢ دانە بۆ٦/١٦٣ دانە و ئەمەریکاش لە ١٢/٦٤٦ دانەوە بۆ ٨/٥٥٦ دانە کەم بکاتەوە. لە گرێبەستێکی تردا بە ناوی ستارت ٢ کە لەرێکەوتی سێهەمی کانوونی دووهەمی ١٩٩٣دا لە نێوان بۆش و یەڵتسین دوو سەرۆک کۆماری ئەمریکا و فیدراسیۆنی رووسیا مۆرکرا، بریاردرا، رادەی چەک وچۆڵە ستراتیژییەکانی دوو وڵات هەتا ساڵی ٢٠٠٣ بۆ یەک لە سێی کاتی مۆرکردنی گرێبەستەکە کەم بکرێتەوە. بەپێی ئە رێککەوتنە، ژمارەی کلاّوە ناوەکی و بۆمبە ئەتۆمییەکانی ئەمەریکا بوو بە ٣٥٠٠ دانەو، هی رووسیا بوو بە ٣٠٠٠ دانە و ئەویتریشی بەپێی رێنماییەکان لە نێو دەچوون. رێککەوتنی ناوبراو لە ٢٧ی کانوونی دووهەمی ١٩٩٦ دا لە سەنای ئەمریکا و لە ١٤ی نیسانی ٢٠٠٠دا لە لایان دۆمای رووسیاوە پەسندکرا.

### ئیسکۆرت — ***Convoy***

جۆرێک لە تەکتیکی هێزی دەریاوانیە کە پاپۆرە بازرگانیەکان بە پشتیوانی ناوە شەرکەرە دەریاوانیەکان وەرێ دەکەون.

پشتیوانیی ناوە شەرکەرەکانی ئەمەریکا و یەکیەتیی سۆڤیەت لە پاپۆرە نەوت هەڵگرەکانی کوێت لە ماوەی شەڕی ئێران و عێراقدا (١٩٨٨-١٩٨٠) بە نموونەی زەق و بەرچاوی ئەم تەکتیکە دەژمێردرێ.

### ئێف.ئێل.ئێن(بەرەی رزگاریدەری نیشتمانی_ ئەلجەزایر) — ***F.L.N***

رێکخراوێکی ناسیونالیستی ئەلجەزایرە کە لە ساڵی ١٩٤٥ لە حیزبی یاسایی ناسیۆنالیستی ئەلجەزایر کە ئەو کاتە کۆلۆنی فەرەنسا بوو، جیا بۆوە تاکوو دەست بە کاری تیرۆریستی بکا. ئەم کارە بە دژی دامەزاوە کۆلۆنیالیستیەکانی فەرەنسا و بەدژی تووخمە سەرەکیەکانی نێو کۆمەڵگای ئیسلامی بوو کە بە بەشێک لە دەزگای کۆلۆنیالی دەژمێردرا. ئەم کارە بوو بە هۆی درێژە کێشانی شەڕی پارتیزانی لە ئەلجەزایرو، لە ئاکامدا ژەنەراڵ دۆگۆلی ناچار بە وتوویژ لە بارەی چارەسەری

شەڕو وەدەرنانی هێزەکان و هاووڵاتیانی فەرەنسی لە ئەلجەزایر بە پێی ڕێککەوتنامەکانی ١٩٦٢ی ئیڤیان (Évian Ageements) کرد.

## ئێف.بی.ئای . F.B.I. (Federal Burean Of Investigation)

بەڕێوەبەریی فیدڕاڵی لێکۆڵینەوەکان"ی ئەمەریکایە کە سەر بە وەزارەتی دادی ئەم وڵاتەیە. ئەم ئیدارەیە لە پێشدا ئەرکی لێکۆڵینەوەی کاروباری وەزارەتی دادی لەئەستۆدا بوو. بەڵام لە ساڵی ١٩٣٥ بە دواوە ئەرکی دیکەی وەک پێڕاگەیشتن بە سەرپێچییەکانی پێوەندیدار بە یاساکانی فیدڕاڵ و تاوانەکانی دژی ئاسایشی نێوخۆیی ئەمریکای پێ ئەسپێردرا.

## ئیکۆ (ڕێکخراوی هاوکاری ئابووری)
## ECO(Economic Cooperation Organ)

ئیکۆ یان ڕێکخراوی هاوکاری ئابووری، ڕێکخستنێکە کە لە مانگی کانوونی دووهەمی ١٩٨٥ جێگای "ڕێکخراوی هاوکاری ئاوەدانکردنەوەی ناوچەیی" (RCD) گرتەوە. ڕێکخراوی RCD لە کۆبوونەوەی ڕێبەرانی وڵاتانی ئێران، پاکستان و تورکیا لە تەمموزی ساڵی ١٩٦٣، لە ئیستامبۆڵ دامەزرا.

دوای رووخانی رژێمی، پاشایەتی لە ئێران (١٩٧٩)، چالاکییەکانی ڕێکخراوی هاوکاری ئاوادەانکردنەوە ناوچەیی " بەکردەوە ڕاوەستا. بە سەرنجادان بە پێویستی هاوکارییە ئابوورییەکانی نێوان ئەو سێ وڵاتە، ڕێکخستنی ئاڕ.سی.دی جارێکی تر ، بەڵام بە ناوی "ڕێکخراوی هاوکاری ئابووری " لە کانوونی دووهەمی ١٩٨٥، سەری هەڵدایەوە. دوای هەڵوەشانەوەی یەکیەتیی سۆڤیەت (کانوونی یەکەمی ١٩٩١)، ژمارەیەک لە وڵاتانی موسوڵمانی ئاسیای نێوەڕاست پێخۆشبوونی خۆیان بۆ چوونە نێو ئەم ڕێکخراوە ڕاگەیاند، بەم شێوەیە یەکەمین کۆبوونەوەی ڕێبەرانی ئیکۆ لە مانگی شوباتی ١٩٩٢ لە تاران پێک هات و، لەو کۆبوونەوەدا پشتیوانی لە لە ئەندامەتیی وڵاتانی ئازربایجان، ئوزبەکستان، تاجیکستان، تورکەمەنستان وقرقیزستان کرا.

هەروەها لە کۆبوونەوەی تاراندا پێشوازی لە پێشنیاری ئەنجوومەنی قایمقامان سەبارەت بە بەشداریی کۆمەڵگای موسوڵمانانی تورک لە قبرێس لە چالاکییە ئابووری، تەکنیکی و کولتوورییەکانی ئیکۆدا، بە بێ ئەوەیکە زیان لە هەڵوێستی هەر یەک لە دەوڵەتانی ئەندام بۆ چارەسەری کۆتایی کێشەی قبرێس بەپێی بڕیارنامەی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیەکگرتووەکان بکەوێ، کرا.

لە کۆبوونەوەی وەزیرانی دەرەوەش دا کە لە ٢٨ی تشرینی دووهەمی ١٩٩٢دا ئیسلام ئابادی پاکستان بەڕێوەچوو، وڵاتانی قرقیزستان و ئەفغانستانیش وەک نۆیەمین و دەیەمین ئەندامی ئیکۆ وەرگیران.

**ئەلقاعیدە** ***AL-Qaida (the Base)***

ڕێکخراوێکی تیرۆریستیە کە لە ساڵی ١٩٨٩ لە لایان ئۆسامە بن لادنەوە دامەزرا. ئامانجی ئەم ڕێکخراوە دامەزراندنی سیستەمی خەلافەت لە وڵاتانی ئیسلامی دایە. ئەو ڕێکخراوە لە ٤٠ هەتا ٥٠ وڵاتی دنیادا لقی هەیە. لە ئەمەریکا، فەرەنساو ئەڵمانیاوە بگرە تاکوو دەگاتە دوورترین وڵاتانی ئاسیایی، کە ٣ هەتا ٥ هەزار ئەندامی هەیە. واپێدەچێ کە بتوانێ سەرنج و پشتیوانی ٦ هەتا ٧ میلیۆن موسوڵمانی دەرمارگرژ و لە نێوان ١٠٠ هەتا ١٢٠ هەزار پارتیزانی چەکدار بۆ لای خۆی ڕابکێشێ کە پێوەندییان بە جیهادو جەماعەتی ئیسلامیی میسر، جەماعەتی ئیسلامی پاکستان و بزووتنەوەی جیهادی بەنگلادیشەوە هەیە. ئەیمەن ئەلزەواهری لە سەرکردەکانی جیهادی ئیسلامیی میسر کە بەرپرسیارەتی کوشتنی ئەنوەر ساداتی بە ئەستۆ گرت (١٩٨٢)، بە تیۆری داڕێژ و گەلاڵە داڕێژی ئەلقاعیدە دەژمێردرێ، دوای سێ ساڵ زیندانی کران، لە میسرەوە چوو بۆ پاکستان و، پاشان چوو بۆ سوودان و ئەفغانستان. دادگای میسر ناوبراوی بە تاوانی تەقاندنەوەی باڵۆیزخانەی میسر لە پاکستان (١٩٩٥) بە ئیعدام مەحکووم کرد. هەروەها ناوبراو بەرپرسی داڕشتنی گەلاڵەی تەقاندنەوەی باڵۆیزخانەکانی ئەمەریکا لە کینیا وتانزانیا دایە.

واپێدەچێ کە ڕووداوی ٩/١١ بۆتە هۆی ئەوەی کە پاندۆڕا باکسی ترۆریزم هەروا یەک لەدوای یەک کارەساتی دیکە بخوڵقێنێ. ساڵێک دوای هێرش بۆسەر ئەفغانستان، دەگوترێ کە لقەکانی ئەو ڕێکخراوە لە دوورترین شوێنەکانی دنیا خەریکی هێرشی تیرۆرستین و، لەگەڵ تاقمە توندڕۆکانی کەشمیری، میسری،ئەفغانی، پاکستانی، فلیپینی و ئەلجەزایریدا پێوەندییان هەیە. جیاوازی

ئەلقاعیدە لەگەڵ گرووپە تیرۆریستیەکانی وەک بریگادی سووری ئیتاڵیا لەوە دایە کە ئەلقاعیدە ڕێکخستنێکی تاڕادەیەک چڕنەبۆوەی هەیە.

ئەلقاعیدە وەک خانەیەکی گەورە هەمووکات گۆڕانی بە سەردادێ و، لە هەموو شوێنێکیش ئامادەیە. دەگوترێ کە لە بواری بیروباوەڕەوە لە ڕواڵەتدا یەکێک لە لقەکانی ئیخوانولموسلمینە. ئەگەرچی ئەوان تەنیا وەک دروشم باسیان لە شەهیدبوون دەکرد، بەڵام ئەلقاعیدە بەکردەوە تیۆری شەهید بوونی پیادە کردووە و، وەک ئەوان ڕێگای ئاشتیانەی نەگرتۆتە بەر. لە بواری ڕێکخراوییەوە خاوەنی شانەی ٤هەتا ١٥ کەسیە. یەکە ئەورووپی و ئەمەریکیەکانی ئەلقاعیدە فرەرەگەزن.

لە بواری پێکهاتەییەوە، ڕێکخراوێکی فرەرەهەندە کە ڕکابەر لە بوارە سەربازی، سیاسی و ئابووری ـ کۆمەڵایەتیەکاندا، لایەنی بەرامبەری خۆی تووشی گرفت دەکا. لەم کاتەدا شەڕ لەگەڵ ئەلقاعیدە وەک پرۆسەیەکی بێ کۆتایی لێ هاتووەو، شەڕی ئەلقاعیدە شەڕێک نیە کە وەکوو شەڕەکانی دیکە بڵێی لایەنێک سەرکەوتووە و لایەنێکیش دۆڕاوە.

## *Oligarchy*

### *ئۆلیگاریشی*

لەسەرچاوەی وشەی یۆنانیی ئۆلیگۆس (Oligos) بە واتای کەم وەرگیراوە. ئەم زاراوەیە لە وشەدا بەمانای سەروەری ژمارەیەکی کەم دێ و، لە زانستی سیاسەتدا بە واتای دەسەڵاتدارەتیی سیاسی و ئابووری تاقمێکی بچووک لە دەوڵەمەندان، چەوسێنەران و داگیرکاران و دەسترۆیشتووەکانە و، بە یەکێک لە شێوەکانی دەسەڵاتداریێ لە ڕژێمە چەوسێنەرەکان دەژمێردرێ.

## *MI-٥*

### *ئیم. ئای. پێنج*

بە بەرێوەبەریی پێنجەمی هەواڵگری سەربازیی بەریتانیا دەگوترێ و، لەساڵی ١٩١٦دا بە جێگای (M.O- ٥) دامەزرا تاکوو ئەرکی دژە سیخووری لە نێوخۆ و لە دەرەوەی وڵاتدا وەئەستۆ بگرێ. ئەو بەرێوەبەریە لە ساڵی ١٩٠٤ دا دامەزرا.

**MI. 6** ***ئیم. ئای. شەش***

"دەزگای هەواڵگری" بەریتانیا کە بە ئێس.ئای. ئێس بە ناوبانگەو، ئەرکی سیخوڕی و کۆکردنەوەی هەواڵی لە وڵاتانی دەرەوە لە ئەستۆدایە.

***Imperialism*** ***ئەمپریالیزم***

لە سەرچاوەی وشەی لاتینی Imperiaum بە واتای دەسەڵاتی رەها، مافی دەسەڵاتدارەتی و ئیمپراتۆری وەرگیراوە.

زاراوەی ئەمپریالیزم بەمانای پیادە کردنی سیاسەتی زۆر خوازانەی ئابووری و هێژمۆنیی سیاسی دەوڵەتە زلهێزەکان بەسەر نەتەوە یان نەتەوەکانی تر دایە. ئەم زاراوەیە دوای بڵاوبوونەوەی کتێبی "ئەمپریالیزم وەک بەرزترین قۆناغی سەرمایەداری" لە لایەن لینینەوە، کارتێکەرییەکی سیاسی تایبەتی بە دەست هێنا.

لە دوای شەڕی دووهەمی جیهانی، ئەمپریالیزم بوو بە پەناگایەکی بەهێز بۆ هەردوو بەرەی سەرمایەداری و کۆمۆنیزم ـ کۆمۆنیستەکان سیاسەتەکانی وڵاتانی رۆژئاوا و بە تایبەتی ئامەریکایان بە ئەمپریالیزم " نادەبردو، لە بەرامبەریشدا، نووسەرانی رۆژئاوایی سیاسەتە کۆمۆنیستیەکانیان بە جۆرێک لە "ئەمپریالیزمی نوێ" نادەبرد. دیارە دەبێ ئەوەش بگوترێ کە هێندێک لە تیۆری داڕێژە کۆمۆنیستەکان، سەرهەڵدانی ئەمپریالیزم بە مەرجی سەرەکیی گەشەی سەرمایەداری دەزانن. بە بڕوای لنین، "ئەمپریالیزم دوایین قۆناغی سەرمایەداری یان قۆناغی کۆتایی سەرمایەدارییە، کە لە کۆتاییەکانی سەدە نۆزدە و سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا، دەستی پێکردووە. ئەم قۆناغە درێژەی حەتمیی هەموو گۆڕانکارییەکانی پێشووی سەرمایەدارییە".

بە بڕوای لنین تایبەتمەندیی سەرەکی و نێوەرۆکی ئەمپریالیزم لە بواری ئابووری دایە کە دەستبەسەرداگرتنی پاوانخوازانە، رۆڵی دیاریکەرو بڕیاردەر لە ئابووری و سیاسەتی وڵاتانی سەرمایەداریدا دەگێڕێ.

***Internationale*** ***ئەنتەرناسیۆناڵ***

لە زمانی فەڕەنسیدا بەمانای نێونەتەوەییە. ناوی رێکخراوەی کرێکارانی جیهانە کە لە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم تاکوو نێوەڕاستی سەدەی بیستەم لە قۆناغە جۆراوجۆرەکانی گەشەی کۆمەڵگادا دامەزرا.

## ئەنتەرناسیۆنالیزم Internationalism

زاراوەیەکە بە واتای ئەو بیروباوەڕ و سیاسەتانەیە کە پشت بە بەرژەوەندییە هاوبەشەکانی ئەتنۆس و نەتەوەکان دەبەستن و، دژی ناسیۆنالیزمی بەرچاوتەنگن.

ئەنترناسیۆنالیستەکان پێیانوایە کە ئەگەر دەرەتانی هاوکاریی ئاشتیخوازانە لە نێوان دەوڵەتەکاندا لە ئارا دانیە ، بەلاّم نەتەوەکان دەتوانن هاوکاری یەکتر بکەن.

## ئەنگیزاسیۆن *Inguisition*

ئەنگیزاسیۆن لەسەرچاوەی لاتینیی Inguisition بەمانای "لێکۆڵینەوە" و"پشکنین" وەرگیراوە. مەبەست لەو پشکنینەش، گەران بە دوای بیروبۆچوونەکان و دەرخستنی ئەو بیروبۆچوونانەیە، کە بە تایبەتی لە سەدەکانی نێوەڕاستدا، بەرامبەر بە نەیارانی بیروبۆچوونەکانی کلیسا (کلیسای کاتۆلیک) بەرێوە دەچوو و، سزای قورسی بەدواوە بوو.

لە سەدەکانی نێوەڕاستدا دامودەزگا و رێکخراوی بەربلاّو (ئاشکراو هێنی)، بە مەبەستی پشکنینی راو بیروبۆچوونی خەڵک، لە ئەورووپا دامەزرا بوون.

ئەم دامودزگا و رێکخستنانە (کلیسای کاتۆلیکی رۆم) _ لە ژێر چاوەدێری پاپ و قەشەکان _ بەمەبەستی پێشگیری لە هاتنە ئاراو و گەشەسەندنی هەرجۆرە بیروبۆچونێکی نوێ دامەزران. تەنانەت پێرستی کتێبە قەدەغەکراوەکانیش بلاّوکرایەوە. بە بڕوای کلیسا، پێشگیری لە بلاّوبوونەوەی بیروبۆچوون و کتێبی پێچەوانەی بیروبۆچوونەکانی مەسیح، ئەرکی سەرشانی ئەوانە. بەرێوەبەران و پشکێنەرانی راوبۆچوونەکان لەسەر و ئاشکرابوون و سەرهەڵدانی بیروهرزو دەنگی نوێ رانەدەوەستان، بەڵکوو دەیانویست سەرچاوەو بناغەی پێکهاتن و سەرهەڵدانی ئەو جۆرە بیروبۆچوون و هزرانە بدۆزنەوە و لە نێویان بەرن، کەیەکێک لە لایەنە گرنگەکانی ئەو هەنگاوە کلیسا، سانسۆر بوو. سانسۆر لەسەرچاوەی لاتینی سانسۆرا (پشکنین و هەڵسەنگاندن)وەرگیراوە کە لە دوای داهێنانی دەزگای چاپ، لە لایەن دەسەلاّتدارە سیاسی و ئایینییەکانەوە زیاتر لە رابردوو بە مەبەستی پێشگیریکردن لە بلاّوبوونەوەی ئاڵوگۆری بیروراکان و پێشگرتن بە دەربڕینی راستیەکان کەڵکی لێ وەرگیرا. هەوەها چەندین سزاش بۆ داهێنەرە فیکری و هزرییەکان لە بەرچاو گیرا بوو؛

وەک: بێ بەش بوونی لە مافی هاووڵاتیبوون، دوورخستنەوە،دەستبەسەرداگرتنی سامان، سووتاندن و لەت لەت کردن و .... هتد.

رێکخراوە پشکنێەرەکانی بیروباوەڕ، زۆر بەهێز بوون؛ فەرمانبەرێکی پشکنین، چەندین کەسی بۆ ئەم مەبەستە لە بەردەست دابوو.

لە ئەوروپادا دوو تیروانینی دژبەیەک، لە ئارادا بوو، یەکیان لە باکووری ئەورووپاو بەریتانیا و وڵاتانی سکەندیناڤیادا بوو کە پێیانوابوو: مرۆڤ بە شێوەیەکی زاتی بێ تاوان و پاک و خاوێنە، مەگەر پێچەوانەکەی بسەلمێندرێ و؛ ئەویتریش لە باشووری ئەورووپا ، واتە ناوەندە بەهێزەکانی کلیسای کاتۆلیک کە لە سەر ئەو باوەڕە بوون:

مرۆڤ بەشێوەیەکی زاتی تاوانبار و هەڵەکارە، هەتا ئەو کاتەی پێچەوانەکەی دەسەلمێندرێ.بۆیە لەو ناوچانەدا سیستەمی لێکۆڵینەوە و پشکنین زۆر بە هێزو چالاک بوو. دیارە کێشەی سووتاندنی کتێب رابردوویەکی کۆنی هەیە. لە سەردەمی ژۆڵ سیزار (٤٤-١٠١ ب.ز) ئیمپراتۆری ڕۆم، بەبریاری ناوبراو، کتێبخانەی گشتی دەکرانەوەو، تەنانەت دەبوایە کۆیلەکانیش کەڵک لەو کتێبخانانە وەربگرن. بەڵام لەسەردەمی نرۆندا (٦٨_٣٧ ز) کە لە ماوەی ساڵەکانی ٦٨-٥٤دا بوو بە ئیمپراتۆری ڕۆم، ئەو کتێبخانانە سووتێنران.

لە سەدەکانی نێوەڕاستدا (لە ساڵی ٣٩٤ تاکوو دەستپێکی ڕێنێسانس یان ژیانەوە ١٤٥٣) کلیسا، دروشمی "کتێبەکان لە نێو بەرن و نووسەران سزا بدەن". کردبووە سەردێڕی پلانەکانی خۆی.

لە سەدەی ١٥، لەگەڵ داهێنانی چاپدا، پاپ (١٤٨٧) بریاریدا کە بەبێ ئیزنی ناوبراو، نابێ هیچ کتێبێک چاپ بکرێ و، لە ساڵی ١٥٦٤دا پێرستی کتێبە قەدەغەکراوەکان بڵاو کرایەوە. بەڵام ئەم بریارە هاوکات بوو لەگەڵ دارمان و لاواز بوونی کلیسا پێکهاتەکانی کلیسا، بەڵام بەو حاڵەش، لە ساڵی ١٦١٦دا کۆنگرەی ئەندۆکس بۆ جارێکی تر پێرستی کتێبە قەدەغەکراو و بەلارێدا بەرەکانی بڵاو کردەوە. کتێبی زانای ئەستێرەناسی واتە کوپێرنێک (١٥٤٣-١٤٧٣) بە ناوی "سوورانی گەردوونە ئاسمانیەکان "لە ریزی کتێبە قەدەغە کراوەکاندا بوو.

لە بەرامبەر پاپدا، کەسانی وەک جۆن کالڤین و مارتین لۆتەر قسەیان لە ئازادیی ویژدان و مرۆڤ کرد و، ڕێنێسانس زۆر بە خێرایی گەشەی کرد.

لە ساڵی ١٦٤٤دا، جۆن میلتۆن نامیلکەی باس لەسەر ئازادی (بەبێ مۆڵەتی چاپ) بڵاو کردەوەو، باسی لە زیانەکانی پشکنینی بیرو باوەڕەکان کردو، ئازادیی لێکۆڵینەوە ورادەربڕینی بەرزنرخاند. لوتکەی توندوتیژی کلیسای کاتۆلیک بەرامبەر بە داهێنان و نوێخوازییەکان، لە کوشتاری سەن بارتێلمی (لە ٢٤ی ئاب هەتاکوو ٢٦ی ئابی ١٥٧٣، بۆ ماوەی سێ رۆژ)دا دەرکەوت کە لەو سێ رۆژەدا بە هەزاران پرۆتستانی (ناڕازی) کوژران، کە تەنانەت منداڵ و شیرەخۆرەکانیش لە نێوبران و، کوژران.

لە سەردەمی پشکنینیی بیروڕاکاندا نزیک بە پێنج ملیۆن کەس بە تاوانی هەبوونی فکر و هزری نوێ و جیاوازەوە لە سێدارە دران. لە ساڵی ١٤٨١ هەتا ١٤٩٩ (هەژدە ساڵ)، دەهەزار و دووسەد و بیست کەسیان سووتاند، شەش هەزار و هەشت سەدو شەست کەسیان لەت لەت کردو نەودو حەوت هەزار و بیست وسێ کەسیان لە ژێر ئەشکەنجەدا کوشت. کۆندێرسە(١٧٩٤ـ ١٧٤٣)، بیرکاری زان و فەیلەسۆفی فەڕەنسی، پێیوابوو کە داهێنانی چاپ کاریگەری لەسەر شۆڕشی مەزنی فەڕەنسا (١٧٨٩)دا هەبوو. سەبارەت بە کتێب سووتاندن، بە درێژای مێژوو کارەساتی زۆر روویان داوە و، ئەمەش زیاتر بەمەبەستی ئەنگیزاسیۆن و پشکنینی بیروڕاکان بووە. کتێب سووتاندنەکانی سۆلتان مەحموودی غەزنەوی لە ئێران بە دنەدانی تاقمێکی دەمارگرژ و، سووتاندنی کتێبخانەی مەزنی ئەسکەندەریە و زۆری تر و، سووتاندنی کتێبخانەی (ێاحب بن عباد) لە شاری ڕەی (سەدو هەڤدە هەزار کتێبی نایاب و دەستنووس کەدە بەرگ تەنیا تایبەت بە پێرستی کتێبەکان بوو) لە لایەن سوڵتان مەحموود و، سووتاندنی کتێبخانەی (دارالعم)ی (شاپوور بن ئەردەشێر) (دەهەزار بەرگی دەسنووس) لە بەغدا لە لایەن(گغرل) ی سەلجوقی (لە ساڵی ١٠٦٨).

### ئۆ ئەی پێک (ڕێکخراوی وڵاتانی عەرەبیی هەناردەی نەوت)
### *OAPEC(Organization Of Arab Petroleum Exporting Countries*

ئەم ڕێکخراوە لە ساڵی ١٩٦٨ و بە ئەندامەتیی سێ وڵاتی عەرەبستان، کوێت و لیبیا دامەزراو، پێرەو پرۆگرامەکەی لە هەمان ساڵ داو لە بەیروت بەواژۆی سێ وڵاتی ئەندام گەیشت. وڵاتانی ئەبووزەبی، ئەلجەزایەر، بەحرەین، دوبەی و قەتەر لە ساڵی ١٩٧٠ و، میسر و سووریا لە

ساڵی ١٩٧١دا هاتنە نێو ئەم ڕێکخراوەیە. لە کارە گرنگەکانی ئەم ڕێکخراوە، بردنەسەری نرخی نەوت بوو کە لە دەرئەنجام دا بوو بە هۆی شۆکی یەکەمی نەوتی و، ڕێکخراوی ئۆپێک پاشان درێژەی بەم ڕەوتە دا. ڕێکخراوی ناوبراو بە ڕێکخراوێکی سەرەتایی بۆ ڕێکخستنی بەرژەوەندی عەرەبەکان دەژمێردرێ.

***ئۆپێک( ڕێکخراوی وڵاتانی هەناردەی نەوت)***

***OPEC (Organization Of Petroleum Exporting Countries)***

ئەم ڕێکخراوە دوای هەوڵێکی زۆر و دووروودرێژی وڵاتانی هەناردەی نەوت، لە ساڵی ١٩٦٠دا دامەزرا. هۆکارەکانی دامەزراندنی ئۆپێک بریتی بوون لە:

١ــدیاریکردن و دانانی نرخی هاوبەش.

٢ــ پاراستنی سەرچاوەی نەوتیەکان.

٣ــ پاراستنی ئاسایشی ئەو نەوتەی کە بۆ دەرەوە بەڕێ دەکرێ.

یەکەمین ئەندامانی ئۆپێک وڵاتەکانی عێراق، عەرەبستان، ڤەنزوێلا، ئێران وکوێت بوون، ئەندامانی واتا قەتەر، لیبیا، ئەندەنۆسیا، ئەبووزەبی، ئیکوادۆر، ئەلجەزایر، گابۆن و نیجریا دواتر هاتنە نێو ئەم ڕێکخراوە. ئیکڤادۆر لە سەرەتای دەیەی ٩٠دا، خۆی کشاندەوە.

***ئوتارکی (سەربەخۆیی ئابووری)*** **Autarky**

ئەم زاراوەیە لە چەمکی یۆنانیی Autarkeia بە مانای سەربەخۆیی و پشت بە خۆبەستن وەرگیراوە.

لایەنگرانی ئەم ڕێبازە باوەڕیان بە نەهێشتنی هەموو پێداویستیەکانی وڵات لە ڕێگای دابینکردنی سەرچاوە نێوخۆییەکان و کەمکردنەوەی هاوردە لە ڕێگای دانانی یاسای گومرگی وباجی زۆر هەیە.

**ئۆلترا ئەمپریالیزم** ***Ultra –Impreialism***

بەپێی تێۆری ئۆلترا ئەمپریالیزم، " ئەمپریالیزم لە پرۆسەی گەشەسەندن و پەرەگرتنی خۆیدا لە پێناوی مۆنۆپۆڵ و پاوانکردنی هەرچی زیاتر، بە قۆناغێک دەگا کە کۆتایی بە ململانێی نێوان ئەمپریالیستەکان دێ و، کەڵک وەرگرتنی هاوبەش لە جیهان لە لایەن تاقە سەرمایەیەکی ماددییەوە لە ئاستێکی یەکگرتووی نێودەوڵەتی دا وەدی دێ".

### ئۆلتیماتۆم *Ultimatum*

زاراویەکە کە لە ریشەی لاتینی Ultimum بە واتای "دوایین" و، لە عورفی سیاسیدا بە دوایین وتە دەگوترێ کە سەبارەت بە بابەتێکەوە دەربرِدرێ.

ئۆلتیماتۆم یان دووایین قسە بریتیە لەو بەڵگەیەی کە لەلایەن دەوڵەتێکەوە بە دەوڵەتێکی تر دەدرێ. لەو بەڵگەدا لانیکەمی ئەو ئیمتیازانەی کە دەوڵەتی یەکەم داوایان دەکا و هەروەها لانی زۆری ئەو ئیمتیازانەی کە دەتوانێ بیدات بە دەوڵەتی دووهەم، گونجێنراوە. لەو بەڵگەیەدا پێشنیارەکان و مەرجەکانی ئەو دەوڵەتەی کە بەڵگەکە پێشکەش دەکا بە شێوەیەکی شێلگیرانە باس دەکرێن. بەڵگەی ئۆلتیماتۆم، بەڵگەیەکی جیددیەوشتەکان بە روون و ئاشکرایی دەنووسرێن.

### ئۆمانیزم *Humanism*

بە هەموو ئەو تیۆرانە دەگوترێ کەبرِوایان بە بەختەوەری و رێزدانان بۆ کەسایەتی مرۆڤ، پێشکەوتنی هەمەلایەنەی مرۆڤ و پێکهێنانی هەلومەرجێکی لەبار بۆ ژیانی کۆمەڵایەتیی مرۆڤ هەیە. بزووتنەوەی مرۆڤدۆستی لە رێنێسانسەوە لە نێوان سەدەکانی چواردە و شازدەدا پەرەی گرت و، دروشمە سەرەکیەکانی بریتی بوون لە : ئازادیی عەقڵ و دژایەتی لەگەڵ گۆشە گیریە ئاینیەکان. نوێنەرانی ناسراوی ئەم بزووتنەوەیە بریتین لە: پێتراِرک، دانتە، بووکاچیۆ،لیۆناردۆداڤینچی، ئاراسمۆس، برِۆنۆ، رابلە، مونیتێ، کوپێرنیک، شکسپێر و فرانسێس بیکێن. دەتوانین لوتکەی بزوتنەوەی ئۆمانیزم لە بەرهەمەکانی رۆشنگەریی سەدەی هەژدەهەمدا ببینینەوە کە دروشمەکانیان ئەوانە بوون: ئازادی، یەکسانی، برایەتی. ئۆگۆست کۆنت لە سەدەی نۆزدەهەمدا بزوتنەوویەکی ئاکاری و ئایینی بە ناوی " پەرستنی مرۆڤایەتی" دامەزراند. هەربەم شێوەیە، لە بەریتانیا، ئەمەریکا و رووسیا .... چەندین تیۆری مرۆڤ تەوەری دارِێژران.

### ئۆڤێرلۆرد *Overloard*

ناوی نهێنی هێرشی نۆرماندی لە حوزیرەانی ١٩٤٤ لە، لایەن هێزە هاوپەیمانەکانەوە بوو.

لە مانگی ئابی ١٩٤٣دا، گەلاَڵەی هێرشی ناسراو بە ئۆڤێرلۆرد لە کۆنفرانسێکدا بە بەشداری فرانکلین رۆزڤەلت، سەرۆک کۆماری ئەوکاتی ئەمەریکا و چەرچیل، سەرۆک وەزیرانی بەریتانیا لە شاری کێبکی کانادا لە لایەن ژەنەراڵ سێرفرێدریک مۆرگان و ئەندامانی ناوەندی

فەرماندەیی ناوبراو، تاوتوێ کرا. ئەم گەلاڵەیە لە ماوەی نیوان مانگی کانوونی دووهەم هەتا حوزەیرانی ١٩٤٤ جارێکی تاوتوێ کرایەوە و مۆنتیگمێری وەک فەرماندەری تاقمی بیست ویەک واتا فەرماندەری گۆڕەپانی شەڕ دیاری کرا. هەروەها ئایزینهاوێریش وەک فەرماندەی باڵای هاوپەیمانان کە کۆنترۆڵی هەمە لایەنەی لە دەست دا بوو، هەڵبژێردرا.

لە رۆژی دەسپێکی هێرشدا، زیاتر لە چوار هەزار پاپۆر لێوارەکانی بەریتانیایان بەرەو لێوارەکانی نۆرماندی ، بەجێهێشت. زیاتر لە یەک و نیو ملیۆن کەس لە سەربازانی ئەمەریکی بۆ بەریتانیا گوازرانەوە تاکوو لە هێرشەکەدا بەشداری بکەن. لە یەکەمین کاتژمێرەکانی شەڕەکەدا (١)، دامەزراوەکانی لێوار ئاوی ئەڵمانیەکان لە لایەن فڕۆکەکانی هاوپەیمانانەوە تەفروتوونا کران. مین هەڵگرەوەکان ڕێگایان بۆ پاپۆرە شەرکەرەکان کردەوە.

بەم شێوەیە تاکوو رۆژی ١٢ی حوزەیرانی ١٩٤٤، ٣٢٦٠٠٠ کەس لە سەرپردێک بە پانایی ٥٠میل سەقامگیر بوون، و تاکوو بەر لە دووی تەمووز زیاتر لە یەک میلیۆن کەس لە سەربازانی هاوپەیمانان چوونە نێو خاکی فەرەنساوە. لە رێکەوتی پازدەی ئابی ١٩٤٤دا لەشکرێکی تری ئەمەریکا لە باشووری فەرەنسا دابەزی و، بەم شێوەیە، بەر لە کۆتایی ساڵی ١٩٤٤ بەشێکی گەورە لە خاکی فەرەنسا و بەلژیکا لە دەستی سەربازانی ئەڵمانیای نازی رزگار کرا.

### ئۆڤێنیزم — *Owenism*

رێبازێکە کە بۆ "رابێرت ئۆڤێن"ی دامەزرێنەری سۆسیالیزمی نوێ دەگەرێتەوە. بیروباوەڕەکانی مارکس لە گەلاڵەکانی ئۆڤێن سەرچاوەیان گرتووە.

### ئیدئۆلۆگ — *Ideologue*

ئیدئۆلۆگ لە زاراوەی فەلسەفەی سیاسیدا بەو بیرمەند، فەیلەسوف وتیۆری دارێژانە دەگوترێ کە خەریکی ئاراستەکردن، رێکخستن ودارشتی ئایدۆلۆژیەک بوون و، لە راستیدا خولقێنەری ئایدۆلۆژیەک بوون.

### ئیزڤێستیا
### Izvestia

زاراوەیەکی رووسیە بە واتای "هەواڵ". ئیزڤێستیا رۆژنامەی رەسمیی ئەنجوومەنی بەرزی یەکیەتیی سۆڤیەت بوو کە بەشێکی زۆری بابەتەکانی خۆی بۆ راڤەکردنی یاسا پەسندکراوەکانی ئەنجوومەنی بەرز و بڕیارە ئیدارییەکانی حکومەتی سۆڤیەت و شیکردنەوەی ئەم بڕیارانە، تەرخان دەکرد.

### ئەشکەنجە/ ئازاردان — Tor Ture

بە پێی ماددەی یەکی کۆنڤانسیۆنی قەدغە کردنی ئەشکەنجە لە رێکەوتی کانوونی یەکەمی ۱۹۸۲ی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان، ئەشکەنجە کردەویەکە کە بە هۆی ئەم کردەوە ئازار و ژانێکی زۆر، چ جەستەیی و چ دەروونی تووشی کەسەکە دەبێ. ئەم ئێش و ژانە بە تایبەتی بەو مەبەستە جێبەجێ دەبێ کە لەو کەسە یان لە کەسێکی سێهەم، زانیاری یا دان پێدانان سەبارەت بە شتێک دەرکێشن کە بتوانن ئەو کەسە یان کەسی سێهەم بە هۆی ئەو کارەی کە کردوویەتی یان گومانی لێدەکرێ کە کردبێتی، سزا بدەن، بیترسێنن یان بیخەنە ژێر گوشار یان کەسێکی سیهەم بترسێنن و بیخەنەژێر گوشارەوە.

بۆ بەرین کردنی پێناسەی کۆنڤانسیۆن سەبارەت بە ئازاردان، پێویستە کە ئەشکەنجە بەمەبەستی دان پێدانان و وەرگرتنی زانیاری بێ و لەلایەن کار بەدەستانی دەوڵەت یان کەسانی رەسمیەوە جێبەجێ بکرێ، لە خۆوەنەبێ و بەمەبەستی سزادانیش نەبێ. بەشی کۆتایی بەندی ۱ی ماددەی یەکی کۆانڤانسیۆن بەراشکاوی ئاماژە بەم خاڵە دەکا:

" زاراوەی ئەشکەنجە ئەو ئێش و ژانانە ناگرێتەوە کە بە تایبەتی لە سزادانە یاساییەکانەوە سەرچاوەیان گرتووە و یان لە پێوەندی لەگەڵ ئەم سزایانەدان یان بە هۆی ئەم سزایانەوە روویان داوە".

بۆ پێش گرتن لە بەرتەسک کردنەوەی دەوڵەتەکان بەو پێناسەیە، بەندی ۲ ی ماددەی ۱ دەڵێ کەئەم ماددە؛ پێشێلی یاسا نێودەوڵەتیەکان و نێوخۆییەکان ناکا کە ئازاردانێکی بەرفراوانتر لە خۆیان دەگرن. لەسەر ئەو بنەمایەیی کە ئازاردان لە لایەن کەسە رەسمیەکان یان دەست و پێوەندەکانی دەوڵەتەوە جێبەجێ دەبێ؛ دەوڵەتەکانی ئەندامی ئەم کۆنڤانسیۆنە، لەم بوارەدا ئەرکی

جیاوازییان لە ئەستۆ دایە. ماددەکانی ٢تا١٦ کۆنڤانسیۆن ئەو مەسەلانەی کە دەبێ دەوڵەتەکان ڕەچاوی بکەن؛ دیاری کردووە. جێگەی وەبیر هێنانەوەیە کە ئەرکی دەوڵەتەکان بۆ جێبەجێکردنی ئەم ئەرکانە، گەرەنتیەکی وردو کاریگەری نیە، بەڵام چونکە ئەو دەوڵەتانەی کە کۆنڤانسیۆنە نێو دەوڵەتیەکانیان مۆر کردووە، تارادەیەک دەیانەوێ سیمایەکی ئازادیخوازی و دادپەروەرانە لە خۆیان نیشان بدەن، لە بەر ئەمە دەتوانین بڵێین کە دەوڵەتەکان بەڵێنێکی ئەخلاقیان بۆ جێبەجێکردنی ئەم کۆنڤانسیۆنە هەیە.

بە پێی ماددەی ٢ ی کۆنڤانسیۆن ، هەر دەوڵەتێکی ئەندام، هەوڵی یاسا دانان، ئیداری، دادو هەوڵی وکاریگەری دیکە بۆ پێشگرتن لە ئازاردان لە هەموو بەشەکانی وڵات دا وەگەڕ دەخا (بەندی ١). هیچ هەلومەرجێکی نائاسایی، هەر هەلومەرجێک بێ وەکووشەڕ، یان هەڕەشەی شەڕ، نەبوونی سەقامگرتوویی سیاسی نێو خۆیی یان هەر حاڵەتێکی نائاسایی دیکە، پاسا و بۆ ئازاردان ناهێننەوە(بەندی ٢)؛ هەروەها دەستووری کەسی سەرەوەتر یان هیچ هێزێکی حکومەتی، ناتوانێ پاساو بۆ ئازاردان بهێنیتەوە.

### *ئەنجوو مەنی جیهانی کلیساکان*

### *World Councill of Churches*

ئەم ئەنجوومەنە کە لە کلیساکانی پرۆتستان و ئورتودۆکس پێکهاتووە لە ساڵی ١٩٤٨دا هاتە ئاراوەو لە دوای پێکهێنانی ئەنجوومەنی ڤاتیکان -٢ (١٩٦٩)، ئەنجوومەنی کلیسای کاتولیکی رۆمیش بوو بە ئەندامی ئەم ئەنجوومەنە. ئەم ئەنجوومەنە لە بوارە سیاسی، ئابووری، کۆمەڵایەتی و ئایینەکان دا باس وراوێژ دەکا و بایەخێکی تایبەتی بە کێشەکانی جیهانیی سێهەم دەدا. پشتیوانی ئەم ئەنجوومەنە لە بزاڤە رزگایدەرە چەکدارەکان لە هێندێک شۆین دا بەرادەیەکە کە دەبێتە هۆی ریسوا بوونی ئەم ئەنجوومەنە. ئەم ئەنجوومەنە دژی سیاسەتی ئاپارتایدە.

### *ئەنجوومەنی باکوور (نۆردیک)*

ئەنجوومەنی باکوور یان ئەنجوومەنی سکەندیناڤیا؛ کۆبوونەوەی نوێنەرانی دانیمارک، سوئید، ئیسلەند، فینلەند و نەرویجە کەئامانجەکەی پەرەپێدانی هاوکاری لە نێوان وڵاتانی سکەندیناڤیا لە بوارە جیاوازەکان دایە.

***ئەنجوومەنی هاوکاری کەنداوی فارس***

***Persian Gulf Cooperative Council***

بەرێکخراوەیێک دەگوترێ کە لە ٢٥ی ئایاری ١٩٨١ لە ئەبووزەبی دامەزراندنی خۆی ڕاگەیاند. ئەندامانی ئەم ئەنجوومە بریتین لە ولاٌتانی کوێت، بەحرەین، قەتەر، ئیماراتی یەکگرتووی عەرەبی، عەممان و عەرەبستانی سعودیا. ئامانجی ئەم ئەنجوومەنە پاراستنی بەرژەوەندی سیاسی، ئابووری و سەربازی ئەندامەکانی خۆیەتی.

***ئەنجوومەنی هاوکاری عەرەب***

***Arab Cooperation Council (ACC)***

ئەم ڕێکخراوە لە ڕێکەوتی ٦ی شوباتی ١٩٨٩ دامەزراوە بۆئەوەی پێوەندی ئابووری نێوان ئەندامەکانی خۆی بەهێز بکا. ئەندامەکانی ACC بریتین لە: میسر، عێراق، یەمەن و ئۆردن. ئەگەرچی بەپێی پێرەوپڕۆگرامی ئەم ئەنجوومەنە ولاٌتانیی دیکەش دەیانتوانی ببنە ئەندام؛ بەلاٌم عێراق ئەم مافەی بۆی خۆی پاراستبوو هەتا هەموو هەولەکانی سووریا بۆ بوون بە ئەندامی لەم ئەنجوومەنەدا " ڤیتۆ" بکا. ئەنجوومەنی هاوکاری عەرەب لەدوای شەڕی دووهەمی کەنداوەوە بە شێوەی کردەیی هیچ تێکۆشانێکی نەماوە.

***ئەنتەرناسێونالٌ*** ***The International***

ناوی کۆمەلٌەی ڕێکخراوە کرێکارییەکان و گرووپ و حیزبە سۆسیالیستیەکانە، کە بۆ گەیشتن بە هاوکاریی جیهانی و بەرەوپێشبردنی بزووتنەوەی کرێکاری لە جیهاندا هەولٌ دەدەن. ئەنتەرناسیۆنالی یەکەم لە سالٌی ١٨٦٤ لە لەندەن و لە ژێر ناوی " کۆمەلٌەی نێونەتەوەیی کرێکاران" دامەزرا. ئەنتەرناسیۆنالی دووهەم لە سالٌی ١٨٨٩ وەک ڕێکخراوی هاوبەشی حیزبەسۆسیالیستیەکان" و ئەنتەرناسیۆنالی سێهەمیش لە سالٌی ١٩١٩ لە مۆسکۆ دامەزرا. ئەنتەرناسیۆنالی سێهەم لە سەرەتادا ناوی کۆمینتێرن و دواتر بوو بە کۆمینفۆرم. ئەنتەرناسیۆنالی چوارەم لە سالٌی ١٩٣٨ لە لایەن لایەنگرانی ترۆتسکی دامەزرا.

ئەنتەرناسیۆنالیستی سۆسیالیست کە لە سالٌی ١٩٥١ و لە فرانکفۆرت دامەزرا، لە چل حیزبی سۆسیال دیمۆکرات پێک هاتبوو کە ناوەندەکەی لە لەندەن بوو.

## Cession — ئەسپاردنی خاک

یەکێک لە شێوە ناسەرەکیەکانی بەدەست هێنانی خاک لە لایەن ولاتێکەوەیە. ئەسپاردنی خاک بەپێی ڕێککەوتننامە جێبەجێ دەبێ. ئەسپاردن لەگەڵ داگیرکردندا جیاوازی هەیە. ئەسپاردن بەپێی ڕێوورەسمێکی تایبەتی بۆ گواستنەوەی دەسەلاتدارەتی لایەنێک بۆ لایەنێکی دیکەیە، بەلام داگیرکردنی بەزۆر بە بێ ڕێککەوتننامە نیە. ئەسپاردن دەتوانێ لە ڕێگای کڕین، گۆڕینەوە، دیاری، جیاوازی، تیکەلاوبوونی دڵخوازانە و یان شێوە سەربەستانەکانی دیکە جێبەجێ بکرێ، یان دەتوانێ ئاکامی سەپاندنی زۆر بەسەرولاتێکدا بێ کە ئەو بەشەی خۆی بەو ولاتە سپیرێ، ئەم شێوازە لە ڕوانگەی یاسای نێودەوڵەتیەوە بە کردەوەیەکی نایاسایی دادەنرێ.

## Elitism — ئێلیتیزم

بە پێی ئەم تیۆرە، سروشتی هەرکۆمەڵگایەک چ دینامیکی و چ میکانیکی، ڕەوا یان نارەوا لە لایەن هەڵبژاردەکانی ئەو کۆمەڵگایەوە دیاری دەکرێ. هەرچەندە ڕابردووی ئێلییتزم دەگەڕێتەوە بۆ بیروبۆچوونەکانی ئەفلاتوون، ماکیاڤێلی و . . .هتد، بەلام ئێلیتیزم وەکوو تیۆرێکی هێزی کۆمەلایەتیی لە لایەن ڤیلفێردۆ پاریتوو ( Vilferdo Pareto)، گائێتا موسکا و ڕوبێرت میشلێز هاتۆتە ئاراوە. ئێلیتیزم لەسەر سێ بنەما ڕاوەستاوە:

١ــ بڕوا بە حەتمی بوونی حکومەتی بژاردەکان و جێبەجێ نەبوونی لیبراڵ دێموکراسی.

٢ــ حاشاکردن لە چەمکی ئێکومینیزمی مارکسیزم بەو واتایەی کە ئابووری دیاریکەری دینامیزمی کۆمەلایەتی بێ.

٣ــ بڕوابە سەربەخۆیی شاراوەی دەوڵەت لە هێزە کۆمەلایەتیی و ئابوورییەکاندا.

## Strars And Strips — ئەستێرە و هێڵ

بە ئالای ئەمەریکا دەگوترێ کە سێزدە هێڵکەی ، نیشانەی سێزدە ویلایەتی یەکگرتووی سەرەتای دامەزرانی ئەم ولاتەو و پەنجا ئەستێرکەش نیشانەی پەنجا ویلایەتی ئێستاکەی ئەمەریکایە.

## ئابڤهێر Abwehr

زاراوەیەکی ئەڵمانیە، بە واتای بەرگریکردنە؛ کە بە ڕێکخستنی سوپای ئەڵمانیای هیتلەری دەگوترا. ئەم ڕێکخستنە لەپێنج بەش پێکهاتووە:

١ــ دەزگای هەواڵگری و سیخوڕی هێزەکانی سێ کوچکە.

٢ــ دەزگای تێکدەری.

٣ــ دەزگای دژە سیخووڕی.

٤ــ دەزگای دەرەکی.

٥ــ یەکەی ناوەندیی ڕێکخستنی هەواڵگری.

## ئاپاترید Apatride

بەکەسێک دەگوترێ کە بە واتای تایبەتی، هاووڵاتی هیچ وڵاتێکی دیاریکراو نیە. ئاپاترید لەم حاڵەتانەدا سەرهەڵدەدا:

١ــ کۆچکردن.

٢- بەپێی یاسای هێندێک لە وڵاتان کە مافی هاووڵاتی بوون بە بیانیەکان نادەن.

### ئاپارتاید Apartheid

وشەیەکی ئەفریقیە، بە واتای جیاوازی دانانە (Segregation)، کە لە ڕاستیدا بە سیاسەتی هەڵاواردنی ڕەگەزی حیزبی نەتەوەیی ئەفریقیای باشوور دەگوترا، کە لە ساڵی ١٩٤٨ هەتا ساڵی ١٩٩٤ لەم وڵاتە، پیادە دەکرا.

سیاسەتی ئاپارتاید بڕوای بە زاڵبوونی ڕەهای تەواوەتی ڕەگەزی سپی و جێبەجێکردنی سیاسەتی ڕەهای هەڵاواردن سەبارەت بە ڕەش پێستەکان لەلایەن سپی پێستەکانەوە هەیە. ئاپارتاید، لە بواری تیۆرییەوە بڕوای بە نایەکسانیی ڕەگەزەکان هەیە.

### ئاتاشە Attace

زاراوەیەکی فەڕنسیە بە واتای بەستراوە، کە زیاتر بە نزمترین ئاستی پلەی دیپلۆماتیک دەگوترێ.

### ئاگربەست Cease –Fire

ئاگربەست یەکەمین ئەڵقەی زنجیرێکە کە لە شەڕەوە هەتا کاتی ئاشتی درێژەی دەخایەنێ. قۆناغە جۆراوجۆرەکانی ئاگربەست بریتین لە:

١ـ ڕاگەیاندنی ئاگربەست لە لایەن هەر دوو لایەنی شەڕ بە هێزەکانی ژێر کۆنترۆڵی خۆیان.

٢ـ هەردوو لایەن دەتوانن هەڵوێستە بەرگرییەکانی خۆیان لە پشتی هێڵەکانی ئاگربەست ڕێک بخەن؛ بەڵام دامەزراندنی هێزەکان یان چەک وچۆڵی نوێ قەدەغەیە.

٣ـ لایەنەکانی شەڕ بۆ پێشگیریکردن لە تێکهەڵچوونی هێزەکانیان، پێوەندییان بەیەکەوە دەبێ و،سەبارەت بە هەر ئاڵوگۆڕێکی بچووکی ناوچەکە ئاڵوگۆڕی بیروڕا دەکەن و یەکتر ئاگادار دەکەنەوە.

٤ـ دیاریکردنی هێڵێکی کاتیی جیاکەرەوەی هێزەکان و، ئەگەری دیاریکردنی ناوچەیەکی ناسەربازی[بێ لایەن .و].

٥ــ چاوەدێرانی سەربازی کە لە بەرامبەر ئەنجوومەنی ئاسایشدا بەرپرسیارن و، چاوەدێری بەڕێوەچوونی ئاگربەستەکە دەکەن.

پێویست بە وەبیرهێنانەوەیە کە ئاگربەست توخمێکی پێویست بۆ وازهێنان (دووهەمین ئەڵقەی زەنجیری سێ ئاڵقەیی ئاگربەست، وازهێنان و کۆتایی دووژمنایەتی )یە و، هەم دەتوانێ پێش وازهێنان و هەم دەتوانێ لەگەڵ وازهێناندا، هاوکات بێ.

**ئادۆمید** **Adomide**

ئادۆمید بە کەسێک دەگوترێ کە خاوەنی شوێنێکی نیشتەجێ بوونی دیاریکراو نەبێ.

***ئاریا / ئاریەن*** ***Arya & Aryan***

سەرچاوەی ئاریا دەگەڕێتەوە بۆ زمانی سەنسکریتی. تایفەیەکی هیندوئەورووپین کە لە سەردەمی زۆر کۆندا بەیەکەوە دەژیان و، دواتر بەسەر دووبەشی گەورەدا دابەش بوون. بەشێکیان چوون بۆ هیندو، بەشێکیشیان چوون بۆ ئێران و، بە خۆیان دەگوت"ئاریا" (واتا: هاوڕێ یان بەوەفا) و، وشەی "ئێران" لەو ناوە وەرگیراوە. ئەو خەڵکە لە سەردەمەکانی دواتردا بەسەر چەند لقی تردا دابەش بوون و، هەریەک چوون بۆ لایەک. پێویست بە ئاماژە پێکردنە کە هێندێک لە زانایانی ئەڵمانی بە هەموو هیندو ئەوروپیەکانیان دەگووت "ئاریا".

***ئاریانای گەورە*** ***Greater Aryana***

بە تیۆرێک دەگوترێ کە لایەنگری لە یەکیەتیی وڵاتە فارسی زمانەکان دەکا. ئەو وڵاتانە بریتین لە ئێران، ئەفغانستان و تاجیکستان.

***ئاریستۆکراسی*** ***Aristocracy***

زاراوەیەکە کە لە ریشەی یۆنانیی Aristokratio (حکومەتی باشترینەکان) وەرگیراوە کە لە زمانی سیاسەتدا بەواتای حکوومەتی پیاوماقوڵان بەکاردێ.

له یۆنانی کۆندا مەبەست له ئەریستۆکراسی جۆرێک له حکومەت بوو که کاربەدەست و دەسەڵاتدارەکانی ئەم سیستەمە پیاوماقوڵان بوون، بەڵام مەبەست له ئەریستۆکراسی له چاخی نوێدا، حکومەتی چینی باڵادەست به زیانی جەماوەری خەڵکه.

## Liberty ئازادی

ئەم زاراوەیه هاوواتای چەمکی لیبێرتەی (Liberte) فەرەنسیەو، سەرچاوە لاتینیەکەی Libertas یە، که به واتای نەبوونی کۆت وبەند و زۆرە.

"ئازادی"، رەوش و هەلومەرجێکه که مرۆڤ لەو رەوشەدا، هەست به قورسایی دەسەڵات ناکا، و هیچ دەسەڵاتێک ناتوانێ بەربەست بێ لەبەردەم جم و جۆڵی زاتی و سروشتیی مرۆڤەکاندا.

چەمکی ئازادی له زمانی فارسیدا له وشەی پەهلەوی " ئازات" بەمانای سەربەست، رەسەن و جوامێر وەرگیراوە. له بواری کۆمەڵایەتیەوە، ئازادی چەندین جۆری جیاوازی هەیه، ئازادی سیاسی، ئازادی ئابووری، ئازادی کولتووری و .... هتدو، هەروەها لایەنی جۆراوجۆری هەیه. ئازادی رادەربڕین، ئازادی نووسین، ئازادی کار وکردەوە و... هتد. ئازادی؛ ئازادیی هزر، ئازادیی بیروباوەڕ و نەترسان له دەربڕینی ئەم ئازادیانە له کۆمەڵگادا له خۆ دەگرێ و، بەیەکێک له بنەماکانی دیموکراسی دەژمێردرێ.

ئازادی به واتای ئانارشیزم و بەربەرەڵلایی نیه. ئازادی بەبێ دسیپلینی ناوخۆیی و دەرەکی، جۆرێک له ئانارشیزمه که لەگەڵ زات و ئامانجەکانی ئازادیدا ناگونجێ.

## Four Freedoms ئازادییه چوار کوچکەکان

له مێژووی هاوچەرخی ئەمەریکادا، رابردووی ئەم زاراوەیه بۆ شەشەمی کانوونی دووهەمی ساڵی ١٩٤١ دەگەڕێتەوە که فرانکلین رۆزڤەلت، سەرۆک کۆماری ئەوکاتی ئەمەریکا لەو رۆژەدا له وتارێک بۆ کۆنگرەی ئەمەریکا، بنەماکانی ئەم ئازادییەی بەم شێوەیەی خوارەوە دەربڕی:

١. ئازادیی قسه و رادەربڕین

٢. رزگار بوون له دەستەندەخواری (پێویستی)

٣. رزگار بوون له ترس

٤. ئازادی خواپەرەستی

### ئازادییه تاکەکسییەکان *Individual Liberties*

ئازادییه تاکەکسییەکان بریتین لەو مافانەی که له لایەن دەوڵەتەکانەوە بە تاکەکان دراون و، مسۆگەر کراون؛ وەک ئازادی چاپەمەنی، ئەنجوومەنەکان، بازرگانی، ئایین، نیشتەجێ بوون و کاروکاسبی. بەگشتی دەستووری وڵاتان، ئەو مافانە مسۆگەر دەکەن.

### ئاژانسی زانیارییه بەرگرییەکان *Defence Intelligence Agency(D.I.A)*

رێکخراوی سیخوورپی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا له بواری کاروباری شەڕ دایه که له ساڵی ١٩٦١ له لایان رابێرت مەک نامارا، وەزیری بەرگریی ئەمریکا له سەردەمی سەرۆک کۆماریی جۆن کەنەدی (١٩٦٣_١٩٦١) دامەزرا. ئەم رێکخراوە بە شێوەیەکی نهێنی چاوەدێری بەسەر کارەکانی "سیا" دا دەکا.

### ئاژانسی ئاسایشی بەرامبەرانە *Mutual Security Agency*

ناوی رێکخراوێکی ئەمەریکیه که بەپێی یاسای ساڵی١٩٥١ به مەبەستی بەهێزکردنی هاوکارییه ئابووری، تەکنیکی و سەربازییەکانی وڵاتانی دۆست، بۆ سەقامگیرکردنی ئاشتیی جیهانی دامەزراوە.

### ئاژانسی ئاسایشی نەتەوەیی *National Security Agency*

رێکخراوی سیخوورپی ئەلیکترۆنیی ئەمەریکایه که بۆ هێزە زەبروەشێنەکانی ئەمەریکا دامەزراوە و له چوار بەرێوەبەری پێکهاتووە: بەرێوەبەری کۆد (رەمز) و دۆزینەوەی دەوڵەتی،بەرێوەبەری دیپلۆماتیک، بەڕێوەبەری لێکوڵینەوە و تەکمیل و بەرێوەبەری کاروباری فەرمانبەران. ناوەندی ئاژانسەکە له مێریلەندی ئەمریکایه.

***ئاژانسی نێونەتەوەیی وزەی ئەتۆمی***

***International Atomic Energy Agency (IAEA)***

بیرۆکەی پێکهێنان و دامەزراندنی ڕێکخراوێکی جیهانی بۆ کەڵک وەرگرتنی ئاشتیخوازانە لە وزەی ئەتۆمی، لە دەیەی ۱۹٥۰دا سەریهەڵدا. لەساڵی ۱۹٥۳، بە دوای پێشنیاری ئایزنهاڤیر، سەرۆکی ئەوکاتی ئەمەریکا، بە کۆمەڵەی گشتی un و داکۆکی کۆمەڵەی گشتیش لە سەر پێشنیارەکەی ئایزێنهاڤیر، بەرنامەی ڕێکخستن و پێکهێنانی ناوەندێک لەو بوارەدا دەستی پێکردو، هێڵە سەرەکیەکانی ئاژانسی وزەی ئەتۆمی دارێژرا. لە کانوونی یەکەمی ساڵی ۱۹٥٤دا، کۆمەڵەی گشتی بڕیارنامەی "ئەتۆم بۆ ئاشتی " پەسند کردو، لە دەرئەنجامدا، لە ۱۳ی تشرینی یەکەمی ۱۹٥٦، ڕەشنووسی پێرەوو‌پرۆگرامی ئاژانس لە کۆنفرانسێکی نێونەتەوەیی وزەی ئەتۆمی لە ۲۹ی حوزیران بەرەسمی هاتە ئاراوە.

لە چواردەی تشرینی دووهەمی هەمان ساڵدا، کۆمەڵەی گشتی ڕێککەوتننامەیەکی سەبارەت بە پێوەندییەکان و هاوکاریی ئاژانس لەگەڵ نەتەوە یەکگرتووەکاندا مۆر کرد.

لەوکاتەوە، ئاژانس وەک ڕێکخراوێکی نێونەتەوەیەیی سەربەخۆ، کە ئەرکی ڕێنوێنی کردنی کەڵک وەرگرتن لە وزەی ئەتۆمی لە پێناوی خۆشگوزەرانی زیاتری لە ئەستۆ دایە، چالاکی خۆی دەست پێکردووە. ئاژانسی نێونەتەوەیی وزەی ئەتۆمی بەپێی پێرەوو‌پرۆگرام، لەگەڵ ڕێکخراوە پرۆفیشناڵەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان و ڕێکخراوە نێودەوڵەتیەکانی دیکەدا پێوەندی هەیە و، ساڵانە ڕاپۆرتی کارو چالاکیەکانی خۆی ئاراستەی کۆمەڵەی گشتی دەکا.

**ئامانجەکانی ئاژانس بەپێی پێرەوی نێوخۆیی :**

١ــ هاندان و هاوکاریکردن بۆ لێکۆڵینەوە و پەرەپێدانی توێژینەوەی زانستی سەبارەت بە وزەی ئەتۆمی بەمەبەستی کەڵک وەرگرتنی ئاشتییانە لە هەموو جیهاندا، پێکهێنانی ئاسانکاری لە وڵاتانی ئەندام، دابینکردنی پێداویستیەکان و پشتیوانیکردن لە لێکۆڵینەوەکان، یان پەرەپێدانی پێشنیاری زانستی بەمەبستی کەڵک وەرگرتن لە وزەی ئەتۆمی لە کاروباری ناسەربازیدا؛

٢ــ خستنەرووی پێشنیاری ئاسانکاریی پێویست بۆ لێکۆڵینەوە و، پێشنیاری پێویست بۆ کەڵک وەرگرتن لە وزەی ئەتۆمی لە پێناوی ئاشتی و خۆشگوزەرانیی مرۆڤ لە هەموو جیهاندا؛

أ

٣ــ کۆکردنەوەی زانیاریی سەبارەت بە گۆڕانکارییە زانستی و تەکنیکیەکان بۆ کەڵک وەرگرتنی ئاشتیانە لەئەتۆم؛

٤ــ پەروەردەکردنی شارەزایانی لێهاتوو و پسپۆر بۆ کەڵک وەرگرتنی ئاشتیانە لە وزەی ئەتۆمی؛

٥ــ رەچاوکردنی خاڵی پێشگیرانە بۆ دڵنیابوون لە بەکارهێنانی کەرەسەکان، خزمەتگوزارییەکان، ئاسانکاری و زانیاری سەبارەت بە وزەی ئەتۆمی بۆ کەڵکی ئاشتیخوازانە؛

٦- دابینکردنی پێویستیەکان، راوێژکردن و پێکهێنانی پێوەندی لەگەڵ رێکخراوەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان و ئاژانسە پسپۆڕییەکانی پێوەندیدار بە رێکخراوەکە لە بارەی ستاندارده پێشیگرانەکان بۆ پارێزگاری کردن لە سلامەتی مرۆڤەکان لە بەرامبەر ئەو هۆکارانەی کە هەڕەشە لە ژیانی مرۆڤ دەکەن و، ئاراستەکردنی پێشنیار سەبارەت بەم خاڵە. هەروەها ئاژانس دەبێ داوا لە وڵاتانی ئەندام بکا، کە لەم پێوەندییەدا، هەوڵەکانی خۆیان لەگەڵ ئاژانسی نێودەوڵەتیی وزەی ئەتۆمی رێک بخەن.

٧ــ ئاسانکاریکردن و دابینکردنی کەرەسە پێویستەکان بۆ کەڵک وەرگرتنی بەجێ لە ئەتۆم لە ژیانی مرۆڤ و بوونەوەرو.... هتددا.

بەگشتی دەتوانین بڵێین کە ئامانجی ئاژانس لە سەر دوو تەوەری گشتی دارێژراوە: یەکیان کەڵک وەرگرتنی ئاشتیخوازانە لە وزەی ئەتۆمی و پەرەپێدان و برەودان بە وزەی ئەتۆمی لە پێناوی ئاشتی، تەندروستی، پێشکەوتن و خۆشگوزەرانی لە هەمووی جیهان و، دووهەم، دڵنیابوون لەوە کە هاوکاری و زانیارییەکانی ئاژانس لە بواری وزەی ئەتۆمییەوە، بۆ مەبەست و ئامانجە سەربازییەکان کەڵکیان لێ وەرناگیردرێ.

بە سەرنجدان بەو ئامانجانە، دەبێ ئاژانس چالاکییەکانی خۆی بەپێی ئەو بنەمایانەی کە خزمەت بە ئاشتی و ئاسایشی جیهانی دەکەن، پەرە پێ بدا. بۆ ئەم مەبەستە، ئاژانس سیستەمی کۆنترۆڵی بۆ دڵنیابوون لە بەکارهێنانی ئاشتیانە لە کەرەسە ئەتۆمییەکان پێک هێناوەو، سەرەڕای ئەوەی راپۆرت بە کۆمەڵەی گشتی دەدا، لە کاتی پێویستدا، ئەنجوومەنی ئاسایش کە ئەرکی پاراستنی ئاشتی و ئاسایشی نێونەتەوەیی لە ئەستۆ دایە، لە رەوتی کار و شێوازی چالاکیەکانی خۆی ئاگادار دەکاتەوە.

ئاژانس وەک نێوبەندێک بۆ دابینکردنی کەرەسە، خزمەتگوزاری، کەل وپەل، ئاسانکاری، پەرەپێدانی ئاڵ گۆڕی زانیاریی زانستی و تەکنیکی و، هاندانی ئاڵ وگۆڕ و راهێنانی زانایان و شارەزایان لە نێوان وڵاتانی ئەندامدا کاردەکا. سەرەڕای ئەمانە، بە گرتنەبەری رێ وشوێنی گونجاو، پێکهێنانی ناوەندی چاوەدێریکردن بەمەبەستی بەربەرەکانێکردن لە خراپ کەڵک وەرگرتن لە هاوکارییەکانی ئاژانس بۆ ئامانجی سەربازی، تێدەکۆشێ. لە گرنگترین کارەکانی ئاژانس، بەرنامەی هاوکارییە تەکنیکیەکان بۆ بەرزکردنەوەی گواستنەوەی لێهاتووییەکان و تەکنەلۆژیا و دابینکردنی خولی راهێنان بۆ وڵاتانی ئەندامە کە لەو بوارەدا زیاتر وڵاتانی جیهانی سیهەمی لە بەرچاو گرتووە و، هاوکاری کردوون.

هەروەها ئەم ئەرکە بە ئاژانس سپێردراوە کە پێش بە بڵاوبوونەوەی چەکە ئەتۆمییەکان بگرێ، واتە رێککەوتننامەی پێشگیریکردن لە بڵاوبوونەوەی چەکە ئەتۆمییەکان Non Prolferation Treaty(NPT) جێبەجێ بکا. جێبەجێکردنی ئەم رێککەوتننامە یەکێک لە گرنگترین لایەنەکانی ئەرک و رۆڵی ئاژانسی نێونەتەوەیی وزەی ئەتۆمی پێک دێنێ. مەبەست لەو رێککەوتننامە، هاوکاریکردنی دەوڵەتەکانە لە بواری جێبەجێکردنی بەڵێنە نێونەتەوەییەکان بۆ پێشگیریکردن لە بڵاوبوونەوەی هەرچی زیاتری چەکە ناوەکیەکان. ئێستا ژمارەیەکی زۆر لە دامەزراوە و ئۆرگانەکانی دیکە لە ژێر چاوەدێریی ئەم ئاژانسە دان. ئەم چاوەدێرییە نزیک بە٥٩% کەرەسە ناوەکیەکانی جیهان لە خۆ دەگرێ(جگە لە کەرەسەکانی ٥ وڵات نەبێ کە خاوەنی چەکی ناوەکین). ئەرکی ئاژانسی نێونەتەوەیی وزەی ئەتۆمی لە بواری چاوەدێریکردن، بەڕادەی بەرنامەکانی هێزی ناوەکی زیادی کردووە و، ئێستاش رای گشتی زیاتر بایەخ بە لایەنە چاوەدێرییەکانی ئەو ئاژانسە دەدا.

### ئاژانسی جوولەکە *Jewish Agency*

رێکخراوێکی جوولەکەیە کە ئیسرایل بە جوولەکەکانی سەرانسەری دنیاوە دەبەستێتەوە. دامەزراندنی ئەو رێکخراوە یەکێک لە مەرجەکانی سەرپەرەستیاری فەلەستین لە لایەن کۆمەڵەی نەتەوەکان بە بەریتانیا بوو.

### Agitation ئاژیتاسیۆن

ئامرازێکە بۆ کارتێکردنی سیاسی لە جەماوەر لە رێگای وتاردان و وتووێژ، رۆژنامەکان، کتێبەکان، نامە، رادیۆ و تەلەفزیۆن و راگەیەنە گشتیەکانی دیکە. هەروەها ئاژیتاسیۆنیان بە چالاکیی پروپاگەندەیی بۆ تێگەیاندنی بیروبۆچوونە سیاسییەکان بەخەڵک پێناسە کردووە.

### Auschwitz ئاشڤیتس

گەورەترین و ترسناکترین کوورە مرۆڤ سووستێنەکانی نازییەکان بوو کە لە ١٥٠مایلی ڤەرشۆ پایتەختی پۆلۆنیا هەڵکەوتووە. ئەم ئۆردوگایە بۆ یەکەم جار لە مانگی مایسی ١٩٤٠ و وەک ئۆردوگای کاری زۆرەملی بۆ پۆلۆنیەکان دروست کرا.

دوای کۆتایی شەڕی دووهەمی جیهانی، زۆربەی ئەڵمانیەکان دەیانگووت کە ئاگایان لە هەبوونی ئەم کوورانە بە تایبەتی لە دەرەوەی ئەڵمانیادا، نەبووە. بەڵام بڵاوبوونەوەی کتێبی سپیی بەریتانیا پەردەی لە سەر زۆربەی هێنیەکان هەڵدایەوە.

رەنگە ئەو دروشمە لە ئاوازی " ئەڵمان ڕاپەڕە"ی بەرهەمی ریشارد ڤاگنێر، مۆسیقاژەنی بە ناوبانگی ئەڵمانی وەرگیرا بێ، کە لە ئەڵمانیادا، زۆر بەناوبانگە.

### Amoralism ئامووڕالیزم

ئەم زاراوەیە بە گشتی بەمانای رەتکردنەوەی هەرجۆرە پرەنسیپێکی رەوشتیەو؛ رێبازێکە کە پاساو بۆ کردەوە دژە مرۆییەکان و تێکشکاندنی هەستە رەوشتیەکان دەهێنێتەوە.

ئامووڕاڵیزم یەکێک لە تایبەتمەندییە تایبەتیەکانی فاشیزم و ئایدۆلۆژی و دۆکتورینە کۆنەپەرستیەکانە.

### Anabaptism ئانابابتیزم

پرەنسیپەکانی بیروباوەڕی گرووپێکی ئاینی بوو کە لە سەردەمی لوتەر (سەدەی ١٦) لە ئەڵماندا هاتە ئاراوە و، پاشان لایەنگرانی ئەم لقە ئاینیە بە سویسرا، هۆڵەندا و موراڤی، نەمسا،

بوهیمیا و شوێنەکانی تری ئەوروپادا بڵاوبوونەوە. لە ساڵی ١٨٧٤دا، لایەنگرانی ئەم بیروباوەڕە لە رووسیا کۆچیان کرد بۆ داکوتای باشور لە ئەمەریکا و، لەوێ نیشتەجێ بوون. بزووتنەوەکەیان ئامانجێکی سۆسیالیستی و کۆمۆنیستی هەبوو، بەڵام چوونکە ئەندامەکانی پەرتەوازە بوون، نەیانتوانییوو رێکخستنێکی پتەو رێک وپێک و سانترالیست پێک بێنن.

بۆیە بەمانە دەڵێن بابتیست، چوونکە دژی " غسل تعمید"ی (رێورەسمێکی ئایینی مەسیحی) منداڵان بوون و، دیانگووت کە پاش گەورەبوون ئەگەر بۆخۆیان ئایینی مەسیحیان قبووڵ کرد، دەبێ خاوێن بکرێنەوە و، ئەم ئەمانە پێیانوابوو کە لە کتێبی پیرۆزدا هێچ ئاماژەیەک بە "غسل تعمید" نەکراوە. لایەنێکی تر ئەوەیە کە لایەنگریان لە چاکسازیە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکان دەکرد. لە نێوخۆیاندا بیروبڕاوی جۆراوجۆر و جیاواز سەریان هەڵدا، هەربۆیە نەیانتوانی یەکڕیزی دەستەبەر بکەن. بەڵام لە سەر هێندێک پرەنسیپی گشتی، بۆوێنە هەموویان لەسەر ئەوە کۆک بوون کە رۆحی هەرکەس لە بەرامبەر خوادا وڵامدەرەو هەروەها بڕوایان بە برایەتیکی رەها لە مەسیحیەتدا هەبوو.

بابتیستەکان وەرگرتنی سوود و رِبایان لە نێو خۆیاندا، قەدەغە کردبوو. لایەنگریان لە ئاشتی دەکرد، و بۆ بڵاوکردنەوەی جۆرێک لە کۆمۆنیزم تێدەکۆشان. سۆیندیان نەدخواردو، دیانگووت پەیڕەویکردن لە دەوڵەت کارێکی دزێو و نگریسە. ئەو تاقمە دەکەوتنە بەر رق و بێزاری و گاڵتە جاڕی خەڵکی تر، یەکێک لە پێشەوایانی ئەو تاقمە تۆماس مونزەر، قەشەی ساکسۆینە کە بە هۆی وانەو داهێنانە سۆسیالیستیەکانی، لایەنگرێکی زۆری پەیدا کردو، رۆڵێکی گرنگی لە شەڕی جوتیارانی ساڵی ١٥٢٥دا هەبوو کە لە پاش شکستی جوتیارەکان، دەستبەسەر کرا و لە سێدارە درا.

دوای مۆنزەر، کە لە گوندی ڕەن، کەسێک لەو تاقمە بە ناوی مەلکوور هوفمەن بانگەشەی ئەوەی کرد کە مەسیح زیندوو بۆتەوەو گەڕاوەتەوە، لە ساڵی ١٥٣٣دا، لە ئیستراسبۆرگدا بەند کرا. هەر لەو کاتەدا، ئەندامانی گرووپەکە لە مونستەر کۆبوونەوە و، سەرەتا دەوڵەتێکی تیئۆکراسیان لە ژێر سەرکردایەتی وتاربێژێک بەناوی بێرنارد راتمەن و نانەوایەکی دەمارگرژی هۆڵەندی بە ناوی یوهان ماتلیزۆن پێک هێنا. لە ساڵی١٥٣٤دا، جۆن ئیف لیدن پۆستەکەی بەدەستەوە گرت و، ناوی لێنا شانشینی زیون . لەو شانشینەدا هاوسەرگیری و یاسا و

خاوەنداریێتی سامانەکان هەڵوشاوە. ئەم شێوازە توندڕۆییانەی ڕێبازی ئاناباپتیزم ( یان کۆمۆنیزمی مەسیحی )لە ساڵی ١٥٣٥دوای ئەوی هێرشیان کردە سەر مۆنتسێر و داگیریان کرد و ڕێبەرانی ئەو گرووپەیانلە سێدارەدا، بە بڕیاری شازادە قەشەی مونتسێر کۆتایی بە حکومەتی ئەم گرووپە هات.، بەڵام ئەندامەکانی ئەو گرووپە بیروراکانی خۆیان پاراست و بزووتنەوەکە لە ناو نەچوو. ژمارەیەک لە ئەندامانی ئەو گرووپە بە ڕێبەرایەتی منۆسیمۆنز، بە منۆنیتەکان بەناوبانگ بوون. ئەندامانی دیکەی ئەم گرووپەش سویسرایان بەجێ هێشت و لە وڵاتانی دیکەی ئەورووپادا پرش و بڵاو بوون.

بزووتنەوەی ئاناباپتیزم هەمووکات لەگەڵ دژایەتیی کەنیسەی کاتۆلیک و پرۆتستاندا بەرەوڕوو بۆتەوە. چوونکە ڕێ و شوێن و پرەنسیپەکانی ئەوانیان بە پێچەوانەی پرەنسیپەکانی مەسیحیەت دەزانی.

### Anarchism ئانارشیزم

لە وشەی یۆنانیی (Anarch(os وەرگیراوە، بە کەسێک دەگوترێ کە ڕێبەر و سەرکردەی نەبێ.

مانای سیاسیی زاراوەی ئانارشیزم ئەو تێزە تایبەتە دەگرێتەوە کە خوازیاری هەڵوشانەوەی هەرجۆرە دەسەڵاتێکی ڕێکخراوە وپێیوایە کە هەر ڕێکخراو و دەسەڵاتێک دەبێتەهۆی گەندەڵی و بە زیانی مرۆڤەکانە.

ئانارشیستەکان پێیانوایە کە هەر شێوازێکی حکومەتی دزێو ونگریسە وسەرچاوەی گەندەڵی و سەرەڕۆییە. بە بڕوای ئەوان، حکومەت گەورەترین و خراپترین نموونەی چڕبوونەوەی دەسەڵاتی ڕێکخراوی سیاسییە. هەر بۆیە هەموو کاتێک ئامانجی سەرەکی ئانارشیەکان لە ناوبردنی هەرجۆرە حکومەتێک بووە.

### Anachronism ئاناکرۆنیزم

لە وشەی یۆنانیی "ئانا" بە واتای گەڕانەوە و" کرۆنووسی" بە واتای کات وەرگیراوە. لە ئەدەبیاتی سیاسیدا، ئاناکرۆنیزم لەگەڵ نەریتخوازیدا بە یەک واتا نین و جیاوازییان هەیە.

**ئانتاگۆنیزم / لە ئاشتی نەهاتوو** *Antagonism*

لە بنەڕەتدا وشەیەکی یۆنانیە، بە واتای مشتومڕ وشەڕ لە دژی یەکترە. ئانتاگۆنیزم تایبەتمەندیی کۆمەڵێک لە دژایەتیەکانە کە لە ئاشتیی نەهاتوون. ئەو چەمکە لە زمانی سیاسیدا بەمانای دژایەتیکردنێکی لە ئاشتی نەهاتووە.

**ئینتانت / هاوڕایی** *Entente*

زاراوەیەکی فەرەنسییە، بە واتای لێک تێگەیشتن و هاوڕاییە. لە عورفی سیاسیدا بە ڕێککەوتنی نێوان دوو یان چەند دەوڵەت لە ڕێگای گرێدانی گرێبەست و ڕێککەوتننامە دەگوترێ.

**ئاوارە** *Refugee*

بە کەسێک دەگوترێ کە لە ولاتی خۆی دەرکەرابێ، یان لە ژێر کاریگەریی ڕووداوێکی وەکوو شەڕدا لە نیشتمانی خۆی ڕای کردبێ.
پێڕاگەیشتن بە کاروباری ئاوارەکان لە ئەستۆی ڕێکخراوە نێونەتەوەییەکانی وەکوو کۆمیسارییای بەرزی پەنابەرانی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان دایە.

**ئاڤاکس**
*AWACS (Airborne Warning And Control system)*

بە " سیستەمی هۆشداری و کۆنترۆڵی ئاسمان بڕ " دەگوترێ کە لە نێو فڕۆکە فەرماندیی و سیخوورییەکان دایە و، بە یەکێک لە دیاردەکانی شەڕی ئەلکترۆنی دەژمێردرێ.

**ئاڤانگارد** *Avant _garde*

زاراوەیەکی سەربازیی فەرەنسییە کە لە پێش ساڵی ١٨٤٨، سەبارەت بەهەر تاقمێکی سیاسی کۆماریخواز یان سۆسیالیستیی پێشڕەو کەڵکی لێ وەردەگیرا.
ئەم زاراوەیە لە دوای ساڵی ١٩١٠ لە زۆربەی وڵاتاندا بە تاقمیکی داهێنەری کولتووری دەگوترا کە جیاواز لە یەکگرتوویە سیاسییەکەیان، خەڵک بەو شێوە لێیان تێ نەدەگەیشت.

**Ausgleish (Ompromise)** **ئاوس گلێیش**

زاراوەیەکی ئەڵمانییە بە واتای سازان و پێکهاتنە. لە بواری مێژووییەوە بەو ڕێککەوتننامە دەگوترێ کە لە ساڵی ١٨٦٧ لە نێوان دەوڵەتی نەمسا و سیاسەتڤانە نەرمڕۆکانی هەنگاریادا گرێدرا و، بەپێی ئەم ڕێککەوتننامە، ئیمپراتۆری نەمسا بوو بە شانشینی دوو وڵاتەی نەمسا ——— هەنگاریا. ئەو سیستەمە سەرەڕای ئەو کێشانەی کە بەهۆی یەکیەتی بازرگانی و ڕەخنەی ناسیۆنالیستەکانی نەمساوە هاتبووە ئاراوە، تا ساڵی ١٩١٨هەروا بەردەوام بوو. ناسیۆنالیستەکانی نەمسا پێیانوابوو کە هەنگاریا زیاتر قازانجی کردووە.

**Ahimsa** **ئاهیمسا**

وشەیەکی هیندییە، بەواتای ئازارنەدانە. ئەم زاراوەیە یەکێک لە پەروەردە بەرزەکانی گرووپی جین (Jain Sect) لە هیندە کە لە سەر بنەمای پیرۆزبوونی ژیان و خۆبواردن لە توندوتیژی ڕاوەستاوە.

ئاهیمسا لە سیاسەتدا بە واتای ناتوندوتیژی و شێوازی ئاشتیخوازانەیە.

**Notification** **ئاگادار کردنەوە**

کردەیەکە کە دەوڵەتێک؛ دەوڵەتێکی دیکە لە مەسەلەیەکی گرنگ ئاگادار دەکاتەوە. مەبەست لەو کردەوەیە ئەوەیە کە لایەنەکە بە شێوەیەکی یاسایی لە مەسەلەکە ئاگادار بێ. ئاگادارکردنەوە ڕەنگە بە دڵخوازانە ، یان بە زۆری و یان بە ناچاری بێ.

**Apologism** **ئاپۆلۆژیزم**

بە ڕێبازی تاقمێک لەو فەیلەسۆفانەی سەرەتاکانی سەرهەڵدانی ئایینی مەسیحی دەگوترێ کە پێیانوابوو لە بەرامبەر نەیارانی مەسیحیەتدا دەبێ پشت بە بەڵگە ببەسترێ و، لە سەپاندنی بەزۆرەملێی ئایین خۆ ببوێرن.

### ئاسایشی نێونەتەوەیی International Security

حاڵەتێکی ئاسایی و هاوسەنگی نێوان دەوڵەتەکانە. لەو حاڵەتەدا بۆ ئەوەی رەوش و بارودۆخی جیهان نەکەوێتە مەترسیەوە، دەوڵەتەکان هێرش ناکەنە سەر خاکی یەکتر. هەرکاتێک دەوڵەتێک پێی لە بەرەی خۆی زیاتر رابکێشێ، لە روانگەی دەوڵەتە نەیارەکانەوە، ئاسایشی نێونەتەوەیی " کەوتۆتە مەترسیەوە".

### ئاسایشی گشتی Collective Security

ئەو زاراوە بە بنەمای پاراستنی ئاشتیی نێونەتەوەیی لە رێگای هەوڵی هاوبەشی نەتەوەکان، بە تایبەتی لە رێگای هەوڵی رێکخراوە نێودەوڵەتیەکانی وەک کۆمەڵەی گشتی و رێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان، دەگوترێ.

### ئاسایشی نەتەوەیی National Security

بە حاڵەتێکی ئاسایی دەگوترێ کە نەتەوەیەک بەبێ ئەوەی هەست بە ترس، یان هەست بە مەترسی لە دەستدانی هەموو یان بەشێک لە حەشیمەت، سامان، یان لە دەستدانی خاکی خۆی بکا، لەو پەڕی ئارامیدا دەژی. ئەمڕۆکە یاسا نێونەتەوەییەکان سنووری ماف وئازادییەکانی دەوڵەتەکانیان پێناسە و دیاری کردووە کە بە گەرەنتی پێشگیریکردن لە دەستدرێژیی وڵاتەکان بۆ سەر مافەکانی یەکتر دادەنرێ.

### ئایدۆلۆژیا Ideology

لە وشەی لاتینی "ئایدیا" بە مانای بیر، ڕا و زەین وەرگیراوە. ئایدۆلۆژیا زانستێکی بەرپرسیارە. زانستێکە کە ئامانجەکەی خزمەت بە مرۆڤایەتی و پاراستن و پشتیوانی لە مرۆڤ و رزگارکردنی زەینی مرۆڤ لە دەمارگرژی و ئامادەکردنی مرۆڤ بۆ قبووڵی حکومەتی عەقڵە.

زاراوەی ئایدۆلۆژیا دواتر لە مانایەکی بەرفراوانتردا کەڵکی لێ وەرگیراوە، بەگشتی، هەرشێوە بیرکردنەوە و تیۆرێک کە بە دوای ئامانجێکی کردەیی تایبەتیەوە بێ و، بە تیۆرێکی رووت

و ئابستراكت نەبەستریتەوە و، بە لێکدانەوەی مارکس، جگە لە راڤە و شیکردنەوە، گورینی جیهانیش بکات بە ئامانج، ئایدۆلۆژیای پێ دەگوترێ. لە سەرەتای سەدەی بیستەم بەدواوە ئایدۆلۆژیا بۆ پێناسەکردنی سیستەمە فیکری و فەلسەفی و ئایینیەکان کە بە شێوەیەک لە شێوەکان لە سەر دیاریکردنی رێباز، کردەوە و هەڵوێستی لایەنگرەکانیان سەبارەت بە بابەتە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکان کاریگەری هەبێ، کەڵکی لێ وەردەگیرێ.

### ئایدیالیست *Idealist*

بەو فەیلەسۆف و سیاسەتڤانانە دەگوترێ کە بۆ پێکهێنانی کۆمەڵگایەک یان حکومەتێکی ئایدیال (نموونەیی) تێکۆشاون و تێدەکۆشن.

### ئاڵای بەرژەوەندییانە *Flag Of Conveniece*

ئاڵای وڵاتیکە کە یاسای ئە وڵاتە لە بەرامبەر وەرگرتنی پارە یان کرێدا، مۆڵەتی تۆمارکردن و پاشانیش مافی هاووڵاتیبوون و مافی هەڵکردنی ئاڵا بە زۆربەی پاپۆرەکان دەدا، بەبێ ئەوەی شتی دیکەی وەکوو هاووڵاتیبوونی خاوەنی پاپۆرەکە یان بەرێوەبەران یان وڵاتی دروستکەری پاپۆرەکە لە بەرچاو بگرێ. پاناما و هێندۆراس لە سەردەمێکیش کۆستاریکا) یەکەمین وڵات بوون کە رەوتی "تۆماری ئازاد" انەیان بەر لە شەری دووهەمی جیهانیدا دەست پێکرد. بەڵام لە دوای شەر، لیبریا یەکەم وڵات بوو کە مافی هەڵدانی ئاڵای بەرژەوەندییانەی بەخشی. بەرادەیەک کە لە ساڵی ١٩٦٧ بەملاوە بە لەبەرچاوگرتنی توناژی تۆمارکراو بوو بە یەکێک لە گەورەترین وڵاتانی خاوەن پاپۆر لە جیهاندا. لەم دەیانەی دواییدا قوبرس، سەنگافوور، سۆمالی، سریلانکاو فلیپین رەوتی تۆمارکردنی ئازادیان دەست پێکردووە، هیچ کام لەو وڵاتانە ئەندامی کۆنڤانسیۆنی ساڵی ١٩٤٨ سەبارەت بە دەریای ئازاد نین. بەپێی ئەم کۆنڤانسیۆنە، دەبێ "پێوەندییەکی راستەقینە" (کە ئەویش پێناسەیەکی روونی نیە) لە نێوان پاپۆرو وڵاتی تۆمارکەردا هەبێ بۆ ئەوەی کە بتوانێ سەلاحییەتێکی کاریگەر کاروباری ئیداری، تەکنیکی و کۆمەڵایەتی لەسەر ئەو پاپۆرانەی کە ئاڵای ئەم وڵاتەیان هەڵداوە، پیادە بکا. دیوانی نێونەتەوەیی دادوەری لە رایەکی راوێژکارانەی خۆیدا سەبارەت بە پێرەوپرۆگرامی

کۆمیتەی پاراستنی دەریایی ئیمکۆ (ریکخراوی نێودەوڵەتیی راوێژکاری دەریایی کە ئەمڕۆکە بە ریکخراوی نێونەتەوەیی دەریایی ناودەبرێ) لە ساڵی ١٩٦٠ دا بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ داکۆکی لە مافە لیبریاو پاناما لە جێبەجێکردنی رەوتی تۆمارکردنی ئازاد کردو، دەنگی بەوەدا کە واتای پێوەندیی راستەقینە کاریگەری لە سەر دیاریکردنی مانای رستەی " گەورەترین ولاّتانی خاوەن پاپۆڕ بۆ ئەندامەتی لە کۆمیتەی پاراستنی دەریایی ئیمکۆ (بەشێوەیەک کە لە کۆنڤانسیۆنی دامەزراندنی ریکخراوەکە داهاتووە)، نیە. دیوان دەنگی بەوەدا کە ئەم رستەیە تەنیا ئاماژە بەو ولاّتانە دەکا کە زۆرترین رادەی توناژی تۆمار کراوی هەیە، بە بێ ئەوی کە سەرنج بە هەرجۆرە پێوەندییەکی نێوان پاپۆڕەکان و ولاّتی خاوەن پاپۆڕەکان بدا؛ کە ئەمەش خۆی بەو مانایەیە کە خاوەندارەتیی خۆی توخمێکی بێ کاریگەرەو، هیچ رۆڵ و کاریگەرییەکی نیە. لە روانگەی نێونەتەوەییەوە، بوونی ئالاّی بەرژەوەندی پرسیاری زۆر دینێتە ئاراوە، وەک : ئایا ولاّتی خاوەنداری پاپۆڕی هەڵگری ئالاّی بەرژەوەندی مافی پشتیوانیکردن یان لە حاڵەتی هەلومەرجی نائاسایی نیشتمانیدا، بەپێی تیۆری کۆنترۆلی کاریگەر، مافی دەستبەسەرداگرتنی هەیە یان نا؟ ئایا یاساکانی کاری ولاّتی خاوەن پاپۆڕەکە دەتوانن پاپۆڕەکانی هەڵگری ئالاّی بەرژەوەندییانە لە خۆبگرن یان نا؟ هەرچۆنێک بێ، بەگشتی، هەموو لایەک لەسەر ئەوە کۆکن کەرەوتی ئالاّ بەرژەوەندییەکان لەگەڵ یاسا نێو دەوڵەتیەکاندا ناتەبا نیە.

*ئاشتی چەکدارانە*

لە ساڵی ١٨٧١ ەوە کە ئەڵمانیەکان بەسەر فەڕەنسیەکان دا سەرکەوتن تا ساڵی ١٩١٤ کە شەڕی یەکەمیی جیهانیی دەستی پێکرد، لە نێوان دەوڵەتەکانی ئەورووپادا هیچ شەڕێک رووی نەداو، بەلاّم ولاّتانی ناوچەکە لەم ماوەی ئەو ٤٣ ساڵەدا کە قۆناغی ئاشتی چەکداری پێ دەگوترێ، بەگەرم و گووڕی خەریکی خۆ ئامادە کردن و پۆشتەکردنی سوپاکانیان بوون.

**ئاسانکاری جیهانیی ژینگە (جێف)**

**Global Enviornment Facility (GEF)**

ریکخراوێکی نێونەتەوەییە کە لە ساڵی ١٩٩١ وەک پلانێکی تاقیکاریی سێ ساڵە و وەک میکانیزمێکی ماڵی دامەزرا، تاکوو هاوکارییە بێ بەرامبەرەکان بە مەبەستی بەرێوەبردنی چالاکی لە

پێناوی پاراستنی ژینگەی جیهانی بدا بە ولاتانی لە حالّی پەرەسەندندا. ئەم ئاسانکارییە دوابەدوای بڕیارنامەی بەرپرسانی بەڕێوەبەریی بانکی جیهانی لەگەلّ "پلانی ئاوەدانکردنەوەی نەتەوەیەکگرتووەکان"، "پلانی ژینگەی نەتەوەیەکگرتووەکان" و"بانکی جیهانی"، هاتە ئاراوە. بۆویتە هاوکارییەکانی "جێف" بریتین لە دابینکردنی دارایی پرۆژە سەرمایەگوزارییەکان و بەخشینی هاوکارییە تەکنیکیەکان بە ولاتانی لە حالّی پەرەسەندن.

پێکهاتەی گشتی جێف بریتیە لە کۆمەڵە، ئەنجوومەن و سکرتاریایەک و؛ گرووپێکی راوێژکاریی تەکنیکی و زانستی کە پێشنیارو راوێژە پێوەیستەکانی خۆی ئاراستەی ناوەندەکانی سەرەوە دەکا.

ئەرکەکانی کۆمەلّە بریتین لە، هەلّسەنگاندنی سیاسەتەگشتییەکانی جێف، هەلّسەنگاندن و تاوتۆیکردنی کارو کردەوەکانی جێف بەپێی ئەو راپۆرتانەی کە لە لایەن ئەنجوومەنەوە پێشکەش دەکرێن و، چاوەدێریکردن بەسەر ئەندامەتی لە ئاسانکاری، هەلّسەنگاندن وپەسندکردنی پێداچوونەوەکان بەسەر بەلّگەی پێکهاتەی جێف بەپێی پێشنیارەکانی ئەنجوومەن. جێف بە پشت بەستن بە هاوکاری سێ دەزگای بەڕێوەبەری خۆیدا، وەکوو میکانیزمێک بۆ هاوکاری نێونەتەوەیی، خەرجی پێویست بۆ بەڕێوەبردنی پلانە پێشبینی کراوەکان لەو بوارانەدا، دابین دەکا:

١_ گۆڕانکارییەکانی کەش و هەوا

٢_ جۆراجۆریی شێوازەکانی ژیان

٣_ ئاوە نێودەولّەتیەکان

٤_ تێکچوونی تۆیکانی ئۆزۆن

### ئاڵوگۆڕە پۆزتیڤ و نێگەتیڤەکان

ئەو ئاڵوگۆڕانەی کە کۆمەلّگا بۆ یەکخستنەوەی توخمەکانی خۆی پێکیان دێنێ یان پۆزەتیڤن، یان نیگەتیف:

١_ ئالّوگۆڕی پۆزەتیف بە بەرەو پێشبردنی ئەو توخمانە دەگوترێ کە داواکەوتوون، بەشێوەیەک کە ئەو توخمانە، بە توخمە پێشکەوتووەکان بگەن و لەگەلّیان دا بگونجێن.

٢ـ ئاڵوگۆڕی نیگەتیف بە بەدواوە گەڕاندنەوەی ئەو توخمانە دەگوترێ کە پێشکەوتوون، بە شێوەیەک کە بگەڕێنەوە ڕەوشی پێشووی خۆیان و لەگەڵ ئەو توخمانەدا کە دوا کەوتوون، بگونجێن.

ئاڵوگۆڕی پۆزەتیف پێویستی بە داهێنانی نوێ هەیە، بەڵام ئاڵوگۆڕی نێگەتیف ئەو داهێنانانەی کە پێشتر هاتوونەتە ئاراوە،ڕەت دەکاتەوە. کۆمەڵگا گەورە مرۆییەکان ڕەهەندێکی گەشەخوازیان هەیە و تەنیا لە هێندێک لە قۆناغەکانی مێژوویی خۆیانداو لە هێندێک بواردا بە شێوەیەکی کاتی بۆ دواوە دەگەڕێنەوە، کە ئەمەش کۆنەپەرەستی لێ دەکەوێتەوە. بۆیە دەبێ هەموومان ئەوە پەسند بکەین کە لە کۆمەڵگا گەورەکان و لە مێژووی گشتی مرۆڤ، بەرەوپێچشقەچوون، بنەمایە و بۆ دواوە گەڕانەوەش حاڵەتێکی کەم و دەگمەنە.

ئەو هەوڵە پۆزەتیڤانەی کە کۆمەڵگا بۆ نۆژەنکردنەوەی خۆی ورێکخستنەوەی دووبارەی خۆی دەیاندا، بە دووشێوە بەڕێوە دەچن: بزووتنەوە لەسەرەخۆ یان چاکسازییەکان و بزووتنەوە توند یان شۆڕشگێرییەکان.

### Bugging
### بەدزی گوێ راداشتن

بە دانانی کەرەستە ئەلەکترۆنیە شاراوەکان ، بە مەبەستی گوێ گرتن یان تۆمارکردنی ئاخاوتنە شاراوەکان دەڵێن بەدزی گوێ راداشتن. ئەم کارە بەکەڵک وەرگرتن لە تەکنەلۆژیای نوێ جێبەجێ دەکرێ. لەم سەردەمەدا بە کەڵک وەرگرتن لەو کەرەسانە، کاری سیخوڕیی سیاسی و پشەسازی بە بەراورد لەگەڵ رابردوودا زۆر ئاسانتر بۆتەوە.

### Credential letter
### بڕوانامە

بە بڕیاری سەرۆکی وڵات دەگوترێ کە بەو باڵوێز و راسپێردراوە سیاسییانە دەدرێ کە دەنێردرێنە وڵاتانی دیکە، بۆ ئەوەی کە پلەو پایەی ئەوان لە لای سەرۆکی ئەو دەوڵەتانە بەهێزتر بکا. وێنەی ئەم بڕیارەلە پێشدا بە وەزیری کاروباری دەرەوەی وڵاتی وەرگر دەدرێ و پاشان رێکەوتی سپاردنی ئەم بڕیارە بە سەرۆکی وڵات دیاری دەکرێ و رادەگەیەنرێ. جاران بە بڕوانامە دەگوترا مەتمانە نامە.

### Continuity Of States
### بنەمای بەردەوامیی وڵاتەکان

بەپێی ئەو بنەمایە، هەر کاتێک وڵاتێک بوو بە خاوەنی شوناسێکی نێونەتەوەیی سەربەخۆ وجێگیر، گۆرانکارییەکانی دوایی ، لە ناو دەوڵەت یان لەناو دەستووردا، کاریگەرییەکیان لەسەر بوونی سەربەخۆی ئەو وڵاتە نابێ. بەردەوامیی وڵاتەکان، ئاماژە بە مانەوەی بەردەوامی دەوڵەتەکان

وەک سووژە و رەچاوکەرانی یاسا نێودەوڵەتیەکان دەکا. شوناس و بەردەوامیی وڵاتێک دەبێ لە مەسەلەی جێنشینی وڵاتان جیا بکرێتەوە، چوونکە لەو هەلومەرجەی دواییدا، کەسایەتیەکی نێونەتەوەیی (دەوڵەتێک)، جێگای کەسایەتیەکی نێو نەتەوەیی تر دەگرێتەوە.

بنەمای بەردەوامیی وڵاتەکان لە هێندێک بواردا کە گۆڕینی ناو یان گۆڕینی دەسەڵات لە رێگای خستنە سەر، تێکەڵ کردن یان بەخشین جێبەجێ بکرێ، گرنگیەکی تایبەتی هەیە. بەردەوامیی ناوی وڵاتێک یان گۆڕینی ناوەکەی رەنگە لەسەرکەسایەتیی نێونەتەوەیی ئەو وڵاتە کاریگەری هەبێ. بەو حاڵە، لە رەوتی نێونەتەوەییدا، چەمکی بەردەوامی بە شێوەیەکی یەکسان پیادە نەکراوە. "کۆماری نەمسا" کەدوای شەڕی یەکەمی جیهانی هاتە ئاراوە، بە هیچ شێوەیەک هاوواتای ئیمپراتۆریی نەمسا ـ کە هەنگاریای لێ جیا بێوە ـ نەبوو، بەڵام ئەو نەمسایەی کە لە لایەن رایخی سێهەمی ئەڵمانیاوە داگیر کرابوو و، دوای شەڕی دووهەمی جیهانی بۆ جارێکی تر سەری هەڵداوە، بە بەردەوامیی وڵاتی نەمسا بەر لە ئەنشەلۆس دەژمێردرا. سیربستان دوای شەڕی لە یەکەمی جیهانی وەک پاشایەتیی سیربەکان، کرۆاتەکان و سلۆڤانەکان بەردەوام بوو و، دواتر وەک یۆگۆسلاڤیا ناسرا. سەرەڕای ئەوەی کە وڵاتانی میسر و سوریا لە ساڵی ١٩٥٨دا سەربەخۆیی خۆیان راگەیاندبوو، بەڵام بە هۆی سەرنەگرتنی هەوڵەکانیان ـ لە روانگەی ئەندامانی دیکەی نەتەوەیەکگرتووەکان ـ کاریگەرییەکی لە سەر راگەیاندنی سەربەخۆییەکان دانەنا.

### *بنەمای سووربوون لەسەر بەڵێن* *Pacta Sunt Servanda*

"پێویستیی سووربوون لەسەر بەڵێن" بە بنەمای سەرەکیی رێککەوتنەکان دەژمێردرێ و، بە بڕوای هێندێک کەس، بنەمای سەرەکیی مافی نەتەوەکان پێک دێنێ. ئەم بنەمایە لە پێشەکی جاڕنامەی رێکخراوەی نەتەوەیەکگرتووەکاندا ئاماژەی پێکراوە و، لە پێشەکی و ماددەی ٢٦ی کۆنڤانسیۆنی ڤیەننا سەبارەت بە رێوشوێنی رێککەوتنەکانی ساڵی ١٩٦٩ش بەم شێوەیەی باس لەو بنەمایە کراوە: " دەبێ هەر دوولایەنی ریککەوتنەکە بریارە پێویستەکان جێبەجێ بکەن و بەنیازپاکیەوە بەڕێوەی ببەن". هەروەها یەکێک لە رێوشوێنە کۆنەکانی مافە نێونەتەوەییەکان ئەوەیە کە بۆ جێبەجێ نەکردنی ئەم بنەمایە ناکرێ پشت بە یاسای نێوخۆیی ببەستین و، ئەمەش لە

کۆنفانسیۆنی ڤیەننادا نووسراوە. زۆر جار گریمانەیەکسەبارەت بە راست بوونی ریککەوتنەکان لە ئارا دایە. بۆوێنە گریدانی ریککەوتنامەیەک کاتیک لە جێی خۆی دایە کە دژی یاسا نیوخۆییەکانی ولاتەکە نەبێ.

**Three Principles** ***بنەمای سێ لایەنەی (سوون یاتسێن)***

بە کۆمەڵە بیرو باوەڕی سوون یاتسێن (١٩٢٥ ـ١٨٦٧) ناسیۆنالیست و شۆڕشگێری بەناوبانگی چین دەگوترێ کە بریتین لە :

١ـ ناسیۆنالیزم (کۆتایی هێنان بە دەسەلاتی داگیر کەران لە چین).

٢ـ دیموکراسی.

٣ـ بژێوی (هە ،سێک مافی ژیان و بەدەستهینانی پێوەرێکی لۆژیکی بۆ گەیشتن بە ژیانی خۆی، هەیە).

**Satellites** ***بەستراوەکان***

زاراوەیەکە کە لە لایەن رۆژئاواییەکانەوە بە ولاتانی سۆسیالیستی ئەورووپای رۆژهەلات دەگوترا. بەڵگەی رۆژئاواییەکان ئەوە بوو کە ولاتانی ناوبراو بەکردەوە لە بواری سیاسی و ئابوورییەوە سەر بە یەکیەتیی سۆڤیەت بوون.

**Hawks** **بازەکان**

لە ئەدەبیاتی سیاسیدا بازەکان (لە بەرانبەر کۆترەکان دا) بەو کاربەدەستانە دەگوترێ کە خوازیاری هەلایساندنی شەڕو درێژەدان بە شەڕ بۆ گەیشتن بە ئامانجە سەربازی ـ سیاسیەکانن. ئەم زاراوەیە بە سیاسەتمەدارە توندڕۆکانیش دەگوترێ.

***Bakuninism*** ***باکۆنینیزم***

بیروباوەڕێکی سیاسیە کە پێوەندی بە باکۆنینەوە Bakunin (١٨٧٦-١٨١٤) هەیە. باکۆنین نووسەری ئانارشی رووس کەلە ساڵی ١٨٦١ هەتا ١٨٧٦ رێبەری حیزبی ئانارشیستی لە ئەورووپا لە ئەستۆدا بوو. ناوبراو هاوکاریی مارکس و ئەنگێلزیشی دەکرد، بەلام لە ساڵی ١٨٧٢دا لە

ئەنتەرناسیۆنالی یەکەم دەرکراو، ڕێبازی باکۆنینیزمی دارشت و، لە کتێبی خۆی بە ناوی "خوا و دەوڵەت " ( God and the State ) خستەڕوو.

بنەماکانی بیروباوەڕی ناوبراو بریتین لە: پێویستیی ڕووخاندنی دەوڵەت و پاراستنی مافی تاکایەتی لەو پەڕی خۆیدا. ناوبراو بە دامەزرێنەی قوتابخانەی "نەهیلیزم"یش دەژمێردرێ.

**بەباڵکانی کردن** *Balkanization*

چەمکی باڵکان لە زاراوەی تورکی بە مانای "چیای شەڕانی" وەرگیراوە.

ئەم ناوە بەدوای لێک هەڵوەشانەوەو دابەشبوونی ئیمپراتۆریی نەمسا_هەنگاریا بۆ وڵاتە بچووک و ئاڵۆزە سیاسییەکانی وەک ئەوەی کە لە باڵکان دامەزراوە، هاتۆتە ئاراوەو؛ بەگشتی ئاماژە بە دابەشبوونی ناوچەیەک بۆ سەر چەندین وڵاتی بچووک، دەکا. مەبەست لە باڵکانی کردن پێشگیری لە دامەزران و جێگرتنی وڵاتێکی سەقامگرتوویە، بۆ کەمکردنەوە لە ئاستی مەترسیی ئەو وڵاتە بۆ سەریان بە دژی ئەو وڵاتەی کە ئەم سیاسەتە پیادە دەکا. دوای هەڵوەشانەوەی یۆگۆسلاڤیا لە نێوان ساڵەکانی ١٩٩٢ هەتا ١٩٩٦، واتای " بەڵکانی کردن" لەگەڵ ژینۆساید و پاکتاوکردنی ڕەگەزی تێکەڵ بووە.

**بەبرەکانی ئاسیا** *Asian Tigers*

بەژمارەیەک لە وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ئاسیا دەگوترێ کە ئابوورییەکەیان لەم دەیانەی دواییدا پەرەسەندنێکی بەرچاوی بە خۆیەوە بینیوە. ئەم وڵاتانە بریتین لە: ژاپۆن، تایوان، سەنگاپوور، کۆریای باشوور و هۆنگکۆنگ. زاراوەی "بەچکە بەبرەکان"یش بە وڵاتانی ئەندەنۆسیا، تایلەند ومالیزیا دەگوترێ. دوای ئەوەی کە هۆنگ کۆنگ بوو بە بەشێک لە وڵاتی چین، ئەم وڵاتە بە "ئەژدیهای ئاسیا"(Asian Dragon ) ناوبانگی دەکرد.

**بەربەریزم** *Barbarism*

لە زاراوەی لاتینی بەربەری Barbari(a) وBarbarism (us) وەرگیراوە. زاراوەیەکە کە بۆ هۆزە بەربەڕ و زیاتر غەیرە لاتینیەکان کەڵکی لێ وەردەگیرێ کە بەگشتی لە ناوچەکانی باکووری ئەفریقیادا نیشتەجێن. ئەمڕۆکە بەربەریزم بە واتایەکی گشتی، بیروباوەڕو داب و نەریت و شێوازی ڕەفتاریی هەموو هۆزە وەحشیەکان لە خۆ دەگرێ.

### بریگاردی نێونەتەوەیی

بەو گیانفیدا کۆمۆنیستانە و باڵی چەپ دەگوترێ کە لە وڵاتە جۆراوجۆرەکانی دنیاوە بۆ لایەنگریکردن لە کۆماریخوازان بە دژی ژەنەراڵ فرەنکۆی دیکتاتۆری بەناوبانگی ئیسپانیا و هێزە دەستەڕاستیەکان لە کاتی شەرە نێوخۆییەکانی ئیسپانیا (٣٩ _١٩٣٦) دا شەڕیان دەکرد. هێندێک لە سەکردە ناسراوە کۆمۆنیستەکانی جیهان وەک تیتۆ و ئۆلبریێشت لەو گیانفیدایانە بوون.

### بۆلشڤیزم **bolshevism**

وشەیەکی رووسیە بەمانای زۆرینە، بەو تاقمە لە حیزبی سۆسیال دیمۆکراتی کرێکارانی رووسیا دەگوترا کە لە کۆتایی دووهەمین کۆنگرەی حیزب لە ساڵی ١٩٠٣دا زۆرینەی حیزبیان بەدەست هێنا(لەبەرامبەر مۆنشڤیکەکان کە "کەمینە" بوون) و، ئەم ناوەش بۆ ئاماژەکردن بە ئەوان و بیروبۆ چوونەکانیان بوو. لە روانگەی بۆلشڤیکەکانەوە، بۆلشڤیزم بریتیە لە لایەنگریکردن لە مارکسیزمی ئۆرتۆدۆکس لە بەرامبەر رۆیزیۆنیزمداو، رێکخراوێکی چەقبەستووی حیزبی بە پێکهاتەیەکی هیرارکیەت و شانەیەک لە شۆڕشگێرە لێهاتووەکان وەک رێبەرانی حیزب لە بەرامبەر حیزبەکانی دیکە کە نارێکخراون و هەروەها بۆلشڤیکەکان لە بەرامبەر حیزبەکانی دیکەدا خاوەنی تاکتیکی شۆرشگێرین.

نازناوی بۆلشڤیکەکان لە ساڵی ١٩١٢ هەتا ١٩٥٢ یەکێک لە ناوە رەسمییەکانی حیزبی کۆمۆنیستیی سۆڤیەتی بوو.بیرمەندانی رۆژئاوا لە ساڵەکانی ١٩٢٠ هەتا ١٩٤٠ بۆلشڤیزمیان لە دەرەوەی سۆڤیەتدا بە توندڕەوترین بزوتنەوەی پێشکەوتنخوازانەی چەپ دەژمارد؛ دواتر لەریزی جۆرەکانی تۆتالیتاریزمیان دانا.

### بۆلشڤیزمی نەتەوەیی **National Bolshevism**

زاراوەیەکە کە لەنێوان دوو شەڕی جیهانی لە ئەڵمان دا کەڵکی لێ وەردەگیرا تاکوو سیاسەتی بەرگریی ناسیونالیستانەی لە بەرانبەر "رێککەوتننامەی ڤێرسای" و رۆژئاوای پشت بەستوو بە یەکیەتیی لەگەڵ سۆڤیەتی بۆلشویک لە دژی دوژمنە هاوبەشەکانی دا پێناسە بکاو لێک بداتەوە.

هێزی پارادۆکسیکالی ئەم زاراوە گرووپەکان لە هەردوو بیروبۆچوونی جیاوازی سیاسی بۆ لای خۆی رادەکێشێ واتا ناسیونالیستەکان لە باڵی راست و کۆمۆنیست و سۆسیالیستە نەیارەکان لە باڵی چەپ دا. لە دوای هاتنە سەرکاری نازییەکان ئەم زاراوەیە لە نێو چوو.

### Bloc — بلۆک

بە ئەندامانی دامەزراوەیەکی یاسا دارێژی دەگوترێ کە بە ناچاری سەر بە حیزبێک نین بەلاّم خاوەنی ئاوات و ئامانجی هاوبەشن. زاراوەی ئاماژە پێکراو هەروەها بە تاقمی ئەو ولاّتانە دەگوترێ کە بۆ دەستەبەر کردنی یەک ئامانج تێدەکۆشن.

### Eastern Bloc — بلۆکی رۆژهەلاّت

ئەم بلۆکە لەم ولاّتانە پێک دەهات کە بەگشتی لە بواری سیاسی و کۆمەلاّیەتیەوە خاوەنی رێبازێک بوون، پەیرەویان لە سیستەمی سۆسیالیستی دەکرد. یەکیەتیی سۆڤیەت ئالبانی، پۆلۆنیا، چیکۆسلۆڤاکیا، رۆمانی، یوگۆسلاڤیا، هەنگاریا بولگارستان و ئەلمانیای رۆژهەلاّت لە کیشوەری ئەورووپاو، کۆریای باکوور و ڤێتنام لە کیشوەری ئاسیاو، کوبا لە کیشوەری ئەمریکا ولاتانی پێکهینەری ئەم بلۆکە بوون.

### Western Bloc — بلۆکی رۆژئاوا

بە ولاّتانی ئەمەریکا و رۆژئاوای ئەورووپا دەگوترێ کە خاوەنی سیستەمە سەرمایەدارییەکان بوون و، زۆربەیان ئەندامی ناتۆن. ئەم ولاّتانە زیاتر لەبەرامبەر بلۆکی رۆژهەلاّتدا سیاسەتێکی یەکدەستیان دادەڕشت و پەیڕەویان لێ دەکرد.

### Bonapartism — بۆناپارتیزم

رژێمی سیاسی ـ سەربازیی ناپلیۆنی یەکەم ( ١٨٢١ ـ ١٧٦٩)، ئیمپراتۆری فەڕەنسایە کە لە بە هۆی پەرەسەندنی خێرای سەرمایەداری لە سەدەی نۆزدەهەمدا و بەپشت بەستن بە خولقاندنی رووداوە سەربازییەکان، گەشەی کرد. ناپلیون کەلّکی لە دەسکەوتەکانی شۆڕشی مەزنی فەڕەنسا وەرگرت و، گەردەلوولی شۆڕشی دامرکاند. بەرژەوەندی و [illegible] ئیمپریالیستیەکانی فەڕەنسا، ناوبرای بە دژی ولاّتانی ئەورووپی هان داو، دنیای نیمچە فیۆدالیش نەیتوانی [illegible] بەرامبەریدا راوەستێ. بەهای هەولّەکانی ناپلیون لەوەدا بوو کەتوانی دروستترین شێوازەکانی تاکتیکی و ستراتیژیی کەلّک وەرگرتن لە کۆمەلّە گەورە چەکدارەکان بدۆزێتەوە. بەلاّم تێکشکانی ناوبراو لە شەڕەکانی ١٨١٤ و ١٨١٥دا و سەرکەوتنی مەزنی هێزەکانی هاوپەیمانە ئەورووپیەکان لەو شەڕانەدا تەنیا بەو هۆیە بوو

که نەتەوەیەک بە هۆی چارەگە سەدەیەک شەڕ لاواز ببوو و، ئیتر نەدەیتوانی لە بەرامبەر هێرشی دنیایەک کە لە دژی ئەو چەکدار ببوو، خۆڕاگری و بەرگری بکا.

### بناژۆ *Fundamentalist*

ئەم زاراوەیە بە کەسێک دەگوترێ کە بڕوای بە دەقی ئینجیل هەیە و خۆی بە راڤە و شیکردنەوەی ئەو کتێبانە نابەستێتەوە. بۆ وێنە گێرانەوەی ئینجیل لە خولقانی مرۆڤ دەکا، دەبێتە هۆی رەتکردنەوەی تێوری دارڤین. بناژۆیی لە ویلاتەکانی باشووریی ویلایەتەیەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە ژێر ناوی هێڵی ئینجیل دا باوە.

ئەمرۆکە، بناژۆیی ئیسلامی بڕوای بە پیرەویکردن و جێبەجێکردنی وردی شەرعی پیرۆزی ئیسلام هەیە.

### بۆربۆنەکان *Bourbons*

١ــ بنەماڵەیەکی پاشایەتی بوون کە حکومەتیان بە سەر ئیسپانیا، فەرەنسا وناپلدا دەکردو، شۆڕشی مەزنی فەرەنسا لە ساڵی ١٧٨٩دا کۆتایی بە تەمەنی دەسەلاتی پاشایەتیی ئەم بنەماڵەیە هێنا. لویی شازدەهەم (١٧٩٣ ــ١٧٥٤) دواێین پاشای ئەم بنەماڵە لە سێدارە درا (١٧٩٣).

٢ــ سیستەمی پاشایەتیی بۆربۆنەکان لە دوای وازهێنانی ناپلیۆن، ئیمپراتۆری فەرنسا دووبارە دامەزرایەوە (١٨١٥)، بۆ جارێکی تر لە ساڵی ١٨٣٠ لە بەریەک هەڵوەشایەوەو، لویی فیلیپ، شارلی دەیەمی لە سەر تەختی دەسەلات لادا. لویی سەر بە هۆزی بۆربۆنەکانی ئۆرلێئان بوو و، بۆخۆشی لە ساڵی ١٨٤٨ لە دەسەلات لادرا. سیستەمی پاشایەتی بەدامەزرانی کۆماری سێهەمی فەرەنسا لە نێوچوو (١٨٧١). پاشایەتی خوازانی فەرەنسا دوولەت بوون. تاقمێکیان کە خۆیان بە مەشروعەخواز ناودەبردو، پیرەوی رێبازی پاشایەتی خوازە کۆنەکان و، تاقمەکەی تر پیرەوی تاقمی پاشایەتیی ئۆرلێئان بوون، لایەنگرنی پاشایەتی خوازەکۆنەکان لە دەیەی نەوەدی سەدەی نۆزدەهەمدا لە نێو چوون. ئێستاکە زۆربەی پاشایەتی خوازانی پیرەوی لە رێبازی پاشایەتی خوازە نوێکان (تاقمی ئۆڕالیتان) بە سەرکردایەتی کۆنت دووپاری (کۆنتی پاریس) دەکەن.

بۆربۆرەکانی ئیسپانیا لە پاشماوەکانی بنەماڵەی پاشایەتی خوازە کۆنەکانن. لە ساڵی ۱۹۳۱دا ئیسپانیا رایگەیاند کە سیستەمی دەسەلاتی ئەو وڵاتە پاشایەتیەو، لە ساڵی ۱۹۷۵یشدا، شازادەخوان کارلۆس بۆربۆن ـپاراما بوو بە شای ئەم وڵاتە.

بۆربۆنە نیئۆپلیتەکان لقێک لە بنەماڵەکانی ئیسپانیا بوون کە لە ساڵی ۱۷۳۸ هەتا ۱۸٦۰ بەسەر ناپڵ و سیسیلدا حکومەتیان دەکرد.

۳ـ ئەم زاراوەیە بە کۆنەپەرستە توندڕۆکانیش دەگوترێ. ئەم زاراوە لە دوای ساڵی ۱۸۱۵ بۆ جارێکی تر هاتە ئاراوە، هۆکارەش ئەمە بوو کە زۆر لە ئەندامانی بنەماڵەی بۆربۆنەکان ولایەنگرەکانیان، بە شێوەیەک هەڵسوکەوتیان دەکرد کە دەتگووت شۆڕشی ۱۷۸۹ی فەرەنسا هەر رووی نەداوە.

## *Bourgeoisie*     *بۆرژوازی*

زاراوەیەکە کە لە وشەی Bourg بە واتای شار وەرگیراوە، کە لە سەرەتادا بە چینی شاری دەوڵەمەند وخوشگوزەرانیان دەگووت.

لەروانگەی مارکسیەکانەوە، بۆرژوازی لە هەناوی کۆمەڵگای فیۆدالی و لەرەوتی هەوڵی بەرهەمهێنانی وردەشتومەک سەری هەڵداوە و گەشەی کردوو؛ لە قۆناغی کەڵەکە بوونی سەرەتایی سەرمایەدا، وەک چینێک وەدەرکەوت و، لە ماوەی چەندین سەدە خەباتدا، توانیویەتی دەسەلاتی خۆی بسەپێنێ.

لە زاراوەی زانستیدا بۆرژوازی بریتیە لە چینی سەرمایەداران، واتە ئەو کەسانەی خاوەنی سەرکیی کەرەسەکانی بەرهەمهێنانی وەک کارگەکان، بانکەکان، کەرەسەکانی گواستنەوە و گەیاندن، بلاوکردنەوە و... هتدن.

بۆرژوازی بەپێی ئەوەی کە سەرمایەکەی خۆی لەکام یەک لە بەشەکانی کاروپیشەدا وەگەڕ خستووە، بەسەر بۆرژوازیی پیشەسازی (خاوەن کارەکان)، بۆرژوازیی بازرگانی (بازرگانە مەزنەکان)، بۆرژوازیی بانکی(بانکدارەکان)و بۆرژوازیی لادێ دابەش دەبێ.

پۆلێن بەندییەکی تری بۆرژوازی بەپێی هێزی ماڵی و کارتێکەریی ئابووری وسیاسیەکەیەتی، کە بەسەر بۆرژوازیی گەورە، بۆرژوازیی ناوەندو وردە بۆرژوازی دابەش دەبێ. لە بواری چەندایەتیەوە ڕێژەی وردەبۆرژوازێ و بۆرژوازی ناوەند لە بۆروازی گەورە زیاترە، بەلاّم توانایە ئابووری و کۆمەلاّیەتیەکان لە دەستی بۆرژوازیی گەورەدایە کە ئەگەرچی لە بواری چەندایەتیەوە کەمنیەیە، بەلاّم زۆربەی سەرچاوەکانی بەرهەمهێنان و ماڵی و دەسەلاّتی سیاسی لە بەردەست دایە. بۆرژوازیی ناوەندو وردە هەرکات لەبەردەم شکستهێنان دان و، و دەبنە کۆسپ لەبەردەم بەرژەوەندییەکانی بۆرژوازیی گەورەدا.

### وردە بۆرژوازی — Betty Bourgeoisie

بە بەرهەمهێنەرە بچووکەکانی شتومەک دەگوترێ کە لە لایەک خاوەنی کەرەسەکانی بەرهەمهێنانن و، لە لایەکی تر زۆربەیان خۆیان کاری بەرهەمهێنان دەکەن و کەس ناچەوسێنەوە.

### بۆرژوازیی کۆمپرادۆر — Comprador Bourgeoisie

بە توێژی بالاّ و دەوڵەمەندی بۆرژوازی دەگوترێ کە پێوەندییەکی پتەوی لەگەڵ مۆنۆپۆلە بیانیەکاندا هەیە. بۆرژوازیی کۆمپرادۆر دەبێتە هۆی پاراستن و سەروەری سەرمایە بیانیەکان.

### بۆرژوازی نەتەوەیی — National Bourgeoisie

بە توێژێک دەگوترێ کە لە هەولومەرجی داگیرکاریی ئەمپریالیزم بەسەر کۆمەڵگا کۆلۆنی و بەستراوەکاندا بە هۆی کۆمەڵێک کێشەی نەتەوەیی و بەسترانە مۆنۆپۆلیەکان پشت بە بەرهەمە نێوخۆییەکان دەبەستێ و، بەرژەوەندییەکانی لەگەڵ مۆنۆپۆلە بیانیەکان یەک ناگرێتەوە و لە دژایەتی دایە.

### بیرۆکراتی — Bureaucracy

لە وشەی لاتینی (Burra) وەرگیراوەو، بۆ یەکەمین جار لە سەدەی هەژدەهەم وەک Bureaucratie لە لایەن یەکێک لە وەزیرانی بازرگانیی فەرەنسا بە واتای حکومەت کەڵکی لێوەرگیرا. لە سەدەی نۆزدەهەمدا ئەم وشەیە بە شێوەی Burokratie هاتە نێو زمانی ئەڵمانی و، ئیتر لەوەبەدواوە کەڵک وەرگرتن لەو وشەیە لە زمانی ئینگلیزی و زمانەکانی دیکەدا پەرەی گرت.

بیرۆکراتی ئەمرۆکە ئاماژە بە توێژی ئیداری و چینی بەڕێوەبەریی ڕێکخراوە و بە تایبەتی ڕێکخراوی دەوڵەتی دەکاو، بەگشتی، بە واتای حکومەتی فەرمانبەران بە شێوەیەکی ڕێک خراو و پێکهاتەیەکی پتەو و یەکگرتووە.

بیرۆکراتی وەک یەکێک لە سەرچاوە گرنگەکانی دەسەڵات، لە هەرکۆمەڵگایەک دا دەتوانێ ببێ بە توێنگەی حکومەتی عەقل و لۆژیک و، کارگێری کاریزماتیک و هەست و سۆزی تاکەکەسی کە لە زۆربەی بڕیارە ئیداری و تەنانەت ڕێباز و یاسا و سیاسەتە گشتیەکانی کۆمەڵگای مرۆییدا خۆی دەنوێنێ، کۆنترۆڵ بکا و لە پێناو بەرژەوەندی گشتی کۆمەڵگا وەگەڕیان بخا. لە هەمان کاتیشدا دەتوانێ شێوەی چەکێکی رووخێنەر و ترسناک بە خۆیەوە بگرێ و، بە پیچەوانەی ویست و بەرژەوەندییەکانی خەڵک وەکار کەوێ.

هێندێکیش وەک کارڵ مارکس، رابێرت میشێل وگیدن جوبێرگ بە چاوێکی نیگەتیڤ سەیری ئەم دیاردەیان کردووە.

مارکس بۆچوونی خۆی سەبارەت بە بیرۆکراتی وێرای باسکردن لە بیروبۆچوونەکانی هیگڵ، دەردەبڕێ. بە بڕوای هیگڵ، بیرۆکراتی لە راستیدا وەک پردێک لە نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگا وایەو؛ کۆمەڵگاش لە گرووپەکان پێک دێ بە بەرژەوەندیی جیاوازەوەو، دەوڵەت پارێزەری بەرژەوەندییە هاوبەشە گشتیەکانی تاکەکانی کۆمەڵگایە. بیرۆکراتی ئامرازێکە کە لە ڕێگایەوە بەرژەوەندییە تایبەتیەکانی گرووپەکان دەگوازرێتەوە بۆ بەرژەوەندییە هاوبەشە گشتیەکان. مارکس بۆچوونی هیگڵ لەو بارەوە کە دەوڵەت نوێنەری بەرژەوەندییە هاوبەشە گشتییەکانی تاکەکانی کۆمەڵگایە، رەت دەکاتەوەو دەڵێ کە دەوڵەت پارێزەری بەرژەوەندییە تایبەتیەکانی چینی دەسەڵاتدارە. بیرۆکراتی خۆی بوار بۆ لە خۆ نامۆ بون (اغتراب) دەرەخسێنێ.

رابێرت میشێل پێیوایە کە ڕێکخراوە بەرفروان و گەورەکان بەپێی پێویستیی سروشتی شێوازو کارەکەیان، بە ناچاری وەک دیکتاتۆرییەک بەڕێوە دەبرێن.

بە بڕوای جوبێرگ، کۆمەڵناسی ئەمەریکی، بیرۆکراتی ئامرازێکە کە چینی خۆشگوزەران بە کەڵک وەرگرتن لەو ئامرازە، بارودۆخی لەبار و گونجاوی خۆیان لە بەرامبەر چینی خوارەوەی کۆمەڵگادا دەپارێزن.

بیرۆکراتی لە روانگەی ئەو کەسانەی کە بە چاوێکی پۆزەتیڤەوە لێی دەروانن بریتیە لە: جۆرێک رێکخستن بە ئەوپەری لێهاتوویی و کارامەیی؛ لەو رێکخستنەدا بەشەکان بە شێوەیەکی لۆژێکی و عەقلانی لەگەڵ یەکتردا پێوەندییان هەیە، بۆ ئەوەی ئەو ئامانجانەی کە رێکخراوێک بۆ خۆی دیاری کردووە،بە باشترین شێوە دەستەبەر بن.

بیرۆکراتی لە روانگەی ماکس ڤیبەر، کۆمەڵناسی ئەڵمانی: سەبارەت بە ڤیبەر دەبێ لە پێشدا لەگەڵ بۆ چوونەکانی ڤیبەر سەبارەت بە دەسەڵات و پیادەکردنی دەسەڵات ئاگادار بین. چوونکە جۆری بیرۆکراتیەت پێوەندی بە چۆنیەتی پیادەکردنی دەسەڵات لە کۆمەڵگادا هەیە. بەواتایەکی تر، پیادەکردنی دەسەڵات لە کۆمەڵگایەکدا بە سیستەمی فیکری و بەها کۆمەڵایەتیەکانی ئەو کۆمەڵگایەوە بەستراوەتەوە.

بەپێی بۆچوونەکانی ڤیبەر، پیادەکردنی دەسەڵات بە سێ شێوە رەوایی پەیدا دەکا:

١_پیادەکردنی دەسەڵات لە سەربنەمای نەریتەکان: لەم حاڵەتەدا رەوایی بوونی پیادەکردنی دەسەڵات لە سەر بنەمای پیرۆزیی داب نەریتەکانی جێی پەسندی کۆمەڵگایەو، دەسەڵاتی گەورەی خێزانەکان بەپێی سیستەمی باوکسالارییە.

٢_ پیادەکردنی دەسەڵات لە سەربنەمای کاریزما(Charisma):لە هێندیک بواردا، دەسەڵاتەکانی رێکخراوە بیرۆکراتیەکان لە کاریزماوە سەرچاوە دەگرێ. کاریزما لە وشەدا بەمانای "دیارییەکی خواپێداوی"یە. سەرکردەیەک خاوەنی تایبەتمەندییەکی میتافیزیکی بێ، بە کاریزما ناودەبردێ. بیرۆکراتیی کاریزماتیک لەگەڵ سەرکردە لە دایک دەبێ و لەگەڵ ئەو لە نێو دەچێ.

٣_ پیادەکردنی دەسەلات بەپێی یاسا: لەم حاڵەتەدا، بروای تاکەکانی کۆمەڵگا بە بەجێ بوونی رێوشوێنە یاساییەکان دەبێتە بنەمای رەوایی بوونی پیادەکردنی دەسەلات. لەم حاڵەتەدا خەڵک بە هۆی ئەوەی کە یاسا بەپێی شێواز و لۆژیکێکی گونجاو بە پەسندی کەسانێک دەگا کە بەپێی یاسا ورێوشوێنەکان هەڵبژێردراون، پیرەوی دەکەن.

بە بروای ماکس ڤیبەر، بیرۆکراتیەکی لۆژیکی خاوەنی ئەم تایبەتمەندیانەی خوارەوەیە:

١-کارەکان بەپێی پسپۆری فەرمانبەرانی ناو رێکخراو دابەش دەبێ.

٢-پێوەندیی نێوان تاکەکان و پۆستەکان، بەپێی هیرارکیەتی ئیدارییە.

٣-چالاکیەکانی ڕێکخراو بەپێی ڕێوشوێنە دارێژراوەکان کۆنترۆڵ وجێ بەجێ دەکرێن.
٤_چالاکیی هەرکام لە فەرمانبەران بەپێی لۆژیکی ڕێکخراوەیی، نەک لۆژیکی تاکەکەسی بەڕێوە دەچی و، بیروبۆچوونی تاکەکەس لەبەرچاو ناگیردرێ.
٥_ لێهاتوویی و پسپۆڕی، هۆکارو فاکتەری سەرەکی دامەزراندنی کەسەکان و بردنەسەری پلەی فەرمانبەرانە.
٦_ تۆمار کردن و ڕاگرتنی بڕیارە ئیدارییەکان و پێکهێنانی دۆسیە بۆ بابەتە جۆراوجۆرەکان بەمەبەستی پێش بینی کاروبارەکان و چاوەدێری بەسەر ڕاپەڕاندنی ئەرکەکان و بڕیاری بەجێ لەو جۆرە بیرۆکراتیەتەدا حەتمی و پێویستە.

### بۆلانژیست *Boulangiste*

بە لایەنگرانی ژەنەڕاڵ ژۆرژ بۆلانژ (٩١ ـــــ ١٨٣٨) لە فەرەنسادا دەگوترێ. بۆلانژە لە ساڵی ١٨٨٨دا دەستی دایە جموجۆڵ بۆ نۆیکردنەوەی دەستوور و دامەزراندنی دەوڵەتێکی بەهێز لە فەرەنسا. بۆلانژە لە نیسانی ١٨٨٩ لە فەرەنسا ڕای کرد و پاشملە بە خیانەت مەحکوم کرا و ئەو بزووتنەوەش لێک هەڵوەشاوە.

### بووندیسڤێهر *Bundeswehr*

زاراوەیەکی ئەڵمانیە، بە هێزە چەکدارەکانی فیدراڵ ئەو وڵاتە دەگوترێ.
لە دوای شەڕی دووهەمی جیهانی، دامەزراندنی سوپای ئەڵمان بابەتێکی زۆر ئاڵۆز بوو و ئەڵمانیەکان زۆریان بیر لێدەکردەوە و ئەگەری ئەوە هەبوو کە جارێکی تر ڕۆحی میلیتاریستی لەناو ئەڵمانیەکاندا ببوژێنێتەوە. بەڵام هەڕەشەی یەکیەتیی سۆڤیەتی سۆسیالیستی و قبوولکردنی بەڕەسمیی ڕێوشوێنە دێمۆکراسیەکان لە لایەن دەوڵەتی ئەڵمانیاوە، کۆتایی بەو ئاڵۆزییە هێنا و، بواری بۆ دامەزراندنی هێزە چەکدارەکانی ئەو وڵاتە خۆش کرد.

### بۆیارەکان *Boyars*

زاراوەیەکی ڕووسییە کە لە سەدەی یازدەهەمدا بە چینی ئاریستۆکراتی ڕووسیا دەگوترا. لە سەدەی پانزدە و شانزدەدا بە تێکەڵاوبوونی نۆکەر و کۆیلە خۆماڵییەکان لەگەڵ ئەو چینەدا، بۆیارەکان، بوون بە چینێکی ئاسایی. لە سەدەی هەژدەهەمدا ئەم تێکەڵاوییە ئەوەندە زۆر بوو کە جیاکردنەوەی

ئاریستۆکراتەکان لە کۆیلەکان زۆر ئەستەم بوو، چوونکە بۆیارەکان بۆخۆشیان کاری خزمەتگوزاریان دەکرد.

### بەهاری پراگ Spring Of Prague

بە ڕەوتێکی لیبراڵ لە چیکسلۆڤاکیا دەگوترێ کە لە لایەن "ئەلیکساندر دووبچێک"، سەرۆکی حیزبی کۆمۆنیستی ئەو وڵاتە پێک هات. سەرکردەکانی سۆڤیەت بۆ ئەوەی کە ئەم بزوتنەوە تەشەنە نەکاتە وڵاتانی تر، بە دەرکردنی ڕاگەیەنراوێک کە ئاماژەی بە ، "پاراستن و بەرگری لەو دەسکەوتانەی کە بە هەوڵی قارەمانانەو لە خۆبردووییەکی زۆری خەڵک بەدەست هاتووە، ئەرکی هاوبەش و نێونەتەوەیی هەموو وڵاتانی سۆسیالیستە " دەکرد، بە ناردنی ٢٤ لەشکر لە سوپای ڕێککەوتننامەی ڤەرشۆ، لە هاوینی ١٩٦٨دا، کۆتاییان بە بەهاری پراگ هێنا. لە دوای ئاڵوگۆڕەکانی پاییزی ١٩٨٩ لە وڵاتانی ئەورووپای ڕۆژهەڵاتدا، سۆڤیەت دەستێوەردانی خۆی لە بەهاری پراگدا بە هەنگاوێکی هەڵە لە قەڵەم دا.

### بێلایەنی Neutrality

بێلایەنی بریتیە لە بەشداری نەکردن لە شەڕی نێوان وڵاتانی دیکەدا. ئەگەر دەوڵەتێک بیهەوێ بێلایەن بێ و مافی بێلایەنی بیگرێتەوە، دەبێ چەندین بەڵێنی وەئەستۆ بگرێ و،بەتایبەتی لە دەستێوەردان لە کاروباری شەڕخۆی ببوێرێ. وڵاتی بێلایەن نابێ لایەنگری یان دژایەتی لە هیچ لایەنێکی شەڕەکە بکاو، ڕێگا نەدا کە لایەنەکانی شەڕ لە خاکی ئەو کەڵک وەربگرن و دەبێ داکۆکی لە بێلایەنی خۆی بکا. نابێ هیچ جۆرە کێشە و ناکۆکیەک لە ناوچە یان ئاوەکانی وڵاتی بێلایەنەکاندا ڕوو بدا. ڕەنگە بیروڕای گشتی، ڕاگەیەنە گشتیەکان و تەنانەت دەوڵەتی وڵاتی بێلایەن لەگەڵ یەکێک لە لایەنەکانی شەڕ هاوسۆزی بکەن، بەڵام هاوسۆزییەکە نابێ سنووری بێلایەنی ببەزێنێ. بێلایەنی بەردەوام کاتێک پێکدێ کە وڵاتێکی وەک سویسرا لە ڕێگای ڕێککەوتنێکی تایبەتیەوە بێلایەنی خۆی ڕابگەیەنێ. بێلایەنیی سنووردار زاراوەیەکە کە لە هێندێک لە ڕێککەوتنەکاندا کەڵکی لێ وەردەگیرێ و ، وڵاتی بێلایەن بەڵێن دەدا کە بە کردەوە نەچێتە نێو شەڕەکەوە، بەڵام دەتوانی هاوکاری لایەنێک بکا، لە سەردەمی ئیستادا کارێکی لەم چەشنە بەکردەوە بە پێشێلکردنی بێلایەنی دەژمێردرێ. بێلایەنیی ناوچەیی ئەوەیە کە وڵاتێک بەشێک لە خاکەکەی خۆی وەک بێلایەن ڕابگەیەنێ.

### بێلایەنیی چەکدارانە *Armed Neutrality*

ئەم زاراوە بە ڕێچکە و هەڵوێستی دەوڵەتێک لە سەردەمی شەڕ یان لە قەیرانێکی نێونەتەوەییدا دەگوترێ. بەو واتایەی کە لەگەڵ ئەگەری سەرهەڵدانی قەیرانێکی لەم چەشنەدا، دەوڵەتی بێلایەن هەوڵ دەدا تاکوو لە تێوەگلانی بەکردەیی هێزە چەکدارەکانی خۆی لە کێشەکەدا خۆی ببوێرێ. بەڵام ئەو مافە بۆ خۆی دەپارێزێ کە لە کاتی پێویستدا لە سەرچاوەکان و یەکپارچەیی خاکی ولاتەکەی لە بەرامبەر دەوڵەتە شەڕخوازەکان بەرگری بکا.

### بێگانەویستی *Xenocentrism*

بریتیە لە حاڵەتێک کە بەپێی ئەم حاڵەتە، ئەو گرووپانەی کە ناتوانن خۆیان لەگەڵ نۆرمەکانی کۆمەڵگاکەیاندا خۆ بگونجێنن، هۆگری کۆمەڵگاکانی تر دەبن.

### بەڵێن *Pact*

بە ڕێککەوتنێکی نێونەتەوەیی دەگوترێ. ئەم چەمکە لەگەڵ ئەم زاراوانەدا، کەڵکی لێ وەردەگیرێ کە بریتین لە :

بەڵێننامەی یەکیەتیی: بەڵێننامەیەکە کە بەپێی ئەو بەڵێننامە، دوو یان چەند دەوڵەت بەڵێن بە یەکتر دەدەن کە بۆ گەیشتن بە هێندێک لە ئامانجە سیاسییەکان لە ڕێگای دزەکردن یان هەڵکوتانەسەر هاوکاری یەکتر بکەن.

بەڵێننامەی یەکیەتیی نێونەتەوەیی: یەکیەتیی نێوان چەند دەوڵەتێکە کە بەڵێن دەدەن ولاتەکانیان لە کاروباری پێوەندیدار بە بابەتی ڕێککەوتنەکە سیستەمێکی هاوبەشیان هەبێ؛ وەک یەکیەتیی پۆستەو گەیاندن.

بەڵێننامەی یەکیەتیی بەرگری: جۆرێک لە ڕێککەوتننامەی یەکیەتیەکە بۆ بەرپەرچدانەوەی هێرشی دەوڵەتانی دیکە و پاراستنی بارودۆخی باو دەبەسترێ.

بەڵێننامەی یەکیەتیی هێرشکردن: جۆرێک لە ڕێککەوتننامەی یەکیەتیە، بەمەبەستی داگیرکاری یان زاڵبوون بە سەر دەوڵەتاندا.

بەڵێننامەی یەکیەتیی گشتی: بە بەڵێننامەیەک دەگوترێ کە لە نێوان دوو یان چەند دەوڵەتێک بە مەبەستی گرتنەبەری شێوازێک لە هێندێک بواردا بۆ گەیشتن بە بەرژەوەندیی هاوبەش دێتە ئاراوە.

بەڵێننامەی یەکیەتیی سەربازی: رێککەوتننامەیەکی یەکیەتیی بەرگری و رێککەوتننامەی یەکیەتیی هێرشبەر یان بە هەردووکی ئەوانە دەگوترێ.

بەڵێننامەی بێلایەنی: بێلایەنیەک کە لە نێوان دوو یان چەند دەوڵەت بەپێی بەڵێننامەیەک دێتە ئاراوە، بە نێوەرۆکی بەڵێننامەکە دەگوترێ رێککەوتننامەی بێلایەنی.

بەڵێننامەی بێلایەنیی هەمیشەیی: بەپێی ئەم رێککەوتننامەیە، یەکەم: دەوڵەتی بێلایەن بەڵێن دەدا کە جگە لە بەرگریکردن لە خۆی، پەنا بۆ شەڕ نابا. دووهەم: دەوڵەتەکانی تر بەڵێن دەدەن کە رێزلە بێلایەنی ئەو وڵاتە بگرن و، هەر دەوڵەتێک رێز لەو بێلایەنیە نەگرێ یان ئەم بێ لایەنیەی ئەو وڵاتە نەپارێزی، هەوڵ دەدەن ناچار بە پاراستنی بێلایەنیی ئەم وڵاتەی بکەن. واتە ناچاری دەکەن رێز لە بێلایەنیەکەی بگرن.

بەڵێننامەی بێلایەنیی کاتی: بەپێی ئەم بەڵێننامە، دەوڵەتە بەڵێندەرەکان دەبێ دەست لە شەڕێک وەرنەدەن، کە لە نێوان دوو یان چەند دەوڵەتێک لە ئارادایە.

بەڵێننامەی وەستاندنی شەڕ بە شێوەیەکی رەها: بەڵێننامەیەکی سیاسییە کە بەپێی ئەم بەڵێننامە لایەنەکانی شەڕ بۆ وەستاندنی شەڕ و پێکدادان لە شوێنێک یان هەموو شوێنەکانی وڵات بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ بەپێی نووسراوێک رێک دەکەون.

بەڵێننامەی وەستاندنی شەڕ بە شێوەیەکی کاتی: بەڵێننامەیەکی سەربازییە کە لە نێوان فەرماندەرانی سوپای لایەنەکانی شەڕ بەمەبەستی راگرتنی کاتی شەڕ (زیاتر لە رۆژێک تێناپەڕێ و، مەبەست لەم رێککەوتنەش زیاتر بۆ کۆکردنەوەی تەرمی کوژراوان و وەرگرتنی دەستوور لە کاربەدەستانی سەرەوەیە ) جێ بەجێ دەکرێ.

بەڵێننامەی سیاسی: رێککەوتنێکە کە لە نێوان دوو یان چەند دەوڵەت دەبەسترێ کە بابەتی رێککەوتننامەکە پێوەندی بەمان و سەربەخۆیی و رێزدانان و یەکپارچەیی خاکی ئەوانەوە هەیە وەک: رێککەوتننامەی ئاشتی، رێککەوتننامەی یەکیەتیی، رێککەوتننامەی گرەنتی، رێککەوتننامەی هاوکاری، رێککەوتننامەی بێلایەنی، رێککەوتننامەی دیاریکردنی سنوورو...هتد.

بەڵێننامەی ئاشتی:لەم رێککەوتننامەدا هەلومەرج و مەرجەکانی کۆتایی هێنان بە شەڕی تێدا دەنووسرێ.

بەڵێننامەی هاوکاری : بە بەڵێننامەیەک دەگوترێ کە دەوڵەتێک لەگەڵ ئەگەری سەرهەڵدانی شەڕدا بەڵێنی هاوکاری لە بواری هێزی سەربازی یان هاوکاری لە بواری تفاقی شەڕ و داراییەوە بە وڵاتێک دەدا، کە لە بەرامبەر ئەم بەڵێننامەدا شتێک وەردەگرێ. دەوڵەتی یارمەتیدەر ناکرێ وەک وڵاتێکی بێلایەن سەیر بکرێ.

### بازرگانیی چەک و چۆڵ Arms Trade

بە گواستنەوەی چەک وچۆڵ و تەقەمەنی و کەرەسەکانی شەڕ لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی دیکە دەگوترێ. ئەم گواستنەوەیە لە چوارچێوەی بازرگانی یان بەرنامەی هاوکارییە سەربازییەکاندا جێبەجێ دەکرێ. لایەنەکانی سات و سەوداکە زیاتر دەوڵەتەکانن، ئەگەرچی تۆڕی جۆراوجۆر لە بازاڕی رەشدا رۆڵیان لە ناردنی چەک وچۆڵ بۆ تاقمە شۆڕشگێرەکان، جیاییخوازەکان یان رێکخراوە میلیشیاکان هەیە.

بەگشتی کڕیارانی چەک وچۆڵ زیاتر وڵاتانی جیهانی سێهەمن، کە دوو لە سێ بازرگانیی چەک وچۆڵی جیهانیان بۆ خۆیان تەرخان کردووە. ئیسرائیل، عەرەبستان و کوێت بە گرنگترین کڕیارەکانی چەک وچۆڵ لە رۆژئاوا دەژمێردرێن. پێنج وڵاتی ئەندامی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان لە سەرووی وڵاتانی هەناردەی چەک و چۆڵ دان. لە نێو ئەوانیشدا ئەمەریکا گەورەترین وڵاتی هەناردەی چەک وچۆڵ بووە و، زیاتر لە نیوەی بازاڕە رەشەکانی چەک و چۆڵی لە بەردەست دایە. ئاستی ئەم بازرگانیە لە ساڵدا دەگا بە ۲۰ میلیارد دۆلار. رووسەکان بەڕادەی یەک لە دەی ئەو بازاڕەیان لە بەردەست دایە. جگە لە ئەمەریکا و رووسیا، بەریتانیاو فەڕەنساش رۆڵێکی بەرچاو لەو بازرگانیەدا دەگێڕن. کۆتایی شەڕی سارد زەبرێکی گەورەی لە بازرگانیی چەک وچۆڵ داوە. سەرەڕای ئەمەش، ژمارەیەک لە گروپەکانی لایەنگری مافی مرۆڤ دژی کڕین و فرۆشتنی چەک وچۆڵ بوون.

کوژرانی نزیک بە ۸۰۰ هەزار کەس لە خەڵکی رڤاندا لە ساڵی ۱۹۹٤ نیشانەی بوونی بەلێشاوی چەک وچۆڵ بوو. لەبەرامبەردا فرۆشیارانی چەک وچۆڵ دەڵێن کە خەڵکی رڤاندا بە چەکی ساکار و سەرەتایی کوژراون نەک بە چەکی مۆدێرن و پێشکەوتوو.

چەک و چۆڵ وەک شەمشێرێکی دوو دمە وایە کە دەبێتە هۆی سەقامگرتوویی، چوونکە سەرچاوەی هۆکارەکانی ناسەقامگرتوویی دەگەرێنەوە بۆ کێشە سیاسییەکان.

لەم ساڵانەی دواییدا چەندین رێگاچارە بۆ کۆنترۆڵی هەناردنی چەک وچۆڵ بەتایبەتی موشەکە بالستیکە دوورهاوێژەکان و مینەکان دانراون.

### بەرەی رۆژهەڵات — *Eastern Front*

بە بەرەی شەری نێوان سۆڤیەت و ئەڵمانیا لە شەرەکانی یەکەم و دووهەمی جیهانیدا دەگوترێ.

### بزوتنەوەی چاکسازی — *Reform Movement*

بزووتنەوە یان جووڵانەوە بریتیە لە جموجۆڵ یان چالاکی گرووپێکی تارادەیەک رێکخراو و بەبەرنامە بۆ گەیشتن بە ئامانجێکی کۆمەڵایەتیی تارادەیەک روون و دیاریکراو، بەپێی گەلاڵە لە پێشدا دارێژراوەکان. بزووتنەوەی چاکسازی بزووتنەوەیەکی هێدی و هەنگاو بە هەنگاوە بۆ پێکهێنانی کۆمەڵێک داهێنان، کە بنە هۆی لابردن و نەهێشتنی کێشە و ناکۆکیە کۆمەڵایەتیەکان.

سەرهەڵدانی بزووتنەوەیەکی چاکسازی پێویستی بەو مەرجانە هەیە:

١_ داهێنان لە هێندێک لە بوارە کۆمەڵایەتیەکان دا.

٢_ دواکەتنی لایەنەکانی تری کۆمەڵایەتی و ناتەبابوونی کۆمەڵگا.

٣_ گەیشتن بەو بابەتە کە بۆ نۆژنکردنەوەی کۆمەڵگا پێویستن.

٤_ دەستنیشانکردنی داهێنانە پێویستەکان بۆ نوژەنکردنەوەی کومەڵگا.

٥_ دابینکردنی کەرەسە پێویستەکان.

### بزوتنەوەی شۆرشگێری — **Revolutionary Movement**

بزووتنەوە یان جووڵانەوەی شۆرشگێری بزوتنەوەیەکی توند و لە ناکاوە، بۆ پێکهێنانی ئەو داهێنانانەی کە بە ئامرازەکانی نەهێشتنی ناکۆکیە کۆمەڵایەتیەکان دەژمێردرێن.

بزووتنەوەی شۆرشگێری کاتێک روو دەدا، کە، یەکەم: ناکۆکیەکانی کۆمەڵگا بە هۆی نەبوونی بزووتنەوەی چاکسازی یان کەم وکوڕییەکانی ئەم بزووتنەوە بەوپەڕی خۆی بگا؛ دووهەم: خەڵکی بە لەدەست ناکۆکیە کۆمەڵایەتیەکان وەزاڵە هاتبن. لە بارودۆخێکی ئەوتۆ دایە کە تەقینەوە

روو دەداو، گۆرانکارییەکی گەورە کە زۆر قوولّتر و بەرفراوانتر لە بزووتنەوەی چاکسازی دەبێ، پێکدێنێ. بێگومان لە مێژووی مرۆڤایەتیدا بزووتنەوە شۆڕشگێڕییەکان بەرادەی بزووتنە چاکسازییخوازەکان نین. مەزەندە کراوە کە لە هیچ کۆمەڵگایەکدا، ماوەی نێوان دوو شۆڕش (ڕاپەڕین) لە سێ بەرە کەمتر نەبووە.

بزووتنەوەی شۆڕشگێڕی چەندین جۆری هەیە. هێندێک جار زۆر توندو، هێندێک جاریش تارادەیەک هێدی و ئارامە. شۆڕشی بەریتانیا زۆر توند نەبوو، بەڵام شۆڕشی فەرەنسا زۆر توند بوو و، شۆڕشی رووسیا لەویش توندتر. هێندێک لە شۆڕشەکان، وەک بزووتنەوە چاکسازییەکان، تەنیا چاوەدێری بەسەر لایەنێکی کۆمەڵایەتیدا دەکەن و، هێندێکی تریش هەموو کۆمەڵگا لەخۆ دەگرن. هەردوو جۆری شۆرش، بە تایبەتی شۆڕشی کۆمەڵایەتیی مەزن کە هەموو کۆمەڵگا لەخۆ دەگرێ. تایبەتمەندی چینایەتی هەیە. هەروەک چۆن شۆرشەکانی بەریتانیا یان فەرەنسا یان رووسیا یان چین، شۆڕشی چینێک بە دژی چینێکی تر بوون.

**بزوتنەوەی جیایی خوازیی باسک**

**Basqus Separatist Movement**

بە بزووتنەوەیەک دەگوترێ کە بۆ بەدەستهێنانی سەربەخۆیی باسک لە باکووری ئیسپانیا تێدەکۆشی و، تا ئێستا چەندین کردەوەی تێکدەرانەشی بەرێوە بردووە.

کۆماری باسک لە رێکەوتی حەوتی ١٩٣٦ دامەزرا، بەڵام تەمەنی کورتی ئەم کۆمارە بە هێرشی هێزە دەستە راستیەکانی ژەنەراڵ فرەنکۆ (١٨٩٢ ـ ١٩٧٥) لە ١٨ی حوزەیرانی ١٩٣٧ کۆتایی پێهات.

**بزوتنەوەی چواری ئایار (١٩١٩) May Fourth Movement**

ئەم زاراوە بە رێپێوانی چوارهەزار خوێندکاری چینی دەگوترێ کە لە رۆژی چواری مانگی ئایاری ١٩١٩دا بە دژی یەکێک لە مەرجەکانی ناو رێککەوتننامەی ڤێرسای سەبارەت بە بەکرێدانی بەندەری کیاچۆ بە ژاپۆنیەکان، بەرێوەچوو. لق وپۆپی ئەم خۆپێشاندان و مانگرتنانە تەشەنەیان کردە شانگهای و، شت ومەکەکانی ژاپۆن لە لایەن خەڵکی چینەوە گەمارۆی خرایە سەر. چینیەکان لە مۆرکردنی رێککەوتننامەکە خۆیان بواردو، رۆشنبیرانی ئەم وڵاتەش دەستیان بە

رەتکردنەوەی فەلسەفە کۆنەکان کرد کە پشتیوانی و بەرگریان لە بیانیەکان دەکرد، ئەم مەسەلە بۆو بە هۆی بەرزبوونەوەی ئاشتی وشیاریی سیاسیی خەڵکی چین.

**بزووتنەوەی وڵاتانی بێلایەن Non - Alignment Movement**

بە رەوتێک دەگوترێ کە لە لایەن ژمارەیەک لەو وڵاتانەی کە ئەندامی دوو پەیمانی سەربازیی (ناتۆ و ڤەرشۆ) و هەروەها رێککەوتنە ناوچەییە سەربازییەکانی وەک سنتۆ و سیتۆ نەبوون و، لە سیاسەتی دەرەوەدا پیرەویان لە سیاسەتی بێلایەنی یان سیاسەتی سەربەخۆ لە دوو بەرەی رۆژهەڵات و رۆژئاوادا دەکرد، دامەزرا. پێشەنگی "سیاسەتی بێلایەنانە" لە جیهاندا وڵاتی هیند و پاشان یۆگۆسلاڤیا بوون و، پاشان وڵاتانی میسر و ئەندەنۆسیا و بەشێکی زۆر لە وڵاتانی تازە بە سەربەخۆیی گەیشتووی ئاسیاو ئەفریقیا چوونە نێو ئەو بەرەوە. رێبەرانی ئەو وڵاتانە لە دوو کۆبوونەوەی گەورەدا واتە کۆنفرانسی باندۆنگ (١٩٥٥) وکۆنفرانسی بیلگراد (١٩٦١) لە دەوری یەکتر کۆبوونەوە و، ئامانجەکانی خۆیان لە بوارەکانی بەربەرەکانی لەگەڵ ئەمپریالیزم و کۆلۆنیالیزم راگەیاند. کۆبوونەوەی ساڵرۆژی دامەزراندن (کۆبوونەوەی ١٤) بە بەشداریی ١٠٢ وڵاتی ئاسیایی و ئەفریقی لە نیسانی ٢٠٠٥دا لە ئەندەنۆسیا بەرێوە چوو. دەکرێ بنەما گشتییەکانی روانگەکانی وڵاتانی ئەندامی بزوتنەوەی بێلایەن بەم شێوەیە کورت بکرێتەوە:

١ــ هەوڵدان بۆ کەمکردنەوەی ئاڵۆزی و ناکۆکی لە پێوەندییە نێو نەتەوەییەکاندا.

٢ــ پەرەپێدان و هاندان و کەڵک وەرگرتن لە رێگا ئاشتی خوازانەکان بۆ چارەسەرکردنی کێشە نێونەتەوەییەکان (وتووێژ، دانوسان و ناوبژیوانی).

٣ــ دامەزراندنی پێوەندییە نێودەوڵەتیەکان لەسەربنەمای یەکسانیی نەتەوەکان و رێز بۆ یەکپارچەیی خاک و سەروەریی نەتەوەیی.

٤ــ پەرەپێدانی هاوکاری لە نێوان نەتەوەکاندا.

٥ــ دژایەتیکردن لەگەڵ کۆلۆنیالیزم.

٦ــ دژایەتیکردن لەگەڵ هەڵاواردنی رەگەزیدا.

٧ــ پشتیوانیکردن لە ئاشتی.

٨ــ پێکەوە ژیانی ئاشتیانە.

٩ــپشتیوانیکردن لە جارنامەی نەتەوەیەکگرتووەکان و بنەما سەرەکیەکانی یاسا نێو نەتەوەییەکان.

١٠ــ ڕێزدانان بۆ هێرش نەکردن و دەست تێوەرنەدان لە کاروباری نێوخۆی ولاتانی تردا.

١١ــ بەشداری نەکردن لە یەکیەتیە نێونەتەوەییە سەربازییەکاندا.

### بزووتنەوەکانی ئاشتی Peace Movements

هەرچەندە ئەمجۆرە بزووتنەوانە رابردوویەکی دووروودرێژیان هەیە، بەلاّم هیچکات وەک سەردەمی ئێستاکە کاریگەرییان لەسەر چارەنووسی مرۆڤ نەبووە.

بزووتنەوەکانی ئاشتی لە دەیەی ١٩٨٠، دوابەدوای زیاتر بوون و توندتر بوونی پێشبڕکێی چەکداربوون لە نێوان زلهێزەکاندا، بە بەڕێوە بردنی خۆپێشاندان و ڕێکخستنی کۆبوونەوە ئاشتیخوازانەکان و وەبیرهێنانەوەی مەترسیی شەڕە ئەتۆمیەکان؛ بیروڕای گشتیان لە دژی دامەزراندنی موشەکە ئەتۆمیەکان وروژاند. بڕیاری ڕێکخراوی ناتۆ لە ساڵی ١٩٧٩دا سەبارەت بە دامەزراندنی ١٠٨ موشەکی پرشنگ ــ٢و، ٤٦٤ مووشەکی تەماهاوک (موشەکی کرۆزی زەوی بە زەوی ) نارەزایەتیەکی بەربلاّوی لە ئەوروپا بۆوێنە لەئەلّمانیای فیدراڵ، هۆلەنداو بەریتانیا لێ کەوتەوە.

هەلّبژاردنی رۆناڵد ریگان بۆ پۆستی سەرۆک کۆماریی ئەمەریکا و راگەیاندنی پلانە چەک و چۆلەکانی ناوبراو بوو بە هۆی دامەزرانی " بزووتنەوەی مەیین "واتە گەورەترین بزووتنەوەی ئاشتی لە مێژووی ئەمەریکادا.

بزووتنەوەکانی ئاشتی لە ئەلّمانیای رۆژئاوا، بە بەراورد لەگەلّ ولاتانی تری ئەورووپی رێکخستنێکی بەرفراوانتری هەبوو. هۆکاری ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە هەموو موشەکەکانی پرشینگ و بەشێکی زۆر لە موشەکەکانی تۆماهاوک لە خاکی ئەو ولاتەدا سەقامگیرکرابوون.

ترس لەوەی کە رەنگە ئەلّمانیا "یەکەم ئامانج"ی سۆڤیەت لە هێرشی وەک" هێرشەپێشگیرانەکان" بێ و، هەروەها ترس و نیگەرانی لە ئاکامەکانی شەرێکی ئەتۆمی بوو بە هۆی پەرەگرتنی بزووتنەوەکانی ئاشتی و "حیزبی سەوز" کە شانبەشانی یەکتر لە دژی پێشبرکێی چەک و چۆلّ تێدەکۆشان.

به دوای دامەزراندنی موشەکەکان، خۆپیشاندانەکان پەرەی گرت. بەیاننامەکانی گرووپەکان و سیاسەتڤانان درێژەیان بە پشتیوانیی خۆیان لە بزوتنەوەکانی ئاشتی دا. ئەوان بە دروشمی وەک: "نەکرۆز، نەپرشینگ"، خوازیاری پێکهێنانی بەرگرییەکی ناسەربازی و ناوچەیەکی پارێزراو لە چەکە ناوەکیەکان بوون.

**بەجیهانیبوون** **Globalization**

ئەگەرچی زاراوەی جیهانی (global) مێژوویەکی چەند سەد ساڵەی هەیە، بەڵام چەندین زاراوەی وەک globalizing ,globalize, globalization، بە گشتی لە دەوروبەری ساڵی ١٩٦٠ بەملاوە برەویان پەیدا کردووە. گۆڤاری ئیکۆنۆمیست لەرێکەوتی ١٩٥٩/٤/٤ کەڵکی لە زاراوەی globalized guota (پشکی جیهانی) وەرگرت. قامووسی ڤێبستێر یەکەمین قاموسێکی دەوڵەمەند بوو کە لە ساڵی ١٩٦١دا چەندین پێناسەی بۆ زاراوەکانی globalization , globalism خستە ڕوو. بەوحاڵەش چەمکی "جیهانی بوون" بە ڕادەیەک بەربڵاوە، کە پێناسەیەکی چڕوپڕی لەو چەمکە ئەستەم کردووە. ئەم پێناسەش بەپێی پێناسە و ڕوانگەی چەندین تیۆرڤانی لێهاتووی "بە جیهانی بوون" ئاراستە کراوە:

"بەجیهانیبوون بریتیە لە پرۆسەی چڕبوونەوەی کات و شوێن کە بۆتە هۆی ئەوەی خەڵکی دنیا کەم و زۆر بە شێوەیەکی ئارادەیەک وشیارانە لە ناو کۆمەڵگای جیهانیدا بتوێنەوە". بەواتایەکی تر، بەجیهانیبوون بریتیە لە پرۆسەیەک کە تاک و کۆمەڵگا لە پانتایەکی جیهانیدا پێکەوە دەبەسترێنەوە.

لە لایەکی تر ئەو تیۆرڤانانەی کە بروایان بەتێزەکانی مارکس هەیە، دان بە گەیشتنی قۆناغێکی نوێ لە گەشەکردنی سیستەمی جیهانیی سەرمایەداری دادەنێن. هێندێک لە مارکسیەکان و نیۆمارکسیەکان لەسەر ئەو بڕوایەن کە ئەمڕۆ ڕەوتی نەپساوەی سەرمایەداری و خۆڕێکخستنەوە پەیتاپەیتاکانی ئەو سیستەمە، سەرمایەداریی بە جیهانی بووی تووشی گرفتی جیددیی کەڵەکە بوون و توانایی لە ڕادەبەدەر کردووە.

ئانتۆنی گیدێتز پرۆسەی بە جیهانی بوون بە بەرهەمی تێکچوونی تەکووزی لە مێژینەی شوێن وکات دەزانێ. بەبڕوای ناوبراو، ناکرێ بە هیچ شێوەیەک بەجیهانیبوون تەنیا بە دیاردەیەکی ئابووری بزانرێ، هەرچەندە کە خۆگرتنی ئابوورییەکی جیهانی بە یەکێک لە گرنگترین توخمەکانی

بەجیهانیبوون دەژمێردرێ. لەراستیدا ئانتۆنی گیدێتز لەو تیورڤانانەیە کە زیاتر لەسەر لایەنە کولتووری و کۆمەلآیەتیەکانی پرۆسەی بەجیهانیبوون پێدادەگرێ.

پرۆسە بەجیهانیبوون (لانیکەم لە بواری مێژووییەوە) گۆڕانێکە کە گەڕانەوەی بۆ نیە. نەک تەنیا ناکرێ هەلومەرجی بەر لە قۆناغی سەرهەلدانی بەجیهانیبوون زیندوو بکرێتەوە، بەلکوو راگرتنی ئەو پرۆسەو تەنانەت هێورکردنەوەی خێراییەکەشی جێبەجێ ناکرێ.

بە تێپەڕبوونی کات بەرفراوانی و خێرایی پرۆسەی بەجیهانیبوون زیاتر دەبێ و، تاکەکان و گرووپە جۆراوجۆرەکان زیاتر دەکەونە ژێرکاریگەریی ئەم پرۆسەو، ناتوانن خۆی لێ دەرباز بکەن.بۆیە سەرهەلدانی جۆرێک لە قەیرانی شوناس و واتاش شتێکی حاشاهەلنەگرە.

**بازدانێکی گەورە بۆ پێشەوە** **Great Leap For Ward**

دروشمی بەناوبانگی چینیەکان لە نێوان سالەکانی ١٩٥٨ هەتا ١٩٦١دا بوو، کە بوو بە هۆی کۆمەلێک گۆڕانکاریی بنەڕەتی لە سیاسەتە کۆمەلآیەتی و ئابوورییەکانی چین، بۆ خێراترکردنی رەوتی دامەزراندنی کۆمەلگای راستەقینەی کۆمۆنیستی لە چیندا.

***بالۆێزخانە*** ***Embassy***

بالوێزخانە بە نوێنەرایەتیی بەرزی سیاسیی ولآتێک لە ولآتێکی دیکەدا و بە شوێنی مانەوەی رەسمیی و نووسینگەکانی بالوێزی ئەو ولآتە دەگوترێ. بالوێزخانە لە پاش دامەزرانی کۆنسولخانە هاتۆتە ئاراوە. مێژووکەی بەم شێوە بووە کە لە دوای قەومانی هەرشەڕێک دا ولآتە دوژمنەکان چەند کەسیان بۆ وتووێژ رادەسپارد. ئەرکی ئەم راسپاردانە بەرەبەرە وای لێهات تا چارەسەرێک بۆ پێشگیری کردن لە هەلآیسانی شەڕ بدۆزنەوە. بۆ ئەوەی ئەم نوێنەرانەبتوانن ئەرکە ئەستەم و هەستیارەکانیان بە شێوەیەکی شیاو و لە پەڕی سەربەستی و بێ هیچ ئاستەنگێک بەرێوە ببەن، مەسەلەی پارێزراوی هاتە ئاراوە. لە پێوەندییە سیاسییەکانی سەردەمی ئێستادا، مافی بالوێزخانە لە یاسا نێو دەولەتیەکان دا، لە تایبەتمەندییەکانی دەولەتە سەربەخۆ و سەربەستەکانە. کەواتە ئەو دەولەتانەی کە تەواو سەربەخۆنین یان لە ژێر سەرپەرستی دەولەتانی دیکەدان،ناتوانن بالوێزخانەی تەواو سەربەخۆیان هەبێ.

ئەم دوڵەتانە دەتوانن نوێنەری سیاسی دەوڵەتانی دیکە قبووڵ بکەن، بەڵام ناتوانن نۆێنەری سیاسی بنێرنە وڵاتانی دیکە، لە کاتێک دا کە دەوڵەتە سەربەخۆ و سەربەستەکان دەتوانن نوێنەری سیاسی بنێرنە دەرەوە و هەم نوێنەری سیاسی وڵاتانی دیکەش قبووڵ بکەن. مافی کردنەوەی باڵوێزخانە، مافێکی بێ ئەملاوئەولای هەموو دەوڵەتێکەو هەموو دەوڵەتێکیش ناچارە نوێنەری سیاسی دەوڵەتانی دیکە قبووڵ بکا کە بە رەسمیی ناسیوون.

هەکاتێک دەوڵەتێک بەبێ ئەوەی لەگەڵ وڵاتێک دا بەشەڕ هاتبێ یان پێوەندی سیاسی لەگەڵ ئەو وڵاتەدا پچراندبێ، ئەگەر لە قبووڵکردنی نوێنەری سیاسی ئەو وڵاتە خۆببوێرێ، لە بواری نێودەوڵەتیەوە هێرشی کردۆتە سەر مافی ئەودەوڵەتە.

ماددەی یەکەمی رێککەوتننامەی لاهاوان کە لە بیستی مانگی شوباتی ١٩٢٨ دا مۆرکراوە، سەبارەت بە مافی باڵوێزخانە بڕیاری داوە: " دەوڵەتەکان ئەو مافەیان هەیە کە نوێنەری سیاسی بنێرنە وڵاتانی دیکە". یەکەمین باڵوێزخانەی هەمیشەیی لە لایەن ریشیلیۆ، راوێژکاری لۆئی سیزدەهەم دامەزرا و دەوڵەتەکانی دیکەش ئەم یاسایەیان رەچاوکرد. کەواتە دەتوانین بڵێین کە باڵوێزخانەی هەمیشەیی لە کۆتاییەکانی سەدەی ١٧ لە جیهان دا دامەزراوە.

### باڵوێز **Ambassador**

باڵوێز، بەرزترین پلەی نوێنەری وڵاتێک لە وڵاتێکی دیکەدایە. لە سەدەکانی ناوەڕاست و بەر لەو کاتەش، چەند باڵوێزیک، بە شێوەی کاتی دەناردرانە وڵاتێکی دیکە، بەڵام لە سەدەی پانزدەهەم دا بوو کە دەیاریکردنی باڵوێزی هەمیشەیی یا نیشتەجێ لە وڵاتێکی دیکەدا وەکوو نوێنەری سەرۆکی وڵات سەری هەڵدا. ئەو وڵاتانەی کە بۆ یەکەم جار باڵوێزیان ناردە وڵاتانی دیکە دەوڵەت_ شارەچکۆلەکانی ئیتالیای ئەوسەردەمە بوون. لە سەدەی ١٦ و ١٧ دا هێندێک جار جگە لە باڵوێزی هەمیشەیی، نوێنەرێکی نائاسایی بۆ ئەرکی تایبەتی دەنێردرا کە دەسەڵاتی لە باڵوێزی نیشتەجێ یان رەسمی زۆرتر بوو و پاشانیش بۆئەوەی باڵوێزە رەسمەکان پێگەیەکی باشتریان هەبێ، بە باڵوێزە رەسمیەکانیان دەگووت، ،باڵوێزی نائاسایی. باڵوێز پیرەوی لە یاسای ئەو وڵاتە ناکا کە تێیدا نیشتەجێیە و وڵاتی خانەخۆی، دەتوانی تەنیا داوا لە وڵاتەکەی بکا کە بانگهێشتی بکاتەوە.

لە ئێران باڵوێزی رەسمی لە دوای شەڕی دووهەمی جیهانیەوە هاتە ئاراوەو بەر لەمە وەزیری موختار دەنێردرایە وڵاتانی دیکە کە لە راستیدا ئەرکی باڵوێزی بەرێوەدەبرد. باڵوێز لەلایەن

سەرۆکی وڵاتەوە هەڵدەبژیردرێ. بەڵام لەم پیوەندییەدا دەبێ ئەو وڵاتەی کە باڵویزی بۆ دەچێ، باڵویزەکە قبوول بکات و دەبێ وڵاتی یەکەم داوای قبوولکردنی باڵویز لە وڵاتی دووهەم بکا. لە دوای پەسند کردنی سەرۆکی ئەو وڵاتەی کەباڵویزی بۆ دەنێردرێ، باڵویز دەبێ لە وڵاتی خۆیەوە بەڵگەیەک بە ناوی"بڕوانامە" وەرگرێ. ئەم بەڵگەنامەیە باڵویز دەناسێنێ کە ڕاستەخۆ لە لایەن خۆیەوەو بە پێی بەرنامەیەکی ڕەسمی پێشکەشی سەرۆکی ئەو وڵاتە دەکرێ. پێش لەوەی باڵویز بڕوانامەی خۆی پێشکەشی سەرۆکی وڵات بکا، دەبێ وێنەیە کی بڕوانامەکەی بداتە وەزارەتی دەرەوەی ئەو وڵاتە. لەگەڵ پێشکەش کردنی بڕوانامە بە سەرۆکی وڵات، تێکوشانی ڕەسمی باڵویز لەو وڵاتەدا دەست پێدەکا.

### باڵویزی ئاکرێدیتە — *Accredited Ambassador*

کاتێک دوو وڵات، کە لەگەڵ یەکتردا پێوەندی سیاسیان هەیە، بەڵام تا ئێستا ئاڵوگۆڕی باڵویزیان نەکردبێ، لە حاڵەتی ئاوادا، زۆربەی کاتەکان باڵویزی خۆیان لە یەکێک لەو وڵاتانەی کە لەو وڵاتەوە نزیکن، وەکوو باڵویزی ئاکریدیتە بەیەکتر دەناسێنن. ئەم باڵویزە لە ڕاستیدا لە دوو وڵات دا ئەرکی باڵویزی بەڕیوە دەبا، ڕێورەسمی ناساندن و پێشکەش کردنیبڕوانامەی باڵویزی ئاکریدیتە وەکوو باڵویزی نیشتەجێ وایە.

### بەستراوە — *Attaché*

ئەم زاراوەیە بە نزمترین پلەی دیپلۆماتێکی دەگوترێ، لە عوورفی سیاسییدا بەستراوە جیاوازەکانی وەکوو بەستراوەی سەربازی (زەمینی، ئاسمانی، دەیایی)؛ بازرگانی، کولتووری و ئابووری لە ئارا دان. ئەم بەستراوانە پێش لەوەی ئەم پۆستەیان پێ بدرێ، لە وڵاتی خۆیاندا پلەی گرنگی سەربازی و سیاسییان هەبووە.

### بزووتنەوی سەد گوڵ — *One Hundred Flowers Movement*

لە سەرەتاکانی دەیەی ۱۹۵۰دا کۆمەڵێک هەوڵ لە پێناوی " چاکسازی هزری" لە چینی کۆمۆنیست لەئارادا بوون بۆ ئەوەی ڕووناکبیران و خاوەن پیشەکان بێننە سەر ڕێبازی سۆسیالیزم. چوونکە ئەمانە سووکایەتیان بەو کادیرە بوێرانە دەکرد کە لە بە پۆستاڵە قوڕاوییەوە بۆ ئێرە و ئەوێ دەچوون و کاروباری خەڵکیان ڕادەپەڕاند، بەرپرسانی حیزبی کۆمۆنیست پێیانوا بوو کە بە جێگەی

ئەوەی لە شێوازی سەرەتایی و توندوتیژیی "چاکسازی هزریی " کەڵک وەگیردرێ، دەبێ لەرێگایەکی ناسکتر بۆ قەناعەت پێ هێنانی ئەوان کەڵک وەرگیردرێ. بۆیە کەڵکیان لە شێوەیەکی نوێی بزووتنەوەکانی سەد گوولی" ساڵەکانی ٥٧_١٩٥٦ وەرگرت. داوایان لە هەموو خەڵک کرد کە لە پێشبیرکێی" سەد چەپکە گوڵ و سەد رێبازی هزری"دا بە شداری بکەن. بە واتایەکی دیکە رژێم بدەنە بەر رەخنە. هاوکات لەگەڵ ئەم هەنگاوەدا، پالأوتنێکی حیزبی لە دژی بیرۆکراتی ئیداری لە نێو کادیرەکاندا پێکهات.

ماو لە شوباتی ١٩٧٥ دا جارێکی دیکە بانگەوازەکەی خۆی راگەیاندەوە و لەناکاو لافاوی رەخنەکان بە هۆی بلأوکردنەوەی وتارەکان و لێدوانەکان هەموو چینی گرتەوە. ئەم رەخنانە زۆر بە توندی دژە حیزبی و دژە سۆسیالیستی بوون و نزیک بوو چوارچێوەی رژێم بدەنە بەر پەلامار، بۆیە وازیان لە بزووتنەوەی سەد گوول هێناو جارێکی دیکە لە شێوازی توندو تیژی "چاکسازی هزری" کەڵکیان وەرگرت.

### *بەڵێننامەی نێودەوڵەتیی مافە ئابووری، کۆمەڵایەتی وکولتوورییەکان (١٩٦٦)*

### ***Social and International Covenant On Economic Cultural Rights***

یەکێک لە دوو رێککەوتننامە بنەرەتیە نێودەوڵەتیانەیە کە مافەکانی ناو راگەیەنراوی جیهانیی مافی مرۆڤ دەگۆڕێ بۆ کۆمەڵێک یاساکە دەبێ جێبەجێ بکرێن. بەڵێننامە هەمووئەو مافە ئابووریی، کۆمەلأیەتیی و کولتوورییانەی کە شیاوی مرۆڤەکانن دارشتووە و دەوڵەتەکانی ناچار کردووە کە بۆ بردنەسەری ئەم مافانە هەوڵ بدەن و دابینیشیان بکەن. کۆمیسیۆنی مافی مرۆڤی رێکخراوی نەتەویەکگرتووەکان هەوڵی سەرەتایی بۆ دارشتنی بەڵێننامە دا ولە ساڵی ١٩٥٤دا ئاراستەی کۆمەڵەی گشتی un کرا، بەلأم تاساڵی ١٩٦٦ بەڵێننامە لەلایەن کۆمەڵەی گشتیەوە پەسند نەکرا و لە ساڵی ١٩٧٦دا بە پەسندکردنی لەلایەن ٣٥ دەوڵەتەوە، دەوڵەتەکان ناچار کراون کە جێبەجێی بکەن. ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بە هۆی ترس و نیگەرانیی سەبارەت بە چۆنیەتی دابەشبوونی دەسەلأتەکانی دەوڵەتە فیدراڵەکان بەپێی دەستوور، ئەم بەڵێننامەی مۆر نەکردووە.

ئەوەی لە شێوازی سەرەتایی و توندوتیژیی "چاکسازی هزریی " کەڵک وەگیردرێ، دەبێ لەرێگایەکی ناسکتر بۆ قەناعەت پێ هێنانی ئەوان کەڵک وەرگیردرێ. بۆیە کەڵکیان لە شێوەیەکی نوێی بزووتنەوەکانی سەد گوولی" ساڵەکانی ٥٧_١٩٥٦ وەرگرت. داوایان لە هەموو خەڵک کرد کە لە پێشبێرکێی" سەد چەپکە گوڵ و سەد رێبازی هزری"دا بە شداری بکەن. بە واتایەکی دیکە رژێم بدەنە بەر رەخنە. هاوکات لەگەڵ ئەم هەنگاوەدا، پالاوتنێکی حیزبی لە دژی بیرۆکراتی ئیداری لە نێو کادیرەکاندا پێکهات.

ماو لە شوباتی ١٩٧٥ دا جارێکی دیکە بانگەوازەکەی خۆی راگەیاندەوە و لەناکاو لافاوی رەخنەکان بە هۆی بلاوکردنەوەی وتارەکان و لێدوانەکان هەموو چینی گرتەوە. ئەم رەخنانە زۆر بە توندی دژە حیزبی و دژە سۆسیالیستی بوون و نزیک بوو چوارچێوەی رژێم بدەنە بەر پەلامار، بۆیە وازیان لە بزووتنەوەی سەد گوول هێناو جارێکی دیکە لە شێوازی توندو تیژی "چاکسازی هزری" کەڵکیان وەرگرت.

### *بەڵێننامەی نێودەوڵەتیی مافە ئابووری، کۆمەلایەتی وکولتوورییەکان (١٩٦٦)*

### ***Social and ،International Covenant On Economic Cultural Rights***

یەکێک لە دوو رێککەوتننامە بنەرەتیە نێودەوڵەتیانەیە کە مافەکانی ناو راگەیەنراوی جیهانیی مافی مرۆڤ دەگۆرێ بۆ کۆمەڵێک یاساکە دەبێ جێبەجێ بکرێن. بەڵێننامە هەمووئەو مافە ئابووریی، کۆمەلایەتیی و کولتوورییانەی کە شیاوی مرۆڤەکانن دارشتووە و دەوڵەتەکانی ناچار کردووە کە بۆ بردنەسەری ئەم مافانە هەوڵ بدەن و دابینیشیان بکەن. کۆمیسیۆنی مافی مرۆڤی رێکخراوی نەتەویەکگرتووەکان هەوڵی سەرەتایی بۆ دارشتنی بەڵێننامە دا ولە ساڵی ١٩٥٤دا ئاراستەی کۆمەڵەی گشتی un کرا، بەلام تاساڵی ١٩٦٦ بەڵێننامە لەلایەن کۆمەڵەی گشتیەوە پەسند نەکرا و لە ساڵی ١٩٧٦دا بە پەسندکردنی لەلایەن ٣٥ دەوڵەتەوە، دەوڵەتەکان ناچار کراون کە جێبەجێی بکەن. ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بە هۆی ترس و نیگەرانیی سەبارەت بە چۆنیەتی دابەشبوونی دەسەلاتەکانی دەوڵەتە فیدراڵەکان بەپێی دەستوور، ئەم بەڵێننامەی مۆر نەکردووە.

### *بەڵێننامەی نێودەوڵەتیی مافە مەدەنی و سیاسییەکان (١٩٦٦)*
### *InternationalCovenant On Civil and Political Rights*

یەکێک لە دوو ڕێکەوتننامە نێو دەوڵەتیەیە کەمافەکانی ناو ڕاگەیەنراوی جیهانیی مافی مرۆڤ دەگۆڕێ بۆ کۆمەڵێک یاسا کە دەبێ جێبەجێ بکرێن. بەڵێننامە کۆمەڵێک مافی مەدەنی و سیاسی هاوبەش بۆ هەموو مرۆڤەکان لەخۆ دەگرێ کە دەوڵەتەکان بەڵێن دەدەن بۆ بردنەسەری ئەم مافانە هەوڵ بدەن و گەرەنتیان بکەن. ئەم مافانە: مافی ژیان و ئاسایش، ئازادیی کۆڕوکۆبوونەوە، ئازادی بیروڕا، ئایین و قەدەغەکردنی کۆیلەداری وئەشکەنجە لەخۆ دەگرێ. ئەم بەڵێننامە لە سەرەتادا لەلایەن کۆمیسیۆنی مافی مرۆڤی UN لە ساڵی ١٩٥٤دا نووسرا و لە ساڵی ١٩٦٦ لە لایەن کۆمەڵەی گشتیەوە پەسند کرا. لە ساڵی ١٩٧٦ دا بە پەسند کردنی نێوخۆیی لە لایەن سی وپێنج دەوڵەتەوە، دەوڵەتەکان ناچار کران کە جێبەجێی بکەن. ویلایەتەیەکگرتووەکانی ئەمەریکا بە هۆی ترس و نیگەرانیی سەبارەت بە چۆنیەتی دابەشبوونی دەسەڵاتەکانی دەوڵەتی فیدراڵ بە پێی دەستوور، ئەم بەڵێننامەی پەسند نەکرد.

### *بەڵێننامەی نیشتمانی (١٩٤٣) National Convenant*

ڕێککەوتنێکی نێوان یەکەمین سەرۆک کۆماریی لوبنان (بشارە ئەلخوری) و یەکەمین سەرۆک وەزیری ئەو وڵاتە (ریاز سولح) بوو کە یەکەمیان مەسیحیەکی مارۆنی بوو و دووهەمیشیان ناسیۆنالیستێکی سوننەی لایەنگری پان عەربیسم بوو. ئەم بەڵێننامە لوبنان بە وڵاتێکی سەربەخۆ، خاوەن سەروەری، وبێلایەن دەناسێ. ئەم بەڵێننامە هەروەها دیاری کردبوو کە مارۆنیەکان خوازیاری پشتیوانیی ڕۆژئاوا و موسڵمانەکانیش بە تایبەتی سوونەکان خوازیاری توانەوە لە کیانێکی عەرەبیی گەورەتردا نابن و لوبنان پێوەندی مەعنەوی و هزریی خۆی لەگەڵ ڕۆژئاوادا ناپچڕێنێ. بەڵێننامە خوازیاری هەڵوەشانەوە و نەهێشتنی بەرەبەرەی سیستەمی تایەفی بوو. پۆستە دەوڵەتیەکان بە شێوەی یەکسان لە نێوان گرووپە ئایینیە ناسراوەکاندا، دابەش دەکران، بەڵام لە پوستە تەکنیکیەکاندا شارەزایی و لێهاتوویی کەسەکان پێویستە. جگە لەمە سێ پۆستی بەرزی دەوڵەتیش بەم شێوە دابەش دەبن

١ــ سەرۆک کۆمار ــ مەسیحی مارۆنی

٢ــ سەرۆک وەزیر ــ موسلمانی سوونە

٣ــ سەرۆکی پەرلەمان ــ موسڵمانی شیعە

***بەڵێننامەی کۆمەڵەی نەتەوەکان***

***League Of Notions Convenat***

لە بابەتە گرنگەکانی بەرنامەی کاری کۆنفرانسی پاریس لە دوای شەڕی یەکەمی جیهانی، مەسەلەی کۆمەڵەی نەتەوەکان بوو کە دەبوایە زوو وەکوو یەکەمین ڕێکخراوی نێودەوڵەتیی جیهان، پاراستنی ئاشتی و ئاسایش بۆ نەتەوەکانی جیهان مسۆگەر بکا. لە ماوەی ساڵەکانی شەڕدا، لە زۆربەی وڵاتەکاندا گەڵاڵەی جیاواز بۆ پێکهێنانی ڕێکخراوێکی بەم شێوەیە داڕێژرابوون و بەتایبەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و بەریتانیا لەم پێناوەدا هەوڵیان دەدا. ئەم وڵاتانە سوور بوون لەسەر ئەوەی کە بۆ پێشگرتن لە هەر شەڕێکی کارەساتباری هاوشێوە، ڕێکخستنێکی جیهانی پێک بێنن. بەریتانیا، فەڕەنسە و ئەمەریکا وێڕای ئەوەی باسی پاراستنی ئاشتی لە جیهان و گەرەنتی ئاسایشی "هەموو نەتەوەکان" یان دەکرد، هەوڵیان دەدا گەڵاڵەیەک ئاراستە بکەن کە بەرژەوەندییەکانی خۆیان دابین بکا و نفووزی ئەوان لە جیهاندا زیاتر بکا.

ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا کە لە دوای شەڕی یەکەمی جیهانیەوە لە هەموو وڵاتانی دیکە دەسەڵات و سامانی زۆرتر ببوو، ڕاشکاوانە لە پێناوی گرتنەدەستی ڕێبەرایەتیی دامەزراندنی سیستەمی پێوەندی نێودەوڵەتیی لە ساڵەکانی پاش شەڕدا تێدە کۆشا. بە بڕوای ڤیلسۆن (سەرۆک کۆماری ئەو کاتی ئەمریکا ) ڕەشنووسی بەڵێننامەی کۆمەڵەی نەتەوەکان کە لە لایەن خۆیەوە ئاراستەی کۆنفرانسی پاریس کرابوو و بۆ خۆشی داوای کردبوو کە لە کۆنفرانسی ئاشتی لەگەڵ ئەڵمانیادا ئاماژە بەم بەڵێننامە بکرێ، دەبێتە هۆی بە هێزکردنی ئەم ئامانجانە. بەڵام بەرنامەکانی ڤیلسۆن بۆ دامەزراندنی ڕێکخراوێکی نێودەوڵەتیی لە ژێر ساباتی پشتیوانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا، لەلایەن بەریتانیاو فەڕەنساوە دژایەتیی لەگەڵدا کرا. ئەگەرچی نوێنەرانی بەریتانیا و فەڕەنسا ڕاشکاوانە لەگەڵ بیرۆکەی دامەزراندنی کۆمەڵەی نەتەوەکاندا دژایەتیان نەدەکرد (و بۆخۆشیان لەم پێوەندییەدا چەند پێشنیاریان دابوو بە کۆنفرانس) ئەوەی لە دەستیان هات، بۆ وەدواخستنی پەسند کردنی ڕەشنووسەکە کردیان و کۆمەڵێک بڕیاری نوێیان لە کۆبوونەوەکاندا هێنایە گۆڕێ و گۆڕانکارییەکی زۆریان لەڕەشنووسەکەدا پێکهێنا و لەگەڵ هێنانە بەرباسی ئەم

رەشنووسە لە رێککەوتننامەی ئاشتیدا دژایەتیان کرد. لە هەمان حاڵدا بەریتانیا و فەرەنسا نەیانتوانی لە سەر هێندێک لە ماددەکانی ئەم بەڵێننامە رێککەون لە کۆتاییدا رەشنووسی بەڵێننامەی کۆمەڵەی نەتەوەکان کە بە هاوبەشی بەریتانیا و ئەمەریکا ولە دوای وتووێژە نارەسمیەکانی ئەم دوو هێزە دارێژرا بوو، وەکوو بناغەی بەڵێننامەی کۆمەڵەی نەتەوەکان پەسندکرا.

## بەرژەوەندییە نیشتمانیەکان National Interest

بەرژەوەندییە نیشتمانیەکان، ئامانجی سەرەکیی و چارەنووسسازی سیاسیەتی دەرەوەی ولاّتێک پێکدێنن. بەرژەوەندییە نیشتمانیەکان، بنەما سەرەکیەکانی ولاّتێک پێکدێنن. پاراستنی کیان، سەربەخۆیی، یەکپارچەیی ولاّت، ئاسایشی سەربازی و خۆشگوزەرانی ئابووریی لەو بنەما سەرەکیانەن کە بۆ هەر ولاّتێک پێویستن. ئەو کاتەی کە بەرژەوەندییە نیشتمانیەکانی ولاّتانی لە یەک ئاراستەدان، ئەم ولاّتانە پێکەوە بۆ چارەسەری کێشەکانیان تێدەکۆشن، بەلاّم ئەگەر بەرژەوەندییەکانیان لە یەک ئاراستەدا نەبوو، کێبەرکێ، گرژی، ترس و لە دوایشدا شەڕ سەرهەڵدەدا. دەوڵەتەکان بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانیان لەم شێوازانە کەڵک وەردەگرن: پەنابردنە بەردیپلۆماسی، کۆتاییهێنان بە کێشەکان بە رێگاچارەی ئاشتیانە ، یاسا نێودەوڵەتیەکان، رێکخراوە ناوچەیی و نێودەوڵەتیەکان.

جۆرەکانی بەرژەوەندییە نیشتمانیەکان: بەرژەوەندییە هاوتەریبەکان، بەرژەوەندییە دژەکان، بەرژەوەندییە هاوبەشەکان، بەرژەوەندییە کێشە خوڵقێنەکان.

لە پێوەندییە نێودەوڵەتیەکاندا، تاقمێک بەرژەوەندی گشتی لە چوارچێوەی عەینی و عەقلاّنی و بە پێی تەکتیکە زانستیەکان لێک دەدەنەوە، بەلاّم تاقمێکی دیکە بە پێی ناکۆکی نێوان روانگە زەینیەکان و پێویستیە سەرەکیەکان لیکی دەدەنەوە و وێرای ئاماژەکردن بە بەرژەوەندییە نیشتمانیەکان بە شێوەی دەرئەنجامە (داتا)سیاسییەکان وەکوو شێوازێکی هونەری تاوتوێی دەکەن.

هەرچۆنێک بێ، دەبێ ئەم چەمکە بە پێی سەنتێزێک لە دوو تەکتیکی عەینی و زەینی تاوتوێ بکرێ.

هانس مۆرگەنتا، وەکوو یەکێک لە لایەنگرانی رێبازی رئیالیزم، بەرژەوەندییە گشتیەکان بە هاوواتای هێز، وەکوو ئامانجی دەوڵەتێک دادەنێ. رئیالیستەکان بۆ دابینکردنی بەرژەوەندی

دەوڵەتەکان، هێز بە شتێکی پێویست دادەنێن. سەرەڕای ئەوەی کە یەکە سیاسییەکان بە دوای ئامانجێکی دیکە لە سیاسەتی دەرەوەدان، بەڵام بە پێی ئەم تیۆرە، هێز، هەموو ئەو ئامانجانە دەخاتە ژێرکاریگەری خۆیەوە. ئەم ڕێبازە لەسەر ناهاوسەنگ بوون و لێکنەچوونی بەرژەوەندیی دەوڵەتەکان ڕاوەستاوە. بە بڕوای مورگەنتا لانیکەمی داخوازییەکانی دەوڵەتێک، پاراستن و پارێزگاریکردن لە شوناسی فیزیکی (یەکپارچەیی وڵات)، سیاسی (پاراستنی حکوومەت) و کولتووریە (پاراستنی شوناسی نۆرمە مێژوویی و بە هاکان) کە بە هۆی توانایی هێزی پێویستەوە دەتوانی دابینیان بکا مورگەنتا بە هۆی ورد نەبوونەوە لە کەڵک وەرگرتن لە دوو چەمکی ئابستراکتی هێزو بەرژەوەندییەکان، لە لایەن ڕێبازی زانستگەریی لە پێوەندییە نێودەوڵەتیەکاندا کەوتە بەر ڕەخنەوە، بەڵام لە بەرامبەر ئەو ڕەخنانەدا، ئەو پێیوابوو کە ئەم چەمکانە لە ناخی خۆیاندا تایبەتمەندییەکی ئابستراکتیان هەیە و نابێ بە پێی پێوەرە ئامارییەکان لێک بدرێنەوە. بەدرێژایی زەمان، سەبارەت بە بەرژەوەندییە نیشتمانیەکان چەند پرسیار هاتوونە گۆڕێ و کۆمەڵێک بابەتیش لەم پێوەندییەدا هاتوونەتە ئاراوە کە ئاماژە بەهێندێکیان دەکەین:

١_ کەڵک وەرگرتن لە چەمکی بەرژەوەندییە نیشتمانیەکان، ڕەوایی دەدا بە ئەرک و ڕۆڵی سیستەمی سیاسی؛ بەو واتایەی کە لە سەردەمی پێکهێنانی حکوومەتە نەتەوەییەکاندا (نیوەی دووهەمی سەدەی ١٨دا) هەموو هەڵبژاردە سیاسییەکان (ئیلیتەکان) بێ سەرنجدانە پێکهاتەی حکوومەتەکانیان، پاساویان بۆ چالاکیی دەوڵەتەکان بەپێی بەرژەوەندییە نیشتمانیەکان لە بواری سیاسەتی دەرەوەدا هێناوەتەوە. هەرچەندە شیکردنەوەی هێندێک لە سیستەمە سیاسیەکان، لە بواری جموجۆل و پێکهاتەییەوە ئەوەمان بۆ دەردەخا کە لەم سیستەمانەدا بەرژەوەندییەتاکەکەسی و گرووپیەکان و بەسەر بەرژەوەندییە نیشتمانیەکاندا زاڵن.

٢_ چەمکی بەرژەوەندییە نیشتمانیەکان لایەنی ئەخلاقی هەیە، چوونکە هەرکام لە دەوڵەتەکان خوێندنەوەی تایبەتیان لە سەرئەم چەمکە هەیە. واتە ڕەنگە دابینبوونی بەرژەوەندی دەوڵەتی "a" بە زیانی بەرژەوەندییەکانی دەوڵەتی "b" تەواو بێ (ئاکامی یارییەکەش سفر دەبێ).

٣ــ پێوەندییەکی راستەوخۆ لە نێوان چوارچێوەی بەرژەوەندییەگشتیەکان ورادەی توانایی و هێزی دەوڵەتەکاندا هەیە. لەم پرۆسەدا، رەنگە بە چوونە سەری ئاستی تواناییەکانی سیستەم (دەوڵەت)، پێناسەیەکی دیکە لە سەر ئامانجەکان و بەرژەوەندییە گشتیەکان بێتە ئاراوە.

٤ــبەرژەوندییە گشتیەکان بەپێی تایبەتمەندییە پێکهاتەیی و تایبەتمەندیی سیستەمی ئایدۆلۆژی لێک دەدرێنەوە.

بە گشتی، سیاسەتی دەرەوە درێژەی سیاسەتی نێوخۆییە. لە سەر ئەم بنەمایە، تایبەتمەندیی سیستەمی سیاسی لە بواری پێکهاتەیی و جموجۆڵەوە دەتوانێ رۆڵێکی کاریگەر لە چۆنیەتی لێکدانەوەی بەرژەوەندییەکان، ستراتیژییەکان و ئامانجەکاندا بگێرێ.

### *بەرپرسیارەتیی نێودەوڵەتی*

### *International Responsibility*

بریتیە لە ئەرک و بەرپۆسیارەتیەک کە بەپێی یاسا نێودەوڵەتیەکان بەسەر دەوڵەتێک دادەسەپێ، تاوەکوو قەرەبووی ئەو زیانە بکاتەوە کە بە هۆی پێشێل کردنی یاسا نێودەوڵەتیەوکان یان خۆبواردن یان رەچاونەکردنی ئەو ئەرکانە تووشی وڵاتێکی دیکە بووە. بە پێی پێناسەی پرۆفیسۆر بادڤان؛ بەرپرسیارەتیی نێودەوڵەتیی دامەزراوەیەکی یاساییە کە بە پێی ئەم بنەمایە ئەو وڵاتەی کە بە پێچەوانەی یاسا نێودەوڵەتیەکان جووڵاوەتەوە، دەبێ بە پێی ئەم یاسایانە قەرەبووی ئەو زیانانە بکاتەوە کە تووشی وڵاتێکی دیکە بووە.

### *بەرپرسیارەتیی وڵات* — *State Responsibility*

بە ئەرک وبەرپرسیارەتی وڵاتێک دەگوترێ بۆ قەرەبووکردنەوەی ئەو زیانانەی کە بەهۆی کەمتەرخەمی یان جێبەجێنەکردنی بەڵێنەکانی بەپێی یاسا نێودەوڵەتیەکان هاتۆتە ئاراوە. بەرپرسیارەتیی وڵات بریتیە لە کردەوە یان جێبەجێ نەکردنی ئەرکێکی نێودەوڵەتیی کە بۆتە هۆی زیان گەیاندن بە وڵاتی داواکار. ئەگەرچی بەرپرسیارەتیی وڵاتەکان زیاتر سەبارەت بە بەرپرسیارەتیی لە هەمبەر ئەو زیانانە دێ کە لە هاوڵاتیانی بیانی دەکەون، بەڵام سەرەرای ئەمەش لە زۆر بوارەکانی دیکەی جگە لە یاسا نێودەوڵەتیەکانیشدا، بەکەڵکن (بۆ وێنە بنەمای قەدەغە بوونی پەنابردنە بەر هێز لە پێوەندییە نێودەوڵەتیەکاندا). بەرپرسیارەتیی وڵات یان بە هۆی ئەو کردەوانە

سەر هەڵدەدا کە لە ڕێگای نوێنەری وولاتەوە ڕاستەوخۆ دەدرێنە پاڵ ئەو ولاتەوە (بەرپرسیارەیتی سەرەکیی )یان لەو کردەوانە سەرچاوە دەگرێ کە ناراستەوخۆ ئەو ولاتەی تێوەگلێ (بەرپرسیارەیتی سەرەکیی). ئەو کردەوانەی دەبنە هۆی هاتنە ئارای بەرپرسیارەیتی سەرەکیی: کردەوەکانی دەسەڵاتەکانی داد، بەڕێوەبەری و یاسادارشتن لە خۆ دەگرن. بەرپرسیارەیتی ناسەرەکیی بە هۆی ئەو کردەوە نایاساییانەوە دێنە ئاراوە کە لە لایەن کاربەدەستەکانی پلەنزمی حکومەت، یان لە لایەن کەسە ئاساییەکانەوە ئەنجام دەدرێن.

## بەکرێگیراو — *Mercenary*

بە هاوولاتی ولاتێکی سێهەم دەگوترێ؛ کە بە مەبەستی بەشداریکردن لە شەڕی چەکدارانە، لە لایەن ولاتێکی دیکەوە بەکرێ دەگیردرێ. ئەو کەسە تەنیا لەبەر پارە ڕاستەوخۆ لە شەڕی نێوان ئەو دوو ولاتەدا بەشداری دەکا. بەپێی یاسا عورفیە گشتیەکان و ڕێوشوێنەکانی کۆنڤانسیۆنی ژمارە ٤ی ساڵی ١٩٠٧ (و کۆنڤانسیۆنی هاوشێوەی ساڵی ١٨٩٩) وکۆنڤانسیۆنی ژمارە ٢٠ی ژنیف(١٩٤٩)، لەگەڵ بەکرێگیراون و ئەوکەسە بیانیانەش کە بە دڵخوازی خۆیان لە شەڕەکاندا بەشداری دەکەن، وەکوو شۆڕشگێڕەکانی دیکە (ڕێکخراو نارێکخراو) هەڵسوکەوت دەکرێ، بەومەرجەی ڕەچاوی یاسا و عورفی شەڕەکانیان کرد بێ. بەڵام بە پێی پرۆتۆکۆلی ژمارەیەکی (١٩٧٧)، بەکرێگیراو (نەکەسی بیانیی)، بە شۆڕشگێڕ نایەتە ئەژمار و لە کاتی دیل کردندا، یاسای دیلەکانی شەڕ نایگرێتەوە. بەپێی ئەم ڕێککەوتننامەیە، بەکرێگیراو (جگە لەو توخمانەی سەرەوە) دەبێ خاوەنی ئەم تایبەتمەندییانەش بێ:

١_ دەبێ بەڵێنی بەخشیش و خەڵاتی ماددی پێدرابێ و ئەم بەخشیش و خەڵاتە دەبێ زۆرتربێ لەو ڕادەیەی کە بە کەسەخۆمانەکان دەدرێ.

٢_ئەم کەسە نابێ هاوولاتی، نیشتەجێ یان ئەندامی یەکێک لە هێزە چەکدارەکانی لایەنەکانی شەڕی بێ

٣_ نابێ لە لایەن ولاتێکی سێهەمەوە ئەرکی پێ سپێردرابێ کە ببێتە ئەندامی ئەم هێزانە ( بەڵکوو بە دڵخوازی خۆی چووبێ).

**بەرەی یەکگرتووەکان** ***Axis Power***

بە هاوپەیمانەتیی نێوان ئەڵمانیا، ئیتالیا، ژاپۆن و دۆستەکانیان لە ماوەی شەڕ دووهەمی جیهانیدا دەگوترێ.

**بڕوانامە** ***Exequature***

بە بەڵگەی رەسمیی دان پێدانان و پەسندکردنی (هاوتای وەرگرتنی باڵوێزەکان) سەرۆکی ئەرکە کۆنسولیەکان دەگوترێ.

**بە ڕووسی کردن** ***Russification***

بریتیە لە بە رووسی کردنی کولتوور، زمان، داب و نەریتی کۆمەڵگا جیاوازەکانی رووسیا لە سەردەمی پاشایەتیی تەزارەکان و شۆرشی سوور، بۆ پێشگرتن لە ناوچەگەرایی و نەهێشتنی جیاوازی لە نێوان نەتەوەکانی نێو ئیمپراتۆریای رووسیا .

## تیۆری دوو شمشێر

## *The Theory Of Two Swords*

ئەم زاراوەیە بە زنجیرە بیروباوەڕێکی تایبەتی دەگوترێ کە بە قۆناغی باوکانی کەنیسە بەناوبانگەو، دەرئەنجامی هزرو بیروبۆچوونەکانی بیریارانی مەسیحیە.

ئەم تیۆرە جۆرێک لە ڕێکخستن و کۆنترۆڵی دووفاقێتی لە بەرامبەر کۆمەڵگای ئەورووپی و دەوروبەری مەدیتەرانە پێک هێنا، کە بەپێی ئەم تیۆرە، کلیسا بەرژەوەندیەکانی پیاوانی ئایینی دەپاراست، بۆ ئەوەی بتوانن مرۆڤەکان بگەیەننە رزگاری هەتاهەتایی. ئەم ڕێبازە کۆمەڵێک ڕێ و شوێنی تایبەتی گرتەبەر کە جێبەجێکردنیان لە ئەستۆی قەشەکان دابوو. هەروەها پاراستنی ویست و حەزە دنیایەکان و پیادەکردنی تەکوز و دادپەروەری چووە ژێر کۆنترۆڵی دەسەڵاتی حکومەتی وڵات، کە کاربەدەستانی سیاسی و بەڕێوەبەرانی وڵات دەبوایە جێبەجێیان بکردایە.

لە کاتی سەرهەڵدانی هەرکێشەیەک لە نێوان دەسەڵاتی ئایینی و دەسەڵاتی سیاسیدا، دەبوایە مافێک کە خوا بۆ دەسەڵاتەکەی تری لە بەرچاو گرتبوو، بپارێزرایە.

## تائۆئیزم / دائۆئیزم Taoism

ڕێبازێکی فەلسەفە ـ سیاسی و کۆمەڵایەتیە کە سەرچاوەی بنەماکانی ئەم بیروبۆچوونە دەگەڕێتەوە بۆ بەرهەمەکانی لائۆتسە، فەیلەسوفی چینی (٥٠١ـ٦٠٤ب.ز). لائۆتسە لە بەرهەمی بەناوبانگی خۆیدا بە ناوی تائۆتێ چینگ (Tao Tching) لەسەر گرنگی سروشت و بێ بەهابوونی هونەر (پیشەسازی و تەکنیک) پێداگری دەکا. ناوبراو دەڵێ کە مرۆڤ لە سەرەتادا بەختەوەرە، بەڵام لە دەرەنجامی ئەو گۆڕانکارییانەی کە کۆمەڵگا پێکی دێنێ، پەرێشان دەبێ و؛ باشترین ڕێگای بەختەوەری ئەوەیە کە مرۆڤ لە شارستانیەتی ئێستاکە ڕا بکا و پەنا بۆ سروشت بەرێ. چوونکە ئەگەر شتەکان و کاروبارەکان لە جووڵە و گەڕانی سروشتیی خۆیاندا سەربەست بن، بە هاوئاهەنگی و بێ کەم و کورتی دەجوڵێن و درێژە بەمانەوەی خۆیان دەدەن. لە بواری سیاسیەوە، لائۆتسە هەر ئەو واتا هزرییەی خزاندۆتە نێو چوارچێوەی حکومەتەوە و، دەڵێ کە بشێویە کۆمەڵایەتی و سیاسیەکان لە دوو شت سەرچاوە دەگرن:

١ـ ئاڵۆزبوونی دامەزراوە کۆمەڵایەتی و سیاسیەکان

٢ـ زاڵبوون و چەوسانەوەی چینە خوارترەکان لە لایەن چینە باڵادەستەکان. لەو بارەوە دەڵێ:

"خەڵک لە دەست برسیەتی دەناڵێن چوونکە کاربەدەستان باجێکی زۆر لە خەڵک وەردەگرن. چوونکە حکومەت دەست لە کاروباری خەڵک وەردەدا، پاڵەپەستۆ دەخاتە سەرخەڵک".

بیروبرواکانی ڕێبازی تائۆئیزم کاریگەرییان لە سەر بیروبۆچوونەکانی ژان ژاک ڕۆسۆ (پەیمانی کۆمەڵایەتی ) و هێندێک لە ئەگزیستانسیالیستەکان (وەک ئاڵبێر کامۆ) و ڕێبازی ئانارشیزمدا هەبووە.

## تاچێریزم Thatcherism

بە زاراوەیەک دەگوترێ کە لە ناوی مارگارێت تاچێر، سەرۆک وەزیرانی بەریتانیا (٩٠-١٩٧٩) وەرگیراوە. تاچێریزم بیربۆچوون، ڕێبازو شێوازە سیاسیەکانی ناوبراو لە خۆدەگرێ. بەر لە دەسەڵات گەیشتنی تاچێر، بەریتانیا لەگەڵ دابەزینی گەشەی ئابووری، زۆر بوونی بێکاری، ناکارامەیی بازرگانی، دابەزینی ئاستی بەرهەمهێنان، کەمبوونەوەی سەرمایەگوزاری، بەرزبوونەوەی

ئاستی هەڵاوسان و مانگرتن لەبەشە جۆراوجۆرەکانی پیشەسازیدا بەرەوڕوو بوو. ناوبراو بە گرتنەبەری سیاسەتێکی چەند لایەنەی وەک کۆنترۆڵی خستنە ڕووی پارە بۆ کەمکردنەوەی هەڵاوسان، بەتایبەتیکردنی پیشەسازییە دەوڵەتیەکان، کەمکردنەوەی خەرجیەکانی دەوڵەت، کەمکردنەوەی باجەکان و لابردنی گرفتەکانی بەردەم سەرمایەگوزاری لە بەشی تایبەتیدا هەوڵیدا لەگەڵ گرفتەکانی وڵاتەکەیدا شەڕ بکاو لە ناویان بەرێ.

گرتنەبەری ئەم سیاسەتانە لە دوو ساڵی یەکەمی حکومەتەکەی ناوبراودا نارەزایەتیەکی زۆری دروست کرد. ئاستی بێکاری هەروا بەرز بوو، خۆشەویستی ناوبراویش بە نزمترین ئاستی خۆی ( لە سەردەمی "چێمبرلین" ەوە) گەیشت.

زۆربەی خەڵک لەسەر ئەو بڕوایە بوون کە ناوبراو لە خولی داهاتووی هەڵبژاردنەکاندا دەنگەکانی خۆی لەدەست دەدا، بەلام ڕوودانی شەڕی فاڵکەند (کانوونی دووهەمی١٩٨٢) کە بە سەرکەوتنی بەریتانیا کۆتایی هات، تاچێری کرد بە کەسایەتیەکی دژە کۆمۆنیستی و بە "خاتوونی ئاسنین" بەناوبانگ بوو. لە هەڵبژاردنەکانی کانونی دووهەمی ١٩٨٣دا هەڵاوسان بە شێوەیەکی بەرچاو دابەزیبوو، بەلام ئاستی بێکاری هەروا بەرزبوو. تاچێر لە درێژەدان بەو بەرنامە سیاسیانە لە بەرامبەر سۆسیالیستەکان و لە داماڵینی چەکی ناوەکی، مانگرتنی ڕێکخراوە کرێکارییەکان و دەوڵەتانی کۆمەڵەی ئەورووپی سەرکەوتوو بوو. تاچێر درێژەی بە بەرنامەکانی خۆی لە بوارەکانی خۆشگوزەرانیی گشتی، خزمەتگوزاریی تەندروستی و خاوەنداریتی تایبەتی دا.

تاچێریزم دژی سۆسیالیزم و دێریژیزم بوو، بە بڕوای هێندێک لە چاوەدێران، بەرنامەکانی تاچێر، نیشانەی لە پەلەقاژەدابوونی سۆسیالیزم لە بەریتانیادا بوو. بەلام بەو حاڵەش، ئەم هۆکارانە بونە هۆی ئەوی کە تاچێریزم بەرەو تێکشکان خلۆربێتەوە:

زۆر بوونی ڕێژەی سوود بەڕادەی ١٥/٤%؛ بەرزبوونەوەی ئاستی هەڵاوسان بەڕێژەی ٧/٥%و زیاتر؛ گرتنە بەری سیاسەتی خۆتەریک خستنەوە لە بازاڕی هاوبەشی ئەورووپادا؛ گۆڕانکارییەکانی ئەورووپای ڕۆژهەلات؛ دارمانی خزمەتگوزارییە گشتیەکان؛ گەلاڵە توندڕۆکان لە بواری دابینکردنی خزمەتگوزارییە تەندروستیە نیشتمانیەکان و، ڕیفورمە پەروەردەییەکان لە قوتابخانە و زانکۆکاندا کە هیچ دەرەنجامێکیان لێ نەکەوتەوە.

دەرکەوتنی تاچێریزم دەرەنجامی کۆمۆنیزمێکی دەمارگرژ و توندڕۆ بوو کە لەگەڵ لەبەریەک هەڵوەشانەوەی رژێمە کۆمۆنیستەکان و هەروەها کۆتایی شەڕی سارد، تارادەیەکی زۆر فەلسەفەی مانەوە و رەوایی خۆی لەدەست و، رێگای بۆ سەرکەوتنی تۆنی بلێر (سەرۆکی حیزبی کرێکار) خۆش کرد(١٩٩٧).

## تاکتیک Tactics

وشەیەکی یۆنانیە بە واتای "دارشتن و رێکخستن"ە، ئەمرۆکە بە دوو مانا کەڵکی لێ وەردەگیرێ:

١ـ لێوەشاوەیی و هونەری فەرماندەیی لە گۆڕپانی شەڕدا

٢ـ ئەو ئامرازو گەڵاڵە شیاو و بەجێیانە کە بۆ گەیشتن بە ئامانج کەڵکیان لێ وەردەگیردرێ.بۆیە دەتوانین Tactical Conduct بە رێبەرایەتیی لێهاتووانە" پێناسە بکەین و لە واتای یەکەمدا کورتکراوەی وشەی "زانستی شەڕ"ە.

تاکتیک بە پێچەوانەی ستراتیژی، بە هەڵکشان و داکشانی گۆڕانکارییەکان بەستراوەتەوە، بەپێی گۆرانکارییەکان، گۆڕانی بە سەردادێ. واتە بەپێی پێویستی دەگۆڕێ. لەراستیدا، تاکتیک بە بەشێک لە ستراتژی دادەنرێ.

## تاکتیکی سالامی Salami Tactics

ئەو شێوازانەی کە لە رێگایانەوە لایەنێک لە لایەنەکانە پێکهێنەرەکانی هاوپەیمانەتیی دەوڵەتی بە لە نێوبردنی یەکەیەکەی لایەنە بەشدارەکانی نێو هاوپەیمانەتیەکە، دەسەڵات دەخاتە پاوانی خۆیەوە. ئەم تاکتیکە بە شێوەیەکی تایبەتی دوای ساڵی ١٩٤٥ سەبارەت بە وڵاتانی ئەورووپای رۆژهەڵات کەڵکی لێ وەرگیرا. ئەم ناوە لە راپۆرتی راشکاوانەی " ماتیاش راکوشی"، سەرۆکی کۆمۆنیستی هەنگاریا وەرگیراوە کەنیشان دەدا کە زۆرینەی "حیزبی خاوەن سەرمایە بچووکەکان" و حیزبی سۆسیال دێمۆکرات هەرکام بە نۆرەی خۆیان لە نێو دەبران؛ واتە بەو شێوەیە کە سەرەتا باڵی راستی ئەوان و، پاشان ئەندامە ناوەندگەراکانیان لە نێو دەبران، هەتا ئەو رادەیە کە تەنیا هاوکارە نزیکەکانی کۆمۆنیستەکان دەمانەوە.

## Thalweg
## تاڵڤێگ

بە قووڵترین شوێنی رووباردا تێدەپەڕێ. ئەمجۆرە هێڵە بۆ دیاریکردنی سنوور لە رووبارە سنوورییەکانی نێوان وڵاتان دا، شێوازێکی باش و گونجاوە، چوونکە لەم رێگایەوە هەر دوو وڵاتەکە دەتوانن بۆ هاتووچۆی پاپۆڕەکانیان لەو رووبارە کەڵک وەرگرن. ئەوە لە حاڵێک دایە کە ئەگەر سنوورەکە لە نێوەڕاستی رووبارەکە دەستنیشان بکرێ، ئەوا رەنگە بەشە قووڵەکە تەنیا وەبەر لایەنێک بکەوێ و، پاپۆڕەکانی لایەنەکەی تر نەتوانن بەم رووبارە دا هاتووچۆ بکەن.

## Thomism
## تۆمیزم

ئەم زاراوە بۆ "تۆماس ئەکویناس (١٢٧٣_١٢٢٥)، فەیلەسۆفی بە ناوبانگ و یەکێک لە گەورەکانی کلیسای کاتۆلیکی رۆم دەگەڕێتەوە.

ئەم رێبازە پێیوایە کە : مرۆڤ بوونەوەرێکی سیاسی و کۆمەڵایەتیە؛ ئامانجی دەوڵەت پاراستنی بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵگایە؛ سەرچاوەی دەسەڵاتی لە لایەن خواوەیە؛ لە پێوەندیی تاک و دەوڵەت دا، دەوڵەت یان حکومەت نابێ زۆڵم لە خەڵکی خۆی بکاو بیانچەوسێنێتەوە؛ باشترین جۆری حکومەت سیستەمی پاشایەتیە، بەمەرجێک کە یاسا باڵادەست بێ و جێبەجێ بکرێ؛ خەڵک بەگژ حکومەتدا نەچنەوە، کلیسا بەسەر دەوڵەت دا زاڵ بێ، و بڕوا بەوەی کە شەڕ شتێکی ڕەوایەو، ڕەوایی شەڕیش لەسەر بنەمای شەڕی کاتۆلیکی رۆم ڕاوەستاوە. بەڵام درۆ و شکاندنی بەڵێن و پێشێلکردنی بەڵێن و کوشتنی ژن و منداڵ لەشەڕدا قەدەغەیە.

## Theory
## تیۆری

بریتیەلە :

١_ کۆمەڵێک لە بیروبۆچوونە رێ نیشاندەرەکان لە بواری زانیارییەکانی مرۆڤدا.

٢_ روونکردنەوەو شیکردنەوەی زانستیانەی یاساکانی گەشەسەندن لە سرۆشت یان لە کۆمەڵگادا.

## تیۆکراسی
## Teocracy

تیۆرێکی سیاسی و ئاینییەو پێیوایە تەنیا حکومەتی ئایینی، حکومەتێکی رەوایە و یاسای بەجێ و ڕاست، ئەو یاسایەیە کە لەلایەن پێغەمبەرانەوە بە خەڵک ڕاگەیەنراوە و خوا دایرشتووە. بەپێی ئەم تیۆرە، ئاین وسیاسەت لە یەکتر جیا نین و، دەبێ یاساکانی خوا بەسەر خەڵک دا جێبەجێ بکرێن.

## تراستی مێشکەکان
## Brains Trust

ئەم زاراوەیە بەو ئابووریزان و بازرگانە ئەمریکیانە دەگوترا کە راوێژکاری رۆزڤەلت، سەرۆک کۆماری ئەو وڵاتە بوون (١٩٤٥_ ١٨٨٢). ئەو راوێژکارانە ڕۆڵێکی بەرچاویان لە ڕێکخستنی سیاسەتی نیودیلدا (سات وسەودای نوێ)هەبوو.

ئەمرۆکە ئەم زاراوەیە بە شێوەیەکی بەربڵاو بەو تاقمە لە پسپۆڕ و شارەزایانە دەگوترێ کە کاریگەرییەکی حاشاهەڵنەگریان لە دیاریکردنی سیاسەتەکانی دەوڵەتێکدا هەیە.

## *تیرمیدۆر*
## *Thermidor*

لە وشەی یۆنانییThérmé بە واتای گەرما وەرگیراوە. لە رۆژژمێری شۆڕشگێری فەرەنسادا بە یازدەیەمین مانگی ساڵ دەگوترا کە بەپێی رۆژژمێری گریگووری هاوکات بوو لەگەڵ نۆزدەی تەمووز هەتا حەڤدەی مانگی ئاب . ئەم زاراوەیە لە مێژووی شۆڕشی مەزنی فەرەنسادا بە کودەتای نۆیی تیرمیدۆر (٢٧ی تەمووزی ١٧٩٤) دەگوترێ کە کۆتایی بە سەردەمی زەبرو زەنگ و سەرکوتی ژاکۆبینەکان هێناو، بەدوای ئەودا، قۆناغی کۆنەپەرستیی بە ئاشکرای بۆرژوازی لە بەرامبەر چەمکە شۆڕشگێرییەکانی روبیسپەرو چینی کرێکاری پاریس دەستی پێکرد. ترۆتسکی شۆڕشگێری بە ناوبانگی رووسیا ئەم زاراوەی بۆ یەکەم جار لە ساڵی ١٩٠٣ دا بەکارهێنا. ناوبراو لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە، سەپاندنی کۆنترۆڵێکی ناوەندیی توند بەسەر حیزبی دیمۆکراتی رووسیا لە لایەن لنینەوە ڕێگا بۆ تیرمیدۆرە هەلپەرستە سۆسیالیستەکان خۆش دەکا. یەکێک لە بابەتە سەرەکیەکانی هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی پۆست و دەسەڵات لە دەزگای بەڕێوەبەری سۆڤیەتدا

(دوای مردنی لنین ) ئەو مەترسیە بوو کە ترۆتسکی و لایەنگرەکانی بە "تێرمیدۆر"ێکی نوێ ناویان دەبرد؛ واتە خیانەتی دەوڵەتی نوێ و بیرۆکراتیی حیزب بە شۆڕشی رووسیا و چینی کرێکاری رووسیا.

## ترۆتسکیزم Trotskism

ترۆتسکیزم بە تیۆرێک و بزووتنەوەیەک دەگوترێ کە لە لایەن لیئۆن ترۆتسکی (١٨٧٩-١٩٤٠) هاتە ئاراوە و خۆی گرت. ترۆتسکیستەکان بە پشت بەستن بە وانەکانی مارکس، ئەنگێلز و لنین و هەروەها ئەزموونەکانی شۆڕشی رووسیا کە تروتسکی بۆخۆی رۆڵێکی بەرچاوی تێدا هەبوو، خۆیان بە مارکسیە شۆڕشگێڕەکان دەزانن. ئەوان خوازیاری نەهێشتنی سەرمایەداری لە رێگای شۆڕشێکی کرێکارین. لایەنگری لە دیکتاتۆریی پرۆلتاریا دەکەن کە دەبێ رێگای گەیشتن بە کۆمەڵگای سۆسیالیستی خۆش بکا کە لەودا دەسەڵات لە دەستی چینی چەوسێنەردا نەمێنێ و حکومەتی زەحمەتکێش و چەوساوەکان بە شێوەی سیستەمێکی سۆسیالیستیی فرەحیزبی دابمەزرێ؛ دیارە هەر ئەو حیزبانە دەتوانن بە دەسەڵات بگەن کە بروایان بە سۆسیالیزم هەیە. ئەوان ئەگەرچی پێکهاتەی کۆمەڵایەتیی ولاتانی بەرەی رۆژهەڵاتیان قبووڵە، بەڵام سیستەمی بیرۆکراتیانەی ئەوان پرۆتستۆ دەکەن. لەم رووەوە لە ولاتانی رۆژهەڵاتدا، خوازیاری شۆڕشێکی سیاسین کە گۆرانکاریە سۆسیالیستیەکان مسۆگەر بکا.

ترۆتسکی بۆ یەکەمین جار لە ساڵی ١٩٠٦، لە وتارێکدا بە ناوی "شۆڕشی ئێمە"، بۆچوونی خۆی لە بارەی شۆڕشی بەردەوام خستە ڕوو. دواتر، لە دەیەکانی بیست وسی دا، جارێکی تر بە پێداگریەوە بەرگری لە بۆ چوونی خۆی کردو، لەم بەستێنەدا، دیاریکەری ئەو فیکرە بوو کە لە شۆڕشدا کێشە لەسەر رووداوێکی یەکجارەکی نیە، بەڵکوو کێشە لەسەر زنجیرە گورانکاریەکی کۆمەڵایەتی و سیاسی وەک شۆڕشێکی بێ پسانەوەیە کە بۆ شۆڕشێکی کرێکاری _ تەنانەت لە دوورترین شوێندا _ ئەو هەلە پێک دێنێ کە سەربەخۆ لە هێزە بەرهەمهێنەرەکانی خۆی شۆڕش هەڵگیرسێنێ و بەرەوپێشی ببا. چینی کرێکاری شۆڕشگێڕ لە ولاتێکی دواکەوتوودا کاتێک دەتوانێ دەسەڵاتی خۆی بسەپێنێ و کۆمەڵگایەکی سۆسیالیستی دابمەزرێنێ کە ئەم شۆڕشە نەقیزەیەک بێ بۆ شۆڕشی نێونەتەوەیی سۆسیالیستی. سەرکەوتنی چینی کرێکار لە ولاتێکی دواکەوتوودا کاتێک دەتوانێ مسۆگەر بێ کە شۆڕش لە ئاستی نێونەتەوەییدا سەربکەوێ. بەبێ

پشتیوانیی بزووتنەوەی نێونەتەوەیی کرێکاران، گۆڕانکاری سۆسیالیستی ناتوانێ بە سەرکەوتوویی کۆتایی بێ و، کۆمەڵگای سۆسیالیستی دامەزرێ.

لە خاڵی بەرامبەری تیۆری "شۆڕشی بەردەوام"ی ترۆتسکی دا، تیۆری ستالین سەبارەت بە "سۆسیالیزم لە وڵاتێک دا" هەبوو.

لەم پێناوەدا ، ترۆتسکی لە پاییزی ساڵی ١٩٢٣ لە زنجیرە وتارە بە ناوبانگەکانی دا ناوی " ئاراستەی نوێ" دژایەتی خۆی لەگەڵ بیرۆکراتی دەست پێکرد.

ناوبراو هەر لەو ڕۆژانەدا رەخنەی لەوەگرت کە بڕیارەکانی حیزب لە لایەن کادیرە پلە بەرزەکانەوە دەدرێ، ئەوە لە حاڵێک دایە کە ئەندامانی حیزب لە ریزەکانی خوارەوەدا تەنیا لە بڕیارە دەرچووەکان ئاگادار دەکرێنەوە. ناوبراو رەخنەی توندی لە لوت بەرزیی بیرۆکراتیانەی کادیرەکان و دوورکەوتنەوەی لە ڕادەبەدەری ئەو کادیرانە لە خەڵکی ئاسایی دەگرت. ترۆتسکی لە کۆتایی ساڵی ١٩٢٣دا ئاماژەی بەوەکرد کە بیرۆکراتی بە هیچ شێوەیەک جۆرێک لە " بینەوبەرە پێکردن" یان پاشماوەی بارودۆخی رابردوو نیە، بەڵکوو ریچکەیەکی بنەڕەتیە کە دەتوانێ ببێتە هۆی دژە شۆڕشێک. ئەو هەروەها رەخنەی لە مەیینی ئایدۆلۆژی دەکرد کە بە ئەسپایی هەنگاوی دەنا.

ترۆتسکی پێشنیاری کرد کە حیزب دێمۆکراتی بکرێ. چالاکی حیزبی لە سەرەوە بۆ خوارێ و بۆ ریکخراوەکانی خوارەوە بگوازرێتەوە. ترۆتسکی پێیوابوو کە دەستەبەربوونی دێمۆکراسیی نێو حیزبی تەنیا رێگای زاڵبوون بەسەر ورەی چینایەتی کادیرەکانە. دیارە دەبێ یەکگرتوویی حیزب بپارێزرێ، بەڵام لە هەر حاڵدا دەبێ دەرەتانی ئەوە هەبێ کە مرۆڤ بەرگری لە بیروبۆچوونی خۆی بکا و، هەر نەیارێک هەلی دەربڕینی ڕاو بۆچوونەکەی هەبێ، هەرچەندە کە لە کەمینەش دا بێ. ترۆتسکی دەیگووت، لنینیزم پێویستی بە هزری رەخنەگرانە وبوێریی ئایدۆلۆژییانە هەیە.

ترۆتسکی لە کتێبەکەیدا بە ناوی " شۆڕشێک کە خیانەتی پێ کرا" دەڵێ کە: " یەکیەتیی سۆڤیەت وەک وڵاتێکی کرێکاری، ئاکامی شۆڕشی تشرینی یەکەمی ١٩١٧ بوو، بەدەوڵەتیکردنی ئامرازەکانی بەرهەمهێنان بۆتە هۆی گەشەی خێرای ئابووری ئەم وڵاتە. بەڵام لە ژێردەسەڵاتی ستالینیزمدا، دەوڵەت بەتەواوەتی گۆڕاوە. دەوڵەت لە ئامرازێک کە دەبێ لە خزمەتی چینی کرێکار

دابێ، بۆتەئامرازێک بۆ چەوسانەوەی چینی کرێکار؛ بیرۆکراتی بۆتە توێژێکی خاوەن ئیمتیاز کە هەرچی پێی خۆش بێ دەیکا. دەوڵەت لە یەکیەتیی سۆڤیەتدا گۆڕاوە و، رووی ناشیرینی دەوڵەتێکی کرێکاری بە خۆیەوە گرتووە. بنەماکانی دەوڵەتی کرێکاری پارێزراون، بەڵام بیرۆکراتی بۆتە بەربەستێک لە بەردەم گۆڕانکارییە سۆسیالیستیەکاندا. تەنیا شۆڕشێکی سیاسی دەتوانێ بیرۆکراتی لەنێو بەرێ. تەنیا لەم رێگایەوە دەکرێ بنەماکانی سۆسیالیزم بپارێزرێ و، بەر بە گەڕانەوەی سەرمایەداری بگیردرێ".

بە بڕوای ترۆتسکی"، دەبێ پرۆسەی شۆڕشگێری بەدژی نایەکسانی کۆمەڵاتی و سەرکوتی سیاسی بێ. دەبێ سەندیکاکان و کومیتەکانی کارخانەکان سەربەستی خۆیان بەدەست بێننەوە. دەبێ ئیمتیازی تایبەتی نەمێنێ و، پۆستە ئاریستۆکراتیەکانی سۆڤیەت بێ سەروشوێن بکرێن. دەبێ بۆ جارێکی تر ئەنجوومەنەکان (سۆڤیەتەکان) ئۆرگانە جۆراوجۆرەکانی زەحمەتکێشان بن، حیزبە سیاسییەکان _ ئەوانەی بڕوایان بە سۆسیالیزم و هێزو رۆڵی ئەنجوومەنەکان هەیە_ یاسایی بکرێن، دەبێ ئابووری بەپێی پلان بە قازانجی بەرهەمهێنەران و رکاربەران بۆ جارێکی تر رێک بخرێنەوە. دەبێ کۆمیتەی کارخانە مافی چاوەدێریکردنی بەسەر بەرهەمهێناندا هەبێ. کشتوکاڵیی هاوبەش دەبێ لەگەڵ ویستی وەزیرە کەڵخۆزەکاندا بگونجێ و، هەر لەم پێناوەشدا گۆڕانی بەسەر دابێ و دووبارە رێک بخرێتەوە، دەبێ بە هەموو رێوشوێنە سیاسیەکاندا بچنەوەو، ئەوانەی دەنگۆ چەوت و هەڵەکان بڵاو دەکەنەوەو دادگایی بەرواڵەتی پێک دێنن، سزابدرێن. لە سیاسەتی دەرەوەدا، دەبێ خۆبەزلزانی بەرتەسک و ناسیۆنالیستی نەمێنێ و، شوێنی خۆی بدا بە گرۆتینداں بە شۆڕشی جیهانی لە رێگای ناسەربازییەوە.

دەبێ نامە دیپلۆماتیکەکان بڵاو بکرێتەوە، حیزبە کۆمۆنیستەکان دەبێ لە ژێر دەسەڵاتی مۆسکۆ رزگار بن، چوونکە تەنیا ئەو شۆڕشە دەتوانێ بمێنێتەوە کە بە پشت بەستن بە هێزەکانی خۆی سەرکەوتبێ".

جێگای وەبیرهێنانەوەیە کە لە دەیەکانی دواییدا بزووتنەوەی ترۆتسکیستی لە هێندێک بواردا لایەنگرە گەنجەکانی "چەپی نوێ" بۆ لای خۆی راکێشا، کە هۆگرێکیان بە کۆمۆنیزمی لە جۆری سۆڤیەت نەبوو و، خۆشیان لە ماویزمدا نەدەبینیەوە. ترۆتسکیزم لە شۆڕشەکانی مانگی ئایاری ساڵی ١٩٦٨ ی فەرەنسادا رۆڵی گێڕا. لە ئەورووپای رۆژهەڵاتیشدا، بنکەو ناوەندی نایاسایی

ترۆتسکیستی دامەزرابوون (وەک ئەڵتەرناتیڤی چەپی" شۆڕشگێڕ ـ مارکسی " لە بەرامبەر سیستەمی جێگر توودا). بەهەرحاڵ، تاقمی لەمجۆرە لە پۆڵەندا و هەنگاریاش خەریکی چالاکی بوون. "حیزبی شۆڕشگێری سۆسیالیستی " چیکسلۆڤاکیاش بڕوای بە ترۆتسکیزم هەبوو.

**تیرۆر** ***Terror***

لە وشەی لاتینیی Terrere بە مانای ترس و تۆقاندن وەرگیراوە.

ئەم وشەیە لە مێژووی شۆڕشی مەزنی فەڕەنسادا واتایەکی تایبەتی هەیە و دوو مەبەست دەگەیەنێ: یەکەم، بە واتای گرتنەبەری ڕێوشوێن و شێوازی توندو تیژ لە بەرامبەر ئەو کەسانە دایە کە دژی شۆڕش رادەوەستان ( دژە شۆڕش).

دووهەم، ناوی چەند قۆناغ لە مێژووی شۆڕشی فەڕەنسایەکە لەو قۆناغانەدا تیرۆر بەو واتایە کەڵکی لێ وەرگیراوە. دەستپێکی قۆناغی یەکەم لە ١٠ی ئاب هەتا ٢٠ی ئەیلوولی ١٧٩٢ لە خۆ دەگرێ. دوای رووخانی کۆشکی توئیلری و تاکوو پێش لە دامەزرانی کۆنڤانسیۆن، دەسەڵات لە نێوان ئەنجوومەنی بەڕێوەبەریی کاتی و کۆمۆنی شۆڕشگێردا دابەش کرا.

دووهەمین قۆناغ، قۆناغێکە کە ژاکۆبینەکان لەسەر دەسەڵات بوون. ئەم قۆناغە تاکوو ٥ی ئەیلوولی ١٧٩٣ درێژەی کێشا. لەو ماوەیەدا ژاکۆبینەکان چەندین کاریان جێبەجێ کردو، هێندێک یاساشیان پەسند کرد. ئەوان درێژەیان بەسەرکوتی خەڵک و بە توندی لەگەڵ دژی دژە شۆڕشە ئاریستۆکرات و کەڵەکەکارە بۆرژواکان دەجووڵانەوە.

**تیرۆری سوور** ***Red Terror***

ئەم زاراوەیە بە زیندانی کردن یان لە سێدارەدانی نەیارانی دەوڵەتی بولشڤیک دەگوترێ کە دوای شۆڕشی تشرینی یەکەم (١٩١٧)ی رووسیا پەرەی گرت.

**تیرۆری سپی** ***White Terror***

بە بزووتنەوەیەکی دژە شۆڕش و توندوتیژ دەگوترێ کە لە لایەن لایەنگرانی رژێمی پاشایەتی لە دژی نەیارەکانیان لە هەرێمەکانی باشووری رۆژهەڵاتی فەڕەنسادا بەڕێوە دەچوو. ئەم بزووتنەوە نەیارەکانی خۆی بە دزێوترین شێوە دەکوشت. تیرۆری سپی لە مانگی ئایاری ١٧٩٥ لە پاریس رووی دا.

## Terrorism

## تیرۆریزم

چەمکی تیرۆر (Terror) لە ریشەی لاتینیی Terrere بە مانای ترس وتۆقاندن وەرگیراوە. ئەم چەمکە (تیرۆر / Terrur) بۆیەکەمین جار (لە ساڵی ١٧٩٦) لە پێوەلکاوی فەرهەنگی وشەی " فەرهەنگستانی زانستەکانی فەڕەنسا"دا هاتە ئاراوە و، تیرۆریزم بە مانای "رژێم یان سیستەمی تۆقاندن" دادەنێ.

قامووسی فەڕەنسیی رۆبێر (Robert) دوو پێناسە بۆ تیرۆریزم دەخاتە ڕوو:

١ـ پیادە کردنی بەردەوامی توندوتیژی لە پێناوی ئامانجێکی سیاسی و، ئەو کردەوە توندو تیژییانەی کە بۆ گەیشتن بەو ئامانجە جێبەجێ دەبن.

٢ـ ئەو هەڵسوکەوت وکردەوانەی کە نیشانەی پێکەوە هەڵنەکردن و نەسازانن و دەبنە هۆی ترساندن و تۆقاندن.

قامووسی فەڕەنسیی لارووس ( Larousse ) تیرۆریزم بە دوو شێوە وێنا دەکا:

***شێوەی یەکەم)*** کۆی ئەو کردەوە توندوتیژانەی کە رێکخراوێک بە مەبەستی خولقاندنی بشێوی، یان بۆ رووخاندنی دەوڵەتێکی سەقامگرتوو بەڕێوەیان دەبا.

***شێوەی دووهەم)*** سیستەم و شێوازی توندوتیژانەی دەوڵەتێک.

قامووسی زاراوە سیاسییەکانی داڵۆز ( Dalloz) تیرۆریزم بە کردەویەکی سیاسیی توندوتیژانەی تاکەکان یان کەمینە رێکخراوەکان بە دژی ئەو تاکەکەس، دارایی و دامەزراوانە دادەنێ کە بۆ گەیشتن بە ئامانجی وەک، بەدەستهێنانی سەربەخۆیی لە دەوڵەتێک، رووخاندنی رژێمی دەسەلاّتدارو شەڕ لە دژی هێندێک لە لایەنە سیاسیەکانی دەوڵەتێک، بەرێوە دەچن.

قامووسی زاراوە سەربازییەکان (ناوەندی هاوبەشی سوپا و وەزارەتی بەرگری ئەمەریکا ) تیرۆریزم بەم شێوەیە پێناسە دەکا:

" کەڵک وەرگرتنی رێکخراو لە توندوتیژی نایاسایی یان هەرەشەی کەڵک وەرگرتن لە توندوتیژی، بە مەبەستی ترساندن ؛ یان سەرکوت؛ یان تۆقاندنی حکومەتەکان یان کۆمەڵگاکان، لە پێناوی گەیشتن بەو ئامانجانەی کەبە گشتی سیاسی، ئایینی یان ئایدۆلۆژیین".

پێناسەی کۆنگرەی ئەمەریکا لە تیرۆریزم لە یاسایەکدا بە ناوی یاسای "چاوەدێری بەسەر زانیارییەکانی دەرەوە"دا:

١ــ لە چوارچێوەی سەلاحییەتی دادوەری ئەمەریکا دا بێ و، یاساکانی ئەویی پێشێل کردبێ؛
یان

٢ــ لە دەرەوەی سنوورەکانی ئەمریکادا هەڵکەوتبێ؛

٣ــ خاوەنی یەکێک لەو ئامانجانە بێ؛

الف) بەکارهێنانی هەڕەشە و زۆرو هێز بەرامبەر بە خەڵکی سڤیل

ب) بە کارهێنانی هەڕەشە و هێز بەرامبەر بە سیاسەتە دەوڵەتیەکان

ج) هەوڵدان بۆ کاریگەری دانان لەسەرهەڵسوکەوتی دەوڵەت لە ڕێگای مرۆڤ ڕفاندن یان کوشتنی خەڵک.

دەوڵەتی کەنەداش بەپێی گەڵاڵەی ١٦٩ی پەسندکراوی ١٨ی کانوونی یەکەمی ٢٠٠١ پێناسەیەک لە تیرۆر دەخاتە ڕوو. بەپێی پێناسەی نوێ، کردەوەی تیرۆریستی بریتیە لە:

ــ چالاکیەک کە لە نێوخۆ یان لە دەرەوەی کەنەدا بەڕێوە بچێ و دژی کۆنڤانسیۆن و پرۆتۆکۆلە دژە تیرۆریستیەکانی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بێ؛

ــ بە ئامانجی سیاسی، ئایینی و ئایدولۆژیی بەڕێوە چووبێ و، ڕێگای کوشتنی بەئەنقەست، زەربەلیدان و لە مەترسی هاویشتنی بەجیددیی ژیانی کەسێک ترس بنێتەوە، یان دەوڵەت ناچار بە ئەنجامدانی کارێکی ترس هێنەر بکا.

ــ زیانێکی بەرچاو لە سامانی گشتی بدا.

ــ بەهۆی دەستێوەردان یان بشێوی نانەوە لە خزمەتگوزارییە گشتییەکان، ئیمکانات و بناغە پێویستەکان، زیانی کاریگەر لە خەڵک بکەوێ. بۆ جیاکردنەوەی هێندێک لە هەوڵە تیرۆریستیەکان لە ڕوونکردنەوەیکدا ئاماژە بەوە کراوە کە تەنیا دەربڕینی بیروراسیاسی، ئایینی و ئایدۆلۆژییەکان، بە کردەوەی تیرۆریستی دانانرێ، بەڵام ئەگەر بەشێکی چکۆلە لە هەوڵێکی تیرۆریستی گەورەتر بێ، کە بچێتە خانەی تیرۆریزمەوە، بە تیرۆریستی دادەنرێ. هەروەها ئاماژە بەوە کراوە کە لە کارخستنی خزمەتگوزارییە پێویستەکان بە مەبەستی کوشتن یان زیان گەیاندنی بنەرەتیی بە خەڵک بەرێوە نەچووبێ، بە کردەوەی تیرۆریستی دانانرێ.

وەزیرانی دادی یەکیەتیی ئەوروپا تیرۆریزم بەم شێوە پێناسە دەکەن:

- "تیرۆریزم کردەوەیەکە کە ببێتە هۆی پێکهێنانی ئالۆزی، ترساندن و تۆقاندن و؛ پاڵەپەستۆ بخاتە سەر دەوڵەت یان ڕێکخراوێکی نێونەتەوەیی و؛ یان ببێتە هۆی شێواندنی باری سیاسی یان کۆمەڵایەتیی دەوڵەت یان ڕێکخراوێکی نێونەتەوەیی".
- "هەرکردەیەکی تاوانکارانە بە ئامانجی تیرۆر و، هەروەها دامەزراندنی ڕێکخراوە تیرۆریستیەکان دەبێ بە توندترین شێوە سزا بدرێن".
- "بڕیاردەران و پشتیوانانی کردەوەکانی وەک کوشتن، بارمتەگرتن، ڕفاندنی فڕۆکەو هەڵگرتنی چەک بەمەبەستی تیرۆرکردن، هەروەها ئەندامانی ڕێکخراوە تیرۆریستیەکان سزا دەدرێن".

چەند تێبینی سەبارەت بە چەمکە جۆراوجۆرەکان: لە پێناسەکانی پیشوودا کە نوێترین پێناسە، بۆ بەریتانیەکان دەگەڕێتەوە، هۆکاری سیاسی وەک هۆکارو پاڵنەری تیرۆریزم دەستنیشان کراوەو، هەرجۆرە کردەوەیەکی توندوتیژ بەههەر مەبەستێکەوە، پڕۆتستۆکراوە بەڵام هۆکارو پاڵنەرەکانیش لەبەرچاو گیراون. لە هەڵوێستی تازەی یەکیەتیی ئەوروپا و ڕێکخراوی ئاسایش و هاوکاریی ئەوروپادا، هۆکارو پاڵنەر بەگشتی لادراون و، کە لە ڕواڵەتدا وڵامێکی ناڕاستەوخۆ بوو بە هەڵوێستی ڕێکخراوی کۆنفرانسی ئیسلامی سەبارەت بە هۆکارو پاڵنەرەکانی خەباتی فەلەستینیەکان بۆ گەیشتن بە ئازادی و سەربەخۆیی.

بە پێی ماددەی یەکی " کۆنڤانسیۆنی ڕێکخراوی کۆنفرانسی ئیسلامی بۆ بەربەرەکانی لەگەڵ تیرۆریزم "دا، تیرۆریزم بەهەر کردەوەیەکی توندوتیژانە یان هەڕەشە بۆ کەڵک وەرگرتن لەجۆرە کردەوانە دەگوترێ کە ــ بە بێ لەبەر چاو گرتنی ئامانجەکانی بەڕێوەبەرانی ئەم کردەوانە ــ بەمەبەستی ترساندن یان هەڕەشە لە خەڵک بەڕێوە بچێ و، ببێتە هۆی لەمەترسی خستنی گیان یان ئاسایشی ئەوان یان زەربەلێدان لە ژینگە یان لە یەکیک لە دامەزراوەکان یان سامانە تایبەتی گشتیەکان.

دوای قۆناغی تیرۆر و تۆقاندن لە فەڕەنسا (ئەیلوولی ١٧٩٣ هەتا حوزەیرانی ١٧٩٤)، تیرۆریزم بوو بە بەشێک لە زمانی سیاسیی ئەوروپاو، بەپێی تێپەڕ بوونی کات، مانا و ڕۆڵ و ئەرکی جۆراوجۆری بەخۆوە گرت؛ بە شێوەیەک کە هێندێک لە واتاکان دژی یەکتر بوون. بە واتایەکی

تر، ئەو کەسەی لە روانگەی هێندێک کەسەوە بە" تیرۆریست" دادەنرا، لە روانگەی هێندێکی ترەوە "بە تێکۆشەری رێگای ئازادی " سەیر دەکرا، واتە ناودانانەکان پێوەندی بە روانگەو و ئایدۆلۆژیای کەسەکەوە هەبوو، ئەوەی کە لەگەڵ ئەم یان ئەو لایەنی کێشەکەدا دۆستە یان یان دوژمنە.

تایبەتمەندییەکانی تیرۆریزم: تیرۆریزم بەگشتی خاوەنی ئەم تایبەتمەندییانەیە:

١ــتێکەڵ بە توندوتیژییەکی فیزیکی یان جەستەیی بەمەبەستی ترساندن و تۆقاندنە.

٢ــ کتوپڕ ولە ناکاو بەڕێوە دەچێ.

٣ــ ئامانج و پاڵنەرێکی سیاسی لەپشتە.

٤ــ لە کەشێکی دەرەوەی شەڕی رەسمیی نێوان دوو گرووپی نەیاری یەکتر روودەدا.

بەم پێیە کردەوەی بە دوور لە توندوتیژی یان توندوتیژی جەستەیی، ناچێتە چوارچێوەی پێناسەی تیرۆریزم ، بەم شێوەیە، ئەو پێک هەڵپرژانانەی کە زۆرجار بە "تیرۆری کەسایەتی" ناودەبرێن، ناچنە چوارچێوەی تیرۆرەوە.

تایبەتمەندیی دووهەم، تیرۆر لە جۆرەکانی دیکەی توندوتیژییە باوەکانی وەک ئەشکەنجە و لەسێدارەدانی رەسمیی جیا دەکاتەوە؛

هەروەها، هێرشی شەوانە لە شەڕێک دا کەهەم لە ناکاوەو، هەم تووندوتیژی تێدایە، بە کردەیەکی تیرۆریستی ناژمێردرێ چوونکە ئەم کارە لە نێوان دوو گرووپی دژبەیەک و دوژمن و لە شەڕێکی رەسمیدا بەڕێوە دەچێ، هەربۆیە دەبێ لە چوارچێوەی چەمکێکی تر دابنرێ.

تیرۆریزم زیاتر لە کەش و هەل ومەرجێکدا روو دەدا کە دەسەڵات بە شێوەیەکینایەکسانانە دابەش کرابێ. لەم هەلومەرجەدا لایەنێک خاوەنی هێزێکی سیاسی، سەربازی، ئابووری یان کۆمەڵایەتیی زیاترەو، لایەنەکەی تر بۆ قەرەبووکردنەوەی لاوازییەکەی خۆی، پەنا بۆ چەکی تیرۆر دەبا. ئەم دیاردەیە لە وڵاتە سەرەڕۆو دیکتاتۆرەکاندا بە زەقی دەبینرێ. لە وڵاتە دێمۆکراتیکەکانیشدا هێندێک جار کەڵەکە بوونی دەسەڵات لە هێندێک لە بەشەکان و ئۆرگانەکان و گرووپەکانی نێو کۆمەڵگادا بە ئاستێک دەگا کە تاقمە نەیارەکان بۆ دەستەبەرکردنی ئایدیاکانی خۆیان، لە تیرۆر کەڵک وەردەگرن.

بە هۆی ئەوی کە تیرۆریزم لە بنەڕەتدا سەرچاوەیەکی رەوشتی هەیە، پێناسەکردنەکەی کارێکی زۆر دژوارە. چوونکە هێندێک لە پۆلێن بەندییەکانی " توندوتیژی سیاسی" پاساویان بۆ دەهێنرێتەوە و هێندێکی تر بۆ ئەوە نابن کە پاساویان بۆ بێتەوە. بۆ دیاریکردنی چەمکی تیرۆریزم و پێناسەیەکی گشتگیرانە دەبێ پاڵنەرە تاکەکەسییەکان، پێگە کۆمەڵایەتی و ئامانجە سیاسییەکان لەبەرچاو بگیرێن.

هێندێک زۆر بە ئاسانی کردەوەیەک بە تیرۆریستی ناودەبەن و، لە بەرامبەردا هێندێکی دیکە هەمان کردەوە بە هیچ شێوەیەک بە کردەوەیەکی تیرۆریستی نازانن.

رێکخراوی فەتح لە روانگەی هێندێک کەسەوە دامەزراوەیەکی تیرۆریستییە، کە هیچ رەوایەتیەکی نیەو، بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی خۆی کەڵک لە کۆمەڵە شێوازێکی توندوتیژانە و"ناپەسند" وەردەگرێ. بە پێچەوانەوە، ژمارەیەکی تر لە ولاّتان، رێکخراوی ناوبراو بە نوێنەری یاسایی خەڵکی زوڵم لێکراو دەزانن و، کردەوەکانی بەشتێکی پێویست بۆ گەیشتن بە ئامانجە رەواکان دادەنێن.

جۆرەکانی تیرۆریزم: تیرۆریزم شێوازی جۆراوجۆری هەیە کە باوترینیان بریتین لە:

***تیرۆریزمی پێشێلکاری یاسا گشتیەکان (Terrorismede Droit Commune):*** بە تیرۆریزمێک دەگوترێ کە بۆ گەیشتن بە ئامانجێکی دیاریکراو بەرێوە دەچێ وەک، کردەوەکانی مافیا لە ئیتاڵیا و تیرۆریزمی ماددە سڕکەرەکان (نارکۆتیرۆریزم) لە ئەمەریکای لاتیندا، ئەمجۆرە تیرۆریزمە بە هۆی نەبوونی بیروباوەڕێکی تایبەتی دیار، بە دوای ئازادیی کردەیی خۆی لە بەرامبەر دەسەلاّتی سیاسی حاکم دایە.

**تیرۆریزمی مارجینالّی (پەراوێزی) (Marginal Terrorism):** ئەم تیۆرە کە وەبیرهێنەرەوەی تیۆری پارتیزانی گیڤارایە، بەمەبەستی راکێشانی پشتیوانیی جەماوەری بەهۆی کردەوەی تیرۆریستیی وەک دانانەوەی بۆمب، بەڕێوە دەچێ. تاقمەکانی وەک بادێرماینهۆف، فراکسیۆنی سوپای سوور، بریگاردە سوورەکان لەو نموونانەن.

***تیرۆریزمی سیاسی (Political Terrorism):*** تیرۆریزمی سیاسی بریتیە لە بەکارهێنانی سیستماتیکی کوشتن و لە نێوبردن و هەڕەشە بە کوشتن بۆ ترساندنی تاکەکەسەکان،

گرووپەکان، کۆمەڵگاکان و دەوڵەتەکان بەمەبەستی ملکەچ کردنیان لە بەرامبەر ویستی سیاسی تیرۆریستەکاندا.

بەبڕوای ویلکینسۆن (Wilkin Son) تیرۆریزمی سیاسی سێ جۆرە:

١ــ تیرۆریزمی شۆڕشگێڕی

٢ــ تیرۆریزمی نیمچە شۆڕشگێڕی

٣ــ تیرۆریزمی سەرکوتکەر.

تیرۆریزمی شۆڕشگێڕی بریتیە لە بەکارهێنانی سیستماتیکی تاکتیکە توندوتیژە تیرۆریستیەکان بەمەبەستی پێکهێنانی شۆڕشێکی سیاسی. ئەمجۆرە تیرۆریزمە خاوەنی چوار تایبەتمەندی بەر چاوە:

الف) دیاردەیەکی گرووپیە، نەک تاکەکەسی؛ هەرچەندە گرووپەکان زۆر بچووکیش بن.

ب) کەڵک وەرگرتن لە تیرۆر بە هۆی ئایدۆلۆژیا یان پلانێکی شۆڕشگێڕییەوە پاساو هەڵناگرێ.

ج) سەرکردەکانی تیرۆریزمی سیاسی دەتوانن پشتیوانی جەماوەر بۆ پلانەکانی خۆیان رابکێشن.

د) بۆ بەدەستەوەگرتنی دەسەڵات لە دوای سەرکەوتنی شۆڕش، خاوەنی پێکهاتە جێگرتووە ئەڵتەرناتیڤەکانن.

لەم سۆنگەوە کە تیرۆریزمی شۆڕشگێر خوازیاری پێکهاتنی " ئاڵوگۆڕی بنەڕەتیی" لە پێکهاتەی سیاسیی وڵاتێک دایە، نیمچە تیرۆریزم بە ئامانجی کەمتر و بەرتەسکتری وەک ناچار کردنی دەوڵەت بە گۆڕینی هێندێک لە سیاسەتەکانی، هۆشداری دان یان سزادانی هێندێک لە بەرپرسانی دەوڵەتی یان تۆڵەئەستاندنەوە لە هێندێک کارو کردەوەی دەوڵەت قەناعەت دەکا.

تیرۆریزمی سەرکوتکەر بریتیە لە کەڵک وەرگرتنی سیستماتێک لە کردەوەی تیرۆریستی توندوتیژانە بۆ سەرکوت، بێدەنگ کردن، دامرکاندن یان کەمکردنەوەی چالاکی تاقمەکان یان تاکەکەسەکان، یان پێشگیری لەو هەڵسوکەوتە جۆراوجۆرانەی کە بە دڵی دەسەڵاتی سەرکوتکەر نیە. ئەمجۆرە لە تیرۆریزم بە توندی پشت بە دەزگا سیخوورییەکان دەبەستێ و، ئەندامەکانی بۆکردەوە، ئەشکەنجە، کوشتن و فریودان راهێنراون.

***تیرۆریزمی ڕاستی توندڕەو (Extreme –Right Terrorism):*** ئەمجۆرە تیرۆریزمە بە مەبەستی دامەزراندنی سیستەمێکی دیکتاتۆری بەڕێوە دەچێ. وەک ستراتیژیی " تیرۆریزمی ڕەش" لە ئیتاڵیا لە دەیەی ١٩٨٠دا.

***تیرۆریزمی گەریلایی (Guerrilla Terrorism):*** ئەمجۆرە لە پرۆسەی شۆڕشگێری یان شەڕ ڕزگاریدەرەکاندا دەبینرێ کە ئامانج لەم کارە ڕاکێشانی پشتیوانی جەماوەرە. لە ڕەوتە ناشۆڕشگێرەکاندا ئامانج پارمەتی گەیاندن بە بزووتنەوە بەرگرییەکانە، وەک تەقینەوە ئۆردوگاکانی ئەڵمانیای نازی، لە ماوەی شەڕی دووهەمی جیهانیی.

***تیرۆریزمی ئایینی (Religious Terrorism):*** لە تیرۆریزمی سیاسی نزیکە، بەڵام توندوتیژییەکی زیاتری تێدایە. تاقمی تیرۆریستی شین ری کیۆ (Shinri kyo) لە ژاپۆن و، لایەنگرانی هەزارەی زایینی سەربەم جۆرە تیرۆریزمەن.

***تیرۆریزمی دەوڵەتی ( State Terrorism ):*** ئەم چەمکە کە سەرچاوەکەی لە مارکسیزم دایە، نیشاندەری سیاسەتەکانی دەوڵەتە تۆتالیتێرەکانە کە بە پشت بەستن بە پۆلیسی نهێنی و کردەوەی سەرکوتکەرانە، خەریکی بەرەوپێشبردنی ئامانجەکانی خۆیانن.

ئەمرۆکە تیرۆریزمی دەوڵەتی (State – Sponsored Terrorism) بریتیە لە شێوازێک لە تیرۆریزم کە دەوڵەتێک لە ستراتیژی خۆی بۆگەیشتن بە ئامانجەکانی خۆی پشت بە کردەوە تیرۆریستیەکان دەبەستێ. پشتیوانیی سیاسی و ئابووری (ماددی و مەعنەوەی) نموونەی ئەم شێوە تیرۆریزمەن. ئەمجۆرە لە تیرۆریزم کاتێک بەڕێوە دەچێ کە دەوڵەتێک بە پشت بەستن بە هێرشە سەربازییە کلاسیکەکان نەیتوانیوە ئامانجەکانی خۆی بەرەو پێشەوە ببا.

***تیرۆریزمی نێودەوڵەتی (International Terrorism):*** بە هاوکاری بزووتنەوە تیرۆریستیەکانی دەیەی ٦٠ (هاوکاری نێوان رووسیەکان و کوبیەکان) لە سەردەمی شەڕی سارددا لە ڕێگای بەخشینی هاوکاریە ماددی و مەعنەوییەکان بە تاقمە ڕاست و چەپە توندڕەوەکان، دەگوترێ. هاوکاری توندوتۆڵی بادێرماینهۆف و سوپای سوور و، گۆڕینەوەی سرویسە پشتیوانیەکان و "فرەرەگەزکردنی تیرۆریزم "یش بە تیرۆریزمی نێودەوڵەتی دەژمێردرێ.

**تیرۆریزمی ئەنفۆرماتیک ( *Terrorism Informatiquy Computer (Terrorisme***

بە پێکهێنانی ئاڵۆزی لە تۆرە ئەنفۆرماتیکەکانی وڵاتێک دەگوترێ کە بە مەبەستی پاڵەپەستۆ یان شێواندنی دەوڵەتێک بەرێوە دەچێ. ئەم هێرشە دەرئەنجامی خێرای نابێ. تیرۆریزمی ئەنفۆرماتیک ئامانجێکی ستراتیژی و درێژخایەنی هەیە . لەم پێوەندییەدا سێ جۆر هێرشی ئەنفۆرماتیک لە ئارا دایە:

١ــ هەوڵی نێوخۆ؛

٢ــ کەڵک وەرگرتن لەتووندوتیژی بەمەبەستی لێدانی دەرەوەی تەرمیناڵە ئەنفۆرماتیکەکان؛

٣ــ هێرشکردنە سەر تۆرەکان بە هۆی دزەکردنی هۆکارە دەرەکیەکان و لە کارخستنی هاوکاری ئەوان بە هەناردنی ڤایرۆس، پێکهێنانی ترافیکی قورس لە تۆرە پێوەندییەکان و شێوازە هاوشێوەکانی.

تیرۆریستەکان رەنگە بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانیان پەنا بۆ ئەم سێ ڕێگایە بەرن:

١ــ هێرشی جەستەیی بەمەبەستی زەربەلیدان لە کەرەسە ئەنفۆرماتیکەکان لە ڕێگای دانانەوەی بۆمب، سووتاندن و .... هتد.

٢ــ هێرشی جۆری (سین تاکسیک Syntaxique) لە ڕێگای ناردنی ڤایرۆس، وەک ڤایرۆسی ئەسپی ترۆی.

٣ــ هێرشی سیمانتیک (Semantique) بە هۆی شێواندنی پرۆگرام سازی .

**سۆپەر تیرۆریزم (Super Terrorism)**: سۆپەر تیرۆریزم بە کەڵک وەرگرتنی لە رادەبەدەر لە مادده کیمیایی، بایۆلۆجی، رادیۆلۆجی و ناوەکیەکان بە رێوە دەچێ.

مەبەست لە مجۆرە تیرۆریزمە:

١ــ زەبروەشاندنێکی کاریگەر بەمەبەستی بردنە سەری ئاستی زیانی گیانی؛

٢ــ نانەوەی ترسێکی زۆر؛

٣ــ نیشاندانی هێز و توانایی

٤ــ بە دەستهێنانی ئاوانتاژی رووحی

٥_ پێکهێنانی زیانی ئابووری و کۆمەڵایەتی. (بۆ وێنە هەرەشەی گریلاکانی تامیل لە دەوڵەتی سینهالی لە سریلانکاکە رایانگەیاند نەخۆشیەکی نەناسراو بەناو زەویزارەکانی چاندنی چایی ئەو وڵاتەدا بڵاو دەکەنەوە. ئامانجی ئەوان لەو کردەوە پەکخستنی ئابووری ئەو وڵاتە بوو.

تیرۆریزمی بایۆلۆجی (Biological Terrorism): شێوازی جۆراوجۆری هەیە:

١_ دابینکردنی هۆکارێکی بایۆلۆجی لە بانکە میکرۆبیەکان

٢_ دزی لە تاقیگاکان

٣_ چاندنی باکتریا لە رێگای سەرچاوە سروشتیەکان

٤_ کڕینی مادە پیس و مەترسیدارەکان لە رژێمێکی سەرەڕۆ.

**تیرۆریزمی کیمیایی(Chemical Terrorism)**: ئەمجۆرە تیرۆریزمە بەکەڵک وەرگرتن لەو مادە کیمیاییانە بەڕێوە دەچێ.

١_ گازە خنکێنەرەکانی وەک فۆشرین (Phosgene) وکۆلۆرین(Cholorine)

٢_خوێن: سیانید هیدۆژەن و کۆلۆرید سیانۆژەن

٣_ گازی خەردەل

٤_ گازەکانی تابوون (Tabun) و سارین(Sarin)

٥_ (VX) تێکدانی دەمار.

**تیرۆریزمی رادیۆلۆجی (Radiological Terrorism)**: ئەمجۆرە تیرۆریزمە خەڵک لەبەرامبەر سیستەمە کوشندەکانی شەپۆلەکانی رادیۆ ئەکتیڤیتەدا دادەنێ کە لە سیزیۆم_ ١٣ (Cesium)، ئیرریدیۆم_ ١٩٢(Irridium) و کۆبالت_ ٦٠(Cobalt) پێکدێ.

**گەورە تیرۆریزم (Hyper Terrorism)**: لەمجۆرە تیرۆریزمەدا کە ڕووداوی ١١ی ئەیلوولی ٢٠٠١ بە نموونە بەرچاوەکەی دەژمێردرێ، تیرۆریستەکان بە کەڵک وەرگرتن لە فرۆکە نەفرهەڵگرەکان و بە هۆکارو پاڵنەری سیاسی، دەستیان بە کوشتنی مرۆڤەکان بە مەبەستی نانەوەی "ترسێکی گەورە" کرد.

**رێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان و تیرۆریزم**: رێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان هەوڵەکانی خۆی بەمەبەستی پێناسەکردنی تیرۆریزم لە ساڵی ١٩٧٢دا دەست پێکردو، سەرەنجام لە ساڵی ١٩٧٩دا راپۆرتی خۆی بە بێ هیچ جۆرە پێناسەیەک لە تیرۆریزم پێشکەش بە کۆمەڵەی گشتی کرد. ئەم

ڕێکخراوە دوای هەڵسەنگاندنێکی زۆر لەساڵی ١٩٨٩ و بە دەرکردنی بڕیارنامەیەک پێداگری خۆی لەسەر سروشتی بوونی مافی دیاریکردنی چارەنووس و سەربەخۆیی بۆ هەموو ئەو خەڵکانەی کە لە ژێر دەسەڵاتی ڕژێمە داگیرکەرو ڕەگەزپەرست و شێوازەکانی تری دەسەڵاتی بێگانە وداگیرکاریی دەرەکیدا بەسەر دەبەن، ڕاگەیاند و، هەوڵی ئەو خەڵکەی ، بەتایبەتی ئەو بزووتنەوە ڕزگاریخوازانەی کە لەگەڵ ئامانج و پرەنسیپەکانی جاڕنامەی نەتەوەیەکگرتووەکاندا لە ئاراستەیەکدان، بەڕەسمی و ڕەوا دانا. کۆمەڵەی گشتی UN هەموو کاروکردەوەو شێوازە تیرۆرستییەکانی لە هەرشوێنێک لە لایەن هەر کەسێکەوە کە بەڕێوە بچێ پرۆتستۆ کردو، ئەوانی بە تاوانبار زانی.

نەتەوەیەکگرتووەکان لە ماوەی دەرکرنی ئەو بڕیارنامە، تاکوو دەرکردنی بڕیارنامەی ١٣٦٨ (١٢ ئەیلوولی ٢٠٠١) واتە دوای ڕووداوی ١١ی ئەیلوولی ٢٠٠١، هەوڵی زۆری بۆ پرۆتستۆکردنی کردەوە تیرۆریستییەکان، کوشتنی دیپلۆماتەکانی ئێرانی ئەفغانستان و کردەوەکانی تالیبان دا.

**بڕیارنامەی ١٣٦٨:** لە دوای ڕووداوی ١١ی ئەیلوولی ٢٠٠١دا ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیەکگرتووەکان بڕیارنامەی ١٣٦٨ی بە کۆی دەنگ پەسند کرد کە لەودا پێداگری لەسەر "بەڕەسمی ناسینی مافی زاتیی بەرگری ڕەوای تاکەکەسی یان بەکۆیی بەپێی جاڕنامەی نەتەوەیەکگرتووەکان " کراوە. لە ڕاستیدا نەتەوەیەکگرتووەکان بە شێوەیەکی ناڕەسمی داکۆکی لە ڕوانگەی ئەمەریکا و زۆر لە وڵاتانی ڕۆژئاوایی سەبارەت بەوەی کە کردەوە تیرۆریستییەکان بە جۆرێک لە "هێرشی چەکدارانە"، یان "هێرشی سەربازی" دەزانن ، کرد. ناساندنی تیرۆریزم وەک هێرشی چەکدارانە، ڕێگا بە دەوڵەتی قوربانی ئەم کارە دەدا کە بەپێی ماددەی ٥١ی جاڕنامەی نەتەوەیەکگرتووەکان بۆ بەرگریکردن لە خۆی پەنا بۆ هێزی سەربازی ببا.

بڕیارنامەی ١٣٧٣: ئەم بڕیارنامەیە کە بە دەنگی ئەریی هەر ١٥ ئەندامی ئەنجوومەنی ئاسایش پەسند کرا، لە چوارچێوەی بەشی حەوتەمی جاڕنامەدا ڕاگەیەنراو، و ئاماژەی بەوە کردبوو کە "هەموو کردەوە تیرۆریستییە نێودەوڵەتیەکان و بۆوێنە کردەوەی ١١ی ئەیلوول بە هەڕەشەیەک بۆ ئاشتی و ئاسایشی نێو دەوڵەتی دەژمێردرێ".

ئەم بڕیارنامەیە لە بواری بەرفروانی و بەبڵاوییەوە بە گرنگترین بڕیارنامەی ئەنجوومەنی ئاسایش دەژمێردرێ کە سەرچاوە ماڵی و بنەما ئابوورییەکانیش دەکاتە ئامانج و، داوا لە دەوڵەتەکان دەکا

که به لەبەرچاوگرتنی پێوەندییە توندوتۆڵەکانی تیرۆریزمی نێودەوڵەتی لەگەڵ تاوانە داڕێژراوە نێودەوڵەتیەکانی وەک قاچاغی ماددە سڕکەرەکان، پارەی ساختە، قاچاغی نایاسایی چەک وچۆڵ، هەڵگرتن و گواستنەوەی نایاساییانەی ماددە ئەتۆمی، کیمیایی وبیایۆلۆجی و ماددە مەترسیدارەکانی تر، هەوڵەکانی خۆیان بۆ بەربەرەکانی لەگەڵ دیاردەی تیرۆریزمدا ڕێک بخەن.

## تیرۆریزمی کوێر Blind Terrorism

مەبەست لەم جۆرە تیرۆریزمە ئەوەیە کە کۆمەڵە کردەوەیەک بەمەبەستی پروپاگەندە و نانەوەی دەنگ و هەڵایەکی زۆر بە قازانجی تاقم یان بزووتنەوەی ئەنجامدەری ئەم کارەو، ڕاکێشانی ڕای خەڵک بە لای کارێک دا یان ڕاکێشانی پشتیوانی توخمە لەبارو ئامادەکان بۆلای ئەم تاقمە یان بزووتنەوەیە. ئەمجۆرە هێرشانە خاوەنی پلانێکی وردو هەڵسەنگێندراو نین.

## ترۆیکا Troika

زاراوەیەکی ڕووسیە، بەمانای کەژاوەی سێ ئەسپەیەو؛ لە عورفی سیاسی دا بە دامەزراوەیەک دەگوترێ کە هاوکات لە لایان سێ کەسەوە کە بە "سێ کوچکەی دەسەڵات" ناو دەبرێ، بەڕێوە دەچێ.

## تەزار Tsar (Czar)

زاراوەیەکی ڕووسیە بەواتای ئیمپراتۆرە.

تەزار نازناوی ئیڤانی چوارەم بوو کە لەساڵی ١٥٤٧دا لە لایەن ناوبراوەوە کەڵکی لێ وەرگیرا. ئەم نازناوە هاوواتای "ئیمپراتۆری ڕۆمی پیرۆز" بوو کە تاکوو وازهێنان و لە سێدارەدانی نیکۆلای دووهەم لە ڕووسیا (ساڵی ١٩١٧) کەڵکی لێ وەردەگیرا. بە کوڕی گەورەی تەزار دەگوترا تەزارڤیچ و بە هاوسەرەکەی دەگوترا تەزارینا.

## تاک جەمسەری Unipolarity

سیستەمێکە کە جەمسەرێک یان بکەرێکی هەیە کە ئەو بکەرە بە بکەری باڵادەست دەناسێندرێ. لە سیستەمی تاک جەمسەریدا پێویست نیە کە بەهێزترین بکەر دەوڵەت بێ و، لە ڕاستیدا لە بواری مێژووییەوە ئەو سیستەمە تاک جەمسەریانەی کە لە ئارادا بوون، زیاتر ئیمپراتۆرە فرەڕەگەزەکان

بوون. بەپێی گریمانە، هۆکاری بەرتەسکردنەوەی سیستەمی تاک جەمسەری حکومەتێکی جیهانیی دەبێ کە لەودا بەپێی پێناسەی وردە سیستەمەکان (Sub-Systems) هەموو لایەنەک پێرەوی لە پێکهاتەی سیستەمی گشتی دەکەن. لە سیستەمە تاک جەمسەرییەکاندا ئەگەر بکری بالآدەست بتوانێ رێوشوێنێکی توندوتۆڵ و بنەمایی دابڕێژێ کە لە هەموو سیستەمەکەدا پەسند بکرێ، ئەگەری ئەوە هەیە کە بەسەرچاوەی سەقامگرتوویی بژمێردرێن. تەنانەت سیستەمە ئیمپراتۆرییەکانیش لەم بوارەدا ناتوانن تەنیا بە زۆرەملێی درێژە بە دەسەلات و مانەوەی خۆیان بدەن. بکەری بالآدەست رەنگە لە دارشتن و پاراستنی رێوشوێنە بنەماییەکاندا ناچاربێ نرخێکی بەرچاو بدات.

بە کۆتایی سەردەمی شەری سارد لە سیاسەتی جیهانیدا، زۆرجار گوتراوە کە ویلایەتە یەکگرتووەکان تەنیا زلهێزی جیهانەو، ئەم رووداوەش "هەلی تاک جەمسەری بوونی" بۆ ئەمەریکا رەخساندووە، بەلآم سیستەمی تاک جەمسەری تەنیا لە هزروخەیاڵ دا بوونی هەیە.

لیبرالیزمی ئابووری و بەرادەیەکی کەمتریش دیمۆکراسیی بەشداری، ئەمرۆکە تارادەیەک پێگەیەکی گرنگیان بەدەست هێناوە. سەرەرای ئەوەی کە ئەو ئایدیایانە بە هەمان ئاست کە بناغەی چەندلایەنەگەرایی پێک دێنن، رەنگە بە هێزکەری [سیستەمی] تاک جەمسەریش بن.

## تەکنۆکرات Technocrat

بەکەسێک دەگوترێ کە نوێڵی فەرماندەرییەکی کاریگەری بەسەر میکانیزمی دەسەلآتی لەدەست دایە. بە مانایەکی گشتیتر، چ لە چوارچێوەی گشتی و چ لە بواری ئابووریی تایبەتیدا، ئەگەر بیهەوێ دەتوانێ بەبێ سەرنجدان و رەچاوکردنی رێوشوێنەکانی هیرارکیەت، بۆگەیشتن بە ئامانجی دووانەی سەربەخۆیی و بەرپرسایەتی بە مەبەستی بەشداری لە دەسەلآتدا، رەوتی رووداوەکان نەک تەنیا، لە چوارچێوەی خۆی بەڵکوو لە روانگەیەکی بەرفراوانتروگشتیترەوە دیاری بکاو، ئیرادەی خۆی وەگەر بخا.

بە لەبەرچاوگرتنی ئەو گریمانەیە کە هەلومەرجی سەرهەڵدانی تەکنۆکراتەکان بە شێوەیەکی بەرچاو خاوەنی تایبەتمەندییەکی هەمیشەیین و، ئەم گۆرانکارییانەی کە لەم حاڵەتەوە سەرچاوە دەگرن لە

زۆر لە ولآتاندا لە دارەدارە دایە، ئەوان لە پێگەو نفووزی خۆیان بۆ پەرەپێدانی پێگەی فەرماندەری و چاوەدێری و بالآدەستیان بەسەر سەرچاوەکانی ئابووری، سیاسی و تەنانەت کۆمەڵگادا کەڵک وەردەگرن. ئەم کارە وەک پێویستییەک ئەو مانایە ناگەیەنێ کە ئەوان سیستەمی تەکنۆکراتی بە یاساو رێسا وریۆشوێن و ئامانجی روونەوە دانامەزرێنن.

## تەکنۆکراتی Technocracy

تەکنۆکراتی بە حکومەتی تەکنیککاران دەگوترێ. دەبێ ئەمجۆرە حکومەتانە بە بەرهەمی پێشکەوتنی خێرای زانست و تەکنیک لە جیهان دابنرێ، چونکە ئەم پێشکەوتنە بەتەواوەتی کاریگەری لەسەر بیروبۆچوونە سیاسییەکانی کاربەدەستان و وهەڵسوکەوتی سیاسەتڤانان دادەنێ. تیۆری تەکنۆکراتی پێیوایە کە بەسەرنجدان بە پرۆسەی روو لە گەشەی زانست، دەبێ بەرێوەبەران و هەڵسوورێنەرانی کاروباری ولآت لە نێو زانا و خاوەن تەکنیک و شارەزایان هەڵبژێردرێن.

## *تویامارۆکان Tupamaros*

لە ناوی توپاک ئامارۆ، سەرکردەی سەدەی هەژدەی "ئینکا"یەکان وەرگیراوە. زیاتر بەو گریلا شارییانەی ئۆرگۆواو و شۆرشگێرەکانی باڵی چەپ بۆ رفاندنی کەسایەتیە گرنگەکانی دەرەوە و دەستبەسەرکردنیان بە مەبەستی وەرگرتنی پارە، دەگوترێ.

تۆپامارۆکان لە ساڵی ١٩٦٩دا زۆر چالاک بوون، بەلأم لە ساڵی ١٩٧٤ دا سەرکوت کران و لە نێو بران. کۆمەڵێک تاقمی گریلا لە ئەمەریکای لاتیندا و بەتایبەتی لە ئەرژەنتین بە کەڵک وەرگرتن لە تاکتیکەکانی وەک تاکتیکەکانی تۆپامارۆکان چەندین کوشتاری سیاسی جۆراوجۆریان بەرێوە برد.

## *تۆتالیتەر Totalitaire*

زاراوەی تۆتالیتەر لە وشەی لاتینیی Totus بە مانای" "هەموو"، وەرگیراوە.

لەوشەدا بەمانای "گشتگیر" و "هەمەلایەن" بوونە و، لە سیاسەتدا بەو رژێمانە دەگوترێ کە ئەم تایبەتمەندییانەیان هەبێ:

١ــ چاوەدێری دەوڵەت بەسەر هەموو لایەن و کەڵێن وقوژبنە ئابووری وکۆمەلآیەتیەکان.

٢ــقۆرخکردنی دەسەلآتی سیاسی لە لایەن حیزبی دەسەلآتدارەوە.

٣ــ نەهێشتنی هەرجۆرە چاوەدێرییەکی دێمۆکراتیکی کۆمەڵگا

٤ـ پەنابردن بۆ تیرۆر بۆ سەرکوتی هەرجۆرە نەیاری و دژایەتیەک.

٥ـ بالادەستیی تاکەکەسێک لە هەرەمی حیزب و دەوڵەتدا.

٦ـ هەوڵدان بۆ پێکهێنانی کۆمەڵگا بەپێی ئایدۆلۆژیای حیزبی

٧ـ کەڵک وەرگرتن لە هەموو هێزەکانی کۆمەڵگا لە پێناوی ئامانجەکانی حیزب و دەوڵەت و، لە نێوبردنی سەربەخۆیی تاکەکەسی.

### جەماوەر *Mass*

جەماوەر هاوواتای Masse لە زمانی فەرەنسی دایەو، کە لە زاراوەی لاتینی Massa (هەویر و شتی تێکئالاو) وەرگیراوە.

جەماوەر لە زانستە مرۆڤایەتی و کۆمەڵایەتیەکاندا بە جێگیربوونی ژمارەیەکی لە خەڵکێک لە شوێن و ناوچەیەکدا، دەگوترێ. لە واتای گشتیدا بە کۆی سروشتیی بوونەوەرەکان و بەگشتایەتیی کەڵەکەبووی هۆکارکان و ئەم توخمانەی بە چوارچێوەیەک دەژمێردرێن، گوتراوە.

لە جەماوەردا تەنیا سەرنج بە گشتایەتی و چوارچێوەی گشتی دەردێ ، نەک بە بەشەکان و توخمە پێکهێنەرەکانی؛ هەربۆیە جیاوازییەکی زۆری لەگەڵ گرووپدا هەیە.

لە جەماوەردا، زیاتر بیروبۆچوون، حەزەکان وداهێنانە تاکەکەسی و گرووپیەکان یان شێوازە هەڵبژاوەکانی ژیان دەرناکەون، بەڵکوو ئەوانە لە کۆی شێوازەکان و کارو کردەوە و بیروبۆچوونە گشتییەکاندا دەتوێنەوە. لە جەماوەردا وزە و هێزی شاراوە هەیە، تێکەڵاویی لاسەنگی ویژدان و هەڵسو کەوتی ناوشیارانە بەرچاوترەو، بابەتە دژبەیەکەکان شان بە شانی یەکترن.

جەماوەر، گرووپ نیەو، خولقاوی تایبەتمەندی و هاوپێوەندییەکانی ئیرادەی گرووپ و پلەکانی دەروونیی گرووپیش نیە. لەجەماوەردا هەست کردن بە فشار کەمتر، نفووزو کارتێکردن لە جەماوەری خەڵک دا ئاسانترەو، بەئاسانی دەکرێ جەماوەرێکی ناڕازی بکرێ بە جەماوەرێکی رازی.

### تیتۆئیزم *Titoism*

ئەم زاراوەیە بە ڕێبازە سیاسییەکانی مارشال تیتۆ (١٨٩٢-١٩٨٠)ی سەرۆکی یۆگۆسلاڤیا دەگوترێ و، بەگشتی ئایدۆلۆژیایەکی داڕێژراو و روون نیە.

تیتۆئیزم لە دوای شەڕی دووهەمی جیهانی لە یۆگۆسلاڤیا بە سەرکردایەتی«تیتۆ پێکهات.

یۆگۆسلاڤیا بە پێچەوانە ولاتانی دیکەی رۆژهەلات، لە لایەن سوپای سوورەوەئازاد نەکرا، بەلکوو لە لایەن ناسیۆنالیستەکانەوە رزگارکرا، بۆیە ئەم ولاتە هەروا کۆیرکوێرانە پشتیوانی لە سۆڤیەت نەکرد و وەدوای نەکەوت و چەند جارێکیش لە بەرەی سۆسیالیزم دەرکرا. تیتۆ پێوابوو کە دەبێ تەنیا بەو رادەیە کەلک لە سۆسیالیزمی سۆڤیەتی وەربگیرێ کە لەگەڵ بەرژەوەندیەکانی ولاتدا یەک بگریتەوە. تیتۆ بەرەنگاری سیاسەتی بەناو "برایەتی سۆسیالیستی" بۆوە کە بەروالەت هەلەکانی بە شێوەیەکی یەکسان لە نێو براکاندا دابەش دەکردو، لە راستیدا ئامانجی پاراستنی بەرژەوەندیەکانی سۆڤیەت بوو. بەپێی ئەم سیاسەتە، سۆڤیەت پێویستییە پیشەسازییەکانی خۆی بەسەر ولاتانی ئەورووپای رۆژهەلاتدا دەسەپاند. تیتۆئیزم بەو مانایەیە کە یۆگۆسلاڤیا دەتوانێ لە دەرەوەی بەرەی سۆڤیەت و بەبێ چوونە نێو ریزی سەرمایەداریش درێژە بە ژیانی خۆی بدا و، بەبێ ئەوەی کە پشت بە یەکێک لەو بەرانە ببەستێ، سۆسیالیزم بپارێزێ.

### تاوانی سیاسی — *Political Offence*

بەکردەیەکی تاوانکارانە دەگوترێ کە ئامانجەکەی رووخاندنی سیستەمی سیاسی و کۆمەلایەتی و بشێوی نانەوە لە بەڕێوەبردنی ولات و زیان گەیاندن بە دەسەلاتدارانی ولاتە، یان هەر کردەیەکی تاوانکارانەیە کە ئاکامەکەی رووخانی سیستەمی سیاسی و کۆمەلایەتی و زیان گەیاندن بە بەرپرسانی سیاسی و سەرۆکی ولات بێ.

روودانی تاوانی سیاسی وەک روودانی هەر تاوانێکی تر بەدەستەبەر بوونی سێ بناغەی ماددی، یاسایی و مەعنەوی بەستراوەتەوە کە ئەگەر یەکێک لەو سێ بناغەیە دەستەبەر نەبووبێ، کردەوەکە بە تاوان ناژمێردرێ. دەستەبەربوونی بناغەکانی تاوانی سیاسی رەخنەیان دێتەوە سەر، هەربۆیە لەسەر پێناسەی تاوانی سیاسی شک و گومان لە ئارا دایە. گرنگترین رێوشوێن بۆ دەستنیشانکردنی تاوانی سیاسی، رێوشوێنی زەینی و عەینیە.

لەرێوشوێنی زەینیدا کەسی تاوانبار و ئامانجەکەی بە پێوەری کردەکە دادەنرێ، نەک تاوان و ئەو کاریگەرییەی کە لە پاش خۆی بە جێی دێلێ. بەپێی ئەم شێوازە، تاوانی سیاسی ئەوەیە کە تاوانبار کردەکە بە پالنەری سیاسی و بەمەبەستی زەربەلێدان لە دەزگای بەڕێوەبەریی حکومەت

بەڕێوە ببا، هەرچەندە سروشتی کردەکە وەک ئەو تاوانە نەبێ کە زۆرجار بە تاوانی سیاسی ناو دەبرێن.

لە ڕێوشوێنی عەینیدا پێوەری سەرەکی بۆ دەستنیشانکردنی تاوانی سیاسی ئەو دەرئەنجامەیە کە لە دوای تاوان دەمێنێتەوە. ئەگەر تاوانی بەڕێوەچوو زەربە لە سەروەریی وڕێکخستنی حکومەت و ئازادییە گشتیەکان بدا، ئەوا لە چوارچێوەی تاوانی سیاسی دادەنرێ.

### تاوانەکانی شەڕ *Warcrimes*

بە پێشێلکردنی یاسا و عۆرفەکانی شەڕ دەگوترێ کە بەپێی یاسا نێودەوڵەتیەکان بە تاوانی شەڕ دەژمێردرێ. بەپێی ماددەی ٦ی پێرەوپڕۆگرامی دادگا سەربازییە نێودەوڵەتیەکانی ساڵی ١٩٤٥وپێداگریی دووبارەی کۆمیسیۆنی یاسا نێونەتەوەییەکان و کۆمەڵەی گشتیی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ساڵی ١٩٥٠دا ، بەم شێوەیە باس لەو کردەوانە دەکا کە بە تاوانی شەڕ دەژمێردرێن :"کوشتن، هەڵسوکەوتی خراپ یان ڕاگواستنی خەڵکی سڤیل لە شوێنە داگیرکراوەکان، یان بۆ شوێنە داگیرکراوەکان بەمەبەستی کاری زۆرەملێ یان هەر کارێکی تر؛ کوشتن یاهەڵسوکەوتی خراپ لەگەڵ دیلەکانی شەڕ یان هەرکەسێک لە دەریادا؛ کوشتنی بارمتەکان؛ بە تاڵانبردنی سامانە تایبەتی و گشتیەکان؛ خاپوورکردنی دوژمنکارانەی شارەکان، شارۆچکە و گوندەکان یان هەر خاپوورکردنێک  کە بە بیانووی پێویستی سەربازی جێبەجێ دەکرێ. "هەروەها ئەو کردەوانەی تر کە بە تاوانی شەڕ دەژمێردرێن: "کەڵکی خراپ وەرگرتن لە ئالای سپی یان مانگی سوور یان ئاماژەیەکی لەمجۆرە؛ پۆشێنی جلو بەرگی مەدەنی یان جلی دوژمن لەکاتی شەڕدا؛ ژەهرکردنە ناو ئاوی ڕووبارەکان و بیرەکان؛ کوشتنی ئەو دوژمنەی کە چەکەکەی فڕی داوە؛ تیرۆر؛ پێشێلکردنی مافەکانی ئەو کەسەی خۆی بەدەستەوە داوە، پێشێلکردنی "بارودۆخی ئازادیی مەرجدا رو؛ شێواندنی  بەئەنقەستی ئەو دەسکەوتانەی کە  دوژمن لە شەڕ وەدەستی هێناون.

ئەو کردەوە دوژمنکارانەی کە لە لایەن تاقمە میلیشیا تێکدەرەکانەوە(بەمانای ڕەهای خۆی)ەوە بەڕێوە دەچن بە تاوانەکانی شەڕ دەژمێردرێن کە ئەگەر بە شێوەیەکی واقیع بینانە سەیری بکەین تەنیا لەلایەن دادگاکانی دوژمنەوە سزا دەدرێن. سیخووڕی بە تاوانێکی شەڕ ناژمێردرێ.

بەپێی پێناسەی دادگای نۆرێنبێرگ، تاوان لە دژی مرۆڤایەتی (کوشتاری بەکۆمەڵ) بە خراپتر لە تاوانەکانی شەڕ دادەنرێ، چوونکە دەکرێ هەم بەر لەشەر وهەم پاش شەڕ بەڕێوە بچن و، ڕووبەڕووی هەر گرووپ و کۆمەڵێک ببنەوە. ئەم پێناسە بە جۆرێک ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە تاوان لە دژی مرۆڤایەتیش، کە لە کاتی ڕوودان یان لە پێوەندی لەگەڵ شەڕ لە دژی دانیشتوانی دوژمن بەڕێوە دەچن، دەبێ بە بەشێک لە تاوانەکانی شەڕ بژمێردرێ. بەپێی یاسا نێونەتەوەییەکان، بەشداری لە بەڕێوەبردنی تاوانەکانی شەڕیش بە تاوان دەژمێردرێ. کەسێک ناتوانێ بە بیانووی ئەوەی کە بەرپرسیار بووە یان داکۆکی و پارێزگاری لە حکومەت کردووە، پاساو بۆ تاوانەکانی خۆی بێنێتەوە. یان کەسێک کە تاوانی شەری ئەنجام داوە، لە کاتی دادگاییکردندا، ناتوانێ پاساو بۆ تاوانەکەی خۆی بەوە بێنێتەوە کە لە کەسی سەرووتر، بۆوێنە لە سەرۆک حکوومەت یان هەرکەسێکی تر دەستووری وەرگرتووە؛ واتا لە دادگادا ئەم بەڵگەو پاساوانە پەسند ناکرێن. هەرچەندە ڕەنگە لە کەمکردنەوەی سزاداندا ڕۆڵی هەبێ. پێوەری سەرەکی ئەوەیە کە ئایا تاوانبار لە ڕووی هەڵبژاردنێکی وشیارانە ورەوشتییەوە کارەکەی بەڕێوەبردووە یان نا. بە بڕوای زۆربەی یاساناسەکان، تاوانەکانی شەڕو هەروەها تاوان لە دژی مرۆڤایەتی پێوەندی بە تێپەڕ بوونی کاتەوە نیە؛ واتە ناکرێ بە هۆی تێپەڕبوونی کاتەوە بەسەر تاوانێکی شەڕ یان تاوانی لە دژی مرۆڤایەتی چاوپۆشی لە دادگاییکردنی تاوانباران بکرێ یان واز لە تۆمارکردنی سکاڵا لە دژی ئەوان بهێنرێ. ئەم بابەتە بەتایبەتی سەبارەت بە دادگاییکردنی تاوانەکانی شەڕ لە لایەن دەوڵەتانی ئەندامی " کۆنڤانسیۆنی نەگرتنەوەی تێپەڕبوونی کات بەسەرتاوانەکانی دژی مرۆڤایەتی "ی پەسندکراوی کۆمەڵەی گشتیی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ساڵی ١٩٦٨دا، دروستە. ویلایەتەیەکگرتووەکانی ئەمەریکا یەکێک لەو دەوڵەتانە بوو کە دژی پەسندکرانی ئەم کۆنڤانسیۆنە بوو.

### *Crimes Against Peace* — *تاوانەکانی دژی ئاشتی*

تاوانەکانی دژی ئاشتی بریتین لە دارشتنی پلان؛ خۆرێکخستن، دەستپێکردن یان وەرێخستنی شەڕێکی هێرشکارانە؛ یان شەڕێک کە ببێتە هۆی پێشێلکردنی ڕێککەوتننامە یان بەڵێننامە نێونەتەوەییەکان؛ یان بەشداریکردن لەگەڵلایەکی هاوبەش بۆ بەڕێوەبردنی هەرکام لەو

کردەوە ئاماژەپێکراوانە، یان ئەو حاڵانەی کە بەپێی ڕێککەوتنی پاریس (کلۆگ بریان) و بەتایبەتی پیرەوپرۆگرامی Un، ئەو ئەرکە دەخاتە ئەستۆی ئەنجوومەنی ئاسایشی ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووکان کە بە مەبەستی پاراستن و گەڕانەوەی ئاشتی و ئاسایشی نێودەوڵەتیی، لە بەرامبەر هەر جۆرە هەڕەشە یان پێشێلکردنی ئاشتی نێونەتەوەیی یان کردەوەی هێرشکارانە، بڕیاری پێویست دەربکا. تاوانەکانی دژی ئاشتی یەکێک لەو سێ دەستە تاوانانە بوو کە دادگا سەربازییە نێونەتەوەییەکانی تۆکیۆ ونۆرێنبێرگ لە داوای شەڕی دووهەمی جیهانی بڕیاریان دا، لێی بکۆڵنەوە. دادگای نۆرێنبێرگ بەم هەوڵی دەدا کە ئەو پرەنسیپانەی کە لە جاڕنامەدا گونجێنراون، نیشانەی یاسا نێودەوڵەتیەکانی ئەوکاتە بوون کە ئەو دادگایە دامەزراوە. ئەم پرەنسیپانە پێناسەی تاوانەکانی دژی ئاشتی لە خۆ دەگرت. لە ساڵی ١٩٤٦دا، کۆمەڵەی گشتیی ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان بڕیارنامەیەکی پەسند کرد کە پێداگری لەسەر پرەنسیپەکانی یاسا نێونەتەوەییەکان دەکرد. ئەم یاسایانە لە لایەن جاڕنامەی دادگای نۆرێنبێرگ و بڕیاری دادگا بەڕەسمی ناسرا بوون.

ڕەنگە تاوانەکان لە دژی ئاشتی یەکێک لەو سێ دەستە تاوانانەی ناو جاڕنامەی دادگای سەربازیی نێونەتەوەیی بێ. دوو تاقمەکەی تر بریتی بوون لە تاوانەکانی دژی مرۆڤایەتی و تاوانەکانی شەڕ. بەرلە جاڕنامەی نۆرێنبێرگ، پەیمانی نەتەوەیەکگرتووەکان وپەیمانی کلۆگ بریان، شەڕیان جگە لە حاڵەتی بەرگری لە خۆکردن (بەرگریی ڕەوا) قەدەغە کردبوو؛ بەڵام ڕێک ئەم ناوەیان لەسەر دانەنابوو. جارنامەی نەتەوەیەکگرتووەکان پەنابردنی بۆ هێزی قەدەغە کردبوو و، بە نایاسایی دەزانی. بەڵام بە ئاشکرا ناوی تاوانی لەسەر دانەنابوو. بەو حاڵە، پرەنسیپەکانی جاڕنامەی دادگای سەربازی نێونەتەوەیی بە چەندین جار لە لایەن کۆمەڵەی گشتیی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە داکۆکی و پێداگری لە سەر کراوەتەوە، چەند بابەتی گشتی لە پێوەندی لەگەڵ تاوانەکانی دژی ئاشتیدا گرنگییەکی تایبەتیەکان هەیە. یەکەم بابەت ئەوەیە کە ئایا دەکرێ کردەوە هێرشبەرانەکانی هێزە دۆڕاوەکان لە شەڕی دووهەمی جیهانیدا بە پێشێلکردنی یاسا عورفیەکان یان ڕێککەوتنەکانی ئەو سەردەمە بژمێردرێ یان نا؟ لە حاڵێکدا کە ڕێبازێکی فیکریی دیکەحاشا لە قەدەغە بوونی هێرش دەکاو؛ هەروەها بابەتی گشتیی دووهەم واتە ئەوە کە هیچکات لەبارەی پێناسەی هێرشەوە ڕێککەوتنێک لە ئارادانە بووە. ڕەنگە بابەتی یەکەم هیچکات بە شێوەیەکی حەتمی یەکلایی نەکراوەتەوە، بەڵام بابەتی دووهەم بەپێی بڕیارنامەی ١٣١٤ لە ٢٩یەمین دانیشتنی

کۆمەڵەی گشتیی نەتەوەیەکگرتووەکان لە ١٤ی کانوونی یەکەمی ١٩٧٤ وڵام دراوەتەوە. هێرش بەم شێوەیە پێناسە کراوەکە: "پەنابردنی وڵاتێک بۆ هێزی سەربازی لە دژی سەروەری، سەربەخۆیی ویەکپارچەی خاکی وڵاتێکی تر، یان هەر شێوەیەکی تر کە بە پێچەوانەو لە دژی جارنامەی رێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان بێ". پاشان ئەو کردەوانەی کە بە هێرشکارانە دەژمێردرێن، باس دەکرێن. ئەم پێناسەیە گشتگیر نەبووەو، ناتوانێ گشتگیریش بێ. لە ئاکامدا، بەپێی ماددەی ٣٩ی جارنامەی رێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان، سەرچاوەی کۆتایی و یەکلاکەرەوە بۆ دیاریکردنی هێرشبەر، ئەنجوومەنی ئاسایشی رێکخراوەی نەتەوەیەکگرتووەکانە.

## تاڵیبان *Taliban*

تاڵیبان لە گرووپە سیاسی ــ سەربازییەکانی دواکەوتووی توندرۆی ئەفغانستانە کە لە ناوەراستی ساڵی ١٩٩٤ بە هاوکاری راستەخۆی وڵاتانی ناوچە و لەوانە پاکستان، بوونی خۆیان راگەیاند. زۆربەی "تەلەبەکان " (فەقێ کان) لە "قوتابخانە ئایینەکانی" پاکستان دا، لە بواری ئایینی و سەربازییەوە راهێنرابوون.

بە دوای ئەو بشێوی و ئاڵۆزییە سیاسییە کە لە دوای پاشەکشەی هێزەکانی سۆڤیەت کەوتە ئەفغانستانەوە، تاڵیبان توانی بە پشتیوانی ماددی عەرەبستان و یارمەتیە سەربازییەکانی پاکستان لە ئەیلوولی ١٩٩٦دا، کابول بگرێ و نەجیبوڵڵاخان، سەرۆک کۆماری پێشووی ئەم وڵاتە لە گۆرەپانی ئاریانای کابۆل لە سێدارە بدەن.

تاڵیبان لە درێژەی هێرشەکانی خۆیاندا توانیان شاری مەزارشەریف لە مانگی ئابی ١٩٩٨دا داگیر بکەن و هەزاران کەس لە شیعەکانی ئەم وڵاتە بکووژن.

رژێمی تاڵیبان سەرەرای هەوڵە چرەکانی بۆ بەرەسمیی ناسینی نێو دەوڵەتیی، تەنیا لە لایەن پشتیوانەکانیانەوە، واتە ئیماراتی یەکگرتووی عەرەبی، عەرەبستانی سعوودیا و پاکستانەوە بە رەسمی ناسران. تاڵیبان لە دوای ئەوەی دەستی بەسەر ٩٠% لە خاکی ئەفغانستان داگرت، ناوی ئەفغانستانیان بۆ "ئیماراتی ئیسلامی ئەفغانستان گۆری و" مەلامحەممەد عومەر" بەناوی "ئەمیری موسڵمانان" ەوە لەسەر تەختی دەسەڵات دانیشت. سیاسەتە توندرۆکانی نێوخۆو دەرەوەی ئەم

رژێمە شەپۆلێک لە ترسی لە ناوەوە و دەرەوەی ئەفغانستان دا پێکهێنا و ئەو کوشتارەی کە لە دوای داگیرکردنی شارە جیاوازەکان دا دەیانکرد، رق و بێزاری جیهانی لەم رژێمە زیاتر کرد.

لە دوای رووداوی ١١ی ئەیلوولی ٢٠٠١ لە ئەمەریکا، ویلایەتە یەکگرتووکان قامکی تۆمەتیان بۆلای ئوسامەبن لادەن، نەیاری عەرەبستانی سعوودیە راکێشا کە بە پشتیوانی تاڵیبان لە ئەفغانستاندا، هەوڵی پێکهێنانی بنکەی سەربازی و راهێنانی پارتیزانی بۆ هێرشکردنەسەر ئەمەریکا دەدا کە ئەو بەزەبروەشاندن لە بەرژەوەندییەکانی ئەمپریالیسمی دادەنا.

تاڵیبان کە لە بەدەستەوەرانی بن لادن و داخستنی بنکەکانی " القاعدە" خۆی بوارد، کەوتە بەرهەرەشەی ئەمەریکا و لە حەوتی تشرینی یەکەمی ٢٠٠١دا، سوپای ئەمەریکا ناوچە جیاوازەکانی ئەفغانستانی بەموشەکەکانی کرۆز و فرۆکە سەربازییەکانی کوتا و رێگای بۆ نەیارانی تاڵیبان خۆش کرد. لەم نێوەدا، یەکیەتیی باکوور کە لە رێکەوتی ٩ی ئەیلوولدا، ئەحمەد شامەسعوود، رێبەری سیاسی و سەربازی خۆی لە دەست دابوو، توانی بە رێکخستنی هێزەکانی خۆی و پشتیوانی نێو دەوڵەتیی، جارێکی دیکە کابول بگرێتەوە. (تشرینی دووهەمی ٢٠٠١).

تاڵیبان کە جگە لە راکردن چارەیەکیان نەمابوو، شوێنەکانی خۆیان بە جێدەهێشت و رایان دەکرد بۆ چیاکان. ئەو بەشە لە هێزە سەربازییەکانی پاکستان کە نەیاری تاڵیبان بوون، وایان بلاوکردەوە کە تاڵیبان بەرنامەیەک بوو کە لە لایەن بەریتانیاوە دارێژرا بوو، ویلایەتە یەکگرتووکانی ئەمەریکا رێبەرایەتی کرد، عەرەبستانی سعوودیا پشتیوانی ماددی کرد و پاکستان لە نەبووە هێنای بوو، تا بتوانێ بە ئامانجە لەمێژینەکانی خۆی وەکوو هێنانە سەر دەسەلاتی رژێمێکی لایەنگری خۆی لە ئەفغانستان، ناسینی هێڵی سنووری دیوراند و پێکهێنانی قووڵاییەکی ستراتیژیی بگا.

### چینە کۆمەلآیەتیەکان

سەبارەت بە چینە کۆمەلآیەتیەکان پێناسەیەکی گشتگیرو هەمەلایەنە لە ئارادا نیە، چونکە هەر پێناسەیەک بە رژێمێکی کۆمەلآیەتیی تایبەتیەوە بەستراوەتەوە. بۆ تێگەیشتن لە چەمکی چینە کۆمەلآیەتیەکان لە کۆمەڵگا جیاوازەکان دا، پێویستە ئەم چەند خاڵە لەبەرچاو بگرین:

الف_ لەو ولآتانەی کە پیشەسازی نین؛ جیاوازی ئاستی ژیان و پێگەی کۆمەلآیەتی نێوان توێژە کۆمەلآیەتیەکان بە جۆرێکە کە بە تەواوەتیی چینەکان لەیەکتر جیا ناکاتەوە.

ب_ له رۆژئاوا دا باسی" چینه جیاوازه کۆمەلایەتیەکان" لەئارادایه، بەلاّم ئەوان بۆ شیکردنەوەی چینەکان، له چەمکەکانی چینی رووناکبیر، خاوەن کار و دەرەبەگە خاوەن زەوی و زارەکان کەڵک وەرناگرن. به پێچەوانەوە باس له چینی هەژاران، چینی پرۆلتاریا، چینی بۆرژوا و به تایبەتی چینی کرێکار و کەم و زۆر باس له چینەکانی ناوەراست دەکەن.

دەبێ ئەوەمان له بەرچاو بێ که واتای چینی کۆمەلاّیەتیی له زمانی ئاسایی و زمانی مارکسیەکان و هێندێک له کۆمەڵناسان وەکوو یەک وانیه.

١_ له زمانی ئاساییدا، لەرووی حەزو ئیرادەوە، ئەو واقعییەته کۆمەلاّیەتیه تارادەیەک ناروونانه به چینی کۆمەلاّیتی دادەنرێن. بۆ وێنه سەبارەت به داهاتەکان، پێگەی گرووپەکان له هیرەمی کۆمەلاّیتی و رۆڵی گرووپه کۆمەلاّیەتەکانیش به نیسبەت دەسەلاّت و شێوەی ژیان لەم چەمکه کەڵک وەردەگرن.

٢_ له قامووسی مارکسیەکاندا: ئەوکاتەی کەرادەی بەرهەمی هەرکەسێک بەشی بژێوی ژیانی خۆی دەکرد، کۆمەڵگا بەسەر چینەکان دا دابەش نەبیوو. بەلاّم له ئاکامی گەشەکردنی ئامرازەکانی بەرهەم هێناندا، هەرکەسێک دەیتوانی زیاتر له نەمر نەژی بەرهەم بێنێ. بەواتایەکی دیکه جگه له نەمرنەژی، برێک بەرهەمی زیادەش بەرهەم دەهات. بەلاّم ئێستاش ئەو بەرهەمه بەشی خۆشگوزەرانی هەموو کەسەکانی کۆمەڵگای نەدەکرد. لەوکاتەوە چەوسانەوەی مرۆڤ بەدەستی مرۆڤ دەستی پێکرد و پاشان قۆناغی کۆیلایەتی، دەرەبەگیی و لەکۆتاییش دا سەرمایەداری سەری هەڵدا.

له هەموو ئەم قۆناغانەدا، چەوسانەوەی مرۆڤ بەدەستی مرۆڤ و چینی چەوسێنەر و چینه چەوساوه له ئارادایه. کەواته چینی پرۆلتاریا که خاوەنداری هیچ شتێک نەبوو، سەری هەڵدا. پرۆلتاریا دەگاته ئەو وشیارییەی که ئەوه هێزو سامانی ئەوه که گەیشتۆته چینه بالاّ دەستەکان. کەواته خەباتی چینایەتی که له درێژایی مێژوودا هەبووه، گەرم و گوورتر دەبێ. له قۆناغی سەرمایەداریدا دەرەفەتی، زانستی و ئابووری بۆ له ناو بردنی چینەکان دەرەخسێ، چونکه پێشکەوتنه تەکنیکی و زانستیەکان دەبنه هۆی ئەوەی کەبەرهەم هێنان بەرادەی پێویست بێ و پێداویستیەکانی هەموو کەسەکانی کۆمەڵگا به بەرنامەیەکی زانستی کۆمەڵگا دابین دەبێ. کەواته خەبات بۆ

دامەزراندنی کۆمەڵگای بێ چینایەتی دەست پێدەکا، تا لە کۆتاییدا چینی کرێکار بە پێی دیالکتیکی مێژوو سەردەکەوێ.

٣ـ لەمانای کۆمەڵناسەکان دا.

لە نێو کۆمەڵناسەکان دا بە پێی بیرو بۆچوون و ئەو کۆمەڵگایەی کەشی دەکەنەوە، پێناسەی چینی کۆمەڵایەتیی جیاوازی هەیە.بەڵام ئەم پێناسانە کەم و زۆر رەنگ و بۆنێکی ئایدۆلۆژیان بەخۆ گرتووە: لێرەدا ئاماژە بە دوو پێناسە دەکەین:

الف)ـ چینی کۆمەڵایەتی گروپێکی ناو کۆمەڵگایە کە بە یەکەیەکی جوگرافیاییەوە نەبەستراوەتەوە(یانی ئەندامانی ئەم گرووپە لە تەواوی شوێنەکانی وڵات وله ئاستی نێو دەوڵەتیش داهەن). ئەوان ئەم هەست بەوە دەکەن کەلە ژیانیان دا لایەنیکی هاوبەشی ئابووریان پێکەوە هەیە و هەروەها ئەو هەستە هاوبەشەشیان هەیە کە لەگەڵ گرووپێکی دیکە لە کۆمەڵگادا دوژمنن(دوژمنی چینایەتی).

ب)ـ گرۆپێکی کۆمەڵایەتی چالاک و پرجموجۆڵە کە لە هەلومەرجێکی یەکساندا دەژین و هەست بە چارەنووسی هاوبەشی خۆیان دەکەن و بڕواشیان بەوە هەیە کە دەبێ لە کۆمەڵگادا رۆڵیان هەبێ. چینی کۆمەڵایەتی ئەو کات هەست بە بوونی خۆی دەکا کە پێگەو رۆلی خۆی بە نیسبەت کۆمەڵگاوە هەڵدەسەنگێنێ و پێکەوە هەست بە پلەو پێگەی خۆیان دەکەن. چینی کۆمەلایەتیی ئەو کاتە سەر هەڵدەدا کە گرووپێکی کۆمەڵایەتی ـ ئابووری لەگەڵ ئامانجەکانی گرووپێکی دیکە لە کۆمەڵگادا دەکەوێتە دژایەتیەوە و نێوەرۆک و بنەمای رژێمی کۆمەڵایەتی ئێستا دەخاتە بەررەخنە وژێر پرسیارەوە. کاتێک رژێمی کۆمەڵایەتیی لە خزمەتی چینێکی تایبەتی دایە، ئەو گرووپە یان گرووپەکانی دیکە کاتێک هەست بە بەرژەوەندییە هاوبەشەکانیان دەکەن، چینی کۆمەڵایەتی خەباتگێر پێک دێنن و دەسەڵاتی ئێستا و یاساو پێوەندییە کۆمەلایەتیەکانی دەسەڵاتدار دەخەنە بەر رەخنە و بەم شێوە خەباتی چینایەتی دەست پێدەکا. هەموو لە سەر ئەوە کۆکن کە جیاوازی و خەباتی چینایەتی لە ئارادایە، بەڵام هێندێک لە رێبازەکان پێیانوایە، خەباتی چینایەتی لە سروشتی کۆمەڵگای دابەشبوو بە سەر چینەکان دا سەرچاوەی گرتووە و هەتا هاتنەئارای کۆمەڵگای بێ چین درێژە دەکێشێ. یانی دەبێ لە کۆتاییدا زۆرینەی گەورەی بەرهەم هێنەکان، گرووپ یان چینە مشەخۆرە چکۆلەکان لە

ناوبەن تا کۆمەڵگای بێ چین و خەباتی چینایەتی پێک بێ. بەڵام هێندیکی دیکە پێیانوایە کە خەباتی چینایەتی ئاکامی سروشتی کۆمەڵگا نیە . کەواتە ئاشتی لە نێوان چینە دەسەڵاتدارو بێ دەسەڵاتەکان وچینە چەوسێنەرو چەوساوەکان، بە کەمکردنەوەی پلەی چەوسانەوە پێک دێ.

### Individuaism — تاک گەریتی

تاک گەریتی بەمانای بایەخدان بە تاک لە بەرامبەر کۆدایە. ئەم ڕێبازە بڕوای بە گرنگیی و بایەخی تاک لە بەرامبەر کۆ دا هەیە.

فەلسەفەکانی ئەگزیستانسیالیزم، پڕاگماتیزم و پێسۆلیزم هەموویان لە سەر بنەمای فەلسەفەی تاک گەریتی داوەستاون.

### Eclectism — تێکەڵ پێکەڵ

بە لێکدان و تێکەڵاوکردنی نابەجێی چەند بیروبۆچوون و تیۆری لێک جیاواز دەگوترێ کە هیچ فڕێکیان بەسەر یەکترەوە نیە.

### Conventional Rrtaliation — تۆڵەی ئاسایی

پێشنیارێک بوو کە لە ساڵی ١٩٨٣دا لە لایەن سامۆئێل هانتینگتۆنەوە ئاراستە کرا. بەپێی ئەم تیۆرە، گەلاڵەی هێرشی پێشگیرانە بە چەکە ئاساییەکان لە دژی ئەورووپای ڕۆژهەڵات بە جێگای" وەڵامی نەرم" پێشنیار کرا بوو.

### Massive Retaliation — تۆڵەی هەمەلایەنە

ئەو زاراوەیە کە لە دوای شەڕی کۆریا لە لایەن حکومەتی ئایزنهاڤێر بۆ بەربەرەکانی لەگەڵ هەڕەشەی کۆمۆنیزمدا کەڵکی لێ وەرگیرا، بریتی بوو لەوەی کە ئەمەریکا لە پێشەوە مافی تۆڵەی هەمەلایەنەی بۆ خۆی لە هەرکات و شوێنێک کە بەرژەوەندییەکانی خەڵکی ئەمەریکا بخوازێ، دەپارێزێ و، ئەم کارەش تەنیا بە هێرش بۆ سەر ئەو شوێنەی کە هێرشی دەکرێتە سەر، بەرتەسک نابێتەوە. ئەمەریکا و سۆڤیەت هەردووکیان دەزانن کە هیچکامیان ناتوانن لە "زەبری یەکەم" دا یەکتر لە نێو بەرن و، و لایەنی بەرامبەر دەتوانێ لە "تۆڵەی هەمەلایەنە" کەڵک وەرگرێ. لە دەیەی پەنجادا پیادەکردنی ئەم سیاسەتە لە لایەن ئەمەریکاوە، چەندین جار هەردوو زلهێزەکانی ــ ئەمەریکا و سۆڤیەتــ تاکوو لێواری شەڕ برد. دروستکردنی موشەکە ناوەکیە دوور هاوێژەکان لە لایەن سۆڤیەتەوە، بایەخی تێزی " تۆڵەی هەمەلایەنە"ی ئەمریکا خستە ژێر پرسیارەوە.

سیاسەتی حکومەتەکانی کەنێدی و جۆنسۆن لەسەر ئەو ڕێبازە سیاسیە ڕاوەستا بوو کە لەگەڵ سەرهەڵدانی شەڕدا، لە هەموو هێزەکانی خۆیان هەتا ئەو پەڕی توانا بۆ پێشگیری لە پەرەگرتنی شەڕ یان کۆتایی هێنان بە شەڕ لە ناوچەکەدا کەڵک وەرگرن.

### تۆری ئینتلیجێنس *Intelligence Service*

ناوی ڕێکخراوی سیخووڕی بەریتانیایە کە ڕێکخستنەکانی ئەم ڕێکخراوە لە ناوەندی لەندەن لە سەدەی شازدەهەم (ساڵی ١٥٧٣) لە لایەن یەکێک لە وەزیرانی حکومەتی پاشایەتیی، شاژن ئەلیزابێتی یەکەم بە ناوی " فرانسێس ڤاتینگهام" کە ڕاوێژکاری سیاسی ناوبراویش بوو، دامەزرا.

ڕێکخراوی سیخووڕیی بەریتانیا لە بنەڕەتدا، خاوەنی ٦ بەڕێوەبەرییە کە بریتین لە:

١ــ بەڕێوەبەریی هەواڵگریی سیاسی دەرەوە.

٢ــ بەڕێوەبەریی هەواڵگریی دەریایی.

٣ــ بەڕێوەبەریی هەواڵگریی سەربازی.

٤ــ بەڕێوەبەریی هەواڵگریی بازرگانی و پیشەسازی.

٥ــ بەڕێوەبەریی هەواڵگریی نێوخۆیی.

٦ــ بەڕێوەبەریی هەواڵگریی کۆلۆنیەکان.

سەرکەوتنی ڕێکخراوی سیخووڕی بەریتانیا و هێژمۆنی تەکتیکەکانی ئەم ڕیکخراوە بە سەر ڕێکخراوە سیخووڕەییەکانی جیهاندا تەنیا بۆ تەمەنی دوورو درێژو ئەزموونەکانی ناگەڕێتەوە، بەڵکوو هەموو شاکان و سەرۆکەکانی دەوڵەتی بەریتانیا پێشتیوانیان لە توندتر بوون و بەرفراوانبوونی مەودای چالاکیەکانی ئەوڕێکخراوە دەکرد.

### تیۆری یاری *Game Theory*

ئەم تیۆرە لە سەربنەمای جۆرێک بەڵگەوتەی ئابستراکت، کە ئاکامی لێکدانی بیرکاری و لۆژیکە، ڕاوەستاوە. زۆربەی هەرە زۆری دارێژەرانی تیۆری یارییەکان لەسەر ئەو بڕوایەن کە ئاراستەی ئەم ئەو هەڵسوکەوتانە نین کەکەسەکان لە کاتی شەڕو کێشەدا دەیانکەن، بەڵکوو ئاماژە بەو هەڵسووکەوتە "عەقڵانیە بەجێ" یانەی حاڵەتی شەڕ و کێشەکان دەکەن کە لایەنەکانی شەڕەکە

هەوڵ دەدەن شەڕەکە ببەنەوە. مرۆڤەکان لە کاتی شەڕو ناکۆکیدا، بە شێوەی ناعەقلانی دەجوولێنەوە و هەڵدەچن و تووڕە دەبن

### تیۆری سێ جیهان Three World Theory

بەپێی ئەم تیۆرە ماو، دونیای ئێستاکە بە سەرسێ جیهاندا دابەش دەبێ:

١ـ دوو زلهێزی ئەمەریکا و سۆڤیەت کە ئەمەریکا ئەمپریالیست و سۆڤیەتیش سۆسیال ئەمپریالیستە.

٢ـ وڵاتانی پێشکەوتووی سەرمایەداری وەکوو بەریتانیا، ئەڵمانیا، ژاپۆن و وڵاتانی تری سۆسیالیستی.

٣ـ وڵاتانی هەژار و پەرەنە گرتوو. بەڕای ماو جیهانی سێهەم دەبێ لە دژی جیهانی یەکەم لەگەڵ جیهانی دووهەمدا یەک بگرێ.

### تەوەری بەرلین ـ رۆم Berlin – Rome Axisc

ئەم زاراوە ئاماژە بە روانگە و خوێندنەوەی نازی ـ فاشیستی سەبارەت بە کێشە نێودەوڵەتیەکان دەکا کە لە دوای مۆرکردنی پرۆتۆکۆلی تشرینی یەکەم لە لایەن موسۆلینەوە هاتە ئاراوە (تشرینی یەکەمیی ١٩٣٦). ئەڵمانیا و ئیتالیا بە پێی ئەم پرۆتۆکۆلە بەڵێنیان دا کە لە بەرامبەر دەوڵەتیی کۆماری ئیسپانیا و بەگشتی لەگەڵ کۆمۆنیزمی جیهانیدا بەرەنگاری بکەن. ئەم شتە بە واتایەکی روونتر لە " رێککەوتننامەی پۆلا"ی نێوان ئیتالیا و ئەڵمانیا (١٩٣٩) ئاماژەی پێکرا بوو. ئەو دەوڵەتانەی کە ئەم رێککەوتننامەیان مۆر کردبوو بەڵێنیان دا کە لە کاتی سەرهەڵدانی شەڕدا، هاوکاری یەکتر بکەن. تەوەری بەرلین ـرۆم بە بوونە ئەندامی ژاپۆن کە ئەندامی رێککەوتنی بەرەنگاری لەگەڵ کۆمۆنیزمی جیهانیشدا بوو (تشرینی دووهەمی ١٩٣٦ ) پەرەی گرت و یەکیەتیی سێ کوچکە پێکهات (ئەیلوولی ١٩٤٠). سۆڤیەت لە رابردوودا نە بیووە ئەندامی ئەم رێککەوتننامەیە.

### تەوەری شەڕ Axis Of Eril

جۆرج ـWـ بۆش لەوتارێکدا لە کۆبوونەوەی هاوبەشی کۆنگرەو سەنای ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە کانوونی دووهەمی ٢٠٠٢دا، ئاماژەی بە وڵاتانی ئێران، عێراق و

کۆریای باکوور کرد کە ئەمەریکا ئەم دەوڵەتانەی بە هەبوونی چەک و چۆلی کوشتاری بەکۆمەل تاوانبار کرد.

### تابووری پێنجەم Fifth Coloumn

بەو دەستە شاراوە نێوخۆییانە دەگوترێ کەدەستیان لەگەڵ دوژمن دا تێکەڵ کردووە و لەو دیوی بەرەی شەڕەوە خەریکی کاری تێکدرانەن. ئەم زاراوەیە یەکەمجار لەکاتی شەڕە نێوخۆییەکانی ئیسپانیا لە ساڵەکانی ١٩٣٩-١٩٣٦ دا هاتە ئاراوە. لەم کاتەدا ژەنەراڵ فەرەنکۆ بە پشتیوانی هێزەکانی ئەڵمانیا و ئیتالیا لە دژی خەڵکی ئیسپانیا و دەوڵەتی کۆماریی تازە دامەزراودا شەڕی دەکرد. ژەنەراڵ مۆلی، یەکێک لە فەرماندەکانی سوپای فرەنکۆ بە چوار لە شکری سوپاوە بەرەو مەدرید وەڕێکەوت تاکۆماریخوازەکان تێک شکێنێ. لەم کاتەدا رایگەیاند کە لەمن لەشکری " تابوورێک"ی پێنجەمم لە ناو مەدریدا هەیە. مەبەستی ئەو لە تابووری پێنجەم، ئەو خائینانە بوون کە لە ناو شاردا لە دژی خەڵک و بە قازانجی دوژمن کاریان دەکرد. زاراوەی تابووری پێنجەم ئەمرۆکە بە خائین و دەست وپێوەندەکانی دوژمن لە ناو حیزبێک، یان رێکخراوێک یان وڵاتێک دا دەگوترێ.

## پلانی ستراتیژی *Strategic Planninig*

پلانی درێژماوە لە دوو توخمی سەرەکی پێک دێ:

پلانی ستراتژیی و پلانی تاکتیکی.

پلانی ستراتژیی :

١ــ لە ئاستێکی بالاّتر لە بەڕێوەبەریدا رادەوەستێ و، تەنیا سەبارەت بە بڕیارەکان لە ئاستی بەڕێوەبەری دایە.

٢ــ بۆ دابینکردنی ئامانجە سەرکیەکانی یەکەی ئابووری و ڕێکخستنی سەرچاوە پێویستەکان بۆ گەیشتن بەو ئامانجانە هەنگاو دەنێ.

٣ــ پێوەندی بە بڕیارە کورت خایەن و درێژخایەنەکان هەیەو، پێ لە سەر بڕیارە درێژخایەنەکان دادەگرێ. بەبێ ئەوی کە تەنیا بایەخ بەو لایەنە بدا.

٤ــ سەرجەم سەبارەت بە نرخی یەکەی ئابووری کەڵکی لێ وەردەگیردرێ.

٥ــ چالاکیەکی بەردەوام (وەکوو رەوتێک) و چالاکیەکی نارێکخراو (وەکوو نێوەڕۆک).

٦ــ زیاتر پێویستی بەو زانیارییانە هەیە کە لە دەرەوەی چوارچێوەیەی ئەم یەکەیەدا بەدەست دێ.

## پلانی تاکتیکی — Tactical Planning

ئەم پلانە بۆ جێبەجێکردنی ئەو پلانە ستراتیژییانەیە کە:

١ـ لە چوارچێوەی پلانە ستراتژیکەکان وەرێ دەخرێن.

٢ـ تەرخانکردنی عەقلانیی سەرچاوەکان لە پرۆسەیەکی تێروتەسەل دا.

٣ـ لە قۆناغە کورت خایەنەکان دا بەرینترە (یەک مانگە، سێ مانگە، یەک ساڵە)

٤ـ لە هەموو خزمەتگوزارییەکانی پلانە ستراتیژییەکاندا هاوبەشە.

٥ـ لەسەر بنەمای ڕێژەیی و ژمارەیەکە لە یەکەیەکی ئابووریدا کۆ بۆتەوە.

٦ـ چاوەڕوانی ئەوەی هەیەکە کەسانێکی زۆر لە ئامادەکردنی پلانە تاکتیکیەکاندا بەشداری بکەن.

٧ـ بە بەراورد لەگەڵ پلانی ستراتیژیدا ئاسایی تر و دواکەوتووترە.

## پاتت لاو — Pathet Lao

ناوی بزووتنەوەی کۆمۆنیستیی لائۆسە. ئەم وڵاتە لە نێوان ساڵەکانی ١٩٥٤ هەتا ١٩٧٣ گیرۆدەی شەڕی نێوخۆی لە نێوان رژێمی پاشایەتی، هێزەکانی لایەنگری ئەمەریکا و هێزەکانی پاتت لاو بە سەرکردایەتیی شازادەی پێشوو سووفانۆڕۆنگ بوو. هێزەکانی پاتت لاو توانیان هەتا شوباتی ١٩٧٣ بەشێکی گەورە لە وڵات بکێشنە ژێر رکێفی خۆیان. ئاگر بەستێک لە نێوان هێزەکانی دوو لایەندا مۆر کراو، لە مانگی ئەیلوولدا دەوڵەتێکی هاوبەشیان پێکهێنا کە لە پاشایەتیی خوازان و کۆمۆنیستەکان، پێکهاتبوو و، دەسەڵاتی وڵاتەکەیان بەدەستەوە گرت. بەهەرحاڵ، سەرکەوتنی کۆمۆنیستەکان لە ڤێتنام (١٩٧٥) بوو بە هۆی سەرکەوتنی رەهای هێزەکانی پاتت لاو لە لائۆس و، لە ڕێکەوتی دووی کانوونی یەکەمی ١٩٧٥دا رژێمی پاشایەتی بە تەواوەتی لەوڵاتدا بەهەڵوەشاوە ڕاگەیەنراو، بە جێگای ئەو رژێمە، کۆماری دیمۆکراتیکی گەلی لائۆس دامەزرا.

### Patrimonialism پاتریمۆنیالیزم / دەسەڵاتی بەرەبابی

ئەم زاراوەیە لە لایەن ماکس ڤیبەر، کۆمەڵناسی ئەڵمانی داهێنراوە. پاتریمۆنی لە وشەی Paterی لاتینی واتە باوک وەرگیراوەو، بریتیە لەو ملک و سامانەی کە لە باب و باپیرانەوە بە میرات گەیشتبێ. ڤیبەر پاتریمۆنیالیزم بە جۆرێک لە حکومەت دەزانێ کە دەسەڵاتدارەکەی، وەک مولکی تایبەتی خۆی سەیری حکومەت دەکا.

مەبەستی سەرەکی لە دامەزراندنی ئەمجۆرە حکوومەتە، دابینکردنی پێداویستیەکانی بنەماڵە یان خێزانی دەسەڵاتدارە. کاربەدەستانی دەوڵەت هەموویان لەراستیدا نۆکەران و نوێنەرانی دەسەڵاتدارن.

### Parallelism پاڕالیلزم

گریمانەی پاڕالیلزم ناوی بەشێک لە فەلسەفەی ئەفلاتۆنە، لە ژێر ناوی چینە کۆمەڵایەتیەکان یان سێ رۆحەکە کە لە کتێبی " کۆماری"ی ناوبراودا، ئاماژەی پێکراوە.ئەفلاتۆن کۆمەڵ لە سەربنەمای دابینکردنی سێ پێداویستی (دابینکردنی پێویستیەکانی جەستەیی مرۆڤ، پاراستنی کۆمەڵگا و دەسەڵاتکردن بەسەر وڵاتدا) دابەش دەکاو، هاوسەنگیەک لە نێوان توانایی و لێهاتوویی تاکەکەسەکان لەگەڵ چینە کۆمەڵایەتیەکان هاوسەنگیەک دادەنێ.

### Partocrac پارتۆکراسی / حیزب سالاری

پارتۆکراسی زاراوەیەکە کە بە دەسەڵاتدارەتیی حیزبەکان و، بە باوەڕی کۆمۆنیستیەکان بە "دیمۆکراسیی حیزبی " دەگوترێ کە لە سەدەی بیستەمدا لە دوای شۆڕشی کۆمۆنیستی هاتە ئاراوە.

لە سیستەمی پارتۆکراسیدا شێوازەکانی حکومەتی تاکەکەسی، دەسەڵاتدارەتیی ریبەرانی حیزبی و دەسەڵاتدارەتیی حیزب یاندەسەڵاتدارەتیی "چینی نوێ" لە کۆمەڵگا دادەمەزرێ.

### Partisan پارتیزان

ئەم زاراوەیە لە راستیدا بەو بەشە لە خەڵکی رووسیا دەگوترا کە لە ماوەی هێرشی ناپلیۆن، ئیمپراتۆری فەرەنسا بۆ سەر رووسیا، هێرشیان دەکردە سەر هێڵەکانی لۆجستیکی فەرەنسا (١٨١٢). ئەمرۆکە ئەم زاراوەیە بەو گرووپە چەکدارانە دەگوترێ کە لە پشتی هێڵەکانی دوژمنەوە هێرشی دەبەنە سەر دوژمن و، یەکەی بەرگری پێک دێنن.

لە شەڕی دووهەمی جیهانیدا زاراوەی پارتیزان بە چەند تاقم لە گرووپەکانی چەپ دەگوترا کە بە پێی دەستووری ستالین لەو شوێنانەی کە لە لایەن ئەڵمانیەکانەوە داگیر کرابوو، هێرشیان دەکردە سەر ئەڵمانیەکان (٤٢_١٩٤١). هەر لەو کاتەدا پارتیزانە کۆمۆنیستەکان لە ئەڵبانیا، سلۆڤاکیا و یۆنانیشدا لە دەوری یەک کۆبوونەوە. پارتیزانە کۆمۆنیستەکان لە یۆگوسلاڤیا بە سەرکردایەتی مارشاڵ تیتۆ لە کانوونی دووهەمی ١٩٤١ دامەزران و،بەم شێوەیە لە چینیەکان جیا کرانەوە. پارتیزانە کۆمۆنیستەکان لەو شوێنانەی کە لە لایەن سوپای ئەڵمانیاوە داگیر کرابوون هاوکارییەکی بەرچاو و کاریگەرییان لە گەڵ سوپای سووردا دەکرد.

### Parliament پەرلەمان

پەرلەمان ئەو واتایانە لەخۆ دەگرێ:

١_ئەو کۆڕو ناوەندە رسمیانەی کە سەلاحییەتی دەرکردنی بریارێکیان هەبێ و، ئەرکی سەرەکیان تاوتوێکردن و پەسندکردنی یاسا و بوودجەیە.

٢_ بەواتای ئەنجوومەنە.

### Long Parliament پەرلەمانی درێژماوە

لە مێژووی بەریتانیادا بە ئەنجوومەنێک دەگوترێ کە ماوەکەی لە ٣ی تشرینی دووهەمی ١٦٤٠ هەتا ١٦ی مارتی ١٦٦٠ درێژەی کێشا.

## Short Parlament
## پەرلەمانی کورت ماوە

ئەم زاراوەیە لە مێژووی بەریتانیادا بە ئەنجوومەنێک دەگوترێ کە لە ڕێکەوتی ١٣ی نیسانی ساڵی ١٦٤٠ دامەزراو، لە ٥ی مانگی مایسی ئەوساڵەدا لە لایەن چارڵزی یەکەم، پاشای ئەوکاتی بەریتانیا هەڵوەشایەوە.

## Parliamentarism
## پەرلەمانتاریزم

پەرلەمانتاریزم لە وشەی فەرەنسیی Parler (قسە کردن و بڕیاردان) وەرگیراوە. پەرلەمانParlement (شوێن و ئەنجوومەنی شورا) بە دەستەیەک دەگوترێ کە لە لایەن خەڵکەوە (بەدەنگی ڕاستەو خۆ و شاراوە) هەڵدەبژێردرێن تاکوو خەریکی دارشتن و پەسندکردنی یاساکان بن و، بەسەر جێبەجێ کردنی یاساکانیشدا چاوەدێری بکەن. لەو وڵاتانەی کە دەسەڵاتەکان لێک جیا کراونەتەوە (بەڕێوەبردن، یاسا دارێژیی و دادوەری )، پەرلەمان هەمان هێزی یاسادارێژییەو، بە نوێنگەی دیمۆکراسیی ناڕاستەوخۆ دەژمێردرێ. لە یۆنانی کۆن و کانتۆنەکانی سویسرادا دیمۆکراسیی ڕاستەوخۆ لە ئارادا بووە، کە لەودا خەڵک ڕاستەوخۆ لەدارشتن وپەسندکردنی یاساکاندا بەشدارییان کردووە.

پەرلەمانتاریزم، بە بیروبۆچوونێک دەگوترێ کە بڕوای بەیاسادارشتن لە ڕێگای پەرلەمانەوە هەیەو پێوایە دەبێ پەرلەمان بە سەر کاروباری دەوڵەت و حکوومەتدا چاوەدێری بکا. هەڵبژاردنی سەرۆک وەزیرو وەزیرەکان بەدەنگی لە لایەن نوێنەرانی خەڵک لە پەرلەماندا دەنگی متمانەیان پێدەدرێ. سەرۆک وەزیرو وەزیران لە بەرامبەر پەرلەماندا بەرپرسیار و وڵامدەرن. بە واتایەکی دیکە، ئەنجوومەنی وەزیران بە تێکرایی و ئەندامانی حکوومەت (وەزیران) بە تاک لە بەرامبەر دەسەڵاتی یاسادارێژی (پەرلەمان)دا بەرپرسیارن و، پەرلەمان دەتوانێ و ئەو سەربەستیەی هەیە کە دەنگی متمانەیان پێ بدا یان پێیان نەدا. ئەگەر دەنگی بێ متمانەیی بە حکوومەت یان وەزیرێک درا ئەوا ئەو حکوومەتە یان ئەو وەزیرە لەسەر کار لادەدرێ.

هەڵسەنگاندن و پەسندکردنی بووجە، پێدا چوونەوە بە گەلاڵەکان لە کۆمیسیۆنەکانی پەرلەمان بەر لە پەسندکردنی کۆتایی، لە ئەرکەکانی پەرلەمانە. بوونی پەرلەمان نیشانەی ئیرادەی گەل و دەسەڵاتی نەتەوەییە. لە پەرلەمانتاریزمدا، پەرلەمان دەسەڵاتداری ڕاستەقینەو سەرەکیە و،

نوێنەری خەڵکەو، حکومەت تەنیا پەسندکراوەکانی پەرلەمان جێبەجێ دەکا. لە حکومەتە تۆتالیتێرەکاندا پەرلەمان بێ هێزو لاوازەو، زۆر هەڵدەوەشێتەوە.

بۆ یەکەمین جار پەرلەمان لە سەدەی ١٣ لە بەریتانیا دا دەستی بەکار کرد (لەساڵی ١٢١٥). بەو پێشنیارانەی کە ژمارەیەک لە نوێنەرانی خەڵک لە پەرلەمان دا ئاراستە دەکەن، بۆ ئەوەی کە پەسند بکرێن و ببن بە یاسا، گەڵاڵ"ەی پێ دەگوترێ و؛ بەو پێشنیارانەش کە لەلایەن ئەنجوومەنی وەزیران (حکوومەت )ەوە دەدرێ بە پارلەمان، تاکوو پەسند بکرێ و ببێ بە یاسا، پێی دەگوترێ "لایحە".

### پاسیفیزم / ئاشتی خوازی *Pacifism*

پاسیفیک (Pacific) لە زاراوەی لاتینی( Pacific (us بە مانای سۆلح وئاشتی وەرگیراوە. زاراوەی پاسیفیزم لە زمانی فەرەنسیشدا هەر بەو مانایە دێ وو، بۆ ئاماژە بە لایەنگریکردن لە ئاشتی و هێمنایەتی کەڵکی لێ وەردەگیردرێ. لایەنگرانی پاسیفیزم دژی هەرجۆرە شەڕێکن و، پێیانوایە کە دەکرێ لە ڕێگای بانگەشەو ئامۆژگارییەوە ئاشتیی گشتی جێبەجێ بکرێ. لایەنگرانی ئەو ڕێبازە زۆر جار ڕۆڵێکی گەورە لە دەربڕینی ویستەکانی خەڵک بە دژی پلانە شەڕخوازانەکان دەگێڕن.

### پاڵاوتنی نەتەوەیی *Ethnic Cleansing*

لێکدانەویەکی مۆدێرنە بۆ سڕینەوەیەکی ڕێکخراو و بەرنامە بۆ دارێژراو، بەئەنقەست و زۆرەملێ و دڕندانەی گرووپێکی ئەتنی لە وڵاتێکدا کە گرووپێکی ئەتنی دیکە ئەو شوێنە بە هی خۆی دەزانێ. لە بواری تیۆرییەوە، دەکرێ جیاوازی نێوان ئەم زاراوەیە و کوشتنی بە کۆمەڵ و ژینۆساید کە ئامانجەکەی لە نێو بردن وخاشەبڕکردنی کردنی گرووپێکی نەتەوەیی بە شێوەیەکی پلان بۆ داڕێژراوە، دابنرێ؛ بەڵام لە کردەوەدا ناکرێ لێک جیا بکرێنەوە. ئەو چەمکانەی کە هاواتای ئەو زاراوەیەن، بریتین لە: "دژایەتیی ئەتنی / هەریمی"، دژایەتیی کولتووری"، "دژایەتیی نەتەوەیی ــ ئەتنی"، کە هەموویان جۆرێکی نوێ لە ڕەگەزپەرستی تێکەڵ بە ئایدۆلۆژیایی

ناسیۆنالیستین. لە ساڵی ١٩٩٢هەتا ١٩٩٦ لە یۆگۆسلاڤیای پێشوودا، پاڵاوتنی نەتەوەیی لە لایەن میسرییەکان و کرۆڤاتەکان لە دژی یەکتر و بەتایبەتی لەدژی موسوڵمانەکانی بۆسنیا پیادە دەکرا. پلانەکەش بریتی بوو لە کەڵک وەرگرتنێکی رێکخراو لە تۆقاندن، دەستدرێژیکردن بۆ سەر ناموس، برسیکردن و کوشتن بۆ ناچارکردنی [کەسەکان] بۆ چۆڵکردنی شوێنەکە. مەبەست لەم هەنگاوانە، گۆڕینی نەخشەی بۆسنیا_هێرزیگۆڤین بە قازانجی بەڕێوەبەرانی ئەم سیاسەتە بوو. ئەگەرچی ئەو هێرشانە بۆ سەر مافی مرۆڤ، وەک جینایەتەکانی شەڕ ناسراون و، دیوانی نێونەتەوەیی داد لە لاهەدا کەسە دەستبەسەر کراوەکانی دادگایی کردووە، بەڵام زۆر کەس پێیانوایە کە رێککەوتننامەی دەیتۆن (Dayton Agreement) بۆ کۆتایی هێنان بە شەڕی بۆسنیا (١٩٩٥)، چاوی لە دەرئەنجامەکانی پاڵاوتنی نەتەوەیی لە رێگای دان پێدانان بە سنوورە نوێکان کە هەر لە رێگای ئەم پاڵاوتنەوە پێکهاتووە، پۆشیوە.

پاڵاوتنی نەتەویی بە یەکێک لە جۆرەکانی "شەڕی پۆست مۆدێرن" دەژمێردرێ کە دژایەتی و شەڕی نێوان نەتەوەکان، شوێنی خۆی بە دژایەتی و شەڕی نێوان هێزە نیمچەچەکدارەکان، باڵەکان و گرووپە ئەتنیە نارەسمیە رکابەرەکان دەبەخشێ. قوربانیەکان [لەوشەڕانەدا] زیاتر خەڵکی سڤیل و ئاساین کە بە شێوەیەکی دڕندانە لە لایەن دراوسێ و هاونیشتمانەکانی پێشووی خۆیان دەکوژرێن. لە نموونەی نوێترلە بۆسنیا، دەکرێ ئاماژە بە لیبریا، رڤاندا، سریلانکا، سۆماڵی، سودان، هائیتی، کامبۆج وئەفغانستان بکرێ بەوتەی رابێرت کاپلان، شەڕی پۆست مۆدێرن، ژینۆسایدو پاڵاوتنی نەتەوەیی بەرهەمی دەوڵەت _نەتەوە شکست خواردووەکانی دوای شەڕی ساردە؛ واتە ئەو دەوڵەت_ نەتەوانەی کە شایەدی "لاوازیی لە رادەبەدەری حکومەتە ناوەندییەکان، سەرهەڵدانی ناوچە خێڵەکی و هەرێمیەکان، بڵاوبوونەوەی لە رادەبەدەری نەخۆشی و پەرەگرتنێکی زۆری شەڕ بوون." لەم "ئانارشیە ڕوو لەگەشەیە"دا، نەقشە سیاسیە باوەکان ناڕوونن، چوونکە "تۆڕی پۆلێن بەندیی دەوڵەت _ نەتەوە شوێنی خۆی بە نموونەیەکی نارێک لە دەوڵەت شارەکان، گەرەکە هەژارەکانی قەراغ شارەکان و ناوچەگەراییە ناڕوون و ئانارشیەکان دەبەخشێ".

کۆتایی شەڕی سارد خێرایی بەم پرۆسە داوە. نەمانی ململانێی نێوان دوو زلهێزەکە و لەگەڵ ئەویشدا نەمانی هاوکاری و کۆنترۆڵی سەربازی و ئابووری، بۆتە هۆی سەرهەڵدانی رق و

ململانێ هەڵچووە ناوچەییەکان لە زۆربەی ئەو دەوڵەت و ناوچانەی کە فرە ئەتنین و پێشتر لە ژێر دەسەلاتی یەکێک لەو دوو زلهێزە دابوون. پێکهەڵپرژانە ئەتنی ـ نەتەوەییەکان جیاوازییەکی زۆریان لەگەڵ بزووتنەوە دژە کۆلۆنیالی، سەربەخۆی خوازی و جیایی خوازییەکانی پێشوودا هەیە. کۆمەڵگای نێونەتەوەیی بە بیانووی گرێمانەکانی رێککەوتننامەی وێستفالی کە ولاتان نابێ دەست لە کاروباری نێو خۆیی یەکتر وەربدەن، تائێستا نەیتوانیوە ولامێکی گونجاو ورێک بەم دیاردە بداتەوە.

## *Panchashila* پانچاشیلا

ئەم زاراوەیە سەنسکریتیە بە واتای ٥ بنەمایە.. ئەم زاراوەیە لە ئایینی بودا بۆ هەڵسوکەوت و رەوشتی گشتی کە ٥ بنەمای هەیە، کەڵکی لێ وەردەگیردرێ، کە بریتین لە: خۆبواردن لە کوشتن، خۆبواردن لە دزی، خۆبواردن لە درۆکردن، خۆبواردن لە داوێن پیسی و خۆبواردن لە ماددەی سرکەرەکان.

لەم سالانەی دواییدا ئەم زاراوەیە بۆ دەرخستنی سیاسەتی دەرەوەی هیند کەڵکی لێ وەرگیراوە کە خاوەنی ٥ بنچینەی سەرەکیە:

**الف)** رێزگرتن لە سەروەری و یەکپارچەیی خاکی ولاتان

**ب)** هێرش نەکردن

**ج)** دەستێوەرنەدان لە کاروباری نێوخۆیی ولاتان

**د)** پیادەکردنی یەکسانی لە پێوەندییە نێونەتەوەییەکان و، رێزی دوولایەنە

**ه)** پێکەوە ژیانی ئاشتیانەی ولاتان لەگەڵ حکومەتە جۆراوجۆرەکاندا

ئەم ٥ بنەمایە لە کۆنفرانسی باندۆنگدا، وەک پێنج بنەمای پێکەوە ژیانی ئاشتیانە لە لایەن ولاتانی بەشدار، پەسند کرا.

لە ساڵی ١٩٦٥ بەدواوە ولاتی ئەندەنۆسیاش لە بنەماکانی پانچاشیلا، وەک سیاسەتی دەرەوەی خۆی کەڵکی وەرگرتووە.

## *Pan –Geramanism* پان ژێرمەنیزم

پان ژێرمەنیزم بە بزووتنەوەیەکی ئەمپریالیستی دەگوترێ کە ئامانجەکەی یەکخستنی هەموو ئەڵمانی زمانەکان و کۆکردنەوەیان لە ئیمپراتۆرییەک دایە. ئەم بیروبۆچوونە لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم (١٨٩٤) و یەکەمین دەیەی سەدەی بیستەم لە لایەن ئەنجوومەنی پان _ ژێرمەن بە سەرکردایەتی هێزیش کلاس پەرەی پێدرا.

پان ژێرمەنیزم بە ئامرازی سەرەکیی حکومەتی نازییەکان دەژمێردرێ.

### پێگەی کۆمەڵایەتی Social Status

پێگەی کۆمەڵایەتی بریتیە لە: "پێگەی تایبەتی کەس یان کەسەکان، گرووپ یان گرووپەکان، لە هەموو سیستەمێکی کۆمەڵایەتی، بە هەموو تایبەتمەندییە یاسایی و کۆمەڵایەتیەکانیەوە".

هەرکاتێک کە رۆڵێکی کۆمەڵایەتی لە لایەن کۆمەڵگاوە هەڵدەسەنگێندرێ، پێگەی کۆمەڵایەتیی ئەو رۆڵە دەردەکەوێ. پێگەی کۆمەڵایەتی بەهایەکە کە گرووپێک بە رۆڵێکی کۆمەڵایەتی دەبەخشێ.هەر کۆمەڵگایەک بەپێی پێویستیەکانی خۆی رۆڵە کۆمەڵایەتیەکان پۆلێن بەندی دەکا. لەم رووەوە، لە هەر کۆمەڵگایەکدا هێندێک لە رۆڵەکان بەگرنگتر لە رۆڵەکانی تر دەمێژدرێن و و پێگەیەکی کۆمەڵایەتیی بەرزتریان هەیە.

### پراگماتیزم Pragmatism

پراگماتیزم لە زاراوەی یۆنانیی Pragmatos و Pragma (کردە) وەرگیراوە.

پراگماتیزم تیۆرێکە کە لەراستیدا بیرلە هەنگاو وکردەوە دەکاتەوە. واتە ئەو شتەی کە بەکەڵک و بەقازانجە، حەقیقەتی هەیە، شایانی ئەوەیە بەدوای دابچی و، هەوڵی بۆ بدرێ. دەڵێ: بزانم لەوبگەرەو بەردەیەی ژیاندا چ لە بەرژەوەندی مرۆڤ دایە کە بیکات؟ دواتر درێژە دەدا: مرۆڤ دەبێ ئەوکارە بکات کەباش بێ و بەقازانج بێ.

ئەم فەلسەفە و روانگەیە بەدوای حەقیقەتێکی ئابستراکتەوە نیە، بەڵکوو بەرژەوەندییەکی کردەیی دەخوازێ. ئەم زاراوەیە بۆ یەکەمین جار لە ساڵی ١٨٩٨ لە لایەن ڤیلیام جیمز (١٩١٠-١٨٤٢) فەیلەسوف و دەروونناسی ئەمریکایی کەڵکی لێ وەرگیرا. بە بڕوای ناوبراو، دەبێ مرۆڤ

زۆر بایەخ بە تیورە ئابستراکتەکان کە قازانجیکی کردەییان نیە، نەداو، هەروەها نابێ گوێ بداتە بوارە تیۆرییەکان کە هیچ ئاکام و دەرئەنجامێکی عەینی و هەستپێکراو و بەڕێوەبەریان نیە. بەپێی ئەو بیروبۆچوونە ئەگەر کارو کردەوەیەک دەرئەنجامێکی هەبێ و، ئەگەر هەوڵێکی زانستی، ئابووری، سیاسی و کولتووری سوود بەخش بێ، ئەوکاتە شایانی ئەوەیە بەدوای دابچی و لێکۆڵینەوەی لەسەر بکرێ.

پڕاگماتیزم لەسەر بارودۆخی سیاسی، ئابووری و کولتووریی ویلایەتەیەکگرتووەکانی ئەمەریکا کاریگەرییەکی حاشا هەڵنەگری هەبووە.

لە نێو پڕاگماتیزمدا بیروبۆچوون و روانگەیەکی بەریتانی، لە ژێر ناوی "قازانج بینی و قازانج ویستی" هەیە کە بۆ یەکەمجار لە لایەن جۆن ستوارت میل (١٨٧٣-١٨٠٦) فەیلەسۆف و ئابووریناسی بەریتانی، لە باسی ئابووری سیاسیدا بە شێوەیەک حستیە ڕوو و، لە لایەن ڤیلیام جیمز (١٩١٠-١٨٤٢)، فەیلەسۆفی ئەمەریکی وەک بیروبۆچوونێکی گشتی و بنەڕەتی خرایە روو؛ پاشان جۆن دیڤیی (١٩٥٢-١٨٥٩)ی ئەمەریکی پەرەی بەم بۆچوونە دا، بەڵام ئەوەی خستە سەر کە: ناکرێ واز لە هەموو ئەو شتانە بێنین کە قازانجێکی کردەییان نیە.

هێندێک جار پێویستە تیۆر وّ کردە پێکەوە بن.ژۆرژ سورێل (١٩٢٢_ ١٨٤٧)، کۆمەڵناسی توندڕۆی فەڕەنسی و سەرکردەی شۆڕشگێڕی سەندیکالیستی لە ساڵی ١٩٢١دا چەند وتارێکی لە ژێر ناوی "قازانجی پڕاگماتیزم" بلاّوکردەوە کە لە ئیتاڵیا لایەنگری زۆری پەیدا کرد، بۆ وێنە مۆسۆلینی (١٩٤٥-١٨٨٣) لە ژێر کاریگەریی ناوبراو، گوتی " کردەوە، نەک قسە". هێنری بریگسۆن (١٩٤١_١٨٥٩) قازانج ویستی بە پاڵنەرێک ناوبرد نەک بە حقیقەت، لە هەمان کاتدا، حەزیشی لە پڕاگماتیزم دەکرد.

پڕاگماتیزم جگە لەوەی کە کاریگەری لە سەر لایەنە ماددی و عەینیەکانی ژیانی کۆمەلاّیەتیی رۆژئاواو بە تایبەتی ئەمەریکادا هەبوو، کاریگەرییەکی بەرچاویشی لەسەر بیروبۆچوونە سیاسیەکانی خەڵکی ئەو وڵاتەدا هەبووە.

پڕاگماتیزم، عەقڵی کردەیی لە بەرامبەر عەقڵی تیۆری و میتافیزیک دادەنێ.

## پراڤدا Pravda

زاراوەیەکی رووسییە بەواتای حەقیقەتە. پراڤدا، رۆژنامەی ئۆرگانی کۆمیتەی ناوەندی حیزبی کۆمۆنیستی یەکیەتیی سۆڤیەت بوو. ئەم رۆژنامەیە لە سالّی ١٩١٢بە سەرنووسەری و جیگریی مۆلۆتۆف دامەزرا.

## پەردەی ئاسنین Iron Curtain

سنووریک بوو کە سۆڤیەتی (پیشوو) و ولاّتانی سەر بە سۆڤیەتی (بولگاریا، چکلۆسلۆڤاکیا، هەنگاریا، پۆلەندا، رۆمانیا، یۆگۆسلاڤیا) لە بەشەکەی تری ئەورووپا جیا دەکردەوە.

ئەم زاراوەیە بۆ ئاماژە بە نەبوونی ئازادیی رادەربرین و هاتن و چوون بۆ ناوەوە یان بۆ دەرەوەی سنوورەکانی ئەو ولاّتانە کەلّکی لیّ وەردەگیرا. ئەگەرچی دەلّین یەکەمین جار چەرچیل لە قسەکانی خۆیدا لە فولّتەن (١٩٤٦/٢/٥) لەم زاراوە کەلّکی وەرگرتووە، بەلاّم بەر لە چەرچیل، دکتۆر گۆبلیّز، وەزیری راگەیاندنی دەولّەتی ئەلّمانیای نازی لە وتارە دژە بۆلشڤیکیەکانی خۆیدا کەلّکی لەو زاراوە وەرگرتووە.

## پەردەی خەیزەرانی Bamboo Curtain

زاراوەیەکی هاوواتای پەردەی ئاسنینە کە سەبارەت بە چینی کۆمۆنیست کەلّکی لیّ وەردەگیریّ و، ئاماژە بەو بەربەستە جەستەیی و ئایدۆلۆژییانە دەکا کە دەولّەتی چین لە بەردەمی ئازادیخوازانی دادەنیّ. لە نیسانی ١٩٥٥و لە ماوەی کۆنفرانسی ئەفریقایی ـئاسیاییدا کە لە شاری باندۆنگی ئەندەنۆسیا بەرێوەچوو، چوئین لای سەرۆک وەزیرانی ئەوکاتی چینی کۆمۆنیست هەبوونی پەردەی خەیزەرانی رەت کردەوەو، داوای لە لیژنە بەشداربووەکانی ئەو کۆنفرانسە کرد کە سەردانیکی ئەم ولاّتە بکەن. وا پیدەچووکە دوای ئەوەی کە ئەمەریکا گەمارۆکەی لەسەر چین هەلّگرت، ئەم بەربەستانە لادران. لە سالّی ١٩٧١دا چین بوو بە ئەندامی ریکخراوی

نەتەوەیەکگرتووەکان و، نیکسۆن، سەرۆک کۆماری ئەوکاتی ئەمریکاش سەردانی ئەم وڵاتەی کرد. لە ساڵی ١٩٧٥دا پێوەندیی رەسمیی نێوان چین و بازاڕی هاوبەشی ئەورووپا دامەزراو، بەگشتی پێوەندییەکانی ئەم وڵاتە لەگەڵ رۆژئاوادا بەرەو باشی رۆیشت.

## پرێزیدیۆم *Presidium (Lat.Defence)*

زاراوەیەکی لاتینیە بە مانای بەرگری و؛ لە عۆرفی سیاسیدا بە کۆمیتەی بەڕێوەبەریی ئەنجوومەنی بەرزی یەکیەتیی سۆڤیەتی سۆسیالیستی دەگوترا.

## پرۆسترۆیکا *Perestroika*

زاراوەیەکی رووسییە کە بە واتای نۆژەنکردنەوەی بینایە. پێشگری Pere لە زمانی رووسیدا بە واتای "نۆژەنکردنەوە"و Stroikaبە واتای بینایە. بەم شێوەیە، ئەم زاراوەیە بە واتای نۆژەنکردنەوە و رێک خستنەوەیە. بەلاّم مەبەستی داهێنەرانی ئەم زاراوەیە، "پێکهێنانی ئاڵ و گۆڕ لە کۆمەڵگای سۆڤیەت" دا بوو.

گۆرباچۆف پرۆسترۆیکای بە هاوواتای "شۆڕش" دەزانی. بە بڕوای ناوبراو، "ئەگەر ئێمە بتوانین لە نێو هەموو هاواتاکانی پرۆسترۆیکا، گرنگترینەکەیان هەڵبژێرین کە لە هەمان کاتدا تایبەتمەندییەکانی پرۆسترۆیکا بە شێوەیەکی پوخت باس بکا، دەڵێین: پرۆسترۆیکا شۆڕشێکەو، بەبێ شک کاتالیزۆرێکی زۆر گرنگ و کاریگەر لە گەشەی ئابووری، کۆمەلاّیەتی و کولتووریی کۆمەڵگای سۆڤیەت دایە کە بریتیە لە کۆمەڵێک گۆڕانکاری بە مەبەستی پێکهێنانی دەوڵەتێک بە شێوازێکی نوێ".

گۆرباچۆف دەیگووت: "ئەو هەمووە سیستەمە جۆراوجۆرەی کە لە دنیادا پێکهاتوون، هیچ کات بەرهەمی شۆڕشێک نەبوون، بەڵکوو شۆڕشە جۆراوجۆرەکان بوونە هۆی پێکهاتنی گۆڕانکاری لەو سیستەمانەدا". ناوبراو بەو دەرئەنجامە دەگا کە،شۆڕشی سەرمایەداری لە رێگای چەندین شۆڕشەوە دروست بووو، لەم بوارەوە هانا بۆ لنین دەبا. لنین لە سەردەمێکدا نوسیبووی کە فەڕەنسا، ولاّتی شۆڕشی بۆرژوازیی پێشکەوتوو، لە دوای شۆڕشی مەزنی ساڵەکانی ١٧٩٣-

١٧٨٩ پێویستی بە سێ شۆڕشی دیکە، واتا شۆڕشی ١٨٤٨، ١٨٣٠و١٨٧١ بوو تاکوو ئامانجەکانی خۆی دەستەبەر بکا. لەبارەی بەریتانیاشەوە ئەم قسەیە درووستە کە دوای شۆڕشی کرامۆل لە ساڵی ١٦٤٩، شۆڕشی مەزنی (١٦٨٩–١٦٨٨) و ریفۆرمی ساڵی ١٨٣٢ پێویست بوو. لە ئەڵمانیاشدا دوو شۆڕشی بۆرژوازیی ١٨٤٨و ١٩١٨ پێک هات.

گۆرباچۆف لە لێکدانەوەکانی خۆیدا بەم ئاکامە دەگا کە سۆسیالیزمیش ناتوانێ تەنیا لەیەک شۆڕش دا کورت بێتەوە و، پێویستی بە کردەوەی لە شێوەی شۆڕش هەیە تاکوو بارودۆخی قەیراناوی یان بارودۆخی بەرلە قەیران چارەسەر بکا. بەم شێوەیە گۆرباچۆف پرۆسترۆیکا بە پرۆسەی شۆڕش ناو دەبا.

ئەمە واتایەکە کە گۆرباچۆف لە پرۆسترۆیکا دەیخاتە ڕوو. بەڵام لەروانگەی ناوبراوەوە، شۆرش ئامرازێکە بۆ گۆڕینی سیستەمی کۆن کە ڕەوایەتی مێژوویی خۆی لە دەست داوە. کاتێک کە پێوەندییە کۆمەڵایەتیەکان لە سیستەمێکی کۆندا، دەبن بە بەربەست لەبەردەم گەشەی هێزە داهێنەرەکاندا، ئەوکاتە شۆڕش پێویستە. ئەگەر ـــ بەوتەی لنین ـــ لە فەرەنسا، بەریتانیاو ئەڵمانیادا چەندین شۆڕش ڕوویان داوە. چوونکە ئێستاکە سیستەمی فیۆدالی بە تەواوەتی بۆ سیستەمی سەرمایەداری نەگوازرابۆوە.

پرۆسترۆیکا هەروەها بەپێی بانگەشەی دامەزرێنەکەی "شۆڕشێکی لە سەرەوەڕا" بوو. بەڵام شۆڕشێک بوو کە خەڵکی لە خوارەوەشڕا وەجموجۆڵ خست.

ئەگەر لنین کوڕی نەهیلیزمی رووسیا و میراتگری رەوتی رۆشنگەریی دەیەی هەشتای سەدەی نۆزدەهەمی ئەو وڵاتە بوو، ئەوا پرۆسترۆیکاش کوڕی شۆڕشی لنین بوو، بەڵام کوڕێک کە لە دنیایەکی جیاواز لە سەردەمی باوکی خۆی دادەژی و، لە هەوڵی ئەوە دایە کە میراتی باوکی خۆی هەتا ئەوەی بۆی دەکرێ، بەبێ کەمترین زیان، بە شێوەی ئەورۆیی بیدا بە دەستی جیلی نوێ.

بە بڕوای سەرکردەکانی سۆڤیەت دوو هۆکاری سەرەکی بوون بە هۆی هێنانە ئارای سیاسەتە ئابوورییەکانی پرۆسترۆیکا:

١ــ دابەزینی بەرچاوی گەشەی ئابووریی سۆڤیەت لە دوو دەیەی رابردوودا.

٢ــ دابەزینی چالاکیە ئابوورییەکان کە رەنگدانەوەی پرۆسەیەکی گشتی تر بوو.

بەبڕوای ڕێبەرانی سۆڤیەت، کێشەی سەرەکی ئەوە بوو کە شێوازی بەڕێوەبەریی ئابووری وڵات ئیتر لەگەڵ پێداویستییەکانی ئەو وڵاتەدا نەدەگونجاو، شێوازە کۆنەکان و پێداویستیە ڕاستەقینەکانی ئێستای کۆمەڵگادا ناتەبا بوون.

لایەنی ئابووریی پرۆسترۆیکا ئەو بوارانەی گرتەوە:

١ــ دەستەبەرکردنی پێداویستیە کۆمەڵایەتیەکان (شوێنی نیشتەجێ بوون، خۆراک و تەندروستی گشتی).

٢ــ گواستنەوە لە پەرەپێدان لە رووکەش دا (Extensive Growth) بۆ پەرەپێدان لە ناخ (Intensive Growth) دا.

٣ــ چاکسازی لە بەڕێوەبەری دا، واتە گواستنەوە لە شێوازە ئیدارییەکان بۆ شێوازو ڕێوشوێنە ئابوورییەکان.

پرۆسترۆیکا بوو بە هۆی شلەژانێکی پێکهاتەی سیاسیی کۆمارەکانی سۆڤیەت و وڵاتانی سەر بەم بەرەی سۆڤیەت و لە ئاکامدا ڕێگای بۆ هەڵوەشانەوەی یەکیەتیی سۆڤیەت خۆش کرد(کانوونی یەکەمی ١٩٩١).

### Process — پرۆسێس

زاراوەیەکی فەرەنسیە کە لە سیاسەتدا بە پرۆسەی گۆڕانگاری و ئاڵ و گۆڕەکانی بزووتنەوەکان و دەوڵەتەکان دەگوترێ. پرۆسێس لە زاراوەی لاتینی Processus وەرگیراوە.

### Proxenos — پرۆکیسنۆس

لە سەردەمی کۆندا بەو کەسە دەگوترا کە بۆ پاراستن و داکۆکیکردن لە مافی هاووڵاتیانی بیانی دەست نیشان دەکرا، کە خەڵکی وڵاتی خانە خوێ بوو و، هاووڵاتی ئەو بیانیانە نەبوو کە لەو وڵاتەدا نیشتەجێ بوون. ئەو کەسە ئەو ئەرکانەی لە سەرشان بوو کە کۆنسول بەڕێوەی دەبردن، بەڵام ئەو کەسە بۆخۆی خەڵکی ئەو وڵاتە بوو و، ئەم ئەرک و پۆستەش لە لایەن دەوڵەتی بیانیەوە

پێی نەدەدرا، بەڵکوو دەوڵەتی خانەخوێ لە بەرامبەر چەند ئیمتیازێکدا پێی دەدا، هەروەک چۆن ئێستا هەیە و لە سەدەکانی نێوەڕاستیش دا هەبوو.

## پرۆتۆکۆل **Protocol**

لە وشەیەکی یۆنانی وەرگیراوە. بەو لاپەڕە بچووکە دەگوترا کە لە سەر فایل دەدراو، کورتکراوە و پوختەی کێشەی نێو فایلەکەی تێدا دەنوسرا. بەڵام ئەمڕۆکە ئەم وشەیە واتای جۆراوجۆری هەیە وەک:

١ــ ڕێورەسم : بەو پرەنسیپ و ڕێوشوێنانە دەگوترێ لە پێوەندییە ڕەسمیەکانی نێوان دەوڵەتەکان لە ئارادایە، وەک ئەو ڕێوشوێنانەی کە پێوەندییان بە دابونەریتی نێونەتەوەیی و دیپلۆماتیەوە هەیە کە لە چاوپێکەوتنە سیاسی و نووسینە ڕەسمیە دیپلۆماتیەکاندا ڕەچاو دەکرێن.

٢ــ بەرنامەی کۆنفرانس، کورتەی وتوویژەکان: کەڵک وەرگرتن لە پرۆتۆکۆل بەو دوو مانایە لە کۆنگرەی ڤیەننا (١٨٥١-١٨١٤) بوو بە کارێکی باو. هەر کاتێک بەرنامەی کۆنفرانس، وەکوو خۆی و وشە بەوشە تۆمار نەکرێ، Minutesی پێ دەگوترێ و ئەگەر بەرنامەی کاری ئەو وتوویژانەی کە سەبارەت بە چارەسەری کێشەکانن، ئەگەر وەکوو خۆیان و وشە بە وشەش تۆمار بکرێن، پێیان دەڵێن " ڕاپۆرتی تێروتەسەڵ یان ڕاپۆرتی وشە بە وشە".

٣ــ مانای نوێی ئەو وشەیە لە ڕاستیدا شتێکی وەک " ڕێککەوتننامەو ڕێککەوتنە"ە، ئەمەش زیاتر ئەوکاتەیە کە ئەو دەوڵەتانەی ڕێککەوتنی خۆیان لە بەڵگەیەکی لەم چەشنەدا تۆمار دەکەن (لە ڕاستی دا بەڵگەیەک بەو ناوە)، حەزدەکەن کە ئەو ڕێککەوتنە گرنگیەکی کەمتری لە ڕێککەوتننامەکە هەبێ. هەرچەندە زۆر جاری واش هەیە کە ڕێککەوتنی زۆر گرنگ لە نێوان دەوڵەتان لە ژێر ئەو ناوەدا پێک دێ.

٤ــ هێندێک جار ئەم وشەیە بەو بەڵگەنامەش دەگوترێ کە پوختەو خاڵە سەرکیەکانی کە دوولایەن لەسەریان ڕێککەوتوون، تێدا تۆمار دەکرێ و، پاشان دەخرێتەسەر دەقی ڕێککەوتننامەکە. کە دەتوانین پێی بڵێین "ڕێککەوتننامەی سەرەتایی" یان " ڕەشنووسی ڕێککەوتننامە". هێندێک جار ئەم وشەیە بەو بەڵگەیە دەگوترێ کە نێوەرۆکی ڕێککەوتننامە شی دەکاتەوە کە "تەواوکەر"یشی پێ دەڵێن. هێندێک جاریش ئەم وشەیە بەو ڕێککەوتنە سەربەخۆ

و جیاوازە دەگوترێ کە بوارەکانی وەک کێشە سنوورییەکان یان دامەزراندنەوەی دووبارەی پێوەندییە سیاسیەکان لە خۆ دەگرێ کە لەم حاڵەتەدا بە "ڕێککەوتننامە" وەرگێڕدراوە.
پرۆتۆکۆڵ لەم حاڵەتەدا، چەندین لق و پۆپی لێ دەبێتەوە: ڕێککەوتننامەی واژۆ ( Of Signature): بەڵگەیەکە کە لەو بەڵگەدا، بە کورتی ئاماژە بە واژۆی ڕێککەوتننامە و هەموو ئەوشتانە دەکرێ کە دوو لایەن لەسەریان ڕێککەوتوون؛ وەک گەرەنتی و بەڵێنەکانی دوولایەن و... هتد. بەڵام ئەو بەڵگەیە هیچ شتێک جگە لە ناوەڕۆکی سەرەکی ڕێککەوتننامەکە لەخۆ ناگرێ.
ڕێککەوتننامەی تەواوکەر(Additional): بە بەڵگەیەک دەگوترێ کە بە ڕێککەوتننامەی سەرەکیەوە زیاد دەکرێ و ئامانج لەم کارەش تەواوکردن یان هاوسەنگ کردن یان راستکردنەوە یان روونکردنەوەی هێندێک لە ماددەکانی ڕێککەوتننامە سەرەکیەکەیەو، بە بەشێک لە ڕێککەوتننامە سەرەکیەش دادەنرێ.
ڕێککەوتننامەی کۆتایی (Final): بەڵگەیەکە کە لەپاڵ ڕێکخستنی ڕێککەوتننامە سەرەکیەکەدا ڕێک دەخرێ و، روونکردنەوەی دەرەنجامەکان و شیکردنەوەی خاڵە لێڵەکان و روونکردنەوەی بابەتە ئاڵۆزەکان لە خۆدەگرێ و، رەنگە لە هێندێک حاڵەتیشدا بڕیارە تەواکەرەکانیش لە خۆبگرێ کە لەو حاڵەتەدا بە بەشێک لە ڕێککەوتننامەکە دادەنرێ. رەنگەئەو بەڵگەیە ئاماژە بە ژمارەی بەشدار بووان لە کۆنفرانس یان دەرئەنجامەکانی وتووێژەکانی ئەو کۆنفرانسە بکا کە لەم حاڵەتەدا جیاوازییەکی لەگەڵ Final act دا نابێ.

## پرۆلتاریا *Prolétariat*

لە وشەی لاتینی Proles بە واتای منداڵ وەرگیراوە. لە رۆمی کۆندا پرۆلتاریا بەو کەسانە دەگوترا کە هیچ مافێکیان نەبوو، لەوانە مافی خاوەنداریێتی و جگە لە وەچەنانەوە لە کۆمەڵگادا هیچ رۆڵ و ئەرکێکی کۆمەلایەتیان نەبوو. لە ساڵی ۱۸۳۸دا " سیسمۆندی ئەم زاراوەی سەر لە نوێ زیندوو کردەوە و، بەوو کەسانەی دەگووت پرۆلتاریا کە " هیچ پشکێکیان لە سامانی کۆمەڵگادا نەبوو و هیچ کەس و لایەنێکیش پشتوانی لێ نەدەکردن کە ژیانێکی نەمر نەژیان

هەبێ و هیچ رابردوو داهاتوویەکیشیان نیە" ئەم وشەیە ئیستاش لە ئاخاوتندا هەر بەو واتایە کەڵکی لێ وەردەگیرێ و ئامانجەکەشی پێناسەکردنی چینێکی تایبەت لە کۆمەڵگا دایە.

دەکرێ هەلومەرجی ژیانی پرۆلتاری بە دابین نەکردنی ژیان، کەمیی داهات و کەمیی حەقدەستی کار و هەروەها بە دابین نەکردنی کار و بێ بەش بوون لە بیمە لە بەرامبەر مەترسیەکانی سەر ژیان و پیشەکەیان پێناسە بکەین. کاری بەردەوام و درێژماوەش نیشانەیەکی گرنگی دیکەی ژیانی پرۆلتاریایە. هەوەها دژواری هەلومەرجی دەرەوەی شوێنی کار، واتە هەلومەرجی ژیانی ئاسایی. زاراوەی خوار پرۆلتاریاش هەیە کە بە نزمترین توێژی لە حاڵی هەڵبەزدابەز و بێ بەش تر و هەژارتر لە پرۆلتاریا دەگوترێ. مارکس زاراوەی پرۆلتاریا و چۆنیەتی پێکهاتن و گەشەی پرۆلتاریا لە پرۆسێسی مێژوویی و ململانێی چینایەتیدا راڤە دەکا. بە بروای ناوبراو، "پرۆلتاریا بە چینێک دەگوترێ کە هەموو ئەرک و باری کۆمەڵگای لە سەرشانە، بەبێ ئەوەی کە هیچ ئیمتیازێکی لەو کارەدا هەبێ و، بە ناچاری دەکەوێتە دژایەتیکردن لەگەڵ چینەکانی تردا... پرۆلتاریا وێنەی لەبەریەک هەڵوەشانەوەی هەموو چینەکان و هەموو نەتەوەکانە". هەروەها مارکس لە بەرهەمە فەلسەفیەکانی خۆیدا دەنووسێ: "پرۆلتاریا بریتیە لەو ژینگە مرۆییەی کە مرۆڤ خۆی بە تەواوەتی لە دەست داوە و خۆی لێ بزر بووە و، ناتوانێ سەرلە نوێ خۆی بدوزێتەوە مەگەر ئەوەی سەر لە نوێ و بە تەواوەتیی هەل و مەرجی مرۆیی خۆی وەدەست بێنێتەوە".

پرۆلتاریا بەپێی سروشتی خۆی هێزێکی سەربزێوە. بەرهەمێکە کە بۆرژوازی، بە نیشانەی زیندووی کۆمەڵگایەکی دابەش کراو، بەرهەمی هێناوە. ئەم یاریە دیالیکتیکیە حەتمیەی دژبە یەکەکان، (پرۆلتیار و بۆرژوازی )دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی سەنتێزی ئەم دوو دژ بە یەکە، واتە، کۆمەڵگای بەبێ چین".

دیکتاتۆری پرۆلتاریا: تێپەڕبوون یان چوون بۆ کۆمەڵگایەکی بێ چین بەبێ تێپەڕینی قۆناغی نێوبەند جێبەجێ نابێ."یەکەم قۆناغی شۆڕشی کرێکاری، هاتنە ئارای پرۆلتاریا وەک چینی دەسەڵاتدار یان وەک چینی باڵادەستە "(مانیفێستی کۆمۆنیست). "دیکتاتۆریی شۆڕشگێری پرۆلتاریا" بۆ مارکس وەکوو شێوازێک وایە کە لەو قۆناغەدا دەوڵەت دەگۆڕێ بۆ ئەو شێوازە. واتە لە قۆناغی گواستنەوەی شۆڕشگێریی کۆمەڵگای سەرمایەداری بۆ کۆمەڵگای کۆمۆنیست، سەرەتا دیکتاتۆریی پرۆلتاریا دێتە ئاراوە تاکوو دەوڵەت لە نێو دەچێ، بۆ ئەوی کە بە جێگای ئەوەی

حکومەت بەسەر تاکەکەساندا حکومەت بکا، بەڕێوەبردنی شتومەکان دابمەزرێ. (ڕەخنە لە پلانی گووتا).

ناپرۆلتاریایی بوون: بەگشتی ناپرۆلتاریی بوون بریتیە لە رزگارکردنی چینی کرێکار لە هەل ومەرجی پرۆلتاریایی. بە بڕوای کۆمۆنیستەکان کردەی ناپرۆلتاریایی بوون بەبێ ڕووخاندنی کۆمەڵگای سەرمایەداری و دامەزراندنی دیکتاتۆریی پرۆلتاریا جێبەجێ نابێ.

## پرۆنیزم — *Peronism*

زاراوەیەکە کە لە ناوی خوان پرۆن (١٨٩٥-١٩٧٤)ی دیکتاتۆری بە ناوبانگی ئەرژەنتین (٥٥-١٩٤٦و ٧٤-١٩٧٣) و هاوسەرەکەی ئیڤا پرۆن وەرگیراوە و بە پلان و بەرنامە سیاسی، ئابووری و کۆمەلایەتیەکانی خوان پرۆن دەگوترێ.

پرۆن بە ڕێکخستنی جەماوەریی چینی کرێکاری ئەرژەنتین لە ڕێکخراوە کرێکاری ومیلیشیا کرێکارییەکاندا بە دژی تاقمی بژاردەی توێژی بالای ناوەندو شێوازەکانی جێبەجێکردن و پیادە کردنی دەسەلات لە بوارەکانی سیاسەتی دەرەوەداو، هاندانی هەستی ئەرژەنتینەکان بە دژی ئەمەریکا و، ئەوەی کە ئەرژەنتینیەکان دەبێ سەرکردایەتی ئەمەریکای لاتین بەدەستەوە بگرن، توانی سەرنجی خەڵکی دنیا بۆلای خۆی رابکێشێ. ناوبراو توانای چارەسەرکردنی کێشە ئابوورییەکانی ولاتەکەی نەبوو، بەلام بەو حالەش خاوەنی ڕێز و خۆشەویستیەکی تایبەتی بوو. دوای مردنی ناوبراو، سەرکردایەتی ئایدیەکانی پێرۆنیستی کەوتەدەستی هاوسەرەکەی، واتا ئیڤا پیرۆن. ناوبراو دوای ئەوەی کە لە لایەن ژەنەراڵە ئەرژەنتینیەکانەوە لەسەر دەسەلات لابرا (١٩٧٦)، کەسایەتی و ڕێزی پێشووی خۆی لە دەست دا.

## پۆست مۆدێرنیزم — *Post – Modernism*

لە بواری سیاسیدا، ئەم ڕیبازە پێیوایە کە خەباتی چینی کرێکار بەرەو کوژانەوە یان دامرکان چووەو، چینی کرێکار لە کۆمەڵگا پێشکەوتووە پیشەسازییەکاندا لە نێو هەناوی بەرژەوندییەکانی سیستەمی سەرمایەداریدا تواوەتەوە. بە بڕوای لایەنگرانی ئەم ڕێبازە، ویستەکان و

خەباتی بان چینایەتیی وەک بزووتنەوەی پاراستنی ژینگەو بەرگری لە مافەکانی هیمۆسیکسشاڵەکان جێگای خەباتی چینایەتی گرتۆتەوەد. بە بڕوای دانیەل بێل، کۆمەڵناسی ئەمەریکی، قۆناغی پۆست مۆدێرنیزم، قۆناغ یان سەردەمی دژە نۆرمەکانی بۆرژوایی و حاشاکردن لە ناسنامەی کۆمەڵایەتی، تاکەیەتیی لە رادەبەدەر، چێژوەرگرتنی تێپەڕو کوێر و راوەستان لە دژی کولتووری مۆدێرنیزم، سیاسەتی دیمۆکراتیک و ئابووریی سەرمایەداری و بەها ئایینییەکانە. هێندێک کەس پۆست مۆدێرنیزم بە دژکردەوەیەکی کولتووری بە دوایین گۆڕانکارییە سیستماتیکەکانی سەرمایەداریی جیهانی دەزانن. هێندێکیش پێیانوایە کە ئەم سەردەمە هیچ دەسکەوت و بەرهەمێکی فیکری و سیاسی نەبووە، واتە لە هیچ پانتاییەکی کردەیی و تیۆریدا دەسکەوتێکی بەهادار و بەنرخیان پێ نەبووە و؛ پێیانوایە تایبەتمەندییەکانی پۆست مۆدێرنیزم بریتین لە لە هەژاریی فیکری، سازان و پێکهاتن، تێکەڵ پێکەڵی و، خۆبواردن لە دۆزینەوەی رێگا چارە.

## Black Panthers
## پڵنگە رەشەکان

یەکێک لە رێکخراوە ناسراوەکانی رەش پێستەکان لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکایە کە پرۆپاگەندەی بۆ خەباتی چەکدارانەی کۆمەڵە رەش پێستەکان دەکرد. ئەم رێکخراوە دوای کوژرانی مارتین لۆسەرکینگ (١٩٦٨)دامەزرا.

بە هۆی ئەوەی پڵنگە رەشەکان چەکیان هەڵگرتبوو، پۆلیسی ئەمەریکا لێیان بە گومان بوو. ئەم بزووتنەوەیە بڕوای بە هەوڵی هاوبەشی رەش و سپی پێست و سپی پێستەکان لە خەباتی چینایەتیدا هەبوو.

## Plenum
## پلینۆم

لە وشەی پلینۆسی لاتینی بە مانای تژی وەرگیراوە. لە راستیدا پلینۆم بە کۆبوونەوەیەک دەگوترێ کە سەرکردایەتی یان دەستەی بەڕێوەبەریی رێکخراو یان حیزبێکی سیاسی پێکی هێناوە.

بە کۆبوونەوەی گشتیی ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندیی حیزب، پلینۆمی کۆمیتەی ناوندیی ئەو حیزبە دەگوترێ. لە پلینۆمە بەرفروانەکاندا جگە لە ئەندامەکانی سەرکردایەتی یان کۆمیتەی

ناوەندی، ژمارەیەک پسپۆر و شارەزا لە بوارە جۆراوجۆرەکانەوە لە کۆبوونەوەکەدا بەشداری دەکەن.

### پلۆتۆکراسی / حکومەتی دەوڵەمەندەکان Plutocracy

بە رژێمێکی سیاسی دەگوترێ کە کەسانی دەوڵەمەندی نێو کۆمەڵگا، دەسەڵاتی کۆمەڵگا بەڕێوە دەبەن. دەکرێ پلۆتۆکراسی بە حکومەتی دەوڵەمەندەکان ناو ببەین. ئەم زاراوەیە هێندێک جار بە دەوڵەمەندترین کەسەکانی نێو کۆمەڵگایەکیش دەگوترێ.

### پلۆڕالیزم Pluralism

زاراوەی پلۆڕالیزم لە چەمکی لاتینیی Pluralis (چەند یەکە) وەرگیراوەو، بە بیروبۆچوونێک دەگوترێ کە بڕوای بە فرەیی، فرەچەشن بوون و چوونە سەری ژمارەی حیزبە سیاسیەکان، کۆمەڵەکان، ئەنجوومەنەکان و جیاوازی بیروڕا و بۆچوونەکان لە پێناوی بەرژەوەندی گشتی و لە ئاکام دا بڕوای بە فرەیی دەسەڵات لە هەموو بوارەکاندا هەیە. پلۆڕالیزم داکۆکی لەو خالاّنە دەکا کە ئاماژەمان پێکرد و، خەڵک هان دەدا کە بڕوایان بە فرەحیزبی، یەکیەتی و کۆمەڵە جیاوازە سیاسی و ئابوورییەکان، پەروەردەوفێرکردنی کولتووری، یەکیەتیی و سەندیکا پیشەییەکان بێ، تاکوو لە ڕێگای بەشداریی هەمەلایەنەی خەڵک لە کاروباری گشتیدا بەرژەوەندی گشتی دابین بێ و، بەڕێوەبردنی کاروباری کۆمەڵگا لە پانتایەکی بەرفراوانتردا جێبەجێ بکرێ.

زاراوەی پلۆڕالیزم لە بوارەکانی سیاسی، ئابووری، کولتووری، تەندروستی، داد و... هتددا کەڵکی لێ وەردەگیردرێ. مۆنتسکیۆ (١٧٥٥_١٦٨٩) نووسەر و فەیلەسوفی کۆمەڵایەتی سیاسیی فەڕەنسی پێیوایە کە پلۆڕالیزم کاتێک دەتوانێ ئاکام و دەسکەوتی هەبێ کە ئەندامانی حیزبەکان، کۆمەڵەکان، ئەنجوومەنەکان، یەکیەتیەکان، ڕێکخراوەکان وسەندیکاکان و تەنانەت کەمینە ئاینیەکان هەڵسەکەوتێکی نەرم و نیانیان لەگەڵ یەکتردا هەبێ و ڕێز لە بیروبۆچوونی جیاوازی یەکتر بگرن. ناوبراو دژی هەر جۆرە چەقبەستوویی و چربوونەوەیەک بوو و، پێشنیاری دەکرد کە دامودەزگا ناحکومیەکان دڵخوازانە لە کاروباری حکومەتدا بەشداری بکەن.

"ئانارشیەکان" خوازیاری پلۆڕالیزمێکی زۆر و لەڕادەبەدەرن. تاقمە ئایینی و کەمینەکانی هێندێک لە وڵاتان کە خوازیاری دامەزراندنی قوتابخانە، دامەزراوەو، ڕێکخراوە دادوەرییە تایبەتیەکانی خۆیانن، لەریزی ئەو کەسانەدان کە خوازیاری پلۆڕالیزمن. لایەنگرانی لێک جیاکردنەوەی هێزەکانی یاسادارێژی، داد و بەڕێوەبەری و فیدڕالی خوازەکان بە پشتیوانانی پلۆڕالیزم دەژمێردرێن.

پلۆڕالیزم، دوژمنی کەڵەکەبوونی هێز و دژی حکومەتی چەقبەستووی دیکتاتۆرییە. لە بەرامبەر پلۆڕالیزمدا سیستەمی فەلسەفیی مۆنیزم هەیە. پلۆڕالیزم داکۆکی لە فیدرالیزم دەکا وفرەیی دەسەڵات بە مەرجی دەستەبەربوونی ئازادی دەژمێردرێ. ڕێزدانان لە بیروبۆچوونەکان لە سەربنەمای پەروەردەیەکی وردو هەڵسەنگێنراو و عەقڵانی، فیدڕالیزم لە خەسارەکان دەپارێزێ.

## Secret Police

### پۆلیسی نهێنی

بەهێزێکی تایبەتی دەگوترێ کە بەمەبەستی کردەوە نهێنیە نایاساییەکانی بەدواداگەران و چاوەدێریکردن و لێکۆڵینەوە وسەرکوتی بە ناو "دوژمنانی دەوڵەت" کەڵکی لێ وەردەگیردرێ. لەو کۆمەڵگایانەی کە خاوەنی سیستەمێکی راستەقینەی دێمۆکراتین، پێویستیەکی ئەوتۆیان بەم دامودەزگایانە نیە؛ بەڵام ئەو دەوڵەتانەی کە ئایدۆلۆژیای نەیارە سیاسیەکانیان پێ تەحەممول ناکرێ، بە پشت بەستن بەم دامودەزگایانە خۆیان و دەسەڵاتەکەیان لە مەترسی و هەڕشەکان دەپارێزن.

پۆلیسی نهێنی بە ئامرازێکی سەرەکیی سەرکوت و پیادە کردنی دەسەڵاتی تاک حیزبی لەوڵاتێکدا دەژمێردرێ. گۆستاپۆی ئەڵمانیای نازی و K.G.B ی یەکیەتیی سۆڤیەت لە ریزی ئەم دامودزگایانەن.

## Asylum

### پەنابەری

لە ساڵی ١٩٥٠دا، دوای ئەو گۆڕانکارییە یەک لە دوای یەکانەی کە لە بواری پەنابەرییەوە لە ماوەی بیست وپێنج سەدەی رابردوودا روویان دابوو، دارێژەرانی پێرەوپرۆگرامی یاسای بەڕێوەبەری کۆمیسیاری بەرزی پەنابەران، زاراوەی "پەنابەری" بەو شێوە پێناسە دەکەن:

پەنابەر بە کەسێک دەگوترێ کە، " بە هۆی ترسێکی بەجێ کە هەیبووە یان هەیەتی، یان بە هۆی رەگەز، ئایین، نەتەوە یان بیروباوەڕی مەترسی لەسەرە، لە وڵاتی خۆی یان ئەگەر هاووڵاتی هیچ وڵاتێک نەبێ، لە وڵاتێک کە پیشتر بە پێی عادەت تێی دا نیشتەجێ بووە بچێتە دەرو، بە هۆی

ئەو ترسە نەیهەوێ بگەڕێتەوە وڵاتی خۆی؛ یان ئەگەر هاووڵاتی هیچ وڵاتێک نەبووبێ و نەیهەوێ بۆ ئەو شوێنە یان وڵاتەی کە پێشتر تێدا نیشتەجێ بووە، بگەڕێتەوە"؛ (بریاری ژمارە ٤٢٨ی کۆمەڵەی گشتی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان، کە ڕێکەوتی چواردەی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٥٠).

بەپێی پێناسەی دیوانی نێونەتەوەیی داد، پەنابەر بریتیە لەو کەسەی کە لە لایەن دەوڵەتێکەوە چاوەدێری دەکرێ و مەترسی لە سەرەو، وڵاتێکی تر پشتیوانی لێ دەکا و لە ڕێگای چەندین کەناڵەوە لەم مەترسی و چاوەدێرییە دەپارێزێ. پەنابەری چەندین جۆری هەیە کە باوترین حاڵەتەکانی پەنابەری، پەنابەری سیاسی یان دەرەکیە. ئەمجۆرە پەنابەریە ڕەنگە لە لایەن دەوڵەتێک لە دەرەوەی سنوورەکانی خۆی یان لەو شوێنانەی کە یاسا نێودەوڵەتیەکان بەر بە پیادەکردنی دەسەڵاتی بەرپرسانی دەوڵەتی چاوەدێریکەر دەگرێ، جێبەجێ دەکرێ. پەنابەری، تاوانبارانی ماف و یاسا گشتیەکان ناگرێتەوە. جۆرێکی تری پەنابەری، پەنابەری نێوخۆییە کە بەپێی ئەمجۆرە، دەوڵەتێک لە نێوخۆدا پەنابەری بەکەسێک دەبەخشێ.

هیچ ڕێوشوێنیک و یاسایەکی نێونەتەوەیی دەوڵەتێک ناچار بە بەخشیی مافی پەنابەری بە کەسێک ناکا.

مەرجەکانی پەنابەری:

بەپێی ڕێککەوتننامەی گشتی و پێڕەوپرۆگرامی کۆمیسیاریای بەرزی پەنابەران، دەبێ کەسێک، خاوەنی یەکێک لەو مەرجانە بێ، تاکوو کەسەکە بە پەنابەر بناسرێ. ئەم دوو مەرجە بریتین لەوەی کە ئەم کەسە "نەتوانێ" یان بە هۆی ترسێکی بەجێ "نەیهەوێ" لە وڵاتی خۆی یان لە شوێنی نیشتەجێ بوونی خۆی بمێنێتەوە.

"نەتوانین" Unable لە چەند شێوەدا خۆی دەنوێنێ:

- لە دەست دانی مافی هاووڵاتی بوون
- نەبوونی پێوەندیی سیاسی لە نێوان ئەو وڵاتەی کە مافی پەنابەری بەخشیوە لەگەڵ ئەو وڵاتەی کە پەنابەر لەوێوە ڕای کردووە.
- نەبوونی نیشتمان، کە ئەم حاڵە ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە نیشتمانیان نیە.

"نەویستن " Unwilling كاتێک دروستەکە دەوڵەتێک لە پشتیوانیکردنی هاوولاتیەکی خۆی کە هاوولاتیی ولاتێکی ترە، خۆی نەبواردبێ بەلام هاوولاتیەکە لە بارودۆخی پەنابەریدا بەسەردەبا و دەزانێ کە ئەگەر ئەم پشتیوانیەی ولاتەکەی قبوول بکا ئەوا بارودۆخەکەی لە مەترسی دەکەوێ و مەرجەکانی پەنابەری نایگرێتەوە، هەر بۆیە ئەم پشتیوانیە رەت دەکاتەوە. دەبێ ئاماژە بەوەش بکرێ کە هەرکاتێک دەوڵەتەکە بە شێوەیەکی یەک لایەنە ئەم پشتیوانیەی بەرەسمی زانێ و، هاوولاتیەکەی بە ژێرکۆمەڵەی پشتیوانیی خۆی لە قەڵەم دا، بە بێ ئەوەی کە ویست و حەزی هاوولاتیەکە لەبەر چاوگیرابێ، ئەم کارە هیچ زیانێک بە پێگە و بارودۆخی پەنابەرەکە ناگەیەنێ. بۆ ئەو کەسانەی کە هاوولاتیی زیاتر لەولاتێکیان هەیە، مەرجی تایبەتیی دیکە هەیە کە بریتیە لە: " زاراوەی هاوولاتی هەموو ئەو ولاتانە دەگرێتەوە کە مافی هاوولاتی بوونیان بەکەسێک داوە". کەوایە بۆ کەسانی لەمجۆرە، دەبێ هەموو ئەو ولاتانەی کە ناوبراو مافی هاولاتی بوونی تێیان دا هەیە دەبێ ترسێکی بەجێی لە سەربێ واتە مەترسی چاوەدێری لەسەربێ، دەنا ئەگەر ئەم ترسەی لەسەر نەبێ ناتوانێ داوای هاوولاتی بوون لە ولاتێکی تر بکات.

### *Pentagon* پێنتاگۆن

زاراوەی پێنتاگۆن بە مانای پێنج کوچکەیە، کە ناوی بینایەکی پێنج کوچکەیە کە لە ڤێرجینیای ویلایەتەیەکگرتووەکانی ئەمەریکا دایەو، ناوەندی وەزارەتی بەرگری ئەمەریکایە. ئەم بینایە لە رووداوی ١١ی سێپتەمبەری ٢٠٠١دا کەوتە بەرهێرش و، بەشێکی زۆری تێک رووخا. لەم رووداوەدا بە دەیان فەرمانبەری ئەم وەزارتخانە کوژران و بریندار بوون. زاراوەی پێنتاگۆنیزم بە شێوەیەکی مەجازی بە مانای هێزی سەربازیی ویلایەتەیەکگرتووەکان و سیاسەتەکانی ئەم ناوەندە لە بەرامبەر کێشە جیهانیەکان کەڵکی لێ وەردەگیردرێ.

### *Black Thursday* پێنج شەممەی رەش (١٩٢٩/١٠/٢٤)

بە رۆژی ٢٤ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٢٩ دەگوترێ کە سەرەتای دەستپێکی قەیرانی ڤاڵ ستریت بوو کە بازاڕەکانی ئەمەریکای بە توندی شڵەژاند. ئەو هەولانەی کە بۆ بوژاندنەوەو گەڕانەوەی متمانە هاتنە ئاراوە، هیچ بەرهەمێکی نەبوو و؛ Stocke Value لە رۆژی سێ شەممە

٢٩ تشرینی یەکەم داگەیشتە پلەی سیفر. ئەم قەیرانە لە ئاکام دا بوو بە، هۆی دابەزینی بە ناوبانگی دەیەی ١٩٣٠.

## پۆپۆلیزم *Populism*

پۆپۆلیزم لە زاراوەی لاتینیی Populus (جەماوەری خەڵک) وەرگیراوە. لە پۆپۆلیزمدا ئامانجە سیاسیەکان لە ڕێگای جەماوەر و پاڵەپەستۆی خەڵک بۆسەر حکومەت، بەبێ هیچ نێوبەندییەکی تاقم، حیزب یان ڕێکخراوێک،جێبەجێ دەکرێن. ئەم ڕوانگەیە زیاتر لەسەر ئەوە پێداگری دەکا کە لە ڕێگای خەڵک و بیروڕای گشتییەوە داخوازییە گشتییەکان بەسەر حکومەتدا بسەپێنرێن.

لە پۆپولیزمدا ئیرادەی جەماوەری خەڵک زیاتر بەلای یەکسانی و دادپەروەری دایە، میکانیزمی ئەم ئیرادەیەش کاریگەرترە لە میکانیزمەکانی ڕێکخراوە جۆراوجۆرەکان و؛ حکومەتەکانیش ، بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ، زیاتر دەکەونە ژێر گوشار و کاریگەری ویستی گشتیی خەڵک و، لە ئاکامدا ڕێکخستن و دارشتنەوەی کاروبارو دیاریکردنی سیاست و ئەرکەکانیان دا ناچارن ئەم ئاراستەیە لە بەرچاو بگرن، یان بە سیاسەتەکانیان دا بچنەوە.

بەگشتی، پەرەگرتنی گەندەڵی لە دەزگای بەڕێوەبەریدا دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی جموجۆڵی پۆپولیستی. هەمووکات پۆپۆلیستەکان بە دوای سەرەداوێکدا دەگەڕێن کە گەندەڵی حکومەت لەقاو بدەن. ڤیکتۆر هۆگۆ (١٨٨٥- ١٨٠٢) نووسەری کتێبی بێنەوایان پێیوا بوو : حکوومەتێک کە خاوەنی پشتیوانیی جەماوەری نەبێ، حکوومەتی سەرەڕۆیی و زۆردارییە. ئەلێکساندێر، برای لنین (١٩٢٤-١٨٧٠) یەکێک لە پۆپولیستە توندڕۆکان بوو کە لە سێدارە درا. ماکیاڤێلی (١٥٢٧-١٤٦٩) پێیوابوو کە چوونکە لە نێو هێندێک لە جەماوەری خەڵکدا دەستپیسی و نادادپەروەری، پەرەگرتنی بێ سەرەوبەری، زیاد بوونی دووبەرەکی و چاوچنۆکی و کۆمەڵێک لادانی تر هەن ، بۆیە نابێ بەهایەک بە ویست و ڕاو بۆچوونی گشتی خەڵک بدرێ. لەبەرامبەر ئەمەدا، لە سەدەکانی ١٦،١٧و١٨دا ڕای زۆربەی فەیلەسۆف و نووسەران ئەوە بوو کە دەسەڵاتی سیاسی لە خەڵکەوە سەرچاوە دەگرێ و، خەڵک مافی بەربەرەکانیان لە بەرامبەر حکوومەتدا هەیە و، دەتوانن پاڵەپەستۆ

بخەنە سەر حکوومەتە چەقبەستووەکان. بە بڕوای پۆل تاگارێت، پۆپولیزم دژکردەوەیە کە لە بەرامبەر بیروبۆچوون ، دامودەزگا و شێوازەکانی سیستەمە پەرلەمانیەکانە و؛کاتێکیش کە هەست بە قەیران دەکا، پەنا دەباتە بەر زەقکردنەوەو گەورەکردنەوەی نموونەی یۆتوپیایی خۆی. هەروەها بە هۆی ئەوی کە خاوەنی بەهای بنچینەیی گشتی نیە دەکەوێتە ژێر کاریگەرییەوە و، تایبەتمەندییەکانی دەوروبەری خۆی بە خۆیەوە دەگرێ و، لە کردەوەدا دەبێ بە دیاردەیەکی کاتی و تێپەڕ.

### پۆلیت بۆرو / مەکتەبی سیاسی **Politbureau**

ئەم زاراوەیە بە مانای مەکتەبی سیاسییە و، لە هەمان کاتیشدا بە دەستەی ناوەندیی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەت کە سەرکردایەتی سیاسی و دەسەڵاتی ڕاستەقینەی یەکیەتیی سۆڤیەتی لەدەست دابوو، دەگوترا.

### پێشنیاری "ئاسمانی کراوە" **Open Sky Proposal**

ناوی گەڵاڵەیەکە کە لە ساڵی ١٩٥٥، لە لایەن ژەنەراڵ ئایزنهاوێر، سی و چوارەمین سەرۆک کۆماری ئەمەریکا _ لە یەکەمین کۆبوونەوەی کۆنفرانسی ژنێڤدا پێشکەش بە نیکیتا خرۆشچۆف _سەرۆک وەزیرانی یەکیەتیی سۆڤیەت_ کرا تاکوو ترس لە هێرشێکی لە ناکاوی ئەتۆمی کەم بکاتەوە و، کۆتایی بە بۆنبەستی وتووێژەکانی کەم کردنەوە و نەهێشتنی چەک وچۆڵ بێنێ. بەپێی ئەم گەڵاڵەیە، ئەرکی ئەمەریکا و سۆڤیەت ئەوە بوو کە گەڵاڵەکانی خۆیان لە بواری سەربازییەوە بخەنە ڕوو، درێژە بە چاوەدێرییە ئاسمانیەکانی خۆیان لەسەر خاک و وڵاتی یەکتر بدەن.

### پێشەوا **Führer**

ئەم زاراوەیە کە لە زمانی ئەڵمانیدا پێی دەگوترێ "فوهرێر"، نازناوی ئادۆلف هیتلەر بوو. لە ڕاستیدا ناوبراو بە چاولێکەری لە مۆسۆلینی، سەرکردەی فاشیستەکانی ئیتالیا کە ناوی خۆی نابوو "دووچە"، ئەم نازناوەی لەسەر خۆی دانا.

لە ئابی ١٩٣٤دا واتە دوای مردنی هیندێنبۆرگ، هیتلەر پۆستەکانی راویژکاری و سەرۆک کۆماریی ئەڵمانیای تێکەڵ بە یەکتر کردو، لەو رێکەوتە بە دواوە، پێشەوا بوو بە نازناوی رەسمی و دەوڵەتیی هیتلەر.

## پێکەوەنووسان Association

ئەم چەمکە لە رەوتی سڕینەوەی کۆلۆنیالیزمدا لە لایەن کۆمەڵەی گشتیی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە برەوی پەیدا کرد. پێکەوەنووسان رێوشوێنێکی رەسمیە لەنێوان هەرێمێکی ناخودموختار و وڵاتێکی سەربەخۆ (حکومەتی ناوەندی) کە، هەرێمی ناخودموختار وەک دەوڵەتێکی پێوەنووساو، لە بەرێوەبردنی کاروباری نێوخۆییدا خودموختارە، بەڵام دەوڵەتی ناوەندی بەرپرسی سیاسەتی دەرەوەو بەرگریی ئەو دەوڵەتە پێوەنووساوە دەبێ. بەپێی بریارنامەی ژمارە ١٥٤١ی کۆمەڵەی گشتی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لە رێککەوتی ١٤ی کانوونی یەکەمی ١٩٦٠، بۆ ئەوی کە پێوەنووسان باری یاسایی بەخۆوە بگرێ،جگە لە دان پێدانان لە لایەن نەتەوە یەکگرتووەکانەوە، دەبێ خاوەنی دوو مەرجی گشتیی دیکەش بێ:

١ـ دانیشتوانی ئەو هەرێمە دەبێ رازیبوونی خۆیان بۆ ئەم پێوەنووسانە دەرببڕن؛

٢ـ دەبێ پێوەنووسان ببێتە هۆی گەشە و بوژانەوەی خۆشگوزەرانی و پەرەسەندنی هەرێمی پێوەنووساو.

مەرجی یەکەم، پێوەنووسان لە سیستەمی ژێر کۆنترۆڵ (تحت الحمایە) جیا دەکاتەوە، چوونکە سیستەمی (تحت الحمایە) بەپێی ویست و ئیرادەی پاشا یان بژاردەکانی دەسەڵات پێکدەهات. مەرجی دووهەم، رەنگدانەوەی ئامانجەکانی سیستەمی سەرپەرستیاری رێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکانە.

## پاڵاوتن Liquidation

ئەم زاراوە لە عۆرفی سیاسی دا بەواتای دەرکردنی ئەندامانی حیزب، رێکخراو، یان دەوڵەت دەگوترێ کە ئەو کەسانە لەبەر هۆکاری سیاسی وەدەردەنرێن. پاڵاوتن بە هۆی ئیعدام یان زیندانی کردن لە شوێنێکی نادیار جێبەجێ دەبێ.

پاڵاوتنەکانی ستالین لە دەیەی ١٩٣٠ (ڕادان، بەندکردن یان کوشتنی نەیارانی ستالین) و پاڵاوتنی ئەندامانی ڕێبەرایەتیی سۆڤیەت لە لایەن خرۆشچۆف لە ساڵی ١٩٥٥، بە دوو نموونەی زەقی ئەم کارە دەژمێردرێن.

## پاڵاوتنی خویناوی (١٩٣٤) Blood Purge

لەو پاڵاوتنە خوێناوییەدا ژمارەیەک لە بەرپرسانی (SA) و، لە سەرووی هەمووانەوە ئەرنێست ڕۆهم (١٨٨٧-١٩٣٤) لە لایەن تاقمەکانی مەرگی SS کوژران (حوزیران و تەمووزی ١٩٣٤).

## پەسندکردن Ratification

پەسندکردن، بە قبوولکردنی ڕەسمیی ئەو ڕێککەوتننامە دەگوترێ کە لە لایەن نوێنەری وڵاتێکەوە مۆر کراوە. ئەم کارە لە ڕێگای گۆڕینەوەی بەڵگەکانی پێوەندیدار بە قبوولکردنی ڕەسمیی ڕێککەوتننامەکانی نێوان دەوڵەتەکانی لایەنی ڕێککەوتنەکە بەڕێوە دەچێ. لە پەسندکردنی ڕێککەوتننامەکان بەتایبەتی لە وڵاتە دێمۆکراتیکەکاندا ئەو هەلە بە خەڵک دەدەرێ کە ڕای خۆیان سەبارەت بە ڕێککەوتنەکە دەربڕن.

## *پەرەگرتوویی جێگر* *Sustainable Development*

ئەم زاراوەیە بە واتا بەرفراوانەکەی، بەڕێوەبردن و کەڵک وەرگرتنێکی دروست و کارامە لە سەرچاوە سەرکیەکان، سەرچاوە سروشتی، سەرچاوە ماڵی و هێزە مرۆییەکان بۆ گەیشتن بە نموونەی کەڵک وەرگرتنی گونجاو وێڕای بە کارهێنانی کەرەسە تەکنیکی و پێکهاتە و ڕێکخستنە گونجاوەکان بۆ دابینکردنی پێویستی جیلەکانی ئەمڕۆ داهاتوو، بە شێوەیەکی بەردەوام، لە خۆ دەگرێ.

پەرەگرتوویی جێگیر بە پەرەگرتووییەک دەگوترێ کە پێویستیەکانی جیلی ئەمڕۆ بەبێ زەربەلێدان لە توانای بەرەکانی داهاتوو لە دابینکردنی پێداوێستییەکانی خۆیاندا، دابین بکا. واتای ئیستای پەرەگرتوویی جێگیر، بەرهەمی سەرەکیی کۆنفرانسی جیهانیی ١٩٩٢ی ڕیۆدۆژانیرۆ بوو. لە ڕوانگەیەکەوە دەکرێ سەرهەڵدانی مانای گەشەی جێگیر بە بەرهەمی داهێنانی سێ چەمک لە

سێ راپۆرتی جیاوازی جیهانی واتە راپۆرتی "ئاسایشی هاوبەش"ی کۆمیسیۆنی پاڵمە، راپۆرتی "قەیرانە هاوبەشەکانی "ی کۆمیسیۆنی برانت و راپۆرتی "داهاتووی هاوبەشی ئێمە"ی کۆمیسیۆنی برانت لەند، بزانرێ.

### پەرەگرتوویی سیاسی — *Political Development*

بە چوونەسەری ئاستی توانایی و لێهاتوویی سیستەمێکی سیاسی بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکیە تاکەکەسی و گشتیەکان، پێکهاتەی جەماوەری و گۆڕانکاریی بنەڕەتی لە کۆمەڵگایەکدا دەگوترێ. پەرەگرتوویی سیاسی پێویستی بە گەشەی دیمۆکراسی هەیە. هەرچەندە سیستەمێکی سیاسی لە چەقبەستوویی بۆ نەرمی، لە سادەیی بۆ ئالۆزی، لە شوێن کەوتن بۆ خودموختاری و لە پەرش و بڵاوی بۆ یەکگرتوویی بچێ، بەهەمان ڕادەش پەرەگرتوویی سیاسیش لەو سیستەمەدا زیاد دەبێ. نۆژەنکرنەوەی سیاسی زیاتر ئاماژە بە جوانکاریەکانی سیاسی دەکا، ئەوە لە حاڵێک دایە کە پەرەگرتوویی سیاسی پێوەندی بە گۆڕانکارییە بنەڕەتیەکانەوە هەیە. سێ هۆکاری رێکخراو، کارامەیی، عەقڵانیەتی زانستی و یەکگرتوویی ئایدۆلۆژیای سەرکردەکان، بە پێویستییەکانی پەرەگرتوویی سیاسی دانراون.

### پەرەگرتوویی نەتەوەیی — *National Development*

بە چوونەسەری ئاستی کارامەیی ماددی و مەعنەویی سیستەمی نەتەوەیی وبە گەیشتن بە ئاستێکی نوێی ئایدۆلۆژی، رێکخستن و داهێنان لە بواری ئابووریی دەگوترێ. پەرەگرتوویی نەتەوەیی پێویستی بە چوونەسەری ئاستی کارامەیی و زیاد بوونی خۆشگوزەرانیی کۆمەڵایەتی و پێکهێنانی دادپەروەری کۆمەڵایەتیە. لە بواری سیاسیەوە، پەرەگرتوویی نەتەوەیی پێویستی بە چارەسەری ناکۆکیی بەرژەوەندییەکانی تاکەکەسی و گشتی هەیە. لە بواری کولتوورییەوە، پەرەگرتوویی نەتەوەیی پێویستی بە تێپەربوون لە کولتووری داخراوی نەریتی بۆ کولتووری کراوەی عەقڵانی و مۆدێرن هەیە.

## Use Of Force
## پەنابردن بۆ هێز

ئەم زاراوەیە دەکرێ بە دوو شێوە پێناسە بکرێ: پەنابردن بۆ هێز بریتیە لە هەرجۆرە کردەیەکی توندوتیژانە کە ناچێتە چوارچێوەی کردەوە سەربازییەکان. بەڵام لە پێناسەی دووهەم دا، هەموو رێوشوێن و کردەوە سەربازییەکان، بۆ وێنە شەڕ لە خۆدەگرێ.

## Plot
## پیلان

بە کردەویەکی زۆر نهێنی دەگوترێ کە لە لایەن تاقمێکی بەرهەڵستکار بۆ رووخاندنی ناوەندی سەرکردایەتی بەڕێوە دەچێ. لەم بارەوە دەکرێ ئاماژە بە چەند نموونە بکرێ: پیلان لە دژی هیتلەر (١٩٤٤)؛ لە دژی "نوری السعید" و مەلەک فەیسەڵ عێراق (١٩٥٨)؛ و لە دژی ژەنەراڵ عەبدولکەریم قاسم لە عێراقدا (١٩٦٣).

## Northern Tier
## پشتێنە (ئاڵقە)ی باکوور

ئاڵقەی باکوور یان پشتێنەی باکوور زاراوەیەکی رۆژئاواییە کە بۆ ئاماژە بە وڵاتانی تورکیا، ئێران و پاکستان کە بە بەربەستێک لە بەردەم پەرەگرتنی نفووزی سۆڤیەت لە رۆژهەڵاتی نێوەڕاستدا دەژمێردران، کەڵکی لێ وەردەگیردرا. ئەم سێ وڵاتە وێڕای بەریتانیا ئەندامی رێکخراوی پەیمانی ناوەندی (سەنتۆ) بوون.

## Diplomatic Protection
## پشتیوانی سیاسی

بریتیە لە ئەرک و هەوڵی دەوڵەتێک لە لای دەوڵەتێکی تر بەمەبەستی دەستەبەرکردنی مافی هاووڵاتیانی خۆی و پشتیوانیکردن لەوان، کە لە لایەن وڵاتێکی بیانیەوە، مافیان پێشێل کراوە یان دەستدرێژی کراوەتەسەر ماڵ و گیانیان.

## Credibility
## پێگە (مەتمانە)

ئەو رادە چاوەڕوانیەی کە هۆکارەکانی پێوەندیدار بە بەڵێنێک لە مێشکی کەسێکی دیکەدا پێکی دێنێ و، ئەو چاوەڕوانیەش، کاتێک دێتە دی کە هەل ودەرفەتی بۆ برەخسێ. ناکامی

لە جێبەجێ کردنی ئەم چاوەڕوانیەدا، زۆرجار بە کەڵێنی پێگە ناودێر کراوە. زاراوەی شیاوبوونی مەتمانە لە راڤە ستراتیژییەکانی ئەمەریکا لە دەیەی ۱۹۵۰دا پێک هات. واتە وەک چەمکێک لە ستراتیژیی کاریگەری پێشگیرانە لە بەرامبەر یەکیەتیی سۆڤیەت و چین لە بواری ئاسایشی ویلایەتەیەکگرتووەکان و بەڵێنیەکانی ئەمەریکا لە بەرامبەر هاوپەیمانەکانی لە ئەورووپا و ئاسیادا هاتە ئاراوە.

**پێکدادانی شارستانیەتەکان؟** **The Clash Of Civilizations**

تیۆری سامۆئیل هانتینگتۆن، مامۆستای زانکۆی هارڤاردە.

ناوبراو کۆتایی شەڕی سارد بە دەستپێکی قۆناغێکی نوێی "پێکدادانی شارستانیەتەکان" دەزانێ و، بەپێی ئەم تیورە، زۆر لە رووداوەکانی ئێستا بە شێوەیەک راڤە دەکا کە لە خزمەت بەهێزبوونی گریمانەکانی تیۆرە نوێیەکەی دابێ. ناوبراو شارستانیەتەکان بە سەر شارستانیەتی رۆژئاوا، کۆنفۆسیۆسی، ژاپۆنی، سلاڤی، هیندۆ، ئۆرتۆدۆکس، ئەمەریکای لاتین و لە پەراوێزیشدا، شارستانیەتی ئەفریقیی دابەش دەکا. بە بڕوای هانتینگتۆن، دژایەتیی نێوان ئەو شارستانیەتانە دەبێتە سەرچاوەی شەڕ لە داهاتوودا و جێگای یەکەی سیاسی دەوڵەت _ نەتەوە دەگرێتەوە. بە بڕوای هانتینگتۆن، پێکدادانی شارستانیەتەکان، سیاسەتی زاڵی جیهانی و دوایین قۆناغی گەشەی پێک هەڵپژانەکانی چاخی نوێ پێک دێنێ، چوونکە:

✱کێشەی شارستانیەتەکان بنەڕەتیە

✱وشیاریی شارستانیەتی بەرەو زیاد بوون دەڕوا

✱ژیانەوەی ئایین وەک ئامرازێک بۆ پڕکردنەوەی "بۆشایی شوناس" روو لە گەشە کردنە؛

✱ هەڵسوکەوتی رۆژئاوا بۆتە هۆی بەرزبوونەوەی وشیاریی شارستانیەتی (لەلای ئەوانیتر)؛

✱تایبەتمەندییەکان و ناکۆکیە کولتوورییەکان نەگۆڕن؛

✱ ناوچەگەریی ئابووری و رۆڵی هاوپێوەندییە کولتوورییەکان روو لە گەشەیە؛

✱ئێستاکە هێڵی ترازانی نێوان شارستانیەتەکان جێگای سنوورە سیاسی و ئایدۆلۆژییەکانی شەڕی ساردی گرتۆتەوەو، ئەم هێڵانە وەک بروسکە بۆ قەیران و خوێنڕشتن وان.

دوای رووداوی ۱۱ی سێپتەمبەری ۲۰۰۱، گریمانەی پێکدادانی شارستانیەکان پێگەیەکی تایبەتی بۆ خۆی دەستەبەر کردووە.

## پێکەوە ژیانی ئاشتیانە *Peace Ful Coexitace*

زاراوەی پێکەوە ژیانی ئاشتیانە یەکێک لە بنەما گشتییەکانی سیاسەتی دەرەوەی سۆڤیەت لە هەمبەر وڵاتانی سەرمایەداری لە پاش شەڕی یەکەمی ودووهەمی جیهانی بوو. یەکەمین نیشانەی پێکەوە ژیانی ئاشتیانە بۆ یەکەمجار لە دەیەی ١٩٢٠دا سەری هەڵدا. ئەو کات لنین ئاماژەی بە پێویستی پێکەوە ژیانی ئاشتیانە و شەڕنەکردنی کاتی لەگەڵ وڵاتانی سەرمایەداری کرد، بەڵام لنین بڕوای بە پێکەوە ژیانی بەردەوام و هەمیشەیی نەبوو. ئەم حاڵە لە ساڵی ١٩٥٠ بۆ خرۆشچۆف و دەزگای ڕێبەری سۆڤیەت گەورەترین ڕاستی جیهان لە دوای شەڕی دووهەمی جیهانی بوو. دوو بەرەی دژ بە یەک نەیان دەتوانی لەگەڵ یەکتردا شەڕی ئەتۆمی بکەن، بۆیە ناچار بوون فێری پێکەوە ژیانی ئاشتیانە لەگەڵ یەکتردا بن، لە سەرەتاکانی دەیە ١٩٧٠دا، پێکەوە ژیانی ئاشتیانە گەشەی سەند و بوو بە سیاسەتی سڕینەوەی گرژی و ئاڵۆزی. وا پێدەچێ کە تیۆری "پێکەوە ژیانی ئاشتیانە"، تیۆرەکانی مارکسی ــــ لنینی سەبارەت بە دژایەتیی شێلگیرانەی نێوان کۆمۆنیزم و کاپیتالیزمی وەلا نابێ، لە سەردەمی خرۆشچۆفدا دەیانگووت کە پێکەوە ژیانی ئاشتیانە، وازهێنان لە ئامانجی دوا ڕۆژی جیهانی سۆسیالیستی نیە، بەڵکوو تەنیا کۆمەڵێک ڕێگاچارەی دیکە بۆ گەیشتن بە سۆسیالیزمە. سۆسیالیزم لە ڕێگای شەڕەوە سەرناکەوێ، بەڵکوو سوسیالیزم بە هۆی کێبەرکێی ئاشتیانەی ئابووری بە ئامانجەکانی خۆی دەگا. دەستکەوتە ئابوورییەکانی یەکیەتیی سۆڤیەت، بردنەسەری ئاستی ژیانی خەڵک تا ئەو پەڕی خۆی و تەکنەلۆژیای پێشکەوتوو دەبنە هۆی ئەوەی کە سۆسیالیزم لە هەموو جیهاندا لایەنگر و دۆست پەیدا بکا، بەتایبەتی لەو حاڵەتانەدا کە ڕۆژئاوا تووشی قەیرانێکی قووڵی ئابووری بوو بێ و نەتوانێ خۆی لێ دەربازکا، خرۆشچۆف لە بیستەمین کۆنگرەی حیزبی کۆمۆنیست لە ساڵی ١٩٥٦دا، جگە لە ڕاگەیاندنی سڕینەوەی ستالینیزم، سیاسەتی دەرەوەی یەکیەتیی سۆڤیەتیشی لە سەربنەمای پێکەوە ژیانی ئاشتیانە و تیۆری "ڕێگا جیاوازەکان بۆ گەیشتن بە سۆسیالیزم"ی داڕشت. بەپێی ئەم سیاسەتە پێویست ناکا حیزبە کۆمۆنیستەکان لە هەموو شوێنەکاندا بۆ گەیشتن بە دەسەلاّت، لە ڕێگا شۆڕشگێرانەکانی مارکس و شەڕە نێوخۆییەکان کەڵک وەرگرن. بۆ وێنە حیزبە کۆمۆنیستە گرنگەکانی جیهان لە ئیتالیاو

فەرەنسا، دەتوانن لە ڕێگای پەرلەمانەوە بگەنە دەسەلاّت و تەنانەت لە ولاّتانی جیهانی سێهەمیشدا شەڕە ڕزگایدەرە نەتەوەییەکان تەنیا ڕێگای گەیشتن بە دەسەلاّت نین. بە گشتی نابێ ئەوەندە لایەنگری لەم شەڕانە بکرێ کە ببنە هۆی کێشەو ئاژاوە نانەوە لە جیهاندا.

سیاسەتە نوێکانی خرۆشچۆف بوون بە هۆی تووڕەبوونی ڕیبەرانی چین. ماو سەرەڕای ئەوەی بۆ خۆی ڕەخنەی لە هەڵەکانی ستالین دەگرت، بەلاّم هێرشکردنی خرۆشچۆفی بۆ سەر ستالین بەلاوە پەسند نەبوو. لە ڕوانگەی ماو، قسەکانی خرۆشچۆف بوون بە هۆی هەڵگەڕانەوەی پۆلۆنیاو هەنگاریا لە بەرەی سۆسیالیزم و بەرەی سەرمایەدارییان دڵخۆش کردووە. جگە لەمە، هێرشکردن بۆ سەر ستالین بەبێ لەبەرچاونەگرتنی هەل و مەرج و سەردەم و بەبێ تاوانبارنەکردنی ڕیبەرانی دیکەی سۆڤیەت، نادادپەروەرانە بوو. لە ڕوانگەی چینیەکانەوە ستالین هەرچی بێ، ڕێبەرێکی سۆسیالیستی ئەو قۆناغە بووە.

لەمەش گرنگتر، پێداچوونەوەی خرۆشچۆف بەسەر مارکسیزم ـــــــ لنینیزم دابوو. لنین دەیگووت مادام چەوسانەوەی ئەمپریالیستی ـ کاپیتالیستی لە ئارادایە، هیچ پێکەوە ژیانێکی ئاشتیانە ناتوانێ لە گۆڕێ دابێ. لە حاڵێکدا ئێستا کە گەورەترین و گرنگترین حیزبی کۆمۆنیستی جیهانی، باسی لە " جیهانی بە بێ شەڕ" دەکرد کە لەم جیهانەدا، تەنانەت شەڕە نێوخۆییەکانیش کۆتاییان پێ دێ.

ولاّتانی بەرەی سۆڤیەت چۆن دەیانتوانی پشت لەو چەندها میلیۆن دۆستانەی خۆیان بکەن کە لە پێناوی ڕزگاری ولاّتی خۆیاندا خەباتیان دەکرد؟ بە تایبەتی لە جیهانی سێهەمدا ئەم قوربانیانەی ئەمپریالیزم بۆ ڕزگاربوونی خۆیان هیچ هیوایەکیان جگە لە شێوازە تاقیکراوەکانی خەباتی شۆڕشگێرانە نەبوو.

ئەم کێشانە لە کۆنگرەی حیزبە کۆمۆنیستیەکان کە لە ساڵی ١٩٥٧ لە مۆسکۆدا بەرێوە چوو، هاتنە بەرباس. کۆنگرە لە کۆتایی کارەکانی خۆیدا بەپێی ڕەوشی ناو کۆنگرە، ڕاگەیەنراوێکی سازشکارانەی دەرکرد کەهەم دانی بە شێوازی " پەرلەمانی" و هەم دانی بە شێوازی "شۆڕشگێرانە" بۆ گەیشتن بە دەسەلاّت دانا.

بیروڕاکانی دەوڵەتی کۆمۆنیستی چینیش لەمبارەوە گرنگن: مەبەستی ماو لەم باس و خواسانە شەڕێکی هەمەلایەنە لەگەڵ سەرمایەداری نەبوو، بەڵکوو مەبەستی ماو ئەوە بوو کە دەبێ

یەکیەتیی سۆڤیەت لە دەسەلاّت و هێزی خۆی بۆ بەرنگاری کردنەوەی شێلگیرانە لەگەلّ رۆژئاوا و بە قازانجی بەرەی سۆسیالیزم و لەوانەش چین کەلک وەرگری. بەلاّم ریّک لەو کاتەدا کە ماو لەسەر پێویستی هەلّوێستێکی شۆڕشگێرانە لە بەرامبەر رۆژئاوادا، پێی دادەگرت، خرۆشچۆف بەتەمای رێگایەکی نەرم و هێمنانەتر بۆ گەیشتن بە پێکەوە ژیانی ئاشتیانە لەگەلّ ئەمەریکادا بوو، خرۆشچۆف زیاتر بیری لە بەرژەوەندییەکانی سۆڤیەت وەکوو بەرلین و . . . هتد، دەکردەوە و نەی دەویست بە نوێنەرایەتیی لە لایەن چینەوە، دوژمنی سوێند خواردووی ئەمەریکا لە دژی واشینگتۆن بدوێ و پێوەندییەکە بشێوێنێ. کەواتە شتێکی ئاسایی بوو کە کە بە خۆشتربوونی پێوەندیی نێوان سۆڤیەت و ئەمەریکا، پێوەندی نێوان چین و سۆڤیەت بەرەو کزی بروا.

لە تەمموزی ١٩٥٨دا ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و بەریتانیا هێزەکانی خۆیان بۆ پشتیوانیکردن لە حکومەتە دەستە راستیەکانی رۆژهەلاّتی نێوەڕاست ، ناردە ئەم ناوچە. چینیش لە بەرامبەر ئەم کردەوەدا هەڕەشەی لە ئەمەریکا و لە بەریتانیا کرد کە ئەگەر پاشەکشە نکەن، زەربەیان وێ دەکەوێ، بەلاّم دژکردەوەی سۆڤیەت هێمنانە بوو و خرۆشچۆف بە تەما نەبوو توورە بێ!

لە مانگی ئابی ١٩٥٨دا چین تەقەی لە دوورگەکانی کومۆی و ماتسۆ کرد (لە نێوان چین و تایوان) کە ئیستا هەر لە ژێر دەستی کومین تانگدا بوون، ئەمەریکا توورە بوو و رایگەیاند کە هەروا پشتیوانی لە کومین تانگ دەکا، بەلاّم کاتێک سۆڤیەت رایگەیاند کە پشتیوانی لە چینی ئاژاوەگێڕ ناکا، چین دەستی لە بۆمبارانکردنی ئەو دوورگانە هەلّگرت.

لە حوزیرانی ١٩٥٩دا، یەکیەتیی سۆڤیەت رێککەوتننامەی خۆی لەگەلّ چیندا کە سەبارەت بە پەرەپێدانی چەکە ناوەکیەکان بوو هەلّوەشاندەوە، بۆ ئەوەی بەروالّەت سیمای ئاشتی خوازانەی خۆی بە ئەمەریکا پێش لە کۆبوونەوەی خرۆشچۆف لەگەلّ ئایزینهاڤێر لە کەمپ دەیڤیددا پیشان بدا.

لە مانگی ئایاری ١٩٦٠یشدا، رووداوی U-٢ (فرۆکەی سیخوڕی ئەمەریکا ) بەرووسەکانی سەلماند کە ناکرێ بروا بە ئەمەریکا بکرێ. خرۆشچۆف بە بەجێ هێشتنی کۆبوونەوەی کۆنفرانسی سەرۆکان لە پاریسدا، تووڕەیی و نارەزایەتیی خۆی دەربڕی، بەلاّم چینیەکان پێیانوابوو خرۆشچۆف هەلی لەدەست داوە و دەیتوانی ئیمتیازی زیاتر لە ئەمەریکا

وەرگرێ. خرۆشچۆف پێیوابوو کە شەڕخوازی ماو لە بەرامبەر رۆژئاوادا زۆر مەترسیدارە و، دەیگووت: "ئەوانەی کە دەڵێن ئەمەریکا بەبرێکی ناسکە ، چاک لەوە تێدەگەن کەئەم بەبرە ناسکە، خاوەنی ددانی ئەتۆمیە". سیاسەتی پێکەوە ژیانی ئاشتیانە لە سەردەمی خرۆشچۆفەوە تا هەرەسهێنانی یەکیەتیی سۆڤیەت، یەکێک لە بناغەکانی سیاسەتی دەرەوەی ئەم وڵاتە بوو.

## پارێزراویی سیاسی *Diplomatic Immunity*

پارێزراوی بەم واتایەیە کە خاوەنەکەی لە بەدوادا گەڕان و چاوەدێریکردنی یاسا و بەڕیوبەرانی دەوڵەتێکی دیکە پارێزراوە. لە یاسای گشتی نێودەوڵەتیدا، شوێنی نیشتەجێ بوون و ئەرکی دیپلۆماتەکان لە پشکنین و چاوەدێریکردنی بەڕیوەبەرانی وڵاتی خانە خوێ، پارێزراوە. پارێزراوی دیپلۆماسی دوو شێوەی گشتی هەیە: یەکیان پارێزراوی لە بەرامبەر هەڵکوتانەسەر یان هێرش کردنە سەر Iniolability دووهەمیشیان پارێزراوی لە بواری دادە Judical Immunity. لە زاراوەی یاسای نێودەوڵەتیدا پارێزراوی لە هەڵکوتانەسەر بە واتای پێشێل نەکردنی ڕێزی شوێنێک یان کەسێکە. ڕێزی شوێن بە واتای نەچوونە ژوورەوەی بێ مۆڵەت و ڕێزی کەسیش بە واتای پێشێل نەکردنی ئازادی و مافەکانیەتیی. ڕاسپێردراوی دیپلۆماتێک لە دەست بەسەرکردن پارێزراوە و بە پێی ماددەی ٢٩ی ڕێککەوتننامەی ڤیەننا (١٩٦١)، دەوڵەتیی خانەخوێ دەبێ ڕەچاوی ڕێزی دیپلۆماتی بکا، و پێش بە هێرشکردنە سەر ئازادی و کەسایەتیی دیپلۆماتی بگرێ. هەڵبەت ئەمە نابێ بێ سنوور بێ، چوونکە پاراستنی ئاسایشی وڵاتی خانەخوێش گرنگە، بۆیە پارێزراویی سیاسی چوارچێوەی هەیە. کۆمیسیۆنی یاسایی کۆنفرانسی ڤیەننا لە لێکۆڵینەوەکانی خۆیدا ئەم چوارچێوەی تاوتوێ کردووە، بەڵام نە خراوەتە ناو دەقی ڕێککەوتننامەی ١٩٦١ وەوە. ئەو شتەی کە لە لێکدانەوەی وتووێژەکانی کۆمیسیۆن جێگەی سەرنجە، ئەو حاڵانەن سەبارەت بە سیخوڕی و جینایەتن. بەگشتی ژماردن و دیاریکردنی هەموو ئەو حاڵانەی کە دەبنە هۆی سڕینەوەی پارێزراویی، ڕەنگە کارێکی زۆر ئەستەم بێ. بەڵام دەبێ خاوەنی دوو تایبەتمەندیی بن تاکوو بنەمای پارێزراویی تووشی چەواشە نەکرێ. ئەم دوو تایبەتمەندییە بریتین لە : "گرنگیی کردەوە لە ڕوانگەی ئاسایشی وڵات و کەسەکان" و " دەستبەجێ بوون". " تاوانی ئاشکرا" پێوەری هەڵسەنگاندنی هەر

دوو تایبەتمەندییەکەیە. گومان لەوەدانیە کە نابێ پۆلیس بە بیانووی ئەوەی کە کەسێک پارێزراوی سیاسی هەیە، تەنیا سەیری جیناتە کە بکاو هیچی کارێکی دیکە نەکا. ئەرکی پۆلیسە کە پێش بە تاوان بگرێ و پۆلیس دەتوانێ دیپلۆمات دەستبەسەر بکا. بۆ ئەوەی هیچ جۆرە کێشەیەک نەیاتە ئاراوە، پۆلیس لە دوای دڵنیابوون لە ناسنامەی ئەو دیپلۆماتەی کە بە پێچەوانەی یاساوە جووڵاوەتەوە، کەسەکە ئازاد دەکا وشتەکە دەگەیەننە وەزارەتی کاروباری دەرەوە. وەزارەتی دەرەوە دەتوانێ دیپلۆمات ئاگادار بکاتەوە یان هێندێک جار کە تاوانەکە گەورەیە رەنگە ئەو دیپلۆماتە وەدەرنرێ.

جۆرێکی دیکەی پارێزراویی، پارێزراویی دادە. واتە یاساکانی وڵاتی خانەخوێ، بە پێچەوانەی خەڵکی ئەو وڵاتەو هاووڵاتیانی بیانی دیکەش، راسپێردراوە دیپلۆماتیکەکان ناگرێتەوە. ئەو کردەوانەی کە دیپلۆمات بە بۆنەی پۆست یان بە ناوی دەوڵەتی خۆیەوە ئەنجامیان دەدا، پێوەندییان بە سیستەمی یاسایی وڵاتی خۆیەوە هەیە. لە هەردوو حاڵەتەکەدا دادگای وڵاتی خانەخوێ، ناتوانێ دیپلۆمات دادگایی بکا. بەڵام لە پاڵ ئەم کارانەشدا، راسپێردراوی دیپلۆماتی کۆمەڵێک کاری تاکەکەسیی دەکا کە سەبارەت بە هەرکام لەم کارانە دەبێ سنووری پارێزراوی لە بەدواداگەڕان و جێبەجێ کردنی بڕیارەکان روون بکرێتەوە.

پارێزراوی سیاسی لە بواری یاساکانی سزادا، بە شێوەی رەهایە (پارێزرواییی سزادان) نە پۆلیس و نە بەرپرسانی داد ناتوانن لێکۆڵینەوە لە دیپلۆمات بکەن. رێککەوتننامەی ڤیەننای ١٩٦١ لەمبارەوە بەراشکاوی دواوە و ڕای زانایانی بواری یاسا و هەروەها رەوتی دادیش هەر لەم ئاراستەدایە. بەرپرسانی داد یان پۆلیس بەپێی تاوانەکە، کێشەکە بە ئاگاداری وەزارەتی دەرەوە دەگەیەنن تاکوو ئەوانیش باڵوێز ئاگاداربکەنەوە.

راسپێردراوە دیپلۆماتیەکان تووشی کردەی یاسایی تایبەتیش دەبن، بەڵام بە پێچەوانەی پارێزراویی بواری سزادان کە رای گشتی لە سەری کۆکە؛ پارێزراویی شارستانی دژایەتی زۆری لەگەڵ دادەکرێ. زۆربەی وڵاتەکان پارێزراوی داد بەسەر هەموو کردە یاساییەکانی راسپێردراوی دیپلۆماتی پەرە پێدەدەن، بەڵام چوارچێوەیەکیش بۆ ئەم پارێزراوییە دیاری کراوە. کە کێشەکانی سەبارەت بە خاوەندارێتی، کرێی سامانە نەگوازراوەکان، کێشەکانی سەبارەت بە میرات و تێکۆشان و چالاکیی سەربەستانەی تاکەکەسیی دیپلۆمات لە خۆدەگرێ. سامانە نەگوازراوەکان لە

ژێردەسەلاتی یاساکانی ئەو وڵاتەدان. ئەگەر سامانی نەگوازراوە لە وڵاتی خانەخوێدا بە ناوی وڵاتی ڕاسپاردەوە کرابێ، لەم حاڵەتەدا دەبێتە سامانی وڵاتی بیانی (ڕاسپاردە)، کە پارێزراویی داد دەیگرێتەوە. بەڵام ئەگەر دیپلۆمات شتێکی نەگوازراوەی بە ناوی خۆیەوە کرد بێ، لە حاڵەتی سەرهەڵدانی کێشەدا پارێزراوی نایگرێتەوە. ماددەی ٣١ی ڕێککەوتننامەی ڤیەننا بە ڕاشکاوی باسی ئەوەی کردووە کە پارێزراوی ئەم حاڵەتە ناگرێتەوە، مەگەر ئەوەی ڕاسپێردراوی دیپلۆماتیک ئەم سامانە نەگوازراوەی بە ناوی وڵاتی خۆیەوە کردبێ یان بۆ باڵوێزخانەی کڕیبێ.

ئەگەر هات و ڕاسپێردراوی دیپلۆماتێک میراتگر یان بەڕێوەبەریی ئیدارەی تەرەکە یان پارێزەری بەرژەوەندی سامانی نەگوازراوەی وڵاتی خانەخوێ بێ، پارێزراویی داد نایگرێتەوە. هەرکاتێک کە ڕاسپێردراوی سیاسی بۆخۆی (نەوەکوو دیپلۆمات) جگە لە ئەرکی ڕەسمیی خۆی خەریکی بازرگانی کردن و شتی دیکە لە ناو وڵاتی خانە خوێدا بێ، لەو کێشانەی کەلەم پێوەندییەدا تووشیان دەبێ، ناتوانێ لە پارێزراوی دیپلۆماسی کەڵک وەرگرێ. لەو سێ حاڵەتانەی کە ئاماژەیان پێکرا بڕیارەکانی دادگای وڵاتی خانەخوێ لەسەر دیپلۆمات جێبەجێ دەبێ. بەو مەرجەی کە لەو بڕیارانەدا پارێزراویی تاکەکەسیی دیپلۆمات وماڵەکەی هیچ زیانێکیان لێ نەکەوێ.

خۆبواردن لە پارێزراوی دەبێ بەپێی ڕەزایەتیی دەوڵەتی ڕاسپاردە بێ (ماددەی ١ی ڕێکەوتننامەی ڤیەننا). تەنانەت ئەگەر ڕاسپێردراوێکی دیپلۆماتی ئامادە بێ بۆ بەرگری کردن بچێتە دادگا، دەبێ ڕازیبوونی دەوڵەتەکەی خۆی کە لە لایەن باڵوێزەوە ڕادەگەیەنرێ، ئاراستە بکا، بە پێچەوانەی ئەم حاڵەتە، دادگا گوێ ناداتە قسەی ڕاسپێردراو. چوونکە پارێزراویی داد لە بوارەکانی " بەشداریکردن لە دادگا" و جێبەجێکردنی بڕیارەکان" لەگەڵ یەکدا جیاوازییان هەیە، بۆیە خۆش بوون لە پارێزراویی بۆبەشداریکردن لە دادگادا، جێبەجێکردنی بڕیارەکانی دادگا لە خۆناگرێ و دەوڵەتی ڕاسپاردە دەبێ بە جیا لەگەڵ بەشی دووهەمدا، ڕازیبوونی خۆی دەربڕێ.

## پێشبڕکێی چەک و چۆڵ

بە کێبەرکێی چەک وچۆڵیی نێوان (لانیکەم )دوو لایەنی شەڕێک دەگوترێ. پرۆسەی بنەرەتیی کێبەرکێیەکی چەک و چۆڵ، " پارادایمی کردەوە ــ دژکردەوە"یە. ئەم کێبەرکێیانە بە

تووندرتیژی دەست پێدەکەن و بەشەڕیش کۆتاییان پێدێ. کێبەرکێی دەریایی نێوان ئیمپراتۆری ئەڵمانیا و بەریتانیا، بوو بە سەردتایەک بۆ دەستپێکردنی شەڕی یەکەمیی جیهانیی.

پێشبڕکێی چەک و چۆڵ تەنیا، مەرجی پێویست و سەرەکی دەست پێکردنی شەڕنیە. لەلایەکی دیکەوە ئەو تیۆرانەی بەتووندی لە ژێر کاریگەری بیروبۆچوونەکانی ستراتیژی "گێرانەوە"دان، بڕوایان بەوە هەیە کە بۆ پێشگیری کردن لە هەڵایسانی شەڕ، هەبوونی چەک وچۆڵ لە رادەیەکی کەمدا، شتێکی پێویستە. بەواتایەکی دیکە هاوسەنگینی چەک وچۆڵ لە نێوان دوو رکابەردا، دەبێتە هۆی ئەوەی کە دوو رکابەرە پێکەوە شەڕ نەکەن و ئەوە لە دەستڕاگەیشتنی گرنگترە لە دەستڕاگەیشتنی لایەنەکان بە چەک وچۆڵ لە رادەیەکی کەمدا گرنگترە و، لاسەنگی لە نێوان دوو هێزە، ئەگەری دەست پێکردنی شەڕ زۆرتر دەکا.

## پاسپۆرت Passport

بەڵگەیەکە کە لە لایەن دەوڵەتی ولاتێکەوە دەدرێتە هاولاتیەکی ئەو ولاتە و رێگا بەو کەسە دەدا کە لە ولات بچێتە دەرەوە. ئەم بەڵگە دەیسەلمێنێ کە ئەو کەسە خەڵکی ئەو ولاتەیە.

پاسپۆرت چەند جۆری هەیە:

١ـ پاسپۆرتی سیاسی ( Diplomatic Passport )، تایبەت بە بەرپرسانی پایەبەرزی ولات و ستافی دیپلۆماسی ئەو ولاتەیە.

٢ـ پاسپۆرتی ئەرک بەرێوەبردن (Serrice Passport ) تایبەتە بە راسپێردراوە دەوڵەتیەکان بۆ بەجێگەیاندنی ئەرکەکانیان لە دەرەوەی ولات.

٣ـ پاسپۆرتی ئاسایی (نیشتمانی ) تایبەتە بە هاوولاتیانی ئاسایی ولات.

ئەوانەی کە پاسپۆرتی سیاسی و ئەرک بەرێوە بردنیان هەیە، خاوەنی ماف و ئیمتیازی تایبەتی و مافی پارێزراوی ولاتە بیانیەکانن.

پاسپۆرتی سیاسی و ئەرک بەرێوەبردن لەلایەن وەزارتی کاروباری دەرەوە و پاسپۆرتی ئاساییش لە لایەن پۆلیسەوە دەردەچێ کە سەربە وەزارتی نێوخۆیە.

## پێکهاتن(سازان) Conciliation

پرۆسەی چارەسەری ئاشتیانەی کێشەیەکی نێودەوڵەتیی لە لایەن، لایەنێکی سێهەمەوەیە کە لەلایەن کۆمیسیۆنێکی هەمیشەیی یان کۆمیسیۆنێکی تایبەتیی پێکهاتن کە هەدوولا لەسەری کۆکن، دیاری دەکرێ و راستیەکان بەتەواوەتی و بێلایەنانە روون دەکاتەوە راپۆرتێک بۆ چارەسەری کێشەکە ئامادە دەکا ( دوولایەنی کێشەکە ناچار ناکرێن کە دەبێ پێشنیارەکان جێبەجێ بکەن). پێکهاتن لە نێوبژیوانی رەسمیترو نەگۆڕترە.

## Jihad (Holy War) جیهاد

زاراوەی جیهاد بەو واتایانە کەڵکی لێ وەردەگیرێ یان پێناسە دەکرێ:

١ـ شەڕ لەگەڵ کافرەکان لە پێناو پاراستنی ئایینا کە، لە قورئاندا زیاتر بە "قتال" باسکراوە. جیهاد لە مەزهەبی شیعەی دوازدە ئیمامیدا تایبەتە بە سەردەمی پێغەمبەر و ئیمامەکانە.

٢ـ "قتال" بۆ پشتیوانی لە دین ، کردەوەیەکی رەوایە.

٣ـ شەڕی موسوڵمانان لەگەڵ لایەنەکان بەمەبەستی بانگهێشتی ئەوان بۆ ئایینی ئیسلام یان بەمەبەستی بەرگری لە سەربەخویی حکومەتی ئیسلام و موسوڵمانان و، هەروەها شەڕ لەگەڵ ئەو سەرهەڵداوە نێوخۆییانەی کە شەڕی بە کۆیی و چەکدارانە لە دژی حکومەتی یاسایی ئیسلام وەڕێ دەخەن.

٣ـ بەخشینی گیان وماڵ بو بەرزکردنەوەی ئیسلام و بەڕێوەبردنی ڕێوشوێنە ئایینیەکان.

٥ـ هەوڵ و ماندوو بوون لە ڕێگای خوادا، واتە پروپاگەندەی ئیمان و بڵاوکردنەوەی بیری خوا پەرستی و بوژاندنەوە و بەرزراگرتنی وشەی حەق لە جیهاندا.

جگە لەو واتایانە، جیهاد بە واتای ڕێنوێنی کردن و خۆراهێنانی دەرونیش دەگوترێ. جێهاد "واجب کفای"یە. جیهادی ئیسلامی دووجۆرە: شەڕی بەرگری لە بەرامبەر ئەو دوژمنانەی کە داگیرکارن و، هەروەها شەڕی ڕزگاریدەر بە مەبەستی بانگهێشتی کەسانی تر بۆ ئیسلام و بەهێزکردنی بزووتنەوەی ڕزگاریدەری نەتەوە ژێر دەستەکان لە ڕێگای لاواز کردنی پاڵپشتە ئایدۆلۆژییەکانی ڕژێمە سیاسیە داگیر کەرەکانیان.

زاراوەی تر کە لەو پێوەندییەدا هەن، بریتین لە:

جیهادی سەرەتایی: جیهادێک کە بە مەبەستی بەرگری نەبێ و، لە جۆری شەڕە دەرەکیەکان بێ.

جیهادی بچووک : بەمانای شەڕ لەگەڵ کافرەکان و پێکدادانێکی بچووک.

جیهادی گەورە: بەمانای شەڕی گەورەو؛ بەمەبەست لەمەش شەڕ لەگەڵ نەفس و هەوڵدان لە پێناوی پێکهێنانی چاکسازی لە خوودی مرۆڤدایە.

جیهادی بانگهێشت: جۆرێک لە شەڕی هێرشبەرانەیە بەمەبەستی بڵاوکردنەوە وپەرەپێدان بە ئایینی ئیسلام. کە بەمەبەستی بەرگریکردن لە ناوچەی ژێردەسەلاتی ئیسلام و پێشگیری لە داگیرکران و پاراستنی گیانی دانیشتووانی وڵاتانی ئیسلامیدا بەڕێوە دەچێ.

## جیهانی سێهەم — The Third World

زاراوەی جیهانی سێهەم بۆیەکەمین جار لە لایەن ئابووریزانێکی فەڕەنسی بە ناوی "ئاڵفرێد سووی" کەڵکی لێ وەرگیرا. بەو وڵاتانە دەگوترێ کە لە بواری ئاستی گەشەکردنەوە لە بارودۆخێکی خوارتر لە دەسەڵاتە گەورە و ناوەندەکانی جیهاندان.

زۆربەی ئەو وڵاتانە بۆ ماوەیەکی زۆر لە ژێر دەسەڵاتی داگیرکەراندا بوون و، تا ئێستاش نەیانتوانیوە ئاسەوارەکانی ئەم دەسەڵاتە لە نێو بەرن.

## *جانتای دیپلۆماسی* — *Diplomatic Bag*

جانتای دیپلۆماسی بە کۆی ئەوشتانە دەگوترێ کە لە ڕێگای پۆستەوە بۆ دیپلۆماتە سیاسییەکان بەرێ دەکرێن. بە پێی ماددەی ٢٧ی ڕێککەوتننامەی ١٩٦١ ڤیەننا، دەوڵەتەکان دەبێ

ڕێگا بۆ گەیاندنی ئازاد و بە بێ ئاستەنگ بۆ ڕاسپێردراوە سیاسییەکانی وڵاتانی دیکە لە وڵاتی خۆیاندا لەگەڵ بەرپرسانی وڵاتی دیپلۆماتەکاندا خۆش بکەن. باڵوێزخانە دەتوانێ لە هەر ئامرازێکی گەیاندن کە دەستی وێ ڕابگا، کەڵک وەربگرێ. ئیستاکەش هێندێک لە دەوڵەتەکان لە ڕاسپاردەی سیاسی بۆ ئەم مەبەستە کەڵک وەردەگرن و ئەم ڕاسپاردە دەبێ پارێزراو بن. پارێزراویی ڕاسپاردەی سیاسی بەم واتایەیە کە بارەکەشی ( ئەو شتەی کە دەیهەوەێ بیگەیە نێ) دەبێ پارێزراو بێ و نابێ لە لایەن پۆلیسی ئەو وڵاتەوە یان هەر وڵاتێکی دیکە، کە ئەم کەسە بە پێیدا تێدەپەرێ و لەگەڵ ئەو وڵاتەدا پێوەندی دۆستانەی هەیە، بپشکێنرێ.

**جیهانی ئازاد** **Free World**

سیاسەتڤانانی ڕۆژئاوا بۆ پێناسەو ڕاڤەی جیهانی غەیرە کۆمۆنیست کەڵکیان لێ وەرگرتووە.

## Party

## حیزب

ڕێکخراوێکی سیاسیە کە هاوبیران و لایەنگرانی ئایدیایەک، بە پێی ویستی خۆیان، کۆ دەبنەوە و؛ ئاساییشە کە وشیارترین کەسەکانی چین یان توێژێکی کۆمەڵایەتیی خاوەن بەرژەوەندیی هاوبەش لەدەوری یەکتر کۆدەکاتەوە؛ دەربڕی ویست و بۆچوونەکانی ئەو چین یان توێژەیەو، دەبێتە ڕێبەری ئەو کەسانە لە خەباتی کۆمەڵایەتیدا. لەو پێوەندییەدا "پالۆمبراف"و "ڤانیر" پێیانوایە کە:

١ـ حیزب دەبێ خاوەنی ڕێکخراوە ناوەندی، ڕێنوێنیکەر ، جێگرتوو وبەردەوامەکان بێ.

٢ـ دەبێ حیزب خاوەنی ڕێکخراوە ناوچەییە جێگرتووەکان بێ و، لەگەڵ ڕێکخراوە ناوندییەکاندا پێوەندییەکی بەردەوامی هەبێ.

٣ـ دەبێ ڕێبەرە سەرەکی و ناوچەییەکانی حیزب سوور بن لەسەر ئەوەی کە دەسەڵاتی سیاسی لە هەموو وڵات ـ بەتەنیایی یان بە هاوکاری حیزبەکانی تر ـ بەدەستەوە بگرن.

٤ـ دەبێ حیزب خاوەنی پشتیوانی جەماوەری خەڵک بێ.

کورتە مێژوو: حیزبە سیاسیەکان هاوکات لەگەڵ ڕێوشوێنی سیستەمی هەڵبژاردن و پەرلەمانیدا لە دایک بوون و پەرەیان گرت. ئەوانە سەرەتا لە ژێر ناوی کۆمیتەکانی هەڵبژاردن سەریان هەڵدا و، ئەرکی ئەوان، کۆکردنەوەی متمانەی پێویست بۆ پالێوراوەکانی هەڵبژاردنەکان بوو. هەروەها لە

چوارچێوەی پەرلەمانیشدا گروویی پەرلەمانی لە نوێنەرانی بیروبۆچوونێکی هاوبەش بە مەبەستی کارێکی هاوبەش پێک دێنن. ئەو نزیکایەتیەی نوێنەران لە ئاستێکی بەرزدا بە شێوەیەکی سروشتی بوو بە هۆی ئەوەی کە کۆمیتەکانی هەڵبژاردن لەگەڵ یەکتردا رێک بکەون. بەم شێوە یەکەمین حیزبە سیاسیەکان هاتنە ئاراوە. پاشان ئەو رژێمانەش کە پەرلەمان و سیستەمی هەڵبژاردنیان نەبوو، یان ئەو رژێمانەی کە سیستەمێکی نیمچە هەڵبژاردن یان نیمچە پەرلەمانیان بوون، یان ئەو کاتە کە پالێوراوێک لە بەرامبەر دەنگی دەنگداراندا رادەوەستا، یان ئەو کاتە کە حیزبێک هەموو کورسیەکانی پەرلەمانی بەدەست دەهێنا، لە حیزبە سیاسیەکان کەڵک وەرگیرا. سەرهەڵدانی حیزبەکان بە پەرەگرتنی هەڵبژاردنەکان و پەرلەمان بەستراوەتەوە. تاک حیزبی، بە شێوەیەکی روون، ئامرازێکە بۆ دیکتاتۆری، بۆ ئەوی کە رێوشوێنەکانی هەڵبژاردن و پەرلەمان دابرێژێ ورووخسارێکی دێمۆکراتێک بە خۆی ببەخشێ. وا پێ دەچێ کە سنووری نێوان رژێمە تاک حیزبی و رژێمە فرەحیزبیەکان بە شێوەیەکی روون دیاری نەکرا بێ. لە پێوەندی لەگەڵ حیزبدا چەندین زاراوە کەڵکیان لێ وەردەگیردرێ، کە گرنگترینیان بریتین لە:

پێڕەوی نێوخۆ : بریتیە لە کۆی ئەو یاسا و رێوشوێنانەی کە بەسەر نێوخوی حیزب یان رێکخراوێک دا زاڵن و، پێکهاتە و بینا و شێوازی کار و هیرارکیەت و چالاکیی ئەو حیزب یان رێکخراوە بەپێی ئامانجەکانیان دیاری دەکا. کە واتە لە پێڕەو وپرۆگرامی حیزبدا، کۆی رێوشوێن و پرەنسیپەکانی حیزب رەنگ دەداتەوە.

لە پێڕەوپرۆگرامدا شێوازی کارکردنی رێکخراوەکانی حیزب، شێوازی پێکهاتنی ئۆرگانەکان ورێبەرایەتیی حیزب، کۆنگرەکان وکۆنفرانسەکان و کۆبوونەوەکانیش باس دەکرێ.

حیزبی کەمینە و حیزبی زۆرینە: زاراوەی زۆرینەو کەمینە زیاتر بە حیزبی باڵادەست و حیزبی نەیاری ئەو لە سیستەمێکی سیاسیدا دەگوترێ. ئەمە ئاکام و نیشانەی رژێمە پەرلەمانیەکانە کە هەر حیزبێک کە زۆرینەی دەنگەکان بەدەست بێنێ، دەوڵەت پێکدێنێ و، حیزبێک کە زۆرینەی پەرلەمانی لەبەردەستدا نەبێ، ناتوانێ دەوڵەت پێک بێنێ.

سۆسیال دێمۆکرات: ناوی ژمارەیەک لە حیزبە مارکسیەکانە کە لە ئەورووپای ناوەندی، رۆژهەڵات و رۆژئاوادا بەر لە شەری یەکەمی جیهانی خەریکی چالاکی بوون.

یەکەمین حیزبی سۆسیال دێمۆکرات هی ئەڵمانیا بوو کە لە ژێر ناوی "حیزبی سۆسیال دێمۆکراتی چینی کرێکار " لە کونگرەی گشتی گرووپە سۆسیالیستەکانی ئەڵمانیا لە ئیزنباخ لەساڵی ۱۸٦۹ لە لایەن ڤیلهێلم لیب کۆنشت و ئۆگۆست بیبل دامەزرا.

سۆسیال دێمۆکراسی: سوسیال دێمۆکراسی بزوتنەوەیەکی سیاسی و رەوتێکی تایبەتیی حیزبیە کە لە وڵاتە جۆراوجۆرەکان و بەناوی جیاواز سەریان هەڵدا. بەڵام بەگشتی لە هەوڵی دەستبەرکردنی ئامانج و پرەنسیپەکانی سۆسیالیزم و دیموکراسی دان.

لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەمدا لە ئەڵمانیا کەسانێک خۆیان بە "سۆسیال دێمۆکرات " ناودەبرد کە جگە لە چاکسازیی سیاسی، خوازیاری چاکسازیی کۆمەڵایەتیش بوون؛ وەک گرووپی "چاکسازیخوازە کۆمەڵایەتیە دێمۆکراتیکەکان". لەبەرامبەر ئەوانیشدا، کۆمۆنیستەکان خۆیان بەلایەنگری شۆڕشی کۆمەڵایەتی دەزانی.

فالآنژ : فالآنژ زاراوەیەکی یۆنانیەو، بە بەشێک لە سوپای یۆنان دەگوترا. لە عۆرفی سیاسیدا، مەبەست لە فالآنژ، گرووپێکە کە بە شێوەیەکی زۆر پتەو بەیەکەوە گرێ دراون و، خاوەنی جۆرێک لە هەستی پتەوی گرووپین. حیزبی فالآنژ لە لوبنان و پێشتریش لە ئیسپانیادا هەبووە.

دروشمی حیزبی: بریتیە لە پەیامێکی کورت کە بەروونی و بەکورتی ئامانج وبابەتێکی گرنگ لە قۆناغ یان کاتێکی دیاریکراوی مێژوویدا کە لە بەردەم حیزبێک دایە، دەردەبڕێ. دەکرێ دروشم ئابووری یان سیاسی، ستراتیژی یان تاکتیکی بێ.

کۆمیتەی ناوەندی: ئۆرگانێکی هەمیشەیی و هەڵبژێردراوە کە لە ماوەی نێوان دوو کونگرەدا بە بەرزترین ئۆرگانی حیزبی دژمێردرێ و، چالاکیە سیاسی و رێکخراوەییەکانی حیزب بەڕێوە دەباو، لەبەرامبەر کۆنگرەدا بەرپرس و وڵامدەرە.

مانیفێست: ئەم زاراوە چەندین واتای تایبەتی هەیە. باوترین واتای ئەم زاراوە دەربڕینی بۆچوون و پەیامێکی دوورودرێژە کە دەکرێ لە لایەن حیزبێک یان گرووپێک، کەسایەتیەکان یان رێکخراوەکانەوە بلاّو بکرێتەوە. لە مانیفێستێکدا زیاتر ئەو دنیابینی، ئامانج و پرۆگرامی کارو بڕیارو پێشنیارانەی کە دەبێ جێبەجێ بکرێن، دەگونجێنرێ.

ئەو زاراوە هەروەها لە هێندێک بواردا بە واتای دەقێکی سیاسی کە ئامانجەکەی بابەتێکی روون و هەستیارە ولە نێو خەڵکدا بلاّو دەکرێتەوە، کەڵکی لێ وەردەگیردرێ.

خەباتی حیزبی: خەباتی حیزبی دووجۆرە: دەرەوەی حیزب و نێوخۆی حیزب. خەباتی دەرەوەی حیزب بە خەباتێک دەگوترێ کە حیزب بە مەبەستی ئامانجەکانی خۆی و بۆ جێبەجێکردنی ئەو ئامانجانەی کە لە پرۆگرامەکەیدا رەنگی داوەتەوە، بەڕێوەی دەباو؛ لە سێ جۆری گشتیی ئایدۆلۆژیک، سیاسی و ئابووریدا خۆی دەنوێنێ و، بە دوو شێوەی ئاشکراو نەهێنی بەڕێوە دەچێ.

خەباتی نێوخۆی حیزبی بە خەباتێک دەگوترێ کە بۆ بەهێزکردنی یەکگرتوویی حیزب؛ بەرگری لە ئایدۆلۆژیاو رێبازی سیاسی و رێوشوێنەکانی رێکخستن بەڕێوە دەچێ و، وەک خەباتی دەرەوەی حیزب بە دوو شێوەی ئاشکراو هێنی بەڕێوە دەچێ.

رێباز: یان پرۆگرامی حیزبێک بریتیە لە بەڵگەیەکی سەرەکی کە ئامانج و ئەرکەکانی حیزبی تێدا گونجێنراوە.

لە پرۆگرامدا ئاماژە بە رێگاچارەی گۆرانکارییە بنەڕەتی و شۆڕشگێرانەکان و شێواز و کەرەسەکانی گەیشتن بە ئامانج دەکرێ و، لە هێڵە گشتیەکانی خۆیدا، بەشێوەیەکی روون، لایەنە جۆراوجۆرەکانی ئەو ئامانجانەی کە دەبێ پێی بگات لە بوارە جۆراوجۆرەکانی وەک کشتوکاڵ وپێکهاتەی دەوڵەتی و کاروباری پێوەندیدار بە بابەتی نیشتمانی و نەتەوەیی و کاروباری کۆمەڵایەتی و خۆشگوزەرانی وپیشکەوتن و... هتد، شی دەکاتەوە.

لە زۆربەی پرۆگرامەکاندا بەشێکی تیۆری هەیە کە باس لە بنەما ئایدۆلۆژییەکان دەکا یان دیاردە سەرەکیەکانی قۆناغی هاوچەرخ شی دەکاتەوە.

میتینگ: زاراوەیەکە بە واتای چاوپێکەوتن بۆ وتووێژ لەسەر بابەتێک. میتینگ بە کۆبوونەوەیەکی تاڕادەیەک بەرفراوان دەگوترێ کە بۆ باس و دەربرینی بۆچوون لەسەر بابەتێک یان رووداوێکی سیاسی پێکدێ. یان بە واتای کۆبوونەوەی بەرفراوانی خەڵک لە شوێنێک بۆ گوێگرتن لە قسەو رای ئەو کەسانەی کە لە سەر رووداو و بابەتێک قسە دەکەن و، بەم شێوەش خەڵک راو بۆچوونی خۆیان دەردەبرن.

حیزبە تاکەکەسیەکان: ئەمجۆرە حیزبانە لە لایان کەسایەتیە بەتوانا و لێهاتوو و بەرپرسانی حکومەت دادەمەزرێن.

هێندێک جار گرووپ و حیزبەکان لە دەوری ئەو کەسایەتیە سیاسیانەی کە پۆستی ڕەسمی و دەوڵەتیان نیە، پێکدێن. ئەمجۆرە حیزبانە زیاتر دوای مردنی سەرکردەکانیان لەبەریەک هەڵدەوەشێنەوە.

حیزبە وەرزییەکان: ئەو حیزبانەن کە لەگەڵ ڕوودانی ڕووداوێک یان هۆی ڕووداوێک پێکدێن و دەست بە چالاکی دەکەن. بارودۆخی وەک ڕاپەڕین، شەڕ، قەیران، شەڕی نێوخۆیی یان هێرشی وڵاتێکی دەرەکی دەبێتە هۆی ئەوی کە گرووپەکان وحیزبە سیاسیەکانی ناو نێو گۆڕەپانی سیاسیی وڵات لە یەکتر نزیک ببنەوە و، زۆرجاریش یەک بگرن.

زاراوەکانی وەک: "بەرە" ، "یەکیەتیی"، "ڕێکخراو"، "هاوپەیمانی" وشتی لەم بابەتە لە جۆرە بارودۆخانەدا کەڵکیان لێوەردەگیردرێ.

حیزبە ئایدۆلۆژییەکان: ئەم حیزبانە کەمتر لە حیزبەکانی تر ئامانجی بەرژەوەندی خوازانەیان هەیە و، زیاتر بۆ پێکهێنانی کۆمەڵگایەکی یۆتۆپیایی لەسەر بنەمای بیرۆکەو پرۆگرامە تایبەتی خەریکی چالاکین.

حیزبە کرێکارییەکان: ئەم حیزبانە زیاتر لە گرووپێکی کۆمەڵایەتی تایبەتی (کرێکاران) پێکدێن و، بۆ بە دەستهێنانی ئیمتیازە کۆمەڵایەتی، ئابووری، و سیاسیەکان تێدەکۆشن. لایەنگران و ئەندامانی ئەم حیزبانە، هەموویان کرێکار نین، ئەندامانی کۆمەڵگایەک بە پەسندکردنی ، پێڕەوپرۆگرامی نێو خۆ و بنەما و بەرنامە و ڕێکخستنی حیزب، و بە مەبەستی پشتیوانیکردن لە داخوازییەکان و ئامانجی کرێکاران، دەچینە نێو ڕیزی ئەم حیزبانەوە.

سیستەمی تاک حیزبی: ڕژێمە تاک حیزبیەکان دەسکەوت و داهێنانی سەدەی بیستەمەن. ئەم حیزبە بنەمای دەوڵەت پێکدێنێ و، لەڕێکخستن وپێکهاتەکانی حکوومەتدا، ڕۆڵی سەرەکی دەگێڕێ.

یەکێک لە مەرجەکانی ئەندامبوون لەو حیزبەدا ئەوەیە کە داواکار ناتوانێ سەربەستانە ئەندامەتیەکە قبووڵ بکاو، ئەندامەتیەکەی شانازییە کە تەنیا دەتوانێ بە کەسانی بژاردە ببڕێ. مەرجێکی تری بوونە ئەندام لەو حیزبانەدا ئەوەیە کە داواکار دەبێ لە کۆمەڵێک ڕێورەسمی پێشبڕکیی بوون بە ئەندام دەربچێ.

لە تایبەتمەندییەکانی رژێمە تاک حیزبیەکان بەڕێوەچوونی یەک ئایدۆلۆژیاو پیادەکردنی سیاسەتی تیرۆر و تۆقاندن و کەڵەکەبوونی دەسەڵات لە دەست تاکەکەسێک دایە. نموونەی بەرچاوی رژێمی تاک حیزبی لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم دا " ناسیۆنال سۆسیالیزم " و "فاشیزم" بوو.

سیستەمی دووحیزبی: رژێمی دوو حیزبی رژێمێکە کە دوو حیزبی بەهێز حکوومەت دەکەن. لە سیستەمە دوو حیزبیەکاندا رەنگە حیزبی دیکەش هەبن.

لە وڵاتی بەریتانیادا جگە لە دوو حیزبی "پاریزگاران" و "کرێکار"، حیزبەکانی دیکەی وەک حیزبی "لیبرال" و حیزبی "کۆمۆنیست" هەن. ئەم حیزبانە لە پەرلەمانیشدا نوێنەریان هەیە، بەڵام حکومەت لە بەردەست دوو حیزبی بەهێزی "پاریزگاران"و"کرێکار" دایە. لە رژێمی دوو حیزبیدا "حیزبی زۆرینە" هەموو کات باڵادەستەو، حیزبی کەمینەش رەخنە دەگرێ و چاوەدێری دەکا. لە ئەمەریکادا جگە لە دوو حیزبی دێموکرات و کۆماریخواز، حیزبی دیکەش هەن کە لە پەرلەماندا نوێنەریان هەیە، بەڵام زۆرینەی کۆنگرە و زۆرینەی دەنگدەرانی هەڵبژاردنەکانی سەرۆک کۆماری هی یەکێک لە دوو حیزبی "دێموکرات" و " کۆماریخواز"ە.

لە تایبەتمەندییەکانی سیستەمی دوو حیزبی ئەوەیە کە ئاستی چاوەدێری و کۆنترۆل و نفووزی دەزگای حیزبی بۆ دیاریکردنی پاڵیوراوەکان و هەروەها سەبارەت بە دانان و دابەشکردنی پۆستە ئیداری و دەوڵەتیەکان، زۆر بەرزە.

سیستەمی فرەحیزبی: سیستەمە حیزبیەکان ئەم تایبەتمەندییانەیان هەیە.

١-لە هەڵبژاردنەکاندا گرووپەکان و حیزبەکان و تاکەکەسەکان و تاقمە جۆراوجۆرەکان بەشداری دەکەن و، نوێنەرانی پەرلەمان بەدەنگی خەڵک هەڵدەبژێردرێن و: سەرۆک کۆماری بەپێی هەڵبژاردنێکی تایبەت هەڵدەبژێردرێ، وەزیرەکان دیاری دەکا، نوێنەرانی دوو پەرلەمانیش لە رێگای هەڵبژاردنێکی تردوە، هەڵدەبژێردرێن.

٢-بوونی دوویان چەند حیزب و، چالاکیی گرووپەکان و حیزبەکان لە هەڵبژاردنەکان و پەرلەمان و کاروباری حکومەتدا بە بنەمای رژێم دەژمێردرێ.

## Nazi Party حیزبی نازی

ئەم زاراوەیە لەو ناوە وەرگیراوە:

Der National Sozialistische Deutsche Arbeiter Partie (the National Socialist German Worker's party.)

بە واتای حیزبی کرێکارانی ناسیونالٚ سوسیالیستی ئەڵمانیایە.

حیزبی نازی، بزووتنەوەیەکی سیاسی بوو کە لە ساڵی ۱۹۱۹دا دامەزراو، لە سەرەتای دەیەی ۱۹۳۰دا ئادۆلف هیتلەر گەیشتە لوتکەی ئەم ڕێکخستنە.

ناوبراو لە ساڵی ۱۹۳۳دا بە هاوپەیمانی لەگەڵ باڵی ڕاست بەشداری لە حکومەتدا کردو، بە خێرایی هاوپەیمانەکانی خۆی لە نێو بردو، ڕژێمێکی تاکڕەوی پێکهێنا کە دەسەڵاتی بۆخۆی قۆرخ کردبوو.

تایبەتمەندییەکانی ئەم حیزبە بریتی بوون لە:

١- باوەڕ بە بەرزتربوونی ڕەگەزی ئاریا.

٢- خوازیاری بێ ئەملاوئەولا بەرامبەر شوێنی ژیان (لەنبرزیۆم).

٣- دژایەتی لەگەڵ جولەکەو، باوەڕبە " ڕێگاچارەی کۆتایی" بۆ ناوبردنی هەمەلایەنەی جوولەکەکان.

٤- پشتیوانی لە دەسەڵاتی سەربازیی ئەڵمانیا بۆ دامەزراندنی دەسەڵاتی ڕایخی سێهەم.

## *Hassásin* حەشاشین

ئەم زاراوە عەرەبییە کە لە زمانە لاتینیەکاندا بە شێوەی Assassins دەنووسرێ، بە لایەنگرانی حەسەنی سەبباح دەگوترێ کە لە نزیکەی ساڵی ۱۰۹۰ لە "قەڵای الموت"ی قەزویندا جێگر بوون، نزیک بە دوو سەددەی حکومەتی تیرۆر و ڕەشەکوژییان لە ئێران و شامدا پیادە کرد. ڕۆژئاواییەکان پێیانوایە کە ئەندامانی ئەم بزوتنەوە بە خواردنی حەشیشە نەیارەکانی خۆیان دەکوشت.

لقی ئێرانیی ئەم گرووپە لە ساڵی ۱۲۵٦دا بە دەستی مەغولەکان و لقی شامی ئەم گرووپە لە ساڵی ۱۲۷۰ دا بەدەستی دەسەڵاتدارنی میسر لە نێو چوون.

## حکومەت Government

حکومەت بریتیە لە کۆمەڵێک لە ڕێکخراوە کۆمەڵایەتیەکان کە بۆ دابینکردنی پێوەندیەکانی چینە کۆمەڵایەتیەکان و پاراستنی ڕێکخستنی کۆمەڵگا پێکدێن. کۆمەڵگا سەرتاییەکان، خاوەنی ئەو ڕێکخراوانە نین. کۆمەڵگا سەرەتاییەکان بە هۆی یەکگرتوویی و لێکچوونی پتەوی خۆیان، بەبێ پێرەوی لە تاکەکەس یان ڕێکخراوێکی دیاریکراو هەڵدەسووڕێ و، تەنیا لە کاتی ڕووداوە گرنگەکانی وەک شەڕدا کەس یان کەسانێک کە لە ڕوانگەی خەڵکەوە هێزو توانایەکی لە ڕادەبەدەریان هەیە، بە سەرۆکایەتی هەڵدەبژێردرێن. بەڵام ئەم سەرۆکایەتیە درێژماوەو هەتاهەتایی نیە بەڵکوو لەگەڵ تێپەڕبوون و کۆتایی هاتنی ڕووداوەکە، بە شێوەیەکی ئۆتۆماتێک ئەم سەرۆکایەتیەش کۆتایی دێ. سەرکردەی کاتی لە کۆمەڵگا سەرەتاییەکاندا هێندێک جار ئەرکە کۆمەڵایەتیەکان بە هاوکاری کەسانی تر و بەتاییەتی بە هاوکاری پیاوماقوڵانی کۆمەڵگا کە ڕادەپەڕێنن. بەڵام بە هیچ شێوەیەک لە نەریتەکانی کۆمەڵگا تێپەڕ ناکا و ناگاتە ئاستی تۆتالیتەری.

کۆمەڵگا سەرەتاییەکان بە چەندین هۆ پێویستیان بە حکومەت نەبوو:

١ـ بچووک بوونی گرووپ.

٢ـ نەبوونی خاوەندارێتیی گشتی.

٣ـ نەریت پەرستی.

تایبەتمەندییەکانی حکومەت لە کاتی ئێستادا:

لە چاخی ئێستادا حکومەت زۆر ئاڵۆز بووەو، ئەرکی زۆر مەترسیدارو بەرفراوانی کەوتۆتە ئەستۆ. سێ هۆکاری گرنگ، لەم ئاڵوزییەدا ڕۆڵیان هەیە:

١ـ بەرفراوانیی وڵات: داگیرکارییەکانی هێندێک لە دەوڵەتەکان و، لکان وگرێدرانی نەتەوە جۆراوجۆرەکان بە یەکترەوە بۆتە هۆی سەرهەڵدانی دەوڵەتە زۆر بەرفراوانەکان.

٢ـ ئاڵۆزبوونی ژیان کۆمەڵایەتی : کەمتر دەوڵەتێک هەیە کە تەنیا نەتەویەک لە خۆ بگرێ، واتە نەتەوەیەک بە پێشینەی مێژوویی هاوبەش و بەرژەوەندیی هاوبەش و زمان و کولتووری

هاوبەش. هێندێک لە دەوڵەتە نوێکان، خەڵکێکی زۆر کە لە بواری رەگەزی و نەتەوایەتی و ئایینی وشتی ترەوە جیاوازییەکی زۆریان لەگەڵ یەکتردا هەیە، لە خۆ دەگرن.

٣ـ گۆڕانی بەردەوام: کۆمەڵگاکانی ئەو سەردەمە بەهۆی پێشکەوتنی خێرای تەکنەلۆژیا، هەمووکات لە حاڵی گۆڕان و نوێ بوونەوەدان و، ئەم گۆڕانکارییە بەردەوامانە کێشەیەکی زۆر بۆ حکوومەت دەنێنەوە.

ئەم هۆکارانە بوونە هۆی ئاڵۆزی و دژواریی ئەرکەکانی حکومەت. زۆر لە حکومەتەکانی ئەم سەردەمە ناتوانن وەک حکومەتەکانی پێشوو بە ئاسانی ژیانی کۆمەڵایەتی رێک بخەن و، نەیەڵن تووشی بشێوی بێ. لادان لە نۆرمە کۆمەڵایەتیەکان و شۆڕش و راپەڕین کە لە زۆربەی کۆمەڵگا پێشکەوتووەکاندا بەرەو زیادبوون دەڕۆن، پاراستنی نەزمی کۆمەڵایەتی زۆر دژوار کردووە.

لە دەرەنجامی ئاڵۆزبوونی کاری حکومەتەکاندا، ژمارەی رێکخراوەکان و فەرمانبەرانی ئیداری زیاد بووە، هەربۆیە خەڵک بە توندی گیرۆدەی بیرۆکراتی بوون. حکومەت بەزیادکردنی ژمارەی فەرمانبەرانی ئیداری، بە شێوەیەکی باشتر دەتوانێ ئەرکەکانی خۆی راپەڕێنێ.

## حکومەتی سەد رۆژە (١٨١٥) The Hundred days

لە مێژووی فەڕەنسادا بە حکومەتی سەدرۆژەی ناپلیۆن (مارت هەتا حوزیرانی ١٨١٥) دەگوترێ.

لە مانگی مارتی ١٨١٥ هەواڵێک لە کۆنگرەی ڤیەننادا بڵاو بۆوە سەبارەت بەوەی کە ناپلیۆن لە دورگەی ئالْپ رای کردووە و، لە رۆژی یەکەمی مانگی مارتدا چۆتە نێو فەڕەنساو، بەرەو پاریس دەڕوا. ئەم هەواڵە زۆر زوو پشت ڕاست کرایەوە. بێزاریی خەڵک لە لویی هەژدەهەم کە بەزەبری نێزە بە دەسەڵات گەیشتبوو، هەروەها لەو ئاریستۆکراتە تاراوگە نشینانەی کە لەگەڵ ناوبراودا گەڕابوونەوە، ئەوەندە زۆر بوو کە ناپلیۆن توانی بە بێ تەقاندنی تەنیا فیشەکێک لە ماوەی سێ حەوتوودا دەست بەسەر هەموو وڵات دابگرێ و، بەرەو پاریس بەڕێ بکەوێ.

ئەم هەواڵە لە هەموو ئەورووپادا تەقییەوە. دەگێڕنەوە و دەڵێن کاتێک کە هەواڵی گەیشتنی ناپلیۆن بۆ کەنداوی ژوان، گەیشتە پرۆسی رۆژهەڵات، خاوەن زەوییەکانی ، پرۆس بە شڵەژاوی بڕیاریاندا ڕابکەن بۆ قووڵایی سیبریا. لە ڤیەننا کۆتایی بە هەموو ناکۆکیەکان هات،

نوێنەرانی هەشت وڵات کە لەوێ ئامادە بوون، ڕاگەیەنراوێکیان سەبارەت بە پرۆتستۆکردنی کاری نایاساییانەی ناپلیۆن مۆر کرد. هەر لەو شوێنەو کەمتر لە مانگێک، هاوپەیمانیەتیەکی دیکەی دژی فەڕەنسا پێکهات و، سوپاکانی ئەورووپای یەکگرتەوە و بۆ بەربەرەکانێ لەگەڵ ناپلیۆن بەڕێ کەوتن.

ناپلیۆن کە لەگەڵ یەکیەتیەکی بەهێزدا بەرەوڕوو بوو، تەنیا یەک ڕێگای لە بەردەم بوو کە ئەویش پشت بەستن بە پشتیوانی خەڵک و دەستپێکردنی شەڕێکی شۆڕشگێڕانە بە دژی حکومەتەپاشایەتیەکانی ئەورووپا بوو. گەلی فەڕەنسا زیاتر لە هەرکاتێکی تر بۆ ئەم کارە ئامادە و گیان لەسەر دەست بوون. بەڵام ناپلیۆن وەک خۆی لە هیواو ئامانجی خەڵک و لەم شەڕە شۆڕشگێڕیە دەترسا. هەر بۆیە ناپلیۆن بە قبووڵنەکردنی شەڕی شۆڕشگێرانە، کە تەنیا شێوازی زاڵبوون بەسەر سوپای هاوپەیماناندابوو، کە لە بواری ڕادەی کەسەکانەوە لە سوپای فەرەنسا زۆرتر بوون، هەلەکەی لە دەست داو، بۆ دوایین جار لە ڕۆژی ١٨ی حوزەیرانی ١٨١٥ لە شەڕی واتیرلۆدا تێکشکاو، لە ٢٢ی حوزەیراندا دەست لەکارکێشانەوەیەکی دیکەی مۆر کرد. قۆناغی دووهەمی دەسەڵاتدارەتی ناپلیۆن سەد ڕۆژ دەوامی هەبوو و، دوای ئەوە، دوورخرایەوە بۆ دوورگەی دوورە دەستی سێنت هێلێن و لە ساڵی ١٨٢١دا لەو شوێنەدا مرد.

### حکومەتی ناڕاستەو خۆ Indirect Rule

بە سیستەمێک لە حکومەتی کۆلۆنیالیستی دەگوترێ کە هێندێک لە دەسەڵات و سەڵاحییەتەکان بە دامەزراوە خۆماڵیەکان دەدرێن کە گۆڕانکاری و نۆژەنکردنەوەی پێویستیان تێدا بەڕێوە چووە. ئەم شێوازە بۆ یەکەم جار لە لایەن لۆرد لۆگارد لە نیجیریا لە ساڵی ١٨٤٨دا بەڕێوە چوو. حکومەتی ناڕاستەوخۆ لە هەموو ئیمپراتۆریی بەریتانیاو تاڕادەیەکیش لە لایەن فەڕەنسیەکان و دواتر هۆڵەندییەکان کەڵکی لێ وەرگیردرا.

### حاڵەتی نائاسایی Martial Law

بریتیە لە پیادەکردنی ئۆتۆریتە و کۆنترۆڵ و چاوەدێری سەربازیی دەوڵەتێک بەسەر هاووڵاتیانی سڤیلی وڵات، لە ماوەی شەڕ یان لەکاتی پێویست دا.

لەکاتی ڕاگەیاندنی حاڵەتی نائاساییدا بەجیگای ڕێوشوێنی مەدەنی، لە یاسا و ڕێوشوێن و بڕیارە سەربازییەکان کەڵک وەردەگیردرێ و، دادگا سەربازییەکان بە جیگای دادگا مەدەنیەکان بڕیار دەردەکەن.

### حکوومەتی ڤیشی (١٩٤٠ _٤٥) Vichy Gouernment

ئەم زاراوە لە ئەدەبیاتی سیاسیی فەڕەنسا بە حکومەتێک دەگوترێ کە دوای هێرشی سوپای ئەڵمانیای نازی بۆسەر فەڕەنسا بە سەرکردایەتی ژەنەڕاڵ پیتن لە ناوچەی ڤیشی ـ یەکێک لە پارێزگاکانی فەڕەنسا_ دامەزرا. پایتەختی ئەم حکومەتە لە ١٩٤٠ هەتا تەمموزی ١٩٤٤ هەر لەو شارەبوو. ئەم رژێمە، سەرەڕۆو کۆماری بوو و، هاوکارییەکی تەواوی لەگەڵ ئەڵمانییەکاندا هەبوو. دەوڵەتانی هاوپەیمان هیچکات حکومەتی ڤیشیان بە ڕەسمی نەناسی و دانیان پێدا نەنا.

دوای رزگاربوونی فەڕەنسا لە ژێردەستی سوپای نازی، حکومەتی ڤیشی بۆ سیگمارینگێن لە ئەڵمانیا گوازراوە و، دوای رووخانی نازییەکان (١٩٤٥) بە تەواوەتی لەبەریەک هەڵوەشاوە.

بەرپرسانی ئەم رژێمە دوای کۆتایی شەڕ دادگایی کران و، مارشاڵ پیتن بەمەرگ مەحکوم کرا (١٩٤٥). ئەم بڕیارە بە پێی بڕیاری مارشاڵ دووگۆل گەورەپیاوی سەربازی ـ سیاسی فەڕەنسا، بە پلەیەک خوارتر کەمکرایەوە بۆ زیندانی هەتاهەتایی. ناوبراو ئەوەندە لە بەندیخانەدا مایەوە تاکوو لە ساڵی ١٩٥١دا مرد.

## Khmer Rouge خمێره سووره‌كان

به بزوتنه‌وه‌ی كۆمۆنیستیی كامبۆجیا ده‌گوترێ كه ناوی خۆیان له كۆماری خمێر وه‌رگرتووه. له مانگی مارتی ١٩٧٠دا رژێمی ده‌سه‌ڵاتدار به سه‌رۆكایه‌تی شازاده نورودۆم سیهانووک له شۆڕشێكی سه‌ربازیدا به سه‌رۆكایه‌تی مارشاڵ لۆن نوول، رووخا. ویلایه‌ته یه‌كگرتووه‌كانی ئه‌مه‌ریكا له سه‌ر ئه‌و بڕوایه بوو كه سیاسه‌تی بێلایه‌نیی كامبۆج به پشتیوانیكردن له ده‌وڵه‌تی كۆمۆنیستی ڤێتنامی باكوور كۆتایی دێ. له‌م رووه‌وه پشتیوانی له ژه‌نه‌ڕاڵ لۆن نوول و رژێمی تازه دامه‌زراوی كۆماری خمێر كرد. له ساڵی ١٩٧٥دا، خمێره سووره‌كان توانیان پنیۆم پێن (پایته‌ختی كامبۆج)داگیر بكه‌ن. راپه‌ڕینی ماركسی له‌وڵاتدا رووی داو، سیهانووک وه‌ک سه‌رۆكی وڵات له ئه‌یلوولی ١٩٧٥ دا گه‌ڕایه‌وه بۆ كامبوج.

## Junta خوونتا

زاراوه‌یه‌كی ئیسپانی و پۆرتوگالیه كه له سه‌رچاوه‌ی لاتینی Juncata به مانای "پێكه‌وه به‌ستراو"، وه‌رگیراوه. له قامووسی سیاسیدا زیاتر به ئه‌نجوومه‌نه سه‌ربازییه‌كان ده‌گوترێ كه به‌رهه‌م ده‌ره‌نجامی كودیتا سه‌ربازییه‌كانن. وه‌ک: خونتای ئه‌ڕژه‌نتین و خونتای شیلی.

**Mein** *خەباتی من* **Kampf**

کتێبی خەباتی من یان ئینجیلی نازیسم، نووسراوەی ئادۆڵف هیتلەر، پێشەوای (ڕێبەری) ئەڵمانیا، بە یەکێک لە بەرهەمە سیاسیە کلاسیکەکانی هاوچەرخ دادەنرێ و دەربڕی کۆمەڵێک بیروبۆچوونە کە دونیایان لە شەڕ دووهەمی جیهانیەوە گلاند. ئادوڵف هیتلەر لە سەرەتای ئەم کتێبەدا کە لە ڕێکەوتی ١٦ تشرینی یەکەمی ١٩٢٤ و لە گرتووخانەی شاری لەندێسبێرگدا نووسیویەتی و ڕۆدۆڵف هیس تایپی کردووە، دەڵێ: بۆ ڕێز گرتن لە بیرەوەری هاوبەشمان، بەرگی یەکەمی ئەم کتێبە پێشکەش بەم قارەمانانە دەکەم. ( شازدە کەس لە هاوڕێکانی کە لە کودەتای بیرە فرۆشی میونیخدا کوژران). هەروەها لە سەرەتای بەرگی دووهەمیشدا کە لە ساڵی ١٩٢٦ لە برچێسگادانددا تەواوی کرد، دەڵێ " بۆ ڕێبازێک کە دەبێ بە شێوەیەکی یەکسان و پێکەوە گرێدراو گەشە بکا، لە پێش هەموو شتێکدا پێویستە کە بنەماسەرەکیەکانی دابڕێژێ. بەم بۆنەوە حەزدەکەم لەم بەرهەمە دوو بەرگیە وەکوو بەردی بناغەی بزووتنە مەزنەکەمان کەڵک وەرگرم...".

کتێبی پیرۆزی نازییەکان ئەوەندە سەرنج ڕاکێش بوو کە تا ساڵی ١٩٤٠، شەش میلیۆن دانەی لێ فرۆشرا. لە ئەڵمانیای هیتلەریدا بەهەر ژن و پیاوێک کە تازە ژیانی هاوبەشیان پێکدێنا، کتێبکیان بە خۆڕایی پێدەدان و هەموو و ئەندامێکی حیزبی نازیش دەبوایە نوسخەیەک لەم کتێبەی پێ بوایە. لە چاپەکانی تری ئەم کتێبە لە ئەڵمانیادا، هیتلەر بۆ شاردنەوەی ئامانجەکانی خۆی و بۆ خافڵاندنی دوژمنە بەهێزەکانی خۆی، بڕیاریدا ئەو بەشەی کتێبەکە کە هێرشی کرد بووە سەر ڕووسیاو فەڕەنسا، بسڕنەوە. هیتلەر ئەم کتێبەی لە ژێر کاریگەری بیروبۆچوونی جیاوازدا نووسیوە: سیاسەتی ماکیاڤێلی، نیشتمانپەروەری و فەنتازیای عیرفانی ڤاگنێر، تیۆری گەشەسەندنی گیانلەبەرەکانی دارڤین، ڕەگەز پەرەستیی کۆفت گۆبینۆ و هۆستون ئیستوارت چەمبرلین، لە چاوەڕوانی مەسیحی فیختە و هیگڵ، گڤە سەربازییەکانی ترایچکە و بێرهاردی و پیلانەکانی چینی ئاریستۆکراتی پرۆس.

ئۆتۆلیشۆس نێوەرکی کتێبی "خەباتی من" بە "١٠٪ ژیاننامە، ٩٠٪شتی دۆگم و چەقبەستوو ١٠٠٪ بە پروپاگەندە" دەزانێ. زۆر ئەستەمە بڕوابکەی کە ئەم کتێبە توانیبێتی هەستی نەتەوەیەکی پێشکەوتوو و خاوەن شارستانیەت بۆ لای خۆی ڕاکێشێ، بەڵام دەڵێن زەمانە بۆ خۆشەویستی و بازاڕ گەرمیی ئەم کتێبە گونجاو بوو. لێکدانەوەکانی لۆدڤێگ ئەم ڕاستیە دەسەلمێنن: " خەڵکی

ئەڵمانیا لە ساڵی ١٩٣٣دا، لە رەوشێکدا دەژیان کە ئامادە بوون لە باستیلی (زیندانی بەناوبانگی فەرەنسا) فاشیزمدا دیل بکرێن. ئەوان بە دوای رێگایەکەوە بوون بۆ دابینکردنی ژیانێکی شیاو و ژیاندنەوەی گەورەیی رۆڵی نیشتمانی . بەڵام بە سەر رێگایەکی نەشیاودا کەوتن. نەتەوە گەورەکان تەنیا حەزیان لەوە بوو ئەڵمانیا زیاتر قەرەبووی زیانەکانیان بکاتەوە، حیزبە کرێکارییەکانی ئەڵمانیاش کە شتێکیان لەدەست دەهات، تووشی دووبەرەکیی ببوون و لە گیانی یەکتر بەر ببوون. هەمووی ئەم کردنەوانە لەگەڵ سەدەیەک نێشتمانپەروەری پڕکەف و کووڵ و هەستی بەهێزی ناسیونالیزمی خەڵکی ئەڵمانیادا نەدەگونجان و نەتەوەی ئەڵمانیا وای لێهاتبوو کە ئارامی و ئاسایشی لە ئازادی سیاسی (کە هاوواتای ئاژاوە و خوێن رشتن بوو) بەلاوە گرنگتر بێ. هیتلەر بەم رازەی زانی و بە هۆی ئەو لێهاتوویییەی کە لە رێکخستن و پڕۆپاگەندەکردندا هەیبوو و، بە کەڵک وەرگرتن لە ئامادەیی پیشەسازییە گەورەکانی ئەڵمانیا بۆ دابینکردنی پێداویستیە ماددییەکانی خەباتی خۆی، لەم دەرفەتە لە پێناو گەیشتن بە ئامانجەکانی خۆی کەڵکی وەرگرت".

نێوەرۆکی بنەڕەتیی کتێبی " خەباتی من" کە بەردەوام دووپات دەبێتەوە بریتیە لە، رەگەز، خاوێنی رەگەز و بەرزتربوونی رەگەز ـ ئەگەرچی هیتلەر لە هیچ شوێنێکی کتێبەکەدا پێناسەی رەگەز ناکا ـ هیتلەر دەیگووت مرۆڤەکان سێ دەستەن: خۆلقێنەرانی کولتوور و شارستانیەت کە تەنیا نموویەکی لە جیهاندا هەیە ئەوانیش رەگەز ئاریان (بەتایبەتی نەتەوەی ئاڵمانیا)، ئەوانەی کولتوور وەردەگرن، وەکوو: ژاپۆنیەکان و رووخێنەرانی کولتوور، وەکوو جوولەکەکان و رەش پێستەکان. هیتلەر دەیگووت: لە سروشتدا هیچ کاتێک رەگەزەکان وەکوو یەک نەخولقێنراون، وەک چۆن مرۆڤەکانیش یەکسان نەخووڵقاون؛ هێندێک لە رەگەزەکان لە رەگەزەکانی دیکە گەورەترن. ئەڵمانیەکان وەکوو بەرزترین رەگەزەکان، دەبێ بەسەر " رەگەزە خوارووتر"ەکاندا حکومەت بکەن.

هێندێک بەشی " خەباتی من" بیروراکانی هیتلەر سەبارەت بە " رەگەزەکانی خوارەوە" روون دەکاتەوە.

هیتلەر سەبارەت بە ئیمپراتۆریای نەمسا دەڵێ:

" تێکەڵاویی ڕەگەزەکان لە پایتەختی نەمسادا تێکی دام ، لەم چێشتی مجێورەی چیک و پۆلۆنی و هەنگار و سیربی و کرۆڤاتی و لەم کوارگەی (کارگ) هەمیشەیی ڕەگەزی مرۆڤ، واتە جوولەکە بێزم هەڵدەستا" و سەبارەت بە ئەفریقیەکانیش دەڵێ:

"شێتایەتیەکی تاوانبارانەیە کە ئێمە کەسێک کە بە نیوەمەیموونی لە دایک بووە، وای بەخێو کەین کە خەڵک پێیان وابێ دەکرێ ببێتە مافناسێکی گەورە، لە حاڵێکدا کە بە میلیۆن کەس لە ڕەگەزی بەرزتری شارستانیەکان دەبێ هەروا لە خوارترین پۆست و پلەکاندا بمێننەوە .... ئەمە گوناحێکە لە بەرامبەر ئیرادەی خوایدا کە سەدان هەزار کەس لە بە تواناترین کەسەکان لە گەرداوی پرۆلتاریای ئێستاکەدا بخنکێن و ئەو کاتەش کافرەکانی زۆلۆ (هۆزێکی ڕەش پێستی ئەفریقی ) بۆ ئەرک وپۆستی بەرگریکردن ڕاهێنرین.

خەڵکی نەتەوەی هیند، هەمیشە بە لامەوە زۆربلێی فشەکەر بوون کە قسەکانیان هیچ بنەمایەکی ڕاستەقینەیان نەبووە. پۆلۆنیەکان، چیکەکان، جوولەکەکان، ڕەشەکان و ئاسیاییەکان بەدڵنیاییەوە ڕایەیان ناکەوێ کە ببنە هاوولاتی ئەڵمانیا، هەرچەندە لە ئاڵمانیاشدا لە دایک بووبێتن و بتوانن بە زمانی ئەڵمانیش قسە بکەن".

هەروەها بە سووکی باسی فەڕەنسیەکان دەکا:

" لە بواری ڕەگەزییەوە، ڕەشەکان بەرادەیەک لە فەڕەنسادا تەشەنەیان کردووە کە دەتوانین فەڕەنسا بە ولاتێکی ڕەش پێست دابنێین. سیاسەتی کۆلۆنیالیستی ئێستای فەڕەنسە لەگەڵ سیاسەتی پێشووی ئەڵماندا بەراورد ناکرێن. ئەگەر تاکوو سێ سەد ساڵی دیکە ئەم ڕەوشە هەروا بەردەوام بێ، دواپین دڵۆپەکانی خوێنی ڕەگەزی فەڕەنسی لە دەوڵەتی دوورەگەی ئەورووپی ـ ئەفریقیدا کە لە حاڵی تەشەنەکردن دایە، دەتوێتەوە و نامێنێ".

سەبارەت بە جوولەکەکان، دەمارگرژیی هیتلەر دەگاتە ئەوپەڕی شێتایەتی:

" بیرورای جولەکەکان لەم پێوەندییەدا زۆر روون و ئاشکرایە، مەبەست لە بۆلشڤیک کردنی ئەڵمانیا واتە لە ناوبردنی رووناکبیرانی ناسیۆنالیستی جوولەکە بۆ ئەوەی چینی کرێکاری ئەڵمانیا کە لە ژێر کۆت و بەندی ئابووریی و ماددی جولەکەکاندا گیان بسپێرن ـ ئەمە یەکەمین هەنگاو هەڵێنانی جوولەکەکانە بۆ داگیرکردنی جیهان. هەروەکوو ئەوەی کە لە مێژوودا زۆرجاران رووی داوە. ئاڵمان تەوەری سەرەکیی ئەم بەرەنگارییانە بووە. و ئەگەر خەڵک و دەوڵەتی ئێمە ببنە پاروی

زۆرداره خوێنخۆر و چاوچنۆکه جووله‌که‌کان، هه‌موو خه‌ڵکی جیهان ده‌که‌ونه دوای ئه‌م هه‌ژدیها حه‌وت سه‌ره‌وه. ئه‌گه‌ر ئه‌ڵمانیا خۆی له ته‌شقه‌ڵه‌ی جووله‌که‌کان رزگار بکا، ئه‌م گه‌وره‌ترین هه‌ڕه‌شه و مه‌ترسیه‌ی که له سه‌ر خه‌ڵکی جیهانه، له ناو ده‌چێ. بۆ خاوێن راگرتنی خوێنی ئارییه‌کان، واته بۆ خاوێن راگرتنی ره‌گه‌زی ئه‌ڵمانی، ده‌بێ پێش به " زۆڵایه‌تی " بگیردرێ که ئاکامی تێکه‌ڵاوبوون له‌گه‌ڵ ره‌گه‌زه خوارتره‌کانه".

هیتله‌ر ده‌یگووت داڕمان و هه‌ره‌سهێنانی نه‌ته‌وه گه‌وره‌کانی پێشووتر بێ هیچ گومانێک، ئاکامی تێکه‌ڵاوبوونی خوێن و نه‌مانی ره‌سه‌نایه‌تی ره‌گه‌زی بووه. بۆ پێشگرتن له‌م نه‌هامه‌تیه ده‌بێ ده‌وڵه‌ت ده‌ستبه‌کار بێ هه‌رچه‌نده " مرۆڤه ترسنوک و لاوازکان" ره‌خنه بگرن که هێرش کراوته سه‌ر مافه‌کانی ئه‌وان. ده‌وڵه‌ت ده‌بێ: "ئاگادار بێ که خوێنی نه‌ته‌وه به خاوێنی رابگرێ، تا مرۆڤایه‌تی بگاته به‌رزترین ترۆپکه‌ی گه‌شه‌سه‌ندن. ده‌وڵه‌ت ده‌بێ پێکهێنانی ژیانی هاوبه‌ش له گه‌رداوی سه‌رشۆڕیی ره‌گه‌زایه‌تی رزگار بکا و ژیانی هاوبه‌ش وه‌کوو هۆکارێک بۆ دروستکردنی مرۆڤه‌کان به شێوه‌ی خوایی، پیرۆز بکا".

" ژیانی هاوبه‌ش نابێ ببێته هۆی دروستکردنی زه‌به‌لاحه‌کان که له تێکه‌ڵاو بوونی مه‌یموون و مرۆڤ خوڵقاون". هیتله‌ر که ده‌مارگژانه بڕوای به به‌رزتربوونی زاتی ره‌گه‌زی ئاریا هه‌بوو؛ ئامۆژگاری ده‌کرد که ماف و ئه‌رکی ره‌گه‌زی به‌رزتر ئه‌وه‌یه که شوێنه‌کانی دیکه داگیر بکا و بیانچه‌وسێنێته‌وه، و ته‌نانه‌ت ئه‌گه‌ر بۆ پاراستنی سه‌رچاوه‌کانی خۆشی بێ، ده‌توانێ ره‌گه‌زه‌کانی دیکه له ناو ببا. چوونکه رێژه‌ی دانیشتوانی ئه‌ڵمانیا زۆر بووه و پێویستیان به له‌نبرزیۆمێکی (شوێنی ژیان) زیاتر هه‌بوو، هیتله‌ر ئه‌و مافه‌ی به ئه‌ڵمانیا ده‌دا که وه‌کوو گه‌وره‌ترین ده‌سه‌ڵاتی سکه‌ندیناڤی ، وڵاتی سلاڤه‌کان داگیر بکا و له‌وێیان بگوازێته‌وه و ئه‌ڵمانیه‌کان له‌وێ نیشته‌جێ بکا. له‌گه‌ڵ به‌رفراوان بوونی شوێنی ژیانی به‌رزترین ره‌گه‌ز و یه‌کگرتوویی نه‌ته‌وه ئه‌ڵمانیه‌کان له ژێر ئاڵایه‌کدا، ته‌نانه‌ت هه‌موو ره‌گه‌زی مرۆڤ قازانج ده‌کا. "ته‌نیا وڵاتێک که راده‌ی پێویست پان و به‌رینه، ئازادیی ژیانی نه‌ته‌وه‌یه‌ک دابین ده‌کا. ده‌بێ ئه‌ڵمانیا هێزێکی جیهانیی بێ، ده‌نا نه‌بوونی باشتره و شیاوی ئه‌وه نیه که بژی". ئه‌م وڵاته پان و به‌رینه‌شی که هیتله‌ر ئاواتی بۆ ده‌خواست، ته‌نیا به داگیرکردنی رووسیا وه‌دی ده‌هات. هیتله‌ر به تامه‌زرۆییه‌وه چاوی بڕیبووه رۆژهه‌ڵات و پێیوابوو: " ئه‌گه‌ر ئۆراڵ به که‌ره‌سه خاوه‌کانی و ئۆکرایناش به‌زه‌ی وزاره پان و به‌رینه‌کانیه‌وه بکه‌وێته ده‌ست

ئەڵمانیا، چ شتێک دمێنێتەوە کە نەتوانێ بیکەی! بۆیە دەبوایە ئالمانیا خەڵکی رووسیا لە شەڕی ڕێبەرە بۆ لشڤیکەکان رزگار بکا. هیتلەر دەڵێ: " ئەگەر ئەمرۆکە باسی وڵاتێک لە ئەوروپادا دەکەم، لە پێش هەموو شوێنێکی دیکەدا، مەبەستم لە رووسیا و ئەو دەوڵەتانەیە کە سەر بە رووسیان و دراوسێی ئەو وڵاتەن. لێرەدا چارەنووس پێمان دەڵێ " چونکە دەسەڵاتدارەیتی بۆلشڤیزم بەسەر رووسیادا ، نەتەوەی رووسیای لەو رووناکبیرانە بێبەش کرد کە جاران هەیانبوو، بۆلشڤیزم وەکوو حکوومەتێک بنجی داکوتا . . . کاتی ئەوە هاتووە ئەم ئیمپراتۆرییە مەزنەی رۆژهەڵات هەڵتەکێ".

هیتلەر پێیوابوو کە هێز و دەسەڵات، پاساو بۆ هێرش و داگیرکردن دێننەوە. "سنوورەکانی وڵاتێک لە لایەن مرۆڤەوە دیاری دەکرێن و لە لایەن مرۆڤیشەوە دەگۆڕێن. ئەم راستیەی کە نەتەوەیەک توانیویەتیی وڵاتێکی پان و بەرین داگیر بکا، نابێ ببێ بەهۆی ئەوەی کە تاسەر ئەم وڵاتە بەرفراوانە، مڵکی هەمیشەیی ئەم نەتەوە بێ. گەورەترین کارێک کە نەتەوەیەک دەتوانێ بیکا ئەوەیە کە ئازایەتیی داگیرکەرانی خۆی و بێ هێزی نەتەوەکانی دیکە بسەلمێنێ و لەم نێوەشدا راستی تەنیا بە هۆی هێزەوە مسۆگەر دەبێ".

هیتلەر بەو راستیە گەیشتبوو کە جگە لە داگیرکردنی وڵاتانی دیکە بۆ چارەسەری کێشەی زیاد بوونی دانیشتوان، ڕێگا چارە دیکەش هەن. یەکێک لەم ڕێگا چارانە کەمکردنەوەی رادەی زاوزێیە. بەڵام هیتلەر ئەم ڕێگا چارەی بەلاوە پەسندنەبوو، چوونکە لەگەڵ تیۆری بەرزتربوونی رەگەزیدا نەدەگونجا. ڕێگایەکی دیکە کە دەسەڵاتدارەکان پێش لە شەڕی ئاڵمان رەچاویان دەکرد، زۆرترکردنی ڕێژەی بەرهەمهێنانی کارخانەکان بۆ هەناردنی بەرهەمەکان بۆ بازارەکانی جیهان بوو. هیتلەر ئەم ڕێگاچارەشی پەسند نەبوو، چوونکە ئەو دەیهەویست ئەڵمانیا لەسەر پێی خۆی رابوەستێ و بۆ خۆی،خۆی بەخێو بکا.

هەروەها هیتلەر لەگەڵ سەرهەڵدانی چینێکی گەورەی کرێکاری کە لە ئاکامی زۆرتربوونی کارخانەکان سەری هەڵدابوو، بە توندی دژایەتی دەکرد. ڕێگاچارەی سێهەم ئەوە بوو کە رادەی بە پیت بوونی زەوی وزارەکان بچێتە سەرەوە، بەڵام هیتلەر پێیوابوو ئەمە ڕێگاچارەیەکی کاتیە و کێشەکە چارەسەر ناکا. کەواتە تاقانە چارەسەری ئەوە بوو کە ئەڵمانیا ئەم سنوورانەی ئیستای

بەزێنێ وشوێنی دیکە داگیر بکا تا ژمارەیەکی زۆرتر لە ئەڵمانیەکان  لەم شوێنانەدا نیشتەجێ بکرێن.

هیتلەر وای چاوەڕوانی دەکرد کە ڕێژەی دانیشتوانی ئەڵمانیا لە ماوەی سەد ساڵی داهاتوودا زیاتر لە سێ هێندە دەبێتەوە و هەرکەسێکش زیاتر لە دوو هێندەی ئێستاکەی جێگای لەبەردەست دا دەبێ. تیۆری دانیشتوانی پەرتەوازەش لە وڵاتێکی پان و بەریندا لەبەر هۆکارە سەربازی و جوگرافیەکان، سەرنجی هیتلەری ڕاکێشابوو، چوونکە نەتەوەیەک کە لە وڵاتێکی بەریندا دەژی، لە بەرامبەر هێرشی دوژمندا زیاتر پارێزراوە. بۆ گەیشتن بەم ئامانجانە، هیتلەر سێ ڕێگا پێشنیاردەکا کە بریتین لە پروپاگەندە، دیپلۆماسی و سەپاندنی زۆر. لە هیچ شوێنێکی کتێبەکەیدا هیتلەر خۆیی و تاکتیکەکانی خۆی بەقەد ئەو شوێنەی کە باسی تەککتیکەکانی پروپاگەندە دەکا، دەرنەخستووە.
هیتلەر بە چاکی  بەو ئاکامە گەیشتبوو کە پروپاگەندەکردن یەکێک لە کاریگەرترین و ترسێنەرترین چەکەکانە، هیتلەر بۆ تەواوکردنی لێهاتوویی خۆی لە تەکنیکی پروپاگەندەکردندا؛ خەریکی خوێندنەوەی میتودەکانی  پروپاگەندەی مارکسیەکان، ڕێکخراو و شێوازەکانی کلیسای کاتۆلیکی، پروپاگەندەی بەریتانیەکان لە شەری یەکەمی جیهانیی و شێوازەکانی پروپاگەندە لە ئەمەریکا و دەروونناسیی فرۆید بووە. بۆخۆی دەڵێ" ئەرکی پروپاگەندە هەڵسەنگاندنی مافەکانی خەڵکی جیاواز نیە، بەڵکوو تەنیا پێداگرتن و سەپاندنی ئەو مافەیە کە بۆ خۆت دەتهەوێ. ئامانجی پروپاگەندە ئەوە نیە کە ببێتە هۆی سەرگەرم کردنی گەنجە داماوەکان، بەڵکوو ئەوەیە کە لایەنی بەرامبەر بە قەناعەت بگەیەنین و مەبەستی من لە لایەنی بەرامبەر، کۆمەڵانی خەڵکن".

ڕادەی بڕوای هیتلەر بە پرۆپاگەندەکردنئەم قسەی هیتلەر، ڕادەی بڕوای هیتلەر بە پروپاگەندە دەردەخا: "بە هۆی پروپاگەندەی شیلگیرو وەستایانە دەتوانی بڕوا بە خەڵک بێنی کە بەهەشت، جەهەننەم  و جەهەننەمیش بەهەشتە. بۆ ئەوەی پروپاگەندە کاریگەرییەکی زۆرتری هەبێ دەبێ زیاتر لە عەقڵەوەە دوور بێ و پێش لە هەموو شتێک بایەخ بە هەست و سۆزی خەڵک بدەین و زۆر کەم بڕوا بە عەقڵی  درۆزنانەی خەڵک بکەین، پروپاگەندە هیچ پێوەندییەکی بە وردبینی زانستیەوە نیە، هەروەک چۆن ڕاگەیەنراوێکی سەر دیوار، هیچ پێوەندییەکی بە هونەرەوە نیە . . .، ئەگەر بمانەوێ جەماوەرێکی زۆرتر بخەینە ژێر کاریگەری  خۆمانەوە، دەبێ ئاستی پروپاگەندە ببەینە سەرەوە".

هیتلەر کۆمەڵانی خەڵکی بە مێگەلێکی بێ مێشک و نەزان دەزانی، کە رادەی بەک زانینی کۆمەڵانی خەڵک بەلای هیتلەرەوە دەردەخا. هیتلەر بەردەوام باسی ئەوەی دەکرد کە مرۆقەکان وەکوو کۆمەڵێکی تەوەزەل و ترسنۆک و هەستیار و بێعەقڵن وەکوو ژن وان. ئامانجی کۆتایی لە تەکنیکی پڕوپاگەندەی هیتلەریدا، بنەمای درۆی گەورەیە. بەڕای ئەو " گەورە بوونی درۆ، دەبێتە هۆی ئەوەی کە لایەنی بەرامبەر بڕوا بە قسەکانت بکا. . .، ساویلکەبوونی خەڵک دەبێتە هۆی ئەوەی کە درۆی گەورەتر، لە درۆی چکۆلەتر کاریگەرتر بێ. چوونکە کۆمەڵانی خەڵک لە شتی چکۆلەدا لەگەڵ یەکتردا درۆدەکەن و ئەگەر درۆی گەورەتر بکەن، تەریق دەبنەوە. بۆیە هیچ کاتێک گومان لەدرۆی گەورە ناکەن. باوەڕ ناکەن کە کەسێک لەوپەڕی لە خۆرادیوییەوە درۆیەکی ئاوا گەورە بکا و تائەم رادەیە راستی چەواشەبکا. بە کورتی هەرچی درۆکە گەورەتر بێ، ئەگەری ئەوە زیاترە کە کۆمەڵانی خەڵک زیاتر بڕوای پێ بکەن".

بنەمایەکی بنەڕەتی دیکە لە پڕوپاگەندەدا؛ داتاشینی مۆتەکەیەکە. هیتلەر دەڵێ، مەهێڵین خەڵک لە یەک کات و ساتدا، رقیان لە چەند دوژمن بێتەوە، چوونکە ئەمە مێشکیان سەرقاڵ دەکا. هەموو هەوڵی خۆتان لە سەر دوژمنێک چڕبکەنەوە و کارێکی واش بکەن خەڵک تەنیا رقیان لەم دوژمنە بێتەوە. هیتلەر جوولەکەکانی کردە مۆتەکەو دوژمنی بابمردووی ئەڵمانیا.

لەو ساتانەشدا کە هیتلەر لە دژی دێموکراسی، مارکسیزم، رێککەوتننامەی ڤێرسای، فەڕەنسا یان ئامانجەکانی دیکە دەدوا، جیاواز لە هێرشکردنەسەر بۆ سەر ئەوانە، بە بڕوای ئەو جوولەکە لە هەموو شوێن و لە هەموو کاتێکیشدا هەن و لە هەموو حاڵەتەکاندا خەریکی پیلان گێڕانن. جوولەکەکان بە کردەوە دزێو و نگریسەکانیان، هەوڵ دەدەن کولتووری ئارییەکان لە ناو ببەن. نموونەی رقی هیتلەر ئەم وتارەیە:

"فەڕەنسا دڕندەترین دوژمن بووە و ئیستاش هەرگەورەترین دوژمنە، خەڵکی ئەم وڵاتە کە زیاتر لە جاران رەش پێست دەبن، بە هۆی پێڕەویکردن لە جوولەکەکان کە بە تەمای داگیرکردنی جیهانن، بوون بە مەترسیەکی بەردەوام بۆ سەر رەگەزی سپی لە ئەورووپادا. چوونکە پیس بوون بە هۆی خوێنی رەشەکانەوە لە راین کە ناوجەرگەی ئەورووپایە و کەف و کوڵی سادیستی (خەڵک ئازاردان) ئەم دوژمنە بابمردووەی خەڵکی ئەڵمانیا، بە تەمای تۆڵە کردنەوەیە کە بە بەرنامەیەکی ورد و هێمنانە خەریکی زۆڵ کردنی ناوەڕاستی ئەورووپایە و، لەم رێگایەوە دەیهەوێ بەهۆی

پیسکردنی خوێنی رەگەزی سپی بە خوێنی مرۆڤە لە خوارترەوەکان، ئەم رەگەزە لە دامەزراندنی کیانێکی سەربەخۆ بێبەش بکا".

بیروبۆچوونەکانی هیتلەر سەبارەت بە پەروەردەی گشتی لەگەڵ بیروبۆچوونەکانی ئەو سەبارەت بە دیموکراسی لە یەک ئاراستە دان. و هیتلەر لە هەردەرفەتێک بۆ کوتانی دیموکراسی کەلکی وەردەگرت:

" دیموکراسی رۆژئاوا لەم سەردەمەدا، پێشەنگی دیموکراسیە. بە بێ مارکسیزم ئەم دیموکراسیە وێنا ناکرێ، دیموکراسی هاوچەرخ بۆ ئەم پەتا جیهانگەرەوە، بوارێکی رەخساندوە کە مێکرۆبەکانی ئەم پەتایەی تێیدا بگورێن و بلاّو ببێتەوە. حکومەتیی پەرلەمانی لە زەقترین شێوازی خۆیدا، زەبەلاحێکی لە پیسایی و لە ئاور هێناوەتە ئاراوە کە بەداخەوە بەڕای من ئاگرەکەی بەرەو کوژانەوە دەچێ". هیتلەر دیموکراسی بە " تیۆرێکی هەڵخەڵەتێن" دادەنێ کە جوولەکەکان هێناویانەتە ئاراوە تا بانگەشەی ئەوەی پێ بکەن کە هەموو مرۆڤەکان یەکسان خولقاون و بە پێچەوانەوە هەر بیروبۆچوونێک سەبارەت بە مافی دەنگدانی گشتی و مافی یەکسان، بێ کەڵک و تێکدەرە".

هیتلەر بنەمای پێشەوایی (رێبەرایەتیی ) کردە ئەلتەرناتیڤی دیموکراسی و کۆمەڵێک پیشەوای لە سەرەوەی کۆمەلاّنی خەڵک دانا و رایگەیاند کە دەبێ کۆمەلاّنی خەڵک بێ ئەملاوئەولا بریاری ئەم پێشەوایانە جێبەجێ بکەن. لە سەرەوەی هەموو پێشەواکانیشدا، کاریزما هەبوو کە بۆ هەموو ئەوکارانەی کەدەیکردن یان لە بەرامبەر هەموو ئەو بوارانەی کە ناسەرکەوتوو دەبوو، بەرپرسیارەتی تەواوەتیی وەئەستۆی خۆی دەگرت.

سەبارەت بە " خەباتی من" نووسیویانە: "یەکێک لە کاریگەرترین کتێبەکانی سەدەی بیستەمە . . . ، چوونکە بۆ هەر وشەیەکی ئەم کتێبە ١٢٥ کەس، بۆ هەر لاپەرەیەکی ٤٧٠٠ کەس و بۆ هەر بەشێکیش زیاتر لە ١/٢٠٠/٠٠٠ کەس تێدا چوون". کاریگەری ئەم کتێبە بەرادەیەک بوو کە وەکوو ئینجیلی سیاسی خەڵکی ئەڵمانی لێهاتبوو و سیاسەتی "رایخی سێهەم" لە سالّی ١٩٣٣ەوە تاکۆتایی شەڕی دووهەمی جیهانی بە پێی نووسینەکانی ئەم کتێبە بەڕێوە دەچوو.

### خۆماڵیکردن Nationaliziation

بە بەڕێوەبردنی یەکەیەکی ئابووری لە لایەن دەوڵەتەوە دەگوترێ کە لە رابردوودا لە بەردەست کەسەکان یان دامەزراوە تایبەتیەکان یان لە ژێر کۆنترۆڵی حکوومەتی هەرێم (کە لە ژێر کۆنترۆلی راستەوخۆی حکوومەتی ناوەندیدا نەبێ) ویان لە بەرەدست بیانیەکاندا بووە. لە پرۆسەی خۆماڵیکردندا، دەوڵەت دەبێ بە خاوەنداریی یەکە ئابوورییەکانی وڵات. ئەو کاتەی کەمەبەست لە خۆماڵیکردن گۆڕانی رەهای سیستەمی ئابووری وڵات بێ، خۆماڵیکردن بریتیە لە گواستنەوەی هەموو ئامرازەکانی بەرهەمهێنان و ئالووگۆڕپێکردن لە پێناوی بەرژەوەندی کۆمەڵ، واتە ئەو ئامرازانە لە کەسەکان دەستێنرێنەوە و بە قازانجی گشتی کۆمەڵگا تەرخان دەکرێن، نەک بۆ بەرژەوەندی خاوەندارەتی تایبەتیی. بەڵام لەو وڵاتانەی کە سیستەمی ئابووری بە شێوەی رەها خۆماڵی نەکراوە، رەنگە بەپێی کۆمەڵێک هۆکار، پیشەسازییەک یان چالاکیەکی تایبەتیی خۆماڵی بکرێ. لە ناو هەموو ئەوپێناسانەدا کە لە سەر خۆماڵیکردن کراون، ئەم پێناسە لە هەموویان چڕو پڕترە:

"خۆماڵیکردن پرۆسەیەکە لە پێناو دابینکردنی بەرژەوەندییەکی بەرزی گشتی بە هۆی گواستنەوەی چالاکی کەرتی تایبەت بۆ کەرتی گشتی، بە قازانجی کۆمەڵگا. کەرتی گشتیش یان دەوڵەتە یان ئەنجوومەنێکی هەرێم یان دامەزراوەیەکی هەرەوەزییە بۆ ئەوەی دەستبەجێ یان لە داهاتوودا چالاکیە ئابوورییەکان لە پێناوی بەرژەوەندی گشتی کۆمەڵگادا، وەگەڕ کەون.بەم پێناسەدا دەردەکەوێ کە خۆماڵیکردن دوو بنەمای سەرەکیی هەیە؛ یەکیان گۆڕینی خاوەندارێتی تایبەتیی بە خاوەندارێتی گشتی و ئەوی دیکەشیان دەستبەسەرداگرتن و کەڵک وەرگرتن لە سامانە خۆماڵی کراوەکان لە پێناو بەرژەوەندی کۆمەڵگادایە (کۆنترۆڵ کردنی نیشتمانی ).

خاوەندارێتی سامانەکان و بەڕێوەبردنی هێندێک لە پیشەسازییەکان و دەستبەسەرداگرتن بە هێندێک کاروباری ئابووریدا لە لایەن دەوڵەتەوە، رابردوویەکی لەمێژینەی لە شوێنە جیاوازەکانی جیهاندا هەیە.بەڵام لە رابردوودا ئازادیی خاوەندارێتی تایبەتی و چالاکیە ئابوورییەکان بەپێی سیستەمە یاساییەکان بە مافی سروشتی کەسەکان دادەنران و تەنیا لە هێندێک حاڵەتی دەگمەندا کە ئەم ئازادیيانە زیانیان لە بەرژەوەندی گشتی دەدا، بەرتەسک دەکرانەوە. بەڵام سیستەمە ئابوورییە سۆسیالیستیەکان بە شێوەی رەها و سیستەمەکانی دیکە لە هێندێک حاڵەتی تایبەتیدا، ئەو بنەمایەیان

ئاوەژوو کردۆتەوە. سۆسیالیستەکان پێیانوایە سامانەکان هیی هەموو کۆمەڵگان و دەوڵەت دەبێ بە قازانجی کۆمەڵگا دەست بەسەر هەموو سامانەکاندا بگرێ. سۆسیالیستەکان لە ئاستێکی زۆر بەتەسکدا بڕوایان بە خاوەندارێتی تاکەکەسی هەیە. بەواتایەکی دیکە بەڵگەی سۆسیالیستەکان بۆ ئەم بیروبۆچوونەی خۆیان، دابینکردنی بەرژەوەندی گشتی کۆمەڵگایە. بیرۆکەی خۆماڵی کردن ئاکامی لێکدان و ناکۆکی لە نێوان دوو غەریزەی مرۆڤ، واتە پاراستنی بەرژەوەندی گشتی و پاراستنی بەرژەوەندی تاکەکەسیە. سەرچاوەی ویستی خۆپەرسک و سروشتی مرۆڤ بۆ خاوەندارێتی و پاراستنی سامان و پێشگرتن لە هێرشی خەڵک بۆ سەر سامانی تاکەکەسی، دەگەڕێتەوە بۆ مێژووی شارستانیەتی مرۆڤ، بۆ سەرەتای سەرهەڵدانی کۆمەڵگا.

بە شێوەیەک کە لە کۆنترین سیستەمە یاساییەکاندا بنەمای خاوەندارێتی تایبەتیی و مافی خاوەندارێتی وەکوو مافێکی سروشتی و پیرۆز بەرەسمیی ناسراون. لەگەڵ پێشکەوتنی کۆمەڵگاکاندا، ڕەوشی پێکەوە ژیانی مرۆڤەکان لەگەڵ یەکتردا زەقتر بۆتەوە. کۆمەڵگا پێشکەوتووەکانی ئێستا بە هێندێک کۆت و بەندەوە بەستراونەوە کە هەر تاکێک بەرژەوەندی خۆی بەم کۆت و بەندانەوە بەستۆتەوە ورەچاوکردنی ئەم کۆت و بەندانەش لە پێناو دابینکردنی بەرژەوەندی گشتیدا بە پێویست دەزانن. بە کورتی بنەمای سەرەکیی یاسای کۆمەڵ، پاراستنی بەرژەوەندی گشتی لە بەرامبەر بەرژەوەندی تایبەتی دایە.

خۆماڵیکردن چەمکێکی تارادەیەک نوێیە کە نزیکەی سەدەیەک لەومەوپێش هاتۆتە ئاراوە و لە ژێر کاریگەریی بزووتنەوە ئابووریی و کۆمەڵایەتیەکاندا گەشەی کردووە و لەم چەند دەیەی دوواییدا بە گەرم و گوڕی باسی لێدەکرێ. لە سەدەی بیستەمدا، جگە لە پاڵنەرە ئابووری و کۆمەڵایەتیەکان، فەلسەفە سیاسی و ئەخلاقیەکانیش کاریگەریان لە گۆڕانی ئەم چەمکەدا هەبووە و لایەنگرانی خۆماڵیکردن پێیانوایە کە خۆماڵیکردن جگە لە دابینکردنی پێداویستیە ماددیەکان، دەبێتە هۆی یەکسانیی و دادپەروەری و کۆتایی بە کێشەی چینایەتیی و چەوسانەوەی مرۆڤ لە لایەن مرۆڤەوە دێنێ و، ڕێگا بۆ پێکهێنانی ئاشتیی گشتیی خۆش دەکا.

**Class Struggle** **خەباتی چینایەتی**

بە پێی تیۆری مەتریالیزمی مێژوویی، هەتا ئەوکاتەی کە کۆمەڵگای مرۆڤایەتیی نەگاتە قۆناغی کۆمۆنیزم و کۆمەڵگای بێ چین وەدی نەهاتبێ، بەردەوام لە نێوان چینە زۆرلێکراو چینەزۆردارەکان، کرێکار و خاوەن کار، دەرەبەگ و جوتیاردا ناکۆکی وکێشەی چینایەتی هەیە. هەر سیستەمێکی کۆمەڵایەتیی لە کۆمەڵگایەکدا کە خاوەنی کێشەی چینایەتیە، لە هەناوی خۆیدا، گەرای دژی خۆی پەروەردەدەکا، تا ئەوکاتەی کە چینە لاوازەکان ڕێک دەخرێن و سیستەمی کۆمەڵایەتیی دەڕوخێنن و سیستەمێکی کۆمەڵایەتیی نوێ دێننە ئاراوە.

### خۆدزینەوە Escapism

خۆدزینەوە بەبەشداری نەکردنی کۆمپانیاکان لە کارە کۆمەڵایەتیەکان، بەشداری نەکردن لە باس و راوێژە سیاسیەکان و قبووڵ نەکردنی بەرپرسیارەتی دەوڵەتیی لە لایەن کەسێکەوە دەگوترێ. خۆدزینەوە لە یۆنانی کۆندا گوناحێکی گەورە بوو و ئەم کەسانە بەلادەری کۆمەڵگا دادەنران. بە هۆی شکستە سەربازییەکانی یۆنان و سەرهەڵدانی کێشە و ناکۆکی،نارەزایەتیی لە ناوچینەکاندا و رەش بینی سەبارەت بە حکومەت پەرەیان گرت و هەر لەبەر ئەمەش بوو کە گومانکەرەکان، کەلبیەکان و ئەبیکۆرییەکان لایەنگری دوورەپەرێزی و تەریک بوونەوە بوون.

### خاچی شکاو/ سڤاستیکا Swastika

سڤاستیکا لە زمانی سەنسکریتی دا بە جۆرە خاچێکی شکاو دەگوترێ (کە ددانە شکاوەکانی بە پێچەوانەی سوورانی چرکەژمێرەکانی کاتژمێرە). ئەم خاچە رەمزی ئایینی هیندووەکان بوو و رەمزی خۆر و چاکە و بەختەوەری بوو.

لە مێژووی هاوچەرخ دا، خاچی شکاو لە قاموسی نازیسم دا، نیشانەی رایخی، سێهەم و رەمزی شەری رەگەزی ئاریا لە دژی رەگەزی سامی بوو.

### خۆپیشاندان Demonstrations

خۆپیشاندان بە کۆبوونەوە و وەڕێکەوتن لە شەقامەکان و گۆڕەپانەکان، و بە دەربڕینی ویست و داخوازییەکان لە ڕێگای دروشمە نووسراو وزارەکیەکان بۆ نارەزایەتی دەربڕین لە بەرامبەر کردەوە و بڕیار و سیاسەتی دەوڵەت یان بە هێنانە گۆڕی یەکێک لە ویستە سیاسی و ئابوورییەکان، دەگوترێ.

## خۆبەدەستەوەدانی بێ کۆت و بەند Uhconditional Surrender

بە یەکێک شێوازەکانی کۆتایی هێنان بە شەڕ دەژمێردرێ کە بەپێی ئەمە، هیچ سنوورێک بۆ ئازادیی کردەی لایەنی سەرکەوتوو بەسەر چارەنووسی دوژمنی شکست خواردوو دانانرێ. خۆبەدەستەوەدانی بێ کۆت و بەند، تایبەتمەندی رێککەوتننامەیەکی نیە، هەربۆیە دەبێ جیاوازی لە نێوان رێککەوتننامەو خۆبەدەستەوەدان و وازهێنان لە دوژمنایەتی ــ کە هەردوو بە رێککەوتنێک لە نێوان نوێنەرانی دوژمنەکان دادەنرێن ــ دابنرێ. لە بواری یاساییەوە، خۆبەدەستەوەدانی بێ کوت وبەند، کۆتایی بەشەڕ ناهێنێ مەگەر ئەوی کە لایەنی سەرکەوتوو بۆ خۆی حەز بکا.

## جیایی خوازی Separatism

بەویستی گرووپێکی تایبەتی دەگوترێ کە دەیهەوێ لە خاک و دەسەڵاتدارەتیی سیاسیی وڵاتێک جیا بێتەوە کە خۆی بەشێک لەو وڵاتە پێک دێنێ؛ وەک داخوازیی شۆڕشگێڕانی باسکی ئیسپانیا بۆ پێکهێنانی دەوڵەتێکی سەربەخۆ.

## *خۆشبوونی شەڕ* *Escalation Of War*

بە زیادکردن، بەرفراوانکردن یان خەست و خۆڵترکردن، یان پەرەپێدان بە فاکتەر و مەودای شەڕ دەگوترێ. خۆشبوونی شەڕ بە بردنەسەری ئاستی ژمارەی ئەندامانی سوپا، دەستێوەردانی لایەنی سێهەم، کەڵک وەرگرتن لە چەکە کۆمەڵکوژەکان یان گۆڕینی ئامانجە سیاسی و سەربازییەکان جێبەجێ دەبێ. خۆش بوونی شەڕ بە دووشێوەی ئاسۆیی و ئەستوونی بەڕێوە دەچێ.

خۆش بوونی ئەستوونی بریتیە لە قووڵترکردن و ئاڵۆزترکردنی کێشەیەک، کە بە کەڵک وەرگرتن لە چاکە ئاساییەکان دەست پێدەکا و بەکەڵک وەرگرتنی تاکتیکی یان ستراتیژیی لە شەڕی ناوەکی درێژەی دەخایەنێ. وەک کەڵک وەرگرتنی ستراتیژیی "دژکردەوەی نەرم"ی ناتۆ. خۆش بوونی ئاسۆیی بریتیە لەبەرفراوانبوونی جوگرافی گۆڕپانەکانی شەڕ، وەک کەڵک وەرگرتنی

هاوکات لە "هێز دژکردەوە بەدەست و بردەکان"ی ئەمەریکا (لە کۆتاییەکانی دەیەی حەفتاو سەرەتاکانی دەیەی هەشتادا)و هێزە دەریاوانیەکانی ئەو ولاتە بۆ وەڵامدانەوە بە هێرشی سۆڤیەت لە گۆڕەپان و، خزاندنی شەڕ بەرەولای دوژمن لەرێگای هەڕەشەی راستەوخۆ لە بەرژەوەندییەکانی سۆڤیەت لە شوێنەکانی تر و، لە رێگای کەڵک وەرگرتن لە ژێر دەرياییەکان.

## Prisoners Of War

## دیلەکانی شەڕ

بە ئەندامانی هێزە چەکدارەکانی لایەنێکی شەڕی چەکدارانە دەگوترێ کە لە لایەن دوژمنەوە دیل کرابن. بارودۆخی یاسایی دیلەکانی شەڕ کە لە رێوشوێنەکانی کۆنڤانسیونی ژمارە چواری لاهە (هەروەها کۆنوانسیۆنی ساڵی ١٨٩٩)دا باس کراوە، بە درێژی لە کۆنڤانسیۆنی ژمارە سێی ساڵی ١٩٤٩ی ژنێف سەبارەت بە هەڵسوکەوت لەگەڵ دیلەکانی شەڕ (بەدیلی کۆنوانسیونی ١٩٢٩) رێک خراوەو، پەرەیان بە هێندێک لە رێوشوێنەکانی پرۆتۆکۆلەکانی ژمارە یەک و دووی ساڵی ١٩٧٧ داوە. بارودۆخی دیلەکانی شەڕ لە سەر ئەمجۆرە کەسانەی خوارەوە پیادە دەکرێ: ئەندامانی هێزە چەکدارە رێکخراو و نارێکخراوەکان، بو وێنە ئەو کەسانەی کە لە بەرامبەر حکوومەت یان مەرجەعێکدا وەفاداریی خۆیان رادەگەیەنن (کە ئەو دەسەلاتەی ئەوانی دەستبەسەر کردووە بەشەرعی و و رەسمی ناناسێ)؛ ئەو کەسە مەدەنیانەی کە لەگەڵ هێزە چەکدارەکانن، وەکوو ئەو کەسانەی کە لە بەشە ناسەربازییەکاندا کار دەکەن، پەیامنێرانی شەڕ و کەسانی لەم چەشنە، کارگوزرانی پاپۆڕە بازرگانیەکان و فڕۆکە ناسەربازییەکان؛ ئەندامانی هێزی بەرگری و پشتیوانی پێرسنێلی بەرزی حکوومەتی ناسەربازی، پێرسنێلی پزیشکی و کەسایەتیە ئایینیەکان دەکەونە بەر پشتیوانی حاڵەکانی کۆنڤانسیۆنی ژمارە سێی ژنێف. سیخوورەکان، تێکدەران و کەسانی لەم شێوە، رێوشوێن و بارودۆخی دیلەکانی شەڕ نایانگرێتەوە، بەڵام بەهەر حاڵ دەبێ بە شێوەیەکی مرۆڤانە هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا بکرێ و بە شێوەیەکی دادپەروەرانە دادگایی بکرێن.

کۆنڤانسیۆنی هەڵسوکەوتی مرۆیی لەگەڵ دیلەکانی شەڕ، ئەرکی قورس بەسەر ئەو هێزەی کە دیلەکانی دەستبەسەر کردووە، دادەسەپێنێ. کاتێک لە بارەی بابەتێکەوە پرسیار لە دیلێکی شەڕ دەکرێ، دیلەکە دەبێ تەنیا ناو و ناوبانگ، پلە، ڕێکەوتی لە دایکبوون و ژمارەی ڕیزی خۆی بدرکێنێ و، نابێ ئەو دیلە بە درکاندن و دانی زانیاری بەکەڵک بە لایەنی بەرامبەر ناچار بکرێ. دیلەکانی شەڕ دەتوانن شتە تایبەتیەکانی خۆیان بپارێزن و، دەبێ خاوەنی هەموو مافێکی سەربازی ئەو وڵاتە بن کە دیلەکەی دەستبەسەر کردووە. ئەو هێزەی کە دیلێک دەستبەسەر دەکا، دەتوانێ لە هێزی دیلەکە لە بوارە تایبەتیەکانی ئابووریدا کەڵک وەربگرێ، بەڵام خاوەنی پلە سەربازییەکان تەنیا دەتوانن وەک چاوەدێر کار بکەن. لە هیچ هەل و مەرجێکدا، ناکرێ ئەفسەران ناچار بە ئیش بکرێن بەڵام دەتوانن داوای کارێکی گونجاو بۆ خۆیان بکەن.

### دوورەپەرێزی — *Isolationism*

ئاراستەیەکی سیاسیە، کە بۆ پێناسە و شیکردنەوەی سیاسەتی دەرەوە کەڵکی لێ وەردەگیرێ. واتای ڕوونی ئەم زاراوە، هەبوونی پێوەندییەکی بەرتەسک لەگەڵ دونیای دەرەوە دایە. هەر بۆیە جێبەجێکردنی ئەم سیاسەتە پێویستی بەچەند پێوەرێکی ڕوون هەیە. بە تایبەتی، هەڵبرانی جوگرافی لە ناوەندە سەرەکییەکانی دەسەڵات لە سیستەمی نێودەوڵەتیدا، پشت بەخۆبەستن ، ڕێبەرایەتیەکی سیاسی کە لە پەرەپێدان و بەرفراوان کردنی نەتەوەیی وەک ئامانجێکی گرنگ لە دارشتنی سیاسەتەکانی، خۆش ببێ. دوورەپەرێزی لە کردەوەدا خۆی لە بەڵێن دانی سیاسی، دیپلۆماتیک یان سەربازی بە وڵاتانی تر خۆ دەبوێرێ. چین و ژاپۆن لە وڵاتانە بوون کە ئەم سیاسەتەیان جێبەجێ کردووە. لە چاخی نۆێدا، ئەم زاراوەیە بە شێوەیەکی تایبەتی پێوەندی بە سیاسەتی دەرەوەی ئەمەریکا هەبووە، بەڵام بۆ پێناسەی هێندێک لە قۆناغەکانی سیاسەتی دەرەوەی بەریتانیاش کەڵکی لێ وەرگیراوە. لە بەریتانیادا ئەم تێڕوانینە لە ئارادا بوو کە پیرەوی لە دروشمی" نەدۆستایەتی هەتا سەر، نە دوژمنایەتیش هەتا سەر، تەنیا بەرژەوەندی هەتا سەر"، پەرەی بە دورەپەرێزیی دیپلۆماتیکی وڵات دەدا.

ویلایەتە یەکگرتووەکان بە باشترین شێوە سیاسەتی دوورەپەرێزیان کردۆتە بنەمایەکی دۆگمی و پێوەرێکی دەگمەنی سیاسی. لە پاش دەوڵەتی جۆرج واشینگتۆن (٩٧-١٧٨٩) ئەم بڕوایە لە ئارادابوو کە یەکەمین سەرۆک کۆماری ئەمەریکا فاکتەرەکانی دوورەپەرێزی لە وتاری ماڵئاوایی

خۆیدا دەستنیشان کردووە. واشینگتۆن لە هاونیشتمانانی خۆی دەخوازێ کە خۆیان لە " هاوپەیمانەتی هەمیشەیی" بویێرن، بەڵام لە هەلومەرجە زۆر پێویستەکاندا هاوپەیمانەتی کاتی بە ڕەسمی بناسن و رەوایی پێ بدەن. ئەم قسانەی واشینگتۆن _بەهەڵە_ والێک درانەوە کە ناوبراو بە تەواوەتیی لایەنگری لە قەدەغەکردنی هەوڵە دەرەکیەکان بووە. کاتێک کە سێهەمین سەرۆک کۆمار [ئەمریکا] واتە تامس جیفرسۆن لە وتاری دەسپێکردنی سەرۆک کۆماریدا لە ساڵی ۱۸۰۱ هێرشی کردە سەر "هاوپەیمانەتیە بێکەڵکەکان"، بارودۆخەکە ئاڵۆزتر بوو. بەم شێوەیە، دوورەپەرێزی لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا بوو بە هۆی دابڕان لە ناوەندە سەرەکیەکانی چالاکی سیاسی، دەگمەن بوون و تاقانەبوونی ئەمەریکا وەک دەوڵەتێکی لیبراڵ و بڕوا بە زاڵبوون و بەرزتربوونی شێوازی ژیانی ئەمەریکی. سیاسەتی دوورەپەرێزی تەنیا سەبارەت بە ئەورووپا جێبەجێ دەکرا و، نیوەگۆی رۆژئاوا و ناوچەکانی زەریای ئارام یان رۆژهەڵاتی دووری نەدەگرتەوە. لەراستیدا، دۆکترینی مۆنرۆ لە کیشوەری ئەمەریکادا، زیاتر لە هەر شتێکی تر نیشانەی دەستێوەردانی ئەمەریکا بوو. تەنانەت لە پێوەندی لەگەڵ ئەورووپاشدا، بە پێچەوانەی چین و ژاپۆن کە ئاماژەیان پێکرا، دوورەپەرێزی ئەمەریکا بەواتای دابڕانی بازرگانی و کولتووری یان دابڕانی بیر وهزر نەبوو.

کەڵک وەرگرتن لەم چەمکە بوو بە هۆی سەرهەڵدانی مشتومڕێکی زۆر لە نێو مێژوونووسانی بواری دیپلۆماسی و سەرکردە سیاسیەکان و بیروڕای گشتی. هەروەک پێشتر ئاماژەی پێکرا، تێڕوانینی "واشینگتۆنی" و "جیفرسۆنی" لە سەر دوورەپەرێزی جیاوازییەکی وردیان بەیەکەوە هەبوو. یەکیان خوێندنەوەیەکی ریئالیانەی هەیە و بایەخ بە بەرژەوەندی نەتەوەیی دەداو، ئەویتر تایبەتمەندییەکی ئایدۆلۆژیای لیبراڵانەو ریزپەڕانەی هەیە. مێژوونووسانی دیپلۆماسی پێیانوایە کە مێژووی سیاسەتی دەرەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکان لە ساڵی ۱۷۸۳ بەدواوە لە سەربنەمای کێشەی بەردەوامی نێوان لایەنگرانی " دوورەپەرێزی"و لایەنگرانی "دەستێوەردان" راوەستاوە، بەڵام ئەم خوێندنەوەیە پرسیارێک لە بارەی گرنگی رێژەیی دوو روانگە لەسەر دوورەپەرێزی دەخوڵقێنێ.

زۆرکەس پێیانوایە لوتکەی دوورەپەرێزی ئەمەریکا لە سەدەی بیستەمدا، رەتکردنەوەی ڕێککەوتنامەی ڤێرسای لە ساڵەکانی ۱۹۱۹ و ۱۹۲۰ لە لایەن سەناوە بوو. بەڵام بە سەرنجدان بەرۆڵی ویلایەتەیەکگرتووەکان لە کۆنترۆڵی چەک و چۆڵ و دیپلۆماسیی قەرەبووکردنەوەی شەڕ

کە هەموو زلهێزە سەرەکیەکانی لەخۆ دەگرت، ناکرێ بە ئاسانی سیاسەتی ئەمریکا لە دەیەی ١٩٢٠دا، بە سیاسەتی دوورەپەرێزانە دابنێین. سیاسەتی دەرەوەی ئەمەریکا لە دوای دابەزینی گەورەی ئابووری (١٩٣٣_ ١٩٢٩) و گەلاڵەی "نیودیل" لە دەیەی ١٩٣٠دا لە دژایەتیکردن لەگەڵ دەستێوەردان و چەند لایەنەگەری ، رەوتێکی توندوتۆلتری بە خۆیەوە گرت. ئەم سیاسەتە بە یاسا بێلایەنەکانی ساڵەکانی (١٩٣٧_١٩٣٥) و لۆبی گرووپە هاوبەشەکانی وەکوو "سەرەتا ئەمەریکا" گەیشتە ئەوپەڕی خۆی. ئەمەریکا بە هۆی شەڕی دووهەمی جیهانیەوە بوو بە رێبەری سیاسەتی جیهانی و، کاریگەری گواستنەوەی ئەم رێبەرایەتیە لە سیاسەتی دژایەتیکردنی هەمەلایەنە لە بەرامبەر تەشەنەکردندا لە قۆناغی شەڕی ساردا هەست دەکرێ. شەڕی ڤێتنام بوو بە هۆی هێنانەگۆری جارێکی تری دوورەپەرێزی و ئەم سیاسەتە ئێستاش هەروا یەکەمین و جێگیرترین هەڵویستی سیاسەتی دەرەوەی ئەمەریکایە.

### دەستی رەش — Black hand

ئەم زاراوە بە ئەنجومەنێکی زۆر نهێنی دەگوترێ، کە لە سوپای سیربەکاندا چالاکی دەنواند (١٩١١). ئامانجی ئەم رێکخستنە رزگارکردنی سیربەکان لە ژێر دەسەڵاتی نەمسا ـ هەنگاریا و تورکیا بوو. دەستی رەش لە سەردەمی شەڕەکانی باڵکان دا رۆڵ و کاریگەرییەکی زۆری لە بەڕێوەبردنی سیاسەتی سیربیاندا هەبوو و، خەریکی راهێنان و ناردنی تیرۆریستەکان بوو. ئارشیدۆک فرانتێز فرێدیناند لە لایەن دەست و پێوەندییەکانی ئەنجومەنی دەستی رەشەوە کوژراو، ئەم کارەش بوو بە بیانووی سەرهەڵدان و دەسپێکی یەکێک لە گرنگترین رووداوەکانی سەدەی بیستەم واتا شەڕی یەکەمی جیهانی(١٩١٨-١٩١٤). بە دوای ئەم رووداوە، بەرپرسانی سیربیا کەوتنە گرتن وراوەدونانی ئەندامانی ئەم ئەنجومەنەو، بە تاوانی هەڵیساندنی ئاژاوە و کوشتنی جێگیری پاشای نەمسا، ئەندامانی سەرکردایەتی ئەم ئەنجومەنە دەستبەسەر کران و لە سێدارەدان.

### دووبەرەکی بنێوە و حکومەت بکە — Divide and Rule

یەکێک لە دروشمە ناسراوو کۆنەکانی کۆلۆنیالیزمە کە کۆلۆنیالیستەکان بەهۆی دووبەرەکیی نانەوە لە نێوخەڵکی وڵاتێکدا درێژەیان بە چەوسانەوە لەو وڵاتەدا دەدا.

## World Outlook دنیا بینی

بریتیه لە سیستەمی بۆچوونەکان، چەمکەکان و وێناکان سەبارەت بە جیهان. ئەم زاراوە لە واتا بەرفراوانەکەی خۆیدا هەموو بۆ چوونەکانی مرۆڤ سەبارەت بە جیهان لەخۆ دەگرێ ـ واتە ڕا وبیروبۆچوونە فەلسەفی و کۆمەڵایەتی و سیاسی ورەوشتی و هونەری و بابەتەکانی پێوەندیدار بە زانستە سروشتیەکان و.... هتد. مانای بەرتەسکتری زاراوەی دنیابینی بریتیە لە را و بیروبۆچوونە فەلسەفیەکان.

بەگشتی دەکرێ جۆرەکانی دنیابینی بەسەر سێ جور دابەش بکەین:

١ـ دنیا بینیی زانستی

٢ـ دنیا بینیی فەلسەفی

٣ـ دنیا بینیی ئاییتی

## European Caurt Of Human Rights دادگای ئەوروپیی مافی مرۆڤ

بە دەزگای دادوەریی کۆنڤانسیۆنی ئەورووپیی مافی مرۆڤ دەگوترێ کە سەلاحییەتی پێراگەیشتن بە فایلی ئەو سکاڵا تۆمارکراوانەی کە سەبارەت بە مافی مرۆڤن، پێ سپێردراوە. ئەم فایلانە لەلایەن ولاّتانەی کە مۆریان کردووە یان لە لایەن کۆمیسیۆنی ئەورووپیی مافی مرۆڤ بۆ ئەم ناوەندە دەنێردرێن. ئەم دادگایە بەپێی پرۆتۆکۆلێک کە بە کۆنڤانسێونی مافی مرۆڤەوە لکێندراوە، پێک هاتووەو، لە چەندین دادوەر پێکدێ کە بۆ ماوەی نۆ ساڵ لەلایەن کۆڕی ئەنجوومەنی ئەورووپا لە نێو ئەو ناوانەی کە پێشکەش بەم ئەنجوومەنە دەکرێ، هەڵدەبژێردرێن. سەلاحییەتی دادگا سەربەستانەیە، واتا ئەو ولاّتەی کە کۆنڤانسیۆنی ئەورووپیی مۆر کردووە، بە شێوەیەکی ئۆتۆماتێک سەلاحییەتی دادگا قبووڵ ناکا، بەڵکوو دەبێ سەرەڕای قبوولکردنی پرۆتۆکۆلی گرێدراو بە کۆنڤانسیۆن، ڕاگەیەنراوێکیش بۆ ئەم مەبەستە دەربکا. بڕیاری دادگا پێویستە لەلایەن لایەنەکانەوە جێبەجێ بکرێ.

### داس و چەکوچ Hammer and Sickle

رەمزێک بوو کە لەسەر ئاڵای سووری یەکیەتیی سۆڤیەتی سۆسیالیستی بە نیشانەی یەکیەتیی جوتیاران و پرۆلتاریای پیشەسازی کێشرابۆوە. ئەو رەمزە هەروەها لەسەر گرنگی هاوشانی کشتوکاڵ و پشەسازی پێی دادەگرت.

### دیتانت / سڕینەوەی قەیران Détente

زاراوەیەکی سیاسیە کە بۆ ئاماژەکردن بە رەوشی کەمبوونەوەی پاڵەپەستۆ، یان گرژی و ئاڵۆزی نێوان دوویان چەند وڵات کەڵکی لێ وەردەگیردرێ. رەنگە قۆناغی دیتانت لە ئەنجامی گرێدانی پەیماننامەیەکی رەسمی یان لە ئەنجامی گۆڕانکاریی ستراتیژیی نەتەوەیی لە ماوەی چەندین ساڵدا پێک بێ. بۆوێنە، رێککەوتننامەی لوکارنۆ (١٩٢٠)، قۆناغێکی تا رادەیەک سەقامگرتوو و ئارامی لە ئەوروپادا پێکهێنا. قۆناغێکی دیتانتیش لە پێوەندییەکانی ئەمەریکا و سۆڤیەتدا پێکهات کە بەپێی پێکەوە ژیانی ئاشتیانە بوو و، ئەم قۆناغە بە تێگەیشتن لەو راستیە کە شەڕێکی هەمەلایەنە دەتوانێ لە ئاکامدا لە نێو چوونی هەردوولای لێ بکەوێتەوە، پێک هاتبوو.

### دەستێوەردان Intervetion

دەستێوەردان بە کردەیەک دەگوترێ کە دەوڵەتێک بە حەزو ئیرادەی خۆی و بەبێ هیچ بەڵگە و مافێکی یاسایی، دەوڵەتێکی سەربەخۆی دیکە ناچاردەکا لە کاروبارەکانی پێوەندار بە سیاسەتی دەرەوەو نێوخۆییدا پێرەوی لە بۆچوونەکانی ئەو دەوڵەتە بکا.

توخمە پێکهێنەرەکانی دەستێوەردان : بەپێی ئەم پێناسە، بۆ ئەوەی کە بتوانین کارێک بە دەستێوەردان ناوبەرین دەبێ سێ مەرجی تێدابێ:

یەکەم: دەستێوەردان دەبێ لە کاروباری دەوڵەتێکی سەربەخۆ وخاوەن سەروەریدا بەڕێوە چووبێ. هەربۆیە، هەرکارێک کە لە دەرەنجامی هاوکاری ویەکیەتی و هاوبەشیەوە بەڕێوەچووبێ، ناکرێ بە دەستێوەردان یان خۆتێهەڵقورتاندن ناوببرێ. بۆوێنە، لە دەوڵەتە یەکگرتووەکان پاراستنی یەکپارچەیی خاکی هەرکام لە دەوڵەتەکان ئەرکی دەوڵەتەیەکگرتووەکانە، یان رێو شوێنەکانی پاراستنی دەستوور بە حکومەتی دەوڵەتە یەکگرتووەکان سپێردراوە، هەربۆیە ئەگەر خاک یان

دەستووری یەکیک لەو ولآتانە بکەویتە مەترسیەوە، خۆتێهەڵقورتاندن بۆ دەوڵەتی یەکگرتوو نەک تەنیا مافە، بەڵکوو بە ئەرکیش دەژمێردرێ. هەروەها ئەگەر بێلایەنی دەوڵەتێک کە بێلایەنیەکەی لە لایەن دەوڵەتانی تردا دانی پێدانراوە، بکەوێتە بەر هێرش و دەستدرێژی، ئەوا ئەو دەوڵەتانەی کە دانیان بە بێلایەنی ئەو دەوڵەتەدا ناوە، لە کاتی ئەو هێرش و دەستدرێژییەدا، نەک تەنیا مافی خۆیانە، بەڵکوو ئەرکی سەرشانیانە کە بەرگری لە بێلایەنیی ئەو ولآتە بکەن و، ئەمەش بە خۆتێهەڵقورتاندن دادەنرێ.

دووهەم دەستێوەردان یان خۆتێهەڵقورتاندن دەبێ تەنیا بەپێی حەزو ئیرادەی دەوڵەتی خۆتێهەڵقوتێنەر بەڕێوە بچێ.

ئەگەر دەوڵەتێک بۆخۆی داوا لە دەوڵەتێکی دیکە بکا کە بە قازانجی ئەو دەوڵەتە شتێک بکا، یان لە حاڵەتێکدا کە بەپێی رێککەوتننامە یان بە پێی یاسایەکی نێودەوڵەتیی، ئەرکێک بە ولاتێکی دیکە بسپێردرێ، ئەوە بە دەستێوەردان دانانرێ.

سێهەم: دەستێوەردان یان خۆتێهەڵقورتاندن دەبێ بۆ سەپاندنی حەزو ئیرادەی دەوڵەتی خۆتێهەڵقورتێنەر بەڕێوە بچێ. هەرکاتێک دەوڵەتی خۆتێهەڵقوتێنەر تەنیا پێشنیار ئاراستە بکا یان راوبۆچوونی خۆی دەربڕێ و لایەنی بەرامبەر سەرپشک بکا کە پێشنیارەکان پەسند بکا یان رەتیان بکاتەوە، ئەو کارە بە دەستێوەردان دانانرێ.

جۆرەکانی دەستێوەردان: دەستێوەردان رەنگە تاکەکەسی، کۆمەڵایەتی، سیاسی یان چەکدارانە بێ. رەنگە دەستێوەردانی سیاسیش دۆستانە بێ یان رەسمی بێ. لە ساڵی ١٨١٥دا دەوڵەتەکانی پرۆس و نەمسا دەستێوەردانێکی سیاسیی دۆستانەیان لە دەوڵەتی "پیەمۆن"دا بەڕێوە برد، واتا بە ناردنی راسپاردەیەکی تایبەتی بۆ دەرباری ڤیکتۆر ئیمانوئێل، پاشای ئەم ولآتە، ناوبراویان لە بیرو بۆچوونەکانی خۆیان ئاگادار کردەوە، پێیان راگەیاند کە ئەگەر ئەم دەوڵەتە درێژە بەم سیاسەتەی خۆی بدا، ئەوا دەبێتە هۆی نیگەرانی ئەو دوو ولآتە؛ بەڵام پاشای پیەمۆن گوێی بەم ئامۆژگاری وپێشنیارانە نەدا و، ئاڵوگۆڕی لە سیاسەتەکەی خۆیدا پێک نەهێنا.

بە پێچەوانە، دەوڵەتەکانی فەرەنساو بەریتانیا لە ساڵی ١٨٥٦دا دەستێوەردانێکی سیاسیی رەسمییان لە دەرباری "ناپڵ"دا کرد، تاکوو ئەم دەوڵەتە ناچار بکەن گۆڕان لە سیاسەتەکانی خۆیدا

پێک بێنێ، خۆی لەگەڵ سیاسەت و بیروبۆچوونی ئەواندا ڕێک بخا؛ بەڵام چوونکە دەوڵەتی ناوبراو گوێی بەم داواکارییەی ئەم دەوڵەتانە نەدا، ئەوا هەردوو دەوڵەتی فەڕەنساو بەریتانیا نوێنەرانی سیاسی خۆیان لەم وڵاتە بانگ کردەوەو، پێوەندییە سیاسیەکانی خۆیان لەگەڵ دەوڵەتی ناپڵ دا پچڕاند.

## دەریای خەزەر، باری یاسایی

## Legal Status Of The Caspian Sea

دوای لەبەریەک هەڵوەشانەوەی یەکیەتیی سۆڤیەت و سەربەخۆیی وڵاتانی دەوروبەری دەریای خەزەر، مەسەلەی کەڵک وەرگرتن لە سەرچاوەکانی ئەو دەریایە، گرنگیەکی تایبەتی پەیدا کردووە. ئەم دەریایە خاڵی بەیەک گەیشتنی ٥ی وڵاتی گرنگ، واتە ئێران، رووسیا، قەزاقستان، تورکەمەنستان وئازەربایجانەو، دوای ناوچەی خاوەن نەوتی کەنداوی فارس و سیبریا، بە گەورەترین سەرچاوەی نەوت و گازی دنیا ناسراوە.

یەکێک لە کێشەکانی پێوەندیدار بە دەریای خەزەر، چۆنیەتی دیاریکردنی باری یاسایی ئەو دەریایەیە کە ئەم توخمانە لە خۆدەگرێ:

١ـ کێشەی هاتوچۆی پاپۆرەکان؛

٢ـ کێشەی کەڵک وەرگرتن لە سەرچاوە زیندووەکانی ناو دەریا؛

٣ـ کێشەی ژینگە، بۆوێنە بەرزبوونەوەی ئاستی ئاوی دەریا؛

٤ـ کێشەی کەڵک وەرگرتن لە سەرچاوە کانزاییەکان؛

٥ـ دیاریکردنی سنوور و ئاستی دەسەڵات و سەلاحییەتی دەوڵەتەکانی لێوار دەریای خەزەر بەسەر ئەو دەریایەدا.

دەریای خەزەر بارێکی تایبەتیی یاسایی تایبەت بە خۆی هەبووە. ئەم دەریایە تەنیا لە ڕێگای کەناڵە دەستکردەکانەوە لە ڕێگای ڕووباری ڤۆلگا ـ دەن، دەگاتەوە دەریای ڕەش و دەریای باڵتیک و، تەنیا پاپۆرەکانی وڵاتانی لێواری ئەم دەریایە مافیان هەیە هاتوچۆی تێدا بکەن. ڕێوشوێنەکانی ئێستای یاسای نێونەتەوەیی گشتی سەبارەت بە دەریای ئازاد و ناوچە دەریاییەکانی دەوڵەتەکانی جیهانی ئازاد ئەم دەریایە لە خۆ ناگرێ. سەرەکیترین سەرچاوەی یاسایی کە دەکرێ لە وتووێژە سیاسیەکاندا پشتی پێ ببەسترێ، تەنیا ئەو ڕێککەوتننامانەن کە ئێستا لەبەر دەست دان.

ئەوەی کە لە پێناسەی کۆنڤانسیۆنەکانی ئێستادا سەبارەت بە یاسای دەریاکان دەردەکەوێ ئەوەیە کە دەریای خەزەر بە هۆی هەڵکەوتی جوگرافی، ناچێتە خانەی دەریا داخراو ونیوە داخراوەکانەوە.

گرنگترین ئەو ڕێککەوتننانەی کە لەو پێوەندییەدا هاتوونە ئاراوە، بڕیتین لە ڕێککەوتننامەی ١٩٢١ و، ڕێککەوتننامەی هاتوچۆی پاپۆڕەکان و بازرگانیی ساڵی ١٩٤٠ کە لە نێوان ئێران و یەکیەتیی سۆڤیەتدا گرێدراون. لە فەسڵی یازدەی ڕێککەوتنی ١٩٢١ی نێوان ئێران و شۆڤیەت مافی وەک یەک بۆ هاتوچۆی پاپۆڕەکانی شەڕ و پاپۆڕەکانی بازرگانی لە بەرچاو گیراوەو، ماددەی ١٣ی ڕێککەوتنی هاتوچۆی پاپۆڕەکان و بازرگانیی ساڵی ١٩٤٠ بە ڕوونی باس لەوە دەکا کە : " هەردوو لایەنی ڕێککەوتنەکە (ئێران و یەکیەتیی سۆڤیەت)، بەپێی ئەو پرەنسیپانەی کە لە ڕێککەوتننامەی ٢٦ی شوباتی ١٩٢١دا ڕاگەیەنراوە، کۆکن لەسەر ئەوی کە تەنیا پاپۆڕەکانی ئەو دوو وڵاتەو ئەو پاپۆڕانەی وڵاتانی دەرەوە کە کار بۆ بازرگانیی ئەو دوو وڵاتە دەکەن و لەژێر ئاڵای ئەواندا هاتوچۆدەکەن،بتوانن لە دەریای خەزەردا هاتووچۆ بکەن".

بەگشتی سێ سیناریۆ سەبارەت بە ڕژێمی یاسایی دەریای خەزەر لە ئارا دایە:

سیناریۆی یەکەم: کۆنڤانسیۆنی یاسای دەریاکانی ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان لە ساڵی ١٩٨٢ (Unclos III.١٩٨٢)، بۆ هەر وڵاتێکی لێواری دەریای خەزەر، ئاوی سەرزەوی و چوارچێوە و ناوچەی تایبەتی ئابووری و ڕۆخی دەریا لەبەرچاو گیراوە. ماددەی سێی کۆنڤانسیۆن ناوچەیەکی بە پانایی ١٢میلی دەریایی لە هێڵی سەرەکی (Baseline) بۆ ئاوی ژێرزەوی لەبەرچاو گرت و، دەکرێ ١٢ میلی دیکە، وەک ناوچەی تەنیشت بخرێتەسەر ئەو دوازدە میلەی پێشوو (ماددەی ٣٣). هەروەها بە پێی ماددەی ٥٧ی کۆنڤانسیۆن دەکرێ ناوچەی تایبەتی ئابووری هەتا ٢٠٠ میلی دەریایی درێژەی هەبێ. بەسەرنجدان بەوی کە پانایی دەریای خەزەر زیاتر لە ٢٠٠ میل نیە هەر بۆیە شوێنێک بە ناوی دەریای ئازاد نامێنێتەوە. سەرەڕای ئەمە، تێکەڵبوونی ناوچەی تایبەتی ئابووریی ئەو وڵاتانە لەگەڵ یەکتر، بارودۆخێکی دژوار دەنێتەوە کە تەنیا بەگرێدانی ڕێککەوتننامەی تایبەت دەبێ چارەسەر بکرێ.

سیناریۆی دووهەم: بەپێی ئەم سیناریۆیە کە ئازەربایجان لە هەموو لایەک زیاتر لایەنگری لێ دەکا، دەریای خەزەر دەبێ بەپێی سنووری ئاویی هەروڵاتێک لە نێو ئەو پێنج وڵاتەدا دابەش

بکرێ. ئەم سیناریۆیە، بەپێچەوانەی ڕواڵەتە دادپەروەرانەی کە، ڕەنگە بە زیانی هێندێک لە وڵاتان لە پێوەندی لەگەڵ کەڵک وەرگرتن لە سەرچاوە هیدرۆکەربۆری، تەواو بێ. یەکێک لەو بابەتانەی کە گرنگی دیاریکردنی چوارچێوەی یاسایی دەریای خەزەر دوو هێندە دەکا، کەڵک وەرگرتن لە سەرچاوە و کانزاکانی هیرۆکەربۆرییە.

سیناریۆی سێهەم: بەپێی ئەم سیناریۆیە، چوارچێوە یان بەشێکی دیاریکراو لە ئاوەکانی لێواری دەریا بۆ هەروڵاتێک تەرخان دەکرێ و تایبەت بەو وڵاتە دەبێ و، ئەویتریش بە شێوەی خاوەندارێتی هاوبەش ( Res Communis) کەڵکی لێ وەردەگیردرێ. خاوەندارەتیی هاوبەش بە سەلاحییەت و دەسەڵاتی هاوبەشی نێوان دوو یان چەند دەوڵەت بەسەر ناوچەیەکدا دەگوترێ.

دوای گرێدانی یەکەم ڕێککەوتننامەی دەستنیشانکردنی سنوورە ئاوییەکانی نێوان ڕووسیاو ئازەربایجان لە تشرینی یەکەمی ۲۰۰۲ دا، سێ وڵاتی قەزاقستان، ئازەربایجان و ڕووسیا لە ١٤ی ئایاری ۲۰۰۳دا، ڕێککەوتنێکی سێ لایەنەیان لە کۆبوونەوەی تایبەت بە نوێنەرانی وڵاتانی لێواری دەریای خەزەر لە ئەڵماتی قەزاقستاندا مۆر کرد. بەم شێوە و بە سەرنجدان بە درێژایی لێوارەکان و بەکەڵک وەرگرتن لە هێڵی نێوەڕاست، بەشی قەزاقستان ۲۷ لە سەد و هی ڕووسیا ١٩ لە سەد و ئازەربایجان ١٨ لەسەد دەستنیشان کرا؛ واتە بەگشتی چارەنووسی ٦٤ لە سەدی ئاوەکانی دەریای خەزەر یەکلا کراوەتەوە.

## دیسپۆتیزم Despotism

ئەم زاراوە لە وشەی یۆنانیی Despotés ( fmواتای "ئاغا"و"خودان") وەرگیراوەو، بە دەسەڵات و ئۆتۆریتەیەک دەگوترێ کە هیچ سنوورێکی یاسایی نەبێ و سەرەڕۆیانە پیادە بکرێ. دیسپۆتیزم بە واتای دەسەڵاتێکی دیکتاتۆرو سەرەڕۆش کەڵکی لێ وەردەگیردرێ. بەڵام مەبەست لە دیسپۆتیومی ڕۆشنبیرانە جۆرێک لە حکومەتی ئایدیالە کە ئەفلاتۆن و کۆمەڵێک لە بیرمەندانی چاخی نوێ بانگەشەیان بۆ کردووە.

بەپێی تیۆری کارڵ ڤیتفۆگێل (Witfogel)، دیسپۆتیزمی ڕۆژهەڵات کە واتایەکی نوێ لە دیسپۆتیزمە، بەکۆمەڵگایەک دەگوترێ کە خاوەنی ئەم تایبەتمەندییانە بێ:

١ــ حکومەتی تاکەکەسی (ئوتوکراسی).

٢ــ بەڕێوەبردنی وڵات لەلایەن ڕێکخراوێکی ئیداریی چەقبەستوو.
٣ــ نەبوونی ئاریستۆکراتیەتێکی جێگرتوو.
٤ــ بێ بایەخ بوونی کۆیلەداری.
٦ــ کشتوکاڵێک بە ئاودێرییەکی بەرفراوان.
بە بڕوای ڤیتفۆگل، کشتوکاڵ رۆڵێکی گرنگی لە دیسپۆتیزمداهەیە.

## دۆکترین/ ڕێبازی سیاسی **Doctrine**

لەزاراوەی لاتینیی Doctrina وەرگیراوە. دۆکترین بریتیە لە تیۆر و ڕاهێنانە زانستی، فەلسەفی، سیاسی و ئاینیەکان و، کۆمەڵێک لە سیستەمە فیکرییەکان کە بنەمای روون و دیاریکراویان هەیە. دۆکترین جۆرێک لە دونیابینیە کە پرۆگرامە سیاسیەکانی لەسەر دارێژرابن. هەروەها دۆکترین بەو پرەنسیپانە دەگوترێ کە دەوڵەتەکان ڕێبازەکانی خۆیان، بە تایبەتی پێوەندییە نێونەتەوەیەکانیان بەپێی ئەو ڕێبازە دیاری دەکەن. زاراوەی دۆکترینێر Doctrinaire بەکەسێک دەگوترێ کە پشتیوانی لە دۆکترینێکی روون و دیاریکراو دەکا.

## دۆکترینی پێڕەویی کوێرکوێرانە
## Doctrine Of Passive Obedience

سەرچاوەی ئەم زاراوە بەسەردەمی بالآدەستیی تیۆری "مافی خوایی پاشاکان" دەگەڕێتەوە کە بەپێی ئەم تیۆرە، مل نەدان و پیڕەوی نەکردن لە بریارەکانی پاشا بە تاوانێکی گەورەو نەبەخشراو دەژمێردرا. ئەم تیۆرە لە سەردەمی دەسەلآتدارەتیی چارلزی یەکەم (١٦٤٩ــ ١٦٢٥) لە لایەن قەشەکانی بەریتانیاوە پەرەی پێدرا.

## دۆکترینی پێویستیی سەربازی
## Doctrine Of Military Necessity

بەو دۆکترینانە دەگوترێ کە بەر لە شەڕی یەکەمی جیهانی لە لایەن هێندێک لە یاساناسانی ئەڵمانیا خرانەڕوو و، تەنیا لە لایەن ئەڵمانیا و هێندێک وڵاتی تر پیڕەو دەکران. بەپێی ئەم دۆکترینانە، لە کاتی زۆر پێویستی سەربازیدا، یاساکانی شەڕ گرنگیی خۆیان لە دەست دەدەن. یاسا

نێونەتەوەییەکان دۆکترینی پێویستی سەربازی ڕەت دەکەنەوە و بە یاسایی نازانن. ڕێوشوێن و یاساکانی لاهە (کۆنڤانسیۆنی ژمارە ٤ی ساڵی ١٩٧٠ و کۆنڤانسیۆنی هاوشێوەیەو کۆنڤانسیۆنە لە ساڵی ١٨٩٩دا) بە ڕوونی دەڵێن کە مافی لایەنی شەڕ بۆ هەڵبژاردنی ئامرازی زەربەلیدان لە دوژمن بێ سنوور نیە و، یاساکانی شەڕ لە کاتی پێویستیی سەربازیدا گرنگیی خۆیان لە دەست نادەن. هەروەها، خوودی یاساکانی شەڕ بە شێوەیەک ڕێکخراون کە پێشتر، مانای پێویستی سەربازییان لەبەرچاو گرتووە.

## دۆکترینی فرانک سیناترا Frank Sinatra Doctrine

ئەم زاراوە لە گۆرانی فرانک سیناترا، گۆرانی بێژی بە ناوبانگی ئەمەریکی و ئەکتەری پێشووی هۆلیفود، بە ناوی "من بە شێوازی خۆم کاردەکەم" (I did it my way) وەرگیراوە. ئەم زاراوە لە کانوونی یەکەمی ١٩٨٩دا لەلایەن "گۆنادی گراسیمۆف"، وتەبێژی وەزارەتی دەرەوەی سۆڤیەت بۆ پاساوی سیاسەتە نوێکانی سۆڤیەت سەبارەت بە گۆڕانکارییە خێراکانی وڵاتانی ئەورووپای ڕۆژهەڵات کەڵکی لێ وەرگیرا. ناوبراو وتی: " لەمەو بە دوا یەکیەتیی سۆڤیەت پیرەوی لە دۆکترینی فرانک سیناترا لە پێوەندی لەگەڵ وڵاتانی ئەندامی ڕێککەوتننامەی ڤەرشۆدا دەکا. بەو واتایە کە ئەوان هەرکارێک کە پێیان خۆشە بیکەن. بەم پێیە، هەر وڵاتێک مافی ئەوەی هەیە کە بڕیارە سەربەخۆکانی خۆی لەهەر ڕێگایەکەوە کە پێی خۆشە، بەڕێوە ببا. هەروەها، دەبێ پێکهاتە و سیستەمە سیاسیەکانی هەر وڵاتێک لە لایەن خەڵکی ئەو وڵاتەوە دیاری بکرێ و بەڕێوەبچێ".

## دۆکترینی پەرداخێک ئاو One Glass Of Water Doctrine

ئەو دۆکترینە دوای سەرکەوتنی شۆڕشگێڕەکانی رووس لە لایەن لنینەوە کەڵکی لێ وەرگیرا. بەپێی ئەم بۆچوونە، دەبێ کۆمۆنیستێک بە شێوەیەک سەیری بابەتە جنسیەکان (سێکسییەکان) بکا وەک ئەوە وابێ کە بەقەد پەرداخێک ئاو گرنگیان پێدەدا. کۆمۆنیستە شۆڕشگێڕەکان لە قۆناغی سەرەتایی شۆڕشی رووسیا و شۆڕشی چیندا باوەڕیان بەم تێزە هەبوو. ئەم ڕێبازە لە چیندا بە یاسای

"پێی ــ شووئی ــ چوو ــ ئی" به‌ ناوبانگه‌و، چینیه‌کان باوه‌ڕیان پێیه‌تی. شۆڕشگێڕه‌ کۆمۆنیسته‌کان له‌ دنیای ڕۆژئاوادا باوه‌ڕیان به‌م دۆکترینه‌ نیه‌.

## دۆگماتیزم demagogy

دۆگماتیزم له‌ زاراوه‌ی یۆنانیی Dogma به‌واتای بڕیار و بیروبۆچوون وه‌رگیراوه‌. ئه‌م زاراوه‌ له‌ قامووسه‌ فه‌لسه‌فی و ئایینیه‌کاندا به‌ هه‌ر پره‌نسیپێکی بیروبوچوونی ئایینی یان غه‌یره‌ ئایینی ده‌گوترێ که‌ له‌ ڕوانگه‌ی لایه‌نگره‌کانیه‌وه‌ به‌ شتێکی حاشاهه‌ڵنه‌گر، ڕه‌ها، گومان هه‌ڵنه‌گر و نه‌گۆڕ داده‌نرێ.

هه‌ر سیسته‌م یان ڕێبازێکی ئایدۆلۆژی له‌سه‌ر زنجیره‌ پره‌نسیپێک دامه‌زراوه‌ که‌ به‌ دوگمه‌کانی ئه‌و سیسته‌مه‌ یان ڕێبازه‌ داده‌نرێن، بڕوا پێ بوون یان بڕوا پێ نه‌بوون به‌و دوگمانه‌، به‌ پێوه‌ری به‌ستراوه‌یی یان نه‌به‌ستراوه‌یی که‌سێک به‌و ڕێبازه‌ ئایدۆلۆژییه‌ داده‌نرێ.

## دیماگۆژی Demagogy

دیماگۆژی له‌ زاراوه‌ی یۆنانیی Demagogia وه‌رگیراوه‌. ئه‌م زاراوه‌ له‌ دوو به‌شی demos به‌ واتای خه‌ڵک و agogos به‌ واتای ئه‌و که‌سه‌ی که‌ ڕێنوێنی ده‌کا، پێکهاتووه‌. له‌ زمانی سیاسیی ئه‌وڕۆکه‌دا، ئه‌م زاراوه‌ به‌ واتای خه‌ڵک فریودان و چه‌واشه‌کردنی خه‌ڵک له‌ ڕێگای به‌ڵێن و دروشمی سه‌رنج ڕاکێش و درۆزنانه‌، که‌ڵکی لێوه‌رده‌گیرێ. دیماگۆگ به‌و که‌سه‌ ده‌گوترێ که‌ هه‌وڵ ده‌دا له‌ ڕێگای به‌ڵێنی به‌درۆ و بێ بنه‌ماو هه‌روه‌ها له‌ ڕێگای هه‌ڵگێڕانه‌وه‌ی ڕاستیه‌کان سه‌رنجی خه‌ڵک بۆلای خۆی ڕابکێشێ بۆ ئه‌وه‌ی که‌ له‌ لایه‌ن ئه‌وانه‌وه‌ پشتیوانی لێ بکرێ.

شایانی باسه‌ که‌ له‌ یۆنانی کۆن و هه‌روه‌ها له‌ ڕۆمی کۆندا دیماگۆژی به‌ مانای "سه‌رکردایه‌تی کردنی خه‌ڵک" بووه‌و، مانایه‌کی پیرۆزی هه‌بووه‌.

## دیموکراته‌کان Democrats

له‌ کۆمه‌ڵگا کۆمۆنیستیه‌کاندا به‌و گرووپه‌ له‌ " ڕۆژئاواچیه‌کان " ده‌گوترێ که‌ وانه‌ و ڕاهێنانه‌ مارکسیه‌کان ڕه‌ت ده‌که‌نه‌وه‌و، له‌سه‌ر ئه‌و بڕوایه‌ن که‌ مارکس و ئه‌نگێلز له‌ سه‌رده‌مێکدا ده‌ژیان که‌ کاپیتالیزم تازه‌ قۆناغی سه‌ره‌تایی خۆیی تێپه‌ڕ ده‌کردو؛ خوێندنه‌وه‌و بۆچوونه‌کانی ئه‌وان سه‌باره‌ت به‌ سه‌رمایه‌وه‌ به‌ هه‌ڵه‌ ده‌زانن.

دیمۆکراتەکان لە سەر ئەو بڕوایەن کە، " نەخۆشیەکانی کۆمەڵگای سەرمایەداری پێوەندی بە قۆناغی گەشەی سەرمایەدارییەوە هەیە کە ئەویش چارەسەر دەکرێ و، ئەم سیستەمە دەتوانێ لە دەست نەخۆشیەکانی وەک قەیرانی بەرهەمی زیادی، بێکاری و رەگەزپەرەستی رزگار بێ".

## دیموکراسی Democracy

زاراوەیەکە کە لە چەمکی یۆنانیی Démokratiaوەرگیراوە، کە پێشگری دیمۆس بە واتای "بەڕێوەبردنی کاروباری دەرەوەی وڵات"ە. دیمۆس دواتر بەمانای هەژار و لێقەوماو و گوندییەکان و لە ئاکامدا بە واتای "حەڵک " کەڵکی لێوەرگیراوە.

"کراسیا"ش لە کراتۆس Kratos وەرگیراوە و، بەمانای دەسەڵات و ئۆتۆریتە و هەروەها بە واتای دەسەڵاتدارەتی و حکوومەت کردنیشە.

زاراوەی دیمۆکراسیا بۆیەکەمین جار لە ئەسینا ولە سەردەمی کلێستیندا هاتە ئاراوە. ناوبراو لە ساڵی ٥١٠ی بەر لە زاین کۆتایی بە حکومەتی هیپارک و براکەی هیپاس هێناو، بە پێکهێنانی چەندین چاکسازیی یاسایی، حکومەت کەوتە دەست گوندییەکان و هەژارەکان؛ ئەم حکومەتە بە دیمۆکراسیا بەناوبانگ بوو و، "کلێستین"یش بە دامەزرێنەری دیمۆکراسی ناسرا.

دواتر لە یۆنانی کۆندا زاراوەی دیموکراسی بە حکومەتی گشتی وئاریستۆکراتی بە حکومەتی چینە تایبەتەکان دەگوترا.

هیردۆت، مێژوونووسی یۆنانی دەنووسێ: " ئەگەرچی دیمۆکراسی هەموو کەس لە بەرامبەر یاسا بە یەکسان دەزانێ، بەڵام گرفتەکە لەوەدایە کەبە ئاسانی دەتوانێ ببێ بە مۆبۆکراسی یان حکومەتی نەزان و نالێهاتووەکان کە بە دڵنیاییەوە حکومەتی زانا و کەسە لێهاتووەکان لە حکومەتی نەزانەکان باشترە".

دیموکراسی بەمانایی ئەوڕۆیی ولە زمانی سیاسەتدا بە واتای " بەڕێوەبردنی حکومەت لەلایەن خەڵک" کەڵچکی لێوەردەگیردرێ. هەر ئەو مانایە لە لایەن ئابراهام لینکۆڵن (١٨٠٩-١٨٦٥)، سەرۆک کۆماری ئەمەریکا لە ساڵەکانی ١٨٥٩ و ١٨٦٤دا بەم شێوە راگەیەنراوە:

"دیموکراسی بە واتای حکومەتی خەڵک، بەدەستی خەڵک و بۆخەڵک".

دیموکراسی له بنەڕەتدا بە واتای "حکومەتی گشت خەڵک"ە، بەڵام چوونکە حکومەتی ڕاستەوخۆی خەڵک لە هەلومەرجی ژیانی ئەوڕۆیی و بەهۆی گەورەبوونەوەی شارەکان و زۆربوونی حەشیمەتی ولاتەکان نایەتەدی، هەر بۆیە دیمۆکراسی لە ڕێگای ناڕاستەوخۆ، واتە لە ڕێگای هەڵبژاردنی نوێنەران و بەخشینی دەسەلاتی حکومەت بەدەستی ئەوان، بەڕێوە دەچێ. ئەم کەسانە کە بەپێی دەستوور و یاسا باوەکان و بەتایبەتی یاسای هەڵبژاردنە گشتیەکان بۆ ماوەیەکی دیاریکراو ئەرکی نوێنەرایەتی لە ئەستۆ دەگرن، بە جێگای دەنگدەران ئایدیاکانی ئەوان بەدامەزراندنی دەسەلاتێکی نەتەوەیی جێبەجێ دەکەن.

بەڵام هەڵبژاردنەکان بۆ ئەوە بەڕێوە دەچن تا دەرکەوێ کە چ ئایدیاو بیروبۆچوون و چ پرۆگرام وچ حیزبێ لە نێو خەڵکدا برەوی هەیە، واتە کام یەک لەوانە بەپێی ویست و حەزی خەڵکەو، کام بیروبۆچوون توانیویەتی لە نێو خەڵکداجێی خۆی بکاتەوە. یەکێک لە ڕێگاکانی پیادەکردنی دیمۆکراسی ئەوەیە کە ڕێز لە ئازادیە بنەڕتیەکان وبە تایبەتی ڕێز لە ئازادیی بیروبۆچوون، ئازادییە چاپەمەنیەکان، ئازادیی کۆبوونەوەکان، ئازادیی پروپاگەندە وراهێنانەکان ... هتد بگیرێ و، لە کردەوەدا جێبەجێ بکرێ. ئەگەر ئەم ئازادییانە لە دیمۆکراسی دانەبن و دیموکراسیش بەم شێوە جێبەجێ نەکرێ، دەبێ بڵێین کە نە ڕێز لە بیروبۆچوونە گشتی و تایبەتیەکان و حیزبەکان دەگیرێ ونە هەڵبژاردنی ڕاستەقینەی هیچ یەک لەوانەش لە ئارادایە. بە پێچەوانە، بە دەستەبەربوونی هەلومەرجی دیمۆکراسی دەکرێ بگوترێ کە حکوومەتی خەڵک دەستەبەر بووە.

لە حکوومەتی دیمۆکراسیدا بابەتی زۆرینە شتێکی حاشاهەڵنەگرە. حکومەتی خەڵک لە ڕێگای خوودی خەڵکەوە، حکومەتی هەموو نوێنەرانی خەڵک لە خۆ دەگرێ کە هیچکات کێشە و ناکۆکیەکانی خۆیان ناشارنەوەو، بیروبۆچوونی جیاواز دەخەنە ڕوو بە بێ ئەوی کە پێ لەسەر ئەوە دابگرن کە بۆچوونی ئەوان، لە هەموویان باشترە.

هەربۆیە دەکرێ بگوترێ کە دیمۆکراسی حکومەتی ژمارەیەو، دەربڕی دەنگی زۆرینەیەو، هیچکات ئەم حکومەتە پێک نایا، مەگەر ئەوەی کە بە شێوەیەکی سەربەستانەو بە بەهای یەکسانی هەموو ڕاوبیروبۆچوونەکان بێتە ئاراوە.

## دێموکراسیی سۆسیالیستی Socialist Democracy

بەپێی بۆچوونی مارکسیەکان، " دێموکراسیی ڕۆژئاوایی، دێمۆکراسیی بورژواییە کە لەخزمەتی چینی سەرمایەداری دایە. لە حاڵێکدا کە جۆری بەرزی دێمۆکراسی، دێمۆکراسیی سۆسیالیستیە؛ چوونکە بە قازانجی زۆربەی زەحمەتکێشان و پارێزەری بەرژەوەندییەکانی ئەوانەو، بناغەی ئابووریی ئەمجۆرە سیستەمە لەسەر خاوەندارەتیی گشتی وەستاوە".

هەر بەپێی ئەم بۆچوونە، " لە سیستەمی سۆسیالیستیدا یەکسانیی ڕاستەقینەی تاکەکەسەکان _ بە بێ لە بەرچاوگرتنی ڕەگەز، نەتەوە، ئایین و.... هتد_ لە هەموو بوارەکاندا دابین دەبێ".

## دێموکراسیی پیشەسازی Industrial Democracy

بەپێی ئەم فەلسەفە، دەبێ کرێکاران لە بڕیارەکانی پیشەسازییەکاندا ڕۆڵیان هەبێ. لەم بوارەدا ڕای جۆراوجۆر خراوەتە ڕوو کە دواین جۆری ئەم بیروبۆچوونانە، خوازیاری ڕووخاندنی کاپیتالیزم و دامەزراندنی حکومەتی کرێکارانە.

تیۆرێکی نوێی دیکە کە سەبارەت بە دێموکراسیی پیشەسازی خراوەتە ڕوو، ئەوەیە کە ئەم سیستەمە، کاپیتالیزم و بەڕێوەبەرەکانیشی قبووڵ کردووەو، دانی بەوە داناوە کە کرێکاران نەیانتوانیوە بەباشی ڕۆڵی بەڕێوەبەریی پیشەسازی بەڕێوە بەرن و، ناتوانن بە باشیش بەڕێوەی ببەن.

## دووچە I L Duce

سەرچاوەی ئەم زاراوە ئیتالیە، بەواتای ڕێبەر یان سەرۆکە. لە مێژووی سیاسیی هاوچەرخی ئیتاڵیادا نازناوی بنیتۆ مۆسۆلینی (١٩٤٥-١٨٨٣)، سەرۆکی هاوپەیمانیی فاشیست _ ناسیۆنالیستی ئیتاڵیاو دیکتاتۆری بە ناوبانگی ئەو وڵاتە بوو.

## دووجەمسەری Bipolarity

بیروبۆچوونێک بوو کە هەریەک لە دوو بلۆکی سەرەکی واتە ویلایەتەیەکگرتووەکانی ئەمەریکا و یەکیەتیی سۆڤیەتی سۆسیالیستی بە زلهێز دەزانی.

دوای لەبەریەک هەڵوەشانی سۆڤیەت (کانوونی یەکەمی ١٩٩١) زۆر لە تیورڤانەکان ئەمەریکا بە "تەنیا زلهێز"ی جیهان دەزانن.

## دەوڵەت State

ئەم زاراوە کە هاوواتا ئینگلیزییەکەی Statee و لاتینیەکەی Statusە، لە چەمکی Stare بە واتای "راوەستاو" وەرگیراوە.

دەوڵەت لە واتا بەرفراوانەکەیدا بریتیە لە کۆمەڵگایەک کە دەسەلاتی سیاسی بەپێی "دەستوور" دیاری کراوە. لە واتا بەرتەسکەکەیدا، دەوڵەت بریتیە لە دەسەلاتێک کە چارەنووسی کۆمەڵگایەکی لەبەردەست دایە. لە واتا گشتیەکەیدا، دەوڵەت بە واتای کۆمەڵێک رێکخراوی بەرێوەبەرییە کە دەسەلاتی بەرێوەبەریی کۆمەڵگا یان پێ سپێردراوە. دەوڵەت لەو بەشانە پێکهاتووە:

الف_ پەرلەمان، پاشا، یان هەر دوو لا؛

ب_ حکومەت یان کۆی سەرۆک وەزیرو کابینەکەی؛

ج_ دەزگای ئیداری، پۆلیس و هیزە چەکدارەکان؛

د_ دادوەری یان دەسەلاتی داد.

دەوڵەتی بەمانای یەکەم، بەگشتی سێ کۆڵەکەی سەرەکی هەیە کە بریتین لە : شوێنی جوگرافی، حەشیمەت وسەروەری.

شوێنی جوگرافی: شوێنی جوگرافی دەوڵەتێک بریتیە لە چوارچێوەیەک لەزەوی، دەریا و ئاسمان کە دەوڵەتێک دەسەلاتی خۆی تێدا بەرێوە دەبا. هەبوونی شوێنی جوگرافی بە مەرجی سەرەکی پێکهێنانی دەوڵەت دەژمێردرێ. شوێنی جوگرافی دەوڵەتێک نابێ دابەش ببێ و لەبەریەک هەڵوەشێتەوە و، ئەم بابەتە بنەمایەکی روونی نێو یاسای نێودەوڵەتیەکانە.

دیارە دەوڵەتێک دەتوانێ بەشێک لە جوگرافیای خۆی بدات بە دەوڵەتێکی تر، یان پێی بفرۆشێ یان بەکرێی بدات. زۆرجار دەوڵەتێکی تێکشکاو لەشەردا و لە کاتی گرێبەستی ئاشتی، بەشێک لە خاکی خۆی بە دەوڵەتی بەرامبەر دەبەخشێ و ئەو بەشە بە خاکی دەوڵەتی سەرکەوتووە دەلکێت. یان رەنگە بە هۆی راپەرینێک بەشێک لە خاکی دەوڵەتێک جیا بێتەوەو، ببێ بە دەوڵەتێکی سەربەخۆ.

بەلژیکا لە ساڵی ١٨٣٠دا لە هۆڵەندا جیا بۆوەو، یۆنانیش لە ساڵی ١٨٢٩ لە عوسمانی جیا بۆوە.

دەوڵەتێکی سەربەخۆ دەتوانێ بەشێک لە خاکی خۆی بە دەوڵەتێکی تر بفرۆشێ، وەک فرۆشتنی ناوچەی ئالاسکا لە لایەن رووسیای تیزاری بە ئەمەریکا لە ساڵی ١٨٧٦ بە نرخی

۷,۲۰۰,۰۰۰ دۆلار، یان فرۆشتنی فیلیپین لە لایەن ئیسپانیاوە بە ئەمەریکا لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم، یان فرۆشتنی دورگەکانی ماریان، کارۆلینا و مارشال لە لایەن ئیسپانیاوە بە ئەڵمانیا.

لە مێژووی رابردووی جیهاندا سەبارەت بە بەکرێدانی بەشێک لە خاکی دەوڵەتێک بە دەوڵەتێکی تر، نموونەی بەرچاو هەیە: دەوڵەتی چین لە ساڵی ١٨٩٨ دا "بەندەری کیا چۆ"ی بە ئەڵمانیا و "پێرت ئارتوور"ی بە رووسیا و"بەندەری هۆنگ کۆنگ"ی بەریتانیا و ناوچەی " کووانگ چووان"ی بە فەرەنسا بەکرێدا. تەنانەت رەنگە دوو دەوڵەت بەشێک لە خاکی خۆیان بگۆرنەو. بۆوێنە لە ساڵی ١٨٩٠ دا بەریتانیا دورگەی هێلگۆلەند (لە دەریای باکوور)ی بە دەوڵەتی ئەڵمانیا بەخشی و، لەبەرامبەردا بوو بە خاوەنی بەشێک لە کۆلۆنیەکانی ئەڵمانیا لە لێوارەکانی رۆژهەلاتی ئەفریقیا. دەوڵەتی ئێرانیش بەپێی رێککەوتنی ٢٣ی کانوونی دووهەمی ١٩٣٢ هێندێک لە ناوچە سنوورییەکانی خۆی بۆ دەوڵەتی تورکیا گواستەوەوە و لە بەرامبەردا بەشێک لە ناوچەکانی دەوڵەتی تورکیای بەدەست هێنا.

**حەشیمەت:** حەشیمەت بریتیە لە هەموو ئەو کەسانەی کە لە ولاتێکدا نیشتەجێن. بە سەرنجدان بەو پێناسە، دەبێ ئەم خالانە لەبەر چاو بگیرێن:

هاوولاتیە بیانیەکانی نیشتەجێی ولاتێک بە بەشێک لە حەشیمەتی ئەو ولاتە دەژمێردرێن و، لە ژێر سیستەمێکی یاسایی تایبەتی دان.

حەشیمەتی ولاتێک رەنگە لە چەندین توخم پێک بێ کە لە بواری رەگەز و زمان و ئایین و مەزهەب و شارستانیەت جیاوازییان لەگەلْ یەکتردا هەبێ: وەک ئیمپراتۆریی عوسمانی کەلە توخمەکانی تورک، عەرەب، سلاڤی، ئەرمەنی و.... هتد پێک دەهات؛ یان دەوڵەتی نەمسا ـ هەنگاریا لە توخمە جۆراوجۆرەکانی ئەڵمانی، مەجاری، چیک، سربب، کرۆئات، سلۆن، تورک، و...هتد پێک دەهات و، دەوڵەتی رووسیای تیزاری (سۆڤیەت)یش لە توخمە جۆروجۆرەکانی سلاڤی، پۆڵەندی، تاتار، گورجی، ئەرمەنی و... هتد پێک دەهات.

**سەروەری** : سەروەری بە دەسەلاتی سەربەخۆی دەوڵەتێک، بۆ بەرێوەبردنی ئیدارەی دەوڵەتەکەی خۆی (پیادە کردنی سەروەری) دەگوترێ، کە دەبێ ئەم رجانە، تێدا بێ :

- خاوەنی هێزی ماددیی پیادەکردنی سەروەری بێ، وەک هێزە چەکدارەکان، ڕێکخراوە سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتیەکان.
- دەبێ هەمیشەیی و ڕێک وپێک بێ.
- دەبێ لە بواری ئیدارەی کاروباری نێوخۆیی و دەرەکی دا سەربەخۆ بێ.

**واتای فەلسەفی ـــ سیاسیی دەوڵەت لە ڕێبازە جۆراوجۆرەکاندا**

واتای فەلسەفەی ـ سیاسیی دەوڵەت بە سەرچاوەی دەوڵەت بەستراوەتەوە:

**تیۆری سەرچاوەی نەتەوەیی دەوڵەت:** بەپێی ئەم تیۆرە، دەوڵەت دەسەڵاتی خۆی بە سەرچاوەگرتوو لە خەڵک و نەتەوە دەزانێ و، بەم شێوە مەسەلەی سەروەری نەتەوەیی دێنێتە گۆڕێ.

**تیۆری مارکسیزم:** مارکس لە ڕاستیدا شێواز ونێوەڕۆکی دەوڵەت بە سەرچاوەگرتوو لە سیستەمی پێوەندییەکانی بەرهەمهێنانی زاڵ بەسەردەوڵەتێکدا دەزانێ. لنین ومارکسیە نوێکانی تر، بە پشت بەستن بە تیۆری مارکس ، لەسەر ئەو بڕوایەن کە لەڕاستیدا دەوڵەتە غەیرە سۆسیالیست و غەیرە کۆمۆنیستەکانی جیهان، نوێنەری چینی سەرمایەدارن و، بەزیانی گەلان دەجووڵێنەوە. حکومەتی ئایدیال و خوازراوی ئەوان دەوڵەتی شووڕاکان و پڕۆلتاریایە.

**تیۆری ئیسلام:** لە ئیسلامدا دەسەڵاتی دەوڵەت لە خوارەوە سەرچاوە دەگرێ و لەڕاستیدا بابەتی سەرەکی بۆ " حکومەتی خوایی و حکومەتی ئیسلامی" دەگەڕێتەوە.

**دەوڵەتی پۆلیسی** police state

بەو ڕژێمە دیکتاتۆر و تۆتالیتەرانە دەگوترێ کە هێزەکانی نەیاری ڕژێم سەرکوت دەکرێن و، ناڕازییەکانیشی لەلایان پۆلیسەوە ــتەنیا بە هۆی سیاسیــ دەخرێنە زیندانەوە.

**دەوڵەتی شەڕکەر** **War State**

دەوڵەتێک لە کاتی قەیران و بەتایبەتی لە کاتی شەڕدا بۆ ئەوی کە بتوانێ بە خێرایی و یەکیەتی و پتەوەکی زۆرەوە بجووڵێتەوە، ناچار دەبێ ببێ بە دەوڵەتێکی شەڕکەرو، لە دەرەنجامدا پەرە بە سنووری ڕێکخراوە بەڕێوەبەرییەکانی خۆی بدا. هەروەها ناچار دەبێ چوارچێوەی چالاکیەکانی بەرهەمهێنانی تایبەتی و ئازادیە تاکەکەسیەکان بەرتەسک بکاتەوە.

## دەوڵەتی یاسایی — Recht State

چەمکی دەوڵەتی یاسایی دەرەنجامی بۆچوونە نەریتیەکانی ئەڵمانی و سویسراییەکانە.

"فریدریش یۆلیۆس شتالʼ"، سیاسەتڤانی پاریزگاری ئەڵمانی لەسەر ئەو باوەڕەیە کە: " دەوڵەت دەبێ بەستێن و سنووری کاری خۆی و شوێنی جموجۆل و چالاکیی هاوولاتیان بە شێوەیەکی یاسایی دەستنیشان بکاو، بە شێوەیەکی توندوتۆڵ پاریزگاریان لێ بکا".

تایبەتمەندییە بەرچاوەکانی دەوڵەتی یاسایی:

١ـ بوونی دەستووریک کە دابەشبوونی هێزەکان و سەلاحیەتەکانی تێدا روون کرابێتەوە.

٢ـ دیاریکردنی مافە ئازادی و کۆمەلایەتیەکانی هاوولاتیان لە دەستووردا کە دەبنە بنەما بۆ دارشتنی یاسای نوێ.

## دەوڵەتی تاراوگە — Government in Exile

بە دەوڵەتێک دەگوترێ کە لە دەرەوەی ولات پێکهاتووە. دەوڵەتی تاراوگە، کە دەوڵەتی "دوژوورە"ی ولاتێکی داگیرکراوە و، هەتا ئەو کاتە تاراوگەبوونی خۆی بە مەسەلەیەکی کاتی بزانێ، لە روانگەی ئەو ولاتانەی کە وەک دەوڵەتی "دوژوورە" دانیان پێداناوە، وەک دەوڵەتی دوژوورە دەمێنێتەوە. دەوڵەتێک کە لە تاراوگە دامەزرابێ، هیچ پێوەندییەکی بە حکومەتی پێشووە نیە. دەوڵەتی تاراوگەی نوێ بەر لەوەی کە دەسەلاتی پێویستی بۆ بەدەستەوەگرتنی نوێنەرایەتی ولاتەکەی هەبێ، دەبێ لەلایەن ولاتانی دیکەوە بەرەسمی بناسرێ. لەم حاڵەتدا دەوڵەت لە تاراوگەدا پێش بینی ئەوە دەکا کە لە ئاکام دا دەبێتە حکومەتی راستەقینە ویاسایی ئەو ولاتە.

نموونەی جۆراوجۆر لەسەر حکومەتی لە تاراوگەدا هەبووە کە لە ئاکامی هێرشی نازییەکان لە ماوەی شەڕی دووهەمی جیهانی بۆولاتێکی دیکە گوازراونەتەوە یان لە دەرەوەی سنوورەکانیان دامەزراون. بۆ وێنە دەکرێ ئاماژە بە دەوڵەتەکانی چیکسلۆڤاکیا، ئەتیۆپی، یۆنان، هۆڵەندا، نەرویج، پۆلەنداو یوگۆسلاڤیا بکرێ. سەرەڕای ئەوەی کە ئۆتۆریتەی حکومەت لە تاراوگەدا بە شێوەیەکی کاتی لە ولاتی خۆیدا هەڵپەسێردراوە (هەرچەندە رەنگە ئۆتۆریتەیەکیان بە شێوەی نهێنی و بە هۆی ریکخستنەوە هەبێ)، بەلام ئەم حکومەتە بەلای ئەو ولاتانەی کە هەروا بە رەسمی دەناسن، بە

نوێنەری یاسایی دەژمێردرێ. لە حاڵەتێکدا کە ئەم دەوڵەتانە واز لە دان پێدانان بە حکومەتە بێنن، ئیتر یاسایی بوونی خۆیان لەدەست دەدەن.

### دەوڵەت شار Polis

دەوڵەت شار بەو حکومەتانە دەگوترا کە لە لە یۆنانی کۆندا لە ئارادا بوون. هەروەها لە سەدەکانی نێوەڕاست و نوێدا بە شارانەی ئەورووپا دەگوترا کە خاوەنی سەروەری و سەربەخۆیی خۆیان بوون . دەوڵەت شارە کۆنەکان لە یۆناندا خاوەنی دامودەزگا و دامەزراوەی ئەوتۆ بوون کە بەگشتی دەزگایەکی حکومی یان " دەوڵەت" یان پێک دەهێنا. ئەم دەوڵەتانە لە بواری گەورەیی و حەشیمەتەوە زۆر بچوک بوون.

### دەوڵەتی سەربەخۆی فەلەستین Independent Palestinian

ئەنجوومەنی نیشتمانی فەلەستین لە کۆبوونەوەی ڕێکەوتی ١٥ی تشرینی دووهەمی ١٩٨٨ی خۆی لە ئەلجەزایر، دامەزرانی دەوڵەتی سەربەخۆی فەلەستینی ڕاگەیاند و، یاسر عەرەفاتی وەک سەرۆکی دەوڵەتی تازە دامەزراو هەڵبژارد.

عەرەفات بەئاماژە بەبڕیارنامەی ژمارە١٨١ی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانی ڕێکەوتی ١٩٤٧ کە باس لە دامەزرانی دەوڵەتی سەربەخۆی عەرەب و ئیسرائیل دەکا، ڕایگەیاند کە ناوبراو بڕیارنامەکانی ٢٤٢و ٣٣٨ی ئەنجوومەنی ئاسایشی ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکانی پەسند کردووە. (بڕیارنامەی ٢٤٢ داوا لە ئیسرائیل دەکا کە کۆتایی بە داگیرکردنی ئەو شوێنانە بێنێ کە لە شەڕی شەش ڕۆژەدا داگیری کردوون و ئەو مافە بە وڵاتانی ناوچە کە بدات کە لە ئاشتی و ئارامیدا بژین. هەروەها، بڕیارنامەی ٣٣٨ یش داوای پێکهێنانی کۆنفرانسێکی ئاشتیی نێونەتەوەیی بۆ چارەسەری کێشەی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاستی کردبوو.

عەرەفات سەرەڕای پرۆتستۆکردنی تیرۆریزم بە هەر شێوەیەکی گونجاو و، هەروەها بەڕەسمی ناسینی مافی ئیسرائیل وەک دەوڵەتێکی سەربەخۆ، بەکردەوە وازی لە بۆچوونەکانی ڕابردووی هێنا. لە مانگی کانوونی یەکەمی ١٩٨٨دا، ڕۆناڵد ڕیگان سەرۆک کۆماری ئەمریکا (٨٩-١٩٨١) ڕایگەیاند کە بڕاقی ڕزگاریدەری فەلەستین هەموو مەرجەکانی ئەمەریکای قبووڵ کردووە، هەربۆیە

مۆڵەتی بە وەزارەتی دەرەوە داوە هەتاکوو چەند وتوویژێک لەگەڵ بەرپرسانی ئەم بزاڤەدا بکات. لە نێوەڕاستەکانی مانگی کانوونی یەکەمی ١٩٨٨دا یەکێک لە دیپلۆماتەکانی ئەمەریکا لە تونس چاوی بە نوێنەرانی بزاڤی رزگاریدەری فەلەستین کەوت. ئەمەریکا لە ساڵی ١٩٧٥ بەملاوە هەر جۆرە وتوویژێکی لەگەڵ ئەم بزاڤەدا قەدەغە کرد.

## دەوڵەتە بێزراوەکان / سەربزێوەکان Pariah/ Rogue States

ئەو دەوڵەتانە کە بە دەوڵەتە سەربزێوەکانیش دەناسرێن، ئەکتەرێکی نێودەوڵەتین کە بە هۆی سیستەمە سیاسیەکانیان، روانگە و ئایدۆلۆژییە رێبەرایەتیی یان هەلسوکەوتەکانیان، تووشی تەریک بوونەوەی دیپلۆماتیک و بێ متمانەیی جیهانی بوون، رەوایی ئەم دەوڵەتانە لە ژێر پرسیار دایە، چونکە واپێدەچێ کە ئەمجۆرە وڵاتانە رێوشوێن و کۆنڤانسیۆنە رەسمیەکانی یاسا نێونەتەوەیی و دیپلۆماسیەکان، یان نۆرمە رەوشتیەکان رەچاو ناکەن. نموونەی ئەمجۆرە ئەکتەرە، ئەفریقیای باشوور لە ساڵی ١٩٨٤ هەتا ١٩٩٤ە. ئاپارتاید و رەوتی سیاسەتە نێوخۆیی و دەرەکیەکانی ئەو وڵاتە دژایەتیەکی راشکاوانەی لەگەڵ پێوەرە رەسمیەکانی مافی مرۆڤ و دیاریکردنی چارەنووس و سڕینەوەی کۆلۆنیالیزمدا هەبوو.

بێزراوی (Pariahood ) بەهیچ جۆرێک دیاردەیەکی نێونەتەوەیی هاوچەرخ نیە. بۆ وێنە ئیمپراتۆری عوسمانی لە لایەن دەوڵەتە ئەوروپیەکان لە رێنێسانسەوە هەتا سەدەی نۆزدە — لەبەر لایەنی ئایینی — بە دەوڵەتێکی بێزراو دادەنرا. رووسیای بۆلشڤیک و کۆماری ڤەیمەری ئەڵمانیا کە لە دەیەی ١٩٢٠دا خاوەنی رەوشێکی لەم چەشنە بوون، هەردوولا لە ئەندامەتیی کۆمەڵەی نەتەوەکان بێ بەشکران. بەڵام لە سەردەمی ئێستادا بەهۆی بابەتی بەدەستهێنانی چەکە ناوەکیەکان، تایبەتمەندیەکی تایبەتی پەیدا کردووە. دەوڵەتە بێزراوەکان بە توندی هەوڵی بەدەستهێنانی چەکە ناوەکیەکان وەک تەنیا رێگا مانەوە لە بەرامبەر پاڵەپەستۆی دەوڵەتانی دنیادا، دەدەن.

ئەگەرچی زۆرجار بە شێوەی هاوواتای یەکتر لە زاراوەکانی دەوڵەتی سەربزێو (Rogue) و بێزراو (pariah) کەلک وەردەگیردرێ. بەڵام لەگەڵ یەکتردا جیاوازییان هەیە. بۆیە زاراوەی سەربزێو بە وردی ئاماژە بە سیستەمی سەرکردایەتیی Leadership دەکا، ئاماژە بە سیستەمە

سیاسیەکان، خەڵک یان نەتەوەکان ناکا. بە شێوەیەکی تایبەتی بۆ ئاماژەکردن بەو سەرکردانەی Leader نالۆژیکی، ناباسایی، فێڵباز، کێشەخوڵقێن، شەڕانی یان بە گشتی سەرشێتن،کەڵکی لێ وەردەگیردرێ. لە لایەکی تر بێزراو زیاتر ئاماژە بە حاڵە لاوازەکانی سەرکردایەتی Leadership دەکا. ئەم چەمکە ئاماژە بەو دەوڵەتانە دەکا کە پێگە یان رەوایەتیەکەیان، هەڵسوکەوت و ئایدۆلۆژیاکانیان بە شێوەیەکی بەرفراوان لە لایەن کۆمەڵگای نێودەوڵەتیەوە لە ژێر پرسیار دان.

## Duma
## دۆما

زاراوەیەکی رووسیە بە واتای، هزر و ئەنجوومەنە. دۆما ناوی پەرلەمانی رووسیا لە قۆناغی بەر لە شۆرشی ئۆکتۆبەرە کە لە ۱۹۰٦ تا کانوونی یەکەمی ۱۹۱۷ لە ئارادا بوو و لە چوار قۆناغدا پێکهات:

دۆمای یەکەم: ئەم پەرلەمانە لە ئاکامی شۆرشی سیاسی ۱۹۰٥ (شۆرشی مەشرووتەی رووسیا) پێکهات و بریاری دامەزرانی لە لایەن نیکۆلای دووهەمەوە دەرچوو. ئەم پەرلەمانە لە ۱۰ی مانگی ئایاری ۱۹۰٦ هەتا بیست و یەکی تەمموزی ئەو ساڵەی (کەمتر لە سێ مانگ) خایاند. بە هۆی ئەوەی کە لە دەستووری نوێدا، ئیمپراتۆری رووسیا ئەو مافەی بۆخۆی پاراستبوو کە لە کاتی پێویستدا پەسندکراوە پاشایەتیەکان (کە دەسەلات و رەوایی یاسایی هەبوو) دەربکا وهەورەها بە هۆی ئەوەی کە دارایی دۆما بەپێی دەستوور بەرتەسک کرابۆوە، بۆیە دۆمای یەکەم لەسەر دەستبەرکردنی مافەکانی خۆی پێداگری دەکرد و ئەوەش بوو بە هۆی ئەوەی کە ئیمپراتۆر دوای حەفتا رۆژ بریاری هەڵوەشانەوەی دۆما دەربکا.

دۆمای دووهەم کەلە پێنجی مارتی ۱۹۰۷ تا شازدەی حوزەیرانی ۱۹۰۷ی خایاند،بۆ دەستەبەرکردنی مافەکانی خۆی لە دۆمای یەکەم زیاتر پێداگری دەکرد. کێشەی نێوان دەوڵەت و خەڵک زۆر بوو و نیکۆلای دووهەم ناچار بوو کە دۆمای دووهەمیش هەڵوەشێنێتەوە. بەلام بەر لەوەی کە هەڵبژاردنی گشتی بۆ دیاریکردنی نوێنەرانی پەرلەمانی نوێ دەست پێ بکا، دەوڵەت دەستوورێکی نوێی دارشت کە ئامانجەکەی بردنەسەری ئاستی ژمارەی نوێنەرانی چینە بەرزەکان بۆ پەرلەمان بوو، ئەوە لە حاڵێکدا بوو کە دەستووری پێشوو زیاتر رێگای بۆ نوێنەرانی چینی نزمی کۆمەڵگا ئاوەلا کردبوو.

دۆمای سێهەم: کە ئەندامەکانی بەپێی یاسای نوێ هەڵبژێردرابوون زیاتر لە دوو پەرلەمانی پێشوو بەردەوام بوو ونزیک بە پێنج ساڵ درێژەی کێشا (لە ساڵی ١٩٠٧ هەتا ١٩١٢). ئەم پەرلەمانە توانی کۆمەڵێک چاکسازی بنەڕەتی جێبەجێ بکا.

دۆمای چوارەم: ئەم پەرلەمانە هەتا شوباتی ١٩١٧ درێژەی کێشا، بە رادەی دۆمای سێهەم بەتوانا و کاریگەر نەبوو، چوونکە بەشێکی زۆری لە تەمەنی هاوکات بو لەگەڵ کێشە و قەیرانە نێونەتەوەییەکان، کە لە ئاکامدا شەڕی یەکەمی جیهانی لێکەوتەوە. ئەم پەرلەمانە بەر لە یەک ساڵ لە روودانی شۆڕشی ئۆکتۆبەری ١٩١٧، دەوڵەتی لەوە ئاگادار کردبۆوە کە ئەگەر چاکسازیی پێویست جێبەجێ نەکا، ناتوانێ پێش بەو شۆڕشە بگرێ کە لە رێدایە. لە دوای شۆڕشی شوباتی ١٩١٧، تیزار بە دەرکردنی بڕیارێک، دۆمای هەڵوەشاندەوە و حکومەتی کاتی رووسیا کاروبارەکانی بەرێوە دەبرد.

## دۆمینۆی بلۆکی رۆژهەلات East-Bloc Domino

ئەو زاراوە بەو گۆرانکاریانە دەگوترێ کە لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٨٩ لە ئەورووپای رۆژهەلاتدا قەومان وبە خێرایی هەموو ئەو وڵاتانەی تەنیەوە. ئەو گۆرانانە زیاتر لەو ئاڵوگۆرانە سەرچاوەیان دەگرت کە لە ناو یەکیەتیی شۆڤیەتدا روویاندابوو. هەڵوەشانەوەی حیزبی کۆمۆنیست و کۆتایی هێنان بە تەڕاتیێی کۆمۆنیستەکان، ئازادیی سەفەرکردن بۆ رۆژئاوا، هەڵگرتنی سنووری نێوان وڵاتان، رووخانی دیواری بەرلین و سپاردنی پۆستە گرنگەکان بە غەیرە کۆمۆنیستەکان لە نموونەی ئەو ئاڵوگۆرانە بوون. یەکێک لە خوێناویترین ئەو ئاڵوگۆرانە رووخاندنی حکومەتی چائۆشێسکۆ لە رۆمانیا بوو (کانوونی یەکەمی ١٩٨٩)

## دۆمینیۆن Dominon

دۆمینیۆن لە وشەی لاتینی Dominium و Dominos وەرگیراوە، بە واتای دەسەڵات، چاوەدێریکردن، مافی سەرەوەری، دەسەلاتی حکومەت و هەروەها زەوی وزاری فیۆدالەکان، ناوچەی ژێردەسەلاتی پاشا و دەوڵەت کەڵکی لێ وەرگیراوە. لە بەریتانیادا چەمکی دۆمینیۆن واتای تایبەتی هەبوو و بە ناوچەکانی ئەودیو دەریاکانی ژێر دەسەلاتی بەریتانیا دەگوترا. لە ساڵی ١٩٠٧ بەدواوەوە، دۆمینیۆن بەو کۆلۆنیانە دەگوترا کە خاوەنی حکومەتی خودموختاری خۆیان بوون

وخەڵکەکەشیان بەریتانی رەسەن و ئینگلیزی زمان بوون.ولاّتانی کەنەدا، ئوستراليا، ئەفریقیای باشوور و لە ساڵی ١٩٢١ ولاّتی ئایرلەندی ئازادیش بارودۆخێکی لەم چەشنەیان هەبوو.لە ساڵی ١٩٢٦ لە کۆنفرانسی پاشایەتیدا باردۆخی دۆمینیۆکانی ئاماژەپێکراو روون کرایەوەو، لە ساڵی ١٩٣١دا دۆمیێونەکان بەپێی یاسای ڤێست مێنیستێر دەسەلاّتی یاسایی و بەڕێوەبەریان پەیدا کرد. لەوکاتە بەدواوە، دۆمینیۆن بریتی بوو لەو ولاّتەی کە بارودۆخی یاسایی یەکسانی لەگەڵ بەریتانیادا هەبوو و، وەفادار بە " پاشایەتی " بەریتانیا وئەندامەتی لە کومەڵەی ولاّتانی هاوبەرژەوەندیدا مایەوە. بەم شێوە، جیاوازی لە نێوان دۆمییۆن وکۆلۆنیەکانی بەریتانیادا پێکهات.

لە ساڵی ١٩٤٧دا بارودۆخی دۆمییۆن بە هیندستان، پاکستان وسەیلان بەخشرا؛ بەلاّم لەم رێکەوتە بەدواوە ئیتر چەمکی دۆمینیۆن تەنیا سەبارەت بە ئوستراليا و نیوزلەندا کەڵکی لێ وەرگیراو، بۆ ولاّتانی تر بە جێگای کەڵک وەرگرتن لە چەمکی دۆمینیۆن کەڵک لە ئەندامی ولاّتانی هاوبەرژەوەندی وەرگیرا.

جێگای باسە کە زاراوەی دۆمییۆنی هاوبەش بەمانای دەسەلاّتی چەند ولاّت بەسەر ولاّتێک دایە، وەک سوودان کە دۆمینیۆنی هاوبەشی میسر و بەریتانیا بووە.

## Diaechy
### دیارشی

زاراوەیەکی یۆنانیە کە لە di بەواتای "دوو" و، archy بەمانای حکومەت وەرگیراوە. لە عورفی سیاسیدا دیارشی بە مانای حکومەتی هاوبەشە. دیارشی لە ئیمپراتۆری بەریتانیادا کەڵکی لێ وەرگیردرا، بەو مانایە کە دەوڵەت بۆ بەڕێوەبردنی ناوچەیەک، ئەو ناوچەی بە سەر دوو بەشدا، دابەش دەکرد. بەشێک لەو ناوچە لە لایەن کاربەدەستانی پاشایەتی کە لە لایەن پاشاوە دیاری دەکران، بەڕێوە دەچوو و، لە بەرانبەر پەرلەمانی بەریتانیادا ولاّمدەر بوون. بەشەکەی تر لە لایەن ئەو وەزیرانەوە بەڕێوە دەچوو کە لە لایەن دەسەلاّتی یاسادارێژیی هەرێمەوە هەڵدەبژێردران و، لە بەرامبەر خوودی ئەو دامەزاوەشدا ولاّمدەر بوون.

## Dialectic
### دیالکتیک

دیالکتیک لە سەرچاوەی لاتینیی (dialect (us و لە سەرچاوەی یۆنانیی (os) dialect بەواتای "قسە"، "مشت ومڕ" ، "زمان" و" زاراوە"، وەرگیراوە. ئەم زاراوە هاوواتای

(dialeg (esthai ە کە خۆی لە پێشگیری dia بە واتای "دوولایەنە بوون" و (in) log بە واتای "قسەکردن" ە.

دوو واتای سەرەکیی ئەم دیالۆگ بریتیە لە: "قسە" یان " ئاخاوتن" و "بەڵگە" . زاراوەی دیالکتیک dialectic لە سەرچاوەی لاتینیی (dialectic (a و چەمکی یۆنانیی dialektik (techne) بە واتای هونەری "مشت ومڕ، وتوویژ و ئاڵوگۆڕی بیروڕا" یە.

بەم شێوەیە، دیالکتیک لە بواری وشەیی یەوە دوو واتای هەیە:

١ــ هونەری " ئاخاوتن" کە لایەنی بەرامبەر لەو شتەی کە دەهەوێ تێی دەگەیەنی.

٢- هونەری مشت ومڕ لەسەر بابەتێک.

لەمانای دووهەمدا دیالکتیک هونەری سەلماندن و رەتکردنەوەی بابەتێک لە خۆ دەگرێ. بەم شێوە، دیالکتیک پێوەندییەکی نزیکی لەگەڵ لۆژیکدا هەیە. بەڵام لۆژیک زیاتر شێوازێکی هزری عەقلانی یە، کەچی دیالکتیک بریتیە لە هونەری گونجاندنی ناسینی رێوشوێنە لۆژیکیەکان لەسەر مشت ومڕ.

نوێلی سەرەکی چالاکیی لۆژیک زان، بنەمای "شوناس" (identity)ە، کە حاڵەتە نێگەتیفەکەی بنەمای " نەبوونی پاڕادۆکس"ە. بنەمای نەبوونی پاڕادۆکس تاکوو سەردەمی هیگڵ بە کۆڵەکەی سەرەکیی دیالکتیک و لۆژیک دەژمێردرا، بەڵام دیالکتیک لە درێژایی مێژووی چەندین مانای جۆراوجۆری بەخۆوە گرتووە.

ئەرستۆ، فەیلەسۆفی یۆنانی دیالکتیک بە داهێنانی زەنون ئیلیایی، قوتابی پارمنیدۆس دەزانێ. فەلسەفەی راوەستان و یەکسانیی ئیلیایی لە بەرامبەر فەلسەفەی گۆڕان و پاڕادۆکسی هیراکلیتۆس دایە. پارمنیدۆس لە رێگای بەراوردکاری و بەپێی هزری بوون دەڵێ کە زەنون دەیهەوێ نیشان بدا کە بیروبۆچوونەکانی دژ بە ناوبراو بە دەرەنجامی پاڕادۆکس دەگەن. راهێنەری دیالکتیک کۆڵەکەی خۆی لەسەر بنەمای پاڕادۆکس دادەمەزرێنێ.

تایبەتمەندی سەرەکی دیالکتیکی زەنون؛ یەکەم ئەوەیە کە نایهەوێ دەزگایەکی فیکری یان سەلماندنی تیوری دامەزرێنێ، بەڵکوو دەیهەوێ تیۆری دژی خۆی تێک بشکێنێ و، ئەمە دیالکتیکی نیگەتیفە. دووهەم ئەوەیە کە دەیهەوێ باسەکە بەو پێشەکیە دەست پێ بکا کە لەلایەن

نەیار یان لایەنی بەرامبەرەوە قبووڵ کراوە یان سەلمێندراوە، نەک بە پێشەکیەک کە بەتەواوەتی لێی دڵنیا بێ. واتە بەکەڵک وەرگرتن لەهۆکارەکانی لایەنی بەرامبەر بەڵگە دێنێتەوە.

دیالکتیک لە هزری سوفەستاییەکاندا: دیالکتیک لەلای سوفەستاییەکان بوو بە تەکنیکی دواندەری و وتاربێژی و بەڵگەهێنانەوە. بەپێی نووسراوی ئەفلاتۆن، سوفەستایی بە کەسێک دەگوترێ کە بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی خۆی بەردەوام هەوڵ دەدا بەڵگەی بە درۆ بێنێتەوە کە تەنیا لەرواڵەتدا بەکەڵک دێن کە پێی دەڵێن سەفسەتە.

**دیالکتیک لە هزری سوقراتیەکاندا:** بە بڕوای سوقرات، لەراستیدا مشتومڕ بە واتای یاریکردن بە وشەکان و لێهاتوویی لە قسەکردندا نیە، بەڵکوو مەبەست دۆزینەوەی راستیەکانە. دیالکتیکی سۆقرات بە پێچەوانەی دیالکتیکی زەنون نێگەتیف نیە، بەڵکوو پۆزتیڤە و، بە دیالکتیکی سوقراتی ناو دەبرێ.

**دیالکتیکی ئەفلاتۆنی:** دوو جۆرە دیالکتیک لە هزری ئەفلاتۆن دایە؛ یەکەم شێوازی مشتومڕ، کە لە سوقرات وەری گرتووەو، ئەویتر شێوازی میتافیزیکیە، کە تایبەت بە خۆیەتی.

**دیالکتیکی ئەرەستۆیی:** دیالکتیکی ئەرەستۆیی، رێک و پێک کردن، سیستماتیک کردن، رێکخستن و پەرەپێدانی شێوازەکانی مشتومڕ و ئاخاوتنە، کە لە دیالکتیکی ئەفلاتۆنی دا هەیە.

**دیالکتیک لەلای رەواقییەکان:** بە پێچەوانەی ئەرەستۆ کە دیالکتیکی لەبەرامبەر لۆژیکدا دادەنا؛ بەڵام داهینەری دیالکتیکی رەواقی بەکردەوە دیالکتیکی لەگەڵ مانا و دەربرین و رێزمان بە یەکەوە دانا.

هێندێک لەفەیلەسووفەکان ماناو دەبڕینی دیالکتیکیان بە دووبەش لە لۆژیک دەزانی کە ئامانجی ئەم لۆژیکە دۆزینەوەی راستی بوو. لەو دۆزینەوەدا دیالکتیک بە دوو جۆر بەشدار بوو. یەکەم بە دانانی رێوشوێنی بەراوردکاریی بەڵگەوتە (ئەوشتەی کە تایبەت بە لۆژیکی ئەرەستۆ بوو) و، پاشان بە فێرکردنی هونەری مشت ومڕوئاخاوتن (شتێک کەدیالکتیکی سەرەتایی زەنونی دەردەخست).

**دیالکتیک لە چاخەکانی نێوەڕاست دا:** دیالکتیک یەکێک لە گرنگترین وانەکان بوو؛ واتاو دەربڕینی خستبووە ژێر کاریگەریی خۆی، هەروەها لە رێزمانیشدا نفووزی کردبوو.

دیالکتیک لە چاخەکانی نێوەڕاستدا لە لۆژێکی سەوری کە لەلای ئەرەستۆدا هاوواتا بوون، زۆر زیاتر پەرەی گرت.

لە سەدە هاوچەرخەکاندا (لە دوای ریێنیسانس) وشەی دیالکتیک وردە وردە لە قامووسە فەلسەفیەکان دەسرێتەوەو، "لۆژیک" جێگای دەگریتەوە. کانت لە رێگای شیکردنەوەی دیالکتیک تارادیەک دیالکتیک زیندوو دەکاتەوە، بەڵام ئەو واتاو شیکردنەوە تایبەت بە فەلسەفەی خودی خۆیەتی.

دیکارت زۆر جار دیالکتیک بە هاوواتای "لۆژیک" بەکاردەبا. بەڵام بەو حاڵەش، ناڕازاییبوونی تەواوی خۆی بە دیالکتیک نیشان دەدا.

دیالکتیک لە قامووسە جۆراوجۆرەکان دا:

"بوایە" لە قامووسی فەلسەفی خۆیدا، دیالکتیک ولۆژیک بە هاوواتای یەکتر دەزانێ.

قامووسی لارۆس دیالکتیک بە "هونەری بەڵگەوتە هێناوە بەپێی شێواز و بە دروستی" دەزانێ.قاموسی مێژوویی و رەخنەیی بێل کە لە ساڵەکانی ١٦٩٦ هەتا ١٧٠٢ بلاوبۆوە، باسێکی لە دیالکتیک نەکردووە. ئەنیسکلۆپیدیای دالآمبێر و دیدرۆ (١٧٦٦-١٧٥١) دیالکتیکی بە " هونەری بەڵگەوتە ومشتومڕو ئاخاوتن " ناو بردووە.

لەم رێکەوتە بەدواوە ئەم جیاوازییە لە بیر کراوەو، دیالکتیک تەنیا بە " هونەری بەڵگەوتە" باس کراوەو؛ بەم شێوە بە هاوواتای لوژیک هاتووە.

لە قامووسی لیترە (١٨٨٥)، دوای باس لە دیالکتیکی زەنون و ئەفلاتۆن، بەو شێوە پێناسەکراوە: "لەروانگەی ئەرەستۆوە دیالکتیک بەمانای هونەری مشتومڕو ئاخاوتن بووەو، ئەم مانایە هەتا ئەمڕۆکەش پارێزراوە".

لارۆسی سەدەی بیستەم بەم شێوە دیالکتیک پێناسە دەکا:"هونەری بەڵگەوتە هێنانەوە بەپێی شێواز و بەدروستی ".

قاموسە نوێکانی دیکە بەم شێوە باس لە دیالکتیک دەکەن: " هونەری ئاخاوتن".

بەم شێوە، مانای هاوچەرخی دیالکتیک هەرئەوەیە کە لە سەرەتادا هەبووە.

دیالکتیکی هیگڵ: بە بۆچوونی هیگڵ پرۆسێسی دیالکتیکی کە "ئایدیا" لەلایەن ئەمەوە لە سروشت و لە زەیندا دەستەبەر دەبێ، لە سەربنەمای پاڕادۆکس دامەزراوە.

هیگڵ لەو ڕەوتەدا ئاماژە بە سێ قۆناغ دەکا: تێز، ئانتی تێزو سەنتێز، کە لە ڕاستیدا دەکرێ سەلماندن، ڕەتکردنەوەی و ڕەتکردنەوەی ڕەتکردنەوە بن.

بۆوێنە دەکرێ بەم شێوە لەبارەی کۆمەڵگای سیاسیی فەڕەنسا ئەم سێ قۆناغە باس بکرێن: قۆناغی یەکەم کە قۆناغی تێزە، سیستەمی پاشایەتی لە وڵاتی فەڕەنسادا جێگیر بوو؛ لە قۆناغی دووهەمدا واتە، ئانتی تێز، شۆڕشی مەزنی فەڕەنسا ڕووی داو؛ لە قۆناغی سێهەمدا واتە قۆناغی سەنتێز، هیگڵ ، " ئیمپراتۆریی ناپلیۆن" ـ کە زۆر لە ژێر کاریگەریی کەسایەتی ئەو دابووەـ بە سەنتێز دەزانێ.

دیالکتیکی مارکسی: کارڵ مارکس کە کەسێکی مەتریالیستە، بۆدژایەتی لەگەڵ ئایدیالیزمی هیگڵ خەبات دەکا. مەتریالیزمی مارکسی زیاتر لێکدانەوەیەکی مێژوویيە هەتاکوو فەلسەفی بێ، واتە مەتریالیزمی مێژوویيە. بەپێی بۆچوونی مارکس، " ئەوە هزر نیە کە دنیا هەڵدەسوورێنێ، بەڵکوو هزر ملکەچی بارودۆخ و کەشی ئابووری و لە دەرەنجامیشدا، ملکەچی ماددەیە؛ لە ئاکامدا، مادده دیاریکەری مێژووە و، ئابووری بنەمای سەرەکیی پێوەندییەکانی مرۆڤایەتی پێک دێنێ و، ئایدۆلۆژییەکان، جگە لە رووکەش هیچی تر نین".

مەتریالیزمی مارکسی بەر لە هەر شتێک دژی ئایدیالیزمە. تیۆرە سەرەکیەکەی ئەوەیە "ڕاستییەکی عەینی سەبەرخۆ لە وشیاریی مرۆڤ کە وشیاری مرۆڤ ڕەنگدانەوە ئەو ڕاستیەیە، لە ئارا دایە ".

ئەو دیالکتیکە لە ئەدەبیاتی مارکسیدا، بەڕەسمی وەک، " قووڵترین وگشتگیرترین فێرکردنی جووڵە و گەشەسەندن"، لەقەڵەم دەدرێ. دیالکتیکی ئاماژەپێکراو، یاسامەندیی سیاسیی هەمەلایەنەی هەر جووڵە، هەرگۆڕان و هەر گەشەیەک هەڵدەسەنگێنێ. لە ناوەندی دیالکتیکی مارکسیدا سێ یاسا هەیە: یاسای گۆڕینی چەندایەتی بۆ چۆنایەتی، یاسای یەکیەتیی ناکۆکیی دژەکان و، یاسای "ڕەتکردنەوە لە ڕەتکردنەوەدا".

مەتریالیزمی دیالکتیک: بەپێی بۆچوونەکانی مارکس، " مادده وەک ئەوەی کە فیزیکی کلاسیک و هزری گشتیی زمان پێیانوابوو، ڕاستییەکی پاسیڤ و ڕاوەستاو نیە کە تەنیا لە ژێر کاریگەریی ئەو هێزانەی کە پێی دەکەوێ، بگۆڕێ، بەڵکوو بە پێچەوانە لە نێوەڕۆکدا جیاوازی لەگەڵ دیالکتیکی هیگڵیدا کە لە سەربنەمای ئایدیالیزم ڕاوەستاوە، هەیە.

مارکس دەڵێ: " شێوازی دیالکتیکی هەتا ئەوکاتە جیاوازی هەیە کە میتۆدی هیگڵی دێتە ئاراوە؛ ڕێبازی من ڕاستەوخۆ دژی ڕێبازی هیگڵە."

سەرەونخونبوونی دیالکتیکی هیگڵ لە لایەن مارکس و ئەنگێلسەوە بەم شێوە وێنا کراوە: " ڕێبازی فەلسەفیی هیگڵ لەسەر سەر ڕاوەستاوەو، دەبێ بیهێنینەوە سەر پێکانی."

## دیپلۆمات **Diplomat**

بەفەرمانبەرێکی سیاسی دەگوترێ کە وڵاتێکی بیانیدا ئەرکی خۆی بەڕێوە دەبا. هەرچەندە لەبارەی پۆلێن کردنی نازناوە سیاسیەکاندا ڕێوشوێنێکی دیاریکراوی نێونەتەوەیی لە ئارادا نیە، بەڵام یاسای نێونەتەوەیی عورفی لەم بوارەدا لە ئارادایەو، ئەمڕۆ کە زۆربەی وڵاتان ئەم پۆلێنەیان قبووڵ کردووە.

دیپلۆماتەکان بەپێی پلە، دوای باڵوێز یان وەزیری موختار ئەم نازناوانەیان هەیە: ڕاوێژکار (پلە١، پلە٢، پلە ٣)، سکرتێری یەکەم، سکرتێری دووهەم، سکرتێری سێهەم و، بەستراوە (ئاتاشە). بەستراوەکان (ئاتاشە) ئەگەر فەرمانبەری سیاسیی وەزارەتی کاروباری دەرەوە بن، ئەوا نازناوی "بەستراوەی سیاسی" یان دەبێ. بەڵام ئەگەر فەرمانبەری ڕێکخراوەکانی تری دەوڵەت بن ئەوا ڕەنگە نازناوی "بەستراوەی سەربازی" یان " بەستراوەی ئابووری " یان " بەستراوەی کولتووری " یان هەبێ. ئەم تاقمە لە بەستراوەکان خاوەنی ئیمتیازەکان و پارێزراوییەکانی بەستراوە سیاسییەکانن.

هەڵبژاردنی فەرمانبەرانی سیاسی بۆ بەڕێوەبردنی کارێک بەپێی ڕای سەرۆکی کارەکە و بڕیاری وەزیری کاروباری دەرەوە بەڕێوە دەچێ کە ژمارەیان بە سەرنجدان بە قەبارەی کارو ڕێکخراو وڕێکخستنەکانی باڵوێزخانە دیاری دەکرێ.

## دیپلۆمات کاریری **Diplomat de Carriére (fr)**

زاراوەیەکی فەڕەنسیی، بە مانای دیپلۆماتی پرۆفیشناڵ و لێهاتووە .

## Diplomatic — دیپلۆماتیک

ئەم وشە یۆنانیە لە دیپلۆما Diploma وەرگیراوە کە لە بنەڕەتدا بە واتای لاپەڕە یان لاپەڕەیەکی لولدراو یان نوشتاوە دێ و، بە هەر بەڵگەیەک دەگوترا کە بەپێی ئەم بەڵگەیە نازناوێک یان ئیمتازێک بەکەسێک دەدراو، ئەم بەڵگەیە بۆیە "دیپلۆما"ی پێ دەگوترا چوونکە دەنوشتایەوە.

دواتر ئەم زاراوە بۆ ئەو بریارانە کەڵکی لێ وەردەگیرا کە بەپێی ئەو بریارانە، ئیمتیازێک بە دامەزراوەیەک یان زیاتر بە شارێک دەدراو، ئەم بەڵگەیە ئەو مافەی بە خاوەنداری بەڵگەکە دەدا کە کەڵک لەو ئیمتیاز یان مافانە وەربگرێ. دیپلۆم (لە فەرەنسا) و دیپلۆما (لە زمانەکانی تری ئەورووپایی) و..... "دیپلۆماتیک " و وشەکانی "دیپلۆماسی" و "دیپلۆمات" هەموویان لە سەرچاوە یۆنانیەکە وەرگیراون. ئاوەڵناوی دیپلۆماتیک لە واتا گشتیەکەیدا بە پێوەندییە گشتیەکانی نێوان دوو دەوڵەت دەگوترێ. پێوەندییە دیپلۆماتیەکان، ئامرازی جێبەجێکردنی سیاسەتی دەرەوەی وڵاتێکن.

بۆ وشەی دیپلۆماسی پێناسەی جۆراوجۆر کراوە، وەک؛

١_ بەڕێوەبردنی کاروباری نێونەتەوەیی لە ڕێگای باڵوێز و فەرمانبەرە دیپلۆماتیکەکانی تر؛

٢_ بەڕێوەبردنی کاروباری نێوان دەوڵەتەکان لە ڕێگای ئاشتیخوازانە؛

٣_ پیشەی دیپلۆمات؛

٤_ هونەری دیپلۆمات لە بەڕێوەبردنی کاروباری دەرەوەی دەوڵەت لە ڕێگای ئاشتیخوازنە، بە تایبەتی لە ڕێگای دانوسان و وتووێژ.

## Preventive Diplomacy — دیپلۆماسیی پێشگیرانە

بەو هەوڵانە دەگوترێ کە بە مەبەستی پێشگیری لە ڕوودانی کێشە لە نێوان دوو لایەن، پێشگیری کردن لەو ناکۆکیانە کە دەبنە هۆی تێکهەڵچوون و، بەرتەسک کردنەوەی تێکهەڵچوونەکان (ئەگەر ڕوویان دا)، دێنە ئاراوە. پێناسەیەکی کورتتر لەم زاراوەیە بەم شێوەیە: " پێشگیری کردن لە پەرەگرتنی ئەو ناکۆکیانەی کە دەبنە هۆی تێکهەڵچوونە چەکدارییەکان."

بە بڕوای پێترۆس غالی سکرتێری گشتیی پێشووی ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان، ئەگەرەکانی ئاماژەپێکراو ڕەنگە لە ڕێگای ئۆرگانەکان و پرۆگرامە پسپۆرییەکان یان لە لایەن ئەنجوومەنی ئاسایش و کۆمەڵەی گشتی و لە ئاکامدا لەلایەن ڕێکخراوە ناوچەییەکان بە هاوکاری

ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکانەوە جێبەجێ بکرێن و، بۆ دەستەبەرکردنی ئەو ئەگەرانە، دەکرێ لەکەرەسەی وەک هەوڵی دڵنیاکەرەوە، وریا کردنەوە لە ڕێگای ئەو زانیارییانەی کە بەدەست هاتوون، لە ڕێگای دۆزینەوەی ڕاستیە ڕەسمی و نارەسمیەکان، دامەزراندنی هێز و لە هێندێک حاڵەتیشدا پێکهێنانی ناوچەیەکی ناسەربازی، کەڵک وەربگیرێ. هەروەها سکرتێری گشتی باس لە گۆڕینەوەی ڕێکوپێکی دەستە سەربازییەکان، پێکهێنانی ناوەندێک بۆ کەمکردنەوەی مەترسیەکان لە ناوچە جۆراوجۆرەکاندا و، پێشبینی ڕێوشوێنێک بۆ گۆڕینەوەی سەربەستانەی زانیارییەکان، بۆوێنە چاوەدێری بەسەر ڕێککەوتنەکانی چەک و چۆڵی ناوچەیی وەک ڕێوشوێنێک بۆ پێکهێنانی متمانە، لە " بەرنامەیەک بۆ ئاشتی "دا دەکا.

### *دیپڵۆماسیی پینگ پۆنگ / تۆپی سەرمێز* Ping –pong Diplomacy

ئاماژە بەو هەوڵانە دەکا کە لە پێناوی ئاسایی کردنەوەی پێوەندییەکانی ئەمەریکا و چین لە ڕێگای ئەمجۆرە دیپڵۆماسییە لە ساڵی ١٩٧١دا بەڕێوە چوو، کە ئەم کارەش بوو بە هۆی سەردانی نیکسۆن سەرۆک کۆماری ئەوکاتی ئەمەریکا لە پەکین لە شوباتی ١٩٧٢؛ کەئەویش بەنۆرەی خۆی بوو بە هۆی هەڵگیرانی کۆمەڵێک سنوور و چوارچێوە لەسەر پێوەندییە سیاسی و بازرگانیەکانی نێوان ئەم دوو وڵاتە. واتا سەرەتا گرووپێک لە یاریزانانی پینگ پۆنگی ئەمەریکا بۆ بەڕێوەبردنی پێشبڕکێ چوون بۆ چین و، ئەم سەفەرە بواری بۆ ئاسایی کردنەوەی پێوەندییەکانی نێوان ئەم دوو وڵاتە ڕەخساند. لە قۆناغی دواتر، کەیسنجێر بە شێوەیەکی نهێنی لە ئیسلام ئاباد (پایتەختی پاکستان)ەوە چوو بۆ پەکین و، چەند چاوپێکەوتنێکی پێک هێنا. لە قۆناغی کۆتاییدا ریچارد نیکسۆن سەرۆک کۆماری ئەمەریکا سەردانی چینی کردو، ڕاگەیەنراوی بەناوبانگی شانگهای واژۆ کرد کە بوو بە هۆی پێکهاتنی پێوەندییە ڕەسمیەکان لە نێوان دوو وڵات دا.

### *دیپڵۆماسیی هاتن و چوون* Shuttle Diplomacy

زاراوەیەکە کە بە ناوبژیوانیی نێوان لایەنە ناکۆکەکان دەگوترێ کە لە ڕێگای هاتن و چوونی نوێنەرانی ناوبژیوان لە نێوان پایتەختەکانی دوو وڵات بەمەبەستی گەیشتن بە ڕێگای چارەیەکی کۆتایی و یەکلاکەرەوە، جێبەجێ دەکرێ.

## Summit Diplomacy دیپلۆماسیی سەرۆکەکان

ئەم زاراوە لە وتاری هەڵبژاردنی ١٥ی شوباتی ١٩٥٠ی ڤینستۆن چەرچیل سەرۆک وەزیرانی ناسراوی بەریتانیا وەرگیراوە کە لەم وتارەدا خوازیاری بەڕێوەچوونی وتوویژەکان لە "ئاستی سەرۆکەکان" دابوو.

ئەمڕۆکەش ئەم زاراوە بە وتوویژی شەخسی و دوولایەنەی سەرۆکی دەوڵەتەکان و حکومەتی دەسەلاتە گەورەکان، بەمەبەستی چارەسەری کێشەی نێوانیان، دەگوترێ.

دیپلۆماسیی سەرۆکەکان لە سەرەتادا بەمانای دژایەتی لەگەڵ شێوازە نەریتیەکانی وتوویژی دیپلۆماتێک بوو، ئەو شێوازانەی کە نەک تەنیا ناکۆکیەکانی کەم نەدەکردەوە بەڵکوو بواری تێکچوونی پێوەندییەکانی لەبارتر دەکردو، بە بڕوای زۆر لە لیبڕاڵەکان ئەم شێوازانە بەسەرچاوەی هەرچی زیاتری ناکۆکیە نێونەتەوەییەکان دەژمێردران.

## Conference Diplomacy دیپلۆماسیی کۆنفرانس

بەو وتوویژە چەند لایەنانە دەگوترێ کە لە کۆبوونەوە نێونەتەوەییەکاندا بەڕێوە دەچێ. نموونەی بەرچاوی دیپلۆماسیی کۆنفرانس " کۆنگرەی وێستڤالی " (١٦٤٨-١٦٤٢)یە کە کۆتایی بە شەڕە سی ساڵەکان هێنا. دامەزرانی کۆمەڵەی نەتەوەکان لە ساڵی ١٩١٩ لەراستیدا درێژەی دیپلۆماسیی کۆنفرانس بوو کە بە دامەزرانی رێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان درێژەی کیشا. ئەم دیپلۆماسیە لە ئاستێکی بەرتەسکی بابەتی یان جوگرافیشدا بەڕێوە دەچێ. وەک، سندوقی نێونەتەوەیی دراو، رێکخراوی ناتۆ، رێکخراوی یەکیەتیی ئەفریقیا، هەروەها کۆنفرانسی سەرۆکی ولاتانی بێلایەن ( کە لە ساڵی ١٩٥٥دا لە باندۆک بەڕێوە چوو). ئەم دیپلۆماسیە بۆیە گرنگی خۆی هەیە، چونکە بە جۆرێک لە "دیپلۆماسیی کراوە" لە بەرامبەر "دیپلۆماسی نهێنی" دا دەژمێردرێ. لایەنی پۆزەتیڤی ئەمجۆرە دیپلۆماسیە لەوە دایە کە دەوڵەتەکان دەتوانن سکالا، گرفتەکان و بابەتەکانی خۆیان بە شێوەی "کراوە" بیننە گۆڕێ و، بە گۆڕینەوەی بیروڕا، وتوویژو دانوسان چارەسەریان بکەن.

### دیپلۆماسیی نوێ — New Diplomacy

ئەم زاراوە بۆ پێناسەی شێوازەکان و لایەنگری لە " دیپلۆماسیی کراوە" لەبەرامبەر " دیپلۆماسیی داخراو" یان "نهێنی" لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهانی (١٨-١٩١٤) داو، هەروەها دوای ئەم ڕێکەوتەش، کەڵکی وەردەگیرا. ئەم دیپلۆماسیە لایەنگری وتووێژی بە ئاشکرا لەسەر بابەتەکانی سیاسەتی دەرەوە و دژی هەرجۆرە ڕێکەوتنێکی نهێنی بوو.

### دیراکتۆر(١٧٩٩-١٧٩٥) — Directory

حکومەتی دیراکتۆر یان لیژنەی بەڕێوەبەری لە ٢٧ی تشرینی یەکەمی ١٧٩٥ هەتا ١٩ی تشرینی دووهەمی ١٧٩٩ ئیدارەی کاروباری فەڕەنسای لە ئەستۆدا بوو و، لەم قۆناغەدا ئەرکی یاساداڕێژی لە ئەستۆی دوو ئەنجوومەن بەناوی ئەنجوومەنی پێنج سەد کەسی و ئەنجوومەنی پیراندا بوو. دیراکتۆر کارێکی کۆنەپەرستانەی کردو کودیتای "فرۆکتیدۆر"ی وەڕێخست و، لەئاکامدا شکستی بە دەسەڵاتی یاسا داڕێژی هێنا و، خۆیشی لە نێو چوو و، شوێنی خۆی بە حکومەتی کۆنسوڵی بەخشی.

ئەنجوومەنی پێنج سەدکەسی ئەنجوومەنێک بوو کە پێکەوە ئەنجوومەنی پیرانی دەسەڵاتی یاساداڕێژیی فەڕەنسای لە ساڵی ١٧٩٥ هەتا ١٧٩٩ پێک دەهێنا.

ئەنجوومەنی پیران یەکێک لە دوو ئەنجوومەنی یاسا داڕێژی بوو کە لە ساڵی ١٧٩٥ دا دامەزراو، دوو سەدو پەنجا ئەندامی هەبوو و، ئەو یاسایانەی کە لە لایان ئەنجوومەنی پێنج سەدکەسیەوە پەسند دەکران ئەنجوومەنی پیران هەڵی دەسەنگاندن و باسی لەسەر دەکردن.

### دیراکتۆری ئەورووپی — European Directory

دیراکتۆری ئەورووپی ڕێکخراوێک بوو لە نێوان دەسەڵاتە گەورەکاندا، کە لە سەردەمی خەبات لە دژی ناپلیۆن، ئیمپراتۆری فەڕەنسا دامەزراو، مەبەستی تایبەتی خۆی هەبوو کە هەل و دەرفەتی پێویستی بۆ ڕەخسابوو.

## دیکتات / سەپاندن Diktat

زاراوەیەکی ئەڵمانییە بە مانای بڕیارە. دیکتات بە ڕێگا چارەیەکی سەربازی و سیاسی دەگوترێ کە بە ناچار بەسەر دوژمنی دۆڕاودا دەسەپێنرێ. دیکتات زۆر جار بە هاوواتای ڕێککەوتننامەی ۱۹۱۹ی ڤێرسای کەڵکی وەردەگیرێ.

## دیکتاتۆری Dictatorship

زاراوەی دیکتاتۆری لە سەرچاوەی لاتینی dictator وەرگیراوە، کە لە ڕۆمی کۆندا بە کاربەدەستێکی پایەبەرز دەگوترا کە بە هێزو ئۆتۆریتەیەکی زۆر و لە رادەبەدەرەو، کۆنترۆڵی کاروبارەکانی وڵاتی بەدەستەوەگرتبوو. لە قاموسی سیاسیدا ئەمڕۆکە دیکتاتۆری بەو رژێمانە دەگوترێ کە تاکەکەس یان حیزبێک بەر بە ململانێی گرووپەکانی تر دەگرێ و، بەڕێوەبردنی هێزە گشتیەکانی وڵات بە بێ رکابەر، لەبەر دەست تاکەکەس یان ڕێکخراوی خۆیدا کەڵەکە دەکا.

لەسەدەی بیستەمدا هیتلەر، مۆسۆلینی وستالین و حیزبە تاک ڕەهەندە ناسیۆناڵ سۆسیالیست، فاشیست و کۆمۆنیستەکان بە نوێنگەی حکومەتە دیکتاتۆرە تاکەکەسی و حیزبییەکان دەژمێردران.

لە ڕۆمی کۆندا سیستەمی دیکتاتۆری بە بیانووی پێشگیری لە مەترسیی هێرش دەرەکی یان شۆڕشی نێوخۆیی و کودیتا بە دامەزراوەیەکی یاسایی دادەنرو؛ ئەمڕۆکەش ئەم پاساوانە لە زۆربەی سیستەمە دیکتاتۆری و ئایدۆلۆژیا حیزبیەکاندا ڕۆڵی سەرەکیان هەیە.

رژێمە دیکتاتۆرەکان لە بنەڕەتدا بە سەر سێ جۆری کۆنەپەرست، شۆڕشگێرو تێکەڵاو دابەش دەبن.

دیکتاتۆریی کۆنەپەرست هەوڵ دەدا پێش بە گۆڕانی پێکهاتە کۆمەڵایەتیە کۆنەکان بگرێ، بەڵام بە پێچەوانە، دیکتاتۆریی شۆڕشگێر خێرایی بە گۆڕانی دامەزراوەکان و پێکهاتە کۆمەڵایەتیەکان دەبەخشێ. بەڵام هەموو کات ئەم لێک جیاکردنەوە کارێکی ئاسان نیە، چوونکە زۆربەی رژێمە دیکتاتۆرەکان بەکردەوە خۆیان بە شۆڕشگێر دەناسێنن و دەڵێن کە لە سەر کۆمەڵگای کاولی کۆندا، کۆمەڵگایەکی نوێ دادەمەزرێنن؛ بەڵام هێندێک جار کردەوەی کۆنەپەرەستانەیان هەیە و، هێندێک لە چالاکیەکانیشیان شۆڕشگێرانەو لە پێناوی گۆڕینی کۆمەڵگا

دایە. لە دەرەنجامدا دەبێ ئەم پۆلێن کردنە سێ کۆچکەییە قبوولْ بکەین و، دیکتاتۆری تێکەلاو بە هەلْبژاردەی سێهەم دابنێین و، بۆ نموونەی بەرچاوی ئەم جۆرە دیکتاتۆریەش دەکرێ ئاماژە بە رژێمی ناپلیۆن بکەین.

لەسەردەمی کۆنەکانیشدا لێک جیاکردنەوەی دیکتاتۆریی شۆڕشگێڕو کۆنەپەرست ئاسان نەبوو چوونکە هێندێک لە رژێمەکان لایەن و شێوەی تێکەلاوییان هەبوو. لە دیکتاتۆریە کۆنەپەرەستەکاندا دۆکترینە کۆنسەرڤاتیف و بیروبۆچوونە کۆنەکان رۆلێکی گرنگیان سەبارەت بە فەلسەفەی دەسەلاتی سیاسی هەبوو، بەلام لە دیکتاتۆریی شۆڕشگێڕدا ئایدۆلۆژیای نوێ وپرۆگرام و شێوازە نوێکان رۆلیان لە گۆڕان و گۆڕانی دامەزراوە کۆمەلایەتیەکاندا هەیە و، هەر بەم هۆیە تیۆرییەکانی رژێمی دیکتاتۆریی شۆڕشگێڕ لە تێزەکانی سیستەمی کۆنەپەرست مۆدێرنترو روونترن.

روبیسپێر لە ساڵەکانی ۱۷۹۲و ۱۷۹٤ بە ئیلهام وەرگرتن لە روانگەو بۆچوونەکانی رۆسۆ حکومەتی دیکتاتۆریی شۆڕشگێڕی لە فەڕەنسادا دامەزراند و، رایگەیاند: لە ولاتێکدا کە ۸۰لەسەدی حەشیمەتەکەی جوتیارن، بەلام ئاریستۆکراتەکان خاوەنی هێزێکی تایبەتین، تەنیا لە رێگای دیکتاتۆریی بەردەوامەوە دەکرێ چەند کارێکی کاریگەر وبەسوود بە قازانجی چینە زەحمەتکێشەکان بکرێ. تیۆرەمارکسیەکان لەسەدەی بیستەمدا دیکتاتۆریی پرۆلتاریایان وەک قۆناغی نێوەڕاستی نێوان حکومەتی کرێکاران و پێکهێنانی کۆمەڵگای کۆمۆنیستی راگەیاندو، داکۆکی لەو تیۆرە دەکەن کە کاتێک شۆڕشێک روو دەدا، چینە بالادەستەکانی رژێمی پێشوو بە هەموو تواناییانەوە هەولی تێکشکاندنی رژێمی نوێ دەدەن و، لەم هەلومەرجەدا، تەنیا دیکتاتۆری پرۆلتاریا دەتوانێ کردەوەکانی چینی بالادەست تێک بشکێنێ و درێژە بە پێکهێنانی کۆمەڵگای نوێ بدا. دیکتاتۆریی شۆڕشگێر لە هێندێک کۆمەڵگادا بۆ ئامادەکردنی خەلک بەرەو دێمۆکراسی کەلکی لێ وەرگیراوە.

جیاوازیی دیکتاتۆریی شۆڕشگێڕ و کۆنەپەرست لە چوارچێوەی تیۆرەکان و ئایدۆلۆژییەکانیاندا دەردەکەوێ و، لە زۆر بواردا ئەم جیاوازییە زەق و بەرچاوە. بەلام ئەو ئامرازانەی کە دیکتاتۆریی شۆڕشگێڕ و کۆنەپەرست کەلکی لێ وەردەگرن هێندێک جار ئەوەندە لە یەک دەچن کە نەیارانی دیکتاتۆرییەکان هەولْ دەدەن بە پشت بەستن بە شێوازی کارکردن (تاک حیزبی ــ نەبوونی ئازادیی ئەنجوومەکان ــ نەبوونی ئازادیی تاکەکەسی ــ نەبوونی ئازادیی

چاپەمەنیەکان _ نەبوونی ململانێی سیاسی لە نێوان گرووپە جۆراوجۆرەکان حاشا لە هەرجۆرە جیاوازییەکی نێوان دیکتاتۆرییە کۆنەپەرەست و شۆڕشگێڕەکان بکەن و، هەموو جیاوازی و ناکۆکیەکانی نێوان ئایدۆلۆژییەکان لەبەرچاو نەگرن و، بەیەک چاو سەیری هەمو حیزبە کۆمۆنیستەکانی جیهان و حیزبە فاشیست و ناسیۆنالْ سۆسیالیستەکان دەکەن.

ئەوە لە حالێک دایە کە دەبێ جیاوازی لە نێوان ئایدۆلۆژیاو پرۆگرامەکانی ئەم دوو جۆرە لە دیکتاتۆری دابنرێ. لە سەدەی بیستەمدا هەر دوو جۆری دیکتاتۆریی شۆڕشگێڕ و کۆنەپەرەست هەولیان داوە سیستەمی تاک حیزبی پیادە بکەن، بەلاّم چۆنیەتی دامەزراندنی شانەکانی ڕێکخستن و ڕاهێنانی کادر و شێوازی پروپاگەندە و چەقبەستویی ڕێکخراو لە هەموو جۆرە دیکتاتۆرییەکاندا وەکوو یەک وانەبووە.

هەموو ڕژێمە دیکتاتۆرەکانی .سەدەی بیستەم و بەر لەو سەدەیەش، ئەم تایبەتمەندییە هاوبەشانەیان هەیە.

١_ کەڵەکە بوونی دەسەلاّت لە ناوەندا.

٢_ نەهێشتنی ئازادیە تاکەکەسییەکان.

ڕژێمی دیکتاتۆری هێرش دەکاتە سەر ئازادییە تاکەکەسیەکان و، پێشێلیان دەکاو، پەرە بە دەسەلاّت و ئیمتیازەکانی دەزگای حکومەتی دەداو؛ بە کردەوە ئیدارەی دەسەلاّتەکانی وڵات لە ڕێکخراوێکی دەوڵەتیدا کەڵەکە دەکا.

هاتنە سەرکاری ڕژێمی دیکتاتۆری لە ڕێگای کودیتا یان شۆڕش و بەکورتی بە شێوازێک دەبێ کە لەگەڵ یاسا سەرەکیەکانی ڕژێمی پێشوودا یەک ناگرێتەوە. بەلاّم هەرکاتێک ڕژێمی دیکتاتۆری وەک ڕژێمێکی نوێ سەقامگیر بوو، هەولْ دەدا خۆی بە نوێنگەی ئیرادە و ویست خەڵک بنوێنێ و، لە شەڕی نێوان لایەنگرانی ڕژێمی پێشوو و لایەنگرانی حکومەتی نوێدا، تاقمی یەکەم ڕژێمی نوێ بە نایاسایی و زەوتکەر دەناسێنن و دەڵێن کە حکومەتی نوێ بە پەنابردنەبەر هێزو دەسەلاّتی نایاسایی دەسەلاّتیان بەدەستەوە گرتووەو، لە بەرامبەر ئەم هێرشانەشدا، لایەنگرانی ڕژێمی نوێ هەولْ دەدەن کە دەسەلاّت بۆ خۆیان بەڕەوا و یاسایی و سەرچاوە گرتوو لە ویست و ئیرادەی خەڵک لەقەڵەم بدەن.

### دیکتاتۆریی پرۆلتاریا Dictatorship Of Proletariat

لە قاموسی مارکسیزمدا "دیکتاتۆریی پرۆلتاریا دەوڵەتی تایبەت بەو کۆمەڵگایانەیە کە تێیدا پرۆلتاریا دەسەڵاتی سیاسی بەدەست هێناوە و، لە پێناوەو، لە پێناوی سۆسیالیزم و کۆمۆنیزمدا هەنگاو دەنێ."

بە بڕوای مارکس، لە نێوان کۆمەڵگای سەرمایەداری و کۆمۆنیستیدا قۆناغێک هەیە کە قۆناغی گۆڕینی شۆڕشی یەکەم بۆ شۆڕشی دووهەمە. هاوکات لەگەڵ ئەم قۆناغەدا قۆناغێکی تێپەڕی سیاسیش هەیە کە دەوڵەت لەو قۆناغە شتێک نیە جگە لە دیکتاتۆریی شۆڕشگێری پرۆلتاریا."

بەبڕوای مارکسیەکان دیکتاتۆریی پرۆلتاریا بەدەستی پرۆلتاریا و بە هۆی شەڕێکی شۆڕشگێرانە جێ دەگرێ.

بەپێی بۆ چوونی ئەوان، لە بواری مێژوویەوە، کۆمۆنی پاریس بە یەکەمین جۆری دیکتاتۆریی پرۆلتاریا دەژمێردرێ.

### *دیواری بەرلین Berlin Wall*

ئەم زاراوە کە لە نیشانەی سەردەمی شەڕی سارد بوو، بە بینایەک دەگوترا کە لە بەرەبەیانی ١٣ی ئابی ١٩٦١دا هێزەکانی ئاسایشی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات بە بڕیاری ڕووسەکان دەستیان بە دروستکردنی کرد. کاری هەڵچنینی دیوارەکە بە داخستنی شەست و هەشت خاڵ لە هەشتا خاڵی سەر سنوور دەستی پێکردو، هەر لەوکاتەوە دژکردەوەی توندی بەریتانیاو ئەمەریکای بەدواوە بوو کە دامەزراندنی لەشکرێکی تانکەکانی ئەمەریکای لە بەشی ڕۆژئاوای دیوارەکە لێکەوتەوە.

دیواری بەرلین سەرەتا بە تێل دڕوو پاشان بە چیمەنتۆ ڕێک لەسەر ئەو هێڵەی کە بەرلینی بە دوو بەشی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات دابەش دەکرد، دامەزرا؛ درێژاییەکەی چل وشەش کیلۆمەتر بوو. دیواری بەرلین پێوەندیی وشکایی خەڵکی بەرلینی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای بەتەواوەتی دەپچڕی و، بەری بە کۆچی نێوان دوو ئەڵمانەکان دەگرت.

دوای شەپۆلی بەرفراوانی گۆڕانکارییەکان لە ئەورووپای ڕۆژهەڵاتداو، هاتنەگۆڕی مەسەلەی یەکگرتنەوەی دووبارەی ئەڵمانەکان، دیواری بەرلین لە لایەن خەڵکی هەر دوو ئەڵمانەوە

روخێنراو، سنووری نێوان دوو وڵاتیش بەرەسمی لە ڕێکەوتی ١٩٨٩/١١/١٨ کرایەوە و، بەم شێوەیە کۆتایی بەتەمەنی ٢٨ساڵەی ئەم دیوارە هات.

### دیوانی نێونەتەوەیی دادوەری
### Intenational Court of Justice (ICJ)

ئەم دیوانە لە لایەن ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە دامەزراو، بە بەرفراوانترین هەوڵ دەژمێردرێ کە تاکوو ئێستا بۆ پیادەکردنی سەروەری یاسا بەسەر کێشە نێونەتەوەییەکاندا جێبەجێ کراوە. پێڕەوی نێوخۆیی ئەم دیوانە کە پاشکۆی جاڕنامەی نەتەوەیەکگرتووەکانە وەک دیوانی هەمیشەیی دادوەریی نێونەتەوەیی دەچێ و هەموو ئەندامانی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیک بە ئەندامی ئەم دیوانە دەژمێردرێن. دیوان پازدە دادوەری هەیە کە بە دەنگی جیای کۆمەڵەی گشتی و ئەنجوومەنی ئاسایش هەڵدەبژێردرێن. بۆ دڵنیابوون کە بەردەوامیی کار، هەڵبژاردنەکان لە کاتی خۆیدا بەڕێوە دەچێ و، دادوەرەکان بۆ خولێکی نۆساڵە هەڵدەبژێردرێن. ئەندامانی هەمیشەیی ئەنجوومەنی ئاسایش بۆ هەمیشە خاوەنی کورسیەک لە دادوەرەکانن، واتە هەمیشە یەک دادوەری خۆیان لە نێو ئەو ١٥ دادوەرەدا هەیە. بەڵام ئەگەر هیچکام لە دادوەرەکان خاوەنی سیتیزەنی ئەم دەوڵەتە نەبوو کەتێیدا ئەندامە، ئەوکاتە ئەم دەوڵەتە دەتوانێ دادوەرێکی تایبەتی دەستنیشان بکا. دیوان، سەرۆک و جێگری سەرۆک بۆ خولێکی سێ ساڵە هەڵدەبژێرێ و، ناوەندەکەشی لە لاهەیە.

دیوان دوو سەڵاحییەتی هەیە: چارەسەری کێشەنێودەوڵەتیەکان و خستنە ڕووی ڕاکانیان بۆ پێشنیاری وراوێژ. تەنیا دەوڵەتەکان دەتوانن لە دیواندا لایەنی سکاڵا بن، بەڵام بکەرانی ناحکومی وەک کەسە تایبەتیەکان ڕێکخراوە نێونەتەوەییەکان دەتوانن داوای ڕای ڕاوێژکارانە بکەن. ئەو دەوڵەتانەی کە ئەندامی ڕێکخراوەی نەتەوە یەکگرتووەکان نین، دەتوانن لە هەلومەرجێکی تایبەتیدا پەنا بۆ پێڕەو پرۆگرامی ئەم دیوانە بەرن. بەندی بەناو دڵخوازی (مادده ٣٦) بۆ بەهێزکردنی سەڵاحیەتی دیوان داڕێژرا بوو. ئەو بەندە هەموو ئەو لایەنانەی کە واژۆیان کردبوو، ناچار دەکرد کە سەڵاحییەتی دیوان وەک شتێکی حەتمی بە ڕەسمی بناسن. ئەم کارە تارادەیەک نەیتوانیوە

سەرکەوتوو بێ، چوونکە هەتا دەیەی ١٩٨٠ نزیک بە کەمتر لە نیوەی ئەندامانی رێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان ئەم بەندەیان پەسند کردبوو.

ماددەی ٣٨ی پێڕەوی دیوان دەڵێ کە ئەو رێوشوێنە یاساییانەی کە کەڵکیان لێ وەردەگرێ بریتین لە: رێککەوتننامە نێونەتەوەییەکانی عورفی نێونەتەوەیی و"ئەوپرەنسیپە گشتیانەی کە جێگای پەسندی نەتەوە پێشکەوتووەکانن ". دیوان لە کردەوەدا بە توندی لەکارپێکردن بەو سەرچاوە سێهەمەی یاساکان لەو کێشانەی کە دەنێردرێتە دیوان، بەپارێز بووە. دیارە دەبێ ئەوەمان لەبەر چاوبێ کە لە کاتی دامەزرانی دیوانەوە تاکوو ئێستا ژمارەی ئەندامانی رێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان سێ هێندە بۆتەوەو، لەم هەلومەرجەدا گەیشتن بە رێککەوتن سەبارەت بە پرەنسیپە گشتیەکان زۆر دژوارتر بووە.

دیوان چەندین کێشەی ئاڵۆزی تۆمار کردووە و بڕیاری لە بارەیانەوە دەرکردووە، بەڵام زۆرجار پێڕەوی لە بڕیارەکانی نەکراوە. بۆ وێنە، لە کێشەی نێوان بەریتانیاو ئەڵبانیادا سەبارەت بە زیانی پاپۆڕەکان و زیانی کەناڵی کۆرفۆ، دیوان رادەی زیانەکانی بەریتانیای بە یەک میلیۆن پۆند خەملاند و، بڕیاریدا کەئەڵبانیا ئەم زیانە قەرەبوو بکاتەوە، بەڵام ئەڵبانیا بەردەوام لە قبووڵکردنی ئەم بڕیارە و دانی بڕی قەرەبووەکە خۆی بواردووە. ئەگەرچی گومانێکی زۆر لە بارەی بەهای هێنانەگۆڕی کێشەگرنگە نێونەتەوەییەکان لە لای دیوانی نێونەتەوەیی دادوەری لە ئارادایە، بەڵام دیوان سەرکەوتنێکی زۆری لە دیاریکردن و داڕشتنی ئەو پرەنسیپانەی کە دەکرێ لە سەربنەمای ئەوان کێشەکان چارەسەر بکرێن، بەدەست هێناوە.

بۆ وێنە پرەنسیپە بەرچاوەکان لەم بوارەدا بریتین لە : پرەنسیپی کێشانی هێڵی سەرەکی سەبارەت بە ئاوە ژێرزەوییەکان، مافی ڕاوکردنی ماسی و شێوازی دیاریکردنی سنووری ژێر دەریایی بۆ کەڵک وەرگرتن لە سەرمایەکانی ژێر دەریا. بەڵام بەگشتی رابردووی دیوان لە چارەسەری کێشە زۆر ئاڵۆزەکان تێکەڵاوییەک لە حاڵە لاواز و بەهێزەکان بووە. جگە لەمانە، دیوان چەند رایەکی راوێژکارانەشی داوە کە رۆڵی لە دیاریکردنی پرۆسەی کاروباری نێونەتەوەیی لە قۆناغی دوای شەڕدا هەبووە. گرنگترینی ئەم را راوێژکارانەی دیوان، سەبارەت بە ئەفریقیای باشووری رۆژئاوا / نامیبیا بوو. لە ساڵی ١٩٧١دا دیوان، لە پێداچوونەوە بە بڕیارێکی خۆی، رایگەیاند کە بوونی ئەفریقیای باشوور لە نامیبیا کارێکی نایاساییەو، ئەرکی سەرشانی دەوڵەتەکانی دیکەیە کە بە هیچ

شێوەیەک کارێک نەکەن کە ڕەسمیەت بە دەسەڵاتی یاسایی ئەفریقیای باشوور لەم شوێنە بدەن. ئەفریقیای باشوور درێژەی بە دژایەتی خۆی لەگەڵ ئەم ڕوانگەیە داو، دەیگوت کە ڕێکخراوی نەتەوەکان کە جێگای کۆمەڵەی نەتەوەکانی گرتۆتەوە و، سەلاحییەتی مافی چاوەدێریکردنی بەسەر ناوچەی ژێر سەرپەرستیی ئەفریقیای باشووردا، نیە. بەڵام لە ساڵی ١٩٨٩دا ئەفریقیای باشوور لە ئاکامدا ملی بۆ قبوولکردنی بڕیارنامەی ٤٣٥ی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان ڕاکێشا، کە داوای لە ئەفریقیای باشوور دەکرد سەربەخۆیی نامیبیا بەڕەسمی بناسێ. لەم پێوەندییەدا، هۆکارە سیاسیە لاوەکیەکانی وەک دۆکترینی گۆرباچۆف و سیاسەتی بەشداریی بنیاتنەری ویلایەتە یەکگرتووەکان بوو بە هۆی گۆڕانی سیاسەتی ئەفریقیای باشوور نەک بڕیارو فشاری دیوانی نێونەتەوەیی دادوەری.

کۆمەڵەی گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان ئەرکی "پەرەپێدانی" یاسا نێودەوڵەتیەکانی لە ئەستۆیە (ماددەی ١٣)و، دەکرێ بگوترێ کە تاڕادەیەک گومان لەوە دانیە کە دیوان بە یەکێک لە توخمە پێکهێنەرە زۆر گرنگەکانی ئەم پرۆسەیە دەژمێردرێ. دیارە هێندێک ڕەخنەی گرنگ و هۆکاری بەرتەسککەرەوە بەربەستیان لە بەردەم پەرەگرتنی ئەم پرۆسەیە پێک هێناوە. تەنیا چەند کێشەیەکی کەم بۆ چارەسەر دەبرێنە لای دیوان ـ واتە بە گشتی ئەو کێشانەی کە زەربە لە بەرژەوەندییە سەرەکیەکان نادەن. لەو بابەتانەی کە ڕەنگە بووبانە هۆی دروستبوونی کێشەی نێونەتەوەیی ـ بۆ وێنە، بابەتەکانی پێوەندیدار بە شەڕی سارد ـ دیوان نەدەکێشرایە نێو یاریەکەوە. بەبێ شک، نەبوونی دەسەڵاتی جێبەجێ کردن بە یەکێک لە هۆکارەکانی لاوازیی دیوان دەژمێردرێ؛ هەرچەندە کە ئەنجوومەنی ئاسایش بە پێی ماددەی ٩٤ سەلاحییەتی ئەوەی هەیە کە بڕیارەکانی دیوان جێبەجێ بکا، بەڵام هیچکات شتی وای نەکردووە. لە چالاکیەکانی دیوان و تەنانەت لە پێکهاتەی ئەندامەکانیدا، واپێدەچێ کە توخمە "سیاسی" و "یاسایی"یەکان لە دژایەتیکردنی یەکتر دابن لەم بوارەوە، بە شێوەیەکی تایبەتی، دەوڵەتە لە حاڵی پەرەئەستێنەکان ڕەخنەگرانی دیوان بوون و، دیوانیان بە ئامرازێک بۆ بەرەوپێشبردنی بەرژەوەندییەکانی جیهانی یەکەم یان وڵاتانی ئەورووپای ڕۆژئاوا ناو بردووە. سەرەڕای ئەم هەمووە ڕەخنە و گازندانە، کەم کەس هەیە کە گومانی لەوە هەبێ کە دیوانی نێونەتەوەیی دادوەری یەکێک لە گرنگترین هەوڵەکان لە مێژووی نێونەتەوەیی بۆ سەقامگیرکردنی سەروەریی یاسا لە چارەسەری کێشە نێو دەوڵەتیەکاندا بووە.

### دیوانی هەمیشەیی ناوبژیوانی
### *Permanent Court Of Arbitration*

دەستەی هەمیشەیی یاساناسان کە لە ساڵی ۱۹۰۹ بەپێی کۆنڤانسیۆنی ساڵی ۱۸۹۹ی لاهە بۆ چارەسەری ئاشتیانەی کێشە نێونەتەوەییەکان (کە لە ساڵی ۱۹۰۷ پێداچوونەوەی بەسەردا کرا) دامەزرا. وڵاتان دەتوانن بۆ چارەسەری کێشەکانیان کەسانێک لە نێو ئەو ناوبژیوانانە هەڵبژێرن. ناوی "دیوانی هەمیشەیی ناوبژیوانی" ناوێکی بەلارێدا بەرە، چوونکە لە راستیدا جگە لە دامەزراندنی ناوەندێکی هەمیشەیی لە لاهەدا، کۆنڤانسیۆنی ۱۸۹۹، هیچ دیوانێکی دانەمەزراند، بەڵکوو بۆ ئاسانکاریی پێکهێنانی دیوانەکانی ناوبژیوانی، (ئەگەر پێویست بێ) میکانیزمێکی هێنایە ئاراوە، کە هەر "لایەنێکی بەشداربوو لە دیوانی هەمیشەیی ناوبژیوانی" دەتوانێ بە لانی زۆر ٤ کەس وەک ناوبژیوانانی داهاتوو بۆ ماوەی ٦ساڵ (کە دەکرێ پێداچوونەوەشی بەسەردا بکرێ) وەک "ئەندامی دیوانی هەمیشەیی ناوبژیوانی " هەڵبژێرن . ئەو وڵاتانەی کەرازی دەبن کێشەی خۆیان بۆ چارەسەری بنرێنە دیوان، دەتوانن لە نێو دەستەی دیوان چەند ناوبژیوانێک هەڵبژێرن، ئەگەر نەیانتوانی لەسەر پێکهاتەی دادگا رێک بکەون، هەرلایەنێک دەتوانێ دوو ناوبژیوان کە تەنیا یەک ناوبژیوان دەتوانێ سەر بە وڵاتی خۆیان بێ یان لە نێو ئەو ناوبژیوانانە بێ کە "ئەندامی" دیوانن، دیاری بکەن. پاشان چوار ناوبژیوان، بەرپرسێک لە نێوخۆیاندا هەڵدەبژێرن. چەند پرۆسەیەکی هەڵبژاردنیی تایبەتیش بۆئەوکاتەی کە لە سەر هەڵبژاردنی بەرپرس، بە رێککەوتنێک ناگەن، جێبەجێ دەبێ.

### دیکتاتۆریی پڕشنگدار *Enlightened Despotism*

ئەم زاراوە بە شێوازێک لە دەسەڵات دەگوترێ کە لە سەدەی هەژدەهەمدا پێکهات. یەکێک لە تایبەتمەندییە بەرچاوەکانی ئەم حکومەتە کە دیکتاتۆرێک لە لوتکەی دەسەڵاتدا، دەسەڵاتدارەتی دەکرد، دابینکردنی خۆشگوزەرانیی گشتی بۆ هاووڵاتیەکانی وڵاتەکەی بوو نەک بەرژەوەندییە تاکەکەسیەکانی خۆی. تایبەتمەندییەکانی دیکەی دیکتاتۆریی پڕشنگدار بریتی بوون لە چاکسازیی ئیداری، کەمکردنەوەی ئیمتیازەکانی فیۆدالی، پێکهێنانی تۆلۆرانسی ئایینی و پەرەپێدانی ئابووری.

هێندێک لەو دیکتاتۆرانە بریتین لە کاترینی گەورە، فرێدریکی گەورە، لیئۆپۆڵدی دووهەم، توسکانی و ژۆزێفی دووهەم.

## Recognition دان پێدانان

دان پێدانان شێوازو ڕێورەسمێکە کە لە سەدەی ١٨ بەملاوە لە پێوەندییە نێو دەوڵەتیەکان دا بۆتەباو و بریتیە لە دان پێدانان بە وڵاتێکی تازە دامەزراو، لە لایەن وڵاتانی دیکەوە.

دان پێدانان دەبێ لە دوای دامەزراندن و پێکهاتنی وڵاتەوە بێ. چونکە ئەمە بە مانای دان پێدانان بە شتێکە کە تازە دامەزراوە. بەڵام ئەمرۆکە ڕەنگە دان پێدانان لە لایەن وڵاتێکەوە وەدرەنگ کەوێ.( بۆ وێنە حکوومەتی پاکستان هەتا ڕێکەوتی ٢٢ی شوباتی ١٩٧٤ لە دان پێدانان بە بەنگلادیش خۆی بوارد ) یان ئەوەتا پێش لەوەی وڵاتێک دامەزرێ؛ جیبەجێ دەبێ( ناسینی ئەلجەزایر لە لایەن هێندێک ولاتەوە؛ پێش لە سەربەخۆیی).

## Anti_Semitism دژە سامی / دژە جوولەکە

ئەم زاراوەیە بە دوژمنایەتیی یان ڕق و بێزاری گەلی جوولەکە دەگوترێ کە لە سەدەی بیستەم دا بە جێگای ئەوەی لایەنی ئایینی هەبێ، بۆن و بەرامەیەکی ڕەگەزپەرەستی هەیە. بنکەی سەرەکی ئەم بیروبۆچوونە، ئەڵمانیای ژێر دەسەڵاتی نازییەکان ( ٤٥_١٩٣٣) بوو. لایەنی ڕەگەزپەرەستی ئەم بیروبۆچوونە لە ناوەراستەکانی سەدەی ١٩ لەگەڵ تیۆرەکانی بەرزتر بوونی ڕەگەزی ئارایی یان نۆردیک کە هیچ بنەمایەکی زانستی نەبوو، سەری هەڵدا، ئەم بیروبۆچوونە تارادەیەک، بە هۆی ئێرەیی بردن بە جوولەکەکان سەری هەڵدا کە زۆربەی پیشەسازییە هەستیار و گرنگەکانیان لە بوارە بازرگانی و پیشەئازادەکان لە بەردەستدابوو و تارادەیەکیش بە هۆی

هەڵسوکەوتی ئەو کەسانەوە کە دەیانویست گرووپێکی تایبەتی بە بەرپرسیاری شکستەکانی ئەڵمانیا دابنێن.

هیتلەر لە ئەڵمانیای نازیدا، بۆ پێشگرتن لە تێکەڵاوبوونی رەگەزی ئاریا لەگەڵ رەگەزەکانی دیکەدا، کۆمەڵە یاسایەکی دەرکرد. بە پێی ئەم یاسایانە جوولەکەکان بەرەگەزی بێگانە و خوێری دانران کە خوێنییان پیسە و لە دەرئەنجام دا ئەمانا لە زگماکەوە تاوانبارن. بەم شێوەیە پێکهێنانی ژیانی هاوبەش و تەنانەت خۆشەویستی کردنیش لەگەڵ جوولەکەکاندا قەدەغەکرا. هەوڵەکانی دیکەی هیتلەر لەم پێوەندییەدا بریتی بوون لە: دوور خستنەوەی زانا جوولەکەکان، قەدەغەکردنی مۆزیکی مەندێلسۆن و ئۆفن باخ، بێبەش کردن لە مافە مەدەنیەکان و مافی کار و پیشە و پاشانیش بەرێ کردنیان بۆ ئوردوگا بەکۆمەڵەکان کە ٦ میلیۆن کەس لەم ئۆردوگایانەدا کوژران.

ئەورووپای رۆژهەڵات لە سەرەتاکانی سەدەی ١٩ەوە ناوەندی بیروبۆچوونی دژە سامی بوو .

دەستوورەکانی دوای ساڵی ١٩٤٥ یەکسانیی نێوان رەگەزەکانیان مسۆگەر کرد، بەڵام بیروبۆچوونی دژە سامی بە رێژەیەکی کەم لە رژێمە کومۆنیستەکان دا هەبوو. رادەی ئەو جوولەکانەی کە لە دوای شەڕ لە کابینەکان دا بەشدار بوون لەسەریەک کەمی کردەوە. لە دوای شۆرشی ١٩١٧ لە یەکیەتیی سۆڤیەتدا بەڵێنی خودموختاریان پێدرا، بەڵام لە دواییدا تەنانەت کتێب، رۆژنامە، گۆڤار و هۆڵەکانی شانۆی جوولەکەکانیش بەتەواوەتی لە ناو چوون.

## ***Extraterritoriality*** — ***دەرەوە سنووری***

یاسایەکە کە بە پێی ئەو یاسایە، دیپلۆماتە بێگانەکان و نوێنەرە سیاسیەکانی وەک باڵوێزخانەکان و نووسینگە سیاسیەکانی دەوڵەتەکان، سەرەڕای بوونی فیزیکی لە وڵاتانی خانە خوێدا، بەڵام بە خەڵکی ئەو وڵاتە ناژمێردرێن بەڵکوو وەک دەرەوە سنووریی ئەو وڵاتانە سەیر دەکرێن، هەر بۆیە نێردراوە سیاسیەکان لە هەر جۆرە هەڵکوتانە سەرێک پارێزراون و، نوێنەرە سیاسیەکانیش لەبەر هۆکارە جیاوازە یاساییەکان، پێرەوی لە یاسا و رێوشوێنەکانی وڵاتی خانەخوێ نین. چوون بۆ نێو باڵوێزخانەکان بە توندی قەدەغەیەو،تەنانەت ئەم یاسایە هێزەکانی پۆلیسیش دەگرێتەوە. شوێنە تایبەتی و کەرەسە تایبەتیەکانیشیان تەنیا یاسا و رێوشوێنەکانی نێو کۆنڤانسیۆنە

دیپلۆماتیکەکان و کۆنسۆلی ڤیەننا دەیانگرێتەوە. ناکرێ دیپلۆماتەکان دەستگیر بکەین. تەنانەت ئەوان باج و گومرگیش نادەن. کۆنڤانسیۆنەکانی ڤیەننا چاوەدێری چۆنیەتی جێبەجێکردنی یاسا و ڕێوشوێنە نێودەوڵەتیەکان دەکەن. پێشێلکردنی بنەمای دەرەوەی سنووری بە لادان لە یاسا نێو دەوڵەتیەکان دەژمێردرێ.

## دەستووری ستالین **Stalin's Constitution**

دەستووری ٥ی کانوونی یەکەمی ١٩٣٦ ی سۆڤیەتی پێشوو کە زیاتر بە :"دەستووری ستالین"، بەناوبانگە. ئەم دەستوورە لە لایەن کۆنگرەی یەکیەتیی سۆڤیەتەوە دارێژرا و بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە گوایە، ئەم دەستوورە، دیموکراتیکترین دەستووری جیهانە. یەکەم بەشی ئەم دەستوورە بریتیە لە:

*ڕێکخراوی کۆمەڵایەتی:*

*ماددەی یەک:*

یەکیەتیی کۆمارەکانی سۆڤیەتی سۆسیالیستی؛ دەوڵەتی سۆسیالیستی کرێکاران و جووتیارانە.

*ماددەی دوو:*

ئەنجوومەنەکانی نوێنەرایەتیی زەحمەتکێشان، بناغەی سیاسی یەکیەتیی سۆڤیەتی سۆسیالیستی پێک دێنن کە بە هۆی رووخاندنی حکومەتە دەرەبەگ و سەرمایەدارەکان و دامەزراندنی دیکتاتۆری پرۆلتاریا سەریان هەڵداوە و گەشەیان کردووە بەهێز بوون.

*ماددی سێ:*

لە یەکیەتیی سۆڤیەتدا، دەسەڵات بە تەواوی هیی زەحمەتکێشانی شار و گوندەکانە کە ئەنجوومەنەکانی نوێنەرایەتیی، نوێنەرایەتیان دەکەن.

*ماددەی چوار:*

بناغەی ئابووری یەکیەتیی کۆمارەکانی سۆڤیەتی سۆسیالیستی؛ سیستەمی سۆسیالیستی ئابووری و خاوەندارێتی سۆسیالیستی ئامرازەکانی بەرهەمهێنانە کە بە هۆی هەڵوەشانەوەی سیستەمی

سەرمایەداری ئابووری و هەڵوەشانەوەی خاوەندارێتی تایبەتیی ئامرازەکانی بەرهەمهێنان و نەهێشتنی چەوسانەوەی کەسێک لە لایەن کەسێکی دیکەوە دامەزراوە.

***ماددەی پێنج:***

خاوەندارێتی سۆسیالیستی لە یەکیەتیی کۆمارەکانی سۆڤیەتی سۆسیالیستی یان بە شێوەی خاوەندارێتی دەوڵەتی یان بە شێوەی خاوەندارێتی کۆمپانیا هەرەوەزییەکانی کەلخووزەییە.

***ماددەی شەش:***

زەوی، سامانە ژێر زەوییەکان، ئاوەکان، دارستانەکان، کارخانەکان، سەرچاوەو کانزاکان، ئامرازەکانی هاتوچۆ، گواستنەوەی دەریایی و ئاسمانی ، بانکەکان، پۆست، تەلەگراف و تەلەفۆن، ناوەندە گەورەکانی کشتوکاڵ کە لە لایەن دەوڵەتەوە دامەزراون (سوخۆزەکان، ناوەندی ئامێرەکانی کشتوکاڵ، تراکتۆرو...) و هەروها ناوەند و دامەزراوەکانی شارەوانی، و پاشەکەوتی سەرەکی ماڵەکان لە شارەکان و شوێنە پیشەسازییەکان، سامانی دەوڵەتە، یانی سامانی تێکرای گەلە.

***ماددەی حەوت:***

ناوەندە کۆمەڵایەتیەکان لە کەلخووز و رێکخستنە هەرەوەزییەکان بە ئاژەل و شتە پێویستەکانیەوە، ئەو بەرهەمەی لە لایەن کەلخووز و رێکخراوە هەرەوەزییەکان بەرهەم دێ و هەروەها بناغە کۆمەڵایەتیەکەشیان، خاوەندارێتی سۆسیالیستی کەلخووز و رێکخستنە هەرەوەزییەکان پێک دێنێ.

بە پێی بەرنامەوپێرەوی کشتوکاڵی هەرخێزانێکی کەلخووز جگە لە شتە تاکەکەسیەکانی خۆی، پارچە زەوییەکی چکۆلەی لە تەنیشت ماڵی خۆی هەیە و وەکوو خاوەندارێتی تایبەتی، خاوەنی ئابوورییەکی چکۆلە لەم پارچە زەوییەی تەنیشت ماڵەکەی خۆی، ماڵ، خۆراک و ئاژەل، مریشک و ئامێری چکۆلەی کشتوکاڵیە.

***ماددەی هەشت :***

زەوی کە لە بەردەست کەلخووزەکان دایە، بە خۆڕایی و بە بێ دیاریکردنی کات یانی بۆ هەمیشە پێیان دراوە.

**ماددەی نۆ:**

بە پێی یاسا جگە لە سیستەمی سۆسیالیستی ئابووری، کە شێوازی بنەڕەتی وزاڵی ئابووری لە یەکیەتیی کۆمارەکانی سۆڤیەتی سۆسیالیستیە، ئابووریە چکۆلە تاکە کەسیە جووتیاریەکان و خاوەن پیشەکان لە حاڵەتێکدا کە لە سەر بنەمای کار تاکەکەسی بن و کەسی تر نە چەوسێننەوە، ئازادن.

**ماددەی دە:**

مافی خاوەندارێتی تایبەتی کەسەکان بە سەرداهات و حەق دەستەکانیان، ماڵ و ئابووری خێزانی، کەرەسەکانی ناوماڵ، پێداویستیە بەکاربەریە تاکەکەسیەکان و ئامرازەکانی خۆشگوزرانی و مافی (میرات)ی کەسەکان بە هۆی یاساوە دەپارێزرێ.

## دەستێوەردانی مرۆڤدوستانە Humanitarian Intervention

بە دەستێوەردانی زۆرەملێی وڵاتێک لە وڵاتێکی دیکەدا دەگوترێ. ئامانج لەم دەستێوەردانە، پاراستنی گیانی مرۆڤەکان و هەروەها بەرەنگاریکردن لەگەڵ هەڵسوکەوتی دڕندانە و نامرۆڤانە یان ئازار و ئەشکەنجەی خەڵکە. لە نێوان دەستێوەردانی مرۆڤدوستانەی ئەو وڵاتەی کە بەمەبەستی پاراستنی هاووڵاتیانی خۆی لەو وڵاتەدا، لەگەڵ ئەو دەستێوەردانەی کە بە مەستی داکۆکیکردن لە هاووڵاتیانی ئەو وڵاتەی کە تووشی کارەساتەکە بوون، بەردەوام جیاوازی دانراوە. ئەم جۆرە دەستێوەردانەی دوایی جارجارە، "دەستێوەردانی مرۆڤدۆستانە"شی پێ دەگوترێ. بەڵام هەردووشێوازی دەستێوەردانەکە، لە یاسا نێودەوڵەتیەکاندا مشتومڕی زۆریان لێکەوتۆتەوە. وڵاتانی جیهانی سێهەم هەدوو شێوازی دەستێوەردانەکە ڕەت دەکەنەوە و بە پێشێل کردنی سەروەری خۆیانی دادەنێن. لە ڕۆژئاوادا بیروڕای زانایانی بواری یاساو دوەڵەتەکان جیاوازە. ڕوانگەیەک پێیوایە دەستێوەردانی بە زۆری هێز، بەمەبەستی داکۆکیکردن لە هاولاتیان لە هێندێک حاڵەتدا بە جێیە. بۆ وێنە هاووڵاتیان مەترسیەکی گەورەیان لە سەرە و حکوومەتی ئەو وڵاتە ناتوانێ بە پێی پێوەرە پەسندکراوە ئەخلاقیەکان پشتیوانیان لێ بکا. لەم حاڵەتەدا دەستێوەردان تەنیا بەمەبەستی پاراستنی گیانی هاووڵاتیانە. ڕوانگەی دژی ئەم بۆ چوونە پێیوایە، ئەگەرچی دەستێوەردان بەمەبەستی

پشتیوانیکردن لە هاوولاتیان پێش لە دارشتنی پێرەوپرۆگرامی UN کارێکی یاسایی بوو، بەلاّم بە پێی بەندی ٤ی ماددەی ٢ی پێرەو پرۆگرامی UN، پەنابردنەبەر زۆر و هێز لە پێوەندیە نێودەوڵەتیەکاندا قەدەغە و نایاسایە. هەروەها ئەم دەستێوەردانە دەبێتە هۆی ئەوەی کە دەوڵەتەکان ئەمە بکەنە بیانوویەک بۆ وەدیهێنانی بە رژەوەندیەکانی خۆیان، نەک بۆ بەرژەوەندی مرۆڤدۆستانە. ئەگەرچی کێشەکە تا ئیستاش چارەسەر نەکراوە، بەلاّم زۆربەی کەس پێیانوایە کە دەستێوەردانی مرۆڤدۆستانە بەمەبەستی پشتیوانیکردن لە هاوولاتیانی بیانی، شتێکی نایاساییە.

### دادگایی کردنەکانی نۆرنبێرگ (٤٦ -١٩٤٥)

### *Nuremberg Trials*

بە دوای ئاشکرابوونی جینایەتەکانی نازییەکان لە ئۆردوگاکانی دیلەکانی شەڕ و ئەو کوشتارە بێ بەزەییانەی کە لە ناوچە داگیر کراوەکانی خۆیاندا لە ناو چەند جیلدا کروبوویانن، لە ماوەی ساڵەکانی ٤٦-١٩٤٥ زۆربەی ڕێبەرانی نازی کە نەیانتوانیبوو رابکەن یان خۆیان بشارنەوە، لە دادگا جیاوازەکاندا وەکوو تاوانباری شەڕ دادگایی کران و سزا دران. یەکێک لە دادگاییەکان لە دادگای " نۆرنبێرگ"ی ئەڵماندا پێکهات. هۆی هەڵبژاردنی نۆرنبێرگ، لایەنی رەمزیی ئەم شارە بوو، چوونکە هیتلەر و نازییەکان زۆربەی کۆڕوکۆبوونەوەو خۆپیشاندانەکانی خۆیان لە سەرەتادا لە نۆرنبێرگ یان لە میونیخ، لە باشووری ئەڵمانیادا بەرێوە دەبرد.

دادوەرە نێودەوڵەتیەکان لە چوار وڵاتی سۆڤیەت، ئەمەریکا، فەڕەنسا و بەریتانیا و چەندین راوێژکار و پارێزەر لە وڵاتانی دیکە ئەرکی دادگایی کردن و داکۆکیکردن لە تاوانبارانیان لە ئەستۆ گرتبوو. لە ئاکامدا ڕێبەرە پلەیە یەکەکانی نازی ئیعدام کران و ئەوانەی دیکەش، وەکوو "هێس"، جێگری هیتلەر بە زیندانی هەتاهەتایی مەحکووم کران.

### دەسەڵاتە ناوەندییەکان — *Central Power*

دەسەلاّتە ناوەندییەکان لە بنەڕەتدا بریتی بوون لە سێ ئەندامی " یەکیەتیی سێ کوچکە" کە لە لایەن بیسمارک لە ساڵی ١٨٨٢دا پێکهات. یەکیەتیی سێ کوچکە لە ئەڵمانیا نەمسا ــ هەنگاریا و ئیتالیا پێکهاتبوو.

لە دوای دەستپێکردنی شەڕی یەکەمی جیهانیدا(١٩١٤) و بێلایەنی ئیتالیا ئەم زاراوەیە تەنیا یەکیەتیی نێوان ئەڵمانیاو نەمسا ـــ هەنگاریاو هاوپەیمانەکانی واتە تورکیا و بولگاریای دەگرتەوە.

### دەسەڵاتی نەتەوەیی Notional Power

بە کۆمەڵێک توانایی ماددی و مەعنەوی وڵاتێک دەگوترێ. ئەم کۆمەڵە تواناییە بریتین لە:

١ ـ پان و بەرینی، بارودۆخ، کەش و هەوا، وتۆپۆگرافی شوینەکە.

٢ ـ سەرچاوە سروشتیەکان، وزە، و بەرهەم هێنانی خۆراک....

### دەسەڵات Power

لە چەمکە بنەڕەتیەکانی زانستی سیاسەتە کە بە توانایی کەسێک بۆ ناچارکردنی کەسانی دیکە دەگوترێ، کە مل بۆ داواکاری و ویستی ئەو دانەوێنن. ئەو کەسە بۆ گەیشتن بە مەبەستی خۆی لە هەموو شێوازەکان کەڵک وەردەگرێ. یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی رێکخستنی ژیانی کۆمەڵایەتی، هەبوونی ئوتۆریتەیە، کە نەریت یان یاساکان دانیان پێداناوەو رەوایە و سەرکردایەتی لە کۆمەڵگادا، بەهۆی دان پێدانان بە تواناییەکەوەیە، کە لەکەسێک یان لە بەرپرسێکدا شاراوەتەوە.

دەسەڵاتی سیاسی پێویستی بە پێوەندییەکی دەروونی لە ناو بژاردە سیاسییەکان و ئەوکەسانەدا هەیە کە لە ژێر کاریگەری دەسەڵاتدان. سەپاندنی دەسەڵاتی سیاسی، تایبەتمەندی سەرەکی سیستەمێکی سیاسی لە کاتی سەرهەڵدانی چەمکی سەرەوەرییە.

### دان پێدانانی دیپلۆماتیک Diplomatic Recognition

بە پێی ئەو پرۆسەیە دەوڵەتێک بەرەسمیی دان بە مەشرووعییەتی دەوڵەتێکی دیکەدا دێنێ.

### ژاکۆبینەکان

حیزبێکی بە هێزی سیاسی سەردەمی شۆڕشی فەڕەنسابوو کە ئەندامانی ئەم حیزبە، لەسەر شۆڕش و ئامانجی نیشتمانیی پێداگریان دەکرد. ژاکۆبینەکان لە پەرستگەیەک بە مناوە لە کۆلانی سەنت ئونورەی پاریس دا کۆبوونەوەکانی خۆیان پێک دەهێنا و بە مناوە بەناوبانگ بوون و چوونکە لە پەرلەمان دا لە لای چەپ و لە سەرەوەی پارلماندا دادەنیشتن، بە مۆنتانیارەکانیش بەناوبانگن. پێکهێنانی کومیتەی رزگاری نیشتمانی و دادگا شۆڕشگێرانەکان و پاراستنی نەریتە شۆڕشگێڕیەکان و پێشگیریکردن لە هەوڵە کۆنە پەرستانەکان، لە هەوڵەکانی ژاکۆبینەکانن. روبسپیر کە بەشۆڕشگێڕی قارەمان بەناوبانگ بوو، لە سەرکردەو و رێبەرە بەناوبانگەکانی ژاکۆبینەکان بوو.

### ژاکۆبینیزم — ***Jacobinism***

زراوەیەکی فەڕەنسیە کە بە بزوتنەوەی توندڕۆی ناو شۆڕشی گەورەی فەڕەنسە دەگوترێ. سووربوون لە سەر رەوتی شۆرشگێڕانە( بە هەر جۆرێک بێ) و مل نەدان بۆ پێکهاتن و سازان لە تایبەتمەندییە دیارەکانی ژاکۆبنیزمە. ئەم زاراوەیە لە مانا بەربلاوەکەی دا بۆ پێناسەی بیروبۆچوونی توندڕۆیانە لە بزووتنەوە شۆڕشگێڕیەکانی دیکەشدا کەلکی لێ وەردەگیردرێ. بە

هێند نەگرتنی داوای زۆرینە، دیکتاتۆری کەمایەتیەکی پیداگری شۆرشگێر، "کۆمیتەکانی ئاسایش گشتی"، وەکوو دام و دەزگاکانی ترساندن و تۆقاندن، هێندیک لە تایبەتمەندیە مێژوویەکانی ژاکۆبینیزمن.

لنین، رێبەری شۆڕشی ئوکتۆبەر (تشرینی یەکەم)ی رووسیا به لایەنگرەکانی خۆی دەگووت: "ژاکۆبینەکانی سەربە چینی کرێکار".

## ژیئۆپۆلۆتیک — *Gio politiks*

زاراوەی ژیئۆپۆلۆتیک کە ئەمرۆکە بە مانای لێکۆڵینەوەی جوگرافیای سیاسییە، یەکەمین جار لە لایەن جوگرافی زانێکی سویدی بە ناوی رودۆلف کیلن Rodolf Kejellen (١٨٦٤-١٩٢٢)هاتە ئاراوەو کەڵکی لێ وەرگیردرا. بەڕای کیلن، مەبەست لەم زاراوەیە لێکۆلینەوەی ژینگەی سروشتی یەکەیەکی سیاسی وەکوو وڵاتە. ئەو لە لایەنگرانی ئەو تیۆرە بوو کە پێیانوابوو وڵاتەکانیش وەکوو بوونەوەرە زیندووەکان وان. کیلن لە جوگرافیای سیاسیدا، وڵاتی لە چەند لایەنەوە لێک داوەتەوە و ئەم پولێن بەندییەی کردووە:

١. ژیئۆپۆلۆتیک (Geo politik) یان لێکۆلینەوەی جوگرافیای وڵات.
٢. دیمۆپۆلۆتیک (Demo politik)یان لێکۆلینەوەی دانیشتوانی وڵات.
٣. ئۆئیکۆپۆلۆتیک (Oeco politik) یان لێکۆلینەوەی سەرچاوە ئابوورییەکانی وڵات.
٤. سۆسیۆپۆلۆتیک (Socio politik) یان لێکۆلینەوەی باری کۆمەڵایەتیی وڵات.
٥. کراتۆپۆلۆتیک (Kroto politik) یان لێکۆلینەوەی باری سیاسی وڵات.

پاشان ئەڵمانیەکان، بایەخێکی تایبەتیان بە بیروبۆچوونەکانی کیلن دا و، لە سەردەمی هیتلەردا ژیئۆپۆلۆتیک هێندێک چەمکی ناجوگرافی وەکوو بەرزتر بوونی رەگەزی نازییەکانی گرتەوەو بەم پێیە وەکوو جاران نەماو بەو کەڵکە نابەجێیەی کە لە شەڕی دووهەمی جیهانی دا لەم زانستە بۆ وەدیهاتنی ئامانجی نازییەکان، وەرگیردرا، زاراوەی ژیئۆپۆلۆتیک ئەو بایەخەی جارانی نەما و جێگای خۆی دایە جوگرافیای سیاسی. ئەمرۆکە مەبەست لە ژیئۆپۆلۆتیک زیاتر هەڵسەنگاندنی

دەسەڵاتی نیشتمانیی بە پێی هۆکارە جوگرافیاییەکانە کە بەتایبەتی لەسەر ئەو سیاسەتانە پێدادەگرێ کە لە وڵاتان بەڕێوە دەچێ.

## Genocide
## ژینۆساید / پاکتاوی ڕەگەزی

بە قڕکردنی گرووپە نیشتمانی و ڕەگەزی، ئەتنی و ئایینییەکان بە پیلانێکی لە پێش داڕێژراودا دەگوترێ. لە ڕێککەوتننامەی نێودەوڵەتیی پێشگیری لە ژینۆساید لە ڕێکەوتی ٤ی کانوونی یەکەمی ١٩٤٨، ژینۆساید بەم کردەوانەی خوارەوە دەگوترێ:

قڕ کردنی تەواو یان بەشێک لە گرووپێکی ڕەگەزی یان ئایینی، کوشتنی ئەندامانی گرووپ، ئازاری جەستەیی یان دەروونیی ئەندامانی گرووپ، خستنە ناو باری نالەباری ژیان بە ئەنقەست. پێشگیری لە منداڵبوونی ئەندامانی گرووپ، گواستنەوەی زۆرەملێی منداڵانی گرووپ بۆ گرووپێکی دیکە.

## Jus Jentium
## ژۆس ژانتیۆم

بریتیە لە کۆمەڵێک یاسا کە لە لایەن دادوەرانی ڕۆمیی کۆنەوە بۆ چارەسەری کێشەی نێوان هاوڵاتیانی ڕۆم و هاوڵاتیانی بیانیی داڕێژرابوون .

## Girondins
## ژیرۆندینەکان

ژیرۆندینەکان ئەندامی حیزبێکی سیاسی بەناوبانگی سەردەمی شۆڕشی فەرەنسا بوون. ئەم حیزبە بە ناوی یەکێک لە ڕێبەرانی خۆیەوە بە ناوی بریسو، بریسۆتینیشی پێ دەگوترا. ژیرۆندینەکان لە لای ڕاستی هۆڵی پەرلەمان و مونتانیارەکانیش (ژاکوبینەکان) لە سەرەوەو لە لای چەپ و میانڕۆکانیش لە ناوەڕاستی پارلماندا دادەنیشتن. نزیکەی زۆربەی هەرەزۆری نوێنەرانی باشووری فەرەنسا،لایەنگری حیزبی ژیرۆندین بوون.

ژیروندنیەکان لە سەرەتادا نەیاری ڕژێمی پاشایەتیی بوون و هەر لە بەر ئەمەش لە ساڵی ١٧٩٢ دا دەسەڵاتیان بەدەستەوە گرت. بەڵام لەدوای ڕووخانی لویی شازدەهەم، دژی کوشت وبڕی مانگی ئەیلوول هەڵوێستیان گرت ومارا دادگایی کرا. بەڵام هێزی نیشتمانیی لەگەڵ ئەم

کردەوەدا دژایەتیی کرد و کومیتەی پاریس لەدژیان راوەستاو، زۆربەیان بە گیوتین کوژران (۳۱ ئایار تا ۳۱ تشرینی یەکەم ۱۷٦۳).

## سابوتاژ / تیک دان *Sabotage*

سابۆتاژ (کە لە سالّی ۱۸٤۲ کەلّکی وەرگیردرا) لەزاراوەی فەرەنسی Saboter (سەدەی۱۳) وەرگیراوە و بریتیە لە دەنگەدەنگ و هەراهەرا کردن بە سابووت (ئەوپێلاوە دارینانەی کەجووتیارانی فەرەنسا لە پێیان دەکرد.)

ئەم زاراوەیە ئەو کاتە هاتە ئاراوە کە لە رۆژگارانی پێشوودا، هێندێک لە کرێکارە ئەورووپیەکان بە مەبەستی تێکدان، پێلاوە دارینەکانی خۆیانیان دەخستەبەر ئامێری کارخانەکان و ئامێرەکانیان رادەوەستاند وبەم شێوە دەستیان لەکارکردن هەلّدەگرت.

واژەی ساباتو هەروەها بە مانای گۆی نەدان و قۆرت تێخستن و تێکدانی ئامێرەکان و بەرهەمەکان کەلّکی لێ وەرگیردراوە و ئامانجەکەی پێشگیری کردن لە کاری دامەزراوەیەک یان کارخانەیەک بوو. سابو بە واتا سیاسییەکەی بریتیە لە هەولّدان بۆ کاری تێکدەرانە لە دامەزراوە و شوێنە حکوومەتی، گشتی و تایبەتیەکان بە مەبەستی گەیشتن بە ئامانجی تێکدەرانەو نایاسایی.سابوتاژ هەروەها بە "رووخاندن " یش دەگوترێ کە بە لەوەبەپێش پلانی بۆ دارێژابێ.

## ڕێبازی سیاسیی ئایزنهاڤیر Eisenhower Doctrine

دامەزرێنەری ئەم ڕێبازە، ژەنەڕاڵ دڤایت ئایزێنهاڤیر، سی وچوارەمین سەرۆک کۆماری ئەمەریکا لە حیزبی کۆماریخوازی ئەو وڵاتەیە.

ناوبراو فەرماندەریی هێزەکانی هاوپەیمانانی لە شەڕی دووهەمی جیهانی لە ئەستۆدا بوو وتوانییووی لەم ڕێگایەوە خۆشەویستیەکی زۆر لە نێو خەڵکی ئەمەریکادا بەدەست بێنێ، سەرکەوتنی ناوبراو لە هەڵبژاردنەکانی ١٩٥٢ی ئەو وڵاتە، تاراددەیەکی زۆر قەرزداری ئەم شتە بوو.

هەروەها گەندەڵبوونی دەوڵەتی ترومێن و قسەکانی سیناتۆر مەک کارتی سەبارەت بە دزەکردنی مۆرەکانی کۆمۆنیزم لە دەوڵەتی ترۆمێندا، دوو هۆکاری دیکە بوون بۆ سەرکەوتنی ئایزنهاڤیر.( یەکێک لە قۆڵەکان بانگەشەی بۆ ئەوە دەکرد کە حیزب کۆماریخواز، هیچ کۆمۆنیستێکی تێدا نیە).

هۆکارێکی تری سەرکەوتنی ئایزنهاڤیر،سەردانی ناوبراو لە کۆریا و کۆتایی پێهێنان بە شەڕی ئەو وڵاتە لە ڕێگای وتووێژەوە بوو. ناوبراو بەو تایبەتمەندییانە هاتە نێو دنیای سیاسەتەوە. ئایزنهاڤیر لە ماوەی دەسەڵاتداریتی خۆیدا سیاسەتی " ڕوانگەی نوێ "ی گرتەبەر. بەپێی ئەم سیاسەتە ناوبراو، وازی لە سیاسەتی پێشووی خۆی هێنا کە لەسەر بنەمای ڕاهێنانی سەربازی و پێداگرتن لەسەر ئەوە بوو کە شەڕی دواتر وەک شەڕی دووهەمی جیهانی دەبێ، لە تێکهەڵچوونی زیاتری ئەمەریکا لە شەڕ لەگەڵ کۆریادا خۆی بوارد. سیاسەتی ئەمەریکا، هەم لەسەر گرنگیی چەکە

ناوەکیە تەکتیکیەکان و هەم لەسەر رۆلّی هێزی ئاسمانیی تێستراتژیک، وەک هۆکاری گۆمارۆدان، پێداگری دەکرد. بەم شێوە دروستکردنی چەکە ناوەکیە تەکتیکیەکان تەشەنەی کرد.

ئایزنهۆڤێر وتبووی کە "ئەگەر ئەو کەرەسانە تەنیا لە پێوەندی لەگەڵ ئامانجی سەربازیدا کەڵکیان لێ وەردەگیرێ، هیچ هۆکارێک نابینم بۆ ئەوەی کە لەم کەرەسانە وەک فیشەکی تفەنگ یان هەرشتێکی لەم چەشنە کەڵک وەرنەگرین".

لە ئەمەریکادا، ئەم سیاسەتە وەک " تۆڵەی هەمەلایەنە" ناوبانگی دەرکرد.

ئایزنهاڤێر وەک کەسانی پێش لە خۆی لە سەر "ئازادی" پێداگری دەکرد و، بڕیاریدا لە بەرامبەر" مەترسیی کۆمۆنیزم" دا بەربەستێک دروست بکا.

راپۆرتی کۆمیتەی دوولیتل ( Doolittle Committee) کە لە ساڵی ۱۹۵۵ لەلایان ناوبراوەوە ئەرکی لێکۆڵینەوە وراپۆرتی هێرشەکانی "سیا "ی پێ سپێردرابوو، دەڵێ: " ئێستا دەرکەوتووە کە ئێمە لەگەڵ دوژمنێکی کەللە رەقدا بەرەورووین، کە ئامانجی ئاشکرای ئەم دوژمنە، دەستبەسەر داگرتنی هەموو جیهان لە هەررێگایەک و بە هەر نرخێکە. لەو یارییەدا، هیچ یاسایەک بالآدەست نیە. ئەو سەرچاوانەی کە تاکوو ئێستا بۆ رێنوێنی مرۆڤ بەکەڵک بوون، ئیتر ئێستا جێبەجێ ناکرێن. ئەرکی سەرشانی ئێمە ئەوەیە کە تۆڕە سیخووڕی و دژەسیخوڕە کاریگەرەکان پەرە پێ بدەین و، دەبێ فێربین کە دوژمنانی خۆمان بە شێوەیەکی وشیارانەتر، ئالۆزتر و کاریگەرتر لەو شێوازانەی کە ئەوان لە دژی ئێمەی بە کاری دێنن، برووخێنین و، هێرشیان بکەینە سەرو، لە نێویان بەرین."

تێزەکانی ئایزنهاڤێر تارادەیەک لە بەرامبەر قەیرانی سوئێزدا (۱۹٥٦)، ولآمدەر بوو. بەپێی ئەم رێبازە، سەرۆک کۆمار بەڵێنی پشتیوانی بەو وڵآتانەی ناوچەی رۆژهەلآتی نێوەڕاستدا دەدا کە لە بەرامبەرمەترسیی داگیرکاریی دەرەکی کۆمۆنیزم یان تێکدەرانی نێوخۆییدا، خوازیاری پاراستنی سەربەخۆیی و یەکپارچەیی خاکی وڵآتەکەیانن.

ئەو وڵآتانەی کە پشتیوانیان لەم سیاسەتەی ئەمەریکا دەکرد، بەپێی بەرنامەی هاوکاریی دوو لایەنانە، هاوکارییە سەربازی و ئابوورییەکانی ئەمەریکا دەیگرتنەوە.

لە ئەنجامی بەڕێوەبردنی ئەو سیاسەتەدا بوو کە هێزەکانی ئەمەریکا لە سەرکامیل شەمعون _ سەرۆک کۆماری ئەوکات _ نێردرانە لوبنان (١٩٥٨). بەپێی ئەم ڕێبازە، بوار بۆ گۆڕینی ڕێککەوتننامەی بەغدا بۆ سینتۆ بە ئەندامەتی ولاّتانی ئێران، پاکستان و تورکیا رەخسا.

## Estrada Doctrine — ڕێبازی سیاسیی ئیسترادا

بەپێی ڕێبازی سیاسی ئیسترادا، دەوڵەتەکان مافی ئەوەیان نیە کە ڕەوا بوون یان ناڕەوا بوونی حکومەت یان دەوڵەتێکی سێهەم تاوتوێ کەن و هەڵی سەنگێنن. ئەگەر ئەو دەوڵەتەیان بە نایاسایی زانی ئەوا لە بەڕەسمی ناسینی خۆببوێرن، چوونکە ئەم کارە زەربە لە کەسایەتی و سەروەریی ئەو دەوڵەتە دەدا.

ئەم تیۆرە لە لایەن ئیستردا، وەزیری دەرەوەی ئەوکاتی مەکسیک لە بەیاننامەیەکدا، لە دوای چەندین شۆرش و ڕاپەڕین لە ساڵەکانی ٣١ -١٩٣٠ لە ولاّتانی ئەرژەنتین، بەرازیل، پیرۆ، شیلی وبۆلیڤیا و پاناما ڕاگەیەنرا.

## Brezhnev Doctrine — ڕێبازی سیاسیی بێرژنێف

بە ڕێچکە سیاسیەکانی لیئۆنید بێرژنێف سەرۆکی یەکیەتیی سۆڤیەت (١٩٨٢ _ ١٩٦٤) لە هەمبەر ولاّتانی سەربە بەرەی سۆسیالیستی دەگوترا.

ئەم ڕێبازە سیاسییە هەروەها ڕاگەیەنراوە جۆراوجۆرەکانی بێرژنێفیش لە دوای داگیرکردنی چیکسلۆڤاکیا لە ڕووداوی بەناوبانگی " بەهاری پراگ" لە لایان سوپاکانی پێنج دەوڵەتی ئەندامی پەیمانی" ڤەرشۆ" لە خۆ دەگرێ.

ڕێبازی سیاسیی بێرژنێف بەرتەسک کردنەوەی مافی دیاریکردنی چارەنووس و مافی سەروەریی نەتەوەیی ولاّتانی سۆسیالیستیی سەر بە سۆڤیەتیشی لەخۆ دەگرت. بەپێی ئەم ڕێبازە " ناکرێ مافی سەروەریی نەتەوەیی ئەو ولاّتانە لە بەرامبەر بەرژەوەندییەکانی سۆسیالیزمی جیهانی دابنرێن. ڕێساکانی مافە نێونەتەوەییەکان ملکەچی یاساکانی خەباتی چینایەتی و گەشەی کۆمەلاّیەتین". بەشێک لەو ڕێبازە تەنانەت پێش لە داگیرکردنی چیکسلۆڤاکیاش لە " نووسراوەی ڤەرشۆ"دا بەم شێوەیە هاتبووە بەر باس : " ناکرێ ئێزن بدرێ کە سیستەمی سۆسیالیستی لە ڕێگای

ئاشتیخوازانە یان له رێگای توونددو تیژی تووشی گۆڕان و ئاڵ وگۆڕ بێ. ئەوه ئەرکی هاوبەش و نێونەتەوەیی هەموو وڵاتانی سۆسیالیستیه کە بەرگری لە دەسکەوتەکانی سۆسیالیزم بکەن. وڵاتێکی سۆسیالیستی تەنیا دەتوانێ له سەربەخۆیی خۆی وەک ئەندامێک له کۆمەڵگای سۆسیالیستی بەرگری بکات و، بیپارێزێ".

وڵاتانی ئەڵبانیا، چینی کۆمۆنیست، رۆمانیا و یۆگۆسلاڤیا به پشت بەستن به مافی سەروەریی بێ سنوور، رێبازه سیاسییەکانی بێرژنێڤیان رەت کردەوه.

بەپێی راڤەکانی کۆمۆنیستیەکانی چین و ئۆرگانه رەسمییەکانی حیزبی کۆمۆنیستی ئەو وڵاتە، رێبازەکانی بێرژنێڤ نەک تەنیا بەرتەسک کردنەوەی مافی سەروەریی نەتەوەیی وڵاتانی سۆسیالیستی لەخۆ دەگرت، بە لکوو ئامانجی تری وەک دابەشکردنی کاری نێونەتەوەیی له کۆمەڵگای سۆسیالیستی جیهانیشی له خۆ دەگرت کە ئەمەخۆی هێژمۆنی خوازیی ـ سۆڤیەت و سەپاندنی دیکتاتۆریی پرۆلیتاریای بەدواوه بوو.

### رێبازی سیاسیی بۆشی یەکەم (١٩٨٩ـ١٩٩٣) Bush Doctrine

ئەم زاراوەیە کە زۆر جار به هاوواتای " تەکوزی نوێی جیهانی " دادەنرێ، کۆمەڵێک بیروبۆچوون له خۆ دەگرێ کە مانا و واتای روون و ئاشکرایان نیه. بەڵام سەرەرای ئەوەش، ئەو کۆمەڵە رووداوەی کە له سەرەتای دەیەی نەوەدی زایینی لە هەموو جیهاندا روویان داوه، بیرمەندان و خاوەنرایانی ناچار کردووه تاکوو ئەم گۆڕانکارییانه له چوارچێوەی " تەکوزی نوێی نێونەتەوەیی" هەڵسەنگێنن. رووداوەکانی بەرەی کۆمۆنیزم و بەدوای ئەویشدا، گۆڕانی سیستەمەکانی ئەورووپای رۆژهەڵات، رووخانی دیواری بەرلین، کوتایی شەڕی سارد، هێرشی ئەمەریکا بۆ سەر پاناما و هێرش بۆ سەر وڵاتی کوێت بۆ تێکشکاندنی هێزی سەربازیی سوپای عێراق و هێرشکردنه سەر عەرەبستان له نموونەی ئەم رووداوانەن. لەرێکەوتی ١١ی سێپتەمبەری ١٩٩٠، جۆرج بوش (یەکەم) سەرۆک کۆماری ئەمەریکا دوای داگیرکردنی کوێت لە لایەن عێراقەوه (ئابی ١٩٩٠) له وتارێکدا له بەردەم نوێنەرانی کۆنگرەی ئەمەریکا، تەکوزی نوێی جیهانی بەم شێوه پێناسه کرد:

" جیهانێکی زۆر جیاواز لەو جیهانەی کە ئێمە ناسیومانە. جیهانێک کە لەودا دەسەلاّتی یاسا، جێگای یاسای دارستان دەگرێتەوە .جیهانێک کە لەودا ولاّتان ئەرکی هاوبەش بۆ ئازادی و دادپەروەری بەرەسمی دەناسن و، جیهانێک کە لەودا بە هێزەکان رێز لە بێ هێزەکان دەگرن"

بەباوەڕی ئالن دۆبنوا _ بیرمەندی فەڕەنسی _ مەبەست لە پێکهێنانی نەزمی نوێی جیهانی ئەوە بوو کە فاکتەری سیاسی دەچێتە ژێر رکێفی فاکتەری یاسایی و، لە ئاکام دا فاکتەری یاسایی لە خزمەت رەوشتێکی تایبەتی دادەبێ کە ئامانجەکەی پاراستن و رەوایی دان بە بەرژەوەندییەکانی رۆژئاوایە.

### ***رێبازی سیاسیی بوشی دووهەم (٢٠٠١)*** **Bush (Gr) Doctrine**

بە تیۆر و دژکردەوەکانی جۆرج دەبلیۆ بۆش؛ چل وسێهەمین سەرۆک کۆماری ئەمەریکا، سەبارەت بە کێشە جیهانیەکان دەگوترێ. ناوبراو لە کاتێکدا بوو بە سەرۆک کۆماری ئەمەریکا، کە نزیک بەیەک دەیە لە کۆتایی شەڕی سارد و رووخانی یەکیەتیی سۆڤیەت تێپەڕ ببوو و، ئەمەریکا بە کەڵک وەرگرتن لە هەلێک کە بۆی رەخسا بوو، بەدوای سەقامگیر کردنی دەسەلاّتی سیاسی و سەربازیی ریزپەڕانەی (دەگمەن وتایبەتی ) خۆی لە گۆڕەپانی نێونەتەوەییدا بوو تاکوو ببێ بە تاقە هێزی جیهان. رووداوی تێرۆریستیی یازدەی سێپتەمبەر بوو بە هۆی ئەوەی کە دەسەلاّتدارانی ئەمەریکا بە کەڵک وەرگرتن لەو هەلەی کە رەخساوە، ئاواتەکانی ڤیلسۆن لە کردەوەدا، وەدی بێنن.

"بۆش"یش وەک ڤودرۆ ڤیلسون پێیوابوو ئەرکێکی مێژوویی لە ئەستۆیە، کە بۆ بەرفراوانکردنی نەزمی نوێی جیهانی جۆرێک ئەرکی مەعنەوی بەسەر کاربەدستانی ئەمەریکادا دەسەپێنێ. رێبازی سیاسیی بۆش بەر لەوەی کە بنەمایەکی رۆشنبیری هەبێ، سەرچاوەیەکی ئایینی هەیە.

بۆش کە سەرکردەی پارێزگارە نوێکانی ئەمەریکایە، لەگەڵ سیاسەتی دەرەوەی لیبراڵەکان و تەنانەت لەگەڵ سیاسەتی لیبراڵە کۆماریخوازەکانیشدا دژایەتی دەکاو، پێیوایە دەبێ بە کەڵک وەرگرتن لە هێزی سەربازی و یەکلایەنەگەری، سیاسەتی دەرەوەی ئەمەریکا بەڕێوە ببا. وا پێدەچێ کە دوو ئامانجی سەرەکی خۆیان لە ناخی ئیستراتیژی ئەمریکا حەشاردابێ:

١_ بەدەستەوەگرتنی سەرچاوەکانی وزە.

٢ـ کۆنترۆڵی سەربازیی ناوچە ستراتژییەکانی جیهان.

ئێستاکە ئەمەریکا زیاتر لەهەر بوارێکی دیکە، بایەخ بە بەرەنگاربوونەوە لەگەڵ ئەو وڵاتانەدا دەدا، کە لە روانگەی واشینگتۆنەوە سەربزێو (Rouge States) ن. تیۆری پێکدادانی شارستانیەتەکانی سامۆئێل هانتینگتۆنیش رەواییەکی ئایدۆلۆژیانە بەم ستراتژییە دەبەخشێ.

رێبازی سیاسیی بوش دەکرێ لە چوارلایەنی سیاسی، ئابووری، یاسایی و سەربازی هەڵسەنگێندرێ.

لە روانگەی سیاسییەوە، بەسەرنجدان بە بەستراوەبوونی ئەندامانی دەوڵەتی بوش بە تاقمی پارێزگارە نوێکان و سەرهەڵدانی دیاردەی راستی نوێ کە رادیکاڵیزمێکی دەستەراستی و توندڕۆیانە و بنەماکانی لە لیبراڵیزم و پارێزگاری سەرچاوەیان گرتووە ـــــ هەم بۆ پێناسەی نیۆلیبراڵەکان و هەم بۆ پێناسەی پارێزگارە نۆییەکانیش کەڵکی لێ وەردەگرن ـــــــ ، دەبێ چاوەڕوانی ئەوە بین کە پێوەندییەکانی نێوان بزووتنەوەی پارێزگارە نوێیەکان لەگەڵ بزوتنەوەی ڕاستی ئایینیدا رۆژ بە رۆژ بە هێزتر ببێ. لەو پێوەندییەدا، ئەم رێبازە لە بنەڕەتەوە لە بوارەکانی ئابووری و سیاسییەوە رێگای لیبراڵی گرتۆتە بەر، بەڵام لە بواری رەوشتی و کولتووری و کۆمەڵایەتیەوە پارێزگارتر دەبێ.

لە بواری ئابوورییەوە، دۆکتورینی بوش هەوڵ دەدا تاکوو بە کەمکردنەوەی ٦٠٠میلیارد دۆلار لە باجەکان، بوار بۆ جووڵەی هەرچی زیاتری مەکینەی ئابووریی ویلایەتە یەکگرتووەکان بڕەخسێنێ.

بەستراوەیی بێ ئەملاوئەولای تاقمی بوش بە کارتێلە گەورەکانی نەوتی، ماددی، بانکی و ناوەندە سەربازی و پیشەسازییەکان بۆتە هۆی ئەوەی کە بەپشت بەستن بە رووداوی ١١ی سێپتەمبەر، لە بواری سیاسی، رەوشتی و پروپاگەندییەوە، پاساو بۆ سیاسەتەکانی ئەمەریکا بهێننەوە.

٢ـ لە بواری یاساییەوە، ئەمەریکا لە پێناوی جێبەجێکردنی رێبازە سیاسییەکانی بۆش بەچەندین جار پرەنسیپەکانی یاسا نێونەتەوەییەکانی پێشێل کرد. هێندێک لەو بابەتانە بریتیین لە:

٣ـ پابەند نەبوون بە پرەنسیپەکانی رێککەوتننامەی کیۆتۆو، زۆر دژایەتیکردن لەگەڵ ئەو بڕیارانەی کە سەبارەت بە ژینگەن، لە پێوەندی لەگەڵ هەڵێنجانی سەرچاوەکانی نەوت، توێی ئۆزۆن و گازە گوڵخانەییەکان.

٤_ خۆکێشانەوەی بە ڕەسمی لە ڕێککەوتننامەی دژەموشەکیی بالستیک (ABM) بە هۆی ئەوەی کە ئامانجی ئەمەریکا بەرگریکردن لە ئاسایشی خەڵکە نەک پشتیوانیکردن لە گرێبەستە هەڵوەشاوەکان.

٥_ ڕەتکردنەوەی ئیمزای ڕێککەوتننامەی کەمکردنەوەی چەکە ناوەکیەکان.

٦_ دژایەتی لە گەڵ دادگای سزای نێونەتەوەیی.

٧_ پێشێلکردنی ئەو یاسایانەی کە پێوەندییان بە ڕێکخراوی بازرگانی جیهانیەوە هەیە. بۆ وێنە؛ بەرزکردنەوەی نرخی گومرک بەمەبەستی پشتیوانیکردن لە بەرهەمهێنەرانی پۆڵا(مای ٢٠٠٢).

٨_ پێشێلکردنی پرۆتۆکۆلی ١٩٨٩ کە تەواوکەری ڕێککەوتننامەی قەدەغەکردنی لە سێدارەدانی تاوانبارانی ژێر ١٨ساڵە ( کە ئێستاش لە ویلایەتە یەکگرتووەکان، عەرەبەستان، نیجیریا، کۆماری کۆنگۆ، و ..... هتددا بەڕێوە دەچێ).

دوای داگیرکردنی عێراق (نیسانی ٢٠٠٣)، ویلایەتە یەکگرتووەکان ئامادە نەبوو هیچ ئیمتیازێکی ئاوەدانکردنەوەی وڵات و نۆژەنکردنەوە بە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بداو، ڕێکخراوەکەی بە ناکارامە و لێنەهاتوو لە بەڕێوەبردنی کارفەرمانی خۆی واتە دامەزراندنی ئاشتی و ئاسایش تاوانبار کرد.

لایەنی سەربازیی دۆکتورینی بۆش کە بە گرنگترین لایەنی ئەو دۆکتورینە دەژمێردرێ، ئەو توانایيە بە ئەمەریکا دەبەخشێ، تاکوو بە پشت بەستن بە هێزی سەربازی و کۆگا سەربازی ـ پیشەسازییەکان، هەرجۆرە خۆڕاگرییەکی ئەو سوپایانە تێک بشکێنێ کە بەچەکە ئاسایی و نائاساییەکان پۆشتە کراون.

لەو پێوەندییەدا کۆشکی سپی لە ئەیلوولی ٢٠٠٢دا بەڵگەیەکی بڵاوکردەوە، کە بەپێی ئەو بەڵگەیە دەوڵەت، دەوڵەت دەیتوانی لەچوارچێوەی شەڕی پێشگیرانە، هێرشی سەربازی بکاتە سەرئەو وڵاتەی کە دەیویست. بەپێی ئەم تیۆرە کردەوەی پێشگیرانە بۆ ئەوەی بتوانی لەخۆت بەرگری بکەی، گرنگترە، تەنانەت ئەگەر لەوەش دڵنیا نەبی کە دوژمن لە چ سات و کاتێکدا و لە کوێوە هێرش دەکا.

بۆ پێشگیری لە ڕوودانی کردەوەیەکی لەم چەشنە،ویلایەتە یەکگرتووەکان لە کاتی پێویستدا، مافی کردەوەی پێشگیرانە بۆ خۆی دەپارێزێ. بە واتایەکی تر، هەرئەوەندەی کە

واشینگتۆن پێیوابێ ولاتێکی تایبەتی هەڕەشە ومەترسیەکە لە سەر ئەمەریکا، ئەمەریکا دەتوانێ هێرش بکاتە سەر ئەو ولاتە. تەنانەت ملکەچ بوونی ئەو ولاتەش، بەر بە هێرشی ئەمەریکا ناگرێ.

ـ لە شەڕی پێشگیرانە، ویلایەتە یەکگرتووەکان لە ڕێی مۆڵەتی ئەنجوومەنی ئاسایشی ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان ڕاناوەستێ.

ـ نۆژنکردنەوەی توانایی سەربازی ئەمەریکا بە جۆرێکە کە بتوانێ لە قۆناغی یەکەمدا لەگەڵ دوو تێکهەڵچوونی گەورە و، لە دوای ڕووداوی ١١ ی سێپتەمبەری ٢٠٠١، لەگەڵ چوار تێکهەڵچوونی مام ناوەندی، هاوکات لەگەڵ هێرشێکی گرنگ و داگیرکردنی پایتەختی دوژمن بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی نوێ، بەربەرەکانی بکا، تێزەکانی شەڕی پێشگیرانە، زەربە پێکەوتوونەکان بە پرەنسیپی سەروەریی دەوڵەتەکانیش پێش بینی دەکا.

ـ کەڵک وەرگرتن لە چەکی ئەتۆمی: لە حالێک دا کە تێزەکانی پێشوو کەڵک وەرگرتن لەمجۆرە چەکانەیان تەنیا تایبەت بە هێرشە ئەتۆمیەکان دەزانی، بەڵام تێزە نوێنەکان لەمەوبەدوا کەڵک وەرگرتن ل هێزی ئەتۆمی لە هەل و مەرجی شەڕە کلاسیکیەکان بە دژی ئەو ولاتانەی کە ئەم چەکەیان لە بەردەست دانیە، پێش بینی دەکا.

بەشێک لە پلانە سەربازییەکانی ئەمریکا لەڕاستای تێزەکانی بوش بریتین لە :

ـ پشتیوانیکردن لە بەرنامەی موشەکیی شەڕی ئەستێرەکان و زیادکردنی بوودجەی ئەم بوارە بە ڕێژەی ٤٠%.

ـ پشتیوانیکردن لە سیستەمە نوێیەکانی بەرگری موشەکی، ڕادارە لیزەرییەکانی سەرزەوی، ئاسمان، دەریا و بۆشایی.

ـ پێشنیاری بوش بۆ کەمکردنەوەی ژمارەی کلاوە ئەتۆمیەکان (کۆنەکان)ن نابێتە هۆی دابەزینی ئاستی توانایی ئەتۆمی ئەمریکا. چوونکە ئەم ولاتە دەیهەوێ کلاوەزۆر وردتر ولە هەمان کاتدا بە هێزترەکان لە جێگای موشەکە کۆنەکان دابنێ.

ـ چوونە دەری ئەمەریکا لە ڕێککەوتننامەی دژەموشەکی بالستیک (ABM) و، پیڕەویکردن لە پلانە بەرزەفڕانەکانی شەڕی ئەستێرەکان.

هەروەها دەوڵەتی ئەمەریکا لە بەرنامەی دایە تاکوو:

_ کلاْوە بچووکە ئەتۆمیەکان بۆ کارتێکردن لە ئامانجە پتەوەکان بەرهەم بێنێ و کەڵکیان لێ وەربگرێ.

_ دەست بە بەرهەمهێنانی موشەکی بالستیکی بەرەی نوێی ترایدێنت _٣ بکا.

_ کەمکردنەوەی چەکە کۆمەڵکوژەکان بە کەمکردنەوەی ئەم جۆرە چەکانە لە لایەن رووسیاوە ببەستێەوە.

رێبازی بوش لە پێوەندی لەگەڵ ولاْتانی جیهان وڕێکخراوە نێونەتەوەییەکان:

دەکرێ ئەم رێبازە لە دوو قۆناغ دا هەڵبەسەنگێندرێ:

١_ لە رووداوی یازدەی سێپتەمبەر تاکوو هێرش بۆ سەر ئەفغانستان .

٢_ دوای داگیرکردنی ئەفغانستان تاکوو کێشەی عێراق.

بە دوای رووداوی ٩/١١، ئەمەریکا دەستی بە جۆرێکی تر لە هاوپەیمانەتی سیاسی لە ئاستی جیهاندا کردووە، بە دروشمی :" یان لەگەڵ ئێمەن، یان دژی ئێمەن"، هەوڵی ئەوەیدا تاکوو ولاْتانی جیهان بکات بە لایەنگری سیاسەتەکانی خۆی. ولاْتانی ئەورووپی کە بە توندی کەوتبوونە ژێر کاریگەری قووڵی رووداوە دڵتەزێنەکەی ٩/١١ ، هاوپێوەندی و هاوسۆزی خۆیان لەگەڵ ئەمەریکادا راگەیاند. ئەمەریکا لە رێگای تێکهەڵکێشکردنی پێوەندییەکانی خۆی لەگەڵ ولاْتانی ئەورووپیدا، توانی هەم پشتیوانی ئەم ولاْتانەو هەم ئیجازەنامەی ئەنجوومەنی ئاسایش و هەم پشتیوانی زلهێزەکان بۆ هێرش بۆ سەر ئەفغانستان بەدەست بێنێ. بەلاْم یەک لایەنەگەریی لە رادەبەدەری ئەمەریکا بە پێشێل کردنی مافە نێونەتەوەییەکان لە پێوەندی لەگەڵ شەڕدا، بوو بە هۆی ئەوەی کە هاوپەیمانە دێرینەکانی ئەمەریکا (جگە لە بەریتانیا) لە ئەمەریکا دوور کەونەوە، بە شێوەیەک کە لە سەر هێرش بۆ سەر عێراق، درزێکی گەورە کەوتە ناو پێوەندییەکانی ئەمەریکا لەگەڵ ولاْتانی فەڕەنسا، ئەڵمانیا، رووسیا و چین.

لەو نێوەدا فەڕەنسا و ئەڵمانیا بە توندی دژایەتیان لەگەڵ یەک لایەنەگەری ئەمەریکا لە هێرش بۆ سەر عێراقدا کردو، ئەمەریکاش لە بەرامبەردا هەڕەشەی تۆڵەکردنەوەی لەو ولاْتانە کرد.

لە بەرامبەر رووسیادا، ئەمەریکا لە رێگای بەئەندامکردنی کۆمارەکانی پێشووی رووسیا و هاوپەیمانیەکانی ئەم ولاْتە لە ئەورووپای رۆژهەلاْت لە رێکخراوی ناتۆ دا، درێژە بە سیاسەتی

گەمارۆی رکابەر دەدا دەداو، هەنگاو بە هەنگاو لە داماڵینی چەکی ئەتۆمی ئەو وڵاتە نزیک بۆتەوە. وا پێدەچی کە رووسیا بۆ ئاستی هێزێکی پلە دوو دابەزیبێ.

ڕێبازی سیاسی بوش سیاسەتێکی توندتری لە بەرامبەر ئێران، عێراق و کۆریای باکوور گرتۆتە بەرو، ئەم سێ وڵاتەی لە بەرەی شەتیانی دانا(کانوونی دووهەمی ٢٠٠٢). وایێدەچێ کە وڵاتانی رۆژهەڵاتی نێوەڕاست بە هۆی باردۆخی ژیئۆپۆلۆتیک و ژیئۆستراتیژیی خۆیان، لە سەرەوەی ئەو وڵاتانە دابن کە ئەمەریکا بە دوای گۆڕینی رەفتاری سیاسی سیستەمە داخراوەکانی وڵاتانی عەرەبیدا بێ و، تەنانەت رووخاندنی ئەو رژێمانەش لە خۆبگرێ کە بە باوەڕی ئەمەریکا ناوەندێکی لەبار بۆ گەشەکردنی تیرۆریزم بن و، دەبێ لە بناغەوە بگۆڕدرێن. ئەم گۆڕانکارییە سووریا، لوبنان، عەرەبستان، میسر و تەنانەت ئیسرائیلیش لە خۆ دەگرێ.[ئێرانیش لە ریزی ئەو وڵاتانە دایە. و]

کێشەی عێراق لوتکەی دۆکترینی بۆش بوو کە بە بیانووی چەک داماڵینی ئەو وڵاتە، ئەمەریکا لە ٢٠ مارسی ٢٠٠٢دا، بەبێ مۆڵەتی ئەنجوومەنی ئاسایش هێرشی کردە سەر ئەو وڵاتە و داگیری کرد. لە هەمان کاتدا هەڕەشەشی لە سووریا کرد کە لە داڵدەدانی کاربەدەستانی بەعسی عێراقی لە خاکی خۆیدا خۆ ببوێرێ.

لە بارەی عەرەبستانەوە، ئەگەرچی ئەو وڵاتە بە یەکێک لە هاوپەیمانە دێرین و بەوەفاکانی ویلایەتە یەکگرتووەکان دەژمێردرێ، بەڵام بەشداریی بەرفراوانی هاووڵاتیانی عەرەبستان لە رووداوی ١١ سێپتەمبەردا بۆتە هۆی ئەوەی کە ئەمەریکا چاوێک بە پێوەندییەکانی خۆی لەگەڵ ئەم وڵاتەدا بخشێنێتەوە. داگیرکردنی عێراق بوو بە هۆی ئەوەی کە ئەمەریکا بەشێک لە هێزە سەربازییەکانی خۆی لە خاکی عەرەبستان بۆ قەتەرو عێراق بگوازێتەوە.

لە بارەی فەلەستینەوە، لە دوکترینی بوش دا ئەگەرچی پێخۆش بوونی ئەمەریکا بە پێکهێنانی دەوڵەتێکی سەربەخۆی فەلەستین (هەتا ساڵی ٢٠٠٥) راگەیەنراوە، بەڵام زیاتر لایەنگری لە ئیسرائیل کراوە. دوای هەڵبژێرانی ئەبومەئزەن بە سەرۆکایەتی فەلەستین، ئەمەریکا پلانێکی لە ژێر ناوی نەخشەی رێگا (Road Map)دا، بۆ پێکهێنانی پێوەندییەکی نوێ لە نێوان و ئیسرائیل و وڵاتانی عەرەبی پێشنیار کرد.

لە پێوەندی لەگەڵ ئەفغانستان، دوای رووداوی ١١سێپتەمبەر، ئەمەریکا بە تاوانبارکردنی ئۆسامە بن لادن و رژێمی تالیبان بە ئەنجامدانی هێرشی تیرۆریستی، لە تشرینی یەکەمی ٢٠٠١دا،

هێرشی کردە سەر ئەو ولاتەو، داگیری کرد. بەرووخاندنی رژێمی تالیبان، حامد کارزای کردە سەرۆک کۆماری ئەفغانستان.

لە بارەی پاکستانەوە، سیاسەتی تۆقاندن و خۆخۆشەویست کردنی گرتەبەرو، ئەم ولاتەی ناچار کرد کە لە هێرشکردن بۆ سەر ئەفغانستان، هاوکاری ئەمەریکا بکا. لە بەرامبەریشدا لە کۆمەڵێک قەرزی پاکستان خۆش بوو. هەروەها سەبارەت بە کێشەی کەشمیریش، پاکستانی بە پاراستنی بارودۆخی ئێستای کەشمیر، لە بەرامبەر هیند دا رازی کرد.

هەروەها سەبارەت بە چینیش، سیاسەتی " رکابەری ستراتیژیی "ی لە جێگای سیاسەتی "هاوپەیمانەتی ستراتیژیی" دانا.

لە پێوەندی لەگەڵ رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان، ئەگەرچی ئەم دامەزراوەیە دوای رووداوی ١١ سێپتەمبەر کۆمەڵێک بریارنامەی دژە تیرۆریستی پەسند کردووە و، هەروەها لەبارەی ئەفغانستانیشەوە هەنگاوی پۆزەتیڤی لە بارەی گەیاندنی بەپەلەی خۆراک، گەراندنەوەی پەنابەران، پاراستنی ئاشتی، نۆژەنکردنەوە و ئاوەدانکردنەوە و نووسینی دەستوور هەڵێناوە، بەلام ئەو ناکۆکیانەی کە لەسەر پەسندکردنی بریارنامەی ژمارە ١٤٤١ لەو ناوەندەدا پێکهات، نەیارانی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لە کابینەی دەوڵەتی ئەمەریکادا رایانگەیاند کە رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لە بریاردانداا لە سەرەخۆیە، حەز ناکا کێشەکە لە رێگای هێزی سەربازییەوە چارەسەر بکرێ و لە بواری دۆزینەوەی چارەسەری گونجاو بۆ کێشەکە، دیلی بیرۆکراسیەو، ئەوەندە سەرقاڵی کێشەو ناکۆکییەکانی رابردووە، کە ئیتر ناتوانێ ئەرک و بەرپرسیارەتێکی نوێ بە ئەستۆوە بگرێ. لە پێوەندی لەگەڵ عێراق دا، بەرپرسانی دەوڵەتی بۆش بە سەرنجدان بە پێداگری رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ بەدەستهێنانی مۆڵەتی هێرش بۆ سەر ئەو ولاتە، قۆڵی تۆڵەیان لەو رێکخراوە هەڵماڵی و، بەکردەوە لە دوای شەر، ئەم رێکخراەیان خستە پەراوێزەوە.

لە پێوەندی لەگەڵ ناتۆ، ئەگەرچی ئەم رێکخراوە لە سەرەتادا، رووداوی ١١/٩ی بە هێرش بۆ سەر خاکی ئەمەریکا داناو ، بەپێی پێرەوپرۆگرامی نێوخۆی رێکخراوەکە، ئەم هێرشەی بە هێرش بۆ سەر خاکی گشت ولاتانی ئەندام لە قەڵەم دا، لە هێرش بۆ سەر ئەفغانستاندا بەشداری کرد؛ بەلام پشتیوانی لە شەری عێراق نەکرد. بە هۆی ئەوەی کە چەند ناکۆکیەک لە نێوان

ئەمەریکا و بەریتانیا لەگەڵ دوو ئەندامی گرنگی دیکەی ناتۆ و یەکیەتیی ئەورووپا واتا فەرەنسا و ئەڵمانیا سەری هەڵدا، هیچ رۆڵێک بە ناتۆ نەدرا.

### ڕێبازی سیاسیی ترۆمێن (١٩٤٥_١٩٥٣) Trumar Doctrine

ئەم زاراوە بە ڕێبازی سیاسیی ترۆمێن، سی و سێهەمین سەرۆک کۆماری ئەمەریکا لە حیزبی دیموکراتی ئەو وڵاتە دەگوترێ.

ناوبراو لە هەل ومەرجێکی ئاڵۆزدا کە لە تێکهەڵچوونەکانی سوپای ئەمەریکا لە شەڕی دووهەمی جیهانیەوە سەرچاوەی دەگرت، دەسەڵاتی سیاسیی ویلایەتە یەکگرتووەکانی بەدەستەوە گرت؛ بەڵام کارتێکی براوە بەهێزی لەبەردەست دا بوو. ئەم کارتەش گەڵاڵەی مەنهەتەن بوو کە دروستکردنی بۆمبی ئەتۆمی لەخۆ دەگرت و، ترۆمێن بەپشت بەستن بەو گەڵاڵەیە، هەستی بە هێزێکی زۆر لە خۆیدا دەکرد کە سەرکردەکانی پێشوو هیچکامیان ئەم هەستەیان لە خۆیاندا بەدی نەکردبوو.

بنەماکانی ڕێبازی ترۆمێن لە بنەڕەتەوە لە ترسی گشتیی ئەمریکا لە تێوگلان لـــە دابەزینێکی ئابووریی دیکەوە سەرچاوەی دەگرت و، هەربۆیە ئەمەریکیەکان هیچکات پێیان خۆش نەبوو ناوچە جۆراوجۆرەکانی جیهان وەک ئەورووپای ڕۆژهەلات یەک بە دوای یەکدا بچنە نێو باوەشی سۆڤیەتەوە.

ترۆمێن دوای تاقیکردنەوەی یەکەمین بۆمبی ئەتۆمی، هەنگاوی بەرەوشەقامی ستراتیژیی تۆڵەی هەمەلایەنە هەڵێنایەوە، کە ئەمەخۆی بەشێک لە ڕێبازی سیاسیی ناوبراوی پێک دەهێنا.

ئەم ستراتیژییە لە کردەوەدا، لەگەڵ چەند گرفتی بنەڕەتی بەرەوڕووبوو:

١_ژمارەی بۆمبە ئەتۆمیەکانی ئەمەریکا زۆر کەم بوو؛

٢_ بۆمبەکانی نێو جبەخانەی ستراتیژیی خاوەنی هێزێکی بەرچاو نەبوون؛

٣_ لەگەڵ ئەگەری هێرشێکی ئەتۆمی و کوژرانی دەیان هەزار کەسی ئاسایی سۆڤیەت، سووپای سووری ئەم وڵاتە هەروەک خۆی دەمایەوەو، دەیتوانی لە بەرامبەر هێرشی ئاماژە پێکراو، ئەورووپای ڕۆژئاوا داگیر بکا.

تیروانینەکانی ترۆمێن چەندین رەهەندی جۆراجۆری هەبوو. ناوبراو لە ساڵی ١٩٤٧دا وتبووی: دەبێ هەر نەتەوەیەک ڕێگایەک بۆ خۆی هەڵبژێرێ، یەکێک لە ڕێگاکان لە سەر ویستی

زۆرینە وەستاوەو، تایبەتمەندیی ئەم ڕێگایەش بوونی دامەزراوەی سەربەخۆ، دەوڵەتی هەڵبژێراوی خەڵک، هەڵبژاردنی ئازاد، دابینکردنی ئازادیی تاکەکەسی، ئازادیی ڕادەربڕین و ئایین و ڕزگاربوون لە سەرەڕۆیی سیاسییە.

دووهەمین ڕێگاش لە سەرویستی کەمینەیەک ڕاوەستاوە کە لە ڕێگای فشار بە سەر زۆرینەدا حکوومەت دەکا. بناغەی ئەمجۆرە حکومەتانە لە سەر تیرۆر و سەرکوتی ئازادییە تاکەکەسییەکان ڕاوەستاوە. ئەمەریکا دەبێ هەوڵی بدا، پشتیوانی لەو خەڵکە بکا کە یان لە حاڵی بەربەرەکانی لەگەڵ کەمینە چەکدارەکان دان یان لە ژێر فەرمانڕەوایی دەرەکی دان". سیاسەتی دەرەوی ترۆمێن بە شێوەیەک بوو کە لە هەر شوێنێک هەڕەشەیەک لەلایەن کۆمۆنیستەکانەوە لە ئارا دابوایە، بەربەرەکانی لەگەڵ دەکرد؛ بەڵام ئەمەریکییەکان بۆ بەربەرەکانی لەگەڵ ئەم هەڕەشەیە شتێکی جگە لە بۆمبی ئەتۆمیان لە بەردەست دانەبوو. ئەمەریکا بۆ بەربەرەکانیکردن لەگەڵ هەڕەشە سەربازییەکانی سۆڤیەت لە ئەورووپا، سیاسەتی چەکدارکردنی وڵاتان و دانی قەرز بە ئەورووپییەکانی گرتەبەر.

ئەمەریکا لە سەر ئەو بڕوایە بوو کە کۆمۆنیزم لە حاڵەتی قەیران و هەژاریدا گەشەدەکاو، تەنیا ڕێگای بەربەرەکانی لەگەڵ کۆمۆنیزم، بەخشینی هاوکارییە ئابووریی بەو وڵاتانەیە کە بەدەست ئەم کێشانەوەدەناڵن. لە کۆتایی ساڵی ١٩٤٦دا، ئەمەریکا بۆ بەربەرەکانیکردن لەگەڵ هەڕەشەکانی سۆڤیەت، سێ ڕێگای گرتەبەر.

١) نۆژەنکردنەوەی سەرچاوە سەربازییەکانی ئەمەریکا.

٢) هاوکاریکردنی ئەو وڵاتانەی کە مەترسی دان.

٣) بەخشینی هاوکارییە ئابووری و تەکنیکییەکان بەو وڵاتانەی کە پێویستیان پێیەتی.

لەو نێوەدا، بەرواڵەت یۆنان زۆر گرنگ بوو. بەڵام گرنگتر لە یۆنان، ئەڵمانیا بوو کە بۆ بەرگری لە ئەورووپای ڕۆژئاوا وەکوو ڕۆڵی سەرەکی و بنەڕەتی هەبوو. قەیرانەکانی تورکیا و ئێران و داگیرکردنی خاکی ئێران و پشتیوانیی سۆڤیەت لە حکومەتە ناوچەییەکانی ئازەربایجان و کوردستان، کێشەکانی قووڵتر دەکردەوە.

وەزارتی دەرەوەی ئەمەریکا لە سەر ئەو باوەڕە بوو کە ئەگەر یۆنان لە دەست بچێ، بەدوای ئەودا تورکیاش لە دەست دەچێ و، سۆڤیەت دەتوانێ کۆنترۆڵی گەرووی داردانێل

بەدەستەوە بگرێ. بەپێی تیۆری ئاچسۆن: " ئەگەر وڵاتێک چووبا نێو بەرەی کۆمۆنیزمەوە، هاوسێکانی ئەو وڵاتەش ڕێگای ئەویان دەگرتە بەر."

ئەو تیۆرانە دواتر بە "دوومینۆ" ناوبانگیان دەرکرد. لەم ڕووەوە ئاحسۆن پێیوابوو کە سێوێکی رزیو، سێوەکانی تری نێو سیپەکەش دەڕزێنێ.

لە مانگی مارتی ١٩٤٧دا، ترۆمێن پێی لە سەر ئەوە داگرتەوە کە هەرکات و لە هەر شوێنێکدا دەوڵەتێکی غەیرە کۆمۆنیست لە ڕێگای جۆراوجۆرەوە، بۆ وێنە بەهۆی سەرهەڵداوەتێ و خۆجییەکان یان بەهۆی دەستێوەردانی دەرەکی و تەنانەت گوشاری دیپلۆماتێک (وەک تورکیا) بکەوێتە ژێر هەڕەشە و مەترسییەوە، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەبێ پێداویستیە ئابووری، سیاسی و گرنگتر لە هەمووشیان پێداویستیە سەربازییەکانی ئەو وڵاتانە دابین بکا.

لە قامووسی ترۆمێن دا، زاراوەی " خەڵکی ئازاد" و "دژە کۆمۆنیست " هاوواتای یەکتر بوون و، ڕێبازی سیاسیی ترۆمێن پێشی بە هەر شۆرشێک دەگرت. رژێمە دیکتاتۆرەکان هەر ئەوەندە کە گوتبایان دوژمنەکەیان کۆمۆنیستە، ئەمریکا بێ سێ و دوو بەهانایانەوە دەچوو.

ناوبراو بۆ ئەوەی کە لە نێو بیروڕای گشتیدا ڕەوایەتیەک بە هێرشە سەربازییەکانی ئەمەریکا ببەخشێ، پێویست بوو جار ناجارێک ترسێکی گەورە و لەرادەبەدەر لە دڵی ئەمەریکیەکاندا دروست بکا بۆ ئەوەی پشتیوانی ئەوان بەدەست بێنێ. ناوبراو بە جۆرێک باسی لە رژێمە دیکتاتۆرەکان دەکرد کە ئەو رژێمانە لە هەر شوێنێک بن، ئازادی پێشێل دەکەن. بەوتەی ناوبراو " ئێستا کاتێ ئەوەیە کە هەر نەتەوەیەک لە نێوان ڕێگا جۆراجۆرەکانی ژیاندا، ڕێگایەک بۆ خۆی هەڵبژێرێ....".

تێزەکانی ترۆمێن ڕێگای ناردنی هاوکاری و یارمەتیە گەورەکانی بۆ ئەورووپا دەکردەوە، چوونکە بە باوەڕی ئەمەریکا، ئەوە تەنیا ئەورووپایەکی ساغڵەم بوو کە دەیتوانی لە بەرامبەر هێرشی سوپای سووردا بەربەرەکانی بکا.

ترۆمێن بۆ خۆی پێیوابوو کە تێزەکانی ئەو و گەڵاڵەی مارشاڵ دوو ڕووی دراوێکن.

ئەگەرچی سەبارەت بە تورکیا و یۆنان زیاتر پێداگریان لەسەر ڕەهەندی سەربازی دەکردەوە، بەڵام لە پێوەندی لەگەڵ ئەورووپای ڕۆژئاوادا، ئەم پێداگرییە زیاتر ڕەهەندی ئابووری هەبوو. بەڵام بەگشتی هەمووی ئەم ڕەهەندانە یەک ڕۆڵیان لە بەرامبەر سۆڤیەت دا دەگێرا.

یەکێک لە ڕووداوەکانی سەردەمی دەسەڵاتداریێتی ترۆمێن، کودیتای کۆمۆنیستیی چیکۆسلۆڤاکیا بوو کە بەدوای ئەمەدا، سەرۆک کۆمار، بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی ڕێکخستنی " بەڕێوەبەرییە خزمەتگوازییە ستراتیژیی"ەکانی دەرکرد. چوونکە ئەم ڕێکخراوە بە چوارچێوە و پێکهاتەی گۆستاپۆیی، لەگەڵ نەریتەکانی ئەمریکادا یەکی نەدەگرتەوە" .

لە درێژەی ئەم ڕێگایەدا، ناوبراو لە ساڵی ١٩٤٢دا، پێخۆش بوونی خۆی لە سەر دامەزراندنی " ڕێکخراوی هەواڵگری ناوەندی" (CIA) وەک بەشێک لە "یاسای ئاسایشی نەتەوەیی" ڕاگەیاند.

ڕەهەندێکی تری ڕێبازە سیاسییەکەی ترۆمێن بە " پرەنسیپی چوار" بەناوبانگ بوو کە لە ساڵی ١٩٤٩دا هێنایە گۆڕێ. ناوبراو لەو گەلاڵەیەدا بەڵێنیدا کە هاوکارییە تەکنیکیەکانی ئەمەریکا " لە پێناوی دابینکردنی هێز و توانایەکی بنەڕەتی ، ئاراستە دەکا، هەتاکوو ئەم هێزە بنەڕەتیە، خەڵکی دنیا هان بدا، لە دژی سەرکوتکەران و زۆرداران وهەروەها لە دژی دوژمنە لە مێژینەکانی مرۆڤ، واتە لە دژی برسیەتی، چارەرەشی و ناهومێدی ڕاپەڕن".

بە دامەزرانی ئەڵمانیای فیدراڵ لە ڕێکەوتی ٢٣ی مانگی مایسی ساڵی ١٩٤٩دا، ترۆمێن گەیشتە سەرکەوتنێکی دیکە لە بەرامبەر سۆڤیەتدا. بەڵام کێشەی سەرەکی چەکدارکردنی ئەڵمانیای ڕۆژئاوا بوو کە تەنانەت بیرورای گشتی نیوخۆی ئەمەریکاش دژایەتی ئەم سیاسەتەیان دەکرد.

ترۆمێن لە ڕێکەوتی٢٣ی تەمموز ١٩٤٩دا بە بیانووی بەرگریکردن لە دێموکراسی، ڕێککەوتننامەی ناتۆی مۆر کردو، ئەو ڕێککەوتننامە، ڕێگای بۆ چەکداربوونی ئەڵمانیای ڕۆژئاوا خۆش کرد.

لە ڕاستیدا ناتۆ بەو مەبەستە پێکهات کە ئەو بەڵێنە بدا، کە ئەمەریکا تەنیا بە مەبەستی گێڕانەوەی ڕووسیا لە کەڵک وەرگرتن لە چەکی ناوەکی، لە چەکی ناوەکی کەڵک وەردەگرێ.

لە ڕۆژهەڵاتی ئاسیا، هێزەکانی چینی کۆمۆنیست بە پێشڕەوی خۆیان توانیان پاشەکشە بە چیان کای چێک بکەن؛ بەڵام ئەمەریکا بەتەمابوو بە هەرنرخێک بێ، زەربرێکی گەورە لە هێزەکانی ماو بوەشێنێ و، بەر بە پێشڕەوی کۆمۆنیزم بگرێ. وەک بەشێک لەو ستراتیژییە، ترۆمێن گریمانەی سەرەکیی دەستێوەردانی خۆی لە شەڕی کۆریا لە سەر ئەوبنەمایە داڕشتبوو کە دەکرێ

بە نرخێکی کەم بەر بە پێشڕەوییەکانی کۆمۆنیزم لە وڵاتانی ناوچەکە بگیردرێ. بەم شێوەیە، کاتێک کە پارەو کەرەسەکانی ئەمەریکا ئەم کارەیان لە هیندو چین و فلیپیندا بەڕێوە دەبرد؛ هێزی دەریاوانیی ئەمەریکا چیان کای چێکی رزگار دەکردو؛ بۆمب هاویژەکانی ئەمەریکی هێزەکانی کۆریای باکووریان ناچار بە پاشەکشە دەکرد. ئەو گریمانانە بەگشتی بەجێ بوون. بەشێک لەو گریمانانە لە تیۆری ستراتیژیی هێزی ئاسمانیی ئەمەریکا و، لێکدانەوەی هەڵەکانی هێزی ئاسمانیی ئەمەریکا لە شەڕی دووهەمی جیهانی سەرچاوەی دەگرت. بەشێکی تری ئەم گریمانانە لەو روانگەوە سەرچاوەی دەگرت کە ئاسیاییەکان هیچکات توانایی بەربەرەکانیکردنیان لە بەرامبەر چەکە رۆژئاواییەکاندا نیە و، بەشێکی ئەو گریمانانەش، پشتیان بەوە بەستبوو کە گوایە دەوڵەتە کۆمۆنیستیەکان خاوەنی پشتیوانیەکی راستەقینەنیە نین. بەپێی ئەو تیۆرە، دەوڵەتە کۆمۆنیستەکان بە هۆی نەبوونی خۆشەویستی، لە ناردنی سەربازەکانیان بۆ بەرەکانی شەڕ دەترسان و، لەگەڵ هەناردنیان بۆ بەرەکانی شەڕ، سەربازەکان لە شەڕکردن خۆیان دەبوارد.

ترۆمێن رایگەیاند کە کۆریەکان مافی ئەویان هەیە " ئازاد، سەربەخۆ و یەکگرتوو" بن. ئەمەریکیەکان لە سەر ئەو بڕوایەبوون کە، "پیۆنگ یانگ" یەکەم پایتەختە لە پایتەختەکانی پەردەی ئاسنین"ە کە رزگار دەبێ. وادیارە مانای ئەم قسەیە ئەوە بێ کە پایتەختەکانی تریش بەدوای "پیۆنگ یانگ " دا رزگار دەکرێن.

لە روانگەی ئەمەریکیەکانەوە، ترۆمێن دەسکەوتی زۆری بەدەست هێنا بوون، لە سەردەمی ناوبراودا ئەمەریکا ببوو بە خاوەنی بۆمبی هیدرۆژنی(مارتی ١٩٥١)و، لە ئەیلوولی ١٩٥١دا، رێککەوتننامەی ئاشتی لەگەڵ ژاپۆندا مۆر کرد. بەپێی ئەم رێککەوتننامەیە، ئەمەریکیەکان دەیانتوانی لە ژاپۆندا، بنکەی سەربازییان هەبێ، بەڵام سۆڤیەتیەکان لێی بێ بەش بوون. ترۆمێن لە زۆربەی شۆێنەکانی دنیادا بنکەی سەربازیی ئەمەریکی دامەزراندو، لەم رێگایەوە رووسەکان و چینیەکانی گەمارۆدا. ناوبراو لە تشرینی دووهەمی ١٩٥٠ دا فێری ئەوە ببوو کە نابێ زیاتر لە تۆرە ئاسنینەکان پێ رابکێشێ؛ بەڵام دنیای دڵنیا کردبۆوە کە ئەگەر کۆمۆنیستێک لە دەرەوەی ئەو تۆڕەدا، سەربەرز بکاتەوە، کەسێک لەوێ لەسەری دەداو، ئەوکەسەش بە دڵنیاییەوە، ئەمەریکی دەبێ.

دەوڵەتی ترۆمێن بنکەو دامەزراوەیەکی سەربازیی زۆر بەرفراوانی لە دوای خۆی بەجێهیشت. ئەم بنکەو دامەزراوانە، پیشەسازییەکی بەرفراوانی چەک و چۆڵ و لە رواڵەتدا بەردەوامیان پێکهێنابوو کە ئێستاکە بە تەواوەتی بە گرێبەستەکانی دەوڵەتەوە بەستراونەوە. وەزارەتی بەرگری، ببوو بە گەورەترین کۆمپانیای بەڕێوەبەریی پیشەسازی جیهان؛ کۆمپانیا زەبەلاحە تایبەتیەکانی وەک جێنراڵ مۆتۆرز، دۆپۆن و بەرهەمهێنەرانی گەورەی فڕۆکە، بوون بە هێزە پاوانخوازەکان و، دەوڵەت دەستی بە سەر بەرهەمهێنانی چەک و چۆلە گەورە هێدروژنیەکان، لە بنەماڵەی بۆمبی ئەتۆمی، موشەکە کۆنترۆلکراوەکان، زرێپۆش وناوە گەورە نوێکان و بۆمب هاوێژە درێژمەودا و ستراتیژییەکانی B٥٢ و چەکە گەورەکانی تردا گرتبوو.

بەپێی رێبازە سیاسییەکانی ترۆمێن، ئەمەریکا بنکە سەربازییە بەهێزەکانی خۆی لە دەوروبەری ئیمپراتۆریی کۆمۆنیستدا بەرفراوان دەکرد. ناوەندە پیشەسازی ـ سەربازییەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکان بوون بە هێزێکی گەورەی کۆمەڵایەتی و ئابووری.

ترۆمێن لە کاتێکدا، رێبەرایەتی ئەمەریکای بەدەستەوەگرت کە ئەمەریکیەکان حەزیان دەکرد بگەڕێنەوە بۆ نەریتەکانی سەربازی و وڵات بەڕێوەبەری جاران و، سیاسەتی دەرەوەی ئەمەریکا لەسەر بنەمای دەستێوەرنەدان لە کاروباری وڵاتانی دیکەدا بوو. کاتێک کە ترۆمێن ماڵئاوایی لە کۆشکی سپی کرد، بەشداری ئەمەریکای لە هەموو کیشوەرەکانی جیهان و هەروەها پیشەسازییەکی چەک و چۆلی زۆر بەرفراوانی لە دوای خۆی بە میرات بەجێ هێشت.

## *Tobar Doctrine*

## *رێبازی سیاسیی تۆبار*

زاراوەیەکە کە دەیگەڕیننەوە بۆ تۆبار، وەزیری کاروباری دەرەوەی ئەوکاتی ئیکڤادۆر،لە سەبارەت بە " بەرەسمی نەناسینی حکومەتە نوێکان"، کە لە ٢٠ی کانوونی یەکەمی ١٩٠٧دا، بوو بە هۆی گرێدانی رێککەوتنامەیەک لە نێوان ٥ وڵاتی ئەمەریکای ناوەندیدا. ئەو وڵاتانە بریتی بوون لە کۆستاریکا، گواتیمالا_ هیندوراس ـ نیکاراگووا و ئێلسالڤادۆر. بەپێی ئەو رێککەوتنامەیە، ئەو دەوڵەتانە بەڵێنیاندا کە ئەو حکومەتانە بەرەسمی نەناسن کە بە هۆی شۆرش یان بە پێچەوانەی دەستووری وڵاتەکانیان پێکهاتوون.

### ڕێبازی سیاسیی جۆنسۆن *Johnson Doctrine*

ئەم ڕێبازە کە جارو بار وەک ڕێبازی جۆنسۆن ـــــ مەن بەناوبانگە، لە ساڵی ۱۹٦٥دا لە لایەن جۆنسۆن، سی و شەشەمین سەرۆک کۆماری ئەمەریکا و جێگری وەزیری کاروباری دەرەوەی ئەمەریکا بۆ کاروباری ئەمەریکای لاتین (T.C.Mann) داڕێژرا.

بەپێی ئەم ڕێبازە، ئەمەریکا کۆتایی بە سیاسەتی پشتیوانی نەکردن لەو دەوڵەتانەی ئەمەریکای لاتیندا دێنا کە لە ڕێگای هەڵبژاردنی گشتییەوە بە دەسەلاٚت دەگەیشتن، و لە بەرامبەردا، ئەمەریکا بەڵێنی دەدا لەمەولا پشتیوانی لە هەموو ئەو حکومەتانەی ئەمەریکای لاتین بکا کە بەرژەوەندییەکانیان لەگەڵ ئەمەریکادا یەکی دەگرتەوە و دەگونجا. ئەم تێزەی جۆنسۆن لە سەروبەندی دەستێوەردانی سەربازیی ئەمەریکا لە کۆماری دۆمینیکێندا داڕێژراوە و، بە واتایەکی تر، بوژانەوەی سیاسەتە گشتیەکانی دالَس ـــــ ئایزنهاڤێر سەبارەت بە ئەمەریکای لاتین بوو. ئامانجی گشتیی ئەو تێزە پێداگری دووبارەی ئەمەریکا لە سەر شەڕ لەگەڵ" مەترسیی ئاشکرا وهەستپێکراوی بەدەستەوەگرتنی دەسەلاٚت لە لایەن کۆمۆنیستەکان" لە ئەمەریکای لاتیندا بوو.

### ڕێبازی سیاسیی خرۆشچۆڤ *Khrushchev Doctrine*

بە شێوازە سیاسییەکانی نیکیتا خرۆشچۆڤ، یەکێک لە سەرکردەکانی سۆڤیەت لە نێوان ساڵەکانی ۱۹٥٦ هەتا ۱۹٦٤ دەگوترێ. بەلاٚم ئەوە پێناسەی، کۆمەڵێک بیروبۆچوون و تیۆری داڕێژراو و ڕێک و پێک نیە. خرۆشچۆڤ لە ڕێبەرایەتیکردنی سۆڤیەتدا، داهێنانی نوێ و جۆراوجۆری بە کارهێنا. ڕەنگە یەکێک لە ناسراوترینی ئەو داهێنانە، ئەو فڕێدانی" کەسایەتی پەرستی"ی ستالین و پێداگرتنی ناوبراو لە سەر ڕێبەریی بە کۆیی بێ. لە ساڵی ۱۹٥٦ لە بیستەمین کۆنگرەی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەتدا، خرۆشچۆڤ و هاوڕێکانی سیاسەتی نوێی تایبەت بە حەقدەستەکان و مووچەیان ڕاگەیاند. بە پێچەوانەی لنین، ستالین، پەرەی بە نایەکسانیە ئابوورییەکان دا. ئیستا دەبوایە مووچەو مافەکانی بیمەی کۆمەلاٚیەتیی کەسانی هەژار زیاد بکرایەو، داهاتی دەوڵەمەندەکانیش کەم بکرایەتەوە. ئەم سیاسەتە دواتر بەڕێوە چوو و، بوو بە هۆی ناهومێدیی چینی دەوڵەمەند. لە یەکێک لە ڕاگەیەنراوەکانی بیستەمین کۆنگرەی حیزبدا، بەڵێن

درابوو که خوێندنی باڵا هەتاکوو بەرزترین ئاست بەخۆڕایی بێ. لە سەردەمی دەسەڵاتداریێی ستالیندا، خوێندنی باڵا بەخۆڕایی نەبوو و، کە لەگەڵ پرەنسیپەکانی لنینیزم و هەروەها دەستووری ساڵی ١٩٣٦ دا، نەدەگونجا. لە راگەیەنراوێکی دیکەدا بەڵێن درا کە " دەسەڵاتی یاسا" پیادە بکرێ و، زۆربەی گیراوە سیاسییەکان لە ئەشکەنجەکانی سەردەمی ستالین عەفوو بکرێن. هەروەها خرۆشچۆف لەو کۆنگرەدا رایگەیاند کە لەمە بەدواوە پرێزدیۆمی حیزب بڕیارەکانی حیزب دەرناکا و، بەڵکوو ئەم ئەرکە دەکەوێتە ئەستۆی " کۆمیتەی ناوەندی " حیزب.

یەکێک لە گرنگترین لایەنەکانی دوورکەوتنەوە لە ستالینیزم پێوەندی بە سیاسەتی دەرەوە هەبوو. خرۆشچۆف لایەنگری سیاسەتی" پێکەوە ژیانی ئاشتیانە" بوو. هەروەها ناوبراو پێیوابوو کە نەتەوە سەرمایەدارو کۆمۆنیستەکان دەتوانن بەبێ شەڕ لە پاڵ یەکتردا بژین، بێ ئەوەی کە پرەنسیپەکانی پێکەوە ژیانی دوو ئایدۆلۆژیای مارکیسزم و کاپیتالیزم پەسند بکا. ئەو تیۆرە لە لایەن چینی کۆمۆنیستەوە رەت دەکرایەوە و، ئاگری نێوان دووزلهێزی گەورەی جیهانی کۆمۆنیزمی خۆش دەکرد. خرۆشچۆف لە روانگەی چینیەکانەوە کەوتە بەرەی پێداچوونەوەخوازانەکان. ناوبراو کۆنترۆلی سۆڤیەتی لە سەر وڵاتانی ژێردەسەڵاتی خۆی لە ئەورووپای رۆژهەڵاتدا کەم کردەوە و، پێوەندیشی کە لەگەڵ یۆگۆسلاڤیاش باش بۆوە. بەڵام کەمکردنەوەی ئەم چاوەدێری و کۆنترۆڵەی سۆڤیەت لە سەر وڵاتانی ئەورووپای رۆژهەڵات بوو بە هۆی سەرهەڵدانی راپەڕین لە وڵاتانی پۆلۆنیا و هەنگاریا لە ساڵی ١٩٥٦ داو، راپەڕینی هەنگاریا لە لایەن زرێپۆشەکانی سۆڤیەتەوە سەرکوت کرا. لە نێو سۆڤیەتدا، زۆر لەوستالینیستیانەی کە شێوەی بیرکردنەوەی کۆنی خۆیان پاراستبوو، بە هۆی وەلانانی ستالین لە لایەن خرۆشچۆڤەوە لە بیستەمین کۆنگرەی حیزب و هەروەها لە کۆمەڵێک سیاسەتی ناوبراو، ناڕازی بوون. چینی کۆمۆنیستیش بە ئاشکرا سەبارەت بەو سیاسەتانە، رەخنەی لە خرۆشچوف دەگرت.

لە بواری سەربازییەوە، چەند گۆڕانکارییەکی گشتی لە کۆتاییەکانی سەرۆکایەتی خرۆشچۆف هاتنە ئاراوە. سەرەتا دەوڵەتی سۆڤیەت بە هۆی بەرزبوونی ئاستی تێچوونی سەربازی، هێزەکانی خۆی لە ئەورووپای رۆژهەڵات کەم کردەوە و، دووهەمین گۆڕانکاری ئەوە بوو کە ژمارەی سەربازانی سوپای سوور کەم بێتەوە. سێهەم، ئاستی هێز و توانایی موشەکە ناوەکیەکانی سۆڤیەتبە شێوەیەک زیاد کرا، کە بەردەوام لەو ئاستە دیاریکراوە دانەبەزێ.

### ڕێبازی سیاسیی دراگۆ — *Drago Doctrine*

تیۆرێکە کە بەپێی ئەم تیۆرە، وڵاتان ناتوانن بۆ وەرگرتنەوەی قەرزەکانیان لە وڵاتانی دیکە، لە هێز و زۆر کەڵک وەربگرن. تیۆری دراگۆ باس لەوە دەکا کە ئەگەر وڵاتێک نەتوانێ قەرزە گشتییەکانی وڵات بە بیانیەکان یان بە وڵاتێکی تر بداتەوە، ئەوا وڵاتی داواکار ناتوانێ لە ڕێگای بە کارهێنانی هێزی سەربازی، قەرزەکانی خۆی وەربگرێتەوە. ناوی ئەو تیۆرە لە لویس ماریا دراگۆ، وەزیری دەرەوە و، دیپلۆمات، مافناس و ناوبژیوانی نێونەتەوەیی ئەرژەنتینی وەرگیراوە. ناوبراو تیۆری خۆی لە ساڵی ١٩٠٢دا، دوابەدوای گەمارۆی دەریایی ڤەنزوئێلا لە لایەن هێزەکانی بەریتانیا، ئەڵمانیا و ئیتالیا( بەهۆی خۆبواردنی ڤەنزوئێلا لە دانەوەی قەرزەکانی) ئاراستە کرد.

### ڕێبازی سیاسیی ریگان — *Reagan Doctrine*

زاراوەیەکە کە دەگەڕێتەوە بۆ ڕۆناڵد ریگان، چلەمین سەرۆک کۆماری ئەمەریکا. ئەم ڕێبازە وەک ڕێبازەکانی ترۆمێن و نیکسۆن هیچکات بە ڕەسمی وەک کۆمەڵێک بیروبۆچوونی داڕێژراو و ڕێکخراو چاپ و بڵاو نەکرایەوە. " کارڵ کراوسهامێر" لە ساڵی ١٩٨٥دا لە گۆڤاری تایمدا ئاماژەی پێکرد. کە لە ڕاستیدا مەبەستی ناوبراو ئاماژەکردن بەو سێ بابەتە بوو:

١) زاڵبوونی بیروڕای گشتی ئەمەریکا بەسەر "کێشەی ڤیێتنام"؛

٢) گەڕاندنەوەی " غرور و هەستی مەتمانە"ی ئەمەریکیەکان؛

٣) چەکدار بوونی ویلایەتە یەکگرتووەکان هەتا ئەو ئاستەی کە بتوانێ لە بەرامبەر دوژمنانی خۆیدا خاوەنی " ڕێژەی مەتمانە " بێ.

ڕێبازی سیاسی ریگان لە سەر ئەم خاڵە چەقی بەستبوو کە ئەمەریکا مافی دەستێوەردان بۆ خۆی بە دژی " ڕژێمەناڕەواکان"( بە تایبەتی مارکسیست _ لینینیست) دەپارێزێ.

بەگشتی سێ لایەنی هەستپێکراو لە سیاسەتی دەرەوەی ریگان دا دەبینرێ:

١) پێکهێنانی " تەکووزێکی نێونەتەوەیی" لە ڕێگای بەستنەوەی " ڕەوایی دەوڵەت" بە " پرۆسەی دیمۆکراسی " لە وڵاتێکدا. مەبەست لە بەڕێوەبردنی ئەم سیاسەتە ئەوە بوو کە ئەمەریکا بە باوەڕی خۆی، لە هەموو شوێنێکدا هەستی بە " بەرپرسیایەتیەکی ڕەوشتی" بۆ

پشتیوانیکردن له شۆڕشه دژه کۆمۆنیستهکان دهکرد. جا ئهم پشتیوانیه چ له ڕێگای هێرشی سهربازی بێ و ( وهک گرانادا له سالی ۱۹۸۳)، چ ناڕاستهوخۆ و له ڕێگای ناردنی هاوکارییه ئابووری و سهربازییهکانهوه بێ. (وهک پاکستان، ئهفغانستان، ئهنگۆلا و نیکاراگۆوا). ئهمهریکا ههتا سالی ۱۹۸٦ به گشتی بڕی یهک میلیارد دۆلاری وهک هاوکارییه سهربازییهکان و چوار میلیارد دۆلاری وهک هاوکارییه ئابوورییهکان بۆ کۆنترۆلی ڕهوته دژه کۆمۆنیستیهکان و، کهمکردنهوهی ئاستی کارتێکهریی یهکیهتیی سۆڤیهت و کۆمۆنیزم له جیهانی سێههم دا تهرخان کرد.

۲) دابینکردنی هاوسهنگییهکی سهربازی و ستراتیژییهکی ئهوتۆ که " هیچ دوژمنێک توانای ههڕهشهکردنی له سهرچاوه بنهڕهتیهکانی ویلایهته یهکگرتووهکانی ئهمهریکا" ی نهبێ. ئهم هاوسهنگیه له ڕێگای درێژهی پلانهکانی بهرگریی ستراتیژیی، لهگهڵ موشهکیی M-x، ژێر دهریاییهکانی ترایدنێت، هێزهکانی دژکردهوهی خێرا، پێکهێنانی فهرماندهرییهکی ناوهندی بۆ دهستێوهردانی سهربازی له ڕۆژههلاتی نێوهڕاست و ئاسیاو، زیادکردنی ژمارهی پاپۆڕهکانی شهڕ له ٤۸٥ پاپۆڕهوه بۆ ٦۰۰ پاپۆڕ. تێچووی سهربازی ئهمهریکا ههتا سالی ۱۹۸٦ به ڕادهی ٤٥% زیادی کرد.

۳) پێشگیریکردن له دهست وێراگهیشتنی یهکیهتی سۆڤیهت به تهکنهلۆژیای ڕۆژئاوا به مهبهستی پیادهکردنی گوشاری زیاتر بۆ سهر ڕژێمی کۆمۆنیستی.

پێویست به وهبیرهێنانهوهیه که ئهم ڕێبازه له سالی ۱۹۸٥ به دواوه، وردهورده کارامهیی خۆی به دژی ئهوشتهی که ئهمهریکا ناوی لێنابوو" ئیمپراتۆری ئههریمهنی"، له دهست دا؛ چوونکه گۆرباچۆف به هێنانه گۆڕی " هزری نوێ" بهربهرهکانی خۆی له لهگهڵ سیاسهتهکانی ئهمهریکا دهست پێکرد. ریگانیش له ئاکامدا چهند ئالْ و گۆڕێکی له سیاسهتی شهڕی ساردی خۆیدا پێکهێناو،"ڕووبهڕوو بوونهوهیهکی شیاو"ی گرتهبهر؛ واته وتوویژ و دانوسان لهگهڵ سۆڤیهت لهسهر کۆنترۆلی چهک وچۆل لهگهڵ گۆڕانکاری له بواری مافهکانی مرۆڤ و کێشهکانی تری ناوچه بهیهکهوه بهسترانهوه.

### ڕێبازی سیاسیی کارتەر (١٩٨١-١٩٧١) Carter Doctrine

ئاماژەیە بە ڕێبازی جیمی کارتەر ، سی و نۆیەمین سەرۆک کۆماری ئەمەریکا لە حیزبی دیموکراتی ئەمەریکا.

کاتێک کە جیمی کارتەر ئەم پۆستەی بەدەستەوە گرت، حیزبی دیموکرات لەگەڵ پروپاگەندەی توندی دژە ئەمەریکی لە جیهان و بەتایبەتی لەولاّتانی شۆڕشگێڕ و دژە داگیرکەر ـ بەرەو ڕوو بوو. کاربەدەستانی زۆربەی ولاّتانی جیهانی سێهەم (بەتایبەتی لە ڕۆژهەلاّتی نێوەڕاست ) لە ریزی بەکرێگیراوانی ئەمەریکادا بوون و، بۆ بەهێزکردنی دەسەلاّتەکەیان لە هیچ کردەوەیەک خۆیان نەدەبواردو، ئەمەریکایش دانی بە کردەوەکانیاندا دێنا.

لەم هەل و مەرجە ئاماژە پێکراوەدا، کارتەر لە هەوڵی ئەوەدابوو کە سیاسەتێکی دووفاقەش بگرێتەبەر. واتە سەرەڕای پاراستنی پێگەی ئەمەریکا لە جیهاندا، ژێستێکی (سیما) بە رواڵەت ئازادیخوازانەش لە گۆڕەپانی سیاسەتی نێودەوڵەتیدا لە خۆی بنوێنێ. ئەو سیاسەتە دوو فاقیەی کارتەر بە مەبەستی ئەو ئامانجانەی خوارەوە دارێژرا:

١)ـ جێبەجێکردنی سیاسەتی مافەکانی مرۆڤ

٢)ـ بەربەرەکانێکردن لەگەڵ رژێمە شۆڕشگێڕو دژە داگیرکەرەکان

سیاسەتی مافەکانی مرۆڤی کارتەر لە کاتێکدا خرایە ڕوو کە وشیاری نەتەوە چەوساوەکانی جیهان لە سەر ئامانجە داگیرکارییەکانی ئەمەریکا بە لوتکە گەیشتبوو و، دەرەتانی هەڵوەشانەوەی رژێمە بەکرێگیراوەکانی ئەمەریکا لە هەموو جیهاندا لە ئارا دابوو. مەبەستی راستەقینەی کارتەر (و حیزبی دیمۆکرات ) لە بواری جێبەجێکردنی سیاسەتی مافەکانی مرۆڤ، لە دوو ئامانجی خوارەوەدا کورت دەبۆوە:

١) دیکەوەنانی پێگەیەک بۆ ئەمەریکا لە نێو نەتەوە ژێردەست و چەوسانەوەکانی جیهاندا.

٢) ناچار کردنی رژێمە بەکرێگیراوەکان بە جێبەجێکردنی چەند ریفۆرمێکی رواڵەتی، بە شێوەیەک کە رادەی دژایەتیەکان دابەزێ و، لەگەڵ مانەوەی ئەو رژێمانەشدا، بەرژەوەندییە داگیرکارییەکانی ئەمەریکاش وەکوو جاران پارێزراو بێ.

دەوڵەتی ئەمەریکا لە ئاستی نێونەتەوەییدا لەگەڵ رژێمە شۆڕشگێڕ و دژە داگیرکارییەکان بەرەوڕوو بوو کە بە " رژێمە توندڕەوەکان" ناو دەبران. سەرکردەکانی ئەو رژێمانە ماوەیەکی کەم بوو کە دەستیان بەخەبات لە پێناوی کورت کردنەوەی دەستی ئەمەریکا لە وڵاتەکانیان بە مەبەستی پاراستنی مان و بوونی نەتەوەیی و ناسنامەی سەربەخۆی مێژوویی و کولتووری خۆیان کرد بوو. ئەمەریکا کە بە تەواوەی هەستی بەمەترسی بۆ سەر بەرژەوەندییەکانی خۆی دەکرد، بڕیاریدا کەڵک لەم تەکتیکانەی ـ بەپێی دەرەتان ـ خوارەوە وەربگرێ:

١) گرتنەبەری رەوتێکی ئەسپایی لە بەرامبەر ئەو رژێمانەو، هەڵخەڵەتاندنیان.

٢) زەربە لە رژێمێکی شۆڕشگێڕ بدات بۆ ئەوەی ئەوانیتر چاوترسێن بکا و، ناچاریان بکا کە پیرەوی لە ئەمەریکا بکەن.

٣) رووخاندنی ئەو رژێمە شۆڕشگێڕانەی کە بە هیچ شێوەیەک ئامادە نەبوون رووی خۆش بە ئەمەریکا نیشان بدەن و درێژەیان بە خەباتی خۆیان لە دژی ئەمپریالیزمی ئەمەریکا دەدا.

ئیستا بەشێک لەو تێزە سیاسیانەی کارتەر کە لە هێندێک لە وڵاتانی جیهاندا بەڕێوە چوون، دەخنەینە روو:

ڕێبازی سیاسیی کارتەر بەرامبەر بە نیکاراگۆوا: بەرووخانی رژێمی سەرەڕۆی ئاناستازیا سوموزا، سەرۆک کۆماری نیکاراگۆوا لە ١٧ی حوزەیرانی ١٩٧٩دا، نەیارانی ناوبراو بە ناوی بەرەی ساندینیستەکان دەسەلاتیان لە وڵاتدا بەدەستەوە گرت. کارتەر بە گشتی هەموو هەوڵی خۆی لە سەر دزەکردن لە نێو رژێمی نوێ، بەهێزکردنی باڵە میانەڕۆترەکانی دەوڵەت و هاندانی سیستەمی دژە حیزبی لە کۆمەڵگای نیکاراگۆوادا چڕ کردبۆوە.

کۆنگرەی ئەمەریکاش بڕیاریدا لەو پێناوەدا بڕی حەفتاوپێنج میلیۆن دۆلار بداتە دەوڵەتی ماناگۆوا. ئامانجەکانی ئەم بەرنامە بریتی بوون لە :

١) پێکهێنانی دەرەتانی رکابەریکردنی ئەمەریکا لەگەڵ سۆڤیەت و کوبا کە ژمارەیەکی کەم لە راوێژکارانی سەربازی و هەزاران چەکداری مەدەنی، یارمەتیدەری تەندروستی و شتی لەم چەشنەیان نارده نیکاراگۆوا.

٢) بەهێزکردنی پێگەی چینی ناوەراست کە لایەنگرییەکی زۆریان لە ساندینیستەکان کردبوو، بەلاّم وا پێدەچوو کە وەک هێزێکی گرنگ بێتە ژێر دەسەلاّتی ئەوان .

لە روانگەی شارەزایانەوە، رێبازە سیاسییەکانی کارتەر لە نیکاراگۆوادا سەرکەوتوو بوون، بەلاّم لە هەلّبژاردنەکانی ١٩٨٠دا بایەخێک بەو سەرکەوتنانە نەدرا. ریگان ( جێنیشینی کارتەر) و لایەنگرانی پێیانوابوو کە سەرکەوتنی ساندینیستەکان نیشانەی لاوازیی کارتەر بووە.

**رێبازی سیاسیی کارتەر سەبارەت بە ئەفغانستان:** لە کاتی دامەزرانی رژێمی مارکسی (نیسانی ١٩٨٧)، تاکوو داگیرکرانی ئەو ولاّتە لە لایەن سۆڤیەتەوە(١٩٧٩)، دەولّەتی کارتەر کەمتر پێرەوی لەو شێوازی پێشوو دەکرد. لەراستیدا حکومەتی واشینگتۆن لە چاوەڕوانی ئەوەدا مابۆوە کە بە باشترین شێوە، ئەو زیانانە قەرەبوو بکاتەوە کە لە ئاکامی گۆڕانی رژێم لە ئەفغانستاندا، هاتبوونە ئاراوە. بەو هیوایە کە رژێمی تازە وەک " کۆمونیستە ناسیۆنالیستەکان کار بکا نەک وەک بەکرێگیراوی سۆڤیەت"، بەلاّم رووداوەکانی کانوونی یەکەمی ١٩٧٩ بەو مانایە بوو کە گرتنەبەری سیاسەتێکی پتەوتر لەگەلّ " دەستێوەردانێکی بەکەلّک" لە لایەن ئەمەریکاوە رەنگە تەنیا دەستێوەردانی سۆڤیەتی وەپێش خستبا.

بەهەرحالّ، دوای هێرشی سۆڤیەت بۆ ئەفغانستان و داگیرکردنی ئەوولاّتە لە کۆتاییەکانی کانوونی یەکەمی ١٩٧٩، هەم ئامانجەکان و هەم شێوازەکانی کارتەر گۆڕانی بەسەر داهات. سیاسەتی بەرتەسک کردنەوەی زیانەکانی " شۆڕشی نیسانی ١٩٧٨"، بوو بە دراژیەتیکردنی چالاکانەی ئەمەریکا لەگەلّ دەولّەتی کابوّل لە رێگای کەلّک وەرگرتن لە سزا ئابوورییەکان و هاوکاریکردنی لە ژێرەوەی سەرهەلّداوەکان.

بەگشتی، ئەو رێبازە سیاسیانەی کە لە لایەن کارتەرەوە لە پێوەندی لەگەلّ ولاّتانی باشووری رۆژئاوای ئاسیادا پێرەو دەکراو، ریگانیش داکۆکی لێ دەکردن، بریتی بوون لە:

١ــ بەهێزکردنی بەرگرییە دژە سۆڤیەتیەکان لە ناوچە و ولاّتە سەرەکیەکانی وەک پاکستان و، هاوکاریکردنی کۆماری گەلی چین بۆ باشترکردنی ئاسایشی پاکستان.

٢ــ بردنەسەری ئاستی توانایی سەربازیی ئەمەریکا بۆ دژکردەوەی خێرای سەربازی لە بەرامبەر ئەگەری هێرشی سۆڤیەتدا.

٣ــ زیندووڕاگرتنی کێشەی ئەفغانستان لە ڕێگای پاراستنی بەرگری و لە هەمان کاتدا هەوڵدان بۆ ڕاکێشانی سۆڤیەت بۆ گەڕاندنەوەی بێلایەنی ئەفغانستان.

٤ــ ڕێگادان بە بەشداری هیند، لە چارەسەرکردنی کێشەی ئەفغانستان، لە ئاستێکی زۆر بەرتەسکدا و، پێکهێنانی هەل و مەرجێک کە ببێتە هۆی کەم بوونەوەی ناکۆکیی نێوان هیند و پاکستان.

٥ــ بردنەسەری وشیاریی سیاسی موسوڵمانانی سۆڤیەت.

**ڕێبازی سیاسیی کارتەر لە بەرامبەر هیند و چین دا:** هەوڵی کارتەر بۆ ئاسایکردنەوەی پێوەندییەکان، لە زنجیرە چاوپێکەوتنێک لەگەڵ بەرپرسانی ڤێتنامدا لە ساڵەکانی ١٩٧٧ و ١٩٧٨دا، شکستی هێنا. ڤێتنام لەسەر ئەوە پێداگری دەکرد کە ئەمەریکا زیانەکانی شەڕی ڤێتنام قەرەبوو بکاتەوە. هەتاکوو هاوینی ساڵی ١٩٧٨، ڤێتنامیەکان زیاتر بەرەو پێکهاتن لەگەڵ ئەمەریکادا دەڕۆیشتن، بەڵام دەوڵەتی کارتەر بە هۆی جۆراوجۆر بە پێچەوانەوە، هەنگاوی هاویشت. ئەو هۆکارانە بریتی بوون لە : (١) دژایەتیە سیاسییەکان و دژایەتیەکانی کۆنگرە. (٢) پێشێلکردنی مافی مرۆڤ لە لاین ڤێتنام .(٣) پێوەندییەکانی ڤێتنام و سۆڤیەت (٤) پەرەگرتنی ڕەوتی ئاساییکردنەوەی پێوەندییەکانی ئەمەریکا لەگەڵ کۆماری گەلی چین ، کە لە دەرەنجامدا، چین خۆی دەبوو بە دوژمنی ڤێتنام.

لەمناوەدا ، ڤێتنامیەکان بە لابردنی پۆلپۆت، کامبۆجیەکانیان لە تۆقاندن و کوشت و کوشتار رزگار کردو، وێرای داگیرکردنی کامبۆج، عەقید" سامرین" یان لەسەر دەسەڵات دانا . لەو سەروبەندەدا، پێکهێنانی پێوەندیی دیپلۆماتیک لە ڕوانگەی ئەمەریکاوە، هەم لە بواری تیۆری و هەم لە بواری سیاسەتی بەڕێوەبەریدا، بە شێوەیەکی گشتی، جێبەجێ نەدەبوو. وتووێژەکانی سەبارەت بە کێشەکانی دوولایەن درێژەیان هەبوو، بەڵام سیاسەتی" نزیکایەتیی شیاو" لە بەرامبەر ڤێتنامدا وەلاو نرا.

**ڕێبازی سیاسیی کارتەر سەبارەت بە ئەفریقیای باشوور:** شێوازی کارتەر لەو ناوچەیەدا تارادەیەک بە قازانجی ئەو وڵاتــــە بوو. ئەو شەڕ و کێشانەی کە ناوچەی باشووری ئەفریقیایان لە ساڵی ١٩٧٧ دا تەنیبۆوە، پێکهاتەیەکی ئاڵۆزی پێک دەهێنا . دەوڵەتی کارتەر لەو پێوەندییەدا بڕیارێکی دا کە لەسەر هاوکارییە نێونەتەوەییەکان پێداگری دەکرد. ئەم دەوڵەتە لە پێوەندی

لەگەڵ رۆدزیا لەگەڵ بەریتانیا و، لە پێوەندی لەگەڵ نامیبیا لەگەڵ بەریتانیا، فەڕەنسا، کەنەدا و ئەڵمانیادا هاوکاریەکی نزیکی هەبووو، بەکەڵک وەرگرتن لە نفووزی ئەو وڵاتانە، ئەفریقیای باشووری ناچار بە پێملبوون بکا.

موگابە کە لە هەڵبژاردنەکانی زیمبابۆوەدا بە زۆرینەیەکی رەها سەرکەوتنی بە دەست هێنا، سەرەڕای ئەوەی کە خۆی بە مارکسی دەزانی، بەڵام بەلای پێکهێنانی پێوەندیەکی دۆستانە لەگەڵ واشینگتۆن و وڵاتانی تری رۆژئاوادا شکایەوەو پشتی لە سۆڤیەت کرد.

سەبارەت بە ئەنگۆلاش، کارتەر پێخۆشبوونی خۆی لەسەر بەخشینی ١٥٢/٤ میلیۆن دۆلار قەرز و ئیعتباری گرەنتی کراوی " بانکی هەناردە_ هاوردە" دەبڕی. بەگشتی، ئەمەریکا توانی بە بەخشینی چەند ئیمتیازێکی بچووک، هاوکاریی ئانگۆلاو مۆزامبیک بۆ چارەسەرکردنی کێشە ناوچەییەکان، بۆ لای خۆی رابکێشێ و، ئەمەریکا لەم پێوەندییەدا تاڕادەیەک سەرکەوتوو بوو؛ بەڵام گوشارێکی کەم بۆ سەر ئەفریقیای باشوور لە پێوەندی لەگەڵ سیاسەتی رەگەزپەرستیدا، کاریگەرییەکی ئەوتۆی نەبوو.

**رێبازی سیاسیی کارتەر سەبارەت بە لیبیا:** رابردووی ئەم کێشە دەگەرێتەوە بۆ ساڵی ١٩٧٠. لەو ساڵەدا نیکسۆن، سەرۆک کۆماری ئەوکاتی ئەمەریکا، سیاسەتی رێککەوتنی لەگەڵ مەعەممەر قەزافی، رێبەری لیبیادا تاقی کردەوە و، لە سەر داخوازیی قەزافی، ئەمەریکا بڕیاریدا کە بنکەی ئاسمانیی ڤیلۆس، چۆڵ بکا، بەڵام ئەو پێوەندییانە بە هۆی جۆراجۆر رۆژ بە رۆژ دادەبەزین. کارتەر لە ساڵەکانی سەرەتای بە دەسەڵات گەیشتنیدا، بایەخێکی ئەوتۆی بە لیبیا نەدا. بەڵام رێگای پارێزکارانەی باشترکردنی پێوەندیەکانی بە ئاواڵەیی هێشتبۆوە.

لەمناوەدا، ئەمەریکا جارناجارێک لیبیای بە لایەنگری لە تیرۆریزم و پێشێلکردنی مافی مرۆڤ تاوانبار دەکرد. لە کانوونی یەکەمی ١٩٧٩دا، لە دوای رووداوی بارمتەگرتنی فەرمانبەرانی باڵوێزخانەی ئەمەریکا لە تاران (٤ی تشرینی دووهەمی ١٩٧٩)، چەندین گرووپ لە خەڵکی لیبیا بە پشتیوانی لە دەوڵەت ، باڵوێزخانەی ئەمەریکایان ئاگر تێبەرداو، بەهۆی ئەم روداوانە، دوایین دیپلۆماتی ئەمەریکا لە مانگی مایسی ١٩٨٠دا، ماڵئاوایی لە لیبیا کرد.

**ڕێبازی سیاسیی کارتەر سەبارەت بە ئێران:** دەوڵەتی ئەمەریکا لە دوای بەڕەسمی ناسینی ڕژێمی تازە بە دەسەڵات گەیشتووی کۆماری ئیسلامی، ڕێبازێکی دوژمنکارانەی دوای داگیرکرانی باڵیۆزخانەکەی لە تاران و بە بارمتەگیرانی فەرمانبەرکانی ( ٤ی تشرینی یەکەمی ١٩٧٩)، گرتەبەر. سەرنەکەوتنی کارتەر لە ئازادکردنی بارمتەکان و شکستە یەک لە دوای یەکەکانی لە بەرامبەر ئێراندا بوو بە هۆی ئەوی کە لە هەڵبژاردنەکانی سەرۆک کۆماریی ئەمەریکا لە بەرامبەر ڕۆناڵد ریگان، پاڵێوراوی حیزبی کۆماریخوازدا، بە توندی شکست بخواو، شوێنی خۆی لە کۆشکی سپی ئەسپاردە ریگان.

### *ڕێبازی سیاسیی کلینتۆن (١٩٩٣_٢٠٠١)* **Clinton Doctrine**

ئامانجی ئەو ڕێبازەی کە پلانی کاری بیل [ویلیام جیفرسۆن ] کلینتۆن چل و دووهەمین سەرۆک کۆماری ئەمەریکای لە خۆ دەگرت، پەرەپێدان بەو دێموکراسیانە بوو کە بە بەرفراوانکردنی دەسەڵات، پشتیان بە بازاڕ دەبەست، و ئەو خاڵانەی لە خۆ دەگرت:

١_ بەرفراوانکردن و بەهێزکردنی " ناوەندی بنەڕەتیی" ئابوورییەکانی بازاڕ لە ڕێگای بوژاندنەوەی ئابووری ئەمەریکا و هاوپەیمانەکانی

٢_ پشتیوانیکردن لە بەرفراوانکردنی دێموکراسی و بازاڕ لە ڕێگای ڕزگارکردن لە دەرەوەی ناوەندی بنەڕەتیی ، واتە لە ئاسیا، ئەفریقیا، ئەمەریکای لاتین و بە تایبەتی لە وڵاتانی سەربەخۆی هاوبەرژەوەندی ؛

٣_ کەمکرنەوەی ئەوپەڕی هەڕەشە ومەترسی حکومەتە سەربزیوەکان کە سیستەمێکی سەرەڕۆ و دژە لیبراڵیان هەیە و لە بەرامبەر ریفۆرمە دێمۆکراتیەکاندا، بەربەرەکانی دەکەن؛

٤_ درێژەدان بە هەوڵە مرۆڤ دۆستانەکان کە هەوڵی گولبژێر بە مەبەستی پاراستنی ئاشتی و کردەوە هاوشێوەکانە.

### *ڕێبازی سیاسیی کەنێدی (١٩٦١_١٩٦٣)* **Kennedy Doctrine**

ئەم زاراوەیە بە ڕێبازی سیاسیی جۆن_ئێف کەنێدی، سی و پێنجەمێن سەرۆک کۆماری ئەمەریکا لە حیزبی دێمۆکراتی ئەمەریکا دەگوترێ.

کەنێدی کە بە گەنجترین سەرۆک کۆماری ئەمریکا دەژمێردا، لە کاتێکدا دەسەڵاتی بە دەستەوە گرت کە توانیبووی رکابەرێکی بەهێزی وەک ریچارد نیکسۆن بە جیاوازییەکی کەمی رێژەی دەنگەکان، لەسەررێگای خۆی لابەرێ و، بگاتە کۆشکی سپی.

ناوبراو و دەوروبەرەکانی لە سیاسەتەکانی دەزگای رێبەریی ئایزنهاڤێر بێزار ببوون؛ چوونکە پێیانوابوو، ئایزنهاڤێر بەرادەی پێویست، هێرشبەر نیە. ناوبراو زیاتر حەزی لە پێکهاتن و سازان دەکردەوە و، نەیدەتوانی خەڵکی ئەمەریکا ناچار بکا کە کاری گەورە ئەنجام بدەن. ئایزنهاڤێر لە بنەڕەتدا بیری لە رێگاچارەی سەربازی بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی شەڕی سارد نەدەکردەوە، یان ئەوەی کە ئەمەریکا بتوانێ چارەنووسی جیهان بگۆڕێ. ناوبراو کۆمەڵێک چوارچێوەی بۆ رۆڵی ئەمریکا دانا بوو کە کەنێدی هەمووی رەت کردنەوە.

کەنێدی بە تەما بوو، بە وتەی خۆی کەسایەتی و سەرەوەری لە دەستچووی سەرۆک کۆماری بگەڕێنێتەوە. ئامانجی ناوبراو ئەوە بوو کە سەرنجی خەڵکی ئەمەریکای لاتین، ئەفریقیا و ئاسیا بۆ لای ئەمەریکا و ئەو کارانەی کە سەرۆک کۆمار دەیکا، رابکێشێ.

سیاسەتی کەنێدی کە هەمان سیاسەتی حیزبی دێموکراتی ئەمەریکا بوو، بە ناوی " رزگار کردنی ئازادی " پێی نایە ناو گۆڕەپانەوە. بە بڕوای کەنێدی،" هەموو نیوەگۆی باشووریی گۆی زەوی ببوو بە گۆڕەپانی شەڕ بۆ پەرەپێدان و بەرگریکردن لە ئازادی".

کەنێدی، کوبای وەک یەکەم رووبەرووبوونەوەی شێلگیرانەی خۆی لەگەڵ کێشە جیهانیەکان هەڵبژارد. لە نیسانی ١٩٦١دا، هەڵاتووە کوبیەکان بە کەشتیەکانی ئەمەریکا و بە پشتیوانی فڕۆکەکانی ئەو وڵاتە لە کەنداوی بەرازەکانەوە گەیەندرانە لێوارەکانی کوبا. بەڵام کاسترۆ و هاورێکانی بە توندی لە بەرامبەر ئەو هێزانەدا راوەستان و، هەموویان تێک شکاندن. کەنێدی بڕیاری تیرۆری کاسترۆی دەرکرد، بەڵام پلانەکەی کەنێدی سەری نەگرت.

ناوبراو بە پێشگرتن بە تەشەنەکردنی ناکۆکیەکانی شەڕی سارد، سیاسەتی بەناو" دژکردەوەیەکی نەرم"ی گرتەبەر. گرووپی کەنێدی ـ مەک نامارا دەستیان بە گەورەترین پێشبڕکێی چەک و چۆڵ کرد کە تاکوو ئەوکاتە بێ وێنە بوو. ژمارەی هێزە چەکدارەکان بۆ٣٠٠٠٠٠ کەس زیادی کردو، ٤٠٠٠٠کەسیان رەوانەی ئەورووپا کرد.

سەبارەت بە کێشەی ئەڵمانیا، بە هێنانە گۆڕی کێشەی بەرلین لە لایەن خرۆشچۆف، سەرۆکی سۆڤیەت، ئەمەریکا و سۆڤیەت لەو بوارەشەوە لەبەر یەک راوەستان. سۆڤیەت لە ١٣ی ئابی ساڵی ١٩٦١دا بە دروستکردنی " دیواری بەرلین "، ئەمەریکای رووبەرووی کارێکی نەخوازراو کردەوە.

تەقاندنەوەی بۆمبی ٥٨ میگاتۆنی سۆڤیەت لە رێکەوتی ٣٠ ئابی ١٩٦١دا (بەگشتی ٣٠ تەقاندنەوە)، کەنێدی ناچار کرد کە لەمبارەوە هەڵوێست بگرێ. کەنێدی لە نیسانی ساڵی ١٩٦٢دا، بریاری کۆمەڵێک تاقیکردنەوەی ناوەکی دەرکرد. ئەم دژکردەوە توندەی کەنێدی رووسەکانی ناچار بە پاشەکشە کرد. رووسەکان کە لە بواری ئەتۆمیشەوە بێ هیوا ببوون، روویان لە کوبا کرد و دەستیان دایە دروستکردنی سەکۆی هاویشتنی موشەکە دوور هاوێژەکان (نووتی ١٩٦٢)، تاکوو لەم رێگایەوە شوێن پێیەک بۆ خۆیان بدۆزنەوە. کەنێدی بۆ بەربەرەکانیکردن لەگەڵ قەیرانی موشەکیی کوبا بەدوای ئەو ئامانجانەوە بوون:

١_ وەدەرنانی موشەکەکان لە کوبا.

٢_ خۆ بواردن لە شەڕی ناوەکی.

٣_ دژکردەوە لە بەرامبەر رووسەکان، لە شوێنەکانی تری جیهان.

٤_ پێداگری لە بەرامبەر رووسەکاندا.

کەنێدی، لە کات ژمێری ٧ی شەوی ٢٢ی تشرینی یەکەمی ١٩٦٢لە کاناڵە تەلەفیزیۆنیەکانی ئەمریکاوە رایگەیاند کە بە توندی پاپۆڕە بارهەڵگرە سەربازییەکان بەرەو کوبا دەپشکنێ.

بە دوای ئەم هۆشدارییەی کەنێدیدا، پاپۆڕەکانی سۆڤیەت، رێگای خۆیان گۆڕی و، لە چوون بەرەوکوبا خۆیان بوارد. ئەم قەیرانە لە دوای، داوای خرۆشچۆف لە ئەمەریکا بۆ لابردنی موشەکەکانی لە تورکیا گەیشتە لوتکە. بەڵام بە تێگەیشتنی هەر دوو لایەن لە سەر ئەوەی کە ئەو هەڕەشانە دەبنە هۆی هەڵگیرسانی شەڕێکی ئەتۆمی، لەگەڵ یەکتر رێک کەوتن. لە راستیدا ئەوە کەنێدی بوو کە خرۆشچۆڤی ناچار بە پاشەکشە کرد. سۆڤیەت لەو قەیرانەوە بۆی دەرکەوت کە ئەمەریکا هەروا سنوورەکانی خۆی لە جیهانی سێهەمدا پەرە پێدەدا. لە بواری چەکی ئەتۆمیشەوە، رێککەوتننامەی قەدەغەکردنی تاقیکردنەوە ئەتۆمیەکانیان مۆر کرد.

دەکرێ لە دەرەنجامەکانی قەیرانی موشەکیی کوبا، ئاماژە بە پێداگریی فەرەنسا لەسەر دروستکردن و تاقیکردنەوەی چەکە ناوەکیەکان و، هەروەها چوونەدەری وڵاتی ناوبراو لە ڕێککەوتننامەی ناتۆ بکرێ. ژەنەراڵ دۆگۆل، سەرۆک کۆماری فەرەنسا، پشتیوانی لە تیۆری ئەورووپای سەربەخۆ کرد. کەنێدی ڕەخنەی لە سیاسەتە بەرگرییەکانی ئەمەریکا لە سەردەمی ئایزنهاڤێر دەکردو، و، پێیوابوو کە ناوبراو لە ڕادەبەدەر پشتی بە هێزی بۆمبە ئەتۆمیەکان بەستبوو. ئەو دەیویست لە هەموو بوارەکاندا دەستی بە ڕووبەڕوو بوونەوە و بەربەرەکانیکردن لەگەڵ هێرشی کۆمۆنیستی ڕابگا. کەنێدی لەم بوارەدا دەستی بە دروستکردنی " کڵاوسەوزەکان" کرد تاکوو بە هێزی دژە شۆڕشی خۆیان بۆ پووچەڵ کردنەوەی شۆڕش، یان ڕاپەڕینەکان لە دارستانەکانی ئاسیا یان کێوەکانی ئەمەریکای باشوور، زەبری کۆتایی لە هێزە ئازادیخوازە نەتەوەییەکان بوەشێنن.

هێزی دژە شۆڕشی کەنێدی وابڕیار بوو بە خەڵک نیشان بدا کە، لە نێوان داگیرکاریی فیۆدالی و کۆمۆنیزمی سەرەڕۆدا، هێڵێکی ناوەندی بەناوی لیبراڵ هەیە. بە بڕوای کەنێدی، کاتێک کە ئاسیا ییەکان، ئەفریقیەکان و ئەمەریکیەکان بۆیان دەرکەوێ کەلایەنێکی لیبراڵ هەیە، بۆخۆیان کۆمۆنیزم توور هەڵدەدەن.

لە ڕوانگەی کەنێدییەوە، ڤێتنام شوێنێکی گونجاو و لەبار بۆ تێکهەڵچوون بوو. ناوبراو لەوێدا دەیتوانی هۆگری خۆی بە جیهانی سێهەم نیشانبداو، بیسەلمێنێ کە ئەمەریکا لەسەر بەڵێنەکانی خۆی سوورە. بەم شێوە، سوپای ئەمەریکای تووشی گەورەترین شەڕەکانی مێژووی مرۆڤایەتی کرد. ڕووخاندنی ڕژێمی نیگۆدین دیم، سەرۆک کۆماری ڤێتنامی باشوور، ئاگری شەڕەکەی خۆش کرد. سێ حەوتوو دوای مردنی دیم، کەنێدی خۆی لە ڕۆژی ٢٢ی تشرینی دووهەمی ١٩٦٣ لە شاری دالاس ((تەگزاس) کوژراو، لیندۆن جانسۆن، جێگری ناوبراو پۆستی سەرۆک کۆماری بەدەستەوە گرت. ناوبراو هەروا سیاسەتی کەنێدی لە ڤێتنامدا درێژە پێدا.

ڕێبازی سیاسی کەنێدی لە هێندێک لە وڵاتانی جیهانی سێهەمدا، پێویستی بە شتێ دیکە بوو. بۆ وێنە : ڕووداوەکانی دۆمینیکێن دوای کوژرانی ترۆخیلۆ، سەرۆک کۆماری ئەو وڵاتە (١٩٦١) بوو بە هۆی ئەوی کە کەنێدی سێ ڕێگاچارە (ئەڵتەرناتیڤ) کە بەوتەی خۆی بە پێی گرنگیی هەر کامەیان بریتی بوون لە : پێکهێنانی ڕژێمێکی دێمۆکراتیکی بە پرەستیژ؛ هێنانە سەرکاری ڕژێمێکی وەک ڕژێمی ترۆخیلۆ؛ یان هێنانە سەرکاری ڕژێمێکی وەک ڕژێمی کاسترۆ.

به بروای ناوبراو، " ریگا چارەی یەکەم لە دووانەکەی تر زۆر باشترە.بەلأم هەتا کاتیک دلنیا نەبین کەرەنگەتووشی ئەلتەرناتیفی سیهەم دەبین، ریگا چارەی دووهەم رەت ناکەینەوە."ئەم تیروانینە، روانگەی ئەمەریکا و کەنیدی بەرامبەر بە جیهانی سیهەم دەردەخا.

کەنیدی دەیویست دیمۆکراسی هەبێ، بەلأم ئەگەر دەولەتیکی شۆرشگیر تووخمی سۆسیالیستی لە خۆ بگرتبا، یان ئەوەی کە مەترسی ئەوە هەبوایە کە دەبیتە ولأتیکی کۆمۆنیستی؛ ناوبراو دیکتاتۆری پەسند دەکرد، کە لە دوارۆژدا شتیکی بۆ بکردنایە. لە هەمووی گرنگتر، سووربوونی ناوبراو بوو لە سەر ئەوەی کە رووسەکان وەدەربنێ و، نفووزی سیاسی و ئابووریی ئەمەریکا پاریزێ. کەنیدی هەروەها سەرکردە بەکریگیراوە دیکتاتۆرەکانی جیهانی سیهەمی دەخستە ژیر گوشارەوە، تاکوو شۆرشی سەوز (دابەشکردنی زەوییەکان) بکەن و، لە بوارەکانی کۆمەلأیەتیشەوە دەست بە شۆرشی " سپی" بکەن، تاکوو گیرۆدەی شۆرشی خەلک نەبنەوە. لەو ولأتانەی کە بوار بۆ چەپ رەخساوە، نەهیلێ بچنە ناو باوەشی کۆمۆنیزمەوە.

لەو پیناوەدا، ریگای بە چالاکی هیزە نەتەوەییە غەیرە کۆمۆنیستەکان دەدا، تاکوو ئەجۆرە رژیمانە حکومەتی پارلمانی پەسند بکەن و، پیکەو کەسایەتیەک بۆخۆیان پیکەوە نین.

## ریبازی سیاسی کەنیدی ـ وەمەک نامارا *Kennedy- Mc Namara Doctrine*

ئەم ریبازە بە هەلویستیکی نەرم بەناوبانگە، بریتیە لەوەی کە لەگەلْ هیرشی سۆڤیەتدا، ئەمەریکا دەستبەجێ و بە شیوەیەکی بەرفراوان دەست بە هیرشیکی ئەتۆمی لە دژی سوڤیەت ناکا، بەلکوو سەرەتا لە ریگای هیزە ئاساییە نائەتۆمیەکان، بەری بە هیرشی سۆڤیەت دەگرت. ئەمە هەلیکی باشە بۆئەوەی کە لەگەلْ رووسەکاندا لە بواری سیاسییەوە وتوویژ بکرێ و، مەترسی شەریکی ئەتۆمیان بە گوێ دا بدرێ و، ئەگەر ئەم وتوویژانە بێ کەلک بوون، ئەوکاتە لە هیزی ئەتۆمی کەلک وەرگرن. ئەم ستراتیژییە پیویستی بە بەهیزکردنی هیزی دووهەمی زەبروەشینی ئەمەریکا و بەرفراوانکردنی هیزە نەریتیەکانی ناتۆ هەبوو و، مەبەستیش ئەوە بوو کە رووسەکان بەهەر شیوەیەک کە شەر دەست پێ بکەن، ئەوا ناتۆ توانایی بەربەرەکانی و وەلأمدانەوەی ئەو هیرشەی دەبێ.

### ڕێبازی سیاسیی گۆرباچۆف — *Gorbachev Doctrine*

بە ڕێباز وڕێچکە سیاسیەکانی میخائیل گۆرباچۆف، دواپین سەرۆک کۆماری یەکیەتیی سۆڤیەت لە نیوان ساڵەکانی ١٩٨٥ هەتا ١٩٩١ ( تاکوو هەڵوەشانەوەی سۆڤیەت) دەگوترێ. دوای مردنی لێۆنید بێرژنێف (١٩٨٢)، مەکتەبی سیاسیی سۆڤیەت، یۆری ئاندرۆپۆف، سەرۆکی " K G B"ی وەک جێنشێنی ناوبراو دیاری کرد. ناوبراویش دوای پازدەمانگ کۆچی دوایی کردو، جێگای خۆی بە کۆنستانتین چرنینکۆف کە بە " سێبەری بیرژنێف" دەژمێردرا، بەخشی. چرنینکۆف لە ئاندرۆپۆف پیرتر و نەخۆشتر بوو و، دوای سێزدە مانگ سەرۆکایەتی، لە دەی مانگی مارتی ساڵی ١٩٨٤دا، کۆچی دوایی کرد.

لەو سەردەمەدا سۆڤیەت تووشی قەیرانی مردنی سەرۆکەکانی بیوو و، بە ئاشکرایی هەست بە نەبوونی سکرتێری گشتی لە گۆڕپانی سەرکردایەتیدا دەکرا. مردنی سێ سکرتێری گشتی لە ماوەی کەمتر لە چوار ساڵدا و کۆچی دوایی ٦ کەسی تر لە ئەندامانی پۆلیت بورۆ (مەکتەبی سیاسی)، هەلێکی لە باری بۆ هاتنە گۆڕەپانی ڕێبەرە گەنجترەکان رەخساندو، هەر بەو پێیە گۆرباچۆف وەک ڕیبەر و پێشەنگی بەرەی سێهەمی شۆڕش، لە لایەن گرۆمیکۆ، وەزیری دەرەوەی ئەوکاتی سۆڤیەت بە پاڵێوراوی سکرتێری گشتی حیزبی کۆمۆنیست دەست نیشانکرا.

واپێدەچوو کە هۆکارەکانی خوارەوە بوون بە هۆی ئەوی کە گۆرباچۆف بە شێوەیەکی ئاوا خێرا لە دەزگای بەڕێوەبەریی سۆڤیەتدا گەشە بکا:

١ــ پێوەندی لەگەڵ بەرپرسە باڵاکانی حیزب لە ساڵەکانی ١٩٥٠ هەتا ١٩٦٠.

٢ــ نیشاندانی بەهرە تاکەکەسی و لێهاتوویی و شارەزایی سیاسی و ئابووری لە ماوەی ساڵەکانی ١٩٧٠ هەتا ١٩٨٠.

٣ــ پشتیوانی هەمەلایەنەی تەکنۆکراتەکانی بەرەی سێهەمی شۆڕش بە هۆی تایبەتمەندیی هاوبەشی نێوانیان، کە نەیارەکانی تری حیزب لێی بێبەش بوون.

٤ــ مردنی کۆنە سەرکردەکان کە شوێنی زیاتری بۆ گەنجترەکان ئاوەڵا کرد.

ناوبراو دوابەدوای بەدەسەڵات گەیشتنی، گۆڕانکارییەکی بەربڵاوی لە ئەندامانی مەکتەبی سیاسی، کۆمیتەی ناوەندیی حیزب، حیزبە کۆمۆنیستەکانی پازدە کۆمارەکە، ئەنجوومەنی وەزیران،

فەرماندەرانی سوپا و ئۆرگانەکانی تردا پێکهێنا. ئەم کارە چەندین گۆڕانکاری لە سیاسەتی نێوخۆ و دەرەوەی سۆڤیەتدا پێکهێنا کە ئاماژە بە هێندێکیان دەکەین:

سیاسەتی نێوخۆیی: ئەم سیاسەتە پێشکەوتنی کۆمەلآیەتی و ئابووری سۆڤیەتی خێراتر دەکرد. بە بڕوای بەرپرسانی ئەو ولآتە، ئەم سیاسەتە ڕێبازی ستراتیژیکیی سۆڤیەتی پێک دەهێنا.

بەپێی بڕیارەکانی کۆمیتەی ناوەندیی حیزب، دەبوایە زیاتر لە ٢٠٠میلیارد ڕووبڵ لە پلانی پێنج ساڵەی ئاوەدانکردنەوەدا بۆ نۆژەنکردنەوەو نۆیکردنەوە و ئامادەکردنی تەکنیکی بەرهەمهێنان تەرخان کرابا. بەپێی ئەم سیاسەتە، خێراکردنی پرۆسەی بەرهەمهێنان و ئەلەکترۆنیزەکردنی بەربلآو و ئۆتۆماتیزەکردنی کەرەسە تەکنیکیەکان و کەڵک وەرگرتن لە کۆمپیوتەر پێش بینی کرابوو.

مەسەلەی خۆراک و دابینکردنی بڕی پێویستی خۆراک یەکێک لە گرفتەکانی سۆڤیەت بوو، کە بەپێی بڕیاری کۆمیتەی ناوەندیی حیزب دەبوایە" لە کورتترین هەلی ڕەخساو دا" چارەسەر بکرێ. کۆمیتەی ناوەندی لە سەر ئەو بڕوایە بوو کە دەبێ گۆڕانکارییەکی گرنک و بنەڕەتی لە بواری کشت و کاڵدا پێک بێ و، لەو بوارەشدا ئاشکرای کرد کە قەرەبووکردنەوەی ئەم دواکەوتووییە، کیسەلآنە بەڕێوە دەچێ.

ئامانج و ئاراستە گشتیە ستراتیژییەکانی سۆڤیەت لە پانتایی سیاسەتی دەرەوەدا:

گرنگترین خاڵەکانی ئەو سیاسەتە کە لە ساڵی ١٩٨٦دا لە لایەن گۆڕباچۆفەوە ڕاگەیەندران، بریتین لە :

١ــ لە نێوبردنی هەموو کەرەسە ناوەکیەکان تاکۆتایی ئەم سەدەیە. [سەدەی بیستەم .و]

٢ــ پیرەوی لە ڕێبازی پێکەوە ژیانی ئاشتیانە.

٣ــ پێشگیریکردن لە گوازرانەوەی پێشبڕکێی چەک و چۆڵ بۆ بۆشایی ئاسمانی.

٤ــ وەدەرنانی هێزەکانی سۆڤیەت لە ئەفغانستان بەپێی خشتەیەکی زەمەنیی دیاریکراو.

٥ ــ هاوکاریکردن لە بواری کەمکردنەوەی ئالۆزی.

٦ــ ڕەتکردنەوەی تیرۆریزمی نێودەوڵەتی.

٧ــ درێژەدان بە ڕێککەوتننامەی ڤەرشۆ.

٨ــ باشترکردنی پێوەندییەکان لەگەڵ چینی کۆمۆنیست .

بە بڕوای گۆرباچۆف، بنەماکانی" سیستەمی کۆمەڵگای نێونەتەوەیی" بریتین لە:

**١ــ لە بواری سەربازییەوە:**

ــخۆبواردنی دەوڵەتە خاوەن چەکە ناوەکیەکان لە شەڕ لەگەڵ یەکتردا.

ــ کۆتایی هێنان بە تاقیکردنەوە ناوەکیەکان.

ــ کەمکردنەوەی تێچووە سەربازییەکانی وڵاتان بۆ ڕێژەیەکی گونجاو.

**٢ــ لە بواری سیاسییەوە:**

ــ نەهێشتنی قەیرانە نێونەتەوەییەکان.

ــ پێشگیریکردن لە تیرۆریزمی نێودەوڵەتی.

**٣ــ لە باری ئابوورییەوە:**

ــ خۆبواردن لە سیاسەتی گەمارۆ و سزای ئابووری، بە مەرجێک لە لایەن کۆمەڵگای نێودەوڵەتیەوە پێشنیار نەکرابێ.

ــ چارەسەری کێشەی قەرزەکان.

ــ بەشداریی هاوبەش لە لێکۆڵینەوە و کەڵکی ئاشتیانە لە ئاسمان.

بە بڕوای شارەزایان، بەڕێوەبردنی سیاسەتەکانی بەناو گلاسنۆست و پرۆسترۆیکا لە لایان گۆرباچۆفەوە بواری لەبەریەک هەڵوەشانی سیستەمی سۆڤیەتی لە ماوەی ساڵی ١٩٩١دا ڕەخساند.

### ڕێبازی سیاسیی مونرۆ — *Monroe Doctrine*

ئەم زاراوەیە  بە ڕێبازی سیاسیی جیمز مۆنرۆ، سەرۆک کۆماری ئەمەریکا دەگوترێ کە بۆ یەکەمین جار لە ڕیکەوتی دووی کانوونی یەکەمی ١٨٢٣ لە پەیامێکدا بۆ کۆنگرەی ئەمەریکا ڕاگەیەنرا. سیاسەتی مۆنرۆ لە چوار بەش پێک دەهات کە ئامانجی دوو بەشی یەکەم، پێوەندی بە کەمکردنەوەی چالاکیەکانی هێزە ئەوروپییەکان و، دوو بەشی دووهەمیش پێوەندی بە چالاکیەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاوە هەبوو. دوو بەشی یەکەمی سیاسەتی ناوبراو بریتی بوون لە:

١ــ نابێ لەمەولاوە کیشوەری ئەمەریکا نابێ ببێتە پاشکۆی هیچ وڵاتێکی ئەورووپی.

٢_ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا هەرجۆرە هەوڵێک بۆ پەرەپێدانی سیستەمە سیاسیەکانی ئەوروپا لە هەربەشێک لە نیوگۆی ئەمەریکادا بە دژی ئاشتی و ئاسایشی خۆی دەزانێ .

دوو بەشەکەی تر کە تارادەیەکی زۆر هەتاکوو تێوەگلانی ئەمەریکا لە شەڕی یەکەمی جیهانیەوە جێبەجێ نەکران، بریتی بوون لە:

١_ خۆتێوەرنەدانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە کۆلۆنیەکانی ئەوروپا، جگە لە خوودی کیشوەری ئەمەریکا نەبێ.

٢_ خۆتێوەرنەدانی ئەمەریکا لە شەڕی نێوان هێزە ئەوروپیەکان لە سەر کێشە نێوخۆییەکان

سیاسەتی مۆنرۆ لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا وای لێهات کە ئەمەریکا خۆی بەژاندارمی ئەمەریکای باکوور و ئەمەریکای باشوور دەزانی و، ئەم کارە بوو بە هۆی سەرهەڵدانی ئاڵۆزیەک لە پێوەندییەکانی نێوان ئەو وڵاتە و وڵاتانی ئەمەریکای لاتین.

بە بڕوای کاربەدەستانی ئەمەریکا، سیاسەتی مونرۆ هەروا بە یەکێک لە پرەنسیپە سەرەکیەکانی سیاسەتی دەرەوەی ئەمەریکا دەژمێردرێ.

## ڕێبازی سیاسیی نیکسۆن(١٩٧٤-١٩٦٨) *Nixon Doctrine*

ئەم ڕێبازە سیاسیە بۆ یەکەمجار لە ساڵی ١٩٦٩ لە لایەن ریچارد نیکسۆن، سەرۆک کۆماری ئەوکاتی ئەمەریکا لە " گوام" ڕاگەیەنرا، کە دەربڕی گۆڕانی ڕۆڵی دژە شۆڕشیی ئەمەریکا لە شەڕکردن بە قازانجی ڕژیمێکی لە حاڵی شەڕدا _ وەک ڤێتنام _ بۆ دابینکەری پێداویستی و ڕاهێنانی بەرفراوان و هەمەلایەنەی کڕیارانی ناوچەیی بوو. لە قۆناغی بە ڤێتنامی کردنی شەڕی ڤێتنامدا، کیسەنجەر وەزیری کاروباری دەرەوەی ئەمەریکا، بە دوای پێکهێنانی" پێوەندیی تایبەت" لەگەڵ وڵاتە سەرکیەکانی جیهانی سێهەمدا بوو، چوونکە لەمەوبەدواوە دەبوون بە هاوپەیمانە بچووکەکان لە کردەوەی ئەستەمی بەڕێوەبەریی ئیمپریالیستیدا. لە هەل و مەرجەدا بوو کە بیری" زلهێزە ناوچەییەکان" لە دایک بووو، ئێران لە پاڵ بەرازیل، ئەندەنۆسیا، ئیسرایل و پورتوگال، وەک یەکێک لە گرنگترین پاڵێوراوانی ئەو ڕۆلە هەڵبژێردرا.

ویلایەتە یەکگرتەوەکانی ئەمەریکا لەبەر ئەو هۆیانەی خوارەوە هەوڵی داوە تاکوو سنووری دەسەڵاتی جیهانی خۆی بۆ ناوچەی مەدیتەرانە و زەریای هیند بگوازێتەوە:

١ــ پەرەگرتنی دزەکردنی سۆڤیەت لە ناوچەی گرنگ و ستراتیژی و پڕ لە نەوتی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست و مەدیتەرانە.

٢ــ بە لوتکەگەیشتنی بزووتنەوە رزگاریدەرەکان لە ئەنگۆلا، مۆزامبیک، زیمبابووە، ئەریتریا، فەلەستین و عەممان دا.

٣ــ بوژاندنەوەی دەسەڵاتی ئەمەریکا بۆ پاراستنی پێگەکەی لە سیستەمی جیهانیدا لە بەرامبەر ئەورووپای رۆژئاوادا.

هەر بۆیە پێکهێنانی تۆرێکی پتەو لە هاوپەیمانانی ئەمەریکا لە ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست و باشووری ئەفریقیادا کە لە لایەن ئەمەریکاوە پشتیوانیان لێدەکرا، بوو بەبناغەی سەرەکی ئەم ڕێبازە سیاسیە.

داوابەدوای سەفەری نیکسۆن بۆ تاران (١٩٧٢)، کیسەنجەر داوای لە وەزارەتی بەرگری کرد تاکوو هەرجۆرە کەرەسەیەکی شەڕو بەهەر رادەیەک کە حکومەتی ئێران پێویستی پێی هەبێ، بە ئێران بدا. ئێران لە زۆر بوارەوە، هەڵبژاردەیەکی بێ وێنە بوو بۆ ڕێبازی سیاسیی نیکسۆن. ڕژێمی شا بە هەبوونی پاڵنەری هەستی " بەرپرسیایەتی ناوچەیی" پێوەندییەکی گەرم و گووڕی لەگەڵ ئەفریقیای باشوور و ئیسراییلدا دامەزراند و، پێوەندییەکی گرنگی لەگەڵ عەرەبەستان و شێخەکانی کەنداوی فارسیشدا پێکهێنا. دوای چوونەدەری هێزە سەربازییەکانی بەریتانیا لە کەنداوی فارس، ڕژێمی شا پێی خۆش بوو بۆشاییە پڕ بکاتەوە. چوار هێندەبوونی نرخی نەوت لە نێوان شەڕی تشرینی یەکەمی عەرەبەکان و ئیسراییل (١٩٧٣)دا، خەریک بوو خەونی ڕژێمی شای ئێران وەدی بێنێ.

ئاستی کرینی کەرەسەکانی شەڕ لە ئەمەریکا لە ١٠ ملیۆن دۆلار لە ساڵی ١٩٥٠ بۆ ١/٣ میلیارد دۆلار لە ساڵی ١٩٧٦دا زیادی کرد؛ بە شێوەیەک کە لە سەردەمی ڕووخانی ڕژێمی شا دا دەبوایە بەڕادەی ١٢/١ میلیارد دۆلار لە پێشکەوتووترین چەک و چۆڵی سەربازیی جیهان نێردرابایە بۆئێران.

بنەمای ڕۆڵی ناوچەیی ڕژێمی شا، بەپێی ڕێبازی سیاسیی نیکسۆن بریتی بوو لە:

١ـ تێکدانی هاوسەنگیی سەربازی بە زیانی گوشارەکانی ناسۆنالیستیی رادیکالٚ، بەتایبەتی لە کەنداو دا.

٢ـ سەرکوت کردنی راپەرینی "ڤفار" (١٩٧٥ـ ١٩٧٣).

٣ـ بەشداری لە هێرشە سەربازییەکانی پاکستان لە بەرامبەر هێزە نەیارەکان لە بلوچستان دا.

٤ـ هاوکاریکردنی سۆمالی لە شەڕ لەگەلٚ ئیتیۆپیدا. ئەم کارانە برێکی کەم لە هێزی سەربازیی هێزە چەکدارەکانی رژێمی شای بە خەلٚکی دنیا نیشان دا. رژێمی شا لە ناوچەدا بە تەواوکەری رۆلٚی ئیسرائیل دەژمێردرا.

لە نێوەڕاستەکانی سالٚی ١٩٧٤دا بە رووخانی رژێمەکانی پورتوگال، ئەتیۆپی و یۆنان (کەلە لایەن ئەمەریکاوە پشتیوانیان لێ دەکرا)، تەوەری رێبازی سیاسیی نێکسۆن بەکردەوە هەلٚوەشایەوە.

## Aryan Clause

### رەسەنایەتیی ئاریا

بە ماددەیەکی یاسایی دەگوترێ کە لە مانگی حوزەیرانی سالٚی ١٩٣٣ لە پێناو سیاسەتەکانی هەلاٚواردنی رەگەزیی نازییەکان پەسند کرا. بەپێی ئەم یاسایە بەشداریی جوولەکەکان لە چالاکیە کولتوورییەکان بۆ وێنە بەرهەمهێنانی فیلم و بەشداری لە شانۆدا قەدەغە کرابوو.

## Reform

### ریفۆرم

چاکسازی یان ریفۆرمە سیاسیەکان یەکێک لە هۆکارە سەرەکیەکانی گۆڕانکارییە سیاسیەکانن. ریفۆرمەکان رەنگە لە سەرەتادا تایبەت بە بوارێکی بۆ وێنە دابەشکردنی زەوییەکان بن، بەلاٚم دواتر بەرفراوانتر دەبن. لەو ولاٚتانەی کە دەرەتانی ئەوەیان نەبووە لە خوارەوەڕا شۆڕش و راپەڕین بکەن، بەڕێوەبردنی رێفۆرمەکان لە سەرەوە جێگای شۆڕشیان گرتۆتەوە. ریفۆرمەکانی میجی لە ژاپۆن لە سالٚی ١٨٦٨، ریفۆرمە بە ناوبانگەکانی بیسمارک لە ئەلٚمانیا و، ریفۆرمەکانی ئەم دواییانەی گۆرباچۆف لە یەکیەتیی سۆڤیەتی پێشوو، دەرەنجامی گەورەو شۆڕشگێڕانەیان بەدواوە بووە. هەر بۆیە رەنگە هێندێک ریفۆرم لە هێندێک لە شۆڕشەکان کاریگەرتر بن. لە بارەی هەل و مەرجی ریفۆرمەکانەوە دەبێ بگوترێ کە بەڕێوەچوونی ریفۆرمەکان پێویستی بە جۆرێک کەلێن و

لێکدابڕان لە نێو چینی دەسەڵاتدار و، سەربەخۆیی ریفۆرمیستەکان لەو تاقمانەی کە ڕەنگە لە ڕەوتی ریفۆرمەکاندا زەرەبەیان لێ بکەوێ، هەیە. پاشاکان، هێزە سەربازییەکان و بەشێک لە چینی ئاریستۆکرات و رۆشنبیران لە ولاّتە جۆراجۆرەکاندا، لە ریفۆرمە سیاسیەکاندا رۆڵیان هەبووە.

سەرکەوتنی ریفۆرمەکان بۆوێنە پێویستی بەوە هەیە کە لە هەلومەرجی لەباردا جێبەجێ بکرێن. کاتێک رژێمە سیاسیەکان تووشی قەیرانێکی ئاشکراو لەرادەبەدەر بن، ریفۆرمەکان لە پێگەیەکی لاواز و وەک دژکردە لە بەرامبەر قەیرانەکەدا جێبەجێ دەکرێن و، هەربۆیە ڕەنگە ریفۆرم بۆ خۆی کاریگەری لەسەر تەشەنەکردنی قەیراندا هەبێ و، دەرەنجامی نەخوازراوی لێ بکەوێتەوە. بەڵام کاتێک ریفۆرم لە هەلومەرجی ئاساییدا و بەرلە سەرهەڵدانی قەیران جێبەجێ بکرێ، ئەوکاتە کاریگەرییەکی زیاتری هەیە. سەبارەت بە جۆری ئەو سیستەمانەی کە ریفۆرمیان تێدا جێبەجێ دەکرێ، دەبێ رژێمە داخراو و ئۆتۆریتەخوازەکان لە رژێمە دیمۆکراتیکەکان جیا بکەینەوە. رژێمە داخراوەکان لەم لایەنەوە زوو زەرەبەیان لێ دەکەوێ و، ڕەنگە چەند ریفۆرمێک، بەرە بەرە دەسەڵات و کۆنترۆلی رژێم لاواز بکاو، بەدنەدان و پشتیوانی و بەهێزکردنی نەیارانی رژێم، ببێ بە هۆی رووخانی رژێم . بەڵام بە پێچەوانە، سیستەمە دیمۆکراتیکەکان لە بەرامبەر ریفۆرمدا چاکتر خۆیان رادەگرن. لە بواری جۆری ریفۆرمەوە، ڕەنگە ئامانجی ریفۆرمە سیاسییەکان وەڵامدانەوە بە قەیرانی رەوایی رژێم و بوژاندنەوەی بنەماکانی دەسەڵاتی رژێم یان وەڵامدانەوە بە قەیرانی بەشداریکردن و بەرفراوان کردن و بەهێزکردنی دەلاقەی بەشداریی گشتی لە سیاسەتدا بێ. هەروەها، ڕەنگە ریفۆرمەکان بۆ بە هێزکردنی توانایە جۆراجۆرەکانی دەوڵەت لە کاری کۆکردنەوە و دابەشکردنی سەرچاوە جۆراوجۆرەکان بێ. زۆربەی کاتەکان ریفۆرمە ئابوورییەکان لە بواری دابەشکردنی دادپەروەرانەی سامان و کەمکردنەوەی دژایەتی و ناهاوسەنگیە کۆمەڵایەتیەکان، تایبەتمەندیی سیاسی بە خۆیەوە دەگرێ و، سەرچاوەکانی دەسەڵات و ئیمتیازەکان ناچار بە یەکگرتن دەکا. سەرکەوتنی ریفۆرمخوازان زیاتر پێویستی بە هاوکاریی بەشە سەرەکیەکانی هێزە نەیارو ریفۆرمخوازەکانی دەرەوەی چوارچێوەی دەسەڵاتی سیاسی هەیە.

هێندێک لە نووسەران، پێیانوایە ریفۆرمەکان لە بەرامبەر شۆڕشەکاندان ، لە حاڵێکدا کە قووڵبوونەوەی شۆڕشەکان، زیاتر پێویستی بە ریفۆرم لە سەرەوە هەیە. سەبارەت بە پێوەندیی نێوان ریفۆرم و شۆڕش، ریفۆرمەکان ــ هەروەک ئاماژەمان پێکرد ــ ڕەنگە هاندەری شۆڕش بن و

رەوتی شۆڕش خێراتر بکەن یان ببنە هۆی لەبەریەک هەڵوەشانی ڕژێمە سیاسییەکان. هێندێک لە ریفۆرمە سیاسی و بەرتەسکەکان لە ماوەیەکی زۆر کەم لە پێش سەرهەڵدانی شۆڕشەکان هاتوونە ئاراوە. لە هەل و مەرجی جۆراوجۆردا، ڕەنگە ریفۆرم بەر بە سەرهەڵدانی شۆڕش بگرێ، هەروەک چۆن لە زۆربەی وڵاتانی ئەورووپیدا کە شۆڕش وراپەڕینیان بەخۆوە نەدیوە، دەسکەوتی هاوشێوەیان بە هۆی ریفۆرمەوە وەدەست هێناوە. لە سۆنگەی ئەوەی کە ریفۆرمەکان لە نێو سیستەمە نەریتی، یان لە نێو سیستەمە دیمۆکراتیک یان سیستەمە ئایدۆلۆژییەکاندا روو دەدەن، پۆلێن بەندی بکەین. ریفۆرمەکان لە سیستەمە دیمۆکراتیکەکاندا، بەشێک لە پرۆسەی ئاسایی سیاسی پێک دێنن و، سەقامگیری و کارامەیی زیاتر بە سیستەمەکە دەبەخشن. بەڵام ریفۆرم چ لە سیسستەمە نەریتی و چ لە سیستەمە ئایدۆلۆژییەکاندا بەواتای چوونەدەر لە پرۆسەی ئاسایی سیاسی دەژمێردرێ و، بۆیە ریفۆرمەکان مەترسی و ناسەقامگرتوویی سیاسی دەخوڵقێنن.

### *ڕاگەیاندنی یەک لایەنەی سەربەخۆیی*
### *Uhilateral Declaration Of Independence*

ڕاگەیاندنی یەک لایەنەی سەربەخۆیی لە هەولی دەوڵەتی " بەرەی روودزیا" بەریەرایەتی یان سمیت، سەرۆک وەزیرانی ئەوکاتی ئەو وڵاتە دەچێ، کە لە ڕێکەوتی ١١ی تشرینی دووهەمی ١٩٦٥ یەک لایەنانە سەربەخۆیی ئەو وڵاتەی ڕاگەیاند. بەریتانیا دژی ئەو هەوڵەی دەوڵەتی روودزیا ڕاوەستاو، لە لایەن ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکانیشەوە، مەحکووم کرا.

### *ڕاگەیەنراوی بنەماکانی یاسا نێودەوڵەتیەکان سەبارەت بە پێوەندی و هاوکاریی دۆستانە لە نێوان دەوڵەتان دا*
### *Declaration On Principles Of International Law Concerning Friendly Relations And Cooperation Among States (١٩٧٠)*

بە پاشکۆی بڕیارنامەی ژمارە ٢٦٢٥ی کۆمەڵەی گشتی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان دەگوترێ لە ساڵی ١٩٧٠دا بەمەبەستی هاندان، پەرەپێدان و پیادەکردنی مافە نێودەوڵەتیەکان، بە بێ دەنگدان، لە لایەن کۆمەڵەی گشتییەوە پەسند کرا. ئەو ڕاگەیەنراوە ئەو

خاڵە بەرچاوانە لە خۆ دەگرێ کە ئەندامانی ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان لەسەریان کۆکن. بۆوێنە خۆبواردن لە هەڕەشە یان کەڵک وەرگرتن لە هێز، چارەسەری ئاشتیانەی کێشە نێودەوڵەتیەکان، بەشداریکردن لە کاروباری نێودەوڵەتیدا، بەپێی نێوەڕۆکی جاڕنامەی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان، دەست تێوەرنەدان لە کاروباری نێو خۆیی وڵاتەکان، هەبوونی مافی بەرامبەرو یەکسان و دیاریکردنی مافی چارەنووس، بنەمای یەکسانیی وڵاتان و جێبەجێکردنی بەڵێننامە نێونەتەوەییەکان.

### راگەیەنراوی باڵفۆر — Balfour Declaration

ڕاگەیەنراوی دەوڵەتی بەریتانیایە کە لە لایەن باڵفور، وەزیری دەرەوەی بەریتانیا مۆر کرا. ئەو ڕاگەنراوە وەکوو نامەیەک بۆ لۆرد ڕۆچیڵد نوسرابوو و لە ڕێکەوتی دووی تشرینی دووهەمی ١٩١٧ بلاو بۆوە. لەو ڕاگەیەنراوەدا هاتووە:

"دەوڵەتی خاوەن شکۆ پێی خۆشە دەوڵەتی نیشتمانیی جوولەکە لە فەلەستین دامەزرێ و، ئەوپەڕی هەوڵی خۆی بۆ پێکهێنانی ئاسانکاری بۆ گەیشتن بەو ئامانجە وەگەڕ دەخاو، لە هامان کاتدا هیچ کردەویەک ناکا کە بە پێچەوانەی مافە شارستانی و ئایینیەکانی فەلەستینە غەیرە جوولەکەکان یان بە پێچەوانەی ماف و پێگەی سیاسی جوولەکەکان لە هەر وڵاتێکی تر بێ".

### راگەیەنراوی برازاڤیل — Brazzaville Declaration

ئەو زاراوە بەراگەیەنراوێک دەگوترێ کە بەپێی ئەو ڕاگەیەنراوە، شارڵ دوگول، ڕەسمیەتی بە "یەکیەتیی فەرەنسا" لە قۆناغی دوای شەڕدا بەخشی (١٩٤٤). بەم پێیە، ئەو کەسانەی کە لە نێو کۆلۆنیالەکانی فەرەنسادا دەیانویست ببن بە نوێنەری ئەنجوومەنی نیشتمانیی فەرەنسا، مافی هاووڵاتیی فەرەنسیان پێ دەبەخشرا. ئەوان لە هەمان کاتدا دەیانتوانی ببن بە ئەندامی ئەنجوومەنە نیمچە خودموختارەکانی هەرێمەکانیش.

### راگەیەنراوی برۆکسێل (١٩٨٨) — Brussels Declaration

راگەیەنراوێکە کە لە کۆتایی کۆبوونەوەی ڕێبەرانی ڕێکخراوی ناتۆ لە ٢ و ٣ی مارتی ١٩٨٨ لەگەڵ بەیاننامەی " کۆنترۆڵی چەکە ئاساییەکان " لە ژێر ناوی:"ڕێگای پێشکەوتووانەی دەستەبەرکردنی ئامانجەکانی ناتۆ " بۆ " وتوویژی سەقامگرتووی ئاسایی" کە لە ژێر کاریگەری بیرۆکەی "بەرگری ناهێرشبەرانە" بوو، بڵاو کرایەوە.

لەم کۆبوونەوەدا، ڕێککەوتننامەی ڤەرشۆ بە هۆی توانایی " هێرشی لە ناکاو" و توانای بەڕێوە بردنی "هێرشێکی گەورە و بەرفراوان" کەوتە بەر ڕەخنە . لەو بەیاننامەدا، لە سەر ئەوە پێداگری کرا کە دەبێ ئامانجی سەرەکی هێزە سەربازییەکان، تەنیا پێشگیریکردن لەشەڕهەڵایسان و دڵنیاکردنەوەی پرۆسەی بەرگری ڕەوا بێ، نەک ئەوەی ببن بە ئامرازێک بۆ هێرشکردن یان تۆقاندنی سیاسی و سەربازی.

## *راگەیەنراوی جیهانیی مافەکانی مرۆڤ* Universal Declaration Of Human Rights

ماف و ئازادییەکانی نێو ڕاگەیەنراوی جیهانی مافی مرۆڤ تێکەڵاوێکە لە کۆمەڵێک ماف و ئازادییەکانی مرۆڤ کە بەر لە دامەزراندنی ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان، لە نێو دەستوور و یاسای وڵاتە جۆراوجۆرەکاندا گونجێنرابوون. هەروەها، مێژووی شارستانیەتی مرۆڤ پڕبووە لە هەوڵ وتەقەللای پێغەمبەران، فەیلەسوفان و بیرمەندان و مرۆڤدۆستانی تری ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا بۆ پەرەپێدانی ماف و ئازادییەکانی مرۆڤ . ئەگەر بیرمەندانی ڕۆژهەڵات لە بواری چییەتیی حەقیقەت و ڕۆحی مرۆڤ و ئەرکە ڕەوشتی و مەعنەوییەکانی مرۆڤدا بەرهەمی بەپێز و پڕنێوەرکیان بە میرات بەجێ هێشتووە، ئەوا زانایانی ڕۆژئاوا ڕۆڵێکی گرنگیان لە دروستکردنی تیۆرەکانی پێوەندیدار بە پێوەندییەکانی حکومەت و خەڵک دا گێڕاوە و، دەتوانین زۆربەی ڕاگەیەنراو و بەڵگەکانی پێوەندیدار بە پشتیوانی لە مافە سەرەکییەکانی مرۆڤ لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدە بە دواوە، لە نێو دەستوور و یاساکانی تری وڵاتانی نێوەگۆی ڕۆژئاوادا بدۆزینەوە.

لە ساڵی ١٩١٥دا، بەریتانیا " جاڕنامەی مەزن" (Magna Charta)ی ڕاگەیاندو، ئەگەرچی ئەم بەڵگە مێژووییە کۆمەڵێک لە ماف و ئازادییەکانی بۆهەموو خەڵک مسۆگەر دەکرد، بەڵام مەبەست لە هەموو خەڵک لە ڕاستیدا وەکوو مافی فیودالی سەدەکانی نێوەڕاست بوو و، بە هیچ جۆرێک ڕەش ورووت و ڕەعیەتەکانی لە خۆ نەدەگرت. بۆوێنە یەکەمین یاسا کە پشتیوانی لە مافی

مرۆڤی لە خۆ گەرتبوو، دەتوانین ئاماژە بە جاڕنامەی مافی مرۆڤی ۱۷۷٦ی هەرێمی ڤیرجینیای ئەمەریکا و جاڕنامەیەکی هاوشێوەش لە ئەیالەتەکانی پێنسیلڤانیا، مەریلەند، دلاوەر، نیوجێرسی، کارۆلینای باکوور و باشوور، نیویۆرک و جۆرجیا بکەین. هەروەها ڕاگەیەنراوی سەربەخۆیی ئەمەریکا لە ساڵی ۱۷۷٦، پێوەلکاوەکانی دەستووری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە ساڵی ۱۷۹۱ و ڕاگەیەنراوی مافی مرۆڤی ڕێکەوتی ۲٦ی مانگی ئابی ۱۷۸۹ی فەڕەنساش لە بەڵگە گرنگە مێژووییەکانی پێوەندیدار بە پشتیوانیکردن لە مافەکانی مرۆڤ دەژمێردرێن. هەر بۆیە بۆ یەکەمین جار لە نیوەی دووهەمی سەدەی هەژدەهەم لە ژێر ناوی ڕێبازی لیبڕالیزمدا چەمکەکانی مافی مرۆڤ، دادپەروەری و پاراستنی کەسایەتی مرۆڤ کە بۆ سەردەمی رابردوو دەگەڕێتەوە، بە ڕەسمی کۆکرانەوەو،نووسرانەوە.

بەپێی ماددەی ۱ی جاڕنامەی مافی مرۆڤی ۱۷۷٦ی ئەیالەتی ڤیرجینیای ئەمەریکا، هەموو مرۆڤێک بەپێی بڕیاری سروشت سەربەست و سەربەخۆیەو، مافی زاتیی تایبەتی هەیە کە ناکرێ بەپێی هیچ جۆرە پەیمانێکی کۆمەلایەتی لەو مافانە بێ بەش بکرێ. ئەم مافانە بریتین لە مافی ئازادی و ژیان، مافی مڵکداریتی وێرای ئامرازەکانی وەدەستهێنان و داواکاریی هەموو خاوەندارەییەتیەک ـ هەموو دەسەلات و هێزی حکومەت هی خەڵکەو، لە خەڵکەوە سەرچاوە دەگرێ. حکومەت بۆ خێرو خۆشیی گشتی و پشتیوانی ودڵنیایی خەڵک پێکهاتووە. هەڵبژاردنەکان بەپێی تایبەتمەندیی زاتیی خۆیان دەبێ ئازاد بن و، دەبێ هەموو تاکەکان مافی هەڵبژاردن و دەنگدانیان هەبێ. دەبێ هەموو سەلاحییەتەکان لە بواری دارشتن و هەڵپەساردنی یاساکان لە بەردەستی خەڵک دابێ و، خەڵک لە ڕێگای هەڵبژاردنەوە ئەم دەسەلاتە دەدەن بە نوێنەرەکانی خۆیان. هەموو خەڵک خاوەنی مافی یەکسان بۆ بەڕێوەبردنی سەربەستانەی ڕێوشوێنە ئایینیەکانی خۆیان، بەپێی وێژدانی خۆیانن. حکومەت دەبێ پارێزەری ئازادییە چاپەمەنیەکان بێ کە یەکێک لە بنەما سەرەکیەکانی ئازادییە. لە هەموو دادگاییەکانداو بە تایبەتی ئەو دادگاییکردنانەی کە سزای مەرگ بەسەر تاوانبارندا دەسەپێنن. هەموو تاکێک مافی ئەوەی هەیە کە لە هۆکار و چییەتیی ئەو تۆمەتەی کە وەپاڵی دراوە، ئاگادار بکرێتەوەو، لەگەڵ شایەدەکان و وەپالنەرانی تۆمەتەکە ڕووبەڕوو بکرێتەوە و، هەروەها دەبێ مافی دادگاییکردنێکی بە ئاشکرای لە لایەن دەستەی دادپەروەری هەبێ کە لە کەسانی سەر بە چینی خۆی پێکهاتبێ. نابێ هیچ کەس ناچار بکرێ بە دژی خۆی شایەدی بدا. نابێ سزایەکی

بێرەحمانە و نایاسایی بەسەردا بسەپێ و، لە کۆتاییدا دەبێ حکومەت پشتیوانی لە خەڵک بکا و خۆشگوزەرانی و ئەوپەری بەختەوەریان بۆ دابین بکا.

راگەیەنراوی سەربەخۆیی ئەمەریکاش نموونەیەکی مافەکانی مرۆڤە، فەلسەفە و نێوەرۆکی ئەو راگەیەنراوە لە ژێر کاریگەریی جارنامەی مافەکانی مرۆڤدا دارێژراوە.

راگەیەنراوی مافی مرۆڤی ١٧٨٩ی فەرەنساش لە زۆر لایەنەوە لە دەستووری ئەیالەتە جۆراجۆرەکانی ئەمریکا دەچێ و، لە ژێرکاریگەری دەستووری ئەیالەتەکانی ئەمەریکا دارێژراوە. ماددەی ١ی ئەم راگەیەنراوە دەڵێ:

" هەر مرۆڤێک بە یەکسانی و بەسەربەستی لە دایک دەبێ و، بۆیە دەبێ لە هەموو ماوەی ژیانی خۆیدا لە ئازادی و یەکسانی کەڵک وەرگرێ". بەپێی ماددەی ٢ی راگەیەنراو: "مەبەست و ئامانجی کۆڕو کۆبوونەوە سیاسیەکان شتێک نیەجگە لە پاراستنی مافی تاکەکەسەکان و، ئەو مافانە بریتین لە ئازادی تاکەکەسی _خاوەنداریێ تاکەکەسی، ئاسایشی سەر و ماڵ، بەرەنگاربوونەوە لەگەڵ چەوسانەوە و زۆرداا؛مافی سەروەری لە خەڵکەوە سەرچاوە دەگرێ و، هیچ کەسێک لە تاکەکەسەکان و هیچ چینێک لە چینەکانی خەڵک ناتوانن دەسەڵات بەدەستەوە بگرن، مەگەر ئەوەی کە لە لایەن خەڵکەوە هەڵبژێردرا بن (ماددی ٣)، یاساناسێنەر و نوێنەری ئیرادەی گشتیەو، دەبێ هەموو کەسێک بۆ خۆی یان لە رێگای نوێنەرەکانیەوە لە دارشتن و دیاریکردنی یاساکاندا بەشدار بێ (ماددەی ٦). ناکرێ هیچ کردەیەک بە تاوان دابنرێ، مەگەر ئەوەی کە وەک تاوان ناسرابێ و پێناسە کرا بێ (ماددەی ٨). بەپێی ماددەی ١٠، بیروڕای سیاسی و ئایینی و فەلسەفی و . . ئازادە، بەمەرجێک کە دەربرینی ئەم بیروڕایانە نەبنە هۆێ خولقاندنی بشێوی و ئاڵۆزی. هەرکەسێک دەتوانێ بیروبۆچوونی خۆی لە رێگای چاپەمەنیەکانەوە بڵاو بکاتەوە و، لە شوێنە گشتییەکاندا دەری ببڕێ، بەڵام لە هەمان کاتدا کەڵک وەرگرتنی نابەجێ لەو مافە بە شێوەیەک کە یاسا دەستنیشانی کردووە، سزای بەدواوەیە. . .و، بەپێی ماددەی ١٥، کۆمەڵگا ئەو مافەی هەیە کە لە کاربەدەستانی دەوڵەت سەبارەت بە کارو ئەرکانیان بپێچێتەوە. تاکەکەسەکان مافی خاوەنداریێ سامانە گوازراوەو نەگوازراوەکانیان بە شێوەی تاکەکەسی یان بە کۆیی هەیە. هیچ کەس ناتوانێ دەستدرێژی بکاتە سەر سامانی خەڵک. بەڵام رەنگە ئەگەر بەرژەوەندی گشتیی کۆمەڵگا بخوازێ ئەوا رەنگە بەپێی یاسای لەخاوەنەکەی بسەنێرێتەوە.

ڕەوتی پەسندکردنی یاسا بابەتیەکان لە بواری مافی مرۆڤ لە وڵاتە جۆراوجۆرەکاندا هەتا سەدەی ١٩ هەروا درێژەی هەبووو، ئێستاش هەموو وڵاتە پێشکەوتووەکانی جیهان لە دەستووری خۆیاندا گونجاندوویانە. ئەگەر باس لە مافە سیاسیە و شارستانیەکان نەکەین ئەوا لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە لە دەستوورو یاساکانی تری وڵاتە جۆراوجۆرەکاندا، مافە ئابووریی، کۆمەڵایەتی و کولتوورییەکان هاتوونە گۆڕ. ئەمانەش لە پێویستیەکانی ژیانی سەدەی بیستەمەوە سەرچاوە دەگرن کە پێویستیان بە پشتیوانیکردنی دەوڵەت هەیە؛ وەکوو: مافی پەروەردە و خوێندن و ڕاهێنان، مافی کارکردن، مافی کەڵک وەرگرتن لە هاوکاریی گشتی لەکاتی بێکاری، پیری، نەخۆشی و لاوازیدا، مافی هەبوونی ژیانێکی گونجاو، مافی تەندروستی و بەگشتی ئەو مافانەی کە لە ماددەکانی ٢٢ هەتا ٢٧ی ڕاگەیەنراوی جیهانی مافی مرۆڤدا ئاماژەیان پێکراوە. ئەمڕۆکە زۆربەی دەستوور و یاساکانی تری وڵاتانی دنیا مافەکانی وەک مافی دابینکردنی کۆمەڵایەتی و مافی پەروەردە و خوێندن، مافی تەندروستی، مافی کار و جۆرەکانی تری مافە ئابووری و کۆمەڵایەتی و کولتوورییەکان بەڕەسمی دەناسن. هەر بەوشێوەی کە ئەو مافانە وەکوو مافە سیاسی و شارستانیەکان لە سەدەی ١٨دا لە ئەمەریکا و فەڕەنسا و دواتریش لە وڵاتانی دیکەی ئەورووپی و جیهاندا، وەک مافی مرۆڤ پەسند کران، ئەمڕۆکەش لە لایەن زۆربەی نزیک بە تەواوی وڵاتانی دنیاوە پەسند کراون.

بە لە بەرچاوگرتنی ئەو مەسەلە ئاماژە پێکراوەکانە، دەبینین کە بەر لە پەسندکردنی ڕاگەیەنراوی جیهانی مافی مرۆڤ، زۆربەی ئەو ماف و ئازادییانەی کە لەم ڕاگەیەنراوەدا گونجێندراون، لەوە بەپێش لە دەستوورو یاسای زۆربەی وڵاتانی جیهاندا هەبوون. هەربۆیە دەکرێ بگوترێ کە ڕاگەیەنراوی جیهانیی مافی مرۆڤ، تێکەڵاوێک لە ڕێوشوێنە یاساییە باوەکانی جیهان لە بواری مافی مرۆڤ و ئازادییە سەرکیەکانە؛ هە بۆیە ئەم ڕاگەیەنراوە، بەهایەکی بەنرختری لە بەهای بڕیارنامەیەکی ئاسایی کۆمەڵەی گشتیی ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان هەیە.

بەگشتی ئەو ماف و ئازادیانەی کە لە ڕاگەیەنراوی مافی مرۆڤدا ئاماژەیان پێکراوە، بە ئامانجی هاوبەشی هەموو کۆمەڵگا و دەوڵەتەکان و هەموو تاکەکەسەکان دادەنرێن و، ئەرکی سەرشانی هەموو لایەکە کە هەوڵ بدەن تاکوو لە ڕێگای پەروەردە و ڕاهێنان و پێکهێنانی سیستەمێکی ئابووری و کۆمەڵایەتی کە پەرەپێدانی عەدالەتی کۆمەڵایەتی مسۆگەر بکا، بەر بە

پێشێلکردنی ئەو ماف و ئازادییانە بگرن. وەک ئاماژەمان پێکرد ڕاگەیەنراوی جیهانیی مافی مرۆڤ لە بواری نێونەتەوەییەوە، تەنیا بەڵگەیەکی یاسایی نیە کە دەبێ جێبەجێ بکرێ، بەڵکوو زیاتر بەڵگەیەکی یاسایی ڕەوشتیی نێونەتەوەییەو، هەموو وڵاتانی ئەندامی ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان لە ڕووی ئاکارییەوە بە ئەرکی خۆیانی دەزانن کە بەردەوام یاسا و ڕێوشوێن و هەڵسوکەوتەکانیان لەگەڵ ئەم ڕاگەیەنراوەدا ڕێک بخەن. ئێمە دەزانین کە زۆربەی ڕێوشوێنە یاساییەکان لە سەرەتادا بەشێوەی ڕێوشوێنی ئاکاری بوون، هەربۆیە ڕەنگە بە سەرنجدان بەوەی کە زیاتر لە چەندین دەیە بەسەر تەمەنی ڕاگەیەنراوی جیهانیی مافی مرۆڤدا تێپەڕیوە، و هەروەها بە لە بەرچاوگرتنی ئەوەی کە لەو ماوەدا لە زۆر بوارەوە، لەلایەن هەموو وڵاتەکان و ڕێکخراوە نێونەتەوەییە جۆراوجۆرەکان و تاکەکەسەکان بە بەردەوامی وەک بەڵگە پشتی پێ بەستراوەو، شتی پێ پشتڕاست کراوەتەوە و، چووەتە نێو دەستوورو یاسای وڵاتە جیاوازەکانەوە. هەروەک چۆن لە ڕاگەیەنراوی ١٩٦٨ی کۆنفرانسی مافی مرۆڤی تاراندا ئاماژەی پێکراوە، دەتوانین بڵێین کە ئەمڕۆکە ئیتر ماددەکانی ڕاگەیەنراوی جیهانیی مافی مرۆڤ دەربڕی لێک تێگەیشتنی هاوبەشی نەتەوەکانی جیهان لە بواری مافە زەوت نەکراوەکان و پێشێل کردنی هەموو ئەندامانی بنەماڵەی مرۆڤایەتیەو، بەڵێنێکیش بۆ ئەندامانی کۆمەڵگای نێودەوڵەتی پێک دێنێ.

ڕاگەیەنراوی جیهانیی مافی مرۆڤ لە دەی کانوونی یەکەمی ١٩٤٨ لە لایەن کۆمەڵەی گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە پەسند کرا.

### *ڕاگەیەنراوی دەمشق (کانوونی دووهەمی ١٩٩١)*
### **Damascus Declaration**

ئەو ڕاگەیەنراوە کە لەراستیدا لە ڕێکەوتی شەشی مارتی ١٩٩١ لە لایەن وەزیرانی دەرەوەی شەش وڵاتی ئەندامی ئەنجوومەنی هاوکاریی کەنداوی فارس، میسرو سووریادا، مۆر کرا کە هەنگاوی تایبەتی لە بواری ئاسایش، بۆ ناوچەی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاستی لە خۆگرتبوو، دوای شەڕی کەنداو و پرۆسەی ئازادیی کوێت لە لایەن هێزە هاوپەیمانەکانەوە هاتە ئاراوە و، بە "یاسای٢+٦"ناوبانگی دەرکردووە. جێبەجێکردنی ماددەکانی ئەو ڕاگەیەنراوو لە کردەدا تووشی گرفت بوون. ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ئەو وڵاتانەی ناچار کرد تاکوو واز لە گەڵاڵەی

سەرەتایی بێنن کە بەپێی ئەو گەڵاڵە ئەندامانی ئەنجوومەنی هاوکاری دەبوایە پازدە لە سەدی داهاتی نەوتی خۆیان بۆ هاوکاریکردنی ئابووری میسرو سووریا تەرخان بکردایە.

## ***راگەیەنراوی رۆم*** Rome Declaration

ئەم راگەیەنراوە لە کۆتایی کۆبوونەوەی رێبەر و سەرۆکی وڵاتانی ئەندامی ناتۆ (٧ هەتا ٨ی تشرینی یەکەمی ١٩٩١) دەرچوو. بەشدارانی کۆبوونەوەکە رایانگەیاند کە: "ئێمە بۆ دابینکردنی ئاسایشی ئەورووپا هەوڵ دەدەین و، لەم پێناوەشدا ناتۆ، کۆنفرانسی ئاسایش وهاوکاریی ئەورووپا، کۆمەڵگای ئەوروپا، یەکیەتیی ئەوروپای رۆژئاوا و ئەنجوومەنی ئەورووپا بەتەواوەتی تەواوکەری یەکترن. جگە لەم بەڵگەیە، "چەمکی ستراتیژیی نوێی یەکیەتیی"یش پەسند کرا. لەم بەڵگەدا ئاماژە بەوە کرابوو کە هیچ مەترسی هێرشێکی هەمەلایەنە بە دژی هەموو بەرە ئەورووپیەکانی ناتۆ لە ئارادا نیە کە نەبوونی ئەو مەترسیە دەبێتە هۆی ئەوەی کە ناتۆ دەکا بەپشت بەستن بە بنەماکانی نێو پێرەوپرۆگرامی خۆی، ستراتیژیەکی نوێ دابرێژری". یەکێک لە بنەماکانی ناتۆ ئەوەیە کە رێکخستنەکەی بە تەواوەتی لایەنی بەرگری هەیە؛ چەک و چۆڵەکانی تەنیا بە مەبەستی "بەرگرییەکی رەوا" کەڵکیان لێ وەردەگیردرێ و؛ خۆی بە دوژمنی هیچ لایەنێک نازانێ. هەر بۆ ئەم مەبەستە چەندین بریاری بۆ کەمکردنەوەودابەزاندنی ئاستی ئامادەیی و توانایی هێزەکان دەرکرد.

## ***راگەیەنراوی رێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان سەبارەت بە لەنێو بردنی هەموو جۆرە هەڵاواردنێکی رەگەزی*** U.N.Declaration On Elimination Of All Forms Of Racial Discrimination

لە ٢٣ی تشرینی دووهەمی ١٩٦٣دا راگەیەنراوی سەبارەت بە لە نێوبردنی هەموو جۆرەکانی هەڵاواردنی رەگەزی لە لایەن کۆمەڵەی گشتی رێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکانەوە پەسند کرا. لەم راگەیەنراوەدا پێ لە سەر ئەو داگیراوە کە جیاوازی دانان لە نێوان تاکەکانی مرۆڤ بەپێی رەنگی پێست و رەگەز، بەپێشێل کردنی پرەنسیپەکانی جاڕنامەی نەتەوەیەکگرتووەکان دەژمێردرێ و، دەست درێژییەکە بۆسەر ئەو مافانەی کە لە راگەیەنراوی جیهانیی مافی مرۆڤدا

گوبخێنراون. هەروەها ئەم پێشێل کردنە دەبێتە بەربەستێک لە بەردەم ڕێگای پەرەپێدانی پێوەندیی دۆستانە و ئاشتیخوازانەی نێوان دەوڵەتەکان، کە دەتوانێ هەڕەشە لە ئاشتی و ئاسایشی نێونەتەوەیی بکا. ڕاگەیەنراو هەروەها پێداگری لەسەر لە نێوبردنی هەرجۆرە هەڵاواردنێکی ڕەگەزی بە هەرشێوەیەک و لەهەر شوێنێکی جیهان و بە زوورترین کات، دەکاتەوە.

دووساڵ دوای پەسند کردنی ڕاگەیەنراوی ٢٣ی تشرینی دووهەمی ١٩٦٣، لە ٢١ی کانوونی یەکەمی ١٩٦٥دا، ڕێککەوتننامەی نێونەتەوەیی لە نێوبردنی جۆرەکانی هەڵاواردنی ڕەگەزی لە لایەن کۆمەڵەی گشتیی نەتەوەیەکگرتووەکانەوە پەسند کرا. دەوڵەتانی ئەندامی ئەم ڕێککەوتننامەیە بەڵێنیان داوە کە هەڵاواردنی ڕەگەزی لەهەر شکڵ و جۆرێک و لە هەر شوێنێک پرۆتستۆ بکەن و، بە بێ وەستان و دوودڵی سیاسەتی نەهێشتنی هەڵاواردن بگرنە بەرو؛ ئەگەر لە دەستووریشدا، بوارێک بۆ هەڵاواردن لە ئارادابێ، چاکسازی تێدا دەکەن یان هەڵی دەوەشێننەوە.

## ڕاگەیەنراوی ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان سەبارەت بە بەخشینی سەربەخۆیی بە کۆلۆنیەکان

## *U.N.Declaration On The Granting Of Independence To Cogonial Countries*

لە ساڵی ١٩٦٠دا ڕاگەیەنراوێکی گرنگ سەبارەت بە بەخشینی سەربەخۆیی بە کۆلۆنیەکان لە لایەن کۆمەڵەی گشتی ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکانەوە پەسند کرا. ئەم ڕاگەیەنراوە پشتی بەم فەلسەفەیە بەستووەکە چوونە ژێر دەسەڵات و کۆت و بەندو چەوسانەوەی بێگانەکان، حاشاکردن لە مافە سەرەکیەکانی مرۆڤ و دژی جارنامەی نەتەوەیەکگرتووەکانەو هەروەها بەربەستێکیشە لە بەردەم ڕێگای پەرەپێدان و بەرفراوانکردنی ئاشتی و هاوکاریی نێودەوڵەتی. ئەم ڕاگەیەنراوە ئەوە دەستنیشان دەکا کە هەموو نەتەوەکان مافی ئەوەیان هەیە خودموختاری خۆیان دیاری بکەن و، سەربەستانە درێژە بە پەرەپێدانی ئابووری، کۆمەڵایەتی و کولتووریی خۆیان بدەن. ئەم ڕاگەیەنراوە، لەسەر ئەوە پێ دادەگرێ کە نابێ هیچکات بە بیانووی نالێهاتوویی ئابووری، سیاسی، کۆمەڵایەتی و پەروەردەیی بەمەبەستی وەدواخستنی سەربەخۆیی

ولاتێک کەلک وەربگیردرێ و،یەکێک لە بنەما سەرەکیەکانی خودموختاری نەتەوەیەک ئەوەیە کە مافی سەروەریی هەمیشەیی بەسەر سامان و سەرچاوە سروشتییەکانی خۆیدا هەبێ.

### *راگەیەنراوی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان سەبارەت بە دەسەڵاتدارەتیی هەمیشەیی بەسەر سەرچاوە سروشتییەکاندا*

### *U.N.Declaration On Permanent Sovereignty Over Natural Resources*

کۆمەڵەی گشتیِ رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لەساڵی ١٩٦٢دا راگەیەنراوی دەسەڵاتدارەتیی هەمیشەیی بەسەر سەرچاوە سروشتییەکاندا پەسند کرد. ئەم راگەیەنراوە مافی دەسەڵاتدارەتیی هەمیشەیی هەر ولاتێک بەسەر سامان و سەرچاوە سروشتییەکانی خۆی بە مەبەستی پەرەپێدانی نەتەوەیی و خۆشگوزەرانیی خەڵکی ئەو ولاتە بەرەسمی دەناسێ و، رایدەگەیەنێ کە هاوکاریيە نێودەوڵەتیەکان بۆ پەرەپێدانی ئابووریی ولاتانی لە حاڵی پەرەسەندندا دەبێ لەسەر بنەمای رێزدانان بۆ مافی دەسەڵاتدارەتیی ولاتان بەسەر سامان و سەرچاوە سروشتییەکاندا بێ و، بە شێوەیەک جێبەجێ بکرێ کە پەرەسەندنی ئەم ولاتانە بە شێوەیەکی سەربەخۆدابین بکا.

### *Lima Declaration* — *راگەیەنراوی لیما (١٩٣٨)*

بە راگەیەنراوێک دەگوترێ کە لە کۆتایی کۆنفرانسی پان ئەمەریکێن لە پایتەختی پیرۆ لە رێکەوتی کانوونی یەکەمی ١٩٣٨دا بلاو بۆوە. بەپێی ئەو راگەیەنراوە، هەرجۆرە هەڕەشەیەک لە ئاشتی، ئاسایش و یەکپارچەیی خاکی هەرکام لە ولاتانی ئەمەریکیی بە هەڕەشە بۆ سەر هەموویان دەژمێردرێ. ئەم راگەیەنراوە سەرکەوتنێکی گەورە بوو بۆ رۆژئەڵت کە توانیبووی نوێنەرانی ولاتانی ئەمەریکای لاتین بەدژی تۆتالیتاریزمی ئەورووپی لە دەوری خۆی کۆ بکاتەوە. ئەم راگەیەنراوە سەرەرای هەست کردن بەو راستیە بوو کە هێندێک لە ولاتانی واژۆکاری راگەیەنراوەکەی لیما بە ئاشکرا پشتیوانیان لە فاشیزم دەکرد، تا ئەوەی کە پشتیوانی لە دیمۆکراسیی لیبراڵ بکەن.

## Moscow Declaration

## راگەیەنراوی مۆسکۆ(١٩٤٣)

ئەو راگەیەنراوە لە تشرینی دووهەمی ١٩٤٣دا لەلایەن سێ ولاّتی ئەمەریکا، بەریتانیاو یەکیەتیی سۆڤیەتەوە ئیمزا کرا. دواتر دەوڵەتی چینیش راگەیەنراوی مۆسکۆی ئیمزا کرد. لەو راگەیەنراوەدا ئەو چوار دەوڵەتە، دامەزراندنی ڕێکخراوێکی نێودەوڵەتیان کە دەرگای بوونە ئەندام بۆ هەموو ولاّتەکان ـ گەورە و بچووک ـ کراوەبێ و لە سەر بنەمای یەکسانیی هەموو ولاّتانی ئاشتیخواز ـ گەورە و بچووک ـ دامەزرا بێ، بۆ ئاشتی و ئاسایشی نیشتمانی بە پێویست دانا.

## راگەیەنراوی نەتەوە یەکگرتووەکان

## The United Nations Declaration

ئەو راگەیەنراوە لە ڕێکەوتی یەکەمی کانوونی دووهەمی ١٩٤٢دا بلاّو بۆوە و، لە سەرەتادا بیست و شەش ولاّت بۆوێنە ئەمەریکا، بەریتانیا، چین و یەکیەتیی سۆڤیەت مۆریان کرد. دەوڵەتی ئێران لە ئابی ١٩٤٢دا ئەو راگەیەنراوەی مۆر کرد. راگەیەنراوی نەتەوەیەکگرتووەکان دەڵێ کە:

١ـ هەرکام لەو دەوڵەتانەی کە ئەو راگەیەنراوەیان مۆر کردووە بەڵێن دەدەن کە لە هەموو سەرچاوە ئابووری و سەربازییەکانی خۆیان بۆ شەڕ لە دژی ئەندام یان ئەندامانی یەکیەتیی سێ کوچکە و هاوپەیمانەکانیان کە لەگەڵیان لە شەڕدان، کەڵک وەرگرن.

٢ـ هەرکام لەو دەوڵەتانە دەبێ لەگەڵ ولاّتانی تری ئەندامی راگەیەنراوەکە هاوکاری بکاو، نابێ بە تەنیا قۆڵ لە کۆتاییهێنان بە شەڕو ئاشتی لەگەڵ دوژمنە هاوبەشەکانیان هەڵمالێ.

## Public Opinion

## رای گشتی

بە دژکردەوەی بە شێکی گەورەی کۆمەڵگا لە بەرامبەر ئەو رووداوانەدا دەگوترێ کە بۆ کۆمەڵگا گرنگ و سەرەکین یان لانیکەم بەشێکی گەورە، بە لایانەوە گرنگە. رای گشتی پێوەندی بەو پێوەرانە هەیە کە رووداو یان راستییەکان بە پێی ئەو پێوەرانە هەڵدەسەنگێندرین وهەروەها پێوەندی بە شێوازێک هەیە کە راستییەکان بەپێی ئەوان ئاراستە و شیکراونەوە.

### رازیکردن *Appeasement*

بە ئەسپاردنی خاک (زیاتر خاک یان ولاّتی نەتەوەیەکی تر) بە ولاّتێک، یان خۆبواردن لە جێبەجێکردنی بەڵێنەکانی رێککەوتننامەیەک بە مەبەستی رازیکردنی دوژمن، یان پێشگیریکردن لە رووداني شەڕ دەگوترێ.کاتێک لە دەیەی ۱۹۳۰دا کە نەتەوەکان و و ئەو پرەنسیپانەی کە ولاّتان لەسەریان کۆک بوون، لە پێناو راکێشانی سەرنجی دیکتاتۆرەکاندا (وەکوو هیتلەر) بوونە قوربانی ، پێشگیری کردن لە شەڕ بوو بە یەکێک لە پێناسەکانی ئەو چەمکە.

### راگەیەنراوی کۆبوونەوەی سەعد ئاباد (۲۱ی تشرینی یەکەمی ۲۰۰۳) *Sa'dabad Declaration*

بە بەڵگەنامەیەک دەگوترێ کە سەبارەت بە چالاکییە ناوەکیەکانی ئێران، لە نێوان ئەو ولاّتەو سێ ولاّتی ئەندامی یەکیەتیی ئەورووپا واتا، ئەڵمانیا، بەریتانیا وفەرەنسادا مۆر کرا. نێوەرۆکی راگەیەنراوەکە بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

۱ـ لەسەر بانگهێشتی دەوڵەتی کۆماری ئیسلامی ئێران، وەزیرانی کاروباری دەرەوەی بەریتانیا، فەرەنسا وئەڵمانیا لە رێکەوتی ۲۱ی تشرینی یەکەمی ۲۰۰۳، سەردانی ئێرانیان کرد. کاربەدەستانی ئێران و وەزیرە میوانەکان دوای باس و خۆاستێکی زۆر، سەبارەت بە هەنگاوەکانی چارەسەری هەموو کێشە چارەسەرنەکراوەکانی ئاژانسی نێونەتەوەیی وزەی ئەتۆمی سەبارەت بە پرۆگرامی ناوەکیی ئێران و بردنە سەری ئاستی متمانە بۆ هاوکارییە ئاشتیخوازانەکان، لە بواری ناوەکیەوە رێککەوتن.

۲ـ کاربەدەستانی ئێران بۆ جارێکی تر، پێیان لەسەر ئەوە داگرتەوە کە چەکی ناوەکی لە ستراتیژیی بەرگری ئێران دانیەو، پلان و چالاکییە ناوەکیەکانی ئێران تەنیا لایەنی ئاشتیخوازانەی هەیە.

کاربەدەستان بەڵێنی کۆماری ئیسلامیان بە ملکەچ بوون بە پەرەپێنەدانی چەکی ناوەکی دووبارە کردەوەو، وەزیرەکانیان ئاگادار کردەوە کە:

**الف)** دەوڵەتی ئێران بڕیاری داوە کە هاوکاری ئاژانسی نێونەتەوەیی وزەی بکا تاکوو بە شێوەیەکی روون وڵامی پرسیارە وڵامنەدراوەکانی ئاژانس بداتەوەو، چارەسەریان بکاو، هەرجۆرە هەڵەو گوێنەدانێک لە چوارچێوەی ئاژانسدا روون بکاتەوە و چارەسەری بکا.

**ب)** بۆ بەرزکردنەوەی متمانە و لابردنی هەرجۆرە بەربەستێک لەبەردەم هاوکاری لە بواری ناوەکی دا:

**یەکەم:** دەوڵەتی ئێران بە وەرگرتنی چەند روونکردنەوەیەکی پێویست، بڕیاری داوە کە پرۆتۆکۆلی پاشکۆ ئیمزا و، دەست بە پرۆسەی پەسندکردنی پرۆتۆکۆل بکا. دەوڵەتی ئێران بەر لەوەی پرۆتۆکۆلی پاشکۆ پەسند بکا، وەک نیشاندانی نیاز پاکی خۆی، لەگەڵ ئاژانسدا، بە پێی پرۆتۆکۆل درێژە بە هاوکاری خۆی لەگەڵ ئاژزانسی وزەی ئەتۆمی دەدا.

**دووهەم:** لە حاڵێکدا کە دەوڵەتی ئێران لەچوارچێوەی سیستەمی پەرەپێنەداندا، مافی خۆیەتی وزەی ناوەکی بۆ ئامانجی ئاشتیخوازانە پەرەپێ بدا، بەڵام خۆی بڕیاری داوە کە هەموو چالاکییەکانی پیتاندنی یۆرانیۆم بوەستێنێ.

٣ _ وەزیرانی دەرەوەی بەریتانیا، ئەڵمانیا وفەڕەنسا پێشوازییان لە بڕیاری دەوڵەتی ئێران کردو، ئەم باسانەی خوارەوەیان بە ئاگاداری کاربەدەستانی ئێران گەیاند:

**الف)** دەوڵەتەکانی ئێمە مافی دەوڵەتی ئێران بۆ کەڵکی ئاشتیانە لە وزەی ناوەکی لە برانبەر "NPT" دا بەرەسمیی دەناسێ.

**ب)** بەبڕوای ئەوان، پرۆتۆکۆلی پاشکۆ بە هیچ شێوەیەک مەبەستی خەوشدارکردنی سەروەری، پرەستیژی نەتەوەیی، یان ئاسایشی نەتەویی وڵاتی ئەندام نیە.

**پ)** بە بڕوای ئەوان ئەگەر بەڕێوەبەری گشتی ئاژانسی نێونەتەوەیی وزەی ئەتوومی بڵێت کە ئێران بڕیارەکانی خۆی جێبەجێ کردووە، دەبێ ئەنجوومەنی بەڕێوەبەریی ئاژانس ئەو رەوشەی ئێستا چارەسەر بکا.

ت) هەرسێ دەوڵەت لە سەر ئەو بڕوایەن کە ئەم کارە دەبێتە هۆی ئەوەی کە ڕێگای وتووێژ لە سەر بنەمای هاوکارییە ستراتیژییەکان بکرێتەوە.

هەرکاتێک نیگەرانیی نێو نەتەوەیی، بۆ وێنە نیگەرانیەکانی سێ وڵاتی لایەنی بەرانبەری ئێران نەمێنێ، ئێران دەتوانێ چاوەڕوانی کە ئاسانکاری بۆ ئێران بکرێ کەدەستی بەتەکنەلۆژیای پێشکەوتوو لە بوارە جۆراوجۆرەکان دا ڕابگا.

ج) ئەوان لەگەڵ ئێراندا بۆ بردنەسەری ئاستی ئاسایش و سەقامگرتوویی لە ناوچەدا و، بۆوێنە پێکهێنانی ناوچەیەکی بێ چەک وچۆڵی کوشتاری بەکۆمەڵ لە ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاستدا، بەپێی ئامانجەکانی ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان، هاوکاری دەکەن.

## *ڕاگەیەنراو [ڕێککەوتننامە]ی پاریس (١٥ی تشرینی دووهەمی ٢٠٠٤)*
## *Paris Agreement*

دوابەدوای کۆبوونەوەی سەعدئاباد، وتووێژێکی دیکە لە نێوان ئەڵمانیا، بەریتانیاو فەڕەنسا لەگەڵ ئێراندا دەستی پێکرد کە لە ئاکامدا بە دەرکردنی ڕێککەوتننامەی پاریس کۆتایی هات.

نێوەڕۆکی ڕێککەوتننامەکە بەم شێوەیەی خوارەوە بوو:

دەوڵەتی کۆماری ئیسلامی ئێران و دەوڵەتەکانی فەڕەنسا، ئەڵمانیا وبەریتانیا بە پشتیوانی نوێنەرانی باڵای یەکیەتیی ئەورووپا (سێ وڵات یەکیەتیی ئەورووپا) پێداگریان لەسەر بەڵێنەکانی ڕاگەیەنراوی ٢١ی تشرینی یەکەمی ٢٠٠٣ی تاران کردەوە و، بڕیاریان داوە پێشکەوتنەکانی دوایی لەسەر ئەو بنەمایە دابڕێژن. سێ وڵاتی ئەندامی یەکیەتیی ئەورپاو ئێران بۆ جارێکی تر سووربونی خۆیان لەسەر بەڵێنەکانی NPT دووپات کردەوە.

ئێران بەپێی ماددەی ٢ی NPT دەڵێ کە بەدوای بە دەستهێنانی چەک ناوەکیەکان نیەو نایهەوێ و، سوورە لەسەر هاوکارییکردنی تەواو و ڕوون لەگەڵ ئاژانس.

ئێران هەروەها دڵخوازانە تا ئەوکات کە پرۆتۆکۆلی پاشکۆ پەسند دەکا، پرۆتۆکۆلی پاشکۆ جێبەجێ دەکا. بە مەبەستی ڕاکێشانی متمانەی زیاتر، ئێران دڵخوازانە بڕیاری داوە کە پرۆگرامی ڕاوەستانی بەرنامەی ناوەکی خۆی درێژە پێبدا و، پەرەی پێ بدا کە هەموو چالاکیەکانی

پێوەندیدار بە پیتاندن و بەرهەمهێنان، و بە تایبەتی هاوردەی سانتریفیوژە گازییەکان و ئامێرەکانی، مۆنتاژ، دانان، تاقیکردنەوە و وەکارخستنی سانتریفیوژە گازییەکان، هەرجۆرە کردەیەک بۆ جیاکردنەوەی پلۆتۆنیۆم یان چاککردن یان دامەزراندنی بنکەی جیاکردنەوەی پلۆتۆنیۆم و هەموو تاقیکردنەوەکان لەگەڵ بەرهەمهێنان لەهەر دامەزراوەیەکی گۆڕینی ئۆرانیۆم لە خۆبگری. ئاژانس لەو هەڵپەساردنە ئاگادار دەکرێتەوە و بانگهێشتی ئاژانس دەکا بۆ ئەوەی کە چاوەدێری بەسەر ئەو بەرنامەی ئێراندا بکەن.

ڕاگرتن لەکاتی خۆیدا جێبەجێ دەکرێ بە شێوەیەک کە ئاژانس بتوانێ بەرلە کۆبوونەوەی تشرینی دووهەم دان بە جێبەجێکردنی ئەو بەرنامەی ئێراند بنێ. ڕاگرتن لە کاتی وتووێژەکانی دوولایەنیش دا بەردەوام دەبێ. دەبێ سێ وڵاتی ئەورووپی دان بەوەدا بنێن کە ڕاگرتن دڵخوازانە بووە و لە پێناوی بە دەستهێنانی متمانەی زیاتری جیهانی بووە، نەک ناچارکردنێکی یاسایی.

بەردەوام بوون لە ڕاگرتنی بەرنامەی ناوەکیی ئێران، بەو مەرجەی کە وتووێژە درێژخایەنەکان بەردەوامن، بۆ بەردەوامی پرۆسەی گشتی، شتێکی پێویست و بنەڕەتیە. لە چوارچێوەی ئەو ڕاگرتنەدا، سێ وڵاتی یەکیەتیی ئەورووپا و ئێران ڕێک کەوتوون کە بە مەبەستی گەیشتن بە ڕێککەوتنێک کە هەر دوولا لەسەری کۆک بن، درێژە بە وتووێژەکانی خۆیان بدەن.

کۆمیتەیەکی ڕێبەری پێک دێ و کۆ دەبێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەو وتووێژانە لە نیوەی یەکەمی کانوونی یەکەمی ۲۰۰٤ دەست پێ بکاو، گرووپێکی کاری لە بواری سیاسی، ئاسایش، تەکنۆلۆژی و هاوکاریی ناوەکی پێک دێنێ. کۆمیتەی ڕێبەری بۆ جارێکی تر دوای سێ مانگ کۆ دەبێتەوە تاکوو ڕاپۆرتی پێشکەوتنی کارەکان لە گرووپی کارەکان وەربگرێ و، سەبارەت بە پێشڤەچوونی پرۆژەکان یان هەرکارێک کە دەتوانێ بەر لە ڕێککەوتنێکی گشتی جێبەجێ بکرێ، بڕیار دەدا.

لە چوارچێوەی ئەو ڕێککەوتنە وبە سەرنج دان بەو پێشکەوتنەی کە لە بواری چارەسەری کێشە چارەسەر نەکراوەکاندا رووی داوە، سێ وڵاتی یەکیەتیی ئەرووپا لە ئێستاوە پشتیوانی لە بەرپرسی گشتیی ئاژانس دەکەن تاکوو لە چوارچێوەی ڕێککەوتنەکە و پرۆتۆکۆلی پاشکۆ بەو شێوەیەی کە پێویستە،ئەنجوومەنی بەڕێوەبەری ئاگادار بکاتەوە. سێ وڵاتی یەکیەتیی

ئەوروپا پشتیوانی لە بەرپرسی گشتیی ئاژانس دەکەن تا لە چوارچێوەی پادمان و پرۆتۆکۆلی پاشکۆ، ئەگەر بە پێویستی زانی، راپۆرتی وتووێژەکان بە ئەنجوومەنی بەڕێوەبەری ئاژانسی وزەی ئەتۆمی بدا. هەروەها ئەو سێ وڵاتە پشتیوانی لە سەرۆکی ئاژانس دەکەن بۆ ئەوی ئێران بانگهێشت بکا لە گرووپی پسپۆری تێروانینی چەندلایەنە سەبارەت بە سیکلی سووتەمەنی ناوەکیدا بەشداری بکا. کاتێک کەدان بە راستیی راگرتن نرا، وتووێژ لەگەڵ یەکیەتیی ئەوروپاسەبارەت بەرێککەوتننامەی بازرگانی و هاوکاری دەست پێ دەکاتەوە. سێ وڵاتی یەکیەتیی ئەوروپا هەر لە سەرەتای وتووێژەکانەوە پشتیوانی لە چوونی ئێران بۆ نێو رێکخراوی جیهانیی بازرگانی بە شێوەیەکی چالاک دەکەن. جیا لە بەرەوپێشڤەچوونی کارەکان لە بواری ناوەکیدا، هەرسێ وڵاتی یەکیەتیی ئەوروپا و ئێران پێداگری لە سەر دژایەتی خۆیان لەگەڵ تێرۆریزم وەک چالاکیەکانی ئەلقاعیدە و گرووپە تیرۆریستیەکانی تر دەکەنەوە. هەوەها، هەموویان پێداگری لەسەر پێشیوانیی بەردەوامی خۆیان لە پرۆسەی سیاسیی عێراق و بەمەبەستی پێکهێنانی دەوڵەتێکی هەڵبژێردراوی یاسایی دەکەنەوە.

### راگەیەنراوی راسێل ـ ئەنیشتاین
### Russell – Einstein Manifesto

ئەم راگەیەنراوە کە رەشنووسەکەی لە لایەن بێرتراند راسێڵ فەیلەسوفی بە ناوبانگی بەریتانی نووسراوە و، ئالبێرت ئەنیشتاین، زانای بە ناوبانگ مۆریان کرد، لە کۆبوونەوەی "پۆگڤاش"ی کەنەدا راگەیەنرا. لەو راگەیەنراوەدا سەرەرای وەبیرهێنانەوەی مەترسیی هەڵگیرسانی شەڕێکی ئەتۆمی و گرنگیی پێشگرتن لەم کارە، خەڵک و دەوڵەتەکانی جیهان بۆ "جیابیری" بانگهێشت کرابوون. بیرمەندانی سیاسەتی دەرەوەی سۆڤیەت بە کەڵک وەرگرتن لەم زاراوە، لە ستراتیژییەکانی خۆیاندا کەڵکیان لە "بیری نوێ" وەرگرت.

### راگەیەنراوی هاوبەش Joint Declaration

بەڵگەیەکە کە دەوڵەتێک بەمەبەستی روونکردنەوەی رێبازی سیاسی خۆی سەبارەت بە بابەتێکی تایبەتی یان بە مەبەستی روونکردنەوەی رەوتێکی تایبەتی یان پووچەڵ کردنەوەی لێدوانی نەیارەکان دەری دەکا. رەنگە راگەیەنراو وەکوو رێککەوتننامەی نێوان دوو یان چەند دەوڵەت و دەربری بیروبۆچوون وویستەکان و بڕیارە هاوبەشەکانی ئەوان بێ، یان رەنگە راگەیەنراو بۆ

روونکردنەوەو شیکردنەوەی مادده یان چەندین مادده لە ڕێککەوتنێک کە پێشتر گرێ دراوە، دەربچێ.

### *ڕێککەوتننامەی ئەمەریکا و سۆڤیەت سەبارەت بە نەهێشتنی موشەکە مام ناوەندی هاوێژ و کورت هاوێژەکان (کانوونی یەکەمی ۱۹۸۷)*

### *Treaty Between The USSR and The USA On The Elimination Of Their Intermediate And Shorter Range Missiles*

بەو ڕێککەوتننامە دەگوترێ کە لە ڕێکەوتی هەشتی کانوونی یەکەمی ساڵی ۱۹۸۷دا لە نێوان میخائیل گۆرباچۆف، سکرتێری گشتیی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەت و ڕۆناڵد ڕێگان، سەرۆک کۆماری ئەمەریکا سەبارەت بە نەهێشتنی موشەکە مام ناوەندی هاوێژ و کورت هاوێژەکانی هەر دوو لایەن، لە شاری واشینگتۆنی ئەمریکا مۆر کرا.

ئەم ڕێککەوتننامە موشەکی بالستیک، بالستیکی زەوی بە زەوی، کرۆز، کرۆزی زەوی بە زەوی، خاوەنی مەودایەکی مام ناوەندی (لە نێوان ۱۰۰۰ هەتا ۵۵۰۰کیلۆمەتر)، کورت هاوێژ (لە نێوان ۵۰۰ هەتا ۱۰۰۰ کیلۆمەتر) لە خۆ دەگرێ. بە واتایەکی تر، موشەکە ئێس ئێس ــ۲۰ ، ئێس ئێس ــ٤ ، ئێس ئێســ ٥ی سۆڤیەت و پرشنگی ــ۲ی ئەمەریکا لەریزی موشەکە مامناوەندی هاوێژەکان دان. موشەکە رووسیەکانی لە جۆری ئێس ئێس ــ۱۲، ۲۳وپرشنگی ــیەک (A) لەریزی موشەکە کورت هاوێژەکان دان.

### *ڕێککەوتننامەی باڵکان* **Balkan Pact**

زاراوەیەکە بەم شێوەیەی خوارەو:

۱ــ ئەم ڕێککەوتننامە لە ساڵی ۱۹۳٤ لە نێوان وڵاتانی یۆگسلاڤیا، ڕۆمانیا، یۆنان و تورکیا بەمەبەستی هێرش نەکردن و نەپەڕاندنی سنوورەکانی یەکتر گرێدرا. ئەم ڕێککەوتننامە ئەنجوومەنێکی هەبوو کە بەردەوام و بەرێک و پێکی کۆبوونەوەکانی خۆی بەڕێوە دەبرد. ئەو ڕێککەوتننامە، دوای هێرشەکانی ئەڵمانیای نازی بەکردەوە لەبەریەک هەڵوەشایەوە(۱۹٤۰).

بولگاریاش بانگهێشت کرا کە بیێ بە ئەندامی ئەو ریکەوتننامە، بەڵام چوونکە ئەم وڵاتە دانی بە سنوورەکانی ئێستای مەکدۆنیادا نەدەنا، لە بەەن بە ئەندام لەم رێکەوتننامەدا خۆی بوارد.

٢ـ رێککەوتننامەی هاوکاریی دوولایەنە لە ساڵی ١٩٥٤دا لە بەرامبەر ئەگەری هێرشی هەر لایەنێک بۆ سەر خاکی لایەنەکەی تر، لە نێوان یۆگسلاڤیا، تورکیا و یۆناندا مۆر کرا. کێشەی قوبرس ناکۆکی خستە نێوان تورکیا و یۆنان و، نێوەرۆکی ئەم رێککەوتنە لە هیچ کات لە کردەوەدا جێبەجێ نەبوو.

## رێککەوتننامەی بەغدا (١٩٥٥) Baghdad Pact

ئەم رێککەوتنە لە ٢٤ی شوباتی ١٩٥٥ لە نێوان وڵاتانی تورکیا وعێراقدا بەناوی "رێککەوتنی هاوکاریی دوولایەنە" لە بەغدا مۆر کراو، کە بە ریککەوتننامەی بەغدا بەناوبانگ بوو.

رێککەوتننامەی بەغدا پێشەکی و ٨ ماددە و ٢ ڕاڤەنامەی هەیە. ئامانجی سەرەکیی ئەم رێککەوتنە مسۆگەرکردنی ئاسایش و بەرگریی ناوچەی رۆژهەڵاتی نێوەڕاست بوو و، لە پێشەکیەکەیدا بە پشت بەستن بە ماددەی ٥١ی جاڕنامەی نەتەوەیەکگرتووەکان، روون کرابۆوە کە هەر دوو لایەنی رێککەوتنەکە بە مەبەستی پاراستنی ئاسایش و بەرگری خۆیان و، بۆ دابینکردنی خۆشگوزەرانی و بەختەوەری نەتەوەکانی خۆیان، لەگەڵ یەکتردا هاوکاری دەکەن.

عێراق بۆ ئەوی کە پاساو بۆ ئەم رێککەوتنە بەرگرییە بێنێتەوە و، بۆ ئەوەی کە ئەم رێککەوتننامە لەگەڵ کۆمەڵەی عەرەبیدا بگونجێ، پشتی بە ماددەی ١١ی رێککەوتننامەی بەرگریی هاوبەش و هاوکاریی ئابووریی نێوان ئەندامانی کۆمەڵەی عەرەبی بەست، کە دەڵێ: هیچ کارو رێوشوێنێکی وڵاتانی ئەندام کە بەپێی جاڕنامەی نەتەوەیەکگرتووەکان و لە چوارچێوەی ئەم جاڕنامەیەدا بێ، زەربە لە بەرژەوەندییەکانی هیچ لایەک واتە لە وڵاتانی ئەندام نادا.

بەپێی ماددەی ٥ی رێککەوتننامەی بەغدا، هەموو ئەو وڵاتانەی کە بەرژەوەندی خۆیان لەم رێککەوتننامەدا دەبیننەوە، دەیانتوانی ببن بە ئەندامی ئەو رێککەوتننامەیە. لەم رووەوە، بەریتانیا لە ٣٠ی مارتی ١٩٥٥، پاکستان لە ٢٣ی ئەیلوولی ١٩٥٥ وئێران لە ١١ی تشرینی یەکەمی هەمان ساڵدا بوون بە ئەندامی ریککەوتننامەی بەغدا، بەڵام ئەمەریکا لە بوون بە ئەندام لەم رێککەوتننامەدا خۆی بوارد. پێکهێنانی رێککەوتننامەی بەغدا لە داهێنانەکانی دەوڵەتی ئەمریکا، بەتایبەتی جۆن فاستێر دالس، وەزیری دەرەوەی ئەم دەوڵەتە بوو کە دەیویست رێکخراوێکی بەرگریی بەهێز لە

ناوچەکەدا پێک بێنێ تاکوو بەر بە پەرەگرتنی تەشەنەکردنی سۆڤیەت لە ناوچەکەدا بگرێ و، پشتێنەی بەرگریی ڕۆژئاوا پتەوتر و بەهێزتر بکا. بەڵام ئەمەریکا وای بە باش زانی کە بۆخۆی نەبێ بە ئەندامی ڕێککەوتننامەکە، تاکوو نەبێتە هۆی دنەدانی دەوڵەتی سۆڤیەت، و هەروەها دەوڵەتی ئەمەریکا خۆی لە مشتومڕەکانی سەنای ئەمەریکا سەبارەت بە ئەندامەتیی لەو ڕێککەوتننامەدا پارێزێ و دۆستایەتیی عەرەبەکانیش زیاتر بۆ لای خۆی ڕابکێشێ یان لانیکەم پەرە بە ڕق و بێزاری ئەم وڵاتانە بەرامبەر بە خۆی نەدا. چوونکە لەو سەروبەندەدا دەوڵەتە ناسیۆنالیستەکانی عەرەب و بەتایبەتی میسر پێیانوابوو کە وڵاتە عەرەبیەکان تاکوو بە ئامانجە ناسیۆنالیستەکانیان نەگەن، نابێ هاوکاری وڵاتانی ڕۆژئاوایی بکەن و، دەبێ لەم هاوکاریە خۆ ببوێرن.

ڕێککەوتننامەی بەغدا جیاوازیەکی زۆری لەگەڵ ڕێککەوتننامەی سەعد ئابادا هەیە. چوونکە وڵاتانی ئەندام لە ڕێککەوتننامەی سەعدئابادا بەڵێنی ئەوەیان بە یەکتر دابوو کە سنووری یەکتر نەبەزێنن و، ڕێز بۆ سنوور و سەروەریی خاکی یەکتر دابنێن. هەروەها بەڵێنیان دابوو کە لە کاتی سەرهەڵدانی هەرکێشەیەکی نێونەتەوەییدا کە پێوەندی بە بەرژەوەندیی هاوبەشی ئەوانەوە هەبێ، لەگەڵ یەکتر ڕاوێژ بکەن. بەڵام ئەو ڕێککەوتننامە هیچ جۆرە هاوکاریەکی دوولایەنە و بەرامبەرانە یان بەڵێنێکی سەربازی تێدا نەبوو.

بەڵام لە ڕێککەوتننامەی بەغدادا پێشبینی هاوکاری لە بوارەکانی سەربازی و ئابووریدا کراوە. جگە لەمە، ئەندامەتیی بەریتانیا و بەشداری و چاوەدێریی چالاکانەی چاوەدێرانی ئەمەریکا لە کۆمیسیۆنە جۆراوجۆرەکانی ڕێککەوتننامەی بەغدا، گرنگیەکی زیاتری بەم ڕێککەوتنە بەخشیبوو، واپێدەچوو کە هاوکاریەکانی ئەمەریکا و بەریتانیا بەمەبەستی بەهێزکردنی بنەماکانی بەرگریی وڵاتانیی ئەندام و، لە هەمان کاتدا باشتر کردنی باری ئابووریی ئەم وڵاتانە بووبێ.

دوای شۆڕشی ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨ لە عێراق، دەوڵەتی عەبدولکەریم قاسم ڕایگەیاند کە عێراق سوورە لەسەر هەموو بەڵێنە نێودەوڵەتیەکانی خۆی. بەڵام لە کردەدا خۆی لە بەشداریی کۆبوونەوەکانی ئەنجوومەنی وەزیران و کۆمیتەکانی ڕێککەوتننامەی بەغدا دەبوارد و، هیچ جۆرە چالاکییەکی نەبوو هەتا ئەوەی کە لە ٢٤ی ئابی ١٩٥٩، شەش مانگ بەر لە کۆتایی خولی ٥ساڵەی یەکەمی ڕێککەوتننامەی بەغدا، عێراق بڕیاری چوونە دەری خۆی لەم ڕێککەوتننامەیە بە

نووسراوە ڕاگەیاند و، پاشان لە ٢٤ی شوباتی ١٩٦٠ واتە ئەوکاتە کە خولی ٥ ساڵەی یەکەم کۆتایی هات، بەڕەسمی لە ڕێککەوتنەکە چووە دەر.

هەر بەم هۆیە، ناوەندی ڕێککەوتننامەکە لە بەغداوە گوازرایەوە بۆ ئانکارا و، ناوەکەشی لە مانگی ئابی ١٩٥٩ بۆسەنتۆ گۆڕدرا. هۆکاری هەڵبژاردنی ئەم ناوەش ئەوە بوو کە سەنتۆ (ڕێکخراوی پەیمانی ناوندیی) لە نێوان ناتۆ (لە ڕۆژئاوا) و سیتۆ (لە ڕۆژهەڵات) واتە لە نێوڕاست و ناوەندا هەڵکەوتبوو. لەلایەک بە هۆی ئەندامەیتی تورکیا لە ناتۆ، سەنتۆ لەگەڵ ناتۆ و، لە ڕێگای ئەندامەیتی پاکستانیشەوە لەگەڵ سیتۆدا پێوەندی هەبوو.

### ڕێککەوتننامەی سۆڤیەت و ئەڵمان Russo –German Pact

ئەم ڕێککەوتننامە کە لە ئابی ساڵی ١٩٣٩دا لە نێوان ئەڵمانیای نازی و سۆڤیەتدا مۆر کرا، بوو بە سەرچاوەی گۆڕانکاریەکی زۆر لە نێو خاکی ئەورووپادا. بە پێی ئەم ڕێککەوتننامە بڕیار بوو کە:

١_ هیچکام لە لایەنەکان هێرش نەکەنە سەرخاکی یەکترو، سنوورەکانی یەکتر نەبەزێنن.

٢_ ئەگەر هەرکام لە لایەنەکانی ڕێککەوتننامەکە کەوتنە بەر هێرشی وڵاتی سێهەم، هیچ پشتیوانیەک لە هێزی وڵاتی سێهەم نەکەن.

٣_ نە ئەڵمانیا و نە سۆڤیەت هیچکامیان نابنە ئەندامی هاوپەیمانیەک کە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ لە دژی لایەنێکی ڕێککەوتننامەکە بێ و؛ لە پشتیوانیکردنی ئەم هاوپەیمانەتیە خۆ دەبوێرن.

هەوەها لەسەر داوای سۆڤیەت پرۆتۆکۆلێکیش بەم ڕێککەوتننامەوە لکێندرا، کە بەپێی ئەم، دەستی سۆڤیەتی لە وڵاتانی وەک فینلەندا، ستۆنیا، لیتۆنی، لیتوانیاو، هەروەها پۆڵەنداش بەکراوەیی هێشتبۆوە. ئەم ڕێککەوتننامە ئەم بواری بۆ هیتلەر ڕەخساند، کە هێرش بکاتە سەر فەڕەنسا و بەریتانیا. سۆڤیەتیش بوو بە قوربانیی هێرشەکانی ئەڵمانیای نازی و، خاکی سۆڤیەت لە کانوونی دووهەمی ١٩٤١دا کەوتە بەر هێرشی سوپای هیتلەر.

### ڕێککەوتننامەی سەعدئاباد (تەمووزی ١٩٣٧) Sa'adabad Pact

ئەم ڕێککەوتننامە لە تەمووزی ساڵی ۱۹۳۷دا لە نێوان چوار وڵاتی ئێران، ئەفغانستان، تورکیا و عێراق لە کۆشکی سەعدئاباد (تاران) مۆر کراو، بە ڕێککەوتننامەی هێرش نەکردن و دۆستایەتی بەناوبانگە.

نێوەڕۆکی ڕێککەوتننامەی سەعدئاباد سەبارەت بە هاوڕایی چوار وڵات لە سەر سیاسەتە گشتیەکان و، پشتیوانی لایەنەکان لە لایەنێک لە کاتی ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ هەرمەترسی و هەڕەشەیەکدا بوو.

دەوڵەتەکانی بەشدار بەڵێنیان دابوو کەدەست لە کاروباری نێوخۆیی یەکتر وەرنەدەن وڕێز بۆ سەروەریی سنوورەکانی یەکتر دابنێن؛ هەروەها لە هێرش کردن بۆسەر خاکی یەکتر خۆببوێرن و، پێشگیری لە دامەزرانی کۆمەلەکان و ئەو تاقم و گرووپانە بگرن کە ئامانجیان بشێوی نانەوە و تێکدانی ئاشتی و ئارامی لە نێو وڵاتانی ئەندام دایە.

ئەم ڕێککەوتننامە لە ساڵی ۱۹٤۱ کە هاپەیمانان هێرشیان کردە سەر ئێران، سەلماندی کە لە کردەوەدا هیچ کاریگەرییەکی نەبووە.

## ***Tripartite Pact*** ***ڕێککەوتننامەی سێ لایەنە (۱۹٤۰)***

بەو ڕێککەوتننامە دەگوترێ کە لە ڕێکەوتی ۲۷ی ئەیلوولی ۱۹٤۰ لە نێوان ئەڵمانیا، ئیتالیاو ژاپۆندا مۆر کرا. ئامانجی ئەم ڕێککەوتننامە، پێکهێنانی هاوکاریی دوو لایەنە لە نێوان دەوڵەتە یەکگرتووەکان و ژاپۆندا بوو. بە دوای مۆر کرانی ئەم ڕێککەوتننامە سێ لایەنەیە، ئادۆڵف هیتلەر هاوپەیمانە ئەورووپیەکانی خۆی ناچار بە پێڕەویکردن لەم ڕێککەوتننامە کرد.

## ***ABM Treaty*** ***ڕێککەوتننامەی دژی موشەکی بالستیک (۱۹۷۲)***

بەو ڕێککەوتننامە دەگوترێ لە ۲۷ی مانگی ئەیلوولی ساڵی ۱۹۷۲ لە نێوان ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و یەکیەتیی سۆڤیەتی سۆسیالیستیدا مۆر کرا. بەپێی ئەم ڕێککەوتننامە (بە لەبەر چاوگرتنی هێندێک حاڵەتی دەگمەن) دامەزراندنی سیستەمی دژە موشەکی بالستیک قەدەغە کراو، هەر وڵاتێک تەنیا دەیتوانی ئەم سیستەمە بۆ پاراستنی گۆڕەپانی موشەکە دوورهاوێژەکانی بالستیک و بەرگری لە ڕێکخراویی فەرماندەریی نیشتمانی (پایتەخت) دامەزرێنێ. ئەمەریکا وازی

لەم ڕێککەوتننامە هێنا، بەڵام سۆڤیەت دەستی بە دامەزراندنی ئەو سیستەمە لە دەوروبەری مۆسکۆدا کرد. هێنانە گۆڕی گەلاڵەی ستراتیژیی (شەڕی ئەستێرەکان) لە لایەن ئەمەریکاوە، لە کردەوەدا پێشێلکردنی ئەم ڕێککەوتننامە بوو. دوای بەدەسەڵات گەیشتنی جۆرج بۆش (لە ئەیلوولی ٢٠٠١دا) دەنگۆی هاتنەدەری ئەمەریکا لەم ڕێککەوتننامەدا بڵاو بۆوەو، لە دوای ڕووداوی ١١ی ئەیلوولی ٢٠٠١، ئەمەریکا بە ڕەسمی هاتنەدەری خۆی لەو ڕێککەوتننامە ڕاگەیاند.

### ڕێککەوتننامەی پۆڵایین **PACT oF Steel**

بە ڕێککەوتنی سەربازیی نێوان ئەڵمانیای نازی و دەوڵەتی فاشیستی ئیتاڵیا دەگوترا کە لە ساڵی ١٩٣٩ لە نێوان ئەم دوو وڵاتەدا گرێدرا.

### *ڕێککەوتننامەی ماستریخت* ***Masstricht Treay***

بەو ڕێککەوتننامە دەگوترێ کە لە لایەن سەرکردەکانی ١٢وڵاتی ئەندامی کۆمەڵەی ئابووریی ئەورووپا واتە ئەڵمانیا، ئیسپانیا، بەریتانیا، ئیرلەندا، بەلژیکا، پورتوگال، دانیمارک، فەرەنسا، لۆگزامبۆرگ، هۆڵەندا ویۆنان لە کانوونی یەکەمی ١٩٩١لە شاری ماستریخت (هۆڵەندا) مۆر کرا. مەبەست لەو ڕێکەوتننامە پێکهێنانی یەکگرتوویی سیاسی و ئابووری وڵاتانی ئەورووپایە. دیاریکردنی سیستەمێکی یەکگرتووی دراو، بەرەسمی ناسینی " هاووڵاتیی ئەورووپیی "، هاوکاری نزیکی وڵاتەکان لە بوارەکانی سیاسەتی دەرەوە، ئاسایش، دادوەری کاروباری نێوخۆیی لە بەرنامەی کاری ڕێککەوتنەکە بوون. ئەم ڕێککەوتننامە لە ڕێگای پەرلەمانەکان یان بە هۆی ڕیفراندۆمەوە لەو وڵاتانەدا پەسند کرا.

### *ڕێککەوتننامەی بەربەرەکانی لەگەڵ کۆمۆنیزمی نێودەوڵەتی* ***Anti-Comintern Pact***

ئەم ڕێککەوتننامە لە ساڵی ١٩٣٦، لەنێوان ژاپۆن و ئەڵمانیا بۆ بەرەنگاربوونەوە لەگەڵ کۆمۆنیزمی نێودەوڵەتی پێکهات. لە تشرینی دووهەمی ساڵی ١٩٣٧دا ئیتاڵیاش چووە ریزی ئەم

ڕێککەوتننامەوە. ڕێککەوتننامەی بەربەرەکانی لەگەڵ کۆمۆنیزمی نێودەوڵەتی بە سەرەتایەک بۆ هاوکاریی سەربازیی لە ئەیلوولی ١٩٤٠دا دەژمێررێ.

### *ڕێککەوتننامەی پێشگیری لە پەرەگرتنی چەکە ناوەکیەکان (١٩٦٨)*
### ***Non-Proliferation Treaty (NPT)***

ئەم ڕێککەوتننامە لە سەرەتای کانوونی دووهەمی ساڵی ١٩٦٨ بە مەبەستی پێشگیری لە پەرەگرتن و بەرفراوانبوونی چەکە ناوەکیەکان لە لایەن بەریتانیا، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و یەکیەتیی سۆڤیەتی سۆسیالیستی گرێدرا و، لە ساڵی ١٩٧٠دا جێبەجێ کرا. وڵاتانی تری جیهان پاشان یەک بە دوای یەک چوونە ریزی ئەم ڕێککەوتننامەوە.

لایەنەکانی ئەم ڕێککەوتننامە بەسەردوو گرووپ دابەش دەبن:

الف) وڵاتانی خاوەن چەکە ناوەکیەکان کە بەڵێنیان داوە پێش بە پەرەگرتنی ئەم چەکەنە بۆ وڵاتانی تر بگرن.

ب) ئەو وڵاتانەی کە چەکی ئەتۆمیان نیە و بەڵێنیان داوە لە دەستوێراگەیشتن بەو جۆرە چەکانە خۆبپوێرن.

لە راستیدا ئەم ڕێککەوتننامە ئامرازێکی لۆژیکی بۆ دروستکردنی ناوچەیەکی بێ چەکی ناوەکی (Nuclear Weapons Free Zone) یە.

کاتێک کە ئەم ڕێککەوتننامە لە ساڵی ١٩٧٠دا گەیشتە قۆناغی جێبەجێ کردنەوە، تەنیا پێنج وڵات لە جیهاندا خاوەنی چەکی ئەتۆمی بوون، واتە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، یەکیەتیی سۆڤیەت، چین، فەرەنسا و بەریتانیا، بەڵام ئەمرۆکە وڵاتانی دیکەی وەک هیند و پاکستانیش خاوەنی چەکی ئەتۆمین. لە کۆنفرانسی پێداچوونەوە (Review Conference) کە لە ساڵی ١٩٩٥دا بەڕێوەچوو، ئەم وڵاتانەی کە خاوەنی چەکی ئەتومی نەبوون، رەخنەیان لە ناوەڕۆکی ڕێککەوتننامەکە گرت و، پێیانوابوو کە لە نێوان ئەندامەکاندا جیاوازی دادەنێ. ئەوەی کە دەبێتە هۆی بەهێزبوونی ئەم ڕێککەوتننامە، ئەوەیە کە وڵاتانی خاوەنی بۆمبی ئەتۆمی دڵیان بەو خۆشە کە لە ڕێگای ئەم ڕێککەوتنەوە بەر بەدەستوێراگەیشتنی وڵاتانی تر بەم چەکە دەگرن، هەر بۆیە بەهەموو توانایانەوە هەوڵی جێبەجێ کردن و پابەندبوون بەم ڕێککەوتننامەیە دەدەن. نەچوونی وڵاتانی وەک

ئیسراییل و هیند و پاکستان بۆ ریزی ولاّتانی نێو ئەم ریککەوتننامە، پرۆسێسی روو لە زیادی بووی دەستوێرداگەیشتن بەو چەکانەی کە بۆمبە ئەتۆمیەکان دەهاوێژن (وەک موشەک) و؛ هەوەها دەرەنجامەکانی لەبەریەک هەڵوەشانەوەیی یەکیەتیی سۆڤیەت کە زۆر لە زانا و پسپۆرانی بواری ئەتۆمی خستۆتە لێواری " بەکریگیراویی ناوەکی"، هەرەشە لەو ریککەوتننامە دەکەن.

هەروەها مەترسیی " دژکردەوەی ئالقەی"یش جیهانی خستۆتەسەر لێواری هەڵدێری شەریکی ئەتۆمی. ئەگەر بۆویتە یەکیک لە ولاّتانی ناوچەکە یاساکانی ریککەوتننامەی پێشگیری لە پەرەگرتنی چەکە ناوەکیەکان پێشێل بکا، ئەوا ولاّتانی تریش پێشێلی دەکەن. کێشەکانی نێوان میسر و ئیسرائیل لە رۆژهەلاّتی نێوەراست، هیندو پاکستان لە باشووری ئاسیا و سێ گۆشەی چین ـ کۆریا ـ ژاپۆن لە رۆژهەلاّتی ئاسیا دەکریَ لەم نموونەیە بن.

بە لەبەریەک هەڵوەشانەوەی سۆڤیەتیش چوار ولاّتی فیدراسیۆنی رووسیا، قەزاقستان، ئۆکراینا، وبیلارووس بوون بە میراتگری چەکە ئەتۆمیەکانی ئەم ولاّتە، کە لە ژێر هەوڵەکانی ئەمەریکادا ئەم ولاّتانە ناچار کران بێنە نێو ریزی ئەم ریککەوتننامەوە. بەلاّم بەوحاڵەش دنیا شایەدی نموونەی "کردەیدڵخوازانە"ی ولاّتانی وەک ئەفریقیای باشوور [و، هەروەها لیبیا.و.] بۆ وازهێنان لە دروستکردنی چەکی ئەتۆمیش بووە.

## ریککەوتننامەی ڤەرشۆ (١٩٥٥) Warsaw Pact

ریککەوتننامەیەکی سەربازی بوو کە بە رواڵەت بە مەبەستی بەرگریکردن و لە بەرامبەر ریککەوتننامەی ناتۆ لە نێوان ولاّتانی کۆمۆنیستی ئەورووپای رۆژهەلاّتدا پێکهات. ئەم ریککەوتننامە لە ١٤ی مانگی ئایاری ١٩٥٥ لە شاری ڤەرشۆ بۆ ماوەی بیست ساڵ لە نێوان ولاّتانی سۆڤیەت، ئەڵمانیای رۆژهەلاّت، ئەلبانیا، بولگاریا، چیکسلۆڤاکیا، هەنگاریا، پۆڵەندا ورۆمانیادا گرێدرا. مەبەست لە ریککەوتننامەی ڤەرشۆ پێکهێنانی هاوکاریە سیاسی و سەربازیەکان لە نێوان ئەو ولاّتانەو، زیادکردنی هێزە بەرگرییەکان لە بەرامبەر هێرشی دەوڵەتە رۆژئاواییەکان بوو. بەپێی ئەم ریککەوتننامە، هەرکام لە لایەنەکان هێرشی کرابا سەر، ئەرکی ولاّتانی ئەندام ئەوە بوو کە دەبوایە بەهەموو هێز و کەرەسەکانی بەردەستیان پشتیوانیان لیَ کردباو، هاوکاریان کردبا.

ناوەندی ڕێنوێنی هێرشە سەربازییەکان لە مۆسکۆ بوو. ئەلبانیا لە ساڵی ١٩٦٨ وازی لە ئەندامەیتی لەم ڕێککەوتننامەدا هێنا. ڕێککەوتننامەی ڤەرشۆ، ڕۆڵێکی گرنگی لە سەرکوتی بزووتنەوە نێوخۆییەکاندا گێڕا. هێرشی سوپاکانی ڕێککەوتننامەی ڤەرشۆ بۆ سەر پراگ (هاوینی١٩٦٨ )یەکێک لەو نموونانەیە. سۆڤیەت لە مانۆڕەکانی ڕێککەوتننامەکە بۆ چاوترسێن کردن و سەرکوت و خنکاندنی بزووتنەوە کرێکارییەکانی پۆلەندا کەڵکی وەرگرت (١٩٨١-١٩٨٠) کە هیچ ئاکامێکی نەبوو. دوای ئەو گۆڕانکارییانەی کە لە ساڵی ١٩٨٩ لە وڵاتانی ئەورووپا ڕۆژهەڵاتدا هاتنە ئاراوە، ڕێککەوتننامەی ڤەرشۆش لە تەممووزی ١٩٩١ بەڕەسمی هەڵوەشایەوە.

## ڕێککەوتنی ئەلجەزایر(١٩٧٥) **Algerian Accord**

دوا بە دوای کۆبوونەوەی ڕێبەرانی وڵاتانی هەناردەی نەوت (ئۆپێک)کە لە چوار هەتا شەشی مارتی ١٩٧٥ لە ئەلجەزایر بەڕێوە چوو، ڕاگەیەنراوێکی هاوبەشی نێوان عێراق و ئێران سەبارەت بە چۆنیەتی چارەسەرکردنی کێشەکانی نێوانیان لە سەربنەمای ڕەچاوکردنی پرەنسیپەکانی ڕێزگرتن لە یەکپارچەیی خاک و سنوور نەبەزاندن و دەست تێوەرنەدان لە کاروباری نێو خۆیی یەکتر بەو شێوە بلاّو بۆوە:

١ــ سنوورە وشکایییەکانی خۆیان بەپێی پرۆتۆکۆلی قوستەنتنیەی (ئیستانبول) ساڵی ١٩١٣ و بریارنامەکانی کۆمیسیۆنی دیاریکردنی سنوور لە ساڵی ١٩١٤ دا دیاری بکەن.

٢ــ سنوورە ئاوییەکانی خۆیان بەپێی هێڵی تالڤێگ دیاری بکەن.

٣ــ بەم کارە، هەردوو وڵات ئاسایش لە درێژایی سنوورە هاوبەشەکانی خۆیان و متمانەی بەرامبەرانە پیادە دەکەن.

بەم پێیە، هەر دوولایەن بەڵێن دەدەن کە کۆنترۆڵ و چاوەدێرییەکی ورد لە سنوورەکانی خۆیاندا بەمەبەستی پێشگرتن لە هەر دزەکردنێکی تێکدەرانە پێک بێنن.

٤ــهەر دوو لایەن لە سەر ئەوە ڕێککەوتوون کە بە وردی نێوەڕۆکی ڕێککەوتننامەکە جێبەجێ بکەن؛ پێشێلکردنی هەر ماددەیەک بە دژی ڕێککەوتننامەکە بە دژی ڕۆحی ڕێککەوتننامەی ئەلجەزایر دادەنرێ.

### ڕێککەوتنی نێونەتەوەیی *International Agreement*

ئەم زاراوە بەواتا بەرفراوانەکەی بریتیە لە کردەوەیەکی یاسایی کە لە دەرئەنجامی ڕازیبوونی دوو یان چەند لایەنی نێودەوڵەتی پێکدێ و یاسا نێودەوڵەتیەکان دەیانگرێتەوە. بەپێی ئەم پێناسە، تایبەتمەندییەکانی ڕێککەوتنی نێونەتەوەیی بریتین لە:

١ـ پێویستی بە بەڵگەو نووسراوە نیە. [ئەم ڕێککەوتنە ڕەنگە هەروا زارەکیانە بێ]

٢ـ لە نێوان لایەنە نێودەوڵەتیەکان(نەکەسە تایبەتیەکان) گری درابێ.

٣ـ یاسا نێو دەوڵەتیەکان دەیانگرێتەوە(نەتەنیا یاسای نێو خۆیی وڵاتێکی دیاریکراو).

٤ـ لە نێوان دوویان چەند لایەندا پێک دێ و، یەک لایەنە نیە.

### ڕێککەوتنی ئاشتیی دایتۆن(١٩٩٦) *Dayton Accord*

بەو ڕێککەوتنە دەگوترێ کە لە تشرینی دووهەمی ١٩٩٦ بۆ کۆتایی هێنان بە شەڕی بۆسنیا جێبەجێ کرا. بەم پێیە، دەوڵەتی بۆسنیا پێکهاتوو لە "فیدراسیۆنی کرۆئات ـ موسوڵمان" و "کۆماری سیرب" دامەزرا.

### ڕادیکاڵیزم *Radicalism*

ڕادیکاڵیزم لە زاراوەی لاتینی Radix وIcis بە واتای "بنج و بناوان"، وەرگیراوە. ڕادیکاڵیزم بە واتای باو بە لایەنگریکردن لە ئاڵ وگۆڕە بنەڕەتیەکان دەگوترێ. ڕادیکاڵیزم بۆ یەکەمجار لە وڵاتی بەریتانیا لە لایەن "شارلز فۆکس"(١٨٠٦-١٧٤٩)، ڕێبەری حیزبی ڤیگ هاتە ئاراوەو بە ئەندامانی حیزبی ڤیگ دەگوترا کە خوازیاری چاکسازی بنەڕەتیی لە پەرلەمان و ئاییندا بوون و پشتیوانیان لە پرۆتستانیزم دەکرد.

لە سەدەی نۆزدەهەمدا ڕادیکاڵەکان، بە بەشێکی گەورە لە بۆرژوازی لیبراڵی بەریتانیا دادەنران. داواکاری سەرەکی ڕادیکالیستەکان، چاکسازی یاسای هەڵبژاردن بوو کە لە ساڵی ١٨٣٢دا وەدیهات. لەگەڵ پێکهێنانی حیزبی سۆسیالیست لە بەریتانیادا، ئەم حیزبە تازە دامەزراوە

بوو بە حیزبێکی رادیکاڵ. لە فەرەنسادا، بیروبۆچوونی رادیکالی کە پرۆسەیەکی ئابووری، سیاسی، عەقڵی پرش و بڵاو بوو، لە حیزبی رادیکالی کۆماریخواز و رادیکالی سۆسیالیستدا خۆی نواند.

جۆرج کلمانسۆ (١٨٤١-١٩٢٩)سیاسەتمەداری بەناوبانگ، یەکێک لە گەورەترین رێبەرانی باڵی چەپی حیزبی رادیکاڵی سۆسیالیست بوو.

ئەمڕۆکە رادیکاڵیزم بە هەموو بیروبۆچوون و کردەیەکی سیاسی، ئابووری و کۆمەلایەتیی دەگوترێ کە خوازیاری ئاڵووگۆڕی خێراو [بنەڕەتیی] لە دامووەدزگاو رێکخراوە کۆمەلایەتیەکان دا بێ(بەمانا گشتیەکەی).

بە زۆری مارکسیەکان، سۆسیالیستە توندڕۆکان، سەندیکالیستەکان، ئانارشیەکان و حیزبە چەپە توندڕۆکان، بە رادیکاڵ دەژمێردرێن.

## *The Right*

## *راست*

زاراوەی راست بە هێندێک لەو تیۆریە سیاسییانە دەگوترێ کە لە خالی بەرامبەری خۆیاندا، واتا لە بەرامبەر "چەپ"دا راوەستاون. لە سەرەتادا "دەستە راست"ی بەو کەسە دەگوترا کە لە بەرامبەر هێرشی شۆرشگێرانی فەرەنسا، داکۆکی لە حکوومەتی پاشایەتی و ئاریستۆکراتە بەکرێگیراوەکان دەکرد. بە درێژایی سەدەی نۆزدەهەم ئەم زاراوەیە هاوواتای دەسەلاتخوازی، نیشتمان پەروەری، نەریت، حکوومەتی بەهێز، خاوەنداریتی ، کەنیسە و سوپا بوو. لە دوای دامەزراندنی کۆماری سێهەم لە فەرەنسادا، "راست" هەروا لایەنگری لە حکوومەتی پاشایەتی دەکرد. بەلام لە هەموو شوێنەکاندا لە بەرامبەر سۆسیالیزمدا سەری هەڵدا کە بەرژەوەندی سەرمایەداری خستبووە مەترسیەوە. "راست" نە تەنیا دژی "یەکسانیخوازی" بوو، بەڵکوو دژی دەستێوەردانی دەوڵەت لە بواری ئابووریشدا بوو. بیروبۆچوون و ئاراستەی ناسیۆنالیستی یۆتۆپیایی بەرەبەرە لە ناو " راستی نوێ"دا تەشەنەی کرد و لەدوای شەڕی یەکەمی جیهانی، راستێکی بنئاژۆی نوێ سەری هەڵدا کە لە گەڵ راستی کۆنەپارێزی نەریتیدا لە دژایەتیدا بوو. ئەم "راست"ە دژی بەرژەوەندی چینە باڵادەستەکان بوو. نازیسمی هیتلەری لە ئەڵمانیادا، توندرۆترین حاڵەتی راست بوو. لە دوای شەڕی دووهەمی جیهانی، هەر دوو زاراوەی راست و چەپ بە واتای جیاواز کەڵکیان لێ وەرگیراوە. هێندێک لە بەها نەریتیەکانی راست لە بەرامبەر یەکتردا راوەستان و هەوێرێکی سیاسی

نوێی هێنایە ئاراوە. لە دوای شەڕی دووهەمی جیهانیەوە، نازناوی "ڕاست" بە بەراورد لەگەڵ نازناوی "چەپ" ، زیاتر واتایەکی قێزەونە کە هەم لە ڕۆژئاوا و هەم لە ڕۆژهەڵاتیشدا ئەم واتایەی هەیە. ڕاستی ناسیۆنالیست لە ڕۆژئاوا بەهۆی دژایەتی لەگەڵ یەکیەتیی ئەوروپا لەگەڵ چەپی بنئاژۆخوازدا یەکیان گرت (فەرەنسا). لە ڕۆژهەڵاتدا نەیارانی دەستە ڕاستیەکان لەگەڵ سیستەمی زاڵی یەکیەتیی سۆڤیەتدا دژایەتیان دەکردو لە چینیشدا بنئاژۆ "چەپەکان" پشتیوانیان لە شۆڕشی کوولتووریی ماو کرد.

## *ڕاستی نوێ* — *New Right*

دیاردەی ڕاستی نوێ، تێکەڵاوێک لە توخمەکانی نیۆلیبرالیزم و نیۆ کۆنەپارێزیە . لە دەیەی ١٩٨٠ دا، زۆربەی حکومەتەکانی ڕۆژئاوا لەبەرامبەر قەیرانی ئابووری دەیەی ١٩٧٠، وازیان لە سیاسەتە ئابوورییەکانی کینزی هێنا و بەرەو ئاراستەی ڕاست ڕۆیشتن. ڕاستی نوێ، ڕادیکاڵیزمێکی ڕاست و هێرشبەرە کە بنەماکانی خۆی لە لیبرالیزم و کۆنەپارێزی وەرگرتووە و بۆ پێناسەی هەڵوێستی نیۆلیبراڵ و کۆنەپارێزەکان کەڵکی لێ وەردەگیردرێ. لەبەریتانیادا تاچریزم، سیاسەتە لیبراڵیەکانی وەکوو بە تایبەتی کردن و کەم کردنەوەی ئەو نرخانەی کە دەوڵەت دەبوایە بیدایە و، بێ هێزکردنی یەکیەتیە کرێکارییەکانی لەگەڵ سیاسەتەکۆنەپارێزانەکانی وەکوو ناسیونالیزمی توندڕۆ، کونترۆڵ کردنی کۆچ و دیسپلینی توندی کۆمەڵایەتی لێک دا.

پۆپۆلیزمی تاچێر تێکەڵاوێکی دەولەمەندەو بنەما کۆنە پارێزییە ئۆرگانیکیەکانی وەکوو نەتەوە، خێزان، ئەرک، ئوتۆریتە، پێوەرە ئەخلاقیەکان و نەریتخوازی لەگەڵ بنەما هێرشبەرانەکانی نیۆلیبرالیزم، واتە بەرژەوەندی شەخسی تاکایەتیی ڕکابەری و دژایەتیی لەگەڵ دەوڵەت لێک دەدا. ڕاستی نوێ بە تایبەتی سەبارەت بە سیاسەتە کۆنەپارێزییەکانی بەریتانیا لە سەردەمی تاچێر و حیزبی کۆماریخوازی ئەمەریکا لە سەردەمی ڕۆناڵد ریگان دا کەڵکی لێ وەرگیردراوە. بەگشتی ڕاستی نوێ لە بواری ئابووری و سیاسییەوە لیبراڵە، واتە لەسەر ئازادی ئابووری، کەم کردنەوەی باج، بازاڕی ئازاد و ڕۆڵی بەرتەسکی دەوڵەت پێدادەگرێ. بەڵام لە بواری ئەخلاقی، کولتووری و کۆمەڵایەتی دا کونەپارێزەو داکۆکی لە پاراستنی نایەکسانیە سروشتییەکان، پێشگیری کردن لە بەربڵاوبوونی

مافە کۆمەڵایەتیەکانی هاووڵاتیان، دەوڵەتی بەهێز، بنەما ئایینەکان، خێزان وەکوو بناغەی کۆمەڵگا، لاواز کردنی یەکیەتیە کرێکاریەکان دەکا. لە بواری کۆمەڵایەتیش دا لە گەڵ کاری ژنانی ماڵەوە (کابان) و ئازادییە سێکسیەکانی فیمینیزم دا دژایەتیی دەکا. راستی نوێ ئەو کاتەی کە دەستێوەردانی دەوڵەت بە پێچەوانەی ئازادیە تاکەکەسیەکان دەبینێ، بەرەو لیبرالیزم دەخزێ، بەڵام کاتێک بە پێچەوانەی مانەوەی نایەکسانیە سروشتیەکانی دەبینێ، بەرەو کۆنە پارێزێ دەڕوا، بەڵام لە بواری سیاسیەوە،واتە بەمەبەستی دابینکردنی سەقامگیرکردنی ئاسایش بەهێز دەبێ. بزوتنەوەی کۆنەپارێزی نوێ لە ئەمەریکا کە لە دوای شەڕی دووهەمی جیهانی دا سەری هەڵدا، لێکدانی بیرۆکەی کۆنەپارێزی و لیبراڵی بە جوانی دەردەخا. ئەم بزووتنەوەیە بەردوام پشتیوانی لە دەوڵەتی هەرێمەکان لە بەرامبەر دەوڵەتی فیدراڵ و لە بازاری ئازاد لە بەرامبەر دەوڵەت خۆشگوزەرانیدا دەکا. لە بنەڕەت دا کۆنەپارێزی نوێ لە بەرامبەر"سیاسەتی (New Deal)ی فرانکلین رۆژڤەڵت لە دەیەی ١٩٣٠دا سەری هەڵدا، بەڵام لە بواری بابەتە ئەخلاقی و کولتوورییەکانیش دا هەڵوێستی گرتووە، بە تایبەتی لەگەڵ بەربڵاوبوونی سکولاریزم (عەلمانیەت ) و فەوتانی بەها ئایینیەکان و ئازادییە سێکسیەکان دا دژایەتی دەکرد. گرنکترین نوێنەرانی ئەم بزوتنەوەیە "سیناتۆر جوزێف مەک کارتی" (رێبەری بزوتنەوەی دژە کومونیستیی مەک کارتیزم)؛ سیناتۆر بێری گوڵدڤاتێرو جۆرج ڤاڵاس بوون و، گۆڤاری" نەشناڵ ریڤێڤیو" لە واشینگتۆن ئورگانی ئەم بزوتنەوەیە بوو. بزوتنەوەی کۆنەپارێزی نوێ لە ئەمەریکا دا لەم دواییانەدا لەگەڵ باڵێ راستی حیزبی کۆماریخوازدا پێوەندییەکی توندوتۆڵتریان هەیە. هەروەها لەگەڵ بزوتنەوەی زانستی ئایینی لە ئەمەریکادا بە ریبەرایەتی جێری فالڤێل و گرووپی زۆرینەی ئەخلاقی دا پێوەندییەکی خۆشتریان هەبووە.

## Racism

### راسیزم / رەگەزپەرستی

راسیزم لە وشەی راس (Race) بە مانای رەگەز وەرگیراوە. رەگەزپەرستی تیۆرێکی دژە زانستی و کۆنەپەرستانەیە کە بڕوای بە نایەکسانیی نێوان رەگەزەکان لە بواری توانایی و هێزی بیرکردنەوەدا هەیە. نموونەی زەقی راسیزم، بەرێوەبردنی سیاسەتە دژە مرۆڤانەکانی ئەمەریکا لە دژی سوورپێست و رەش پێستەکانی ئەم وڵاتەیە کە سەرەڕای جاڕنامەی مافی مرۆڤ هەروا درێژەی هەیە. رەش پێستەکانی رۆدزیاو و ئەفریقیای باشووریش چەند جار بوونە قوربانیی سیاسەتە

ناومرۆڤانەکانی بەریتانیا. ئادۆلف هیتلەر، ڕێبەری ئەڵمانیاش لە ژێر دەمامکی رەگەزی باشتردا، چەند میلیۆن جوولەکەی کوشت.

### ڕێپێوانی درێژمەودا(١٩٣٠-١٩٣٤) *Long March*

ئەم واتایە بە کۆچی قارەمانانەی ڕێبەرانی کۆمۆنیستی چین لە نێوان ساڵی ١٩٣٤-١٩٣٥ دەگوترێ بەر لە هاوینی ساڵی ١٩٣٤ کۆیبنی تانگ، کۆمۆنیستەکانی لە بەشی ناوەڕاستی چین بە ناوی ویلایەتی کیانگ سی گەمارۆدا. نزیکەی ٩٠ هەزارکەس گەمارۆکەیان شکاند و بەرەو ویلایەتی کویچۆ لە رۆژئاوای چین وەرێ کەوتن.لەم ناوەدا ماوتسێ تۆنگ بە سەرۆکی مەکتەبی سیاسی حیزبی کۆمیسیۆنی چین هەڵبژێردرا و بڕیاری دا هەتا بنکەی شن سی لە دواشوێنی باکووری رۆژئاوای چین دا ڕێپێوان درێژە پێبدا.

سەرەڕای ناخۆش بوونی ڕێگاکە و هێرشەکانی کۆیبنی تانگ لە درێژایی شەش هەزار مایلی، نزیکەی یەک لە سێی بەشدارانی ڕێپێوانەکە گەیشتنە شن سی. ئەم بنکەیە نەیارەکانی لە بەرانبەر هێزی حکوومەتی چین دا دەپاراست و شوێنێکی پارێزراویش بۆ کۆبوونەوەکانیان بوو.

### ڕێگای سێهەم *Third way*

"ڕێگای سێهەم" دروشمێکە کە بەدوای پێکهێنانی ئەڵتەرناتیڤێک لە نێوان سەرمایەداری و سوسیالیزم دایە. ئەم ئەڵتەرناتێڤە بیریارانی سیاسی لە توێژە جۆڕاوجۆرەکان، بە لای خۆیدا ڕاکێشاوە. سەرچاوەی زاراوەی ڕێگای سێهەم دەگەڕێتەوە بۆ فاشیزمی ئیتالیا و، موسولینی پێی وایە کە ئەو بۆ یەکەمین جار ئەم زاراوەیەی داهێناوە. "ڕێگای سێهەم"ی فاشیزم بە شێوەی کۆرپۆراتیزمە، کە سیستەمێکی ئابووری ـ کۆمەڵایەتیە کە لەو سیستەمە دا، بەرژەوەندییە بنەڕەتیە ئابوورییەکان لە ژێر چاودێری حکوومەت دان. لە قۆناغەکانی دوایی ساڵی ١٩٤٥، "ڕێگای سێهەم" بە پلەی جیاواز لە گەڵ سوسیال دێموکراسی کیتری دا گەشەی کرد و پێشکەوتووترین شێوەی ڕێگای سێهەم لە سوید دا پێکهات. ئەم شێوازە ئابوورییە هەوڵ دەدا کە فاکتەرگەلێک لە سەرمایەداری و سوسیالیزم لێک بدا. ئەگەرچی سەرمایە بەرهەم هێنەکان بە زۆری لە بەر دەستی کەرتی تایبەتی دایە، بەڵام یەکسانیی کۆمەڵایەتی بە هۆی سیستەمێکی خۆشگوزەرانی هەمەلایەنە لە

سەر بنەمای ڕێکخستنی باجی پێشکەوتووەوە دابین دەبێ. بیری ڕێگای سێهەم لە قۆناغەکانی دواتر دا و بە بیرۆکەی سوسیال دێموکراسی یا پۆست ـ سوسیالیست (post_ socialist) لە حیزبی کرێکار (نوێ) ی بەریتانیا، بەڕێبەرایەتی تۆنی بلێر هاتە گۆڕێ.

تایبەتمەندی "ڕێگای سێهەم" ی پۆست ـ سوسیالیست زۆر ڕوون نیە، بەڵام لە زۆربەی شێوازەکانیدا هەڵگری قبوولکردنی گشتی بازاڕ و سەرمایەی بەجیهانی کراو لە گەڵ ئەرکی کۆمەڵایەتی و خستنە ئەستۆی دوولایەنەی ماف و بەرپرسیارەتیەکانە.

### *Reich* — *رایخ*

زاراوەیەکی ئەڵمانیە بە "ئیمپراتۆریای ئەڵمانیا" و "حکوومەتی ئەڵمانیا" دەگوترێ. لە مێژوودا "رایخی یەکەم"، ئیمپراتۆریای ڕۆمی ڕۆژئاوایە کە لە سەدەی نۆهەمی زایینی لە ئەورووپای ناوەڕاست دا دامەزرا و زۆربەی ئەم ئیمپراتۆریە لە وڵاتانی ئەڵمانی زمان پێکهاتبوو و بنەماڵەی هایسبۆرگ بەڕێوەیان دەبرد. رایخی یەکەم لە ساڵی ٩٦٢ دا پێکهات و لە ساڵی ١٨٠٦ دا لە نێوچوو. "رایخی دووهەم" یش ئیمپراتۆریای ئەڵمان بوو کە لە ساڵی ١٨٧١ تا ١٩١٨ ی خایاند. رایخی سێهەم حکوومەتی هیتلەرە کە لە ساڵی ١٩٣٣ تا ١٩٤٥ ی خایاند. لە نێوان رایخی دووهەم و رایخی سێهەم دا حکوومەتی کۆماری لەسەر دەسەڵات بوو.ئەم حکوومەتە لە ساڵی ١٩١٩ تا ١٩٣٣ وڵاتی بەڕێوە دەبرد وبە کۆماری ڤەیمەر بەناوبانگ بوو.

رایخی سێهەم، ڕۆژی ٣٠ کانوونی دووهەم ی ساڵی ١٩٣٣ دامەزرا. هیتلەر پێیوابوو کە هەزار ساڵ دەژی و باسی رایخی هەزار ساڵەی دەکرد، بەڵام لە دوازدە ساڵ و چوار مانگ زیاتری نەخایاند.

### *Richtg* — *رایختاگ*

رایختاگ، پارلمانی ئەڵمانیا لە سەردەمی ئیمپراتۆریادا بوو کە بیناکەی لە بەرلین بوو کە لە ساڵی ١٩٣٣ بە فیتی نازییەکان سووتێنرا.

**رایخ مارشاڵ** ***Richs marschal***

پلەیەکی تایبەتیی سەربازی لە سوپای نازیدا بوو کە هیتلەر بە تایبەتی دایە فیلد مارشاڵ هێرمان گورینگ کە پایە بەرزترین کەسایەتی حیزبی نازی لە دوای خۆی بوو.

**رایخ ڤێهر** ***Rich wehr***

زاراوەیەکی ئەڵمانیە و بە سوپای سەد هەزار کەسی کۆماری ئەڵمانیا دەگوترێ کە بە پێی ڕێککەوتننامەی ڤێرسای پێکهات.

**رژێم** ***Régime***

لە زاراوەی لاتینی Reginien وەرگیراوەو بە مانای ڕێسایەکە کە سەبارەت بە شێوەی ژیان کەڵکی لێ وەردەگیردرێ. لە قاموسی سیاسیدا بە واتای جۆری حکوومەت و شێوەی بەڕێوەبردنی وڵاتە.

**رژێمی کونترۆڵی تەکنولۆژیای موشەکی(١٩٨٧)**
***Missilo Technology control Régime(MTCR)***

ڕێککەوتننامەیەکە کە لە ساڵی ١٩٨٧ لە نێوان کەنەدا، فەرەنسا، ئەڵمان، ئیتالیا، ژاپۆن، بەریتانیا و ویلایەتە یەگکرتووەکان دا پێکهات. پاشان یەکیەتیی سۆڤیەت و چین وەکوو ئەندامی چاوەدێرچوونە ناو ڕێککەوتننامەکەوە.

لە راستیدا ئەو ڕێککەوتننامەیە تەواوکەری "ریککەوتننامەی پێشگیری کردن لە پەرە پێدانی چەکە ناوەکیەکان"ە کە گواستنەوەی ئەمجۆرە چەکانە، ناردنی تەکنولۆژیا و ئامێرەکانی هاویشتنی ئەم چەکانە بە تایبەتیی بۆ وڵاتانی جیهانیی سێهەم قەدەغە دەکا. ڕێککەوتننامەکە تەنیا ئەو لایەنانەی کە ڕێککەوتننامەکەیان مۆر کردووە ناچار دەکا کە یاساکان رەچاو بکەن، و ئەو وڵاتانەی کە ڕێککەوتننامەکەیان مۆر نەکردووە، زۆر بایەخ بە رەچاوکردنی ئەم یاسایانە نادەن.

**ریفراندۆم / راپرسی** ***Referndum***

ریفراندۆم بریتیە لەپرس پێکردن بەرای گشتی ولآت سەبارەت بە بابەتێکی تایبەتی بەمەبەستی ئەوەی هاولآتیان بە شێوە راستەوخۆسەبارەت بەو بابەتە دەنگ بدەن. لە هێندێک ولآت دا (وەکوو ئوستورالیا) گۆرینی دەستوور تەنیا لە رێگای پرس پێکردن بەرای گشتیەوە جێبەجێ دەبێ.

## رۆژنامەی زیندوو — *Living News Paper*

شانۆنامەیەکی سیاسی- پەروەردەییە کە لە هونەری رۆژنامەنووسی بۆ دەربرینی کێشەکانی کۆمەلگا بە شێوەی گالتەجاری کەلک وەردەگرێ. رۆژنامەی زیندوو بە شێوەی شانۆنامەی هاندان و پروپاگەندەیی لە لایەن سوپای سوور لە شۆرشی روسیا دا گەشەی کرد.

## رووناکبیران — *Intellectuals*

ئەم زاراوەیە یەکەمجار لە رووسیا لە دەیەی ١٨٦٠ بەو کەسانە دەگوترا کە لە زانکۆکاندا خوێندبوویان کە بیروبۆچوونێکی رەخنەگرانەیان هەبوو یان نەهیلیست بوون. ئەم کەسانە بەچاوی گومانەوە دەیانروانیە بەها نەریتیەکان. لە فەرەنسادا ئەم زاراوەیە بە واتایەکی سووک، سەبارەت بە دریفۆسەکان کەلکی لێوەردەگیرا. مارکس لە مانیفێستی کۆمۆنیست دا، رووناکبیرەکان بە بەشێک لە بۆرژوازی دادەنێ کە خۆیان بە چینی کرێکارەوە هەلدەواسن و مەبەستیان رێگانیشانداندان بەم چینەیە. ئەمرۆکە رووناکبیران بوونە چینێکی دیاری کۆمەلایەتی.

## روهر — *Rühr*

شارێکی ولآتی ئەلمانیایە، کە لە راستی دا شادەماری پیشەسازییە گەورەکان، پۆلآ و بەردی خەلووزی ئەم ولآتەیە. ئەم هەرێمە لە کانوونی دووهەمی ١٩٢٣دا بە هۆی ئەوەی ئەلمانیا نەیتوانی قەرەبووی ئەو زیانانە بکاتەوە کە بە پێی رێککەوتننامەی ڤێرسای خرا بووە سەری، لە لایەن فەرەنسە و بەلجیکاوە داگیرکرا. ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، بەریتانیاو ئیتالیا، پشتیوانیان لە ئیتالیا و فەرەنسا نەکرد وئەلمانیاش بە کردوەیەکی هێرشبەرانەی لە دژی دانا.

### ڕۆیزیۆنیزم /پێداچوونەوەخوازی — *Revisionism*

ڕۆیزیۆنیزم لە زاراوەی لاتینی Reviser بە واتای "چاو لێکردنەوەو و دووبارە پێداچوونە" وەرگیراوە. ڕۆیزیۆنیزم، بەپێداچوونەوە بە بنەما بنەڕەتیەکان و ئەرکەکانی دوکترینێک دەگوترێ. بە کەسێکیش کە خوازیاری پێداچوونەوە بە دۆکترین یان ئایدۆلۆژیایەک بێ، ڕۆیزیۆنیستی پێ دەڵێن. پێداچوونەوە بە ئاکامەکانی جێبەجێکردنی ئایدۆلۆژیایەکیش، جۆرێک لە ڕۆیزیۆنیزمە. لە هێندێک لە سیستەمە سیاسییەکانی جیهاندا پێداچوونەوەخوازی بە هەوڵێکی نۆێخوازی نابەجێ دادەنرێ. بۆ وێنە هێندێک لە سوسیالیستە سەربەخۆکان بڕوایان بە پێداچوونە هەیە و خوازیاری هەڵسەنگاندن و خوێندنەوەیەکی نوێن، کە لە گەڵ هەلومەرجدا بگونجێ. لە ڕووسیای سۆڤیەت لە دوای شۆڕشی سۆسیالیستی ١٩١٧، هێندێک کەس دیانگووت دەبێ مارکسیزم لەگەڵ هەلومەرجی نوێ دا بگونجێنرێ. لە بەرامبەردا، لنین(١٨٧٩-١٩٢٤) دژی هەرجۆرە خۆێندنەوەو پێداچوونەوەیەک بوو و بەوکەسانەی دەگووت "پێداچوونەوە خواز" و، پێداچوونەوەخوازی بەپاشەکشەو سازان لە قەڵەم دەدا.

سۆسیال دێموکرات و چەپەمیانڕۆکان لە ڕوانگەی مارکسیە توندڕۆکانەوە، پێداچوونەوەخوازن. سوسیال دیموکراتەکان پێیان وایە پێوێست ناکا لەبە گشتی کردن و بە دەوڵەتی کردنی خاوەنداریێتی ئامێرەکانی بەرهەم هێنان لە هەموو بوارەکان دا پەلە بکەین، دەبێ بەرەبەرە دەست بە گۆڕان بکەین. و لەداهاتوودا سیستەمی سوسیالیستی و پاشانیش سیستەمی کۆمۆنیستی دامەزرێ.

ڕۆیزیۆنیستەکان زیاتر خوازیاری پێداچوونەوە لە کاروباری سیاسی، دەستوور و هێندێک ئاڵ وگۆڕی بنەڕەتیی لە پێکهاتە و ئەرکەکان دان. ئەلکساندێر دوبچێک (ڕێبەری پێشووی حیزبی کۆمۆنیستی چیکۆسلۆڤاکیا) کە بڕوای بە شێوازێک نوێی سۆسیالیزم بوو، بە یەکێک لە ڕۆیزیۆنیستەکان دانرا و، کەوتە بەر ڕق و تووڕەیی سۆڤیەت.

مارشاڵ تیتۆ، ڕێبەری یۆگسلاڤیا، هەم بە ریفۆرمیست (چاکسازی خواز) و هەم بە ڕۆیزیۆنیست لە قەڵەم دراوە. لە سۆڤیەت دا خرۆشچۆفیشیان بە ڕۆیزیۆنیست دادەنا. پێداچوونەوەخوازی لە گرووپەکان، حیزبەکان و وڵاتانی کۆمۆنیست، بەواتای لادان و پێکهاتن لەگەڵ سەرمایەداری دایەو بە خیانەت لە قەڵەم دەدرێ.

## Organiziation Armée Secréte — ڕێکخراوی سوپای نهێنی

ڕێکخستنی سوپای نهێنی لە نێوان ساڵەکانی ١٩٦١-١٩٦٣ پێکهات و هێندێک لە ئەندامانی سوپای فەڕەنسا کە لە ئەلجزایر دەژیان (کۆلۆنی فەڕەنسا)، هەوڵیان دا بە کەلک وەرگرتن لە زۆر ڕێگا بە سەربەخۆیی ئەلجەزایر بگرن. سوپای نەهێنی لە هێندێک لە ئەندامانی توندڕۆی فەڕەنسا و خەڵکی ئاسایی فەڕەنسا کە نیشتەجێی ئەلجەزایر بوون، پێکهاتبوو، ئەو کاتە پێکهات کە حکوومەتی فەڕەنسا بە سەرۆکایەتیی ژنەڕاڵ دۆگۆل خوازیاری سەربەخۆیی ئەلجەزایر لە فەڕەنسا بوو.

## Free Officers Committee — ڕێکخراوی ئەفسەرە ئازادەکان

ئەم ڕێکخراوە لە ساڵی ١٩٣٨ لە شاری منقیادی میسردا پێکهات . ئەم ڕێکخراوە کە جەمال عەبدولناسر ئەندامی بوو لە ساڵی ١٩٥٢دا ڕۆڵی سەرەکیی لە گۆڕینی حکوومەتی میسردا هەبوو و ئەندامەکانی لەدوای گۆڕینی حکومەت، کۆنترۆڵی وڵاتیان بە دەستەوە گرت.

کومیتەی بەڕێوەبردنی ڕێکخراوکە لە سەرەتای ساڵی ١٩٥٠دا پێنج ئەندامی هەبوو و پاشان بوو بە ٩ ولە دوایش دا بوو بە ١٣ کەس. لە دوای شۆڕشی ١٩٥٢ ی میسر، ژمارەی ئەفسەرە ئازادەکان گەیشتە چەند سەد کەس. لە دوای ئەم شۆڕشە، فاروق بۆ هەمیشە میسری بە جێهشت و کومیتەی بەڕێوەبردنی ڕێکخراوی ئەفسەرە ئازادەکان وەکو" ئەنجومەنی ڕێبەرایەتیی شۆڕش" کۆنترۆڵی کاروبارەکانی گرتە دەست کە سەرۆکەکەی جەمال عەبدوالناسر بوو. بەڵام عەبدوالناسر لە سەرەتادا وای بە باشتر زانی کە لە یەکەمین قۆناغ دا ژەنەڕاڵ محەممەد نەجیب بێتە گۆڕەپان و، ئەو لە پشتی پەردەوە ڕێبەرایەتیی کاروبارەکان بکا. ناسر بۆ خۆی لەڕێکەوتی ١٨ ی نیسانی ١٩٥٤ دا دەسەڵاتی گرتەدەست.

## ڕێکخراوی ڕێککەوتننامەی ئاتلانتیکی باکوور (ناتۆ)
## North Atlantic Orgarniziation (NATO)

بەو ڕێککەتننامە سەربازییە دەگوترێ کە لە ٤ی نیسانی ١٩٤٩ لە نێوان وڵاتانی بەلجیکا، کەنەدا، دانیمارک، فەڕەنسا، بەریتانیای گەورە، ئایسلەندا، ئیتالیا، لوگوزامبۆرگ، هۆڵەندا، نەرویج، پورتوگال، ئەمەریکا، یۆنان و تورکیا (١٩٥١)، ئەڵمانیای ڕۆژئاوا (١٩٥٥) و ئسپانیا دا

(۱۹۸۲) مۆر کرا. بە پێی ماددەی پێنجەمی ئەم ڕێکخراوە، هێرشکردنە سەر یەک یان دوو وڵاتی ئەندام، بە هێرشکردن بۆ سەر تەواوی ئەو وڵاتانە دادەنرێ و، ناتۆ ناچارە داکۆکی لەو وڵاتە بکات کە هێرشی کراوەتە سەر. ناتۆ لە بنەڕەت دا بە مەبەستی پاراستنی ئاسایشی ئەورووپای ڕۆژئاوا لە بەرامبەر هێزی سەربازی سۆڤیەت و بەرەی ڕۆژهەڵات و لە ڕاستیدا بۆ پێشگیری لە تەشەنەکردنی کۆمۆنیزم دامەزرا.ئەنجوومەنی ئاتلانتیکی باکوور، بەرزترین دامەزراوەی ناتۆیە و ئەرکی هەماهەنگی لە نێوان لقەبەڕێوەبەرییەکان و کۆمیتەی بەڕێوەبەری لە ئەستۆدایە. ناتۆ خاوەنی سێ فەرماندەیی سەربازییە. فەڕنسا لە ساڵی ۱۹٦٦ دا هێزەکانی ناتۆی لەو وڵاتە وەدەرنا بۆ خۆی دەستی لە ئەندامەتی فەرماندەیی سەربازیی کێشایەوە. سەرەڕای ئەمە لە بەشی پشتیوانی سەربازی و بەرنامەکانی دیکەی وەکوو دابینکردنی بوودجە و دامەزراوە مەترسیدارەکان دا مایەوە. لە دوای داڕمانی دیواری بەرلین، یەکگرتنەوەی دوو ئەڵمانەکان و هەرەسهێنانی یەکیەتیی سۆڤیەت، پێکهاتەی ناتۆ گۆڕانی بەسەر داهات.

هێندێک پێیانوایە کە بە ڕاگەیاندنی ڕەسمیی کۆتایی شەڕی سارد، ناتۆ ئەو ڕۆڵەی جارانی نەماوە. بەڵام هێندێک لە خاوەنڕایان پێیانوایە کە بە هەرەسهێنانی یەکیەتیی سۆڤیەت، ئەرکی ناتۆ تەواو نەبووە و رووسیا وەکوو جاران، دەسەڵاتدارانی ڕۆژئاوا هەروا لێی دەترسن بە بڕوای ئەوان ناتۆ ئەرکێکی دیکەی جگە لە ئەرکی سەربازی لەسەر شانە و وەکوو ئامرازێکی سیاسی، هاوکارییە ئابووریە ـ کۆمەڵایەتیەکان، شانبەشانی هاوکارییە سەربازییە ـ سیاسیەکان، گەرەنتی دەکا.

لە پێناوی بەرنامەی نوێی ناتۆ لە چوارچێوەی "بەشداریکردن لە پێناوی ئاشتی" دا، کۆبوونەوەی ناوبەناوە لە ژێر ناوی:(۱+۱٦) بە بەشداری ئەندامان و وەزیرانی دەرەوە و بەرگری رووسیا پێک دەهات و لە کۆتاییش دا لە مانگی ئایاری ۱۹۹۷، ئەم وڵاتە بە مۆرکردنی ڕێککەوتننامەیەک لە پاریس دا، ئامادەیی خۆی بۆ هاوکارییە دوولایەنەکان لە بوارەکانی ئاسایش لە گەڵ ناتۆدا ڕاگەیاند.

لە درێژەی ئەندامەتیی وڵاتانی ئەورووپای ڕۆژهەڵات دا، کۆماری چیک، هەنگاریا، و پۆڵۆنیاش چوونە ناو ناتۆوە (۱۲ی ئازاری ۱۹۹۹). بە پەسند کردنی ئەندامەتیی سلۆڤانیا، سلۆڤاکیا،

ستۆنیا، لیتۆنیا، لیتڤانیا، بولگاریا و ڕۆمانی (نیسانی ٢٠٠٤)، ڕادەی ئەندامانی ناتۆ گەیشتە ٢٦ وڵات.

ناتۆ ئەگەرچی لە بەرنامەی خزان بەرەو ڕۆژهەڵات دا، قەزاقستانیشی کردە ئەندامی "بەرنامەی بەشداریکردن لە پێناوی ئاشتی" دا و، مەودای نفووزی خۆی گەیاندە نزیک سنوورەکانی چین، بەڵام ڕووداوی ١١ی ئەیلوولی ٢٠٠١ بووبە هۆی ئەوەی کە ئەمەریکا بە بیانووی بەرەنگاریکردن لە گەڵ تیرۆریزم و هێرش بۆ سەر ئەفغانستان، هێزە سەربازییەکانی خۆی لە وڵاتانی ئوزبەکستان، تاجیکستان و قرقیزستان دابەزێنێ و بنکەی سەربازی لەو وڵاتانە دامەزرێنێ.

وێدەچێ ئەمەریکا بە دامەزراندنی هێزە سەربازییەکانی خۆی لە ناوچەکە بە بەشداریکردنی هێزەکانی بەریتانیا و فەڕەنسا هەنگاوێکی نوێی بۆ کۆنترۆڵ کردنی سەرچاوەکانی نەوت و گازی ئاسیای ناوەڕاست و ئاڕاستەی ئەم سەرچاوانە هەڵگرتبێ و نیشانی بدا کە ناتۆ ئێستاش کەڵکی خۆی هەروا ماوە.

### *ڕێکخراوی بازرگانی جیهانی*
### *World Trade Organization (WTO)*

ئەم ڕێکخراوە کە لە دوای بڕیاری ١٢٤ وڵاتی ئەندامی ڕێککەوتننامەی گشتی تەعرفەی گومرک و بازرگانی (گات) پێکهات، لە کانوونی دووهەمی ١٩٩٥ جێگای ئەم ڕێککەوتننامەی گرتەوە و هەتا ڕێکەوتی ٢٥ی مانگی ئایاری ٢٠٠٥، ١٤٩ وڵات بوون بە ئەندامی ئەم ڕێکخراوە. ئامانجە بنەڕەتیەکانی ڕێکخراوی بازرگانی جیهانی هەروەکوو لە دەقەڕەسمیەکەی گاتیش دا ئاماژەی پێکراوە؛ بردنە سەری ئاستی ژیان بۆ وڵاتانی ئەندام، پێکهێنانی هەل و دەرفەتی کارکردن، بردنە سەری داهاتە ڕاستەقینەکان و ئاستی داخوازی (طلب)، کەڵک وەرگرتنی کاریگەرتر لە سەرچاوەجیهانیەکان و پەرەپێدانی بەرهەمهێنان و بازرگانیە نێودەوڵەتیەکانە. ئەرکی بنەڕەتی ئەم ڕێکخراوە، گەیشتنی بەم ئامانجانەیە بە هۆی پێکهێنانی ئەو دەرفەت و تواناییانەی کە دەبنە هۆی دابەزینی بەهای گومرک و نەهێشتنی جیاوازی و ئاستەنگەکانی دیکەی بەردەمی بازرگانیکردن. شێوازی کار و تێکۆشانی ئەم ڕێکخراوە لە سەر ئەم چوار بنەما گرنگ و بنەڕەتیانە ڕاوەستاوە.

بنەمای یەکەم: گشتگیرکردنی بێ کۆت و بەندی بنەمای بەناوبانگی "حکومەتی کاملەالوداد " و نەهێشتنی هەڵاواردن لە نێوان وڵاتانی بەڵێنداری بازرگانی نێو دەوڵەتی.

بنەمای دووهەم: نەهێشتنی سەپاندنی مەرجە ژمارەییەکان لە هەنارده و لە هاورده دا.

بنەمای سێهەم: کەمکردنەوەی نرخی تەعرفەی گومرک بە هۆی دانوستان و گەرەنتی ڕەچاوکردنی ئەو ڕێککەوتننامانەی کە بەم شێوە دێنە ئاراوە.

بنەمای چوارەم: ڕاوێژکردن لە سەر سیاسەتە بازرگانیەکان لە گەڵ ئەندامانی دیکە و چارەسەری کێشە و ناکۆکی پەیوەندییە بازرگانیەکان لە ڕێگای وتووێژەوە.

### *ڕێکخراوی جیهانی خاوەنداریتیی رۆحانی (مەعنەوی)*
### *World Intellectuall Property Organization (WIPO)* .

ڕێکخراوی جیهانیی خاوەنداریتیی مەعنەوی سەرچاوەکەی بۆ کۆنڤانسیۆنی پاریس (١٨٨٣) و کۆنڤانسیۆنی بێرن (١٨٨٦) دەگەڕێتەوە . کۆنڤانیسۆنی پاریس، یەکیەتی نێودەوڵەتی بۆ پشتیوانیکردن لە خاوەنداریتی مەعنەوی و کۆنڤانسیۆنی بێرنیش یەکیەتیی نێودەوڵەتیی بۆ پشتیوانیکردن لە بەرهەمە ئەدەبی وکولتورییەکانیان پێکهێنا. ئەم دوو دامەزراوە نێودەوڵەتیە بە "یەکیەتیی پاریس" و "یەکیەتیی بێرن" بەناوبانگن. هەرکام لەم کۆنڤانسیۆنانەبەڕێوەبەرییەکی نێودەوڵەتیان بۆخۆیان پێکهێناوە.ئەم بەڕێوەبەرییانە لە ساڵی ١٨٩٣ دا تێکەڵاوی یەکتر بوون و بە ناوی جیاوازەوە تێکۆشاون کە دوایین ناویان "بەڕێوەبەرییە یەکگرتووە نێودەوڵەتیەکان بۆ پشتیوانی لە خاوەنداریتی مەعنەوی" بوو.

ڕێکخراوی جیهانی خاوەندایتی مەعنەوی بە پێی کونڤانسیۆنی ستۆکهۆڵم (١٤ی تەمموزی ١٩٦٧) کە لە ٢٦ی نیسانی ١٩٧٠ جێبەجێ بوو، هاتە ئاراوە. بەڕێوەبەرییە یەکگرتووە نێودەوڵەتیەکان، بۆ پشتیوانی لە خاوەنداریتی مەعنەوی ئێستاش بۆ ئەو دەوڵەتانەی کە ئەندامی یەکیەتیەکانی بێرن یان پاریسن، بەڵام نەبوونە ئەندامیی ئەم ڕێکخراوە،هەروا یاسایین. ڕێکخراوی جیهانیی خاوەنداریتی مەعنەوی لە کردەوەدا جێگای ئەم دامەزراوەی گرتۆتەوە و لە یەک جیا ناکرێنەوە. ئەم ڕێکخراوە لە ڕێکەوتی ١٧ ی کانوونی یەکەمی ١٩٧٤ دا بۆتە چواردەهەمین دامەزراوەی پسپۆری سیستەمی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان(UN) .

به پێی ماددەی ٣ی کۆنڤانسیۆنی ستۆکهۆڵم، ئامانجەکانی ئەم ڕێکخراوە بریتین لە:

(الف) پەرەپێدانی پیشتیوانیکردن لە خاوەندارێتی مەعنەوی لە هەمووجیهاندا، لە ڕێگای هاوکاریکردنی نێوان دەوڵەتەکان و لە کاتە پێویستەکان دا پەرەپێدان بە هاوکاریکردن لەگەڵ ڕێکخراوە نێو دەوڵەتیەکانی دیکەدا.

(ب) گەرنتی هاوکاری ئیداری لە نێوان یەکیەتیەکان دا.

بەپێی ماددەی ٤ ی کۆانڤانسیۆنی ستۆکهۆڵم، ئەم ڕێکخراوە بەمەبەستی دەستڕاگەیشتن بەم ئامانجانە لە ڕێگای لق و پۆپەکانی خۆی و بەپێی توانایی ودەسەلاّتی هەرکام لە یەکیەتیەکان، ئەم ئەرکانە لە ئەستۆ دەگرێ:

(الف) پەرەپێدانی ئەو هەولاّنەی کە بۆ ڕێگە خۆشکردنی پشتیوانی کاریگەر لە خاوەندارێتی مەعنەوی لە هەموو جیهان دا، دارِێژراون، جگە لەمە هاوئاهەنگی یاسا نیشتمانیەکان پەرپێدەدا.

(ب) ئەرکە ئیدارییەکانی یەکیەتیی پاریس، یەکیەتیە تایەتیە پێکهاتووەکانی سەربەو یەکیەتیەو یەکیەتیی بێرن جێبەجێ دەکا.

(ج) کۆنڤانسیۆن دەتوانێ جێبەجێکردنی ڕێککەوتننامە نێودەوڵەتیەکانی دیکە کە ئامانجیان پەرەپێدان و هاندانی پشتیوانیکردن لە خاوەندارێتی مەعنەوییە، وەئەستۆ بگرێ یان لە جێبەجێکردنیان دا بەشداری بکا.

(د) هاندانی گرێبەستی ئەو ڕێککەوتننامە نێودەوڵەتیانە کە ئامانجیان پشتیوانی لە خاوەندارەتیی مەعنەوییە.

(هـ) هاوکاری ئەو دوەڵەتانەی کە داوای یارمەتیی یاسایی۔ تەکنیکی لە بواری خاوەندارێتی مەعنەوی دا دەکەن.

(ز) کۆکردنەوە و بلاّو کردنەوەی ئەو زانیارییانەی کە سەبارەت بە خاوەندارێتی مەعنەویین، ئەو لێکوڵینەوانەی کە لەم بوارەدا دەکرێن جێبەجێیان دەکا و پەرەیان پێ دەدا و دەرئەنجامەکانیان بلاّودەکاتەوە.

(ح) پشتیوانی لەو دام ودەزگایانە دەکا کە ئاسانکاری بۆ پشتیوانی نێو دەوڵەتیی لە خاوەندارێتی مەعنەویدا دەکەن و لە کاتی پێویست دا ئامرازەکانی تۆمار کردن و بڵاوکردنەوەی زانیارییەکانی ئەم بوارە دابین دەکا.

**ڕێکخراوی جیهانیی خاوەندارێتی مەعنەوی لەم بەشانە پێکهاتووە:**

۱) کۆگای گشتی

۲) کۆنفرانس

۳) هەماهەنگی

٤) نووسینگەی نێودەوڵەتی

### *ڕێکخراوی کۆنفرانسی ئیسلامی*

### ***OrganiziationOFIslamicConference (OIC)***

گەورەترین ڕێکخستنی ئیسلامیە کە لە ٥٧ ئەندام پێکهاتووەو بە شێوەی ڕەسمی لە ئەیلوولی ١٩٦٩ لە کۆنفرانسی ڕێبەرانی وڵاتانی ئیسلامی لە ریبات (پایتەختی مەغریب) پێکهات. هۆکاری کۆبوونەوەی ڕێبەرانی وڵاتانی ئیسلامی، سووتاندنی مزگەوتی ئەقسا لە ڕێکەوتی ٢١ی ئابی ١٩٦٩ لە ئورشەلیم ودۆزینەوەی هۆکارەکانی ئەو شکستە بوو کە وڵاتانی عەرەبی لەشەڕی ئیسرائیلدا لە حوزەیرانی١٩٦٧ تووشی ببوون.

ئامانجی کۆنفرانسی ئیسلامی بردنەسەری ڕادەی یەکگرتوویی ئیسلامی لە نێوان وڵاتانی ئەندام، پتەو کردن و پەرەپێدانی هاوکارییە ئابووری، کۆمەڵایەتی و کولتوورییەکان، نەهێشتنی هەڵاواردنی ڕەگەزی، پشتیوانی لە ئاشتی نێودەوڵەتی، بە هێزکردن و پشتیوانی لە موسڵمانان لە خەبات بۆ پاراستنی شوناس، سەربەخۆیی و مافە نیشتمانیەکانیانە.

ئاڵ و گۆڕە بنەڕەتیەکانی دوو دەیەی ڕابردوو لە گۆڕەپانی جیهان دا و لەوانە هەرەسهێنانی بەرەی کۆمۆنیزم، کۆتایی شەڕی سارد و هەوڵی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بۆ سەپاندنی دەسەڵاتی بێ ئەملاولای خۆی بە سەر سیستەمی نێو دەوڵەتیی دا، ئەندامانی ڕێکخراوی کۆنفرانسی ئیسلامیی هان داوە تا بە لێکدانەوەی ئەم ئاڵ و گۆڕانە و هەڵسەنگاندنی کارو کردەوەکانی ئەم ڕێکخراوە لە بواری جیاوازە سیاسی، کولتووری، کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکان دا

لە پێناوی بەهێزکردنی ڕۆڵی ئەم ڕێکخراوە هەوڵ بدەن پێکهێنانی گرووپی کەسایەتیە گەورەکان بەمەبەستی ڕەخنە و لێکدانەوەی ئەرک و ڕۆڵی ڕێکخراو لە بوارە جیاوازەکان دا، لەو هەولانەن کە بۆ ئەم مەبەستە لە حەوتەمین کۆبوونەوەی سەرۆکانی ولاتانی ئیسلامی بڕیاریان لەسەردرا. لە ڕوانگەی ئەم گرووپەوە پێداچوونەوە و تێکوشانی ڕێکخراوی کۆنفرانسی ئیسلامی دەبێ بە دەوری ئەم تەوەرانەدا بخولێتەوە:

_ دارشتنی ستراتیژیی نوێ بە مەبەستی جموجۆڵی زیاتری ڕێکخراوەکە لەبەرامبەرئەوئاڵ و گۆڕە نوێیانەی کە لە گۆڕەپانی نێودەوڵەتی دا هاتوونە ئاراوە.

_ گۆڕینی واتای یەکگرتوویی ئیسلامی لە خەباتی دژی کولۆنیالیزمی کۆن بۆ ڕاستیە نوێکان و شێوازە نوێکانی دیکەی زاڵبوون.

_ پێکهێنانی گرووپێکی پێکهاتوو لە سکرتێر(ئەمیندار) و دەستەی سەرۆکایەتی بۆ پێکهێنانی چاکسازی لە پێوەندییەکانی ولاتانی ئیسلامیدا.

_ نیشاندانی وێنەیەکی ڕاستەقینە لە ئیسلام و هەڵسووکەوتی پۆزەتیڤ لەگەڵ مەسەلە نێودەولەتیەکان دا.

_ هاوکاری ڕێکخراو لەگەڵ ڕێکخراوە نێودەولەتیەکانی دیکەدا.

_ پێکهێنانی کۆمەڵێکی ئابووری ئیسلامی.

_ هێنانە گۆڕی ئامانجە نوێکانی وەکوو مافی مرۆڤی ئیسلامی، دیموکراسی، مافی منداڵان و....هتد لە پاڵ ئامانجە دیارەکانی جاڕ نامەی ڕێکخراوەکە.

_ کەڵک وەرگرتن لە نموونەی ڕێکخراوی ئاسایش و هاوکاری ئەوروپا بۆ پتەو کردنی پێوەندی نێوان ولاتانی ئیسلامی.

_ دیاریکردنی دەسەلاتی سکرتێر (ئەمیندار) و ڕێک و پێک کردنی باری ماددیی سکرتاریا.

ئەم ڕێکخراوە، کومیتەی قودس و فەلەستینی بۆ چارەسەری کێشەی فەلەستین و ئیسرائیل، پێکهێناوە. چارەسەری مەسەلەی فەلەستین یەکێک لە ئامانجەکانی جاڕنامەی ئەم ڕێکخراوەیە. هەروەها ئەم ڕێکخراوە کومیتەیەکی بەناوی" یەکگرتوویی و ئاسایش " پێکهێناوە کە لەم ولاتانە پێکهاتووە: پاکستان، ئەندەنۆسیا، بەنگلادیش، تورکیا، کۆماری ئیسلامی ئێران لە ئاسیا،

نیجێر، سێنێگال، گینە، ئوگاندا و کامیرۆن لە ئەفریقیا، عەرەبستان، مەغریب، میسر، کوێت و سوریا لە ولاتانی عەرەبی.

بە دوای قەیرانی بۆسنەو هێرزەگۆڤین و کوشتاری موسڵمانانی ئەم ولاتە، رێکخراوی کۆنفرانسی ئیسلامی لە میکانیزمێکی دیکە کەڵکی وەرگرت؛ گرووپی تەماسی بۆسنە لە ٢٤ ی ئاریای ١٩٩٢ بەدوای بلاوبوونەوەی بەیاننامەی ئەندامانی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لە نیویۆرک دا، بە مەبەستی هەماهەنگی پێکهات. بەو پێیەی کە ئەزموونی پێکهێنانی گرووپی تەماسی بۆسنە سەر کەوتوو بوو، ساڵ و نیوێک دوای ئەوە گرووپی تەماسی" جامۆوکشمیر" لە رەوتی حەوتەمین کۆبوونەوەی نائاسایی وەزیرانی دەرەوە لە ئیسلام ئابادی پاکستان دا پێکهات. هەروەها رێکخراوی کۆنفرانسی ئیسلامی بایەخی بە مەسەلە کولتووری و کۆمەڵایەتیەکانیش داوە. رێکخراوی پەروەردەوفێرکاری، زانستی ، کولتووری، ناوەندی توێژینەوەی مێژوو، هونەر و کولتووری ئیسلامی، کۆمیسیۆنی نێودەوڵەتیی پاراستنی میراتی ئیسلامی و فیدراسیۆنی وەرزشە یەکگرتووەکانی ئیسلام لەم هەولانەن و، کۆماری ئیسلامی ئێرانیش پێشنیاری دامەزراندنی رێکخراوی نێودەوڵەتیی ئیسلامی ژنانی کردووە. لە هەوڵەکانی دیکەی ئەم رێکخراوە، رێکخستن و دارشتنی ستراتیژێکی کولتووری بۆ جیهانی ئیسلامە کە دەرئەنجامی باس و راوێژ لەسەر مەسەلە کولتوورییەکانی جیهانی ئیسلام لە کۆبوونەوە پسپۆرییەکانی دامەزراوەکانی سەربەم رێکخراوەیە.

چالاکی ئابووریی ئەم رێکخراوە بەربلاو بووە، بەلام کاریگەرییەکی ئەوتۆی نەبووە، لەم پێوەندییەدا دەتوانین ئاماژە بە دامەزراندنی ئۆرگانەکان و دامەزراوە جۆراوجۆرە ئابوورییەکانی وەکوو: کومیتەی هەمیشەیی هاوکارییە ئابووری و بازرگانیەکان، کومیتەی هەمیشەیی هاوکارییە زانستی و تەکنیکیەکان، بانگی پەرەپێدانی ئیسلامی، ژووری بازرگانی و پیشەسازییە ئیسلامییەکان و ناوەندی ئیسلامیی پەرەپێدان بکەین.بەلام سەرجەم وا پێدەچێ کە سەرەرای دامودەزگا جیاوازەکان، بەرنامەرێژی ئابووری و بازرگانیی ولاتانی ئەندام لە پێناوی بەهێزکردنی هاوکاری ئابووری لە نێوان ولاتانی ئەندامی رێکخراوی کۆنفرانسی ئیسلامی دا، دانەرێژراوە.

## ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان
## The United Nations Organiziation

ڕێکخراوەی نەتەوە یەکگرتووەکان لە دوای شەڕی دووهەمی جیهانی بۆ پێشگیری کردن لە ڕوودانی شەڕ و برەودان بە ئاشتی جیهانیی پێکهات. ئەوهۆکارانەی بواریان بۆ پێکهاتنی ئەم ڕێکخراوە رەخساند، بریتی بوون لە:

جارنامەی ئاتلانتیک، ڕاگەیەندراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ساڵی ١٩٤٢، ڕاگەیاندراوی ئاسایشی گشتی کە لە تشرینی یەکەمی ١٩٤٣ لە نێوان ئەمەریکا، بەریتانیا و سۆڤیەت لە مۆسکۆدا مۆرکرا، کۆنفرانسی تاران لە ساڵی ١٩٤٢، کۆنفرانسی دێمبارتن ئوکس لە ساڵی ١٩٤٤، کۆنفرانسی یالتا لە ساڵی ١٩٤٥و کۆنفرانسی سانفرانسیسکو لە ساڵی ١٩٤٥. ڕاگەیەندراوی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتەوەکان لە ٢٤ی تشرینی یەکەمی ١٩٤٥ لە لایەن هێندیک لەو وڵاتانەی کە پێویست بوو دەنگی پێ بدەن، پەسند کرا و، لەو ڕێکەوتەوە جێبەجێ دەبێ.

**ئامانجەکانی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بریتین لە:**

پاراستنی ئاشتی و ئاسایشی نێو دەوڵەتی، پەرەپێدانی پێوەندی دۆستانە لە نێوان نەتەوەکان لەسەر بنچینەی ڕێزدانان بۆ بنەمای یەکسانی لە مافەکاندا، سەربەخۆیی نەتەوەکان و هاوکاری نێو دەوڵەتیی بۆ چارەسەرکردنی کێشە نێودەوڵەتیەکان کەلایەنە ئابووری، کۆمەلآیەتی و کولتووری و مرۆڤدوستانەکان لەخۆ دەگرێ و، هەروەها پێکهێنانی ناوەندێک بۆ ڕێکخستنی ئەو هەولآنەی کە نەتەوە جیاوازەکان بۆ گەیشتن بەم ئامانجانە دەیدەن. کۆڵەکە سەرەکیەکانی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بریتین لە: کۆمەڵەی گشتی، ئەنجوومەنی ئاسایش، ئەنجوومەنی ئابووری و کۆمەلآیەتی، ئەنجوومەنی سەرپەرستیاری، دیوانی دادی نێودەوڵەتی و سکرتاریا. ئەنجوومەنی ئاسایش ٥ ئەندامی هەیە: ئەمریکا، چین، فەرەنسا، بریتانیا و ڕووسیا کە خاوەن مافی ڤیتۆن. ئەڵمانیا، بەرازیل، هیند و ژاپۆنیش خوازیاری ئەوەن کە ببنە ئەندامی هەمیشەیی ئەنجوومەنی ئاسایش کە پێویستیان بە دوو لە سێی دەنگی ئەندامانی ڕێکخراو هەیە. بەپێی جارنامەی نەتەوە یەکگرتووەکان هەموو ئەو نەتەوە ئاشتیخوازانەی کە بڕیارەکانی ڕێکخراو پەسند دەکەن و بە پێی بڕیارەکانی ڕێکخراویش جێبەجێیان دەکەن، دەتوانن ببنە ئەندام. دەوڵەتەکان لە سەر پێشنیاری ئەنجوومەنی

ئاسایش، لە لایەن کۆمەڵەی گشتیەوە دەبنە ئەندامی ئەم ڕێکخراوە. جاڕنامە هەروەها هەڵپەساردنی مافی ئەندامەتیی یان وەدەرنانی ئەندامەکانی لە بەرامبەر پێشێل کردنی بنەماکانی ڕێکخراو دیاریکردووە، بەڵام تا ئەمڕۆکە ئەوە لەسەر هیچ ئەندامێک جێبەجێ نەکراوە.

بە پێی جاڕنامەی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان، زمانە ڕەسمیەکانی ئەم ڕێکخراوە بریتین لە: ئیسپانی، ئینگلیزی، چینی، رووسی و فەڕەنسی. زمانی عەرەبیش، بۆتە زمانی ڕەسمی کۆمەڵەی گشتی، ئەنجوومەنی ئاسایش و ئەنجوومەنی ئابووری و کۆمەڵایەتی.

**لە سەرەتای جاڕنامەکەدا هاتووە:**

"ئێمە خەڵکی نەتەوە یەکگرتووەکان، بە بڕیاردان لە سەر پاراستنی جیلەکانی داهاتوو لە کارەساتی شەڕ کە دوو جار لە ماوەی تەمەنی مرۆڤێک دا، مرۆڤەکانی تووشی ئازارێکی لە ڕادەبەدەر کردووە و بە ڕاگەیاندنی دووبارەی بەڵێنی خۆمان بە مافە بنەڕەتیەکانی مرۆڤ و گەورەیی و بایەخی کەسایەتیی مرۆڤ و بە یەکسانی نێوان ژن و پیاو و هەروەها لە نێوان نەتەوە گەورە و چکۆلەکان و بە پێکهێنانی هەلومەرجی پێویست بۆ پاراستنی یەکسانی و ڕێزدانان بۆ پێویستیەکانی پێڕەوی کردن لە ڕێککەوتننامەکان و سەرچاوەکانی دیکەی مافە نێودەوڵەتیەکان و بردنەسەری ئاستی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی و هەل ومەرجی ژیانێکی باشتر بە ئازادی زیاتر و بۆ گەیشتن بەم ئامانجانە بە تەبایی و پێکەوە هەڵکردن و ژیانی ئاشتیانە لە گەڵ یەکتر و رۆحێکی پاکی دراوسێیانە و بە یەکخستنی هێزی خۆمان بۆ ڕاگرتنی ئاشتی و ئاسایشی نێودەوڵەتی و بە پەسندکردنی بنەماکان و پێکهێنانی ئەو شێوازانە کە کەڵک وەرگرتن لە هێزە چەکدارەکان تەنیا بۆ گەیشتن بە ئامانجە هاوبەشەکان گەرەنتی بکا و، بە پەنا بردنە بەر ئامراز و دەلاقە نێودەوڵەتیەکان بۆ پێشخستنی پێشکەوتنی ئابووری و کۆمەڵایەتی هەموو نەتەوەکان بڕیارمان داوە کە پێکەوە بۆ وەدیهێنانی ئەم ئامانجانە هەوڵ بدەین و هەربۆ ئەم مەبەستەش،دەوڵەتەکانمان لە ڕێگای نوێنەرەکانیەوە کە لە شاری سانفرانسیسکۆ کۆبوونەوە و دەسەڵاتی تەواویان هەیە و متمانە و ڕاستی دەسەڵاتەکەشیان دانی پێدانراوە، لە سەر جاڕنامەی نەتەوە یەکگرتووەکان ڕێککەوتن و، بەم شێوە ڕێکخراوێکی نێودەوڵەتی کە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانی پێ دەگوترێ، دادەمەزرێنێ.

**ئامانجەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان بە پێی ماددەی یەکەمی جاڕنامەکە بریتین لە:**

١. پاراستنی ئاشتی و ئاسایشی نێودەوڵەتی و بۆ ئەم مەبەستەش: وەگەڕخستنی هەوڵی بەکۆمەڵی کاریگەر بۆ پێشگیری کردن و نەهێشتنی ئەو مەترسیانەی دەکرێنە سەر ئاشتی، ڕاگرتنی هەر کردەوەیەکی هێرشبەرانە یان هەموو ئەو هەولانەی کە ئاشتی پێشێل دەکەن و، پێکهێنانی هاوسەنگی و چارەسەری کێشەی نێودەولەتی یان ئەو هەل ومەرجانەی کە ڕەنگە ببنە هۆی پێشێل کردنی ئاشتی لە ڕێگای ئاشتیخوازانە و بە پێی بنەماکانی یەکسانی و مافە نێودەولەتیەکان.

٢. پەرەپێدانی پێوەندی دۆستانە لە نێوان نەتەوەکان لە سەر بنچینەی ڕێزدانان بۆ بنەمای یەکسانی ماف و خودموختاری گەلان و هەوڵی پێویستی دیکەش بۆ پتەوکردنی ئاشتی جیهانی.

٣. گەیشتن بە هاوکاری نێو دەوڵەتی بۆ چارەسەرکردنی مەسەلە نێودەوڵەتیەکان کە لایەنی ئابووری، کۆمەڵایەتی، کولتووری یا مرۆڤدوستیان هەیە و بۆ بەرەوپێش بردن و ڕێزدانان بۆ مافی مرۆڤ وئازادییە بنەڕەتیەکان بۆ هەمووان بە بێ جیاوازی رەگەز، ژن و پیاو(زمان، ئایین و....).

٤. بوونی ناوەندێک بۆ ڕێکخستنی ئەو هەولانەی کە نەتەوەکان بۆ گەیشتن بەم ئامانجە هاوبەشانە دەیدەن.

**بە پێی ماددەی دووی جاڕنامە :**

١. ڕێکخراو و ئەندامەکانی بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی ماددەی ١ بە پێی ئەم بنەمایانە دەجوولێنەوە .

٢. ڕێکخراو لەسەر بنەمای یەکسانیی دەسەڵاتداریێتی هەموو ئەندامەکانی راوەستاوە.

٣. تەواوی ئەندامەکان بەمەبەستی گەرەنتی ماف و ئیمتیازەکانی ئەندامەتیی، ئەو بەڵێنانەی کە بە پێی ئەم جاڕنامە وەئەستۆیان گرتووە، بە نیەت پاکیەوە بەڕێوەیان دەبەن.

٤. تەواوی ئەندامەکان کێشە نێودەوڵەتیەکانی خۆیان بە شێوەی ئاشتیانە بە جۆرێک کە ئاشتی و ئاسایشی نێو دەوڵەتی و یەکسانیی نەکەوێتە مەترسیەوە، چارەسەر دەکەن.

٥. تەواوی ئەندامەکان لە پێوەندییە نێودەوڵەتیەکانیان دا لە هەڕەشە یان کەڵک وەرگرتن لە هێز و زۆر لە دژی یەکپارچەیی خاک یان سەربەخۆیی سیاسی هەرولاتێک یانلە کەڵک

وەرگرتن لە هەر شێوازێکی دیکە کە لەگەڵ ئامانجەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان دا ناتەبا بێ، خۆ دەبوێرن.

٦. تەواوی ئەندامەکان لە هەر هەوڵێک کە ڕێکخراو بە پێی ئەم جاڕنامەیە دەیاندا، هەموو یارمەتیەکی ڕێکخراو دەدەن و لە یارمەتیدانی هەر وڵاتێک کە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لە دژیان سزای پێشگیرانە یا توندوتیژ دەسەپێنێ، خۆدەبوێرن.

٧. هەروەها ڕێکخراو چاوەدێری ئەو وڵاتانەش دەکا کە ئەندامی ئەم ڕێکخراوە نین، هەتا ئەو ڕادەی کە بۆ پاراستنی ئاشتی و ئاسایشی نێو نەتەوەیی پێویست دەکا، بە پێی ئەم بنەمایانە بجووڵێنەوە.

٨. هیچ کام لەو یاسایانەی کەلە جاڕنامەکەدا هاتوون، ڕێگا بە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان نادەن کە دەست لەو بوارانە وەربدا کە پێوەندییان بە کاروباری نێوخۆیی وڵاتان هەیە و، هەروەها ئەندامەکانیش ناچار ناکا کە چارسەرکردنی ئەم بابەتانە بە یاساکانی ئەم جاڕنامەیەوە ببەستنەوە، بەڵام ئەم خاڵە یان بنەمایە زیان بە سەپاندنی سزای توندی فەسڵی حەوتەم ناگەیەنێ.

ڕادەی ئەندامانی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتەوەکان لە ساڵی ٢٠٠٢دا گەیشتە ١٩١ وڵات.

### *ڕێکخراوی یەکیەتیی ئەفریقیا*

### *Organiziation Of African Unitt (OAU)*

ڕێکخراوێکی نێودەوڵەتیە کە لە ٢٥ی ئایاری ١٩٦٢ لە ئادیس ئابابا، پایەتەختی ئەتیۆپی دامەزرا. ئامانجەکانی بە پێی ماددەی دووی جاڕنامەی ڕێکخراوەکە بریتین لە: بەرەوپێشبردنی یەکیەتیی و یەکگرتوویی نێوان حکومەتەکانی ئەفریقیا و نەهێشتنی هەر جۆرە کۆلۆنیالیزمێک لە ئەفریقیادا. بەمەبەستی ڕێک وپێک کردن و ڕێکخستنی پێوەندی نێوان وڵاتانی ئەفریقی، هێندێک بنەمای گشتی وەکوو: یەکسانیی ڕەهای وڵاتانی ئەندام، خۆبواردن لە کاری تێکدەرانە لە وڵاتانی ئەندام دا، نەگۆڕینی سنوورەکان و چارەسەری کێشەکان لە ڕێگا ئاشتیخوازانەوە، لە بەرچاو گیرابوو.

ئەم ڕێکخراوە ٥٣ ئەندامی هەبوو. ئەفریقیای باشوور لە ساڵی ١٩٩٤ بوو بە ئەندامی ئەم ڕێکخراوەو بزوتنەوەی ڕزگاریدەری پولیساریۆش لە ساڵی ١٩٨٢دا بوو بە ئەندامی ڕێکخراوەکە. بە هۆی جیاوازی زۆر لە نێوان ئەندامەکان دا، گەلاڵەکانی ئەم ڕێکخراوە بە زۆری تووشی شکست دەبوون.

لە پاش پێکهێنانی دوایین کۆبوونەوەی ڕێکخراو، لە ئەفریقیای باشووری (تەمموزی ٢٠٠٢)، ڕێکخراوی یەکیەتیی ئەفریقیا بەرەسمی هەڵوەشایەوەو، "یەکیەتیی ئەفریقیا" جێگاکەی گرتەوە.

## ڕێکخراوی یەکیەتیی گەلانی ئاسیا و ئەفریقیا
## Afro_Asian Peoplos Solidarity Organiziation (AAPSO)

ڕێکخراوێکە کە بیروڕای کۆمۆنیستی هەیە و لەژێر چاوەدێری ئەنجوومەنی ئاشتی جیهانیدا بەمەبەستی ڕێکخستنی گرووپە " بێلایەن" و "هێمنایەتیخوازەکان "کان لە جیهانی سێهەم دا تێدەکۆشێ.

## ڕێکخراوی هاوکاری ئابووری ئەورووپا(١٩٦١-١٩٤٨)
## Organiziation Of European Economic Co-Operation

**(OEEC)**ئەم ڕێکخراوە لە ساڵی ١٩٤٨ لە لایەن ١٦ وڵاتی ( نەمسا، بەلجیکا، دانیمارک، فەڕەنسا، یۆنان، ئیسلەند، ئیرلەندا، ئیتالیا، لۆکزامبۆرگ، هۆڵەندا، نەرویج، پورتوگال، سوید، سویسرا، تورکیا و بەریتانیا) بۆ بەرەوپێشچوونی بەرنامەی مارشاڵ و لە پێناو هەماهەنگ کردنی ئابووری ئەو وڵاتانەی کە لە یارمەتیەکانی "بەرنامەی بووژانەوە"ی ئەورووپا کەڵکیان وەردەگرت، پێکهات. کۆماری فیدراڵی ئەڵمانیا و ئیسپانیا هەرکام بە ریز لە ساڵەکانی ١٩٥٥و ١٩٥٩ بوونە ئەندامی ئەم ڕێکخراوە. یۆگسلاڤیاش تاڕادەیەک ڕێگای پێدرا کە لە بەرنامەکانی ئەم ڕێکخراوەدا بەشداری بکا. کەنەدا و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاش ئەندامانی بەستراوەی ڕێکخراو بوون. لە ٣٠ی ئەیلوولی ١٩٦١، ڕێکخراوی هاوکاری و پەرەپێدانی ئابووری (OECD)جێگای ئەم ڕێکخراوەی گرتەوە.

### *ڕێکخراوی هاوکاری و پەرەپێدانی ئابووری*

### *Organiziation Of Economic Co-Operation And Development (OECD)*

ڕیکخراوی هاوکاری و پەرەپێدانی ئابووری لە OEEC جیا بۆتەوە. ئەندامان و ئەرکەکانی کۆمەڵەی نوێ بەرە بەرە پەرەیان سەند. OECD سێ دەسەڵاتی گەورەی ئابووری لە خۆ گرتووە کە کاتی خۆی لە OEEC کشابوونەوە: ویلایەتە یەکگرتووەکان، ژاپۆن و کەنەدا. هەروەها ئەو ئەرکانەی کە ئەم ڕێکخراوە نێودەوڵەتیە لە ئەستۆی گرتوون، پەرەیان سەندووە. لە سەرەتادا پەرەپێدان بەڕاشکاوی وەکوو ئەرکی سەرەکی ئەم ڕێکخراوە دیاریکرا. لەسەرەتای پێکهێنانی ئەم ڕێکخراوە لە ساڵی ١٩٦١ دا، هەوڵی بەرفراوان کردنی ئەرکی ئەم ڕێکخراوە لە بوارە گشتیەکانی وەکوو: کۆمپانیا فرەرەگەزەکان، گواستنەوەی تەکنەلۆجیا و پێوەندیگرتن لەگەڵ گروپگەلی وەکوو ئۆپێک دراوە. OECDبە هۆی ئەو ڕێکەوتننامەی کە لایەن ٢٠ دەوڵەتەوە لەڕێکەوتی ١٤ی کانوونی یەکەم لە پاریس دا مۆر کرا، دامەزرا. ئەو وڵاتە سەرەکیانەی کە ئەم ڕێکەوتننامەیان مۆر کرد بریتین لە: نەمسا، بەلجیکا، کەنەدا، دانیمارک، فەرەنسا، ئەڵمانیا، یۆنان، ئیسلەند، ئایرلەند، ئیتالیا، لوکزامبۆرگ، بەریتانیا و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا. ژاپۆن لە ساڵی ١٩٦٤ دا بووە ئەندامی ئەم ڕێکخراوە. ئێستاکە جگە لە ئەندامانی دامەزرێنەر، ئوستڕالیا، فینلەندا و نیوزلەندیش ئەندامی ئەم ڕێکخراوەن.

بە پێچەوانەی یەکیەتیی ئەورووپا، OECD بە تەمای ئەوە بوو کە ڕێکخراوێکی نێودەوڵەتی بێ، نەک ڕێکخراوێکی فرەرەگەز. مەرجی بڕیار، زۆر بەرتەسک بۆتەوە و لە ڕاستیدا OECD پێشنیار بە گەلێک لە ئەندامەکانی خۆی دەکا. ماددەی ٦ ی ڕێککەوتننامەکە سەبارەت بە دەنگدان تەنیا وەکوو دەربڕینی دووبارەی پرەنسیپی هاوڕایی دەنگەکان، هەڵبەت بە شێوەیەکی زۆر هێواش (Stto wce) ڕاڤە دەکرێ. ئەم ڕێکخراوە سکرتاریایەکی هەمیشەیی هەیە کە سکرتێر بەڕێوەی دەبا و دەسەڵات و تواناکانی بە پێی ماددەی ١٠ و ١١ دیاری کراوە.

لە بواری بنەما ئابوورییەکانەوە، OECD ڕەنگدانەوەی بەربڵاویی ئایدیاکانی سەر بە لیبرالیزمی ئابووری لە شێوازی قەرەبوو کردنەوەیی و چاکسازی ئابووریی یان کیتریە. بەڵێنی

راشکاوانەی ئەم ڕێکخراوە لە کۆنفرانسی پاریس سەبارەت بە ئامانجەکانی گەشەی ئابووری، ئازاد کردنی ئابووری و پەرەپێدانی بازرگانی ئەم ڕاستیە دەسەلمێنن. لەم سۆنگەوە OECDهەڵوێستێکی نە یارانەی لەگەڵ نیو مێرکانتلیسم (Neo- Mercantilism) و پشتیوانی کردن دا (Protectionism) هەیە. بەر فراوانبوونی ڕێکخراو لە پەسند کردنی ئەندامەتیی ژاپۆن لە ساڵی ١٩٦٤ بەم واتایە بوو کە زۆرینەی وڵاتە گرنگە پێشکەوتووە پیشەسازییەکان، ئەندامی ئەم ڕێکخراوەن . وەرگرتنی ئوسترالیا و نیوزلەندا ئەم پرۆسەی تەواو کرد.

لە باری نێوخۆییەوە، OECDبەمەبەستی یارمەتیدانی وڵاتانی ئەندام بۆ هەماهەنگ کردنی سیاسەتەکانیان بۆ گەیشتن بەو ئامانجانەی کە ئاماژەیان پێکرا، تێدەکوشێ. ئەم ڕێکخراوە بە سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندی زانیاریە ئاماری و ئابوورییەکان بۆ ئەندامان و بەشە بەتواناکانی کۆمەڵگا دادەنرێ. ئەم ڕێکخراوە بە شێوەیەکی کاریگەر لە ئاستی بان_دەوڵەتی دا (Transgovernmental) تێدەکۆشێ. لەو شوێنانەی کە بەرپرسە پایەبەرزەکان بەدوای ڕێکخستن و هەماهەنگ کردنی سیاسەتەکانن. هەڵبەتە هەموویان هاوبەشی لە بەرژەوندییەکاندا لە بەرچاو دەگرن. بەڵام هەروەکوو ئاماژەمان پێدا دەتوانین هەست بەم هاڕاییە ئایدۆلۆجیەی ناو ڕێکخراوەک بکەین.

یەکسانی لە نێوان ئەندامانی ڕێکخراو تاڕادەیەکی زۆر بە هۆی وڵاتانی ناسراو بە گرووپی ٧ پێشێل کراوە. گرووپی ٧ بریتین لە: کەنەدا، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، بەریتانیا، فەڕەنسا، ئەڵمانیا، ئیتالیا و ژاپۆن. نوخبە سیاسییەکانی ئەم وڵاتانە لە هەر خولێک دا لە ژێر ڕێنوێنییەکانی OECD لە کۆبوونەوەی ناسراو بە "کۆبوونەوەی ئابووری ڕێبەران "، لە دەوری یەک کۆ دەبنەوە. ئەگەرچی بابەتە عەینییەکانی ئابووری سیاسی لەو کۆبوونەوانەدا تاوتوێ دەکرێن، بەڵام مەسەلەکانی وەکوو تیروریزمیش جێگەی بایەخی ڕێبەرانی گرووپی حەوتن.

لە بواری دەرەکیەوە؛ دەوڵەتەکانی OECD گرووپێکی هاوبەشی بەهێز لە مشتومڕە جیهانیەکان دان بەم پێیە کاتێک هەست بە مەترسی ئۆپێک دەکرا، زۆر پێویست بوو کە ئەندامانی OECD سیاسەتە وزەییەکانیان بە هۆی ئاژانسی نێودەوڵەتیی وزەوە ڕێک بخەن. لە ڕوانگەی سیاسیشەوە، ئەمە ڕەنگە هەوڵێک بۆ گەڕانەوەی هەژموونی بێ. بێگومان بە لە بەر چاوگرتنی جیاوازی نێوان باکوور و باشوور، ئەم ستراتیژییە بەهەست کردن بە پێویستی بەرەنگاری کردن

لەگەڵ یەکگرتوویی باشووردا، لەگەڵ بەرەیەکی ئاوا یەکگرتووەوە دەگونجا. ئیستا کە ئەم ڕێکخراوە بایەخێکی زۆر بە وڵاتانی تازە بە پیشەیی بوو، و ئەو ئابوورییانەی کە داهاتێکی مامناوەندییان هەیە و، هەروەها گۆڕینی ئابووری رووسیا بۆ ئابووری سەرمایەداری دەدا. لە هەمان کات دا پێوەندی ئایدۆلۆجی ئەم ڕێکخراوە لەگەڵ لیبرالیزمی ئابوورییدا روون و ئاشکرایە. رادەی ئەندامانی OECDلە ساڵی ٢٠٠٢دا گەیشتە ٣٠ وڵات.

## Monarchy

### *ڕژێمی پاشایەتی*

بە ڕژێمێک دەگوترێ کە لەو ڕژێمەدا پاشایەک یان شاژنێک کە بە پێی ئایین، بنەماڵە یان هەڵبژاردن، یان بە پێی داب و نەریتی وڵات بۆتە پاشای وڵات و حکومەت دەکا. ئەو زاراوانەی کە پێوەندییان بەم ڕژێمەوە هەیە بریتین لە :

مافی خوایی پاشایەتیی: بیرو بۆچوونێکە کە پێیوایە پاشاکان مافی پاشایەتیان بە هۆی یاسای خوایی و سروشتی لە باوکیانەوە پێگەیشتووە و لە سەر ئەم بنەمایەش پاشا هیچ بەر پرسیارەتیەکی لە بەرامبەر گەل دا نیە. ئەم بیروبۆچۆنە بەر لە سەرهەڵدانی، بزاڤی لیبراڵ دێموکراسی و کۆماریخوازی لە جیهان دا، بناغەی حکوومەتی سەرەڕۆو ڕەهای پێکدێنا. ئەم بیروبۆچوونە پاشای بە جێبەجێکاری فەرمانەکانی خوادەزانی و پێیان دەگووت "ڤل الله". لە دوای سەرهەڵدانی بزوتنەوە ئازادیخوازانەکانی سەدەکانی نوێ ودارمانی حکوومەتە پاشایەتیە سەرەڕۆکان، ڕژێم گەلی پاشایەتیی مەشرووتە هاتنە ئاراوە. لە هێندێک وڵات دا ڕژێمی کۆماری دامەزرا و بنەمای" پاشا، جێبە جێکاری ئیرادەی گەلە"جێگای گرتەوە. تۆماس هۆبزی بەریتانی لایەنگری ئەم بۆ چوونە بوو و بانگەشەی بۆ دەکرد. جۆن لۆک ئەم بۆچوونە دایە بەر ڕەخنەی توونە ولە دوای شۆرشی ١٦٨٩-١٦٨٨، "مافی خودایی " حکومەتی پاشا، بایەخێکی نەما.

لە چینی کۆن دا، پاشا تا ئەوکاتەی کە خۆشگوزەرانی ڕەعیەتەکانی (دابین) کرد، نوێنەری خودا بوو و بەپێچەوانەوە ئەگەر پاشا خۆشگوزەرانی بۆ خەڵک دابین نەکردیایە، حکومەتی خوادیی لە دەست دەدا و ئەوکات خەڵک شۆڕشیان لە دژی پاشا ڕێک دەخست. لە سەرەتای سەدەی بیستەم دا، لە ئەورووپا بیرو بۆچوونی مافی خودایی هیچ شوێنەرایێکی نەما.

پاشایەتیی سەرەڕۆ : پاشایەتیە کە هەموو دەسەڵاتە دەوڵەتیەکان لە بەردەستی پاشادان و فەرمانبەرانی حکومەت بە ناوی ئەوەوە ئەرکەکان ڕادەپەڕێنن و حکوومەت کردن بە پێی یاسایەکی دیاریکراو نیە. پاشا چۆنی پێخۆش بوو ئاوا دەجووڵێتەوە. پاشایەتیی ڕەهاشی پێ دەڵێن.

پاشایەتیی هەڵبژێردراو: جۆرێک لە ڕژێمی پاشایەتیە کە پاشابە درێژایی تەمەنی وەکوو پاشا لە لایەن گەل یا نوێنەرانەوە یان لە لایەن ئاریستۆکرات و دەولەمەندەکانەوە هەڵدەبژێردرێ.

پاشایەتیی پارلمانی: بە واتای پاشایەتیی مەشرووتەی پارلمانیە.

پاشایەتیخوازی: لایەنگری کردن لە ڕژێمی پاشایەتیی لە بەرامبەر ڕژێمی کۆماری دایە. پاشایەتیخوازی لە سەدەکانی ناوەڕاست لە ئەورووپادا پەرەی سەند ولە سەدەکانی هاوچەرخ دا و لە سەردەمی کێشەی نێوان شۆرشگێڕەکان و کۆماریخوازەکان دا زۆر کەڵکی لێ وەرگیراوە.

پاشایەتیی بەرتەسک : جۆرێک لە ڕژێمی پاشایەتیە کەبەشێک لە دەسەڵات لە بەردەست پاشا و بەشێکی لە بەردەست کۆمەڵەی گشتی گەل یا لە بەردەست چینە دەسترۆیشتووەکان یا لە بەردەست پەرلەمان دایە.

پاشایەتی مەشرووتە: هەمان پاشایەتی بەرتەسکە.

پاشایەتی مەشرووتەی پەرلەمانی: جۆرە مەشرووتەیەکە کە پەرلەمان ناراستەوخۆ دەست لە کاروباری دەسەڵاتی بەرێوەبەری وڵات وەردەدا.

پاشایەتی مەشرووتەی دووفاقە: سیستەمێکە کە پاشا لە دانان و لابردنی وەزیرەکان دا ئازادە و دەتوانێ وەزیرەکان لە ناو کە مایەتیی پارلمانی یان لەناو کەسانی دەرەوی پارلمان دا هەڵ بژێرێ.

پاشایەتی ڕەها: هاوتای پاشایەتی سەرەڕۆیە.

پاشایەتی پشتاوپشت(بەرەبابی ) : جۆرێک لە ڕژێمی پاشایەتیە کە پاشایەتی بە پێی میراتە. هەرچەندە کەسی یەکەم، بەمیرات ئەم پاشایەتیەی وەدەست نەهێنابێ.

پاشایەتی بێ سنوور : پاشایەتیەکە کەدەسەڵاتەکان لە بەردەستی پاشادان و فەرمانبەران بە ناوی پاشاوە ئەرکەکانیان بەرێوەدەبەن، بەڵام حکومەت بە پێی یاسا دارێژراوەکانە.

### ڕێکخراویی لێبوردنی نێونەتەوەیی *Amnestt Internationl*

ڕێکخراوێکی مەدەنی نێونەتەوەییە کە لە ٢٨ی ئایاری ١٩٦١، لە لایەن پیتەر بێرێنسۆن پارێزەرێکی بەریتانی دامەزرا. ئامانج لە دامەزراندنی ئەم ڕێکخراوە، یارمەتیدانی ئەو بەندیکراوە سیاسیانەیە کە کردەوەی توندو تیژییان نەکردووە. ئەم ڕێکخراوە هەروەها یارمەتیی بنەماڵەی ئەم گیراوانە دەدا و بەدوای شێوازگەلێک بۆ باشترکردنی هەڵسوکەوت لەگەڵ گیراوەکان و دەستبەسەر کراوەکان دایە. ئەم ڕێکخراوە هەوڵێکی زۆری بۆ ئاشکرا کردنی ئەشکەنجە، کوشتن و دەستبەرسەرکردنی ناداد پەروەرانە داوە. ڕێکخراوی لێبوردنی نێونەتەوەیی یەک میلیون ئەندامی لە ١٥٠ وڵاتی جیهاندا هەیە (١٩٩٦)و ئەندامەکانی لایەنی ماددی ڕێکخراوەکە دابین دەکەن. بنکەی ئەم ڕێکخراوە لە لەندەنە و بەرواڵەت سەر بە هیچ لایەنێکی سیاسی یان ئایینی نیە. ئەم ڕێکخراوە لە ساڵی ١٩٧٢دا، خەڵاتی نۆبلی ئاشتی بردەوە.

### ڕێککەوتننامەی ڕاپاڵۆ (١٩٢٢) *Treaty Of Rapallo*

ڕێککەوتننامەی ڕاپاڵۆ؛ ڕێکەوتننامەی دۆستایەتی نێوان ئەڵمانیا و یەکیەتیی سۆڤیەت بوو کە لە ساڵی ١٩٢٢ لە ڕاپاڵۆدا گرێدرا. نێوەرۆکی ئەم ڕێککەوتننامە گرنگیەکی ئەوتۆی نەبوو، بەڵام یەکەمین جار بوو کە دەوڵەتێکی گەورە بەرەسمیی دانی بە یەکیەتیی سۆڤیەت دادەنا.

### ڕێککەوتننامەی ڤێرسای (١٩١٩) *Treaty Of Versailles*

بەورێککەوتننامە ئاشتیە دەگوترێ کە لە پاش شەڕی یەکەمی جیهانی، لە ڕێکەوتی ٢٨ی حوزەیرانی ١٩١٩ لەگەڵ ئەڵمانیا و لە هۆڵی ئاوێنەی کۆشکی ڤێرسایدا مۆر کرا. خاڵەکانی ئەم ڕێککەوتننامە کە لە ٤٤٠ مادده و لە ١٥ بەشدا دارێژرابوو، بریتی بوون لە: بەدەستەوەدانی تەواوەتیی کۆلۆنیەکانی ئەڵمانیا، بۆ ئەوەی بەسەر سیستەمی سەرپەرەستیاریدا دابەش بکرێن، گەڕاندنەوەی ئالزاس و لۆرێن بۆ فەڕەنسە، سپاردنی ئوپێی ــ مالمێدی بە بەلجیکا، بەڕێوەبردنی ڕاپرسی گشتی لە ئێشلێزڤیگی باکوور، ئەسپاردنی پرۆسی پۆلۆنیا، هێندێک لە بەشەکانی پرۆسی ڕۆژهەڵات و سیلیزیای سەرەوە بە پۆلۆنیا، ئەسپاردن و بەڕێوەبردنی دانتزیگ لە لایەن کۆمەڵەی

نەتەوەکان، ئەسپاردنی ناوچە چکۆلەکانی دەوروبەری هۆلتشین بە چیکسلۆڤاکیا، ئەسپاردنی مێمێل (کەلە دواییدا لیتڤانیا داگیری کرد)؛ داگیر کردنی "سار" لە لایەن فەرەنسیەکان بۆ ماوەی ١٥ ساڵ، وەدواخستنی راپرسی، ناسەبازی کردنی راینلەند و داگیرکردنی لە لایەن هاوپەیمانەکان بۆ ماوەی ١٥ ساڵ، قەرەبووکردنەوەی زیانەکانی شەڕ، کەمکردنەوەی ژمارەی هێزە سەربازییەکانی ئەڵمانیا بۆ ١٠٠ هەزار کەس بەبێ فەرماندەیەکی گشتی ،خزمەتی ژێرئالاّ، تانک، تۆپخانەی گەورە. بەرهەمهێنانی گازە ژەهراوییەکان، فرۆکە یان زپلین، کەمکردنەوەی ژمارەی پاپۆڕەکانی هێزی دەریایی ئەڵمانیا کە نەتوانن زیاتر لە دەهەزار تەن هەڵگرن، بەبێ مافی هەبوونی ژێردەریایی و چەک و چۆڵە ئاسمانیەکان.

رێککەوتننامەی ڤێرسای، هەروەها یەکیەتیی نێوان ئەڵمانیا و نەمسای (ئانشلۆس) قەدەغە کرد، ئەڵمانیای بە دەسپێکەری شەڕەکە دانا، کۆمەڵە مەرجێکی بۆ دادگاییکردنی ئیمپراتۆری پێشوو و رێبەرانی دیکەی شەڕ دیاری کرد. رێککەوتننامەکە هەروەها جێبەجێکردنی بەڵێننامەی کۆمەڵەی نەتەوەکانی لەخۆ دەگرت. ئەڵمانیا لە ژێر پاڵە پەستۆدا ئەم رێککەوتننامەی مۆر کرد، بەڵام توورەیی و نارەزایەتی خۆی لەو بەندەی کە ئەڵمانیای بە" دەستپێکەری شەڕ دادەنا، دەربڕی. ئیمپراتۆر هیچ کاتێک دادگایی نەکرا و هێندێک لە بەندەکانی رێککەوتننامەکە، ٢٠ ساڵ دواتر، بوونە بیانوویەکی بەهێز بۆ پروپاگەندەکردن لە ئاڵمانیادا. کاتێک ئادۆلف هیتلەر لە ساڵی ١٩٣٣دا دەسەڵاتی ئەڵمانیای بەدەستەوە گرت، بە شێوەی پراکتیکی رێککەوتننامەی ڤێرسای هەڵوەشاندەوە.

## رێککەوتننامەی ڤێستفالی (١٦٤٨) *Treaty Of Westphalia*

ئەم رێککەوتننامەیە لە پاش ئەو شەڕە ئایینیانە لە ئەوروپادا هاتە ئاراوە کە سی ساڵیان خایاند (١٦٤٨_١٦١٨). هەموو ولاّتانی ئەوروویی، جگە لە بەریتانیا و پۆلۆنیا لەم رێککەوتننامەدا بەشدار بوون.

گرنگی رێککەوتننامەی ڤێستفالی لە پێوەندییە نێودەوڵەتیەکاندا:

١_ ئەم رێککەوتننامە و کۆنفرانسی رێککەوتننامەکە بوون بە بنەما بۆ پێکهێنانی کۆنفرانسی دیکەو رێنیوێنی کردنی ولاّتان لە پێوەندییە نێودەوڵەتیەکان دا.

٢ــ ئەم ڕێککەوتننامە دانی بە سەربەخۆیی کۆنفیدراسیۆنی سویسرا و وڵاتی هۆڵەندا دانا.
٣ــ نزیکەی ٣٥٠ یەکەی سیاسی ئەڵمانیا بە هۆی ئەم ڕێککەوتننامەوە سەربە خۆییان وەرگرت.
٤ــ پێداگری لە سەر سەربەخۆیی فەڕەنسا، ئیسپانیا و پورتوگال و قەدەغەکردنی بە ڕەسمی دستێوەردانی پاپا لە کاروباری نێو خۆیی و دەرەوەی وڵاتانی ئەورووپی.
٥ــ وڵاتەکانی ئەورووپا، مافی گرێدانی ڕێککەوتننامە، وەئەستۆگرتنی بەرپرسیارەتی نێودەوڵەتیی و ڕێکخستنی کاروباری نێوخۆییان پێدرا، بەبێ دەستێوەردانی دەوڵەتی دەرەکی و بەبێ سەرنجدان بە داوکارییەکانی ئیمپراتۆریای ڕۆم و پاپا.
٦ــ بنەمای سەربەخۆیی وڵاتان، چ سەربەخۆیی سیاسی و چ سەربەخۆی ئایینی و هەروەها یەکسان بوونیان لە گۆڕەپانی نێودەوڵەتیی و پێوەندییەکانی دەرەوە بۆ یەکەمجار وبە شێوەی ڕەسمیی لەم ڕێککەوتننامە دا پەسندکرا.
٧ــ وڵاتان لە هەڵبژاردنی ئاییندا سەربەست بوون و لە هەمان کاتدا بەڵێنیشیان دا کە گرووپە ئایینیەکانی کاتۆلیکی لوتێری و پرۆتستانی ئازادییەکی تەواویان هەبێ.
٨ــ سیستەمی هاوسەنگی هێز هەم لە ئیمپراتۆریای ڕۆم و هەم لە ئەورووپادا پێکهات. ئامانجی سەرەکی سیستەمی هاوسەنگی هێز، پێشگرتن لە سەر هەڵدانی دەوڵەتێکی " زاڵتر" لە ناو یەکە سیاسییەکانی ئەورووپادا بوو.
٩ــ ئەو دەوڵەتانەی کە ڕێککەوتننامەی ڤیستفالیان مۆر کردبوو، بەڵێنیان بەیەکتردا کە لە بەرامبەر هەر هێرشێکدا، بێ گوێدانە ئایین، هاوکاری یەکتر بکەن.

## ڕۆژئاوا چێتی *Wester Niziation*

ڕۆژئاواچێتی یەکێک لە شێوازەکانی گۆڕانی کولتوورە. گۆڕانی کولتوور، پرۆسەیەکە کە لە ئاکامی بەیەکگەیشتنی کولتوورێک لەگەڵ کولتوورێکی دیکەدا، گۆڕانێک لە دامەزراوەکان، بەهاکان، بیروبۆچوونەکان و شێوەکانی کولتوورێک و کۆمەڵگایەکدا پێکدێنێ. هێندێک لە کۆمەڵناسەکان بەم پرۆسەیە دەڵێن گۆڕانی کۆمەڵایەتی.

چەمکەکانی گۆڕانی کولتووری و گۆڕانی کۆمەڵایەتی، زاراوەگەلێکی نوێن کە لە ڕابردوودا بە جێگەی ئەم چەمکانە، لە چەمکەکانی " گەشەسەندنی کۆمەڵایەتی" و "پێشکەوتنی

کۆمەڵایەتی" کەڵکیان وەردەگرت. کە سەرچاوەیەکەیان بۆ روانگەی دارڤین، مارکسیزم و سپەنسەر دەگەڕێتەوە و رەنگدانەوەی ئایدۆلۆژی هەبووە و پێیانوایە هەموو گۆڕانێک ئاراستەیەکی پێشکەوتووانەی هەیە. رافائێل پەتایی، کۆمەڵناسی بەناوبانگ، رۆژئاواچێتی بەم شێوەپێناسە کردووە:

"رۆژئاواچێتی پرۆسەیەکی تایبەتیی کولتوورییە کە لە ئاکامی ئەم پرۆسەدا، کۆمەڵگا یان بەشێک لە کۆمەڵگا هەموو یان بەشێک لە و کولتوورەی کە لە رۆژئاوادا لە دوای " رێنێسانس " ، " چاکسازی ئایینی" و " شۆرشی پیشە ساز"یەوە هاتۆتە ئاراوە، وەردەگرێ.

لەرەوتی مێژوویی پرۆسەی " رۆژئاوا چێتی" ، " رۆژئاوا لێدراوی " و " دژایەتێکردن لە گەڵ رۆژئاوا "دا، زۆربەی ولاتە ئیسلامیەکان ئەم سێ حاڵەتەیان هەبووە:

الف_ ویستێکی ئاگایانە بۆ وەرگرتنی هێندێک لە شێوەکانی رۆژئاوا بۆ بەربەرەکانیکردن لەگەڵ هێزی رۆژئاوادا کە بەرەبەرە بوو بە هۆی پێکهێنانی حەزو خولیای جیددی کە دەتوانین پێی بڵێین، قۆناغی " رۆژئاواچێتی".

ب _ قۆناغی خۆ بە دەستەوەدان بە رۆژئاوا ولاساییکردنەوەی نەزانانە یان " رۆژئاوا لێدراوی".

ج _ قۆناغی بەربەرەکانییکردن لەگەڵ رۆژئاوا و گەڕانە بۆ خۆ.

رۆژئاوالێدراوی لە ئاستی رووناکبیران و دەسەڵاتداراندا زیاتر بە شێوەی چاولێکەری نەزانانەی ئایدیا بیروبۆچوونەکانی رۆژئاوا و هەوڵدان بۆ بسترانەوە بە رۆژئاوایە و تا ئەو جێگایەش کە پێوەندی بە توێژی رۆژئاوالێدراوی خەڵکەوە هەیە، لە ژیانی رۆژانە و دابونەریتەکانی کۆمەڵگادا دەردەکەوێ. رۆژئاواچێتی لە کۆمەڵگا کۆمۆنیستیەکاندا، بیروبۆچوونێکە کە لە دەرەوەی حیزبە کۆمونیستەکان سەری هەڵداوە. بەڵام لە ناو حیزبیشدا لایەنگری هەیە کە لەگەڵ بیرۆکەی ستالنینیزمدا بەربەرەکانی دەکەن.

گرووپی روناکبیرانی رۆژئاواچی زیاتر بە لای بزووتنە سۆسیال دێموکراسیەکانی رۆژئاوادا دەشکێنەوە. ئەمانە لە هەمان کاتدا لە دێموکراسی رۆژئاوا و لەوانە لە ئازادی رادەبڕین، ئازادی کۆروکۆبوونەوە و پێکهێنانی حیزبەکان، ئازادی گەران (سەفەر کردن) و فرەحیزبی رازین، سیستەمی تاکە حیزبی رەت دەکەنەوە. پێشکەوتنە زانستی و تەکنیکیەکان ئاستی بەرزی توانایی کڕینی خەڵک، لە ولاتانی رۆژئاوایی، لەو بابەتانەن کەئەم رووناکبیرانەیان بۆ لای خۆیان راکێشاوە.

بە بڕوای رۆژئاواچیەکان، ولاتانی گەورەی سەرمایەداری بە پێچەوانەی ئەو شتانەی کە رێبەرە

کۆمونیستەکان دەیڵێن، تووشی "رزین" و " گەندەڵیی" نەبوون، بە ڵکوو رێژەی پێشکەوتنیان لە بوارە پیشەسازی و ئابووریەکاندا، لە وڵاتانی کۆمۆنیستی زیاتر بووە. رۆژئاواچیەکان پێیانوایە کە سەردەمی مارکسیزم ـ لنینیزم بەسەر چووە و سەردەم، سەردەمی پێشکەوتنی کۆمەڵگا بە هۆی زانست و تەکنیکە.

## راسپێردراوە سیاسییەکان *Diplomatic Corps*

راسپێردراوە سیاسییەکان لە شوێنی بەڕێوە بردنی ئەرکەکانی خۆیاندا، تایبەتمەندییەکانی نوێنەرایەتیی وڵاتی خۆیانیان هەیە و نیشانەی دەسەڵات و سەربەخۆیی و سەرەوەریی دەوڵەتیی خۆیانن. ئەوانە رۆڵێکی زۆرگرنگ و قورسیان لە ئەستۆدایە. گرنگترین رۆل و ئەرکەکانی راسپێردراوە سیاسییەکان بریتین لە :

١ـ راسپێردراوی سیاسی (بەزۆری سەرۆک) دەبێ بەوتار و شێوازەکانی دیکە وڵاتی خۆی بە خەڵکی وڵاتی خانە خۆی بناسێنێ.

٢ـ راسپێردراوی سیاسی (بەزۆر سەرۆک) رۆڵی پێوەندیدەری هەیە، واتە هەڵوێست و بیروبۆچوونەکانی وڵاتی خۆی بە ئاگاداری بەرپرسانی وڵاتی خانەخوێ دەگەیەنێ و بە پێچەوانەشەوە، راوبۆچوونەکانی ئەو وڵاتەش بە وڵاتی خوێ رادەگەیەنێ.

٣ـ ئەرکێکی دیکەی راسپێردراوی سیاسی ئاگادار بوونی بە جێ(رەوا) لە بارودۆخی وڵاتی خانە خوێ و ئامادەکردنی راپۆرت و ناردنەوەی راپۆرتەکە بۆ وڵاتی خۆیەتی (بە زۆری وەزیری کاروباری دەرەوە). زانیاری کۆکردنەوەی نابەجێ (نارەوا) لە بارودۆخی وڵاتی خانەخوێ، دەبێتە سیخوڕی و بە پێچەوانەی رێو وشوێن و ئەدەبی نێودەوڵەتیە.

٤- راسپێردراوی سیاسی دەبێ بەرژەوەندییەکانی وڵاتی خۆی و هاووڵاتیانی خۆی لە وڵاتی خانەخوێدا بپارێزێ و پشتیوانیان لێ بکا.

٥ـراسپێردراوی سیاسی دەبێ رێز بۆ یاسا و رێسا نێوخۆییەکان و دابونەریتە نەتەوەیی و ئایینیەکانی وڵاتی خانەخوێ دا بنێ.

٦ـ راسپێردراوی سیاسی نابێ خۆی لە کاروباری نێوخۆیی وڵاتی خانەخوێ هەڵقورتێنێ و لە پۆست و دەسەڵاتی خۆی کەڵکی نابەجێ وەرگرێ. بە پێچەوانەی ئەمەوە، وڵاتی خانەخوێ دەتوانێ ئەم راسپێردراوە بە " کەسی بێ کەڵک" دابنێ و داوا لە وڵاتەکەی بکا کە بانگهێشتنی بکەنەوە یان ئەوەتا بۆ خۆیان ناچاری بکەن لە ماوەیەکی دیاریکراودا، وڵاتی ئەوان بەجێ بێڵێ.

## Members Of The Mission — راسپێردراوی ، ئەندامان

ئەندامانی راسپێردراوی بەو فەرمانبەرە سیاسی و ئیدارییانە دەگوترێن کە کاروبارەکانی راسپێردراوەتی بەرێوەدەبەن. ئەندامانی راسپێردراوەتی بریتین لە: فەرمانبەرانی سیاسی، فەرمانبەرانی ئیداری و تەکنیکی و کارگوزارانی راسپێردراوەتیی.

## Hends Of The Mission — راسپێردراوێتی ، سەرۆکەکانی

بە پێی بریارەکانی کۆنگرەی ڤیەننا (١٨١٥) و پرۆتۆکۆلی ئیکس لاشاپێلْ (١٨١٨) و چاکسازییەکانی رێککەوتننامەی ڤیەننا (١٩٦١)، سەرۆکەکانی راسپێرداوەتی بەریز بریتین لە :

١ـبالْوێزو بالْوێزی پاپ — ٢ـ وەزیری موختار و نوێنەری پاپ

٣ـ شارژدافێر

راسپێردراوەکانی پلەی یەکەم و دووهەم لەگەلْ سەرۆکی وڵاتدا لە پێوەندی دان و راسپێردراوی پلەی سێهەمیش لەگەلْ وەزارەتی کاروباری دەرەوەدا لە پێوەندی دایە. جگە لەم کەسانە، هێندێک کەسی دیکە بە نێوی "کۆمیسێری بەرز" یان بە نێوی دیکەوە ئەرکی سەرۆکی نوێنەرایەتیی دیپلۆماسی بەرێوە دەبەن و بەپێی ماددەی ١٤ی رێککەوتننامەی ڤیەننای ١٩٦١ لە ریزی راسپێردراوە دیپلوماسیەکانی دیکەدان و ئەو ماف و ئیمتیازانەی ئەوانیشیان هەیە. وەکوو کۆمیسێری بەرزی بەریتانیا لە کەنەدا، ئۆستralیا و نیوزلەندا. نازنامەی کۆمیسێری بەرز بە بالوێزەکانی بەریتانیا لە وڵاتە هاوبەرژەوەندەکانی ئەم وڵاتە دەگوترێ، چوونکە ئەم وڵاتانە بەشێوەیەکی فۆرمالیتە پاشای بەریتانیا بە حاکمی خۆیان دەزانن.

## Diplomatic Mission راسپێردراوەتی سیاسی

راسپێردراوەتی سیاسی بەسەر دوو شێوەدا دابەش دەبێ: راسپێردراوەتیی سیاسیی بەردەوام و راسپێردراوەتیی سیاسیی تایبەتی. مەبەست لە راسپێردراوەتیی سیاسیی بەردەوام؛ ئەوکەسانەن کە وەکوو نوێنەری رەسمیی ولاّتی خۆیان و بەردەوام ( زیاتر بۆ ماوەی چوار سال) دەچنە ولاّتێکی بیانی و ئەرکێکی تایبەتیی بەرێوەدەبەن. دامەزراندنی نوێنەرایەتیی و هەناردنی راسپێردراوە سیاسییە بەردەوامەکان بە پێی رێککەوتنی دوولایەنەی ولاّتەکانە وەکوو دامەزراندنی پێوەندی سیاسی بە پێی یەک یان دوو رێککەوتننامەی جیاواز. ماوەی راسپێردراوەتیی سیاسی بەم هۆیانە کۆتایی پێ دێ:

*الف:* بە هۆی پچرانی پێوەندی سیاسی:

١ـ پچرانی پێوەندی سیاسی بە هۆی شەڕەوە

٢ـ پچرانی پێوەندی سیاسی بە هۆی کێشەی سیاسییەوە

٣ـ پچرانی پێوەندی سیاسی بە شێوەی بەکۆمەڵ ، وەکوو سزا

ب ـ ئەو هۆکارانەی کە پێوەندییان بەراسپێردراوە سیاسییەکانەوە هەیە:

١ـ مردن ٢ـ خانەنشینی ٣ـ دەست لە کار کێشانەوە.

ج: ئەو هۆکارانەی پێوەندییان بە ولاّتی راسپێردراوەوە هەیە:

١ـ بانگهێشت کردنەوەی راسپێردراو بە هەر هۆیەک

٢ـ گۆڕانی جۆری راسپێردراوەتی یان گواستنەوەی راسپێردراو

دـ ئەو هۆکارەی کە پێوەندی بە ولاّتی خانە خوێیەوە هەیە:

١ـ وەدەرنانی راسپێردراو وەکوو "کەسی بێ کەڵک".

## Special Mission راسپێردراوەتیی تایبەتی

ئەم ناوە بۆ یەکەمجار لە لایەن کۆمیسیۆنی یاسای نێودەوڵەتیی UN لە ساڵی ١٩٦٠دا کەڵکی لێ وەرگیرا. کۆمیسیۆنی شەشەمی UN، زۆر بە کورتی باسی کردووە و ئاماژە بە سێ شێوە راسپێردراوەتیی دیپلۆماتیکی تایبەتیی دەکا: یەکەم راسپێردراوەتی لە کۆنفرانسە

نێودەوڵەتیەکاندا، دووهەم راسپێردراوەتیی گەڕۆک و سێهەم راسپێردراوەیتە تایبەتیەکان، واتە راسپێردراوەتیی یەک یان چەند کەسێک کە لە لایەن دەوڵەتێکەوە نێردرابنە دەوڵەتێکی دیکە بۆ بەڕێوەبردنی ئەرکێکی تایبەتی. هێندێک ئاماژە بە سێ راسپێردراوەتیی تایبەتی دیکە دەکەن: یەکەم ئەو راسپێردراوانەی کە لە نووسینگە تایبەتیەکان یان لە نووسینگە بەردەوامەکاندا کاردەکەن (وەکوو نووسینگەی بازرگانی ، نووسینگەی کاروباری پێشانگا پیشەسازی و هونەرییەکان و......) دووهەم ئەو راسپێردراوانەی کە بە نوێنەرایەتیی لەلایەن دەوڵەتەکانی خۆیانەوە لە ڕێوورەسمێکی تایبەتیدا (وەکوو، ڕێوو ڕەسمیی تاج لەسەر دانانی پاشایەتیی یان ناشتنی مردوو، یان بۆ وتوویژ و گرێدانی ڕێککەوتننامەی تایبەتیی) بەشداری دەکەن یان ئەرکی وتوویژ و گرێدانی ڕێککەوتننامەیان پێ دەسپێردرێ. سێهەم: راسپێردراوەکانی وەزارتەکان، جگە لە وەزارەتی کاروباری دەرەوە کە بە تەنیا یان لەگەڵ کابینەدا دەچنە سەردانی وڵاتێکی دیکە و لەگەڵ راسپێردراوە هاوشانەکانی خۆیان دادەنیشن. ئاکامی وتوویژەکانی ئەم راسپێردراوانە رەنگە ببێتە هۆی گۆرینەوەی بەڵگەنامە، یان لیژنەیەکی تایبەتی دیکە بنێرن کە کۆتایی بە کارەکان بێنێ، یان باڵوێزخانە ئەم ئەرکە بەڕێوە ببا.

### ڕێک نەکەوتن — *Disintegration*

سەبارەت بەو یەکە سیاسییانە کەڵکی لێ وەردەگیردرێ کە حەزناکەن لە بواری سیاسەتە نێودەوڵەتیەکاندا لەگەڵ وڵاتانی تردا هاوکاری و هاوبیری بکەن کە دەبێتە هۆی دوور کەوتنەوەی وڵاتان لەیەکترو بوار بۆ قەیران و شەڕ دەرخسێ. لە ڕێک نەکەوتندا چەند گۆڕاو کاریگەرییان هەیە کە بریتین لە: فاکتەرە مرۆیی، دەروونی و کۆمەڵایەتیەکانی یەکە سیاسییەکانی سیستەمی نێودەوڵەتی و گۆڕاوە کۆمەڵایەتیە نێودەوڵەتیەکان.

### ڕژێمی سوڵتانی — *Sultanistic Regine*

ماکس ڤیبەر یەکەمجار ئەم زاراوەی داهێنا و مەبەستی ئەو لەم زاراوەیە ئاماژەکردن بە حاڵەتێکی توندڕۆیانەی پاتریمۆنیالیزم (سیستەمی پشتاوپشتی) بوو کە لە پۆلین بەندیی سێ لایەنەی ڤیبەر لەسەر شێوازەکانی ئوتۆریتەی رەوا، شێوازێک لە ئۆتۆریتەی نەریتیە: پاتریمۆنیالیزم و لە شێوە توندڕۆیانەکەیدا، سیستەمە سوڵتانیەکان، ئەو کاتانە سەرهەڵدەدەن کە دەسەڵاتداری نەریتی،

دامودەزگایەکی ئیداری و هێزێکی سەربازی پێک دێنێ کە تەنیا ئامرازی [جێبەجێ کردنی ئامانجەکانی] تاکەکەسی دەسەڵاتدارە. لەو شوێنانەی کە دەسەڵات لە بنەڕەتدا نەریتیە، هەرچەندە کە بە هۆی ئیرادەی تاکەکەسی دەسەڵاتداریشەوە بەڕێوە بچێ، ئەو دەسەڵاتە ئۆتۆریتەی پاتریمۆنیالیە و لەو حاڵەتانەدا کە دەسەلات لە بنەرەتدا لە سەر بنەمای ئیرادەی تاکەکەسی دەسەڵاتدار بەڕێوە دەچێ، پێی دەگوترێ ڕژێمی سوولتانی. هێندێک جار واپێدەچێ کە ئۆتۆریتەی سولتانی بە هیچ شێوەیەک بە هۆی نەریتەوە بەرتەسک نابێتەوە، بەلأم لە ڕاستیدا هیچ کاتێک وانیە. سەرەڕای ئەوە، توخمی نانەریتی بە شێوەی ناتاکەکەسیی، عەقلانی نابێ، بەڵکوو تەنیا زۆربوونی لە رادەبەدەری ئیرادەی تاکەکەسی دەسەڵاتدار لەخۆ دەگرێ. ئەم تایبەتمەندیە دەبێتە هۆی ئەوەی کە لە هەر شێوازێکی عەقلانی جیای بکاتەوە.

### *ڕێککەوتننامەی ئەخلاقی* Moral Agreement

ئەم ڕێککەوتننامانە لەگەڵ ئەوەیدا کە دەبنە هۆی بەڵێنێکی ئەخلاقی، بەڵێندەرەکان ناچار ناکرێن کەڕێککەوتننامەکە جێبەجێ بکەن. ئەم ڕێککەوتننامانە کە لەرەوتی ئەنگلۆساکسۆنی وەرگیراون، تایبەتمەندیی سیاسییان هەیە و بەپێی ئەم ڕێککەوتننامە، دوو یان چەند دەوڵەتێک لە سەر بڕیاری خۆیان سەبارەت بە ڕێبازێکی سیاسی پێداگری دەکەن، بێ ئەوەی بەڵێنێکی یاساییان هەبێ. وەکوو جاڕنامەی ئاتلانتیک .

### *ڕێککەوتننامەی ساکار یان بەڕێوەبەری* Executive Agreement

ئەم ڕێککەوتننامانە تەنیا بە هۆی مۆری سەرۆکی وڵاتان (بە زۆری سەرۆک کۆمار) یان وەزیرانی دەرەوە یان ڕاسپاردە سیاسییەکانی دوولایەن جێبەجێ دەکرێن و ئەو بەرپرسە دەوڵەتیانەی کە خاوەنی "دەسەڵاتی پەسند کردنی ڕێککەوتننامە"ن؛ هیچ ڕۆڵێکیان لە گرێدانی ئەم ڕێککەوتننامەدا نیە. بە واتایەکی دیکە ئەوریوورەسمانەی کە بۆ پێکهێناتنی ڕێککەوتننامەکانی دیکە پێویستن، بۆ ئەم ڕێککەوتننامانە پێویست نین، بەلأم ئاسەواری یاساییان هەیە. گرنگترین ڕێوورەسمەساکارەکان بریتین لە:

١ــ راگەیەنراوی فەرەنسا ــ مەراکیش، لە ڕێکەوتی ٢ی ئازاری ١٩٥٦دا، کە بە پێی ئەم ڕاگەیەنراوە، فەرەنسا دانی بە سەربەخۆیی فەرەنسادا نا. پرۆتۆکۆلی ڕێککەوتننامەی فەرەنسا ــ تونس، ڕێکەوتی ٢٠ی ئازاری ١٩٥٦ سەبارەت بە سەربەخۆیی تونس، ڕێککەوتننامەی بەریتانیا و میسر سەبارەت بە خودموختاری سوودان لە ڕێکەوتی ١٩ی ئایاری ١٩٥٤دا، ڕێککەوتننامەکانی ژنێف لە ڕێکەوتی ١٩٥٤دا، سەبارەت بە کۆتایهێنان بە دوژمنایەتیی هیند و چین.

### ڕێککەوتننامەی سایکس ــ پیکۆ (١٩١٦)
## Sykes –Picot Agreement

ڕێککەوتننامەیەکی نهێنیی نێوان بەریتانیا و فەرەنسایە کە لە ڕێکەوتی ١٦ی ئایاری ١٩١٦ لە نێوان سێرمارک سایکسی بەریتانی و ژۆرژ پیکۆی فەرەنسیدا مۆر کرا. نێورۆکی ئەم ڕێککەوتننامە ڕێک بە پێچەوانەی ئەو بەڵێنانە بوو کە لۆرێنسی عەرەبستان سەبارەت بەرێزگرتن لە مافی عەرەبەکان لەو شوێنانەی کە تورک نشین نەبوون، بە عەرەبەکانی دابوون، بەپێی ئەو ڕێککەوتننامە بە شێکی زۆر لە ڕۆژهەلاتی نێوەڕاست لە نێوان فەرەنسا و بەریتانیادا دابەش کرا. ئەم ڕێککەوتننامە گومانی زۆری لە ناو عەرەبەکان دا سەبارەت بە سیاسەتەکانی بەریتانیا لە پێوەندی لەگەڵ ڕۆژهەلاتی نێوەڕاستدا پێک هێنا و بوو بە هۆی نیگەرانیی عەرەبەکان لە سیاسەتی بەریتانیا.ڕووداوەکانی دوایی ڕۆژهەلاتی نێوەڕاست دەریانخست کە گومانی عەرەبەکان بەجێ بووە.

### ڕێککەوتننامەی ئاشتی بۆسنیا(١٤ ی کانوونی یەکەمیی ١٩٩٥)
## *Bosnian Pace Agreement*

ئەم ڕێککەوتننامەیە کە کۆتایی بە خوێناوی ترین شەڕی ئەورووپا لە دوای شەڕی سارد لە بۆسنیاوهیرزەگۆڤین هێنا، ئاکامی وتوویژی لایەنەکانی شەڕ بوو کە لە ٢١ی تشرینی دووهەمی ١٩٩٥ لە شاری دەیتۆن لە ویلایەتی ئۆهایۆدا (ئەمریکا) پێکهات. ڕێککەوتننامەی ئاشتیی بۆسنیا لە ڕۆژی ١٤ی کانوونی یەکەمی ١٩٩٥ لە نێوان سەرۆک کۆماری بۆسنە هیرزەگۆڤین (عەلی

عیزرەت بێگۆڤیچ)، کرۆڤاتیا (فرانجوتوحجان)، سربستان (سلۆبۆدان میلۆشۆڤیچ) و بە بەشداری ڕێبەرانی ئەمەریکا، ئەڵمانیا، فەڕەنسا، بەریتانیا و ئیسپانیا لە پاریسدا مۆر کرا.

بە پێی ئەم ڕێککەوتننامە:

١ـ کۆمەڵگای نێودەوڵەتی،بە ڕەسمی دانی بە سنوورەکانی بۆسنە هێرزەگۆڤین، وەکوو وڵاتێکی سەربەخۆ دانا.

٢ـ وڵاتی بۆسنە لە فیدراسیونی بۆسنیاـ کرۆڤانیا بەسەر ٥١% و کۆماری سربیاش بەسەر ٤٩% خاکی بۆسنیادا کۆنترۆلیان دەبێ.

٣ـ سیبریەکانی بۆسنیا جگە لە کۆنترۆڵی شارە ڕۆژهەڵاتیەکانی سەربرێنیستا، ژێپا و پاڵە، لە ڕێگای چۆمی ساو، دەستیان بە دەریای ئادریاتیک ڕادگا.

٤ـ شاری سارایێڤۆ وەکوو پایەتەخت لە ژێر کۆنترۆڵی دەوڵەتی موسلمانی کرۆڤاتیادا دەمایەوە، بەڵام سربەکانیش لەو شارەدا، بەرێوەبەریی ئیدارییان دەبوو.

٥ـ سربستان، کۆماریی بۆسنە هێرزەگۆڤینی بەرەسمی دەناسێ.

٦ـ ئاوارەکان دەتوانن بگەڕێنەوە بۆ شارەکانی خۆیان.

بۆ جێبەجێکردنی ئەم ڕێککەوتننامە، نزیکەی ٦٠ هەزار کەس لە هێزەکانی ناتۆ لە چوارچێوەی هێزەکانی پاراستنی UN دا چوونە بۆسنەو هێرزەگۆڤینەوە.

### *ڕێککەوتننامەی گشتی تەعرفە و بازرگانیی*

### *General Agreement On Tariffs and Trade (GATT)*

گات یان ڕێککەوتننامەی گشتیی تەعرەفە و بازرگانیی، بە بەڵگەنامەکانی ڕێکخراوێکی سیستەمی بازرگانیی نێودەوڵەتی دەگوترێ کە ئەندامانی ئەو ڕێکخراوە ناچارن لە دەرەوەو لە ناوخۆشدا، خاڵەکانی ئەو ڕێککەوتننامە جێبەجێ بکەن.

لە دوای قەیرانی ئابووریی ساڵەکانی ١٩٢٩تا١٩٣٢ زۆربەی وڵاتانی جیهان بیریان لەوە کردەوە کە لە ڕێگای تەعرەفە گومیرکیەکانەوە، هاوەردەکانی خۆیان کەم بکەنەوە و ئەو ئەرزەی کە لە ئاکامی هەناردەکانەوە وەدەستی دێنن، بێخەنە ژێر چاوەدێرییەکی وردەوە. بەڵام ئەم

کەمکردنەوانە بوونە ئاستەنگ لەبەردەم بازرگانیی ئازاد لە نێوان ولاتەکان و بوون بە هۆی شێواندنی پەرەپێدان و گەشەی ئابووریی جیهانی پەرەنە گرتوو.

پاشان، لە ماوەی شەڕی دووهەمی جیهانیدا، دەوڵەتی ئەمەریکا کە بۆ پاراستن و زۆرترکردنی دەسەلات و خۆشگوزەرانی ئابووریی، پێویستی بە پێشکەوتنی ئابووری ئەورووپا هەبوو، وێڕای بەخشینی یارمەتیی ئابووریی و سەربازیی بە ولاتانی ئەورووپای رۆژئاوا، شێگیرانە پشیوانی لە سیاسەتی بازرگانیی ئازاد و نەهێشتنی چوارچێوەبەرتەسکە ئابوورییەکان دەکرد. لە جاڕنامەی ئاتلانتیک و رێککەوتننامەی قەرزدان و بە ئیجارە دانیشدا، ئاماژە بە پێویستی رەچاوکردنی بنەمای بازرگانیی ئازاد و نەهێشتنی جیاوازیی ئابووری کراوە.

بۆ وەدیهێنانی ئەم ئامانجانە، ئەمەریکا، بەریتانیا و دەوڵەتە بەرژەوەندیخوازەکانی تر، بەرلە کۆتایی هاتنی شەڕی دووهەمی جیهانیی، لە پێناو دامەزراندنی رێکخراوە نێودەوڵەتیە نوێکاندا کە بتوانن بەسەر کێشەکانی ئەرز، سەرمایەگوزاری و بازرگانیدا زاڵ بن، هەنگاوی کاریگەرییان هەڵێناو بە دامەزراندنی سندووقی نێودەوڵەتیی و بانکی نێودەوڵەتیی بووژانەوەو پەرەپێدان، کۆمەڵێک دەستکەوتیان وەدەست هێنا. بەلام راگەیەنراوی رێکخراوی بازرگانیی نێودەوڵەتیی بە هۆی رێک نەکەوتنی ولاتە گەورەکان، تاکۆتایی شەڕ ئامادە نەکرا. کەواتە ولاتانی هاوبەرژەوەندیی پێیان باشتر بوو کە کۆمەڵێک وتووێژ بۆ کەمکردنەوەی تەعرەفە گومرکیەکان و نەهێشتنی ئاستەنگە بازرگانیەکان دەست پێ بکەن.

لە ئاکامدا لە رێکەوتی ٢٠ی تشرینی یەکەمی ١٩٤٧دا، کۆنفرانسێک لە ژنیف بە بەشداریی ٢٣ ولاتی پێشکەوتووی جیهان پێکهات و رێککەوتننامەی گشتیی سەبارەت بە تەعرەفە گومرکی و بازرگانیەکان کە بە کورتکراوی "گات"ی پێ دەڵێن، مۆر کرد. ئەم رێککەوتننامە کە لە یەکی کانوونی دووهەمیی ١٩٤٨ەوە جیبەجێ دەبێ، لەسەرەتادا تەنیا چوارچێوەیەک بوو کە ولاتانی ئەندام لە سەرئەوە رێککەوتن، وتووێژگەلێکی دوولایەنە بۆ کەمکردنەوەی تەعرەفە گومرکیەکان و ئالووگۆڕی بازرگانیی وەرێ بخەن و کۆمەڵێک رێککەوتننامە دارێژران. کەواتە ئەو رێککەوتننامە هیچ دامەزراوەیەکی پێک نەهێناوە. بەڵکوو تەنیا ئەو ئامانج و بنەمایانەی دیاریکردووە کە دەبێ ولاتانی ئەندام لە پێوەندییە بازرگانیە نێودەوڵەتیەکانیاندا رەچاوی بکەن.

گات ڕێککەوتننامەیەکی نێودەوڵەتی بۆ کەمکردنەوەی تەعرەفە گومرکیەکان، نەهێشتنی چوارچێوە بەرتەسکە بازرگانیەکان و لە ناوبردنی ئاستەنگەکانی بازرگانیکردنی ئازادە. ئەم ڕێککەوتننامە چ لە بواری رادەی ولاتانی بەشدار ، چ لە بواری ڕێژەی ڕێووشوێنەکان و چ لە بواری ڕێژەی ئالووگۆڕە بازرگانیەکاندا؛ چڕترین و باشترین ڕێککەوتننامەیە کە لەم بوارەدا لە نێوان دەوڵەتەکانی جیهاندا، گرێدراوە. ئامانجە تایبەتیەکان و ئامانجی ڕێکحراوی بەرێوەبەریی ئەم ڕێککەوتننامە، بردنەسەری ئاستی ژیانی خەڵکی ولاتانی ئەندام، دابینکردنی کاربەتەواوەتیی، کەڵک وەرگرتنی بەجێ لەسەرچاوە نێوخۆییەکان، بردنە سەری ئاستی بەرهەمهێنان و گواستنەوەی شتومەک (کەرسەکان) لە نێوان ولاتان و یارمەتیدانی پەرەپێدان و ئاوەدانکردنەوەی ئابووری جیهانە. لەم ساڵانەی دواییدا، پەرەپێدانی بازرگانی نێودەوڵەتیی، نەهێشتنی ئاستەنگە بازرگانیەکان، بردنەسەری دەرفەتی دەستڕاگەیشتن بە بازارە گەورەترەکان و دۆزینەوەی چارەسەرێک بۆ کێشەی نەتەوە پەرە نەگرتووەکان، بایەخێکی زیاتری پەیدا کردووە.

بنەماکانی گات:

گات بۆ وەدیهێنانی ئامانجەکانی خۆیی ئەم بنەما گشتیانەی پەسند کردووە:

***الف)*** سیاسەتی جیاوازی دانەنان لە سیاسەتی بازرگانی دەرەوەدا:

بەپێی ئەم بنەمایە هەر ئیمتیازێک کە ولاتێکی ئەندامی گات دەیداتە هەر ولاتێکی دیکە، جاچ ئەو ولاتە ئەندام بێ و چ ئەندامیش نەبێ، هەموو ولاتانی ئەندامیی گات بە شێوەیەکی خۆرسکانە لەم ئیمتیازانە کەڵک وەردەگرن. ئەمە لەراستیدا هەمان بنەمای دەوڵەتیی کامله الوداده بەلام مەودای گات بەربلاوترە؛ چونکە داشکانە گومرکیەکان نەتەنیا هەموو ئەندامانی گات دەگرێتەوە و تایبەت بە ولاتێکی دیاریکراو نین، بەڵکوو بەرهەمە نیشتمانیەکانی ولاتانی ئەندامیش، لە ولاتانی دیکەدا لەخۆ دەگرێ.

***ب)*** بنەمای ئازادیی بازرگانیی یان قەدەغەکردنی دیاریکردن ڕێژە:

بەپێی ئەم بنەمایە، سیاسەتی دیاریکردنی ڕێژەی پشک و دانانی چوارچێوەیەکی ئاماری (ژمارە،بڕ) قەدەغە کراوە. بەندی یەکی ماددەی ١١ی ڕێککەوتننامەکە دەڵێ: " هیچ کام لە ولاتانی ئەندام (بەڵێندەر) نابێ هەموو یان بەشێک لە هەناردە و هاوردەی خۆیان تەنیا بۆ ولاتێکی

تایبەتی ئەندام تەرخان بکەن یان چوارچێوە و ئاستەنگێک بۆ وڵاتێکی دیکە دابنێن و پەنا نەبەنە بەر مۆڵەتی هێنانی ئەرز وچاوەدێریکردنی ئەرز و شتەکانی دیکەدا.

ج) : راوێژکردن لەگەڵ وڵاتانی ئەندام دا:

بەپێی ئەم بنەمایە کێشە بازرگانیەکانی نێوان وڵاتانی ئەندام ـ بۆ وێنە ئەو زیانانەی کە رەنگە بە هۆی سیاسەتی بازرگانی وڵاتێکەوە لە وڵاتانی دیکەی ئەندامیش بکەون ـ لە رێگای راوێژ و وتووێژەوە چارەسەر دەکرێن.

د: ئیمتیازە تەعرەفەیەکان: ماددەی ٢٨ی رێککەوتننامەکە دەڵێ: "دەوڵەتانی ئەندام ئەو راستیە دەسەڵمێنن کە تەعرەفە گومرکیەکان، ئاستەنگێکی گەورە لە بەردەم پەرەپێدانی بازرگانی دان. بۆیە وڵاتانی بەڵێندەر وتووێژی پێویست بۆ کەمکردنەوەی بنەڕەتیانەی تەعرەفەی گومرکی و بەخشینی ئیمتیازە تەعرەفەییە دوولایەنەکان دەدەن.

هـ: بەمەبەستی هاوکاری کردنی وڵاتانی لە حاڵی پەرەسەندندا لە تشرینی دووهەمی ١٩٦٤، بەشێکی نوێ بە رێککەوتننامەی ١٩٤٧ی گات زیاد کرا. بەپێی ئەم بەشە تازە، بنەمای دوولایەنەبوونی ئیمتیازەکان سەبارەت بە وڵاتانی لە حاڵی پەرەسەندندا بە شێوەیەکی سەربەستانە بوو، بەو واتایەی کە وڵاتانی ئەندامیی گات رێگایان پێدراوە ئیمتیازی گومرکیی ببەخشنە وڵاتانی لە حاڵی پەرەسەندن، بەبێ ئەوەی چاوەڕوانی دوولایەنەیان هەبێ.

پێکهاتە یان بناغەکانی گات: تاپێش ساڵی ١٩٦٠، گات وەکوو رێکخراوە نێودەوڵەتیەکانی دیکە، خاوەنی پێکهاتە نەبوو و تەنیا سکرتاریاییەکی چکۆلەی هەبوو کە ئەرکی ئیداری بەرێوە دەبرد و هەموو ساڵێک چەند کۆبوونەوەی بە بەشداریی وڵاتانی ئەندام لە ژنێڤدا پێکدێنا. کە وەکوو کۆمەڵەی گشتیی گات وابوو و بریاری پێویستیشی دەدا. لە ساڵی ١٩٦٠دا، ئەنجوومەنیی نوێنەران پێکهات کەئەرکی ئامادەکردن و دارشتن و جێبەجێکردنی بریارەکانی کۆنفرانسی لە ئەستۆدا بوو. ئەنجوومەن هەمیشەیی بوو و لە ماوەی خولەکانی کۆبوونەوەی گشتی گاتدا، کۆدەبۆوە. چەند کومیتە لە ژێر چاوەدێری ئەنجوومەندا پێکهاتن کە گرنگترینیان بریتی بوون لە: کومیتەی وتووێژە بازرگانیەکان و کومیتەی بازرگانی و پەرەپێدان.

دوای ئەوەی زۆر لە بریارەکانی "گات" شکستیان هێنا. لە ماوەی زیاتر لە نیو سەدە تەمەنی گاتدا، ئەم رێکخراوە لە دوای بریاری ١٢٤ وڵاتی ئەندام، بە شێوەی رەسمیی رێکخراوێکی

نوێی لەیەکی کانوونی دووهەمی ١٩٩٥ لە ژێر ناوی "رێکخراوی بازرگانیی جیهانی " پێکهێنا تاکوو لەگەڵ کێشەکانی وەکوو، سوبسیدەکانی کشتووکاڵ دا بەرەنگاری بکا.

## Munich Agreement — رێککەوتننامەی میونیخ (١٩٣٨)

ئەم رێککەوتننامە لە ٢٠ی ئەیلوولی ١٩٣٨دا، لە نێوان هیتلەر، موسۆلینی، چەمبرلین و دالادیەدا گرێدرا. ئەم رێککەوتننامەیە هەموو ناوچە ئەڵمانی نیشینەکانی سودێتی بە ئەڵمانیا دەسپارد. دەوڵەتەکانی ئەورووپای رۆژئاوا بە گرێدانی ئەم رێککەوتننامە، لە راستیدا ملیان بۆ داواکارییە نابەجێکانی ئەڵمانیای هیتلەری دانەواند و بەشێکی زۆر لە دانیشتوانی ئەم ناوچانە ئەڵمانیەکانی چیکسلۆڤاکیا بوون، لەلایەن ئەڵمانیاوە داگیر کران. لە کۆنفراسی میونیخدا کە بوو بە هۆی گرێدانی ئەم رێککەوتننامە، نوێنەری سۆڤیەت و چیکسلۆڤاکیا بانگهێشت نەکرابوون. ستالین پێیوابوو کۆنفرانسی میونیخ و رێککەوتنی بەریتانیا و فەرەنسا لەگەڵ ئەڵمانیادا دەبێتە هۆی ئەوەی کە هیتلەر هێرش بکاتە سەر ئەورووپای رۆژهەڵات و لە داگیرکردنی ئەورووپای رۆژئاوا خۆببوێرێ.

## Powers Politics — رێبازی رەسەنایەتیی هێز

رێبازی رەسەنایەتیی هێز لە سەدەی ١٧دا بۆ یەکەمجار لە لایەن تۆماس هۆبز لە کتێبە ناوبانگەکەیدا بە نێوی لۆیاتان کە لە ساڵی ١٦٥١دا بلاّو کرایەوە، راگەیەنرا. هۆبز پێی وا بوو هەموو ئاکارەکانی مرۆڤ لە ناو کۆمەڵدا دەرئەنجامی هێز و ترس لە دۆڕانە. پاڵنەری وڵاتەکانیش وەدەستهێنانی هێز، پاراستنی هێز و زۆرکردنی هێزە.

لە دوای شەری دووهەمیی جیهانیدا، مورگانتا، بیریاری ئەمەریکی ئەم رێبازەی زیاتر پەرەپێدا ئەویش پێیوایە کە پاڵنەری هەموو ئاکارەکانی مرۆڤ و وڵاتەکان هێزە. ئاواتی زاڵبوون بەسەرکەسانی دیکە و هێز لە ناخی مرۆڤدا شاراوەتەوە. هێزپەرستی مرۆڤ شتێکی سروشتیە و نافەوتێ، تەنیا بەرتەسک دەبێتەوە. تەنیا هێزە کە هێز هاوسەنگ دەکا. کەواتە باشترین رێگای پێکهاتنی ئاشتی، هاوسەنگیی نێوان هێزەکانە.

## Treaties Of Rapallo — رێککەوتننامەی راپالۆ (١٩٢٠)

بەو ڕێککەوتننامە دەگوترێ کە سەبارەت بە کێشەی سەر سنوور لە نێوان ئیتالیا و یۆگسلاڤیادا گرێدرا (١٢ی تشرینی دووهەمیی ١٩٢٠). ئەم دوو وڵاتە بەڵێنیان دا کە:

١ــ دژایەتیی خۆیان لەگەڵ ژیانەوەی دەسەڵاتدارەتیی هامبۆرگدا بە هەر شێوزایێک کە بۆیان دەلوێ، رابگەیەنن.

٢ــ هەروەها بەو ڕێککەوتننامەش دەگوترێ کە لە نێوان دەستەی نوێنەرایەتیی ئەڵمانیاو سۆڤیەت لە ڕێکەوتی ١٦ی نیسانی ١٩٢٢ دا مۆر کرا. ئەم دووولاتە لە پێش ئەم ڕێککەوتننامەشدا پێوەندی سیاسی خۆیان دامەزراند بۆوە و وازیان لە داواکارییە مادددییەکانی خۆیان هێنا و بەپێی مەرجێکی نهێنی ناو ڕێککەوتننامەکە، ئەڵمانیەکان راهێنانی کار گوزارانی فرۆکەکانی سۆڤیەت و زرێپۆشەکانیان لە ئەستۆ دەگرت. بەپێی ڕێککەوتننامەی ڤێرسای، ئەڵمانیا مافی زرێپۆش و فرۆکەی نەبوو.

## ڕێککەوتننامەکانی ریگا — *Treaties Of Riga*

ئەم زاراوە ئەم دوو ڕێککەوتننامە لەخۆدەگرێ:

١ــ ڕێککەوتننامەیەک لە نێوان لیتۆنیا و یەکیەتیی سۆڤیەت (١٩٢٠) کە بەپێی ئەم ڕێککەوتننامە، سۆڤیەت بە شێوەی رەسمی دانی بە سەربەخۆیی لیتۆنیا دانا.

٢ــ ڕێککەوتننامەیەک لە نێوان پۆلۆنیا و یەکیەتیی سۆڤیەت، کە بەپێی ئەم ڕێککەوتننامە کۆتایی بە حاڵەتی شەڕی نێوان ئەم دوو وڵاتە هات و سنووری رۆژهەڵاتی پولۆنیاش دیاری کرا. هەردوو ڕێککەوتننامەکە بە هۆی گرێدانی ڕێککەوتننامەی سۆڤیەت لەگەڵ ئەڵمانیای نازیدا،(١٩٣٩)، هەڵوەشانەوە.

## ڕێککەوتننامە — *Treaty*

سەبارەت بە ڕێککەوتننامە دوو پێناسە لە ئارادان:

١ــ بە پێی عورف

٢ــ بە پێی ڕێووشوێنەکانی کۆنڤانسیۆنی ڤیەننا (١٩٦٩)

پێناسەی ڕێکەوتننامە بە پێی عورف :

ڕێککەوتننامە بریتییە لە هەر ڕێککەوتن و بڕیارێک کە لە نێوان دوو یان چەند لایەنی خاوەن ماف و بەپێی یاسا نێودەوڵەتیەکان جێبەجێ دەبێ و مەبەست لە گرێدانی ڕێککەوتننامە، پێکهێنانی بوارێکی یاساییەو دەبێ بەپێی یاسا نێودەوڵەتیەکان بێ. مەرجی سەرەکی گرێدانی ڕێککەوتننامە،پێخۆش بوون و ویستی لایەنەکانە. بەڵام مەرجیش نیە کە هەردوو لایەنەکە لە یەک کاتدا و پێکەوە پێخۆش بوونی خۆیان دەربڕن.

پێناسەی ڕێککەوتننامە بە پێی کۆنڤانسیۆنی ڤیەننا:

بە پێی بەندی "a" ماددەی دووهەمیی کۆنڤانسیۆنی ڤیەننا (١٩٦٩)، زاراوەی "ڕێککەوتننامە" بە بڕیارێکی نێودەوڵەتی دەگوترێ کە لە نێوان وڵاتەکاندا گرێدراوە و بە پێی یاسا نێودەولەتیەکان جێبەجێ دەبێ، چ لە بەڵگەیەکدا یان لە دوو یان چەند بەڵگەدا مۆر کرابێ، یان هەر ناوێکی تایبەتیشی لەسەر دانرابێ. تێبینی : هەرچەندە ڕێککەوتننامە بەشێوەی نووسراوەش گرێ نەدرابێ، دیسانەوە بایەخی یاسایی هەیە. (ماددەی سێهەم). کۆنڤانسیۆنی ڤیەننا سەبارەت بەو بڕیارانەی کە نەنووسراون و پێیان دەگوترێ بڕیارە زارەکیەکان Verbal Accord، ڕێووشوێنێکی دیاری نەکردووە و ئەم بڕیارانەی هەروا بە شێوەی نارەسمی پەسند کردووە.

پێویستە ئاماژە بەم بابەتەش بکەین کە ڕێککەوتننامە، هەم نێوەرۆکی بڕیاری نێوان لایەنەکانی ڕێککەوتن و هەم بەڵگە یان نووسراوەکان کە نێوەرۆکی ڕێککەوتننامەکەیان تێدا نووسراوە، لەخۆ دەگرێ. بەپێی کۆنڤانسیۆنی ڤیەننا بڕیار و ڕێککەوتنی گرێدراو ڕەنگە خاوەن یەک یان چەند بەڵگەی نووسراو بێ و هەروەها ئەگەری ئەوەش هەیە ڕێککەوتننامە لە ڕێی نووسراوە یان نووسراوەی ڕەسمیەوە گرێ بدرێ. بۆیە لە ماددەی دووهەمدا ئاماژە بەوە کراوە کە زاراوەی "ڕێککەوتننامە " بۆ هەر ڕێککەوتن و بڕیارێکی نێودەوڵەتیی دەبێ، هەر چەندە "ناوێکی تایبەتیشی لە سەربێ". بەم پێیە بە پێی ئەو ڕێککەوتننامە، روون دەبێتەوە کە ناوی جۆراوجۆر لەسەر ڕێککەوتنی نێوان وڵاتان دادەنرێ. لە ڕاستیدا و لە کردەوەشدا ئاماژە بە نێوی جیاواز دەکرێ: وەکوو بەڵێننامە، ڕێککەوتننامە، پرۆتۆکوڵ، ڕاگەیەنراو، بەڵین، بڕیار، ڕێگای چاکسازی و پێکهاتن، گۆڕینەوەی نووسراوە، نووسراوەی ڕەسمیی، مێموراندۆم سەبارەت بە بڕیار، کۆنکۆرد.

دیوانی دادی نێودەوڵەتی ئەم حاڵەتەی بەرەسمی ناسیووە "کە ئەو ناوەی کەڵکی لێ وەردەگیردرێ لە بواری تایبەتمەندیی بڕیار یان بەڵێنی نێودەوڵەتیەوە، لە هۆکارە دیاریکەرەکان نیە، بەلاّم لە ماددەی ٣٨ی پێڕەو پرۆگرامی دیوانی داد لە زاراوەی "رێککەوتننامە" کەڵک وەرگیراوە.

لە سیاسەتدا لە زاراوەکانی بەڵێننامە، رێککەوتننامە و بڕیار وەکوو سێ زاراوەی سەرەکی کە هەموو رێککەوتننامە نێودەوڵەتیەکان لە خۆدەگرن، کەڵک وەرگیراوە. هەروەکوو لە ماددەکانی ٣٥ و ٣٦ و ٣٨ پێڕەوپرۆگرامی دیوانی دادی نێودەوڵەتیی و هەروەها لە ماددەکانی ١٠٢و ١٠٣ی پێڕەوپرۆگرامیUn یشدا ئەم زاراوانە هەربەم شێوە کەڵکیان لێ وەرگیراوە.

## رێککەوتننامەی ئاشتی — *Peace Treaty*

رێککەوتننامەیەکە کە بە شێوەی یاسایی کۆتایی بە حاڵەتی شەڕ لە نێوان وڵاتاندا دێنێ. رێککەوتننامەی ئاشتی شێوازی باوی گەڕاندنەوەی رەوشی ئاشتی لە نێوان لایەنە بە شەرهاتووەکان دایە. کۆتاییهێنان بە شەڕ و هەوڵەکانی دیکە بۆ راگرتنی شەڕ ئەو کاریگەرییەیان نیە، مەگەر ئەوەی رابگەیەنن کە دەیانەوێ کۆتایی بە شەڕ بێنن و ئامانجیشیان تەنیا کۆتایهێنان بە دوژمنایەتیی ئیستا نەبێ بۆ وێنە: رێککەوتننامەی ئاگربەسی ساڵی ١٩٦٥ی نێوان هیند و پاکستان یان رێککەوتننامەی ئاگربەسی ١٩٧٣ی ڤێتنام کە دەریانخست کۆتاییان بە شەڕ هێناوە و ئاشتیان بۆ ڤێتنام گەڕاندۆتەوە. رێککەوتننامەی ئاشتیی جگە لە راگەیاندنی کۆتایهێنان بە حاڵەتی شەڕ و گەڕاندنەوەی ئاشتی، کۆمەڵێک یاسا و رێساش سەبارەت بە لە ناوبردنی ئاسەوارەکانی شەڕ لەخۆ دەگرێ؛ وەکوو: گەراندنەوەی دارایی و سامانەکان، گەڕاندنەوەی دیلەکانی شەڕ، قەرەبووکردنەوەی زیانەکان، متمانە و رێککەوتننامەکانی پێش لە قەومانی شەڕەکە، کۆت و بەندە سەربازی و نیشتمانیەکان و...هتد.

## رێککەوتننامەی نیولی (١٩١٩) — *Treaty Of Neuilly*

ئەم رێککەوتننامە لەرێکەوتی ٢٧ی تشرینی دووهەمیی ١٩١٩ لە نێوان هاوپەیمانان و بولگاریادا مۆر کرا و بە شێوەی رەسمی کۆتایی بەو دوژمنایەتیە هێنا کە بە هۆی شەڕی یەکەمیی جیهانیەوە کەوتبووە نێوانیانەوە. بەپێی ئەم رێککەوتننامەیە، بولگاریا کۆمەڵێک پارچە خاکی

چکۆلەی بەخشیە ولاّتانی یۆنان، یۆگسلاڤیا و رۆمانیا و پارەیەکیشی وەکوو قەرەبووکردنەوە دایە ئەم ولاّتانە و هەروەها بەڵێنیدا کە ژمارەی هێزە سەربازییەکانی ئەم ولاّتە لە ۰۰۰/ ۲۰ کەس تێنەپەڕێ.

### راگەیەنراوی تۆنکین (۱۹٦٤) Tonkin Resolution

بەو راگەیەنراوە دەڵێن کە لە رێکەوتی حەوتی ئابی ۱۹٦٤، لە لایەن هەر دوو ئەنجوومەنی ئەمریکاوە پەسند کرا. بە پێی ئەم راگەیەنراوە، جانسۆن(۱۹۰۸_۷۳) سەرۆک کۆماری ئەوکاتی ئەمریکا رێگای پێدرا تا هەموو هەوڵەکانی خۆی بەمەبەستی بە کارهێنانی هێزەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بۆ هاوکاریکردنی ولاّتانی ئەندامی سیتۆبخاتەگەڕ. ئەم رێککەوتننامە لە ئاکامی هێرشی هێزەکانی ڤێتنامی باکووری بۆ سەر ناوشکێنی مادۆکس و ناوەکانی دیکەی کەنداوی تۆنکین لە رۆژی دووهەمی ئابی ۱۹٦٤ دا پەسند کرا.

سەنا و کۆنگرێسی ئەمریکا رێگایان بە سەرۆک کۆماردا تا پالاّوگە و ئەنبارەکانی سووتەمەنی هێزی دەریایی ڤێتنامی باکووری بدەنە بەر پەلاماری تۆلەستێنانەو سەرۆک کۆمار وەک مۆڵەتێک لەم رێککەوتننامە کەڵکی وەرگرت بۆ تێکهەڵچوونی تەواوەتی هێزەکانی لەڤیەتنام دا و ئەم شەڕەی کردە شەڕێکی بەرین و بەربلاّو.

### ڕێسای ئیستۆپێل Estoppel

پرەنسیپێکی یاساییە. بە پێی ئەم پرەنسیپە، پێچەوانە قسەکردن سەبارەت بە کەسێکی دیکە، قەدەغەیە.

### روون بوون TransParency

پرۆسەیەکی ئاشکراو نەشاراوەیە کە دامودەزگا بەرپرسیارە دەوڵەتی و نێو دەوڵەتیەکان سەبارەت بە چەک وچۆڵ، ژمارە بانکیەکان، سەرمایەی کۆمپانیا بازرگانیەکان، هەڵبژاردن و راگواستنی چەک وچۆڵ دڵنیا دەبنەوەو هیچ گومانێکیان لەسەر ئەو خالاّنەی کە ئاماژەیان پێکرا، نامێنێ.

## The Middle East

### ڕۆژهەڵاتی نێوە ڕاست

زاراوەیەکی نارِوونە کە لە سەرەتای سەرهەڵدانیەوە تاکوو ئێستا بە چوارچێوەیەکی جوگرافی روون و دیاریکراو نەگوتراوە کە هەموو لایەک لەسەری کۆک بن. روانگەی جۆراوجۆر لەو بوارەدا لە ئارادان کە ناوچەی رۆژهەڵاتی نێوەڕاست ئەم وڵاتانە لە خۆدەگرێ:

١ـ ئێران، تورکیا، قوبرس، وڵاتانی عەرەبی زمانی رۆژهەڵاتی دەریای مەدیتەرانە، فەلەستین، نیمچەدورگەی عەرەبستان، ناوچەی دیجلەو فورات، چۆمی نیل (میسرو سودان) و لیبیا؛ (ساڵنامەی رۆژهەڵاتی نێوەڕاست و باکووری ئەفریقیا ١٩٨٧).

٢ـ ناوچەیەک لە نێوان عەرەبستان و هیندوستان کە لە روانگەی ستراتیژیستەکانەوە ناوەندەکەی لە کەنداوی فارسە (بێرنارد لوییس، رۆژهەڵاتی نێوەڕاست و رۆژئاوا).

٣ـ ناوچەی نێوان لیبیا هەتا ئەفغانستان ( قامووسی راندۆم هاڤس).

٤ـ رۆژهەڵاتی نێوەڕاست ناوێکی دانراو و، تارادەیەکیش دلخوازانەیە. مەبەست لە ناوچەیە سێ وڵاتی گەورەی ئێران، میسرو تورکیا، وڵاتانی رۆژئاوای ئاسیا، ئیسرائیل و قوبرسە ( ژان پییەردرینیک، رۆژهەڵاتی نێوەڕاست لە سەدەی بیستەم دا).

دەکرێ ناوچەی رۆژهەڵاتی نێوەڕاست بە شێوەیەکی رێژەیی و بە سەرنجدان بە فاکتەرەکانی جێیی بایەخی تیۆرڤانان، ئەم وڵاتانە لە خۆبگرێ:

ئێران، ئۆردون، ئیماراتی یەکگرتووی عەرەبی، بەحرەین، تورکیا، سووریا، عێراق، عەرەبستان، عەممان، فەلەستین، قەتەر، لوبنان، کوێت، میسرو یەمەن. بەپێی رای هێندێک لە تیۆرڤانان، دوای هەڵوەشانەوەی یەکیەتیی سۆڤیەت، وڵاتانی موسوڵمانی ئاسیای ناوەندی (ئۆزبەکستان، تورکەمەنستان، قرقیزستان و قەزاقەستان) و ناوەندی قەفقاز و ئەودیو قەفقازیش (ئازەربایجان، ئەرمەنستان و گورجستان)یش بە " رۆژهەڵاتی نێوەڕاستی نوێ" بژمێردرێن.

## Super –power زلهێز

ئەو دەوڵەتانەی کە بە زلهێزە جیهانیەکان دەژمێردرێن، ئەو دەوڵەتانەن کە بە کەڵک ، وەرگرتن لە پیشەسازی، دەزگایەکی بەهێزی سەربازی پێک دێنن. لە چاخەکانی پێشوودا، میسر و ئێران و رۆم بە نۆبە زلهێزی نێودەوڵەتی بوون. لە چاخی نۆیدا، وڵاتە ئەورووپیەکان بوونەتە ناوەندی هێز و دەسەلاّت . لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا، حەوت وڵاتی رۆژئاوایی و وڵاتێکی رۆژهەڵاتی ـ واتا بەریتانیا و ئەڵمانیا و فەڕنسا و نەمسا ـ هەنگاریا و رووسیا و ئیتاڵیا و ویلاتە یەکگرتووکانی ئەمەریکا و ژاپۆن ـــــــ دەسەلاّتیان لە دەست دابوو. لە سەرەتای بیستەمدا، هەموو هێزەکان لە بەرامبەر دوو زلهێزدا، واتا لە بەرامبەر ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و سۆڤیەتدا (هەتاتشرینی یەکەمی ١٩٩١)، زۆر لاواز بوون. دوای هەڵوەشانەوەی یەکیەتیی سۆڤیەت و لە نێوچوونی سیستەمی دوو جەمسەری، زاراوەی زلهێز (Hyper Power) تەنیا سەبارەت بە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بۆتە باو و، کەڵکی لێ وەردەگیرێ.

## سۆلیداریتی *Solidarity*

ئەم زاراوەیە بە بزووتنەوەی کرێکاریی بەریتانیا دەگوترێ کە لە ساڵی ١٩٨٠ بەسەرۆکایەتی لێخ ڤاڵسا لە کۆگای دروستکردنی پاپۆری لنین لە شاری گۆدانسیک دامەزرا. ئەو یەکیەتیە توانی ئیمتیازێکی زۆر لە دەوڵەت وەربگرێ و، چالاکیی ئەم حیزبە بە هاتنە سەرکاری ژەنەراڵ یارۆزلێسکی و راگەیاندنی باری نائاسایی قەدەغە کراو، سەر کردەکانیشی خرانە بەندیخانەوە (١٩٨١).

وا پێدەچوو کە ئەم کردەوانەی دەوڵەت تارادەیەک بۆتە هۆی ترساندنی ئەندامانی یەکیەتیی ناوبراو و، خەوشداربوونی پێگەو متمانەی سەرکردەکانی. بەڵام لەرەوتی قەیرانی سیاسی و ئابووریی ساڵی ١٩٨٨دا، سۆلیداریتی وەک رەمزی نارەزایەتیی گشتی دەرکەوت و، لە دەرئەنجامیشدا لە رێگای وتووێژەوە، لەگەل دەوڵەت گەیشتە چارەسەرێکی سیاسی. بە دوای ئەو گۆڕانکارییانەی کە لە ئەورووپای رۆژئاوادا هاتنە ئاراوە، پۆلۆنیاش لە ئاگری ئەم رووداوانە گلا و، سەرۆکی سۆلیداریتی توانی وەپێش یارۆزلێسکی بکەوێتەوەو، ببێ بە سەرۆک کۆماری پۆلۆنیا.

### سوپای گەورە — Grand Armee (Fr.Geat Army)

سوپای گەورە بە هێزە چەکدارەکانی ناپلیۆن بوناپارت، ئیمپراتۆریی بەناوبانگی فەڕەنسا دەگوترا کە لە نێوان ساڵەکانی ١٨٠٤ هەتا ١٨١٢دا رێک خرابوون. سوپای گەورە لە ٣٥٠ هەتا ٤٠٠ هەزار چەکدار پێک هاتبوو کە لە ساڵی ١٨١٢دا لە شەڕی نێوان فەڕەنسا و رووسیا دا بەشداری کرد.

### سوپای کۆماریخوازی ئایرلەند — IRA(Irish Republican)

ئەم هێزە پارتیزانە نیمچە سەربازییە لە ساڵی ١٩١٩ لە لایەن ناسیۆنالیستە ئایرلەندییەکانەوە بۆ شەڕکردن لە دژی هێزە داگیرکەرەکانی بەریتانیا لە ئایرلەند دامەزرا.

سوپای ئایرلەند، رێککەوتننامەی رێکەوتی ٦ی کانوونی یەکەمی ١٩٢٩، ئایرلەندی وەک بەشێک لە خاکی بەریتانیا دادەنا، رەت کردەوە. دوای سەرکوتی راپەڕینی ئایرلەندییەکان، سوپای ئایرلەند بە نهێنی درێژەیان بە چالاکیەکانی خۆیان دا. سوپای کۆماریخواز زۆر جار هێرشی چریکی بەڕێوە دەبرد، بەڵام یەکێک لە باڵەکانی ئەم سوپایە بەناوی " رەسمیەکان" باوەڕی بە ئاگربەست لەگەڵ هێزە چەکدارەکانی بەریتانیا هەیە.

دوای رووداوی ١١ی ئەیلوولی ٢٠٠١، سەرکردەکانی ئەم سوپایە بەرەسمی پێخۆش بوونی خۆیان بۆ چەک دانان راگەیاند.

### سوپای سوور — Red Army

ئەم زاراوەیە دوو مانای خوارەوە، لە خۆ دەگرێ :

١ــ ناوێک بۆ سوپای یەکیەتیی سۆڤیەت (پێشوو). سۆڤیەتیەکان بۆ خۆیان لە ساڵی ١٩٤٠ بەولاوە، لەو زاراوە کەڵکیان وەرنەگرتووە.

٢ــ ناوێک بۆ پێناسەکردنی رێکخراوێکی تیرۆریستی بە ناوی سێکیگون (Sekigun)، کە خاوەنی بیرو باوەڕێکی وشکی شۆڕشگێڕی ناروون بوو کە لە هەناوی بزووتنەوەیەکی خوێندکاریی رادیکاڵی ژاپۆنیدا سەری هەڵدا(١٩٦٩).

### سوپای سپی **Wite Army**

به لایەنگرانی حکومەتی پاشایەتی لە فەرنسا، دەگوترا کە لە رەوتی شۆڕشی مەزنی فەڕنسادا بە دژی کۆماریخوازان راپەڕیبوون و، پشتیوانیان لە لایەنگرانی رژێمی پاشایەتی دەکرد. ئەوانە وێڕای دەربڕینی دژایەتی، گوڵە سوسەنێکی سپیان بەدەستەوە دەگرت.
لە رەوتی شۆڕشی تشرینی یەکەمی رووسیاشدا، سوپای سپی بە کەسانێک لە سوپای تیزاری دەگوترا کە لە نێوان ساڵەکانی ١٩١٧ هەتا ١٩٢١ بە دژی سوپای سوور و لایەنگرانی شۆڕشی تشرینی یەکەم سەریان هەڵدا.

### سڕینەوەی ستالنیزم **Destalinization**

رەوتێکە کە لە دوای بەڕێوەچوونی بیستەمین دانیشتنی حیزبی کۆمۆنیستی یەکیەتیی سۆڤیەتی سۆسیالیستیی لە ساڵی ١٩٥٦ و لە دوای مردنی ژۆزێف ستالین، سەرۆک وەزیر ومارشاڵی یەکیەتیی سۆڤیەت (١٨٧٩-١٩٥٣)، لە لایەن نیکتیا خرۆشچۆف (١٨٩٤-١٩٧١)، سکرتێری گشتی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەت بەڕێوە چوو. ناوبراو بە رەخنە لە " کەسایەتی پەرستی "ی ستالین و کوشت و بڕی ناوبراو، رێگای بۆ ئەو رەوتە خۆش کرد. لە کۆنگرەی بیست و دووی حیزبدا تەرمی ستالین لە شوێنی گۆڕی لینینەوە بۆ دیواری کرەملین گوازرایەوە و، پەیکەرەکانیشی هەڵگیرانەوە. لە درێژەی ئەو سیاسەتەدا، ناوی گۆڕەپانەکان گۆڕدران و، ناوی ستالینگرادیش بوو بە ڤۆلگا گراد.

### ستالینیزم **Stalinism**

زاراوەیەکە کە بۆ ژۆزێف ستالین، دیکتاتۆر، سەرۆک وەزیران و سکرتێری گشتی حیزبی کۆمۆنیست و فەرماندەیی گشتی هێزەکانی یەکیەتیی سۆڤیەت دەگەڕێتەوە، کە، شێوازەکانی جێبەجێکردنی مارکسیزم ـ لینینزم لە سۆڤیەت لە سەردەمی دەسەڵاتدارەتی ئەوداو و راڤەی بۆچوونەکانی ناوبراو و گونجاندنیان لەگەڵ پراکتیکدا لە خۆدەگرێ. روانگەی ناوبراو بە مانای پیادە کردنی توندو تیژی، رژێمی پۆلیسی، تاک پەرستی و دیکتاتۆرییە.
ناسراوترین راڤەکانی ستالین سەبارەت بە تیۆرەکانی" دەوڵەتی لە سەرەمەرگ" و " ئەنتەر ناسیونالیزم" دایە. ناوبراو پێیوایە کە " مردنی هەنگاو بە هەنگاوی دەوڵەت بە هۆی لاوازکردنی

دەوڵەت نایەتە دی، بەڵکوو بە هۆی بەهێزکردنی لەو پەڕی دەوڵەتدا، دێتە دی. " سەبارەت بە ئەنتەرناسیۆنالیزمیش دەڵێ: ئەنتەرناسیۆنالیست کەسێکە کە بەبێ کۆت و بەند بەرگری لە سۆڤیەت دەکا چوونکە بەرگریکردن لە بزووتنەوەی شۆڕشگێڕی، بەبێ بەرگریکردن لە سۆڤیەت، وەک چوونە ریزی دوژمنانی شۆڕش وایە."

دوای مردنی ناوبراو، ستالینیزم بە لادان لە رێبازەکانی لنین لە قەڵەم درا.

## سەرەڕۆیی Absolutism

بە رژێمێک دەگوترێ کە خەڵک ناتوانن نوێنەرهەڵبژێرن، مافی دەنگانیان نیەو لە بەرێوەبردنی وڵاتیشدا، هیچ رۆڵ و ئەرکێکیان پێ ناسپێردرێ. بێ سنوور بوونی دەسەڵاتی دەسەڵاتدار، لە بواری یاساییەوە، بە شێوەیەک کە دەسەڵاتدار بە تەواوەتی سەر بەخۆ بێ، بوونی دەزگای چەقبەستوو و سەرکوتکەر کە هەر جۆرە نارەزایەتەک سەرکوت دەکا، سیستەمی کۆن و چەوسێنەرانە و هێندێک جاریش پێوەندییەکی فیۆدالیانە لە تایبەتمەندییەکانی رژێمی سەرەڕۆن. سەرەڕۆیی، ئۆتۆکراسی و دیسپۆتیزم چەندین لایەنی هاوبەشیان هەیە، بەڵام بەتەواوەتی وەک یەک نین. لەهەمان کاتدا، هەر تۆتالیتێرێک سەرەڕۆیە، بەڵام هەر سەرەڕۆیەک تۆتالیتەر نیە.

## ستراتیژی Strategy

لە سەرچاوەی یۆنانی Strategos بە واتای لەشکر agein بەواتای " فەرماندەری کردن" وەرگیراوە. کەوایە مانای وشەکە بریتیە لە "فەرماندەری لەشکر".

ئەمرۆکە ستراتیژی بەمانای، زانستی رێکخستنی هاوکاریکردن لە نێوان گەڵاڵە ئابووری و سیاسی و سەربازییەکان لە ئاستی دەوڵەت یان چەند دەوڵەتێکداو، کەڵک وەرگرتن لە هەموو هەل و دەرفەتەکان بۆ گەیشتن بە ئامانجە سەربازییەکانە. ستراتیژی بە درێژایی قۆناغێکی دیاریکراو و گۆڕانی بەسەردا نایا و، تەنیا بە گوازرانەوە لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی تر دەگۆڕرێ و جێگای خۆی بە ستراتیژییەک دەدا کە لەگەڵ قۆناغی نوێدا بگونجێ.

## ستراتیژیی زەوییە سوتێنراوەکان Scorched Earth Stvategy

پلان یان گەلاڵەیەکی سەربازییە کە بەپێی ئەو پلانە، هەموو سەرچاوە و کەرەسە خۆییەکان لەلایەن هێزەکانی لە حاڵی بەرگریدا، لە ناو دەچن، بۆ ئەوەی هێزەکانی دوژمن نەتوانن لەم کەرەسە و سەرچاوانە کەڵک وەرگرن. گرتنەبەری ئەم شێوازە هێزەکانی دوژمن تووشی گرفتی پشتیوانی دەکاو، لە دەرئەنجامدا ناچاریان دەکا کە پاشەکشەی بکەن. ئەگەرچی ستراتیژیی زەوییە سوتێنراوەکان زیاتر لە لایەن هێزە خۆییەکانەوە جێبەجێ دەکرێ، بەلاّم هێندێک جاریش دیتراوە کە هێزە هێرشبەرەکانیش بۆ تێکشکاندنی ئیرادەی بەرگری لایەنی بەرامبەر، گەلاّڵەیەکی لە جۆرە جێبەجێ دەکەن. هێزەکانی سوپای سوور هەم لە ئاستی خۆجەیی و هەم لە ئاستی ناوچەییدا ئەم ستراتیژییەیان لە دژی موجاهدینی ئەفغانستان جێبەجێ کرد. هێزەکانی سوپای عێراقیش دوای پاشەکشە لە کوێت (١٩٩١) کردەوەیەکی لەم چەشنەیان بەرێوە برد.

## Political Independence

### سەربەخۆیی سیاسی

سەربەخۆیی سیاسی بە دەسەلاّتی دەوڵەتێک لە بەرێوەبردنی کاروباری نێوخۆیی و دەرەکیی خۆیدا دەگوترێ، بەبێ ئەوەی ئەو دەوڵەتە چاوەڕانی لە دەوڵەتێکی دیکە هەبێ کە پشتیوانی لێ بکا.

## Slavism

### سلاڤیزم

بە رەوتێکی سیاسی ـ کۆمەلاّیەتی دەگوترێ کە لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەمدا سەری هەڵدا. لایەنگرانی ئەم رێبازە لە سەر ئەو بڕوایە بوون کە رێگای رووسیا لە رۆژئاوا جیاوازە و، دژایەتیان لەگەڵ رۆژئاواچێتیدا دەکرد.

## Crisis Stability

### سەقامگرتوویی قەیران

ئەم زاراوەیە بەگشتی بە توانایی خۆراگرتنی رژێمێک لە بەرامبەر پاڵەپەستۆ و پێش گرتن بە روودانی بشێوی و ئاڵۆزی دەگوترێ. بە واتای تایبەتی، بریتیە لە توانایی رژێمێکی سەربازی بۆ مانەوە لە ژێر کۆنترۆڵی سیاسی، تەنانەت لە هەل ومەرجێک داکە" بڕیاردەران" ( Decision Makers) ئەگەری روودانی شەڕ بە دوو نازانن.

## سیخوور Spy

بەکەسێک دەگوترێ کە لە ڕێگای نهێنی یان خۆنواندێنکی بەدرۆ لە ناوچەی هێرشی وڵاتی دوژمندا، کۆمەڵێک زانیاری بە مەبەستی گەیاندن بە لایەنی بەرامبەر کۆ دەکاتەوە یان هەوڵ دەدا زانیاری کۆ بکاتەوە. سیخوور لەکاتی دەستبەسەرکردندا هیچ مافێکی دیلەکانی شەڕ نایگرێتەوە، بەڵام پێویستە لە دادگاییەکی دادپەروەرانە دادگایی بکرێ و، مافی کەسێکی ژێر سەرپەرستی بۆ لەبەرچاو بگیرێ، واتە مافی ئەوکەسەی کە لە شەڕێکی چەکداری دا یان لە کاتی داگیرکرانی وڵاتێک دا، دەکەوێتە بەردەستی لایەنێکی شەڕ یان دەکەوێتە بەردەستی داگیرکەر و، ئەو کەسە هاووڵاتیی ئەو وڵاتە نیە.

سزای باو بۆ سیخوور لە کاتی شەڕدا ـ بەبێ لە بەرچاوگرتنی ئەوی کە ناوبراو لە بەدەستهێنانی زانیاری یان گەیاندنی بە دوژمندا سەرکەوتوو بووە یان نا ـ کوشتن یان لە سێدارەدانە. کاری نهێنی بە تایبەتمەندیی پێویستی سیخوور دادەنرێ. هەربۆیە ئەوکەسەی جلی سەربازی لەبەردانەبێ و بە مەبەستی کۆکردنەوەی زانیاری چووبێتە ناوچەی شەڕی دوژمن، بە سیخوور دادەنرێ. بۆیە سەربازەکان و ئەو کەسە ئاساییانەی کە راسپێردراوەکانی خۆیان بە شێوەی راشکاوانە بەڕێوە دەبەن، بە سیخوور دانانرێن. کاتی ئاشتیدا یاسا نێودەوڵەتیەکان سیخوور ناگرنەوەو، یاسا وڕێسا نێوخۆییەکانی وڵاتەکە بەسەریدا دەسەپێ.

## سەروەری Sovereignty

سەروەری بریتیە لە هێزی باڵای بریاردان و دارشتنی یاساکان و بەڕێوەبردنی بریارەکان لە لایەن حکومەتی وڵاتیکەوە.

سەروەریی وڵات لە نێو سنوورەکانی ئەو وڵاتەدا جێبەجێ دەکرێ. سەروەریی دەرەکی، واتە مافی ئەوە پێوەندی دامەزراندن ، یان شەڕراگەیاندن لەگەڵ وڵاتێکی تر. دەزگای حکومەتیی هەروڵاتێک کە لە تاکەکەس یان دەستەی بەڕێوەبەری پێکدێ، بەرزترین دەسەڵاتی بریاردانی سیاسی لە وڵاتدا هەیە و دەتوانێ بریارەکانی خۆی پراکتیزە بکا.

سەروەری، نیشاندەری بڕیاردانی سەربەخۆی وڵاتانە. هەربۆیە سەروەری لەگەڵ شێوازی چەقبەستووی ڕێکخراوی حکومەتی جیهانیدا یەک ناگرێتەوە. ناسیۆنالیزم هاندەر و پتەوکەری سەروەرییە. سەروەری لەڕاستیدا ڕەنگدانەوەی حکومەت و گەورەترین ئەرک و ڕۆڵی حکومەتە.

## سەروەریی یاسا **Soverehgnty Of Low**

یەکێک لە پرەنسیپە گرنگەکانی یاسا سەرەکی و ئیدارییەکانی وڵاتێک، پرەنسیپی سەروەریی یاسایە کە بەپێی ئەم یاسایە، دەبێ داڕشتنی کاروباری گشتی و دەرکردنی بڕیار لە لایەن بەرپرسانی ئیداری و بەڕێوەبردنی هەر ئەرک و کردەیەک لە لایەن کارمەندانی دەوڵەتەوە بەپێی یاسا، واتە بەپێی ڕێوشوێنە گشتیەکان بێ کە پێشتر لەلایەن بەرپرس یان شوێنێکی خاوەن سەلاحییەتەوە داڕێژراون و ڕاگەیەنراون. یاسا بەمانا گشتیەکەی بریتیە لە بڕیارێک کە ڕێوشوێنی ماف و ئەرک بەگشتی دادەڕێژێ، ئەمە جگە لەوەی کە سەرچاوەکەی هێزی یاسادارێژی یان بەرپرسانی تری حکومەتی بێ.

یاسا بە واتایەکی تایبەتی هەموو پەسندکراوەکانی پەرلەمانی یاسا داڕێژی لە خۆدەگرێ، ئەمە جگە لەوەی کە سەبارەت بە کاروباری گشتی و بابەتی یان سەبارەت بە کاروباری بچووک و کەسانی دیار و ئاشکرا بێ.

پرەنسیپی سەروەریی یاسا سێ دەرەنجامی لێدەکەوێتەوە:

١ـ یاسا دەبێ بەڕێوە بچێ.

٢ـ دەبێ داڕشتنی کاروباری گشتی بەپێی یاسا بێ.

٣ـ دەبێ کاروباری ئیداری بەپێی یاسا بێ.

سەروەیی یاسا لە پێوەندیی لەگەڵ تاکەکەسەکاندا پێویستی بەو خاڵانە هەیە:

١ـ پیرەوی تاکەکەسەکان لە یاسا.

٢ـ دڵنیا بوون لە بەڕێوەچوونی یاسا.

## *ساتیا گراها* ***Satyagraha***

زاراوەیەکە لە زمانی سەنسکریتی وەرگیراوە و بە واتای "پەنا بردنە بەر حەقیقەت و ڕاستی "یە. ساتیا گراها بەشێک لە بیرۆکەی فەلسەفی و دۆکترینی کۆمەڵایەتی و سیاسییە کە لە لایەن "مەهاتما گاندی "، ڕێبەری بزاڤی دژە کۆلۆنیالی خەڵکی نیمچە دوورگەی هیند هاتۆتە

ئاراوە. ساتیاگراها، ئایدۆلۆژی بزاڤی نیشتمانیی و سەربەخۆیی خوازانەی خەڵکی هیندستان بە پێی تایبەتمەندییەکانی ئەو وڵاتەیە. بەپێی فەلسەفەی ساتیاگراها کاریگەری هێزی دەروونی لە چالاکیە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان دا، لە هۆکارە ماددییەکان زیاترە. گاندی لە فەلسەفەی ساتیاگراهادا، باسی گەیشتنی هیندستان بە سەربەخۆیی لە ڕێگای ئاشتیانە و ڕاکێشانی بەربڵاوی خەڵکی هیندستان دەکا و خەڵکی هیندستان بۆ خەبات و خۆبواردن لە زۆر و توندو تیژی بانگهێشت دەکا و داوا خەڵکی هیندستان دەکا بێ گوێ دانە ڕەگەز، نەتەوە، ئایین، کاست و چینی کۆمەڵایەتی یەکبگرن. گاندی داوای لە خەڵکی هیندستان دەکرد کە واز لە جیاوازییەکانی ناخۆیان بێنن و بە ڕێگای ئاشتیانە ئەم جیاوازییانە لەناو ببەن.

گاندی وێڕای ئاڕاستە کردنی تیۆری " ناتوندو تیژی "، بانگەواز بۆ پرەنسیپی لێک تێگەیشتنی دوولایەنەی نێوان توێژو چینە جیاوازەکانی کۆمەلەگای هیند دەکا. ئەو دەڵێ کە " ناتووندوتیژی" هیچ کاتێک بە واتای یارمەتیدانی توخمەپیسەکان و هاندانی ئەوان بۆ خراپە کردن نیە.

فەلسەفەی ساتیاگراها یان فەلسەفەی ناتوندوتیژی بە مانای "خەبات لە پێناوی ڕاست "یش دا هاتووە. لەم فەلسەفەدا خوا و ڕاستیەکانی جیهانی پلەیەکی بەرزیان هەیە و خاوێن کردنەوەی" نفس" (ناخ) بایەخێکی تایبەتی هەیە. گاندی پەرەپێدەرو لایەنگری خاوێن کردنەوەی ناخ بە هۆی "الهام "ەوەیە. " یاسای خۆشەویستی" لە خاوێن کردنەوەی ناخی گاندی دا ڕۆلێکی بنەرەتی هەیە. گاندی لەم سۆنگەوە دەڵێ کە: مرۆڤ هاوکات لەگەڵ خاوێن کردنەوەی ناخ، خۆبەخشانە پێداویستیەکانی خۆشی سنووردار دەکا بۆیە واز لە پێداویستیە ناسەرەکیەکان دێنێ وروو دەکاتە قەناعەت.

گاندی لە فەلسەفەی سایتا گراها بە هۆی" هێزی ڕاستی " و "خەبات لە پێناوی حەقیقەت" دا هەوڵ دەدا سیاسەت، ملکەچی ئەخلاق بکا. گاندی، لایەنگری لە "بەرەنگار بوونەوەی نێگەتیف" دەکرد و پێشنیاری بە کەسایەتیە هیندیەکان دەکرد کە ئەو نازناوانەی کە لە لایەن بەریتانیاوە پێیان دراوە، فڕێ دەن . گاندی "بەەنگاربوونەوەی نێگەتیف "ی بە هەنگاوێکی پۆزەتیڤ دادەنا. ئەو لە فەلسەفەی سایتا گراها دا لەلایەک پێشنیاری هاوکاری و یەکگرتوویی

ئاشتییانەولەلایەکی دیکەشەوە پێشنیاری بەرەنگاربوونەوەی نیگەتیف لە بەرامبەر کولۆنیالیستە بێگانەکاندا دەکا.

**سارک**

***SAARC (South Asia Association For Regional Cooperation)***

"یەکیەتیی باشووری ئاسیا بۆ هاوکاری ناوچەیی" کە بە کورتکراوی "سارک "ی پێ دەڵێن، ڕێکخراوێکە لە حەوت وڵاتی بەنگلادیش، یۆنان، پاکستان، سریلانکا، مالدیڤ، نیپاڵ و هیند پێکهاتووە.

پێکهاتنی ئەم یەکیەتیە لە دوای کۆبوونەوەی سەرۆکانی ئەم وڵاتانە لە ڕۆژەکانی ٧و٨ ی کانوونی یەکەمی١٩٨٥ ڕاگەیەنرا . ئامانج لە پێکهێنانی ئەم یەکیەتیە بردنەسەری ئاستی هاوکاری دوولایەنەی نێوان ئەو وڵاتانەیە و لەگەڵ ڕێکخراوە نێودەوڵەتیەکانیش لەم بوارەدا هاوکاری دەکا. سکرتاریای هەمیشەیی سارک لە کاتماندۆ پایتەختی نیپالە و، لە ڕێکەوتی ١٩ی کانوونی دووهەمی ١٩٨٧ دەستبەکار بووە.

***SALT (Strategic Arm's Limitiion Talk )*** **ساڵت**

زاراوەیەکە بۆ "دانووسان بۆ کەمکردنەوەی چەک و چۆڵە ستراتیژییەکان" لە نێوان ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و یەکیەتیی سۆڤیەت. ئەم وتووێژانە لە ٢٦ ی مانگی ئایاری ساڵی ١٩٧٢ بوونە هۆی مۆرکردنی ڕێککەوتننامەیەک سەبارەت بە سنووردارکردنی چەک و چۆڵە دژە ـ موشەکیەکان و ڕێککەوتننامەیەکی دیکە سەبارەت بە سنووردارکردنی چەک و چۆڵە ستراتیژییەکان لە نێوان نیکسۆن و بێرژنیف دا. ئەو ڕێککەوتننامەیە بە "ساڵتی ١" بە ناوبەنگە. وتووێژەکانی "ساڵتی٢" لە ساڵی ١٩٧٢ دا دەستیان پێکرد و هەر لەم پێوەندییەش دا ڕێککەوتننامەیەک مۆرکرا (١٩٧٩)، بەڵام لە دوای هێرشی سوپای سۆڤیەت بۆ سەر ئەفغانستان، ئەم ڕێککەوتننامەیە لە لایەن سەنای ئەمریکاوە پەسند نەکرا (١٩٨٠). لە ساڵی ١٩٨٢ ئەم دوو وڵاتە زنجیرە وتووێژێکی نوێیان بە ناوی "ستارت" "START"، واتە وتووێژەکانی کەمکردنەوەی چەک و چۆڵە ـ ستراتیژییەکان دەست پێکرد. (Stratigic Arms Reducation Talks)

### سامیزدات Salizdat (Self _ Publication)

زاراوەیەکی رووسیە بە واتای "خۆچاپ" . کە ئەمرۆ کە بە "ئەدەبیاتی فۆتۆکۆپی" ناسراوە. ئەم زاراوەیە لە ساڵی ١٩٦٦ەوە بۆ بڵاوکردنەوەی وتار و کتێبە سیاسیە تایپیەکان کەڵکی لێ وەردەگیردرا کە بە کاربۆن بڵاو دەبوونەوە کە بڵاوکەرە رەسمیەکان ئەم بابەتانەیان بڵاو نەدەکردەوە. "زنجیرەی یەکەم" ی سۆلژنیستین، لێکدانەوە سیاسیەکانی وەکوو شیکردنەوەی ئازادی، پێشکەوتن و پێکەوە ژیانی ئاندرێ ساخارۆف لەم بابەتانەن کە بەم شێوە بڵاوبوونەوە. زاراوەیەکی دیکە کە هەر لەم پێوەندیە دا کەڵکی لێ وەردەگیردرا تامیزداتە ( Tamizdut = Published + here)ە کە بە مانای "چاپی ئەوێ" یە و ئاماژە بەو بەرهەمە رووسیانە دەکا کە لە رۆژئاوا بڵاو دەبوونەوە و کەم و زۆر بە شێوەی نهێنی دەگەیشتنە ناو رووسیا وەکوو: ژیواگۆی بۆریس پاسترناک.

زاراوەی سێهەم ماگنیتزادتە (Magnitz dat) ئاماژە بە گۆرانی و شێعری نەیارانی سۆڤیەت دەکا کە لە رادیۆ بێگانەکانەوە لە سەر شریت تۆمار دەکران و بە شێوەی نارەسمی لە سۆڤیەت دا بڵاو دەبوونەوە.

### سانترالیزمی دێموکراتیک Democratic Centralism

*سانترالیزم* بە واتای ناوەندێتی دێموکراتیکە. ئەم بنەمایەیەکێک لە بنەما گرنگەکانی رێکخستنی حیزبە کرێکاریەکانە. ئەم بنەمایانە، پێوەندی نێوان سەرکردایەتی و ئەندامانی حیزب، لەپلەکانی خواراوە و سەرەوەی حیزب و لە نێوان ئەندامانی حیزب دا روون دەکاتەوە. لە بواری پراکتیکیدا بریتیە لەوەی کە هەموو ئۆرگانە حیزبیەکان لە رێگای هەڵبژاردنەوە دیاری دەکرێن. هەر ئۆرگانێکی خوارەوەتریش دەبێ راپۆرت بە ئۆرگانی سەرەوەتر لە خۆی بدا. دیسپلینی رێکخراوەیی لە لایەن هەموو ئەندامانی حیزبەوە رەچاو دەکرێ، کەمایەتی پێرەوی لە زۆرینە دەکا، هەموو حیزب بریارەکانی کۆمیتەی ناوەندی جێبەجێ دەکا. رێبەرایەتی گشتی و بەرپرسیارەتی تاک لە گەڵ یەکتر تێکەڵاو دەکرێن و رەخنە لە خۆگرتن ئازادە. لە روانگەی مارکسیەکانەوە سانترالیزم و دێموکراسی دوو لایەنی دیاردەیەکن. لە دوای دامەزراندنی سوسیالیزم لە هێندێک وڵات دا، سانترالیزمی

دێموکراتیک بوو بە هۆی گەشەکردنی دەسەڵاتی دەوڵەتی نوێ و شوێنکەوتووەکانی ماو لە چین پێیانوایە کە دیکتاتۆری پرۆلتاریا بە هۆی بنەمای سانترالیزمی دێمۆکراتەوە بەهێزتر دەبێ. سانترالیزمی دێموکراتیک بە واتای ئەوەیە کە دەبێ بیروبۆچوونە بەکەڵکەکان چڕبکرێنەوە و ڕێبەرایەتی و سیاسەتی پراکتیکی حیزب یەکگرتوو بن. سانترالیزمی دێموکراتیک لە ڕوانگەی مارکسیەکانەوە بەم شێوازەیە:

(١) حیزب بەرنامەکی دیاری هەیە.

(٢) یەک ڕێبەرایەتی هەیە.

(٣) هەموو ئۆرگانەکان سەر بە ناوەندی حیزبن.

(٤) دیسپلینی توونددوتۆڵ (ئاسنین) بە سەر حیزب دا زاڵە.

دێموکراسیش ئەم واتایەی هەیە:

١ـ هەموو ئۆرگانەکانی حیزب هەڵدەبژێردرێن.

٢ـ ئۆرگانەکانی خوارەوە راپۆرت دەدەنە ئۆرگانەکانی سەرەوەتر.

٣ ـ مەسەلە بنەڕەتی و حیزبیەکان لە ناو حیزب دا دەخرێنە بەر باس و ڕاوێژەوە.

## سانسۆر *Sansor Ship*

سانسۆر لە وشەی لاتینی Censere بە واتای "هەڵسەنگاندن و بایەخ پێدان" وەرگیراوە. لە سیاسەت دا سانسۆر ئامرازی سەپاندنی دەسەڵاتی سیاسی و یان شتی لەم بابەتە بۆ پێشگیری کردن لە دەربڕینی هەر بیروڕایەکە کە بۆ دەسەڵات یا سیستەمی سیاسی مەترسی هەیە. سانسۆر لە دوای داهێنانی دەزگای چاپ بە شێوەیەکی کاریگەر کەڵکی لێ وەرگیردراوە.

لە سەدەی شانزدەهەم دا کلیسای کاتۆلیکی یەکەمین پێرستی کتێبە قەدەغە کراوەکانی بڵاو کردەوە و پرۆستانەکانیش لە سەردەمی "چاکسازی ئایینی"دا کەڵکیان لە سانسۆر وەرگرت. سانسۆر ڕەنگە دیاربێ و بە پێی ڕێککەوتنیش جێبەجێ بکرێ. بۆ وێنە ڕەنگە سەبارەت بە "ئاسایشی نەتەوەیی"، بڵاوکەرەوەکان پێکەوە ڕێکک بکەون کەبابەتێک بڵاونەکەنەوە.

لە کۆمەڵگا دێموکراتیکەکانیش دا سانسۆر بە شێوەی دیاریکراو و ڕەسمی هەیە و لەم کۆمەڵگایانەدا لە کاتە نائاساییەکان دا، بە تایبەت لە کاتی شەڕدا، سانسۆرێکی توونددەسەپێ.

### سان کولوت /لاق رووتەکان Les Sans –Culottes

کولۆت زاراوەیەکی فەرەنسەیە. بریتیە لە بەرگێکی پیاوانە کە لە پێشتین تاخوارووی رانی مرۆڤ دادەپۆشێ. لای خوارەوەی دوو لەت کراوە و هەر لەتێکیشیان رانێک دادەپۆشێ. کولۆت بەرگی دەولەمەند و ئاریستۆکراتەکان بووە. سان کولۆت لە شورشی فەرەنسەدا بە بە بێبەش ترین لایەنگرانی شۆرش لە شارەکان و بە تایبەتی لە پاریس دا دەگوترا تا لە خواپێداوەکان جیا بکرێنەوە.

### سوپای ئەفریقیا

سوپای ئەفریقیا بە یەکەکانی سوپای ئەلمانیا لە باکووری ئەفریقیادا (١٩٤٣-١٩٤١) دەگوترا. لە سالی ١٩٤٠ دا کە سوپای ئیتالیا لە میسردا هێرشی کردبووە سەر هێزەکانی بەریتانیاو کەوتبووە ژێر مەترسی بەریتانیاوە و لە پاش ئەوەی کە ١٣٠٠٠٠ کەس لە سوپای ئیتالیا لە لایەن بەریتانیاوە بە دیل گیران. ئیتالیا پاشەکشەی کرد بۆ بنغازی. وێدەچوو کە ئیتالیەکان لە باکووری ئەفریقیا وەدەر دەنرێن. هیتلەر کە دەیزانی هێزەکانی دەولەتە یەکگرتووەکان بە زوویی کۆنترۆلی رۆژهەلاتی ناوەراست لە دەست دەدەن، بە دەرکردنی بڕیاری ژمارە ٢٢ فەرمانی پێکهێنانی هێزێکی تایبەتی دا و لەشکری پێنجەمی ئەلمانیا کە لە پاشان دا بوو بە لەشکری ٢١ ی زرێپۆش، بوو بە بەشی سەرەکی سوپای ئەفریقیا. فەرماندەیی ئەم لەشکرە لە ئەستوی ژەنەراڵ ئێروین رۆمێل دابوو کە دوایە بە "ریۆی بیابان" ناوبانگی دەرکرد.

رۆمێل لەگەڵ لەشکرەکەی دا چوو بۆ ناو ترپیۆلی و دوای ئەوەی بۆی دەرکەوت سوپای بەریتانیای بۆ شەر کردن ئامادە نین، گەلاڵەی هێرشەکەی خۆی جێبەجی کرد و لەگەڵ سوپای ئامادەکراوەکەی ئیتالیادا لە لیبیاوە بەرەو میسر وەرێ کەوتن و لە "تبروک"یش پەرینەوە. لە سەرەتای سالی ١٩٤٢دا، سوپای هەشتەمی بەریتانیا بە دژەهێرشێک چووە ناو لیبیاوە. رۆمێلیش خەرێکی بەهێزکردنی سوپای خۆی بوو و جارێکی تر هێزەکانی بەرەوپێشەوە وەرێ کەوتن و ئەمجارە گەیشتنە ٦٠ مایلی دیلتای نیل.

سوپای ئەفریقیا وا بەهێز ببوو کە دەیتوانی لە ماوەی چەند رۆژدا بەسانایی کانالی سۆئێز داگیر بکا. وبەسەر رۆژهەلاتی ناوەراست دا زالْ بێ. لە هەمان کات دا مەترسی ئەوەش هەبوو کە سوپای تورکیاش یارمەتی سوپای ئەلمانیا بکا و ستالینگردایش بە سانایی بکەوێتە ژێر دەستی

ئەڵمانەکانەوە. سوپای ئەفریقیا لە سێ لەشکر پێکهاتبوو و سێ لەشکری سوپای ئیتالیاش یارمەتیان دەکردن. چوونکە سوپای ئەڵمانیا مەکینەی گازۆلی و پێداویستیەکانی دیکەی بیابانیان پێ نەبوو، ئەمە بوو بە هۆی ئەوەی کە هاوسەنگیەک لە نێوان دوو لایەنی شەڕەکەدا پێک بێ. بەڵام لێهاتوویی رۆمێل لە جێبەجێکردنی تاکتیکەکانی شەڕدا، شایەنی شەڕەکەی بەلای ئەڵمانیادا قورستر کرد. بەڵام چوونکە هێڵەکانی پێوەندی ئەڵمانەکان زۆر بەرفراوان ببوو، ئەمە بەقازانجی ئەواندا نەشکایەوە.

لەمانگی ئەیلوولی ١٩٤٢ هێرشی هاوینەی رۆمێل راوەستاو رەوتی شەڕەکە بە زیانی ئەو تەواو بوو. لە مانگی تشرینی دووهەم دا، سوپای ٨ی بەریتانیا بە هێز بوو. ژەنەراڵ بێرنارد مونتێگمێری، فەرماندەی ئەم سوپایە بوو وفەرمانی هێرشی بۆ سەر سوپای رۆمێل دەرکرد. پاشەکشەی درێژمەودای "رێۆی بیابان " لەشوێنەکانیان دەستی پێکرد وتاترپێۆلی و تونس بەرەو دواوە گەرانەوە. سوپای روملی لە پاشەکشەدا تووشی هێزە تازە هاتووەکانی ئەمەریکا بوون و دەیان هەزار کەسیان لێ کوژرا. سوپای ئەفەریقیا کە لەگەڵ یەکەکانی ئیتالیادا سەرجەم ١٥٠٠٠٠ کەس دەبوون، لە مانگی ئایاری ١٩٤٣دا خۆیان بەدەستەوەدا. تەنیا رۆمێل و هێندێکی کەم لەهاورێکانی توانیان خۆیان دەرباز بکەن.

## سێکتاریزم / گرووپچێتی — Sectarism

لە زاراوەی سێکت بە مانای وەستەوداره، گرووپ یان دەستەیەکی چکۆلەیە و لە قامووسی کۆمۆنیستیەکاندا بە واتای هەڵبران لە جەماوەرو تاقمێکە کە لەگەڵ دابڕاون سێکتاریزم لە واتا سیاسییەکەیدا بەیەکیک لە جۆرەکانی ئۆپۆرتۆنیسم دادەنرێ.

## سۆسیال ئەمپریالیزم — Social Imperialism

ئەم زاراوە لە ساڵی ١٩١٦ دا لە لایەن لنینەوە بە سەر کائۆتسکی و رێبەرانی دیکەی سوسیال دێموکراسی ئاڵمان دا سەپا. لە روانگەی لنینەوە ، سۆسیال ئەمپریالیزم بە واتای بە قسەسوسیالیست و لە کردەوەدا ئەمپریالیست بوونە.

لە دوای داگیر کردنی چەکسلۆڤاکیا(١٩٦٨) لە لایەن سۆڤیەت و سوپاکانی رێککەوتننامە ڤەرشۆ، حیزبی کۆمۆنیستی چین ئەم نازناوەی بەسەر بێرژنێف و هاوبیرەکانی دا سەپاند. لەروانگەی رێبەرانی چینەوە، پێداچوونە خوازەکانی دەسەڵاتداری سۆڤیەت، رێبەرایەتیی

حیزب و دەوڵەتی ئەم وڵاتەیان داگیر کردووە و بەخێرایی بەرەو سۆسیال ئەمپریالیزم دەڕۆن. ئەمپریالیزم و سۆسیال تەنیا لە فۆرمدا جیاوازن، سۆسیال ئەمیریالیزم سەرمایەداری پاوانخوازی حکوومەتی( بە چڕترین شێوازەکەی ) بەناوی سۆسیالیزمەوەیە و لە بواری سیاسی دا، دیکتاتۆری جۆری فاشیزمی هیتلەری( فاشیزمێک کە لەسەر بنەمای سەرمایەداری گەورەی پاوانخوازی دایە) دەسەپێنێ".

لە روانگەی رێبەرانی چینەوە، سۆڤیەت هێزو و دەسەڵاتی خۆی لە چوارچێوەی کۆمەڵگای سەرمایەداری و لە ژێر ناوی دابەشبوونی نێو دەوڵەتیی کار، رێکخستنی بەرنامەکان، توانەوەو لێکدانی هەمەلایەنە و توانەوە و لێکدانی سترۆکتۆرل، دەسەپێنێ. سۆڤیەت بەشە بنەرتیەکانی وڵاتانی ئەورووپای رۆژهەڵات کە لەژێر باڵی خۆیدان، لە بەردەست دایە و تالاّنیان دەکا". لە روانگەی رێبەرانی ئەم رێبازە " خەبات لە دژی ئەمپریالیزم، بەبێ خەبات لە دژی سۆسیال ئەمیریالیزم مانایەکی راستەقینەی نیە".

### *سۆسیال دارڤینیزم* — ***Social Darwinism***

لە نیوەی دووهەمی سەدەی نۆزدەهەم دا، بیروڕا بایۆلۆجیەکانی شارلزدارڤین کاریگەریان لە سەر بیروبۆچۆنە سیاسیەکان دانا. تیزەکانی دارڤین سەبارەت بە پرۆسەی " هەڵبژاردنی سروشتی"،"شەڕی مانەوە"، و"پێدویستی" بە سەر کۆمەڵگا مرۆییەکانیش دا سەپا. ئەم گریمانانە لە سەر لایەنە جیاوازەکانی رکابەری پێیان دادەگرت و هەوڵیان دەدا تا پاساو بۆ کۆنترۆڵی سیاسی لە لایەن کەمایەتیەکی سیاسی و هەروەها سیستەمی ئابووریی سەرمایەداری بێننەوە و بە رەوای دابنێن. ئاکامەکەی ئەوە بوو کە گەشە سەندن بە مانای پێشکەوتنی کۆمەڵگا لێک درایەوە.

رێبەرانی سۆسیال دارڤینیزم (سپەنسەر و گراهام سامنێر )گرنگی و بایەخی " شەڕی مانەوە" یان تەئیید کرد، بە شێوەیەک کە بێتە هۆی پێشکەوتن. بەڵام لە لایەکی دیکەوە بیریارانێکی وەکوو پارسۆنز، گامپلۆڤیچ و سیاسەتمەدارێکی وەکوو بیسمارک، چەمبرلین و رۆژڤەڵت پاساویان بۆ جیاوازی رەگەزەکان یان بۆ جیاوازی نێرو مێی و پەرەپێدانی ئەمپریالیستی کۆلۆنالیزم و شەڕ دەهێنایەوە پێیانوابوو کە شەڕ و رکابەریی چڕی نێوان نەتەوە، رەگەزو گرووپەکان دەبێتە هۆی مانەوەی فیسۆلۆجی ودەروونی خۆگونجێنتریی کەسەکان. بناغە دارێژ وشیکەرەوەی سەرەکی ئەم رێبازە هەربەرت سپەنسەرە.

## سۆسیال فاشیزم Social Fascism

سۆسیال فاشیزم بە رۆلی یەکیەتیی سۆڤیەت دەگوترێ کە لە لایەن ئەو کۆمۆنیستانەی کە لایەنگریان لە مسکۆنەدە کرد، بە سۆڤیەت بەخشرا بوو. سۆسیال فاشیزم لە دوو زاراوەی فاشیزم (کە واتای خراپی ونیگەتیڤی هەیە) و سۆسیالیزم پێکهاتووە.

بەڵگەی لایەنگرانی ئەم بیروبۆچوونە ئەوە بوو کە یەکیەتیی سۆڤیەت لە سوسیالیزمەوە بۆتە دەسەڵاتیکی سوسیال ئەمپریالیستی، چینی بۆرژوا دەسەڵاتی گرتۆتە دەست و لە ناو وڵاتدا پەرە بە فاشیزم دەدەن.

## سوسیال کاتۆلیسیزم Social Catho Licism

بەرەوتێکی هزری دەگوترێ کە لە کۆتاییەکانی سەدەی ١٩ەوە دەستی پێکردووە. ئەم قوتابخانەیە خەباتی خۆی لە دژی بە پیشەسازی بوون بە شێوازی لیبرالیستی و دژایەتیکردن لەگەڵ قوتابخانەی تاک گەرێتیدا چڕ کردۆتەوە.

لایەنگرانی ئەم قوتابخانە جگە لەوەی رێز بۆ بیرورا ئایینەکەی خۆیان دادەنێن، بروایان بە چاکسازی کۆمەڵایەتیش هەیە. ئەو کاتۆلیکانەی کە خۆیان بە سوسیالیستیش دادەنا، لە سەدەی ١٩دا لە دژی تاک گەرێتی لەرادەبەدەری گۆمەڵگای لیبراڵی و ئابووری لیبراڵی دەستیان بە تێکوشان کرد. هەولێکی شێلگیرانەش بۆ لێکدانی قوتابخانەی سەن سیمۆن لەگەڵ ئایینی کاتولێکی درا. ئەم براڤە خەباتی خۆی بردۆتە ناو کۆمەلە کرێکارییەکان و لەرێگای تێورەوە لە دژی تاک گەرێتی و کوفردا رادەوەستن.

## سۆسیالیزم Socialism

ئەم زاراوە لە رێبازە جیاوازە تارادەیەک سەربەخۆکان، بەڵام لە هەلومەرجێکی لێکچوودا سەری هەڵداوە. سۆسیالیزم لە چارەکی (نیوەی دەیەی ٨٠) سەدەی نۆزدەهەم لە بەریتانیا و فەرەنسادا بۆ دیاریکردنی رەوتێک کە لە ئاکامی شۆرشی پیشەسازی و ئاڵوگۆڕە سیاسی و ئابوورییەکان دا پێکهاتبوو، هاتۆتە ئاراوە.

قوتابخانەی "رابێرت ئوون"، کە پێشەنگی سوسیالیزم لە بەریتانیا دا بوو، پەرەی بەم زاراوەدا. ئوون لە ساڵی ١٨٣٥دا " کۆمەڵەی هەموو چینەکان لە هەموو نەتەوەکان"ی پێکهێنا و

ئەم زاراوە بە هۆی باس و لێکدانەوەکانی ئەم قوتابخانە پەرەی سەند. لە دەیەی چوارەمی سەدەی نۆزدەهەم دا ،لۆئیی ریبۆد لە گۆڤاری " دووجیهان" دا زنجیرە وتارێکی بە ناوی "سۆسیالیستە نوێکان " بلاَو کردەوە. لە دوواییدا ئەم کۆمەڵە ناوە لە ساڵی ١٨٤١دا لە ژێر ناوی " توێژینەوە سەبارەت بە چاکسازەکان" یان "سوسیالیستە نوێکان" بلاَو بۆوە. ئەم نامیلکە ژیاننامەی سەن سیمۆن و شوێنکەوتووەکانی ئەو، فوریە و رابێرت ئوون بوو. یەکێک لە سۆسیالیستە ئابوورنیاسەکانی فەرەنسا بە ناوی بلانکی، بە ئیلهام وەرگرتن لەم قوتابخانە، زاراوەی سوسیالیزمی بە کارهێنا و بەرەبەرە ئەم زاراوەهاتە ناو رەوتی توێژینەوە زانستیەکانەوە. لە ساڵی ١٨٤١دا، "رابێرت ئوون " نامیلکەیەکی بە ناوی " سوسیالیزم چیە " بلاَو کردەوە و بە بلاَو کردنەوەی ئەم نامیلکەیە، زاراوەی سوسیالیزم دەنگی دایەوە. بەرواڵەت بۆیەکەمجار لە فەرەنسا، پیرلارۆ لە شوێنکەوتووانی سەن سیمۆن، ئەم زاراوەی بەروونی بە کارهێناوە.

سۆسیالیستەکان کۆمەڵگای سەرمایەداری بە تایبەتی لە شێوە لیبراڵیەکەی دا رەت دەکەنەوە. ئەوان برِوایان بە پێشکەوتن لە ژیان لە کۆمەڵگادا هەیە . بۆ ئەم مەبەستەش بە تەمان کە بە هەوڵێکی گشتی و عەقلانی، دونیایەکی دادپەروەرانەتر بێننە ئاراوە کە هەموو ولاَتەکان لە هەلومەرجێکی یەکسان دابژین.

سۆسیالیزم وەکوو ئایدۆلۆجیایەک دوولایەنی هەیە:

١ـ **لایەنی فەلسەفی و ئەخلاقی** : سۆسیالیستەکان کۆمەڵگای ئیستا، بە کۆمەڵگایەکی نایەکسان و نالەبار دادەنێن. ئەوان برِوایان بە پێشکەوتنی گشتی جیلی مرۆیی هەیە و بۆ داهاتوو و گەیشتن بە سیستەمێکی کۆمەلاَیەتی، گەلاَ لەیەک دادەرێژن کە جیاوازییە کۆمەلاَیەتیەکان و زۆرو زۆرداریش خاشەبر بێ. سۆسیالیستەکان بانگەشەی ئەوە دەکەن کە بۆ رزگارکردنی مرۆڤایەتیی لەم جیهانەدا تێدەکۆشن و خەبات دەکەن. بەلاَم ئەوان واتایەکی جیاوازیان لەوەی کە مرۆڤ لە ئیستادا هەیە و یا دەبێ لە داهاتوودا بێ، هەیە و خویندنەوەشیان لە پێوەندییەکانی نێوان کۆمەڵگا و تاک وەکوویەک وانیە. تاقمێک تاک دەخەنە پێش کۆمەڵگا و تاقمێکیش کۆمەڵگا دەخەنە پێش تاکەوە.

**٢_ لایەنی ئابووری :**

بە لای سۆسیالیستەکانەوە یەکێک لە هۆکارە سەرەکیەکانی بەش مەینەتیی کۆمەڵگا مرۆییەکان، سیستەمی ئابووری ئازاد و پیوەندییە بەرهەم هێنیەکانی ئەم سیستەمەیە. واتا بەش مەینەتی مرۆڤ لە بەرژەوەندی تاکەکەسی، نایەکسانی قووڵ، دابەش کردنی نادادپەروەرانە و نابەجێی سەرچاوەکان و پرەنسیپی زێدەبایی سەرچاوە دەگرێ. سۆسیالیستەکان لە سەر ئەوە کۆکن کە هیچ کاتێک بەختەوەری گشتی بەهۆی بەرژەوەندی تاکەکەسیەوە نەهاتۆتەدی. سۆسیالیستەکان بە گشتی پێیانوایە کە دەبێ خاوەندارێتی هەموو سامان و شتومەکەکان ( یان لانیکەم خاوەندارێتی ئامرازە گشتیەکانی بەرهەم هێنان) لە کەرتی تایبەتیەوە بۆ کەرەتی گشتی یان دەوڵەتی بگوازرێتەوە. دەستبەسەرداگرتن بەسەر ئابووریشدا تەنیا لە رێگای هەوڵی عەقڵانی و رێکخەرانە جێبەجێ دەبێ، کە لە سەرەوەی گرووپە بەرهەرم هێنەکانەوە بریار دەدا. ئابووری دەبێ بچێتە ژێر فەرمانی هەلومەرجی سیاسی سۆسیالیستی.

**دۆرکهایم سەبارەت بە سۆسیالیزم دەڵێ:**

" سوسیالیزم بەو رێبازە دەگوترێ کە هەموو هەوڵە(کردە) ئابوورییەکان یان هێندێکیان کە ئیستاکە ئاڵۆزو بڵاون، بە ناوەندی دەسەڵاتی سیاسی دەبەستێتە"، ئیدی بایەخیش بەوەنادا کە حکومەتەکە بە چ شێوازێک بێ. هەر لەبەر ئەمەشە کە دەبینین ناسیۆنال سۆسیالیزم پێک دێ کەراشکاوانە فری بە سوسیالیزمی راستەقینەوە نیە. چوار پێوەری شیاو، رێگامان پێ دەدەن کە سۆسیالیزمی رەسەن لەوانی دیکە جیا بکەینەوە:

١_ خاوەندارێتی گشتیی ئامرازە گشتیەکانی بەرهەم هێنان.

٢_ رێکخراوێکی ئابووری بەرزتر کە سیاسی بێ و ئابووری بە شێوەیەکی عەقڵانی و گونجاو بەرێوە بەرێ.

٣_ رێکخراوێکی تایبەتی کۆمەڵایەتی کە ئامانجەکەی پێکهێنانی کۆمەڵگایەکی دادپەروەرانە بێ، کە لەو کۆمەڵگایەدا پێداویستیە گشتیەکان بە هۆی کارگێری دیموکراتیکی ئابووری دابین دەکرێ.

٤_ هەوڵدان لە پێناوی ئەوەی کە دەرفەتی یەکسان بۆ هەموو تاکەکان برەخسێ.

### سۆسیالیزمی شۆڕشگێڕانە — *Revolutionary Socialism*

ئەم سۆسیالیزمە هەموو یان بەشێک لە مارکسیزم پەسەند دەکا، بەڵام شێوەی مێژووییەکانی هەموو ڕژێمە کۆمۆنیستیەکان ڕەت دەکاتەوە و حاشا لە ڕۆڵی ڕێبەرایەتیی جیهانیی سۆڤیەت یان هەر وڵاتێکی دیکەی کۆمونیستی دەکا کە ببێتە سەرۆکی حیزبەکانی دیکە. بەم شێوەیە بە هەموو ئەو مارکسیستسانەی کە نەیاری لنین وستالین بوون، سوسیالیستی شۆڕشگێڕە دەگوترا. لە ترۆتسکی، تیتۆ، ڕۆزالۆکزامبۆرگ و جیلاسەوە بگرە تا ئەو گرووپە جیاوازانەی کە لەم دواییانەدا لە کۆمونیستەکان جیا بوونەوە، بە هەموویان دەگوترێ سوسیالیستە شۆڕشگێڕەکان. جگە لەو کەسانەی کە ئاماژەیان پێکرا، ڕەوتی سۆسیالیستی دیکەش لە ئارادان.

بۆ وێنە ئەستەمە کە پێداچوونەوە خوازێکی وەکوو بێرێنشتاین (١٩٣٢-١٨٥٠) یان سۆسیالیزمی سازاوی ژۆرس یان سۆسیالیزمی ئۆمانسیتی لئیۆن بلۆم(١٩٥٠-١٨٧٢) بخەینە ناو خشتەی سۆسیالیستە شۆڕشگێڕەکانەوە. جگە لەم کەسانە دەتوانین ئاماژە بە دووجۆری دیکەش بکەین: جۆری یەکەم، سۆسیالیزمی دەروونناسی و پەروەردەیی قۆناغی سەرەتایی هانری دۆمان(١٩٥٣_١٨٨٦)، و جۆری دووهەمیش نیئۆسوسیالیزمی مارسێل دیئا Marcel Déat (١٩٥٤_١٨٩٤).

### سۆسیالیزمی یۆتۆپیایی — *Utopian Socialism*

ئەم زاراوەیە لە ڕوانگەی مارکسیەکانەوە هاوار و دژکردەوە لە دژی نایەکسانی و مەینەتیەکانی کۆتایی سەدەی هەژدەهەم و سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمە کە ڕوونکەرەوەی ئەو گریمانە و تیۆرانەیە کە لە لایەن ئەم کەسایەتیە دیارانەوە؛ دارێژراون: سەن سیمۆن، فوریە، بوشە، ئوون، کابە، لۆیئی بلان و...هتد.

سۆسیالیزمی یۆتوپیایی، ناوێکە کە کارڵ مارکس بۆ لێکدانەوەی هەموو ئەو ڕەوتە گشتی و لێلانەی کە لە پێش خۆیدا لەئارادا بوون، بە سەری دا بریون.

### سۆسالیزمی خزۆک — *Creeping Socialism*

سۆسیالیزمی خزۆک، دەستێوەردانی بەربەرە و هێمنانەی دەوڵەت لە کەرتی تایبەتی ئابووری دایە و لەو کۆمەڵگایانە دا کە دەوڵەت بەرەبەرە دامەزراوە ئابوورییەکان دەخاتە کەرتی

گشتیەوە، و کەرتی تایبەتی بەرتەسک دەکاتەوە و ڕادەی هەوڵە ئابوورییەکانی دەوڵەت زیاد دەکا، وەدی دێ.

### سوسیالیزمی پیشەیی — Quild Socialism

لە لقەکانی بزوتنەوەی رادیکالی ئەوروپایە کە لە ساڵی ١٩٠٦ دا دامەزرا. ئەم بزوتنەوەیە لایەنگری لە گەڕانەوە بۆ سیستەمی پیشەیی لە سەدەکانی ناوەڕاست دا دەکا. لە ڕوانگەی ئەم کەسانەوە، بەهاکان بە شێوەی کۆیی و بەکۆمەڵ پێک دێن، بەڵام سەرمایەداری بەهاکان بە داهێنان و توانایی تاکەکان دەبەستێتەوە. کەواتە دەبێ یەکیەتیە کرێکارییەکان بەشێوەی یەکیەتی پیشەیی پێک بێن و پیشەسازی بەگشتی بکرێ و بەڕێوە بچێ. ئەم بیروبۆچوونە رادیکاڵیە، بە پێچەوانەی سۆسیالیزم یان بەڕێوەبەری دەوڵەتیە و پێیوایە دەوڵەت دەبێ بە سەر پیشەسازیدا چاوەدێری بکا، نەک کۆنترۆڵی بکا. بزووتنەوەی ـ سۆسیالیزمی پیشەیی لە ١٩٢٥ دا بە هەڵوەشانەوەی "کۆمەڵگای پیشە نیشتمانیەکان " لە ناوچوو، بەڵام ئەو نەریتە ئێستاش لە حیزبی کرێکاری بەریتانیا دا هەرماوە.

### سۆسیالیزمی زانستی — Scientific Socialism

بە بڕوای کارل مارکس، سۆسیالیزم پێویستی بە شیکردنەوەی زانستیانەی کۆمەڵگا و بارودۆخی ئابووری و تەکنیکی کۆمەڵگا هەیە، کە راستیەکانی کۆمەڵگا روون بنەوە. هەروەها مارکس دەیگووت دەبێ ئەویاسایانە بناسین، کەبەسەر کۆمەڵگادا زاڵن، بۆئەوەی بتوانین بەسەر پارادۆکسەکانی سەرمایەداری دا زاڵ بین. هەم مارکسیزم و هەم سۆسیالیزمیش لەسەر لەسەر سۆسیالیزمی زانستی کۆکن. لەلایەکی هێندێک لە سۆسیالیستەکان کە ژمارەشیان کەم نیە، سۆسیالیزم و تەنانەت مارکسیزمیش بە زانست دانانێن و پێیان وایە کە کۆمەڵناسی ئێستاش نەگەیشتۆتە ئەو پلەیەی کە پێی بلێی زانست. جگە لە مەش، هێندێک لە ڕووداو و راستیەکانی سەردەمی ئێستا، هێندێک لە پێش بینیەکانی مارکسیان بدرۆ خستەوە کە بۆخۆی پێیوابوو زانستین. کەواتە قسەکردن لەسەر سۆسیالیزمی زانستی بە واتایەک، پروپاگەندەیەکی نازانستیە. بەڵام ئەو لێکدانەوە، ئالوگۆڕێک لە ڕێبازی پراکتیکی دژایەتیکردنی سۆسیالیزم، لەگەڵ سەرمایەداری دا پێک ناهێنێ.

## سۆسیالیزمی مارکسی Marxian Socialism

لە قامووسی مارکسیەکان دا، کۆمۆنیزم لە دوو قۆناغ پێکهاتووە: قۆناغی سەرەوە کە قۆناغی بەرزی کۆمەڵگای سۆسیالیستی و قۆناغی خوارەوە کە سۆسیالیزمە. بەبڕوای مارکسیزم، قۆناغی سۆسیالیستی؛ توخمی پێویستی کۆمۆنیزمی تێدا نیە.

سۆسیالیزم لە دوای شۆرشی کرێکاری لە کۆمەڵگای سەرمایەداری و لە دوای شۆرشی دێموکراتی نوێ لە کومەڵگا کۆلۆنیەکاندا دەسەڵات بەدەستەوە دەگرێ. لەم قۆناغە دا، کۆمەڵگا ئێستاش لە بواری ئابووری، ئەخلاقی و سیاسی، خاوەنی نیشانە و پێوەندیەکانی بەر لە شۆرشە. لە سوسیالیزمدا مافە بورژواییەکان بە تەواوەتی نافەوتێن، بەڵکوو بە خاوەندارێتی گشتی ئامرازەکانی بەرهەمهێنان، کۆتایی چەوسانەوەی تاک لە تاک دێ و کەسەکانی کۆمەڵگا پشکێکی بە قەد کاری خۆیان وەبەر دەکەوێ.

ئەو یەکسانیەی کە کۆمۆنیزم بانگەشەی بۆدەکا، لە سۆسیالیزم دا نایەتەدی ، چونکە جیاوازی لە ساماندا بەردەوامە و جیاوازی سەرەکی نێوان پرۆلتاریا و بۆرژوایش لە ناو نەچووە و درێژەی هەیە و نایەکسانیی گەورە و چکۆلە لە کۆمەڵگادا هەرلە جێگای خۆیەتی. لە سیستەمی خاوەندارێتی دا دوو جیاوازی هەیە: جیاوازی خاوەندارێتی سوسیالیستی و پاشماوەکانی خاوەندارێتی تایبەتی و جیاوازی نێوان خاوەندارێتی سوسیالیستی و هاوبەشی. جیاوازی یەکەم لەدوای بەهێزبوونی بناغەی سۆسیالیزم و بە هەڵوەشانەوەی خاوەندارێتی تایبەتیی چارەسەردەکرێ. جیاوازی دووهەم بە گەشەکردنی هێزەبەرهەمهێنەکان و پەرەسەندنی سیستەمی Blance Sheet چارەسەر دەکرێ.

لە ئاستی کۆمەڵگای سوسیالیستی دا، سێ جیاوازی هەیە: جیاوازی لە نێوان کاری هزری ودەستی دا، جیاوازی لە نێوان شار و لادێ، و جیاوازی لە نێوان پیشەسازی و کشتوکاڵی دا(بیروبۆچوونی ماۆتسێ دۆنگ). بە چارەسەر کردنی ئەم سێ جیاوازیە بنەڕەتیە؛ رێگای کرانەوەی سوسیالیزم دەکرێتەوە. لە نێوان ژێرخان و سەرخانیش دا جیاوازیی گەلێک هەیە کەپاشماوەی کولتووری بۆرژوافیئودالین. سەرخانی کۆمەڵایەتیی کە سیستەمێکی سیاسی، ئایدۆلۆجی و یاساییە لە دوای دامەزراندنی سۆسیالیزم تاماوەیەک [لەگەڵ سیستەمی نوێ دا] بەربەرەکانی دەکا و لەبەرامبەر پێکهاتەی سۆسیالیستی سەرخاندا رادەوەستێ. قۆناغی سۆسیالیزم، لەدوای چارەسەری کێشە و جیاوازییە بنەرتیەکانی سۆسیالیزم دێتەدی. تیۆری مارکسیستی سۆسیالیزم لە سەدەی بیستەم دا،

سەرکەوتووترین شێوەی سۆسیالیزم بوو کە بە هۆی تیۆرەکانی لنین و ماو لە ڕەوتی شۆرشی چین دا گەشەی سەند و لە هێندێک شوێنی جیهان و کومەڵگا مرۆییەکان دا پیشوازی لێکرا.

### *سۆسیالیزمی مەسیحی* — Christian Socialim

مەبەست لەم زاراوە لە ئەمەریکا و بەریتانیادا، بزوتنەوەیەکە کە نزیکەی ساڵی ١٨٠٠ لە بەریتانیادا دەستی پێکرد. لایەنگرانی ئەم بزوتنەوە دژی بێبەشیەکانی چینی کرێکار راپەرین و دەیانویست خۆشگوزەرانی ئەم چینە بە پێی ئایینی مەسیح دابین بکرێ. چارلیز کینگلی و فرێدریش مۆریس، دوو کەسایەتیی دیاری سۆسیال مەسیحی بوون. ئەم بزووتنە کارگەری چکولەو گەورەی دادەمەزراندن کە سەرکەوتوو نەبوون. ئەم بیرۆکەیە لە دواییدا لەناو بزووتنە هەروەزییەکان دا توایەوە.

سۆسیالیزمی مەسیحی بەپێچەوانەی سۆسیالیزمی خەیالی (یۆتۆپیایی)، بەرنامەی خۆی لە سەر بنەمای بیروبڕوای ڕوونی ئایینی دامەزراند بوو. لە دوای شەڕی یەکەمی جیهانی، حیزبی سیاسیی جیاواز لە وڵاتانی ئەورووپای ڕۆژئاوادا سەریان هەڵداوە کەبیروبۆچوونی سۆسیالیستیان هەیە و پشت بە شێوازە جۆراوجۆرەکانی ئایینی مەسیحی دەبەستن.

### *سۆسیالیزمی ریفۆرمیست (چاکسازی خواز)* — Reformist Socalism

سۆسیالیزمی ریفۆرمیست، بیروبۆچوونی مارکسیانەی نیە. ئەوانە پێیانوایە کەدەتوانن بە بێ پەنابردنە بەر شێوەکانی مارکسیزم، کۆمەڵگایەکی سۆسیالیسی وەدی بێنن. بە مانە دەڵین چاکسازی خواز، چونکە پێیانوایە کە دەتوانن لەناو ڕژێمی سەرمایەداری دا ریفۆرم پێک بێنن و سۆسیالیزم دامەزرێنن. واتە بەرەبەرە حکومەتێک دامەزرێنن کە سەرمایەداری نەبێ وگەیشتن بەم ئامانجەش پێویستی بە شۆرش و پەنابردنە بەردیکتاتوری پرۆلتاریا نیە.

### *سووخۆز* — Sokhose

سووخۆز کورتکراوەی دوو وشەی ڕووسی بە مانای ئابووری هەرەوەزییە. سووخۆز بە تەواوەتی لە ژێر خاوەندارێتی دەوڵەت دایە. واتە لە زەوی وزارەوە بگرە تا بەرهەم و ئامرازەکان بەرهەمهێنان لە ژێردەسەڵاتی دەوڵەت دان. سووخۆزەکان یان دامەزراوە کشتوکاڵیە ئابوورییە بەهەروەزییەکان هەمان پێڕەو بەرنامەی یاسایی دامەزراوە پیشەسازییەکانیان هەیە. سووخۆزەکان

یان دامودەگاکانی کشتوکالّی، لە کردەوەدا وەکوو کارخانە پیشەسازییەکان وان، بەرێوەبەری سووخۆز لە لایەن دەوڵەت و لەئەندامانی حیزبی کۆمۆنیست دیاری دەکرێ.

## Soriet سۆڤیەت

زارووەیەکی رووسیە، بەواتای ئەنجوومەنە. سۆڤیەت یەکەی سەرەتایی پێکهێنەری کۆمەڵگا، بەپێی رێکخستنی سیاسی یەکیەتیی سۆڤیەت بوو. یەکەمین سۆڤیەتەکان، ئەو کومیتە شۆرشگێڕیانە بوون کە لە ساڵی ۱۹۰۵دا لە لایەن سۆسیالیستەکانی رووسیا لە ناو ئەو کرێکارانەدا پێکهاتن کە خەریکی مانگرتن بوون، لە ساڵی ۱۹۱۷دا کە شۆرشی رووسیا دەستی پێکرد، ئەنجوومەنگەلێک لە کرێکاران، سەربازان و وەرزێرەکان لە هەموو وڵات دا پێکهاتن. لەو ناوەدا ئەنجوومەنەکانی ژێر دەسەلاّتی بۆلشڤیکەکان، دەوڵەتی کرنێسکیان رووخاند.

## C.I.A. (Central Intelligence Agency) سی.ئای.ئەی

رێکخراوی ناوەندی هەولگری ئەمەریکا، ناسراو بە " سیا" لە ساڵی ۱۹٤۷ و لە سەردەمی ترۆمێنی، سەرۆک کۆماری ئەو کاتی ئەمەریکا، دامەزرا. ئەم رێکخراوە سەرەتا لە ماوەی شەڕی دووهەمی جیهانی بە شێوەی ئیدارەی خزمەتگووزارییە ستراتێژییەکان (O.S.S)تێدەکۆشا و پاشان بە پەسند کردنی یاسای ئاسایشی نێوخۆیی لە کۆتاییەکانی ساڵی ۱۹٤۷دا، بەرەسمی ناوی "سیا"ی لەسەر دانرا. ئەم رێکخراوە تەنیا لە بەرامبەر سەرۆک کۆماردا بەرپرسیارە.

**ناوەندیی فەرماندەیی سیا لە چوار بەش پێکهاتووە:**

١ـ زانست و تەکنەلۆجیا

٢ـ لۆجستیکی

٣ـ هەوالّگری

٤ـ بەرنامە و پلانەکان

**سیا سێ یەکەی سەربەخۆی هەیە:**

١ـ یەکەی کۆ کردنەوەی هەواڵی دەرەکی

٢ـ یەکەی کردەوە دژە هەوالّگری و دژە سیخوڕییەکان

### ٣_ یەکەی دەست تێوەردانی نهێنی لە وڵاتانی دیکەدا

دزەکردنی سیا لە ڕۆژنامە گرنگەکانی هەروڵاتێک دا بەهۆی بەستراوە کەلتوورییەکانی ئەمەریکاوەجێبەجێ دەبێ. دزەکردن لەو ڕۆژنامانەوە دەست پێدەکا کە سەبارەت بە دەوڵەت هەڵویستێکی ڕەخنە گرانە یان هەیە.

پێکهێنانی ئالووگۆڕ لە سەر دێڕی ڕۆژنامەکان، تانەلیدان لە حکومەت، بلاوکردنەوەی چیرۆکی دنەدەرانە، بلاو کردنەوەی زانیاری ساختەوچەواشە کراو و هەلایسانی شەڕی دەروونی لە تاکتیکەکانی ڕێکخراوی سیان.

لە سەردەمی سەرۆکایەتی دالس دا(١٩٦٢-١٩٥٣) سیا ڕێکخستنەکانی خۆی بەرفراوان کرد. گرنگترین هەوڵەکانی ئەم ڕێکخراوە لە کاتی پێهاتنیەوە بریتی بوون لە:

١_ دامەزراندنی کۆمپانیای ڤێستیرن ئەنتیر پرایز (١٩٥١) لە فەرمیز، بۆ یارمەتیدانی ناسیۆنالیستەکانی چین لە خەبات لەدژی چینی کۆمۆنیست . ئەم کۆمپانیایە لە ژێر ناوی بازەرگانی دا خەرێکی چالاکی سیخوری بوو.

٢_ دزەکردنی بەڕێوەبەرانی سیا لەناو ڕێکخراوە سیخورییەکانی وەکوو KGB، رووسیا و ئینتلەجێنتی بەریتانیا.

٣_ سیخوری بەفرۆکەی یو_ ٢ لە سەر ئاسمانی سۆڤیەتەوە .

٤_ رووخاندنی حکوومەتی موسەددیق لە کودتای ٢٨ی ئابی ١٩٥٣.

٥_ کودتای سەربازیی گواتیمالا(١٩٥٤).

٦_ هەوڵی رووخاندنی دەوڵەتانی وەکوو لائۆس بەرێبەرایەتیی پرێنس سوانا فوما(١٩٥٤)

٧_ رووخاندنی حکومەتی ئاربێتز بە هاوکاری یوناتیێدفرۆت

٨_ هێرشی سەربازی هێزی دەریایی ئەمەریکا بۆ سەر لوبنان (١٩٥٨)

٩_ ڕووداوی کەنداوی بەرازەکان (١٩٦٢)

١٠_ کودتای سەربازی عێراق (١٩٦٣) بەمەبەستی ڕووخاندنی حکومەتی ژەنەراڵ کەریم قاسم.

١١_ دنەدانی ئەفسەرە هەڵگەراوەکانی فەرەنسە لە ئەلجەزایر لە دژی دۆگۆل.

لە ساڵی ١٩٦٢، دالس لە لایەن کێنێدیەوە بە ڕواڵەت لە بەر شکستی ئەم وڵاتە لە کەنداوی بەرازەکان دا، لە سەر کار لابرا.

**کردەوەکانی دیکەی سیا بریتین لە:**

کودتای ساڵی ١٩٦٥ ی ئەندەنۆسیا بە مەبەستی ڕووخانی حکومەتی سوکارنۆ و کوشتاری نزیکەی بە یەک میلیۆن کەس لە هاوڵاتیانی ئەم وڵاتە، پیلان بۆ کوشتنی کاسترۆ، ڕێبەری کوبا و جێبەجێکردنی بەرنامەی فۆنیکس کە بوو بەهۆی کوژرانی زیاتر لە ٢٠ هەزار ڤیت کۆنگ.

ڕێکخراوی سیا هەروەها لە ماوەی ١٥ ساڵ لە ١٩٦١ تا ١٩٧٦ زیاتر لە ٩٠٠ کردەوەی نهێنی لە دژی سیاسەتمەداران و "ڕژێمە نەشیاوەکان" (ئەو ڕژێمانەی بەبڕوای ئەمەریکا، ڕژێمی نەشیاون) وەڕێخستووە. ئامادەکاری بۆ کودتا جیاوازەکان لە ئەرژەنتین، بۆلیڤیا، شیلی، کودتای عەقیدەکان لە یۆنان، ڕۆژهەڵاتی دوور و ئەفریقیا، پشتیوانی لە دەوڵەت و ڕژێمە بەستراوەکان، دەستنیشانکردنی مۆرە بەکرێگیراوەکان لەسەرەوەی دەسەڵاتدا، دەستێوەردانی سەربازی، وەڕێخستنی ڕاپەرین، هەڵایسانی شەڕی نێوخۆیی و کردەوەی تێکدەرانە و دزەکردن لە ڕێکخراوە سیاسی و سەربازییەکانی جیهان لە کردەوەکانی ڕێکخراوی سیان.

ئەم کردەوانە بە هاوکاری پێنتاگۆن، کارتێلە فرەرەگەزەکان و تابووری پێنجەم لە وڵاتانی دیکەی جیهان دا وەڕێدەخرێن. لە سەردەمی حکوومەتی جانسۆن و نیکسۆن دا، ڕێکخراوی سیا لە دوای هەڵوەستەیەکی کورت، دەستی دایە کردەوەی ڕاشکاوانە کە ڕووخانی حکوومەتی ئالێندە، سەرۆک کۆماری شیلی، دانانی ژەنەراڵ ئاگۆستینۆ پینۆشە بە سەرۆکی خونتای سەربازی ئەو وڵاتە بە هاوکاری کۆمپانیا فرەرەگەزەکانی وەکوو ئای. تی. تی لە نموونەی ئەو کردەوە ڕاشکاوانەن.

دزەکردن لەناو ڕێکخراوە بیانیەکانی وەکوو یەکیەتی یەکگرتووی پۆلۆنیا بە ڕێبەرایەتی لێخ ڤالسا، و هەروەها یارمەتی بەردەوامی نەیارەکانی ڕژێمی نیکاراگوا بە مەبەستی ڕووخاندنی ڕژێمی ئەو وڵاتە، بەڕێبەرایەتی دانیەل ئۆرتگا لە کردەوەکانی تری ڕێکخراوی سیان.

لە دوای ڕووداوی تیرۆریستی ١١ ی ئەیلوولی ٢٠٠١، شێوەی کاری ئەم ڕێکخراوە لەلایەن زۆربەی شارەزاکانەوە ڕەخنەی لێ گیراوە. ئێستاکە کردەوەکانی سیا زیاتر لە سەر بەربەرەکانی لە گەڵ تیرۆریزم لە جیهان دا چڕبۆتەوە.

## Politics

## سیاسەت

سیاسەت هاوواتای (Politique) فەڕەنسیە کە لە وشەی لاتینیPoliticus و وشەی یونانیPolitikos لە سەرچاوەی وشەی یونانی (Polis) (شار) وەرگیراوە. لەو سەردەمەدا Politikos بەمانی "هونەرو کردەوەی حکوومەت " لە ولاّت دا کەلکی لێ وەردەگیردرا. (مەبەست دەوڵەت شارەکانی یۆنانە).

مافە سیاسیەکان بە مافی بە شداری هاولاّتیانی دەوڵەت —شارەکانی یوونان لە کاروباری حکوومەت دا راڤە دەکران ( هەر شارێک وەکوو ولاّتێک وابوو و سەربەخۆیی خۆی هەبوو) سیاسەت لە واتا تایبەتیەکەی دا، بەو هەولاّنە دەگوترێ کە حکوومەتەکان بۆ بەرەێوبردنی کاروباری ولاّت و دیاریکردنی شێوە و ناوەرۆکی تێکۆشانی خۆیان دەیگرنەبەر و ئەم هەولاّنە لە دوو کەناڵی نێو خۆیی و دەرەکی دا جێبەجێ دەکرێ:

*الف*_ **کەناڵی نێو خۆیی** : حکوومەتەکان بە هۆی گرتنە بەری هەوڵی رێک وپێک و گونجاو لەگەڵ هەلومەرجی ماددی و مەعنەوی ، کاروباری ولاّت بەرێوەدەبەن تا ئەندامانی کۆمەڵگا ئەرکە کۆمەلاّیەتیەکانی خۆیان بەرێوەببەن (بەمانا گشتیەکەی).

ب_ **کەناڵی دەرەوە:** پێوەندی حکومەتەکان لەگەڵ یەکتر دایە کە پێوەندی نێو دەوڵەتیشی پێ دەڵێن و لە سەربنەمای یاسا نێو دەوڵەتیەکانە.

کاروباری سیاسی زیاتر لەگەڵ هەلومەرجی ئابووری، کولتووری و بیروڕای هاوبەش خەڵکی ولاّت دا دەگونجێن. زاراوەی سیاسەت لە کاروبار و دیاردە سیاسییەکانی وەکوو: دامەزراوە سیاسییەکان، رێکخراوە سیاسییەکان، رەوتە سیاسییەکان، بیروڕا سیاسییەکان، یاسا ورێساکان، رێورەسمە سیاسییەکان و پێوەندییە سیاسییەکان دا کەڵکی لێ وەردەگیردرێ. وجگە لەمە بە مانای رێچکە دێ: رێچکەی ئابووری، رێچکەی کولتووری، رێچکەی کشتووکاڵی، رێچکەی ماددی، رێچکەی پلان دانان، رێچکەی دانیشتوان، رێچکەی کۆمەلاّیەتی و ئابووری سیاسی...هتد.

لە کۆمەڵگایەکی کراوەو زیندوودا کەئەندامەکانی تێگەیشتوو و خوێندەوارن، پلەی بەشداری خەڵک لە کاروباری سیاسی دا لە سەرەوەیە و بە شداریکردنیش ئیرادی و لە ڕووی

تێگەیشتنەوەیە. ئەرەستو دەیگووت: مرۆڤ گیانلەبەرێکی "سیاسییە" Political Animal .
ڕێمۆن ئارۆنی فەرەنسی؛ سیاسەتی لە بەرامبەر دوو زاراوەی پلان، بۆ چوون و کردەوەی سیاسی و شوێنی بەیەک گەیشتنی پلانەکان، بۆ چوونەکان و هەوڵەسیاسییەکان لەگەڵ گۆڕەپانی سیاسەت دا دادەنا و پێیوابوو کەئەم دوو زاراوە تەواوکەری یەکترن، بە جۆرێک کە ئەگەر گۆڕەپانی سیاسەت گونجاو نەبێ، بۆچوون و بەرنامەی سیاسیش لە کردەوەدا هیچ ئاکامێکی نابێ و ئەگەر بۆ چوون و پلانی سیاسیش هەڵنەسەنگێنرێ و لەگەڵ هەلو مەرجدا خۆی نەگونجێنێ، هیچ ڕۆڵێکی نامێنێ وپشتیوانی لێ ناکرێ.

### *سیاسەتی بەرەو ڕۆژهەڵات* ***Ostpolitik***

سیاسەتی بەرەوڕۆژهەڵات لەلایەن کۆرت گیسێنگێر سەبارەت بە پێوەندیی لە گەڵ ئەڵمانیای ڕۆژئاوا لەگەڵ وڵاتانی ئەورووپای ڕۆژهەڵات دا ڕەچاودەکرا. ئەم سیاسەتە بە پێچەوانەی سیاسەتی هالشتاین بوو کەلە سەردەمی کۆنراد ئادنائێر دا پێڕەوی لێدەکرا. ئامانجی " سیاسەتی بەرەو ڕۆژهەڵات " ئاساییکردنی پێوەندیی ئەڵمانیا لەگەڵ وڵاتانی کۆمونیست جگە لە یەکیەتیی سۆڤیەت بوو. ئەم سیاسەتە کە لە لایەن ڤیلی برانت، ڕاوێژکاری ئەڵمانیای فیدراڵ درێژەی پێ درا، بوو بە هۆی گرێدانی ڕێککەوتننامەگەلی ئاشتی لە نێوان ئەڵمانیا و یەکیەتیی سۆڤیەت و پۆڵۆنیا لە ساڵی ١٩٧٢دا. بە پێی ڕێککەوتننامەی ئاشتی، هێڵی ئۆدرنیسە لە لایەن ئەڵمانیاوە وەکوو سنووری ڕۆژئاوای پۆڵۆنیا پەسند کرا. ئەمە بوو بە هۆی گرێدانی ڕێککەوتننامەیەکی نوێ سەبارەت بە ترافیک، خاڵی پشکنین وپێوەندی نێوان بەرلینی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا.

### *سیاسەتی نوێی ئابووری (نێپ)* ***New Economic Plan(N.E.P)***

سیاسەتێکە کە هەتا مانگی ئازاری ساڵی ١٩٢١ لە لایەن لنینەوە جێبە جێ دەکرا، بەڵام ستالین هەر لەو ساڵەدا سەرەڕای دژایەتیی " دەستە ڕاست" یەکان بەرێبەرایەتیی بۆ خارین، درێژەپێدان بەم سیاسەتەی ڕاگرت. بە پێی ئەم سیاسەتە، بە مەبەستی ئامادەکردنی هەلومەرج بۆ دامەزراندی ئابوورییەکی تەواو سۆسیالیستی، ڕێگا بە هێندێک لایەنی ئابووری سەرمایەداری لە ناو سۆڤیەت دا، درا.

## سیاسەتی گۆپاڵی گەورە Big Stick Policy

ئاماژەبەگرتنەبەری سیاسەتی زۆروهیز لە بوارە نێوخۆیی و بیانەکاندایە. یەکەمجار رۆزفەلت کەلکی لەم زاراوە وەرگرت. رۆرفەلت وتبووی: " ئەگەر گۆپاڵێکی گەورەت بەدەستەوە بوو، بە هێواشی قسەبکا".

## سیاسەتی دەرەوە Foréign Policy

بریتیە لە ستراتیژیی یان زنجیرە کردەوەیەکی لە پێش داڕێژراو لە لایەن بڕیار بە دەستەکانی حکومەت بەمەبەستی دەستڕاگەیشتن بە ئامانجێکی دیاریکراو لە چوارچێوەی بەرژەوەندی نیشتیمانی و لە گۆرەپانی نێو دەوڵەتی دا. سیاسەتی دەرەوە دیاریکردن، بەڕێوە بردن و دابینکردنی کۆمەڵێک ئامانج و بەرژەوەندی نیشتمانیە کە لە گۆرەپانی نێو دەوڵەتی دا لە لایەن دەوڵەتەکانەوە جێبەجێ دەکرێ. سیاسەتی دەرەوە هەروەها دەتوانێ بەمانای دەستپێشخەری دەوڵەت یان دژکردەوەی ئەو دەوڵەتە لە بەرامبەر کردەوەی دەوڵەتانی دیکەدا بێ.

بە پێی بۆ چوونی ریمۆن ئارۆن؛ سیاسەتی دەرەوەی دەوڵەتەکان لە خۆیدا دەرئەنجامی هەڵچون و داچوونی نێو خۆی کۆمەڵگایە. بەلاّم تۆرێک لە پێوەندییە تەنراوەکانیش لە ئاستی جیهان دا پێک دێنێ کە دەبنە یەکگرتوویی یان دەبنە هۆی دامەزراندنی ئەو پێوەندییانەی کە پێوەندیەکی ئەوتۆیان بە دەوڵەتەکانەوە نیە.

لە کۆتاییدا دەتوانین بڵێین کە سیاسەتی دەرەوە درێژەی سیاسەتی نێوخۆیی وڵاتە. لەسەر ئەم بنەمایە تایبەتمەندی سیستەمی سیاسی لە بواری پێکهاتەیی و هەڵسوکەوت دا دەتوانێ رۆڵێکی کاریگەری لە شێوەی لێکدانەوەی بەرژەوەندییەکان، ستراتیژییەکان و ئامانجەکان دابگێرێ.

سیاسەتی دەرەوە لە واتا ئەمرۆییەکەی دا: هاوتەریب و جمکی "دەوڵەتی نەتەوەیی" یە. هەڵبەت مێژووی "سیاسەتی دەرەوە" دەگەڕێتەوە بۆ یەکەمین پێوەندییەکانی نێوان کۆمەڵگا سەرەتاییەکان، بەلاّم لە شێوە ئەمرۆییەکەیدا، لەسەردەمی سەرهەڵدانی دەوڵەتە ئەورووپیەکان لە سەدەی ١٧دا هاتۆتە ئاراوە". هەڵبەت سەرچاوەی سیاسەتی دەرەوەش وەکوو تایبەتمەندیەکانی دیکەی دەوڵەت _ نەتەوەکان بۆ دەوڵەتە میرنشینە سەربەخۆکانی ئەورووپا دەگەڕێتەوە.

سیاسەتی دەرەوە بە مانای ئەمرۆییەکەی لە دوای مافی " سەروەری " دەوڵەتەکان هاتە ئاراوە. بەپێی بۆچوونی مۆرگێنتا، لە میرنشینە سەربەخۆکاندا " سیاسەتی دەرەوەی وڵاتان لە راستیدا

نیشتمانی نەبوو، بەڵکوو لەسەر بنەمای بەرەبابی بوو و خەڵک زیاتر لەگەڵ دەسەڵات و سیاسەتەکانی پاشادا هەستیان بە نزیکایەتی دەکرد، هەتا ئەوەی لەگەڵ دەسەڵات و سیاسەتەکانی کۆمەڵەیەکی وەکوو نەتەوەدا، ئەو هەست بە نزیکایەتی بکەن. هەرەکوو چۆن گۆتە لە ژیاننامەی خۆیدا باس دەکا: " هەمووومان بۆ فریدریشی (گەورە) هەستی خۆشحالیمان دەردەبڕی، بەڵام بایەخێکمان بە پرۆس نەدەدا".

لە شۆرشی فەڕەنسا بەملاوە کە ناسیونالیزم بەرەبەرە هەمووتوخمەکانی دەسەڵاتدارەتیی و دەوڵەتە نەتەوەییەکانی پێکەوە بەستەوە، سیاسەتی دەرەوەش بەرەبەرە بە خواست و هەستی نەتەوایەتیەوە بەستراوە. دەتوانین بڵێین :" هاوکات لەگەڵ شەڕەکانی ناپلیۆن دا، سەردەمی شەڕەکان و سیاسەتی دەرەوەی نیشتمانی دەستی پێکرد. یانی هەستی یەکبوونی کۆمەڵە گەورەکانی هاوولاتیانی نەتەوەیەک لەگەڵ دەسەڵاتی نەتەوەیی و سیاسەتە نەتەوەییەکان، جێگەی هەست نزیکایەتی لەگەڵ بەرژەوەندی بەرەبابی دا گرتەوە". مۆرگینتا پێیوایە کاتێک تالیران لە ساڵی ١٨٠٨دا بە ئەلەکساندێر، تزاری رووسیای ووت:" راین، ئالپ و پیرنە بەشی فەڕەنسەن و شوێنەکانی دیکەی ئیمپراتۆریا بایەخێکی ئەوتۆیان بۆ فەڕنسە نیە"، ئاماژە بەم ئالوگۆرە دەکا.

هەتا کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم، بەرەبەرە گرنگی و بایەخی سیاسەتی دەرەوە بۆ رێژەیەکی زۆرتر لە هاوولاتیان روون بۆوە. هەڵبەت لە کاتە ئاساییەکان دا خەڵک زۆر بایەخ بە سیاسەتی دەروەی وڵاتەکانیان نادەن . بایەخدان بە سیاسەتی دەرەوە، شانبەشانی ئالووگۆڕەکان وروتی گەشەسەندنی دەوڵەتی نەتەوەیی و ناسیۆنالیزم بەرەوپێشەوە دەڕوا. توێژینەوەکان دەریدەخەن کە لە درێژەی ئەم رەوتەدا، سیاسەتی دەرەوەی وڵاتان لە سەدەی بیستەمدا زیاتر بەرەو دیموکراسی هەنگاوی هەڵێناوە، بەڵام ئەمە تەنیا لە بەرئەوە نەبووە کە رای گشتی لە ساڵەکانی پێش لە ١٩٤٠ گرنگی زیاتری پەیدا کردووە، بەڵکوو زیاتر لە بەر ئەوە بووە کە دەبێ سیاسەت باشترکردنی ژیانی خەڵک لەگەڵ ئامانجەکانی بەرێوەبەری وڵات لەبەرچاو بگرێ.

لەگەڵ سەرهەڵدانی جیهانی دووجەمسەری و دژایەتیکردنی بەرەی سەرمایەداری لەگەڵ جیهانی کۆمۆنیستی و جیهانی سێهەم دا " سیاسەتی دەرەوە" بەتایبەت لە وڵاتە پێشکەوتووەکان زیاتر بەرەو ئالۆزی دەڕوا و زیاتر لە شێوە نەریتیەکان دوور دەکەوێتەوە، بۆ وێنە لە ساڵی ١٩٧٢دا بەمەبەستی رێکخستنی سیاسەتەکان و رۆلی سیستەمی سەرمایەداری نێو دەوڵەتی بە رێبەرایەتیی و

لەسەر پێشنیاری ئەمەریکا، کۆمیسیۆنێکی سێ لایەنە لە ئەمەریکای باکوور، ژاپۆن و ئەورووپای ڕۆژئاوا پێکهات. ئەم دامەزراوە سیاسی_ئابوورییەی وڵاتانی پیشەسازی زیاتر لە ٤٠٠ ئەندامی هەیە و بە شێوەی ڕێک وپێک بە مەبەستی ڕێکخستنی سیاسەتەکان کۆدەبنەوە. بنکەی ئەم ڕێکخراوە لە نیۆیۆرکە. لەراستی دا ئامانجی ئەم ڕێکخراوە دەستڕاگەیشتن بە ڕێککەوتنێکی گشتی تایبەتی لە سەر مەسەلە گرنگەکان و بڕیاردان لە لایەن دەستەی بەڕێوبەریی وڵاتانی پیشەسازییە.

سەرەرای ئاڵۆزتر بوون و پرۆفیشناڵ بوونی چەمکی سیاسەتی دەرەوەو پاوانکردنی هەرچی زیاتری سیاسەتی دەرەوە لەلایەن بژاردە لێهاتووەکانی سیاسەت و نوقم بوونی هەرچی زیاتری خەڵک لە بەکاربردن(مصرف) و کاروباری ڕۆژانەی ناسیاسیی، هاولاتیان لە کۆتاییەکانی سەدەی بیستەمیشدا، بایەخێکی زۆریان بە سیاسەتی دەرەوە داوە . ئەم دیاردە بۆچەند هۆکاری جیاواز دەگەڕێتەوە، بەڵام لێرەدا تەنیا ئاماژە بەقسەکانی مورگێنتا دەکەین کە لەسەر ئەم بابەتە وتوویەتی:

" لە چارەکی کۆتایی سەدەی بیستەم دا، بێ هیوایی و دڵەراوکێ قووڵەکان بوون بەهۆی ئەوەی کە هاووڵاتیان زیاتر لەگەڵ دەسەلات و سیاسەتی دەرەوەی نەتەوەییدا هەست بە نزیکایەتی بکەن. چڕتربوون و پوختتربوونی ئەم هەستی یەکبوون و نزیکایەتیە یەکێک لە هۆکارەکانی توند و تیژی و بێبەزەیی لە سیاسەتی دەرەوەی هاوچەرخدا بووە. سیاسەتە داگیرکارانە نەتەوەییەکان دەبنە هۆکارێک بۆ پێک هەڵپڕژانی دەوڵەتەکان لەگەڵ یەکترداو تارادەیەکی زۆر هەموو خەڵک بەوپەڕی لەخۆبوردوویی و بەهەستێکی گەرم و گوڕەوە، کە وێنەی ئەم لەخۆبوردووییە لە مێژووددا تەنیا سەبارەت بە بابەتە ئایینەکان بینراوە، پشتیوانی لە سیاسەتەکانی دەروەی دەوڵەتەکانیان دەکەن".

## سیاسەتی دەرگا کراوەکان Open Door Policy

ئەم زاراوەیە بە سیاسەتێک دەگوترێ کە بۆ یەکەمین جار لە لایەن جۆن هێی، وەزیری دەرەوەی ئەوکاتی ئەمەریکا لە ئەیلوولی ساڵی ١٨٩٩ دا بۆ پەرە پێدانی ئابووری چین بەمەبەستی پاراستنی سەربەخۆی و یەکیەتیی سیاسی ئەو وڵاتە پێشنیار کرا.

ئەم زاراوەیە ئەمرۆکە بەو ڕێچکە ئابوورییانە دەگوترێ کە بە پێی ئەم ڕێچکانە لە بواری بازرگانی لەگەڵ وڵاتانی دیکەدا، کۆمەڵە ڕێوشوێنێک ڕەچاو دەکرێن کە مافی پاوان کردن و یان ئیمتیازێکی تایبەتی بەهیچ وڵاتێک نادرێ.

### سیاسەتی هێز — Power Polltics

سیاسەتی هێز، بە بەراوردکردنی رادەی هێزو توانایی و هەروەها بە دزەکردنی بەرپرسانی سیاسەتی دەرەوەی دەوڵەتە، گەورەکان لە شوێنەکانی دیکەی جیهان دەگوترێ. رەخنە گرانی "سیاسەتی هێز " حەزدەکەن بە جێگای ئەم سیاسەتە، ئەخلاق، یاسا و یەکسانی لە پێوەندییە نێودەوڵەتیەکان دا بچەسپێنن. تاقمێکی دیکە پێیانوایە تائەو کاتەی کە جیهان بەسەر دەوڵەتە نەتەوەییە سەربەخۆکان دابەش بووە، هیچ ئەلتەرناتیڤێک ناتوانێ جێگای هێز لە پێوەندییە نێو دەوڵەتیەکان دا بگرێتەوە.

### سیاسەتی ناوچەیی (خۆجەیی) — Community Politics

زاراوەیەکە کە ئاماژە بە چڕبوونەوەی سەرنجی پاڵێوراوەکانی هەڵبژاردن بە مەسەلە خۆجێیەکان دەکا کە لە روانگەی رەخنەگرانی ئەم سیاسەتە، سیاسەتی ناوچەیی بە زیانی سیاسەتە یەکگرتووی نیشتمانیە. ئەم زاراوەیە لە دوای سەرکەوتنی لیبراڵەکان لە هەڵبژاردنی تەکمیلی کانوونی یەکەمی ١٩٧٢ لە بەریتانیادا هاتەئاراوە و نیشاندەری تاکتیکی لیبراڵەکان لە سەرکەوتنی هەڵبژاردنەتەکمیلیەکانی دواتردا بوو.

### سیاسەتی بەشداریکردن — Engagement

یەکێک لە رێچکە سیاسیەکانی ئەمەریکا بوو کە لە سەرەتای ساڵی ١٩٩٤ لەلایەن سەرۆکی فەرماندەی هاوبەشی هێزە چەکدارەکان راگەیەنرا کە درێژەی سیاسەتی بەرفراوان کردن (Enlargemenut) بوو. ئامانجی ئەم سیاسەتە گونجانی گەلاڵە سەربازی و ستراتیژییەکان لەگەڵ چەمکی بەرفراوان کردن دایە. ئەم گەلاڵانە بەپێی ئەکتەرەکان (دەوڵەتەکان ) و هێزوتوانایی ئەوان رێک دەخرێ، ستراتیژیی تێکهەڵچون لەبەرامبەر دۆستان و هاوپەیمانەکانیان لەسەر بنەمای هاوکاری کردن لەگەڵ ئەوان راوەستاوە. لەم حاڵەتەدا هەوڵەکانی ئەمەریکا لە دۆکتۆرینی سیاسی نیکسۆن ئیلهام وەردەگرێ. یانی دۆستان و هاوپەیمانەکانی ئەمەریکا بە هۆی یارمەتیدانی ئەم وڵاتانە، بەرپرسیارەتیەکی زیاتر لە پاراستنی ئاشتی و جێگیری لە ناوچەی خۆیاندا لە ئەستۆ دەگرن. لە پێوەندی لەگەڵ ئەم ئەکتەرانەدا، هەژمۆنی ئایدۆلۆجی و رێبەری؛ دوو تەوەری سیاسەتی دەرەوەی ئەمەریکا پێک دەهێنن.

چەمکی دووهەم سەبارەت بەو وڵاتە بەهێزانەیە کە وەکوو ئەمەریکا خاوەن هێز و دەسەڵاتن و ئەمەریکاش ناتوانێ سیاسەتی بەرفراوان کردن بە سەر ئەم وڵاتانەدا بسەپێنێ. لەم حاڵەتەدا ئەمەریکا تێکەڵاوێک لە دەسەڵات و ڕێیەری جێبەجێ دەکاو ئەگەر هات و ئەم وڵاتانە دژ کردەوەی نیگەتیڤیان سەبارەت بەم سیاسەتەی ئەمەریکا هەبوو، ئەمەریکا لەگەڵیان پێک دێ و لە ستراتیژی "گێڕانەوە" کەڵک وەردەگرێ.

مەسەلەی مافی مرۆڤ و بازرگانیی کردن لەگەڵ کۆماری گەلیی چین، نموونەیەکی ئەم سیاسەتەی ئەمەریکا بوو. ئەمەریکا سەبارەت بە وڵاتانی بێ هێز یان وڵاتانی سەربزێو کە دەسەڵاتێکی ئابووری یان سەربازی ئەوتۆیان نیە، لە ستراتیژی زۆر کەڵک وەردەگرێ. ئەم ستراتیژییە پێش بەو هەڕەشە گرنگانە دەگرێ کە ئاسایشی ناوچەکە دەخەنە مەترسیەوە.

## *سیاسەتی بەسترانەوە* **Linkage Politics**

شێوازێک بۆ شیکردنەوەی پێوەندییە نێو دەوڵەتیەکانە. سێ شێوەی سەرەکی سیاسەتی بەسترانەوە بریتین لە:

١. دزەکردن، وەکوو دزەکردنی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە ئەڵمان و ژاپۆن لە دوای شەڕی دووهەمی جیهانی

٢. دژ کردەوەیی: وەکوو بردنە سەری بوودجەی بەرگری وڵات لە بەرامبەر زۆر کردنی چەک و چۆلی ئەو وڵاتانەی کە بۆنی دۆستایەتیان لێ نەدەهات.

٣. ڕکابەری؛ وەکوو پەرەپێدانی هەوڵەکانی خوشگوزەرانی کۆمەڵایەتی لە وڵاتانی ڕۆژئاوادا.

## *سیاسەتی ڕیئال* **Real Politik**

ئەم زاراوە کە هاوتا ئەڵمانیەکەی ڕیئال پۆلیتیکە، یەکەمجار لە لایەن لۆدڤێک ـ فۆن ڕوخۆ، ڕۆژنامەنووسی بە ناوبانگی ئەڵمانیا هاتە ئاراوە. ئامانجی ڕوخۆ ڕەخنە گرتن لە نەبوونی ڕیئالیسم لە سیاسەتە ئازادیخوازەکانی ئەڵمانیا لە ساڵەکانی ١٨٤٩-١٨٤٨ دایە. ئەم زاراوەیە بە سیاسەتی بیسمارک لە ساڵەکانی یەکیەتیی ئەڵمانیا و پاش ئەو ماوەیەش دەگوترێ. دەبێ سیاسەتی ڕیئالیستی لە سیاسەتی بەرژەوەندیخوازانەو لە سیاسەتی پشت بستنی بێ بەزەییانە بە هێز جیا بکەینەوە. تیۆری

داڕێژانی سیاسەتی نێودەوڵەتیی ئەمەریکاش کە دژی کەڵک وەرگرتن لە توخمە ئایدۆلۆجیاکان لە سیاسەتی دەرەوەی ئەمەریکادان، لەم چەمکە کەڵکیان وەرگرتووە.

### سی. ئێن. ئێن *Cable News Network (C.N.N)*

تۆڕێکی نێو دەوڵەتیی هەواڵی ٢٤ کاتژمێرەی ئەمەریکیە کە لە ساڵی ١٩٨٠ لەلایەن " تێدتێرنێر"، سەرمایەداری بەناوبانگی ئەمەریکی دامەزرا. بنکەی سەرەکی CNN لە ئاتلانتا، ناوەندی ویلایەتی جۆرجیایە. ئەم تۆرەتەلەفیزیۆنیە بە بلاّوکردنەوەی بەرنامەی ڕاستەخۆی تەلەفیزیۆنی لە بەغداوە لە ڕەوتی شەڕی دووهەمی کەنداو(١٩٩١) شەرەکانی بۆسنەوهێرزە گۆڤین لە کۆتاییەکانی سەدەی ٢٠ و ڕووداوی ١١ی ئەیلوولی ٢٠٠١ی نێویۆرک، زۆر بەناوبانگ بووە.

### سیستەم

زاراوەی سیستەم لە وشەی Sustema وەرگیراوە کە بەمانای " کۆمەڵ"ە. ئەم زاراوە لە بەشە جیاوازە فەلسەفی، کۆمەلاّیەتی و سیاسیەکان، ئەم واتایانە لەخۆ دەگرێ:

**الف_** لەروانگەی فەلسەفی؛ وشەی سیستەم بە کۆی ئەو بنەمایانە دەگوترێ کە ڕێبازێکی فەلسەفی یان زانستی یان زانایەک بڕوای پێیانە. بۆ وێنە دەڵێن سیستەمی دیکارت یان سیستەمی دەیفیی.

**ب_** لەهێندێک لە زمانە بیانەکان دا، وشەی سیستەم بەواتای تێکەلاّو کردنی بەشە ڕێکخەرەکان بۆ گەیشتن بە دەرئەنجام یان شێوازێکی جێگرو دیاریکراوە و لە زانستی پزیشکی، ئەستێرەناسی و کێش ناسی دا کەڵکیان لەم چەمکە وەرگرتووە.

**ج_** لە زانستی سیاسەت دا، سیستەم بەمانای شێوەی حکوومەت کردنە. بۆ وێنە دەڵێن: سیستەمی فیئودالیزم، سیستەمی سەرمایەداری یان سیستەمی پەرلەمانی.

* * *

### سەلاحییەت *JurisDisdiction / Competence*

سەلاحیەت ئەم واتایانەی خوارەوە لە خۆ دەگرێ:

١_ چوارچێوەیەک لە دەسەڵاتی حکومەتی تێدا بەرێوە دەچێ.
٢_ رادەی دەسەلآت و توانایيەکانی دادگایەک بۆ چارەسەر کردنی کێشەکان.
٣_ رادەی دەسەلآت و توانایيەکان بە گشتی.
٤_ لێهاتوویی و لێوەشاوەیی Competence ی کەسێکی سیاسی (سەرۆک کۆمار، سەرۆک وزیران و وەزیران).

بە پێی دەستوری هێندێک لە ولآتەکان، هەرکاتێک کە کەسێکی سیاسی، بەتوانا و لێهاتوو نەبێ، پەرلەمان دەنگ بە نالێهاتوویی ئەو کەسە دەدا و لە سەرکاری لادەبا.

### *سندووقی نێودەوڵەتیی دراو*
### *IMF (International Monetary Fund )*

سندووقی نێو دەوڵەتی دراو وەکوو بەشێک لە سیستەمی بێرتون ڤوودز لە ساڵی ١٩٤٤دا دامەزرا و پاشان بوو بە بەشێک لە پێکهاتەی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان. سندووقی دراو لەگەڵ بانکی جیهانیدا یەکێک لە گرنگترین دامەزراوەکانی کارگێری لە پێوەندییە ئابوورییەکانی دوای شەری دووهەمی جیهانیە. هەروەکوو لە ناوەکەی دا (سندوقی نێو دەوڵەتیی دراو) دەردەکەوێ، ئامانج لە پێکهێنانی ئەم سندووقە پێشکەش کردنی نەخینەی نێودەوڵەتیی بە دەڵەتانی ئەندام لە هەلومەرجێک دایە کە ئەوان نەتوانن Blance of Peyments بدەن. جگە لەمە بریاربوو سندووق سیستەمی نرخی ئالووگۆری سەقامگرتوو بەرێوەبەرێ. هەر دراوێک " بە هایەکی یەکسانیی" هەبوو کە بە پێی دۆلار دیاری دەکرا.

ئەگەر ئەگەری (گومان ) ئەوە هەبوو کە Blance of Peymentsی دەرەکی دەوڵەت لە حاڵەتی "لاسەنگی تەواوەتی " دایە، لەم حاڵەتەدا دەبێ سندووقی دراو گۆرینی نرخ پەسند بکا. هەروەکوو ئاماژەمان پێکرد، سندووق جگە لە چاوەدێری کردن بە سەر سیستەمی نرخی ئالووگۆردا، قەرز بەو ئەندامانەی دەدا کە تووشی دانەوەی Blance of Peyments بوون.

هەمیشە ئەگەری ئەوە هەیە کە بەر پرسانی دراوی ئەو ولآتانەی کە قەرزەکان وەردەگرن دەست بدنە هەوڵی هاوسەنگ کردنی، لاسەنگی و لە راستیدا یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی سندووق ئەوەیە کە دیاریکردنی " مەرجەکان " بە شێک لە "کۆی یارمەتیە

گشتیەکان" دەبێ. ئەو حکومەتەی کە بڕی دراوەکە وەردەگرێ بە ناردنی بە لێننامەیەکی نووسراو بۆ سندووق، مافی دیاریکردنی ئەم مەرجانە بۆ سندووق بەرەسمی دەناسێ. کۆی ئەم رەوتە ــ واتا دیاریکردنی مەرجەکان کە لە دوایدا بە نووسراوە پەسند دەکرێن ــ بەراشکاوی بەواتای دابەزینی سەروەری دەوڵەتە. ئەگەرچی ئەم تایبەتمەندییە پەسند کراوە ، بەڵام مشتومڕیشی لەسەرە. نەریتی سندووق ئەوەیە کە داوا لە دەوڵەتەکان دەکا لە بەرامبەر وەرگرتنی قەرزدا، دەست بدەنە چاکسازی پێکهاتەیی بۆ لادانی لاسەنگی. بردنەسەری ڕێژەی وەرگرتنی باج، ڕێژەی قازانج، کەمکردنەوەی نرخی خەرجی بوارە گیشتییەکان، وەکوو سوبسید، لەو سیاسەتە باوانەن کە سندووق گرنگیان پێدەدا.

تەوەری هەوڵە سەرەتاییەکانی بێرتون ڤوودز، دۆلاری ئەمەریکا بوو. نرخی ئاڵوگۆڕی ئاڵتوون / دۆلار لە ساڵی ١٩٤٣ دا بە پێی ٣٠ دۆلار لە بەرامبەر هەر ئۆنس ئاڵتوون دانراو بڕیاریش درا کە ئەم نرخی ئاڵووگۆڕە لە هەر هەلومەرجێکدا جێگرە وگۆڕانی بە سەردا نایا. لە سەرەتاکانی قۆناغی نۆژەنکردنەوەی دوای شەڕی دووهەمی جیهانی، نیگەرانی سەرەکی سەبارەت بە دۆلار، کەمبوونی دۆلار بوو ئەگەرچی لە دەیەی ١٩٥٠دا، Blance of Peyments ی ئەمەریکا بەرەبەرە رووی لەکەمی کرد، بەڵام ئەم مەسەلە بە شێوەیەکی جیددی بایەخی پێ نەدرا. بەسەرنجدان بە کەمبوونی دۆلار، دەوڵەتەکانی دیکە لە سیستەمەدا کەمبوونی Blance of Peymentsی ئەمەریکایان بەدڵ بوو، کە بە ناردنی دۆلار قەرە بوو دەکرایەوە. سیستەمی سندووقی نێو دەوڵەتی دراویش لە راستی دا سیستەمێک بوو کە پشتی بە ئاڵتوون دەبەست و دۆلاریش لە چوارچێوەی ئەم ئامانجانەدا وەکوو ئاڵتوون بەنرخ بوو.

سیستەمی نرخی ئاڵوگۆڕی سەقامگرتووی سندووق کە لە دوای ساڵی ١٩٩٤ەوە وەکوو یەکێک لە بنەماکانی سیستەم پێکهاتبوو، لە کۆتاییەکانی دەیەی ١٩٦٠ەوە تووشی گومانی جیددی هات. لە ساڵی ١٩٦١دا کێشەی گەورەی پەرەستێن، کەمی Blance of Peymentsی ئەمەریکا بوو. ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بە درێژەکێشانی ئەم کەمیە، بڕی پارەی پێویستی سیستەمیان دابین دەکرد، بەڵام لە هەمان کاتدا ئەم مەترسیەشی پێک دێنا کە لە حاڵەتی لە ناو چوونی متمانەدا، نرخی دۆلار بەناچاری دادەبەزی. لە ئاکامیش دا کاتێک کە لە ساڵی ١٩٧١ متمانەکردن بە دولار دابەزی، ئەم رەوشە زۆر بەرچاوتر و گرنگتر بوو. کۆمەڵێک

له ژماره‌كان به گشتی، لاواز بوونی بازرگانیان نیشان ده‌دا و پێده‌چوو كه نیشانه‌ی ئه‌وه بێ كه پێوه‌ندی نێوان ئالتوون و دۆلار بۆ ماوه‌یه‌ك ڕابگیرێ یان كۆتایی پێ بێ. هه‌ر ئه‌وه‌ش بووبه هۆی هێرشكردنه سه‌ر دۆلار له لایه‌ن Speculators. له ئابی ١٩٧١دا سه‌رۆك كۆماری ئه‌مه‌ریكا ڕایگه‌یاند كه توانایی گۆڕینی دۆلار بۆ ئالتوون بۆماوه‌یه‌ك ڕاگیرێ. له كۆتایی سالدا له كۆبوونه‌وه‌ی هاوبه‌شی گرووپی ١٠ و كارگێرانی به‌رێوه‌به‌ری سندووق له سه‌ر ئه‌وه ڕێككه‌وتن كه له ١٠% له به‌های دۆلار له به‌رامبه‌ر دراوی ئه‌ندامانی دیكه‌ی گرووپدا، دابشكێ. ئه‌م بڕیارانه به شێوه‌ی پراكتیكی بوونه هۆی دابه‌زینی سیسته‌می نرخه‌كانی ئالووگۆڕی سه‌قامگرتووی برۆتێن ڤۆدز. به دابه‌زینی دووباره‌ی دۆلار له شوباتی ١٩٧٣ دا، ئه‌م وازیان له‌م سیسته‌مه هێناو سه‌رده‌می نوێی نرخه "هه‌لپه‌سێراوه‌كان"، جێگای ئه‌و سیسته‌مه‌ی گرته‌وه.

بڕیاره به‌پارێزه‌كان سه‌باره‌ت به‌م گۆرانانه، له‌گه‌ڵ یه‌كه‌مین شۆكی نه‌وتی سالی ١٩٧٣_١٩٧٤ كه‌مبوونه‌وه. ده‌وله‌ته‌كان له ناكاودا له ئاستێكی به‌ربلاودا تووشی كه‌می بوودجه یا زیاده بوونی BlanceOf Peyments بوون. ئه‌گه‌ری چاكسازی پێكهاته‌یی كۆتایی پێهات و نرخی ئالووگۆری ناجێگیر درێژه‌ی خایاند. ڕێكه‌وتنی جامایكا له كانوونی دووهه‌می سالی ١٩٧٦ دا به پێدا چوونه‌وه‌ی پێڕوو پرۆگرامی سندووق، مه‌شروعییه‌تی به ناجێگیربوونی‌نرخی ئالوگۆردا. له‌و كاته‌وه‌به‌رپرسانی بانكه ناوه‌ندییه‌كانی ده‌وله‌ته سه‌ره‌كیه‌كانی گرووپی ١٠ به شێوه‌ی كرده‌یی تاراده‌یه‌كی زۆر قه‌رزه‌كانی خۆیان ڕێك خستووه. له ڕێكه‌وتنی جامایكا له‌سه‌ر ئه‌وه‌ش پێداگری كرا كه له داهاتوودا مافی هه‌لگرتنی تایبه‌تی (Special Drawing Right / SDR)

.

قه‌یرانی قه‌رزه‌كانی ده‌یه‌ی ١٩٨٠ له بواره گرنگه‌كانی ستراتیژیی كارگێری سندووقی نێو ده‌وله‌تیی دراوبوو. بڕی یارمه‌تیی سندووقی نێو ده‌وله‌تیی دراو به مه‌كزیك (تشرینی دووهه‌می ١٩٨٢) نزیكه‌ی ٤ ملیارد دۆلار له دارایی سندووقی له به‌رامبه‌ر چاكسازی پێكهاته‌یی وه‌كوو كه‌میی بووجه و سوسیده‌كان له لایه‌ن حكوومه‌تی مه‌كزیكه‌وه درێژ كرده‌وه. مه‌رجێكی دیكه‌ی سندووقی نێو ده‌وله‌تیی دراو بریتی بوو له Credit پێنج ملیارد دۆلاری له بانكه بازرگانیه‌كان له به‌رامبه‌ر دراوی سندووقی نێو ده‌له‌تیی دراو. ڕێكه‌وتنی مه‌كزیك بووه نموونه‌یه‌ك بۆ "كۆمه‌ڵه یارمه‌تیه‌كانی " سندووقی نێو ده‌وله‌تیی دراو. به چوونه سه‌ری قه‌رزه‌كان له چاو به‌رهه‌م هێنانی

نەپالآتووی نێوخۆیی، نرخی گەشە بە توندی دابەزی. بە سترانەوەی سندووق بە پێکهێنانی چاکسازی پێکهاتەیی بووە ئامانجی هێرشە حیزبی و سیاسییەکانی گرووپەنەیارەکانی.

لە ئاکام دا بە هۆی بەرنامەی ناو بریدی ( Drady Plan) دەستپێشخەرییەکی نوێ بۆ رانووسانی دووبارە بەمەبەستی کەمکردنەوەی دانی ....... لە هێندێک بواردا، هەلوەشانەوەی گشتی قەرزەکان راگەیەنرا. بە گشتی سندووقی نێو دەوڵەتیی دراو هەروا لە سەر چاکسازی پێکهاتەیی وەکوو مەرجی بەخشینی قەرزەکان پێداگری دەکا.

### سەهیۆنیزم *Zionism*

رەوتێکی ناسیۆنالیستی دەمارگرژی بورژوازی جوولەکەیە کە لە کۆتاییەکانی سەدەی ١٩ لە ئەورووپادا سەری هەڵدا و ئیستاکە بۆتە ئایدۆلۆژی رەسمیی رژێمی ئیسرائیل ئەمناوە لە سەهیۆن ـ شۆێنێک لە نزیک ئورشەلیم ـ کە بۆ جوولەکەکان پیرۆزە، وەرگیراوە. لە ساڵی ١٨٩٧ دا کۆمەڵێک بە ناوی رێکخراوی جیهانیی سەهیۆنیزم پێکهات کە رایگەیاند ئامانجی ئەو کۆمەڵە راگواستنی هەموو جوولەکەکان بۆ فەلەستینە. توانایی ماددی ئەم رێکخراوە ئیستاکە شان لە شانی سامانی گەورەترین کۆمپانیا پاوانخوازەکانی جیهان دەدا و لە زۆربەی کۆمپانیاکانی جیهان دا خاوەن پشکە. بنکەی سەرەکی ئەم رێکخراوە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکایە. سەهیۆنیزم گەلی جوولەکە بەشتێکی دەگمەن دەزانێ و پێیوایە کە جوولەکەکان هەڵبژاردەی خودان و ئەرکێکی تایبەتیان لە سەر شانە.

### سێزاریزم *Caesarism*

سێزاریزم یا قەیسەریزم لە ناوی سێزاری رۆم وەرگیراوە و بۆ پێناسەی شێوەیەکی تایبەتی لە حکوومەتی رەهای تاکەکەسی یان دیکتاتۆری کەڵکی لێوەردەگیردرێ، کە کۆنترۆڵی دامەزراوەیەکی سەربازی لەگەڵ پشتوانی بەرچاوی جەماوەر تێکەڵاو بکا تا ببێتە خاوەن پێگەیەکی بەرزتر لە ناو وڵاتدا.

به ڕای گرامێشی " سیزاریزم نیشانەی ڕەوشێکە کە لەورەوشەدا، هێزە دوژمنەکان هاوسەنگیەکی کارەساتباریان هەیە و درێژەی دوژمنایەتیەکەشیان تەنیا دەبێتە هۆی لە ناوچوونی هەردوولایەنیان. کاتێک کە هێزی پێشکەوتووی "الف" لەگەڵ هێزی کۆنەپەرستی "ب"دا شەڕدەکا و لە هەمان کاتدا کە هیچ کامیان ناتوانن بە سەر ئەوی دیکەیاندا زاڵ بێ، ئەوکات هێزێکی سێهەمی "ج" لە دەرەوە دێتە ناو بازنەکە و بەسەر پاشماوەی ئەم دووهێزەدا زاڵ دەبێ. ئەگەرچی لە هەموو حاڵەتەکاندا سیزاریزم، ئاماژە بە چارەسەرێکی تایبەتیە کە بەپێی ئەو چارەسەریە لە هەلومەرجێکی مێژوویی ـ سیاسیدا بە تایبەتمەندی هاوسەنگیەکی کارەساتباری هێزەکان، ئەرکی هەڵسانگاندن" دەسپێردرێتە کەسایەتیەکی گەورە، بەڵام سەرەڕای ئەمەش، هەموو حاڵەتەکانی سیزاریزم گرنگیەکی مێژوویی یەکسانیان نیە. [لە مێژوودا] شێوەی پێشکەوتوو کۆنەپەرەستانەی سیزاریزم دەبینرێ. لە شیکردنەوەی کۆتاییدا گرنگی هەرکام لەم شێوانە بە لەبەرچاوگرتنی بواری مێژووی عەینی وتەنیا بە پشت بەستن بە یاساکانی کۆمەڵناسی دەرناکەون. سیزاریزم ئەوکاتە پێشکەوتووە کە بوون و سەرهەڵدانەکەی ببێتە هۆی سەرکەوتنی هێزە پێشکەوتووەکان، تەنانەت ئەگەر ئەم سەرکەوتنە تووشی کۆت وبەندو سازانیش ببێ. لە بەرامبەردا، سیزاریزم کاتێک کۆنەپەرستانەیە کە بوون و سەرهەڵدانەکەی ببێتە هۆی سەرکەوتنی هێزە کۆنەپەرستەکان. لەم حاڵەتەشدا ئاساییە کە کۆت و بەند و پێکهاتن لە ئارادابێ کە گرنگی و بایەخ و ڕەهەندەکانی لەگەڵ کۆت و بەندەکانی جۆری یەکەمدا جیاوازیان دەبێ. ژۆلیۆس قەیسەر و ناپلیۆن، نموونەی سیزاریزمی پێشکەوتوو و ناپلیۆنی سێهەم و بیسمارکیش نموونەی سیزاریزمی کۆنەپەرستانەن.

## *سکۆلاستیک (بزووتنەوەی قوتابخانەیی سەدەکانی ناوەڕاست)*
## Scholasticism

بزووتنەوەیەکی مێژووی بیروڕا سیاسییەکانی ڕۆژئاوایە. ڕێبەرەکانی ئەم بزووتنەوە، زانایانی گەورەی سەدەکانی نێوەڕاست بوون. ئانسلێم، ئابلار، پێترۆی لێمبارد، ئالبیرتۆس ماگنۆس و ئالبێرتی گەورە و لە دواییشدا توماس ئاکویناس، گروتیین بەم بزووتنەوەدا.

بزووتنەوەی قوتابخانەیی ئەوروپا لە شێوازە پێشکەوتووەکەیدا، ئاکامی پروپاگەندەو لێکۆڵینەوە ئاکادمیەکان بوو. زانکۆ یەکێک لە گرنگترین دیاردەکانی سەدەکانی ناوەڕاستە کە

وەکوو پاشماوەیەکی گەورە ـ لە راستیشدا گەورەترین پاشماوەی ئەو سەردەمە ـ گوازراوەتەوە بۆ جیهانی هاوچەرخ. زانکۆکانی سەدەکانی ناوەڕاست لە سەرەتادا لایەنی ڕێکخراوەییەیان هەبوو و بە شێوەی کۆمەڵە ڕێکخراوەییەکانی مامۆستایان و قوتابیان دەستبەکار بوون. کۆنترین زانکۆکانی ئەو سەردەمە بریتی بوون لە هێندێک ناوەندی پسپۆری، بەو واتایەی کە هەرکامیان تەنیا لە بوارێکی تایبەتی زانستدا قوتابیان پەروەردە دەکرد. بۆ وێنە کۆنترین زانکۆی ئەورووپای سەدەکانی ناوەڕاست ــــ زانکۆی سالێرنۆ ــــ قوتابخانەیەکی تایبەتی فێرکردنی پزیشکی بوو. زانکۆکانی بولۆنی و پادۆئا هەموو هەوڵی خۆیان بۆ فێرکردنی بوارە یاساییەکان تەرخان کردبوو. ئەم زانکۆ تایبەتیانە (لە بواری پسپۆرییەوە) لە بواری چۆنیەتی کار کردنەوە جیاوازییەکی ئەوتۆیان لەگەڵ ڕێکخراوەکانی دیکە سەدەکانی ناوەڕاستدا نەبوو. (چوونکە لەو ڕێکخراوانەشدا ئەوانە لە دەوری یەکتر کۆ دەبوونە کە لە بوارێکدا کاریان دەکردو یەکیەتیان پێکدێنا). ئامانجی ئەم ڕێکخراوە پیشەییانە ئەوە بوو کە لەو سەردەمەدا داکۆکی لە ماف و بەرژەوەندی ئەندامەکانیان بکەن و شێواز و تەکنیکەکانی ئەو بوارە فێری ئەو لاوانە بکەن کە تازە دەهاتنە ناو ئەو پیشەوە. یەکیەتیە پیشەییەکانی زانکۆکانیش لە سەدەکانی ناوەڕاست هەر ئەم ئامانجەی ڕێکخراوە پیشیەکانیان هەبوو. بۆوێنە دەزگای " ماڵی زانستی بۆلۆنی" یەکیەتیەکی پیشەیی مافناسەکانی ئەو سەردەمە بوو. بەڵام جیاوازی بنەڕەتیی ئەم دەزگایانە لەگەڵ ڕێکخراوە پیشەییەکانی سەدەکانی ناوەڕاست، ئەوە بوو کە سەبارەت بەو شتەی کە دەیانزانی بەرچاوتەنگ بوون و شتیان فێری خەڵک دەکرد و پاشانیش ئەندامەیتی ئەم یەکیەتیانە لە بەردەست کۆمەڵێک کەسی تایبەتیدا نەبوو. یەکیەتیی پیشەیی زانکۆی بۆلۆنی بە پێچەوانەی یەکیەتیە پیشیەکانی دیکە هەوڵی نەدەدا کە لە زانیارییە زانستیەکانی خۆی (بواری یاسا) وەموو گەنجێکی سەربەمۆر پارێزگاری بکا و یان تەنیا ئەو زانیارییانە فێری ئەو کەسانە بکا کە بە کومەڵێک مەرج و کۆت وبەندەوە بوونە ئەندامی یەکیەتیەکەیان. ئەوە لەلایەکی دیکەوە ئەم راستیەی دەردەخست کە یەکیەتیی پیشەیی زانکۆی بۆلۆنی بوارەپسپۆرییەکەی خۆی (یاسا) بە لقێکی زانستی مرۆڤەکان دادەنا کە مرۆڤەکان حەزدەکەن لە مبارەوە شت بزانن. ئەمە بە پێچەوانەی بیری زاڵی ڕێکخراوە پیشەییەکانی دیکە بوو کە زانیارییەکانی خۆیان تەنیا فێری کۆمەڵێک کەسی تایبەتی دەکرد.

بەڵام نابێ پێمان وابێ کە تەنیا قوتابخانە عەلمانیەکانی سەدەکانی ناوەڕاست تاکە سەرچاوەی زانکۆکان بوون. ئایینیش بەش بە حاڵی خۆی لەم نێوەدا ڕۆڵی هەبووە و لە سەردەمە کۆنەکانەوە هێندێک قوتابخانەی ئایینی دامەزراون کە لە ژێر چاوەدێری کلیسادا بەڕێوە دەچوون. لە حاڵێکدا کە پەرستگە ئایینیەکان بەپێی عورف پەروەردەکردنی ئەندامان و کەسە ئایینیەکانیان لە ئەستۆدا بووە.

ئەگەر لە بواری پسپۆڕی و شارەزاییەوە چاو لە شتەکە بکەین، بۆمان دەردەکەوێ کە پەروەردەی کلیساش جۆرە پەروەردییەکی پسپۆڕانە بووە، چوونکە ئامانجە بنەڕەتیەکەی ئەوە بووە کە قوتابیانی خۆی بکاتە قشە یان بیانکاتە راهیب. بەڵام لەو حاڵەتەشدا سنووردانان، لە نێوان ئەو شتەی کە تەنیا پەروەردەی پسپۆڕانە و تایبەتی بوو لەگەڵ ئەو شتەی کە هیی هەموومرۆڤایەتی بوو، لەگەڵ حاڵەتی پێشوودا (زانکۆ عەلمانیەکان) ئەستەمترە. گرنگترین مەرجی قوتابخانە ئایینیەکان بۆ قەشەکان (یان بۆ ئەو کەسانەی بۆ ئەم مەبەستە رادەهاتن) ئەوە بوو کە لە بواری ئایینی مەسیحیدا زانیاریان هەبێ، بەڵام ئەمە تەنیا تایبەت بە قەشەکان نەبوو، بەڵکوو هەموو مرۆڤەکان حەزیان دەکرد لەم پێوەندییەدا زانیاریان هەبێ. قەشەکان و کەسانی دیکە لە بوارەکانی دیکەی ژیان لەگەڵ یەکتردا زۆر جیاواز بوون. بەڵام قەشەکانی سەدەکانی ناوەڕاست لەم روانگەوە لە پاسەوانانی کۆماری ئەفلاتوون دەچوون کە مەرجی گەیشتن بە پلە و پایە شیاوەکان بۆ هەر دوولایان (هەم بۆ پاسەوانان و هەم بۆ قەشەکان) هەبوونی کۆمەڵێک تایبەتمەندیی بوون کە بەگشتی مرۆڤێک دەکەنە مرۆڤێکی رێک و پێک و چاک. دەتوانین بڵێین کە پەروەردەکردنی پیاوە ئایینەکان لەوسەردەمەدا، وەکوو پەروەردەکردنی پاسەوانانی ئەفلاتوون لە راستیدا جۆرێک پەروەردەی گشتی لە ژێر رووبەندی پەروەردەی پیشەییدا بووە.

ئەوکاتە هەنگاوی گرنگ بۆ پەرەپێدان و پێشخستنی زانکۆکان هەڵگیرا، کە پەروەردەو وانە تایبەتیەکان لە کۆلیژێکدا کەسەر بە بوارێکی تایبەتی بوو، چڕکرانەوە کە بۆ یەکەمجار لە پاریسدا جێبەجێ بوو. لە سەرەتاکانی سەدەی ١٣دا، زانکۆی پاریس ٤ کۆلیژی یاسا، پزیشکی، ئەدەبیات، و خواناسی هەبوو و هەموو زانکۆکانی ئەورووپا چاویان لە رێکخستنی زانکۆی پاریس کرد.

## سیستەمی سەرپەرستیاری *Trusteeship System*

سیستەمێکە کە لەلایەن ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکانەوە دامەزراوەو بەپێی ئەو سیستەمە ولاتێکی ژێرسەرەپەرستیاری لە ژێر چاوەدێری ئەنجومەنی سەرپەرستیاری ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتوەکان،لە لایەن ولاتێکی دیکەوە یان لە ژێر چاوەدێری خوودی ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکانەوە بەڕێوە دەچێ. سیستەمی سەرپەرستیاری کە لە ژێر دەسەلاتی گشتی کۆمەڵەی گشتی UNدا بەڕێوە دەچێ، بەپێی بەشەکانی ١٢و ١٣ی پێڕەوپرۆگرامی UN وەکوو شێوازێک بۆ بردنەسەری ئاستی بارودۆخی سیاسی، ئابووری و کۆمەلایەتیی خەلکی ولاتانی ژێر سەرپەرەستیاری، تاو ئەو کاتەی کە مافی پێکهێنانی دەوڵەت و پاشانیش سەربەخۆییان دەبێ، دامەزرا. سیستەمی سەرپەرستیاری جێگەی سیستەمی نوێنەرایەتیی کۆمەڵەی نەتەوەکانی گرتەوە و ئەو ولاتانەی بە هۆی سیستەمی نوێنەرایەتیی کۆنەوە بەڕێوە دەچوون، جگە نامیبیا، لە لایەن دەسەلاتە سەرەپەرەستەکانەوە خرانە ژێر دەسەلاتی ئەنجومەنی سەرپەرستیارییەوە. ئەفریقیای باشوور پێیوابوو کە بە نەمانی کۆمەڵەی نەتەوەکان، سیستەمی نوێنەرایەتیش تەمەنی بە سەر چووە، کەواتە ئەفریقیای باشوور دەیتوانی نامیبیا بکاتە بەشێک لە خاکی خۆی. دیوانی نێودەوڵەتیی داد لە ساڵی ١٩٥٠دا لە کێشەی " ڕەوشی نێودەوڵەتیی ئەفریقیای باشووری ڕۆژئاوا(نامیبیا) " دا بە پێی دەنگی ڕاوێژکاریی خۆی، ئەم داواییەی ئەفریقیای باشووری ڕەت کردەوە. ئەو ولاتانەی کە چووبوونە ژێر سیستەمی سەرپەرستیاری یان بۆ ئەوە دەبوون بخرێنە ژێر دەسەلاتی ئەم سیستەمەوە جگە لە حاڵەتی نامیبیا، ئەو ولاتانەشی دەگرتەوە کە لە ڕابردوودا لەژێر کۆنترۆڵی دەوڵەتە دۆڕاوەکانی شەڕی جیهانی دووهەم دا بوون، یان ئەوەتا دەسەلاتە کۆلۆنیالیستەکان بۆخۆیان دیاریان دەکرد، بچنە ژێر کۆنترۆڵی ئەنجومەنی سەرپەرستیاری (کەئەم حاڵەتی سێهەمە جێبەجێ نەکرا). سەرجەم ١٥ ولات کە لە ژێر کۆنترۆڵی حەوت ولاتدا بوون، چوونە ژێر دەسەلاتی سیستەمی سەرپەرستیارییەوە. سەرپەرەستیاری ئەمەریکا بەسەر دوورگەکانی ماریاناس، کارۆلنیز و مارشاڵ، ڕەوشێکی نائاسایی هێنایە ئاراوە، چوونکە ئەم کۆمەڵە ولاتە بەپێی گرنگیی جوگرافیەکەیان لە ژێر ناوی " ناوچە ستراتیژییەکانی سەرپەرەستیاری" پۆلین بەندی کران. ئەم ناوچانە چوونە ژێردەسەلاتیی سەربازی ئەنجومەنی ئاسایشەوە و، نەخرانە ژێر چاوەدێری کۆمەڵەی گشتی UN و ئەنجومەنی سەرپەرستیارییەوە. تایبەتمەندیی سەرنجڕاکێشی هەوڵەکانی سەرپەرستیاری UN (کە

سیستەمی نوێنەرایەتیی کۆمەڵەی نەتەوەکان نەیبوو) ئەوە بوو کە ئەم وڵاتانە دەیانتوانی راستەوخۆ لە ژێر سەرپەرەستی ئەنجوومەندا بنە سەرپەرەستیار. ئەمرۆکە سیستەمی سەرپەرەستیاری باوی نەماوەو تەنیا لە بواری مێژوویەوە باسی لێ دەکرێ.

### Consulate سیستەمی کۆنسولی

بە سیستەمی حکوومەتیی فەرەنسە لە دوای رووخانی دیراکتۆر دەگوترێ کە لە تشرینی دووهەمی ١٧٩٩ تا ئەو سەردەمەی ناپلیۆن راستەوخۆ، ئیمپراتۆری خۆی راگەیاند، درێژەی کێشا. (١٨ی ئایاری١٨٠٤). ئەو سیستەمە سێ دەسەڵاتی یاسادانان و دەسەڵاتێکی بەرێوەبەریی هەبوو کە لە لایەن سێ کۆنسولەوە بەرێوە دەچوون. چوونکە ناپلیۆن کۆنسۆلی یەکەم بوو ، هەموو دەسەڵاتەکان لە بەردەست ئەودا بوون، و کۆنسولەکانی دیکە بریارەکانی ئەویان جێبە جێ دەکرد.

### Ancien Régime (Old Order) سیستەمی کۆن

ئەم زاراوە بۆ پێناسەکردنی ئەو پێکهاتە دەوڵەتیە کەڵکی لێ وەردەگیردرێ کە پێش لە شۆرشی ١٧٨٩ی فەرەنسا، دەسەڵاتی ئەم وڵاتانەی بەدەستەوەبوو. تایبەتمەندی دیاری ئەم سیستەمە، پاشایەتیی رەها و دابەشبوونی کۆمەڵگا بە سەرسێ چینی ئاریستۆکرات، رۆحانی و خەڵکی ئاسایی بوو.

### New World Order سیستەمی نوێی جیهانی

زاراوەیەکە کە لە ناوەراستی ساڵی ١٩٨٩ و لەدوای ئاڵوگۆرەکانی بەرەی رۆژهەڵاتدا هاتۆتە نێو قاموسە سیاسییەکانی جیهانەوە. سیستەمی نوێی جیهانی، پێوەندییە نێودەوڵەتیەکانی قۆناغی دوای شەری دووهەمی جیهانی تا کۆتایەکانی دەیەی ٨٠، لەگەڵ ئەو رێکخستنە کە لە دوای ئەم قۆناغە سەری هەڵداوە، جیا دەکاتەوە. هەرەسهێنانی دیواری بەرلین لە کانوونی یەکەمی ١٩٨٩دا، کۆتایی بە پێوەندییە نێودەوڵەتیە کۆنەکان هێنا و، شەری کەنداویش "سنووری هاوبەش" یان "هێڵی نێوان"ی سیستەمی نوێ و سیستەمی کۆن بوو.

دەسەڵاتدارەکانی پێشووی جیهان هەریەکەوە بەپێی بروای خۆیان بە دوای دامەزراندنی "سیستەمی نوێی جیهانی "یەوە بوون، لە مۆنرۆە بگرە تا لنین و لە هیتلەرەوە هەتا بۆش. بەڵام

سیستەمی نوێ بەواتا ئەمڕۆییەکەی زاراوەیەکی لێل و ناروونە کە هەرکەسێک پێناسەیەکی تایبەتی لەسەر ئەم چەمکە دەکا. لە دوای هێرشی عێراق بۆ سەر کوێت لە ڕێکەوتی ٢ی ئابی١٩٩٠ و ناردنی هێزەکانی ئەمەریکا بۆ عەرەبستان، جۆرج بۆش سەرۆک کۆماری ئەمەریکا لە ١١ی ئەیلوولی ١٩٩٠دا لە بەرامبەر نوێنەرانی کۆنگرەی ئەمەریکادا بەم شێوە سەبارەت بە سیستەمی نوێی جیهانی دوا:

"جیهانێکی زۆر جیاواز لەو جیهانەی کە ناسیومانە. جیهانێک کە لەودا دەسەڵاتی یاسا جێگەی یاسای دارستان دەگرێتەوە. جیهانێک کە وڵاتان بەرپرسیارەتی هاوبەش بە ئازادی و یەکسانیی بەرەسمیی دەناسن و جیهانێک کە بەهێزەکان، ڕێز بۆ مافی بێ هێزەکان دادەنێن.

ئالێن دۆبنوا، بیریار و نووسەری فەڕەنسی یەکێک لە دەرئەنجامەکانی دامەزراندنی سیستەمی نوێی جیهانیی بەم شێوە هەڵدەسەنگێنێ:

"فاکتەری سیاسی دەچێتە ژێر ڕکێفی فاکتەری یاسایی و فاکتەری یاساییش دەچێتە ژێر ڕکێفی ئەخلاقێکی تایبەتیەوە کە ئامانجەکەی ڕەوایی دان بە بەرژەوەندییەکانی ڕۆژئاوایە".

بەڕای دۆبنوا، ئامانج لە سیستەمی نوێی جیهانی ئەوەیە کە لەڕێگای ئایدۆلۆژی زاڵەوە، ڕەوایی بدرێ بە دەستێوەردان لە کاروباری وڵاتانی تردا. نوام چۆمسکی ، ڕەخنەگری سیاسەتی دەرەوەی ئەمەریکا کە شێوازی نوێی جیهان لە ڕەهەندی ئابوورییەوە بە سێ جەمسەری و لەرەهەندی سەربازیشەوە بە تاک جەمسەری دادەنێ؛ سیستەمی نوێی جیهانی بە " نێوێکی تازە بۆ پەنابردنە بەر زۆر" دادەنێ.

چەند پێناسەی دیکە سەبارەت بە سیستەمی نوێی جیهانی لە ئارادان وەکوو:

ڤیلیام کانت؛ توێژەری کاروباری ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست: " لە سیستەمی نوێی جیهانیدا مەسەلەکانی جیهان بەپێی بەرژەوەندییە نیشتمانیەکانی دەسەڵاتە گەورەکانی جیهان دابەش دەکرێن. بێرژینسکی : " سیستەمی نوێ بە واتای کۆتایی هاتنی قۆناغی شەڕی سارد و دارمانی ئیمپراتۆری سۆڤیەت وەکوو زلهێزێکە". بە هۆی سیستەمی نوێی جیهانیەوە، شێوازی دەسەڵاتخوازی هێزە جیهانیەکان بەسەر کۆمەڵگا مرۆییەکاندا دەگۆڕێ و تەکتیکە میلیتاریستیەکان جێگای خۆیان دەسپێرنە تەکنیکە ئابوورییە تەکنەلۆژییەکان.

## سیستەمی ئاسایشی بەکۆمەڵ Collective Security system

سیستەمی چڕبووەی یاسا نێودەوڵەتیەکانی پێڕەوپرۆگرامی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانە کە ئاماژە بە پەنابردنە بەر زۆر و هێز لە ژێر چاوەدێری و کۆنترۆڵی UN بەمەبەستی پاراستن و گەڕاندنەوەی ئاشتی و ئاسایش نێودەوڵەتیدا دەکا. چوارچێوەی یاسایی سیستەمی ئاسایشی بەکۆمەڵ ئاکامی عەقلانی نایاسای کردنی زۆر و هێز لە پێوەندییە نێودەوڵەتیەکان دایە. ئەم سیستەمە لە ئەنجوومەنی ئاسایشی UNدا چڕ کراوەتەوە و ئەم ئەنجوومەنە بەرپرسیاری یەکەمی پاراستنی ئاشتی و ئاسایشی نێودەوڵەتیە. جێبەجێکردنی ئەو هەوڵانەی کە لە چوارچێوەی ناوچەیی یان ڕێکخراوە ناوچەییەکاندا دەدرێن پێویستیان بە مۆڵەتی ئەنجوومەنی ئاسایش هەیە. ئەگەرچی ئەنجوومەنی ئاسایش بۆ چارەسەرکردنی ئاشتیانەی کێشە نێودەوڵەتیەکان تەنیا دەتوانێ پێشنیار ئاراستە بکا ( بەشی ٦ی پێڕو پرۆگرام). لەو کێشانەی کە پێوەندییان بە "هەڕەشە لەسەر ئاشتی، ڕۆڵی ئاشتی و کردەوەی داگیرکارانە"وە هەیە، ئەنجوومەنی ئاسایش دەتوانێ بڕیار بدا و بڕیارەکانیشی پێویستە جێبەجێ بکرێن (بەشی ٧ی پێڕەو پرۆگرام). لەو ڕوانگەوە کە ئەو سێ چەمکە پێناسەیەکی تایبەتیان بۆ نەکراوە، ئەرکی سەرەکی ئەنجوومەنی ئاسایش لە پلەی یەکەمدا ئەوەیە کە ئایا ئەو بابەتەی لایەن وڵاتێکەوە، سکرتێر و کۆمەڵەی گشتیUNەوە ئاراستەی ئەنجوومەن دەکرێ، دەشێ بە هەڕەشە لەسەر ئاشتی دابنرێ، ئایا پێشێل کردنی ئاشتیە یان کردەوەی داگیر کەرانەیە. چەمکی " هەڕەشە لە سەر ئاشتی" نەک تەنیا هەڕەشەی لەگەڵ زۆردا ( بە پێی بەندی ٤ی ماددەی ٢ی پێڕەو پرۆگرام) دەگرێتەوە، بەڵکوو لە ژێر کاریگەری هێندێک بارودۆخدا، دیاردەی وەکوو شەڕی نێوخۆیی و تەنانەت پێشێل کردنی مافی مرۆڤیش دەگرێتەوە. پێشێل کردنی ئاشتیی نابێ هەمیشە بەکەڵک وەرگرتن لە هێزی چەک پێناسە بکرێ و کردەوەی داگیرکەرانەش بەپێی بەندی ٤ی ماددەی ٢ نابێ تەنیا بە کردەوەی کەڵک وەرگرتن لە هێزی چەک و یان تەنیا هێرشی چەکدارانە نیە کە بەپێی ماددەی ٥١، ئەو لایەنەی هێرشی کراوەتە سەر، دەتوانێ بەرگری لە خۆی بکا. هەرکاتێک ئەنجوومەنیی ئاسایش دیاری بکا کە هەڕەشە کراوەتە سەر ئاشتیی، یان ئاشتی پێشێل کراوە یان کردەوەیەکی داگیرکارانە ڕووی داوە، ئەو دەسەڵاتەی

هەیە کە لە لایەنەکانی پێوەندیدار داوا بکا (ئەم داواکارییە بە واتای دەستێوەردان راڤە کراوە)، رەچاوی هێندێک چارەسەری کاتی بەپێی ماددەی ٤٠ بکەن، یان کۆمەڵێک پێشنیار بکا، کومەڵێک بریاربدا یان بڕیار بدا لە ڕێگاچارەی ناسەربازی کەڵک وەربگرن یان (لە حاڵێکدا کە ئەم هەوڵانە کاریگەرییان نەبێ یان بسەڵمێن کە کاریگەرییان نیە) پەنا بەرێتە بەر زۆر و هێز. چارەسەرییە کاتیەکان دەتوانن داوا لە لایەنەکان بکەن کە یان ئاگربەس بکەن یان پاشەکشە بە هێزەکانیان بکەن. نێوەرۆکی پێشنیارەکان (کە بە زۆر ناسەپێن) بە روانگەی ئەنجوومەنی ئاسایشەوە بەستراونەوە. چارەسەرییە بەرێوەبەرییەکان دەتوانن بە دوو شێواز بن:

**الف)** ئەو هەوڵانەی کە لە دژی لایەنی تاوانبار دەدرێن و پشت بە هێزی چەکدار نابەستن (ماددەی ٤١).

**ب)** هەوڵەسەربازییەکان (ماددەی ٤٢): کەڵک وەرگرتن لە هێزە سەربازییەکان لە مانۆرە سەربازییەکان بۆ ترساندنی وڵاتی تاوانبار، گەمارۆدان و هەوڵەکانی دیکە دەگرێتەوە. هەوڵەکانی (الف) پچڕانی کاتی پێوەندییە ئابوورییەکان، ئامرازەکانی گەیاندن و پچڕانی پێوەندی دیپلۆماتیک لەخۆ دەگرن. ئەنجوومەنی ئاسایش دەتوانێ بڕیاری جێبەجێکردنی ئەم خاڵانە بدا و یان تەنیا یەکێک لەم شێوازانە پێشنیار بکا. بە پێچەوانەی هەوڵە بەرێوەبەرییە ناسەربازییەکان، هیچ وڵاتێک لە بواری یاساییەوە بەوە ناچار ناکرێ کە لە کردەوەی سەربازی لە دژی داگیرکەردا بە شداری بکا، مەگەر ئەوەی لەگەڵ ئەنجوومەنی ئاسایشدا بە پێی ماددەی ٤٣ سەبارەت بە زانیاری لە سەر جۆرو ژمارەی روونی هێزەکان، رادەی ئامادەیی و شوێنی دامەزرانیان و چۆنیەتی ئەو ئاسانکاری و یارمەتیانەی کە دەتوانێ ئاراستەیان بکا. "بەرێکەوتنی تایبەتی" گەیشبێتن. بەو پێیەی کە ئێستا هیچ رێککەوتننامەیەک لە مبارەوە لەگەڵ ئەنجوومەنی ئاسایشدا گرێ نەدراوە، ئەم رێوشوێنانە لە کردەوەدا هیچ کاریگەرییەکیان نیە. وا پێدەچێ هیچ رێگایەکی یاسایی لە ئارادا نەبێ کە بەپێی ئەو یاسایە رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بتوانێ کردەوەی بەرێوبەری سەربازی کە وڵاتانی ئەندامیش ناچار بکا بەشداری تێدا بکەن، وەئەستۆ بگرێ، مەگەر ئەوەی ئەنجوومەنی ئاسایش بڕیار بدا ئەم هەوڵە لە دەرەوەی رێککەوتننامەی تایبەتیی ماددەی ٤٣ (جیاواز لەوەی کە لە بواری یاساییەوە

مشتوومڕی لە سەرە)جێبەجێ بکرێ. ئەنجوومەنیی ئاسایش دەتوانێ ڕێگابە وڵاتێک بدا کە لە
هێز کەڵک وەرگرێ. هەروەکوو ئەوەی لە ساڵی ١٩٦٦دا ئەو دەسەڵاتەی بە بەریتانیادا کە
لە دەریای ئازاددا خەریکی پشکنینی پاپۆرەکان بێ، تاکوو بزانێ کە ئایا ئەم پاپۆرە نەوت
هەڵگرانە دەچنە ڕۆدزیای باشوور یان نا. ئەنجوومەنیی ئاسایش ئەو دەسەڵاتەی هەیە کە لە
سەرهەوڵەکانی ئاسایشی بەکۆمەڵ بڕیار بدا. بەڵام لەبەر هۆکارە سیاسییەکان، بڕیارەکانی
ئەنجوومەنیی ئاسایش لە بوارەنافۆرمیەکاندا (بابەتەکانی بەشی ٧ی پێڕو پرۆگرامیUN)
پێویستی بە ٩ دەنگی ئەرێی ئەندامانی ئەنجوومەنیی ئاسایش و لەوانە ٥ ئەندامی هەمیشەیی
هەیە. هەروەها ئەگەر وڵاتێک کە بڕیار دراوە هەوڵەکانی لە سەر جێبەجێ بکرێ، بۆ خۆی
ئەندامیی ئەنجوومەنیی ئاسایش بێ، دەتوانێ لە سەر خۆی دەنگ بدا. لە کردەوەدا و بە
پێچەوانەی چۆنیەتی نووسینی بەندی سێی ماددەی ٢٧ی پێڕەوپرۆگرامی UN، دەنگی
بێلایەن، بە ڤیتۆ دانانرێ. ئەوەی کە ئایا ئەندامێکی هەمیشەیی ئەنجوومەن لە کاتی دەنگداندا
بەشدار نەبێ، دەنگەکەی بە بێلایەن دادەنرێ یان نا، روون نەکراوەتەوە. کۆمەڵە گشتیUN
دەسەڵاتی یاسایی پێویستی بۆ جێبەجێکردن هەوڵە بەڕێوەبەرییەکان لە چوارچێوەی سیستەمی
ئاسایشی بەکۆمەڵدا نیە، بەڵام دەتوانێ سەبارەت بەو بابەتانەی کە پێوەندییان بە ئاشتی و
ئاسایشی نێودەوڵەتیەوە هەیە، پێشنیار ئاراستە بکا. بەڵام هەر چۆنێک بێ، ئەگەر کێشەیەک
پێویستی بە هەوڵی بەڕێوەبەریی هەیە یان لەو حاڵەتانەدا کە کێشەیەک یان قەیرانێک لە
ئەنجوومەنیی ئاسایشدا هاتۆتە گۆڕێ، کۆمەڵەی گشتی دەتوانێ تەنیا بابەتەکە تاوتوێ بکا و
پێویستە کە کێشەکە بە ئاگاداری ئەنجوومەنیی ئاسایش بگەیەنێ. لە ماوەی شەڕی کۆریادا،
ئەوکاتەی کە بڕیاری ئەنجوومەنی ئاسایش، بە هۆی ڤیتۆی سۆڤیەت لە پاییزی ساڵی ١٩٥٠دا
بەبنبەست گەیشت، کۆمەڵەی گشتی بۆ وەئەستۆگرتنی ئەو ئەرکەی کە پێی دەگووت "
بەرپرسیارەتی دووهەم"ی خۆی بۆ پاراستنی ئاشتی و ئاسایشی نێودەوڵەتیی، بڕیارنامەی
"یەکیەتیی بۆ ئاشتی" پەسند کرد. بەپێی ئەم بڕیارنامە لە حاڵێکدا کە ئەنجوومەنیی ئاسایش
(بەهۆی مافی ڤیتۆوە) نەیتوانی ئەرکی سەرەکی خۆی بەڕێوە ببا، کۆمەڵەی گشتی دەستبەجێ
کێشەکە بە ئامانجی دەرکردنی پێشنیار بۆ هەوڵی بەکۆمەڵ، تاوتوێ دەکا. یەکیەتیی سۆڤیەت

ئەم بریارنامەی بە نایاسایی لە قەڵەمدا و دژایەتیی لەگەڵدا کرد، بەڵام پاشان کە بۆ خۆی پێویستی پێی بوو، لەم بریارنامە کەڵکی وەرگرت.

### سنوورە سەپێنراوەکان *Super Imposed Borders*

بە سنووری ئەو وڵاتانە دەگوترێ کە بەبێ سەرنجدان بە تایبەتمەندی و جیاوازییە ئەتنی و کولتوورییەکانی دانیشتوانەکانیان دیاریکراون ولە لایەن دەسەڵاتە زاڵەکانەوە بە سەریاندا سەپێنراوە. کۆلۆنیالیستەکان ــ بە تایبەتی لە ئاسیا و لە ئەفریقیا دا ــ بۆ چاندنی تۆوی دووبەرەکیی، زۆربەی سنوورەکانی نێوان کۆلۆنیەکانی پێشووی خۆیان بەبێ سەرنجدان بە تایبەتمەندییە کولتووری و ئەتنیەکان، دیاری کردووە کە ئەمە بۆتە هۆی شەڕ و ئاژاوەنانەوە لەو وڵاتانەدا. بۆ نموونە: سنوورەکانی هیند و پاکستان.

### سنوورە سیاسییەکان *Political Borders*

سنوورە سیاسییەکان، گەورەترین فاکتەری دیاریکردن و جیاکردنەوەی یەکەیەکی ڕێکخراوی سیاسی لەگەڵ یەکەکانیتر دایە. ئەم سنوورە سیاسییانەن کە دەبنە هۆی پێکهێنانی یەکیەتیی سیاسی لەو ناوچانەدا کەرەنگە هیچ خاڵێکی هاوبەشیان پێکەوە نەبێ. هێڵە سنوورییەکان، دەستکردن و بە پێی ڕێککەوتن بە مەبەستی دیاریکردنی چوارچێوەی یەکەیەکی سیاسی لە سەر گۆی زەوی، دیاری دەکرێن. ئەگەر مەبەست لەیەکەی سیاسی وڵاتێکە، لەم حاڵەتەدا ئەو هێڵانەی کە خاکی وڵاتێک لە وڵاتی دراوسێی جیا دەکاتەوە، هێڵی نێو دەوڵەتیان پێ دەگوترێ.

هێڵە سنوورییەکان وێرای دیاریکردنی چوارچێوەی وڵاتێک، پانتایی دەسەڵاتی سیاسی ئەو وڵاتەش دیای دەکەن. بۆوێنە؛ هیچ دەوڵەتێک ئەو مافەی نیە کە لە خەڵکی دەرەوەی سنوورەکانی خۆی باج وەرگرێ، سەربازگیری بکا یان لە خاکی وڵاتی دراوسێکەیدا کردەوەی سەربازی ئەنجام بدا. تەنیا لە حاڵەتێکدا دەتوانێ لە خاکی ئەو وڵاتە کەڵک وەرگرێ کە سەبارەت بەم بابەتە، لەگەڵ ئەو وڵاتەدا ڕێککەوتبن. پەڕینەوە لە هێڵە سنوورییە نێودەوڵەتیەکان بەبێ مۆڵەت قەدەغەیە و پەڕینەوە بەپێی یاسا و پەسندکراوەی تایبەتیی جێبەجێ دەبێ.

## Golden Triangle

### سێ کوچکەی ئاڵتوونی

ئەم زاراوە لە کۆتاییەکانی دەیەی ۱۹٦۰ بە ناوچەیەک دەگوترا کە قاچاغیی ماددە سڕکەرەکانی تێدا کرا. بە هۆی ئەو کۆسپە زۆرانەی کە هاتنە بەردەم فرۆشتنی ماددە سڕکەرەکان لە ئەورووپادا، ناوچەی سێ کوچکەی ئاڵتوونیی جێگای خۆی ئەسپاردە ناوچەی " مانگی ئاڵتوونیی " (Gollden Crescent). ئەم مانگە باکووری رۆژهەڵاتی ئێران، باشووری رۆژهەڵاتی ئەفغانستان و باکووری رۆژئاوای پاکستان دەگرێتەوە.

## شۆڕش *Revolution*

زاراوەی Revolution کە لە چاخی ناوەڕاستی زمانی ئینگلیزیدا کەڵکی لێ وەرگیراوە، لە زاراوەی فەڕەنسیی Révolution کە ئەویش لە وشەی لاتینیی Revolution-on و سەرچاوەی Revoluere وەرگیراوە.

زاراوەی Revolution لە زاراوەکانی ئەستێرەناسییەکە لە زانستە سروشتییەکاندا بە هۆی کاریگەریی کوپێرنیک لە ڕێگای :

De Revolutionibus Orbiud Coelestiub

گرنگیەکی زۆری بەدەست هێنا. ئەم زاراوەیە لە نێو زانستدا مانای ورد و روونە لاتینیەکەی خۆی پاراستووە. ئەم زاراوەیە راشکاوانە ئاماژە بە جووڵەیەکی "دووبارە"و "خولانەوە"، کە سەرچاوەکەی زانستی ئەستێرەناسیەو، ئەو زاراوە لە زانستی سیاسەتدا کەڵکی لێ وەرگیراوە.

واتای ئەو زاراوەیە بەگشتی لە سەردەمە جۆراوجۆرەکاندا بەم شێوەیە بووە: لە سەدەی هەڤدەهەمدا زاراوەی Revolution بۆ یەکەمین جار وەک زاراوەیەکی سیاسی کەڵکی لێ وەرگیراوە، ئەم واتا مەجازییە زیاتر لە رابردوو لە واتا راستەقینەکەی خۆی نزیک بۆوە. واتە "گەڕانەوە بۆ شوێنی یەکەم" و "گەڕانەوە بۆ تەکووزێک کە لە پێشدا دەستنیشان کراوە".

هەروەها ئەم زاراوەیە بە "رووخانی بەتەواوەتیی حکومەتێک لە هەر وڵات یان دەوڵەتێک و، دانانی دەسەڵاتدار یان دەوڵەتێکی نوێ لە رێگای توندوتیژییەوە"، گوتراوە.

لە ساڵی ١٦٦٠دا ئەم زاراوەیە دوای هەڵوەشانەوەی "پەرلەمانی درێژماوە"( Rump Parliamente) کەڵکی لێ وەرگیرا. [ناوی پارلەمانی درێژماوە (١٦٦٠-١٦٤٠) دوای دەرکردنی ١٢١ کەس لە ئەندامانی پەرلەمان کە سوپای شۆڕش لە ساڵی ١٦٤٨دا دان پێدانەدەنان، بە پەرلەمانی بەریتانیا دەگوترا. ئەم رووداوە دوای لابردن و دادگاییکردنی چارلزی یەکەم، شای بەریتانیا بە تاوانی خیانەت، هاتە ئاراوە].

زاراوەی "شۆڕشی مەزن" (١٦٦٨) بە کودەتایەک دەگوترێ کە بوو بە هۆی لەسەرکار لادانی جیمزی دووهەم، شای بەریتانیا لە پاشایەتی، کە بە جێگای ئەو، خوشکەکەی "ماری"و هاوسەرەکەی ڤیلیامی سێهەم ناسراو بە "ئۆرانژ" لە سەر تەختی پاشایەتی پاڵیان دایەوە. ئەم رووداوە بوو بە هۆی ئەوەی کە پەرلەمان بە سەر پلە و پۆستی شایەتیدا، زاڵ بێ. "شۆڕشی مەزن" بوو بە هۆی ئەوەی کە وشەی "شۆڕش بەتەواوەتی بێتە نێو زمانی سیاسەتەوە، بەڵام کەس ئەو رووداوەی بە شۆڕش نەدەزانی و، هەموو کەس بە "گەڕانەوە"ی راستی و شکۆ و گەورەیی پێشوو، بۆ دەسەڵاتی پاشایەتیان دادەنا.

زاراوەی شۆڕش، لە ساڵی ١٧٩٠دا بە هەڵوەشانەوەی رژێمی پاشایەتیی فەڕەنساو دامەزرانی حکومەتی کۆماری لەو وڵاتەدا، دەگوترا(١٧٩٥_ ١٧٨٩).

لە ساڵی ١٧٨٩ەوە ئەم زاراوەیە لە مێژووی ئەمەریکادا بە کۆتاییهێنان بە سەروەریی بەریتانیا لەو وڵاتە بە هۆی "شەڕە سەربەخۆیی خوازەکان"ەوە (١٧٨١-١٧٧٥) دەگوترێ.

جۆرەکانی شۆڕش : بە هەڵسەنگاندنی مێژووی شۆرشەکان، بەمەبەستی ناسینی شێوازەکانی شۆڕش، دەکرێ شۆڕشەکان بە سەر دوو گرووپی "شۆڕشە کلاسیکیەکان" و" شۆڕشە مۆدێرنەکان" دابەش بکەن.

١_شۆڕشی کلاسیک: بریتیە لە: کەڵک وەرگرتن لە هێزی زۆر بۆ پیادەکردنی توندوتیژی بەتەمای پێکهێنانی گۆڕانکارییە بنەڕتیەکان لە سیستەمی حکومەتیی کۆمەڵگایەکدا بە مەبەستی پێکهێنانی سیستەمێکی پشت بەستوو بە دەستووری جیاواز، یان بەگشتی پێکهێنانی سیستەمێکی دیکەی حکومەتی. شۆڕش "گۆڕانکارییەکی چۆنایەتی و بنەڕەتیە، وەرچەرخانێکی مەزنە لە

ژیانی کۆمەڵگادا". هەوەها شۆڕش بە " رووخاندنی سیستەمێکی کۆمەڵایەتیی کۆن و داتەپیو و جێگرکردنی سیستەمێکی نوێ و پێشکەوتوو" دەگوترێ.

شۆڕشی مەزنی فەڕەنسا: کە دوو سەد ساڵ بەرلە ئێستا رووی داوەو، "شۆڕشیکی بورژوایی" بوو کە سیستەمی فیۆدالیی کۆن و رەمزی ئەو سیستەمە، واتا رژێمی پاشایەتی بۆڕبۆنەکانی لە نێو بردو، سیستەمی سەرمایەداری لە جیگای دانا.

شۆرشی ئۆکتۆبەر: شۆڕشێکی کۆمەڵایەتی بوو و، سیستەمی کۆن ورزیوی فیۆدالی و سەرمایەداریی رووسیای لەبەر لە یەک هەڵوەشاند.

لە شۆڕشە کلاسیکەکاندا دەسەڵات لە چینی دەسەڵاتداری پێشوو بۆ چین یان چینە پێشرەوەکان دەگوازرێتەوە، ئەگەر چینێکی کۆنەپەرەست بیهەوێ چینی پێشکەوتنخواز سەرکوت بکا و خۆی بە دەسەڵات بگا، ئەوا بەو چینە دەڵێین " دژە شۆڕش".

٢ـ شۆڕشی مۆدێرن: بریتیە لە پێکهێنانی ریفۆرمە سەرەکیەکان لە بوارە ئابووری، کۆمەڵایەتی، کولتووری ، راهێنان و پەروەردە و ئیداری و سیاسیەکان، بە کەڵک وەرگرتن لە شێوازە زانستی و تەکنەلۆژییەکان.

تایبەتمەندییەکانی شۆڕش: بەسەرنجدان بەو پێناسانەی سەرەوە، دەکرێ بەو دەرەنجامە بگەین کە ئەو گۆڕانکاری و جێ گۆڕکێ بەردەوامانەی کە ئەمڕۆکە لە هێندێک لە کۆمەڵگاکان دا دێنە ئاراوەو و دبنە هۆی جێگۆڕکێ لە دەستەی بەڕێوەبەریی وڵاتدا، ناکرێ بە شۆڕش ناو بەرین، مەگەر ئەوی کە بە دوای ئەو جێگۆڕکێیانەدا گۆڕانکاری و ئاڵوگۆڕی بنەڕەتی لە پێکهاتەی" پەیمانی کۆمەڵایەتی " و"سیستەمی کۆمەڵایەتی" ئەو وڵاتانەدا رووبدا. یەکێک لە تایبەتمەندییە سەرەکی و بەرچاوەکانی شۆڕش ئەویە کە شۆڕش دەبێ ئامانجی درێژماوەی بە مەبەستی پێکهێنانی ئاڵوگۆڕ و گۆڕانکاری بنەڕەتی هەبێ. کەچی ئەم تایبەتمەندییە لەو ئاڵوگۆڕەی کە لە دوای کودەتایەکی سەربازی دێتە ئاراوە،بەرچاو ناکەوێ. یەکێکی تر لە تایبەتمەندییەکانی شۆڕش، بەشداریی بەرفراوان و هەمەلایەنەی چین وتوێژە جۆراوجۆرەکانی خەڵکە. شۆڕش، هیچ خاڵێکی هاوبەشی لەگەڵ "کودەتا" و"شۆڕشی دەربارەی"دا نیە، کە زۆرجار لە مێژوودا روویانداوە.

بەگشتی ئەو بزووتنەوانەی کە سەرکردەکانیان بانگەشەی ئەوە دەکەن کە لە پێناوی پاراستنی بەرژەوەندییە نەتەوەییەکان و لەدژی سیستەمە گەندەڵەکان بووە و، چەمکگەلی وەک

ئازادی، دادپەروەریی کۆمەڵایەتی و پەرەپێدانی ئابووری و ...... هتدیان کردووە بە دروشمی خۆیان، ناکرێ تەنیا بە هۆی بوونی ئامانج و دروشمە شۆڕشگێری و ئایدۆلۆژییەکانیان بە بزووتنەوەی شۆڕشگێری ناوبەرێن. بەڵکوو دەبێ سەرکەوتن یان سەرنەکەوتنی ئەوان لە بەجێ گەیاندنی ئامانجەکانیان لەبەر چاو بگرین. مێژووی هاوچەرخ دەریخستووە کە پێوەری راستەقینەی هەڵسەنگاندنی بزووتنەوەی شۆڕشگێری یان تەنانەت هەبوونەکەی وەک شۆڕشێک ، رادە و رێژەی گونجانی ئاڵوگۆڕ پێکهاتووەکان لەگەڵ ئامانجە راگەیەنراوەکانی ئەو بزووتنەوە دایە.

تیۆرەکانی شۆڕش: بەگشتی ئەمڕۆکە چوار روانگە سەبارەت بە شۆڕش لە ئارا دایە کە لە زۆر لایەندا،خاڵی هاوبەشیان پێکەوە هەیە. یەکەمیان لەسەر بنەمای ئابووری دامەزراوە؛ شۆڕشی لە سەر بنەمای ئابووری، لە پلەی یەکەمدا دیاردەیەکی کۆمەڵایەتیە. واتای شۆڕشی لە سەر بنەمای ئابووری لەو رستەیەدا کورت دەبێتەوە کە لە هەر قۆناغێکی پێشکەوتندا هەلی لەبار بۆ چوونەسەری ئاستی داواکاری پێک دێ و، چوونکە حکومەت توانایی دەستەبەرکردنی داواکارییەکانی نیە، شۆڕش سەرهەڵدەدا. واتا و نێوەرۆکی شۆڕش لەسەر بنەمای ئابووری، سەرهەڵدانی شۆڕش بە هۆی چوونە سەری ئاستی داواکارییەکانەو، کەمتر ئاماژە بە سیاسەت دەکا. روانگە یان تیۆری دووهەم پێیوایە کە شۆڕش لە راستیدا دیاردەیەکی کۆمەڵایەتیە. بەڵام دیاردەیەکە کە لە ئەنجامی کەمتەرخەمیی کۆمەڵ لە دەستەبەرکردنی ئەو پێداویستیانەی کە دەبێ بۆ ئەندامانی خۆی دابینیان بکا، سەرهەڵدەدا.

لە روانگەی چارلز جانسۆن لە کتێبی بە ناوبانگی "شۆڕش و سیستەمی کۆمەڵایەتی"دا، شۆڕشی کۆمەڵایەتی، شەش جۆری هەیە کە بریتین لە: "شۆڕشی جووتیاران، شۆڕشی هەزار ساڵە، راپەڕینی ئانارشیستی، شۆڕشی کۆمۆنیستی، کودەتا لە رێگای پیلان و راپەڕینی سەربازی. لەم پۆلێن بەندییەدا لە روانگەی تیۆرییەوە، تیۆرێکی پتەو نیە و چەندین کەم و کورتی تێدایە. چینە جۆراوجۆرەکانی ئەم پۆلێن بەندیە بەشێوەیەکی روون پێوەندی بە نموونەی هۆکارە کۆمەڵایەتیە ئاماژە پێکراوەکانەوە نیە و، لەو چوارچێوەیەی کە خراوەتە ڕوو، لە نێوان چینەکاندا کەلێن و بۆشایی هەیە. تیۆری سێهەم ئەوەیە کە شۆڕش دیاردەیەکە کە لە هەستی لە خۆنامۆبوونی تاک بەرامبەر بە کۆمەڵ سەرهەڵدەدا. ئەم تیۆرە بۆ یەکەم جار لە لایان تالکۆت پارسۆنزەوە خرایە ڕوو.سێهەم ئەوەیەکە شۆڕش دیاردەیەکە کە لە هەستی لەخۆنامۆبوونی تاک بەرامبەر بە کۆمەڵ

سەرهەڵدادا. ئەم تیۆرە بۆ یەکەم جار لە لایان تالکۆت پارسۆنزەوە خرایە ڕوو. تیۆری چوارەم پشت بە نەریتەکانی ئەرەستۆیی، ماکیاڤێلی و "لۆک" دەبەستێ، کە شۆڕش بەدیارەیەکی سیاسی ناو دەبەن و، ئامانجەکەی بەگواستەوەی دەسەڵاتی سیاسی لەقەڵەم دەدەن. بە بڕوای ئەوان، هەموو بوارەکانی تر پێوەندییان بەم هۆکارە سەرکیەوە هەیە. چوونکە بەبێ گۆڕانکاری سیاسی، گۆڕانکارییە ئابووری، کۆمەڵایەتی و دەروونیەکان ناتوانن بە هیچ شێوەیەک شۆڕشێک بن.

شۆڕش لە ڕوانگەی بیرمەندانەوە:

تۆماس پین: " ئەوەی کە ئێمە لە ڕابردوودا بە شۆڕش ناومان دەبرد، شتێک نەبوو جگە لە گۆڕینی کەسەکان یان ئاڵ وگۆڕی هەلومەرجی نێوخۆیی . ئەم ڕووداوەش وەک هەموو ڕووداوەکانی تر سەری هەڵدەداو، ڕۆژێکیش کۆتایی پێ دەهات و، نێوەرۆک و شتێکی ئەوتۆیان لە هەگبەدا نەبوو کە بتوانن تەشەنە بکەنە ئەودیوی سنوورەکانی خۆیان. هەر بۆیە ئەوەی کە ئەمرۆ لەشۆڕشەکانی ئەمەریکا و فەڕەنسا لە دنیادا بە چاوی خۆمان دەیبینین، شێوازێکی نوێی نەزمی سروشتیی شتەکانە. سیستەمێکی تێکەڵاوە کە لە بنەما گشتی و ڕاستەقینەکانی بوونی مرۆڤ و لەئامانجە ڕەوشتی و سیاسیەکان و سەروەریی نەتەوەیی پێکهاتووە".

جیوسپی مازینی: سەرکردەی نەتەوەیی ئیتالیا و ناسیۆنالیستی بە ناوبانگی ئەو وڵاتە:

" شۆڕشی فەڕەنسا تەنیا پلانێکی ڕووت نەبوو، بەڵکوو بەدەرەنجام و دەسکەوتێک بوو. شۆڕشی فەڕەنسا سەرەتای چاخێکی نوێ نەبوو، بەڵکوو دوایین دیاردەی وەرزێکی تێپەڕبوو".

مارکس و ئەنگێلز: لە ساڵی ١٨٤٨ مارکس بۆ یەکەمین جار لەگەڵ ئەنگڵیز بیروباوەڕە شۆڕشگێڕییە مارکسیەکانی خۆی لە مانیفێستی کۆمۆنیستدا بڵاو کردەوە.

مارکس لە تیۆرەکانی خۆیدا پێشبینی ئەوەی دەکرد کە هیچ شۆڕشیکی نوێ ڕوو نادا، مەگەر ئەوەی کە قەیرانێکی ئابووری دیکە ڕوو بدات". بەڵام دوو ساڵ دواتر، بە ناچار خوێندنەوەیەکی دیکەی هەبوو؛ چوونکە ڕووخانی یەکەمین کۆماری فەڕەنسا نیشانی دا کە بە پێچەوانەی ڕای ناوبراو و کە پێیوابوو سەرهەڵدانی شۆڕش لە دەرەوەی چوارچێوەی قەیرانی ئابووریدا، شتێکی ئەستەمە، بەڵام ڕووخانی کۆماری فەڕەنسا، لەبەر هۆکاری ئابووری نەبوو. مارکس و ئەنگێلز بایەخێکی زۆریان بە هێزە ماددییەکان لە سەرکەوتنی شۆڕش دەدا. بە

سەرنجدان به کودەتای بوناپارتیستەکان، مارکس پێیوابوو کە، "بۆ دامەزراندنی دیکتاتۆریی پرۆلتاریا، دەبێ تاکەکەس لە سەرەتاوە سیستەمی سەربازی و بیرۆکراتیی پێشوو لە نێو بەرێ".

مارکس بانگەشە بۆ ئەوە ناکا کە ئەو داریژەرو دامەزرێنەری تیۆری شۆڕش وەک ئامرازێک بۆ گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتیەکانە. ناوبراو لە ساڵی ١٨٥٢دا نووسی: " ئەوەی کە ئەمن کردوومە، سەلماندنی ئەوسێ خاڵە بووە: خاڵی یەکەم ئەوەی کە بوونی چینی کۆمەڵایەتی تەنیا پێوەندی بە قۆناغە مێژوویيە تایبەتیەکان لە پەرەپێدانی بەرهەمهێنان هەیە و؛ دووهەم ئەوەی کە، ململانێی چینایەتی بە دیکتاتۆریی پرۆلتاریا کۆتایی دێ و؛ سێهەم ئەوەی کە، ئەم دیکتاتۆرییە خۆی دەبێتە هۆکاری سرینەوەی هەموو چینەکان و، گۆڕینی کۆمەڵگا بۆ کۆمەڵگایەکی بێ چینی کۆمەڵایەتی...".

روانگەی مارکس سەبارەت بە شۆڕش زیاتر بەرهەمی ئەو سەردەمە بوو کە تێیدا دەژیا. چوونکە لە هیچ سەردەمێکدا ئەو هەمووە بزووتنەوە شۆڕشگێڕییانە بۆ تاوتوێکردن و لێکۆڵینەوە لە ئارادا نەبوون. ژمارەی ئەو جۆرە بزووتنەوانە لە وڵاتە بچووکەکانی ئەورووپا لە ساڵەکانی ١٨٤٨_٤٩دا، بە زیاتر لە پەنجا بزووتنەوە خەملێندراوە.

تێزەکانی لنین سەبارەت بە شۆڕشی سۆسیالیستی: لە حاڵێکدا کە مارکس و ئەنگێلز شۆڕشیان بە هەلومەرجێکی دیاریکراوی ئابووری و کۆمەڵایەتی دەبەستەوە و بەچەندین جار ئاماژەیان بە رێگاچارە ئاشتیخوازانەکانی کۆمەڵگا کردووە، بەڵام لنین شۆڕشێکی سەرکەوتووی سۆسیالیستیی تەنیا بە هەلومەرجی لەباری سیاسی دەبەستەوەو، لە سەر شۆڕشی توندوتیژانە لە رێگای راپەڕینی چەکدارانەی پێی دادەگرت. بە بڕوای ناوبراو، سەرکردایەتیی ئەو شۆڕشە دەبوایە حیزبێک بە ئەستۆی بگرێ کە هیچکات مارکس و ئەنگێلز باسیان نەکردبوو.

**جۆرج سانتایانا، فەیلەسۆفی هاوچەرخ:** " شۆڕشەکان رووداوی پڕ لە هێنین و، سەرکەوتنی هەر شۆڕشێک بەگشتی پێوەندی راستەوخۆی هەیە بە رادەی دەسەڵاتی ئەو شۆڕشە لەگەڵ گونجاندن و، پێکهێنانی ئەلتەرناتیڤێک لە بەرامبەر ئەو شتەدا کە شۆڕش و راپەڕین لە دژی ئەو شتە، وەرێخراوە. هەزران بزووتنەوەی چاکسازی جیهانیان وەک خۆی بەگەندەڵی و وێرانیی جاران هێشتۆتەوە، چووونکە هەر ریفۆرم و گۆڕانکارییەکی سەرکەوتوو بارودۆخێکی نوێی پێکهێناوە و، ئەم بارودۆخە نوێیەش، کەڵکێکی نابەجێی هێناوەتە ئاراوە کە لەگەڵ خۆیدا دەگونجێ.

**هارۆلد لاسۆل**، مامۆستای زانستە رامیارییەکان: "شۆڕش بەمانای گۆڕانێکی لە ناکاو لە پێکهاتەی چینی دەسەڵاتدارە و، شۆڕشی جیهانی گۆڕانکاریی لە ناکاو لە کولتوور و چەمک و زاروەکانی چینی باڵادەستی لێدەکەوێتەوە. شۆرشی رووسیا لەگەڵ شۆرشی ئەڵمانیا و شۆڕشی ئیتالیای سەردەمی فاشیزمدا هەرسێکیان یەک جۆر بوونەو، ئامانجی هەرسێکیان یەک شت بووە".

**رابێرت مەک ئایۆر**، مامۆستای فەلسەفەی سیاسی و کۆمەڵناسی: " ئەگەر بنەمای نەریتەکان و بیروڕا و دابە کۆمەڵایەتیەکان لاواز و لەرزۆک بن و لە نێو بچن و زنجیرە نەریت و دابی نوێ جێگای کۆنەکانی پڕ نەکردبێتەوە، شۆڕش سەرهەڵدەدا."

لە روانگەی ناوبراوەوە، شۆڕش جۆری جیاوازی هەیە وەک: "شۆڕشی نەتەوەیی، شۆڕشی چینایەتی، شۆڕشی پیشەسازی و شۆڕشی کۆمەڵایەتی".

مەک ئایۆر شۆڕشی نەتەوەیی بە شۆڕشێک دادەنێ کە خەڵک لەو رێگایەوە حکومەتێک کە بە بیانی و دوژمنی خۆیانی دەزانن، دەڕووخێنن. ناوبراو ئەمجۆرە شۆڕشە بە" بزوتنەوەی سەربەخۆیی خوازانە" ناودەبا. ناوبراو ئەو شۆرشانەی کە بوون بە هۆی رووخانی سیستەمی پاشایەتی و، هاتنەسەر دەسەڵاتی کەسانی نێوخۆیی ؛ هەروەها ئەو شۆڕشانەی کە بوون بە هۆی لێک هەڵوەشانەوەی ئیمپراتۆرییەکان و، جیابوونەوەی چەند بەشێک لە کۆلۆنیەکان؛ بە شۆرشی نەتەوەیی یان دەزانێ و، لەسەر ئەو باوەڕەیە کە شۆڕشی لەو چەشنە (لەگەڵ ئەگەری سەرکەوتن) رێگا بۆ پەرەگرتنی ناسیۆنالیزم خۆش دەکەن.

مەک ئایۆر پێیوایە کە شۆڕشی چینایەتی دەرەنجامی کەلێنی نێوان چینی باڵا دەست و چینە هەژار و بێ بەشەکانە و، ئەم شۆڕشە بە ئامرازێک دەزانێ کە چینە هەژارەکان بۆ رزگاربوون لە بارودۆخی نالەباری کۆمەڵایەتی، کەڵکی لێ وەردەگرن.

### *هۆکارەکانی شۆڕش*

بە بڕوای ئەرەستۆ، هۆکارەکانی شۆڕش دوو بەشن: گشتی و تایبەتی. هۆکارە گشتییەکان لە هەموو حکومەتەکاندا دەبنە هۆی سەرهەڵدانی شۆڕش، ئەوە لە حاڵێک دایە کە هۆکارە تایبەتیەکان تەنیا لە سیستەمە سیاسیە تایبەتیەکاندا دەبنە هۆی سەرهەڵدانی شۆڕش. گرنگترین هۆکاری گشتیی شۆڕش، نایەکسانیە. هۆکارێکی تر، بەرژەوەندی خوازی و سەرەڕۆیی دەسەڵاتدارانە، زۆرجار خەڵک نەک تەنیا لە دژی دەسەڵاتداران، بەڵکوو لە دژی رێکخراوەکان و

ئەو یاسایانەش کە ئەوانی بە دەسەڵات گەیاندووە، رادەپەڕن. ترس و بە تایبەتی ترس دوو تاقم، واتە تاقمی تاوانباران کە لە سزادان دەترسن و، تاقمی دووهەم ئەو کەسانەی کە لەوە دەترسن زوڵمێکیان لێ بکرێ و،بەر لەوەی ستەمیان لێ بکرێ، پێشی پێ دەگرن. بەرفراوانی لە رادەبەدەری بەشێک لە پێکهاتەی حکومەتیش بە یەکێک لە هۆکارەکانی شۆڕش دەژمێردرێ.

جیاوازی رەگەزی، یەکێکی تر لە هۆکارەکانی شۆڕشە. زۆربەی ئەو وڵاتانەی کە بێگانەکانیان ـ چ لە کاتی دامەزراندنی دەوڵەتەکەیان و چ پاش ئەمە ـ لە وڵاتی خۆیاندا جێ کردۆتەوە، دواتر تووشی بشێوی و ئاڵۆزی دەبن". ئەرەستۆ رایگەیاند ئەوەی کە بە ڕاستی دەبێتە هۆی روودانی شۆڕش، جیاوازیی چینایەتی ونارەزایەتی خەڵک لە هاڵاواردن و نایەکسانیە.

ئەرەستۆ بەپێی هەلومەرجی شۆڕشەکان، لە سیستەمە سیاسیە جیاوازەکاندا، بەجیا باسی هۆکارەکانی سەرهەڵدانی شۆڕشەکان دەکا. بە بڕوای ناوبراو، هۆکاری شۆڕش لە سیستەمی دیموکراسیدا، هاتنە سەرکار و بەدەسەڵات گەیشتنی سەرکردە خەڵک خەڵەتێنەکان و پێشێلکردنی مافی چینە باڵادەستەکانە؛ لە ئەریستۆکراسیدا بە هۆی ئەوەی کە خەڵک خۆیان بە هاوشانی ئەو کەسانە دەزانن کە بەدەسەڵات گەیشتوون، لە دژی دەسەڵاتدارەکان رادەپەڕن و؛ لە رژێمە ئۆلیگاریشیەکاندا بە هۆی زوڵم و چەوساندنەوەی هەژاران لە لایەن کاربەدەستانەوە، شۆڕش سەهەڵدەدا، بەڵام لێرەشدا رەنگە هۆکاری شۆڕش هەڵاواردن لە نێو چینێکدا بێ و، ئەویش ئەوکاتەیە کە "هێندێک لە کاربەدەستانی حکومەت لەگەڵ کەسانێکی مەزن کە هاوشانی خۆیانن، بە خراپی دەجوڵێنەوە ... [یان لە نێو] کۆمەڵی کەسە شیاو و لێهاتووەکاندا، تاقمێک لەوپەڕی بەختەوەری و تاقمێکیش لەو پەڕی هەژارییدا دەژین".

لە ئاکامدا گرنگترین هۆکارەکانی شۆڕش لە سیستەمی پاشایەتیدا، زوڵمی شا و ئیرەیی بردنی خەڵک بە هێزو گەورەیی ناوبراو، رق و تۆڵەی ئەو کەسانەیە کە لە دەست پاشاوە زەبریان وێ کەوتووە. زۆر جار سەرچاوەی شۆڕش دەگەڕێتەوە بۆ گۆڕانکارییە نێوخۆییەکانی وڵات و هێندێک جاریش دەگەڕێتەوە بۆ دەستێوەردان و ئاژاوەگێڕی بیانیەکان. ئامانجی سەرکردەکانی شۆڕشیش هێندێک جار گۆڕینی سیستەمی دەسەڵاتە؛ بۆوێنە بیانهەوێ شێوەی حکومەت لە دیمۆکراسیەوە بگۆڕن و بیکەن بە ئۆلیگاریشی و، هەروەها هێندێک جار بە مەبەستی گۆڕینی

دەسەڵاتدارانە؛ واتە سەرکردەکانی شۆڕش بەبێ ئەوەی بیانەوێ سیستەم بگۆڕن یان زیانێک بە ڕێکخراوەکانی حکومەت بگەیەنن، دەیانەوێ خۆیان دەسەڵات بە دەستەوە بگرن.

ئەرەستۆ بۆ پێشگیری لە سەرهەڵدانی شۆڕش بەم شێوە حکومەتەکان ئامۆژگاری دەکا:

یەکەم ئەوەی کە شێوازی پەروەردەی تاکەکان بەپێی سیستەمی سیاسیی وڵات بێ. کەوایە ئەگەر شێوازی حکومەت دیمۆکراسیە، دەبێ خەڵک بەپێی یاساکانی دیمۆکراسی پەروەردە بکرێن و، ئەگەر ئۆلیگاریشیە، دەبێ بەپێی یاساکانی ئۆلیگاریشی ڕابهێنرێن. بەپێی بۆچوونی ئەرەستۆ ، ئەگەر شێوازی ژیانی خەڵک لەگەڵ شێوازی حکومەتەکەیاندا ناتەبا بێ، تەنانەت باشترین یاساکانیش،لەسەر باشترکردنی هەلومەرجی حکومەتدا، کاریگەر نین. دووهەم ئەوەی کە دەبێ دەوڵەتەکان خۆیان لە هەر جۆرە کارێکی نایاسایی ببوێرن و نەهێڵن خەڵکیش کاری نایاسایی بکەن، بە تایبەتی هەر لە سەرەتاوە لە کارێکی بچووکی نایاسایی خۆش نەبن و تاوانبار سزا بدەن، چوونکە هەر وەک چۆن نرخە کەمەکان لە ئاکامدا سامانە گەورەکان لە نێو دەبەن، لادانە چکۆلەکانیش لە یاسا، وڵات بەرەو نەمان پەلکێش دەکەن. سێهەم ئەوەی کە چوونکە هەڕەشە و مەترسی دەبنە هۆی ئەوەی کە خەڵک سەبارەت بە ئاسایشی وڵات و پاراستنی حکومەت بەپەرۆش بن و خەڵک وریا دەبنەوە، دەبێ دەوڵەتەکان جارجارە بە درۆ باسی هەرەشەو مەترسییەکان لە داهاتوودا بکەن، یان وابنوێنن کە هەرەشەو مەترسی لێییان نزیکە، بۆئەوەی خەڵک ئامادە و وشیاربن. چوارم ئەوەی کە دەبێ پێش بە دووبەرکی و ناکۆکی دەسەڵاتداران بگرن، یان لانیکەم بێگانەکان لەو کێشەو ناکۆکیانە ئاگادار نەبن. ڕێگاچارەکانی تر بریتین لە : پاراستنی سیستەمی دارو و ئابووری، پێشگیریکردن لە ئۆتۆریتەی لە ڕادەبەدەری بەرپرسانی ئیداری، قەناعەتی دەسەڵاتداران، پێشگرتن بە دزیکردن لە سامانی گشتی، پارێزگاریکردن لە مافی دەوڵەمەند و هەژاران.

### *هۆکارو پاڵنەرەکانی شۆڕش لە سەدەکانی هاوچەرخدا*

سەرچاوەی شۆڕشەکانی جیهان لە سەدە هاوچەرخەکاندا دەگەڕێنەوە بۆ شەڕ، کۆلۆنیالیزم و چەوساندنەوە و نارەزایەتیی گشتی.

### ڕوودانی شەڕ

واپێداچێ کە شەڕ هۆکارێکی گرنگ بێ کە بواری لەباری بۆ سەرهەڵدانی شۆڕش ڕەخساندبێ. زۆربەی شۆڕشە سەکەوتوو و ناسەرکەوتووەکان لە دوای شەڕ ڕوویان داوە. بۆوێنە دەکرێ ئاماژە بە شۆڕشی کۆمۆنی پاریس لە ساڵی ١٨٧١، شۆڕشی ڕووسیا لە ساڵی ١٩٠٥، شۆڕشی یۆگۆسلاڤیا لە ساڵی ١٩٤٥ و شۆڕشی چین لە ساڵی ١٩٤٩دا بکەین. هەروەها، ڕوودانی شەڕ دەبێتە هۆی ئەوەی کە ڕژێمە شۆڕشگێرە ساواکان زیاتر خۆ بگرن.

### شوورەی ئەمەریکا **Fortress America**

بە پێی ئەم تیۆرە ( کە لەو سەردەمەدا باوو بوو کە ئێستا ئەمەریکا، خۆی لە شەڕی دووهەمی جیهانی هەڵنەقرتاندبوو) ویلایەتە یەکگرتووەکان دەبوایە لە دستێوەردان لە کاروباری سیاسەتی نێونەتەوەیی دەرەوەی نێوەگۆی ڕۆژئاوا خۆ ببۆیرێ و، پشت بە دوورەپەرێزی و چەک و چۆڵی بەهێز ببەستێ، بۆ ئەوەی لە شەڕ نەگلێ.

### کۆلۆنیالیزم و چەوساندنەوە

بزووتنەوە شۆڕشگێڕییەکان لە ئاسیا، ئەفریقیا و ئەمەریکای لاتیندا زیاتر بە مەبەستی ڕزگاربوون لە کۆت وبەندی کۆلۆنیالیزم و چەوساندنەوە سەریان هەڵداوە. ئامانجی ئەو شۆڕشانە ئەوەیە کە، بەسەرنجدان بەوەی کە مافە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکانی چینەکانی کۆمەڵگا لە لایەن هێزە بیانیەکانەوە پێشێل دەکرێن، دەبێ هێزە کۆلۆنیالیست و چەوسێنەرەکان تێک بشکێن و، حکومەتی بەکرێگیراوی ئەوان لە نێوخۆی کۆمەڵگادا بروخێنن.

### نارەزایەتی گشتی

ناڵێهاتوویی، لاوازی، گەندەڵی و سەرنج نەدانی دەستەی بەڕێوەبەریی دەسەڵات بە دابینکردنی پێویستیە سەرەکی و بنەڕەتیەکانی خەڵک، یەکێکی تر لە بوارەکانی شۆڕشە، کە لە هێندێک بواردا دەبێتە هۆی پێکهاتنی ناڕەزایەتیی خەڵک و، لە ئاکامدا، ئایدیا شۆڕشگێڕییەکان لە نێو چینە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵگادا سەر هەڵدەدەن. لەو پێوەندییەدا دەبێ ئاماژە بە دوو حاڵی گرنگ بکەین.

الف _ گەندەڵی و پاوانخوازی لە ڕادەبەدەری سیستەمێکی حکومەتی ناتوانێ بە تەنیا ببێتە هۆی سەرهەڵدانی بزوتنەوەیەکی شۆڕشگێڕی، چوونکە تەنانەت لەم سەردەمەشدا حکومەتی لەو چەشنەمان هەیە بەبێ ئەوەی کە تووشی هەڕەشەی شۆڕش بووبنەوە. هەر بۆیە ئەگەر ئەمجۆرە حکومەتانە ڕووبەڕووی شۆڕش بوونەتەوە بەو هۆیەیە کە بەڕێوبەرەکانی متمانەیان بەخۆ نەماوە. بۆ بەهێزکردنی بنەماکانی دەسەلاتی خۆیان، خەڵک بەرتەسک دەکەنەوە، یان چەند ریفۆرمێکی ڕواڵەتیان جێبەجێ کردووە کە لە درێژماوەدا نەک تەنیا نەبۆتە هۆی ڕازیبوونی خەڵک، بەڵکوو گروتینیشی بە بزووتنەوەی شۆڕشگێڕی داوە.

ب_ لەو کۆمەڵگایانەی کە نارەزایەتی گشتی بۆتە هۆکار و پاڵنەری شۆڕش، بزووتنەوە شۆڕشگێڕیەکان لە درێژماوەدا پێکهاتوون. شۆڕشەکانی ڕۆمی کۆن، فەڕەنسا و ڕووسیا کە دەرنجام و بەرهەمی نارەزایەتی گشتی بوون، لە ماوەیەکی دووروودرێژدا دەستیان پێ کردووە وخۆیان گرتووە و بە هێز بوون و، پاشان لە ژێر ڕێنوێنی سەرکردە شۆڕشگێرەکان، سەریان هەڵداوە. ئەو بزووتنەوە شۆڕشگێڕیانەی کە بەپێی ئەو هۆکارو پاڵنەرانەی سەرەوە سەریان هەڵداوە (شۆڕشە کلاسیکەکان)، بوونەتە هۆی پێکهاتنی ئەم دوو شێوازەی خوارەوە:

١_ڕووخاندنی ئەو حکومەتەی کە ئێستا لەسەر کارە و، لەجێدانانی سیستەمێکی حکومەتیی دیکە کە بە بڕوای سەرکردەکانی شۆڕش بە باشترین شێوازی حکوومەتی ناسراوە.

٢-هێندێک لە بزووتنەوە بەڕواڵەت شۆڕشگێرەکان کە لە دوای ڕووخانی ڕژێمی پێشوو بە دەسەلات دەگەن بە کردووە ئامانج شۆڕشگێڕانەکانیان وەلادەنێن و، لە ڕاستیدا هەمان ئامانجەکانی ڕژێمی پێشوو لە چوارچێوەی ڕێکخراو و دەستەیەکی بەڕێوبەریی نوێدا بەڕێوە دەبن.

### شۆڕشی گۆرباچۆف (شوباتی ١٩٩٠) Gorbachevs ١٩٩٠ Revolution

زاراوەیەکە بە گەلاڵەی گۆرباچۆف، سەرۆک کۆماری سۆڤیەت دەگوترێ کە بەپێی ئەو گەلاڵەیە کۆمیتەی ناوەندی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەت لە کۆبوونەوەی پێنجەمی شوباتی ١٩٩٠دا، بڕیارێکی دەرکرد کە شۆڕشێکی سیاسی لێ کەوتەوە. بەپێی بڕیاری ناوبراو، بڕگەی شەشی دەستووری یەکیەتیی سۆڤیەت کە پێداگری لەسەر ڕۆڵی حیزبی کۆمۆنیست وەک

"پێشەنگ" دەکردەوە، لەو یاسایە سڕایەوە و، بە جێگای ئەو، پێشنیاری پرۆسەی بە دیمۆکراتیزەکردن لە چوارچێوەی سیستەمێکی فرەحیزبی دا هاتە ئاراوە.

ماددەی شەشی دەستوور دیاری کرد بوو کە: " حیزبی کۆمۆنیست، هێزی سەرکردایەتی و ئاراستەدەری کۆمەڵگای سۆڤیەت و ناوەندی سیستەمی سیاسی و ریکخراوە دەوڵەتی وکۆمەڵایەتیەکانی یەکیەتیی سۆڤیەتە. حیزبی کۆمۆنیست مانەوەی خۆی لە خزمەت بە خەڵکدا دەبینێ. حیزبی کۆمۆنیست پشت ئەستوورە بە راهێنانەکانی مارکسیزم ـ لنینیزم، ئاسۆی گشتی گەشەی کۆمەڵگا و ڕێبازی سیاسەتی نێوخۆ و دەرەوەی یەکیەتیی سۆڤیەت دەستنیشان دەکاو،سەرکردایەتیی پتەوی سۆڤیەتی لە ئەستۆدایەو، سیمایەکی هاوسەنگ و زانستی بە خەباتی ئەم خەڵکە لە پێناو سەرخستنی کۆمۆنیزم دەبەخشێ.

هەموو رێکخراوەحیزبیەکان لە چوارچێوەی دەستووری یەکیەتیی سۆڤیەتی سۆسیالیستیدا کاردەکەن".

هۆکاری سەرەکیی هێنانە گۆری ئەو پێشنیارە ئەوە بوو کە بەسەدان تاقمی سیاسی لە پانتایی خاکی سۆڤیەت پێکهاتبوون و یەکیان گرتبوو، کە لە ئاکامدا دەبووە هۆی سڕینەوەی رۆڵی حیزبی کۆمۆنیست لە کۆمەڵگای سۆڤیەتدا. ناڕەزایەتی گشتی، ئابووریی دارماو و چوونەسەری رێژەی تاوان بوو بە هۆی ئەوەی کە رق و بیزاری خەڵک بەرامبەر بە سەرکردەکانی حیزبی کۆمۆنیست تەشەنە بکا. هەر بۆیە سەرکردەکانی سۆڤیەت بریاریاندا لە چوارچێوەی بەرنامەی پرۆسترۆیکاو گلاسنۆستدا کۆتایی بە سەروەریی حیزبی کۆمۆنیست بێنن و، پیڕەوی لە سیستەمی فرە حیزبی بکەن.

## شەڕ *War*

ئەم زاراوە بە هەرجۆرە کردەیەکی زۆرەکی و توندوتیژانە دەگوترێ کە دەوڵەتێک بەرامبەر بە دەوڵەتێکی تر بەڕێوەی دەبا بۆ ئەوەی کە ئەو وڵاتە ناچار بکا مل بۆ ئیرادە و ویستی ئەو وڵاتە دانەوێنێ. بە بڕوای کلاوزڤیتز، تیۆری داڕێژی بەناوبانگ، "شەڕ درێژەی سیاسەتە بە کەرەسەیەکی تر".

له روانگەی کۆمەڵناسیەوە، شەڕ پێکهەڵپڕژانێکی توندو رەق و سیستماتیکە کە لە نێوان دوو یان چەند کۆمەڵی سەربەخۆ روو دەدا. لە کۆمەڵگا سەرەتاییەکاندا شەڕ لە هۆکاری وەک دەسکەوت و تالآن، ترس لە بێگانە، نیشاندانی هێز و توانایی و تۆڵە سەرچاوەی دەگرت، بەلآم لە کۆمەڵگاکانی ئیستادا شەڕ لە هۆکاری تیۆری و پراکتیکیی ئاڵۆزترەوە سەرچاوە دەگرێ. چۆنیەتیی شەڕ پێوەندیەکی زۆری بە ئاستی پیشەسازییەوە هەیە. شەڕ لە سەردەمی ئیستادا مەترسیەکی گەورەی بۆ سەر مرۆڤایەتی و شارستانیەتی جیهان پێکهێناوە.

چوونکە لە لایەکەوە چەکەکان توانایەکی تێکدارانەی سەرسوورهێنەریان پەیدا کردووەو، رەنگە شەڕە بچووکەکان ببن بە شەڕی نێوان چەندین دەوڵەتی جۆراوجۆر.

***تایبەتمەندییەکان***

١ــ شەڕ دەبێتە هۆی "پێکهەڵپڕژانی چەکداریی نێوان وڵاتان". بە پێچەوانەی شەڕی نێوخۆیی و هەروەها بە پێچەوانەی کردەوەی چەکدارانە لە بەرامبەر سەرهەڵداوەکان و بە دژی دز و رێگرەکان، شەڕ رووبەروو بوونەوە و تێکهەڵچوونی هێزە گشتیەکانی لێ دەکەوێتەوە. لەم بارودۆخەدا، شەڕ بە پێوەندیی وڵاتێک لەگەڵ وڵاتێکی تر شی دەکرێتەوە. بیرۆکەی شەڕ لە مێشکی بیرمەنداندا، بووێتە لە مێشکی ژان ژاک رۆسۆدا، گەلآڵە کرا و، رۆسۆ شەڕی پێناسە کرد. هەر وەک چۆن رۆسۆ لە کتێبی "پەیمانی کۆمەلآیەتی" (١٧٦٢) دا دەنووسێ:"بە هیچ شێوەیەک شەڕ پێوەندیی نێوان مرۆڤێک لەگەڵ مرۆڤێکی تر دانیە، ئەوە پێوەندیی وڵاتێک لەگەڵ وڵاتێکی تردایە. لەو پێوەندییەدا، تاکەکەسەکان تەنیا، بە شێوەیەکی لە ناکاو و، تەنیا وەک هاووڵاتی ــ نەک وەک مرۆڤ و، وەک زێرەڤان نەک وەک خاوەن نیشتمان، لەگەڵ تاکەکەسەکانی تر دا دەبن بە دوژمن".

٢ــ شەڕ " بەکەڵک وەرگرتن لەو ئامرازانەی کە بەپێی یاسا نێودەوڵەتیەکان رێک خراوە"، بەڕێوە دەچێ. بەم پێیە شەڕ واقعێکی سنووردارە کە لەگەڵ هەلآیسانی دا بەبێ هیچ جیاوازییەک کۆمەڵێک رێوشوێنی یاسایی دیاریکراو چ سەبارەت بە لایەنی شەڕ، چ سەبارەت بە لایەنی سێهەم (بێ لایەن)، دێنێتە ئاراوە. شەڕ لەم پێناسەدا بریتیە لە کردەوەیەکی یاسایی کەهەر وڵاتێک لە کاتی وەدیهێنانی مافی دوژمنایەتیکردندا بەڕێوەی دەبا.

٣ــ شەڕ بەمەبەستی سەپاندنی ئامانجێکی سیاسی، یان بەواتایەکی روونتر سەپاندنی "ئامانجێکی نیشتمانی"، بەڕێوە دەچێ. زانایانی ڕێبازی یاسا عەینیەکان، توخمی ئامانجی نیشتمانیان لە بەرچاو گرتووەو، شەڕ بە "پەنابردن بە هێزی ماددی بە مەبەستی گۆڕینی تەکووزی سەلاحییەتەکانی دەوڵەتێک لە کۆمەڵگای نێونەتەوەیی "دادەنێن ؛ چوونکە لە راستیدا هەرجۆرە کردەوەیەکی توندوتیژانە بەشەڕ دانانرێ. کاتێک ئەمە بەشەڕ دادەنرێ کە بەپێی ڕێسای ڕێککەوتنی کەلۆگ یان ڕێککەوتنی گشتیی خۆبواردن لە شەڕــ ڕێکەوتی ٢٧ی ئاب ١٩٢٨، وڵاتان لە کردەوەی توندوتیژانە "وەکوو ئامرازێکی سیاسەتی نیشتمانی " کەڵکییان وەرگرتبێ، بە پێچەوانە، پەنابردن بە هێزی زەۆرەکی یان توندوتیژانە کە بە مەبەستی ناچار کردنی بەکۆمەڵ و بەپێی داواکاری یان بەپێی بانگهێشتی کۆڵەکەیەک لە کۆڵەکە نێودەوڵەتیەکان بەڕێوە بچێ، بە شەڕ دانانرێ.

### قاچاغی شەڕ Coutraband

بەو کەرەسانە دەگوترێ کە وڵاتە بێلایەنەکان نابێ بیگەیەننە ئەو دەوڵەتانەی کە لەگەڵ یەکتردا بەشەڕ هاتوون. هەرکام لە لایەنەکانی شەڕ، دەتوانن پاپۆڕی وڵاتانی بێلایەن بەمەبەستی دۆزینەوەی کەرەسە قەدەغەکراوەکان بپشکنن.

لە سەرەتادا قاچاغ تەنیا چەک و چۆڵ و تەقەمەنی و ئامرازەکانی شەڕی دەگرتەوە. پاشان ئەسپ و وڵاخە بارهەڵگرەکانیشی گرتەوە، چونکە بۆ هێزی سوارەو تۆپخانە و هەروەها بۆ راگواستنی چەک وچۆڵی سەربازی کەڵکیان لێ وەردەگیرا.

### شەڕ، کەرەسە قەدەغەکراوەکان Prohibited Weapons In Warfare

دەوڵەتە دوژمنەکان لە کەڵک وەرگرتن لە ئامرازە ئازاردەرەکان دەسەڵاتێکی سنووردارییان هەیە و دەستیان ئاوالآ نیە. لەم پێوەندییەدا یاسایەکی گرنگ و متمانەدار (ماددەی بیست و دووی کۆنفانسیۆنی لاهەی ١٩٠٧) دانراوە کە بەپێی ئەو یاسایە کەڵک وەرگرتن لە ئامرازە دڕندەکان قەدەغە کراوە. مەبەست لە ئامرازی دڕندانە ئەو ئامرازانەی شەڕە کە دەبنە هۆی سەرئێشەو بێزارکردنی خەڵک، بەم پێیە ئەم ئامرازانەی خوارەوە قەدەغە کراون:

١ــ فیشەکی گڕدار؛ بەپێی ڕاگەیەنراوی سەن پیترزبۆرگ لە ڕێکەوتی ١٨٦٨/١١/١١ قەدەغەکراوە.

٢ــفیشەکی پەخشان؛ کەڵک وەرگرتن لەم فیشەکانە کە لە نێو جەستەی مرۆڤدا بڵاو دەبنەوە، بەپێی ڕاگەیەنراوی ٢٩ی تەمموزی ١٨٩٩ قەدەغە کراوە.

٣ــ گازە خنکێنەرو ژەهراوییەکان؛ کە بەپێی ڕاگەیەنراوی شەڕی یەکەمی جیهانی لە لایەن هێزەکانی ئەڵمانیاوە کەڵکی لێ وەرگیراو، دواییش لەلایەن هێزە یەکگرتووەکانەوە کەڵکی لێ وەرگیرا. کەڵک وەرگرتن لە گاز لەسەردەمی ئێستادا بەپێی ڕێوشوێنەکانی ڕێککەوتننامەی واشینگتۆن ــڕێکەوتی شەشی شوباتی ١٩٢٢ــ سەبارەت بە کەڵک وەرگرتن لە گازی خنکێنەر لە کاتی شەڕداو، پرۆتۆکۆلی ژنیف ــڕێکەوتی ــ حەڤدەی حوزیرانی ١٩٢٥ــ سەبارەت بە قەدەغە بوونی گازی خنکێنەرو، گازی ژەهراوی و گازی لەم چەشنەو کەرەسەکانی بڵاوکردنەوەی میکرۆب و باکتری، بەرەسمی و بە روونی قەدەغە کراوە.

داڕێژەرانی یاساکانی لاهە (ماددەی ٢٥ی کۆنڤانسیۆنی ١٩٠٧)، لە نێوان شارێکی کراوە بێ بەرگری و شارێکی داخراو یان شارێک کە دەکرێ بەرگری لێ بکرێ، جیاوازییان داناوە و، تەنیا بۆمبارانکردنی شاری داخراوەکانیان بە ڕەوا زانیوە.

## *ڕاگەیەنراوی شەڕ* — **Declaration Of War**

بریتیە لە ڕاگەیەنراوی رەسمی لە سەر بوونی حاڵەتی شەڕ لە نێوان دوو وڵاتدا. کۆنڤانسیۆنی ١٩٠٧ی لاهە سەبارەت بە دەستپێکردنی شەڕ دەڵێ کە دەبێ ڕاگەیاندنی شەڕ بەر لەوەی شەڕەکە بە شێوەی کردەیی دەست پێ بکا، رابگەیەنرێ، بەڵام هەر ئەوانەی کە بۆ خۆیان ئەو کۆنڤاسیۆنەیان مۆر کرد، رەچاویان نەکرد.

ڕاگەیەنراوی شەڕ نەک تەنیا هەڵوێستی وڵاتێک لە بەرامبەر دوژمنەکەی دەردەخا، بەڵکوو بارودۆخی نوێ بۆ وڵاتانی بێلایەن روون دەکاتەوەو؛ هێندێک جاریش لە نێو خۆی وڵاتدا بوونی هەل ومەرجی نائاسایی و بردنەسەری رادەی دەسەلات و توانایی دەوڵەت دەخاتە ڕوو.

مانای یاسایی ڕاگەیەنراوی شەڕ واتە ئەوەی کە پێویستە بەر لەوەی شەڕەکە دەست پێ بکا، رابگەیەنرێ، بەر بە هێرشی لە ناکاو و بروسک ئاسا لە پلانە سەربازییەکاندا دەگرێ و، لە

لایەکی تر، بەسەرنجدان بەوەی کە شەڕ وەک ئامرازێک بۆ گەریشتن بە ئامانجی ولاتان رۆژ لە دوای رۆژ زیاتر پرۆتستۆ دەکرێ، زۆربەی دەولەتەکان هەولْ دەدەن لە راگەیاندنی رەسمیی شەڕ ــ هەتا ئەوپەڕی مومکین ــ خۆببوێرن. زۆربوونی ژمارەی شەڕەکان و ناکۆکییە فیکری و ئایدۆلۆژییەکان لە نێوخۆی ولاتانیشدا زەربەی لە مانای یاسایی راگەیەنراوی شەڕ داوە. چوونکە ئەگەر دەولەتێک لە بەرامبەر یەکێک لە لایەنەکانی دەستپێکەری کێشە نێوخۆییەکانی خۆیدا شەڕ رابگەیەنێ، کۆمەلێک دەرەنجامی لێ دەکەوێتەوە کە بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیک، یاسا بەرەسمی ناسراوەکانی " دوژمن" ئەو لایەنەش کە شەڕەکەی دەست پێکردووە، دەگرێتەوە. شەڕی کۆریا، شەڕی ڤێتنام وشەڕی عێراق لە دژی ئێران بە نموونەی ئەو شەڕانە دەژمێردرێن کە بەبێ راگەیەنراوی شەڕ لە لایەن دەستپێکەرانی شەڕەوە دەستیان پێکردووە.

## کۆتایی شەڕ *Termination Of War*

کۆتایی شەڕ زیاتر لە رێگای گرێدانی رێککەوتننامەی ئاشتی لە نێوان لایەنەکانی شەڕ پێکدێ، بەلام رەنگە لە هێندێک حالەتیشدا بەبێ گرێدانی رێککەوتننامە، کۆتایی بە شەڕبێ:

یەکەم : کاتێک کە یەکێک لە لایەنەکانی شەڕ بە تەواوەتی لاواز بووبێ و دەولەتی سەرکەوتوو بە تەواوەتی ئەو ولاتە داگیر بکا. وەک ئەوەی کە دەولەتی پرۆس، دەولەتی "هانۆڤێر"ی بە بێ گرێدانی هیچ رێککەوتننامەیەک بە خۆیەوە لکاند.

دووهەم: ئەو کاتە کە هیچکام لە لایەنەکانی شەڕ نەتوانن لە رێگای سەربازییەوە بە ئامانجەکانیان بگەن، واتە هیچکامیان توانایی لە نێو بردنی یەکتریان نەبێ، و بەبێ گرێدانی رێککەوتننامەیەک دەست لە شەڕ و پێکدادان هەلدەگرن و کۆتایی بە شەڕ دێنن. دیارە ئەم بارودۆخە زەرەرو زیانێکی زۆری لێ دەکەوێتەوە، چوونکە کۆتاییهێنان بە شەڕ و دەرئەنجام و و کاریگەرییانەی کە دەبێ بە شێوەیەکی یاسایی چارەسەر بکرێن، بە شێوەیەکی شاراوەو نادیار دەمێنێتەوە؛ واتە کوتایی هاتنی یەکجارەکی بەشەڕ دیار نیە. نموونەی ئەمجۆرانە لە مێژوودا زۆر دەگمەنو، دەکرێ تەنیا ئاماژە بە شەڕی ١٧١٧ی نێوان پۆلەندا و سوید بکرێ.

## Afghan War

### شەڕی ئەفغانستان

دوای کودیتای ١٧ی حوزەیران ١٩٧٣ی ژەنەڕاڵ داوودخان کە رووخانی رژێمی پاشایەتیی چل ساڵەی محەممەد رەزاشا (ـ١٩٧٣ـ١٩٣٣) و دەرپەڕانی ناوبراو، بۆ رۆمی لێکەوتەوە، رژێمی کۆماری جێگای سیستەمی پێشووی گرتەوە. داودخان ئەگەرچی پشتیوانیی یەکیەتیی سۆڤیەتی لەو پێوەندییەدا بەدەست هێنا بوو، بەڵام دەیویست پشتیوانیی هۆز و عەشیرە جۆراوجۆرەکانی ئەفغانستانیش بەدەست بێنێ، تاکوو لەم رێگایەوە بەستراوەیی ئەم وڵاتە بە سۆڤیەت کەم بکاتەوە. ناوبراو بە پشت بەستن بە وڵاتە خاوەن نەتەوەکانی رۆژهەڵاتی نێوەڕاست تارادەیەک سەرکەوتوو بوو. هەروەها دەستووری نوێی ئەم وڵاتە لە ساڵی ١٩٧٧ دارێژرا؛ بەڵام سیاسەتی نزیکایەتیی بە رۆژئاوای داود خان بەدڵی سۆڤیەت نەبوو و، ناوبراو لە کودیتای نیسانی ١٩٧٨ی ناسراو بە "شۆڕشی پور" کە لە لایەن نوور محەممەد تەرەکی سەرکردەی باڵی رادیکاڵ گەڵ "حیزبی هەڵوەشاوەی کۆمۆنیستی دیمۆکراتیکی گەلی ئەفغانستان" (PDPA) بەڕێوەچوو، کوژراو، تەرەکی وەک "سەرۆکی ئەنجوومەنی شۆڕش" جڵەوی دەسەڵاتی بەدەستەوە گرت. دەستوورێکی نوێ لەسەر بنەمای تاک حیزبی دارێژراو، رێککەوتننامەی دۆستایەتی و هاوکاری و بەرگریی دوو لایەنەش لە نێوان یەکیەتیی سۆڤیەت و ئەفغانستاندا مۆرکرا(١٩٧٩)و، چەندین ریفۆرمیش لە بوارەکانی کۆمەڵایەتیدا پێشکەش بە خەڵک کران.

ئەو ریفۆرمە رادیکاڵانەی کە بەمەبەستی وەگەڕخستنی جەماوەر هەژارەکان و بەدەستهێنانی پشتیوانیی سەرکردە نەریتیەکانی هۆز و عەشیرەکان جێبەجێ کرا لەگەڵ دژایەتیەکی توندی پارێزگاران بەرەوڕوو بوو و، لەم پێوەندییەدا بە هەزاران کەسی ئاوارە پەنایان بۆ ئێران و پاکستان برد.

لە ناوچەی "هەرات"یشدا شۆڕشێکی مەزن وەڕێخرا. کێشەکانی نێوباڵەکان توندتر بوو، "تەرەکی"یش بە هۆی کودیتایەک کوژرا (١٩٧٩). حەفیزوڵڵا ئەمین کە پۆستی سەرۆک وەزیری و وەزیری کاروباری دەرەوەی وڵاتی لەئەستۆ بوو، لە ئاکامدا بوو بە سەرۆکی ئەنجوومەنی شۆڕش.

حکوومەتی "ئەمین"یش نەیتوانی کۆتایی بە کێشە وشۆڕشە نێوخۆییەکان بێنێ. شەپۆلی ئەم کێشە وشۆڕشانە سۆڤیەتی ناچار کرد تاکوو بیر لە کودیتایەکی تر بە دژی ئەم رژێمە بکاتەوەو، لە

ئاکامیشدا رژێمی ئەمین بە کودیتایەک لە کانوونی یەکەمی ١٩٧٩دا رووخێندراو، کوژرا. دوابەدوای ئەم رووداوە، "بەبرەک کارمیل"، سەرۆکی دوورخراوەی باڵی ئالآی "حیزبی کۆمۆنیستی دێمۆکراتیکی گەلی ئەفغانستان" بە پشتیوانیی چل هەزار کەس لە هێزەکانی سۆڤیەت لەسەر تەختی دەسەڵات پاڵی دایەوە و، بەم شێوەیە خاکی ئەفغانستان لە لایەن هێزەکانی سوپای سوورەوە کەوتە بەرهێرش. ژمارەی ئەو هێزانە سەرەڕای دژایەتیی بەربلاوی ولاتانی جیهان لەگەڵ ئەم کارە، رۆژ لەگەڵ رۆژ زیادی کردو، زۆر لە ولاتانی وەک ئێران، چین، ئەمەریکا، پاکستان، و.... هتد بە هاوکارییە ماددی و مەعنەوی و هەروەها سەربازییەکانی خۆیان پشتیوانیان لە بزوتنەوەکانی لە حاڵی دامەزرانی موجاهدین لە بەرامبەر هێزەکانی سۆڤیەتدا دەکرد.

لە حاڵێکدا کە ژمارەی سەربازانی سوپای سوور لە ساڵی ١٩٨٥، گەیشتە ١٢٠٠٠٠کەس، بەلام بزووتنەوە پارتیزانیەکانی موجاهدین کێشەیەکی زۆریان بۆ رووسیەکان نابۆوەو، بەربەستیان لەبەردەم پێشڕەویی سووپای سوور دروست کردبوو. بەلام سەرەنجام رووسەکان بە داگیرکردنی ناوچەی واخان بە کردەوە ناچەی نفوز دەسەڵاتی خۆیان تاکوو سنوورەکانی پاکستان بەرفراوان کرد.

یەکیەتیی حەوتەوانەی موجاهدینی ئەفغان کە سەرکردایەتی شەڕ لە دژی سۆڤیەت و لە ئاکامدا کۆمۆنیزمیان لەئەستۆ بوو، لەو حیزب و تاقمانە پێک دەهات:

١ــ کۆمەڵەی ئیسلامیی ئەفغانستان بە سەرۆکایەتی بورهانەدین رەببانی

٢ــ بەرەی رزگاریی نیشتمانیی ئەفغانستان بە سەرۆکایەتی پرۆفیسۆر "ێبغەاللە مجددی "

٣ــ حیزبی ئیسلامی بەسەرۆکایەتی ئەندازیار گوڵبەدین حیکمەتیار

٤ــ حیزبی ئیسلامی بە سەرۆکایەتی یۆنس خالس

٥ــ برایەتی نەتەوەیی ئیسلامیی ئەفغانستان بە سەرۆکایەتی پیر سەید ئەحمەد گەیلانی

٦ــ بزوتنەوەی شۆڕشی ئیسلامی بە سەرۆکاییەتی محەممەد نەبی

٧ــ یەکیەتیی ئیسلامیی ئازادیی ئەفغانستان بە سەرۆکایەتی عەبدولرەسووڵ سەییاف سەرۆکایەتی یەکیەتیی حەوتەوانە لە ساڵی ١٩٨٨ دا بە نۆرە لە دەستی گوڵبەدین حیکمەتبار، بورهانەدین رەببانی و ئەحمەد شا مەسعوود (ناسراو بە شێری دۆڵی پێنج شێر)دابوو.

یەکیەتیی حەوتەوانەی موجاهدین بڕیاریدا بوو کە دوای بەدەستەوە گرتنی دەسەلاٌت، "مجددی" بە سەرۆک کۆماری و عەبدولڕەسوولّ سەییاف بە پۆستی سەرۆک وەزیری هەلّبژیریٚ.

بە زیاد بوونی خەسارتەکانی سووپای سوور هاتنە سەرکاری گۆرباچۆف، ناوبراو هەولّی ئەوەی دا کە هەرچی زوتر پێی سووپای سوور لە زلکاوی ئەفغانستان دەربکێشیٚ. لەم ڕووەوە، لە مانگی ئایاری ۱۹۸٦دا، دوکتۆر "نەجیب الله ئەحمەد زای" سەرۆکی پۆلیسی نهێنیی ئەفغانستان ناسراو بە "خاد" بوو بەجێنشینی بەبرەک کارمیل و، لە تشرینی یەکەمی هەمان سالّدا ۸۰۰۰ کەس لە هێزەکانی ڕووسی بەنیشانەی نیاز پاکی لە ئەفغانستان چوونە دەر.

لە شوباتی ۱۹۸۸دا گۆرباچۆف پێشنیاری کرد کە هێزەکانی سووپای سوور بەپێی خشتەیەکی زەمەنیی ۹ مانگە واتە لە مانگی ئایاری ۱۹۸۸ هەتا شوباتی ۱۹۸۹ خاکی ئەفغانستان بەجیٚ بێلّن. ئەم کارە نەبووە ڕێگرێک لەبەردەم درێژەپێدانی شەڕی نێوخۆیی موجاهدین لەگەلّ دەولّەتی ناوەندیی ئەفغانستان دا. موجاهدین بانگەشەیان بۆ ئەوە دەکرد کە ۸۵ لە سەدی خاکی ئەفغانستانیان لە بەردەست دایە، بەلاٌم دەولّەتی ناوەندیش درێژەی بە فشارەکانی خۆی بۆ جێبەجیٚ بوونی ڕێککەوتنێکی سیاسی دەدا.

کاری لێکدان و پێکدادان بە شێوەیەک زۆر ببوو کە دەولّەتەکانی ئەمەریکا و سۆڤیەت بڕیاریان دا تاکوو لە یەکەمی مانگی کانوونی یەکەمی ۱۹۹۲ چیتر چەک وچۆلّ بۆ لایەنەکانی شەڕ نەنێرن. لەگەلّ لەبەریەک هەلّوەشانەوەی سۆڤیەتدا، پالّەپەستۆی موجاهدینیش بۆسەر دەولّەتی ناوەندی زیادی کردو، دکتۆر نەجیب الله لە ١٦ی نیسانی ۱۹۹۲دا وازی لە دەسەلاٌت هێنا.

لێکدان و پێکدادانی تاقمە جۆراوجۆرەکانی موجاهدین لەگەلّ یەکتر لە ئاکامدا بوو بە هۆی گرێدانی "ڕێککەوتننامەی پیشاوەر" لە تشرینی دووهەمی ۱۹۹۳و، سەرۆک کۆماریی دوو مانگەی پرۆفیسۆر "مجددی" و سەرۆک وەزیرانیی مامۆستا عەبدولسەبوور فەرید. دوای کۆتایی ئەم دوو مانگە، دەسەلاٌت بۆ بورهانەدینی ڕەببانی گوازرایەوە، پۆستی وەزارەتی بەرگریش درا بە "ئەحمەدشامەسعوود".

دوای ئەوەی کە ڕەببانی ئەنجوومەنی چارەسەری (شواری اهل حل و عقد)ی بەمەبەستی هەلّبژاردنی سەرۆک کۆماری نویٚ گۆڕی، ئەنجوومەن، جارێکی تر ناوبراوی بە سەرۆک کۆماریی ئەفغانستان هەلّبژارد (کانوونی دووهەمی ۱۹۹۳).

حیزبی ئیسلامیی حیکمەتیار کە لەم هەڵبژاردنە ناڕازی بوو، بەتووندی هێرشیان کردە سەر پێگەکانی دەوڵەتی ناوەندی و، لەئاکامدا رەبانیان ناچار بە دانوسان و رێککەوتن کرد. بە ناوبژیوانیی دەوڵەتەکانی پاکستان، ئێران و عەرەبستان لایەنەکانی شەڕ لە ئیسلام ئابادی پایتەختی پاکستان کۆبوونەوەو، دوای چەند رۆژ باس و خواس، "رێککەوتننامەی ئیسلام ئاباد"یان، بەمەبەستی کۆتایی هێنان بە کێشەو ناکۆکیەکانی نێوانیان مۆر کرد. (مارتی١٩٩٣).

یەکێک لە کێشە سەرکیەکانی تاقمەکان لەسەر هێشتنەوە یان لابردنی ئەحمەدشامەسعوود لە وەزارەتی بەرگری و بەرێوەبردنی ئەو وەزارەتە بەشێوەی هاوبەش و بەبەشداری هەموو لایەنەکان بوو. جێبەجێکردنی رێککەوتننامەی ئاماژەپێکراو لە لایەن ئێران، پاکستان وعەرەبستانەوە، گەرەنتی کرا.

لەگەڵ جێبەجێکرانی ئەو رێککەوتننامە، رەبانی لە پۆستی سەرۆک کۆماریدا مایەوە و، ئەندازیار گولبەددین حیکمەتیار بۆ پۆستی سەرۆک وەزیران هەڵبژێردرا. پاش ماوەیەک واتە دوابەدوای قووڵتر بوونی ناکۆکیی نێوان رەبانی و حیکمەتیار و هەروەها سەرهەڵدانی دیاردەیەک بە ناوی تالیبان، واتە ئەو میلیشیایانەی کە ئەفغانستان دەیگووت لەلایەن پاکستانەوە پشتیوانیی سیاسی، سەربازی و ماڵی دەکرێن، گرێ پووچکەی ئەفغانستان بە داگیر کرانی بەشێکی گرنگ لە وڵات لە لایەن تالیبان و هەروەها داگیرکرانی بەشێکی زۆر لە ناوەندسەربازییەکان لەلایەن ئەو تاقمەوە، رۆژ بە رۆژ ئالۆزتر دەبوو و؛ سەرەڕای ناوبژیوانیەکانی رێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان بۆ کۆتایی هێنان بەشەڕی نێوخۆیی، ئەم هەوڵانە بە دەرەنجامێکی ئەوتۆ نەگەیشتن.

بەدوای هێرشی هەمە لایەنەی تالیبان بۆ سەر ناوەندەکانی حکومەت و گرتنی پایتەختی ئەفغانستان (ئەیلوولی ١٩٩٦)، ژەنەراڵ نەجیب لەگەڵ براکەی لەگۆڕەپانی ئاریانای کابول، لە سێدارە دران و، رەبانی لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە بەرپرسان بەرەو ناوچەکانی باکوور پاشەکشەیان کرد. شەڕێکی دوورودرێژ بە توندییەکی جیاوازەوە لە سەرانسەری ئەفغانستان تاکوو ئەیلوولی ٢٠٠١ درێژەی هەبوو و، لە ماوەی ئەو ٥ ساڵەدا تالیبان توانی ٩٠ لەسەدی خاکی ئەفغانستان بەدەستەوە بگرێ و حکومەتێک دابمەزرێنێ، کە تەنیا لە لایەن پاکستان، عەرەبستان و ئەماراتی یەکگرتووی عەرەبییەوە بەرەسمی ناسرا. تالیبان بە جێبەجێکردنی شێوازێکی کۆنەپەرستانەو دواکەوتوو، دەستی بە لێدان و کوتانی ژنان، منداڵان و پیاوانی ئەفغانی کردو، ئەفغانستانی کرد بە پێگەی کۆمەڵێک پیاوی

دواکەوتوو وکۆنەپەرەست. مەلامحەممەد عومەر کە وەک "امیر المومنین" حکوومەتی بەسەر ئەفغانستاندا دەکرد، بە دارشتنی چەندین یاسا و رێوشوێن بە ناوی "شەریعەت" ئەفغانستانی لە بەرچاوی خەڵکی دونیا خست. بە دوای کوژرانی ئەحمەدشامەسعوود لە کردەوەی تیرۆریستیی ۹ی ئەیلوولی ۲۰۰۱ داو رووداوی ۱۱ی ئەیلوولی ۲۰۰۱، ئۆسامە بن لادن لە لایەن ئەمەریکاوە بە تۆمەتباری ژمارەیەک لە قەڵەم درا.

ئەمەریکا دوای بەدەستەونەدانی بن لادن لە لایەن ئەفغانستانەوە، لە ۷ی تشرینی یەکەمی ۲۰۰۱ دا چەندین هێرشی کردە سەر خاکی ئەم وڵاتەو، بەشێکی بەرچاوی لە خاکی ئەو وڵاتە بۆمباران کرد و هێزەکانی پیادەی ئەمەریکاش لە زۆر ناوچەی ئەفغانستان سەنگەریان گرت. یەکیەتیی باکووریش کەڵکی لەم دەرفەتە وەرگرت و، دەستی بە پێشرەوەی بەرەو کابول کرد و لە ۱٤ی تشرینی دووهەمدا کابوولی ئازاد کرد.

لە دوای پێکهاتنی لۆیی جەرگە (حوزیرانی ۲۰۰۵)، حامید کارزای بوو بە سەرۆکی دەوڵەتی ئەفغانستان.

## شەڕی ئێران وعێراق (۱۹۸۰_۱۹۸۸) Iran – Irag War

ئەم زاراوەیە بە شەڕی هەشت ساڵەی نێوان عێراق و ئێران دەگوترێ کە لە دوای ٦۳۷ جار هێرشی سوپای عێراق بۆ خاکی ئێران لەسەر سنوورەکاندا، دەستی پێکرد. لە کاتژمێر ١٤ی رۆژی ۲۱ی ئەیلوولی ۱۹۸۰ هێزە ئاسمانیەکانی عێراق بەدەیان فرۆکەی سەربازی دەستیان بە بۆمبارانکردنی فرۆکەخانەکانی نێوخۆ و نێونەتەوەیی و بنکە ئاسمانیەکانی ئێران کردو، هاوکات لەگەڵ ئەمەش، شارە سنوورەییەکانی خورەمشەهر، سوسەنگرد، بۆستان، مێهران، دیهلوران، قەسری شیرین، هۆویزە، نەوت شار، سومارو موسیانی داگیرکردو، شارەکانی ئابادان، ئەهواز، دیزفول، شوشتەر، ئەندیمێشک، ئیسلام ئابادی رۆژئاوا و گیلانی رۆژئاوای دایە بەر هێرشی تۆپخانەکانی خۆی.

سۆپای عێراق دوای پەڕینەوە لە سنوورە هاوبەشەکان بە پشتیوانیی ئاگری تووندی تۆپخانەکانی خۆی، بەخێرایی یەکی سەیر پێشرەوی کردە نێو خاکی ئێران و، هەتا کۆتایی ساڵی ۱۹۸۰و بەکردنەوەی بەرەیەکی تر لە ناوچەی کوردستاندا توانی نزیک بە چواردەهەزار کیلۆمەتری دووجا لەخاکی ئێران داگیر بکا.

هێرشی "فتح المبین" کە لە نیسانی ١٩٨٢دا دەستی پێکرد سەرتای هەڵگەڕانەوەی بارودۆخی شەڕ بوو و، هەوڵەکانی هێزەکانی ئێران بوو بە هۆی ئازاد کردنی ئەو ناوچانەی کە عێراق داگیری کردبوون و هەروەها شاری خورەمشەهریش ئازاد کرا.

عێراق سەرەڕای چاوپۆشی لە ستراتیژیی هێرشی بەرفراوانی خۆی وبۆچوونەدەر لەو بۆنبەستە، چەندین تاکتیکی جۆراوجۆری تاقی کردەوەو، دوای شکست خواردن لە هێرشەکانی "فتح المبین" و "بیت المقدس"، ستراتیژیی بەرگریی ڕەهای گرتەبەر. بەرگریی هێزەکانی ئێران، عێراقی ناچار کرد تاکوو بۆ چوونەدەر لەو بۆنبەستە، شەڕەکە بۆ کەنداوی فارس بگوازێتەوە و، شەڕی نەوت هەڵگرەکان دەست پێ بکا.

شەڕ لە کەنداوی فارس و هێرشی بەردەوام بۆسەر نەوت هەڵگرەکان، بواری بۆ دەستێوەردانی ئەمەریکاو زلهێزەکانی تری ڕۆژئاوا لەوێدا خۆش کردو، دەوڵەتی کوێت بەرەسمی داوای لە ئەمەریکا و سۆڤیەت کرد تاکوو لە ژێر ئاڵای خۆیان پارێزگاری لە نەوت هەڵگرەکانی ئەو وڵاتە بکەن.

ڕووداوەکانی تر لەماوەی شەڕدا تاکوو پەسندکردنی بڕیارنامەی ٥٩٨و ڕاگەیاندنی ئاگربەست، بەپێی پێرست بریتین لە:

١ـ دەسپێکردنی شەڕی شارەکان (مارتی ١٩٨٤) و، هێنانەگۆڕی تیۆری شەری هەمەلایەنە یان ئاشتیی هەمە لایەنە لەلایەن عێراقەوە.

٢ـ هێرشی هێزە ئاسمانیەکانی عێراق بۆ سەر ناوی ئەمەریکیی ستارک (١٩٨٦).

٣ـ هێرشی کۆپتەرە شەڕکەرەکانی ئەمەریکا بۆ سەر پاپۆری ئێران ـئەجر (١٩٨٦).

هێرشی بەرامبەرانەی ئێران (١٩٨٤) ودرێژەی شەڕی شارەکان لە نێوان لایەنەکاندا بەدرێژایی بەهاری ١٩٨٥؛ مارتی ١٩٨٦ و بەهاری ١٩٨٧.

٤ـ پەسندکردنی بڕیارنامەی ٥٩٨ لەلایەن ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیەکگرتووەکان لە تەمووزی ١٩٨٧.

٥ـ پەسندکردنی بەرەسمیی بڕیارنامەی ٥٩٨ لەلایەن ئێران لە ١٦ی تەمووزی ١٩٨٧دا.

٦ـ پێکهاتنی ئاگربەست لە بەربەرەکانی شەڕدا لە ئابی ١٩٨٧دا.

***پێشێل کرانی یاسا و ڕێوشوێنە نێونەتەوەییەکان لەلایەن ڕژێمی عێراقەوە***

عێراق لە ماوەی هەشت ساڵ شەڕی خۆی لەگەڵ ئێراندا، چەندین ڕێککەوتننامە و کۆنڤانسیۆنی پێشێل کردو، کە بە کورتی ئاماژەیان پێ دەکەین:

١ـ جارنامەی نەتەوە یەکگرتووەکان سەبارەت بە پەنانەبردنە بەر هێزو، گەڕان بە دوای ڕێگا چارەی ئاشتیانە بۆ کێشەکان.

٢ـ ڕێککەوتننامەی ٦ی مارتی ١٩٧٥.

٣ـ کۆنڤانسیۆنە چوار کوچکەکانی ژنێڤ.

٤ـ پرۆتۆکۆلی ١٩٢٥ی ژنێف سەبارەت بە قەدەغە بوونی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی.

٥ـ ڕێککەوتننامەی١٢ی حوزەیرانی ١٩٨٤ی سکرتێری گشتیی نەتەوەیەکگرتووەکان سەبارەت بە هێرش نەکردنی ئاسمانی، تۆپخانەو موشەکی بۆسەر ئەو ناوچانەی کە خەڵکی لێ دەژی.

٦ـ کۆنڤانسیۆنی مافە دەریاییەکان.

٧ـ کۆنڤاسیۆنی کوێت سەبارەت بە پاراستنی ژینگە و بۆمبارانی چاڵە نەوتیەکان.

٨ـ کۆنڤانسیۆنی شیکاگۆ.

٩ـ ڕێوشوێنەکانی یۆنسکۆ بۆ پاراستنی بینا و شوێنەوارە کۆن و مێژووییەکان.

١٠ـ ڕێوشوێنەکانی ئاژانسی نێونەتەوەیی وزە و ماددەی ٥٦ی پرۆتۆکۆلی ١٩٧٠ی ژنێف بەپێی بەندی یەکەمی بڕیارنامەی ٤٠٧ی ئاژانسی نێونەتەوەیی وزە.

### ***ڕووداوەکانی دوای پێکهاتنی ئاگربەست***

ئەنجومەنی ئاسایشی ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان لە ڕێکەوتی ٨ی ئابی ١٩٨٧دا بڕیارنامەی ٦١٩ی پەسند کرد کە بەپێی ئەو بڕیارنامە، چەندین گرووپی چاوەدێریی سەربازیی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ئێران و عێراق (یۆنیماگ) دا دامەزرێن و، دەنێردرێنە سنوورەکانی ئێران.

### دەستپێکی وتووێژەکانی ئاشتی

یەکەمین خولی و تووێژە ڕەسمیەکانی ئاشتی لە نێوان عێراق و ئێراندا بە چاوەدێریی ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان لە ١٨ی ئابی ١٩٨٧ لەژنێف دەستی پێکرد، بەڵام بە هۆی ئەوپێش مەرجانەی کە لە لایەن عێراقەوە سەبارەت بە رووباری ئەروەند (شگ العرب) و ئازادیی هاتووچۆی پاپۆڕەکانی ئەو وڵاتە لە کەنداوی فارسدا خرانە ڕوو، وتووێژەکانی ئاشتی تووشی شکست کرد.

پێداگرییەکانی عێراق بوو بە هۆی ئەوەی کە لە ساڵەکانی ١٩٨٧ و١٩٨٨ دا هیچ جۆرە پێشکەوتنێک لەوتووێژە دوولایەنەکان وەدی نەیە و، لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٨ پێوەندیی عێراق لەگەڵ ڕۆژئاوا و بەتایبەتی ئەمەریکا ڕووی لە گرژی و ئاڵۆزی کرد. لێدوانەکانی سەدام حوسێن و هەڕەشەکانی ناوبراو لە ڕۆژئاوا، بارودۆخێکی پێک هێنا کە ئەنجوومەنی ئاسایش ڕاگەیەنراوێکی دەرکرد تاکوو لەودا داوا لە هەردوو لایەن بکا کە هاوکاری لەگەڵ سکرتێری گشتی UNدا بکەن. لەو پێوەندییەدا هەر دوولا بە شێوەیەکی گشتی ڕازیبوونی خۆیان بۆ پلانی نوێی سکرتێری گشتی ڕاگەیاند.

***ئاڵ وگۆڕی نامەکان لە نێوان سەرۆک کۆمارەکانی دوو وڵات دا***

لە کۆتایی نیسانی ١٩٨٩دا سەدام حوسێن، سەرۆک کۆماری عێراق نامەیەکی بۆ کاربەدەستانی ئێران نارد. ناوبراو لەو نامەدا سەرەڕای ئاماژەکردن بەمەترسیەکانی سەهیۆنیزم [نووسەر] و هێندێک لە زلهێزەکان و وڵاتە گەورەکان بۆ سەر عێراق و نەتەوەی عەرەب، پێشنیاری کرد تاکوو وتووێژێکی ڕاستەخۆ لە نێوان هەر دوولایەندا لە مەککە بەڕێوە بچێ.

سەدام کە ئامانجی داگیرکردنی کوێتی لە مێشکیدا دەخولایەوە، بە ناردنی نامەیەکی تر، وتووێژی ڕاستەخۆی بەتەنیا ڕێگای گەیشتن بە ئاشتی ناو برد.

لە ٢ی ئابی ١٩٨٩دا عێراق لە نامەیەکی دیکەی بۆ ئێران دا بۆیەکەمین جار باسی لە مەسەلە گرنگەکان کردبوو. عێراق پێشنیاری کردبوو تاکوو وتووێژەکان سەبارەت بە " شگ العرب " لە سێ تەوەردا بێنە گۆڕێ:

١ـ دەسەڵاتدارەتیی تەواو بەسەر ڕووبارەکە هی عێراق بێ، چوونکە ئەوە مافی مێژوویی و ڕەوای عێراقە.

٢ـ پیادەکردنی دەسەڵات بەسەر " شگ العرب" لە لایەن عێراقەوە، وێڕای جێبەجێکردنی شێوازی دیاریکردنی هێڵی تالڤێگ بۆ هاتوچۆی پاپۆرەکان.

٣ـ ناردنی کێشەی " شگ العرب" بۆ دادوەری، بەپێی یاسایەک کە هەر دوولایەن لەسەری کۆک بن.

هەروەها عێراق لەو نامەدا داوای پشتگوێ خستنی بەندی ٦ی بڕیارنامەی ٥٩٨ی سەبارەت بە دیاریکردنی لایەنی دەستپێکەری شەڕی کردبوو. سێ ڕۆژ دوای ناردنی ئەو نامە، سوپای عێراق سنووره هاوبەشەکانی خۆی لەگەڵ کویتدا بەزاند و، خاکی ئەم وڵاتەی داگیر کرد.

١٢ ڕۆژ دوای داگیرکردنی کویت، واتە لە ١٤ ئابی ١٩٩٠، ڕادیۆی عێراق نامەی سەرۆک کۆماری ئەو وڵاتەی لە پێوەندی لەگەڵ پەسندکردنی ڕێککەوتننامەی ١٩٧٥ی خوێندەوە.

بەدوای پاشەکشەی هێزەکانی عێراق لە خاکی ئێران کە لە ڕۆژی ٩ی ئابی ١٩٩٠دا دەستی پێکرد، ئەو هێزانە لە ماوەی ٥ ڕۆژدا بۆ دیوی سنووره نێونەتەوەییەکان پاشەکشەیان کرد.

عێراقیەکان بە گشتی ٢٣٦٣ کیلۆمەتر دووجا لە خاکی ئێرانیان لەبەردەست دا بوو کە دەستیان بە چۆڵکردن و پاشەکشە کرد، بەڵام هێندێک لە ناوچەکانیان هەروا لەبەردەست دابوو. پانایی ئەو ناوچانە ٦٠٠ کیلۆمتری دووجا دەبوو. بەپێی لێدوانی عێراقیەکان، ئێران دەبوایە بەپێی ڕێککەوتننامەی ١٩٧٥ ناوچەکانی میمک، "زین المقدس" و" سیف السعد" بە عێراقیەکان بدا، چوونکە ڕژێمی شا لە ئەسپاردنی ئەو ناوچانە بە عێراق خۆی بواردووە.دیارە دەبێ ئەوە بگوترێ کە یەکێک لە بیانووەکانی هەڵوەشاندنەوەی ڕێککەوتننامەی ١٩٧٥و هێرش بۆسەر ئێران هەر ئەو بابەتە بوو. ئەم ناوچانە بەپێی بانگەشەی کاربەدستانی عێراق نزیک بە ٣٠٠ کیلۆمەتری دووجایە، لە حاڵێکدا ئەوەی کە لەبەردەستی عێراقیەکاندا مابۆوە، زۆر لەوە زیاتر بوو.

***باشتر بوونی پێوەندییەکانی دوو وڵات***

بە دوای پەسندکردنی ڕێککەوتننامەی ١٩٧٥ وپاشەکشەی هێزەکانی عێراق بۆ پشت سنووره دەستنیشانکراوە نێونەتەوەییەکان،لیژنەیەک لە حوزەیرانی ١٩٩٠ هاتە تاران و، باس لەم بابەتانە کرا:

١ـ دانانی تێلە سنوورییەکان؛

٢ـ گۆڕینەوەی دیلەکان؛

٣ـ قەیرانی کەنداوی فارس؛

٤ـ دابینکردنی ئاسانکاری بۆ سەردان و زیارەتی شوێنە پیرۆزەکان؛

٥ـ دەستپێکرنەوەی پێوەندییە دوولایەنیەکان و، کردنەوەی باڵۆێزخانەکان لە هەردوو وڵاتدا.

لەم پێوەندییەدا وەزیری دەرەوەی ئێران لەسەر بانگهێشتیی هاوتا عێراقیەکەی خۆی لە ئابی ١٩٩٠دا سەفەری بۆ بەغدا کردو، عێززەت ئیبراهیم، جێگری سەرۆک کۆماری عێراق بە سەرۆکایەتی وەفدێکی سیاسی و ئابووری سەردانی ئێرانی کرد (تشرین یەکەمی ١٩٩٠).

***ئاڵۆزیی دووبارەی پێوەندییەکان***

دوای هێرشی هێزە هاوپەیمانەکان بە سەرۆکایەتی ئەمەریکا بۆ سەرعێراق (کانوونی دووهەمی ١٩٩١)، دەوڵەتی ئەو وڵاتە رایگەیاند کە لە ماوەی شەڕدا ١٤٨ فڕۆکەی سەربازی و نەفەرهەڵگری عێراق لە خاکی ئێراندا نیشتوون و، داوا لە ئێران دەکا کە بۆ ئەم وڵاتەیان بگێڕێتەوە.ئێران رایگەیاند کە ٢٢ فڕۆکەی عێراق لە ئێران نیشتۆن. ژمارەیەک لەو فڕۆکانە هی کوێت بوون، کە عێراق لەو وڵاتە هێناوێ و، لە ئێران نیشتوونەوە. ئێران فڕۆکەکانی کوێتی ناردەوە بۆ کوێت و رایگەیاند هەر کاتێک کۆمیتەی گەمارۆی ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیەکگرتووەکان بە ئێران بڵێ کە ئەو فڕۆکانە بنێرێتەوە، ئێران ئەوانیش دەنێرێتەوە بۆ عێراق. بەمەبەستی جێبەجێکردنی بەندی ٦ی بریارنامەی ٥٩٨، سکرتێری گشتی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ١٤ی ئابی ١٩٩١دا داوای لە ئێران و عێراق کرد تاکوو راپۆرتێکی تێروتەسەل لە سەر روانگەی خۆیان سەبارەت بە دەستپێشخەری شەڕ هەتا ١٤ی ئەیلوول پێشکەش بە ناوبراو بکەن. دوای هەڵسەنگاندنی راپۆرتەکان، سکرتێری گشتیی سەرەنجام لە راپۆرتی خۆیدا ( ئەیلوولی ١٩٩١) بۆ ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیەکگرتووەکان، رایگەیاند کە دەوڵەتی عێراق بەرپرسی دەستپێشخەری شەڕ لە دژی ئێران لە ٢٢ی ئەیلوولی ١٩٨٠دا بووە.

***رادەی زیانەکان***

بە پێی لێکۆڵینەوەی لیژنەکانی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان رادەی ئەو زیانانەی کە لە ئێران کەوتوون، بەو شێوە بووە:

١: رادەی زیانە ڕاستەخۆکان، ٩٧,٢میلیارد دۆلار،

٢: رادەی زیانە ناڕاستەخۆکان، ٣٤,٥٣٥ میلیارد دۆلار،

ئێران رادەی زیانەکانی بە ١٠٠٠ میلیارد دۆلار راگەیاندووە.

بابەتە هەڵپەسێردراوەکانی دوولایەن

گرنگترین بابەتەکانی دوو وڵات کە ئێستا بە چارەسەر نەکراوی ماونەتەوە بریتین لە:

١ــ دانانی تێلەکانی سەر سنوور،

٢ــ گرێنەدانی رێککەوتننامەیەکی ئاشتی لە نێوان دوو وڵات دا،

٣ــ خاوێنکردنەوەی چۆمی ئەروەند (شەتتولعەرەب)

٤ــ دیاریکردنی رۆخی دەریای ئێران و عێراق. بابەتی دیاریکردنی رۆخی دەریای ئێران و عێراق لە کەنداودا لە ساڵەکانی ١٩٦٤و ١٩٧٠ لە نێوان ئەو دوو وڵاتە و وتووێژی لەسەرکرا، بەڵام هیچ دەرەنجامێکی لێ نەکەوتەوە. رێکنەکەوتنی ئێران وعێراق لەسەر دیاریکردنی رۆخی دەریا بوو بە هۆی ئەوەی کە ئێران و کوێتیش لەسەر ئەم بابەتە رێک نەکەون، چوونکە رۆخی دەریای ئەم سێ وڵاتە لە باکووری کەنداو پێک دەگەنەوە.

بە دوای شەڕی ئەمەریکاو بەریتانیا لەگەڵ عێراق و، رووخانی رژێمی سەدام حوسێن لە نیسانی ٢٠٠٣ دا، داواکارییەکانی ئێران لەو وڵاتە هەروا بە نادیاری ماوەتەوە.

## شەڕی بروسک ئاسا Blitzkrieg [lightning War]

هێرشێکی بەدەستوبردەو خێرایە کە لە پانتاییەکی بەرتەسکدا، بۆ دزەکردنێکی بەرین لە قوڵایی هێڵی دوژمندا بەڕێوە دەچێ. ئەم تەکتیکە لە رێگای هێرشە ئاسمانیەکانەوە بەمەبەستی بۆمبارانی سەنگەرەکانی دوژمن بۆ کەمکردنەوەی توانایی بەرگریی ئەوان و هەروەها بۆ دابەزاندنی یەکە زرێپۆشە تیژتێپەرەکان، بەڕێوە دەچێ. ئەم شێوازە لە شەڕی دووهەمی جیهانیدا بە شێوەیەکی بەرفراوان لە لایەن ئەڵمانیەکانەوە بەڕێوە چوو. ژەنەراڵ گودەریان، ژەنەڕاڵی بە ناوبانگی سوپای ئەڵمانیای نازی لەشەڕی ئەڵمانیەکان لەگەڵ فەرەنسیەکاندا، لەم تاکتیکە کەڵکی وەرگرت (١٩٤٠).

ئەم زاراوە لە زمانی ئینگلیزیدا بە کورتی Blitzی پێ دەگوترێ کە مەبەستەکەی پێناسە وباس لە هێرش و بۆمبارانە قورس و هێرشەکانی شەوانەی هێزی ئاسمانیی ئەڵمانیای نازی بەسەر شارەکانی بەریتانیا لە ماوەی شەڕی دووهەمی جیهانی دایە.

## شەڕی مەزن Great War

ئەم زاراوە بە شەڕی یەکەمی جیهانی دەگوترێ کە بەڕاگەیاندنی شەڕ لە لایەن نەمسا ـ هەنگاریا بە دژی سیربیا لە ڕێکەوتی ٢٨ی حوزەیرانی ١٩١٤ دەستی پێکرد و لە ١١ی تشرینی دووهەمی ١٩١٨ واتە ئەو ڕۆژەی کە دەوڵەتی ئەڵمانیا کۆتایی شەڕی ڕاگەیاند، کۆتایی پێ هات.

## شەڕی پێشگیرانە Preventive War

شەڕی پێشگیرانە بڕیارێکی بە ئەنقەستە، بەمەبەستی دەستپێکردنی هێرشی سەربازییە، چوونکە دەستپێکەری شەڕ پێیوایە کە لە بواری هێز و توانایەوە بە سەر دوژمندا زاڵە. هەروەها پێیوایە کە ئەم ناهاوسەنگیە، کاتیەو ئەگەر ئەو پەلە نەکا، ڕەنگە دوژمنە خیاڵیەکەی ئەو بگاتە ئاستی ئەو و تەنانەت لە داهاتوودا وەپێش ئەویش بکەوێ. کەوایە لە کردەوەدا دەستپێکی شەڕی پێشگیرانە کردەیەکی بەنقەستە و ئاگایانەیە کە لە سەربنەمای ڕوانگەی پێشوو سەبارەت بە زاڵبوونی کاتیە. لە هەلومەرجی گشتیدا شەڕی پێشگیرانە حاڵەتێکی هێرشبەرانەی هەیە نەک بەرگرییانە. سەبارەت بە پێناسەی ئەم زاراوە دەبێ ئاماژە بە دووخاڵ بکەین. یەکەم ئەوەی کە شەڕی پێشگیرانە یەکێک لەوجۆرە کردەوانەیە کە بەستراوە بە شتێکە کە دەکرێ بە "ڕێبازی هێرشبەرانە" ناوی ببرێ. دووهەم ئەوە کە شەڕی پێشگیرانە بەپێی واتای بەرفراوانی جاڕنامەی نەتەوەیەکگرتووەکان کارێکی نایاسایی و لە دەرەوەی هەڵوێستی گشتیی سەدەی بیستەمە، کە تەنیا کاتێک ڕێگە بە کەڵک وەرگرتن لە هێز دەدا کە بەمەبەستی بەرگریکردن بێ و، شەڕی پێشگیرانە زیاتر هێرشبەرانەیە تاکوو بەرەنگارانە بێ، شەڕی پێشگیرانە لەسەر دوو گریمانەی پێوەندییەکان و هەلومەرج ڕاوەستاوە، یەکەم ئەوە کە شەڕ لە هێندێک بوارەوە حەتمی بێ. دووهەم ئەوە کە زەبری یەکەم کاریگەر دەبێ. حەتمی بوونی شەڕ دەکرێ وەک پێناسەیەکی ڕەش بینانەی تایبەتی لە بارودۆخ باس بکرێ کە هێندێک جار سیاسەتڤانان، دیپلۆماتکاران، ستراتیژیستەکان و سەرکردە سەربازییەکان لەبارەی داهاتوو وێنای دەکەن. ئەم ڕەش بینیەش بە قووڵی لە هزری پێوەندیدار بە پێوەندییە نێوەنەتەوەییەکانەوە سەرچاوەی دەگرێ.

مانای زەربری یەکەم لە شوێنێکی تردا باس دەکرێ. بەڵام لێرەدا تەنیا پێویست دەکا ئاماژە بەو خاڵە بکەین کە شەڕی پێشگیرانە تەنیا لە کاتێکدا دەکرێ پاساو بدرێ کە دوژمنەکانی ئێستا، هێزی پێویستیان بۆ وەشاندنی زەربری یەکەم هەبێ، بەڵام نەتوانین بەرگرییەکی چالاک لە دژی

یەکتر بەڕێوە ببەن. هەڵی هەڵگیرساانی شەڕ کاتێک بە هێز دەبێ کە لایەنی بەرامبەر زانیارییەکی زۆری لە سەر ڕادەی توانایی سەربازی و جێگۆڕکێی هێزەکان و چۆنیەتی دامەزرانی هێزەکانی لایەنی بەرامبەری خۆی هەبێ.

بەپێی پێناسە، شەڕی پێشگیرانە بە دژی یاسا نێودەوڵەتیەکانە. شەڕی پێشگیرانە بڕیاردەران ناچار دەکا کە دەست بۆ وەشاندنی زەربری یەکەم ببەن کە ئەمەش لە بواری ڕەوشتی و دەروونیەوە پاساودانی تۆزێک دژوارەو، پێویست بەوە دەکا کە سەر کردە سیاسیەکان، هەوڵی بەرچاو بۆ نیشاندانی متمانەی خۆیان بەدەزگا زانیارییەکان و دامەزراوە سەربازییەکان بدەن.

## شەڕی یەکەمی جیهانی _(١٩١٨_١٩١٤) World War I

شەڕی یەکەمی جیهانی لە ساڵی ١٩١٤دا دەستی پێکرد، کە سەرچاوەکەشی بۆ ململانێی نێوان دەوڵەتە گەورەکان لەسەر کۆلۆنیالیزم وکێشە سەربازی و کێشە نەتەوایەتیەکانی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی بیستەم دەگەڕێتەوە.

بیانووی هەڵگیرسانی شەڕی یەکەمی جیهانی کوژرانی فرانسوا فردیناند، جێگری ئیمپراتۆری نەمسا لە ٢٨ی حوزەیرانی ١٩١٤ لە سەرایێڤۆ، یەکێک لە هەرێمەکانی بۆسنیا بوو. خەڵکی ئەم هەرێمە حەزیان دەکرد کە لەگەڵ سیربیادا تێکەڵ ببنەوە، بەڵام دەوڵەتی نەمسا ئێزنی ئەم کارەی نەدەدا. کاربەدەستانی نەمسا، دەوڵەتی سیربیایان بە بەرپرسیاری کوشتنی جێگری ئیمپراتۆری نەمسا دەزانی و، چوونکە نەمسا دڵنیا بوو کە ئەڵمانیا پشتیوانی لێدەکا، ئۆلتیماتیۆمێکی بە سیربیا دا، و داوای لێکرد کە لەو پیلانەی بۆ کوشتنی جێگری ئیمپراتۆری نەمسا بەڕێوە چوو، بکۆڵنەوە و، ئەوانەی کە دەستیان لەو پیلانەدا هەبووە دادگایی بکا. لە لایەکی تر، دەوڵەتی نەمسا سیربیای ڕاسپارد کە نەیارانی نەمسا لە پۆست و بەرپرسایەتی ئیداری بێبەش بکا. سیربیا ئەم ئۆلتیماتیۆمەی قبووڵ نەکرد، بەڵام ئامادە بوو کە کێشەکە بۆ دیوانی دادوەریی لاهە بنێرێ. ڕووسیاش لەم بارەوە پشتیوانی لە سیربیا کرد. نەمسا بانگەشەی بۆ ئەوە دەکرد کە وڵامەکەی سیربیا ناتوانێ ڕازی بکا، هەربۆیە نەمسا شەڕی لەگەڵ سربیادا ڕاگەیاند.

ڕاگەیاندنی شەڕی نەمسا لەگەڵ سیربیا بوو بە هۆی ئەوەی کە ئەندامانی هاوپەیمانیی سێ گۆشە (بەریتانیا، فەڕەنساو ڕووسیا) و یەکیەتی سێ کوچکە (ئەڵمانیا، نەمسا، ئیتاڵیا) شەڕ لەگەڵ یەکتر

رابگەیەنن. رووسیا هێزەکانی خۆی پۆشتە کرد تاکوو بە فریای سیربیا بکەوێ. ئەڵمانیا لە یەکەمی مانگی ئابی ١٩١٤ دا شەڕی لەگەڵ رووسیا و رۆژی دواتریش لەگەڵ فەڕەنسا راگەیاند.
کاتێک کە ئەڵمانیا بێلایەنیی بەلژیکی پێشێل کرد بۆ ئەوی کە لە پشتەوە هێرش بکاتە سەر فەڕەنسا، دەوڵەتی بەریتانیا لە چواری ئابدا شەڕی لەگەڵ ئەم وڵاتە راگەیاند. ژاپۆن بۆیە شەڕی لەگەڵ ئەڵمانیادا راگەیاند چوونکە دەیویست داگیرکراوەکانی ئەو وڵاتە کە لە زەریاری ئارام دابوو، بۆ خۆی داگیر بکا.
ئیتاڵیا لە یەکیەتیی سێ کوچکە چووە دەرێ و، هەتاکوو ساڵی ١٩١٥وەک بێلایەن مایەوەو، لەو رێکەوتەوە چووە ریزی هاوپەیمانان. هۆکارەکەش ئەوە بوو کە ئەویش دەویست دەسەلاتی ئەو ناوچە ئیتالی زمانانەی کە لەبەردەستی دەوڵەتی نەمسادا بوو و لەگەڵ چەند کۆلۆنیەکی دیکە لە ئەفریقیا بەدەستەوە بگرێ. تورکیای عوسمانی پشتیوانی لە ئەڵمانیا کرد بۆ ئەوەی کە نەهێڵێ رووسیا دەست بەسەر گەرووەکانی دەریای رەشدا بگرێ. هەتا شەڕ درێژەی کێشا ژمارەی دوژمنەکان زیادی دەکرد. بۆوێنە بولگاریا چووە ریزی وڵاتانی ناوەندی و، ئەمەریکا و پۆرتوگاڵ و یۆنان و رۆمانی چوونە بەرەی هاوپەیمانانەوە. لە ماوەی شەڕی یەکەمی جیهانیدا بە ئالمانیا و نەمسا و هاوکارەکانیان بە هاوپەیمانان دەناسران و، ئەمەریکاش لە ساڵی ١٩١٧ چووە ریزی هاوپەیمانانەوە.
لە ئەورووپا، ئەفریقیا، رۆژهەلاتی نزیک و رۆژهەلاتی دوور شەڕ نێوان لایەنەکانی شەڕ لە ئارادا بوو، بەلام شەرە سەرکیەکان لە ئەورووپا بوو. گرنگترین گۆڕەپانی شەڕ لەو کیشوەرەدا فەڕەنسا بوو. ئەڵمانیەکان کە دەیانویست بە زووترین کات پاریس داگیر بکەن و بە خاکی بەلژیکدا تێپەڕین و هێرشیان کردە سەر فەڕەنسا، بەلام لەمانگی ئەیلوولی ١٩١٤دا هاوپەیمانان لە شەڕی مارۆن لە فەڕەنسا، پێشیان بە هێرشەکان گرت. بەلام سەرەڕای هێرشە بەردەوامەکانی ئەڵمانیەکان وهێرشی بەرامبەرانەی هاوپەیمانان، هێڵە گشتیەکانی گۆڕەپانەکانی شەڕ هەتاکوو ساڵی ١٩١٨، واتە هەتا کۆتایی شەڕ هەروەک خۆی مایەوەو، لەم رێکەوتە بەدواوە بوو کە هاتنی ئەمەریکیەکان بۆ نێو شەرەکە بارودۆخەکەی بە قازانجی هاوپەیمانان گۆڕی.
لەبەرەی رۆژهەلاتدا رووسەکان بە توندی لەبەرامبەر ئەڵمانیەکاندا شکستیان خواردو، کاتێک لە ساڵی ١٩١٧دا بۆلشفیکەکان لە رووسیا دەسەلاتیان بەدەسەوە گرت، لە شاری برێست لیتۆفسکدا،

ڕێککەوتننامەیەکیان لەگەڵ ئەڵمانیەکاندا گرێدا، خۆیان لە شەڕەکە کێشایەوە. لە دوایین ساڵی شەڕدا بولگاریا و تورکیا و نەمسا خۆیان بەدەستەوەدا.
هاوپەیمانان هەموو کۆلۆنیەکانی ئەڵمانیایان لە ئەفریقیا و ڕۆژهەڵاتی دوور داگیر کردو، وڵاتانی سەر بە عوسمانیشیان لە ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاستدا، واتا سووریا و عەرەبستان داگیر کرد. شکستی کۆتایی ئەڵمانیەکان لە ئاکامی هێرشی هاوپەیمانان لە ساڵی ١٩١٨دا بە سەرۆکایەتیی مارشاڵ " فووش"ی فەرەنسی بوو و، ئەڵمانیا بە ناچاری داوای کۆتایی شەڕی کردو، کاتێک لە ١١ی تشرینی دووهەمی ١٩١٨دا مەرجەکانی هاوپەیمانانی قبووڵ کرد، شەڕی یەکەمی جیهانی کۆتایی پێ هات.

## شەڕی دووهەمی جیهانی (١٩٤٥_ ١٩٣٩) World War II

هیتلەر، پێشەوای ئەڵمانیای نازی بە بەدەستەوە گرتنی پۆستی فەرماندەیی گشتیی هێزەکانی ئەڵمانیا لە شوباتی ١٩٣٨دا پێگەی خۆی بەهێز و پتەو کردو، وردەوردە پۆستە گرنگ و هەستیارەکانی دەوڵەتی بە نازییەکانی نەمسا سپارد. ڕۆژی ١٢ی مارت هێزەکانی ئەڵمانیا لە سنوورەکانی نەمسا پەڕینەوەو، ڕۆژی دواتر لکانی نەمسا بە ئەڵمانیا ڕاگەیانرا. هیتلەر سوور بوو لەسەر ئەوی کە بە پشتیوانی سێ میلیۆن چێکی ئەڵمانی زمانی دانیشتووی هەرێمی سوودوت، ئەم وڵاتەش بە ئەڵمانیاوە بلکێنێ. لە مانگی مارتی ١٩٣٩دا هیتلەر بەکردەوە هێرشی کردە سەر چیکسلۆڤاکیاو، هەموو ئەو وڵاتی داگیر کردو بە ئاڵمانیاوەی لکاند.
دوای داگیرکردنی ئەم دوو وڵاتە، هیتلەر دەستی بە هەڕەشەکردن لە پۆڵەندا کردو، لە ئابی ١٩٣٩دا ئەڵمانیا و، سۆڤیەت ڕێککەوتننامەیەکی هێرش نەکردن بۆ سەر خاکی یەکتریان مۆر کرد.
ڕۆژی یەکەمی ئەیلوولی ١٩٣٩، هێزە مۆتۆریزەکانی ئەڵمانیا _ سەرەڕای بەرگری قارەمانانەی خەڵکی پۆڵەندا _ بە پشتیوانی بەربڵاوی هێزە ئاسمانیەکان، لە ماوەی چوار حەوتوودا ئەم وڵاتەیان داگیر کرد. لە نۆی نیسانی ١٩٤١دا ئەڵمان هێرشی کردەسەر دانیمارک و، ئەم وڵاتەشی داگیر کرد.
لە هێرش بۆ سەر نەرویجدا، هێزەکانی فەرەنسا و بەریتانیا بەهانای ئەم دەوڵەتەوە چوون، بەڵام بەرگریی ئەوانیش لە ١٠ی حوزەیراندا کۆتایی پێهات. ئەڵمانیا لە ١٠ مانگی ئایاردا هێرشی کردە

سەر هۆڵەندا، بەلجیک و لۆگزامبۆرگ و، ئەوانیشی داگیر کرد. لە ٢٦ی مانگی ئایاردا سوپای بەلجیک خۆی بەدەستەوەدا.

لە نێوان ٢٦ی مانگی ئایار، هەتا ٤ی مانگی حوزەیران، زیاتر لە ٢٠٠ هەزار سەربازی بەریتانیی و ١٢٠ هەزار سەربازی فەڕەنسی لە ژێر بۆمبارانی فڕۆکەکانی ئەڵمانیا، بەندەری دوونکرۆکی فەڕنسایان بە پشتیوانی فڕۆکە شەڕکەرەکانی بەریتانیا و بە هەزار پاپۆر، چۆڵ کرد.

لە ڕۆژی پێنجی حوزەیرانی ١٩٤٠دا هێزەکانی نازی هێڵی بەرگریی سوپای فەڕەنسایان تێک شکاندو، بە خێرایی بەرەو باشوور هێرشیان برد. ئیتالیای فاشیستی لە ڕۆژی ١٠ی حوزەیراندا شەڕی لەگەڵ فەڕەنسادا ڕاگەیاند. ئەڵمانیەکان دوای چوونە نێو پاریس لە ٢٢ی حوزەیرانی ١٩٤٠دا، مەرجەکانی ئاشتیی خۆیان بە سەرفەڕەنسادا سەپاند کە بەپێی ئەو، فەڕەنسا بە سەر دوو بەش، دابەش بوو. بەشێک لەو ژێر دەسەڵاتی ئەڵمانیا داو، بەشەکەی تریش کە پایتەختەکەی شاری ڤیشی بوو لە ژێر دەسەڵاتی فەڕەنسادا بوو.

سەرۆکایەتی حکومەت لە لایەن مارشاڵ پیتن بەڕێوە دەچوو. فەڕەنسای ڤیشی لە ساڵی ١٩٤٢دا لە لایەن هێزەکانی ئەڵمانیاوە داگیر کرا، بەڵام حکومەتی ڤیشی هەتاکوو ساڵی ١٩٤٤ مایەوە.

تاقمێک لە فەڕەنسیەکان لە لەندەن بە سەرۆکایەتی مارشاڵ دۆگول حکومەتی کاتیان دامەزراندو، لە نێوخۆی وڵاتیشدا باڵی چەپ سەرەڕای توونددوتیژییەکی زۆری ئەڵمانیا و گۆستاپۆکان لەگەڵ فەڕەنسیەکاندا، شانەی بەرگریان پێکهێنا.

لە تەمووزی ١٩٤٠دا، هێرشی شێری دەریایی دەستی پێکرد و، هێزەکانی ئەڵمانیا هێرشە ئاسمانیەکانی خۆیان بە ناوی هێرشی هەڵۆ لە دژی بەریتانیا دەست پێکرد. بەریتانیەکانیش بە هۆی هەبوونی دەزگاکانی ڕادار توانیان زەربرێکی زۆر گەورە لە هێزە ئاسمانیەکانی ئاڵمانیا بدەن.

لە ڕێکەوتی ٢٢ی حوزیرانی ١٩٤١دا، سوپای نازی هێرشێکی بەربڵاو و هەمەلایەنەی بەدژی سۆڤیەت دەست پێکرد. بەرگریی قارەمانانە و لێبڕاوانەی خەڵکی سۆڤیەت بە تایبەتی لە ستالینگرادو بووە هۆی ئەوەی کە پاشەکشە بە ئەڵمانیەکان بکەن.

لە ٧ی کانوونی یەکەمی ١٩٤١دا، فڕۆکەکانی ژاپۆن هێرشەکانی خۆیان بۆسەر پڕلهاربێر دەست پێکرد و، پاپۆرە شەڕکەرەکانی ئەمەریکایان دایە بەرهێرشی بۆمبەکانی خۆیان. لە مانگی ئایاری ١٩٤٢دا، ئەمەریکا هاتە نێو شەڕ بە دژی بەرەی وڵاتانی تەوەر. لە کۆتایی ساڵی ١٩٤٢دا

بەریتانیەکان دژەهێرشێکی بەرفراوانیان دارشت و، توانیان وردە وردە ئەڵمانیەکان و ئیتالیەکان لە باکووری ئەفریقیا وەدەر بنێن. لە ساڵی ١٩٤٣دا هاوپەیمانەکان دەستیان بەکردنەوەی بەرەی دووهەم کردو، سوپای هاوپەیمانان هێرشیان کردە سەر سیسیل. ئەم هێزانە دوای رووخانی مۆسۆلینی لە کانوونی دووهەمی ١٩٤٤، لە بەندری ئازیۆ لە نزیک رۆم دابەزین.

لە ٦ی حوزەیرانی ١٩٤٤، سوپایەکی گەورە لە هێزەکانی ئەمەریکا، بەریتانیاو کەنەدا لە لێوارەکانی نورماندی فەرەنسا کە لە بەردەستی نازییەکاندا بوو، دابەزین. لە هێرشی نۆرماندی دا بە سەرۆکایەتی ژەنەراڵ ئایزنهاڤێر، هاوپەیمانان زەبرێکی کوشندەیان لە هێزە شەرکەرەکانی ئەڵمانیا وەشاند. دوای شەرێکی توندو دژوار، هێزەکانی ئەڵمانیا پاشەکشەیان پێکراو، لە رۆژی ١٥ی ئابی ١٩٤٤دا هێزەکانی هاوپەیمانان لە باشووری فەرەنسا دابەزین.

لە رۆژی ١٧ی ئابدا بەشێکی گەورە لە هێزەکانی ئەمەریکا چوونە نێو شاری ئورلێئان، کە لە ١١٣ کیلۆمەتری شاری پاریسدا هەڵکەوتووە. لەو ماوەدا بزووتنەوە بەرگرییەکانی فەرەنسا لە پاریس بە دژی داگیرکرانی ئەڵمانی راپەرین و، بە لە خۆبردووییەکی زۆرەوە تەنگیان بە هێزەکانی ئەڵمانی هەڵچنیبوو. دوای شەش رۆژ، لەشکرێکی زرێپۆش بە فەرماندەیی ژەنەراڵ لۆکلرۆک هاتە نێو شارو، بنکەی سەربازی ئەڵمانیەکان کە خەریکی کوشتنی ئەندامانی بزووتنەوە بوو، خۆی بەدەستەوەدا؛ بەم شێوە دوای چوار ساڵ پاریس لەدەستی دوژمن و داگیرکەران رزگاری بوو. رۆژی دواتریش دووگۆڵ گەڕایەوە بۆ فەرەنساو، بوو بە سەرۆکی حکومەتی کاتیی وڵات.

لە رۆژی سێی ئەیلوولدا، هێزەکانی بەریتانیا چوونە نێو خاکی بەلجیکا و، پەرەشووتوانەکانی هاوپەیمانان لە هۆڵەندا هاتنە خوار تاکوو لەوێوە هێرش بکەنە سەر ئەڵمانیا (هەرێمی راین)، بەڵام لە مانگی کانوونی یەکەمدا، فەرماندەی گشتی سوپای ئەڵمانیا، مارشاڵ فن رۆنیشتادێت لە ناوچەی ئاردەنی بەلجیک هێرشی لە ناکاو و فریودەرانەی کرد، بەڵام لە ئاکامدا هێزەکانی هاوپەیمانان لە شوباتی ١٩٤٥دا، هێڵی "زیگفرید" یان تێک شکاندو، لە مانگی مارتدا لە  رووباری راینەوە چوونە نێو خاکی ئەڵمانیا.

لە کانوونی دووهەمی ١٩٤٥دا سۆڤیەت زۆر بە خێرایی هێزەکانی ئەڵمانیای لە خاکی خۆی وەدەرناو، لە رۆژهەڵاتەوە لە خاکی ئەڵمانیا نزیک دەبۆوە. هێزە هاوبەشەکانی بەریتانیا و ئەمەریکاش لە رۆژئاواوە خۆیان بۆ هێرشکردنە  سەر پایتەختی ئەڵمانیا ساز کردبوو.

لە رۆژی ٢٤ی نیساندا هێزەکانی سۆڤیەت چوونە نێو شاری بەرلین و، لەگەڵ هێزەکانی ئەمەریکادا تێکەڵ بوونەوە. لە ئاکامدا سوپای ئەڵمانیا خۆی بەدەستەوەدا و، ئەم شەڕە خوێناوییە لە رۆژی ٨ی مانگی ئایاری ١٩٤٥ لە کیشوەری ئەورووپا کۆتایی پێهات.
ئەمەریکا بە خۆبەدەستەوەدانی کۆتایی ژاپۆن، لە مانگی ئابی ١٩٤٥دا، دوو بۆمبی ئەتۆمی لە شارەکانی هێرۆشیما و ناکازاکی داو، بەرگریی ئەم وڵاتەی تێکشکاند. بەم شێوە شەڕی دووهەمی جیهانی لە هەموو بەرەکاندا کۆتایی پێهات.

## شەڕی دووهەمی کەنداوی فارس The Second Persian Gulf War

بە شەڕی ٢٤ رۆژە دەگوترێ کە هاوپەیمانە رۆژئاواییەکان بە سەرۆکایەتی ئەمەریکا بۆ ئازاد کردنی خاکی کوێت کە لەلایەن سوپای عێراق لە ٢ی ئابی ١٩٩٠ داگیر کرا، وەرێیانخست.
شەڕی دووهەم کەنداو لە سێ قۆناغ لە کۆمەڵە هێرشێک بە ناوەکانی قەڵغانی سەحرا، گەردەلوولی بیابان و شمشێری بیابان لە دژی عێراقدا دەستی پێکرد. لە قۆناغی "قەڵغانی بیابان"دا ئەمەریکا و هێزە یەکگرتووەکان دەستیان بە ناردن و سەقامگیرکردنی سەدان هەزار کەس لە هێزە چەکدارەکانی خۆیان بۆ خاکی عەرەبستان بە مەبەستی پێشگیری لە هاتنی هێزەکانی عێراق بۆ نێو خاکی ئەو وڵاتە کرد. هاوکات لەگەڵ ئەمە، بەسەدان فڕۆکەی بۆمب هاوێژ و پاپۆرەکانی هاوپەیمانان هاتنە ناوچەی کەنداوی فارس.
رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانیش لە سەرەتای هێرشەکەدا بە دەرکردنی بریارنامەی ئەنجوومەنی ئاسایش داوای لە عێراق کرد کە بە زووترین کات هێزەکانی خۆی بۆ پشت سنوورەکانی بەر لە دووی ئابی ١٩٩٠ بکێشێتەوە.
لەم پێوەندییەدا هێزەکانی هاوپەیمانان تاکوو رۆژی ١٥ی کانوونی یەکەمی ١٩٩١ ئەم ماوەیان بە دەوڵەتی عێراق بەخشی، تاکوو مل بۆ بریارنامەی ئەنجوومەنی ئاسایش رابکێشێ. بە کۆتایی هاتنی ئەم ماوە دیاریکراوە، لە کاتژمێر ٢٢:٣٠ بە کاتی گرینفیچ رۆژی ١٩٩١/١/١٦ هێرشی گەردەلولی بیابان بە فەرماندەیی ژەنەراڵ شوارتسکۆف و بە بۆمبارانی هەمەلایەنەی خاکی عێراق لە لایەن فڕۆکەکانی ئێف ـ١٧ی ستیلس و هەروەها ناردنی موشەکانی تۆماهاوکیی کرۆز لە کەنداوەوە،

لە رۆژی ٢٤ی نیساندا هێزەکانی سۆڤیەت چوونە نێو شاری بەرلین و، لەگەڵ هێزەکانی ئەمەریکادا تێکەڵ بوونەوە. لە ئاکامدا سوپای ئەڵمانیا خۆی بەدەستەوەدا و، ئەم شەڕە خوێناوییە لە رۆژی ٨ی مانگی ئایاری ١٩٤٥ لە کیشوەری ئەوروپا کۆتایی پێهات.

ئەمەریکا بە خۆبەدەستەوەدانی کۆتایی ژاپۆن، لە مانگی ئابی ١٩٤٥دا، دوو بۆمبی ئەتۆمی لە شارەکانی هیرۆشیما و ناکازاکی داو، بەرگریی ئەم وڵاتەی تێکشکاند. بەم شێوە شەڕی دووهەمی جیهانی لە هەموو بەرەکاندا کۆتایی پێهات.

## شەڕی دووهەمی کەنداوی فارس The Second Persian Gulf War

بە شەڕی ٢٤ رۆژە دەگوترێ کە هاوپەیمانە رۆژئاواییەکان بە سەرۆکایەتی ئەمەریکا بۆ ئازاد کردنی خاکی کوێت کە لەلایەن سوپای عێراق لە ٢ی ئابی ١٩٩٠ داگیر کرا، وەڕێیانخست.

شەڕی دووهەم کەنداو لە سێ قۆناغ لە کۆمەڵە هێرشێک بە ناوەکانی قەڵغانی سەحرا، گەردەلوولی بیابان و شمشێری بیابان لە دژی عێراقدا دەستی پێکرد. لە قۆناغی "قەڵغانی بیابان"دا ئەمەریکا و هێزە یەکگرتووەکان دەستیان بە ناردن و سەقامگیرکردنی سەدان هەزار کەس لە هێزە چەکدارەکانی خۆیان بۆ خاکی عەرەبستان بە مەبەستی پێشگیری لە هاتنی هێزەکانی عێراق بۆ نێو خاکی ئەو وڵاتە کرد. هاوکات لەگەڵ ئەمە، بەسەدان فڕۆکەی بۆمب هاوێژ و پاپۆرەکانی هاوپەیمانان هاتنە ناوچەی کەنداوی فارس.

رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانیش لە سەرەتای هێرشەکەدا بە دەرکردنی بڕیارنامەی ئەنجوومەنی ئاسایش داوای لە عێراق کرد کە بە زووترین کات هێزەکانی خۆی بۆ پشت سنوورەکانی بەر لە دووی ئابی ١٩٩٠ بکێشێتەوە.

لەم پێوەندییەدا هێزەکانی هاوپەیمانان تاکوو رۆژی ١٥ی کانوونی یەکەمی ١٩٩١ ئەم ماوەیان بە دەوڵەتی عێراق بەخشی، تاکوو مل بۆ بڕیارنامەی ئەنجوومەنی ئاسایش رابکێشێ. بە کۆتایی هاتنی ئەم ماوە دیاریکراوە، لە کاتژمێر ٢٢:٣٠ بە کاتی گرینفیچ رۆژی ١٩٩١/١/١٦ هێرشی گەردەلوولی بیابان بە فەرماندەیی ژەنەراڵ شوارتسکۆف و بە بۆمبارانی هەمەلایەنەی خاکی عێراق لە لایەن فڕۆکەکانی ئێف ـ١٧ی ستیلس و هەروەها ناردنی موشەکانی تۆماهاوکیی کرۆز لە کەنداوەوە،

دەستی پێکرد. هاوپەیمان لە حەوتوویەکدا بەگشتی دوازدە هەزار فڕین و ٢١٦ موشەکی تۆماهاوکیان هاویشت.

دوای ٣٨ رۆژ بۆمبارانکردنی حەست و خۆڵی عێراق، هێرشی وشکایی بۆ رەپاڵنانی هێزەکانی عێراق لە ژێر ناوی هێرشی بیابان دەستی پێکرد (٢٤ی شوباتی ١٩٩١)و، تەنیا سەد کاتژمێر درێژەی کێشا. لە ئاکامدا عێراق مەرجەکانی هاوپەیمانانی بۆ ئاگربەست قبووڵ کرد (٢٨ی شوباتی ١٩٩١).

بەگشتی لە ماوەی ئەوشەڕەدا هاوپەیمانان ١٠٦,٠٠٠ فڕینیان بە دژی عێراق بەڕێوە بردو، رێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکانیش لە رێکەوتی ٢ی ئابی ١٩٩٠ هەتا ١٧ی کانوونی دووهەمی ١٩٩١بە گشتی نۆزدە بڕیارنامەی لەم پێوەندییەدا پەسند کرد.

لە ماوەی ئەم شەڕەدا عێراق بە هاویشتنی موشەکی ئیسکاد بۆ ئیسرائیل و عەرەبستان وەڵامی هێرشەکانی هاوپەیمانانی دەدایەوە، بەڵام دژە موشەکەکانی پاتریۆت توانیبوویان تارادەیەکی زۆر وڵامی ئەو هێرشانە بدەنەوە. ئەم شەڕە بوو بە هۆی راپەڕینی کوردەکان و شیعەکان بە دژی حکومەتی ناوەندیی عێراق. سەرکوتی کوردەکان و شیعەکان و هەروەها تۆپباران کردنی شوێنە پیرۆزەکان لە لایەن سوپای عێراقەوە بوو بە هۆی ئەوەی کە هێزەکانی هاوپەیمانان " ناوچەی ئارام" لە بەشی کوردستانی عێراق و، هەروەها دوو ناوچەی دژەفڕین لە سەر هێڵی ٣٣ و ٣٦ پلە لە باشوور و باکووری ئەو وڵاتە پێک بێنێ.

گواستنەوە و جێگۆڕکێ پێکردنی موشەکەکانی سوپای عێراق لە کانوونی یەکەمی ١٩٩٢ و کانوونی دووهەمی ١٩٩٣دا بوو بە هۆی ئەوی کە شارەکانی عێراق لە لایەن ١١٠ فڕۆکە وچل موشەکی کرۆزی هاوپەیمانانەوە بومباران بکرێ.

ئەگەرچی ئەو هێرشانە لە رۆژەکانی کۆتایی قۆناغی سەرۆک کۆماری جۆرج بوش، سەرۆک کۆماری ئەوکاتی ئەمەریکادا(١٩٩٣_١٩٨٩)بوو، بەڵام بۆمبارانی ئەمەریکیەکان تەنانەت پاش گوازرانەوەی پۆستی سەرۆک کۆماری بۆ بیل کلینتۆن (چل و دووهەمین سەرۆک کۆماری ئەمریکا ) هەتا چەند رۆژ بەردەوام بوو.

بەشێک لە دەرەنجامە دیارەکانی ئەم شەڕە لە ناوچەی رۆژهەڵاتی نێوەڕاستدا بەم شێوەیەیە:

١_ سەقامگیربوونی بەربڵاو و هەمەلایەنەی هێزە سەربازییەکانی رۆژئاوا لە عەرەبستان و ناوچەی کەنداوی فارس بەمەبەستی دەستبەسەرداگرتنی چاڵە نەوتیەکان.

٢ــ گرێدانی پەیمانە بەرگرییەکانی دوو یان چەند لایەنەی وڵاتانی عەرەبیی ناوچەی کەنداو لەگەڵ هاوپەیمانە رۆژئاواییەکان.

٣ــ فرۆشی لەرادەبەدەری چەک وچۆڵ و کەرەسە سەربازییەکانی رۆژئاوا بە وڵاتانی عەرەبی.

٤ــ دابەش بوونی دوفاکتۆی عێراق بەسەر سێ ناوچەی کوردستان، ناوەند و شیعەنشینی باشوور.

٥ــ پێکهاتنی کۆنفرانسی ئاشتیی مەدرید لە نێوان ئیسرائیل و عەرەبەکان (تشرینی یەکەمی ١٩٩١) کە بە بروای بۆش ئەم کارە یەکێک لە گەورەترین دەسکەوتەکانی شەڕی دووهەمی کەنداو بووە. ئەم وتووێژانە دواتر لە ئەمەریکا درێژەیان پێدراو، لە دەرەنجامدا، مۆرکرانی رێککەوتننامەی سازانی رێکخراوی رزگاریدەری فەلەستین و ئیسرائیلی لە ئەیلوولی ١٩٩٣ دا لێکەوتەوە.

هێندێک لە تیۆری دارێژان بەم شێوەیە دەرەنجامە سیاسی و سەربازییەکانی ئەم شەڕە لێک دەدەنەوە:

١ــ دەرەنجامە سیاسیەکان

الف) رێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان بەوە تاوانبار کرا کە بۆتەئامرازێک لەبەردەست ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا.

ب) ویلایەتە یەکگرتووەکان و هاوپەیمانەکانی بە پیادەکردن و بەڕێوەبردنی سیاسەتی جیاوازی دانان و هەڵاواردن تاوانبار کران. چوونکە پێشتریش بابەتی لەمجۆرە واتە پێشێلکردنی یاسا نێونەتەوەییەکان (تەنانەت لە لایەن خوودی ئەمەریکاوە) رووی داوە.

ج) زۆر ئامانج و مەبەست لە پشتی پەردەی کردەوەی رۆژئاوادا هەبوون، کە نیگەرانی لە برانی نەوت بە یەکێک لەوان دەژمێردرێ.

٢ــ دەرەنجامە سەربازییەکان

الف) بۆ پێشگیری لەشەڕ دەبێ لە رێگای دیپلۆماتیک بە شێوەیەکی کاریگەر کەڵک وەربگرن.

ب) ناکارامەبوونی چەکە ناوەکیەکان و، دیاریکردنی رۆڵی چەکە ئاساییەکان بۆ شەڕەکانی داهاتوو.

ج) هێزی ئاسمانیی بەگشتی وبەرگریی ئاسمانی بە تایبەتی رۆڵێکی گرنگ لە دیاریکردنی چارەنووسی شەڕ دەگێڕێ، بەڵام سەرکەوتن بەبێ بوونی هێزی ویشکایی بەدی نایا.

د) هەرەشەی موشەکەکانی بالیستیک زیاتر لە رادەی پێویست زەق کرابۆوە.

ه) گرنگیی بەکارهێنانی چەکە پێشکەوتووەکان.

و) گرنگیی پاراستنی رۆح ورۆلی دیمۆکراسی بۆ کەلک وەرگرتن لە خاڵە لاوازەکانی رژێمە دیکتاتۆرەکان.

پێویستە بگوترێ کە بەرگری لاوازی هێزەچەکدارەکانی عێراق لە کۆمەڵێک هۆکارەوە سەرچاوەی دەگرت تاکوو لە لاوازییەکی گشتیی جۆری بەگری کردنی شەڕەوە سەرچاوەبگرێ، وەک

_ لاوازییە فیزیکیەکان کە لە بەرگری ئاسمانیی عێراقەوە سەرچاوەی گرت.

_ هەڵبژاردنی فەرماندەرانی سەربازی بەپێی بەرژەوەندیی سیاسی بوو، هەتا ئەوەی کە پێوەرەکانی لێهاتوویی و توانایی لە بەرچاو بگیرێ.

_ گۆڕپانی شەڕ بۆ شەڕێکی بەرگری زۆر نالەبار بوو بە تایبەتی بۆ بەرگریکردن لە پێگە و شوێنە سەقامگرتووەکان.

_ گرنگتر لە هەمووان ئەوە کە هێزە چەکدارەکانی عێراق نەیانتوانی لە رۆڵی بەرگریکردندا خۆ بنوێنن بە ڵکوو ئەو داگیرکەرانەبوون کە بە خێرایی ناچارکران بەرگری لە خۆیان بکەن.

## شەڕی سارد، قۆناغی (١٩٩٠_١٩٤٥) Cold War Era

ئەم قۆناغە کە دوای کۆتایی شەڕی دووهەمی جیهانی لە نێوان دوو زلهێزی رۆژهەلاّت و رۆژئاوادا دەستی پێکرد، چل و پێنج سالّی درێژە کێشا و، لە ئاکامیشدا لە رێکەوتی ١٩ی تشرینی دووهەمی ١٩٩٠کۆتایی پێهات. لەم رۆژەدا گۆرباچۆف، دوایین سەرۆکی یەکیەتیی سۆڤیەت، یەکگرتنەوەی دوو ئەڵمانیای کە بەپێی ویستی رۆژئاوا جێبەجێ ببوو، بە رووداوێکی گرنگ و مەزن پێناسە کرد. لە بواری جوگرافیەوە ئەم کێشە و ناکۆکیە لەسەر داگیرکردنی ناوچەی پان و بەرینی ئۆراسیاو لە ئاکام دا بەدەستەوەگرتنی دەسەلاّتی جیهانی بوو. قۆناغی شەڕی سارد سێ قۆناغی روون و دیاریکراوی هەبوو: قۆناغی یەکەم لە سالّی ١٩٤٥ هەتا سالّ ١٩٥٣، واتە سالّی مردنی ستالین. لەم قۆناغەدا گرنگترین بیرۆکەی ستالین پاراستن و هارینی دەسکەوتە سەرەکیەکانی خۆی لە شەڕدا واتە دەسەلاّت بەسەر ئەورووپای ناوەندی بەبێ تێکهەڵچوونێکی راستەوخۆ لەگەلّ ئەمەریکادا، بوو. لەم قۆناغەدا رۆژئاوا بەگشتی هەڵوێستێکی بەرگریکارانەی هەبوو و، ئەمەریکاش ئامادەبوونی سەربازیی خۆی لەو سەری رۆژهەلاّت (ژاپۆن) و رۆژئاوا (ئەڵمانیا) و ئۆراسیادا پاراست. دوای مردنی ستالین و کۆتایی قۆناغی یەکەمی شەڕی سارد، هەر دوو لایەن ئامادەی رێکخستنەوەی

هێزەکانیان بوون و، واپێدەچوو کە رۆژئاوا بڕیاری دابێ تاکوو حاڵەتێکی هێرشبەرانە بە خۆوە بگرێ.

زیاترکردن ۆ بەهێزکردنی پرۆگرامەکانی رادیۆی ئەورووپای ئازاد بۆ وڵاتانی ژێردەسەڵات و نفووزی سۆڤیەت، زیاترکردنی پشتیوانیی ماڵی لە چالاکیە سیاسیەکانی هاووڵاتیانی سۆڤیەت و ئەورووپای رۆژهەڵات کە لە رۆژئاوادا نیشتەجێ بوون، هەوڵی زۆرتر بۆ پشتیوانی لە تاقمەکانی دژە سۆڤیەت لە تایبەتمەندییەکانی ئەم ڕێبازە بوون.

لە قۆناغی دووهەمی شەڕی سارد کەلە ۱۹۵۳ هەتا ۱۹۷۰ درێژەی کێشا، بڕیار بوو کە سۆڤیەت لە بواری ئابوورییەوە وەپێش ئەمەریکا بکەوێتەوە و، گشت جیهانی کۆمۆنیستیش لە بواری ئابوورییەوە، لەجیهانی سەرمایەداری بە هێزتر بێ.

لەم قۆناغەدا، ئەمەریکا و سۆڤیەت بۆ جارێکی تر بە شێوەیەکی جیددی رووبەڕووی یەکتر بوونەوە جارێکیان لەسەر بەرلین و جارەکەی تر لەسەر کوبا، کەلە هەر دوو حاڵەتدا خۆنواندن و مانۆڕی سۆڤیەتیەکان ئەم قەیرانەی نابۆوە. گەرچی سەرکەوتنی ئەمەریکا کاتیی بوو، بەڵام دەسکەوتەکانی سۆڤیەت زیاتر بوون. دروستکردنی دیواری بەرلین لە لایەن سۆڤیەتەوە بوو کە کەس پێشی پێ نەگرت، بوو بە هۆی بەهێزبوونی هەرچی زیاتری دەسەڵاتی سۆڤیەت بەسەر ئەڵمانیای رۆژهەڵات و لە ئاکامیشدا بە سەر ئەورووپای ناوەندیدا. هەڵگرتنەوەی موشەکەکانی سۆڤیەت لە کوبا لە بەرامبەر ئەو رێککەوتنەدا بوو کە دەوڵەتی کەنێدی (۱۹٦۳ـ ۱۹٦۱)، دانی بە سیستەمێکی لایەنگری سۆڤیەت لە کوبا دادەنا.

قۆناغی سێهەمی شەڕی سارد لە دەیەی ۱۹۷۰ەوە دەست پێدەکا. لەم قۆناغەدا توندیی هێرشەکانی سۆڤیەت بە لوتکە گەیشت. ماندووبوونی لە رادەبەدەری ئەمەریکا لە شەڕی ڤێتنام و حەزی رۆژئاوا بەکەمکردنەوەی گرژی و ئاڵۆزی و پێکهێنانی پێوەندیی نێوان ئەمەریکاو چین لە تایبەتمەندییە گرنگەکانی ئەم قۆناغەن. هێرشە جیهانیەکانی سۆڤیەت لە ڤێتنام، ئەتیۆپی، یەمەن، کوباو ناوچەی رۆژهەڵاتی نێوەڕاست و هەروەها ئەنگۆلاو مۆزامبیک، رەهەندێکی بەرفراوانی بە خۆیەوە گرت. مەبەست لە دامەزراندنی موشەکەکانی ئێس.ئێس۲۰ کە ئەورووپای رۆژئاواو ژاپۆنی کرد بۆوە ئامانج، تۆقاندن و ترساندنی رکابەر بوو. بەڵام دەرەنجامی ئەم رەهەندە پێچەوانەوە بۆوەو، مەزنخوازییە لە رادەبەدەرەکانی سۆڤیەت بوو بە هۆی خێرایی بەخشین بەم هەڵگەڕانەوە گرنگە

میژوویە. هێرشی سۆڤیەت بۆ سەر ئەفغانستان لە مانگی کانوونی یەکەمی ١٩٧٩، ئەمەریکای لە بواری جوگرافیەوە ناچار کرد تاکوو پشتیوانی لە سیاسەتی کوشتنی راستەوخۆی سەربازانی سۆڤیەت بکاو، ئەمەریکا دەستبەجێ سیاسەتی پشتیوانی هەمەلایەنە لە موجاهدینی ئەفغانی گرتەبەرو، بە نوێنەرایەتی لە لایەن بەرگریی ئەفغانستان هاوپەیمانەتیەکی لە ولاّتانی پاکستان، چین، عەرەبستان، میسرو بەریتانیا پێک هێنا.

گرەنتیکردنی بە ئاشکرای ئاسایشی پاکستان لە لایەن ئەمەریکا لە بەرامبەر هێرشی هەمەلایەنەی سەربازیی سۆڤیەت و پێکهێنانی ناوچەیەکی ئارام بۆ پارتیزانەکانی ئەفغانستان بوو بە هۆی ئەوەی کە ئەمەریکا بتوانێ سۆڤیەت لە زلکاوی شەڕێکی وەک شەڕی ڤێتنام رۆبەرێ.

ئەمەریکا هاوکات لەگەڵئەو هەوڵ و چالاکیانەدا، بڕیاریدا تاکوو موشەکە دوورهاوێژە زۆر وردەکانی خۆی لە ولاّتانی ئەورووپای رۆژئاوادا سەقامگیر بکاو، لەوێوە خاکی سۆڤیەت لەبەرامبەر هێرشێکی چاوەڕواننەکراودا بداتە بەر هێرشی پەلامارەکانی خۆی.

هاتنەسەرکاری گۆرباچۆف لە مارتی ١٩٨٥ و دەستپێکردنی چەندین ریفۆرم کە بە نارێک و پێکی و خێراییەکی لەرادەبەدەرەوە بەڕێوە چوو، نەک تەنیا ژیانێکی دووبارەی وەبەر سیستەمی سۆڤیەت نەهێناوە، بەڵکوو خاڵە لاوازەکانی ئەم سیستەمەی زیاتر خستەڕوو.

زیادبوونی پێشبڕکێکانی چەک وچۆڵ، ئابووری ولاّتی لە گروتین خستبوو و، هەروەها خۆبەدەستەوەدانی سۆڤیەت لەبەرامبەر بزووتنەوەی یەکگرتووی پۆڵەنداو نەرمی نواندن لە بەرامبەر ئەو بزووتنەوەدا، خێرایی بە سەرهەڵدانی سەرکردەیەکی کۆمۆنیستی و خەڵکی تر و ریفۆرمخوازتر بەخشی و، لە ئاکامدا بوو بە هۆی نزیک بوونەوەی کاتی رووخانی سیستەمە کۆمۆنیستیەکان.

لە ساڵی ١٩٨٩دا گۆرباچۆف دوو رێگای زیاتر لە بەردەم دانەبوو، یان دەبوایە بە خوێنرشتنێکی زۆر زیاترەوە کە دوور نەبوو ببێتە هۆی تەقینەوەیەکی توندوتیژانە لە نێوخۆو لە دەرەوەی ولاّت و، ئەگەری ئەوە هەبوو کە ئەمەریکاش خۆی تێوەربدا دەسەلاّتی پێشوو بپارێزێ یان ئەوەی کە خۆی بەدەستەوە بدا. گۆرباچۆف رێگای دووهەمی هەڵبژاردو، لە ئاکامی ئاڵۆزی و بشێوی لە ئەورووپای رۆژهەلاّت و ناوەندیدا، بلۆکی کۆمۆنیزم لەبەریەک هەڵوەشا.

بیرژنسکی دەڵێ:

دەکرێ گۆرباچۆف ــ دوایین سەرۆکی سۆڤیەت ــ لە بواری پراکتیکیەوە بە مامۆستایەکی هەڵە هەڵسەنگاندن و لە بواری مێژووییەوە بە کەسایەتیەک دابنێین کە چارەنووسێکی تراژێدی هەبوو. ناوبراو پێیوابوو کە دەتوانێ ئەو ئابوورییەی کە بێرژنێف بە بوودجە قورسە سەربازییەکی لە نێوی بردبوو، جارێکی تر زیندوو بکاتەوە. ئاکامەکانی شەڕی ئەفغانستان و بەردەوامیی بزووتنەوەی یەکگرتوو لە پۆڵەندا و هەوڵ بۆ ئاشتکردنەوەی رۆژهەڵات و رۆژئاوا، مەترسی دەستێوەردانی سەربازیی سۆڤیەتی لە نێو بردو؛ دژکردەوەکانی گۆرباچۆف بوو بە هۆی هەڵوەشانەوەی هەرچی زیاتر رژێمی کۆمۆنیستی و، لە ئاکامدا بوو بەهۆی لەبەریەک هەڵوەشانەوەی بەرەسمیی یەکیەتیی سۆڤیەت لە کانوونی یەکەمی ١٩٩١دا.

## شەڕی باڵوێزخانەکان (١٩٨٧) War Of The Embassies

بەرەوتێکی سیاسی لە پێوەندیی نێوان دوو دەوڵەتی ئێران و فەرەنسا دەگوترێ کە بوو بە هۆی گەمارۆدرانی باڵوێزخانەی ئێران لە پاریس و لە ژێرچاوەدێری گرتنی باڵوێزخانەی فەرەنسا لە تاران (بەهۆی ئامادە بوونی ژان پۆل تووریی کۆنسوڵی فەرەنسا لە تاران کە بە بەڕێوەبردنی کاری نایاسایی و نائیسلامی (ا.و) تاوانبار کرا بوو )و، لە ئاکامدا بە هۆی ئەوی کە پێوەندیی سیاسیی نێوان دوو وڵات لە ئابی ١٩٨٧دا بپچڕێ. دەوڵەتی فەرەنسا بڕیاریدا بوو کە یەکێک لە ئەندامانی باڵوێزخانەی کۆماری ئیسلامی ئێران لە پاریس بە تاوانی هەبوونی پێوەندی هاوکاری لەگەڵ تیرۆریستەکانی بەڕێوەبەری تەقینەوەکانی ئەیلوولی خوێناویی ١٩٨٦ بۆ دادگا بانگ بکرێ و، دەوڵەتی کۆماری ئیسلامیش لەبەرامبەردا کۆنسولی فەرەنسای بۆ دادگای شۆڕشی ئیسلامی بانگ کرد. دوای چەندین مانگ پچڕانی پێوەندی، لە ئاکامدا هەردوولایەن لەسەر ئەو رێککەوتن کە بەگۆڕینەوەی ئەندامی باڵوێزخانەی کۆماری ئیسلامی و ژان پۆل تووری کۆتایی بەم شەڕە بێنن.

## شەڕی کیمیاوی Chemical War Fare

لە شەڕی کیمیاویدا لە ئامرازەکانی وەک کەرەسەکانی تەقینەوە، گازە سووتێنەر، خنکێنەر، دووکەڵاوی و ئاگردارەکان کەڵکیان لێ وەردەگیردرێ. کەڵک وەرگرتن لە گازی ژەهراویی

کلۆر لەشەڕی یەکەمی جیهانیدا لە لایەن ئەڵمانیەکان بە یەکەم نیشانەی کەڵک وەرگرتنی بەرفراوانی ئەو چەکە لە شەڕ دادەنرێ. لە شەڕی دووهەمی جیهانیشدا کەرەسە کیمیاویەکان لە لایەن لایەنەکانی شەڕەوە تارادەیەک کەڵکی لێ وەرگیرا. ئەمڕۆکە لە گۆڕەپانەکانی شەڕدا لەم جۆرە ئامرازانە بە شێوەی جۆراوجۆر کەڵکی لێ وەردەگیرێ. بۆمبی ناپاڵم و بۆمبە کیمیاویە سووتێنەرەکان لە گۆڕەپانەکانی شەڕو لە شەڕەکانی هیند وچین، شەڕەکانی یەمەن و شەڕەکانی ئەفریقیا کەڵکیان لێ وەرگیراوە. هەروەها لەشەڕی ئێران و عێراقیشدا ئەم چەکە کەڵکی لێ وەرگیراوە.

## Just War

### شەڕی ڕەوا

لە روانگەی ئیسلامەوە ئامانجی شەڕو ئەو ئامراز و شێوازانەی کە لەشەڕدا کەڵکیان لێ وەردەگیرێ، ڕەوا یان نارەوابوونی شەڕ دیاری دەکەن، بەگشتی، هێرشکردن، زۆڵم کردن و دەستدرێژی کردن لە ئیسلامدا بەڕەوا دانانرێ.

مارکسیەکانیش ( بەپێی بنەما ئایدۆلۆژییەکانی خۆیان) لەسەر ئەو بڕوایەن کە: " شەڕە ڕەواکان لە پێناوی گەشەی کۆمەڵایەتیدا بەڕێوە دەچن و، هۆکاری بوونی ئەم شەڕانەش تێکشکاندنی سیستەمە کۆنەکان، چەوساندنەوەو دەسەڵاتی داگیرکەران و ڕێگا خۆش کردن بۆ دامەزراندنی سیستەمە کۆمەڵایەتیە پێشکەوتووەکانە. ئەم شەڕانە لە دژی ئەمپریالیزم و لە پێناوی پێشکەوتنی کۆمەڵ و سۆسیالیزمدا بەڕێوە دەچن".

## Ideological War

### شەڕی ئایدۆلۆژیا

جۆرێک لە کێشە وناکۆکیی نێوان سیستەمە ئایدۆلۆژییە ڕکابەرەکان یان شێوازی ژیانە، کە بە مەبەستی گۆڕینی بیروبۆچوون و ڕوانگەی جەماوەر سەر هەڵدەدا. شەڕی ئایدۆلۆژیا بە کەڵک وەرگرتن لە پروپاگەندە، پرۆگرامە کولتووری، ڕاهێنان و هونەرییەکان، گەلاڵە زانستیەکان، هاوکاریە دەرەکیەکان و شتی لەمجۆرە بەڕێوە دەچێ. گرنگترین شەڕی ئایدۆلۆژیا لە سەدەی بیستەمدا لە نێوان کۆمۆنیزم و سەرمایەداری دابوو.

## شەڕی ناڕەوا Unjust War

شەڕێکی داگیرکارانەیە بۆ چەوسانەوەی نەتەوەکان و بەرفراوان خوازی. یەکێک لە شێوازە سەرکیەکانی وڵاتانی داگیرکار هەڵایسانی شەڕە نێوخۆییەکانە. ئەم شێوازە بە چەندین مانۆڕی جۆراوجۆر بەڕێوە دەچێ و، هێندێک جاریش لە لایەن بەرکرێگیراوانی ئەوانە جێبەجێ دەکرێ.

## شەڕی بەرتەسک Limited War

کێشەو شەڕێکی چەکدارانەیە کە ئامانجەکەی لە نێوبردنی بەتەواوەتی یان خۆبەدەستەوەدانی بێ ئەملاوئەولای دوژمن نیە. مەودای شەڕی بەرتەسک بە سەرنجدان بە رادەی ئەو هێزە تێکدەرەی کە بە کاردێ یان بە ژمارەی بەشداران لەو شەڕەدا، یان بە بەربلاویی ناوچەکانی شەڕ یان گەیشتن بە ئامانجە سیاسیەکان بە جێگای ئامانجە سەربازییەکان یان تێکەڵاوێک لە هەمووی ئەو حاڵانە، دیاری دەکرێ. هێندێک لە حاڵەتەکانی شەڕی بەرتەسک بریتین لە :

١ـ تێکهەڵچوون لە نێوان دەسەڵاتە ئەتۆمیەکان بەبێ کەڵک وەرگرتن لە چەکی کوشتاری بەکۆمەڵ یان هێرش بۆسەر ناوەندە پڕحەشیمەتەکانی دوولایەن.

٢ـ تێکهەڵچوون لە نێوان وڵاتانی بچووکدا بەبێ دەستێوەردانی ڕاستەوخۆی زلهێزەکان.

٣ـ تێکهەڵچوون لە نێوان وڵاتە بچووکەکان بە هاوکاری ڕاستەخۆ و ناڕاستەخۆی دەسەڵاتە ئەتۆمیەکان لە چوارچێوەی ناوچەیەکی جوگرافیدا بەبێ کەڵک وەرگرتن لە چەکە ئەتۆمیەکان.

٤ـ هێرشی سەربازی لە لایەن وڵاتێکی ئەتۆمیەوە بۆ سەر وڵاتێکی بچووک بەبێ دەستێوەردانی زلهێزەکانی تر.

٥ـ شۆڕشی نێوخۆیی بە دژی هێزێکی داگیرکەر یان دەوڵەتێکی جێگرتوو کە هەر دوو لایەن لە چەکە ئاساییەکان کەڵک وەردەگرن و، لە لایەن دەسەڵاتە ئەتۆمییە ڕکابەرەکان پشتیوانیان لێدەکرێ ( هەم لە بواری ماددی و هەم لە بواری هەم لە بواری کەسەوە) .

٦ـ تێکهەڵچوونی ئەتۆمیی زلهێزەکان کە تەنیا لە چەکە ئەتۆمیە تاکتیکیەکان بۆ بەدەستهێنانی ئامانجە سەربازییەکان کەڵک وەردەگرن.

پەرەگرتنی چەکە ئەتۆمی و غەیرە ئەتۆمیەکان لە لایەن زلهێزەکانەوە بۆتە هۆی ئەوەی کە ئەوان ناچار بن تاکوو بەر بە بەرفراوانبوونی تێکهەڵچوونەکان بگرن و، ڕێگاچارەی سیاسی بۆ مانەوەی خۆیان بدۆزنەوە.

## شەڕی میکانیزە Mechanised War Fare

بەشەڕێک دەگوترێ کە لە زرێپۆش و مەکینە کەڵک وەردەگیردرێ. هاوکات لەگەڵ شەڕی زرێپۆشیدا، بۆ پشتیوانی لەم ئامرازانە، لە فڕۆکەش کەڵک وەردەگیرێ. یەکەمین بە کارهێنانی ئامرازە میکانیزەکان لە شەڕی یەکەمی جیهانیدابوو کە بەریتانیەکان لە تانک و زرێپۆش کەڵکیان وەرگرت. لە هێرشی ئەڵمانیا بۆ سەر بەریتانیا لە شەڕی دووهەمی جیهانیدا، ڕادەی هێز و توانایی کەرەسە زرێپۆش و مەکینەکان دەرکەوت. هێزەکانی سوپای ئەڵمانیای نازی لە کەڵک وەرگرتن لە مەکینەکان شارزاییەکی بێ وێنەیان هەبوو. نەتەوەکانی تریش بە خێرایی دەستیان بە پەرەپێدانی کەرەسە میکانیزەکان کرد بۆ ئەوەی بتوانن لە بەرامبەر ئەڵمانیای نازیدا خۆ ڕابگرن. ئەمرۆکە لە شەڕی کلاسیکدا، لە ئامرازە میکانیزەکان کەڵک وەردەگیردرێ و، تەنانەت لە شەڕە پارتیزانیەکانیشدا ئەم کەرەسانە ڕۆڵێکی و بایەخێکی تایبەتیان هەیە.

## شەڕەکانی ئیسرائیل و عەڕەبەکان Arab _Israeli Wars

ئەم زاراوە ئەم شەڕانە لە خۆدەگرێ:

١_شەڕی فەلەستین (٤٩_١٩٤٨)، لە نێوان ئیسرائیل و ٦ وڵاتی عەرەبیدا.

٢_ شەڕی سوئێز (١٩٥٦)، لەم شەڕەدا هێزەکانی بەریتانیا، فەڕەنسا و ئیسرائیل بە دژی میسر هاتنە ناو گۆڕەپانی شەڕەوە.

٣_ شەڕی شەش ڕۆژە (حوزەیرانی ١٩٦٧)، لەم شەڕەدا ئیسرائیل بەدژی میسر، سووریا و ئوردۆن شەڕی کرد.

٤_ شەڕی ئۆکتۆبەری (١٩٧٣)، کە میسر سووریا بە دژی ئیسرایيل شەڕیان کرد.

٥_شەڕی ئسرائیل لە دژی لوبنان (١٩٨٢).

٦_ شەڕی جاروبارەی نێوان ئیسرائیل و فەلەستینیەکان (لە ساڵی ٢٠٠٠وە تاکوو ئێستا).

## شەڕەکانی کەنداوی فارس Persian Gulf Wars

ئەم زاراوە ئەو شەڕانە لە خۆدەگرێ:

شەڕی یەکەمی کەنداوی فارس (١٩٨٨_١٩٨٠) یان شەڕی نێوان ئێران و عێراق کە لە ٢٢ی ئەیلوولی ١٩٨٠ هەتا ٢٠ی ئابی ١٩٨٨ درێژەی کێشا.

شەڕی دووهەمی کەنداوی فارس (١٩٩١_١٩٩٠) کە دوابەدوای هێرش و داگیرکردنی کوێت لە لایەن هێزەکانی عێراقەوە روویدا (٢ی ئابی ١٩٩٠) و، دواتریش هێزەکانی هاوپەیمانان بە سەرۆکایەتی ئەمەریکا لە کانوونی دووهەمی ١٩٩١ هێرشیان کردە سەر هێزەکانی عێراق و، لە رێگای هێرشێکی خەست و خۆڵی ویشکایی و ئاسمانی توانیان ئەم هێزانە لە خاکی کوێت راوبنێن. (شوباتی ١٩٩١).

شەڕی سێهەمی کەنداوی فارس (مارت _نیسانی ٢٠٠٣ )کەدوای چەندین ئاگادارکردنەوەو لە لایەن هێزە هاوبەشەکانی ئەمەریکا و بەریتانیا بە بیانووی داماڵینی چەکی عێراق لە ٢٠ی مارتی ٢٠٠٣ دەستی پێکردو، بە گیران و رووخانی بەغدا لە رۆژی ٩ی نیساندا، رژێمی سەدامیش بەکردەوە لەبەریەک هەڵوەشاوە.

## شەڕی بەوەکالەتی هێزەکان *Proxy Forces Warfare*

بەکەڵک وەرگرتن لە هێزە سەربازییەکانی وڵاتی سێهەم لە گۆڕەپانی شەڕ، بە جێگای هێزە خۆییەکان دەگوترێ. لەم بارە دەکرێ ئاماژە بە کەڵک وەرگرتنی سەربازەکانی کوبی لە ئەنگۆلا لە لایەن سۆڤیەت یان هێزەکانی کۆنترا بە دژی نیکاراگۆوا لە لایەن ئەمەریکا بکەین.

## شەڕی ئەستێرەکان *Star Wars*

بە گەڵاڵەی " بەرگری ستراتیژیی ئاسمانیی ئەمەریکا" (ئیس. دی. ئای) دەگوترێ کە لە رێکەوتی ٢٣ی مارتی ١٩٨٣ لە لایەن رۆناڵد رێگان _ چلەمین سەرۆک کۆماری ئەمەریکا _ هاتە ئاراوە. ناوبراو داوای لە کۆمەڵەی لێکۆڵەرەوەکانی ئەمەریکا کرد کە چارەیەک بۆ شێوەکانی بەرگری لەبەرامبەر موشەکە بالستیکە ئەتۆمیەکان بدۆزنەوە. جێبەجێکردنی پرۆژەی شەڕی

ئەستیرەکان پێویستی بە کەڵک وەرگرتن لە تەکنیک و داهێنانی زۆر ئاڵۆزو نوێ هەبوو و، بەوتەی یەکێک لە زانا ئەمەریکیەکان، پێویستی بە وەدیهاتنی سێهەمین شۆڕشی پیشەسازیی جیهان هەبوو کە بەپێی ئەم شۆڕشە، گۆڕانکارییەکی گەورە لە تەکنیک و داهێنانی ئاسمانی و لە ئاکامدا لە ستراتیژیی سەربازی پێک دەهات.

دەکرا هۆکاری هەڵبژاردنی شەڕی ئەستیرەکان یان پرۆژەی ئێس.دی.ئای لە لایەن ریگانەوە بەم هۆیانە بێ:

١ــ ئەم پرۆژە وەک پلانێکی ستراتیژیی هەمەلایەنە، هەموو هێز وتواناییە شاراوە سیاسی، ئابووری، پیشەسازی ، زانستی، تەکنەلۆژی و سەربازییەکانی کۆمەڵگا پێشکەوتووە پیشەسازییەکانی دنیای بۆ ململانێ وشەڕ بانگهێشت دەکرد.

٢ــ رەهەندە سەربازییەکانی پرۆژەی ئێس.دی.ئای تەکنیکەکانی شەڕی بەتەواوەتی دەگۆڕی.

٣ــ ئەمەریکا بە کەڵک وەرگرتن لەم گەڵاڵە و، بە قۆرخکردنی تەکنیکە پێشکەوتووەکان، هەوڵی دەدا باڵادەستیی خۆی بەسەر سۆڤیەتدا بسەپێنێ.

بەوتەی کاربەدەستە ئەمەریکیەکان، مەبەست لە جێبەجێکردنی پرۆژەی ئێس.دی. ئای. (گەڵاڵەی بەرگریی ستراتیژیی )، پەرەپێدان ودامەزراندنی سیستەمێک لە سەر زەوی و لە ئاسماندا بوو کە دەکرا بە کەڵک وەرگرتن لە تەکنەلۆژیای پێشکەوتووانەی تیشکی لەیزەر و تۆپە ئەلەکترۆمۆگناتیسیەکان، موشەکە بالستیکەکانی دوژمن لە قۆناغە جیاوازەکانی فریندا لە نێو ببرێن.

ئەم کاربەدەستانە دەیانگووت کە پرۆژەی ئێس.دی.ئای، سستەمێکی بەرگرییە، کەچی ئەوە لە حاڵێکدا بوو کە بە بڕوای هێندێک لە شارەزا سەربازییەکان، بەتەکمیل بوونی ئەم سیستەمە، دەکرێ وەک سیستەمێکی گرنگی هێرشبەر لەم بوارانەوە کەڵکی لێ وەربگیرێ:

١ــ ئێس.دی.ئای، دەکرێ وەک تەواوکەری سیستەمی زەربەوەشێنی ئەتۆمی کەڵکی لێ وەربگیرێ. بۆ ئەم کارە، سەرەتا کەڵک لە سیستەمی هێرشبەرانەی ئەتۆمی لە دژی دوژمن وەردەگیرێ و، پاشان بەکەڵک وەرگرتن لە چەکەکانی ئێس.دی.ئای، بەر بەکردەی بەرامبەرانەی دوژمن دەگیردرێ یان پووچەڵ دەکرێتەوە.

٢ــ چەکەکانی ئێس.دی.ئای، دەتوانن سەتەلایتەکانی دوژمن کە بە بەراورد لەگەڵ موشەکە بالیستیکەکاندا بە ئامانجێکی ئاسانتر دەژمێردرێن، بدەنە بەر هێرش و، لە نێوی بەرن.

٣ـ بە کەڵک وەرگرتن لە چەکەکانی ئێس.دی.ئای. دەکرێ هێرشی بروسک ئاسا بە دژی ئامانجەکانی سەرزەوی، وەک تانکەرە نەوت هەڵگرەکان و فڕۆکەکان، رێک بخرێ. هێرشەکان ئەوەندە بەرفراوانن کە دەکرێ لە ماوەی سی خولەکدا وڵاتێکی پێشکەوتووی پیشەسازی بکرێ بە خەڵوز.

٤ـ ئێس. دی.ئای، دەتوانێ تەنانەت سایلۆ چیمەنتۆ و پۆڵایینەکانی موشەکان لە بەریەک هەڵتەکێنێ و، لەراستیدا یەکەم زەربەی ئەتۆمی لە دوژمن بوەشێنێ.

بە بڕوای شارەزایان، بە هۆی باشتربوونی چەندایەتی و چۆنایەتیی هێزە هێرشبەرەکانی سۆڤیەت، ئەمەریکیەکان هەستیان بە پێویستیی دامەزراندنی سیستەمێکی بەرگری و هێرشبەرانەی نوێ کردبوو. لەم رووەوە، ئەمەریکیەکان بە تەرخانکردنی بڕی سی میلیارد دۆلار ـ بۆ ئەم مەبەستە، هەوڵی گەیشتن بەم ئامانجانەیان دەدا:

١ـ رێگایەک بۆ چوونەدەر لە بۆنبەستی ئەتۆمی بدۆزنەوە و، بتوانێ سیستەمی "متمانەی وەرگرتنی دوولایەنە" (MAS) لە جێگای سیستەمی "متمانەی لەنێوبردنی بەرامبەر ". (MAD) دابنێ.

٢ـ ببێتە هۆی ئەوی کە سۆڤیەتیش بە تەرخانکردنی بودجەیەکی سەر سووڕهێنەر، لە داوی ململانێ چەک وچۆڵ بکەوێ و، لە ئاکامدا بوار بۆ هەڵوەشانەوەی سۆڤیەت خۆش بکا.

ئەگەرچی شەڕی ئەستێرەکان بۆ ماوەیەک راگیرا، بەڵام دوای بەدەسەڵات گەیشتنی جۆرج دەبلیۆ بۆش، (کانوونی دووهەمی ٢٠٠١) و، راگەیاندنی چوونە دەری بەرەسمیی ویلایەتە یەکگرتووەکان لە رێککەوتننامەی موشەکیی دژە موشەکی بالستیکی (١٩٧٢)؛ گەلاڵەیەکی دیکە بە ناوی "قەڵغانی موشەکی " جێبەجێ کرا.

## شارژدافێر *Charge D'affaires*

وشەیەکی فەرەنسیە.بە نوێنەری سیاسی وڵاتێک لە وڵاتێکی دیکەدا دەگوترێ کە ئەرکی دیپلۆماسی بەجێ دەگەیەنێ. پلەی شارژدافێر لە پلەی باڵوێز لەخوارترە.

شارژدافێرێک کەسەربەخۆ کار دەکا
c...d...a... ad hoc

c...d...a...de missi
c...d...a...en pied
c...d...a... en titre

١. شارژدافێرێک که له جیگەی کەسێکی دیکە یان بە وەکالەت کاردەکا
c... d... a... ad interim

٢. شارژدافێری کاتیی (بەگرنگیەکی کەمتر له بەرێوەبەرانی پلەی( ١و٢ )
c... d... a... of the Embassy

بەرێوبەری ژمارە ١ بەشێوەی هەمیشەیی وەکوو سەرۆکی دەستەیەکی سیاسی دادەنرێ و له بەرامبەر وەزیری دەرەوەدا بەرپرسیارە، نەک له بەرامبەر سەرۆکی دەوڵەت دا. (بەرێوبەری ژمارە ٢ یان ٣ کەسێکە کە لە جێگەی باڵوێزو وەزیری موختاردا ئەرکەکانی ئەو بەرێوە دەبا. کاتێک وڵاتێک بیهەوێ نارەزایەتیی یان دڵ هێشاوی خۆی سەبارت بە وڵاتێکی دیکە دەربڕێ، باڵوێز یان وەزیری موختاری خۆی لەو وڵاتە بانگهێشت دەکاتەوە و ئەرکەکانی ئەوان دەسپێرێتە " شارژدافێری کاتیی".

لە بنەڕەتدا، راگرتنی پێوەندی سیاسی لە ئاستی شارژدافێر بۆ ماوەیەکی زۆر و بەبێ بەڵگەیەکی عەقلانی بەپێچەوانەی هەڵسوکەوتی نێو دەوڵەتیە. پێوەندی سیاسی نێوان دوو وڵات رەنگە لە سەرەتادا لە ئاستی شارژدافێردا بێ یان بە هۆیی کێشە، پێوەندی سیاسی بۆ ئاستی شارژدافێر دابەزێ.

## شانتاژ *Chantage*

شانتاژ بە مانای دەمبەست کردن یان رووتکردنە. شانتاژ لە "فعل "ی فەرەنسی Chanter کە لە زاراوەی لاتینی Chantare بەمانای گۆرانی ووتن و فشە پێ کردن وەرگیراوە.

ئەگەر کەسێک یان گرووپێک بە هۆی پێگە یان دەسەلاتێکی بەرزترەوە، لە دژی کەسێک یان کەسانێک کەڵکی نابەجێ وەرگرێ و لایەنی بەرامبەر ناچاربکا کە بە پێچەوانەی ویستی خۆی بجوولێتەوە، بەم کەڵکە نابەجێیە دەڵێن شانتاژ. شانتاژ بە زۆری بە هۆی قسە پێ ووتن

و هەرەشە لێکردن، بەمەبەستی ریسوا کردن و سووکایەتیکردن بە لایەنێکی دیکە بەرێوە دەچێ، هەتا لایەنی بەرامبەر بێدەنگ بێ یان هەڵوێستیەکەی بگۆڕێ یا ناچار بێ باج بدا.

شانتاژ بەمەبەستی ترساندن، هەواڵی ناڕاست، ناچارکردنی کەسەکە بە ملکەچ بوون ورەنگە داواکاری نابەجێ بەڕێوە بچێ. شانتاژ بەهۆی لادان لە پێوەرە ئەخلاقیەکان بەرێوەدەچێ و ئەوکەسەی لە شانتاژ کەڵک وەردەگرێ بە پلەی جیاواز گیرۆدەی نەخۆشی دەروونی و ئەخلاقیە. شانتاژ نەخۆشیەکە و لە ئاکامی هەلومەرجی نالەباری بایۆلۆجی، پەروەردەیی و کۆمەڵایەتی (ئابووری، سیاسی و کولتووری) سەرهەڵدەدا.

### *Crystal Night* شەوی شووشەیی (١٩٣٨)

ئەم زاراوەیە کە بە "شەوی شووشەیی رایخ" یش بە ناوبانگە، بە شەوەکانی نۆ و دەی مانگی تشرینی دووهەمی ١٩٣٧ دەگوترێ کە لەم شەوانەدا، خۆپێشاندانی رێکخراوی نازییەکان لە دژی جوولەکەکان بوو بەهۆی کوژران و بریندار بوونی ٧٤ جوولەکە و قۆڵبەست کردنی ٢٠ هەزار کەس و رووخاندنی ٨١٥ دووکان و ١٧١ خانوو و سووتاندنی ١٩١ کنیسەی جوولەکەکان. رێژەی زیانەکان گەیشتە ٥٢ میلیۆن مارک کە تەنیا زیانی شیشە شکاوەکان ٥ میلیۆن مارک بوو. شەوی شووشەیی رایخ بە بیانووی کوژرانی ئەرنێست فۆم راس، سکرتێری سێهەمی بالوێزی ئەڵمانیا لە پاریس لە لایەن ئاوارەیەکی جوولەکە کە لەراستیدا بەتەمای کوشتنی بالوێزی ئەڵمانیا لە فەرەنسادا بوو، رووی دا.

### *Night Of the Long Knives* شەوی چەقۆ درێژەکان

ئادۆڵف هیتلەر بە شەوەکانی ٢٩و٣٠ی حوزیرانی ١٩٣٤ی دەگووت کە لەو شەوانەدا هیتلەر بە کەڵک وەرگرتن لە هێزی S.S، کراس مۆرەکان (قاوەییەکان)ی ئەرنێستی رۆهەم و هێندێک لە رکابەرە حیزبیەکانی خۆی تەفروتوونا کرد.

خاوێنکردنەوەی حیزبی نازی لە مۆرە توندرۆکان بە دڵی سوپای ئەڵمانیا و خاوەنی پیشەسازییەکانی ئەو وڵاتە بوو. زیاتر لە ١٠٠کەس لەم ڕووداوانەدا گیانیان لە دەست دا کە دەتوانین ئاماژە بە ژەنەراڵ نۆن ئیشلایشێر، ڕاوێژکاری پێشوو و هاوسەرەکەی بکەین.

## شۆردنەوەی مێشک Brain Washing

بەو ئازارە جەستەیی و دەروونیانە دەگوترێ کە بە هۆی پروپاگاندە، ئاخافتن، و بەخشینی پاداش بە مەبەستی ئەوەی ئاڵوگۆر لە هەڵسوکەوت یان لە بیروبۆچوونی ئەو کەسەدا پێک بێ. ئەم زاراوە لە بنەڕەت دا سەبارەت بە هەڵسوکەوتی کۆمۆنیستەکان لەگەڵ دیلەکانی شەڕ و لە ماوەی شەڕی کۆریا(٥٣-١٩٥٠)دا کەڵکی لێ وەرگیردرا، هەتا لە شێوەی هەڵسوکەوت و و هەروەها لە تێگەیشتن و بیروبۆچوونەکانی ئەوان سەبارەت بە ڕۆژئاوا، ئاڵوگۆر پێک بێنن.

شۆردنەوەی مێشک ئەمڕۆکە بۆ شکاندنی ئیرادەی خۆراگرانەو ڕۆحیەی زیندانیەکان بە هۆی بێخەوی و ڕەخنەگرتنی بەردەوام و سەپاندنی بیروڕای جیاواز جێبەجێ دەکرێ. خۆ کوژی بە کۆمەڵی ٩١١ کەس لە لایەنگرانی ئایینی"پەرستگەی گەل" لە ڕێکەوتی ١٨و ١٩ی تشرینی دووهەمی ١٩٧٨ لە گویان دا، نموونەیەک لە شۆردنەوەی مێشک بە هۆی سەپاندنی بیروڕای هزری یان ئایینیەوە بوو.

## شمشێری دامۆکلێس The Sword Of Damocles

ئەم زاراوە لە ئەفسانەیەکی کۆنی یۆنانی وەرگیراوە. بە پێی ئەم ئەفسانەیە دیۆنیسۆس Dionysius، پاشای سەرەرۆی سیراکوس Syracuse شمشێرێکی زۆر تیژی بە مووی ئەسپێکەوە لە سەرسەری داموکلێس رکابەری خۆی هەڵواسیبوو بە جۆرێک کە بە چکۆلەترین جووڵەیەکی دامۆکلێس، ڕەنگە مووەکە بپسایە و شمشێرێکە لە تەپڵی سەری هەڵچەقیبایە. شمشێری دامۆکلێس لە باسە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکان دا، بەو هەرەشە بەردەوامە دەگوترێ کە هەموو کردەوەو و دژ کردەوەیەک دەخاتە مەترسیەوە.

**شۆڤینیزم** ***Chauvinism***

ئەم زاراوە لە نێوی نیکۆلا شۆن(Nicholas- Chauvin) وەرگیراوە کە بەردەوام بە باڵای ناپلیۆن بوناپارتیدا هەڵدەگووت. و بەواتای پێداهەڵگوتنی لەرادەبەدەر و هەستی دەمارگرژانەی ناسیۆنالیستیە.

***شاری ئازاد*** ***Free City***

بەشارێک دەڵێن کە لە لایەن ڕێکخراوێکی نێودەوڵەتیەوە بەڕێوەدەچێ و هیچ وڵاتێک مافی کۆنترۆڵ کردنی ئەم شارەی نیە. وەکوو دانتزیگ لە نێوان ساڵەکانی ١٩١٩ و ١٩٣٣ کە لەژێر کۆنترۆڵی کۆمەڵەی نەتەوەکاندا بوو.

***شێوازی بەرهەم هێنانی ئاسیایی***

***Asiatic Mode Of Prodoction***

زاراوەی شێوازی بەرهەم هێنانی ئاسیایی لە سەرەتادا لە لایەن جۆن ستوارت میل، بیریاری بەریتانی بۆ لێکدانەوەی سیستەمی ئابووری وڵاتانی ئاسیایی کەڵکی لێ وەرگیردراو، پاشان لەلایەن بیریارانێکی وەکوو کارل مارکس بە شێوەیەکی تیروتەسەلتر هاتە بەرباس. مارکس لە کۆمەڵگاکانی هیند، چین و رووسیادا جۆرێک تایبەتمەندی سەرەکی لێکچووی دەبینێ کە بە گشتی شێوازی بەرهەم هێنانی ئاسیاییان پێ دەڵێ. بە بڕوای مارکس، بارودۆخی ژینگەیی و جوگرافی وڵاتانی ڕۆژهەڵات، بە جۆرێکە کە ئاوداشتن بە کارێز و دامەزراوە ئاوییەکان، بناغەی کشتوکاڵی ئەم وڵاتانە بوون. ئەم شێوازە بە پێی پان و بەرینی وڵاتەکان و هەروەها نەبوونی شارستانیەتی تەکنیکی ئاسیاییەکان، ناچار دەبێتە هۆی دەستێوەردانی حکوومەتی ناوەندی. بەم شێوەرێبەرایەتیکردن و زاڵ بوونی دەوڵەت بە سەر سەرچاوەکانی ئاودا دەبێتە هۆی پێکهاتنی کۆمەڵگای تایبەتی ئاسیایی و ئەم شێوازە ڕێگا بۆ هاتنە ئارای حکومەتە سەرەڕۆکان لەم وڵاتانەدا خۆش دەکا. پێکهاتنی حکوومەتە سەرەڕۆکان لە وڵاتانی ئاسیایی دا، لە ڕوانگەی مارکسەوە بۆتە هۆی ئەوەی کە پرۆسەی گەشە کردنی بۆرژوازی و پاشانیش کاپیتالیزم و لە ئاکام دا وەدیهاتنی سۆسیالیزم لەو کۆمەڵگایانەدا، بچێتە ژێر کاریگەری حکوومەتە سەرەڕۆکان.

## Domicile
## شوێنی مانەوە

پێوەندییەکی یاسایی یە و، خاوەنی کۆمەڵێک تایبەتمەندیی سیاسییە کە لە نێوان تاکەکەسەکان و ناوچەیەکی تایبەتی لە خاکی دەوڵەتێکدا پێکدێ و، بەم شێوەیە تاکەکەسەکان بە بێ ئەوەیکە خاوەنی تایبەتمەندیی هاووتیبوون بن، لەو کەسانەی کە لەو شوێنە نیشتەجێن، جیا دەکرێنەوە. بە واتایەکی تر، شوێنی مانەوەی کەسێک لە وڵاتێک دایە کە بەرژەوەندییەکانی ئەوکەسە لەو وڵاتەدایە. ئەو بەرژەوەندییانەش زیاتر بەرژەوەندی ئابوورین.

شوێنی مانەوە خاوەنی ئەم تایبەتمەندییانەیە:

١_ هەرکەسێک دەبێ خاوەنی شوێنێکی مانەوە بێ.

٢_ هیچ کەسێک نابێ زیاتر لە شوێنێکی مانەوەی هەبێ.

٣_ شوێنی مانەوە، شتێکی هەمیشەیی نیە.

## شێوە هێمنانەکانی چارەسەری کێشە نێونەتەوەییەکان
## Peaceful Means For The Settlement Of International Disputs

شێوە هێمنانەکانی (ئاشتیانەی) چارەسەری کێشەی نێوان وڵاتەکان بەبێ پەنابردنە بەر هێزی زۆر بریتین لە: پێکهێنانی لێک تێگەیشتنی دوولایەنە بە شێوەی راستەوخۆ، یارمەتیی هەمەلایەنە، نێوبژیوانی، کۆمیسیۆنی نێونەتەوەیی لێکۆلینەوە، دیاریکردنی لایەنی تاوانبار، ناردنی کێشەکە بۆ دیوانی هەڵسەنگاندن یان بۆ بۆ دیوانی نێو نەتەوەیی داد.

---

## Civilization
## شارستانیەت

شارستانیەت هاوواتای Civilizatonی فەرەنسییە کە لە وشەی Civiliser(رزگار بون لە بارودۆخی سەرتایی) وەرگیراوە.

شارستانیەت سێ واتای هەیە:

_ خزان بەرەو لای عەقڵ ومرۆڤایەتی

ــ ریکخستنی کاروباری ژیان،

ــ خزان بەرەو لای رەوشت و هەڵسوکەوتی شارییانە

شارستانیەت وەک زاراوە بە: "کۆی دامەزراوە و ریکخراوە کۆمەڵایەتیەکان، هەل ومەرج و پیوەندیە ئابووری و کۆمەڵایەتی، بەرهەمهینان، ئایینی، هونەری و ئەدەبی لە کۆمەڵگایەکی پیشکەوتوو" دەگوتری، یان بەواتایەکی گشتیتر، شارستانیەت بە کۆی پاشەکەوتە ماددی و مەعنەوییەکانی مرۆڤ لە کۆمەڵگایەکی پیشکەوتوودا دەگوتری.

## عەلمانی *Laic*

لائیک لە سەرچاوەی لاتینی Laicus (شتێک کەهیی خوایە) وەرگیراوە. هەروەها بەکەسێک دەگوترێ کە هیچ پلە و پایەیەکی لە هیرەمی کلیسادا نیە و لەلایەن کلیساوە، هیچ ئەرکێکی ئاینی پێ نەسپێردرابێ.

عەلمانیەت ئێستاکە بە ڕێبازێک دەگوترێ کە بەتەمایە دامەزراوە و دامودەزگا کۆمەڵایەتیەکان لە ژێردەسەڵاتیی ئاین و کلیسا رزگار بکا. عەلمانیەت بزوتنەوەیەک بوو کە دژی کۆت و بەندی ئایینی و پشکنینی بیروڕاکان بوو و لەگەڵ ڕێنسانس و لە ئەوروپادا سەری هەڵدا. ئامانجی عەلمانیەت دژایەتیکردن لەگەڵ ئەو ماف و ئیمتیازانەدا بوو کە بەرپرسە ئایینەکانی کلیسا لە سەدەکانی ناوەڕاستدا وەکوو خاوەن زەوی وزارە گەورە و دەوڵەمەندو ئاریستۆکراتەکان هەیانبوو، بەشێوەیەک کە مێژووی دەرەبەگایەتیی لە ئەوروپا، پێوەندییەکی نەپچڕاوەی لەگەڵ کلیسادا هەیە.

عەلمانیەت بە واتای هەڵوێست و ڕوانگەیەکە کە دام و دەزگاو دامەزراوە کۆمەڵایەتیە عەلمانیەکان سەبارەت بە ئایینەکان هەیانە. کە لە دووشێوەدا خۆی دەنوێنێ:

**الف** ـ پشتگوێ خستنی ئایین لە لایەن دەوڵەتەوە کە دەتوانین بە چەند شێوەلێکی بدینەوە:

١ــ بە واتای جیاکردنەوەی ئایین لە سیاسەت:

لەم حاڵەتەدا دەوڵەت هیچ دەسەڵاتێکی ئایینی نیە ودەستێوردانی کلیساش لە کار و بارەکانی خۆیدا رەت دەکاتەوە. لەبەرامبەردا کلیساش هیچ دەسەڵات و کاریگەرییەکی سیاسی نیە.

٢ــ بە واتای بێلایەن بوونی دەوڵەت لە کاروبارە ئایینەکاندا: لەم حاڵەتەدا دەوڵەت بە چاوێک سەیری هەموو ئایینەکان دەکا [لەنێوان ئایینەکان دا جیاوازی دانانێ] وبۆ هەموو هاوڵاتیانی وڵات، بە بێ جیاوازی دانان، ئازادی ئایینی دابین دەکاو هیچ کاتێک نە لایەنگری لە ئایینێک دەکا و نەدژی ئایینێکیش هەڵوێست دەگرێ.

ب ــ پشتگوێ خستنی ئایین لە قوتابخانەکاندا:

ئەم بابەتە پێوەندی بە سیستەمی سیاسی وڵاتەوە هەیە. رەنگە سیستەمی پەروەردەیی وڵات رێگا بەهەموو بیروبۆچوونێکی ئایینی بدا و بریاریش بدا کە هیچ لایەنێکی ئایینی نابێ هەستی ئایینی لایەنێکی دیکە بریندار بکا و هەموو پروپاگەندەیەکی ئایینی [بێ جیاوازی] قەدەغە بکرێ. و بابەتە ئایینەکان بە شێوەیەکی عەقڵانی و زانایانە ئاراستە و راڤەبکرێن و رێنوێننە ئایینیەکانیش لە ژێر چاوەدێری بەرێوەبەری هەر ئایینێک، وەزارەتی روشنبیری و قوتابخانە دا بێ.

## چارتیزم Chartism

چارتیزم لەوشەی Charte بەواتای نووسراوە، بەڵگە، لاپەڕە، جاڕنامە و پێناسەیەو لەسەرچاوەی لاتینی cartula , carta و یۆنانیی Khartés وەرگیراوە.

چارتیزم بزووتنەوەیەکی چاکسازیی بەریتانی بوو کە لە هێندێک بواردا توخمی سۆسیالیستی لەخۆ دەگرت. نێوەرۆکی سەرەکیی ئەم بزووتنەوە کە لە ١٨٤٠ هەتا ١٨٤٨ لە بەریتانیا لە ئاردابوو، پەرەپێدان بە چاکسازییە پەرلەمانیەکان بوو. پێشکەوتنی چارتیزم لەراستیدا، قەرزداری ئەو تاقمە لە کرێکاران بوو کە بە خۆیان دەگووت چارتیست. ئەم بزووتنەوەش بۆیە بەمناوە بەناوبانگ بوون چوونکە ئەو تاقمە لە ساڵی ١٨٣٧دا سەرەتا بەڵگەنامەیەکیان پەسند کرد کە بە ناوی جاڕنامەی گەل People's charter ناوبانگی دەرکرد. هێندێک لە چارتیستەکان لەراستیدائەو سۆسیالیستانە بوون کە لەگەڵ شێوازی سەرمایەداریدا دژایەتیان دەکرد و، لەسەر ئەو بڕوایە بوون کە دەبێ بنەمای کاری ئەوان ئەوەبێ تاکوو نوێنەرانی چینی کرێکار بۆ پەرلەمان بنێرن.

سەرکردەکانی ئەم بزووتنەوە لە جاڕنامەی ساڵی ١٨٣٨دا ئەم داخوازیانەیان خستبووە ڕوو:

١ـ دەبێ هەڵبژاردنەکانی ئەنجوومەنی نوێنەران هەموو ساڵێک بەڕێوە بچێ؛
٢ـ دەبێ ئەو نێرینانەی کە گەیشتوونەتە تەمەنی گەورەیی، لەو هەڵبژاردنانەدا بەشداری بکەن؛
٣ـ دەنگدان دەبێ لە لاپەرەیەکی "نهێنی"دا بەڕێوەبچێ؛
٤ـدەبێ ناوەندەکانی هەڵبژاردن لە وڵاتدا بە یەکسانی دابەش بکرێن؛
٥ـ مەرجی خاوەندارێتی دەبێ لە مەرجەکانی ئەندام پەرلەمانی لابرێ؛
٦ـ مووچەیەک بۆ ئەندامانی پەرلەمانەکە دیاری بکرێ تاکوو کەسانی کەم داهات بتوانن لەم پەرلەمانەدا ببن بە ئەندام.

چارتیستەکان لە بواری مێژووییەوە رۆڵێکی شۆڕشگێرانەیان لە پشتیوانیی چینی کرێکاردا لە ئەستودابوو. ئەگەرچی چارتیزم لە ساڵی ١٨٤٨ لە بەریەک هەڵوەشا، بەڵام دواتر هێندێک لە ئامانجەکانیان لە ڕێگای پلانە کۆمەڵگا هەرەوەزییەکان و یەکیەتیە کرێکارییەکاندا جێبەجێ کرا.

## چەپی نوێ New Left

ئەم زاراوە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا باوە و، بۆ ئاماژە بەو کەس یان ڕێکخراوانەی کە بەگشتی لایەنگری لایەنە جۆراوجۆرەکانی نیۆمارکسیزم، سۆسیالیزم، سەندیکالیزم، ئانارشیزم و پاسیفیزمن، کەڵکی وەردەگیرێ. لایەنگرانی سەرەکیی ئەم بزووتنەوە، ڕێکخراوە خوێندکارییەکان و ڕێکخستنەکانی ڕەش پێستەکانی ئەمەریکان. ئەم بزووتنەوە بۆ دژایەتیکردن لەگەڵ پەرەگرتنی شەڕ لە ڤیتنام لە دوای ساڵی ١٩٦٤دا چالاکی زۆری نواند.

## چەپ وڕاست Left & Right

دووزاراوەی چەپ وڕاست سەرەتا لە سەردەمی شۆڕشی مەزنی فەڕەنسادا برەوەی پەیدا کرد و، تا ئێستا چەندین مانای جۆراوجۆری پەیدا کردووەو، ئەوەندە بە تاقمەجۆراوجۆرە سیاسیەکان گوتراوە کە دەکرێ بڵێین مانایەکی روون و دیاریکراوی نیە. بەهەرحاڵ، دەستە چەپیەکان بەگشتی لە بواری کۆمەڵایەتیەوە زیاتر خوازیاری گۆڕانکاریی خێرای کۆمەڵایەتی (شۆڕش و گۆڕانکاری )، دادپەروەریی کۆمەڵایەتی، رۆڵی دەوڵەت لە ئابووری داو، سەربەخۆیی کۆلۆنیەکان بوون. ئەو ناوە بە تاقمێکی بەرفراوان لە کۆمۆنیست و سۆسیالیستەکان (لە ئێتیلی سیاسەتڤانی بەریتانیەوە بگرە

تاکوو ترۆتسکی)و، هەروەها بە حیزبە جۆراوجۆرەکان (لە حیزبی کۆمۆنیستی ماو بگرە تاکوو حیزبی سۆسیال دیمۆکراتی کۆماری فیدراڵی ئەڵمان) گوتراوە.

دەستەراستیەکان زیاتر ئەو کەسانەن کە جیاوازیی چینایەتی بە بەشێک لە سیستەمی سروشتی دەزانن و، لایەنگری لە نەریتەکان، دەوڵەتە بەهێزەکان و کەمترین رۆڵی دەوڵەت لە کاروباری ئابووریدا دەکەن. ئەم پێناسە، دەستەراستییە پارێزگارەکان و هەروەها فاشیستە توندڕۆکانیش دەگرێتەوە. لە دەیەی ۱۹۳۰دا دەستە چەپی بەو کەسانە دەگوترا کەدژی فاشیزم و لایەنگری یەکیەتیی سۆڤیەتی بوون. گۆڕانکارییەکانی دوای شەڕ (کێشەو ناکۆکیی نێوان سۆڤیەت و چین، گۆڕانکارییەکانی ئەورووپای رۆژهەڵات و لەدایکبوونی چەپە نوێکان ) گیانێکی تازەی بەم دووچەمکە بەخشیوە.

## Cheka

## چیکا

چیکا پۆلیسی نهێنیی سۆڤیەت لە سەرەتای شۆڕشی کۆمۆنیستیدا بوو کە دوابەدوای پەسندکرانی ئەنجوومەنی کۆمیسێرەکانی گەل، لە رێکەوتی کانوونی یەکەمی ۱۹۱۷دا لە سۆڤیەت دوای سەرکەوتنی شۆڕشی کانوونی یەکەم دامەزرا.

ئەرکەکانی "چیکا" بریتی بوون لە:

١ـ پێشگیری لە چالاکی دژە شۆڕشەکان و تێکدەرەکان.

٢ـ پەلکێش کردنی ئەندامان و تۆخمەکانی سەربە دژە شۆڕشەکان بۆ بەردەم دادگاکانی شۆڕش.

٣ـ لێکۆڵینەوەی سەرەتایی لەو کەسانە.

لە نۆیەمین کۆنگرەی سۆڤیەت لە ساڵی ۱۹۱۹دا، لنین پێشنیاری گۆڕینی چیکای هێنایە بەرباس. ناوبراو وتی کە ئیتر هێزی دوژمنانی سۆڤیەت تێک شکێندراوەو، هەڕشەو مەترسیەکی راستەوخۆ لەلایەن ئەوانەوە لەسەر ئێمە نەماوە. بەم شێوە لە ساڵی ۱۹۲۲دا "چیکا" هەڵوەشایەوە. چیکا بەیەکێک لە ئامرازە سەرەکیەکانی دیکتاتۆریی بۆلشڤیکی دەژمێردرا. دەگوترێ کە نزیک بە نێو میلیۆن کەس لە خەڵکی رووسیا بەدەستی ئەم رێکخراوە کوژراون.

بە هەڵوەشانەوەی چیکا ئەم ئەرکە سەرەتا بە GPU (۱۹۲۲)و، پاشان بە OGPU (۱۹۲۳) و لە ئاکام دا بە NKVD (۱۹۳٤) سپێردرا.

## چواردە خاڵەکەی ڤیلسۆن Fourteen Points

لە ڕێکەوتی ٨ی کانوونی دووهەمی ١٩١٨دا ڤیلسۆن سەرۆک کۆماری ئەوکاتی ئەمەریکا، ڕاگەیەنراوێکی سەبارەت بە ئامانجی هاوپەیمانان لە شەڕدا بلاّو کردەوە کەبە چواردە خاڵەکەی ڤیلسۆن بەناوبانگە. ئەوخاڵانە بریتین لە:

١ـ وەستاندنی سیاسەتە نهێنییەکان و، گرێدانی ڕێککەوتننامە ئاشکراکانی ئاشتی.

٢- ئازادیی هات وچوون لەدەریاکاندا.

٣ـ هەلگرتنی بەربەستە گومرگیەکان و، پیادەکردنی ئازادی و یەکسانی لە بازرگانیدا.

٤ـ کەمکردنەوەی چەک وچۆلّ.

٥ـ چارەسەری ڕەوای کێشەی کۆلۆنیەکان.

٦ـ چۆلکردنی خاکی سۆڤیەت.

٧ـ سەربەخۆیی دووبارەی بەلژیکا.

٨ـچۆلکردنی فەڕەنسا و گەڕاندنەوەی "ئالزاس ولۆرین" بۆئەم ولاّتە.

٩ـ پێداچوونە بە سنوورەکانی ئیتالّیا

١٠ـ خودموختاریی کەمینەکانی نەمسا ـ هەنگاریا.

١١ـ چۆلکردنی خاکی سیربیا و مۆنتینیگرۆ و ڕۆمانی و، چارەسەری ڕەوای کێشەکانی بەلّکان.

١٢ـ سەربەخۆیی نێوخۆیی نەتەوەکانی ژێردەسەلاّتی تورکیا (عوسمانی)و، بە نێونەتەوەیی کردنی گەرووی داردانێلّ.

١٣ـ دامەزراندنی دووبارەی دەولّەتی پۆلّەندا.

١٤ـ دامەزراندنی "کۆمەلّەی نەتەوەکان".

## چواردەی تەمووزی ١٧٨٩ 14th July ١٧٨٩

ئەم ڕۆژە کە بە ڕەمزی هەلّوەشانەوەی سەرەڕۆیی پاشایەتی "ڕژێمی پێشوو"ی فەڕەنسا دادەنرێ، لەڕاستیدا سەرەتای دەستپێکی شۆڕشی مەزنی ئەو ولاّتە بوو. لەم ڕۆژەدا کرێکارە شۆڕشگێرەکانی ناوچەی فوبۆرگ سێن ئانتوان، هێرشیان کردەسەر بەندیخانەی باستیل و، لەگەلّ خاکدا تەختیان کرد. بۆ ڕێزگرتن لە ١٤ی تەمووز، هەموو ساڵێک ڕێورەسمی تایبەتیی سان و ڕێژەی هێزە

چەکدارەکانی سوپای فەرەنسا بە ئامادەبوونی سەرۆک کۆمار و کەسایەتیە گرنگە سیاسی و سەربازییەکانی ئەو ولاتە لە گۆرەپانی شارل دووگۆل تاکوو گۆرەپانی کۆنکۆرد بەرێوە دەچێ.

## چەک داماڵین Disarmament

ئەم زاراوەیە بەدوو واتا کەڵکی لێ وەردەگیردرێ:

١ـ بە پرۆسەیەک دەگوترێ کە کەم بوونەوە، جێگۆرکێ یان نەهێشتنی سیستەمەکانی چەک وچۆلی لێ دەکەوێتەوە؛

٢ـ بەکۆتایی رەوش و حاڵەتێک دەگوترێ کە ببێ بە هۆی پێکهێنانی دنیایەکی بێ چەک وچۆل و پێش بە دووبارە چەکدار بوونەوەی ئەم دنیایە بگرێ.

پرۆسەی چەک داماڵین رەنگە یەک لایەنە، دوو لایەنە یان چەند لایەنە؛ بەشیی یان گشتی بێ؛ هەروەها رەنگە تەنیا بەشێک لە سیستەمەکانی چەک وچۆل بگرێتەوە یان هەموو سیستەمەکان لە خۆبگرێ. چەک داماڵینی گشتی و تەواوەتی بە هەمەلایەنەترین پرۆگرامی ئەو بوارە دەژمێردرێ.

لە سیستەمە سیاسییە هاوچەرخەکاندا چەک داماڵین بەدوای تێکشکانی یەکێک لە لایەنەکانی شەر بەرێوە دەچێ و، دەوڵەتی سەرکەوتوو دەست بە چەک داماڵینی لایەنی تێکشکاو دەکا. ئەم سەرکەوتنە لە داسەپاندنی ئاگربەست، کۆتایی هێنان بە دوژمنایەتی یان لە گرێدانی رێککەوتننامەی ئاشتیدا خۆ دەنوێنێ و؛ لایەنی تێکشکاو لە هەبوون یان دەستوێراگەیشتن بە هێندێک لە جۆرەکانی چەک بێ بەش دەبێ.

پێویست بەوە بیرهێنانەوەیە کە چەک داماڵین بەشێوەی ئۆتۆماتێک ناتوانێ کۆتایی بە کێشەکان بێنێ. پارادۆکسی بابەتە کە لەوە دایە کە پرۆسەی چەک داماڵین کە بۆ کەمکردنەوەی ئەو ناکۆکی و ئاڵۆزییانەی کە لە پێشبرکێی چەک و چۆڵەوە سەرچاوەدەگرن، بەرێوە دەچێ، بۆ خۆی کۆمەڵێک ناکۆکی و ئاڵۆزی لێ دەکەوێتەوە.

چاوەدێری بەسەر پرۆسەی چەک داماڵین پێویستی بە کارگێرییەکی بەتوانا و لێهاتوو هەیە.

### چەماوەی جەی J –Curve

جۆن جەی John Jay کۆمەڵناس، هۆکاری سەرهەڵدانی شۆڕشەکان بە جیاوازی زۆر، چاوەڕوانی و داواکاری ئەندامانی کۆمەڵگا و دابینکردنی پراکتیکی ئەم داواکارییانە دەزانێ کە ئەندامانی کۆمەڵگا کاتێک ئەم جیاوازیانە دەبینن، هەست بە "بێبەش"ی دەکەن. جۆن جەی ئەم تیۆرەی لە چەماوەیەک دا، بە نێوی چەماوەی جەی نیشان داوە.

### چارت
### Chart

١ـ بەڵگەیەکی دیپلۆماتیکە کە ئەو دەوڵەتانەی ئەم بەڵگەیان مۆر کردووە، بەپێی ئەم بەڵگە هێندێک لە بنەماکان رەچاودەکەن و داکۆکیشی لێ دەکەن. وەکوو جارنامەی رۆژئاوا ـ چەرچیل (١٤ی ئابی ١٩٤١) بە ناوی جارنامەی ئاتلانتیک

٢ـ بەڵگەیەکی دیپلۆماتیکە کە باس لە دامەزراندنی رێکخراوێکی نێودەوڵەتیی دەکا و ئەوانەی کەئەم جارنامەیان مۆر کردووە چوارچێوەی دەسەڵات و توانایییەکانی تێدا دیاری دەکەن؛ وەکوو جارنامەی رێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان (un) و جارنامەی بوگۆتا، ٣٠ی نیسانی ١٩٤٨ (جارنامەی رێکخراوی وڵاتانی ئەمەریکی).

### چارتی ٧٧ Chart

گرووپێکی نەیاری چیکسلۆڤاکیا بوو، کە لە ساڵی ١٩٧٧دا، لە پراگ پێکهات تاکوو حاڵەتەکانی لادانی دەوڵەتی ئەم وڵاتە لە مافە شارستانیەکان لەقاو بدا. لە نێوان ساڵەکانی ١٩٧٨ تا ١٩٧٩ دەوڵەتی چیسلۆڤاکیا ئەندامانی ئەو گرووپەی سەرکوت کرد. هێندێکیان زیندانی کران و هێندێکی دیکەشیان دوور خرانەوە.

## چارەسەری کۆتایی Final Solution (Endlösuns)

ئەم زاراوە لە مێژووی هاوچەرخی ئەڵمانیا دا بە واتای "فەوتاندنی جەستەیی جوولەکەکانی ئەورووپا بە مەبەستی چارەسەری کۆتایی کێشەی جوولەکەکان"ە. لە پێناوی جێبەجێکردنی ئەم سیاسەتە دا، لە کانوونی دووهەمی ١٩٤٢دا، کۆنفرانسیک لە نوێنەرانی ئیداری ئەڵمان لە "ڤانزە"دا پێکهات کە لە کۆتایی ئەم کۆنفرانسەدا، پێکهێنانی ئۆردووگاکانی قڕکردن بە کەڵک وەرگرتن لە ژوورەکانی گاز و کوشتاری بە کۆمەڵ پەسند کرا. بەهۆی ئەم کردەوانە ٤،٥ تا ٦ میلیۆن جوولەکە لە پرۆسەی بە ناو هۆلۆکۆست دا (کوشتاری بە تەواوەتی) تێدا چوون.

## گەڕاندنەوەی کەسایەتی Rehabiliation

ئەم زاراوە لە رژێمە کۆمۆنیستیەکان بەو تاقمە لە فەرماندەرانی سەربازی و رێبەرە سیاسیانە دەگوترا کە لە رەوتی پالاوتنە کارەساتبارەکانی سەردەمی ستالیندا لە رووسیا یان لە ئەوروپای رۆژهەلاتدا بە شێوەی نهێنی کوژران. رەوتێکی دیکەش لە سۆڤیەتدا لە ئارادبوو کە ئەو بەرپرسە حیزبیانەی کە لە پرۆسەی گەڕاندنەوەی کەسایەتیدا، گەڕاندنەوەی کەسایەتیان بۆ کرا، جارێکی دیکە بە خاین لە قەلەم درانەوە.

## گەلاڵەی بنەمای چوار *Ooint Four Program*

بە گەلاڵەیەک دەگوترێ کە لە لایەن هاری ترۆمێن (١٨٨٤_١٩٧٢) سێ و سێهەمین سەرۆک کۆماری ئەمەریکا بۆ ناردنی یارمەتیە تەکنیکییەکان بۆ ولاتە دواکەوتووەکان، ئاراستە کرا. ئەم زاراوەیە بۆیە پێی دەگوترێ "بنەمای چوار"، چوونکە بەندی چواری وتاری دەستپێکردنی سەرۆک کۆماری ناوبراوی پێک دەهێنا (کانوونی دووهەمی ١٩٤). بەرنامەی بنەمای چوار بوو بە هۆی بردنەسەری ئاستی نفوزی ئەمەریکا لە ولاتانی جیهانی سێهەم و لە ئاکامدا بوو بە هۆی دەستێوەردانی ئەمەریکا لە کاروباری نێوخۆیی ئەو ولاتانە.

### گەلاڵەی مارشاڵ (١٩٤٧-١٩٥٢) Maeshall Plan

پلانێکە کە لە لایەن جۆرج مارشال، وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا لە وتاری پێنجی حوزەیرانی ١٩٤٧ی ناوبراودا پێشنیار کرا. بەپێی ئەم گەلاڵە، ویلایەتە یەکگرتووەکان هەموو هەوڵی خۆی بۆ گەڕاندنەوەی سەقامگرتوویی ئابووریی ئەورووپا و نۆژەنکردنەوەی ئەم ئابوورییە وەگەڕ دەخست.

وڵاتانی کۆمۆنیست پلانی مارشاڵیان پەسند نەکرد؛هەروەها فینلەندا و ئیسپانیاش ئەم گەلاڵەیان پەسندنەکرد. لە ١٢ی تەمموزی ١٩٤٧دا، نوێنەرانی وڵاتانی نەمسا، بەریتانیا، ئیرلەندا، ئیسلەندا، بەلژیکا، پۆرتوگاڵ، تورکیا، دانیمارک، سوید، سویسرا، فەرەنسا، لۆگزامبۆرگ، نەرویج، هۆڵەنداو یۆنان بۆ پێکهێنانی کۆنفرانسی هاوکاریی ئابووریی ئەورووپا لە پاریس کۆبوونەوەو، پلانێکیان بۆ ساڵەکانی ١٩٤٧ هەتا ١٩٥١ دارشت کە "بە گەلاڵەی نۆژەنکردنەوەی ئەورووپا" ناوبانگی دەرکرد، دوای ئەمە، "رێکخراوی هاوکاریی ئابووریی ئەورووپا" (OEEC) بۆ جێبەجێکردنی ئەم گەلاڵەیە دامەزرا.

### گەورەکانی ئۆژیاش Augean Stables

ئەم زاراوەیە لە ئەفسانەیەکی یۆنانی وەرگیراوە و ئاماژە بە گەورەکانی ئۆژیاش، یەکێک لە پاشاکانی یۆنانە کە ماوەی سی ساڵ بە هۆی پیسایی ئاژەڵەکان پیس ببوو و خاوێنکردنەوەکەشی زۆر ئەستەم بوو کە پاشان بە هۆی لادانی رەوتی ئاوی دووچۆم توانیان گەورەکان خاوێن بکەنەوە.

ئەمڕۆ کە لە عورفی سیاسی دا، ئەم زاراوەیە بەو ناوەند، بەرێوبەری و رێکخراوانە دەگوترێ کە بوونە ناوەندی گەندەڵیی وبەرتیل خواردن و خراپکاری و چاکسازیش لەم ناوەندانەدا زۆر ئەستەمە.

### گەلاڵەی باروخ (١٩٤٦) Baruch plan

گەلاڵەیەک بۆ کۆنترۆلکردنی وزەی ئەتۆمی و پێکهێنانی رێکخراوێکی بەربلاوی نێودەوڵەتیی ناسیاسی وزەی ئەتۆمی بوو کە لە یەکەمین کۆبوونەوەی کۆمیسیۆنی وزەی ئەتۆمی

ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ١٤ی حوزریرانی ١٩٤٦ لە لایەن بێرنارد باروخ، نوێنەری ویلایەتەیەکگرتووەکانی ئەمەریکاوە ئاراستە کرا.

هەر لەم کۆبوونەوەیەدا گرۆمیکۆ، نوێنەری یەکیەتیی سۆڤیەت گەلاّلەیەکی تری هێنایە گۆڕێ کەبە بەپێی ئەم گەلاّلە، بەپێی ڕێککەوتنێکی نێودەوڵەتی، بەرهەمهێنان، ڕاگرتن و کەلک وەرگرتن لە چەک و چۆڵە ئەتۆمیەکان قەدەغەکرا و هەموو چەک وچۆڵە ئەتۆمیە کانیش دەبوایە لە ماوەی سێ مانگی دوای جێبەجێکردنی ئەم ڕێککەوتننامەیە لە ناوبچن. بە هۆی دژایەتیی پێشنیارەکەی گرۆمیکۆ لەگەڵ گەلاّلەی بارۆخدا، ڕێککەوتنێک سەبارەت بە کونترۆلی نێودەوڵەتیی وزەی ئەتۆمی سەری نەگرت و لە دواییشدا لە ١١ی کانوونی دووهەمی ١٩٥٢دا، کۆمیسیۆنی وزەی ئەتۆمی هەڵوەشایەوە.

## *گەلاّلەی بۆش ( ١٩٩١)* — *Bush Initiative*

ئەم گەلاّلەیە لە ڕاگەیەنراوی ڕێکەوتی ٢٧ی ئەیلوولی ١٩٩١ی جۆرج بۆش (باوک) سەرۆک کۆماری ئەمەریکا و ماوەیەکی کەم لە دوایی مۆرکردنی ڕێککەوتننامەی ستارتی ــ ١ سەبارەت بە چەک و چۆڵە ئەتۆمیەکان ئاراستە کرا. کە یەک لایەنانە ئەم بنەمایانەی لە خۆدەگرت:

— نەهێشتنی چەک و چۆڵە ناوەکیە تاکتیکیەکان (موشەکەکانی کرۆز) لە سەر کەشتی و ژێر دەریاییە هێرشبەرەکان.

— نەهێشتنی تەقەمەنی ناوەکی تۆپخانەیی وکلاّوە شەڕکەرەکانی موشەکەکانی بالستیکی کورت هاوێژ.

— کەمکردنەوەی خۆ ئامادەکردن (بۆشەڕ).

— جگە لەمە بۆش پێشنیاریشی بە سۆڤیەت کرد تا سەبارەت بەنەهیشتنی موشەکە کیشوەربڕە فرەکلاّوە ناوەکیەکان و تووێژ بکەن .

## گەلاڵەی ترۆیکا (١٩٦٠) Troika Plan

ئاماژە بە گەلاڵەی بەڕێوەبردنی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لە لایەن دەستەیەکی سێ کەسیە، کە لەلایەن خرۆشچۆف، سەرۆک وەزیرانی ئەوکاتی سۆڤیەت لە بیستەمین کۆبوونەوەی کۆمەڵەی گشتی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ساڵی ١٩٦٠ دا هاتە گۆڕێ. خرۆشچۆف لەگەڵ ئەوەدا کە بە توندی هێرشی کردە سەر هامێرشولد وەکوو " بە کرێگیراوی ڕۆژئاوا" پێشنیاریشی کرد کە لیژنەیەکی سێ کەسی بە جێگەی سکرتێری گشتیی، ئەرکەکانی سکرتێری گشتیی ڕاپەڕێنن. هەرکام لەم سێ کەسانە نوێنەری بیرو بۆچوون و سیاسەتی وڵاتانی ڕۆژئاوایی، و هاوپەیمانەکانیان، وڵاتانی سوسیالیستی و وڵاتانی بێلایەن بوون. جێبەجێکردنی پەسندکراوەکانی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ئەستۆی سکرتێری گشتیی دایەو بڕیارەکانی دیکە کە لە لایەن سکرتێرەوە دەدرێن، تەنیا لە حاڵەتێک دەبێ جێبەجێ بکرێن کە هەرسێ ئەندامەکەی ترۆیکا پەسندی بکەن. ئەم گەلاڵە کە بە ترۆیکا (کەژاوەی سێ ئەسپە) بەناوبانگە، لەلایەن زۆربەی وڵاتانی ئەندامی ڕێکخراو کەوتەبەر ڕەخنە. ڕەخنەیەکی بنەڕەتیی لەسەر ئەم گەلاڵەیە ئەوە بوو کە زۆر ئەستەم بوو کە ئەم سێ سکرتێرە گشتیانە لە بوارەکانی بەڕێوەبردندا ڕێککەون کەئەمەش لەئاکامدا دەبێتە ئاستەنگ لەبەردەم ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان. پاساوی خرۆشچۆف بۆ پێشنیارەکەی خۆی ئەوەبوو کە ئەو دەیگووت:" لە جیهانی ئێستاکەدا وڵاتی بێلایەن هەیە، بەڵام کەسی بێلایەن بوونی نیە". کەواتە بە پێی بیروبۆچوونی خرۆشچۆف، جێبەجێکردنی ماددەی ١٠٠ کە کەسێکی وەکوو سکرتێری گشتیی ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان دیاریکردووە، ئەستەم دەبێ. ماددەی ١٠٠ی ڕاگەیەنراوە کە دەڵێ :

١ـ سکرتێر و فەرمانبەرانی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ڕاپەڕاندنی ئەرکەکانی خۆیان دا لە هیچ دەوڵەت یان بەرپرسێک لە دەرەوەی ڕێکخراو فەرمان وەرناگرن و هیچ فەرمانێکیش پەسند ناکەن. ئەوان تەنیا لە بەرامبەر ڕێکخراودا بەرپرسن و لە هەر کردەوەیەک کە لەگەڵ پێگەکەیان وەکوو بەڕێوەبەرانی نێودەوڵەتیی دا ناتەبابێ، خۆ دەبوێرن.

٢_ هەموو ئەندامەکانی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بەڵێن دەدەن کە ڕێز بۆ ئەرکی نێودەوڵەتیی سکرتێری گشتی و فەرمانبەرەکان دادەنێن و هەوڵی ئەوەش نادەن کە لە جێبەجێکردنی کارەکانیان دا بیانخەنە ژێر کاریگەری خۆیانەوە.

لەبەر ئەم هۆیانە بوو کە خرۆشچۆف پێشنیاری سێ سکرتێرەی هێنایە گۆڕێ. هەڵبەت ئەم پێشنیارە لەگەڵ دەقی ئاشکرای ماددەکانی ٩٧ تا ١٠١ی ڕاگەیەنراوی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکاندا ناتەبا بوو. لە پێشنیارەکەی سۆڤیەت دا، هەرکام لە سێ سکرتێرە گشتییەکان، ڕەنگدانەوەی بیروبۆچوونەکانی سێ لایەن بوو ( ڕۆژئاوا، بەرەی سۆسیالیستی و وڵاتانی بێلایەن). جگە لەمە بەپێی ئەو گەڵاڵەیە، فەرمانبەرانی سکرتاریاش دەبوایە بە شێوەی یەکسان لە نێوان هاوڵاتیانی سێ لایەندا دیاری بکرانایە. جگە لە وڵاتانی ڕۆژئاوا، وڵاتانی ئاسیا، ئەفریقیا و ئەمەریکای لاتینیش بە توندی لەگەڵ ئەم گەڵاڵەیەدا دژایەتیان کرد. چونکە لە کردەوەدا، مافی ڤیتۆی وڵاتانی گەورەی تا قۆناغی جێبەجێکردنی سکرتێری گشتی پەرەپێدەدا.

بە هۆی دژایەتیی زۆربەی وڵاتانی ئاسیا، ئەفریقیا و ئەمەریکای لاتین لەگەڵ ئەم گەڵاڵەدا، سۆڤیەت وازی لە گەڵاڵەی ترۆیکا هێنا.

## گەڵاڵەی ڕاپاکی (١٩٥٧) *Rapaci Plan*

گەڵاڵەیەک بۆ نائەتۆمیی کردنی ناوچەیەک لە ئەورووپای ناوەڕاستدا بوو. ڕاپاکی، وەزیری کاروباری دەرەوەی پۆلۆنیا ئەم گەڵاڵەیەی بۆیەکەمجار لە ڕێکەوتی ٢ی تشرینی یەکەمی ١٩٥٧ ئاراستەی کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان کرد. بە پێی ئەم گەڵاڵە ناوچەی نائەتۆمی دەبوایە، پۆلۆنیا، هۆڵەندا، هەنگاریا، چیکسلۆڤاکیا، ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای بگرتایەوە. لە نووسراوەکەدا هاتبوو: " لەم ناوچەدا نابێ چەک و چۆڵی ئەتۆمی بەرهەم بێ ورابگیرێ و تەقەمەنی و دامەزراوەی چەک و چۆڵە ناوەکیەکانیش دامەزرێ و کەڵک وەرگرتن لە چەکە ناوەکیەکان لە دژی ئەم ناوچە قەدەغە دەکرێ"، ئەم گەڵاڵە وڵاتانی ناوچە، فەرەنسا، بەریتانیا، ویلایەتە یەکگرتووکان، یەکیەتیی سۆڤیەت و وڵاتانی دیکەی( لەو کاتەدا مەبەست بەلجیکا، کانادا، دانیمارک، هۆڵەندا) دەگرتەوە کە هێزی سەربازییان لەو ناوچەیەدا بوو.

هەروەها پشکنینی ئاسمانی و زەمینی لە لایەن ناتۆو فەرشۆوە هاتە ئاراوە. دەوڵەتی پۆلۆنیا بەهیوا بوو کە ئەم گەلاڵە ببێ بەهۆی کەمکردنەوەی هێزە نائەتۆمیەکان لەم ناوچە و گرێدانی رێککەوتننامەیەکی بەرفراوان، بەمەبەستی چەک داماڵین. یەکیەتیی سۆڤیەت پشتیوانی لە گەلاڵەی راپاکی کرد، بەلاّم ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و بەریتانیا دژایەتیان لەگەڵدا کرد. چونکە بەهۆی ئەم گەلاڵە بوار بۆ زاڵبوونی بەرەی رۆژهەلاّت دەرەخسا.

## گەلاڵەی کۆلۆمبۆ (١٩٥١) Colombo plan

ئەم گەلاڵە بە هۆی بڕیارەکانی کۆنفرانسی وەزیرانی دەرەوەی دەوڵەتانی ئەندامی کۆمەڵەی هاوبەرژەوند، لە شاری کۆلومبۆی پایتەختی سریلانکا دامەزرا. ئامانجی ئەم کۆنفرانسە باسکردن لەسەر مەسەلە ئابووری و نێودەوڵەتیەکانی ولاّتانی باشوور و باشووری رۆژهەلاّتی ئاسیا بوو. گەلاڵەی کۆلومبۆ بەمەبەستی پەرەسەندنی ئەم ناوچەیە لە رێگای یارمەتیە تەکنیکیەکانەوە هاتە ئاراوە.

دامەزرێنەرانی یەکەمی گەلاڵەکە، ولاّتانی ئوستورالیا، کانادا، سریلانکا، هیندستان، نیوزلەند، پاکستان و بەریتانیا بوون کە پاشان چەند ولاّتی دیکەش کە ئەندامی کۆمەڵەی هاوبەرژەوەندییەکان نەبوون، چوونە ناو ئەم گەلاڵەوە. ئەم ولاّتانە بریتی بوون لە : کامبۆج، لائۆس، ڤێتنام،مالیزیا، ئەفغانستان، بەنگلادیش، بووتان، بێرمە، ئەندەنۆسیا. ژاپۆن، کۆریای باشوور، مالدیف، نیپالّ، فیلیپین، سەنگافوور، تایلەند، فیجی، گینەی نوێ و ئێران.

نووسینگەی ناوەندی ئەم گەلاڵە لە کۆلۆمبۆیەو ولاّتانی ئەندامی ئەم گەلاڵە، هەموو ساڵێک جارێک کۆ بوونەوەیەک بۆ ئالوگۆڕی بیرورا وتاوتۆیکردنی چالاکیەکانیان پێک دێنن. ماوەی جێبەجێکردنی گەلاڵەکە لە سەرەتادا ٧ ساڵ بوو، بەلاّم لە دوایی دا بە پێی بڕیاری دەوڵەتانی ئەندام درێژ کرایەوە.

یارمەتیەکانی گەلاڵە کۆلۆمبۆ بە ولاّتانی ئەندام، راهێنانی کادیری فێرکردن ، ناردنی پسپۆرە تەکنیکیەکان و هاوکاری کردن لە کڕینی ئامرازە تەکنیکیەکان بوو.

لە کۆبوونەوەکانی ساڵانەی گەلاڵەکەدا، جگە لە ولاّتانی ئەندام، بانکی نێودەوڵەتیی بووژانەوەو پەرەپێدان، بەرنامەی ئاوەدانکردنەوەی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان، کۆمیسیۆنی

ئابووری و کۆمەڵایەتی ئاسیا و ئوقیانوسیە، ڕێکخراوی نێودەوڵەتیی کار، ڕێکخراوی خۆراک و کشتوکاڵی جیهانی، کۆمەڵگای ئابووری ئەورووپا، بانکی پەرەپێدانی ئاسیا و سکرتێری وڵاتانی هاوبەرژەوەندی وەکوو چاوەدێر بەشداری دەکەن.

## گەڵاڵەی گێنشێر (١٩٩٠) Genscher Plan

ئەم گەڵاڵە لە لایەن هانێس دیتریش گێنشێر، وەزیری دەرەوەی ئەڵمانیای ڕۆژئاوا داڕێژرا. بەپێی ئەم گەڵاڵەیە ئەڵمانیای ڕۆژئاوا و یەکیەتیی سۆڤیەتدا بەو شێوە لەگەڵ یەکتردا ڕێککەوتبوون کە هێزەکانی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات لە پاش یەکگرتنەوە لەگەڵ ئەڵمانیای ڕۆژئاوادا، نەدەبوایە دەستەبەجێ ببونایە بەبەشێک لە هێزەکانی ژێردەسەڵاتی ناتۆ. سۆڤیەتیش لە بەرامبەردا، دانی بەوەدادەنا کە ئەڵمانیای ڕۆژئاوا هەروا بەشێک لە هێزەکانی ناتۆ بێ. بەم شێوە هێزەکانی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات تەنیا لە پاش یەکگرتنەوەی تەواو لەگەڵ ئەڵمانیای ڕۆژئاوا و لە کۆتایی ساڵی ١٩٩٤دا چوونە ژێردەسەڵاتی فەرماندەیی هێزەکانی ناتۆوە. ماددەی پێنجی ڕێککەوتننامەی کۆتایی وتووێژەکانی ٤+٢ کە لە ١٢ی ئەیلوولی ١٩٩٠ دا مۆر کرا، ئاماژەی بەم مەرجانە دەکرد.

## گەڵاڵەی گومۆلکا (١٩٦٣) Gumulka plan

ئەم گەڵاڵە لە لایەن ڤلادیسلاو گومۆلکا، سکرتێری یەکەمی حیزبی کۆمونیستی پۆلۆنیا لە ڕێکەوتی ٢٨ی کانوونی یەکەمی ١٩٦٣دا هاتە گۆڕێ. ئەم گەڵاڵە پێشنیارگەلێکی سەبارەت بە " ڕاگرتنی چەک و چۆلە ناوەکیەکان لە ئەورووپای ناوەڕاست" دا لە خۆدەگرت کە دەبێ لەگەڵ" گەڵاڵەی ڕاپاکی " دا بەراورد بکرێ.

## گەڵاڵەی ڤلادیڤۆستۆک (١٩٨٦) Vladivostok Plan

ئەم گەڵاڵە سەبارەت بە کەمکردنەوەی چەک وچۆلەکان لە ناوچەی ئاسیا ــ ئۆقیانوسی ئارام دا بوو کە لە لایەن گۆرباچۆف لە ساڵی ١٩٨٦دا ئاراستەی ژاپۆن کرا. ئەم گەڵاڵە پێشنیارگەلێکی بنەمایی سەبارەت بە پێکهێنانی ناوچەیەکی بێ چەک وچۆلی ناوەکی لە نیمچە

دورگەی کۆریا و ناوچەی باشووری ئۆقیانووسی ئارام، کەمکردنەوەی هێزە چەکدارەکان و چەک وچۆڵە ئاساییەکان لە ئاستێکی مامناوەندیدا لە خۆ دەگرت.

## گەلاڵەی یارۆزلسکی(۱۹۸۷) *Jaruzelski Plan*

ئەم گەلاڵە لەلایەن ژەنەراڵ یارۆزلسکی، سکرتێری یەکەمی حیزبی کۆمۆنیست و سەرۆک کۆماری پۆلۆنیا۱۹۹۰ -۱۹۸۰) بەشێوەی رەسمیی لە ساڵی ۱۹۸۷دا، ئاراستەی وڵاتانی ئەندامی کۆنفرانسی ئاسایش و هاوکاری ئەورووپا کرا. ئەم گەلاڵە لەراستیدا فۆرمێکی نوێی " گەلاڵەی راپاکی" بوو کە لە ساڵی ۱۹۵۷دا بۆ نائەتۆمی کردنی بەشێک لە ئەوروپا، (پۆلۆنیا، چێکسلۆڤاکیا، ئەڵمانیای، رۆژهەڵات و رۆژئاوا) لەلایەن وەزیری دەرەوەی ئەوکاتی پۆلۆنیا هاتە گۆرێ. گەلاڵەی یارۆزلسکی جگە لە چەک و چۆڵە ناوەکیەکان، چەک وچۆڵە ئاساییەکانیشی دەگرتەوە. ئەم گەلاڵە زیاتر لە سەر نەهێشتنی ئەو چەک و چۆڵانە پێی دادەگرت کە دەبوونە ئەگەری قەومانی "هێرشی لەناکاو".

## گاردی سوور *The Red Guard*

نێوێکە کە سەرەتا کرێکارە چەکدارەکانی سۆڤیەت لە سەر خۆیان دانابوو. ئەم گرووپە رۆڵێکی سەرەکیان لە بەدەسەڵات گەیاندنی بۆلشفیکەکان (شۆرشی ئۆکتۆبەر)دا هەبوو و پاشانیش بەشی بنەرەتیی سوپای سووریان پێکدینا. لە دەرەوەی یەکیەتیی سۆڤیەتیشدا، رێکخراوە خوێندکارییە خەباتگێرەکان کەڵکیان لەم نێوە وەرگرت. لە چینی کۆمۆنیستیشدا، خوێندکارەکانی چین بە هاندانی لینپیاو و هەڤاڵەکانی، گاردی سووریان بەمەبەستی پەرەپێدانی شۆرشی کولتووری و پێشگیریکردن لە بیروراکانی ماوتسێ دۆنگ و لادانی دوژمنانەکانی ماو رێکخست. بەم گرووپەیان دەگووت ژەنەراڵە گەنجەکانی ماو. لە پاییزی ساڵی ۱۹٦٦دا گاردە سوورەکان رێگایان پێدرا کە هەر چۆنێک خۆیان بە چاکی دەزانن، بۆ درێژەدانی شۆرش کولتووری هەنگاو هەڵگرن. بەڵام لەدواییدا کێشە نێوخۆییەکان تەشەنەیان کرد. لە ساڵی ۱۹٦۷ و ۱۹٦۸ەوە گاردی سوور وەکوو جاران کۆنترۆڵ کرایەوە و پروپاگەندەکردن سەبارەت بە گاردی سوور لەو کاتەوە قەدەغە کراوە.

## گرووپی ٢+٦

G_٦+٢

لیژنەیەکە کە بە نوێنەری ٨ وڵات بۆ چارەسەرکردنی قەیرانی ئەفغانستان پێکهاتووە. وڵاتانی گرووپی ٢+٦ بریتین لە ٦وڵاتی دراوسێی ئەفغانستان واتە : ئێران، پاکستان، ئوزبەکستان، تاجیکستان، تورکەمەنستان و چین و ٢ وڵاتی ئەمەریکاو رووسیا. ئەم گرووپە لەکاتی قەیرانی ئەفغانستاندا لەگەڵ یەکدا بەمەبەستی چارەسەرکردنی قەیرانی ئەم وڵاتە و گەیشتن بە ئاشتی، وتووێژو باس و راوێژیان دەکرد. لە دوای رووداوی ١١ی ئەیلوولی ٢٠٠١ و هێرشی ئەمەریکا بۆ سەر ئەفغانستان (٧ی تشرینی یەکەمی٢٠٠١ ) و جموجۆڵە سەربازییەکانی هاوپەیمانیەتی باکوور کە بوو بە هۆی گیرانی کابوول، ئەم گرووپە رۆڵێکی بەرچاوی لە دیاریکردنی رێبازی سیاسی داهاتووی ئەفغانستاندا گێراوە.

## گرووپی ٧

G – ٧

بە ٧ وڵاتی پیشەسازی رۆژئاوا دەگوترێ کە بریتین لە : ئەڵمانیا، بەریتانیا، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، ئیتالیا، ژاپۆن، فەرەنسە و کانادا. لە دوای هەرەسهێنانی سۆڤیەت (کانوونی یەکەمی ١٩٩١) فیدراسیۆنی رووسیاش لە خولەکانی کۆبوونەوەی؛ ئەم گرووپەدا بەشداری دەکا.

لەدوای ئەوەی رووسیا لە ساڵی ١٩٩٧دا بوو بە ئەندامی رەسمیی ئەم گرووپە، ناوەکەی گۆرا بۆ گرووپی ٨.

## گرووپی ١٠

G–١٠

لەسەرەتادا بەدەوڵەتە پیشەسازییەکان دەگوترا کە ئیستا کە ژمارەکەیان گەیشتۆتە ١١ وڵات. ئەم وڵاتانە بریتین لە: ئەڵمانیا، بەریتانیا، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، ئیتالیا، بەلجیکا، ژاپۆن، سوید، سویسرا، فەرەنسا، کەنەدا و هۆڵەندا.

### گرووپی ١٥ — G – ١٥

ئەم گرووپە لە ١٥ وڵات پێکهاتووە کە ئامانجەکەی پشتیوانی کردن لە وڵاتانی بێلایەنە. ئەندامانی ئەم گرووپە بریتین لە : ئەرژەنتین، ئەلجەزایر، ئەندەنۆسیا، بەرزایل، پیرۆ، جامائیکا، زیمبابووە، سینیگاڵ، مالیزیا، میسر، مەکسیک نیجریا، ڤەنزۆئیلا، هیندستان و یۆگسلاڤیا.

### گرووپی ٧٧ — G –٧٧

ئەم گرووپە لە کۆنفرانسی بازرگانی و پەرەپێدانی UN( UNCTAD)دا پێکهات تا گرووپێکی فشار بێ و پشتیوانی وداکۆکی لە بەرژەوەندەی وڵاتانی لە حاڵی پەرەسەندن دا بکا.ئەم ڕێکخستنە لە ٧٧ وڵات پێکهاتووە و بۆیە پێی دەڵێن گرووپی ٧٧. ئەگەرچی ژمارەی ئەندامانی ئەم گرووپە لەم ڕێژەیە زۆرتر بووە، بەڵام ئیستاش هەر بەم ناوە بەناوبانگە.

### گرووپی ستێرلینگ — Sterling Area

بڕێک لەو وڵاتانەن کە بە جێگەی ئەوەی دراوی خۆیان بە ئاڵتوون ببەستنەوە، دراوی خۆیان بەستێرلینگ (لیرەی بەریتانیا) بەستۆتەوە و پاشەکەوتی دراوی خۆیان لەگەڵ" بانکی بەریتانیا"دا ڕێکخستووە. گرووپی ستێرلنیگ لە ساڵی ١٩٣٩دا هەڵوەشایەوە و" ناوچەی ستێرلنیگ" جێگای ئەم گرووپەی گرتەوە.

### گرووپی بانکی جیهانی — World Bank Group

ئەم گرووپە لە سێ ڕێکخراوی نێودەوڵەتیی پەرەپێدان ( IGOS)، بانکی نێودەوڵەتیی بۆ بوژانەوەو پەرەپێدان (IBRD)، دامەزراوەی نێودەوڵەتیی پەرەپێدان (IDA) و کۆمپانیای ڕێکخستنی دارایی نێودەوڵەتیی (International Finance Corporation) پێکهاتووە. بانکی نێودەوڵەتیی بووژانەوەو پەرەپێدان لە ئاستی گشتیدا بە بانکی جیهانی ( World Bank) بەناوبانگە. هەروەکوو لە ناوەکەیدا دەردەکەوێ، ئامانجە دووانەکانی دامەزراندنی بانکی جیهانیی وەکوو بەشێک لە سیستەمە دامەزراوە ئابوورییەکانی نێودەوڵەتیی برۆتۆن ڤوودز ( Bertton

Woods)، بریتین لە : ئاسانکاری بۆ نۆژەنکردنەوەی ئەو ئابوورییە پەرەگرتووانەی کە بە هۆی شەڕەوە دارما بوون و هاوکاری ماددی بۆ پەرەپێدانی ئابووریی ولاتە کەمتر پەرەگرتووەکان ( L D S). بانکی جیهانیی ڕێکخراوی هاوشێوە یان جمکی سندورقی نێودەولەتیی دراوە (IMF) و لەراستیدا ئەو ولاتانە دەتوانن ببنە ئەندامی بانکی جیهانیی کەئەندامی سندووقی نێو دەولەتیی دراویشن. بانکی جیهانیش وەکوو سندووقی نێودەولەتیی دراو، سیستەمێکی دەنگدانی هەیە کە بە پێی ئەو سیستەمە دەسەلاتی کاریگەر بەسەر دەرئەنجامی هەلبژاردنەکان، دەدرێتە ئەو دەولەتانەی کە پشکێکی زیاتریان هەیە. لە راستیدا ئەم پشکانە وەکوو مافی ئەندامەیتی بانک دێنە ئەژمار و رادە و پشکی (سەهم)ی دەولەتانی ئەندام، یەکێک لە بنەڕەتیی ترین سەرچاوەکانی سەرمایەی بانکی جیهانیە. جگەلەمە بانکی جیهانیی چۆتە ناو بازاڕی سەرمایەکانی کەرتی تایبەتیشەوە تا سەرچاوەی خۆی باتر بکا وئەم قەرزانە ئێستا کە گەورەترین سەرچاوەی " نەختینەی" بانکی جیهانی پێک دێنن. بەماکانی بانکە بازرگانیەکان لەو پەڕی خۆیاندا بەسەر ئەم بانکەدا زالن. بۆیە دەبینین کە سیاسەتی قەرزدانی ئەم بانکە بەتەواوەتیی لە پێوەرو ڕێووشوێنە بازرگانیە توند و تۆڵەکانی بانکە بازرگانیەکان پێرەوی بکا.

پێویستی هەبوونی دامەزراوەیەک کە قەرزی کەم بە ولاتان بدا، بوو بە هۆی پێکهێنانی " دامەزراوەی نێودەولەتیی پەرەپێدان" لە سالی ۱۹٦۰دا. ئەم دامەزراوەیەش وەکوو بانکی جیهانیی، زیاتر قەرز دەداتە ولاتەکان لەوەی کە هەروا بە خۆڕایی یارمەتیان بدا. لە هەمان کاتیشدا وەکوو بانکی نێودەولەتیی بووژانەوە وپەرەپێدان، ئەو ولاتانەی کە دەبێ قەرزیان پێ بدرێ، دیاری دەکرێن. ئەم قەرزانە لە پێناوی پەرەپێدانی پێکهاتە بنەڕەتیەکان دەدرێتەولاتان. بە پێچەوانەی بانکی جیهانی، دامەزراوەی نێودەولەتیی پەرەپێدان، بەتەواوەیتی بۆ دابینکردنی سەرچاوەی ماددی و داراییەکەی بە سەرمایەی دەولەتانی ئەندام بەستراوەتەوە.

کۆمپانیای ڕێکخستنی دارایی نێودەولەتیی لە سالی ۱۹٥٦ و بۆ بەهێزکردنی کەرتی تایبەت و توانایە کار خولقێنیەکان لە ولاتانی کەمتر پەرەگرتوودا پێکهات. کۆمپانیای ڕێکخستنی دارایی نێودەولەتیی بەشداری خۆی لە پرۆژە و بەرنامەکان، بەکەمترین پشک (سەهم) بەستۆتەوە و زیاتر بایەخ بە بەشە دووهەم وبەرهەمهێنەکان دەدا. نەریتیی کۆنەپارێزی بانکی جیهانی و مەدوای بارودۆخی نالەباری ئابووری، لە ئابووری جیهانیدا ( لەدەرەوەی ئەمریکا باکوور) لە دوای سالی

۱۹۷٤ەوە بەم واتایەیە کە ئەم بانکە تەنیا سەیرکەرەو هیچی تر. ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بە هۆی هەڵەکانی خۆی وەکوو گەلاڵەی مارشاڵ، بە هۆی بوودجەی بەرگری و هەڵەپشتیوانیکەرەکانی دیکە بە هۆی قەرەبووکردنەوەی کەمی دولاڕ بۆ بەهێزکردنی پاڵنەرە ئابوورییەکانی ولاتانی پێشکەوتووی پیشەسازی چەند هەنگاوی هەڵێناوە. لە سەردەمی ترۆمێنەوە کە شەڕی سارد بۆتە مەترسیەکی گەورە بۆ ئەم ولاتە، بەرنامەی یارمەتیی دەرەکیش چووە ژێر کاریگەری بەرژەوەندییە ئاسایشی و سەربازییەکان و تائەو رادەیە بایەخی پەیدا کرد، کە ئەم یارمەتیانە بۆ مەبەستی جیاواز تەرخان بکرێن و بە نوێنەرایەتیی بانکی جیهانی بسپێردرێن.

هەرەسهێنانی سیستەمی برۆتۆن ڤۆدز و شۆکە نەوتیەکانی دەیەی ۱۹۷۰، نەبوونە هۆی کەمکردنەوەی رۆڵی پەراوێزی بانکی جیهانیی لە بواری یارمەتیە ماددییەکاندا. بانکی جیهانیی لە دۆزینەوەی دۆلاڕە وونبووەکانی دوای شۆکە نەوتیەکان لە رێگای سیستەمی رۆژئاواوە، تارادەیەک رۆڵی هەبووە، دوو گۆڕانکاری لە دەیەی ۱۹۸۰دا بوون بە هۆی ژیانەوەی سەرچاوە ماددییەکانی بانکی جیهانیی: یەکیان نەمانی ستراتیژییە ئابوورییەکانی سیستەمی سۆسیالیستی بە قازانجی کەرتی تایبەت و چاکسازییەکانی بازاڕی ئازاد، نیشانەی ئەون کە بنەماکانی لیبرالیزمی ئابووری کە ئایدۆلۆژی زاڵی بانکی جیهانیەوە، هەرئێستا کە زیاتر لە بواری دەروونی و سیاسیشەوە لە ئاستی جیهاندا پەسند دەکرێن. دووهەمیان ئەوەیە کە قەیرانی قەرزەکان و پێشنیارە جیاوازەکان بۆ بەربەرەکانیکردن لەگەڵ ئەم قەیرانەدا، وەکوو گەلاڵەکانی بەلکێرو برەیدی (Baker And Brade) بوونە هۆی ئەوەی کە بانکی جیهانیی ببێتە ئەکتەرێکی بەتوانا لە بوارەکانی جێبەجێکرنی ئەم گەلاڵەنەدا.

### گرووپی چوار کەسە *Gang Of Four*

بەو کەسانە دەڵێن کە رێبەری گرووپی رادیکاڵی کۆمۆنیستەکانی چین بوون کە نەیاری دێنگ شیائۆپینگ بوون. ئەم گرووپە بریتی بوون لە جیانگ کینگ، ژانگ چۆنگیا، ڤانگهۆنگ ڤۆن و یائۆڤێنیۆئان. لە ساڵی ۱۹۷٦دا هوئاکۆفنگ ئەم کەسانەی لەسەر کارلادا و دادگایی کران و

مەحکووم کران (١٩٨٠). ئەم زاراوە لە حوزەیرانی ١٩٩١ یشدا لە پێوەندی لەگەڵ ئالۆگۆرەکانی سۆڤیەت و نەیارانی چاکسازیخوازی ئەو وڵاتە کەڵکی لێ وەرگیردرا.

گرووپی چوار کەسەی نەیاری میخائیل گۆرباچۆف بریتی بوون لە :

١_ ڤالێنتین پاولۆف، سەرۆک وەزیران

٢_دیمیتری یازۆف، وەزیری بەرگری

٣_ ڤلادیمیر کریچکۆف، سەرۆکی K.G.B

٤_ بوریس پوگۆ، وەزیری نێوخۆ

### گرووپی ماف مرۆڤی هێلسینکی
### *Helsinki Human Rihghts Group*

ئەم ڕێکخستنە لە دوای کۆنفرانسی هێلسینکی سەبارەت بە ئاسایش و هاوکاری ئەورووپا (٣٠ی تەمموز_ یەکی ئابی ١٩٧٥)لە لایەن دوکتۆر یووری ئۆرۆلۆف لە مانگی ئایاری ١٩٧٦دا دامەزرا. لەم کۆنفرانسەدا یەکیەتیی سۆڤیەت بڕیاریدا کەرێز لە ماف مرۆڤ و ئازادیە بنەڕەتیەکان بگرێ. لە مانگی ئایاری ١٩٧٨دا، ئورۆلۆف حەوت ساڵ زیندانی بۆ برایەوە و هەرلەو ساڵەشدا ئەلەکساندر گیتربۆرگ، هاوکاری ئورۆلۆف هەشت ساڵ زیندانی و ئاناتۆلی شارانسکی سێزدە ساڵ زیندانی بۆ برایەوە. شارانسکیان بە خیانەتیش مەحکووم کرد.ساخارۆفیش لە ساڵی ١٩٨٠دا دوورخرایەوە بۆ شاری گورکی.

### گرووپی دژە حیزبی (کۆمۆنیست)

بە هێندێک لە ڕێبەرانی گەورەی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەت بە سەرکردایەتیی مالێنکۆف، کاگانۆڤیچ ومولۆتۆف دەگوترێ کە لە حوزەیرانی ساڵی ١٩٥٧دا هەوڵێکی بێ ئاکامیان لە پێناوی لە سەرکارلادانی خرۆشچۆف لە پۆستی ڕێبەری حیزبی کۆمۆنیست دا، بە پێی زانیارییەکانی دواتر، بۆلگانینیش ئەندامی ئەم گرووپە بووە.

### گۆستاپۆ *Gestapo*

دەزگای پۆلیسی نهێنی ئەڵمانیای نازی بوو. کورتکراوەی وشەکانی Geheim Staats Polizeه. ئەم ڕێکخراوە لە ساڵی ١٩٩٣ لە لایەن گورینک دامەزراوە و پاشان هیلمێر ڕێبەرایەتی ئەم دەزگایەی وەئەستۆ گرت و لەگەڵ دەزگای S.S دا تێکەڵاوی کرد. ئەم ڕێکخراوە لەبەرامبەر هیچ بەرپرسێکی دادو دەوڵەتیدابەرپرسیار نەبوو و تەواو سەربەخۆ بوو. گۆستاپۆ دەسەڵاتێکی بێ سنووری هەیە و ئامرازی هێزو سەرکوتی نازییەکان بوو. لە دوای کۆتایی هاتنی شەڕی دووهەمی جیهانی، دادگای نۆرنبێرگ گۆستاپۆی وەکوو ڕێکخراوێکی تاوانبار مەحکووم کرد.

### گۆبینیزم *Gobinism*

بیرو بڕوای ژوزێف گۆبینۆ (١٨٨٢ـ١٨١٦) ڕۆژهەڵاتناس و دیپلۆماتی فەڕەنسایە کە لە کتێبەکەی خۆیدا بە ناوی "نایەکسانیی ڕەگەزی مرۆڤ"دا، گریمانەی بەرزتربوونی ڕەگەزی ئاریای هیناوەتە گۆڕێ. ئەم گریمانە لە دواییدا، کاریگەرییەکی زۆری لەسەر" ئەفسانەی ڕەگەزی و بەرزتربوونی ڕەگەزی "نۆردیک"ی فەلسەفەی ئاڵمانیای نازیدا دانا.

### گرووپی فشار *Pressure Group*

لە کۆمەڵگا پیشەسازییە نوێکان دا، بیروڕای گشتی کاریگەرییەکی قووڵیان هەیە. بۆیە گرووپە جیاوازە کۆمەڵایەتیەکان، بەتایبەتی گرووپە ڕەسمیەکان هەوڵ دەدەن تابە ئامرازی جیاواز بیروڕای گشتی لەگەڵ بیروراکانی خۆیاندا بگونجێنن. پرۆفیشناڵ بوونی سەردەمی نوێ بۆتە هۆی ئەوەی کە دامەزراوەی زۆر ڕێک و پێک کە لە کۆمەڵناسی گرووپی فشار یان گرووپی سەپێنەریان پێدەگوترێ، سەرهەڵبدەن. ئەم گرووپانە لە ڕێگای [illegible] هەوڵ دەدەن کە یان بیروڕای گشتی لەگەڵ ئامانجەکانی خۆیانیاندا بگونجێنن. یان بیروڕاکانی خۆیان بە سەر ڕای گشتیدا بسەپێنن. بە واتایەکی دیکە گرووپەکانی فشار تێدەکۆشن بە شێوەی ڕاستەخۆ یان ناراستەوخۆ تەشەنە بکەنە ناو بیروڕای گشتیەوە.

ئەو ئامرازە شیاو و نەشیاوانەی کە گرووپەکانی فشار بۆزاڵبوون بە سەر بیروڕای گشتیدا کەڵکیان لێوەردەگرن فرەچەشن و جیاوازن. لێرەدا باس لە چوار ئامراز دەکەین کە گشتین و بایەخێکی زۆرتریان هەیە:

١_ هەوڵە ئابوورییەکان: گرووپەکانی فشار بە بەخشینی بەرتیل، دیاری و قەرز، کۆمەڵە مرۆییەکان دەخەنە ژێر رکێفی خۆیانەوە.

٢_ هەوڵە یاساییەکان: گرووپە فشارەکان تێدەکوشن کە داواکارییەکانیان بە پێی یاساو رێووشوێنە کۆمەڵایەتیەکان بەسەر خەڵکدا بسەپێنن. کەواتە بە ئامرازی جیاواز دزە دەکەنە ناو رێکخراوەکانی داڕشتن و جێبەجێکردنی یاسا. لە کۆمەڵگاکانی رۆژئاوادا بە تایبەتی لە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکادا، ئەم گرووپانە راشکاوانە ئەندامانی ئەنجومەنەکانی یاساداڕشتن دەخەنە ژێر فشارەوە. لۆبیەکان لە نموونەی ئەم گرووپانەن.

٣_ هەوڵەتێکدەرانەکان: گرووپەکانی فشار بە شێوەی نهێنی یان راشکاوانە بۆ تێکشکانی خۆراگری خەڵک و راکێشانی بیروڕای گشتی، پەنادەبەنە بەر هەوڵی تێکدەرانە و رووخاندنی دام و دەزگاکان و کۆمەڵە نەیارەکان

٤_ هەوڵە پڕۆپاگەندەییەکان: گرووپەکانی فشار بە کەڵک وەرگرتنی شارەزایانە لە پڕۆپاگەندەکردن، خەریکی دزین یان گۆڕینی یان پێکهێنانی بیروڕای گشتی دەبن.

## گلاسنۆست *Glasnost*

زاراوەیەکی رووسیە بە واتای راشکاوبوون لەقسە کردن دایە (Openness) کە لە عورفی سیاسیدا بە " ئاوەڵا بوونی سیاسی" و "پرۆسەی دیموکراتیزەکردن"ی بەرەی سۆسیالیستی دەگوترێ. ئەم زاراوە لە دوای هاتنە سەرکاری گورباچۆف لە سۆڤیەت برەوێکی زۆری پەیدا کرد. گلاسنۆست و پرۆسترۆیکا دوو زاراوەی جمکن کە رێبەرانی سۆڤیەت بەتەمای جێبەجێکردنیان بوون. ئەم گۆڕانکاریانە بوونە هۆی پێکهێنانی ئاڵوگۆڕی بەربڵاو لە سۆڤیەت و لە ئاکامیشدا بوونە هۆی کۆتاییهێنان بە دەسەڵاتی رەهای حیزبە کۆمۆنیستەکان لە جیهاندا.

### گوتار *Discourse*

چەمکی گوتار (Discourse) دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی ١٤ و لە زاراوەی فەرەنسی Discours و زاراوەی لاتینی Discurs – us وەرگیراوە بە واتای ئاخافتن و وتووێژکردنە و لە زاراوەی Discursum / Discurrer بە واتای خۆدزینەوە، گنخاندن و لە لای سەرەوڕا کردنەوە ، ...هتد، وەرگیراوە.

گوتار، دیاردە، وتەزا یان پرۆسەیەکی کۆمەڵایەتیە و بە واتایەکی دیکە پرۆسە و ڕەوتێکە کە لە کۆمەڵگاوە سەریهەڵداوە. بابەتە دەربڕاوەکان، گوزارەو مەسەلەکان،وشەو ڕستەکان، پێوەندیان بەو خاڵەوە هەیە کە بابەتەراگەیەنراوەکانو گوزارەکان و کەی، کێ، چۆن، لەلایەن چ کەسێکەوە، لەدژ یان بەلایەنگری لە چ کەسیک یان چ شتێک کەڵکیان لێوەرگیراوە.

گوتار ئامانج و ڕۆڵێکی چەندلایەنەی هەیە کەیەکیان بریتیە لە دوورخستنەوەی چەمکی "خود" لە بواری فەلسەفە، ئایدۆلۆژی و پرۆفیشنال بوونی زانستی و گەڕاندنەوەی پێگەی واتای " خود" بۆ ئەم چەمکە. گوتار لە دەیەی ١٩٧٠ بەملاوە لە شێوازی جیاوازدا دەردەکەوێ کە گرنگترینیان شێوەی " شیکردنەوەی گوتار"یە ( Discourse Analysis ) کەوە کووئامرازێکی میتدۆ لۆژی نوێ لە بواری زانستە مرۆیی و کۆمەڵایەتیەکاندا سەری هەڵداوە.

### گیوتین *Guillotion*

ئامێرێکی ئیعدام کردنی تاوانبارەکان لە سەردەمی شۆڕشی مەزنی فەرەنسادا بوو کە کەڵکی وەرگرتن لەم ئامێرە لەلایەن ژوزێف ئینیاس گیتین (١٨١٤ -١٧٣٨)، پزیشکی فەرەنسی زیندوو کرایەوە. ئەم ئامێرە چوارچێوەیەک و دەمێکی تیژی هەبوو کە دوای کەوتنە خوارەوەی دەمە تیژەکە، ملی تاوانبارەکەی دەقرتاند. لۆئیی شانزەهەم، پاشای فەرەنسا، هاوسەرەکەی ماری ئانتوانت و هەروەها ڕۆبسپیر،شۆڕشگێری بەناوبانگ لەو کەسانە بوون کە بە گیوتین کوژران. ئەم دەزگایە لە ساڵی ١٧٩٢دا، لە گۆڕەپانی گرێڤی (Place Of Gréve)ی پاریسدا هەڵواسرا.

دەڵێن کە ١٣٧٦ کەس لە نەیارەکان لە سەردەمی تیرۆر و ١٧٩٤ کەسیش لە نێوان ١٠ ی حوزەیران هەتا ٢٧ ی تەمموز بەم ئامێرە ملیان قرتێنرا.

## گۆلیزم Gaullism

بە کۆمەڵە تەکتیک، بیروبۆچوون و شێوازەکانی شارل دۆگۆل، کەسایەتی سیاسی — سەربازیی فەڕەنسا (١٩٧٠ - ١٨٩٠) دەگوترێ کە لە بیرەوەرییەکان، وتارەکان، لێدوانەکان، کۆنفرانسە چاپەمەنیەکان و ڕێبازە سیاسیەکان لە ماوەی دەسەڵاتدارەتیدا، وەکوو یەکەمین سەرۆک کۆماری، کۆماری پێنجەم لە ساڵی ١٩٥٨ دا خۆیان دەنوێنن.

دۆگۆل بەمەبەستی خێراترکردنی یەکیەتیی نەتەوەیی چەند دەوڵەتی بەرفراوانی بەبەشداری کۆمۆنیستەکان پێکهێنا. لە بواری ئابووریشدا جێبەجێکردنی کۆمەڵە چاکسازییەکی ئابووری وەکوو خۆماڵیکردنی پیشەسازییەکانی بەردەخەڵووز و کارەبا، کۆمپانیای فڕۆکەوانی "ئێرفرانس"، بانکە گەورەکان، کارخانەی دروستکردنی ئۆتۆمبێلی " رینۆ"، هەروەها چاکسازییە کۆمەڵایەتیەکانی وەکوو دابینکردنی کۆمەڵایەتیی هەمە لایەنە و مافی دەنگدانی ژنان، بوونە هۆی باوەڕبەیەک کردن و سازان و پێکهاتنی توێژە جیاوازەکانی ئەو کۆمەڵگایەی کە بە خێرایی و بە شێوەیەکی بەرنامە بۆ دارێژراوو ڕێک و پێک خەریکی لە ناوبردنی ئەو کە سانە بوو کە لە سەردەمی ڕژێمی " ڤیشی" لەگەڵ نازییەکاندا هاوکاریان کرد بوو.

لە کانوونی دووهەمی ١٩٤٦دا، کاتێک کە ئەنجوومەنی دامەزرانەری نوێ بڕیاریدا پێشنیارەکانی دۆگۆل لەسەر پێکهێنانی سیستەمێکی بە هێزی سەرۆک کۆماری و کەمکردنەوەی هێزی پەرلەمانی رەت بکاتەوە، دۆگۆل وازی لە پۆستی سەرۆک کۆماری هێنا و بۆماوەی ١٢ ساڵ دەستی لە کاروباری سیاسی کێشایەوە. لە مانگی ئایاری ١٩٥٨ دا، لە قووڵایی قەیرانی ئەلجەزایدا، بە هۆی ئەو ڕاپەڕینەی لە ناو سوپا فەڕەنسادا روویدا، کۆماری چوارەم هەرەسی هێنا وژەنەراڵ دۆگۆل بە دەسەڵات گەیشت. یەکەمین ساڵەکانی سەردەمی بەدەسەڵات گەیشتنی پربوون لە گرژی و ئاڵۆزی کە زیاتر بەرهەمی بارودۆخی ئەلجەزایر بوون. دۆگۆل لەم گرژی و ئاڵۆزیە سیاسیە بۆ دامەزراندنی سیستەمێکی حکوومەتیی تاکەکەسیی، بەپێی ڕاپرسیە گشتییەکان کەڵکی وەرگرت.

دۆگۆل لە بواری نێودەوڵەتیدا، هەوڵی دا تا گەورەیی فەرنسا زیندوو کاتەوە. بۆ ئەم مەبەستە لە ساڵی ١٩٦٦ دا، فەرەنسای لە لقی سەربازی ناتۆ دابراند و بە گرتنەپێشی سیاسەتێکی یەک لایەنە هەوڵیدا تا بە پشت بەستن بە جبەخانەیەکی ئەتۆمیی سەربەخۆ، لەبەرامبەر دوو زلهێزی رۆژئاواو رۆژهەڵاتدا، فەرەنسا بکاتە" هێزی سێهەم". دۆگۆل بە سیاسەتێکی مەسڵەحەت خوازانە، پەرەی بە رەوتی سرینەوەی کۆلۆنیالیزم لە ئەفریقیای فەرەنسی زمان دا. لە ساڵی ١٩٦٢دا، بە شێوەی رەسمی دانی بە سەربەخۆیی ئەلجەزایر دانا. لە هەمان حاڵیشدا هەوڵیدا کە پێوەندییە ئابوورییەکانی فەرەنسا، لەگەڵ کۆلۆنیەکانی پێشوی خۆیدا هەروا بپارێزێ.

ماوەی دەسەڵاتدارەتیی ژەنەراڵ دۆگۆل لە هەموو لایەنەکانەوە سەکەوتنی بەرچاوی لە بواری دەرەکی و نێوخۆیی بۆ فەرەنسا بەدواوە بوو. رەوتی گەشەی ئابووری زۆرتر بوو و داهاتی سەرانەی نەتەوەیی لە نێوان ساڵەکانی ١٩٦٠ تا ١٩٧٠ دوو هێندە بۆوەو بەگشتی " فەرەنسایەکی هاوچەرخ"ی دامەزراند. بەڵام سەرەرای ئەوەش، رەوتی گۆرانکارییە سیاسی و کۆمەڵایەتەکان بە هۆی بەردەوامی دەسەڵاتدارەتیی کۆوەبووی باوک سالارانە، هێواشتر بوو. هەر بەم هۆیەوە بەرەبەرە کەلێنی قووڵ و مەترسیدار کەوتە ناوپێکهاتەی سیاسی و ئابووری وڵاتەوە.

نارەزایەتیی گشتیی خوێندکارانی فەرەنسا لە ئایاری ساڵی ١٩٦٨دا بوو بە هۆی دابەزینێکی گەورە لە هەموو بوارەکاندا. دۆگۆل لە نیسانی ١٩٦٩دا، چارەنووسی سیاسی وڵاتی خستە ریفراندۆمەوە. ئاکامی ریفراندۆمەکە بە قازانجی دۆگۆل نەبوو و وازی لە سیاسەت هێنا.

گۆلیزم بە گشتی لەسەر سیاسەتی ناسیۆنالیستی، سیاسەتی سەربەخۆی دەرەکی، رێبەرایەتیی و سانترالیست بوونی نەریتیی فەرەنسا، ئەخلاقی کلیسای کاتۆلیکی رۆما، ئاسایشی سەربازی، جێگیری سیاسی، گەشەی ئابووری و پشتیوانی لە سەرمایەداری پێداگری دەکا. ئەمرۆکە " کۆمەڵەی کۆماریخوازان"ی فەرەنسا (RPR) خۆیان بە شوێنکەوتووی سیاسەتەکانی گۆلیزم دەزانن. RPR توانی بە یارمەتیی حیزبە راستەکانی دیکەی فەرەنسا، (جگە لە حیزبی راستی توندرۆی بەرەی نیشتمانی بە رێبەرایەتی ژان ماری لۆپوەن) لە دووهەمین خولی هەڵبژاردنەکانی سەرۆک کۆماری فەرەنسادا (٥ ئایاری ٢٠٠٢) هەڵبژاردن بباتەوەو بۆ جاری دووهەم ژاک شیراک بۆوە بە سەرۆک کۆماری فەرەنسا. بە هۆی رەچاوکردنی سیاسەتەکانی گۆلیزم RPR توانی هەڵبژاردنەکان بباتەوە.

### گەلاڵەی "بەشداریکردن بۆ ئاشتی"ی ناتۆ
### NATO "Partner Ship For Peace"

گەلاڵەیەکی ناتۆ (ڕێکخراوی ڕێککەوتنی ئاتلانیکی باکوور) بۆراکیشانی وڵاتانی ئەورووپای ڕۆژهەڵات و کۆمارە تازە سەربەخۆ بووەکانی یەکیەتیی سۆڤیەت بوو. ئەو وڵاتانەی کە تا کۆتایی ساڵی ١٩٩٤ چوونە ناو ئەم گەلاڵە، بریتی بوون لە: ئازەربایجان، قەزاقستان، قرقیزستان، ئوزبەکستان، تورکەمەنستان، گورجستان، مۆلداڤیا، ئۆکراینا، لیتۆنیا، لیتڤانیا، ستۆنیا، بولگاریا، ڕۆمانیا، هەنگاریا، پۆلۆنیا، ئالبانیا، سلۆڤیانیا، سلۆڤاکیا، چیک، سوید و فینلەندا. فیدراسیۆنی رووسیا لە ڕێکەوتی ٢٢ی حوزەیرانی ١٩٩٢دا، ئەم گەلاڵەی پەسند کرد، بەڵام لە ١ی کانوونی یەکەمدا لەمۆرکردنی دوو ڕێککەوتننامەی گرنگی ئەم گەلاڵە خۆی بوارد. کۆنفرانسی ئاسایش و هاوکاری ئەورووپا (کۆبوونەوەی بوداپێست) کە بە بەشداری سەرۆکی ٥٢ وڵاتی ئەندام لە ڕۆژەکانی ٥و٦ی کانوونی یەکەمی ١٩٩٦دا کۆبۆوە، داوای لە وڵاتانی تری ئەورووپا کرد تا بەمەبەستی دامەزراندنی ئاشتی و ئاسایش لە ئەورووپادا، ببنە ئەندامیی گەلاڵەی "بەشداریکردن بۆ ئاشتی" ناتۆ.

### گەمارۆی کیشوەری
### Contiental System

ئەم زاراوە بە قەدەغەکردنی کەرەسەکانی بەریتانیا لەلایەن ناپلیۆن بوناپارت، ئیمپراتۆری فەڕەنسا دەگوترێ. ناپلیۆن لە ساڵی ١٨٠٦دا گەلاڵەیەکی بە نێوی "گەمارۆی کیشوەری" پەسند کرد. بە پێی ئەم گەلاڵە، وڵاتانی ئەورووپی دەرگاکانی خۆیان بەرووی کەرەسەکانی بەریتانیادا دادەخست. لەم گەلاڵەدا ئاماژە بەوە کرابوو کە " دورگەکانی بەریتانیا لە گەمارۆدان، هەموو جۆرە بازرگانی و پێوەندییەک لەگەڵ دورگەکانی بەریتانیادا قەدەغەیە". بەپێی ئەم بریارنامە؛ هەموو بەریتانیەکان لە ناو خاکی فەڕەنساو هاوپەیمانەکانیدا دەستبەسەر دەکران و دەستیش بەسەر کەلوپەلەکانیاندا دەگیرا.

ئەم بریارە بە زیانی فەڕەنسیەکان بوو. چوونکە ناوەکانی بەریتانیا هێرشیان کردە سەر پاپۆرەکانی فەڕەنسا و هاوپەیمانەکانی. بازرگانی بیانیی فەڕەنسا کەوتە مەترسیەوە و وڵاتانی ئەورووپا

بوونە رکابەری فەرەنسا . راسپێردراوەکانی فەرەنساش خەریکی پەیداکردنی کەرەسە قاچاغکراوەکانی بەریتانیا و بە تایبەتیی پارچە (قوماش) و پێلاّو بۆسەر بازەکانی سوپای فەرەنسا بوون.

## گرێبەست Contract

گرێبەست سەبارەت بە پێوەندییە بازرگانیەکان کەلکی لێوەردەگیردرێ. جۆرەکانی گرێبەست بریتین لە:

١ـ ئەو گرێبەستانەی کە دەوڵەتێک لەگەڵ دەوڵەتەکانی دیکە و یان رێکخراوە نێودەوڵەتیەکانی دیکە لەگەڵ یەکتردا گرێ دەدەن، ئەم گرێبەستانە؛ پێرەوی لە یاسا نێودەوڵەتیەکان دەکەن.

٢ـ ئەو گرێبەستانەی کە دەوڵەتەکان لە نا ولاّتی خۆیاندا، لەگەڵ کەسە ئاساییەکاندا دەیبەستن( کەسە ئاسایەکان واتە ئەو کەسانەی کەسەر بە رێکخراوە نێودەوڵەتیەکان نین و سەر بەستانە کاردەکەن) و تەنیا یاسا نێوخۆییەکانی ئەو ولاّتە، لە گرێدانی ئەم گرێبەستانەدا کاریگەرییان هەیە.

٣ـ ئەو گرێبەستانەی کە دەوڵەتەکان لەگەڵ کەسە بیانیەکاندا گرێی دەدەن و لەسەر ویستی خۆیان، ئەو گرێبەستانە پێرەوی لە یاسا نێودەوڵەتیەکان دەکەن. بەم گرێبەستانە دەڵێن: " گرێبەستی نێوان دەوڵەتەکان و دامەرزاوە گشتیەکان لەگەڵ کەسە ئاساییە بیانیەکان" وهەروەها گرێبەستی نیمچە نێودەوڵەتییشیان پێ دەگوترێ. .

## گەل People

لە سیاسەتدا بەکۆی ئەو چین وتوێژو گرووپە کۆمەلاّیەتیانە دەگوترێ کە لە خەباتی دژە ئەمپریالیستیدا بەشداری دەکەن.

گەل، زاراوەیەکی رێژەییە؛ واتە لە هەر قۆناغێک لە تێکۆشانی کۆمەلاّیەتیدا، گەل هێزێکی بەرفراوانتر لە خۆ دەگرێ. بەلاّم بە گەشەکردنی شۆرش و قووڵبوونەوەی شۆرش کە

بەرژەوەندییەکانی چینی چەوسێنەر دەکەوێتە مەترسیەوە، داوێنی ئەو هێزانەی کەبە گەڵ دەژمێردرێن، چکۆلەتر و بەرتەسکتر دەبێتەوە. ئەم زاراوە زیاتر لە لایەن گرووپە چەپەکەکانەوە کەڵکی لێ وەردەگیرێ.

## گریلاکانی شار Urban Guerrillas

بەو کەسانە دەگوترێ کە هەوڵ دەدەن بە پشت بەستن بە تاکتیکە تیرۆریستیەکان لە نێو شارەکاندا بە ئامانجەکانی خۆیان بگەن. بریگادە سوورەکانی ئیتاڵیا و ئەندامانی سوپای سووری ژاپۆن لەریزی گریلاکانی شار دان.

## گۆڕینی وڵات State Succession

بە گواستنەوەی دەسەڵاتدارەتیی لە بابەتێکی یاسا نێودەوڵەتیەکانەوە بۆ بابەتێکی تری یاسا نێودەوڵەتیەکان دەگوترێ.

گۆڕینی وڵات؛ سڕینەوەی بە تەواوەتیی وڵاتێک یان گواستنەوەی بەشێک لە خاکی ئەو وڵاتە بۆ وڵاتێکی تر لە خۆ دەگرێ. ئاکامی سڕینەوەی بەتەواوەتیی وڵاتێک، گۆڕینی گشتیە کە بەهۆی ئەو خاڵانە جێبەجێ دەبێ:

١_ داگیرکردن و ملکەچ کردن (لە یاسا نێونەتەوەیە کۆنەکاندا شتێکی یاسایی بوو بەڵام بەپێی یاسا نێونەتەوەیە هاوچەرخەکان کارێکی نایاسایی یە).

٢_ دابەشکردنی وڵاتێک بەسەر دوو یان چەند وڵاتێکدا (بۆوێنە دابەشکردنی مالیزیا لە ساڵی ١٩٦٥دا بەسەر سەنگاپوور و مالیزیادا، یان دابەشکردنی پاکستان بەسەر پاکستان و بەنگلادیش لە ساڵی ١٩٧دا، یان دابەشکردنی یەکیەتیی سۆڤیەت بەسەر فیدراسیۆنی رووسیا و ١٤ وڵاتی تردا لە ساڵی ١٩٩١).

٣_ تێکەڵکردنی دوو یان چەند وڵاتێک لە وڵاتێکی یەکگرتوودا، وەک یەکیەتیی تانگانیکاو زەنگبار لە ساڵی ١٩٦١داو، دامەزراندنی تانزانیا.

٤ــ راکێشانی وڵاتێک لە لایەن وڵاتێکی تر (وەک راکێشانی تەکزاس لە لایەن ئەمەریکاوە لە ساڵی ١٨٤٥).

دیاریکردنی ئەو بابەتە کە ئایا ئەو کیانە نوێیە، وڵاتێکی نوێیە یان بەرفراوانکردن و پەرەپێدانی وڵاتی پێشووترە، لە کردەوەدا کارێکی دژوارە، گۆڕینی بەرتەسک لە دەرئەنجامی ئەسپاردنی (یان شێوازەکانی تری گواستنەوەی دەسەڵاتدارەتیی ) بەشێک لە خاکی وڵات جێبەجێ دەکرێ. بەڵام لەهەر حاڵدا گواستنەوە لە رێگای پەنابردن بۆ هێز بەکارێکی نایاسایی دادەنرێ. گۆڕینی وڵات گرفتی یاسایی ئاڵۆز لە پێوەندی لەگەڵ مافەکان و ئەو بەرپرسیارەتیانەی کە لە وڵاتی گۆڕاودا داگوازرێنەوە، پێکدێنێ. هەتا ئەم ساڵانەی دوایی، گۆڕینی وڵات بە تەوەاوەتی بەپێی یاسا نێونەتەوەییە عورفیەکان جێبەجێ دەبوو، بەڵام کۆنفانسیۆنی ڤیەننا سەبارەت بە گۆڕینی وڵات لە سامانەکان، بەڵگەنامە و قەرزەکان(١٩٨٣)، چوارچێوەیەکی بەرفراوانی لە رێوشوێنەکانی گۆڕینی وڵات رێک خستووە. گۆڕینی وڵات گرفتی وەک گواستنەوەی رێککەوتننامەکان، ئەندامەتی لە رێکخراوە نێونەتەوەییەکان، مافەکانی پێوەندیدار بە سامانە گشتی و تایبەتیەکان، داواکاری نێونەتەوەیی و ئەرکە دیاریکراوەکانی بەدواوەیە. دەبێ گۆڕینی وڵاتەکان لە دەوڵەتەکان جیا بکرێتەوە، چوونکە لە گۆڕینی دەوڵەتەکاندا تەنیا نوێنەری سیاسیی وڵات دەگۆڕێ.

## کوونەوەی ریۆ (١٩٩٢) Rio Summit

ئەم کۆبوونەوە کە بە بەشداری زیاتر لە ١٤٠ کەس لە سەرۆکی ولاّتان و دەوڵەتەکان لە حوزەیرانی ساڵی ١٩٩٢دا لە لایەن کۆنفرانسی جیهانی ژینگە و پەرەسەندن ( UNCED) لە ریۆ دوژانیرۆی بەرازیل بەرێوەچوو، یەکەمین کۆبوونەوەی نێودەوڵەتیی لە بواری ژینگەدا بوو. تەوەری ئەو کۆبوونەوە، دوو چەمکی ژینگە و پەرەسەندن بوو. بەشدارانی ئەو کۆنفرانسە لە سەر ئەوە کۆک بوون کە لە رابردوودا ئەو دوو چەمکە کە بە دوژمنی یەکتر دەژمێردران و، لە دەیەی ٧٠دا کۆمەڵگای نێودەوڵەتی، لە پێناو ئاشتکردنەوەی ئەو دوو چەمکەی هەوڵی داوە، دەبێ ئێستا تێکەڵ بکرێن. لەدەرئەنجامی ئەو تێکەڵبوونە،چەمکی نوێی گەشەی بەردەوام هاتە ئاراوە. بۆیە دەبێ کۆنفرانسی ریۆ بە خاڵی وەرچەرخان لە رەوایی دان بە بەرفراوان کردنی چەمکی ژینگە بزانین.

لە کۆنفرانسی رێودا، رێککەوتنی گەورە لە نێوان ولاّتانی پێشکەوتوو(باکوور) و ولاّتانی لە حاڵی پەرەسەندن (نامی) (باشوور) هاتە ئاراوە کە لە بەڵگەنامەکانی کۆبوونەوەکەدا رەنگی داوەتەوە.

هەروەها لە راگەیەنراوی ریۆدا، بنەماکانی سەبارەت بە پاراستنی دارستان و هەروەها دوو کۆنڤانسیۆنی گرنگی نێودەوڵەتی، واتە (کۆنڤانسیۆنی گۆڕانەکانی کەش و هەوا و کۆنڤانسیۆنی جۆراوجۆریی بایۆلۆجی) لە کۆتایی کۆنفرانسەکەدا لە لایەن سەرۆکی لیژنەکانی بەشداری

کۆبوونەوەکە مۆرکرا . خشتەی بەرنامەی کاری ۲۱، لە ٤٠ بەش پێکهاتبووو، هێڵە گشتی و ئەو چوارچێوە سیاسەتگوزاریانەی کە دەبێ لە سەر ئاستی نەتەوەیی و نێونەتەوەیی لە لایەن ولاّتانەوە بەڕێوە بچن و، هەروەها میکانیزمە ماددی و بەڵێنیەکانی ولاّتانی پێشکەوتووی لە بەرامبەر ولاّتانی حاڵی پەرەئەستێندا لە پێناوی دەستەبەرکردنی ئامانجەکانی کۆنفرانسی ریۆ، دەستنیشان کردووە. "ڕاگەیەنراوی ریۆ" کە بە " جاڕنامەی زەوی" ناوبانگی دەرکرد، خاوەنی ۲۷ بنەمایە کە چوارچێوەی گشتی ئەرکە سیاسییەکانی دەوڵەتەکان و ئەرک و بەرپرسیارەتیەکانی سەبارەت بە پاراستنی ژینگەی تێدا گونجێنراوە. لە "بنەماکانی پێوەندیدار بە دارستان"یش چۆنیەتی بەڕیوەبەریی بەردەوام وپاراستنی دارستانەکانی روون کردۆتەوە.

### کۆبوونەوەی مالّتا ( کانوونی یەکەمی ۱۹۸۹ ) *Malta Summit*

ئەم کۆبوونەوەیە لە نێوان جۆرج بوش، سەرۆک کۆماری ئەمەریکا و میخائیل گۆرباچۆف، سەرۆکی یەکیەتیی سۆڤیەت لە ڕێکەتی دووی ئەیلوولی ۱۹۸۹ لە سەر پاپۆری رووسیی " ماکسیم گورکی"، پێک هات. لەو دانیشتنەدا لە لایان جۆرج بۆشەوە چەندین گەلاّڵە لە بارەی مەسەلە جۆراوجۆرە نێودەوڵەتیەکانەوە خرایە روو. هێندێک لە و پێشنیارانە بریتی بوون لە :

١ــ دیاریکردنی ڕێکەوتی کۆبوونەوەی دواتر لە دوو حەوتووی کۆتایی مانگی حوزەیرانی ۱۹۹٠ لە ئەمەریکا.

٢ــ چاوپێکەوتنی وەزیرانی دەرەوەی دوو ولاّت لە مانگی کانوونی دووهەمدا لە مۆسکۆ.

٣ــ وتووێژ سەبارەت بەرێککەوتننامەی کەمکردنەوەی چەک و چۆلە ستراتیژییەکان.

٤ــ وتووێژی بازرگانیی نێوان دوو ولاّت.

٥ــ هاوکاریی ئابووریی زیاتری نێوان دوو ولاّت.

٦ــ هەوڵدان بۆ دەستوێڕاگەیشتن بە نرخی بازاڕ بۆ شتومەکەکانی سۆڤیەت.

٧ــ نەهێشتنی یاسای قەدەغە بوونی هەناردەی تەکنەلۆژیای پێشکەوتوو بۆ سۆڤیەت

٨ــ وتوویژ بۆ سەرمایەگوزارییە هاوبەشەکان.

٩ــ چارەسەری کێشەی مافەکانی مرۆڤ لە سۆڤیەت.

١٠ــ خێرایی بەخشین بە وتووێژی دوولایەنە لە سەر چەک وچۆڵە ستراتیژییەکان.

١١ـ ڕێککەتننامەی هاوبەش لە بواری بەڕێوەبردنی تاقیکاری ئاشتیخوازانەی ناوەکی .

١٢ـ بڵاوکردنەوەی خشتەی پلانە سەربازییەکان و ئاستی بەرهەمهێنانی چەک و چۆڵەکان .

١٣ـ پێکهێنانی کۆمیتەی هاوبەشی ئەمەریکا و سۆڤیەت بۆ باشتر بەڕێوبردنی پێشبڕکێکانی ئۆلەمپیکی بەرلین لە ساڵی ٢٠٠٤.

١٤ـ پێکهێنانی کۆبوونەوەی زانستی لە واشنیگتون لەبارەی سیستەمە وریاکەرەوە جیهانیەکان.

١٥ـ گۆڕینەوەی هەزار خوێندکار بۆ خوێندنی ساڵی ١٩٩١ لە نێوان هەر دوو وڵات دا.

١٦ـ کۆتایی هێنان بە بەرهەمهێنانی چەکە کیمایيەکان لە لایەن هەر دوو وڵات.

## کۆبوونەوەی مۆسکۆ (١٩٩١) Moscow Summit

ئەم کۆبوونەوە لە ڕێکەوتی ٣٠ی تەمموزی ١٩٩١ لە نێوان سەرۆک کۆماری ئەمەریکا و سەرۆکی یەکیەتی سۆڤیەتدا بەڕێوە چوو.

لەم کۆبوونەوەدا ئەمەریکا سەرەڕای بەخشینی " مافی دەوڵەتی کامیلە ئەلویداد" بە سۆڤیەت، ٥ ڕێککەوتنامەی لەگەڵ ئەم وڵاتەدا مۆر کرد کە بریتین لە :

١ـ پرۆتۆکۆلی هاوکارییە تەکنیکەکان بەمەبەستی قووڵتر کردنی پێوەندییەکانی نێوانیان.

٢ـ ڕێککەوتنامەی هاوکاری دەواو دەرمان بە مەبەستی قەرەبووکردنەوەی کەم و کورتیەکانی دەواو دەرمان لە سۆڤیەت دا.

٣ـ ڕێککەوتنامەی دوو لایەنە سەبارەت ئاسایشی فڕۆکەکانی وڵات، بەمەبەستی بەربەرەکانیکردن لەگەڵ تیرۆریزم.

٤ـ گرێدانی ڕێککەوتننامە سەبارەت بە پەرەپێدانی پلانی شوێنی نیشتەجێ بوون.

٥ـ گرێدانی ڕێککەوتنامە سەبارەت پێکهێنانی هاوئاهەنگی سەبارەت بە هاوکارییە سەرەتاییەکان لە کاتی ڕوودانی کارەساتە سروشتیەکاندا.

کۆبوونەوەی مۆسکۆ بە مۆرکردنی ڕێککەوتننامەی بەناوبانگی ستارت، دوای دوو ڕۆژ کۆتایی هات. بەپێی ئەو ڕێککەوتنە ٧٠٠ لاپەڕەییە، بۆ یەکەمین جار ژمارەی چەک و چۆڵەکانی دوو زلهێز بۆ ڕادەی ٦٠٠٠ کلاّوەی شەڕ بە مەودای ٥٥٠٠ کیلۆمەتر کەم دەبۆوە. وتوویژەکانی سەبارەت بە کەمکردنەوەی چەک چۆڵە ستراتیژییەکان زیاتر لە ٩ ساڵ لە نێوان ئەم دوو زلهێزەدا درێژەی هەبوو.

ستارت، سیهەمین و لەڕاستیدا گرنگترین ڕێککەوتنی چەک و چۆڵی نێوان ئەمەریکا و یەکیەتیی سۆڤیەت بوو کە لە ماوەی چوار ساڵدا مۆر کرا. ئەم ڕێککەوتنە کەمکردنەوەی هێزە ئاساییەکان لە ئەورووپا و نەهێشتنی موشەکە ناوەکیە نێوان بڕەکانی لە خۆدەگرت. بە بڕوای چاوەدێرانی سیاسی، ئەم ڕێککەوتنە کۆتایی بە پەنجا ساڵ ڕووبەڕوو بوونەوەی دوو لایەنە هێناو، هاوکات لەگەڵ بوار ڕەخساندن بۆ هاوکاریی زیاتری ئابووری، بواری بۆ نەمانی کۆمۆنیزمیش لە جیهاندا، ڕەخساند. کۆبوونەوەی مۆسکۆ شەشەمین چاوپێکەوتنی نێوان جۆرج بوش و میخائیل گۆرباچۆف بوو.

### کۆنەپەرستی — *Reaction*

بە دژایەتیکردن و بەرەنگاربوونەوەی ئەو چین و بیروبۆچوونە کۆنانەی کە لە گیانەڵلایی و حاڵی فەوتاندان، لەگەڵ ڕەوتی پێشکەوتنی کۆمەڵگا دەگوترێ.

کۆنەپەرستی بە واتای بەرگریکردن لە سیستەمێکی کۆن و دواکەوتووە کە بە هۆی کۆن بوون، لەحاڵی فەوتان دایە. واتە دژایەتیکردن لەگەڵ پێشکەوتن و بەرەوپێشوە چوونە. ئەم زاراوەیە زیاتر لە لایەن گرووپە چەپەکان لە بەرامبەر گرووپە ڕاستەکان و گرووپە ئایینیەکاندا کەڵکی لێ وەردەگیرێ.

### کۆنەپەرست — *Reactionary*

ئەم زاراوەیە بەکەسێک دەگوترێ کەنەک تەنیا لە بەرامبەر هەر جۆرە گۆڕان و ئاڵ وگۆڕێکدا بەربەرەکانی دەکا، بەڵکوو لە هەوڵی ئەوەدایە کە چرکە ژمێرەکانی کاتیش بۆ دواوە بگەڕێنێتەوە و، پێوەرەکانی ڕابردوو بکات بە پێوانەی جموجۆڵ و کردەی خۆی لە کاتی ئێستادا.

زاراوەی کۆنەپەرست زۆرجار بە واتای دژە پێشکەوتن و دژایەتیکردن لەگەڵ بەرەوپێشفەچوونیش کەڵکی لێ وەردەگیردرێ.

ڕیبازەکانی نازیسم و فاشیزمیش کەڵکیان لەو زاراوەیە وەردەگرت. مەبەستی ئەوان لە کۆنەپەرستی ئەوبەرگرییە بوو کە لە لایەن دامەزراوە نەریتیەکان لە بەرامبەر بنباژۆوە دەستە ڕاستیەکان لە ئارادا بوو. بیروبۆچوونە چەپیەکانیش لەو زاراوە کەڵک وەردەگرن.

## کەڵەپیاو *Ubermensch ( Super_ man)*

بەپێی بیروباوەڕی نیچە فەیلەسوفی ئەڵمانی، مێژووی مرۆڤ بریتیە لە مێژووی خەبات لە نێوان ڕەگەزە بالاّ و ڕەگەزە نزمەکان، لە نێوان بە هێزەکان وبێ هێزەکانە و؛ جیهان و کۆمەڵگاش، گۆڕەپانی کردەی کەڵەپیاوان و دەگمەنەکانە، کە بەوپەڕی هێزەوە بەرەو لوتکە، شەڕ و سەرکەوتن دەڕۆن و، تەنیا ئەوانن کە خولقێنەری مێژوون و، بۆ گەیشتن بەو لوتکەش نە دەتوانن و نەخۆشیان بە هیچ یاسایەکی ئاکاری دەبەستنەوە. چوونکە گەیشتن بە گەورەیی لەگەڵ ڕێ و شوێنە ڕەوشتیەکاندا یەک ناگرێتەوە. مرۆڤ بەپێی خووخدە، ملکەچی ئەو کەسانەیە کە خوازیاری گەیشتن بە دەسەلاّتن؛ کەوایە دەبێ خووخدەی کەڵەپیاوان، جێگای ڕەوشتی مێگەلیی کۆیلەکان بگرێتەوە

## کۆلۆنیالیزم *colonialism*

کۆلۆنیالیزم وشەیەکە بە مانای ئاوەدان کردنەوە و، لە سیاسەتدا بریتیە لە ڕژێمێکی سیاسی و ئابووری، کە بە پێچەوانەی ویستی خەڵکی ناوچەیەک بەسەریاندا سەپاوە و جێگیر بووە و، ئامانجەکەشی دابینکردنی بەرژەوەندی بیانیەکان یان بەکرێگیراوانی نێوخۆییە.

"کۆلۆنیالیزمی کلاسیک" دوای شەڕی دووهەمی جیهانی شوێنی خۆی بە "کۆلۆنیالیزم نوێ" داوە کە شێوازی نوێی سیاسی، ئابووری، کولتووری و کۆمەلاّیەتی لە خۆ دەگرێ.

هاتنە سەرکاری بەکرێگیراوانی خۆماڵی کە لە ڕۆاڵەتدا داکۆکی لە دابینکردنی بەرژەوەندییە نەتەوەییەکان دەکەن؛ دەستێوەردان لە هەڵبژاردنە نەتەوەییەکان و بەلاّرێدا بردنی حکوومەتە یاساییەکان؛ برەودان بە ئاڵۆزییە نێوخۆییەکان و، هاوکاریی تەکنیکیی سنووردار بۆ بە ئاراستەدابردنی ئابووریی وڵات بەرەو بوارە دڵخوازەکان و فرۆشتنی چەک و چوڵی سەربازی

بەنرخێکی زۆر گران لە نموونەکانی شێوازی کۆلۆنیالیزمی نوێیە کە لە لایەن داگیرکەرانەوە پیادە دەکرێ.

### کردەوە تۆڵەئەستێنانەوەکان لەشەڕدا *Reprrisalsin War*

بە کردەوەیەکی تۆڵەئەستێنانەوە دەگوترێ کە لە بنەڕەتدا، کردەوەیەکی نایاساییە، بەڵام بەپێی ئەو کردەوانەی کە دوژمن دەیانکاو، ئەو کردەوانە مافەکانی شەڕ پێشێل دەکەن بە مەبەستی جێبەجێکردنی ڕێ وشوێنە پەسندکراوەکانی شەڕی شارستانیانە و بەمەبەستی پشتیوانیکردن لە ڕەچاوکردنی بنەماکانی شەڕ، لە داهاتوودا لە دژی کەسەکان و داراییەکانی دوژمن لە لایان لایەنەکەی دیکەی شەڕەوە،کەڵکی لێ وەردەگیردرێ.

دەبێ لە نێوان کردەوەی تۆڵە ئەستێنانەوە لە شەڕدا (یان کردەوەی تۆڵە ئەستێنانەوەی دوژمنکارانە) و کردەوەی تۆڵەئەستێنانەوە لە ئاشتیدا جیاوازی دابنرێ. بەر لەوەیکە کەڵک لە کردەوەی تۆڵەئەستێنانەوەی دوژمنکارانە وەربگیرێ، دەبێ ڕێگاچارەیەکی تر بۆ دابینبوونی یاسا و ڕێساکانی مافەکانی شەڕ پیادە بکرێ. هێندێک لە کردەوە تۆڵەئەستێنانەوەکانی وەک سزادانی بەکۆ [سووتاندنی تەڕو وپشک بەیەکەوە. و]، بارمتەگرتن و ڕەق هەڵرشتن بەسەر دیلەکانی شەڕ و خەڵکی ئاساییدا، قەدەغەیە. کۆنڤانسیۆنی ژمارە سێی ژنێف (١٩٤٩) هیچ بەڵگەیەک بۆ ماددەی قەدەغەبوونی پیادەکردنی کردەوەی تۆڵەئەستێنانە بە دژی دیلەکانی شەڕ قبووڵ ناکاو، ئەمەش بەو مانایە کە هیچ بەڵگەیەک بۆ پێشێلکردنی ماددەی ژمارەسێی ژنێف، تەنانەت بە ناوی کردەی بەرامبەرانە یان وەک دژکردەوەش، قبووڵ ناکرێ و، ئەم ماددەیە مانایەکی ڕەهای هەیە. کردەوەی تۆڵەئەستێنانە نابێ نالۆژیکی بێ یان لە کردەوەی پێشێلکاریی لایەنی بەرامبەر زیاتر بێ. زیاتر بەرپرسی فەرماندەیی گشتیِ هێزە سەربازییەکان دەتوانێ بڕیاری کردەوەی تۆڵەئەستێنانە بدا.

### کردەوەی ڕاستەوخۆ *Direct Action*

دروشمێکە کە لە لایەن لایەنگرانی سەندیکالیزمی شۆڕشگێر، لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەم دا لە پێوەندی لەگەڵ مانگرتنەکان، سابۆتاژی پیشەسازی، داگیرکردنی کارگەکان لە لایەن کرێکاران و تەنانەت ڕاپەڕینە سیاسییەکان بەجێگای هەوڵی پەرلەمانی کەڵکی لێ وەردەگیرا. ئەم

زاراوەیە لە ساڵی ١٩٤٧دا لە لایەن حیزبی کۆمۆنیستی فەڕەنساوە زیندوو کرایەوە تاکوو پەرە بە مانگرتنەکان و ئاڵۆزی و بشێوی شارستانی (مەدنی) بدات.

## کەمینەکان — *Minorities*

بە تاقمێک لە خەڵک دەگوترێ کە خاوەنی کولتوور، رەگەز، داب و نەریت و ئایینێکی جیا لە کولتوور و ئایینی خەڵکی ئەو وڵاتە بن کە تێیدا دەژین.

## کۆنسیسێون (ئیمتیاز) — *Concession*

لە یاسای ئیداریدا بە بەخشینی مافی سوود وەرگرتن لە هەرشتێک بە کەس یان کەسانێک یان بە چەندین بەرپرس، کۆنسیسێۆن یان ئیمتیازی پێ دەگوترێ. دەسەڵاتە گشتییەکان ئەم مافە سەبارەت بە مڵک و سامانی نەگوازراوەی خۆیان یان لە ئەو مڵک و سامانەی کە لەبەردەستیان دایە، بە کەسێکی تر دەدەن. وەک ئیمتیازی بەخشینی زەوی بەو کەسانەی کە دەیانەوێ ئاوەدانی بکەنەوە یان بەخشینی بە جوتیاران، یان خزمەتگووزارییە گشتییەکان یان کەڵک وەرگرتن لە کانزاکان و . . . .

ئەو ئیمتیازانەی کە سەبارەت بە خزمەتگوزارییە گشتیەکان و کانزاکانن هەم لە بواری کۆمەڵایەتی و هەم لە بواری ئابووریشەوە لە هەموو ئیمتیازەکانی دیکە گرنگترن.

ئیمتیازی کانزاکان: لە ساڵی ١٨١٠دا لە فەڕەنسا سەرچاوە ژێرزەوییەکان بەپێی یاسا بوون بە سامانێکی سەربەخۆ و لە سامانەکانی سەر زەوی جیاکرانەوە. کاتێک سەرچاوەیەکی ژێرزەوی دەدۆزرێتەوە، دەوڵەت چوارچێوەکەی دیاری دەکا و دەیدا بەو کەس و لایەنانەی کە لە بواری هەڵێنجانی سەرچاوە ژێرزەوویەکاندا خەریکی چالاکین، کە بەمەش دەگوترێ ئیمتیازدان.

ئیمتیازی خزمەتگوزارییە گشتیەکان: ئیمتیازێک کە لە لایەن دەسەڵاتە ناوەندییەکان یان لە لایەن هەرێمیەکانەوە بە تاکەکەسەکان دەدرێ و، ئەم سەلاحیەتەیان پێ دەبەخشێ کە بۆ ماوەیەکی دیاریکراو باجی رێگاوبان وەربگرن. وەک باجی پرد یان شارێکان. سەبارەت بە رێگای ئاسن و دابەشکردنی گاز و کارەبا، دەوڵەتی ناوەندی یان دەوڵەتی هەرێم بە جێگای ئەوی کە سەلاحییەت بە کەسێک بدەن تاکوو باج کۆبکاتەوە، مافی سوودێکی کەمیان ــ بە پێی نرخی دیاریکراوــ لەبەر چاو گرتووە.

بە دەسپێکردنی سەدەی بیستەم بە جێگای پێدانی ئیمتیاز یان ئیزنی کەڵک وەرگرتنی تایبەت و دیاریکردنی باج بەپێی ڕێوشوێنی یاسایی، خۆیان کانزاکان و دامەزراوەکان بەڕێوە دەبەن. ئەم حاڵەتە لە پێوەندی لەگەڵ ڕێگای ئاسن و کارەبا و گازدا بایەخێکی تایبەتی پێدراوە و، ئیتر لەگەڵ سەرمایەی تایبەتیدا، ڕێککەوتننامە مۆر ناکەن. لەگەڵ خۆماڵیکردندا ئیمتیازە گرنگەکانیش رادەوەستن.

### کۆبوونەوەی حیزبی
### Caucus

ئەم زاراوەیە لە بنەڕەت دا لە ئەمەریکا بە کۆبوونەوە تایبەتیەکانی ئەندامانی حیزبەسیاسییەکان دەگوترێ. لەو کۆبوونەوانەدا سەبارەت بە سیاسەتەکانی حیزب یان دەستنیشانکردنی پاڵێوراوەکان بۆ هەڵبژاردنەکان، چەندین بریار دەدرێن.

### کۆبوونەوەی نهێنی
### Conclave

ئەم زاراوەیە بە کۆبوونەوەی ئەنجومەنی کاردیناڵەکانی کلیسای کاتۆلیکی ڕۆم دەگوترێ کە بۆ هەڵبژاردنی پاپی نوێ پێک دێ. دوای مردنی پاپ، دەبێ ئەنجوومەنی ناوبراو لە ماوەی سێ حەوتوودا کۆببێتەوە. هەموو کاردیناڵەکان بانگهێشت دەکرێن، بەڵام بەشداریی نیوەی ئەوان بۆ ڕەوایی دان بە کۆبوونەوەکە تەواوە. زیاتر لە سێ سەد کەس کاردیناڵ لەو کۆبوونەوە نهێنییەدا بەشدارن. نێوەڕۆکی ئەو کۆبوونەوەیە بە هیچ شێوەیەک بڵاو ناکرێتەوەو، هەتا ئەو کاتە پاپی نوێی هەڵنەبژێردرێ هیچ کام لە کاردنیاڵەکان ناتوانێ لەگەڵ دەرەوەی ڤاتیکاندا پێوەندی پێک بێنێ. دوو لە سێی دەنگەکان بۆ هەڵبژاردنی پاپی نوێ بەسە. ئەگەر کاتێک دەنگەکان بە ئاستی پێویستی خۆی نەگا، ئەوکاتە بەرگەی دەنگەکان بە پووشێکی تایبەت دەسوتێنرێن تاکوو دووکەڵێکی ڕەشی لێ بەرزببێتەوە. چوونەدەری دووکەڵی ڕەش لە دەلاقەی تایبەت مانای ئەوەیە کە کاردیناڵەکان تاکوو ئیستا بۆ هەڵبژاردنی پاپی نوێ بە ئاکامێک نەگەیشتوون. هەلبژاردن تا ئەو کاتە دەخایەنێ کە دوو لە سێی دەنگەکان بە یەکێک لە پالیوارەکان دەدرێ. ئەمجارە دەنگەکان بەبێ پووشە تایبەتیەکە لە شتێکی تایبەتی دەنرێن و دەسووتێنرێن. ئەمجارە دووکەڵێکی سپی لێ بەرزدەبێتەوە کە ئەم

دووکەڵە سپییە مانای ئەوەیە کە پاپی نوێ هەڵبژێردراوە. دوای بەڕێوەچونی ئەم ڕێورەسمە، بەتەمەنترین قەشە بەوتنی ئیمە پاپ مان هەیە"، هەلبژاردنی ناوبراو بە دنیا ڕادەگەیەنێ.

## Slavery — کۆیلەداری

زاراوەیەکە کە لە کۆمەڵناسیی زانستی دا بە یەکەمین فۆرماسیۆنی کۆمەڵایەتی ـ ئابووری دەگوترێ کە لە سەربنەمای چەوسانەوەی تاک و بەدەستی تاک ڕاوەستاوە. کۆیلەداری لە قۆناغی دوای کۆمۆنی سەرەتایی و لە سەربنەمای نایەکسانی ئابووری کە خۆی بەرهەمی سەرهەڵدانی خاوەنداریتی تایبەتی بوو، سەری هەڵدا. کۆیلایەتی سەرەتا لە میسری کۆن، بابل، ئاشوور، چین وهیند سەری هەڵدا، بەڵام لە یۆنان و ڕۆمی کۆندا بە شێوەی کلاسیکی خۆی گەشەی کرد. پێوەندییەکانی بەرهەمهێنان لەو قۆناغەدا بریتی بوون لە خاوەنداریتی خاوەن کۆیلە بەسەر کەرەسەکانی بەرهەمهێنان و هەروەها بەسەر کۆیلەدا کە وەک ئامرازێک دەکران و دەفرۆشران. هەروەها کۆیلەدار، خاوەنی گیانی کۆیلە. کۆیلەداران بەسەر خاوەن زەوییە گەورەکان، خاوەنداران و ئەو کەسانەی کە سات و سەودایان بە کۆیلەکان دەکرد، دابەش دەبوون.

## The End Of History? — کۆتایی مێژوو؟

تیۆرێکە کە لە لایەن فرانسیس فۆکۆیاما، جێگری بەشی پلان دانانی سیاسی لەوەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا لە ساڵی ١٩٨٩ لە بڵاوکراوەی " بەرژەوەندییە نیشتمانیەکان"دا هاتە ئاراوە.

ناوبراو تیۆرەکەی خۆی سەرەتا وەک وتارێک و پاشان بە بڵاوکردنەوەی کتێبێک لە ژێر ناوی، "کۆتایی مێژوو و دوایین مرۆڤ " ( The End Of History And The Lestman) خستە ڕوو. بە بڕوای ناوبراو، "لیبراڵ دیمۆکراسی" دوایین جۆری حکومەت لە کۆمەڵگای مرۆڤایەتی دایە. مێژووی مرۆڤایەتیش کۆییەکی پتەو ئاراستەدارە کە بەشێکی گەورە لە کۆمەڵگای مرۆیی بەرەو لیبراڵ دیمۆکراسی هان دەدا. فۆکۆیاما لە لێکدانەوەی زیاتری تیورەکەی خۆیدا دەڵێ:

"کۆتایی مێژوو ئەو کاتەیە کە مرۆڤ بە جۆرێک لە کۆمەڵگای مرۆیی بگات کە ئەو کۆمەڵگایە قووڵترین و سەرەکیترین پێداویستیە مرۆڤایەتیەکان دابین بکا. مرۆڤی ئەمرۆکە بە

گەیشتۆتە ئاستێک کە ناتوانێ دنیایەکی جیاواز لەم دونیایەی ئێستا وێنا بکا، چوونکە هیچ نیشانەیەک لە دەرەتانی باشتربوونی بنەڕەتی تەکووزی ئێستا لە ئارادانیە".

هەوەها فۆکۆیاما پێیوایە :

" لەچەند سالی رابردوودا هاوکات لەگەلْ سەرکەوتنی لیبرالْ دیمۆکراسی بەسەر نەیارە ئایدۆلۆژییەکانی خۆی وەک پاشایەتیی پشتاوپەشت، فاشیزم و لە هەمووشیان نوێتر، بەسەر کۆمۆنیزمدا، لە سەرانسەری جیهان دا، هاوڕاییەکی گرنگ سەبارەت بە رەوایی لیبرالْ دیمۆکراسی، وەک حکومەتێکی سەرکەوتوو هاتۆتە ئاراوە. بەلام جیاواز لەو هاوڕاییەش رەنگە لیبرالْ دیموکراسی " خالی کۆتایی گەشەی ئایدۆلۆژیای مرۆڤایەتی " و"دوایین جۆری حکومەتی مرۆڤایەتی بێ بەو بایەخەی کەهەیەتی، "کۆتایی مێژوو" پێک بێنێ. لە راستیدا، هەرەسهێنانی کۆمۆنیزم هۆکاری سەرکەوتن و زالبوونی بە هاکانی لیبرالیزمی رۆژئاواو کۆتایی پێکدادانە ئایدۆلۆژییەکانە. من باوەڕم بە کۆتایی هاتنی مێژوو هەیە. مێژوو وەک پرۆسەیەکی پتەو و بگۆڕ کە بە تێرامان لە ئەزموونی تێکرای خەلک لە هەموو سەردەمەکان لێی تێدەگەین. وەها تێگەیشتنێک لە مێژوو، بەر لە هەموو کەس بە ناوی "هیگلْ"ی فەیلەسوفی ئەلمانی دەناسرێتەوە. کارلْ مارکسیش بە قەرزکردنی ئەم چەمکە لە مێژوو، کردی بە بەشێک لە چوارچێوەی هزروبیری رۆژانەی ئێمە".

فۆکۆیاما، دوای رووداوی ١١ی ئەیلوولی ٢٠٠١، بە نووسینی وتارێک بۆ جارێکی تر پێی لە سەرتیۆری "کۆتایی مێژوو" داگرتەوە.

## *کراس ڕەشەکان* — *Black Shirts*

زاراوەیەکی گشتی و باوە کە لە مێژووی هاوچەرخی ئیتالیادا بە "تاقمی هەلمەت" واتا "تاقمە تێکۆشەرە نیشتمانیەکان" ناوبانگی دەرکردووە.

ئەم رێکخستنە لە سالی ١٩١٩ دا بە مەبەستی بەربەرەکانیەکی توندوتیژ لەگەلْ سۆسیالیزم و کۆمۆنیزم دامەزرا. کراس ڕەشەکان ئەرکی پاراستنی شارەکانیشیان لە ئەستۆدا بوو. ئەو گرووپە لە سالی ١٩٢١دا وەک رەمزی میلیشیا نیشتمانی لەگەلْ حیزبی فاشیستی ئیتالیا تێکەلْ کرا. نازناوی "کراس ڕەشەکان" بە ئەندامانی گرووپی "ئێس. ئێس"ی ئەلمانیای نازیش دەگوترا.

### کۆنفیدراسیۆنی گشتیی کار (سی.ژ.ت) CGT

بە بزووتنەوەی یەکیەتیی کرێکاریی فەرەنسا دەگوترێ کە لە ساڵی ١٨٩٥ لە لیمووژ دامەزراو، لە ساڵی ١٩٠٢ لە موون پیلیە لەگەڵ یەکیەتیەکان دیکەدا یەکی گرت.

ئەم کۆنفیدراسیۆنە لە بوارەکانی مووچە، ماف و هەل ومەرجی کار و کێشە سیاسیەکاندا کاری دەکرد.

ئەو بزووتنەوە لە ساڵی ١٩٣٦ لە ژێر دروشمی بەرەی گەلدا، یەکیەتیەکی نوێی دامەزراند، چوونکە لە ساڵی ١٩٢١دا باڵی شۆڕشگێری ژێر سەرکردایەتیی کۆمۆنیستەکان ڕێکخراوێکی دیکەی دامەزراندبوو. هەربۆیە یەکیەتیی ناوبراو سەرلە نوێ لە ساڵی ١٩٤٠ هەڵوەشایەوەو، دیسان لە ساڵی ١٩٤٦ دامەزراو، لە ژێر نفووزو دەسەڵاتی کۆمۆنیستەکان دابوو. توخمە غەیرە کۆمۆنیستەکانی ئەم یەکیەتیە لە ساڵی ١٩٤٧ وازیان هێنا، تا ئەوەی کە "کۆنفیدراسیۆنی گشتیی کار ـ هێزی کرێکاری" دامەزرێنن.

### کۆمەڵگای گەورە Great Society

زاراوەیەک بوو کە لیندۆن جانسۆن (٧٣-١٩٠٨) سی وشەشەمین سەرۆک کۆماری ئەمەریکا (٦٨-١٩٦٣) بۆ پێناسەی کۆمەڵگای ئەمەریکی کەڵکی لێ وەردەگرت. بە بڕوای ناوبراو، بە بەڕێوەچوونی یاسا مەدەنیەکان لەو ئەمەریکادا، ئەمەریکا دەبێ بە کۆمەڵگای یۆتۆپیایی خەڵکی سەربەست و ئازادیخوازی جیهان، نەک یەکیەتیی سۆڤیەت.

### کۆمەڵگای بێ چین Classless Society

لە ئەدەبیاتی سیاسیی هاوچەرخی ئەڵمانیادا زاراوەی "کۆمەڵگای بێ چین" لە بەرامبەر "شەڕی چینایەتی"دا، یەکێک لە بنەما سەرەکیەکانی ئایدۆلۆژیای نازییەکانی پێک دەهێناو، بە بڕوای ئەوان، ئێس ئێس نوێنگەی کۆمەڵگای بێ چین بوو.

### کۆمەڵەی عەرەبی / یەکیەتیی عەرەبی
### League Of Arab States

ئەم کۆمەڵەیە دوای هەوڵێکی زۆر و بەردەوامی وڵاتانی عەرەبی بۆ دامەزراندنی یەکیەتیەک، پێک هات. بەمەبەستی پێکهێنانی ئەو یەکیەتیە، پرۆتۆکۆلێک ( کە لەودا ئاماژە بە دامەزرانی کۆمەڵەیەک لە وڵاتانی عەرەب کرا بوو) لە لایەن میسر، عێراق، لوبنان، سووریاو ئۆردون مۆر کرا. کۆمیتەی یەکیەتیی پان عەرەب لە کۆنفرانسی ئەسکەندریە لە ١٤ی شوباتی ١٩٤٥دا کۆبوونەوەیەکی بەمەبەستی پەسندکردن و مۆرکردنی پێرەوپرۆگرامێک بۆ کۆمەڵەی عەرەبی پێکهێنا. رێککەوتننامەی وڵاتانی عەرەبی لە رێکەوتی ٢٢ی مارتی ١٩٤٥ لە لایەن نوێنەرانی دەوڵەتەکانی میسر، عێراق، لوبنان، عەرەبستان، سووریا، ئۆردون، نوێنەرێک لەفەلەستین و یەمەن مۆر کرا. لیبیا لە ساڵی ١٩٥٣، سوودان لە ١٩٦١ وئەلجەزایر لە ١٩٦٢ چوونە ریزی ئەم رێککەوتننامەوە. کۆمەڵەی عەرەبی خاوەنی ٩ کۆمیتەی سیاسی، ئابووری، کولتووری، کومەلایەتی، سەربازی، یاسایی وهتد.... دەبێ. دەوڵەتی لیبیا لە مانگی ئایاری ٢٠٠٣، وازی لە ئەندامەتیی لە کۆمەڵەی عەرەبی هێنا. ژمارەی ئەندامانی کۆمەڵەی عەرەبی ٢١ وڵاتە.

### کۆمەڵگای فرەگەز — Transnational Society

ئەم زاراوە لە لایەن "ریمۆن ئارۆن"، کەسایەتیی سیاسی فەرەنسا بۆ پێناسەی فرەیی پێوەندییە دەروونیەکان، جموجۆڵەکان و ئەو رێکخراوانەی کە لە دەرەوەی سنوورە نەتەوەییەکاندا خەریکی چالاکین، کەڵکی لی وەرگیراوە.

### کۆمەڵگای مەدەنی — Civil Society

زاراوەیەکی باوی سەدەی هەژدەهەمە کە لە پاش تیۆری "پەیمانی کۆمەڵایەتی" هاتە نێو هزری سیاسیەوە. کۆمەڵگای مەدەنی باس لە رەوش و هەلومەرجێک دەکا کە مرۆڤ لە ئازادییە سروشتیەکانی خۆی خۆش دەبێ و مل بۆ دەسەڵاتی دەوڵەت و یاسا دادەنەوێنێ.

کۆمەڵگای مەدەنی (Societes Civilis) وەرگێراوی لاتینیی(koinonia Politike) ئەرەستۆیە بە بڕوای ناوبراو، مرۆڤ بەپێی سرۆشتی خۆی، "کۆمەڵایەتی" [دەوڵەت _

شار"ی"] یەو، کەسێک کە لە"دەوڵەت_شاردا ناژی، بوونەوەرێکە یان لە مرۆڤ نزمترە یان بەرزترەو، هەر لەو پیاوە دەچێ کە هۆمەر لە سەرکۆنەیدا وتووتەیی" بێکەس، لێقەوماو وبێ سەرەوبەرە".

هیگڵ، فەیلەسۆفی ئەڵمانی کۆمەڵگای بەسەر دەوو بەشی مەدەنی و سیاسیدا دابەش دەکرد. بەپێی بیروبۆچوونی هیگڵ، کۆمەڵگای مەدەنی سێ بەشی [قۆناغ، خولەک وکات]ی هەیە:

١_ سیستەمی پێویستیەکان: "هێنانە گۆڕی پێویستیەکان و دابینکردنی پێداویستیەکانی ئەوان"؛

٢_ پیادەکردنی دادپەروەری (داد): دەستەبەربوونی ئازادی بۆ دەستەبەر بوونی ئەوکارە پێویستە [دابینکردنی پێداویستییەکان]، واتە پارێزگاریکردن لە ماڵ (خاوەنداریێتی ) لە رێگەی "پیادە کردنی دادپەروەری".

٣_ کۆنترۆڵکردن (پۆلیس): لە بەرامبەر رووداوە چاوەڕان و پێشبینی نەکراوەکان [رووداوی نەخوازراوو ناخۆش]، چاوەدێریکردن بەسەر ویستە چکۆلەکان وەک ویستی گشتی لە رێگای پۆلیسەوە.

بە بڕوای هیگڵ، کۆمەڵگای مەدەنی لە گەشەسەندنی خۆیدا، قەرزداری دەوڵەتە.

لە کۆمەڵگای ئەمڕۆییدا دوو روانگە لەسەر کۆمەڵگای مەدەنی هەیە. لە روانگەی یەکەمدا، کۆمەڵگای مەدەنی، کۆمەڵگایەکە کە یاسا سەروەرە. هەروەها کۆمەڵگایەکی راوەستاو لە سەر پەیمانە کۆمەڵایەتەکان، شەفاف، پارێزەری مافە تاکەکەسیەکان،پشت بەستوو بە سەروەریی نەتەوەیی ، دابەشکردنی دەسەڵات بە سەر حیزبەکان و ئەنجوومەکاندا.

لە روانگەی دووهەمدا، کۆمەڵگای مەدەنی بریتیە لە بۆشایی نێوان دەوڵەت و خێزان. لەم روانگەدا هەر کۆمەڵگایەک لە سێ چینی گشتی دا وێنا دەکرێ. لە چینی سەرەوەدا دەوڵەت و دەسەڵات راوەستاون. چینی خوارەوە لە هاوولاتیان ، خێزان، خەڵکی نارێکخراو بە شێوەی جەماوەر یان بە شێوەیەکی نەریتی ( لە کۆمەڵگا جۆراوجۆرەکان دا جیاوازە) و... هتد پێکدێ. چینی سەرەوە بە "بەستێنی دەوڵەتی" و چینی خوارەوە بە " بەستێنی تایبەتی" ناودەبەن. بەڵام لە هێندێک لە کۆمەڵگاکاندا چینێکی ناوەندیش هەیە کە نە دەوڵەتیەو، نەتایبەتی؛ کە بە بەستێنی گشتی ناودەبەن. بەو چینە ناوەندی و بەستێنە گشتییە دەگوترێ" کۆمەڵگای مەدەنی "؛ وەک ئەنجوومەنەکان، یەکیەتیە حیزبی، سینفی، فیکری، هونەری و.... هتدەکان. بە واتایەکی تر،

کۆمەڵگای مەدەنی هەموو ئەو دامەزراوانە لە خۆدەگرێ کە بەبێ سەرنجدان بە دەوڵەت و ئەو گۆرانکاریيانەی کە بەسەر دەوڵەت دادێن، هەروا دەمێنێتەوە.

## گۆرینی وڵات State Succession

بە گواستنەوەی دەسەڵاتدارەتیی لە بابەتێکی یاسا نێودەوڵەتیەکانەوە بۆ بابەتێکی تری یاسا نێودەوڵەتیەکان دەگوترێ.

گۆرینی وڵات؛ سرینەوەی بە تەواوەتیی وڵاتێک یان گواستنەوەی بەشێک لە خاکی ئەو وڵاتە بۆ وڵاتێکی تر لە خۆ دەگرێ. ئاکامی سرینەوەی بەتەواوەتیی وڵاتێک، گۆرینی گشتیە کە بەهۆی ئەو حاڵانە جێبەجێ دەبێ:

١ــ داگیرکردن و ملکەچ کردن (لە یاسا نێونەتەوەییە کۆنەکاندا شتێکی یاسایی بوو بەڵام بەپێی یاسا نێونەتەوەییە هاوچەرخەکان کارێکی نایاسایی یە).

٢ــ دابەشکردنی وڵاتێک بەسەر دوو یان چەند وڵاتێکدا (بۆوێنە دابەشکردنی مالیزیا لە ساڵی ١٩٦٥دا بەسەر سەنگاپوور و مالیزیادا، یان دابەشکردنی پاکستان بەسەر پاکستان و بەنگلادیش لە ساڵی ١٩٧دا، یان دابەشکردنی یەکیەتیی سۆڤیەت بەسەر فیدراسیۆنی رووسیا و ١٤ وڵاتی تردا لە ساڵی ١٩٩١).

٣ــ تێکەڵکردنی دوو یان چەند وڵاتێک لە وڵاتێکی یەکگرتوودا، وەک یەکیەتیی تانگانیکاو زەنگبار لە ساڵی ١٩٦١داو، دامەزراندنی تانزانیا.

٤ــ راکێشانی وڵاتێک لە لایەن وڵاتێکی تر (وەک راکێشانی تەکزاس لە لایەن ئەمەریکاوە لە ساڵی ١٨٤٥).

دیاریکردنی ئەو بابەتە کە ئایا ئەو کیانە نوێیە، وڵاتێکی نوێیە یان بەرفراوانکردن و پەرەپێدانی وڵاتی پێشووترە، لە کردەوەدا کارێکی دژوارە، گۆرینی بەرتەسک لە دەرئەنجامی ئەسپاردنی (یان شێوازەکانی تری گواستنەوەی دەسەڵاتدارەتیی ) بەشێک لە خاکی وڵات جێبەجێ دەکرێ. بەڵام لەهەر حاڵدا گواستنەوە لە رێگای پەنابردن بۆ هێز بەکارێکی نایاسایی دادەنرێ. گۆرینی وڵات گرفتی یاسایی ئاڵۆز لە پێوەندی لەگەڵ مافەکان و ئەو بەرپرسیارەتیانەی کە لە وڵاتی

گۆراودا داگوازرێنەوە، پێکدێنێ. هەتا ئەم ساڵانەی دوایی، گۆڕینی وڵات بە تەوەاوەتی بەپێی یاسا نێونەتەوەییە عورفیەکان جێبەجێ دەبوو، بەڵام کۆنفانسیۆنی ڤیەننا سەبارەت بە گۆڕینی وڵات لە سامانەکان، بەڵگەنامە و قەرزەکان(١٩٨٣)، چوارچێوەیەکی بەرفراوانی لە ڕێوشوێنەکانی گۆڕینی وڵات ڕێک خستووە. گۆڕینی وڵات گرفتی وەک گواستنەوەی ڕێککەوتننامەکان، ئەندامەتی لە ڕێکخراوە نێونەتەوەییەکان، مافەکانی پێوەندیدار بە سامانە گشتی و تایبەتیەکان، داواکاری نێونەتەوەیی و ئەرکە دیاریکراوەکانی بەدواوەیە. دەبێ گۆڕینی وڵاتەکان لە دەوڵەتەکان جیا بکرێتەوە، چوونکە لە گۆڕینی دەوڵەتەکاندا تەنیا نوێنەری سیاسیی وڵات دەگۆڕێ.

## کۆمار **Republica**

کۆمار ناوی کتێبی بەناوبانگی ئەفلاتۆن، فەیلەسۆفی یۆنانیە. یەکەمین خاڵ کە دەکرێ خوێنەر لە خوێندنەوەی کتێبەکەدا تووشی بێ، ناوی کتێبەکەیە. چوونکە خوێنەری ئەمڕۆیی ڕەنگە پێی وابێ کە نێوەڕۆکی کتێبەکە پێوەندی بە جۆرێکی تایبەتی لە حکومەت واتە سیستەمی کۆماری (لەبەرامبەر پاشایەتی)هەیە. ئەوە لە حاڵێکدایە کە وانیەو، زاراوەی یۆنانیی ناوی کتێبەکە واتە ڕێپۆبلیکا وهاوواتا لاتینیەکەی واتە ریسپۆبلیکا بە مانای وڵات یان کۆمەڵگا یان ڕێکخراوی حکومەتە و، لە یۆناندا حکومەتەکان ئەگەر کۆماری یان پاشایەتی یان ئاریستۆکراتییش بن، هەر بەو ناوە گشتیە ناویان دەبەن. بەڵام بابەتەکانی"کۆمار" سەرەڕای ڕەخنەگرتن لەو حکومەتانەی کە لە ئارادان، تایبەتە بە بابەتە گشتیەکانی سیاسەت و پەروەردەو فەلسەفەیە و؛ کەمتر باس لەوردەکارییەکان دەکا و، باسەکانیش لە هەموو بارێکەوە بۆ بابەتە ڕەوشتیەکان دەگەڕێنەوە. ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە پێکهاتەی ژیانی کۆمەڵایەتی لە شارەکانی یۆناندا بە شێوەیەکی ڕێژەیی سادە بوو و، خەڵکەکەی هیچ جیاوازیکیان لە نێوان ڕەوشت و سیاسەت دانەدەنا. واتە ئەوان پێیانوانەبوو کە دەکرێ هەڵسوکەوتی تایبەتیی تاکەکەس لە بنەماکانی حکومەت جیا بکرێتەوە. بەڵکوو پێیانوابوو کە یاسای وڵات سەرچاوەی هەموو ڕێوشوێنەکانی ژیانی مرۆییەو، فەزیلەتی تاکەکەسی لەگەڵ فەزیلەتی سیاسیدا یەک شتە. ئەم بڕوایە بوو بە هۆی ئەوەی کە یۆنانیەکان بە بەراوەرد لەگەڵ نەتەوەکانی تردا کەمتر خۆویست و خۆبەزل زان بن و، بە پێچەوانەی نەریتی ئەمڕۆکە، سیاسەت و ڕەوشت گرێدرا و لێک جیانەبۆوە بزانن. دوای ڕەوشت ،

بابەتە پەروەردەییەکان گرنگترین تەوەرەکانی کۆمار پێک دێنن، چوونکە بە بڕوای ئەفلاتۆن هەتا ئەو کاتەی فەیلەسۆفەکان بە دەسەڵات نەگەن، ژانەکانی مرۆڤایەتی چارەسەر نابێ. لەم رووەوە، گرنگترین ئەرکی سیاسەت، پەروەردەکردنی فەیلەسۆفەکانە بۆ دەسەڵات کردن و، ئەگەر ئەم پەروەردەیە بە شێوەیەکی دروست جێبەجێ بکرێ، دەکرێ بە بیرێکی ئاسوودە هەموو کاروبارەکانی وڵاتیان پێ بسپێردرێ.

### کۆماری Republic

لە قامووسی سیاسیدا، کۆماری، حکومەتێکی دێمۆکراتیک یان نادێمۆکراتیکە کە دەسەڵاتدارەکەی بەدەنگی راستەخۆ یان ناڕاستەخۆی توێژە جۆراوجۆرەکانی خەڵک هەڵبژێر درابێ و، دەسەڵاتدار بەهۆی میرات بە دەسەڵات نەگەیشتووە، و، بە پێی حاڵەتەکان، ماوەی دەسەڵاتدارەتیەکە بەرتەسک و سنووردارە.

کۆماری لە زۆربەی حاڵەتەکاندا بە رژێمی دێمۆکراتیکی پەرلەمانی دەگوترێ ـ هەرچەندەکە لە هێندێک لە وڵاتاندا سەرەڕای بوونی رژێمی کۆماری، دێمۆکراسیی پەرلەمانی رەچاو ناکرێ. رژێمی کۆماریی یۆنان و رۆمی کۆن، لەگەڵ مانای ئەورۆیی کۆماریدا جیاوازن. کۆماری لە یۆناندا رژێمی دڵخوازی بیرمەندە گەورەکان بوو و، زۆربەی دەسەڵاتداران لە نێو ئاریستۆکرات و چینی سەرەوە هەڵدەبژێردران.

ئەمرۆکە کۆماری بە حکومەتی وڵاتێکی خاوەن دێمۆکراسی یان دیکتاتۆریی غەیرە پاشایەتیش دەگوترێ. کۆماری بەتەنیایی نیشانەی دێمۆکراسی نیە، بەڵکوو سیستەمە بەرتەسکەرەوەکانی دەسەڵاتی دەسەڵاتدار، وەک پەرلەمان و حیزبەکانیش رۆڵی گرنگ لە سیستەمی وڵاتێکدا دەگێڕن.

لە پۆلێن بەندیی کۆمارییە نوێکاندا چەندین شێوازی گشتی دەبینرێن:

١ـ کۆمارییە دێمۆکراتیکەکانی لە جۆری رۆژئاوا: لە راستیدا ئەمجۆرە کۆمارییانە لە ناخی چوارچێوەی دێمۆکراسی و ئیرادەی گشتی هەڵقوڵاون و؛ بەرهەمی شۆڕشە ئازادیخوازانەکانی سەدەی هەژدە و نۆزدەی ئەورووپان. نەریتەکانی دێمۆکراسی لەم شێوازەدا دەبینرێ و،

فەرمانڕەوا لە ڕێگای هەڵبژاردنی گشتیەوە هەڵدەبژێردرێ. لەمجۆرە حکومەتەدا، ڕۆڵی حیزبەکان و پەرلەمان بەرچاوە.

بۆوێنە دەکرێ ئاماژە بە کۆماری لە جۆری فەرەنسی بکرێ کە لەودا سەرۆک کۆمار دەسەلاتێکی بەرفراوانی هەیە، سەرۆکی دەوڵەتی ناوبراو دەبێ بەردەوام لە بیری بەدەستهێنان و پاراستنی دەسەلاتی پارلەمانیی خۆیدا بێ.

٢ـ کۆمارییە دێمۆکراتیکە جەماوەرییەکان: ئەمجۆرە کۆمارییە لەدوای سەرهەڵدانی شۆڕشە کۆمۆنیستیەکان لە ئەورووپای ڕۆژهەلات و ئاسیا و هێندێک لە ناوچەکانی تری جیهاندا گەشەی کردووە. لەم ولاتانەدا سەرچاوەی دەسەلادارەتیی بە دیکتاتۆریی پرۆلتاریا دەزانن.

٣ـ کۆمارییەکانی لە جۆری ئەمەریکای لاتین: لەمجۆرە کۆمارییانەدا ئیرادەی گشتی ڕۆڵێکی لە بەڕێوەبەریی ولات دانیە و، دەسەلات بە تەواوەتی لە دەستی دەسەلاتدار دایە. پرەنسیپی لێک جیا کردنەوەی هێزەکان ڕەچاو نەکراوەو، سەرۆک کۆمار کە زیاتر لە ڕێگای کودەتا یان ڕێککەوتنێکی سیاسی بە دەسەلات دەگا، دەسەلاتێکی بێ سنووری هەیەو، لەم ولاتانەدا هەڵبژاردن بە شێوەیەکی ڕواڵەتی بەڕێوە دەچێ. ئەم سەرۆک کۆمارانە بۆ پاراستنی حکومەت و دەسەلاتی خۆیان کەڵک لە شێوازی پۆلیسی وەردەگرن و، زۆرجار هەتاکوو مردن جڵەوی دەسەلاتیان لە دەستدا دەبێ. پەرلەمان لەم جۆرە ڕژێمانەدا وەک ئامرازێک لەدەستی ڕژێمی حاکم بەسەر ولات دایە.

زاراوەی تر لەم بوارەدا باون کە بریتین لە:

١ـ کۆماری ئاریستۆکراتی: جۆرێک لە کۆمارییە کە تەنیا ئاریستۆکراتەکان دەتوانن پۆستە بەرزەکان بەدەستەوە بگرن. ئەگەر ئەم ئیمتیازە لە ئارادا نەبێ، ئەمە بە کۆماری دێمۆکراتیک یان کۆماری نیشتمانی ناو دەبرێ.

٢ـ کۆماری ڕاستەوخۆ: بە جۆرێک لە کۆماری دەگوترێ کە خەڵک لە ڕێگای نوێنەرەکانی خۆیانەوە مافی دەسەلاتدارەتی و سەروەری پیادە دەکەن.

٣ـ کۆماری ناڕاستەوخۆ: جۆرێک لە کۆمارییە کەخەڵک بەبێ نێوبەند مافی دەسەلاتدارەتی خۆیان (دانانی یاسا، هەڵبژاردنی وەزیران و کاربەدەستە بالاکان، چاوەدێری بەسەرکاروباری حکوومەت دا) پیادە دەکەن.

٤ـ کۆماریی پاشایەتی: لەم جۆرە رژێمەدا، دوای مردنی سەرۆک کۆمار، پۆستی سەرۆک کۆماری وەک سیستەمە پاشایەتیەکان بە کورەکەی دەسپێردرێ. لە کۆریای باکوور کیم جوونگ ئیل دوای مردنی کیم ئیل سوونگ (١٩٩٤ـ١٩١٢)؛ لە سوریا بەشار ئەسەد دوای حافز ئەسەد (٢٠٠٠-١٩١٤) بە پۆستی سەرۆک کۆماری گەیشتن.

### کۆماری گیلان

لە ٢٥ی تەمووزی ١٩٢٠، دەوڵەتی کاتیی شۆڕشگێری ئەنجوومەنی شۆڕشگێری کۆماری گیلان بەسەرۆکایەتی "میرزاکوچک خان" دامەزرا. پرۆگرامی ئەم دەوڵەتە بریتی بوو لە دامەزراندنی رژێمی کۆماری لە هەموو ئێراندا، هەڵوەشاندنەوەی رێککەوتننامە ناجوامێرو نایەکسانەکان، ئازادیە تاکەکەسی و کۆمەڵایەتیەکانی هەموو خەڵک، یەکسانیی مافەکان بۆ هەموو نەتەوەکان و پاراستنی ئیسلام.

### کۆمارەکانی فەرەنسا French Republics

لە مێژووی فەرەنسادا واتە لە سەردەمی شۆڕشی مەزن و رووخانی حکومەتی پاشایەتیی لویی شانزدەهەم تاکوو ئەمڕۆ پێنج کۆماری دامەزراوە کە بریتین لە:

کۆماری یەکەم: لە ٢١ی ئەیلوولی ١٧٩٢ لە لایەن کۆنڤانسیۆنەوە دامەزراوە، هەتاکوو مانگی ئایاری ١٨٠٤ بەردەوام بوو.

کۆماری دووهەم: دوای وازهێنانی لویی فیلیپ لە پاشایەتی ، لە ٢٥ی شوباتی ١٨٤٨ دامەزراو، تاکوو دووی کانوونی یەکەمی ١٨٥١ درێژەی هەبوو.

کۆماری سێهەم: بە هۆی تێکشکانی فەرەنسا لە ئەڵمانیا، لە ئەیلوولی ١٨٧٠دا دامەزراو، هەتا حوزەیرانی ١٩٤٠ بەردەوام بوو.

کۆماری چوارەم: دوای رزگاری فەرەنسا لە هێرشی ئەڵمانیای نازی و نەمانی "حکوومەتی ڤیشی" (١٩٤٤)، دامەزراو، تاکوو ٥ی تشرینی یەکەمی ١٩٤٨ بەردەوام بوو.

کۆماری پێنجەم: ناسەقامگرتوویی و قەیرانە یەک لە دوای یەکەکانی کۆماری چوارەم بە هۆی زۆریی حیزبەکان و گرفتە پەرلەمانەکان و بشێوییەکانی ئەلجەزایر بۆ هۆی ئەوەی کە ژەنەراڵ دوگوڵ بیر لە دامەزراندنی کۆماری پێنجەم بکاتەوە. دەستووری کۆماری پێنجەم لە ٢٨ی ئەیلوولی ١٩٥٨ لە ریفراندۆمێکدا پەسند کراو، بەوشێوە دەسەڵاتی سەرۆک کۆمار زیادی کردوو، لاوازیی دەسەڵاتی بەڕێوەبەری قەرەبوو کرایەوە.

## کۆسمۆپۆلیتیزم Cosmopolitism

کۆسمۆپۆلیتیزم بە مانای "جیهان نیشتمانی"یەو، لە دوو زاراوەی یۆنانیی، Kosm(جیهان) و Polites (خەڵکی شار و هاووڵاتی )وەرگیراوە.
کۆسمۆپۆلیتیزم، هەم شێوازی ژیان و هەم روانگەیەکی جیهانیە. کۆسمۆپۆلیتیزم بیروبروایەکە کە بروای بە قەتیس مانەوە لە وڵاتێک یان لە نەتەوەیەک دا نیەو و، تاکی کۆسمۆپۆلیست هیچ هۆگرییەکی کولتووری، نەریتی وسیاسی بەرامبەر بە شوێن، ناوچەو وڵاتی خۆی نیەو؛ لەسەر ئەو بروایەیە کە جیهان، نیشتمانی هاوبەشی هەموو مرۆڤەکانەو، پێویستی بە حکومەتێکی جیهانی هەیە.
کۆسمۆپۆلیتیزم، لەگەڵ هەرجۆرە ناوچە یان سنوورێکی کولتووری، سیاسی و ئاییندا دژایەتی دەکا. کانت (١٨٠٤_١٧٢٤) فەیلەسوفی ئەڵمانی و گۆتە (١٨٣٢_١٧٤٦)، نووسەری بەناوبانگی ئەڵمانی لە لایەنگرانی کۆسمۆپۆلیتیزم بوون. پروپاگەندەچیە مەسیحییەکانی ئەورووپا لە کۆلۆنیەکانی خۆیاندا پروپاگەندەیان بۆ کۆسمۆپۆلیتیزم دەکرد. ئەنتەرناسیۆنالیزم و مارکسیزمیش پێداگری لەسەر کۆسمۆپۆلیتیزم دەکەن.

## کەنداوی بەرازەکان Bay Of Pigs

بە شوێنێک دەگوترێ کە لە لێواری باکووری رۆژهەڵاتی کوبا هەڵکەوتووە. لەو شوێنەدا نزیک بە ١٤٠٠ کەسی دوورخراوەی خەڵکی کوبا کە لە لایەن "سیا "وە پشتیوانی دەکران هەوڵێکی سەرنەکەوتوویان لەرێکەوتی حەڤدە هەتا بیستەمی نیسانی ١٩٦١ بەڕێوە برد، تاکوو رژێمی شۆڕشگێڕو تازەدامەزراوی فیدڵ کاسترۆ، سەرۆکی کوبا، بروخێنن.لەم رووداوەدا ٦٠ کەس کوژران و ١١٧٣ کەس لە لایەن پارتیزانەکانی کوباوە بەدیل گیران.

## کۆرپۆراتیزم Corporatism

ئایدۆلۆژیای دەوڵەتی کۆرپۆراتیزم لە سەرەتادا لە سیستەمە فاشیستی و تۆتالیتەرەکان بە مانای شێوازی ڕێکخستنی نێوان دەوڵەت و گرووپە کۆمەڵایەتیەکان کەڵکی لێ وەردەگیرا. بەڵام ئەم ئایدۆلۆژییە دوو جۆری سەرەکی هەبوو: جۆرێکی دەوڵەتی یان ئۆتۆریتە خوازانەو، ئەویتر جۆری کۆمەڵایەتی یان لیبرالی بوو. جۆری دەوڵەتیی ئەم ئایدۆلۆژیایە لە دەوڵەتە فاشیستی و ئۆتۆریتە خوازەکانی پورتوگال و ئیسپانیادا بەر لە سەردەمی دێموکراسی لەو وڵاتانە، باو بووە. جۆری کۆمەڵایەتیی کۆرپۆراتیزم کە لە هێندێک لە دێموکراسیە ئەورۆپییەکانی وەک سوید و نەمسادا باوە. لەراستیدا جۆرێک لە نوێنەرایەتیی گرووپ و سەندیکا ڕێکخراوەکان لە نێو دەوڵەت دایە کە لەپاڵ دامەزراوە نوێنەرایەتیە باوەکانی وەک پەرلەمان و حیزبەکان چالاکییان هەیە. لەم جۆرە دەوڵەتانەدا ئەم ڕێکخراوانە کە نوێنەری بەرژەوەندی ئابووری و کۆمەڵایەتیی کۆمەڵگان، لەو توێژ و دانوسان لەگەڵ بەرپرسانی دەوڵەتیدان، سەبارەت بە بڕیاردان لەسەر گرنگترین بابەتە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکان، پێگەیەکی بەرز و بەرچاویان هەیە، بەڵام لە کۆرپۆراتیزمی دەوڵەتیی وەک ڕژێمەکانی مۆسۆلینی و سالازار لە ئیتاڵیا و پورتوگالدا هیچ هەلێک بۆ دێموکراسی و بەشداریی سیاسی لە ئارادا نەبوو و، بە پێچەوانە دەسەڵات لە دەستی تاقمێکی بچووک و کەمینەی سیاسیدا بوو. دەوڵەت چاوەدێرییەکی زۆری بەسەر ڕێکخراوەکان و دامەزراوە کرێکاری و سەندیکاکاندا هەبوو، هەروەها بە توندی کۆنترۆڵی دەکردن. بەگشتی، ڕێکخراوەکان و دامەزراوە ئابووری و کۆمەڵایەتیەکانی نێوبەندی نێوان دەوڵەت و کۆمەڵگا لە ژێر چاوەدێری و کۆنترۆڵ و دسیپلینی دارێژراو دابوون.

لەبەرامبەردا، لە کۆرپۆراتیزمی دێمۆکراتیکدا ڕێکخراوە خۆرسکەکان نوێنەری بەرژەوەندییەکانی چین و گرووپە جۆراوجۆرەکانی ئابووری ــ بەتایبەتی چینی کرێکار و چینی سەرمایەدارـــ ن و؛ ڕێکخراوەکانی وەک ژووری بازرگانی و پیشەسازی و ڕێکخراوە کرێکاری و خاوەن کار و کشتو کاڵیەکان ڕۆڵی سەرەکیان لە بڕیاردانە گشتیەکاندا هەیە. نەمسا و وڵاتانی سکەندیناڤیا خاوەنی دەوڵەتی کۆرپۆراتیزم بە شێوەی دێموکراتیکن. لەو وڵاتانەدا ئەو هاووڵاتیانەی کە کار دەکەن و پیشەیەکیان هەیە، دەبێ لە ڕێکخراوەکان و سەندیکاکان دا ئەندام بن. هەررێکخراوێکی سینفی لە ئاستی نیشتمانیدا نوێنەرایەتی بەرژەوەندییەکانی چین وتوێژی خۆیانن.

هەروەها، هەموو ڕێکخراوە سینفیەکان لە وتوویژ و بڕیاردانەکانی پێوەندیدار بە سیاسەت دارێژیە ئابووری و کۆمەڵایەتیەکاندا مافی وەک یەکیان هەیە و، ئەم کارەش لە وڵاتانی دیکەی وەک هۆڵەنداو ئەڵمانیاشدا تاقی کراوەتەوە.

لەگەڵ پەرەگرتنی ئایدۆلۆژیای لیبرالیزم و بە تایبەتیکردن لە دەیەی ۱۹۸۰دا، کۆرپۆراتیزمی کۆمەڵایەتی تارادەیەک دابەزیوە.

**کورتە مێژوو**

لە هاوینی ۱۹۲۰ دا ئادۆلف هیتلەر، ڕێبەری ئەڵمانیا بڕیاریدا تا نیشانەیەک بۆ ئاڵای نازییەکان دابینێ. هیتلەر پاش ماوەیەک ئاڵایەکی دروستکرد کە سوور بوو و بازنەیەکی سپی تێدا بوو. لە سەر ئەم بازنەیە خاچێکی ڕەشی شکاو کێشرا بۆوە. ئەم خاچەشکاوە لە پاشان دا بوو بە ڕەمزی بەهێز تۆقێنەری حیزبی نازی و پاشانیش بوو بە ڕەمزی هەموو ئەڵمانیای نازی. (ددانە شکاوەکانی ئەم خاچە بە ئاراستەی چرکەژمێرەکانی کاتژمێر بوو). خاچی شکاو مێژوویەکی کۆنی هەیە. لە ناو پاشماوە کاولبووەکانی ترۆی، میسر و چیندا دۆزراوەتەوە. لە پەرستگە کۆنەکانی هیندییەکان و بوداییەکان دا بەزۆری دەبینرێ. لە سەردەمە نوێکان دا ئەم نیشانە لە وڵاتانی قەراغ بالتیک وەکوو ستۆنیا و فینلەندا وەکوو دروشمی ڕەسمی وابوو و سەربازەکانی سوپای ئازادی ئەڵمانیا لە ڕەوتی شەڕەکانی ۱۹۱۹-۱۹۱۸ لەم وڵاتانەدا بینیبوویان. لە کودەتای ۱۹۲۰ی کاپ کە سوپای لیوای ئەهرهارت چوونە ناو بەرلینەوە، خاچی شکاویان لە سەر کڵاوە ئاسنیەکانیان هەڵکەندبوو. هیتلەر لە ڕەنگە سوورەکەدا هزری کۆمەڵایەتیی بزوتنەوەکە و لە ڕەنگە سپیەکەش دا بیروڕای نەتەوەیی و لە خاچە شکاوەکەش دا ئەرکی ئەرکی خەباتی دەبینی.

بەڕای هیتلەر، خاچی شکاو زیاتر لە هەموو شتێک، نیشانەی شەڕی ڕەگەزی ئاریا لە دژی ڕەگەزی سامی و ڕەمزی بیروبڕواو داب و نەریتەکانی هیندو ئەورووپی لە بەرامبەر ئایینی جوولەکەدابوو و هیتلەر لە مێژ بوو بیری لەم خاچە شکاوە دەکردەوە کەبیکاتە ڕەمز و ئەم نیشانەی بە سەر حیزبی نازیدا سەپاند. هیتلەر لە قۆناغی خوێندن لە قوتابخانەی کاتولیکی لامباخ دا لەگەڵ ئەم خاچەدا ئاشنا بوو.

باوکە هاگین؛ گەورەی پرستگەی لامباخ کە پیاوێکی زانا بوو و لە ئەستێرەناسی و زانستەکانی دیکەش دا شارەزایی هەبوو. هاگین هەموو ئەو شتانەی کەلە سەر قیامەت نامەی

حەزرەتی یووحەننا Apocalypse نووسرا بوون، بەوردی خوێندبۆوە. لە ساڵی ١٨٥٦ دا سەفەرێکی بۆ رۆژهەڵاتی نزیک کرد و لە ئورشەلیم مایەوە و قیامەت نامەکەی نووسی. هاگین لە ساڵی ١٨٦٨ دا گەڕایەوە لامباخ و بڕیاریدا تا لە هەر چوارسووچەکەی پەرستگەی لامباخدا، خاچی سفاستیکا هەڵکەنن. کاتێک کە هیتلەر گەیشتە لامباخ، هاگین مردبوو، بەڵام سفاستیکای شکاو هەروا دەدرەوشایەوە. رەنگە هیتلەر کە ئەوکات منداڵ بوو، هەر کە یەکەمجار چاوی بەم خاچە کەوتووە، چووبێتە ژێر کاریگەری ئەم خاچەوە.

### کردەوەی نادۆستانە — *Unfriendly Act*

هەر کردەوەیەک کە لە لایەن دەوڵەتێکەوە بێ و دەوڵەتێکی دیکە ئەم کردەوە بە زیانی خۆی بزانێ، کردەوەی نادۆستانەی پێ دەڵێن. ژمارەی ئەم کردەوانە دیاری ناکرێ. چۆنیەتی ئەنجامدانی کردەوەکەو و دژکردەوەی دەوڵەتەکان روون دەکاتەوە کە ئەو کردەوە دۆستانەیە یان دوژمنانەیە. بۆ وێنە رەنگە دەوڵەتێک لە بەرامبەر کردەوەیەکدا کە لە لایەن دوو دوڵاتەوە ڕوو دەدا، دژ کردەوەی جیاوازی هەبێ( بە پێی ئەو پێوەندییانەی کە لەگەڵ هەرکامیاندا هەیەتی یا دەیەوێ هەیبێ). کردەوەی نادوستانە رەنگە ئەنجامدان یان خۆبواردن لە ئەنجامدانی کردەوەیەک لە بەرامبەر دەوڵەت یا هاوڵاتیەکانی دا بێ و ئەم ئەنجامدانە یان خۆ بواردنە لە روانگەی یاساییەوە،ئاساییەو تەنیا لە روانگەی سیاسییەوە بە قازانجی ئەو لایەنەدا ناشکێتەوە. کردەوەی نادۆستانە هێرشکردن یان پێشێلکردنی یەکێک لە رێوشوێنەکانی یاسای نێونەتەوەیی نیە، کەواتە ئەو لایەنەی کە کردەوەی نادۆستانەی لەدژ کراوە، نابێ تۆڵە بکاتەوە، بەڵام دەتوانێ کردەوەی هاوشێوەی کردەوەکەی ئەو ئەنجام بدا.

### کردەوەی شمشێری بیابان (١٩٩١) **PERATION Desert Sabre•**

کردەوەی شمشێری بیابان، قۆناغی سێهەمی، شەڕی دووهەمی کەنداوی فارس بوو کە لە رۆژی ٢٤ ی شوباتی ١٩٩١ بەمەبەستی پاشەکشەی هێزەکانی عێراق لە کوێت و لەلایەن هێزە هاوپەیمانەکانی رۆژئاوا بە رێبەرایەتیی ئەمەریکا و بەفەرماندەیی ژەنەراڵ نۆرمان شوارتسکۆف

بەرێوەچوو، کە سەرجەم سەد کاتژمێری خایاند. کردەوەی زەمینی شمشێری بیابان بەرەسمی لە ڕۆژی ٢٨ی شوباتی ١٩٩١ و بەپەسندکردنی ئاگربەس و پاشەکشەی تەواوەتی هێزەکانی عێراق کۆتایی پێهات.

### کەسی بێ کەڵک — *Person Nongrata*

ئەگەر وڵاتێک، مانەوەی ڕاسپێردراوێکی سیاسی باڵوێزخانەیەک، بە زیانی خۆی بزانێ، بەم ڕاسپێردراوە دەڵێن کەسی بێ کەڵک. لەم حاڵەتەدا، دەبێ ڕاسپێردراوەکە لە ماوەیەکی دیاریکراودا، ئەو وڵاتە بەجێ بێڵێ.

لە حاڵەتێکدا، ڕاسپێردراوێک دەبێتە " کەسی بەکەڵک"، کە دەست لە کاروباری نێوخۆیی ئەو وڵاتە وەربدا. چونکە ڕاسپێردراوە سیاسییەکانی باڵوێزخانەکان لە بواری سیاسی، دیپلماتێک و دادەوە پارێزراون، بۆیە ئەو مافەیان نیە کە دەست لە کاروباری نێوخۆیی ئەو وڵاتە وەربدەن کە لەوێدا خەریکی بەرێوەبردنی ئەرکی سیاسین.

لەم حاڵەتانەدا ڕاسپێردراوە سیاسییەکان، وەکوو کەسی بێ کەڵک وەدەردەنرێن: سیخوری کردن، پێوەندی گرتن لەگەڵ هێزە نەیارەکانی ئەو وڵاتە، هەوڵی قاچاغی دراوی ئەو وڵاتە و....هتد. هەڵبەت جارجارەش وەکوو دژکردەوەیەک لە دژی لایەنی بەرامبەر بەرێوە دەچێ.

### کارەساتی چەرنۆبیل (نیسانی ١٩٨٦) — *Chernobyl Disaster*

ئەم زاراوەیە لە "بنکەی ناوەکی چەرنۆبیل، کە ناوی شوێنێکی وڵاتی ئۆکرانیایە وەرگیراوە. ئەم بنکە یەکێک لە نموونە تایبەتیەکانی تەکنولۆژیای سۆڤیەت بوو کە بە چوار ڕئاکتۆری ١٠٠٠ میگاڤاتی و بە توانایی بەرهەمهێنانی ٤٠٠٠ میگاڤاتەوە، گەورەترین ناوەندی بەرهەمهێنانی کارەبای ناوەکی لە یەکیەتیی سۆڤیەتدا بوو. دوو ڕئاکتۆری ناوەکی دیکەش لە حاڵی دروستکردندا بوون کە بریار وابوو سەرجەم شەش هەزار میگاڤات کارەبا بەرهەم بێنن و ببنە سەرچاوەیەکی گەورەی وزە بۆ ناوچەی پیشەسازی ئۆکراینا.

کارەساتەکە کاتێک دەستی پێکرد کەیەکەیەکی بنکەی چەرنۆبیل لە کاتژمێر ١:٢٣ ڕۆژی شەممە ٢٥ی نیسانی گڕی گرت و دوای ماوەیەکی کەم، ڕئاکتۆرەکانی دیکەش گڕیان

گرت. حەوتوویەک پاش کارەساتەکە، نزیکەی ٥٠ میلیۆن کووری (یەکەی پێوانی رادیۆ ئاکتیڤ) و نزیکەی ٦ میلیۆن کوری سیزیۆمی رادیۆ ئەکتیڤ لە ئاسماندا بلاّو بۆوە.

لە بواری سیاسییەوە، بلاّونەکردنەوەی هەواڵی تەقینەوەی بنکەی ناوەکی چەرنۆبیل و تەنیا بلاّوکردنەوەی راگەیەنراوێکی ٤ دێری لە لایەن مەکتەبی سیاسی حیزبی کۆمۆنیستی سۆڤیەت ( ئەویش لە دوای گەیشتنی هەوری رادیۆئاکتیڤ بۆ سەر ئاسمانی ولاّتی سوید) کارەساتبار بوو. هەستی دژەناوەکی لە ئۆکراینا، بیلۆرووسیا و کۆمارەکانی باڵتیک بە توندی جوولاّ، ئەگەرچی رەخنەکانی زیاتر ئاراستەی بێرژنێف کران، بەلاّم گۆرباچۆفیشی گرتەوە.

ئەم کارەساتە، بێ هێزی لە رادەبەدەری کارگێری نەریتی و نەگونجانی ئەم کارگێرییەی لەگەڵ تەکنەلۆژیای هاوچەرخدا دەرخست. چەند ساڵ لەوەپێش، پسپۆرەکان ئاماژەیان بە هەڵسەنگاندنی هەڵەی ئابووری و ئیکۆلۆژی ستراتیژیی دەیەی حەفتا، بۆ پەرەپێدانی ناوەندە ئەتۆمیەکان کردبوو. رئاکتوری ناوەکی زۆر لە نزیکی ناوەندە پیشەسازی و پرحەشیمەتەکان دروستکرابوو و بیناکەی بە پێی نەخشەکە تەواو نەکرابوو. سەرەڕای ئەمە بێرژنێف لەسەر خێراترکردنی بەرنامەی ئەتۆمی لە پێناوی ئاشتیدا " کە بە ئامرازێکی سیحراوی بۆ چارەسەری کێشەی رووله قەیرانی وزەی دادەنا، پێداگری دەکرد. کاتێک کەئەم کارەساتە قەوما، دەرکەوت کە بەرێوەبەرانی ئەم ناوەندە کەسانی شارەزاو لێوەشاوە نەبوون.

ئەمڕۆکە زاراوەی چەرنۆبیلی سیاسی (Political Chernobyl) بە کارەساتێکی سیاسی قەرەبوو نەکراوە دەگوترێ.

## کولتوور Culture

کولتوور بەو کۆمەڵە تۆخمە ماددی و ناماددیانەی ناو رێکخراوە کۆمەلاّیەتیەکان دەگوترێ کە لە جیلێکەوە بۆ جێلێکی دیکە دەگوازرێنەوە کە پاشماوەی کۆمەلاّیەتی یان پاشماوەی کولتووریشیان پێ دەگوترێ.

هەموو کولتوورێک لە کومەڵێک کەس پێکهاتووە کە تایبەتمەندی کولتووری جیاوازیان هەیە. تایبەتمەندیەکولتوورییەکان تێکەلاّوی یەکتردەبن و یەکەیەکی گەورە بە ناوی کۆمەڵەی کولتووری پێک دێنن.

پێکەوەبەسترانەوە دوولایەنە کۆمەڵایەتیەکان وادەخوازن کە لە کولتوورێکی تایبەتیدا، تایبەتمەندییە کولتووری یان کۆمەڵە کولتوورییەکان، وێرای ئەوەی کە لەگەڵ یەکتردا جیاوازییان هەیە، جۆرە پێوەندییەکی هاوسەنگیشیان لەگەڵ یەکتردا هەبێ و فۆرماسیۆنێکی ( پێکهاتەیەکی پتەو) کولتووری پێک بێنن.

سەرجەم کولتوور بە سەر دوو لایەن دا دابەش دەبێ:

کولتووری ماددی و کولتووری مەعنەوی (کولتووری نامادی). کولتووری ماددی بەو بەشە لە پاشماوەی کۆمەڵایەتی دەگوترێ کە ژێرخانی ئابووری کۆمەڵگایە. کولتووری مەعنەوی سەرخانی کۆمەڵگا، واتە زانست، هونەر، فەلسەفە و بیروبڕوا و دامەزراوە کۆمەڵایەتیەکان لەخۆ دەگرێ.

### کێشەی شەتتولعەرەب

شەتتولعەرەب یان ئەروەندرود (چۆمی ئەروەند) ناوی چۆمێکە کە لە شوێنی تێکەڵاو بوونی ئاوی دیجلە وفورات لە نزیک "قەرنە" لە نزیکی کەنداوی فارسدا پێکهاتووە. ئەم چۆمە ١٧٥ کیلۆمەتر درێژایی و نزیکەی ٤٥٠ تا ١٢٠٠ مەتر پانایی هەیە و بەشێک لە چۆمی کارۆنیش دەرژێتە ناو ئەم چۆمەوە. ئەم چۆمە زۆر کۆن نیە. چۆمەکانی کارون، دیجلە، فورات و کەرخە هەرکامیان لە شوێنێکی دیکەوە دەرژانە ناو کەنداوی فارسەوە. لیتاوی ئەم چۆمانە بەرەبەرە پاشەکشەی بە کەنداوی فارس کرد و شەتتولعەرەبی پێکهێنا.

شەتتولعەرەب لە ڕێگای " فاو" ەوە دەرژێتە ناو کەنداوی فارسەوە. شەتتولعەرەب یەکێک لە چۆمە بەرینەکانی دونیایە کە پاپۆرەکان بە ئاسانی هاتوچۆی تێدا دەکەن کەهەرچی زیاتر بەرەو باشوور دەڕوا، پانترو قووڵتر دەبێتەوە. بۆ وێنە لە مەودای نێوان بە سرە و زارکی کەنداوی فارسدا دەگاتە ١٢٠٠ مەتر و لەکاتی هەستانی ئاودا دەگاتە ١٣٠٠ مەتر. لە حاڵێکدا کە پاناییەکەی لە باکووری بەسرە و نزیکی " قەرنە" ناگاتە ٤٥٠ مەتریش. هەروەها قووڵایی شەتتولعەرەب بە تایبەتی لە کاتی هەستان و نیشتنەوەی ئاودا زۆر کەم دەبێ. بە واتایەی کە لە ١٥ تا ٣٥ و جارجارەش تا ٤٥ مەتر جیاوازی دەبێ. بۆیە بۆ هات وچۆی پۆرەکان گونجاوە.

چوونکە ئەم چۆمە لە سنووری عێراق و ئێراندا هەڵکەوتووە و چۆمێکی نێودەوڵەتیشە، پێویستیەکە بە پێی ڕێوشوێنە نێودەوڵەتیەکان و پێویستی پاراستنی بنچینەی ئاشتیخوازانە و دراوسێیەتی وهێڵی قەبڵێنراوی تالڤێگ کە هەردوولایان قبووڵیان بێ، ئەم دوو وڵاتە وەکوو یەکتر بتوانن لەم چۆمە بۆ هاتوچۆی پاپۆڕکانیان و بەرهەمەکانی دیکەی شەتتولعەرەب کەڵک وەرگرن. زیاتر لە سەد ساڵە دوو دەوڵەتی عێراق و ئێران ( عێراق بەشێک بوو لە ئیمپراتۆریای عوسمانی) لەسەر شەتتولعەرەب نێوان ناخۆشی و کێشەیان هەیە. عێراق پێیوایە ئەو چۆمە تەنیا هی ئەم وڵاتەیە، بەڵام ئێران بە پشت بەستن بە بنەماگشتییەکانی یاسا نێودەوڵەتیەکان، جاڕنامەی نەتەوە یەکگرتووەکان و ڕێووشوێنەکانی دیکەی پێوەندی نێوان دەوڵەتان، بە تایبەتی ڕێووشوێنەکانی سەبارەت بە چۆمە گرنگە نێودەوڵەتیەکان؛ پێیوایە چوونکە ئەم چۆمە، چۆمێکی نێودەوڵەتیە، هێڵی سنووری نێوان ئەم دوو وڵاتە دەبێ بە پێی هێڵی تالڤێگ بێ نەک هێڵی ناوەڕاستی ئاو یان لێواری دوو وڵات کە بە هۆی ڕێککەوتننامە سنوورییەکانی سەردەمی کۆلۆنیالیزمی بەریتانیا بەسەر ئێراندا سەپاون.

### کابینە — *Cabinet*

لە سیستەمی پەرلەمانیدا بە کۆی وەزیرەکان و جێگرەکانیان دەگوترێ کە لە بەرامبەر دوو ئەنجوومەنی وڵاتدا بەرپرسیارەتیەکی سیاسی هاوبەشیان هەیە. بە سەرۆکی کابینە سەرۆک وەزیران، سەرۆک کۆمار و ڕەئەیسولوەزەرا و سەرۆکی دەوڵەتیش دەگوترێ.

### کابینەی سێبەر — *Shadow Cabinet*

کابینەیەکە کە وەکوو دەوڵەتێکی ئەلتەر ناتیڤە، کە لەلایەن ڕێبەرایەتی ئۆپۆزیسێونەوە پێکهاتووە. یەکێک لە بنەماکانی دێموکراسی پەرلەمانی بەرەسمی ناسینی مافی ئۆپۆزیسێونە بۆ ڕێکخستنی خۆیان و دژایەتی لەگەڵ دەوڵەتی دەسەڵاتدار، بەڵام ئەم ئوپۆزیسیۆنە لە چوارچێوەی دەستووری وڵاتدا چالاکی دەکا. گرووپی ئۆپۆزیسێون دەتوانێ نوێنەری لە بوارە جیاوازەکاندا هەبێ وەکوو: کاروباری دەرەوەی وڵات، بەرگری و وەزارەتخانەو وەزیران لە بەرامبەر وەزیرەکانی دەوڵەتی دەسەڵاتداردا هەبێ کە وەکوو" سێبەر" تێدەکۆشن. گرووپی نەیار هەروەها دەتوانێ سیاسەتی ئەلتەرناتیڤی خۆی لە بەرامبەر سیاسەتی دەوڵەتی دەسەڵاتدار دا ئاراستە بکا.

لایەنی باشی " دەوڵەتی سێبەر" ئەوەیە کە دەستبەجێ دوای ڕووخانی "دەوڵەتی دەسەڵاتدار"، دەتوانێ کابینەی سەرەکی پێک بێنێ، بێ ئەوەی هەڵوەستەیەک لە بواری سیاسییەوە لە وڵاتدا پێک بێ.

## کاپیتال **Capital**

ئەم زاراوە لە سەرچاوەی لاتینی Capitellum وەرگیراوە کە پێشگری Caput بە واتای " سەرە"و و لە ئابووریدا بە واتای سەرمایەیە کەهەر لە واتا بنەرەتیەکەی وەرگیراوە، چونکە ئەو قازانجەی کە دەخرێتەر سەر دراو، لە بەرامبەر خوودی دراوەکەدا ڕێژەیەکی کەمە و سەرجەم بەشی سەرەکی دراوهەمان کاپیتال یان سەرمایەیە. دراو لەو لایەنەوە کە دەبێتە هۆی قازانج وەدەستهێنان، سەرمایەی ماددییە.

***سەرمایەی تەکنیکی:*** کۆمەڵە ئامرازی ماددی بەرهەمهێنانی دامەزراوەیەک وەکوو: زەوی، بینا، ماشین و ئامرازەکانی بەرهەم هێنان و ئامرازەکانی گواستنەوەو...هتد.

***سەرمایەی بە ناو:*** بریتیەلەو شتەی خاوەن پشکەکان (سەهمەکان) لەسەرەتای کاردا لە کۆمپانیایەکدا دادەنێن. ئەوە هەرئەوبرە پارەیە کە لە سەر پشکەکان نووسراوە. زۆربوونی پشکەکان بە هۆی خستنەسەری دراوی نوێ یان بە هۆی خستنەسەری سەرچاوەکانی قازانجی سەرمایەکەیەوە. سیستەمی سیاسی و ئابووری بە هەر شێوازێک بێ، سەرمایە تەکنیکی و دارایەکان بۆ بەرهەمهێنان پێویستن. ئەوەی لە سیستەمە جیاوازەکاندا، جیاوازی هەیە بریتیە لە چۆنیەتی خاوەندارێتی ئەم سەرمایانەو هەروەها خاوەندارێتی ئەو قازانجەی کە دێتە ئاراوە یان جیاوازی لە ڕێژەی ئەو ماف وئمیتیازانەدایە کە کەسەکان یان گرووپەکان بە نیسبەت سەرمایە و قازانجەوە هەیانە.

***سەرمایەی یاسایی:*** سەرمایەیەکە کە خاوەنەکەی بەبێ ئەوەی کار بکا، ئەم مافە وەدەست دێنێ. بە هاکانی وەکوو پشکەکان و بەڵێنەکان، سەرمایەی یاسایین کە خاوەنەکانیان مافی خاوەندارێتیان بە سەر دامەزراوەکەدا نیە. لە دامەزراوەیەکدا سەرمایەی جێگرو هەمیشەیی و هەروەها سەرمایەی لە حاڵی گەڕاندا هەیە.

سەرمایە لە سیستەمە ئابورییە جیاوازەکاندا، واتای جیاوازی هەیە. لە سیستەمی سەرمایەداریدا، سەرمایە، قازانج پێک دێنێ. لە سیستەمی ئابووری سۆسیالیستیدا، سەرمایە یەکێک لە مەرجەکانی کارە و بۆ خۆی لە خۆیدا لە پرۆسەی گەشەی بەرهەمهێناندا، هیچ بەها یان قازانجێک نائێنێتە دی. بەڵکوو راستەوخۆ و بەبێ زیادبوون دەخرێتە سەر شتومەکی بەرهەمهێنراو. قازانجی نوێ تەنیا لەلایەن کرێکارە وەبەرهەم دێ. ئەو قازانجەی کە دەست سەرمایەدار دەکەوێ بریتیە لە " زێدەبایی" بە هۆی رادەی کاتژمێرەکانی کارکردن کە سەرمایەدار نەیداوە بە کرێکار.

### کاپیتال (کتێب) *Das kapital*

ناوی کتێبی کارل مارکس، فەیلەسووفی ئەڵمانیە، کە لە لەندەن و بە مەبەستی رەخنەگرتن لە سیستەمی سەرمایەداری نووسی. بەرگی یەکەمی ئەم کتێبە لە ساڵی ١٨٦٧دا بڵاوبووە کە ئێستا بۆ خۆی لە ژیاندا مابوو و دووبەرگەکەی تریش کە تەواونەبیوو، لە لایەن ئەنگڵسەوە تەواو کرا ولەدوای مەرگی ئەو لە ساڵەکانی ١٨٨٥ و ١٨٩٤ دا بڵاوبۆوە. ئەم کتێبە بە " ئینجیلی کومونیزم" بەناوبانگە.

پێکهاتەی " کاپیتال" بە میتۆدی ئابستراکتی مارکس نووسراوە و پێوەندی بە پێکهاتەی هێرەمی ئابووریی سەرمایەدارییەوە هەیە. ئەم پێکهاتە ئابستراکتە کە بەپێی پێویستی پێکهاتەی چەمکە هەمیشە ئاڵۆز بووەکان و چەمکە ساکارترەکان دیاری دەکرێ و ئەوی دیکەیشان پێکهاتەی دیاریکەرانەیە کە کە بە هۆی ئابووری و تۆخمە بنەماییەکانی تیوری مارکس دەسەپێ. ناوی بەرگەکانی ئەم کتێبە ئاماژە بە پێکهاتەی ئەم کتێبە دەکا کە پشت بە خاوەنداریتی هێرەمی ئابووری دەبەستێ.

بەرگی یەکەم ،"بەرهەمهێنانی سەرمایەداری" سەبارەت بە پرۆسەکانی بەرهەم هێنانە. بەرگی دووهەم؛ " پرۆسەی سوورانی سەرمایە" و بوارەکانی ئاڵوگۆر (سات وسەودا ) و پێوەندی لەگەڵ بەرهەمهێناندا شی دەکاتەوە. بەرگی سێهەم" بەرهەمهێنانی سەرمایەداری تایبەتی"یە و هەروەها ئەوبەشە کۆمەڵایەتیانەی کەوەکوو سەرمایەدارەکان پربوون لە رۆحی قازانج پەرەستی.

## Capitulation کاپیتۆلاسیۆن

زاراوەی کاپیتۆلاسیون لەوشەی لاتینی Capitulare یان لە وشەی ئیتالی Capitulazione وەرگیراوە و بە واتای گرێدانی ڕێککەوتننامە و گرێبەست، یان بە مانای ڕێککەوتننامەش دێ.

هێندێک لە نووسەرەکان پێیانوایە کەلەکاتی گرێدانی یەکەمین ڕێککەوتننامەی نێوان عەرەب و مەسیحیەکانی نیشتەجێی شاماتدا(سووریا و لوبنان) زمانی دانیشتوانی ئەم ناوچە ئیتالی بووە و ئەم وشە بە واتای ڕێککەوتنی نێوان مەسیحیەکان و عەرەبەکانە. هێندێکیش پێیانوایە وەرگیردراوی وشەی عەرەبی "ئاستی کاتی"ە.

کاپیتۆلاسیون بە بێ سەرنجدانە سەرچاوەی واتایەکەی، لە مێژووی یاسای ئەورووپیدا بە بەڵگە یەکلایەنەکان یان ئەو ڕێککەوتننامانە دەگوترێ کە بەپێی ئەو ڕێککەوتننامانە (بابی عالی) و حکومەتەکانی شامات و ئەفریقیای باکوور، باری یاسایی بیانیەکانی نیشتەجێی ئیمپراتۆریای عوسمانیان دیاری دەکرد و ئەو وڵاتانە ئیمتیازیان دەدا بە هاووڵاتیە بیانیەکان لە وڵاتەکانی خۆیاندا.

بڕیاری یەکەمی شوباتی ١٥٣٥ ی سولێمانی قانوونی، سووڵتانی عوسمانی کە وەکوو ئیمتیازێک درایە فرانسوای یەکەم، پاشای فەڕەنسە و کاپیتۆلاسیونی نێوان لوئی پانزەهەم و سووڵتان محەممەدی یەکەم لە ڕێکەوتی ٢٨ ئاریاری ١٧٤٠ لە و ڕێککەوتننامە و بەڵگانەن کەبەم مەبەستە دارێژراون و لە کاپیتۆلاسیۆنە گرنگەکانن.

واتای گشتی کاپیتۆلاسیون بریتیە لە سیستەمی دادی کۆنسولی و هێندێک گەرەنتی و ئیمتیاز و پارێزراوی لە بواری دادگاییکردندا کە بەپێی بڕیارە یەکلایەنیەکان یان ڕێککەوتن یان بەڵگەی دادی دیکە دەدرێتە هاووڵاتیانی وڵاتە مەسیحیەکان لە وڵاتانی نامەسیحیدا. لەو وڵاتانەدا بەگشتی هاووڵاتیانی بیانی، تەنانەت هێندێک جار بەبێ ڕەچاوکردنی بنەماکانی کردەوەی دوولایەنە، نەدەچوونە ژێر دەسەڵاتی بەرپرسانی دادی ئەو وڵاتانەی کە لێیی بوون و سەربە سەلاحییەتی بەرپرسان و بەتایبەتی بەڕێوەبەرە کۆنسولی و سیاسییەکانی دەوڵەتی خۆیان بوون و کێشە و سکالاکانیان و هەروەها دادگاییکردنیشیان لە لایەن کۆنسول یان نوێنەری دەوڵەتەکەیانەوە چارەسەردەکرا. ڕێککەوتننامە یان بڕیارەکانی کاپیتۆلاسیۆن وەکوو گەرەنتیەکی ڕەسمی بۆ پێکهینان

و دارێژەرانی ئەم ماف و ئیمتیازانە وا بوو، بەلاّم سەرچاوەی یاسایی ئەم ماف و ئیمتیازانە تەنیا رێککەوتنەکان بوون:

بە پێی عورف و نەریتیی نێودەوڵەتیی کۆنسولەکان سێ سەلاحییەتیان هەبوو کە بریتی بوون لە :

۱ _ سەلاحییەتی دارشتنی رێووشوێن بە نیسبەت هاولاّتیەکانیانەوە.

۲ _ سەلاحییەتی پاراستن بە نیسبەت هاەلاّتیەکانیان نیەوە.

۳ _ سەلاحییەتی دادگاییکردن لە کێشەی نێوان هاولاّتیەکانیان و خەڵکی ئەو ولاّتەدا.

سەلاحییەتی یەکەم پێوەندی بە سەردەمی کۆنەوە هەیە. ئەو کاتەی کە هاوولاّتیە مەسیحیەکان بە گشتی و یان ئەو هاولاّتیانەی کە لە رەگەزو ئاینێکی جیاواز بوون، بۆ پاراستن و ئاسایشی خۆیان لە دەوری یەکتر دەژیان و کاتێک ژمارەیان زۆرتر دەبوو، گەرەکێکیان بۆ تەرخان دەکردن. لە ناو ئەم گەرەکەدا، کۆنسول مافی دارشتنی یاسا و رێووشوێنی سەبارەت بە بەرێوەبردنی کاروباری گشتی( پاک و خاوێنی، ئاو......) یان پێوەندیی کەسەکان لەگەڵ یەکتردا یان پارێزگاریکردن لەوانی هەبوو.

سەلاحییەتی دووهەمیش هەر وەکوو هۆیەکانی سەلاحییەتی یەکەم وابوو و بەبەرەکە گەرەکەکان چۆل کران و هاوولاّتیان لە ناو شاردا بلاّوبوونەوە، لە ناو چوو.

سەلاحییەتی سێهەم کە داد گاییکردن بوو لە سەرئەم بنەمایە بوو کە سیستەمی دادی ئەو ولاّتە ناتوانێ هاوولاّتیانی بیانی دادگایی بکا. سەلاحییەتی دادی کۆنسول زۆر بەربلاّو بوو و بەپێی ولاّتەکان دەگۆرا. و بە پێی تێپەریی زەمانیش شێوە جیاوازەکان ئالووگۆریان بەسەردا هاتووە. مافی دادی کۆنسول لە راستیدا گرنگترین لایەنی کاپیتۆلاسیۆنە. لە بواری جیاوازییەوە، سەرەتا دەبێ دابەشبوونێکی گشتی بکەین کە پێوەندی بە سروشتی جیاوازی بابەتی کێشەکەوە هەیە، واتە کێشەی شارستانی و ئەوکێشانەی پێوەندییان بە بابەتە سزاییەکانەوە هەیە. کێشە شارستانیەکانیش بەپێی ئەوەی کە هەر دوو لایەنی کێشەکە خەڵکی ولاّتێک بن یان خەڵکی چەند ولاّت بن یان لە نێوان هاولاّتیانی بیانی و هاولاّتیانی ئەو ولاّتەدا بێ. بەسەر چەند جۆردا، دابەش دەبن:

الف_ کێشەی شارستانی لە نێوان هاولاٚتیانی ولاٚتێکدا. لەم کێشانەدا، سەلاحییەتی دادگاییکردن تەنیا تایبەت بە کۆنسولە.

ب_ لە کێشەی نێوان دەولەتە جیاوازەکاندا، جارێک سەلاحییەتی دادگاییکردن هی کونسولی ئەم هاوولاٚتیە بوو کە داواکار بوو( سکالاٚی کردبوو) (ئێران) و جارێکیش دەدرایە کۆمسییونی تێکەلاٚو لە کۆنسولەکانی هەر دوو هاوولاٚتیەکە ( لە عوسمانی و میسردا).

ج_ کێشە لە نێوان هاولاٚتیانی بیانی و خەلٚکی ئەو ولاٚتە لە ئەستۆی بەرپرسانی دادی ولاٚتی خانەخوێدا بووە.بەو تایبەتمەندییەی کە لە هێندێک لەو ولاٚتانەدا، کۆنسول مافی ئەوەی هەبوو لە دادگادا بە شدار بێ و بەسەر پرۆسەی دادگاییکردندا چاوەدێری بکا و لە هێندێک ولاٚتی دیکەشدا بۆ چارەسەری ئەم کێشانە، دادگای تایبەتی پێکدەهات و هەرئەم داداگاییکردنە لە دوو قۆناغی سەرەتایی و کۆتایی و لە دادگا تایبەتیەکانی ولاٚتی خانەخۆیدا جێبەجێ دەبوو. لە هێندێک ولاٚتدا، سەلاحییەتی بە دوادا چوونی کێشەکانی نێوان هاولاٚتیانی بیانی و خانەخوێ، لە ئەستوی ولاٚتی کەسی داواکاردا بوو. جۆرێکی تر، سەلاحییەتی بەدواداچوونی دادگای ولاٚتی خانەخوێ بۆ ئەمجۆرە کێشانە بوو، بەلاٚم لە هەمان حالٚدا، کۆنسولیش ئەو سەلاحییەتەی هەبوو کە ببێتە نێوبژیوانی دوولایەنی کێشەکە و تەنیا لە دوای ئەوەی کە نەیدەیتوانی کێشەکە چارەسەر بکا، مەسەلە کە دەخرایە بەردەم ولاٚتی خانەخوێ(چین).

سەبارەت بە مەسەلە سزاییەکان لە هەموو ئەو ولاٚتانەی کە سیستەمی کاپیتۆلاسیۆنیان پەسند کردبوو، بەرپرسانی پێوەندیداری ولاٚتی خانەخوێ، بە هیچ شێوەیەک دەستیان لە پرۆسەی بە دواداچوونی تاوان و سزای هاوولاٚتیەکی بیانی و هاولاٚتیەکی هەمان ولاٚتەوەرنەدەدا و کۆنسول سەلاحییەتی رەهای هەبوو. بەلاٚم کاتێک کە یەکێک لە لایەنەکان، هاولاٚتی خۆیان بوو، لە هێندێک ولاٚتدا کۆنسول و بەرپرسانی ولاٚتی خانەخوێ هەرکامیان بە نیسبەت هاولاتیانی خۆیان، سەلاحییەتیان هەبوو (چین جگە لە ناوچەی ئیمتیاز). لە هێندێک ولاٚتی دیکەدا دادگایەکی تایبەتی سەلاحییەتی هەبوو، بەو مەرجەی کۆنسولەکەی بەشداربێ (سیام لە سالٚی ١٩٠٤ دا). کاتێک کە لایەنێکی تاوان هاولاٚتیەکی بیانی لە دەولەتێک و لایەنەکەی دیکەش هاولاٚتیەکی دەولەتێکی بوو، سەلاحییەتی دادگاییکردن لە ئەستۆی کونسولی لایەنێکدا بوو کە تاوانەکەی کردبوو (تورکیا و ژاپۆن). لە روانگەی جۆری تاوانەکانەوە، بۆچوونەکان جیاواز بوون. جاران سەبارەت بە

لادانەکان، دادگای تایبەتی وڵاتی خانەخوێ و سەبارەت بەتاوانە چکۆلە و جینایەتەکان دادگای تێکەڵاو خاوەن سەلاحییەت بوو. لە هێندێک حاڵەتدا کۆنسول سەلاحییەتی تەواوی بەنیسبەت هەموو ئەو تاوانانەی کە کەهاوڵاتیەکی ئەو دەوڵەتە کردبوونی هەبوو، چ ئەوەی ئەوکەسەی تاوانەکەی هاوڵاتی ئەو وڵاتە یان هاوڵاتی وڵاتێکی بیانی دیکە یان هاوڵاتی وڵاتی خانەخوێ بێ (میسر).

بەسەرنجدان بەو شتانەی کە ئاماژەیان پێکرا، پشتیوانی کۆنسولەکان لەبەژەوەندی هاوڵاتیەکانیان لە سیستەمی کاپیتۆلاسیون دا زۆر بەربلاو بوو و دەسەڵاتی جێبەجێکردنیشیان زۆر بەر چاو بوو.

کۆنسولەکانی کاپیتۆلاسیون بەرەبەرە پشتیوانیان لە هاوڵاتیانی وڵاتی خانەخوێش دەکرد. لە سەرەتادا وەرگێری کۆنسول و ئەو فەرمانبەرانەی کۆنسولخانە کە خەڵکی وڵاتی خانەخوێ بوون، بە پێی نامەیەک لە لایەن کۆنسولەوە پشتیوانیان لێدەکرا. پاشانیش هێندێک لە هاوڵاتیانی وڵاتی خانەخوێ بە هۆی ئایین، یان لایەنەکانی دیکە وەکوو . لایەنی سات و سەودا یان کارەکانی دیکەی کۆنسول، بە هۆی نامەی کۆنسولەوە پشتیوانیان لێدەکراو لە بەرامبەر بەرپرسانی وڵاتی خۆیاندا رادەوەستان. لە قۆناغەکانی دیکەدا کۆنسۆل، بە هەر کەسێک لە هاوڵاتیانی وڵاتی خانەخوێ کە دوای نامەیان بکردایە، بەمەرجی سادەو ساکار و لە هێندێک حاڵەتیشدا لە بەرامبەر پارەدا، نامەیان پێدەدان، بەبێ ئەوەی پرس بە بەرپرسانی وڵاتی خانەخوێ بکەن. ئەمە لە سەرەتادا بۆ بردنەسەری پێگەی وڵاتی کۆنسول دەکرا، بەڵام ئەوەندە زیادرۆیی تێدادەکرا کە بوو بە هۆی نیگەرانی و سەرئێشە بۆ هەر دوو وڵات و بەرەبەرە بەرتەسک بۆوە و پاشانیش لە ناوچوو.

هەڵوەشانەوەی کاپیتۆلاسیون: بە پەرەپێدانی رێکخستنەوەی دەزگای ئیداری و جووڵانی هەستی نەتەوایەتی لەو وڵاتانەی کە لە ژێر سیستەمی کاپیتۆلاسیۆندا بوون، فەلسەفەی کاپیتۆلاسیۆن کەوتە ژێرپرسیارەوە، بۆیە بەرەبەرە دژی ئەم سیستەمە راپەڕین و هەڵیان وەشاندەوە. لە هێندێک لەو وڵاتانەی کە توانایی ئەم کارەیان نەبوو، کاپیتۆلاسیون تا دوای شەڕی یەکەمی جیهانی هەروا مایەوە، بەڵام دژایەتیی لە نێوان فەلسەفەی پێکهێنانی کۆمەڵەی نەتەوەکان و دیوانی دادی لاهە لەلایەک و ئەم سیستەمە لە لایەک، بوو بە هۆی ئەوەی کە ئەم وڵاتانەش بتوانن هەڵی وەشێنینەوە.

لە هێندێکی کەم لە وڵاتە بێ هێزەکاندا، کاپیتۆلاسیۆن هەرچەندە تارادەیەک کەمکرا بۆوە، بەڵام تاشەڕی دووهەمی جیهانی خایاند ( میسر، مەراکیش، ئەتیۆپی، چین)

یەکەم وڵات کە توانی بەرێکەوتن لەگەڵ بەریتانیا و بەخشینی هێندێک گەرەنتی، کاپیتۆلاسیۆنی ئەو وڵاتە هەڵوەشێنێتەوە، ژاپۆن بوو کەلەم وڵاتەدا، بەریتانیا، ئەمەریکا، فەرەنسا، رووسیا، ئیتالیا، ئەڵمانیا، بەلجیکا و دانیمارک مافی دادگاییکردنی کۆنسولیان هەبوو. بەرێکخستنەوەی ئیداری سیستەمی وەدادی ژاپۆن کە لە هەموو لایەنەکانەوە بەدڵی بیانیەکان بوو، لە سەرەتادا بەریتانیا لە ١٨٩٤ و پاشانیش هەموو وڵاتانی دیکە پشتیوانیان لە کاپیتۆلاسیون کرد.

## کارتێل **Cartel**

کارتێل لە سەرچاوەی وشەی ئیتالی Cartello (دەرخستنی نیشانە) وەگیراوە. وشەی کارتێل ئەم واتا یانەی هەیە. بانگهێشتکردن بۆ شەڕ، نامەی داکۆکیکردن، بانگهێشتکردن بۆ دوئیل (شەڕی دەستەویەخەی نێوان دوو کەس)، شەڕ. یەکیەتیی و هاوپەیمانی خاوەنی لقەکانی بوارێکی پیشەسازی، پێکهاتنی سەندیکا سیاسی و پیشەسازییەکان لەگەڵ یەکتردا.

کاتێک کەچەند کۆمپانیاو یەکەیەکی ئابووری و بڵاوکردنەوە(توزیع) کە رۆڵێکی، جیاوازیان لە بەرهەمهێنان، بازاڕ و نرخ لە ئەستودایە، گرووپێکی رێکخراو، پێکدێنن و دەگەنە پێکهاتنێک کە هەر کام لە کۆمپانیاکانی ئەندام و یەکگرتوو، کەسایەتی یاسایی( لە رووی ماف و ئیمتیاز) خۆیان بپارێزن، کارتێلیان پێ دەڵێن. کارتێلەکان رەنگە بەرهەمهێن بن و لایەنی هاوبەشیان لە قازانجدا هەبێ کە پێیان دەڵێن " دراو". جۆرێکی دیکە لە کارتێلەکان پێوندییان بە بازاڕە بازرگانیە جیهانیەکانەوە هەیە کە دەیانەوێ بەتەواوەتی بەسەر بازارەکانی جیهاندا زاڵ بن. بەگشتی کارتێلەکان لەگەڵ پاراستی سەربەخۆیی و کەسایەتیی یاسایی خۆیان؛ لە بوارە جیاوازەکاندا خەریکی چالاکین.

کارتێل و تراستەکان لەگەڵ ئەوەدا کە لەو گرووپانەن کە بە ئازادی هەڵ دەبژێردرێن، بەڵام هاتنەدەر لەم گرووپانە بۆ هەرکام لە ئەندامەکان، رەنگە ئاکامی زۆر خراپی لێ بکەوێتەوە و لە کاتی تەریککەوتنەوەدا زیانێکی قورسیان وێ کەوێ.

دامەزراوەو یەکە ئابوورییەکانی ئەندامی کارتێل رەنگە سەر بە چەند وڵات بن. کارتێلەکان لە بوارەکانی بەرهەمهێنان یان بازرگانی و رەنگە لە هەر دوو بوارەکەشدا پێک بێن و هەلومەرج و نرخی فرۆشتن بخەنە ژێر کۆنترۆلی خۆیانەوە. کۆنترین کارتێلەکانی جیهان، یەکیەتیی نێوان کۆمپانیای "ئاڵکۆ" (ئەمریکا) و "ئالاگ"ی سۆئیسرایە کە لە بواری ئەڵەمینیۆمدا کاریان دەکرد(١٨٩٦). پاشان کۆمپانیای بەرهەم هێنی دیکە هاتنە ناو ئەم کارتێلانەوە.

## کاست / چین — *Caste*

کاست لە زاراوەی پورتوگالی Casta و لاتینی Castus وەرگیراوە و بە واتای خاوێن و پاڵاوتوو و تێکەڵاونەبووە. کاست بە چینێکی کۆمەڵایەتی داخراو دەگوترێ کە هیچ بزاوتێکی چینایەتی و کۆمەڵایەتی و دینامیزمی گرووپی تێدا نەبێ و ئەگەری گواستنەوە لە کاستێکەوە بۆ کاستێکی دیکە نیەو ئەگەر هەبێ زۆر ئەستەمە. بە تایبەتی لە کاستێکی خوارەوەتر بۆ کەستێکی سەرەوەتر.

کاستەکان جۆروشێوەی تایبەتیان هەیە وەکوو کاستە ئایینیەکان، رەگەزییەکان، پیشیەکان و سیاسییەکان.

کاستی فیرعەونەکانی میسر، کاستی شەڕکەران، کاستی بازرگانەکان، کاستی کۆیلەکان، کاستی وەزیرەکان، کاستی هونەرمەندان لە میسری کۆن و کاستە جیاوازەکان لە یۆنانی کۆن و رۆمی کۆن (وەکوو گلادیاتۆرەکان...) و کاستەکانی هیندستان.

ئاڵۆزترین پێوەندی کۆمەڵایەتیی کاستی لە هیندستاندا بوو کە ئیستاکەش بە پلە و رێژەیەکی کەمتر، لە هێندیک لە شوێنەکانی هیندوستاندا بەرچاو دەکەوێ کە سەرچاوەکەی لە کۆت و بەندە کولتوورییەکان، ئایینیەکان و پەروەردەییەکان دایە. لە سیستەمی کاستیدا، چینەکان لە یەک جیا نەبوون و هیچ بزاوتێکی ئاسۆیی و ئەستوونی پێک نەدەهات. لە هیندستاندا کاستی رۆحانی (برەهمەنەکان)، کاستی شەڕکەران ( کاشاتریا)، کاستی وەرزێر و بازاڕ (وی سی یا) و کاستی کرێکار(سودرا) هەرکامیان گرووپی فرەچەشنیان هەبووە و داب و نەریتی تایبەتیان هەبووە و چوون بۆ کاستێکی تر قەدەغە بوو.

کاستەکان لە کردەوەدا، کۆنەپەرست و دۆگم بوون و بریاردان سەبارەت بە شتێک، لە رووی و شیاری وئیرادەوە نەبووە. لە سیستەمی کاستی کۆمەڵگا مرۆییەکاندا، پلەی ئانترۆپی نێگەتیف زۆرلە سەرێیە و پێوەندییەکی زیندوو (دینامیکی ) نیە و دابەزین لە هەموو بوارەکاندا بەر چاوە. پێگەی کۆمەڵایەتی لە ناو کاستەکاندا پاشماوەیی و پشتاوپشتە.

## کەی.جی.بی K.G.B

کورتکراوەی رووسی Komitet Gosudar Stvennoi Bezopasnosti یە واتای کومیتەی ئاسایشی دەوڵەتیە و لە ساڵی ١٩٤٥ەوە بەو رێکخستنە دەگوترێ کە ئامانجەکەی پاراستنی دەستکەوتەکانی سۆسیالیزم، لادانی نەیارانی نێوخۆیی، پاراستنی سنوورەکانی وڵات، کۆنترۆڵی برۆکراسی، چاوەدێری کردن بەسەر هێزە چەکدارەکان دا بوو. جگە لەمە، کەی .جی. بی ئەرکی سیخوڕی لە وڵاتانی دەرەوە و بە تایبەتی لە وڵاتانی ئەندامی رێککەوتننامەی ڤەرشۆی لە ئەستودا بوو تا دەسەڵاتی خۆی توندوتۆڵ بکات.

ئەم رێکخراوەش وەکوو دامەزراوەکانی پێش لە خۆی واتە: چێکا، ڤێچێکا (Rcheka)، ( G.P.U)، (O.G.P.U)، (N.K.V.D)، (N.K.G.B)، (M.G.B)، رەمزەی درەندەیی و بیرەحمی لە ئاست هاووڵاتیانی رووسیادا بوو.

لە دوای جێبەجێکردنی سیاسەتەکانی گلاسنۆست و پرۆسترۆیکا لە لایەن گۆرباچۆفەوە، دوایین سەرۆک کۆماری سۆڤیەت، کردەوەکانی K.G.B لە دژی نەیارەکان کۆتاییان پێهات و بە هۆی بەشداریکردن لە کودەتای ١٩ی ئابی ١٩٩١، پێکهاتە کۆنەکەی هەڵوەشایەوە و لە ساڵی ١٩٩٢دا، رێکخراوێکی چکۆلەتر بە ناوی " سیستەمی هەواڵگری ناوەندیی کۆماری رووسیا" جێگاکەی گرتەوە. ئەم سیستەمە هەواڵگریە، هاوکارییەکی بەربڵاوی لەگەڵ دامەزراوە هاوشێوەکانی خۆی لە رۆژئاوادا لە بوارەکانی: نەهێشتنی پەرەپێدانی چەک و چۆڵی ناوەکی، کیمیایی و بایۆلۆجی و هەروەها بەربەرەکانیی لەگەڵ تیرۆریزم و قاچاقی ماددە سڕکەرەکاندا دە کرد.

## بنەمای دەوڵەتەکانی کامیلە الوداد

## *The Most Faroured Nation Clause*

گونجانی بنەمای دەوڵەتەکانی کاملەالوداد لە گرێبەستە بازرگانیەکاندا بە واتای پەسندکردنی یەکسانیی هەڵسوکەوت و جیاوازی دانەنانە. ئەم بنەمایە دەبێتە هۆی ئازادی و پەرەگرتنی بازرگانی نێودەوڵەتیی. لە سەدەی حەڤدەهەمەوە لە زۆربەی گرێبەستە بازرگانیەکانی نێوان وڵاتانی ئەورووپیدا بەرچاو دەکەوێ. گونجاندنی بنەمای دەوڵەتەکانی کاملەالوداد لە گرێبەستە بازرگانیە دوولایەنەکاندا ( کە لە نموونە هاوشێوەکانی وەکوو گرێبەستە سەرمایەگوزارییەکان، کۆچ، پیشە، مۆڵەتی داهێنان و بوارەکانی باج وەرگرتندا دەبینرێ)، بە واتای ئەوەیە کە بەڵێندەرەکان، بەڵێن دەدەن کە هەڵسوکەوت لەگەڵ لایەنی رێککەوتنەکەدا، لە چاو لایەنێکی دیکەدا ( هەروڵاتێکی تردا) خراپتر نابێ. ئەم مەرجە دەبێتە هۆی ئەوەی کە وڵاتێکی سێهەمیش لەم مافانە کەڵک وەرگرێ. هەروەها بەڵێندەرکانیگرێبەستەکان لە سەر ئەو رێک دەکەون، هیچ رێوو شوێنێک نەگرنەبەر کە لە دژی بەرژەوەندییەکانی لایەنی گرێبەستەکەدا بێ. لە ئاکامدا ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی کە پێگەی هەردوو لایەن لە بازارەکانی یەکتردا جێگیر ببێ.

سەرەرای ئەمە کەڵک وەرگرتن لە بنەمای" دەوڵەتەکانی کاملەالوداد." لە پێوەندی نێوان وڵاتەکاندا بە توانایی ئەو وڵاتەوە بەستراوەتەوە، چوونکە لە هەلومەرجێکی نایەکسانی ئابووریدا، وڵاتی بە هێزتر زیاتر لەم مەرجە کەڵک وەردەگرێ و وڵاتی بێ هێز و لاوازی بەکەمی دەتوانێ لەم یاسایە کەڵک وەرگرێ.بۆیە لە رابردووشدا ئەم بنەمایە لە لایەن دەوڵاتە بە هێزترەکانەوە بە سەر دەوڵەتە لاوازەکاندا دەسەپا. وەکوو رێککەوتننامەی ١٨٢٨ ی تورکمانچای لە نێوان ئێران و رووسیادا، پاشانیش بەریتانیا و وڵاتانی دیکەی ئەورووپی لە رێککەوتننامەکانی خۆیان لەگەڵ ئێراندا ئەم بنەمایەیان گونجاند. هەروەها ئەڵمانیا لە رێککەوتننامەی فرانکفۆرتدا ئەمەی بەسەر فەرەنسادا سەپاند و لە دوای شەری یەکەمی جیهانیشدا ئەم بنەمایە لە لایەن هاوپەیمانەکانەوە بەسەر دەوڵەتە دۆراوەکاندا سەپا.لەم حاڵەتانەدا بەرژەوەندی بەخشینی ئیمتیاز لە لایەن دەوڵەتی بێ هێزەوە لە بەرچاو ناگیرێ و وڵاتە بەهێزەکان کەڵکی لێ وەردەگرن.

*بەگشتی بنەمای دەوڵەتەکانی کاملەالوداد بە سێ شێوە ئاراستە دەکرێ:*

الف_ دەوڵەتەکانی کاملەالوداد بە مەرج:

لەم حاڵەتەدا کەڵک وەرگرتن لە ئیمتیازەکانی دەوڵەتەکانی کاملەالوداد بە بەخشینی ئیمتیازی هاوشێوە و هاوسەنگەوە دەبەسترێتەوە. گونجانی بنەمای دەوڵەتەکانی کاملەالوداد بەمەرجەوە پێویستی بە مافی و تووێژ بۆ لایەنی رێککەوتنەکە هەیە. وەکوو رێککەوتننامەی بازرگانیی ٦ ی شوباتی ١٧٧٨ ی نێوان ئەمریکا و فەرەنسا.

ب_ بنەمای دەوڵەتەکانی کاملەالوداد بەبێ مەرج:

لەم حاڵەتەدا لایەنەکانی رێککەوتننامەکە دەتوانن لە حاڵەتە هاوشێوەکاندا لە دەوڵەتەکانی کاملەالوداد کەڵک وەرگرن و پێویستی بە وتووێژ و رێوشوێنەکانی حاڵەتی یەکەم نیە. ئەم حاڵەتە لە ماددەی ١٦ ی جارنامەی هاڤاناو ماددەی یەکی رێککەوتننامەی گشتی تەعرەفەی گومرک و بازرگانی پەسند کراوە.

خۆ بواردن لە بنەمای دەوڵەتەکانی کاملەالوداد بە بێ مەرج بە هۆی دامەزرانی تەعرەفە گومرکیەکان دەرەخسێ، بۆ وێنە ئەڵمانیا لە ساڵی ١٩٠٢دا بە کەڵک وەرگرتن لەم شێوازە بوو بە هۆی کەمکردنەوەی هاوردەکانی فەرەنسا بە قازانجی سویسرا، ئەڵمانیا لە تەعرەفە گومرکیەکانی خۆیدا بە گونجانی " کوێستانی بوون"ی ئاژەڵ و دیاریکردنی رەنگی ئاژەڵەکان، بەرزایی شوێنی بەخێو کردنی ئاژەڵەکان لە ئاستی دەریا و جۆری لەوەڕی ئاژەڵەکان، کۆمەڵێک مەرجی دانابوو کە تەنیا ئاژەڵەکانی سویسرای دەگرتەوە.

ج_ بنەمای دەوڵەتەکانی کاملە الوداد بە شێوەی بەرتەسک و سنووردار:

لەم حاڵەتەدا، مەبەست بەخشینی سنووورداری ئیمتیازەکانی حاڵەتی بێ مەرجی بنەمای دەوڵەتەکانی کاملە الوداد بە شتومەکێکی دیارو یان لە شوێنێکی دیار یان لە چوارچێوەی رێککەوتننامەی بەکۆمەڵی تایبەتیە. لەم حاڵەتەدا کە حاڵەتێکی دەگمەنی بنەماکەیە، گشتاندنی دەرئەنجامەکانی بنەمای دەوڵەتەکانی کاملە الوداد تەنانەت لە حاڵەتە بێ مەرجەکەشدا، گشتی نیە و تەنیا شتومەکە ئاماژە پێکراوەکان یان ئەندامانی یەکیەتی لایەنی رێککەوتننامەکە یان ئەوانەی رێککەوتننامەیەکی دیاریکراویان مۆر کردووە، دەگرێتەوە.

## کۆمۆن لاف / یاسای عورفی Common Low

یەکێک لە سەر چاوە بنەڕەتیەکانی یاسای نێوخۆیی و نێونەتەوەیی ئانگلۆساکسۆن،کۆمۆن لاف (یاسا عورفی)ە. کۆمۆن لاف سیستەمێکی یاساییە کە لە بەریتانیادا لە دوای زاڵبوونی نۆرمەنەکان بە سەر ئەم وڵاتەدا و بە شێوەی گەشتی لە ئاکامی هەوڵی دادگاکانی پاشایەتی ئەو وڵاتە هاتۆتە ئاراوە. بنەماڵەی کۆمۆن لاف جگە لەوەی کە سەرچاوەی یاساکانی بەریتانیا بووە، سەرچاوەی یاسای هەموو وڵاتانی ئینگلیزی زمانیش (جگە لە هێندێک حاڵەت) بووە. جیا لەوڵاتانی ئینگلیزی زمانیش، کۆمۆن لاف لە زۆربە و رەنگە لە هەموو ئەو وڵاتانەشدا کە لە بواری سیاسیەوە سەربە بەریتانیا بوون یان ئێستاش هەر سەربە بەریتانیان، تەشەنەی کردووە. رەنگە لە هێندێک بواردا، ئەم وڵاتانە داب و نەریت و دامەزراوە و چەمکە تایبەتیەکانی خۆیانیان پاراستبێ، بەڵام لە زۆربەی حاڵەتەکاندا یاساکانی بەریتانیا روانگەی بیروبۆچوونی مافناسەکانی ئەم وڵاتانەی خستۆتە ژێر کاریگەرییەوە، بەتایبەتی بەم هۆیەی کە لە لایەکەوە، رێکخستنی ئیداری ودادو لە لایەکی دیکەوە؛ رێسای پێراگەیشتن ( مەدەنی یاسزا) و بەڵگەی سەلماندنی داواکاری لە هەموو شوێنەکاندا لەبەر نموونەی بەریتانی وەرگیراون و رێکخراون.

هەموو لێکوڵینەوەکان لەسەر کۆمۆن لاف دەبێ بە خوێندنەوەی یاسای بەریتانیا دەست پێ بکا. کۆمۆن لاف سیستەمێکە کە بە قووڵی چۆتە ژێر کاریگەری مێژووی خۆیە و ئەم مێژووە تا سەدەی ١٨ ، تەنیا مێژووی بەریتانیا بووە. ئەمە هۆکارێکی کاریگەرە، هەرچەندە کە هێندێک لە سیستەمە هاوشێوەکانی کۆمۆن لاف، وەکوو ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا؛ جیاوازییەکی قووڵیان لەگەڵ یاساکانی بەریتانیادا هەیە و هێندێکی دیکەیان وەکوو یاساکانی هیند یان سوودان لە بواری " باری کەسی "دا یاسای دیکەیان رەچاو کردووە.

## کەناڵی سۆئیز Sues Canal

کەناڵی سوئیز کە میسرییەکان پێی دەڵێن: "قنات السويس"، مەدیتەرانە بە دەریای سوور دەبەستێتەوە. ئەم کەناڵە کە ١٦٠ کیلۆمەتر درێژایی هەیە، لە سەردەمی حکومەتی دەوڵەتی عوسمانی لە میسردا، لە لایەن کۆمپانیایەی تایبەتی و بە بەرێوەبەرایەتیی فردینالد دولێسپێس هەڵکەنرا. مۆڵەت

نامەی دامەزرانی کانالی سوئیز لە ڕێکەوتی ٣٠ی تشرینی دووهەمی ١٨٥٤ دەرچوو. بە پێی بەڵگەی مۆڵەت نامەکە، هەموو وڵاتەکان بە شێوە یەکسان دەیانتوانی لەم کەناڵە کەڵک وەربگرن.

لە دوای شەڕی عوسمانی و رووسیا لە ساڵی ١٨٧٧دا و هەروەها گرژی و ئاڵۆزییەکانی ساڵی ١٨٨١ی میسر، مەسەلەی مافی پەڕینەوە لە کەناڵی سوئیز ڕەهەندی نوێی بە خۆیەوە گرتن. ولەئاکامدا لە ساڵی ١٨٨٨دا ڕێککەوتننامەی" قوستەنتنییە" لە کۆنفرانسێکدا کە لە نوێنەری عوسمانیەکان و شەش وڵاتی گەورەی ئەورووپی پێکهاتبوو، گرێدرا. بە پێی ئەم ڕێککەوتننامە ئەم بنەمایانە بۆ پەڕینەوە لە کەناڵی سوئیز دیاریکران:

*الف*_ ئازادی هاتوچۆی پاپۆڕەکان لە کاتی شەڕ و ئاشتیدا.

ب_ ئازادی پەڕینەوەی ناوە شەڕکەرەکان بەو مەرجەی کە لەم کەناڵەدا ڕانەوەستن، و هێزو چەک و چۆڵیش دانەبەزێنن.

ج_ بێلایەن بوونی کەناڵی سوئیز ( بەم واتایە کەئەم کەناڵە لە کاتی شەڕیشدا نابێ دابخرێ یان بدرێتە بەرپەلامار).

ئەم یاسایانە جگە لە ماوەی شەڕی یەکەمی جیهانی، سەرجەم ڕەچاودەکران. لە کاتی شەڕی یەکەمی جیهانیدا، ئەڵمانیەکان و تورکەکان هێرشێکی زەمینیان کردە سەر کەناڵەکە، بەڵام سەرکەوتوو نەبوون و بەریتانیەکان پێشیان بە هاتووچۆی پاپۆڕەکانی تورکەکان و ئەڵمانیەکان گرت.

لەدوای شەڕی یەکەمی جیهانیدا، لەگەڵ گرێدانی ڕێککەوتننامەی ڤێرسای (ماددەکانی ١٥٢ و ٢٨٢) و ڕێککەوتننامەی لۆزاندا (ماددەی ٩٩)، سیستەمەکەی ساڵی ١٨٨٨ جارێکی دیکە دامەزرایەوە.

بە پێی ڕێککەوتننامەی یەکیەتیی نێوان میسر و بەریتانیا لە ڕێکەوتی ٢٦ی ئابی ١٩٣٦ ( کەلە ساڵی ١٩٥١ دا هەڵوەشایەوە)، بەریتانیا دەیتوانی لە نزیکی کەناڵی سوئیز، هێزی پێویستی زەمینی و ئاسمانی بۆ پاراستنی ئەم کەناڵە دابەزێنێ.

لە نێوان ساڵەکانی ١٩٤٥ و ١٩٥٦دا، دەوڵەتی میسر هەوڵیدا کە هێزەکانی بەریتانیا لە نزیکی کاناڵی سوئیز وەدەرنێ و ئەمەش لە ١٣ی حوزیرانی ١٩٥٦ دا سەری گرت. لە ساڵی ١٩٤٩ شدا ڕێککەوتننامەیەک لە نێوان میسر و کۆمپانیای نێودەوڵەتی کاناڵی سوئیزدا گرێ درا کە

بە پێی ئەو ڕێککەوتننامەیە پشک و ڕێژەی بەشداری میسر لە بواری داهات و بەڕێوەبردنی کەناڵی سوئێز زۆر بوو.میسر لە ساڵی ١٩٤٨دا(شەڕی فەلەستین) سەرەڕای ڕێککەوتننامەی کۆتاییهێنان بە شەڕی ٢٤ ی شوباتی ١٩٤٩ لەگەڵ ئیسرائیلدا، هات وچۆی کەناڵی سوئێزی بە کۆمەڵێک مەرجەوە بەستبۆوە کە لەگەڵ ڕێککەوتننامەی" قوستەنتنیە"دا نەدەگونجا.

ڕێککەوتننامەی یەکەمی ئەیلوولی ١٩٥١ پەسندکراوی ئەنجوومەنی ئاسایش کە داوای لە میسر دەکرد ڕێووشوێنە نوێکان هەڵوەشێنەوە، لەکاتی خۆیدا جێبەجێ نەکرا. ئەم شتەکە بەقەیرانی کانالی سوئێز بە ناوبانگە. بە خۆماڵیکردنی کۆمپانیای نێودەوڵەتیی کەناڵەکە بە پێی بڕیاری ٢٦ی تەمموزی ١٩٥٦ ی دەوڵەتی میسر گەیشتە ئەوپەڕی خۆی. دەوڵەتەکانی فەڕەنسا و بەریتانیا بە هاوکاری ئیسرائیل لە تشرینی یەکەم و تشرینی دووهەمی ساڵی ١٩٥٦دا هێرشیان کردە سەر میسر بەڵام نەیانتوانی بە ئامانجەکانیان بگەن. ئیستا کە بەپێی ڕاگەیەنرواى ٢٤ ی نیسانی ١٩٥٧ دەوڵەتی میسر، پەڕینەوە لەم کاناڵە بە هەڵوێستی ئەم وڵاتەوە بەستراوەتەوە.

بە دەسپێکردنی شەڕی حوزیرانی ١٩٦٧، هات وچۆ لەم کەناڵەدا بەرتەسک بۆوە، بەڵام لە ساڵی ١٩٧٥دا کەناڵەکە کرایەوە.

## کتێب سووتان **Book Rurning**

لە دیاردەکانی سەرکوتی کولتووری لەو کۆمەڵگایانە دایە کە خاوەنی ڕژێمێکی دیکتاتۆرین. لە ئەدەبیاتی سیاسی ئەڵمانیا ئەم زاراوە بە ڕووداوەکانی ڕۆژی ١١ی ئایاری ١٩٣٣ دەگوترێ کە بە پێی بڕیاری گوبلێز، وەزیری پڕوپاگەندەی ئەڵمانیای نازی، خوێندکاران هان دران تا ئەو کتێبانەی کە بە ئەڵمانی نەنووسرابوون لە کتێبخانەکان بیاهێنە دەر و بیانسووتێنن. ئەوان مەشخەڵی ئاوریان بەدەستەوە بوو و لە ناوەڕاستی شاردا بە ریزدە ڕۆیشتن و نزیکەی بیست هەزار بەرگ کتێبیان سووتاند. بە هۆی ئەم ڕەوتە، بەرهەمی جوولەکەکان، سۆسیالیستەکان، لیبراڵەکان و نووسراوەکانی توماس مان، ئەنیشتاین، فرۆید، پرۆست و هێربێرت جۆرج ڤێلزسووتێنران.

## Kremlin کرەملین

زاراوەیەکی رووسیە بە واتای قەلاّیە. کرەملین کۆشکی گەورەی رووسیا لە مسکۆیە کە لە لێواری چەپی چۆمی مسکۆدا دروستکراوە و ماوەیەکی زۆر و هەتا پێش لە رووخانی یەکیەتیی سۆڤیەت، بنکەی سەرەکی دەسەلاّتدارانی ئەو ولاّتە بوو. زاراوەی کرەملین لە زمانی سیاسەتدا بە واتای " حکوومەت و بەرپرسانی سۆڤیەت" یان بە واتای" سیاسیەتەکانی سۆڤیەت" بوو.

## Krem Linism کرەملینیزم

ئەبجۆرە لە کۆمۆنیزم کە سەر بە سۆڤیەت ناوەندی سەرەکی و سەرەتایی کۆمۆنیزمی جیهانیە، ماوتسێ دۆنگ بە هەڵگەراوە دەزانێ و پێیوایە کۆمۆنیزمی چین هەموو پێوەندییەکانی خۆی لەگەڵ مارکسیزم ـ لنینیزم داـ پچراندووە. کۆمۆنیزمی سۆڤیەت لە ناو هەموو سیستەمە کۆمۆنیزمەکانی جیهاندا لە هەموویان کۆنەپارێزترە. نێرۆکی سەرەکی کۆمۆنیزمی سۆڤیەت، "پاراستنی هەلومەرجی ئێستا" لە ناوچەکانی ژێر دەسەلاّتی سۆڤیەت دایە.

## Politicide کوشتاری سیاسی

کوشتاری سیاسی، کوشتاری رێکخراوی بەکۆمەڵە بە هۆی هەڵوێستی سیاسی و هاندان یان جێبەجێکردنی سیاسەتگەلێک لە لایەن دەوڵەتێک یان دەست و پێوەندەکانی ئەو دەوڵەتە کە دەبێتە هۆی مەرگی بەرچاوی ئەندامانی گرووپێکی سیاسی. ئەگەرچی ژینۆساید و کوشتاری سیاسی لە بواری شیکاریەوە لە یەک ناچن، بەلاّم ئامانجی هەردوکیان لە ناوبردنی جەستەیی گشت یان بەشێک لە گرووپە دیارە رەگەزی و سیاسییەکانە. توێژەرەکان سەبارەت بە لایەنەکانی جیاوازی شیکاری ئەم رووداوانە لەگەڵ یەکتردا کۆک نین. زۆربەی ئەو کەسانەی کە لێکۆڵینەوەی بەراوردکاریان سەبارەت بە ژینۆساید کردووە، لە سەر پێوەندیی نێوان کوشتارە جەماوەرییەکان (Mass Slaughters) یان کوشتارە بەکۆمەڵە رێکخراوەکان (Pogroms) لەگەڵ ژینۆسایددا کۆکن. توێژەرانی وەکوو" کوپتر" (Knper)، "فین" (Fein) و " هورروتیز" (Horowitz) ئەم رەوتانە بە ئالۆزی تێکدەرانەی پێکەوە بەستراوە، کوشتارە ئایدولۆژییەکان،

یان تەنیا بە ژینۆسایدیان دادەنێن. سەرەڕای ئەوەی کە بەرهەمی ئەم توێژەرانە لە بەردەست دایە، بەدوو هۆ، هەست بە پێویستی روونکردنەوەی ژینۆسایدو پۆلی تیساید دەکرێ:

١ ــ هیچ لێکۆڵینەوەیەکی رێک وپێک لە سەر ئەم رووداوانە نەکراوە.

٢ ــ سەبارەت بەوەش کە بۆچی ئەم رەوتە درەندانە بە درێژایی مێژوو و لە سیستەمە جیاوازەکاندا بەردوام دووپات دەبنەوە؛ لێکدانەوەیەکی گشتی تاقیکراوە لە ئارادانیە.

ئەو لێکۆڵینەوانەی تائێستا کراون لەسەر هۆکارو گۆڕاوە جیاوازەکان پێدادەگرن. لەراڤە و شیکردنەوە سیاسییەکاندا، ئاماژە بە نیشانە جیاوازەکانی رۆڵی دەوڵەت و ئامانجەکانی ئەو کەسانەی کەئەم کردەوانە ئەنجام دەدەن، دەکەن. بۆ وێنە پتەوبوونی دەسەڵاتی دەوڵەت لە دوای ئالووگۆڕە سیاسییەکان یان دژکردەوەی دەوڵەت لە بەرامبەر جیابیراندا. لێکدانەوە کولتوورییەکان ئاماژە بەو هەلومەرج و رەوشانە دەکەن کە نایەکسانیە لەمێژنیەکان بەرادەیەک قووڵ دەبنەوە کە گرووپێک بە کەلک وەرگرتن لە دەسەڵاتی دەوڵەتی یان پاوانکردنی ئەم دەسەڵاتە هەوڵی لادانی نەیارەکان دەدا. هێندێک لە توێژەرەکان رۆڵی ئایدۆلۆژی لەو سیستەمە پاوانخوازانەدا کە حاشا لە مافی تاقمێک دەکەن کە دەیانەوێ ژیانێکی بەرێزیان هەبێ، بە هۆکارێکی گرنگ دادەنێن. ئەوانەی دیکەیش بایەخ دەدەنە ململانێی ئابووری و فاکتەرە نێودەوڵەتیەکان. بەڵام بەبێ زانیارییەکی وردو رێک و پێک سەبارەت بە پانتایی ئەم رەوتانە، لانیکەم لە پانتایی سەدەی ٢٠ دا، ناتوانین گرنگی رێژەیی ئەم هەلومەرجانە هەڵ سەنگێنین یان تیۆری دڵنیاکەرو وەڵامدەر بەچەند گۆڕاوێک سەبارەت بەم دیاردەیە ئاراستە بکەین.

لایەنە جیاوازەکانی ژینۆساید و پۆلی تیساید لەگەڵ هەوڵە سەرکوتکەرە "ئاسایی" یەکاندا، روون نین. لە کاتی شەڕدا، کوشتنی شەڕکەرەکان شتێکی "ئاسایی"یە، لە حاڵێکدا کوشتاری هاوولاتیە مەدەنیەکان وا نیە.یەکێک لەو شتانەی کە لە بواری تیۆری و کردەییدا ژینۆسایدو پۆلی تیساید لێک جیا دەکاتەوە، لێرەدایە: ئەگەر هاوولاتیە مەدەنیەکان بەئەنقەست و بەشێوەی رێکخراو. بکوژرێن، هەرچەندە لایەنگریان لە گرووپێکی نەیاری دەوڵەتیش کردبێ، ئەمە نموونەیەکی ژینۆساید یان پۆلی تیسایدە. ژینۆساید یان پۆلی تیساید بریتیە لە هاندان یان جێبەجێکردنی

ئەو سیاسەتەنانەی کە دەولەتێک یان دەست و پێوەندەکانی ئەو دەولەتە دەیکەن کە دەبێتە هۆی نەمانی بەشێکی زۆر لە ئەندامانی گرووپێک. جیاوازی نێوان ژینۆسایدو پۆلی تیسایدو بە هۆی ئەو تایبەتمەندییانەوەیە کە دەولەت ئەو گرووپانە بە هۆی ئەو تایبەتمەندییانەوە دەناسێتەوە. لە ژینۆسایددا گرووپی قووربانیی لە بنەڕتدا بەپێی تایبەتمەندییە کۆمەلایەتیەکان، واتە رەگەز، ئایین و نەتەوە دەناسرێتەوە، لە حالێکدا لە پۆلی تیسایددا، هۆکاری سەرەکی پێکهێنەری ئەو گرووپە لە بنەڕەتدا بە هۆی پێگەی ئەو گرووپە لە هیرەمی کۆمەلایەتی یان بەهۆی دژایەتی سیاسی ئەو گرووپە لەگەڵ دەولەت و گرووپە زالەکان دایە.

### Cohditz کۆلدتیز

بەناوبانگترین بەندیخانەی دیلەکانی شەڕ لە ئەلمانیای نازی. قەلای کۆلدتیز لە سالی ١٠١٤ دا دروستکرا. لە سالی ١٨٠٠دا کردیان بە بەندیخانە و لە ١٨٢٨دا وەکوو شێتخانە کەلکیان لێوەرگرت. لە سالی ١٩٣٩دا ئەفسەرە دیلەکانی پۆلۆنیا و لە سالی ١٩٤٠دا، ئەفسەرە بەلجیکیەکانیان ناردە ئەوێ. کۆلدیتز، شوێنی حەوانەی دیلەکانی نەتەوە جیاوازەکان بوو کە لە ئۆردوگاکانی دیکە رایان کردبوو.

### Kemalism کەمالیزم

کەمالیزم بە ئایدۆلۆژی، بنەما و شێوازەکانی مستەفا کەمال پاشا، ناسراو بەئەتاتورک کە یەکەمین سەرک کۆمار و دامەزرێنەری تورکیای هاوچەرخ بوو، دەگوترا. ئەم بنەمایانە کە بناغە سەرەکیەکانی حیزبی گەلیی تورکیا پێک دەهێنن بریتین لە: کۆماریخوازی، ناسیۆنالیزم، چاکسازیخوازی، عەلمانیەت، جەماوەریکردنی کاروبارەکان و پێکهێنانی دەولەتێکی بەهێز. لە هەولەکانی ئەتاتوورک بۆ بەرۆژئاوایکردنی تورکیا دەتوانین ئاماژە بە نەهێشتنی حیجاب، هەلبژاردنی نازنامە، هەلبژاردنی رۆژژمێری زایینی و گۆڕینی رێنووسی عەرەبی بۆ لاتینی بکەن.

کەمالیزم لە راستیدا بۆ بەرۆژئاوایکردنی تورکیا دارێژرا بوو و کەمال پاشاش بۆخۆی بەچاکی هەستی پێدەکرد.

ئەتاتورک دەیویست بە هەولەکانی خۆی خەلکی تورکیا لەو بنەماو رێووشوێنانە کە بۆ ماوەیەکی زۆر پێیەوە بەسترابوونەوە، هەلبڕێ و بەرە شارستانیەتی رۆژئاوا هانیان بدا.

## کۆمۆنی سەرەتایی Primative Commune

لە قامووسی مارکسیەکاندا، کۆمۆنی سەرەتایی یان کۆمەڵگای هاوبەشی سەرەتایی، یەکەمین شێوازی بەرهەمهێنان لە سەرەتای سەرهەڵدانی مێژوودایە. بناغەی ئەم شێوازی بەرهەمهێنانە، خاوەندارێتی بەکۆمەڵی کۆمەڵەکان و گرووپە مرۆییەکان بەسەر ئامرازە زۆر سەرەتاییەکانی بەرهەمهێنان و کاری بەکۆمەڵ دا بوو. زەوی، ئامرازەکانی کار، خانوو و...هتد، موڵکی هاوبەشی بەکۆمەڵی هەموو تاکەکانی هۆزو عەشیرە و گرووپ بوو. بەرهەمهێنان بە شێوەی بەکۆمەڵ و بەهۆی ئامرازە سەرەتاییەکان جێبەجێ دەکرا.

## کۆمۆنی پاریس The Paris Commune

زاراوەیەکی مێژووی فەرەنسەیە کە بە حکومەتی ٧٢ رۆژەی شاری پاریس لە ساڵی ١٨٧١دا دەگوترێ. کۆمۆنی پاریس، بەرهەمی کۆمەڵێک رووداوی وەکوو شەڕی نێوان ئەڵمانیا و فەرەنسا بوو. لە دوای ئەوەی سوپای ناپلیۆنی سێهەم لە سەدان خۆی بەدەستەوەدا، ئیمپراتۆریای دووهەم رووخا. شۆڕشی جەماوەری ٤ی ئەیلوولی ١٨٧٠ گەیشتە ئاکام، بەڵام رێبەرە سیاسییەکان ئاراستەی دەستکەوتەکانیان بە قازانجی خۆیان گۆڕی. لە حاڵێکدا کە سوپای ئەڵمانیا لە پاریسدا بەرەو پێشەوە دەرۆیشت، دەوڵەتی خۆی ناونا " دەوڵەتی بەرگری نیشتمانی ". رۆژی ٢٢ی ئایار سەربازەکانی دەوڵەتی ڤێرسای بەرەو پاریس وەڕێکەوتن و خوێنڕێژی " حەوتووی ئایار" دەستی پێکرد. هێزەکانی دژەشۆڕش بەکەڵک وەرگرتن لە چەکوچۆڵی جیاواز، تۆڵەیان لە کۆمۆنارەکان (لایەنگرانی کۆمۆن) کردەوە. شەڕەکە لە رۆژی ٢٨ی ئایاری ١٨٧١دا، بە شکستی کۆمۆنی پاریس کۆتایی پێهات.

## کۆمۆنیزم Communism

لە ساڵی ١٨٤٠ەوە کە زاراوەی کۆمۆنیزم بۆ تەباو؛ کۆمۆنیزم، واتای جیاوازی هەبووە، کە بە شێوەیەکی کورت ئاماژەیان پێ دەکەین:

١ــ رێکخستن و هەوڵێکە بۆ وەدیهێنانی ئاواتەکانی هێندێک لە سۆسیالیستە یوتۆپیاییەکان. بە پێی بۆچوونی ئەمانە دەبێ هەموو سامان و داراییەکانی جیهان لە نێوان مرۆڤەکاندا بە شێوەی هاوبەشی بێ. هەموو کەسیک دەبێ کاربکا و بەپێی تواناییەکانی بەرهەم بێنێ و بەپێی

پێداویستیەکانیشی بەرکەوێ. ئەم ڕێچکەی سۆسیالیزم خاوەنداریێتی تایبەتی لەسەر ئامرازەکانی بەرهەمهێنان و شتومەکە بە کاربەریەکان قەدەغەدەکا.

٢_ به هێندێک جیاوازی لەگەڵ پێناسەی یەکەمدا؛ ڕێکخراوێکی کۆمەڵایەتیە بە میتۆدێکی زانستی و واقعبینانەتر کە مارکس لە بۆچوونەکانی خۆیدا باسی کردووە: " مێژووی مرۆڤ، خەباتی بەردەوامی کۆمەڵەکان بۆ باشترکردنی باری ژیانیانە، خەباتێک کە لە قۆناغی سەرمایەداریدا دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی خەباتی چینایەتی و لە ئاکامیشدا بە دیکتاتۆری پرۆلتاریا کۆتایی پێدێ".

لەم قۆناغەدا تاک بەرهەمی بایەخ پێدراوی کۆمەڵگایەکە کە توانایيەکانی لەوپەڕی خۆیاندا گەشەیان کردووە. هەرکام لە مرۆڤەکان بە شێوەی هاوسەنگ و ڕێک وپێک لە کۆمەڵگای خۆیاندا، سیمای کۆمەڵایەتی دەگرنە خۆ. لە بواری ئابوورییەوە، ئەم کۆمەڵگایە بە پێی ئەم یاسایە بەرێوە دەچێ: " هەموو کەسێک بە پێی توانایی و هەموو کەسێکیش بە قەد پێویستیەکانی".

٣_ ئەو شتانەی لەو دوو خاڵانەدا ئاماژەیان پێکرا؛ دەچنە خانەی مارکسیزمەوە، کە کۆمۆنیزم لە بواری تیۆرییەوە شی دەکەنەوە. بەڵام جگە لە تیۆری، ڕژێمگەلێکی دیار لە جیهانی ئەمرۆکەدا سەریان هەڵداوە ( وەکوو کۆمۆنیزمی سۆڤیەت، چین و دێموکراسیە جەماوەرییەکان) کە مارکسی ـ کۆمۆنیزمیان پێ دەگوترێ.

لە بواری سیاسییەوە ئەو کاتە کۆمۆنیزم دێتەدی کە دەوڵەت، وەکوو ئامرازێکی حکوومەتکردن بەسەر هەژار و بێبەشەکاندا لە ناو بچێ. لە ڕوانگەی ئابووریشەوە ئەو سیستەمانەی کە کۆمۆنیستین، لە ڕاستیدا سیستەم گەلێکی هاوبەشین ( ئامرازەکانی بەرهەمهێنان لە بەردەست دەوڵەت دان و خاوەنداریێتی تایبەتی لەم سیستەمەدا نیە). بەڵام ئەمە تەنیا بۆ کۆمونیست بوون تەواو نیە، لە بواری کۆمەڵایەتیەوە لەو وڵاتانەی کە کۆمۆنیزمن، لە کاتی ئیستادا کە بۆ خۆیان پێی دەڵێن قۆناغی سوسیالیزم ئەم یاسایە زاڵە. " هەموو کەسێک بە قەد تواناییەکەی و بۆ هەموو کەسێکیش بە قەد کارەکەی".

٤_ لە وڵاتە سەرمایەدارییەکان یان لە سیستەم لیبراڵەکاندا، زاراوەی کۆمۆنیزم بۆ نیشاندانی ئەو ڕەوتە ئایدولۆژی و ئەو هەوڵە ستراتیژییە تایبەتیانە کەڵکی لێوەرگیردرێ کە

خۆیان بە شوێنکەوتووی مارکس دادەنێن و پیڕەوی لە سیاسەتی ئەو سیستەمانە دەکەن کە کۆمۆنیزمیان پێدەگوترێ.

لە زۆربەی هەرەزۆر و نزیکە بە تەواوی وڵاتانی سەرمایەداری یان لیبراڵدا، حیزبە کۆمۆنیستیە شاراوە و ئاشکراکان خەریکی چالاکین. ئەم حیزبانە هەوڵی بەربلاّو دەدەن تا لە نارەزایەتی خەڵک کەڵک وەرگرن و بەکەڵک وەرگرتن لەم نارزایەتیانە، ویژدان و وشیاری چینایەتی خەڵک پەرە پێ بدەن و پەروەردەی بکەن. و لە ئاکامیشدا خەباتی چینایەتی قووڵ بکەنەوە و بوار بۆ شۆڕش پێک بێنن. بەسەرهەڵدانی شۆڕش و دیکتاتۆری پرۆلتاریا، کۆتایی بە تەمەنی سەرمایەداری دێ.

کۆمۆنیزم بە پێی ئەم دوو واتایەی دوایی، لە دوای شۆرشی ئۆکتۆبەر پێکهات. لنین هەڵوەشانەوەی ئەنتەرناسیۆنالی دووهەمی راگەیاند و ئەنتەرناسیۆنالی سێهەم یان کۆمۆنیزمی نێودەوڵەتی (کۆمینتێرن) پێکهێنا.

کۆمینتێرن و پاشانیش ستالین و ستالنیزم هەموو حیزبە کۆمۆنیستەکانی جیهانیان خستە ژێر کونترۆڵی توونددوتۆڵی خۆیانەوە. نە تەنیا هەر حیزبی بۆلشڤتیک، بە تەواوەتی یەکپارچە بوو، واتە تاقەتی هیچ رەخنە و دژایەتیەکی نەبوو، بەڵکوو هەموو حیزبە کۆمۆنیستەکانی جیهانیشی یەکپارچە کرد. هەموویان ناچار بوون ملکەچی کۆمنیتێرن بن. کۆمینتێرنیش کە ناوەندەکەی لە مۆسکۆدا بووە، پێڕەوی لە حیزبی بۆ لشڤیک دەکرد. لە دوای سەرهەڵدانی شۆرشی چین و یۆگسلاڤیا کە هەر دوو شۆرشەکە بە بێ بەشداری و خۆتێهەلقورتاندنی سوپای سوور سەریان گرتبوو و بە تایبەتی لە دوای کۆتایی سەردەمی ستالین، بارودۆخەکە گۆڕا و ئەو یەکپارچە بوونەی رابردوو لە جیهانی کۆمۆنیزم دا نەدەرەخساوە.

ئیستاکە شێوەی جیاوازی کۆمۆنیزمی سەربەخۆ سەریان هەڵداوە و بە تایبەتی ناکۆکیە ئایدۆلۆژی و سیاسییەکانی نێوان سۆڤیەت وچین، ئەو دەرفەتەی خستە بەردەم حیزبە کۆمونیستیەکانی دیکە کە بەبێ هەستکردن بە ترس لە هەڵگەرانەوەبوونی سیاسی، بروایان بە سەربەخۆیی خۆیان هەبوو. لە دوای کۆمۆنیزمی جۆری یۆگسلاڤیا و چین و سۆڤیەتیش، کۆمۆنیزمی جۆری پۆلۆنیا و هەنگاریا و کووباش سەریان هەڵدا.

کۆمۆنیزم لە هێندێک لە وڵاتانەی کە سۆڤیەتیش یەکێک لەم وڵاتانە بوو، لایەنی شۆڕشگێڕی خۆی لە دەستدا. بە تایبەتی هاوسەنگی ترس لە شەڕی ناوەکی، سۆڤیەت و ڕۆژئاوای لە یەکتر نزیک خستەوە و پێشی بە هەموو پێکدادانێک دەگرت کەدەبووە ئەگەری هەڵایسانی شەڕی ناوەکی.

### کۆمۆنیزمی نهێنی / خزۆک — Crypto – Commnnist

بە لایەنگر یان بە ئەندامێکی بزووتنەوەی کۆمۆنیستی دەڵێن کە بیروبۆچوونەکانی خۆی لە خەڵکی دیکە دەشارێتەوە.

### کۆمۆنیزمی شەڕ — War Communism

ئەم زاراوە بە یەکێک لە سێ قۆناغە بنەڕەتیەکەی مێژووی سۆڤیەت لە نێوان ساڵەکانی ١٩١٧ تا ١٩٢٢دا دەگوترێ کە لەم قۆناغەدا بنەما تیۆرییەکانی کۆمۆنیزم بە شێوەی تایبەتی جێبەجێ دەکران. واتە خاوەندارێتی تایبەتی هەڵ دەوەشایەوە. کەڵک وەرگرتنی هاوبەش بەسەرکەرتی کشتوکاڵدا دەسەپا. هەموو بەرهەمە کشتوکاڵی و پیشەسازییەکان کۆ دەکرانەوە و لە نێوان بەکاربەرەکان بە پێی پێداویستیەکانیان، بێ لەبەرچاوگرتنی کارەکەیان، دابەش دەکرا. بازاڕی میکانیزمی نرخەکان و دراو لە ناودەچوو و تەنانەت پێشنیاری ئەوەش کرا کە " یەکەیەکی کار" جێگەی دراو بگرێتەوە.

ئەگەرچی ئاکام و دەرئەنجامی ئەم هەوڵانە؛ سەر کەوتنێک بۆ سوپای سوور بوو، بەڵام بۆ ئابووری سۆڤیەت کارەسات بوو. چوونکە نێوەنجی بەرهەم هێنانی دانەوێڵە کە لە نێوان ساڵەکانی ١٩٠٩ تا ١٩١٣ نزیکەی ٧٧ میلیۆن تەن بوو، لە دەیەی ١٩١٣ تا ١٩٢٣ بۆ ٤٩١٩ میلیۆن تەن دابەزی. ڕێژەی بەرهەمهێنانی پیشەسازی بە هۆی ئەم سیاسەتە، ١٨٠ پلە دەگەڕێتەوە بۆ دواوە. لنین، ڕێبەری شۆڕشی سۆڤیەت ئەم ڕاستییەی نەشاردەوە ورایگەیاند کە: " زیان و خەسارەکان ئەوەندە زۆرن کە ناتوانین بە جارێک پیشەسازی گەورەی دەوڵەتی و سۆسیالیستی دامەزرێنین. ئەم ڕەوتە بە واتای دامەزرانەوەی سەرمایەدارییە و بۆ جووتیارەکانیش بە واتای چاوپۆشی کردن لە جێگیر بوونی ئازادی بازرگانی و دەسەڵاتی سەربەستانەی بەرهەمی زیادەیە ".

دەوڵەت هەوڵ دەدا تا لە ڕێگای داهێنانی تایبەتی و دنەدانی بەرژەوەندی تاکە کەسی؛ هۆگری بەبەرهەم هێنان پێکبێنێ. خاوەنداریتی تایبەتی، پیشەسازی چکۆلە و مامناوەند، دامەزراوە تایبەتیەکانی بواری کشتوکاڵیش جارێکی تر بیووژێنەوە. بازرگانی و کارو کاسبی تایبەتی ئازاد بکرێن، بازاڕ کە شوێنی بەیەک گەیشتنی داواو ئاراستە ( عرض و طلب ) بۆ دیاریکردنی نرخە، جارێکی تر بێتە کایەوە. لە ئاکامدا بەرهەم دەچێتە سەرەوە. لە ساڵی ١٩٢٦دا، بەرهەم گەیشتەوە ئاستی ساڵی ١٩١٣، بەلاّم سیستەمی هاوبەشی خستە مەترسیەوە.

قۆناغی سێهەم:قۆناغی بەرنامەی پێنج ساڵەیە (١٩٢٨)، بەرنامە پێنج ساڵەکان لە ١٩٢٨دا، گەڕانەوە بۆ بنەما سەرەتاییەکانی ( ئۆرتۆدۆکس) بوو، بەلاّم جێبەجێکردنی بەرنامەکان بە پێی پێداویستیەکانی سەردەم، بایەخیان پێدەدرا.

## *کۆمۆنیزمی زانستی* Scientific Communism

ئەم زاراوە لە ساڵی ١٩٦٢دا، لە لایەن میخائیل سوسلۆف، تیۆری دارێژی بەناوبانگی سۆڤیەت لە کۆنگرەیەکی گەورەی ئایدۆلۆژیدا هاتە گۆڕێ. بە پێی بۆچوونی کۆمۆنیستەکان: " کۆمۆنیزمی زانستی بریتیە لە، زانستی خەباتی چینایەتی چینی کرێکار و شۆڕش سۆسیالیستی و یاسایی بوونی کۆمەلاّیەتی و سیاسی بینای سۆسیالیزم و کۆمۆنیزم. کۆمۆنیزمی زانستی، باس لەزانستی پەڕینەوە لە سەرمایەداری بۆ سۆسیالیزم لە ئاستێکی جیهانی و پێکهاتنی کۆمەڵگایەکی کۆمۆنیستی دەکا کە "سۆسیالیزم"، یەکەمین قۆناغەکەیەتی". کەواتە ڕوانگەی " کۆمۆنیزمی زانستی " بەرهەمی ئەو ئایدۆلۆژیەیە کە بە مەتریالیزمی دیالکتیک دەست پێدەکا و پاشان " مەتریالیزمی مێژوویی" و " ئابووری سیاسی" بە دوا دادێ.

### *کۆمۆنیزم، جەمسەرەکانی*

جەمسەرەکانی کۆمۆنیزم لە جیهاندا بریتین لە :

١ــ کۆمۆنیزمی سۆڤیەت کە کەرەملینیزمیشی پێ دەڵێن و ناوەندەکەی مۆسکۆ؛ پایتەختی یەکیەتی سۆڤیەتە.

٢ــ مائۆئیزم یان کۆمۆنیزمی چینی ( کۆمونیزمی مائۆستەدۆن، ڕێبەری چین)

٣_ كاسترۆیزم (كۆمۆنیزمی تایبەتی داهێنراوی فیدێل كاسترۆ)

٤_ تیتۆئیزم (كۆمۆنیزمی مارشال تیتۆ، ڕێبەری یۆگسلاڤیا)

٥_ كۆمۆنیزمی ریفۆرمیزم ( كە زۆربەی حیزبە كۆمونیستیەكانی ئەوروپای رۆژئاوا روویان تێكرد).

## *National Communism* كۆمۆنیزمی نەتەوەیی

ئەم زاراوە بەرێبازی ئەو كۆمۆنیستانە دەگوترێ كە لەگەڵ سۆڤیەت یان لەگەڵ جەمسەرەكانی دیكەی كۆمۆنیستی لە جیهاندا، جیاوازیان هەیە و پێیانوایە كە دەسەڵات لە نەتەوەوە سەرچاوە دەگرێ. ئەم زاراوە هاو واتای تیتۆئیزمە كە بۆ یەكەمجار لە دوای جیابوونەوەی تیتۆ، ڕێبەری یۆگسلاڤیا لە ساڵی (١٩٤٨) هاتە ئاراوە، بەڵام لە دواییدا واتایەكی بەربلاوتری گرتەوە.

## كۆمیتەی كۆتایی كۆلۆنیالیزم
## *The Special Committee [Of ٢٤] On Decolonization*

لە ٢٤ ی ئەیلوولی ١٩٦٠دا، كۆمەڵەی گشتی نەتەوەیەكگرتووەكان، ڕاگەیەنراوی بەخشینی سەربەخۆیی بەو وڵاتانە و خەڵكی ژێردەسەڵاتی كۆلۆنیالیزمی ( ڕاگەیەنراوی كۆتایی كۆلۆنیالیزم) لە سەر پێشنیاری ٤٣ وڵاتی ئەفریقی و ئاسیایی بە ٩٠ دەنگی ئەرێ و ٩٩ دەنگی بێلایەن و بێ هیچ دەنگێكی نەیار پەسند كرد. لەم ڕاگەیەنراوەدا كۆمەڵەی گشتی ڕایگەیاند كە: ژێردەستەبوون، چەوسانەوە، یان بەستراوەبوونی خەڵكێك لە لایەن حكومەتێكی بیانیەوە، پێشێلی بنەماكانی پێرەوپرۆگرامی نەتەوە یەكگرتووەكان و ئازادی ومافە بنەڕەتیەكانە و كۆسپێك لە بەردەم پەرەپێدانی ئاشتی و هاوكاری نێودەوڵەتیە. بۆ لەناوبردنی ئەم رەوشە، كۆمەڵەی گشتی خوازیاری " كۆتاییهێنانی خێرا و بێ شەرت و مەرجی هەموو شێوەكانی كۆلۆنیالیزم و سەربە خۆیی دەستبەجێی هەموو وڵاتە ناخودموختارەكان، چ وڵاتانی ژێرسەرپەرەستیاری، كۆلۆنیەكان و چ ئەو هەرێمانەی دیكەش كە لە مافی خودموختاری بێبەشن "، بوو.

ماددەی پێنجی ڕاگەیەنراوی بەخشینی سەربەخۆیی بە وڵاتەکان و خەڵکی ژێردەسەڵاتی کۆلۆنیالیزم، دیاری کردووە کە بۆ ئەسپاردنی دەسەڵات بە خەڵکی وڵاتانی ژێرسەرپەرستیاری و ناخودموختارو هەموو ئەو وڵاتانەی کە ئیستاکەش نەگەیشتوونەتە سەربەخۆیی، بە بێ هیچ کۆت و بەندێک و بە پێی حەزو ویستی ئازادنەی خۆیان دەبێ هەوڵی خێرابدەن تا بتوانن بە سەربەخۆیی و ئازادی تەواوەتی بگەن.

هەروەها ئەم ڕاگەیەنراوە کە لە سەر ئەم خاڵەش پێیدا دەگرت کە نەبوونی ئامادەیی سیاسی، ئابووری، کۆمەڵایەتی یان کولتووری نابێ ببێتە بیانوویەک بۆ وەدواخستنی سەر بەخۆیی ئەم وڵاتانە.

### کۆمیسیۆنی برانت (۱۹۷۷) Brandt Commission

ئەم کۆمیسیۆنە لە تشرینی دووهەمی ساڵی ۱۹۷۷ لە ژنێڤدا پێکهات و لە ڕێکەوتی ۹ی کانوونی یەکەمی هەمان ساڵدا، بۆ لێکدانەوەی گیروگرفتەکان لە چوارچێوەی " کۆمیسیۆنی سەربەخۆی لێکدانەوەی مەسەلەکانی گەشە کردن و پەرەسەندنی جیهان" و ئاراستە کردنی چارەسەری شیاو و بەربەرەکانی لەگەڵ هەژاریدا، دەستی بەکارەکانی خۆی کرد. پێشنیاری پێکهێنانی ئەم کۆمیسیۆنە لە لایەن ڕۆبێرت مەک نامارا، وەزیری پیشووی بەرگری ئەمریکا و سەرۆکی بانکی جیهانی " هاتە گۆڕ ( ۱۵ کانوونی دووهەمی ۱۹۷۷) و لە ڕێکەوتی ۲۸ی ئەیلوولدا ڤیلی برانت، ڕاوێژکاری ئەڵمانیای ڕۆژئاوا ئامادەیی خۆی بۆ وەگەڕخستنی ئەم گەلاڵە دەربڕی. کۆمیسیۆن لە شوباتی ساڵی ۱۹۸۰دا، ڕاپۆرتی سەرەکیی خۆی لە ژێر ناوی "باکوور ـــ باشوور : گەلاڵەیەک بۆ مانەوە" و ڕاپۆرتی تەواو کەری خۆی پاش سێ ساڵی تر بلاوکردەوە. ئەم ڕاپۆرتە بە " ڕاپۆرتەکانی برانت"یش بە ناوبانگە.

### کۆمیسیۆنی نێودەوڵەتیی لێکۆڵینەوە
### *International Commission Of Investigation*

کەڵک وەرگرتن لە کۆمیسیۆنی لێکۆڵینەوە، یەکێک لە ڕێگاکانی ئاشتیانەی چارەسەری کێشەی نێودەوڵەتیەکانە. ئەم ڕێگا چارە بریتیە لەوەی کە لەکاتی سەرهەڵدانی کێشەیەکدا، کێشەکە

دەسپێرنە چەند کۆمیسێرێکی تایبەتی لێکۆڵینەوە. ئەرکی ئەم چەند کۆمیسێرە" دیاریکردنی نێوەرۆک و چۆنێتی کێشە" کەیە و بە هیچ شێوەیەک مافی ئەوەیان نیە سەبارەت بە بەرپرسیارەتی کەسەکان لە کێشەکەدا هیچ شتێک بڵێن. چونکە ئەگەر راپۆرتە کە بە شێوەی عەینی و راست ئامادە کرابێ، بەرپرسیارەتی هەرکەسێک بۆ خۆی دەردەکەوێ. تەنیا وڵاتانی پێوەندیدار مافی ئەوەیان هەیە لەو راپۆرتەدا دەرئەنجام وەرگرن و کێشەکە لە نێوان خۆیاندا بە شێوەی راستەوخۆ چارەسەربکەن یان ئەوەی بینرێنە لای نێوبژیوانێک کە چارەسەری کێشەکە بکا.

ئەم شێوە بەرهەمی کۆنفرانسەکانی ئاشتی لاهەیە. ماددەکانی نۆ تا سی و شەشی رێککەوتننامەی ژمارەیەکی ١٨ی تشرینی یەکەمی ١٩٠٧ سەبارەت بەم حاڵەتەیە. بە پێی سیستەمی لاهە کەڵک وەرگرتن لە کۆمیسیۆنی نێودەوڵەتیی بەم رێسایانەوە بەستراوەتەوە:

**الف_** ئەرکی ئەم کۆمیسیونە دیاریکردنی چۆنیەتی روودانی کێشە کەیە.

**ب_** لایەنەکان لە جێبەجێکردن یا جێبەجێ نەکردنی ئەم شێوەدا سەربەستن.

**ج_** ئەم کۆمیسیۆنە بە گرێدانی رێککەوتننامەیەکی تایبەتی دادەمەزرێ.

**د_** لایەنەکان لە راپۆرتی کۆمیسیوندا سەربەستن و هەر چونێک کە پێیان باش بوو، جێ بەجێی دەکەن.

## Palme Commission

## *کۆمیسیۆنی پاڵمە*

رێکخراوێکی سەربەخۆیە بۆ لێکۆڵینەوەی چەک داماڵین و ئاسایش بە سەرۆکایەتیی ئولاف پاڵمە، سەرۆک وەزیری سوید که هەتا کۆچی دوایی لە ساڵی(١٩٨٥)دا، سەرۆکایەتی ئەم کۆمیسیۆنەی لە ئەستۆدا بوو. ئەم کۆمیسیۆنە راپۆرتی سەرەکی خۆی لە ژێر ناوی " ئاسایشی گشتی: پلانێک بۆ مانەوە" لە ساڵی ١٩٨٢دا، بڵاو کردەوە و بەراپۆرتێکی کورت لە ژێر ناوی " جیهانێک لە ئاشتیدا: ئاسایشی گشتی لە سەدەی بیست و یەکەم"دا (لە ساڵی ١٩٨٩) کۆتایی بەکاری خۆی هێنا.

ئەم راپۆرتانە پێشنیارگەلێکی پتەو رێک و پێکیان سەبارەت بە " پێکهێنانی ناوچەیەکی بێ چەکی ناوەکی " لە ئەورووپای ناوەڕاستدا لە خۆ گرتبوو. ئەم پێشنیارانە زۆر بە پارێزەوە

داڕێژرابوون و دەربڕی مەبەست و ئامانجی لایەنە ناکۆکەکان لەسەر" جێگربوونی ئاشتی دوولایەن"ەیە.

کۆمیسیۆنی پاڵمە بە هۆی پارێزگار بوونیەوە، لە لایەن باڵە رادیکالەکانەوە کەوتۆتە بەر رەخنە.

### کۆنترۆڵی چەک و چۆڵەکان *Arms Control*

پرۆسەیەکە کە ئامانجەکەی دانانی کۆمەڵێک یاسایە بۆ کەڵک وەرگرتنی بەجێ لە چەک و چۆڵەکان. لە حاڵێکدا کە ئامانجی چەک داماڵین گەیشتن بە رێگای ئاشتیانە بە هۆی لە ناوبردنی چەک و چۆڵەکانە. کۆنترۆڵی چەک و چۆڵەکان بە ستراتیژیی جۆراجۆر و گرێدانی رێککەوتننامەی جیاواز جێبەجێ دەبێ وەکوو:

١ـ کەمکردنەوەی رێژەو و جۆری ئەو چەک و چۆڵانەی لە شەڕدا کەڵکیان لێ وەردەگیردرێ.

٢ـ کەمکردنەوەی رێژەی توانایی لێکدانی چەک و چۆڵەکان بە هۆی کەمکردنەوەی ژمارەی جبەخانەکان.

٣ـ کەمکردنەوەی رێژەی چەک و چۆڵەکان.

٤ـ قەدەغەکردنی کەڵک وەرگرتن لەو تەکنەلۆژیایەی کە رەنگە کاریگەرییەکی نێگەتیڤیان لە سەرهاوسەنگی هێزەکان هەبێ.

٥ـ پەرەپێدانی چارەسەرییە دڵنیاکەرەوەکان.

رێککەوتننامەی کۆنترۆڵی چەک و چۆڵەکان دەبێتە هۆی پەرەنەگرتنی بڕێک لە چەک و چۆڵەکان و سیستەمەکانیان و کۆسپ و لەمپەر لە بەردەم بەرهەمهێنان و کەڵک وەرگرتن لەم چەک و چۆڵانە دادەنێ کە رەنگە ببنە هۆی زۆرتربوونی ئەگەری شەڕ. لە ساڵی ١٩٤٥ەوە، هێندێک لە رێککەوتننامەکانی کۆنترۆڵی چەک و چۆڵەکان، زیاترلایەنی پەرەنەگرتنی چەکە ناوەکی، کیمیایی وبایۆلۆجیەکان، مەسەلەکانی پێوەندیدار بە سێستەمی مووشەکە دژە بالیستیکیەکان و کەمکردنەوەی تاقیکاریە ناوەکیەکانی لەخۆ گرتووە. هێندێک لە گرنگترین رێککەوتننامە کانی کۆنترۆڵی چەک وچۆڵەکان بریتین لە:

- پرۆتۆكۆلی ١٩٢٥ ی ژنێف سەبارەت بە کەڵک وەرنەگرتن لە گازە ژەهراوییەکان و چەکە باکتریۆلۆجیەکان
- رێککەوتنی ١٩٥٩ی جەمسەری بەستەڵەکی باشوور، سەبارەت بە دامەزراندنی بنکە سەربازییەکان لەم ناوچەدا.
- کۆمیسیۆنی ١٩٧٢ی چەکە بایۆلۆجیەکان سەبارەت بە بەرهەم نەهێنان و خاوەنداریێتی چەکە بایۆلۆجیەکان
- رێککەوتنی ١٩٦٨ پەرەپێنەدانی چەکە ناوەکیەکان (NPT).
- وتووێژەکانی کەمکردنەوەی چەکە ستراتیژییەکان، ناسراو بە سالتی ـ١ (SALT.1) ١٩٧٢.
- رێککەوتنی ١٩٨٩ی کەمکردنەوەی هێزە ئاساییەکان لە ئەورووپادا (CAFÉ)
- وتووێژەکانی کەمکردنەوەی چەکە ستراتیژییەکان (٢ـ١٩٩١) ناسراو بە ستارتی ـ١ (START)
- کۆنڤانسیۆنی ١٩٩٣ ی چەکە کیمیاییەکان (CWC) کە خوازیاری فەوتاندنی کۆگای پاراستنی چەکە کیمیاییەکانی ئەو دەوڵەتانەیە کە ماوەی یەک دەیەیە ئەم کۆنڤانسیۆنەیان مۆر کردووە.

یەکێک لە و ئاستەنگانەی کە لەبەردەم کۆنترۆڵی چەک و چۆڵەکان دایە؛ مەسەلەی هەڵە نەکردنی تاقیکردنەوەکانی (verification) پرۆسەی کۆنترۆڵە کە سەرەڕای بوونی سەتەلایتە زۆر پێشکەوتووەکان، ناتوانرێ بڕوا بە جموجۆڵی دەوڵەتەکان بهێنرێ. ئەگەرچی ویلایەتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا، بۆخۆی یەکێک لەو دەوڵەتانەیە کە ئەم کۆنڤانسیۆنەی مۆر کردووە. بەڵام بڕێکی زۆر چەک و چۆڵی کیمیایی بەرهەم هێناوە و لە کۆگاکاندا دەپارێزێ. لە لایەکی دیکەوە سەپاندنی گەمارۆی دیپلۆماتیک و ئابووری تەنیا پاڵەپەستۆ دەخاتە سەر وڵاتەبێ هێزو لاوازەکان و لەسەر ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، چین و رووسیا کاریگەری نابێ. ئەورەخنەی هاتۆتە سەر رێککەوتنی ١٩٦٨ی پەرەپێ نەدانی چەکە ناوەکیەکان ئەوەیە کە ئەم رێککەوتننامە تەنیا وەکوو" شمشێری دامۆکلێس" بۆ وڵاتانی جیهانی سێهەم وایە و زیاتر پەرە بە هەژموونی دەسەڵاتە گەورەکان دەدا تائەوەی کێشە نێودەوڵەتیەکان کەم بکاتەوە.

## کۆنسێرتی ئەورووپی Europcan Concert

کۆنسێرتی ئەورووپی لە پێنج دەسەڵاتی گەورەی دیراکتۆری (هەڵبژاردە) ئەورووپا پێکهاتبوو کە لە ساڵی ١٨٥٦ دا ساردنیش بووە ئەندامی ئەم کۆنسێرتە. کۆنسێرتی ئەورووپی لە سەردەمی سەربەخۆیی بەلجیکا لە ساڵی ١٨٣٠دا پێکهات و تا شەڕی یەکەمی جیهانیشی خایاند. بەپێی ئەو کۆنفرانسانەی کە پێوەندییان بە کۆنسێرتی ئەورووپییەوە هەبوو، وڵاتە گەورەکان ئەورووپا بوونە خاوەن مافی بڕیاردان سەبارەت بە چارەنووسی وڵاتانی دیکە، بێ ئەوەی نوێنەری ئەم وڵاتانە لەو کۆنفرانسانەدا بەشداربن. ئامانجی کۆنسێرتی ئەورووپی، راوێژی هاوبەش سەبارەت بە هێندێک مەسەلە و پاراستنی هاوسەنگی لە ئەورووپا بە تایبەتی بەسەرنجدان بە بارودۆخی ئیمپراتۆریای عوسمانی بوو. بەگشتی ئەم بیرۆکەیە زاڵ بوو کە دەسەڵاتە گەورەکان بۆ هەوڵی هاوشێوە لە بابەت ئەورووپادا، لە پێناوی دابینکردنی ئاسایش و هێنمایەتی بەردەوامی ئەورووپا، بەرژەوەندی هاوبەشیان هەیە. سەرەڕای ئەمە کاتێک لە نێوان خۆیاندا، کێشەیەک سەری هەڵدەدا؛ کۆنسێرتی ئەورووپی هیچ دەورێکی نەبوو و هەرئەمەش بوو بە هۆی سەرهەڵدانی شەڕ لە ساڵەکانی ١٨٧٠ و ١٩٤٠ دا.

## کۆنسێرتی لایف ـ ٨ Live -٨

بەگەورەترین رووداوی موزیک و تەلەفیزیۆنی مێژووی مرۆڤ دەگوترێ کە بە ئامانجی ناچارکردنی سەرۆکانی وڵاتە پیشەسازییەکانی رۆژئاوا لە کۆبوونەوەکانی گرووپی ٨ ( سکۆتلەند ـ ٦ی تەمموزی ٢٠٠٥) بۆ یارمەتیدانی خەڵکی ئەفریقیا، لە پایتەختی وڵاتە گەورەکانی جیهاندا ( بەرلین، پاریس، تۆکیۆ، رۆما، فیلادلفیا، باری لە کانادا، لەندەن، مۆسکۆ، ژۆهاسنبۆرگ) بەرێوەچوو (٢ی تەمموزی ٢٠٠٥). پەیامی کۆبوونەوەی لایفی ـ ٨ ئەوە بوو:

"خێرمان پێ مەکەن، ئیمە بەدوای دادپەروەری و یەکسانیدا دەگەڕێین؛ هەژاری بە مێژوو بسپێرن و بۆ خۆتان مێژوو ساز بکەن".

ڕێکخەری ئەم هەوڵە، سێربۆب گوڵدۆف؛ گۆرانیبێژی بەناوبانگی ئایرلەندا بوو کە لە ساڵی ١٩٨٥ شدا ڕێوورەسمێکی بەو شێوەی بەناوی Live Aid بەڕێوە بردبوو. داواکارییەکانی ئەم بزووتنەوەیە کە بە زمانی موزیک دەدوا بریتی بوون لە :

١_ هەڵوەشانەوەی تەواوەتیی قەرزی وڵاتانی ئەفریقیا

٢_ دووهێندەکردنی یارمەتی وڵاتانی دەوڵەمەند بۆ ئەفەریقیا

٣_ پەسندکردنی یاسای بازرگانی دادپەروەرانە لە ئەفریقیادا.

## Consul

## *کۆنسول*

زاراوەیەکی لاتینیە و لە بنەڕەتدا بە واتای هاوبەش (شەریک)ە.

کۆنسوڵ ناوی یەکێک لە دوو حاکمەکەی ڕۆما لە دوای ڕووخانی پاشایەتی لە ساڵی ٥٠٩دا بوو کە بۆ ماوەی ساڵێک هەڵدەبژێردران، بەو مەرجەی زۆرێنەی دەنگەکانیان مسۆگەر کردبا، هەموو دەسەڵاتی بەڕێوەبەری و سەربازیان جێبەجێ دەکرد و دەشیان توانی پەسندکراوەکانی سەنای ڕۆما ڤیتۆ بکەن. لە سەدەکانی ناوەراستدا، لە فەڕەنسادا بە دادوەرە هەڵبژێردراوەکانی هێندێک لە شارەکانی باشووری ئەم وڵاتە دەگوترا. هەروەها لە ساڵی هەشتەمی شۆڕشی فەڕەنسا تا کاتی دامەزرانی ئیمپراتۆریا (١٨٠٤_ ١٧٩٩) بەو سێ کەسانە دەگوترا کە دەسەڵاتی بەڕێوەبەریی وڵاتیان لە ئەستۆدابوو و ناپلیۆن بوناپارت کۆنسولی یەکەم بوو.

بەڵام لە سەدەی ١٩ بەملاوە؛ کۆنسول واتایەکی نوێی پەیدا کردووە. بە پێی ئەم واتا نوێیە، کۆنسول بە چینێک لە ڕاسپێردراوەکانی دەوڵەت دەگوترێ کە لە وڵاتێکی بیانیدا، ئەرکی پاراستن و پشتیوانیکردن لە بەرژەوەندییەکانی هاوڵاتیانی وڵاتی خۆیان و هەروەها گواستنەوەی زانیاری بازرگانی و سیاسیان بۆ وڵاتی خۆیان لە ئەستۆ دایە.

سەرەتای دامەزرانی کۆنسول دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئیمپراتۆریای ڕۆما. لەو کاتەوە بەرەبەرە کۆمەڵێک ڕێسا بۆ مافی بیانیەکان دیاریکراون کە بوونە بنەمای هێندێک لە یاسا نێودەوڵەتیەکانی تایبەتیەکانی سەردەمی ئێستا. بازرگانی و ئاڵوگۆر لە نێوان هێندێک لە شارە خودموختارەکاندا دەبووە هۆی ئەوەی کە هەمیشە هێندێک کەس لە شارێکە و بۆ شارێکی دیکە بەمەبەستی سات و سەودا لە هات و چۆدابن کە ئەمانە لەو شارانەدا بێگانە بوون. پاشان لە نێوان

هێندێک لە شارو وڵاتەکانی ئەو کاتدا سات و سەودای بازرگانی پەرەی گرت (کەزیاتر لە دەریاوە دەکرا) کە ئەمە بوو بە هۆی زۆربوونی ڕێژەی بیانیەکان و کەرەسە بیانیەکان لە بەندەرەکان و پێکهاتنی گیرو گرفت و کۆسپ لەبەردەم کارو بەرژەوەندی بیانیەکاندا. بەم هۆیە ئەم بێگانانە بۆ پاراستنی ماف و بەرژەوەندیەکانیان لە دەوری یەکتر کۆدەبوونەوە و لە هەرگەڕەکێکدا کەسێکی بەتوانایان لە ناو خۆیاندا (هاوڵاتی خۆیان ) هەڵدەبژارد کە کێشەو گیروگرفتەکانیان چارەسەر بکا.

ئەمە بوو بە بنەماو بناغەی کۆنسولی لە کاتی ئێستادا، و چوونکە لە سەرەتادا لە شارەکان و بەندەرەکانی ئیتالیادا سەریهەڵدا و بە نوێنەری هەڵبژێراوی وڵاتێکی بیانیان دەگووت کۆنسول.

هێندێکی دیکە دامەزرانی کۆنسول دەگەڕێننەوە بۆ سەردەمی یۆنانی کۆن. بەو جیاوازییەی کە ئەو کەسەی کە بۆ پشتیوانی و پاراستنی هاوڵاتیانی بیانی دیاری دەکرا، لەناو خەڵکی وڵاتی خانە خوێدا هەڵدەبژاێردراو بەو کەسەش کە هەڵدەبژێردرا: " پرۆکزنۆس"یان پێ دەگووت. کە واتە ئەگەر تەنیا لە ڕوانگەی بەڕێوبردنی ئەرکەوە چاو لەم بابەتە بکەین، دەتوانین دامەزرانی کۆنسولی بگەڕێنینەوە بۆ یۆنانی کۆن. بەڵام ئەگەر لە ڕوانگەی چۆنیەتی کەسایەتی کۆنسول و هاووڵاتی بوون و ئەرکەکانەوە سەیری کۆنسول بکەین، ڕەنگە مێژووەکەی لە سەدەکانی ناوەڕاست بەولاوەتر نەڕوا. جیاوازی بنەڕەتیی نێوان کۆنسولی ئیتالی و یۆنانی ئەوەیە کە لە یۆناندا ئەو کەسەی کە پشتیوانی لە بیانیەکان دەکرد، هاووڵاتی ئەوان نەبوو و وەکوو ڕاسپێردراوێکی ئەو وڵاتە بۆ چاوەدێریکردن بەسەر بارودۆخی بیانیەکاندا کاری دەکرد. بەڵام لە ئیتالیادا کۆنسول هاووڵاتی بیانیەکان بوو کە پشتیوانی لێدەکرا.

دامەزرانی کۆنسولی لە سەدەکانی ناوەڕاست بەملاوە، ئاڵوگۆڕی بە سەرداهات کە ئاکامی گۆڕانکاری لە پێوەندییە نێودەوڵەتیەکاندا بوو. دەسەڵاتی پاشاکانی ئەورووپا و ویستی ئەوان بۆ سەپاندنی کەسایەتی خۆیان و هەروەها سەرهەڵدانی چەمکی نوێی دەوڵەت و دەسەڵاتدارەیتی بوونە هۆی ئەوەی کە دەوڵەتەکان زیاتر لە جاران بەرژەوەندی بازرگانی هاووڵاتیەکانیان، بە بەرژەوەندی خۆیان بزانن و هەوڵی زیاتر بۆ پشتیوانی کردنیان بدەن. لەلایەکی دیکەوە دەوڵەتەکان بۆ پاراستن و پەرەپێدانی دەسەڵاتداریتی خۆیان، زۆرتر لە جاران جموجۆڵی بیانیەکان بخەنە ژێر چاوەدێرییەوە یان بەرتەسکی بکەنەوە. ئەم دوو ئاراستە ناکۆکە ـــ کە دەوڵەتەکانی لە بەرامبەر یەکتردا ڕادەوەستاند ـــ بوونە هۆی ئەوەی کە دامەزراوەی کۆنسولی لە حاڵەتی تایبەتی و ئازاد

بێتەدەر و ببێتە دامەزراوەیەکی دەوڵەتی. جگە لەمە هات و چۆی بازرگانەکان بۆ وڵاتانی دیکە زۆرتر دەبوو و بە تایبەتی پەرەگرتنی دەریاوانی و بوونی و پاپۆرە بیانیەکان لە بەندەرەکاندا، کێشەی زۆری بۆ هاووڵاتیە بیانیەکان و شتومەک و هەروەها سات و سەوداکانیان لەگەڵ هاووڵاتیانی نێوخۆیی کە لە لایەن یاسا نێوخۆییەکانی ئەو وڵاتەوە پشتیوانیان لێدەکرا، پێکدێنا.

ڕەنگە بەریتانیا کە خاوەنی گەورەترین سیستەمی گواستنەوەی دەریایی سەرەتای سەدەی نۆزدەهەم بوو، ژمارەیەکی زۆر لە هاووڵاتیەکانی لە بەندەرە جیاوازەکانی ئەورووپا بوون و بڕێکی زۆر لە کەرەسەکانی ئەم وڵاتە لە شوێنە جیاوازەکان ئاڵوگۆڕیان پێدەکرا، یەکەم وڵات بووبێ کەرسەرەتا لە ڤێنیز و پاشان لە شارەکانی دیکەدا ڕاسپێردراوی دەوڵەتی دامەزراند. ئەم ڕاسپێردراوە دەبوایە لە لایەن دەوڵەتی بەرامبەر تەئیید بکرایە، هەتا بەتەنگ داواکارییەکانەوە هاتایە و لەوڕێکەوتەوە دامەزراوەی کۆنسولی بوو بە ئەرکیکی دەوڵەتیی، بەڵام ئەو کۆنسولەی کە دیاری دەکرا، یەکێک لە بازرگانەکان یان هاووڵاتیەکی بەریتانی نیشتەجێی ئەو شوێنە بوو.

ئاڵوگۆڕێکی دیکەش بەسەر دامەزراوەی کۆنسولی داهات کە ئاکامی پەرەگرتنی بازرگانی و زۆربوونی سەردانی هاووڵاتیانی وڵاتێک بۆ وڵاتێکی دیکە بە هۆی پێشکەوتنی تەکنیکی و پەرەسەندنی ئامرازەکانی گواستنەوە بوو. پەرەگرتنی بەرژەوەندی بازرگانی وڵاتەکان بوو بە هۆی زۆرتربوونی گیروگرفت کە ئاکامەکەی، زۆرتروبوونی ڕێژەی هاووڵاتیان لە دەرەوەی وڵاتەکانی خۆیاندابوو. هەر لەبەر ئەوە، بۆ نەهێشتنەوی کێشە جیاوازەکان ، گرووپێکی تایبەتی لە ڕاسپێردراوە حکومەتیەکان بۆ بەرێوبردنی کاروباری کۆنسولی ڕاهێنران کە ئەرکی ئەمانە لەگەڵ ڕاسپێردراوە سیاسییەکانی ئەو وڵاتەدا جیاوازی هەبوو.

چوونکە پێوەندییە دیپلۆماسیەکان، پێوەندیان بە کاروباری نێوان دەوڵەتەکان هەیە و پێوەندییە کۆنسولیەکان، پێوەندییان بە هاووڵاتیانەوە هەیە، پێوەندییە کۆنسولیەکان درەنگتر چوونە ژێر باری یاساورێساکانی هاوبەشی نێوان دەوڵەتەکان. بەو پێیەی کە ئەم یاسا و ڕێسایانە ئاکامی لێک تێگەیشتنی نێوان دەوڵەتەکان نین، بەڵکوو ئاکامی ڕێککەوتنی ڕاشکاوانەی دەوڵەتەکانن، دەبوایە بە پێچەوانەی پێوەندییە دیپلۆماسیەکان لە ڕێککەوتننامە دوولایەنەکاندا، وردەکارییەکان دیاری بکرانایە. هەر لە بەر ئەمەش بوو کاتێک کە ڕێسای پێوەندییەکۆنسولیەکان لە ڕێککەوتننامەیەکی گشتیدا دارێژرا، لەو کۆمەڵە یاسایانە کەڵک وەرگیردرا کە لە ڕێککەوتننامە

دوو لایەنە جیاوازەکاندا کەڵکیان لێ وەرگیرابوو. ئەرکەکانی کۆنسول لە ماددەی ٥ی ڕێککەوتننامەی ١٩٦٣ ی ڤیەننادا بە تێروتەسەلی باسکراوە.

## کۆنسولخانە Consulate

کۆنسولخانە لە پێش بالویزخانەدا پێکهاتووە و ئامانج لە دامەزرانی کۆنسولخانە، بەڕێوەبردنی کاوبارەکان و پاراستنی بەرژەوەندییە ئابوورییەکانی ولاتان لە دەوڵەتە بیانیەکان دایە. سەبارەت بە سەرچاوەی کۆنسولخانە بیروڕای جیاواز هەن:

هێندێک پێیانوایە کە سەرچاوەی کونسولخانەکان" پرۆکزنۆس"، کانن. لە یۆنانی کۆندا وا باو بوو کە هەر وڵاتێک یەکێک لە هاولاتیانی خۆی دەناردە وڵاتێکی بیانی تا لە بەرژەوەندییەکانی هاولاتیانی نیشتەجێی خۆی لە وولاتەدا پشتیوانی بکا. بەم راسپێردراوەیان دەگووت: پرۆکزنۆس Proxenns. وشەی Proxenns لە پێشگیری PROبە واتای " پێش " و Xenos بە واتای " میوان "پێکهاتووە . لە لێکوڵینەوەی باری ئەم کۆنسولانەدا وا دەردەکەوێ کە هێندێک جار ئەرکی کۆنسول بە شێوەیەکی دەگمەن لە لایەن یەکێک لە هاوولاتیانی ولاتانی خانەخوێوە جێبەجێ دەکرێ. واتە ئەگەرچی ئەم کەسە خەڵکی ولاتی خانەخویە، کەلەم حالەتەدا پێی دەڵێن " کۆنسولی بازرگانی ". بەڵام دەبێ ئەومان لە بیر نەچێ کە ئەمە حالەتێکی دەگمەنە و کۆنسولە راستەقینەکان ئەو کەسانە بوون کە لە لایەن ولاتی خۆیانەوە بەمەستی پاراستنی ماف و بەرژەوەندییەکانی خۆیان دەنێردرانە ولاتە بیانیەکان. هێندێکی دیکە لە لێکۆلەرەوەکان پێیانوایە سەرچاوەی کۆنسولخانەکانی ئەمرۆکە "کۆنسولی دەریا" یان " کۆنسولەکانی سەر دەریا"ی سەدەکانی ١٢یان ١٣ بوون. کۆنسولەکانی دەریا ئەرکێکی تایبەتیان لە بەندرەکاندا سەبارەت بە پاپۆرەکان هەبووە کە لە کاتی گەشتی سەردەریادا پارێزگاری لە سامانی بازرگانەکان بکەن. لە پێوەندییە نێودەوڵەتیەکاندا ئەمرۆکە کۆنسولەکان بەم شێوەیە دابەش کراون:

١ــ سەرۆک کۆنسول

٢ــ کۆنسول

٣ــ جێگری کۆنسول

٤ــ نوێنەری کۆنسول

دیاریکردنی پلە کۆنسولیەکان لە شوێنە جیاوازەکاندا بەو بایەخ و گرنگیەوە بەستراوەتەوە کە ئەو دەوڵەتەی کە کۆنسولەکەی ناردووە، بۆ کۆنسولە نەگۆڕەکانی خۆی دایدەنێ. سەرۆک کۆنسولەکان بۆ ناوەندە پیشەسازی و ئابوورییە گەورە و بەندەرە گرنگەکان دیاری دەکرێن. نوێنەرە کۆنسولیەکان لە شار و بەندەرە چکۆلەکان و لە و شوێنانەی کە بازنەی تێکۆشانی کۆنسولی زۆر بەربڵاو نیە، خەریکی بەرێوبردنی ئەرک دەبن. بەرێوەبەرییە کۆنسولخانەکان بە پێی گرنگی سەرۆکەکانیان، سەرۆکی کۆنسولخانە، کۆنسولخانە، جێگری کۆنسول و نوێنەرایەتیی کۆنسولخانە ( ئاژانسی کۆنسولخانە)یان پێ دەگوترێ.

## Confederation

### *کۆنفیدراسیون*

کۆنفیدرارسیۆن، یەکیەتیەکی رەسمیە لە نێوان ئەو دەوڵەتانەی کە پێوەندییەکی لاوازیان لەگەڵ یەکتردا هەیە. بە پێی رێککەوتنێک کە زیاتر بە هۆی ئەم رێککەوتنەوە؛ کۆڵەکەیەکی دەسەڵاتی ناوەندی کە خاوەنی دەسەڵاتی دیاریکراو لە کاروباری دەوڵەتانی ئەندام دایە، پێکدێ، بەڵام بە شێوەی راستەخۆ بە سەریاندا حکومەت ناکا. لە کۆنفیدراسیۆنێکدا دەوڵەتە بەشدارەکان دەسەڵاتی سەربەخۆیان هەیە و دەتوانن لەم یەکیەتیەش جیا ببنەوە. لە نێوان وڵاتی فیدراڵ و کۆنفیدراسیۆندا جیاوازی هەیە. وڵاتی فیدراڵ بابەتێکی یەکگرتووی یاسا نێودەوڵەتیەکانە کە بە شێوەی راستەوخۆ ئۆتۆریتەی خۆی بەسەر هاووڵاتیانی ناو یەکەکانی خۆیدا دەسەپێنێ. لە سەردەمی ئیستادا، ژمارەیەکی کەم کۆنفیدراسیۆنی راستەقینە لە ئارادان. ئەگەرچی لە زاراوەناسی (تەرمینولۆژیای) فەڕەنسی، ئیتالی ولاتیندا، خەڵکی سویسرا، هەروا بە سیستەمی خۆیان دەڵێن کۆنفیدارسیۆن کە لەساڵی ١٨٤٨دامەزراوە. بەڵام سەرەڕای ئەمەش سویسرا هەر وڵاتێکی فیدراڵە.

سویسرا تا پێش ساڵی ١٨٤٨، لە نێوان ساڵەکانی (١٧٩٨ ـ ١٢٩١) و (١٨٤٨ ـ ١٨١٥)دا کۆنفیدراسیۆن بوو. بە پێی پێرەوپرۆگرامی کۆنفیدراسیۆن، ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکاش لە ساڵی ١٧٨١ تا ١٧٨٩ کۆنفیدراسیۆنێکی پێکدێنا. ئەو کۆنفیدراسیۆنەی کە کۆماری ئەمەریکای پێ دەگوترا( هێندوراس، نیکاراگواو سان سالڤادۆر) لە ساڵی ١٨٩٥ تا ١٨٩٨ لە ئارادا بوو. کاتێک کە لە ساڵی ١٩٨١دا گامبیاو سێنێگال کۆنفیدراسیۆنی سینە ــ گامبیایان پێکهێنا، بە شێوەی رەسمی کۆنفیدراسیۆنێک پێکهات. یەکیەتیی نێوان لیبیاو مەراکیش کە بەپێی

ڕێککەوتننامەی نێوان ئەو دوو وڵاتە پێکهات و لە ساڵی ١٩٨٦دا، مەراکیش خۆی لە کێشایەوە لە کردەوەدا کۆنفیدراسیۆنێکی لاواز بوو کە زۆر لەو شەش یەکیەتیەی پێشووی لیبیا دەچوو کەلەگەڵ هێندێک لە وڵاتانی عەرەبیدا پێکی هێنابوو. هەموو ئەو یەکیەتیانەی کە لیبیا تێیاندا بەشدار بوو لە دوای ماوەیەکی کورت هەڵوەشانەوە.

### کۆنفرانس — *Conference*

ئەم زاراوە ئەم واتایانە لە خۆ دەگرێ:

١ــ بە کۆبوونەوەی نێوان نوێنەرانی سیاسی دوو یان چەند دەوڵەتێک دەگوترێ کە هەرکامیان دەسەڵاتی تەواویان هەیە، بەمەبەستی دۆزینەوەی چارەسەری و گەیشتن بە دەرئەنجامێک لە بوارێک یا چەند بوارێکی سیاسی نێودەوڵەتیدا. چارەسەرییەکان و دەرئەنجامە وەرگیراوەکان دەبێ لە بەڵگەنامەیەکی سیاسیدا دابڕێژرێن. وەکوو کۆنفرانسی ئاشتی شەڕی یەکەمی جیهانیی. بابەتی ئەم کۆنفرانسە ڕەنگە ڕێکخستنی مەسەلە سیاسییەکان یان مەسەلە تەکنیکی و بەڕێوەبەرییەکان، یان مەسەلە یاساییەکان بێ. (وەکوو کۆنفرانسی نەیارانی کۆیلەداری برۆکسێل لە ١٨٩٠دا). لەم حاڵەتەدا، کۆنفرانس لە باری یاساییەوە لەگەڵ کۆنگرەدا جیاوازی نیە. لەم حاڵەتەدا جیاوازی نێوان کۆنفرانس و کۆنگرە تەنیا بە هۆی ژمارەی زۆری بەشداران و ڕێورەسمی تایبەتی کۆنگرەیە، کە کۆنفرانس ئەم حاڵەتەی نیە.

٢ــ بە کۆبوونەوەی وەزیری دەرەوەی وڵاتێک لەگەڵ نوێنەرانی سیاسی بیانی دەگوترێ، کە لە وڵاتی ئەودا خەریکی بەڕێوەبردنی ئەرکن، بۆ تاوتوێکردنی شتێک یان بابەتێک، وەکوو کۆنفرانسی لەندەن سەبارەت بە بەلجیکا ١٨٣٩ ــ ١٨٠٣.

٣ــ بە کۆبوونەوەی نوێنەری دەوڵەتەکان دەگوترێ کە دەسەڵاتی مۆرکردنی ڕێککەوتننامەیان نیە و تەنیا بەرپرسیاری توێژینەوەیەکی دیار و دارشتنی گەڵاڵەیەکن و دەبێ ئاکامی هەوڵەکانیان لە لایەن دەوڵەتەکانیانەوە تاقی بکرێنەوە: وەکوو کۆنفرانسی یاسای نێودەوڵەتیی تایبەتی لاهە.

٤ــ بە کۆبوونەوەی شارەزایان و پسپۆڕانی هەڵبژێردراوی دوویان چەند دەوڵەتێک یان ڕێکخراوێکی نێودەوڵەتی دەگوترێ کە ڕاسپێردراون، لێکۆڵینەوەیەک ئاراستە بکەن و ڕاپۆرتی ( ڕەنگە پێشنیاری ) پێویستیش ئامادە بکەن.

٥ـ له چەمكەكانی ئیستادا بەرێكخراوی راوێژكاری رێكخراوێكی نێودەوڵەتیی دەگوترێ كە له یاساو رێووشوێنەكانی ئەم رێكخراوەدا، پێكهاتە، شێوە، ئەرک و تواناییەكانی له بەرچاو گیراون. وەكوو كۆنفرانسی نێودەوڵەتیی كار و كۆنفرانسی گشتی یۆنسكۆ.

٦ـ به كۆبوونەوەی نوێنەرانی رێكخراوە تایبەتیەكان دەگوترێ كه نوێنەری دەوڵەتەكان بەردەوام لەم كۆبوونەوانەدا بەشداری دەكەن: وەكوو مانگی سوور، جاری وایە بەم كۆبوونەوەش دەگوترێ، كۆنفرانسی نێودەوڵەتیی، بەڵام ئەم خوێندنەوە له دەرەوەی چەمكە نێودەوڵەتیە گشتیەكان دایە.

واتاكانی دیكەی كۆنفرانس (له دەرەوەی بازنەی چەمكە نێودەوڵەتیەكان) بریتین له:

١ـ وتوویژو باسكردنی بەرپرسە نارەسمیەكان، بەرپرسە پایەبەرزەكانی دەوڵەت و نوێنەرانی خاوەنداره بەرژەوەندیيە تایبەتیەكان له بواره گرنگەكاندا. ئەم باس و ووتوویژانە زۆربەی جارەكان دەبنە هۆی سەرەتایەک بۆ رێكخستنی كۆنفرانسێكی نێودەوڵەتیی ( كۆنگرە).

٢ـ به واتای كۆبوونەوە به مەبەستی راوێژكردن (سمینار) سەبارەت به بابەتە زانستی یان تەكنیكیەكانە، وەكوو سمیناری خوێندكارێک له بواری شوێنەوارناسی، ماف، ئەدەب، پزیشكی و ...هتد. جیاوازی كۆنفرانس لەم حاڵەتەدا لەگەل دواندەریدا ئەوەیە كە دواندەر هەوڵدەدا بیسەری قسەكانی خۆی به قەناعەت بگەیەنێ. ئەمە ئەركی دواندەرە. بەڵام ئەو كەسەی سیمینار پێشكەش دەكا تەنیا توێژینەوەی خۆی دەخاتە بەردەم بیسەران و بەتەماش نیە كە قەناعەت به بیسەرانی قسەكانی بێنێ. بەڵكوو به لۆژیک و به بەڵگە، توێژینەوەی خۆی ئاراستە دەكا.

## كۆنفرانسی "٤+٢" Conference "٢+٤"

به كۆبوونەوەی یەک رۆژەی وەزیرانی دەرەوەی ئەمەریكا، سۆڤیەت، فەرەنسا و بەریتانیا لەگەلْ وەزیرانی ئەڵمانیای رۆژهەلاّت و رۆژئاوادا دەگوترێ كه له رێكەوتی ٥ی ئایاری ١٩٩٠ له بۆندا بەرێوە چوو. لەم كۆنفرانسەدا مەسەلەی رێكخستنەوەی دوو ئەڵمانەكان و به تایبەتی بارودۆخی سیاسی و سەربازی ئەم وڵاتە خرایە بەرباس وراوێژەوە. سەرەكی ترین بابەتی ئەو

کۆنفرانسە مەسەلەی ئەندامەیتی یان ئەندام نەبوونی ئەڵمانیای یەکگرتوو لە ڕێککەوتننامەی ناتۆ یان ئەندامەتیی ئەم وڵاتە لە هەر دوو ڕێککەوتننامەی ڤەرشۆ و ناتۆدا بوو. هۆی سەرەکی دژایەتیی سۆڤیەت لەگەڵ ئەندامەتیی ئەڵمانیای یەکگرتوو لە ناتۆدا ئەوە بوو کە ئەم وڵاتە ئەندام بوونی ئەڵمانیای یەکگرتووی لە ڕێککەوتننامەیەکی سەربازیدا بە هەڕەشەیەک بۆ سەقامگرتوویی ئەوروپا دادەنا. لە لایەکی دیکەشەوە ئەمریکا پێیوابوو کە لەسەر ئەوەی کە ئەڵمان ببێتە ئەندامی ناتو یان نا، دەبێ لەم پێوەندییەدا، وڵاتانی ڕۆژئاواوە بڕیاری لە سەربدەن .

### *کۆنفرانسی ئاڵمائاتا (کانوونی یەکەمی ١٩٩١)*

### *Alma –Ata Conference*

ئەم کۆنفرانسە کە لە ٢١ی کانوونی یەکەمی ١٩٩١ لە ئاڵمائاتا، ناوەندی قەزاقستانی یەکیەتیی سۆڤیەت و بە بەشداری دوازدە کۆماری یەکیەتیی سۆڤیەت پێکهات، کۆتایی تەمەنی سۆڤیەتی ڕاگەیاند و بناغەی ڕێکخستنێکی نوێی بە ناوی "وڵاتانی سەربەخۆی هاوبەژەوەند" دارشت. بڕیارنامەی ئەم کۆنفرانسە لە لایەن هەموو کۆمارەکانی سۆڤیەت جگە لە گورجستان مۆر کرا، کۆمارە بەشدارەکانی ئەم کۆنفرانسە بریتی بوون لە:

ئازەربایجان، ئەرمەنستان، ئوزبەکستان، ئۆکراینا، تاجیکستان، تورکەمەنستان، ڕووسیا، بیلارۆس، قەزاقستان، قرقیزستان، گورجستان و مولداڤیا.

### *کۆنفرانسی ئەلجەزایر(١٩٠٦)* *Algerian Conference*

بە کۆبوونەوەی دەوڵەتانی ئەورووپا لە نێوان مانگەکانی کانوونی یەکەم تا ئازاری ١٩٠٦ دەگوترێ کە لەو کۆنفرانسەدا لەسەر یەکپارچەیی مەراکیش و هەروەها مافی هەموو دەوڵەتەکان بۆ کەڵک وەرگرتنی بێ کۆت و بەند لە بازرگانی پێداگری کرا. ئەم کۆنفرانسە ڕێگای بە ئیسپانیا و فەڕەنسادا هەتا بۆ کونترۆلکردنی ناوچەکانی ژێر نفووزی خۆیان لە هێزی سەربازی کەڵک وەرگرن.

### کۆنفرانسی ئاسایش و هاوکاری لە ئاسیادا
### *Conference for Security And Cooperation In Asia (CSCA)*

ڕێکخراوێکی هاوشێوەی " ڕێکخراوی ئاسایش و هاوکاری ئەورووپا"یە کە لە پێناو پاراستنی ئاشتی و سەقامگرتوویی لە ئاسیادا پێکهاتووە. لە دوای کۆبوونەوەی سەرۆک کۆمارەکانی ئێران، تورکیاو ولآتانی ئاسیای ناوەڕاست لە عیشق ئابادا (۱۹۹۲) لە سەر پێویستی پێکهێنانی چارەسەری نوێ لە بواری ئاسایشدا، سەرۆک کۆماری قەزاقستان پێشنیارێکی سەبارەت بە پێکهێنانی کۆنفرانسێکی ئاسایش و هاوکاری لە ئاسیادا هێنایە گۆڕێ. ئامانجی ئەم ڕێکخراوە بریتین لە :

۱ـ مسۆگەرکردنی ئاسایش و سەقامگرتوویی لە ناوچەکەدا بەپێی سنوورە ناسراوەکانی ئێستا.

۲ـ هەنگاونان بۆ دامەزران و پەرەپێدانی هاوکاریە ئابوورییەکان لە نێوان ولآتانی ناوچەکەدا.

۳ـ دیاریکردن و کەڵک وەرگرتن لە پێوەرە ئەخلاقیەکان و پێکهاتە یەکسانەکانی هەلسووکەوتە سیاسی و کۆمەلآیەتیەکان. کۆنفرانس خاوەنی سێ کۆمەڵە ڕێککەوتن و ڕێککەوتننامەیە؛ تۆڕی ئاسایش، تۆڕی ئابووری و ڕێککەوتننامە مرۆییەکان.

### کۆنفرانسی ئاسایش و هاوکاری لە ئەورووپادا
### *Conference On Security And Cooperation In Earope (CSCE)*

یەکیەتیەکە کە لە ٥٣ ولآت پێکهاتووە و بناغەکەی لە دوای بلآو کردنەوەو مۆرکردنی "ڕاگەیەنراوی هێلسینکی" دامەزرا. ئامانجی ئەم "کۆنفرانس"ە لە " ڕاگەیەنراوی پاریس"دا کە لە ڕێکەوتی ۲۱ی تشرینی دووهەمی ۱۹۹۰وە لەلایەن ئەندامەکانیەوە مۆرکرا، بریتین لە :

١ـــچارەسەرکردنی ئاشتیانەی کێشەکان

٢ـــ ڕێزدانان بۆ بەها دیموکراتیەکان، مافە مرۆیی و ئازادییە بنەڕەتیەکان.

وەزیرانی دەرەوەی ئەم ڕێکخستنە هەموو ساڵێک لەگەڵ یەکتر دادەنیشن. بەپێی پێرەوپرۆگرام، ئەم دامەزراوانە بۆ بەرەپێش بردنی هەرچی باشتری ئەم ڕێکخراوە پێکهاتوون:

١ـــ سکرتاریای کۆنفرانسی ئاسایش و هاوکاری ئەورووپا کە ناوەندەکەی لە پراگ دایە .

٢ـــ " ناوەندی پێشگیری لە شەڕ کە ناوەندەکەی لە ڤیەننایە.

٣ـــ " نووسینگەی هەڵبژاردنی ئازاد" لە ڤەرشۆ (پۆلۆنیا).

*ئەندامانی ئەم ڕێکخستنە بریتین لە:*

ئەڵبانیا، ئەرمەنستان، نەمسا، ئازەربایجان، بەلجیکا، بۆسنەهیرزەگۆڤین، بەریتانیا، بولگاریا، بیلارۆس، کانادا، کرۆڤاتیا، قیبرێس، چیک، دانیمارک، ستونیا، فینلەندا، فەڕەنسا، ئێشتاین، لتیڤانیا، لۆکزامبۆرگ، مالت، مۆلداڤیا، مۆناکۆ، هۆڵەندا، نەرویج، پۆلۆنیا، پورتوگاڵ، ڕۆمانیا، فیدراسیۆنی رووسیا، سەنمارنیۆ، سلۆڤانیا، ئیسپانیا، سوید، سویسرا، تاجیکستان، تورکیا، تورکەمەنستان، ئۆکراینا، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، ئوزبەکەستان، ڤاتیکان، یۆگسلاڤیا (سەربستان و مونتینەگرۆ) و یۆنان.

لە کۆبوونەوەی بوداپێستدا (٥و٦ی کانوونی یەکەمی ١٩٩٤) ناوی ئەم ڕێکخستنە گۆڕا بۆ " ڕێکخراوی ئاسایش و هاوکاری لە ئەورووپا"دا.

## *کۆنفرانسی نێودەوڵەتیی دابینکردنی کار*

## ***International Conference Of Eployment***

کۆنفرانسی نێودەوڵەتی دابینکردنی کار بەدەسپێشخەری ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان لە ٤ تا ١٧ی حوزیرانی ١٩٧٦ لە ژنێڤدا بە ڕێوەچوو. لەم کۆنفرانسەدا ١٣٠٠ پسپۆڕ لە لایەن دەوڵەتەکان، کرێکارانی یەکیەتیە کرێکارییەکان و خاوەن کارانی ١٢١ ی وڵاتی جیهان لەسەر بانگهێشتی ڕێکخراوی نێودەوڵەتیی کار (کە لە دامەزراوە پرۆفیشناڵەکانی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووکانە) بەشدار بوون.

ئامانجی سەرەکیی کۆنفرانس، تاوتوێ کردن و ئاراستەکردنی ڕێگاچارەی شیاو سەبارەت بە چۆنیەتی پەرەپێدانی ئاستی کاری راستەقینە لە شارەکان بەسەرنجدان بە کێشە جیاوازەکانی شارەکان و گوندەکان و پلانەکانی پەرەپێدان بوو. ئەم کۆنفرانسە لە راستیدا سەرەتایەک بوو بۆ تێکۆشانی شێلگیرانەی نێودەوڵەتی، لە پێناوی نەهێشتنی ڕێژەی بێکاری لە جیهاندا. بەڕای زۆربەی شارەزایانی نێودەوڵەتی، ئەگەر کێشەی بێکاری لە ناونەچێ، ڕۆژبەرۆژ مەترسیدارتر دەبێ. کۆرت ڤالدهایم لە پەیامێکدا کە لە لایەن سکرتێری نووسینگەی کاری ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ژنێڤدا خوێندراوە، ئاماژەی بەم خاڵە کرد کە: "ئەگەرچی کێشەی سەرەکی ئێمە پاراستنی ئاشتی نێودەوڵەتیە، بەڵام بە هیچ شێوەیەک ناتوانین حاشا لەوە نەکەین کە زاڵبوون بە سەر هەژاریدا، گرنگیەتی هاوشێوەی ئاشتی نێودەوڵەتیی هەیە. دەبێ گۆڕانکاری پێوەندییە ئابوورییەکان لە ڕێگای چاکسازی کۆمەڵایەتیی و ئابووری وڵاتانی لە حاڵی پەرەگرتندا و بە هۆی شێوازە نوێکانی بەرەنگاریکردن لەگەڵ بێکاریدا بە هێز بکرێن".

کۆنفرانسی نێودەوڵەتیی دابینکردنی کار لەسەر ئەوە پێدادەگرێ کە زۆربوونی ڕێژەی کاری بەرهەمهێن، هۆکارێکی کاریگەرە بۆ دابینکردنی پێداویستیە بنەرەتیەکانی مرۆڤ وەکوو، خۆراک، خانوو، خزمەتگوزاری کۆمەڵایەتیی. کۆنفرانس خوازیاری هاوکاری نێودەوڵەتیی لە پێناوی وەدیهێنانی ئەم ئامانجانەیە و پشتیوانی لە هەوڵەکانی کۆمەڵەی گشتی UN بۆ چاکسازی لە سیستەمی بازرگانی و ئابووری جیهان لە پێناوی بەرژەوەندی وڵاتانی لە حاڵی پەرەسەندن و نزیک بوونەوە بە سیستەمێکی نوێی ئابووری نێودەوڵەتیدا کرد. هەروەها ئەو پێشنیارەش هاتە گۆڕ کە بەشێک لە بوودجەی تەرخانکراوی سندووقی یەک میلیارد دۆلاری پەرەپێدانی کشتووکاڵ، بۆ دابینکردنی کار لە گوندەکان کە شوێنی نیشتەجێ بوونی زۆربەی هەرە زۆری حەشیمەتی هەژاری جیهانە، تەرخان بکرێ. بەگشتی ئەو بابەتە بنەرەتیانەی کە لە کۆنفرانسدا دێنە گۆڕ ئەمانەن: هەڵبژاردن و گواستنەوەی تەکنەلۆجیا، کێشەی کۆچ و کێشەی هەلومەرجی نوێی کار و خۆگونجاندنی کرێکاران لەگەڵ هەلومەرجی نوێدا.

### *کۆنفرانسی نێودەوڵەتیی یاسای دەریاکان*

## *International Conference On Low Of The Sea.*

دەریاکان ئامرازی گواستنەوە، سەرچاوەی خۆراک، خەزێنەی گەورەی سەرچاوەکان و جیهانێکی پڕ لە ژیانی دەریایین. زۆربوونی دانیشتوان و چوونەسەری ئاستی ژیان، رادەی داواکاری خۆراک، وزە و سەرچاوەکانی دیکەی بە شێوەیەکی بێ وێنە زۆرتر کردووە. مرۆڤ بە کەڵک وەرگرتن لە پێشکەوتنی زانست و تەکنەلۆجیا رووی لە سەرچاوە دەوڵەمەندەکانی دەریاکان کردەووە. بەڵام دەریاکان سنوورێکی دیاریکراویان نیە. ئایا دەریاکان مافی هەموو نەتەوەکانن یان هیی هیچیان ؟ دەسەڵاتدارەتیی نەتەوەیی بە سەر دەریاکاندا تا کوێیە؟ هەر وڵاتێک تا چ مەودایەک دەتوانێ لە دەریاکان بۆ کەڵک وەرگرتنی خۆی تەرخان بکا؟ هاتوچۆی پاپۆڕە بازرگانی و شەڕکەرەکان بە چ یاسایەک دەبەسترێنەوە؟ پێداویستی ئەو وڵاتانەی کە رێگای دەریاییان نیە، بەچ شێوەیەک دابین دەبێ؟ ئەگەر تەنیا وڵاتانی پیشکەوتوو، خاوەنی تەکنەلۆجیا و سەرمایەی پێویست بۆ کەڵک وەرگرتنی بنکی ئاوەکانن، وڵاتانی لە حاڵی پەرەسەندندا چۆن دەتوانن ببنە هاوبەشی داهاتەکانی دەریاکان؟ راوەماسی و توێژینەوە زانستیەکان لە ناو دەریاکاندا دەبێ بەچ شێوەیەک بێ؟

ئەو پرسیارانەی کە هاتنە گۆڕێ، بەشێک لە کیشەی دەریاکانن کە هەر ئێستاکە وڵاتانی جیهان لەگەڵ ئەم کێشانەدا بەرەوڕوون. رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بە پێی پێڕەوپرۆگرامی خۆی، وەکوو ناوەندێک بۆ رێکخستنی کێشەکان، رۆڵێکی سەرەکی لە پەرەپێدان و پتەوبوونی یاسا دارشتن و چارەسەرکردنی کێشەکاندا گێراوە. هەوڵەکانی کۆمیسیۆنی یاسای نێودەوڵەتیی رێکخراوی UN، بۆتە هۆی پێکهێنانی چەند کۆنفرانس سەبارەت بە یاسای دەریاکان. یەکەمین کۆنفرانسی یاسا دەریاکان لە ساڵی ١٩٥٨دا (ژنێڤ) بەرێوەچوو و چوار کۆنڤانسیۆنی سەبارەت بە ئاوی لێوارەکان، دەریا ئازادەکان، راوەماسی و پاراستنی بوونەوەرەکانی ناو دەریا و قەلپەزەکان پەسند کرد. بەڵام لەم کۆنفرانسەدا زۆر کێشە بە چارەسەرنەکراوی مانەوە، کە کۆنفرانسی دووهەمی یاسای دەریاکانیش لە ساڵی١٩٦٠دا نەیتوانی چارەسەریان بکا. پەرەگرتنی خێرای تەکنەلۆجیا، سەربەخۆیی وەرگرتنی نەتەوە جیاوازکان و بایەخ دانی زیاتری وڵاتان بەگرنگی و

بایەخی ئابووری سەرچاوەکانی لێواری دەریا وقەڵپەزەکان، قووڵایی دەریاکان بوون بە هۆی ئەوەی
کە لە ساڵەکانی دواتردا بیرۆکەی پێکهێنانی کۆنفرانسێکی دیکە بێتە گۆڕێ. لە ساڵی ١٩٧٠دا،
کۆمەڵەی گشتی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بەرێوەچوونی سێهەمین کۆنفرانسی یاسای
دەریاکانی پەسند کرد. کۆنفرانسی سیهەمی دەریاکان لە راستیدا کومیتەی بواری دەریا بوو کە لە
ساڵی ١٩٦٧دا لە لایەن کۆمەڵەی گشتی UN بەمەبەستی مەسەلە قووڵایی دەریاکان لەو دیوی
دەسەڵاتی نێوخۆی ولاتەکان بەسەر قەڵپەزەکان و لەسەر دوای دوکتۆر پاردۆ، بالوێزی مالت،
پێکهات.

کۆنفرانسی ١٩٥٨ی یاسای دەریاکان یاسایەکی تایبەتی بۆ سیستەمی یاسایی بواری
دەریاکان دیاری نەکردبوو. چوونکە لەو کاتەدا سەرچاوەزۆرەکانی بنکی دەریاکان نەدۆززرابوونەوە
و لە هەمان کاتدا زانیاری تەکنیکی بۆ کەڵک وەرگرتن لە سەرچاوەکانی ناو قووڵایی دەریاکان
گەشەیان نەکردبوو. پیشنیاری دوکتور پاردۆ و خواستی زۆربەی ولاتەکانیش ئەوە بوو کە بواری
دەریاکان "میراق هاوبەشی مرۆڤایەت" ین. وەدیهینانی ئەم شتەش پێویستی بە دیاریکردنی رادەی
دەسەڵاتی نێوخۆیی ولاتەکان لە دەریاکان و پێدا چوونەوە بەسەر هێندێک لە ماددەکانی ١٩٥٨
سەبارەت بە قەڵپەزەکان و دەریای ئازاد هەبوو. بەشداری ولاتە تازەدامەزراوەکان و هەروەها
نیگەرانیی ولاتانی جیهان سەبارەت بە راوەماسی و پیس بوونی دەریاکان کە هیچیان لە رێگای یاسا
نێوخۆییەکانەوە چارەسەر نەدەکران، پێویستی گۆرانکاری زیاتری لەم بوارەدا، زۆرتر کرد. یەکەمین
کۆبوونەوەی کۆنفرانسی سێهەمی یاسای دەریاکان لە ساڵی ١٩٧٣دا پێکهات و لەئاکامدا لە
ساڵی ١٩٨٢دا کۆنڤانسیۆنی نوێ ئامادەکرا و، لە ١٠ی کانوونی دووهەم بۆ مۆرکردن ئاراستەی
ولاتان کرا.

## *کۆنفرانسی پوستدام (١٩٤٥)* — ***Potsdam Conference***

ئەم کۆنفرانسە لە رێکەوتی ١٧ ی تەمووز تا رێکەوتی ٢ی ئابی ١٩٤٥ بە بەشداری
ولاتانی سەرکەوتووی شەڕی دووهەمی جیهانی ( ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، بەریتانیا و
سۆڤیەت) و بە مەبەستی وەدیهێنانی بڕیارەکانی کۆنفرانسی یالتا پێکهات. کۆنفرانسی پوستدام

ئەڵمانیای بەسەر چوار ناوچەدا دابەش کرد و هەرکام لە وڵاتانی ئەمەریکا، سۆڤیەت، بەریتانیا و فەرەنسا بەشێکیان بۆ خۆیان داگیر کرد.

### *کۆنفرانسی تاران (١٩٤٣)* — *Tehran Conference*

ئەم کۆنفرانسە بە بەشداری سەرۆکی سێ وڵاتی ئەمریکا، سۆڤیەت، بەریتانیا لە تاران پێکهات (یەکەمی کانوونی ١٩٤٣) و لە کۆتاییدا، راگەیەنراوێک سەبارەت بە پاراستنی سەربەخۆیی، سەروەری و یەکپارچەیی وڵاتی ئێران بڵاو کرایەوە.

### *کۆنفرانسی جیهانی دژی ئاپارتاید*
### *International Conference Againat Apartheid*

ئەم کۆنفرانسە لە ٢٢ تا ٢٦ی ئابی ساڵی ١٩٧٧ لە لائۆس، ناوەندی وڵاتی نیجریا بەرێوە چوو، و ئەم راگەیەنراوەی پەسند کرد کە داوای لە هەموو وڵاتانی جیهان کردبوو، لە فرۆشتنی چەک و چۆڵ بە وڵاتی ئەفریقیای باشوور، کە سیاسەتی ئاپارتاید بەرێوە دەبا، خۆ ببوێرن و هیچ یارمەتی و هاوکارییەکی ئەم وڵاتە لە بواری وزەی ناوەکیدا نەکەن .

### *کۆنفرانسی ئاشتیی لاهە (١٨٩٩)*
### *Hague Peace Conference OF ١٨٩٩*

ئەم کۆنفرانسە لەسەر داوای نێکۆلای دووهەم، ئیمپراتۆری رووسیا پێکهات. بەشدارانی کۆنفرانسەکە لەسەر سێ بابەتی سەرەکی رێککەوتن :

١ــ دامەزراندنی دیوانێکی هەمیشەیی نێوبژیوانی ( دادوەری ) وەکوو سەرچاوەیەکی دەسەڵاتدار لەم بوارەدا.

٢ــ ئامادەکردن و دارشتنی یاساکانی شەری زەمینی

٣ــ جێبەجێکردنی رێککەوتننامەی ژنێف لەرێکەوتی ١٨٦٤ لە بواری شەری دەریایی دا.

کۆنفرانسی دووهەمی لاهەش لە رێکەوتی ١٥ ی حوزیرانی ١٩٠٧دا پێکهات و جگە لە تەواوکردنی کارەکانی کۆنفرانسی یەکەم؛ سێزدە رێککەوتننامەی نوێشی سەبارەت بە یاساکانی بێلایەنی و شەری دەریایی مۆر کرد.

## کۆنفرانسی سەن فرەنسیسکۆ (١٩٤٥)
## Sanfrancisco Conference

کۆنفرانسی سەن فرەنسیسکۆ لە نێوان ٢٥ی نیسان تا ٢٦ی حوزیرانی ١٩٤٥ بە بەشداری نوێنەرانی ٥٠ وڵات پێکهات و، بەرنامەوپێڕەوی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانی پەسند کرد. وڵاتانی بەشداری ئەم کۆنفرانسە، ئەندامە سەرەکیەکانی ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان پێکدێنن. لەسەر داوای یەکیەتیی سۆڤیەت، پۆلۆنیاش کە لە کۆنفرانسەکەدا بەشدار نەبوو، بوو بە ئەندامی سەرەکی ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان. بەم شێوە کۆمەڵەی گشتیِ ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان، یەکەمین کۆبوونەوەی خۆی بە بەشداری ٥١ وڵاتی ئەندام پێکهێنا.

دەبێ سەرنج بدەینە ئەم بابەتە کە کۆنفرانسی ١٩١٩ی پاریس کە ڕێککەوتننامەی کۆمەڵەی نەتەوەکانی ئامادە کردبوو، لە دوای کۆتای شەڕدا (شەڕی دووهەمی جیهانی) پێکهات و کۆنفرانسی سەن فرەنسیسکۆ لەگەرمەی شەڕدا (شەڕی دووهەمی جیهانی) پێکهات. ڕۆزڤەڵت پێیوابوو کە شەڕ هاوکاری و لێک تێگەیشتنی نێوان هاوپەیمانەکانی گەیاندۆتە ئەوپەڕی خۆی و باشترین دەرفەت بۆ پێکهێنانی کۆنفرانس بەمەبەستی هێنانەگۆڕ و پەسندکردنی پێڕەوپرۆگرام لە نێوان هاوپەیمانەکان دایە. هەروەها لە حاڵێکدا کە ڕێککەوتننامەی کۆمەڵەی نەتەوەکان بەشێک لە ڕێککەوتننامەی ئاشتی پێکدێنا، کۆنفرانسی سەن فرەنسیسکۆ تەنیا بۆ هێنانەگۆڕ و پەسندکردنی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان پێکهات و تەنیا پێڕەوپرۆگرام وەکوو ڕێککەوتننامەیەکی نێودەوڵەتیی بۆ مۆرکردن و پەسندکردنی وڵاتانی بەشدار لە کۆنفرانسدا خرایە بەر باس. پێکهێنانی کۆنفرانسی نەتەوە یەکگرتووەکان لە شاری سەن فرەنسیسکۆدا نیشانەیەکی دیکەی گۆڕینی بیروڕای ئەمەریکا لە سیاسەتی خۆتەریک کردنەوەدا بوو.

بە پێی گەڵاڵەی دامبارتۆن ئۆکس و ڕێککەوتننامەی یالتا؛ ئەنجوومەنی ئاسایش؛ بەشی سەرەکی بناغەی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانی پێکدێنا و دەبوایە پەسندکراوەکانی ئەنجوومەنی ئاسایش سەبارەت بە هەڕەشە لە سەر ئاشتی یان پێشێل کردنی ئاشتی لەلایەن هەموو ئەندامانی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە جێبەجێ بکرایە. ئەنجوومەنی ئاسایش ١١ ئەندامی هەبوو: پێنج

ئەندامی هەمیشەیی ( ئەمەریکا، بەریتانیا، چین، فەرەنسا، یەکیەتیی سۆڤیەت) وپێنج ئەندامی کاتی کە لە لایەن کۆمەڵەی گشتی و بۆ ماوەی دوو ساڵ هەڵدەبژێردران. ئەندامەیتی سێ ئەندامی کاتی هەمووساڵێک تەواو دەبوو و کۆمەڵەی گشتی ولاتی دیکە هەڵدەبژاردن. ئەم رادەیە دوای گۆرانی بەسەر داهات، مەسەلەی دەسەلاتی بەربلاوی ئەنجوومەنی ئاسایش و مافی ڤیتۆ بۆ ٥ ولاتی گەورە، لەلایەن زۆربەی ولاتە چکۆلەکانەوە کەوتە بەر رەخنە. بەلام بە هۆی نایەکگرتوویی ئەم ولاتانەوە کە سەرچاوەکەی سیاسەتە تاکرەوانەکانیان بوو و هەروەها پێداگری ولاتە گەورەکان لەسەر مافی ڤیتۆ، دژایەتیەکەیان هیچ ئاکامێکی نەبوو.

یەکیەتیی سۆڤیەت رایگەیاند ئەگەر گەلاڵەی یالتا سەبارەت بە مافی ڤیتۆ و رادەی دەسەلاتی ئەنجوومەنی ئاسایش، بەتایبەتی سەبارەت بەوەرگرتنی ئەندامی نوێ و چاکسازی پێرەو پرۆگرام گۆرانکاری تێدا بکرێ، ئەم ولاتە واز لە ئەندامەیتی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان دێنێ. ئەمەریکا زۆری پێ خۆش بوو کە دامەزرانی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان شکست نەهێنێ. چوونکە بیرۆکەی دامەزراندنی ئەم رێکخراوە لە سەرەتادا لە لایەن ئەمەریکاوە هاتۆتە گۆرێ و شکستهێنانی ئەم رێکخراوەش، شکستێک بۆ ئەو دەوڵەتە لە گۆرەپانی سیاسەتی نێودەوڵەتیدا بوو. هۆکاری دیکەی پێخۆش بوونی دەوڵەتی ئەوکاتی ئەمەریکا و سەرکەوتنی کۆنفرانسی سەن فرەنسیسکۆ ترسێک بوو لە بەهێزبوونی ئەو کەسانەی کە بروایان بە خۆتەریک کردنەوەی ئەمەریکا ( لەگۆرەپانی سیاسەتی جیهانی دا) بوو کە ژمارەکەیان لە کۆنگرەدا زۆر بوو. هەڵبەت دەوڵەتی ئەمەریکا سەرەرای ئەو تاسە زۆرەی کە سەبارەت بە دامەزرانی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان هەیبوو، بە پێی سیاسەتی لەمێژینەی خۆی پێی خۆش نەبوو سەرەوەری ئەو ولاتە بە هۆی ئەم رێکخراوە زیانێکی لێ بکەوێ و هەرلەبەر ئەمەش لە دڵەوە خوازیاری پەسندکردنی گەلاڵەی یالتا بوو. ئەمە سەبارەت بە سۆڤیەت و بەریتانیاش وەراست دەگەرێ. سەرەرای ئەوەش هەوڵی ولاتە چکۆلەکان بۆ گۆرینی گەلاڵەی دامبارتۆن ئۆکس لەم بوارانەدا بەکەڵک بوو:

١ــ زۆرتربوونی رادەی دەسەلاتی کۆمەڵەی گشتی (ماددەکانی ١٠ تا ١٧ی پێرەوی نەتەوەیەکگرتووەکان )

٢ــ خستنەسەری ماددەکانی ٧٣ و ٧٤ بۆسەر پێرەوپرۆگرام سەبارەت بە ولاتە ناخودموختارەکان

٣_ خستنەسەری ئەو ماددانەی کە پێوەندیان بە سیستەمی سەرپەرستیاری نێودەوڵەتیی و ئەنجومەنی سەرپەرستیاری هەبوو، بۆسەر پێرەوی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان (ماددەکانی ٧٥تا ٩١)

٤_ زۆر ترکردنی ئەو ماددانەی کە پێوەندییان بە هاوکارییە ئابووری، کۆمەلایەتی و نێودەولەتیەکانەوە هەیە و هەروەها زۆرترکردنی رادەی دەسەلاتی ئەنجومەنی ئابووری و کۆمەلایەتی (ماددەکانی ٧٥ تا ٩١ ).

٥_ گونجاندنی مافی سروشتی داکۆکیکردنی رەوای تاکەکەسی یان بەکۆمەڵ تا ئەو کاتەی کە ئەنجومەنی ئاسایش هیچ هەولێکی بۆ پاراستنی ئاشتی و ئاسایشی نێودەوڵەتی نەداوە. (ماددەی ٥١).

٦_ ئەو ماددانەی دیکە کە لە سەن فرەنسیسکۆ و لە سەر داوای دامبارتۆن ئۆکس خرانە سەر پێرەو یان تەواوتر کران، پێوەندییان بە رێککەوتننامەکانی رێکخراوە ناوچەییەکان ( ماددەکانی ٥٢ تا ٥٤ پێرەو) و مافی مرۆڤ و ئازادییە بنەرەتیەکان ( ماددەکانی ١ و١٣و ٥٥و ٥٦و ٦٢و ٧٦و ٨٧) هەبوو .

٧_ سەرەرای ئەوەی کە لە پێشنیارەکانی دامبارتۆن ئوکس تەنیا ئاماژەبە پێخۆش بوونی، هەبوونی دادگای نێودەوڵەتیی داد کرابوو و لە سەر ئەوەی کە ئایا دەبێ دیوانی پێشوو هەروا بمێنێتەوە یان دیوانێکی نوێ جێگاکەی بگرێتەوە، هیچ باسێک نەکرا بوو. کۆنفرانسی یالْتا لە شوباتی ١٩٤٥دا، داوای لە هاوپەیمانەکان کرد کە نوێنەرەکانیان بۆ بەشداریکردن لە کۆنفرانسێکدا کە مەبەستی رێکخستنی پێرەوپرۆگرامی دیوانی نێودەوڵەتی داد لە واشینگتۆندا پێک دێ، بنێرن. ئەم کۆنفرانسە کومیتەیەکی لە یاسا ناسەکانی ولاتە جیاوازەکانی راسپارد کە گەلالەی پێرەوپرۆگرامی نێوخۆیی دیوانی نێودەوڵەتی داد دارێژن هەتا لە کۆبوونەوەی کۆنفرانسی سەن فرەنسیسکۆدا، بەمەبەستی پەسندکردن بخرێتە بەرباس و راوێژەوە. کۆنفرانسی سەن فرەنسیسکۆ پێرەوپرۆگرامی دادگای نوێی کە پاشماوەی دیوانی هەمیشەیی نیودەوڵەتیی دادبوو پەسند کرد و خستیە سەر پێرەوپرۆگرامی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان.

پێرەوپرۆگرامی نەتەوە یەکگرتووەکان لەرێکەوتی ٢٤ ی تشرینی ١٩٤٥ لە لایەن ژمارەی ئەو ولاّتانەی کە پێویست بوو، دەنگی پێ بدەن، پەسندکرا.

### کۆنفرانسی باکوور و باشوور *North –Souch conference*

لە رێکەوتی کانوونی یەکەمی ١٩٧٥دا نوێنەرانی نەتەوەکانی جیهانی لە پاریس دا کۆبوونەوە تا ئەرکێکی گەورە بە جێ بگەیەنن. ئەم ئەرکەش بریتی بوو لە گۆڕینی ئەو سیستەمەی کە لەمێژبوو بەسەر پێوەندییە ئابوورییەکانی جیهاندا زاڵببوو.

ئەو ولاّتانەی کە بۆ بەشداریکردن لە کۆنفرانسی پاریسدا بانگهێشت کرا بوون، بریتی بوون لە ١٢ ولاّتی لە حاڵی پەرەسەندندا بە نوێنەرایەتیی لە زیاتر لە سەد ولاّت، ٢ میلیارد کەس لە خەڵکی جیهان، ٧ ولاّت لە دەوڵەتەکانی بەرهەمهێنی نەوت و نۆێنەرانی ولاّتە پیشەسازییەکان ( جگە لە سۆڤیەت و ولاّتانی ئەرووپای رۆژهەلاّت ).

چوار کۆمیسیون بۆ بەدواداچوونی کێشەی وزە، کەرەسەخاوەکان، بواری دراو وماددی و پەرەگرتنی ئابووری پێکهاتن و هەر کۆمیسیۆنەی بە سەرۆکایەتیی هاوبەشی دوو کەس بەرێوە دەچوو، یەکیان لە لایەن ولاّتانی پیشەسازی و ئەوی دیکەشیان لە لایەن ولاّتانی لە حاڵی پەرەسەندندا. هەروەها کۆمیتەیەکی رێکخەریش پێکهات کە لە سەرۆکی کۆنفرانسەکان و سەرۆکی چوار کۆمیسیۆنەکە پێکهاتبوو کە ئامانجی ئەم کومیتەیە ئەوە بوو کە بەرنامەی کاری کۆمیسیۆنەکانی دیاری دەکرد. ئەرکی کومیتەی رێکخەر ئەوە بوو کە چواچێوەی سیاسی ئەو وتووێژانە دیاری بکا کە لە قۆناغەکانی دواتردا دەچنە نێو باسە تەواو تەکنیکیەکان. چوار کۆمیسیۆنەکە لە شوباتی ١٩٧٦ دا دەستبەکار بوون، یانی چوونە نێو ئەو باس و تووێژانەوە کە رەنگە چەندمانگ و ساڵیان پێ بچێ تا بگەنە ئاکام و دەرئەنجامێک. هەر چۆنێک بێ ئەم سەرەتایانە بوونە یەکەمین هەنگاو بۆ وەدیهێنانی ئەو بیرۆکەی کەلەم ساڵانەی دواییدا سەریان هەڵداوە و ئەمرۆکە بە "سیستەمی ئابووری نوێی جیهانی" ناسراوە.

مێژووی سەرهەڵدانی بیرۆکەی سیستەمی ئابووری جیهانی:

**الف_** زۆربەی ولاّتانی جیهان کە لە دوای شەڕی دووهەمی جیهانی، بە سەربەخۆیی گەیشتن، بەرەبەرە لەناو ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکاندا بوونە زۆرینە، بەلاّم هەوڵی گرنگی "ئۆپێک" لە ساڵی ۱۹۷۳دا بوو بە هۆی ئەوەی ئامانجە سیاسی و ئابوورییەکانی ئەم ولاّتانە پێکەوە گرێ بدرێ و شێوەیەکی ڕێکخراو و یەکگرتوو پەیدا بکا. ولاّتانی هەناردەی نەوت، ئەو کاتە زەبری ئابووری خۆیان وەشاند کە نیشانەی دابەزینی ئابووری تازە لە ولاّتە پیشەسازییەکاندا خۆی دەنواند و ئەم ولاّتانە بۆیان دەرکەوت کە شتەکە ئاوەژوو بۆتەوە. چوونکە چوار هێندە بوونی نرخی نەوت، هاوسەنگی هێزی لە بازرگانی نێو دەوڵەتیی نەوتدا بە تەواوەتی تووشی گۆڕان کرد و بوو بە هۆی ئەوەی کە لە ساڵێکدا نزیکەی ۱۰۰ میلیارد دۆلاّر بچێتە گیرفانی هێندێک لە ولاّتانی لە حاڵی پەرەگرتندا. بەمجۆرە گۆڕانکاری کت وپڕ لە پرۆسەی دەسەلاّتدا، ئەویش لە بوارێکدا کە بۆ ئابووری ولاّتانی پیشەسازی گرنگی و بایەخێکی تایبەتی هەبوو، ئەم ولاّتانەی تووشی کێشەیەک کرد کە بۆ ماوەی چەند ساڵ ولاّتانی جیهانی سێهەم پێیەوە گیرۆدە بوون. واتە لە بڕیارە گرنگە ئابوورییەکاندا خاوەن دەسەلاّت نەبوون. پێکەوە بەستراوەبوونی ئابووری هەرچی زیاتر جیهانیش مەودای قەیرانەکەی قووڵتر کردەوە و بوو بە هۆی کەمترکردنەوەی زیاتری مادده خۆراکیەکان کە هەر لەو کاتەدا سەریهەڵدا. ئەگەرچی کەمبوونی ڕێژەی بەرهەمهێنانی مادده خۆراکیەکان لە جیهاندا لە ساڵی ۱۹۷۲دا کەمتر لە ۱/۳ بوو، بەلاّم میکانیزمی بازاڕ بوو بە هۆی چوونەسەری نرخی مادده خۆراکیەکان و زۆرتربوونی برسیەتی لە هێندێک شوێنی جیهانی سێهەمدا. هەڵبەت ئەمە لە کەس شاراوە نیە کە ئەم کێشانە تەنیا بە جموجۆڵ و میکانیزمی بازاڕ چارەسەر ناکرێن.

بەم پێیە پێویستیی گۆڕینی یاسا کۆنەکان بە ڕوونی دەردەکەوت، بەلاّم لە داڕشتنی یاسا نوێکاندا، نەوت و مادده خۆراکیەکان،کێشەی سەرەکی نین. کێشەی سەرەکی تەنیا هەلاّوسان و بێکاریش نیە، بەڵکوو دامەزراندنی یاسا و سیستەمێکی نوێ لە جیهان دایە کە ڕەنگە ئەمە بەدڵی هێندێک لە ولاّتان نەبێ.

بەگشتی وا پێدەچێ کە جیهانی دوو جەمسەریی بیست ساڵە (دەیەکانی ۵۰و ۶۰) گۆڕابێ بۆ جیهانێکی دووجەمسەری دیکە لە دەیەی (۸۰ _۱۹۷۰)دا. بەو جیاوازییەی کە باشوور و باکوور جێگەی ڕۆژهەلاّت و ڕۆژئاوایان گرتەوە کە دووجەمسەری دیاری ئەو سەردەمە بوون.

ب ـ ڕێبەرانی وڵاتە بێلایەنەکان لە چوارەمین کۆنفرانسی خۆیاندا کە لە ئەیلوولی ١٩٧٣ لە ئەلجەزایردا پێکهاتبوو، بڕیاریاندا کە داوا بکەن کۆمەڵەی گشتی ڕێکخراوەی نەتەوە یەکگرتووەکان کۆبوونەوەیەکی نائاسایی بەمەبەستی هەنگاونانی بنەرەتیی بۆ لەناوبردنی " هۆکارەکانی گەشە سەندنی ئەسپایی و دوا کەوتوویی " پێک بێنێ. ئەمەریکا و زۆربەی وڵاتە پیشەسازییەکان گوێیان نەدایە قسەی وڵاتانی لە حاڵی پەرەسەندندا. تەنانەت چەند حەوتوو دواتریش کە " ئۆپێک " بڕیاری گرنگی خۆی سەبارەت بە نرخی نەوت ڕاگەیاند، وڵاتانی پیشەسازی بەو شێوەی کە پێویست بوو، بایەخیان بەم بڕیارە نەدا. کاتێک کە کۆبوونەوەی نائاسایی کۆمەڵەی گشتی لە نیسانی ١٩٧٤دا پێکهات، ئەمەریکا و وڵاتە پیشەسازییەکانی دیکە گوێیان نەبزوا و ئەوکاتەش کە ئەو کۆبوونەوە بەبێ دەنگدان، دامەزراندنی سیستەمێکی نوێی ئابووری نێودەوڵەتیی هێنایە گۆڕێ و بەرنامەی بەڕێوە بردنەکەشی دیاری کرد، وڵاتە پێشکەوتووەکان شتەکەیان بە هێند وەرنەگرت و پێشنیاری وڵاتانی لە حاڵی پەرەسەندنیشیان بە نازانستی و فەنتازیا لەقەڵەم دا، لە ڕاستیدا هێندێک لەو پێشنیارانەش وەکوو قەرەبووکردنەوەی زیانەکانی وڵاتانی لە حاڵی پەرەسەندندا کە بە هۆی کۆلۆنیالیزم لەو وڵاتانە کەوتبوون، نازانستی و فەنتازی بوو. بەڵام زۆربەی خاڵەکانی دیکە کە هاتنە گۆڕێ بەجێ بوون و دەکرا قسەیان لە سەر بکرێ: چاکسازیکردن لە پێوەندی سات و سەودای بازرگانی، چاکسازی لە سیستەمی دراو، خێراترکردن و باشترکردنی گواستنەوەی تەکنەلۆژیا، پێکهێنانی ڕێکخراوی جیاواز لە وڵاتانی بەرهەمهێنی کەرەسە خاوەکان و...هتد. کۆنفرانسی باشوور و باکوور کە بە پێی ئەو هۆکارانەی کە ئاماژەیان پێکرا، پێکهاتبوو، نەگەیشتە ئاکامێکی بەر چاوی ئەوتۆ.

### *کۆنفرانسی ئاشتیی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست (مەدرید ـ تشرینی یەکەمی ١٩٩١)*
### *Middel –Eastpeace Conference*

ئەم کۆنفرانسە بە دەستپێشخەری ئەمەریکا لە شاری مەدرید، ناوەندی ئیسپانیا و بە بەشداری عەرەبەکان و ئیسرائیل، جۆرج بۆش، سەرۆک کۆماری ئەوکاتی ئەمەریکا و گۆرباچۆڤ، سەرۆک کۆماری ئەوکاتی یەکیەتیی سۆڤیەت پێکهات و لە دوای چەندین کۆبوونەوە و وتووێژ، ڕێکخراوی ڕزگایدەری فەلەستین لەگەڵ ئیسرائیل لە ڕێکەوتی ١٢ی کانوونی یەکەمی

۱۹۹۳دا، له کۆشکی سپی ئەمەریکا و بەبەشداری بیل کلینتۆن و وەزیرانی دەرەوەی ئەمەریکا و رووسیا رێککەوتننامەیەکی ئاشتیان به ناوی " راگەیەنراوی بنەماکان" مۆر کرد. رێککەوتننامەیەکی ئاشتیانەش له نێوان ئۆردون و ئیسراییل له رێکەوتی ۲۵ ی تەمووزی ۱۹۹٤ له کۆشکی سپیدا به بەشداری بیل کلینتۆن مۆر کرا. له دوای مۆرکردنی ئەم رێککەوتننامانەدا، وتووێژگەلێک له نێوان ئەمەریکا، ئیسراییل و سووریا بۆ مۆرکردنی رێککەوتننامەیەکی هاوشێوه له بەرامبەر چۆلکردنی بەرزاییەکانی جۆلان ( گولان) پێکهات که هیچ ئاکامێکی نەبوو. مۆرکردنی رێککەوتننامەکانی ئاشتی، بۆته هۆی دژایەتیی گرووپه فەلەستینەکانی وەکوو بزووتنەوەی ئیسلامی حەماس و حیزبوڵلا.

## کۆنفرانسی کازابلانکا (۱۹٤۳) Casablanka Conference

ئەم کۆنفرانسه بەو کۆبوونەوه دەگوترێ که له مانگی کانوونی دووهەمی ساڵی ۱۹٤۳ له نێوان رۆژڤەڵت و چەرچیلدا پێکهات. به پێی ئەم کۆنفرانسه دوولایەن له سەر گەڵاڵەی هێرش کردنه سەر سیسل و ئیتالیا، بۆمباران کردنی ئەڵمانیای نازی، خۆبەدەستەوەدانی بێ ئەملاولای هێزەکانی بەرەی یەکگرتووەکان و گواستنەوەی هێزەکانی بەریتانیا بۆ بەرەی رۆژهەڵاتی دوور له دوای گەمارۆی ئەڵمانیا، رێککەوتن.

## کۆنکۆردا Concordat

ئەم زاراوه بەو بەڵگەنامەیه دەگوترێ که له نێوان پاپ، رێبەری کاتۆلیکەکانی جیهان و سەرۆکی ولاّتێکدا مۆردەکرێ و ئامانجی ئەم رێککەوتنه، پاراستنی بەرژەوەندییەکانی کلیسای کاتولیکی رۆما لەو ولاّته دایه.

هێندێک کەس پێیانوایه که کۆنکۆردا رێککەوتننامەیەکی نێودەوڵەتی نیه و هیچ ئاماژەیەک به بواره ئابووری و سیاسییەکانی تێدانیه و تەنیا رێککەوتننامەیەکی ئایینیه. لەبەرامبەردا، هێندێک کەسی دیکه پێیانوایه که کۆنکۆردا رێککەوتننامەیەکی نێودەوڵەتیه. چوونکه ئەو رێووشوێنانەی که له رێککەوتننامەیەکی نێودەوڵەتیدا لەبەرچاو دەگیردرێن، سەبارەت به کۆنکوورداش رەچاو دەکرێن.

### کۆنفرانسی وڵاتانی ئەفریقی ـ ئاسیایی

### *Afro – Asian Conference*

ئەم کۆنفرانسە لە نیسانی ساڵی ١٩٩٥ لە شاری باندۆنگی ئەندەنۆسیادا بەڕێوەچوو و یەکەمین کۆنفرانسی نێوان کیشوەری نەتەوەکانی ئاسیا و ئەفریقیا بوو. وڵاتە بەشدارەکان بریتی بوون لە : ئەفغانستان کامبۆج، سریلانکا، ئوردۆن، لائۆس، لوبنان، لیبریا، نیپاڵ، پاکستان، ئێران، فیلیپین، عەرەبستانی سعوودیا، سوودان، سووریا، تایلەند، تورکیا، ڤێتنامی باکوور، ڤێتنامی باشوور و یەمەن. شارەزایانی مەسەلە سیاسییەکان، نوێنەرانی قیبریس ( قەشە مارکایۆس، کەلەو کاتەدا ڕێبەری بزوتنەوەی ئونۆسیس بوو)، ئەمەریکا ( یەکێک لە ئەندامانی ڕەش پێستی کۆنگرە) و کۆنگرەی نیشتمانیی ئەفریقیاش بە بەشدارانی ئەم کۆنفرانسەوە زیاد دەکەن.

کێشەیەکی قووڵ لە نێوان وڵاتانی لایەنگری ڕۆژئاوا و دەوڵەتە لایەنگرەکانی کۆمۆنیزم وولاتە بێلایەنەکان لە ئارادا بوو، بەڵام سەرەڕای ئەوەش، کۆنفرانسی باندۆنگ کۆمەڵە ڕاگەیەنراویکی سەبارەت بە پشتیوانی لە هاوکاریکردنی ئابووری، کولتووری خودموختاری و دژایەتیی لەگەڵ کۆلۆنیالیزم دا مۆر کرد، هەروەها کۆنفرانس پشتیوانی خۆی بۆ ڕاگەیەنراوی مافی مرۆڤ، سەرەڕای دژایەتیی چینەکان ڕاگەیاند.

### کۆنفرانسی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ بازرگانی و پەرەپێدان (یوئێن کتاد)

### *United Nations Conference On Trade And Development* (UNCTAD)

لە دوای شەڕی دووهەمی جیهانی، بازرگانی بە شێوەیەکی بەرچاو پەرەی گرتووە، بەڵام نەتەنیا هەناردەی وڵاتانی لە حاڵی پەرەسەندن لە چاو ڕێژەی هەناردەی وڵاتانی پەرەگرتوو، کەمتر بەرز بۆتەوە، بەڵکوو بەشی وڵاتانی لە حاڵی پەرەگرتن لە هەناردەی جیهانیشدا کە لە ساڵی ١٩٥٠، نزیکەی ١/٣ بوو، بەرەبەرە دابەزی و لە ساڵی ١٩٦٢دا گەیشتە نزیکە ١/٥ .

جگە لەمەش، کێشەکانی وڵاتانی لە حاڵی پەرەسەنداندا لەم ماوەدا زۆرتر بوون و هۆکارەکەش دابەزینی نرخی بەرهەمە کشتوکاڵیەکان بەتایبەتی بەرهەمە سەرەکیە هەناردەییەکانی ئەم وڵاتانە لە بەرامبەر بەرزبوونەوەی نرخی هاوردەکانیان ( کەرەسە پیشە سازییەکان) دایە، بۆ

زاڵبوون بەسەر ئەم کێشانەدا، وڵاتانی لە حاڵی پەرەسەندن، پەنایان بردۆتە بەر پلان دارشتنی ئابووری و کۆمەڵایەتیی. بەلاَم جێبەجێکردن و وەدیهاتنی ئەم گەلاَڵەنە تووشی کۆسپ و ئاستەنگ بۆتەوە.

گرنگترین ئاستەنگەکان بریتین لە :

**الف**_ نەبوونی جێگری بازاڕە نێودەوڵەتیەکانی بەرهەمە سەرەتاییەکان.

**ب**_دەسترانەگەیشتن بە کەرەسەی (شتومەکەکانی) وڵاتە پیشەسازییەکان.

چوونکە هەوڵە تاکەکەسیەکانی وڵاتەکان ناتوانن چارەسەری ئەم کێشانە بکەن و پێویستیان بە هەوڵی بەکۆمەڵ و رێکخراوی هەموو وڵاتانی جیهانی هەیە ـ چ پەرەگەرتوو و چ لە حاڵی پەرە سەندان ـ بۆیە کۆمەڵەی گشتی رێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان لە شازدەهەمین خولچی کۆبوونەوەکانی خۆیدا، لەگەڵ بڕیارنامەی ژمارە١٧٠٧ ی پەسندکراوی ١٦ کانوونی یەکەمی ١٩٦١، بڕیاریشی داوە کە کۆنفرانسێک بەبەشداری هەموو وڵاتانی ئەندامی UN بەرێوەبچێ و مەسەلەی بازرگانی نێودەوڵەتیی و بەتایبەتی ئەو شتانەی کە پێوەندیان بە بەرهەمە سەرەتاییەکانەوە هەیە، بخاتە بەر باس و تاوتوێیان بکا.

دوای ماوەیەکی کەم لە ساڵی ١٩٦٢دا هێندێک لە وڵاتانی لە حاڵی پەرەسەندن دا کە لە قاهیرەبۆ باس و تاوتوێکردنی پەرەگرتوویی ئابووری کۆبیوونەوە، پێشوازیان لە بڕیاری کۆمەڵەی گشتی رێکخراوەی نەتەوە یەکگرتووەکان کرد و دوابەدوای ئەمە هەر لەو ساڵەدا، UN بڕیارنامەیەکی نوێی بە ژمارەی ١٧٨٥، لە رێکەوتی ٨ی کانوونی یەکەمی ١٩٦٢دا پەسند کرد و لە سەر ئەوەش پێی داگرت کە هەرچی زووتر کۆنفرانسێک پێک بێ و لە بواری بازرگانی و پەرەپێدان دا هەوڵ بدا. کۆنفرانسەکە لە رێکەوتی ٢٣ ئازاری ١٩٦٤ لە ژنێف بە بەشداری ١٢٠ وڵات و بۆ وێنە ٧٧ وڵاتی لە حاڵی پەرەسەندندا پێکهات و ماوەی ١٢ حەوتووی خایاند. کونفرانس هەوڵی دا کە:

١_ لە پێناو هاندانی هەناردەی وڵاتانی لە حاڵی پەرەسەندن دا، هەوڵی شێلگیرانە و پوزەتیف بدا.

٢_ لەناوبردنی ئەو جیاوازییە روو لە زیادانەی کە لە نێوان نرخی هەناردەکان و پێداویستیە هاوردەییەکانی وڵاتانی لە حاڵی پەرە سەندن دا هەیە، بە گرتنەبەری سیاسەتێکی نوێی بازرگانیی.

کۆنفرانس لە کۆتایی کۆبوونەوەکانی خۆیدا، راگەیەنراوێکی دەرکردو چەند بڕیاریشی دەرکردن کە لە دوو بەشی سەرەکی پێکهاتبوون: بە شی یەکەم ئەو یاسا و ڕێوشوێنانەی دەگرتەوە کە دەبێ لە بازرگانیی نێودەوڵەتیدا رەچاو بکرێن. بەشی دووهەمیش داوای لە کۆمەڵەی گشتی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان کرد کە کۆنفرانس ببێتە لقیکی هەمیشەیی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان و بناغەکانی کۆنفرانس لە ئەنجوومەنێک و چەند کۆمیسیۆن و سکرتارییەکی هەمیشەیی پێک بێن. ئەم داواکاریە لە ڕێکەوتی ۳۰ی ئەیلوولی ۱۹٦٤ بەپێی بڕیارنامەی ژمارە ۱۹۹۵ لە لایەن کۆمەڵەی گشتی un ەوە پەسند کرا.

ئەرکەکانی یوئین کتاد ( UNCTACT ) بریتین لە :

**الف**ـ هاوکاریکردن لە بواری پەرەپێدانی بازرگانیی نێودەوڵەتیی بە مەبەستی خێراترکردنی پەرەپێدانی ئابووری و تایبەتی، بەرفراوان کردنی بازرگانی لەو وڵاتانەدا کە گەیشتونەتە پلەی جیاوازی پەرەپێدان.

**ب**ـ دارشتنی بنەما و سیاسەتەکانی پێوەندیدار بە بواری بازرگانیی نێودەوڵەتی.

**ج**ـ تاوتۆیکردنی تێکۆشان و چالاکیی دامەزراوەکانی دیکەی سەر بە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لە بواری بازرگانیی نێو دەوڵەتیدا.

**د**ـ ڕێکخستنی سیاسەتی دەوڵەتەکان و گرووپە ئابوورییە ناوچەییەکان لە بواری بازرگانی و پەرەپێداندا.

UNCTAD چوار بناغەیان کۆڵەکەی هەیە: کۆنفرانسی گشتی، ئەنجوومەنی بازرگانیی و پەرەپێدان، کۆمیسیۆنەکان و سکرتاریا.

کۆنفرانسی گشتی رۆڵی کۆمەڵەی گشتی و پەرلەمانی UNCTAD دەگێڕێ کە لە هەموو دەوڵەتەکانی ئەندامی UNCTAD پێکهاتووە و هەرسێ ساڵ جارێک پێک دێ.

### *کۆنفرانسی یاڵتا (۱۹٤٥)* — *Yalta Conference*

ئەم کۆنفرانسە لە ڕێکەوتی ٤ تا ۱۱ی شوباتی ۱۹٤٥ بەبەشداری سەرۆکی ئەمەریکا، سۆڤیەت و بەریتانیا لە یاڵتادا (باشووری نیمچە دوورگەی کریمە) بەڕێوەچوو و چەند بڕیارێکی گرنگی دەرکردن:

١ــ له دوای بەدەستەوەدانی ئەڵمانیا، وڵاتە بەشدارەکانی کۆنفرانس و هەروەها فەڕەنسا، ئەڵمانیا داگیر دەکەن

٢ــ کۆنفرانسی سەن فرەنسیسکۆ بەمەبەستی بڕیاردان لەسەر پێکهێنانی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان پێک دێ و شێوەی دەنگدانی "ڤیتۆ " تاووتوێ دەکرێ.

٣ــ سۆڤیەت بەڵێنیدا له ماوەی سێ مانگ دژی ژاپۆن شەڕ بکا.

٤ــ گەڕانەوەی دوورگەکانی " ساخالین " و " کوریل" بۆ سۆڤیەت و گەڕانەوەی هەلومەرجی ساڵی ١٩٠٤ بۆ "پۆرت ئارتۆر" و "دارێن". زاراوەی یاڵتا له عورفی سیاسیدا هاوواتای دابەشکردنی جیهان له پشت دەرگا داخراوەکانه.

## کۆنفرانسەکانی ژنێڤ — *Geneva Conference*

١ــ کۆنفرانسی ئایار :تەمموزی ساڵی ١٩٥٤. ئەم کۆنفرانسە به ئامانجی چارەسەرکردنی شەڕی نێوان کۆریا و هیندوچین بوو. که له قۆناغی یەکەمدا به ئاکامێکی ئەو تۆ نەگەیی، بەڵام له قۆناغی دووهەمدا بوو به هۆی له دەست دانی کۆلۆنیەکانی فەڕەنسە له باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا و له کۆتاییشدا بوو به هۆی سەربەخۆیی وڵاتانی ڤێتنامی باکوور، ڤێتنامی باشوور، لائۆس و کامبۆجیا.

٢ــ کۆنفرانسی تەمموزی ١٩٥٥: کۆنفرانسی سەرۆکەکان به بەشداری ئایزینهاڤێر، خرۆشچۆف، ئیدێن و ئیدگارفۆر ( سەرۆک وەزیری فەڕەنسە ) بەمەبەستی سڕینەوەی گرژی و ئالۆزییەکانی شەڕی سارد .

٣ــ کۆنفرانسی کانوونی یەکەمی ١٩٧٣ : کۆنفرانسی ئاشتی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست له ژێر چاوەدێری ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان که شکستی هێنا.

٤ــ کۆنفرانسی تشرینی یەکەم ـــ تشرینی دووهەمی ١٩٧٦. ئەم کۆنفرانسە بەمەبەستی دۆزینەوەی ڕێگاچارەیەک بۆ زیمبابووە (ڕودزیا)پێکهات.

## کۆنگرە Congress

کۆنگرە لە زاراوەی یونانی Congress وەرگیراوە. بە واتای کۆبوونەوە بۆ لێک تێگەیشتن و باس و راوێژکردنە. لە زاراوەی نێودەوڵەتیدا، بە واتای کۆبوونەوەی سەرۆکی وڵاتەکان یان نوێنەرەکانیان بۆ گەیشتن بەو ئامانجانەیە. ئەگەرچی کۆنفرانسیش هەر بۆ ئەو مەبەستانە پێکدێ، بەڵام هێندێک لە سۆنگەی جۆری بەشداران و ئەو بابەتانەی کەدەخرێنە بەرباس و تاوتوێ دەکرێن، بە هێندێک لە کۆبوونەوەکان دەڵێن کۆنفرانس و بە هێندێکیش دەڵێن کۆنگرە. زۆربەی شارەزایانی بواری یاسا نێودەوڵەتیەکان جیاوازی نێوان کۆنفرانس و کۆنگرە دەگێڕنەوە بۆ پلە وپایەی بەشداران و گرنگی ئەو مەسەلانەی کە باسیان لەسەر دەکرێ. لە روانگەی هێندێک کەسەوە، ئەگەر لە کۆبوونەوەکاندا سەرۆکی وڵاتان یان وەزیرەکان بەشداربن یان بابەتی بەرباس و لێکۆڵینەوە گرنگیەکی نێودەوڵەتیی هەبێ، ئەوە کۆنگرەیە و هەرکاتێکیش بەشدارانی کۆبوونەوەکە لە بەرپرسانی خوارەوە بن و بابەتەکانی بەرباس و لێکۆڵینەوەش گرنگیەکی کەمتریان هەبێ، ئەوە کۆنفرانسە. لە روانگەی هێندێک کەسی دیکەوە، کۆنگرە بۆ چارەسەری مەسەلە سیاسییەکان و کۆنفرانسیش بۆ دارشتنی بنەما یاساییەکان پێکدێ. واپێدەچی کە لە سەدەی بیست و یەکدا بایەخێک بەم جیاوازییە نادرێ.

## کۆنگرەی نیشتمانیی ئەفریقیا Africa National Congress

ئەم زاراوە بە بزووتنەوەیەکی سیاسی لە ئەفریقیای باشووردا دەگوترێ کە بەمەبەستی بردنەسەری ئاستی خۆشگوزەرانی کۆمەڵگای رەش پیستەکان لە ساڵی ۱۹۱۲دا دامەزرا. ئەم بزووتنەوە لەگەڵ هیندییەکانی ئەم وڵاتە یەکیان گرت، تاکوو نەتەوەیەکی یەکگرتوو پێک بێنن(۱۹۲٦). ئەم کۆنگرە بەرێبەرایەتیی لتیۆلی ( ٦۷ــ ۱۹۵۲) و بەکەڵک وەرگرتن لە شێوە هێمنانەکان، گروتینی بە خەباتی خۆی لە دژی ئاپارتایددا، بەڵام رژێمی دەسەڵاتدار بە توندوتیژی بەرەنگاریان بۆوە و ئەم رێکخستنەی بە نایاسایی راگەیاند (۱۹٦۱). باڵی سەربازی کۆنگرە بە ناوی " شمشێری گەڵ" لە لایەن نێلسۆن ماندێلاوە دامەزرا، تا جێبەجێکردنی کردەوەی تێکدەرانە و تۆڵەئەستێنانە وەئەستۆ بگرێ.ئەم رێکخستنە چەند نووسینگەشی لە دەرەوی وڵاتدا هەبوو تا

پشتیوانی وڵاتانی دیکەی جیهان بۆ کۆتایی هێنان بە رژێمی ئاپارتاید بۆلای خۆیان رابکێشن و بتوانن حکوومەتی رەش پیستەکان لە ئەفریقیای باشوور دامەزرێنن. لە ساڵی ١٩٩٠دا و بەدوای ئەو گۆرانکارییانەی کە لە شۆێنە جیاوازەکانی جیهاندا روویاندا، دەوڵەتی ئەفەریقای باشووریش چەند هەوڵی بۆ هەڵوەشانەوەی یاساکانی هەڵاواردنی رەگەزی دا.
گرنگترینی ئەو هەوڵانە کە لە و تاری ( شوباتی ١٩٩٠) دوکلریک، سەرۆک کۆماری ئەفریقیای باشوور ئاماژەیان پێکرا بریتی بوون لە :
ـ یاسایی کردنی کۆنگرەی نیشتمانیی ئەفریقیا.
ـ ئازادکردنی دەستبەجێی نێلسۆن ماندێلا، رێبەری کۆنگرەی نیشتمانیی ئەفریقیا.
نزیکە ساڵ و نیوێک دوای ئەمە، دۆکلێرک بە شێوەی رەسمیی هەڵوەشانەوەی هەموو یاساو رێوشوێنەکانی رژێمی ئاپارتایدی راگەیاند ( حوزیرانی ١٩٩١). لەم وتارەدا رایگەیاند: " ئێستا کە هەموو لایەک [لە هەڵاواردنی رەگەزی] رزگار بوون، رەگەزی سپی، رەگەزی هیندی ورەگەزی دوورەگە. ئاپارتاید بۆ هەمیشە چووە ناو مێژووەوە". سەرەڕای ئەمە شارەزایان پێیانوایە کە قەرەبووکردنەوەی خەسارەکانی رژێمی ئاپارتاید پێویستی بە ماوەیەکی زۆر هەیە.

## کۆنگرەی ڤیەننا (١٨١٤ ـ ١٥) *Congress Of Vienna*

کۆنگرەیەکی نێودەولەتیێ بوو بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی ئەورووپا لە دوای " شەرەکانی ناپلیۆن"، کە لە ئەیلوولی ١٨١٤ تا حوزیرانی ١٨١٥ی خایاند. وڵاتانی بەشداری ئەم کۆنگرە بریتی بوون لە: نەمسا، بەریتانیا، رووسیا، پرۆس و فەرەنسا. بەشی زۆری بریارەکانی ئەم کۆنگرە لە لایەن نەمسا و بەریتانیاوە دەدران. چارەسەری کێشەی خاک لە بەندی کۆتایی ٩ی حوزیرانی ١٨١٥دا کە " بەرێککەوتننامەی ڤیەننا" بە ناوبانگە، گونجێنرا. سێ هەرێمی نوێی پێکهات: پاشایەتیی یەکگرتووی هوڵەندا کە لە بەلجیکا، هۆڵەندا و لۆکزامبۆرگ پێکهاتبوو. کۆنفیدراسیۆنێکی ئەڵمانی کە لە ٣٠ یەکەی سەربەخۆ پێکهاتبوو بەبێ حکومەتی ناوەندی ئەم یەکانە پێوەندییەکی لاوازیان لەگەڵ یەکتردا هەبوو و شاری ئازادی کراکۆ. دوو پاشایەتیی ژێر سەرپەرەستیاریش دامەزران: یەکیان لۆمباردی ـ ڤێنیز کە سەر بە پاشایەتی نەمسا بوون و پاشایەتی پۆلۆنیاش سپێردرایە تیزاری رووسیا. پاشایەتیە یاساییەکان لە ئیسپانیا، ناپێل، پیەمۆنت، تووسکانی و

مووددناشدا دامەزران. گۆنگرە هەروەها جارێکی تر کۆنفیدراسیۆنی سویسرای پێکهێناوە و گەرەنتی بێلایەنی هەمیشەیی ئەم کۆنفیدراسیۆنەی کرد. نەمسا نە تەنیا لۆمباری ـ ڤێنیز، بەڵکوو دالماسی، کارنیۆلا، سالزبۆرگ گالیشیی وەدەستهێنا. پرۆسیش، پوزێن، دانزیک بەشی زۆری ساکسۆنی، بەشێکی زۆر لە ڤێستڤالیا و ناوچەکانی پێشووی ژێردەسەڵاتی سویدی کردە هیی خۆی. نەرویجیەکان لەگەڵ سویدییەکاندا یەکیان گرت. بەریتانیا، ماڵت، هلیگۆلند، کلکەی ئومیدنیک، سەریلانکا، توباگۆ، سانتالۆسیا و مۆریسی بۆ خۆی راگرت و سەرپەرستیاری دوورگەکانی یونیشی (تا ساڵی ١٨٦٢) وەدەستهێنا. جگە لە گۆرانکارییەکان ناو بەڵگەی کۆتایی کۆنگرەکەدا؛ کۆنگرە بریاری گرنگی دیکەیشی دەرکردن: مافی هاتوچۆی ئازادی پاپۆرەکان لە راین و مۆیسدا، مەحکووم کردنی رەسمیی بازرگانیی کۆیلەکان، پێشنیاری درێژکردنەوەی بەخشینی ماف بە جوولەکەکان بە تایبەتی لە ئەڵمانیا و دامەزراندنی سیستەمێکی دیپلۆماسی کە بە درێژایی سەدەی نۆزدەهەم و دوای ئەو ماوەیەش بەردەوام بوو.

## کۆنڤانسیۆن *Convention*

کۆنڤانسیۆن ئەم واتایانە لە خۆ دەگرێ:

١ـ کۆنڤانسیۆن یان کۆنڤانسیۆنی نەتەوەیی. ناوی کۆمەڵەیەکی گرنگ بوو کە لە دوای ئەنجوومەنی یاسادارشتن لە لایەن خەڵکی فەرەنساوە لە٢١ی ئەیلوولی ، ١٧٩٢دا دامەزرا. کۆنڤامسیۆن، کۆماری فەرەنسای راگەیاند و حوکمی لە سێدارە دانی لوئیی شازدەهەمی پەسندکردو کۆمیتەی رزگاری نەتەوەیی پێکهێنا و چەند کەسی ناردە شارەکان کە بنەماکانی شۆرش و بنەماکانی راگەیەنراوی مافی مرۆڤ و بناغەکانی نیشتمانپەروەرری بەهێز بکەن. نوێنەرانی کۆنڤانسیۆن لە دوو حیزبی گەورەی ژیرۆندین و مونتانیارەکان (ژاکوبێنەکان) هەڵبژێردرا بوون. کۆنڤانسیۆن لایەنگرانی سیستەمی پاشایەتیی لە ویلایەتەکانی ڤاندە و باشووری فەرەنسا تێکشکاند و ئەو یەکیەتیە ئەورووپییەی کە لە لایەن پاشاکانی ئەورووپا لە دژی شۆرش پێکهاتبوو، لە ناو برد.

کۆنڤانسیۆن چەند دامەزراوە و بنیاتی لە فەرەنسادا پێکهێنا وەکوو: پەیمانگەی بەرز، قەتابخانەی پۆلی _ تەکنیک، بەڕێوەبەریی جۆگرافی، بەڕێوەبەریی پیشەسازییەکان و پیشەکان، قوتابخانە سەرەتایی، ناوەندی و تایبەتیەکان، مووزەی مێژووی سروشتی، کۆنسێرڤاتۆر، سیستەمێکی متریک، ئاکادیمی زانستە سیاسی، ئەخلاقی یەکان و ئەدەبیات و هونەرە جوانەکان و دامەزراوەی هاوشێوەی دیکە. کۆنڤانسیۆنی فەرەنسە لە ٢٦ ی تشرینی یەکەمی ١٧٩٥ دا هەڵوەشایەوە.

٢_ بە کۆبوونەوەیەک دەگوترێ، کە لە ناو دەنگدەرانی حیزبێکدا لە شارێک یان لە بەشێکدا و نوێنەرانی شارەکانی ویلایەتێکدا کە پالێوراوی حیزبیان بۆ هەڵبژاردن دیاری کردووە، بەرنامە و ئامانجەکانی حیزب و چۆنیەتی ڕێکخستنی حیزب دادە ڕێژێ.

*تێبینی:* کۆڕوکۆبوونەوە نێودەوڵەتیەکان کۆنڤانسیۆن نین و بەم کۆبوونەوانە دەڵێن کۆنفرانس.

٣_ ناوی ئەنجوومەنێکە کە ناوە بە ناوە بۆ پێداچوونەوەی دەستوور و پێشنیارکردنی دەستوور بەو کەسانەی کە هەڵدەبژێرن، پێک دێ.

٤_ کۆنڤاسیۆن لە زاراوەی یاسای نێودەوڵەتیدا بەو " بەڵگەنامە چەند لایەنە نێودەوڵەتی " یانە دەگۆترێ کە لە باری فۆرمەوە لە " ڕێککەوتننامە " دەچن.

کۆنڤاسیۆن بوارەکانی وەکوو: پێوەندیە پۆستی، کۆنسولی، گومرکی و سەربازییەکان لە خۆدەگرێ و زۆربەی دەوڵەتەکان پەسندیان کردووە. وەکوو کۆنڤاسیۆنەکانی شەڕو یاساکانی شەڕ کە لە نێوان چەند دەوڵەتی تایبەتیدا گرێ دراون، کەوڵاتەکانی دیکەش دەتوانن ببنە ئەندامی ئەم کۆنڤانسیۆنانە. وەکوو کۆنڤانسیۆنەکانی گواستنەوەی بریندارانی شەڕ لە گۆڕەپانەکانی شەڕدا و کۆنڤاسیۆنەکانی لێکدانە دەریاییەکان، ڕزگارکردنی نوقم بووەکان، پشتیوانی لە خاوەندارێتی تەکنیکی و ئەدەبی و فرۆکەوانی و پاپۆڕوانی و پێوەندیە دوورەکان.

لە کۆنڤانسیۆنە بەناوبانگەکان دەتوانین ئاماژە بە ڕێککەوتننامەی نێودەوڵەتیی ئاشتی لاهە (١٨٩٩و١٩٠٧) و ئەو ڕێککەوتننامانە بکەین کە لە ژێر چاوەدێری ڕێکخراوەی نەتەوە یەکگرتووەکاندا مۆرکراون، وەکوو: کۆنڤانسیۆنی ١٩٣٦ ی قەدەغەکردنی بازرگانی کۆیلەکان یان

کۆنڤانسیۆنەکانی ڤیەننا سەبارەت بە پێوەندیە دیپلۆماسیەکان (١٩٦١) و پێوەندییە کۆنسولیەکان (١٩٦٣).

هەروەها کۆنڤانسیۆن بەو بەڵگەنامەنەش دەگوترێ کە پێوەندییان بە یەکیەتیە نێودەوڵەتیەکانەوە هەیە یان دەبنە هۆی پێکهێنانی ئەمجۆرە یەکیەتیانە؛ وەکوو کۆنڤانسیۆنی پۆستێ و هەروەها کۆنڤانسیۆنی مۆنترۆ (١٩٣٦) کە بوو بە هۆی سیستەمێکی هەمیشەیی لە سەر گەروەکانی بۆسفۆرو داردانێل.

### کۆنڤانسیۆنی ئەمەریکیی مافی مرۆڤ (١٩٦٩)

### American Convantion On Humn Rights (١٩٦٩)

رێککەوتننامەی رێکخراوی وڵاتانی ئەمەریکی (OAS)ە کە لە کۆبوونەوەی ١٩٦٩ی ئەم رێکخراوە لە کۆستاریکادا پەسندکراو پێوەندی بە پشتیوانی نێودەوڵەتیی مافی مرۆڤ لە نیوەگۆی رۆژئاوادا هەیە. کۆنڤانسیۆنی ئەمەریکی مافی مرۆڤ، بەڵگەیەکی هەمەلایەنەیە کە لە کۆنڤانسیۆنی ئەورووپی پشتیوانی لە مافی مرۆڤ و ئازادییە بنەڕەتیەکان (١٩٥٠ ) وەرگیراوە. ئەم کۆنڤانسیۆنە نزیکەی ٢٢ مافی بنەرەتیی سیاسی و شارستانی مسۆگەر دەکا وەکوو:مافی ژیان، مافی هەڵسووکەوتی مرۆڤانە، مافی ئازادی تاکە کەسیی. مافی دادگاییکردنی دادپەروەرانە، مافی کەڵک وەرگرتن لە ژیانی تایبەتی، مافی قەرەبووکردنەوەی زیانەکان، مافی وەڵام دانەوە، مافی کۆڕ کۆبوونەوە، مافی پێکهینانی خێزان، مافی هەبوونی ناو، مافی هەبوونی سامان و دارایی، مافی بەشداریکردن لە دەوڵەتدا. مافی پشتیوانی یەکسان لە بەرامبەر یاسادا، مافی کەڵک وەرگرتن لە پشتیوانی داد، مافی مناڵان، مافی رزگاربوون لە کۆیلایەتی و ئەو یاسایانەی پێوەندییان بەرابردووەوە هەیە، مافی ئازادی ئایین، بیر، رادەربرین، پێکهێنانی کۆڕو کۆبوونەوە، گواستنەوە و هەڵبژاردنی شوێنی نیشتەجێ بوون. ئەم کۆنڤانسیۆنە هەروەها بریاری پێکهێنانی دادگای مافی مرۆڤی ئەمەریکی و کۆمیسیۆنی مافی مرۆڤی وڵاتانی ئەمەریکی (لەراستیدا کۆمیسیۆنی OASە)دەرکرد. دەبوایە بریارەکانی کۆنڤانسیۆن لە ساڵی ١٩٧٨ەوە جێبەجێ بکرانایە.

## کۆنڤانسیۆنالیزم Conventionalism

بەسەرنجدان بە واتاکانی کۆنڤانسیۆن، کۆنڤاسیۆنالیزم بەواتای زیادەرۆیی لە پێرەوی کردن لە ڕێووشوێنەکانی ڕێککەوتننامە و کۆنڤانسیۆنەکانە.

## کۆنڤانسیۆنی دانووب (١٩٤٨) Danube Convention

کۆنڤانسیۆنی دانووب لە ساڵی ١٩٤٨ لە شاری بێلگراد، لە نێوان وڵاتانی بولگاریا، چیکسلۆڤاکیا، هەنگاریا، ڕۆمانیا، سۆڤیەت، ئوکراینا، ویۆگسلاڤیادا مۆرکرا. ئەم کۆنڤانسیۆنە درێژەو دان پێدانان بە ڕێککەوتننامەی ١٩٢١ بوو کە کۆمیسیۆنی ئەورووپی دانووب (١٨٥٦ — ١٩٤٨) بە پێی ئەورێککەوتننامە دامەزرا بوو. کۆنڤانسیۆنی دانووب ئازادی هات و چۆی پاپۆرەکانی لە چۆمی دانووبدا بۆ هەموو پاپۆرە بازرگانیەکان و بازرگانی گشتی وڵاتان مسۆگەر دەکرد.

## کۆنڤانسیۆنی ئەورووپیی پشتیوانی لە مافی مرۆڤ و ئازادییە بنەڕەتیەکان
## Europen Convention For The Proteection Of Humn Rights And Fundamental Freedoms

ڕێککەوتننامەیەکە کە باس لەو ماف و ئازادییانە دەکا کە وڵاتانی ئەورووپای ڕۆژئاوا بۆ هاوڵاتیەکانیان مسۆگەر کردووە. ماف و ئازادییەکانی کۆنڤانسیۆن بریتین لە: مافی ژیان و ئازادی، قەدەغەکردنی کۆیلایەتی و ژێردەستە بوون، ڕزگاربوون لەدەستبەسەرکردن، زیندانی کردن و دوورخستنەوەی لە خۆڕایی، مافی دادگاییکردنی دادپەروەرانە، ئازادی بیروڕا دەربڕین، ئازادی کۆڕو کۆبوونەوە (پێکهێنانی یەکیەتیەکان) و ئازادی ئاین. کۆنڤانسیۆن ئەم خاڵانە ناگرێتەوە:

دابینکردنی کۆمەڵایەتی، دامەزراندن ( تعین بوون) یان ستاندارده بەرزەکانی ژیان ( ئەم بوارانە لە ڕێککەوتننامەی ڕاگەیەنراوی کۆمەڵایەتیی ئەورووپا (١٩٦٠)دا باسکراون). ئەم کۆنڤانسیۆنە بۆ وەرگرتن و تاوتوێکردنی سکاڵاکانی پێشێل کردنی مافی مرۆڤ کە بە هۆی سکاڵای وڵاتانی ئەندام یان کەسەکانەوە تۆمار دەکرێ، کۆمیسیۆنی ئەورووپی مافی مرۆڤی دامەزراندووە. ئەم کۆنڤانسیۆنە هەروەها دادگای مافی مرۆڤی ئەورووپای دامەزراند. ژمارەی ئەندامانی کۆمیسیۆن بەقەد

رادەی ئەو ولاّتانەیە کە کۆنڤانسیۆنیان مۆر کردووە. ئەندامەکانی بۆ ماوەی ٦ ساڵ لە لایەن کومیتەی وەزیرەکانی ئەنجوومەنی ئەورووپا و بەپێی ئەو پیشنیارانەی کە دەستەکانی نوێنەرایەتیی نەتەوەیی دەیخەنە بەردەم کۆمەڵەی راوێژکاری ئەنجوومەنی ئەروپا، هەڵدەبژێردرێن. کۆنڤانسیۆن لە شێوەیەکی تایبەتی کەڵک وەردەگرێ، چوونکە زۆربەی ئەو ولاّتانەی کە کۆنڤانسیۆنیان مۆر کردووە، رێگایان بە کۆمەڵە تایبەتی و کەسەکان و ولاّتەکانیش داوە کە سکالاّکانی خۆیان ئاراستە بکەن. کۆمیسیۆن لە پێڕاگەیشتن بە سکالاّکان سەربەستە. واتە ولاّتێک نەک تەنیا دەبێ کۆنڤاسیۆنەکەی لە ناو خۆدا پەسند کردبێ، بەڵکوو دەبێ مافی کۆنڤانسیۆنیشی سەبارەت بە گوێ راگرتن لەو سکالاّیانەی کە لەدژی ئەو ولاّتە کراون پەسند بکا. بەو مەرجەی کە سکالاّکە پێوەندی بە کۆمیسیۆنەوە هەبێ، کۆمیسیۆن لەم بارەوە لێکۆڵینەوە دەکا، بەو مەرجەی ئەو کەسە سکالاّکەی بردبێتە دادگا نێوخۆییەکانی [ بەلاّم لەوێ چارەسەر نەکرابێ یان چارەسەریان نەکردبێ.] لە حاڵێکدا کە کۆمیسیۆن نەتوانێ چارەسەری دوستانە بدۆزێتەوە، راپۆرت و پێشنیارەکان بۆ بریاری کۆتایی دەنێردرێتە کومیتەی وەزیرانی ئەنجوومەنیی ئەورووپا. ولاّتانی ئەندامی کۆنڤانسیۆن لەوەدا سەربەستن کە دەسەلاّتی زۆرەملێی دادگای مافی مرۆڤی ئەورووپی لەسەر ئەو مەسەلانەی کە پێوەندییان بە راڤە کردن و کردەوەکانی کۆنڤاسیۆن هەیە، پەسند بکەن. کۆنڤاسیۆنی مافی مرۆڤی ئەورووپی لە ساڵی ١٩٥٠ و بەشداری ١٥ وەزیری دەرەوەی (ئەندامانی کۆمەڵگای ئەورووپا) ئەورووپا پەسند کراو لە ساڵی ١٩٥٣ەوە بریارەکانی جێبەجێ دەکرێن. ئیستاکە ٢١ ولاّت ئەندامی کۆنڤانسیۆنن و چەند پرۆتۆکۆلی دیکەش خراوەتە سەر کۆنڤانسیۆنەکە.

## *کۆنڤاسیۆنی لۆما (١٩٧٥)* — *Lome Convention*

بەو رێککەوتننامە دەگوترێ کە لە رێکەوتی ٢٨ی شوباتی ١٩٧٥ لە نێوان کۆمەڵگای ئابووری ئەورووپا (EEC)و ٤٦ ولاّتی لە حاڵی پەرەسەندن لە لۆما ناوەندی ولاّتی توگۆدا پێکهات. بە پێی ئەم کۆنڤاسیۆنە کۆمەڵگای ئابووری ئەوروپا بەڵێنیدا تا یارمەتی و سەرمایەگوزارییەکانی خۆی بداتە ولاّتانی لە حاڵی پەرەسەندندا تاکوو ئەوانیش دەستیان بە بازارەکانی کۆمەڵگای ئابووری ئەورووپا رابگا.

## كۆنڤانسیۆنی قەدەغە کردنی چەک و چۆڵە کیمیاوییەکان

## Convention On The Prohibition Of Chemiecal Weapons

ئەم کۆنڤاسیۆنە پێشەکیەک، ٢٤ مادده و ٣ دەقی نووسراوی هەیە کە پاشکۆکانی ئەم کۆنڤانسیۆنەش، بە دەقی سەرەکیی کۆنڤانسیۆن دێنە ئەژمار. سکرتێری نەتەوەیەکگرتووەکان، پارێزەری بەرژەوەندییەکانی کۆنڤانسیۆنە. ئامادەکردن و دارشتنی ئەم کۆنڤانسیۆنە نزیکەی ٢٤ ساڵی خایاند و وتوویژەکانی دارشتنی ئەم کۆنڤاسیۆنە لە مانگی حوزیرانی ١٩٩٢ لە کۆنفرانسی چەک داماڵیندا کۆتاییان پێهات و پاشان لە بریارنامەیەکدا لە کۆبوونەوەی چل وحەوتی کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکاندا بە تێکرای دەنگەکان پەسند کرا.

١_ ئامانجی ئەم کۆنڤاسیۆنە پێش گرتن بە بەرهەمهێنان، کەڵەکەکردن، کەڵک وەرگرتن و پەرەپێدانی چەک و چۆڵە کیمیاییەکانە. لە ناوبردنی هەموو چەک و چۆڵە کیمیاییەکان و دامەزراوەکانی بەرهەمهێنی ئەم چەک چۆڵانە لە ماوەی دە ساڵدا و چاوەدێری کردن بەسەر چالاکیە کیمیاییەکانی وڵاتان بە بێ ئەوەی زیان بەپەرە پێدانی تەکنیکی و تەکنەلۆجیای وڵاتان بگەیەنێ ورێنوێنی کردنی هەوڵەکانی ئەم وڵاتانە بە ئاراستەیەکی ئاشتیخوازانەدا، لە ئامانجەکانی دیکەی ئەم کۆنڤانسیۆنەیە.

پرۆتۆکولی ١٩٢٥ی ژنێڤ تەنیا کەڵک وەرگرتن لە چەک و چۆڵە کیمیاییەکانی قەدەغە دەکرد و کۆنڤانسیۆنی میکرۆبی ١٩٧٢ش، سیستەمێکی چاوەدێری کردن، و پشکنینی نەبوو.

٢_ بە پێی ماددەی یەکی کۆنڤانسیۆن، وڵاتەکان بەڵێن دەدەن لە ژێر کاریگەری هیچ بارودۆخێکدا لە پەرەپێدان، بەرهەمهێنان، کەڵەکەکردن و کەڵک وەرگرتنی چەک و چۆڵە کیمیاییەکان (چ لە ناخۆ و دەرەوەی وڵاتی خۆیان دا ) خۆببوێرن. جگە لەمە هەر بە پێی ئەم ماددەیە، کەڵک وەرگرتن لە ماددە کیمیاییەکانی دژەشۆڕشیش قەدەغە کرا.

٣_ بە پێی ماددەی سێ، هەموو وڵاتانی ئەندام، بەڵێن دەدەن لە ماوەی کەمتر لەو ٣٠ رۆژەی کە دەبێ بریارەکانی کۆنڤانسیۆن جێبەجێ بکرێن، چەک و چۆڵە کیمیایی یان دامەزراوەکانی بەرهەمهێنی ئەم ماددانە لە ناوەوەو لە دەرەوەی بازنەی دەسەڵاتی خۆیان، نێوەرۆکی هەوڵ و

مەودای چالاکیی پیشەسازییە کیمیایی و دامەزراوەکانی ژێر کۆنترۆڵی خۆیان و گەلاڵەی رووخاندنی ئەم دامەزراوانە بدەنە ریکخراوی کۆنڤانسیۆن. ئاشکرایە کە وەڵامی ئەرێ یان نا، بەم پرسیارانە لە لایەن هەر ولاتیکەوە پێویستی بە بانکێکی زانیاری دەولەمەند هەیە کە بەپێی ماددەی حەوت سپێردراوەتە بەرپرسانی هەرولاتێک.

٤ــ ئەم کۆنڤانسیۆنە خاوەنی بنچینەگەلی توندوتۆلی پشکنینە. پشکنینی دیاریکراو و پشکنینی لەناکاو بە شێوەی جیاواز جێبەجێ دەبن. پشکنینی لەناکاو ( Challenge Inspection ) گرنگترین جۆری پشکنینە کە لەم کۆنڤانسیۆنەدا باسی لێکراوە. کە لە ماوەیەکی کەم و لەهەر شوێنێکی ولاتی تاوانبار بە بێ ئەوەی ئەم ولاتە مافی نارەزایەتیی دەربڕینی هەبێ، جێبەجێ دەبێ. بەپێی یاساکانی پشکنینی لەناکاو، هەرکاتێک ولاتی "الف" ولاتی "ب"ی بەوە تاوانبار کرد کە چەک و چۆڵی کیمیایی هەیە یان کەڵکی لێ وەرگرتووە، پشکێنەرانی کۆنڤانسیۆن لە ماوەی ١٢ کاتژمێردا لە شوێنی هاتنە ناوەوە کە ئەو ولاتە لەو بەپێش بە ئاگاداری سکرتاریای کۆنڤانسیۆنی گەیاندوە، دەچنە شوێنی پشکنینەکە. ئەم پشکنینانە لە جۆری خۆیاندا بێ وێنەن و بۆ یەکەمجار تەنیا لەم کۆنڤانسیۆنەدا گونجێنراون.

٥ــ سەرەرای ئەم پشکنین و بەڵێنە روونانە، جێبەجێکردنی کۆنڤانسیۆکە نابێ زیان بە هەوڵە ئاشتیخوازنەکانی ولاتان و پەرەپێدانی تەکنەلۆجیا و ئاڵوگۆری سەربەستانەی ماددە کیمیاییەکان بگەیەنێ. بە پێی ماددەی ٦ و پاشکۆکان، ولاتان دەبێ بە شێوەی شیاو و پێویست هەوڵە ئاشتیخوازانەکانی خۆیان لەم پێوەندییەدا بسەلمێنن کە بەسەردانە دیاریکراوەکان راستی هەوڵە ئاشتی خوازانەکان دەسەلمێنرێ.

٦ــ فرۆشتنی زیاتر لە نۆ ماددە کە بە پێی سێ خشتە دیاریکراون، لەگەڵ ٤٥ ماددەی کیمیایی دیکەدا لە لایەن " گرووپی ئوسترالیا" وە بە ولاتانی جیهانی سێهەم قەدەغە کراوە. سەرەرای هەوڵی زۆری ولاتانی جیهانی سێهەم لە ماوەی وتووێژەکاندا، ماددەی ١١ی کۆنڤانسیۆن کە باس لە پەرەپێدانی ئابووری و تەکنیککی دەکا، لە دوای جێبەجێکردنی کۆنڤانسیۆنیش، ولاتانی گرووپی ئوسترالیا ناچار ناکات کە گەمارۆ بازرگانیە بێ بنەماکانی خۆیان لە سەر ولاتانی جیهانی سێهەم هەڵگرن. ئەگەر چی ئەم گرووپە لە مانگی ئابی ١٩٩٢دا راگەیەنراوێکی دەرکرد

که له دوای جێبەجیکردنی کۆنڤانسیۆن، گەمارۆ بازرگانیەکان هەڵ دەگیرێن. بەواتایەکی روونتر، گەمارۆ بازرگانیەیەکان زیاتر زیان بە ولاّتانی جیهانی سێهەم دەگەیەنن کە ئەم ماددانە لەو ولاّتانی گرووپی ئوسترالّیا دەکرن. بۆیە ئەگەر پیشەسازیەکانی ولاّتانی جیهان سێهەم ببنە ئەندامی ئەم کۆنڤانسیۆنە، کەمتر تووشی پاڵە پەستۆو ئاستەنگ دەبنەو گەشەش دەکەن. بەلاّم دەبێ پیشەسازیەکانی خۆیان لەگەڵ پشکنینەکانی کۆنڤانسیۆندا بگونجێنن.

۷ــ بە پێی ماددەی ۱۲ی کۆنڤانسیۆن بۆ ئەو ولاّتە لادەروسەربزێوانەی کە گوێ نادەنە پێشنیارەکانی ئەنجومەنی بەرێوەبەری بۆ چاکسازی، ئەو رەوشەی کە دەبێتە هۆی پێشێل کردنی کۆنڤانسیۆنەکە، سێ قۆناغی سزادان پێش بینی کراوە کە بریتین لە:

۱ــبەرتەسککردنەوە وراگرتنی ئەو ماف وئیمتیازانەی کە کۆنڤانسیۆن بە ولاّتانی ئەندامی داوە.

۲ــ هەوڵی بەکۆمەڵ بە پێی رێوو شوێنەکانی یاسای نێودەوڵەتیی لە دژی ولاّتی تاوانبار .

۳ــ ناردنی کێشەکە بۆ ئەنجومەنی ئاسایش لە هەلومەرجی قەیراناویدا.

بەخشینی دەسەلاّتی سزادان بە رێکخراوی کۆنڤانسیۆن، شتێکی نوێیە لە یاسا نێودەوڵەتیەکانی رێکەوتننامەکاندا، کە تەنیا بەم شێوە لەم کۆنڤانسیۆنەدا لەبەرچاو گیراون و رێکخراوە نێودەوڵەتیەکانی دیکەی وەکوو: رێکخراوی نێودەوڵەتیی وزەی ئەتۆمی، ئەم دەسەلاّتەیان نیە و ئەنجومەنی ئاسایش سەبارەت بەم مەسەلە بریاردەدا.

## *کۆنڤانسیۆنی ڤیەننا سەبارەت بە پێوەندییە دیپلۆماسیەکان (۱۹٦۱)*

## *Vienna Convention On Diphomatic Relations (۱۹٦۱)*

کۆنڤانسیۆنی ڤیەننا، لە پاش کۆنفرانسێکی رێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان لە ساڵی ۱۹٦۱دا، پێکهات. لەو کۆنفرانسەدا، ۸۱ ولاّت بەشدار بوون هەتا سەبارەت بە پێوەندییە دیپلۆماسیەکان واتە، ئەرکە دیپلۆماسیەکان، دەستنیشانکردن، قبووڵ کردن و پلەی سەرۆکی بەرێوبەری ئەرکەکان، دەست پێشخەری، پچرانی پێوەندییە دیپلۆماسیەکان....و هتد، رێووشوێن و یاسا دابرێژن. ئەم کۆنڤانسیۆنە بە پێی رەشنووسی ئامادەکراوی کۆمیسیۆنی یاسای نێودەوڵەتیی

داریژرا بوو. هەوڵەکانی کۆمیسیۆن بۆ دارشتنی کۆنڤانسیۆن سەرکەوتوون بوون، چوونکە دەرئەنجامەکان رەنگدانەوەی یاسا عورفی و رەوتە جێگیرەکانی وڵاتان بوون، ئەگەرچی لە هێندێک بواردا کۆنڤانسیۆن یاسای نوێ و بەرتەسک تری سەبارەت بە پارێزراویە دیپلۆماتیەکان دارشت. سەرەرای ئەوەی کە دیپلۆماتەکان و خێزانەکانیان پارێزراوی سزایی و شارستانی وڵاتی خۆیان هەیە، بەڵام ئەو پارێزراوییە ئەو بوارە بازرگانیی و پیشەییانە ناگرێتەوە کە پێوەندییان بە ئەرکی رەسمیی دیپلۆماتەوە نیە. هەروەها فەرمانبەرە ئیداری و تەکنیکیەکان پارێزراوی تەواو هاوشێوەی دیپلۆماتیان نیە، و یاسای سزاو شارستانی وڵاتی خانەخۆی تەنیا لە بوارانەدا پشتیوانیان لێدەکا کە رەسمین. ئەم کۆنڤانسیۆنە هەروەها بوارەکانی: بەخشراو بوون لە جۆرەجیاوازەکانی باج، گواستنەوە سەفەرکردن، پێوەندییەکان (نووسراوەو...هتد)، گومرک، کەرەسەکانی ناومال و پەرنەوەو ترانزیتی دیپلۆمات لە وڵاتانی سێهەم و هەڵنەکوتانەسەر شوێنی بەرێوەبردنی ئەرکی دیپلۆمات (کەرەسەکانی ناومالْ، سامان، سەیارەو بەڵگەنامەکان) لە خۆدەگرێ. ئەم کۆنڤانسیۆنە لە ساڵی ١٩٦٤ەوە جێبەجێ دەبێ.

### کوکتێل مولۆتۆف — *Molotov Cocktail*

ئەم زاراوە لە نێوی ڤیاچێسلاو مولوتۆف (١٩٨٦ــ ١٨٩٠)، وەزیری بە ناوبانگی دەرەوەی یەکیەتیی سۆڤیەت لە سەردەمی شەری دووهەمی جیهانی، وەرگیراوە و بەو بۆمبە ساکارە بەنزینیە دەگوترا کە پارتیزانەکان لە دژی هێزەکانی ئەڵمانیای نازی لە بەرەکانی رووسیا و بالکاندا، کەڵکیان لێوەردەگرت.

### کۆنڤانسیۆنی ڤیەننا سەبارەت بە پێوەندییە کۆنسولیەکان (١٩٦٣)

### *Vienna Convention On Consular Relations (١٩٥٣)*

ئاکامی یەکێک لە کۆنفرانسەکانی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانە کە لە ساڵی ١٩٦٣ و بەشداری ٩٢ وڵات لە ڤیەننا، بەمەبەستی دارشتنی یاسا سەبارەت بە ئەرکەکان، ماف و ئیمتیاز و پارێزراوییە کۆنسۆلیەکان پێکهات. بنەمای کاری ئەم کۆنفرانسە، بەپێی رەشنووسی

ئامادەكراوی كۆنسولی بوو. وەكوو: پارێزراوی لە دەستبەسەركردن، تاكاتی دادگاییكردن (جگەلە تاوانە قورسەكان )؛ پارێزراوی لە قۆڵبەست كردن تا كاتی دەرچوونی بڕیاری كۆتایی، ئازادی سەفەركردن و نامەناردن (هەرنووسراوەیەكی دیكە)، ئازادی بینین و سەردانی ئەوهاوولاتیانەی كە خەڵكی ولاتی كۆنسولن و لە بەندیخانەی ولاتی خانەخوێدا گیراون و پارێزراوی لە سەلاحییەتی ئەو كێشانەی بە هۆی ئەركە كۆنسولیەكان دێنە ئاراوە، جگە لەمە نابێ هێرش بكرێتە سەر كۆنسولخانەكان و (ئەو شوێنانەش كە سەربە كونسۆلخانەن) و بەڵگەنامەكانیان. ئەم كۆنڤانسیۆنە لە ساڵی ١٩٧٦ەوە جێبەجێ دەبێ.

### *كۆنڤانسیۆنی ڤیەننا سەبارەت بە نوێنەرایەتیی ولاتان، لە پێوەندییەكانیان لەگەڵ ئەو ڕێكخراوە نێودەوڵەتیانەی كە تایبەتمەندیی جیهانیان هەیە(١٩٧٥).*

### *Vienna Convention On The Representation Of States In Their Relations With International Organiziation Of a Universal Characte r(١٩٧٥)*

نموونەكانی پێكهاتنی ئەم كۆنڤانسیۆنە، كۆنڤانسیۆنی ڤیەننا سەبارەت بە پێوەندییە دیپلۆماسیەكان (١٩٦١) وكۆمیسیۆنی یاسای نێودەوڵەتی ( I LC) بوون. ئەو نوێنەرایەتی، ڕاسپاردە و بەڕێوەبەرانە دەگرێتەوە كە ولاتان دەیانێرنە ڕێكخراوە كۆنفرانسە نێودەوڵەتی و جیهانیەكان. ئەم كەسانەش وەكوو دیپلۆماتەكان مافی پارێزراوبوونی سیاسیان هەیە كە بە پێی كۆنڤانسیۆنی ١٩٦١ پێیان بەخشراوە. لە ڕاستیدا ئەم پارێزراوییانە لەو حالانە كە لە كۆنڤانسیۆنی ١٩٦١ دا ئاماژەیان پێكراوە بەربلاوترن. چوونكە پارێزراوییەكی زۆرتر بۆ فەرمانبەران پێك دێنن.

### *كۆنڤانسیۆنی فڕۆكە ڕفاندنی لاهە (١٩٧٠)*

### *The Hague Air Hijacking Convention (١٩٦٥)*

كۆنڤانسیۆنێكی چەندلایەنەیە كە لە لایەن ڕێكخراوی ئیكائۆ (ڕێكخراوی فڕۆكەوانی نێودەوڵەتیی) بەمەبەستی كۆتاییهێنان بە دەستبەسەرداگرتنی فڕۆكە مەدەنیەكان دارێژراوە و ١٣٠ ولات مۆریان كردووە. كۆنڤانسیۆنی فڕۆكەرفاندنی لاهە ڕێككەوتننامەیەكی گرنگی نێودەوڵتیە كە

چوارچێوەی یاسایی ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ دەستبەسەرداگرتنی فڕۆکەی لە حاڵی فڕیندا دیاری دەکا. کۆنڤانسیۆن بەبێ ئاماژەکردن بە" فڕۆکە ڕفاندن "؛ ئەم تاوانەی پێناسە کردووەو هەموو ئەو وڵاتانەی کە ئەم ڕێککەوتننامەیان مۆر کردووە، ناچار دەکا بە توندترین شێوە، سزا بۆ ئەم تاوانە ببڕنەوە و هەر وڵاتێکی ئەندامی کۆنڤانسیۆنیش دەبێ بۆ سەلماندنی دەسەڵاتی خۆی لەسەر تاوانی فڕۆکە ڕفاندن، ئەم تاوانە بخاتە ناو یاسای سزاکانی خۆیەوە. دەوڵەتەکان لەم حاڵەتانەدا دەتوانن کەسی ڕفێنەر سزا بدەن:

١ــ ئەگەر تاوانەکە لە ناو فڕۆکەی تۆماری کراوی ئەووڵاتەدا کرابێ کە کۆنڤانسیۆنەکەی مۆر کردووە.

٢ــ نیشتنەوەی فڕۆکە لەیەکێک لەو وڵاتانەی کە ئەم کۆنڤانسیۆنەیان مۆر کردووە.(بەپێی یەکێک لە بەندەکانی کۆنڤانسیۆن کە ڕێگا بە گرتنی فڕۆکە ڕفێن دەدا)

٣ــ ئەگەر تاوانەکە لە فڕۆکەی بە کرێدراوی ئەو وڵاتەدا کرا و ئەو کەسەی فڕۆکەکەشی بە کرێ گرتووە شوێنی سەرەکی بازرگانی و نیشتەجێ بوونی بەردەوامیشی لەو وڵاتەدا بێ. هەموو ئەو وڵاتانەی کە کۆنڤانسیۆن مۆر کردووە، دەبێ فڕۆکەڕفێنەکان بگرن، بە بێ گوێدانە ئەوەی کە ئایا فڕۆکە ڕفاندنەکە لەو وڵاتەدا کراوە یان نا و، لەبنەڕەتدا دەبێ بەبێ سەرنجدانە ئەوەی کە بۆچی فڕۆکەکە ڕفێنراوە، فڕۆکەڕفێنەکان بگیرێن.

### کو ــ کلۆکس ــ کلان *Ku – Klux – Klan (K.K.K)*

کۆمەڵێکی نهێنیی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بوو کە بە تایبەتی لە دژی ڕەش پێستەکان، ودوایە کاتۆلیک جوولەکە و بیانیەکان لەو وڵاتەدا، ڕادەوستا. ئەم ڕێکخراوە لە سەرەتادا لە باشووری ئەمەریکا و لە دوای شەڕێنوخۆییەکانی ئەم وڵاتە بەمەبەستی پێشگرتن بە پێشکەوتنی کۆیلە ڕزگار بووەکان پێکهات .

ئەگەرچی ڕێکخراوی Ku – Klux – Klan لە ساڵی ١٨٦٩دا بەرەسمیی قەدەغە کراو هەڵوەشایەوە، بەڵام کۆنگرە دوایە ناچار بوو یاسای تایبەتی لە دژی ئەم ڕێکخراوە پەسند بکا.

ئەندامانی ئەم ڕێکخستنە تێدەکۆشان هەوڵەکانیان زیاتر توندوتیژانە بێ و نەیارەکانیان زیاتر بترسێنن، تەنانەت لە دوای شەڕی یەکەمیی جهانیشدا هەروا بەردەوام خەریکی تێکۆشان بوون.

نیشانەکەیان " خاچی ئاورین " بوو کە لەسەر زۆربەی شوێنەکانی ئەمەریکا دا بەرچاو دەکەوت. دەزگای F.B.I بە ڕێبەرایەتیی ئێدگار هوور ڕۆڵێکی کاریگەری لە بەرتەسک کردنەوەی تێکۆشانی ئەم ڕێکخراوەدا هەبوو.

لە دوای پەسندکردنی یاسای نەمانی هەڵاواردنی ڕەگەزی لە قوتابخانەکانی ئەمەریکادا (١٩٥٤)، کو ـ کلۆکس ـ کلانەکان هەروا درێژەیان بە تێکۆشانی خۆیاندا و لە ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٥٥دا ناوی " ئەنجوومەنی هاوڵاتیە سپیەکان" ڕۆڵێکی گرنگیان هەبوو. لە دەیەی ١٩٦٠دا، ڕادەی دژایەتیی خۆیان لەگەڵ ڕەش پێستەکان زۆرتر کرد وتەنانەت هەڕەشەشیان لەو سپی پێستانە دەکرد کە لەگەڵ بزووتنەوەی مافە مەدەنیەکاندا هاوکاریان دەکرد و هێندێکیشیان لێ تیرۆر کردن. لەم ساڵانەی دواییدا سەرەڕای تەشەنەکردنی زیاتری کو ـ کلۆکس ـ کلانەکان لەناو کۆروکۆمەڵەکانی ئەمەریکا و بەتایبەتی لە قوتابخانەکاندا، گرووپ گەلێکیان بە نێوی " ڕاستی نوێ" پێکهێناوە، بەڵام وەکوو جاران ناتوانن بە شێوەی ڕاستەوخۆلەگەڵ هێزی "ڕەش پێستەکان "دا دژایەتیی بکەن.

## Komsomol

### کۆم سۆمۆل

زاراوەیەکی ڕووسیە کورتکراوەی Komunisticheski Soyuz Molodezkiیە.

کۆم سۆمۆڵ " یەکیەتیی لاوانی کۆمۆنیست" ە. ئەم ڕێکخستنە لە ڕاستیدا ڕێکخراوی لاوانی حیزبی کۆمۆنیستی یەکیەتیی سۆڤیەتی سوسیالیستی بوو.

## Kibboutz

### کیبۆتس

وشەیەکی عیبریە بە واتای "کۆ"یە. کیبۆتس یەکەمین گوندەکانی ئیسرائیل بوون کە کۆچبەرە بێکارە جووەکان لەم گوندانەدا نیشتەجێ دەکران و زەوی زارە بێ کەڵکەکانیان ئاوەدان دەکردەوە و دەیان کێلاّن. لە ساڵی ١٩٢٧دا پێڕەوی ئەم گوندە هاوبەشانە دارێژرا. کیبۆتسەکان، کۆمەڵگا کشتووکاڵیە تایبەتیەکانن کە لەسەر بنەمای دێموکراسی ڕێکخراون. ژیانی ماددی ئەم

کۆمەڵگایانە بە شێوەی ڕەها بەکۆمەڵ و بەهاوبەشی بەڕێوەدەچن. هەموو کەسێکی ساغ و پێگەیشتوو(گەورە) دەبێ کاربکا. ئەم کۆمەڵگایانە ئاگاداری لە منداڵ و پیر و نەقوستانەکان دەکەن. خۆراک، پێویستیە سەرەتایی و بنەڕەتیەکانی ژیان دەبێ بە شێوەی هاوبەش بێ. کەرەسە بەکاربەریەکان بە پێی پێویستی دابەش بکرێن، حەقدەستێک.لە ئارادانە بێ. منداڵەکان بەکۆمەڵ و بەپێی شێوازە پەروەردەییە نوێکان و لە شوێنیکدا گەورە بکرێن. هەموو کیبۆتسەکان بەپێی بیروبرواکانیان لە ناو ٥ یەکیەتیی یان فیدراسیۆندا ڕێکخراون (کرێکاری، لیبرال، ئایینی، و دووبۆچوونی مارکسیش). ئەم سیستەمە لە سیستەمی کەلخووزی یەکیەتیی سۆڤیەت وەرگیراوە.

## کۆنکۆرد *Condcorde*

دەتوانین کۆنکۆرد بە ئیرادە و ویستی گرووپێک سەبارەت بەئامانجێکی هاوبەش یان سەبارەت بە ڕوانگەو بیروبۆچوونێک پێناسە بکەین. یان دەتوانین بڵێین کۆنکۆرد کۆک بوون لە سەر ئامانجێکی هاوبەشی گشتیە (ئاشتی، دادپەروەری و هەماهەنگیی). لە وڵاتێکدا کە ئامانجێکی دیاریکراو بە سەر خەڵک دا دەسەپێ، کۆنکۆرد ساناتر پێکدێ و، ئەمەش پێوەندی بەوەوە هەیە کە بزانین نێوەرۆکی ئەو ئامانجە چیە. ئاشتی و ئارامی ناو وڵاتێک لە ڕێگای هاوسەنگی ڕێکخراوەیی و هەماهەنگیی کۆمەڵگا وەدەست دێ کە هەرکەس (ئاغاو ڕەشایی و فەرماندە و...هتد) لەو کومەڵگایەدا لە شوێنی خویدا بێ، بە جۆرێک کە ببێتە هۆی بەردەوامی و مانەوەی حکومەت. لەو کاتانەدا کە شەڕی نێوخۆیی و شەڕی ئایینی زیاتر لە شەڕی دەرەوە، دەبێتە هۆی لێکترازان و دوورکەوتنەوەی کۆمەڵگا ، لەم حاڵەتانەدا نابێ چاوەڕوانی یەکگرتوویی لە تاکەکانی کۆمەڵگا بکەین. لەم حاڵەتانەدا ئایین یان ڕێبازێکی ئەخلاقی، زیاتر تاکەکان ڕێک دەخا و ئاسایشی دەروونی تاکەکان دابین دەکا.

## کۆنترۆڵ
## *Containment*

یەکێک لە بنەماکانی سیاسەتی دەرەوەی ئەمەریکا بۆ پێشگرتن لە تەشەنەکردنی کۆمۆنیزم لە جیهان و داگیرکاری یەکیەتیی سۆڤیەت بوو. تیۆری "کۆنترۆڵ" لە دوو قۆناغی بەرنامەی هاوکاریکردنی تورکیا ویۆناندا جێبەجێ کرا(١٩٤٧). قۆناغی یەکەم لە تیۆری ترۆمێندا دەرکەوت کە پێشی بە بەبلاوتر بوونی سنووری جوگرافی سۆڤیەت دەگرت . لە قۆناغی دووهەمدا ئەمەریکا ئەو مافەی بە خۆی دەدا کە لە هەر شوێن و ساتێکدا کە بیهەوێ، پێش بە تەشە نەکردنی کۆمۆنیزم بگرێ.

## Dnal Containment

## کۆنترۆڵی دوو لایەنە

یەکێک لە ستراتیژییەکانی ئەمەریکا لە بەرامبەر ئێران و عێراقدا بوو. ئەمەریکا دەیهەویست لە ڕێگای ئەم ستراتیژییەوە، ئەم دوو وڵاتە کۆنترۆڵ بکا و تەریکیان بکاتەوە. دژایەتی ئێران لەگەڵ پرۆسەی وتووێژی عەرەبەکان و ئیسرائیل لە کۆنفرانسی مەدرید لە دەیەی ٩٠دا و قووڵبوونەی دوژمنایەتیی ئەمەریکا [بە هۆی فشارەکانی ئیسرائیل] و هەروەها هێرشی عێراق بۆ سەر کوێت و کەوتنە مەترسی بەرژەوەندییەکانی ئیسرائیل لە لایەن عێراقەوە لە کۆتاییەکانی ئاياری ١٩٩٣، بوونە هۆی هاتنە ئارای سیاسەتی کۆنترۆڵی دوولایەنە. بەڵام بە بڕوای ئەمەریکیەکان ئەم سیاسەتە تەنیا لە سەر عێراق جێبەجێ دەکرا بۆیە سیاسەتێکی هاوسەنگ لە بەرامبەر ئەم دوو وڵاتەدا جێبەجێ نەدەبوو. لاسەنگیەکە بەلای ئێران دا، بوو بە هۆی ئەوەی کە ئەمەریکا لە ساڵی ١٩٩٥دا بە تەواوەتیی ئەم سیاسەتە جێبەجێ بکا. بۆیە کلینتۆن لە بەرنامەی کاری ژمارە١٢٩٥٧، سەرۆک کۆماری لە ڕێکەوتی ١٨ ئازاری ١٩٩٥دا، هۆکاری گەمارۆدانی ئێرانی بەم شێوەیە ڕاگەیاند: "ئێران هەڕەشەیەکی گەورە لەسەر ئاسایشی نیشتمانی، سیاسەتی دەرەوە و ئابووری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکایە" . لەم ئاراستەدا، کلینتۆن ئاماژەی بەسێ هۆکار کرد:

١_ کردەوە تیرۆریستەکانی ئێران کە هەڕەشەن لە ئاسایش و ئاشتیی گەلانی جیهان دەکەن.

٢_ ستراتیژیی پشتیوانیکردنی ئێران لە "تیرۆریزمی نێودەوڵەتیی" بۆوێنە پشتیوانیکردن لەو کردەوانەی کە ئاشتی ڕۆژهەلاتی نێوەڕاست دەخەنە مەترسیەوە.

٣_هەوڵی ئێران بۆ دەستراگەیشتن بە چەک و چۆڵە کۆمەڵکوژەکان.

مارتین ئیندیک، وێرای دووپاتکردنەوەی ئەو خاڵانە، ئاماژەی بە چەند هۆکاری دیکەش کرد:

١ــهەوڵی ئێران بۆ دەستڕاگەیشتن بە توانایی هێرش بردن لە بواری چەک و چۆڵە ئاساییەکان بە مەبەستی ترساندنی دراوسێکانی خۆی

٢ــمافی مرۆڤ و دیموکراسی.

بەرپرسانی ئەمەریکا پێیانوابوو کە هەوڵەکانی ئێران بەرژەوەندییە بنەڕەتیەکانی ئەمەریکا لە ناوچەدا دەخاتە مەترسیەوە. بەرژەوەندییەکانی ئەمەریکا لە ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست بریتین لە :

١ــ سەرکەوتن لە پرۆسەی ئاشتی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست دا کە گرنگترین مەبەستی دەوڵەتیی کلینتۆنە.

٢ــ ئاسایشی دۆستان و هاوپەیمانانی ئەمەریکا بە تایبەتی لە ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاستدا.

٣ــ پەرەپێدانی دیموکراسی و بازاڕە ئازادەکان، لە ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاستی ئارام، سەقامگرتوو و خوازیاری پاراستنی بەرژەوەندییە بنەڕەتیەکانی ئەمەریکا لە کەنداوی فارس دا.

بەگشتی چوار ڕوانگەی جیاواز سەبارەت بە سیاسەتی کۆنترۆڵی دوو لایەنە لە ئارادایە:

ڕوانگەی یەکەم : سیاسەتی کۆنترۆڵ بە "سەرکەوتوو" دەزانێ.

ڕوانگەی دووهەم: سیاسەتی کۆنترۆڵ بە "دۆڕاو" دەزانێ.

ڕوانگەی سێهەم: بە "هەڵە"ی دەزانێ. وچوارەمین ڕوانگەش : باسی دۆڕان و سەرکەوتن ناکا، و سیاسەتی کۆنترۆڵ بە " سیاسەتێکی شێلگیر" دادەنێ.

### *کۆنڤانسیۆنی مافی سیاسیی ژنان*

### *Convention On Political Rights of Women*

کۆمەڵەی گشتیی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان (un) لە ڕێکەوتی ٢٠ی کانوونی یەکەمی ١٩٥٢دا، کۆنڤانسیۆنی مافی سیاسی ژنانی پەسند کرد. بەپێی ئەم کۆنڤانسیۆنە دەوڵەتانی ئەندامیی un بۆ پشتیوانیکردن لە ماددەکانی پێڕەوپرۆگرامی un و ڕاگەیەنراوی جیهانیی مافی مرۆڤ، بەڵێن دەدەن کە بڕوایان بە مافی یەکسانیی سیاسی ژنان لەگەڵ پیاواندا هەبێ. بەپێی

نێوەرۆکی ئەم کۆنڤانسیۆنە، ژنان بەبێ جیاوازیدانان، وەکوو پیاوان مافی یەکسانیی هەڵبژاردن، هەڵبژێردران، گەیشتن بە پۆستە گشتیەکان و بەڕێوەبردنی ئەرکە گشتیەکان دەبێ.

## کۆنڤانسیۆنی قەدەغەکردنی هەڵاواردن لە پەروەردەدا
## Convention Against Discrimination In Edacntion

لە ساڵی ١٩٦٠دا کۆنفرانسی گشتیی یۆنسکۆ ئەم کۆنڤانسیۆنەی پەسند کرد. دەوڵەتانی ئەندامیی ئەم کۆنڤانسیۆنە بەڵێنیان داوە هەموو ئەو و ڕێوشوێنانە هەڵوەشێنێتەوە کە دەبنە هۆی جیاوازی دانان لە پەروەردەدا.

## کێشەی کشمیر
## Kashmir Question

هەرێمی جامۆوکشمیر لە باکووری پەنجاب دا هەڵکەوتووە و لەگەڵ هیند، پاکستان و تەبەت لە ڕۆژهەلات و ئەفغانستان لە ڕۆژئاوا و ویلایەتی سینگ کیانگی چین و تاجیکستاندا هاوسنوورە. پانتایی ئەم ولاتە٢٢٢/٢٣٦ کیلۆمەتری دوو جایە.

لە دوای دابەشبوونی هیند لە ساڵی ١٩٤٧دا، هەرێمی، کشمیر سەرپشک کرا لەوەی کە بچێتە پاڵ هیند یان بچێتە پاڵ پاکستانەوە. مەهاراجای کشمیر (میرنشین) کە بۆخۆی هیندوو بوو، رایگەیاند کە کشمیر دەچێتە پاڵ هیندستانەوە. دەوڵەتی پاکستان دژی ئەم هەڵوێستەی مهاراجای کشمیر راوەستا، چوونکە زۆرینەی خەڵکی کشمیر موسڵمان بوون. بۆیە ئەمە بوو بە هۆی گرژی و ئالۆزی لە نێوان هیندووەکان و موسڵمانەکاندا. لەپاش ئەوەدا ماهاراجای کشمیر لە تشرینی یەکەمیی ١٩٤٧دا، بەرەسمیی داوای لە هیندوستان کرد کە ئەم ویلایەتە ببێتە ویلایەتێکی هیندوستان. هیندوستان بەتەنگ داواکەی ماهاراجاوە هات بەومەرجە دوای هێور بوونەوەی بارودۆخی کشمیر، مەسەلەی چارەنووسی ئەم هەرێمە بخرێتە بەر ریفراندۆمەوە. هێزە سەربازییەکانی هیندوستان وێرای سەرکوتکردنی ئەوکەسانەی کە دژایەتیان لەگەڵ ئەوەدا دەکرد کە کشمیر ببێتە بەشێک لە هیندوستان، بەشی گەورەی ناوچەی ناوەراست و باکووریی ئەم هەرێمەیان خستە ژێر کۆنترۆڵی خۆیانەوە. لەلایەکی دیکەوە لە تشرینی یەکەمیی ١٩٤٧دا،

حکومەتێک بە نێوی حکوومەتیی ئازادیی کشمیر بە پشتیوانی پاکستان لە کشمیردا پێکهات و بەشێک لە ناوچەکانی رۆژئاواو باشووری رۆژئاوای خستە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە.

لەسەرەتاکانی ۱۹٤۸دا، دەوڵەتی هیند ئەنجوومەنیی ئاسایشی UNی ئاگادار کردەوە کە ئاسایش و ئارامیی کشمیر بە هۆی هێرشی هۆزەکانی سەر سنوورەوە کەوتۆتە مەترسیەوە و پاکستانی بەم کارە تاوانبار کرد. پاکستان وێڕای رەتکردنەوەی ئەم تاوانە، چوونە پاڵی کشمیری بە هیندوستان، بە نایاسایی دانا و لە دژی هیندوستان، سکاڵانامەیەکی ئاراستەی UN کرد. ئەنجومەنیی ئاسایش لە دوای تاوتوێکردنی کێشەکە، کۆمیسیۆنێکی بە نێوی کۆمیسیۆنی UN بۆ هیندو پاکستان پێکهێنا. ئەندامانی ئەم کۆمیسیۆنە لە نوێنەرانی چیلسلۆڤاکیا، ئەرژەنتین، ئەمەریکا و بەلجیکا پێکهاتبوون. کۆمیسیۆن داوای لە دوو دوەڵەتەکە کرد بڕیاری ئاگربەس بە هێزەکانی خۆیان بدەن. ئەومەرجانەی کە کۆمیسیۆن دیاری کردبوون، لەلایەن پاکستان و هیندوستانەوە پەسند کران و هەوڵەکانی کۆمیسیۆن هیچیان لێ شین نەبۆوە.

لەو کاتەوە کێشەی کشمیر چەند جار لە unدا هاتۆتە گۆڕێ و چەند بڕیارنامەش سەبارەت بە کێشەی کشمیر دەرچوون، بەڵام کێشەکە هەروا بەچارەسەرنەکراوی ماوەتەوە. لەم نێوەدا شێخ.عەبدوڵلاّ، سەرۆک وەزیری پێشووی کشمیر کە بۆ ماوەی ۱۲ ساڵ لە هیندوستاندا بەند کرابوو، ئازاد کرا. شێخ عەبدوڵلاّ لە دوای ئازاد بوونی، جارێکی دیکە داوای لە هیندوستان کرد کە رێگا بە خەڵکی کشمیر بدا لە رێگای راپرسیەکی گشتیەوە چارەنووسی خۆیان دیاری بکەن. بە تەشەنەکردنی کێشەی نێوان پاکستان و هیندوستان لەسەر کشمیر، لە ئابی ۱۹٦٥دا لە نێوان ئەو دوو وڵاتەدا شەڕهەڵایسا. بەنێو بژیوانی UN لە دوای سێ حەوتوو شەڕکردن، ئاگربەس راگەیەنرا. بەدوای ئەم شەڕەدا رێبەرانی دوو وڵات لەسەر بانگهێشتنی سەرۆک وەزیری سۆڤیەت لە تاشکەند(ناوەندی کۆماری تاجیکستان) کۆبوونەوە و لە راگەیەنراوێکدا بەڵێنیان دا. کە هێزەکانی خۆیان بکشێننەوە بۆ هێڵەکانی پێش کاتی شەڕ. دوو لایەن بەشێوەی نارەسمی، بارودۆخی کشمیریان پەسند کرد.

لەو کاتەوە تا کاتی دەسپێکردنی شەڕی سێهەمی هیند و پاکستان کە بوو بە هۆی لەت بوونی پاکستان و سەربەخۆیی بەنگلادیش، بە شێوەیی کردەیی هیچ هەوڵێک بۆ چارەسەری ئەم کێشە نەدراوە. هیندوستان کشمیر بە بەشێک لە خاکی خۆی دەزانی و ئەو بەشەی کە پاکستانیش

پێی دەڵێ؛ کشمیری ئازاد بە کشمیری داگیرکراوی دەزانێ. هیندوستان پێیوایە کە شتێک بەناوی خودموختاری یان پرس کردن بەرای گشتی بۆ دیاریکردنی چارەنووسی کشمیر لە ئارادانیە و کشمیر بەشێکی دانەبڕاوەی هیندوستانە. هێڵی ئاگربەسی کشمیر جارێکی دیکە لە ڕێککەوتننامەی "سمیلا" کە لە نێوان ئیندیراگاندی و بوتۆ لە دوای شەڕی سێهەمی هیند و پاکستان لە ساڵی ١٩٧٢دا مۆر کرا، دانی پێدا نرا.

لەلایەکی دیکەوە پاکستان پێیوایە کە سەبارەت بە کێشەی کشمیر دەبێ پرس بە رای گشتی بکرێ و مافی دیاری کردنی چارەنووس بدرێتە خەڵکی کشمیر. بۆیە ئەوبەشەی کەلە ژێر دەسەڵاتی پاکستان دایە، نەیخستۆتە سەرخاکی خۆی و پێی دەڵێ کشمیری ئازاد. پاکستان بەردەوام هەوڵ دەدا بە هێنانە گۆڕی کێشەی کشمیر لە UNدا، بیکاتە مەسەلەیەکی نێودەوڵەتیی، لە حاڵێکدا هیندوستان پێیوایە بە پێی ڕێککەوتننامەی سمیلا دوو وڵات دەبێ کێشەکانی خۆیان لە ڕێگای وتووێژی دوو لایەنەوە چارەسەر بکەن.

لە دوای ڕووداوی ١١ی ئەیلوول و تاوانبارکردنی پاکستان لە لایەن هیندەوە سەبارەت بەوەی کە پاکستان پشتیوانی لە تیرۆریزمی نێودەوڵەتی دەکا، چەند سەد هەزار کەس لە هێزە سەربازییەکانی ئەو دوو وڵاتە لەبەریەک ڕاوەستان و خەریک بوو تووشی شەڕێکی سەربازی بن و دەست بۆ چەکی ناوەکی ببەن.(حوزیرانی ٢٠٠٢).

## کۆنسەرڤاتیڤ (کۆنەپارێزی) Conservatism

کۆمەڵێک بیروبۆچوونی سیاسییە کە داکۆکی لە داموو دەزگا کۆن و لە مێژینەکان دەکا و دژی دامودەزگا نوێکان رادەوەستێ و هەروەها دژی ئەو شتانەشە کە نوێن و تاقی نەکراونەوە. پارێزگارەکان لە سەر گرنگی یاسا و ڕێکخستن، یەکگرتوویی، نەریت، پارێزکردن لە داهێنانی شتی نوێ وڕێککەوتننامە کۆمەڵایەتیەکان پێداگری دەکەن و حاشا لەوە دەکەن کە خراپە بە شێوەیەکی رەها لە سەر جیهان دا خاشەبڕ ببێ، چوونکە پێیانوایە کە مرۆڤ بە شێوەیەکی زاتی خاوەنی کەم و کوورییە.

کۆنەپارێزی لە نەریتیی سیاسی بەریتانیادا پێگەیەکی بەهێزو دیاری هەیە. مێژووی کۆنەپارێزی لە بەریتانیادا دەگەڕێتەوە بۆ ماوەی نێوان ساڵەکانی ١٨٤٠_١٨٣٥ و لەو کاتەوە ئەم

نازناوە شوێنی نازناوی "تۆری" گرتەوە، ئەگەرچی بەتەواوەیی نەسڕایەوە. لە سیستەمی سیاسی بەریتانیادا، حیزبی پارێزگاران بەردەوام یەکێک لە حیزبە هەرەگەورەکان بووە و کەسایەتیەکانی وەکوو: ئێدمۆند برێک، کالریج، پیل و دیزرائیلی رۆلێکی گەورەیان لە گەشە پێدانی نەریتی کۆنە پارێزی سیاسی بەریتانیادا هەبووە. کۆنەپارێزی هیچ کاتێک سیستەمێکی پتەوی فەلسەفیی نەبووە؛ بەڵام دەتوانین بەم شێوە باسی بنەما گشتیەکانی بکەین:

کۆنە پارێزی دژی رادیکاڵیزم و شۆڕشە، ئەمە گرنگترین و بنەڕەتیی ترین تایبەتمەندیی کۆنەپارێزییە. بە بڕوای پارێزگارەکان؛ شۆڕشگێرەکان و رادیکاڵەکان تەنیا بەپێی کۆمەڵێک ئامانجی تیۆری و ئایدۆلۆژی دەیانەوێ زۆربەی دامو دەزگا سیاسییەکان لە سەر بنەمای تیۆری دامەزرێنن، و پەلە دەکەن و ناهێڵن ئەم داموو دەزگایانە بۆ خۆیان لە ناو رەوتی رووداوەکاندا سەر هەڵدەن و بە شێوەیەکی خۆڕسک و بەپێی پێویستی کۆمەڵگا بێنە ئاراوە". "نموونەی رەهای یۆتۆپیایی، لە هەمووو ئەم بنەما تیۆرە ئابستراکتانە مەترسیدارترە، چوونکە هیچ شتێک بەرادەی دیمەنی سەرنجراکێشی یۆتۆپیا، بۆ پێشکەوتنی راستەقینە زیانبارتر نیە، سیاسەت لە کردەوەدا لاوازە، و هیچ شتێکیش لەوە مەترسیدارتر نیە کە لە هێزو زۆر بۆ وەدیهێنانی ئامانجەکان کەڵک وەرگیردرێ ". لە پاڵ تیۆری بەرتەسک بوونی دەسەڵاتی دەوڵەتدا، چەمکی کۆمەڵگا وەک گشتێکی پێکهاتوو؛ لە بەشە سەربەخۆکان، راوەستاوە. بە پێی ئەم تیۆرە کۆمەڵگا زیاتر لە ئۆرگانیزم دەچێ تا وەکوو لە مەکینە بچێ. کۆمەڵگا تان و پۆیەکی ئالۆزی پێوەندییە مرۆییەکانە کە بەرنامە چاکسازییە گەورە و بە پەلەکان، بە سانایی رێکخستنی ئەم تان و پۆیانە هەڵ دەوەشێننەوە. جگە لەمەش، کۆمەڵگا ئۆرگانیزمێکە کە تێپەرینی زەمان و قۆناغە مێژووییەکان؛ پێوەری سەرهەڵدان و گەشە سەندنیەتی و بە کات هەڵدەسەنگێنرێ و پێوەرەکەشی، بەردەوام بوونیەتی. بۆیە پارێزگارەکان بایەخێکی تایبەتی بە " لە مێژینە بوون" دەدەن و هەرچەندە داموودەزگا کۆمەڵایەتیەکان کۆن تربن، ئەوانە پتر داکۆکیان لێ دەکەن. پارێزگارەکان بەردەوام چاو دەبڕنە ئەزموونە چرو پرەکانی جیلەکان و هەوڵ دەدەن بە خوێندنەوەی رۆحی ئەو ئەزموونانە، چاکسازی لە شتێکدا پێک بێنن. ئێدمۆند برێک دەڵێ: " من بڕوام بە چاکسازی هەیە ...... بەڵام تەنانەت کاتێک کەشتێکیش دەگۆڕم، دەبێ ئەو گۆڕانە بپارێزم ...... کە دەمانەوێ شتێکی نوێ بکەین، دەبێ چاو لە رابردووەکانمان بکەین. من تا بۆم بکرێ ، دەبێ لە رووی شێوازی وەستاوە، بیناکەم نوێ بکەمەوە".

کۆنەپاریزی، تەنیا خوێندنەوەیەکی رەهای رووناکبیرانە سەبارەت بە رووداوە سیاسییەکان نیە. بنەما گشتیەکانی سیاسی و ئابووری پارێزگاری لە بەریتانیادا بریتین لە: پاراستنی پاشماوەی لیبراڵیزم، رێزدانان بۆ خاوەندارێتی تایبەتیی، و بروا بە پلەیەک لە نایەکسانی لە نێوان خەڵکدا، و کەمترین رادەی دەستێوەردانی دەوڵەت لە پرۆسەی ئابووریدا، پاراستنی ئازادیە تاکەکەسیەکان، نەریتەکان، پەیمانە کۆمەڵایەتیەکان، پاراستنی دامودزگا سیاسی و کۆنەکان.

## کۆمەڵگای پیشەسازی ـ سەربازی
## Military – Industrial Complex

ژەنەراڵ ئایزینهاوێر، سی و چوارەمین سەرۆک کۆماری ئەمەریکا لە وتاری ماڵئاوایی خۆی لە پۆستی سەرۆک کۆماری، باسی لە کۆمەڵگای پیشەسازی ـــ سەربازی کرد. (کانوونی دووهەمیی ١٩٦١) ئایزینهاوێر لە وتارەکەی خۆیدا خەڵکی ئەمەریکای ئاگادار کردووە کە پێش بە میلیتاریزەبوونی وڵات بگرن. مەبەست لە کۆمەڵگای پێشەسازی ـ سەربازی ، یەکیەتیەکی نارەسمیی لە نێوان سیاسەت دارێژانی کۆمەڵگادایە کە بە سەررەوتە سیاسی، ئابووری و سەربازییەکانی وڵاتێک دا زاڵبوون.

## کارگێرپی قەیران
## Crisis Magnagement

ئەم زاراوە لە دوای سەرهەڵدانی قەیرانی موشەکیی کوبا لە لایەن رۆبێرت مەک نامارا، وەزیری بەرگری ئەوکاتی ئەمەریکا هەتا ئاراوە. بەبڕوای نامارا کێشەیەک بە ناوی ستراتیژی لە گۆڕێدا نیە. کێشە تەنیا قەیرانەو هیچی تر. بە بڕوای نامارا پێوەندیی نێوان دەوڵەتەکان دەبێ بە شێوەیەک بێ کە ئەندامانی سەرەکیی بەرێوەی ببەن، و رێگا نەدەن لە پێوەندییەکانیاندا قەیران سەرهەڵبدا کە لە ئاکامدا، هەر دوولایەنەکە تێداچن.

### کوشتاری ئەرمەنیەکان(١٨٩٦-١٨٩٤)

### *Armenion Masscres*

کوشتاری ئەرمنیەکان ئەو کوشتارانەیە کە لە نێوان ساڵەکانی ١٨٩٤ تا ١٨٩٦ سووڵتان عەبدولحەمیدی دووهەم، سووڵتانی عوسمانی وەرێی خستن. بە هۆی ئەم کوشتارانە ژمارەیەکی زۆر لە ئەرمەنیەکان کووژران. هەروەها سوپا کردەوەی سەر کووتکەرانەی دیکەشی لە دژی ئەرمەنیەکان جێبەجێ کرد. نزیکی دوو میلیۆن ئەرمەنی رایان کردە سووریا و نزیکەی ٦٠٠ هەزار کەسیشیان لە بەرەبەرەکانیدا کوژران یان گیانیان لە دەست دا.

## ڤیزه *Visa*

ڤیزه لەسەر چاوەی لاتینیی Visum بە واتای دیتن وەرگیراوە. بریتیە لەوەرگرتنی مۆڵەتی رەسمیی لە بەرپرسانی وڵاتێک بۆ هاتنە ناو یا چوونە دەر لەو وڵاتێک. ڤیزە لە سەرلاپەرەکانی پاسپۆرت و بەڵگەکانی ناسنامە دەدرێ.

جۆری ڤیزەکان پێوەندییان بە جۆری سەفەر و جۆرەکانی پاسپۆرتەوە هەیە.

ڤیزەکان بریتین لە:

- ڤیزەی توریستی یان گەشتیاری: ئەم ڤیزەیە بۆ ئەو کەسانە دەردەچێ کە بۆ گەشت و سەیران دەچنە وڵاتێکی دیکەوە.
- ڤیزەی پەڕینەوە: تایبەت بەوکەسانەیە کە بۆ گەیشتن بە شوێنی مەبەستی خۆیان بەناو وڵاتێکی دیکەش دا تیدەپەڕن
- ڤیزەی سەفەرکردن: تایبەتە بەو کەسانەی کە لە ساڵێکدا چەند جار دەچنە وڵاتێک، وەکوو بازرگانەکان

ئەو ڤیزانە دەخرێنە سەر پاسپۆرتی ئاسایی :

ڤیزەی خزمەت( Servise): بەو کەسانە دەدرێ کە پاسپۆرتی خزمەتیان هەیە و تایبەت بە راسپێردراوە ناسیاسییەکانی دەوڵەتە.

ڤیزەی سیاسی: ئەم ڤیزەیە تایبەت بە راسپێردراوانی سیاسی و خاوەنی پاسپۆرتە سیاسییەکانە.

## ڤیتۆ Veto

ڤیتۆ بەواتای رەتکردنەوەیە. ئەم وشە لاتینیە و بەواتای " من قەدەغە دەکەم"ە. ئەو واتایانەی کە ئەمرۆکە بۆ ئەم زاراوە لە ئارادان بە شێوەیەکی تێروتەسەل بریتین لە :

١ــ رەتکردنەوە، دان پێدانەیان یا قەدەغەکردنی بەرپرسێکی رەسمیی.

٢ــ ماف و دەسەڵات و توانایی: ماف و دەسەڵاتیی ئۆرگانێکی دەوڵەتی بۆ قەدەغەکردن یان پووچەڵ کردنەوەی بریاری ئۆرگانێکی دیکە. ئەم واتایە زیاتر سەبارەت بە توانایی دەسەڵاتی بەرێوەبەریی بۆ پێشگرتن لە جێبەجێ کردنی بریارە یاساییەکانی دەسەڵاتی یاسا دانان وەراست دەگەرێ. ئەگەر ئەم توانایی و دەسەڵاتە ئەوەندە بێ کە ببێتە هۆی سرینەوەی هەمیشەیی و گشتی بریاری دەسەڵاتی یاسادانان لەلایەن دەسەڵاتی بەرێوەبەرییەوە؛ ڤیتۆی پێ دەڵێن. دەستووری ئەمەریکا ئەو دەسەڵاتەی بە سەرۆک کۆماری داوە کە دەتوانێ پەسندکراوەکانی کۆنگرە تەنیا جارێک " ڤیتۆ " بکا و لە حاڵێکدا کە کۆنگرە هەر ئەو بابەتە بۆ جاری دووهەم بەزۆرینەی ٢/٣ی ئەندامانی کۆنگرە پەسند بکاتەوە، سەرۆک کۆماریمافی ڤیتۆی نامێنێ. ئەم مافە بە پاشای بەریتانیاش دراوە کە دەتوانێ پەسند کراوەکانی پەرلەمان "ڤیتۆ" بکا، بەلام لە ساڵی ١٧٥٧ەوە کەڵکی لێ وەرنەگیردراوە.

٣ــ مافێکە کە ئەندامانی هەمیشەیی ئەنجوومەنی ئاسایشی UN بۆ هەڵوەشانەوەی بریارەکان هەیانە. لە ئەنجوومەنی ئاسایشی UN دا بریارەکانی سەبارەت بە پێرەوپرۆگرام و شێوەی کار بە زۆرینەی ٩دەنگ، دەردەچن. ئەم بابەتانە بریتین لە بانگهێشتنی ئەنجوومەن،بەرنامەی کۆبوونەوە، هەڵبژاردنی سەرۆکی کۆبوونەوە، ناساندنی دەوڵەتانی ئەندام بە ئەنجوومەن، هەڵبژاردنی دادوەرانی دیوانی نێو دەوڵەتیی داد و...هتد. لە حاڵەتەکانی دیکەدا ئەنجوومەنی ئاسایش بە زۆرینەی ٩ دەنگ لە بەرامبەر ١٥ دەنگدا بریار

دەدا، بەو مەرجەی کە ٥ کەس لە ئەندامانی هەمیشەیی دەنگی "نا" بدەن، کارەکانی ئەنجوومەن رادەوەستێ کە لەراستیدا بە پێشگرتن بە دەرکردنی هەر بڕیارێک، چواردە دەنگەکەی دیکە هەرچەندە "ئەرێ"ش بن پووچەڵ دەبنەوە. ئەم شێوازە یان بەواتایەکی روونتر کەڵک وەرگرتن لەم دەنگە "نا" یە " مافی ڤیتۆ"ی پێ دەگوترێ.

مافی ڤیتۆ دەسەلاتێکە کە تەنانەت لە پێرەوپرۆگرامدا نەگونجێنراوە، بەلام لە کۆنفرانسی یالتادا لەسەر داوای ئەمەریکا و یەکیەتیی سۆڤیەت بەرەسمی ناسراوە. لەلایەکی دیکەوە ئەندامانی هەمیشەیی ئەنجوومەنی ئاسایش دەتوانن بەکەڵک وەرگرتن لەمافی ڤیتۆ، نەهێڵن و تووێژەکان بەرێوە بچن، ئەگەر نوێنەرێک (ئەندامی ئەنجوومەن) پێشنیارێکی ئاراستەی ئەنجوومەن کرد، لە پلەی یەکەمدا دەبێ ئەنجوومەن لەسەر ئەوە بڕیاربدا کە ئایا ئەم پێشنیارە پێوەندی بە پێرەوپرۆگرامی ئەنجوومەنەوە هەیە یان نا و پاشان سەبارەت بە بابەتەکە بڕیاریدا.

مافی ڤیتۆ یەکێک لەو بابەتانە بووە کە بەردەوام کەوتۆتە بەر رەخنە. دەوڵەتە چکۆلەکان هەر لە سەرەتاوە لە کۆنفرانسی سەن فرەنسیسکۆدا لەگەڵ بەرەسمی ناسینی ئەم مافە بۆ دەوڵەتە گەورەکان، دژایەتیان کردو بە پێچەوانەی رۆحی پێرو پرۆگرامی UN یان دانا. چوونکە رەنگە زلهێزەکان بەکەڵک وەرگرتن لەم مافە هەموو هەوڵە ئاشتیخوازیانەکانی UN راوەستێنن. لە بەرامبەردا دەوڵەتە گەورەکانیش دەڵێن کە قورسایی پاراستنی ئاشتی و ئاسایشی نێودەوڵەتیی لەسەرشانی ئەوانە. ئەوە ئەم ولاتانەن کە لەکاتی مەترسیدا، دێنە مەیدان و پێش بە هەلایسانی شەڕدەگرن یان ئەگەر شەڕێکیش هەلایسا دەیکووژێننەوە. ئەگەر ئەم دەوڵەتانە ئەو مافەیان نەبێ، رەنگە ئەنجوومەنی ئاسایش بڕیارێک دەربکا کە دژی بەرژەوەندی ئەم ولاتانە بێ کە رۆڵێکی سەرەکی لە پاراستنی ئاشتی جیهانیدا دەگێڕن. ٥ ولاتە گەورەکە لە کۆتایی کۆنفرانسی سەن فرەنسیسکۆ لە بەرامبەر ئەو رەخنانەی کە لە سەرمافی ڤیتۆ دەگیردران، رایان گەیاند کە ئەگەر ئەو مافە بەرەسمی نەناسرێ، بیرۆکەی دامەزراندنی رێکخراوی نەتەو یەکگرتووەکان بە گشتی هەڵدەوەشێتەوە. بۆیە ولاتانی دیکە لە رووی ناچارییەوە ملیان بۆ داواکانی ئەو ٥ زلهێزە دانەواند، چوونکە ئەو ولاتانە ئەو مافەیان لە دامەزراندنی un بەلاوە

گرنگتر بوو. هەڵبەت بە هۆی ئەم خالآنەی خوارەوە تارادەیەک لە کاریگەری ڤیتۆ کەم بوتەوە:

- بڕیارنامەی یەکیەتیی ئاشتی: ئەگەر هات و ئەنجوومەنی ئاسایش بە هۆی مافی "ڤیتۆ"وە نەیتوانی بڕیاری پێویست دەربکا، سکرتێری گشتیUN یان بە گشتی ئەندامانی UN یان تەنانەت ئەندامانی ئەنجومەنی ئاسایش دەتوانن (بەدەنگی "ئەرێی" ٩ ئەندام بە بێ مافی ڤیتۆ) داوا لە کۆمەڵەی گشتی بکەن کە بە جێگەی ئەنجوومەنی ئاسایش بڕیاربدا. لەم حاڵەتەدا بڕیاری کۆمەڵەی گشتی وەکوو بڕیاری ئەنجوومەنی ئاسایش وادە بێ.
- دەوڵەتێک کە ئەندامی ئەنجوومەنی ئاسایشە و بۆخۆشی لایەنێکی کێشەکەیە، ناتوانێ لە ئەنجوومەندا دەنگ بدا. لەم حاڵەتانەدا دەوڵەتە گەورەکان ناتوانن لە مافی ڤیتۆ کەڵک وەرگرن.
- بەشداری نەکردنی بەئەنقەست لە کۆبوونەوەکانی ئەنجوومەنی ئاسایشدا و خۆبواردن لە دەنگدان، بە ڤیتۆ ناژمێردرێ.

## ڤاتێرگیت *Watergate*

ڕووداوێکی سیاسی، مێژووی هاوچەرخی ئەمەریکایە کە بوو بە هۆی دەست لە کار کێشانەوەی نیکسۆن، سەرۆک کۆماری ئەوکاتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، لە ماوەی ململانێی هەڵبژاردنەکانی نێوان دوو حیزبی کۆماریخواز و دیموکرات لە ساڵی ١٩٧٢دا، بەرێوەبەرانی حیزبی کۆماریخوازنە ـــــ کە نیکسۆنیش ئەندامی ئەم حیزبە بوو ـــــ لە پێشەوەدا هێرشیان کردە سەر نووسینگەی هەڵبژاردنی حیزبی دیموکراتی لە ڤاتێرگیتی واشینگتۆن و بەڵگەو فایل و سەماعە هێنیەکانی ئەم حیزبەیان دزی کە لە راستیدا جۆرێک گوێ گرتن و سیخوری لە دژی حیزبی کۆماریخواز بوو. ئەو هەرا گەورەیەی کە لەم ڕووداوە کەوتەوە بوو بە هۆی گیرانی چەند کەس کە هێندێکیان فەرمانبەری کۆشکی سپی بوون، لە ڕۆژی ١٠ی

کانوونی یەکەمی ۱۹۷۳دا ٥ کەس بەم تاوانە، دادگایی کران. گیراوەکان دانیان بەوەدانا کە لە شەوی ۱۷ی تەمموزی ۱۹۷۲ هێرشیان کردۆتە سەر نووسینگەی هەڵبژاردنی دیموکراتەکان و دزیان لێکردووە. گیراوەکان ئەندامی "کومیتەی هەڵبژاردنەوەی نیکسۆن" بۆ پۆستی سەرۆک کۆماری بوون. لە سەرەتادا وا هەست دەکرا کە تەنیا دزییەکی ئاسایی بووە، بەڵام دوو پەیامنێری رۆژنامەی "واشینگتۆن پۆست" بەگەرمی دوای کێشەکە کەوتن و هێندێک بەڵگەیان دەست کەوت کە دەرکەوت ئەم رووداوە گەندەڵیەکی گەورە و سەرشۆڕانە بووە. بەدوای ئەمەدا کاربەدەستانی کۆشکی سپی و نیکسۆنیش لە کێشەکەوە گلان و هێندێک لە چاوەدێرانی سیاسی داوای "لێپرسینەوە "یان لە نیکسۆن هێنایە گۆڕێ. لە رۆژی ۸ی ئابی ۱۹۷٤دا نیکسۆن یەکەمین سەرۆک کۆماری مێژووی ئەمەریکا بوو کە ناچار کرا دەست لە کاربکێشێتەوە و رۆژی دواتر "جراڵدفۆرد"، جێگری نیکسۆن رێوەرەسمی سوێند خواردنی بۆ وەرگرتنی پۆستی سەرۆک کۆماری بەجێ هێنا.

## Fabianism

### فابیانیزم

بیروبۆچوونی سیاسی ڕێکخراوێکی سۆسیالیستی لە بەریتانیادا بوو، کە لە لایەن ڕووناکبیرە سۆسیالیستەکانی ئەو وڵاتە لە ساڵی ١٨٨٤دا دامەزرا و ئەم گرووپە هەوڵیاندا کە بیروبۆچوونە سۆسیالیستیەکانیان بەرەبەرە لە ناو چینی ناوەڕاستدا پەرەپێبدەن.

دامەزرێنەرانی ئەم ڕێبازە فرانک پودمۆر و ئیدوارد پیز بوون و پاشانیش بێرناردشاو، سیدنی و بیئاتریس ڤێب و تاقمێکی دیکەی وەکوو مەک دۆنالد، کلێمێنت ئەتلیش چوونە پاڵیان و ئەم کۆمەڵە بوو بە بنەمای پێکهێنانی حیزبی کرێکاری بەریتانیا. بەڵام لە دوای دامەزرانی حیزبی کرێکار، ئەم کۆمەڵە وەکوو کۆمەڵێکی پڕوپاگەندەیی و لێکۆڵینەوەیی بە ناوی" کۆمەڵەی فابیان" درێژەی بە چالاکی خۆی دەدا. وتارگەلێکیان بە دژی فەلسەفەی مارکس بڵاو کردەوە. بنەماکانی بیری ئەم کۆمەڵە بریتی بوون لە :

١ــ چاکسازی کۆمەڵایەتی، دەبێتە هۆی گەشەی کۆمەڵایەتی و باری ئابووری کرێکار بۆ خۆی بەرەو باشی دەڕوا و پێویستیەک بە توندو تیژی و وەرێخستنی شۆرش نیە.

٢ــ پێشکەوتنی کۆمەڵایەتیی پێویستی بە ململانێی چینایەتی نیە.

## فاشیزم Fascism

ئەم زاراوەیە لە وشەی فاشیسمۆ Fascimo وەرگیراوە و بریتیە لە کۆمەڵە دارێکی کورتی پێکەوە بەستراوە لەگەڵ تەورێکدا کەلە رۆمای کۆندا، وەکوو رەمزی هێز لەلایەن کەسانی ریزەکانی پێشەوەی شەڕ هەڵدەگیرا.

فاشیزم وەکوو چەمکێکی مێژوویی؛ سیستەمێکی حکومەتیە کە لە نێوان ساڵەکانی ١٩٢٢ تا ١٩٤٣ لە ئیتالیا و لە لایەن موسۆلینیەوە رێبەرایەتیی دەکرا. لە دواییدا ئەم زاراوە واتایەکی بەربلاوتری پەیداکرد و بەو رژێمە دەستەراستیانەش دەگوترا کە تایبەتمەندی هاوشێوەی ئەم رژێمەیان هەبوو.

بە ڕای موسۆلینی " فاشیزم چەمکێکی ئایینیە کە بە پێی ئەم چەمکە مرۆڤ بە یاسایەکی بەرزترو ئیرادەیەکی راستەقینەوە بەستراوەتەوە کە لەتاک بەرزترە و بۆ کۆمەڵگایەکی رۆحانی بەرز دەبێتەوە. پێدەچێ ئەوانەی کە پێیانوایە، سیاسەتە ئایینیەکانی فاشیزم، تەنیا هەڵپەرەستین، لەم چەمکە نەگەیشتبن، کە فاشیزم جگە لەوەی سیستەمێکی حکومەتیە، زیاتر سیستەمێکی هزریشە. فاشیزم لەگەڵ هەموو ئەزموونە تاک گەرییەکانی مەتریالی دا ــ وەکوو ئەوەی لە سەدەی ١٨ دا بەرەوی هەبوو ــ دژایەتیی دەکا. فاشیزم دژی سەربەخۆی تاکە و لایەنگری لە دەوڵەت دەکاو تا ئەو جێگایە رێز بۆ تاک دادەنێ کە لەگەڵ دەوڵەت، واتە ویژدان و ئیرادەی گشتی مرۆڤ لە بوونە مێژووییەکەیدا بگونجێ. بنەمای ئازادییەکانی دەوڵەت لە بەرامبەر بەرژەوەندی تاکدا رەت دەکاتەوە، بەڵام فاشیزم دەوڵەت وەکوو واقعییەتێکی راستەقینە بەبناغەی کۆمەڵگا دادەنێ.

بنەما گشتیەکانی فاشیزم کە موسۆلینی لە ئینسکلۆپیدیای ئیتالیا لە ساڵی ١٩٣٢دا رایگەیاند بوون، بریتین لە:

١ــ ئاشتی هیچ کەڵکێکی نیە.

٢ــ دژایەتیکردن لەگەڵ بیروبۆچوونی سۆسیالیستیدا.

٣ــ دژایەتیکردن لەگەڵ لیبرالیزمدا.

٤ــ پێرەوی کردنی هەموو گرووپەکان لە دەوڵەت (توتالیتێر بوونی دەوڵەت).

٥ــ پیرۆزکردنی رێبەر(پێشەوا، کاریزما) تا ئەو پەڕی خۆی.

٦ــ سیستەمی تاک حیزبی.

٧ــ دژایەتیکردن لەگەڵ دیموکراسیدا.(فاشیستەکان بە دیموکراسی دەڵێن هەوانتەیان خۆپەرەستی )

٨ــ بڕوای قووڵ بە قارەمان پەرستن.

٩ــ بەرەودان بە رۆحی شەڕخوازانە.

**کورتە مێژووی فاشیزم:**

لە دوای شەڕی یەکەمیی جیهانییەوە، ئیتالیاش وەکوو ولاّتانی دیکەی ئەوروپا، گیرۆدەی کێشەی کۆمەلاّیەتی و ئابووری بوو، مانگرتنەکان، راپەڕینەکان و داگیرکردنی زەوی و زار لەلایەن خەڵکی دێهاتەوە لە ناوچە کشتوکالیەکان، لەو کێشانە بوون کە ئەم ولاّتە تەنیبۆوە. چینەکانی ناوەڕاست وەکوو چینەکانی هاوشێوەی خۆیان لە ولاّتانی دیکەی سەرمایەداریدا لە بۆ لشڤیزم دەترسان. لە ولاّتێکدا کە سیستەمی حکومەتەکەی دیموکراتیک بوو، بەلاّم بە پێچەوانەی بەریتانیا و ئەمەریکا نەریتێکی بە هێزی سیاسییان بۆ پشتیوانیکردن لە دیموکراسی نەبوو، هەموو ئەم کێشانە بە چارەسەرنەکراوی مانەوەو پەرەیان بە بشێوی و ئالۆزی دەدا.

لە وەها رەوشێکی گرژوئالۆزدا، خۆشەویستی حیزبی فاشیستی موسۆلینی پەرەی گرت. فاشیزم رایگەیاند کە ئیتالیا لە بۆلشڤیزم رزگار دەکا و بەڵێنی ئەوەشیدا کە گەورەیی وریزی ئیمپراتۆرییای رۆمی کۆن دەگەڕێنیتەوە بۆ ئیتالیا کە ئیستاکە ئاڵۆزو شێواوە.

فاشیزم هەموو کەسە ناڕازییەکانی بۆ لای خۆی رادەکێشا: سەربازەکانی پێشوو کە بێکار بوون، چینەکانی ناوەڕاست کە بێ هیوا ببوون، لاوەنیشتمانپەروەرەکان و دێهاتیە رەش و رووتەکان. فاشیستەکان کراسی رەشیان لە بەردەکرد، چەکمەیان لە پێ دەکرد و بۆ ئامانجێکی گەورەی نیشتمانی دروشمیان دەدا کە هەموو شتێکی پێشکەش بە هەموو کەس دەکرد: کار، بەختەوەری و شانازی نەتەوەیی. فاشیستەکان لە تیروریزم و شەڕی سەرشەقام کەڵکیان وەردەگرت و دەوڵەت بێ هێزتر لەوە بوو کە پێشیان پێ بگرێ. لە ئاکامدا کاتێک کە ئەنجوومەن و کۆمەڵە پیشەسازییە بە هێزەکان پشتیوانیان لە فاشیزم کرد، موسۆلینی( ئیل دوچە/ پێشەوا) بە دوای رێپێوانێکی گەورەدا کە لە ١٩٢٢دا وەرێخرا، دەسەلاّتی ولاّتی بە دەستەوە گرت. موسۆلینی دەستبەجێ دیکتاتۆرییەکی سەربازی دامەزراند و ئابووریشی بە شێوەی تایبەتی خۆی رێکخست.

دەوڵەت هێندێک لە کاروبارە گشتیەکانی وڵاتی وەئەستۆ گرت و سوپای بەهێز کرد و بە داگیر کردنی ئەتیوپی لە ساڵی ٣٦_١٩٣٥دا، ڕێگابۆ پەرەگرتنی ئیمپراتوریای ئیتالیا لە ئەفریقیای باکووردا خۆش بوو. فاشیزم سەرکەوتوو بوو، چونکە ئاسایش و هێمنایەتی لە وڵاتێکی ئاڵۆزو شێواودا دابینکرد بوو.خەڵکی ئیتالیا دانیان بە موسۆلینی دادەنا، چونکە توانیویەتی لە کاتێکی لەباردا شەمەندە فەرەکە وەڕێ بخا".

موسۆلینی بە ڕاگەیاندنی ئەوەی کە فاشیزم فەلسەفەیە ، هەوڵی دا پێگە و متمانەیەک بۆ ڕژێمەکەی دەستەبەربکا. موسۆلینی گرێمانەیەکی بە ڕەستەگەلی سەرنجڕاکیش بەلاّم بێ واتای وەکوو " وڵات ویژدان و ئیرادەی گشتی مرۆڤایەتیە"، دەڕازاندەوە. دروشمە بەناوبانگەکانی بۆ جەماوەر روون بوون: " هەمیشە حەق بە موسۆڵینیە" ،"باس و ڕاوێژ، نەتەنیا پێڕەوی کردن"، " بڕوا بێنن، پێرەوی بکەن، شەڕ بکەن".

دیکتاتۆرەکانی دیکەی باڵی ڕاستی دەیەی ١٩٣٠یش لاساییان لە شێوە سیاسییەکانی ئیتالیای فاشیست دەکردەوە و لەگەڵ هەلو مەرج و دابونەریتەکانی وڵاتی خۆیاندا، دەیانگونجاند. بۆ وێنە لە ئیسپانیادا ژەنەراڵ فرەنکۆ سوپای لەگەڵ ئاریستۆکراسی و کلیسای کاتۆلیکی پێکەوە بەستەوە.

ڕژێمی فاشیستی موسۆلینی تادەیەی ١٩٧٥ی خایاند. بەلاّم ڕژێمەکانی هاوشێوەی ئەم ڕژێمە وەکوو ئەڵمانیای نازی و چەند ڕژێمێک لە ئەورووپای ڕۆژهەلاّت دا (تەنانەت خوودی ئیتالیای فاشیست)لە شەڕی دووهەمی جیهانیدا تووشی شکست بوون. سەرکەوتووترین و دزێوترین وڵاتی فاشیستی، ئەڵمانیای نازی بوو. لە دوای شەڕی یەکەمی جیهانیدا، ئەڵمانیاش وەکوو ئیتالیا تووشی گیروگرفت بوو. ئەم وڵاتە ناچار بوو خۆی بۆ سەرشۆڕی و سزاکانی دۆڕانی خۆی ڕابگرێ. ئەو نیمچە دێموکراسیەی کە لە ساڵی ١٩١٩ لەم وڵاتەدا دامەزرا، هێچ کاتێک جێگەی پەسندی چینی ناوەڕاست نەبوو کە بە تاسەوە سەیری ڕابردووی پڕ لە شانازی ئەڵمانیای ئیمپراتۆریان دەکرد. ئەوان و ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی ئەڵمانیا پێشوازیان لە بیروبڕوای نازیسمی هیتلەر دەکرد چونکە پێوەندی بە نەریتە پەسندکراوەکانی مێژووی ئەڵمانیا، واتە پێڕەوەیکردن لە کەسی سەرەوەتر، ڕۆحی سەربازی وشەڕخوازانە و پێداهەڵگوتنی ڕۆمانسیانە لە "نەتەوە" هەبوو. جگە لەمە ئەم بیروبڕوایە لەگەڵ هەستی دژەسامی لە ئەڵمانیادا دەگونجا. هەڵبەت دەبێ ئاماژە بەوە

بکەین کە هیتلەر، داهێنەری هەستی دژەسامی نەبوو، بەڵکوو بە شێوەیەکی باش لەم هەستە کەڵکی وەرگرت. لە ئەڵمانیا تیۆری فاشیستی بەرزبوونی نەتەوەیی لە ژێر ناوی تیۆری "رەگەزی بەرزتر" هاتە ئاراوە و بانگەشەی بۆدەکرا. ئەم تیۆرە سەرچاوەی مێژوویی هەیەو دەگەڕێتەوە بۆ بیری فەیلەسووفەکانی سەدەی نۆزدەهەم. بەم پێیە چونکە ئەڵمانەکان رەگەزی بەرزتر بوون، کەواتە شکستی ئەڵمانیا لە شەڕی یەکەمی جیهانیدا، بە هۆی کەمتەرخەمی سوپای ئەڵمانیاوەنە بووە. بۆیە پێویست بوو تۆباڵەکەی بخرێتە ئەستوی کەسانی تر. ئەم کەسانەش بریتی بوون لە: بۆلشفیکەکان، جوولەکەکان و ئەو سۆسیال دیموکراتانەی کە" لە پشتەوەڕا شیریان لە سوپای ئەڵمانیا راکێشا بوو" و ئیستاش ئەم کەسانە هۆکاری تەواوی کێشەکانی دوای شەڕ بوون.

لە سەرەتاکانی دەیەی ١٩٣٥دا کە بارودۆخی ئەڵمانیا بە دوای دابەزینێکی گەورەی ئابووری بەرەو خراپی رۆیشت، بە میلیۆن کەس لە خەڵکی ئەڵمانیا بە تاسەوە پشتیوانیان لە لێکدانەوەو شیکردنەوەکانی هیتلەر سەبارەت بە بارودۆخی ولاتی خۆیان کرد. لە ١٩٣٣دا نازییەکان گەورەترین حیزبی ئەڵمانیایان، پێکهێنا و هیتلەر بووبە راوێژکاری ئەڵمانیا. ئەو هەر دەستبەجی دوای گەیشتن بە دەسەلاّت، دەوڵەتێکی تاک حیزبی پێکهێنا.

تایبەتمەندییەکانی دیکەی حیزبی نازی لە حیزبی فاشیستی ئیتالیا دەچوون، ئەو شێوازانەی کە هیتلەر بۆ سەپاندنی بیروڕاکانی خۆی کەڵکی لێ وەردەگرتن، هەر ئەو شێوازانە بوون کە موسۆلینی کەڵکی لێ وەردەگرتن: کەڵک وەرگرتن لە گۆپاڵ یان قامچی چەرمی و کوتانی لاق بە ران . نازییەکانیش ــ وەکوو فاشیستەکانی دیکە ــ لە لایەن سەرمایەدارو خاوەن کارەگەورەکان پشتیوانیان لێدەکرا. هیتلەریش پلانی گەورەی دەوڵەتیی وەکوو رێگاوبان و لە هەموانیش گرنگتر بەرنامەی گەورەی بووژانەوەی چەک و چۆڵەکانی وەگەڕخست کە کاری بۆ شەش میلیۆن کەسی بێکاری ئەم ولاّتە دابینکرد.

هەوڵەکانی حکومەتە فاشیستیەکان بۆ کەمکردنەوەی رێژەی بێکاری، پێوەندییەک لە نێوان بۆچوونی سۆسیالیستی فاشیستیدا پێک دێنن (لە راستی ناوی تەواوەتیی حیزبی نازی ئەڵمانیا،حیزبی ناسیۆنال سوسیالیستی کرێکارانی ئەڵمانیایە.). خاڵی هاوبەشی ئەم دوو شێوە حکوومەتانە بریتیە لە: دەوڵەتی بە هێز و دەستێوەردانی دەوڵەت لە هەموو کاروبارەکاندا لە پێناوی پاراستنی بەرژەوەندی نەتەوەییدا. هیتلەر و موسۆلینی لە کاتی بەدەسەلاّت گەیشتندا، بە شێوەیەکی

لێلاوی بەڵێنیاندا هەڵسوکەوتێکی باشتریان لەگەڵ کرێکاران دا دەبێ. رەنگە وێستبێتیان بەم شێوەیە دەنگی کرێکارەکان لە ژێر دەستی حیزبە چەپەکان دەرکێشن. بەڵام بەڵێنیەکانیان پراکتیزە نەکران، چونکە رژێمەکانیان ئاڵوگۆڕێکیان لە پێکهاتەی کۆمەڵایەتیدا پێک نەهێنا و هەر ئەو چینە دەسەڵاتدارە لە سەردەسەڵات مایەوە. لە ئەڵمانیا و ئیتالیادا جگە لە چەند کەس، ئەندامانی دیکەی چینی سەرەوە پشتیوانیان لە حکومەتی فاشیستی دەکرد و لەلایەن ئەو حکومەتەشەوە، پشتیوانیان لێدەکرا.

زۆری نەخایاند کە بە میلیۆن ئەڵمانی، ئامادەیی خۆیان بۆ پێرەویکردن لە پێشەوا (رێبەر) راگەیاند. هەرکەسێکیش کە سەبارەت بە ئایدولۆژی نوێ بە گومان بوو ، یان لە وڵات رای کرد یان بێدەنگیەکی قووڵی گرتەبەر. ئەوانەی کە دژی ئایدولۆژی نوێ قسەیان دەکرد، نێردرانە ئۆردوگا زۆرە ملێیەکان تا بچەنە پاڵ جوولەکەکان، قەرەجەکان و نەقوستان و پەککەوتەکانی مرۆڤایەتی. نازییەکان لە رێکخستنی خۆپێشاندان و مانۆرە گشتییە هەست بزوێنەکاندا، توانایەکی تایبەتیان هەبوو و زۆریشی پێنەچوو کە هەموو نەتەوە دروشمێکیان دەگوتەوە "وڵاتێک، خەڵکێک، پێشەوایەک".

بەم شێوە هەموو گەل پشتیوانیان لە فەلسەفەی هیتلەر کرد کە دەیگووت "شەڕ نەمرە، شەڕ ژیانە".

تیۆرە بەناوبانگەکانی هیتلەر هیچ بنەمایەکی ئەخلاقی یان کردەییان نەبوو؛ بەڵام ئەو سیاسەتانەی کەئەو بە پێی ئەم تیۆرانە جێبەجێ دەکردن لە قۆناغی یەکەمدا زۆر سەرکەوتوو بوون. چارەسەری کۆتایی هیتلەر بۆ کێشەی جوولەکە، شەش میلیۆن جوولەکەی کردە قوربانیی. ئارەزووی لە مێژینەی هیتلەر بۆ داگیرکردنی جیهان، ئاگری شەری دووهەمی جیهانی هەڵایساند و لە ئاکامدا بۆ وڵات و خەڵکەکەی بووبە هۆی کارەسات.

لە دوای شەڕی دووهەمی جیهانی، ئیتالیا و بەشی رۆژئاوای ئەڵمانیا وەکوو دیموکراسیە لیبرالێەکان خۆیان رێک خستەوە و فاشیزم و نازیسم پێگەی خۆیان لە دەستدا. بەڵام ترس لە ژیانەوەی فاشیزم لە جیهان لە دوای شەڕ و بەتایبەتی لە وڵاتانی وەکوو سۆڤێەت کە زیاتر لە هەمووان لە لایەن ئەڵمانیاوە زەبری وێ کەوتبوو، هەروامایەوە. ئەم ترسە کاریگەرییەکی قووڵی لە سیاسەتی سۆڤێەت لە بەرامبەر ئەڵمانیادا بەجێهێشت.

بە گشتی فاشیزم؛ لە کار و کردەوەی هێندێک لە دەوڵەتەکانی باڵی راستی توندڕۆ بۆ وێنە لە دیکتاتۆری سەربازی "عەقیدەکانی " یۆنان لە نێوان ساڵەکانی ١٩٦٧_٧٤ و ئەو سەرەنجڕاکێشەیەی کە فاشیزم بۆ هێندێک لە خەڵک هەیەتی، وەبەر چاو دەکەوێ. هێندێک لە گرووپە سیاسییەکانی رۆژئاوا وەکوو بەرەی نیشتمانی بەریتانیا؛ رەنگدانەوەی تیۆرە فاشیستیەکانی بەر لە شەڕن.

## Factionalism
## فاکسیۆنالیزم /حیزبایەتی

فاکسیۆن بە واتای حیزبە و بۆیەکەمجار جۆرج ڤاشینگتۆن لە سەرەتای سەر بە خۆیی ئەمەریکادا بە جێگەی پارتی (Party)، کەڵکی لێوەرگرت. فاکسیۆنالیزم بە واتای حیزبایەتی و بڕوا بە بە پێویستی حیزبە سیاسییەکان و پشت بەستنی دەوڵەت و حکومەت بە حیزبە گشتیەکانە، کە سیستەمی حیزبیشی پێ دەگوترێ.

## Phalange
## فالانژ

زاراوەیەکە لە وشەی لاتینی Phalangen و Phalanx وەرگیراوە. زاراوەی فالانژ(Phalanx(es لە درێژایی مێژوودا، واتای جیاوازی هەبووە:

١_ لە یۆنانی کۆندا، " فالانژی ساکار" بەشێک لە رێکخستنی سوپای یۆنانی پێکدێنا ( ٦ب.ز) کە لەم هێزانە پێکهاتبوو و بەم شێوەیە رێکخرابوو:

الف)_ هێزی پیادە بە چەکی سووکەوە: لە ریزی پێشەوەی شەڕدایە و خاوەنی چەک و چۆڵی سووک و تیروکەوان؛ قۆچەقانی (شتێکە کە بەردی پێ دەهاوێژن)، ژاولو و نێزەی سووکن.

ب)_ هێزی پیادە بە چەکی قوورسەوە: بریتیە لە کەسەکانی ریزی پێشەوە کە بە کۆمەڵ و بە چڕی هێرش دەبەن و لە ناو لاوانی چینە دەسترۆیشتووەکاندا هەڵ دەبژێردرێن.

ج)_ هێزی پیادەی تێکەڵاو: بەبێ قەڵغان کە لە بواری رێکخستن و چەکوچۆڵەوە لە نێوان ئەم دوو هێزانەدان.

د)_ هێزی سوارە قەڵغاندار بە چەکوچۆڵی قورسەوە: خاوەنی نێزە و شمشێرن

هـ)_ هێزی سوارە بە چەکوچۆڵی سووکەوە: خاوەنی تیروکەوان و نێزەی کورت و سووکن.

زاراوەی " فالانژی تێکەڵاو" بە یەکەیەکی تەکتیکی گەورەی سوپای یۆنان دەگوترێ. فالانژی گەورە لە چوار فالانژی چکۆلە پێکهاتبوو و هێزی سوارەش ئەملاو ئەولای ئەم یەکەی گرتبوو.

٢ـ لە سالی ١٦٠٠ەوە بەو کەسانە دەگوترا کە بۆ ئامانجێکی هاوبەش لە دەوری یەکتر کۆدەبوونەوە و بەرەیەکی یەکگرتوویان پێکدێنا.

٣ـ لە سالی ١٧٧٣دا بە رێکخراوێکی رێک وپێک و بەیەکەوە بەستراوە دەگوترا کە کۆمەڵیک کەس بە شێوەیەکی رێک وپێک لە دەوری یەکتر کۆ دەبوونەوە و خۆیان بۆ هێرش یان بۆ بەرگریکردن ئامادە دەکرد.

٤ـ لە سالی ١٨١٤دا بە گرووپە رێک وپێک و چرەکانی سوپا و هەروها بە پارتیزانەکانیش دەگوترا.

٥ـ کاکڵەی سەرەکی کۆمەڵگای خەیاڵی، شارلزفوریە، سوسیالیستی بە ناوبانگی یۆتۆپیایی، فالانژی پێ دەگوترا.

٦ـ زاراوەی فالانژی ئیسپانیا کە لەم سەدانەی دواییدا بۆتە باو؛ ناوی رێکخراوێکی فاشیستی و نیمچە سەربازییە کە لە ٢٩ی تشرینی یەکەمی ١٩٣٣ لەمەدریددا دامەزرا.

دامەزرێنەری بزووتنەوەی فالانژی لە ئیسپانیادا، خۆزێ پریمۆ دۆرێۆرا، کوری پریمۆ دۆرێۆرا دیکتاتووری پێشووی ئەم ولاتە لە ساڵەکانی ١٩٣١ـ١٩٢٣دا بوو. "حیزبی فالانژی ئیسپانیا " لە سالی ١٩٣٤دا پێکهات و خوزێ ئانتۆنیۆ بوو بەرێبەری ئەم حیزبە. بەرنامەی ئەم حیزبە بریتی بوو لە: خۆماڵیکردنی سەرمایەکان، چاکسازی لەزەوی و زاردا، رێکخستنەوەی سوپاو...هتد.

حیزبی فالانژی ئیسپانیا لە ماوەی شەرە نێوخۆییەکاندا (١٩٣٨ـ١٩٣٦) لە شەرکردن لەگەڵ کەسە چەپی و راستیەکاندا(کومونیستەکان، ئانارشیستەکان و کۆنەپارێزان) رۆلێکی گرنگی لە ئەستۆدا بووە. دامەزرێنەری حیزبی" فالانژی یەکگرتووی ئیسپانیا " لە سالی ١٩٣٦دا دەستبەسەر کراو بەدەستی کۆماریخوازەکان کوژرا. زاراوەی فالانژ ئەمرۆکە بە گرووپە دەستەراستییە توندرۆکانی وەکوو" فالانژی لوبنان "یش دەگوترێ.

## Feudalism فیۆدالیزم/ دەرەبەگایەتی

فیۆدالیزم یان دەرەبەگایەتیی لە بنەڕەتدا ئاماژە بە قۆناغێکی دیاریکراوی مێژووی وڵاتانی ئەورووپی (سەدەی ٩ تا ١٣) دەکا. دەرەبەگایەتیی سیستەمێکی کۆمەڵایەتیە کە لەو سیستەمەدا دەسەڵات لە نێوان خاوەن زەوییەگەورەکاندا دابەش بووە و هەر خاوەن زەوی یان ئاغایەک هێندێک ڕەعیەتی هەیە کە لە بەرامبەر سەربازی کردن یان خزمەتی دیکەدا، مافی خاوەندارێتی یان کەڵک وەرگرتن لە پارچە زەوییەک کە ئاغا پێیداون وەدەست دێنن. بەم زەوییە دەڵێن سیورسات.

فیۆدالیزم لە ئەورووپادا لە دوای هەڵوەشانەوەی ئیمپراتۆری شارلمانی (٧٤٢_٨١١) سەریهەڵداو دەسەڵاتی میرنشینەکان گەشەی کرد.خەڵکی شار ودێکان کە خۆیان لە ژێر هەڕەشەی هێرشی بێگانەکان دا دەبینی، هیچ چارەیەکی دیکەیان جگە لە پەنابردنە بەر میرنشینەکان نەبوو. بەم پێیە ئاغای ناوچەکە تەنیا کەسێک بوو کە پارێزگاری لێدەکردن و ئەمە سەرەتای دامەزرانی سیستەمی فیۆدالی لە ئەورووپای ڕۆژئاوادا بوو. لە ماوەی سێ سەدەدا ئەم سیستەمە ڕێک وپێکتر بوو و زۆربەی زاناکان پێیانوایە کە ئەم سیستەمە تایبەت بەو قۆناغە تایبەتەی مێژووی ئەورووپایە و کۆمەڵگاکانی دیکە بەم قۆناغەدا تێنەپەڕیون. بەڵام هێندێک بە هۆی هێندێک لێکچوونەوە (بە تایبەتی مەسەلەی ناناوەندی بوونی دەسەڵات و سەرهەڵدانی ئاغاکان لە شوێنە جیاجیاکانی وڵات ) زاراوەی فیۆدالیزمیان بۆ وڵات و شوێنەکانی دیکەش بەکارهێناوە. مێژووی فیۆدالیزم دەریخستووە کە هەرکاتێک ئەم هەلومەرجانە لە کۆمەڵگایەکدا هەبوون؛ فیۆدالیزم لەو شوێنەدا بە سانایی گەشەدەکا:

١) شێوازی سەرەکی بەرهەمهێنان، کشتوکاڵی بێ.

٢) کۆمەڵگا بەسەر هۆزو عەشیرەی جیاوازدا دابەش بوو بێ کە پێوەندییەکی لاوازی ئابووری، کولتووری و مێژوویان لەگەڵ یەکتردا هەبێ.

٣) پێوەندی نیوان ناوچە جیاوازەکانی وڵات بە هۆی جوگرافی یان هۆیەکانی دیکە ئەستەم بێ یان هەر پێوەندییان نەبێ.

٤) یەکیەتیی ئابووری وڵات هەڵوەشابێتەوە و یان بە هۆی نەبوونی یەکیەتیی ئابووری، وڵات خاوەنی حکومەتێکی ناوەندی نەبێ.

٥) حکوومەتی ناوەندی نەتوانێ هاوڵاتیەکانی خۆی لە بەرامبەر هێرشی زۆردارەکانی ناوخۆو داگیر کەرانی دەرەوەدا بپارێزێ.

## Federation فیدراسیۆن

فیدراسیۆن لە چەندوڵاتێک پێکهاتووە کە هەر کامیان خاوەنی حکومەت وبناغەی تایبەتی خۆیانن و بۆخۆیان وڵاتی خۆیان بەڕێوە دەبەن. وڵاتی فیدراڵ کە لە کۆی وڵاتانی ئەندامی فیدراسیۆن پێکهاتووە، خاوەنی ماف و ئیمتیاز گەلێکە کە هەموو وڵاتانی ئەندام ودانیشتوانەکانیان دەگرێتەوە، بەڵام لە هەمان کاتدا سەربەستی وڵاتانی ئەندام لە کاروباری نێوخۆییدا دەپارێزێ.

لە سیستەمی فیدراسیوندا، هێندێک بنەما لە ئارادان، وەکوو ئەوەی کە یاساکانی فیدراڵ لە سەرەوەی یاسا نێوخۆییەکانی وڵاتانی ئەندامی فیدراسیۆن دان. هەروەها پێوەندییەکانی دەرەوە تەنیا لە ئەستۆی وڵاتی فیدراڵ دایە و وڵاتی فیدراڵ لە چوارچێوەی دیاریکراوی دەستووردا، خاوەنی کۆلەکەی تایبەتیە و دەسەلاتی ڕاستەخۆی بەسەر تەواوی خاکی وڵاتانی ئەندامدا هەیە.

سیستەمی فیدراسیۆن لە کوتاییەکانی سەدەی ١٨ لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکای باکووردا پێکهات و سەرکەوتووش بوو وبوو بە نموونە بۆ زۆر وڵاتی دیکەش، بە جۆرێک کە بەشی زۆری وڵاتە تازە سەرخۆکانی کیشوەری ئەفریقیا و زۆربەی وڵاتانی هاوبەرژەوەندی ڕوویان لەم سیستەمە سیاسییە کرد.

## Balkan federation فیدراسیۆنی باڵکان

فیدراسیۆنی باڵکان پلانێک بوو بۆ پێکهێنانی فیدراسیۆنێک لە وڵاتانی باڵکان و دانووب کە لە ساڵی ١٩٤٧دا، لە لایەن تیتۆ، سەرۆک کۆماری یۆگسلاڤیا و گێئۆرگی دیمیترۆف، سەرۆک وەزیرانی بولگاریاوە ئامادە کرا. بەڵام ستالین دژی پێکهاتنی ئەم فیدراسیۆنە بوو.

## Fraction فراکسیۆن

فراکسیۆن لە وشەی لاتینی Fractio و Fractum و لە سەرچاوەی لاتینی Frangere بەواتای شکان وەرگیراوە.

فراکسیۆن بەمانای بە شێک لە یەکەیەک یان لە گشتێک و زیاتریش بە واتای لەتکردن ودابەشکردن و ئاکام و دەرئەنجامی ئەم لەتکردن و دابەشکردنەش کەڵکی لێوەردەگیردرێ.

فراکسیون لە بواری سیاسییەوە بە گرووپێک دەگوترێ کە لە ناو حیزبێک یان لە ناو رێکخراوێکی سیاسییدا سەر هەڵدەدا و ئەندامەکانی لەسەر چۆنیەتی جێبەجێ کردنی بەرنامە وریبازە گشتیەکانی ئەو رێکخراوە بیروڕای جیاوازیان لەگەڵ ئەندامانی دیکەی رێکخراوەکەدا هەیە. لە پەرلەمانەکانیشدا، فراکسیۆنەکانی پەرلەمان بە گرووپی نوێنەرانی حیزبەکان دەگوترێ. فارکسیۆنێر Fractionnairc بە کەسێک دەگوترێ کە لە بەرامبەر رێبازی گشتی رێکخراوێکدا، خاوەنی بیروبۆچوونێکی روون و نووسراو بێ.

## فراماسیۆنێری Freemasonary

فراماسیۆنێری لە زمانی فەرەنسیدا بە واتای " وەستای سەربەست و ئازاد"ە و ناوی ئەنجوومەنێکی نهێنیە کە بە کەڵک وەرگرتن لە رێووشوێنی تایبەتی خۆیان، لە پیناوی گەیشتن بە ئامانجێکی سیاسی ـ کۆمەڵایەتی و ئابووریدا تێدەکۆشن. ئەندامانی ئەم ئەنجوومەنە بە کۆڕو کۆمەڵەکانی خۆیان دەڵێن "لۆژ" و بە خۆشیان دەڵێن " ماسۆن". فراماسۆنەکان پێیانوایە کە گرووپەکەیان زۆر کۆنە و سەرچاوەکەی بۆ ئەو وەستایانە دەگەڕێتەوە کە پەرستگەی سولەیمانیان لە ئورشەلیمدا دروست کردووە. هەرچۆنێک بێ، مێژووی سەرهەڵدانی رێکخراوی فراماسونێری دیارنیە و واپێدەچی ئەم کۆمەڵە لە دوای سەدەکانی ١٧ و١٨ەوە پەرەیان سەندبێ. سەبارەت بە سەرچاوەی لۆژە کانیش، دەڵین کە لە رۆمی کۆندا؛ وەستاکان، وەکوو خاوەن پیشەکانی دیکە، رێکخراوێکی تایبەتیان هەبووە کە زۆر گرنگ بووە.

ئەندامانی ئەم رێکخراوە، نهێنیەکانی کاروباری خۆیان دەپاراست و لەلای کەس هیچیان نەدەدرکاند بۆ ئەوەی هەمیشە خەڵک کاریان بەم وەستایانە بێ. دەوڵەتیش هەرکاتێک بریاری دەدا شتێک بروخێنێ یان شتێک درووست بکا، دەچووە لای ئەم وەستایانە. ئەم وەستایانەش بەر لەوەی دەسبەکاربن، لە شوێنێکی نزیک ئەو شوێنەی کە بریاربوو شتەکەی لێ سازبکەن، بینایەکیان سازدەکرد و لەوێ کۆدەبوونەوە و راوێژیان دەکرد، ئەم شوێنە ناوەندی بریاردانی ئەوان بوو. بەم بینایەیان دەگووت"لۆژ" و فراماسۆنە نوێکانیش بە شوێنی کۆبوونەوەی خۆیانیان دەگووت " لۆژ". رێکخستنی وەستاکان بەرەبەرە لە پاوانی وەستاکان هاتەدەرو سیاسەتمەدارەکان ئاڵوگۆڕیان تێدا پێکهێنا. سیاسەتمەدارەکان بە کەڵک وەرگرتن لە بنەمای رێکخستی هەموو رێکخراوە نهێنیەکانی

جیهان، خۆیان ڕێک دەخست. فراماسۆنەکان تەنانەت لە بنەمای گرووپەکانی، وەکوو ئیسماعیلیەکان، باتینیەکان، بەکتاشیەکان و ڕێکخراوەی شۆڕلاو و جوامێرەکان و کۆمەڵە مێنیەکانی ئەوروپی بۆ ڕێکخستنی کاروبارەکانیان و وەرگرتنی ئەندام کەڵکیان وەردەگرت. فراماسۆنەکانی ئەم سەدانەی دوایی بەدروشمی ئازادی، یەکسانیی، برایەتیی لە زۆربەی ڕەوتە گەورە سیاسییەکان و ئاڵوگۆڕە گرنگەکانی جیهاندا وەکوو، شۆڕشی مەزنی فەڕەنسە ( زۆربەی ئەوانەی نەیاری ڕژێمی پاشایەتی بوون و چاکسازی خواز بوون، ئەندامی لۆژەکانی فەڕەنسە بوون )، شۆڕشی ئۆکتۆبەری رووسیا، شۆڕشی پیشەسازی بەریتانیا و شەرەکانی سەربەخۆیی ئەمریکا بەشداربوون. بە تایبەتی لەرەوتی سەربەخۆیی ئەمریکادا، فراماسۆنەکانی ئەمریکا ڕۆڵێکی گرنگیان هەبوو و هاوکارییەکی باشی سەربەخۆخوازەکانی ئەمریکایان کرد. زۆربەی سەرۆک کۆمارەکانی ئەمریکا ولەوانە جۆرج واشینگتۆن، یەکەم سەرۆک کۆماری ئەم وڵاتە " ماسۆن" بووە و نشیانەی سەرەکی فراماسیۆنێری کە بە " چاوی خوا" بەناوبانگ بووە، لەسەر دراوی ئەمریکا هەڵکەندراوە.

فراماسۆنە ئەمریکیەکان ڕێبیوان یان خۆپیشاندانی سەرشەقامەکانیش وەرێدەخەن. لە ئەمەریکادا، ڕێکخراوە جیاوازەکانی وەکوو نادی ڕۆتاری، نادی لانیز، کۆمەڵەی خۆئامادە کردنی ئەخلاقی و کۆمەڵەی برایانی جیهانی، ئامانجگەلی ماسۆنیان هەیە.

لە فەڕەنسەشدا، کۆمەڵەی مافی مرۆڤ، کۆمەڵەی ڕێنوێنینە گشتییەکان و کۆمەڵەی ئۆنینۆنی ڕەگەزپەرست فراماسۆنین.

مێژووی تێکوشانی فراماسۆنی لە ڕۆژهەڵاتدا بە پێچەوانەی ئەورووپا و ئەمریکایەو رابردوویەکی گەشی نیە. بەریتانیەکان کە یەکەم کەس بوون ئەم ڕێبازەیان لە ڕۆژهەڵاتدا بڵاو کردەوە، کەڵکی نابەجێیان لە دروشمەکانی فراماسۆنی وەرگرت.

لە سەدەی هەژدەهەمدا لەم لۆژانە وەکوو گرنگترین ئامرازی کۆلۆنیالکردن و چەوسانەوەی وڵاتانی بە وتەی خۆیان (ئەو دیوی ئاوەکان) کەڵکیان وەرگرت. ڕاسپێردراوە بەریتانیەکان ماسۆنیکردنی کەسایەتیەکانی شوێنی ئەرکی خۆیان بە گرنگترین خۆیان دادەناو پاشانیش هەر لەم کەسایەتیانە بۆ کۆنترۆڵی سیاسەت و ئابووری ئەو وڵاتانە لە پیناوی بەرژەوەندیەکانی خۆیاندا کەڵکیان وەرگرت.

## فرانشیز *Franchise*

له وشه‌ی Franc به واتای راشکاوه و به که‌سێک ده‌گوترێ که بیروراکانی خۆی ناشاریته‌وه؛ زاراوه‌ی فرانشیز به واتای مافی ئیمتیاز، مافی رزگارکردن و مافی ده‌نگدان له هه‌ڵبژاردنی په‌رله‌ماندا که‌ڵکی لێ وه‌رگیراوه.

فرانشیز له سه‌ده‌کانی ناوه‌ڕاستدا به جاڕنامه‌یه‌ک ده‌گوترا که به پێی ئه‌م جاڕنامه ڕێگا به ره‌عیه‌ته‌کان ده‌درا له زه‌وی ده‌ره‌به‌گ و کلیساکان بچنه ده‌رو هه‌روه‌ها به‌و راگه‌یانراوه‌ش ده‌گوترا که به پێی ئه‌و راگه‌یه‌نراوه، ئه‌و مافه به ره‌عیه‌ته‌کان ده‌درا که که‌لوپه‌له بازرگانیه‌کانی خۆیان له شوێنی ژێر ده‌سه‌ڵاتی ده‌ره‌به‌گه‌کان بۆ شوێنێکی دیکه بگوازنه‌وه. نامه‌ی فرانشیز که وه‌کوو ده‌ستنووسێکی ئازادی ره‌عیه‌ته‌کان وا بوو، له سه‌ده‌ی یازده له ئیتالیای باکوور، ئه‌ڵمانیا و باکووری فه‌ره‌نسادا به‌ره‌وی په‌یدا کرد و له ئاکامدا پێوه‌ندیه‌کی راسته‌وخۆی له‌گه‌ڵ پێشکه‌وتنی ئابووری شاره‌کان له سه‌ده‌ی ۱۱ و ۱۲دا په‌یدا کرد.

له‌و کاته‌دا خه‌ڵکی شاره‌کان خوازیاری هه‌ڵوه‌شانه‌وه‌ی ئه‌و ئاسته‌نگانه بوون که ده‌ره‌به‌گه‌کان له بواری بازرگانیی، خاوه‌نداریێ و هاتووچۆدا له ناوچه‌کانی ژێر ده‌سه‌ڵاتی خۆیاندا بۆ خه‌ڵکی شاره‌کانیان پێکدێنا.

هه‌روه‌ها فرانشیز به‌و دارستانانه‌ش ده‌گوترا، که ده‌ره‌به‌گه گه‌وره‌کان (سینیۆره‌کان) له ناوچه‌کانی ژێر ده‌سه‌ڵاتی خۆیاندا ده‌یانڕواندن. ئامانجی ده‌ره‌به‌گه گه‌وره‌کان، بریتی بوو له ئاوه‌دانکردنه‌وه‌ی دارستان و پێکهێنانی شاری تازه یان شاری ئازاد ( فرانش) تا خه‌ڵک بۆ ئه‌م شارانه راکێشن. سینیۆره‌رکان چونکه پێویستیان به‌هێزی کار بوو و له ده‌ره‌به‌گه رکابه‌ره‌کانیش ده‌ترسان، جارنامه‌ی ئازادیان (فرانشیز) له ناو خه‌ڵکی ژێرده‌سه‌ڵاتی خۆیاندا بلاو ده‌کرده‌وه.

له سه‌ده‌کانی ناوه‌ڕاستدا، به‌ریتانیه‌کان له دارشتنی یاساکانی خۆیاندا، که‌ڵکیان له چه‌مکی فرانشیز وه‌رگرت. که بریتی بوو له ئیمتیازێک که پاشا ده‌یبه‌خشیه هاوولاتیه‌کانی خۆی. زاراوه‌ی فرانشیز له یاسای نێوده‌وڵه‌تیدا بۆ ئه‌و پارێزراوییه جیاوازانه که‌ڵکی لێوه‌ر ده‌گیردرێ که ده‌درێته دیپلۆماته سیاسیه‌کانی ولاتان: وه‌کوو: فرانشیزی شوێنی نیشته‌جێ بوون یا فرانشیزی باج.

## فەلەستین Palestine

ناوچەیەکە بە پانتایی ۱۰٤۲۹ کیلۆمەتری دووجا، کە لەقەراغی مەدیتەرانەی رۆژهەلاتدا هەلکەوتووە و تا کۆتایی شەڕی یەکەمی جیهانی بەشێک لە ئیمپراتۆریای عوسمانی بوو، بەلام ئیسرائیل ئێستا بەشێکی ئەم ولاتەی داگیر کردووە. لە دوای سالی ۱۹۱۸ەوە فەلەستین لە لایەن کۆمەلەی نەتەوەکانەوە چووە ژێر سەرپەرستی بەریتانیاوە. بەریتانیا بەلێنی دابوو کە بە پێی مەرجەکانی سەرپەرستیاری فەلەستین، بە شێوەیەک ئەم ناوچە بەڕێوە ببا کە بواربۆ پێکهێنانی ولاتێکی سەربەخۆ پێک بێنێ و پشتیوانی لە خەلکی فەلەستینی بکا. بەریتانیا لە ژێر پالەپەستوی کۆڕوکۆمەلە جووەکان، ڕێگای بە ژمارەیەکی زۆر لە جوولەکاندا کە بێنە ناو فەلەستینەوە. لە سالی ۱۹۱۹ دا زۆربەی دانیشتوانی فەلەستین عەرەب بوون. عەرەبەکانی فەلەستینی لە چاو عەرەبی شوێنەکانی دیکە، پێشکەوتووتر بوون.(چونکەفەلەستین یەکەم ناوەندی پێوەندی کولتووری ئیسلام و ئەورووپا بوو.) لە سالەکانی ۱۹۲۱ و ۱۹۲۹دا فەلەستینەکان بۆ وەدەستهێنانی ئازادی ڕاپەڕین، بەلام هێزەکانی بەریتانیا ڕاپەڕینەکەیان سەرکووت کرد.

ئەشکەنجە و ئازاری و جوولەکەکان لە لایەن نازییەکانی ئەلمانیاوە بوو بە هۆی ئەوەی کۆچی یاسایی جوولەکەکان بۆ فەلەستین پەرە بستێنێ. بزوتنەوەی نوێی سەهیۆنیزم بە دوای پێکهینانی ولاتێکی جوولە لە فەلەستین (نیشتمانیی بەلێن پێدراو ) دابوو. دواتر بەریتانیا ڕایگەیاند کە ئامانجەکەی دامەزراندنی ولاتێکی سەربەخۆ لە فەلەستینە کە جوولەکەکان و عەرەبەکان بەسەرێکەوە دەسەلاتیان بە دەستەوە بێ. بە پێی بەلێنی بەریتانیا بڕیار وابوو کە لە ماوەی ۱۰ سال دا ولاتی فەلەستین پێک بێ.

لە دوای شەڕی دووهەمی جیهانی لە نێوان عەرەبەکان و جوولەکەکاندا کێشە و ئاژاوەی زۆر دروست بوو و بەریتانیا کێشەکەی نارده ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان. کومیتەی تایبەتی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ فەلەستین پێشنیاری کرد کەئەم ولاتە دابەش بکرێ و ئەم پێشنیارە لە لایەن کۆمەلەی گشتی ڕێکخراوی نەتەوەیکگرتووەکانەوە پەسند کرا. لە ١٤ ی ئایاری ۱۹٤۸ دا، کۆمێسێری بەرزی بەریتانیا لە فەلەستین ، ناوچەکەی بەجێهیشت و ئیسرائیل بوونی خۆی ڕاگەیاند. سوپای ولاتانی عەرەب وەکوو، میسر، عێراق ئۆردن، لوبنان، سووریا و عەرەبستانی سعوودیا هێرشیان کردە سەر ئیسرائیل کەدانیان پێدانەدێنا، بە لام هێرشەکەیان شکستی

خوارد و له کۆتاییشدا له شوباتی ١٩٤٩دا ئاگربەست ڕاگەیەنرا. ئیسرائیل لەگەڵ ئەوەدا کەدانی بە دابەشبوونی ئەم وڵاتە داهێنابوو، بەڵام زۆربەی ناوچەکانی بەشی عەرەبی فەلەستینی داگیر کرد و نزیکەی ٤٠٪ زیاتر لەو بەشەی کە بۆی دانرا بوو، داگیری کرد. بەشی ڕۆژئاوای چۆمی ئۆردنیش کە عەرەب بوو، بوو بە بەشێک لە ئۆردن، و میسریش هێڵی غەززەی داگیر کرد. لە دوای شەڕی عەرەبەکان و ئیسرائیل لە حوزەیرانی ١٩٦٧دا، ئیسرائیل هەموو ناوچەکانی فەلەستین و تەنانەت بەشێکیش لە خاکی دراوسێکانی داگیر کرد ڕاشەی گەیاند کە هەتا عەرەبەکان دان بە ئیسرائیل دانەنێن، ئەو شوێنانە چۆڵ ناکا.

لە دوای زیاتر لە نیو سەدە خەباتی فەلەستینیەکان لە دژی ئیسرائیل و ٥ شەڕ وگرێدانی ڕێککەوتننامەی جۆراوجۆر، ئاگربەس و ئاشتی کە لە ئاکام دا بوو بە هۆی ئەسپاردنی بەشێکی کەم لە خاکی فەلەستین بە حکوومەتی خودموختاری فەلەستین بەرێبەرایەتیی یاسرعەرەفات، خەباتی نەپساوەی فەلەستینیەکان لە چوارچێوەی "ئینتیفازە"ی یەکەم و دووهەم دا بۆ چۆلکردنی ئەم شوێنانە و دان پێدانانی ئیسرائیل بەوەی کەئەم شوێنانە بە شێک لە خاکی فەلەستین، هەروا درێژەی هەیە.

## *فێمینیزم/ بزوتنەوەی ئازادیی ژنان* — ***Feminism***

سەرچاوەی فێمینیزم بۆ شارستانیەتە کۆنەکانی یۆنان و چین دەگەڕێتەوە و لە زۆربەی کولتوورەکانیشدا ئاماژەی پێکراوە. ئاکار و کردەوەی ژنانی بە ناوبانگی پێشوو و پشتیوانی لە مافی ژنان بۆ کەڵک وەرگرتن لە پەروەردە و فێرکردن و نفووزی سیاسی، وەکوو بوونە پاڵپشت بۆ بزووتنەوە هاچەرخەکانی ژنان. سەرەڕای ئەمە تەنیا لە ناوەڕاستەکانی سەدەی ١٩دا دابوو کە بزوتنەوەیەکی ڕێکخراوی ژنان پێکهات. خەبات بۆ وەدەستهێنانی مافی دەنگدانی ژنان کە لە ئاکامی پەرەگرتنی بەرەبەرەی مافی دەنگدانی پیاوانەوە سەرچاوەی گرتبوو، لە تایبەتمەندی ئەو قۆناغەیە کە پێی دەڵێن شەپۆلی یەکەمی بزوتنەوەی ئازدی ژنان و تایبەتمەندییەکەی ئەوەیە کە ژنان دەبێ مافی یاسایی و سیاسی وەکوو پیاوانیان هەبێ. مافی دەنگدان بۆ ژنان، ئامانجی سەرەکی ئەم قۆناغەی خەباتی ژنان بوو. چوونکە ئەم بیروڕایە زاڵ بوو کە ئەگەر ژنان بتوانن دەنگ بدەن، شێوەکانی تر جیاوازی و هەڵاواردنی ڕەگەزیش لە ناو دەچێ.

هەلومەرجی سەرهەڵدانی شەپۆلی دووهەمی ئازادی ژنان، تارادەیەکی زۆر لە هەلومەرجەکانی شەپۆلی یەکەم دەچێ. ئاڵوگۆڕەکانی سیستەمی سەرمایەداری لەگەڵ چوونەسەری

ڕادەی پێویستی بە هێزی کار بە تایبەتی لە قۆناغەکانی گەشەی ئابووری و شەڕدا، ڕاکێشانی ژنان بۆ لای Secondary Market لە قۆناغەکانی دابەزینی ئابووری و گەشە کردنی بەشی خزمەتگووزارییەکان ( لە چاوبەشی بەرهەمهێنان دا) و پێویستی بە هێزی کاریش لەم بەشەی ئابووریدا، چوونەسەر و زۆر بوونی ئاستی بەشداری هێزی کاری ژنانی لێکەوتەوە. پەرەگرتنی خوێندەواری بە تایبەتی لە ئاستە بەرزەکاندا بوو بە هۆی خوێندەواری زیاتری ژنان و تواناییە شاراوەکەیان بۆ گەیشتن بە ئاستە بەرزەکانی پیشەوکار، لە هەمان کاتدا ژنان لەرەوشێکی نایەکسان و نابەرامبەر لەگەڵ پیاوان دا دەژیان.

دوو ڕەوتی سەرەکیی بزووتنەوەی ئازادی ژنان لە شەپۆلی دووهەمدا، واتە ڕەوتی لیبراڵ و ڕادیکال لە بواری بنەما بنەڕەتیەکان، لێکدانەوەی ئەستەم، دیاریکردنی دوژمن، ئەو ئامرازانەی کەڵکیان لێوەردەگرتن، ناوەندی سەرەکی خەبات لە دژی ڕێکخستن، جیاوازییەکی زۆریان لەگەڵ یەکتردا هەبوو. بزووتنەوەی ئازادی ژنانی لیبراڵ کە پاشماوەی یەکسانیی شەپۆلی یەکەمە، هەروا لەسەر یەکسانیی ماف و نەهێشتنی هەڵاواردنی ڕەگەزی پێدادەگرێ و بزووتنەوەی ئازادی ڕێکخستنی ڕادیکالی لە پێناو ڕزگاری ژنان لە ژێر هەر دەسەڵاتێکی پیاواندا تێدەکۆشێ و بڕوای بە بنەمای دژایەتیی ژن و پیاو هەیە.

بزووتنەوەی ڕادیکاڵ پێویستی پێکهێنانی ئاڵوگۆڕی بنەڕەتیی لە هەموو بوارەکانی ژیانی تایبەتی و گشتیدا دێنێتە گۆڕێ و هێندێک لە ڕاڤەو لێکدانەوەکانیان، کە لە بنەڕەتدا لە سەر خۆڕسک بوونی دژایەتیی نێوان ژن و پیاو ڕاوەستاون، لەسەر جیابوونی ژنان و پیاوان لەکۆمەڵگادا پێداگری دەکەن.

شەپۆلی دووهەمی ئازادی ژنان لە پێکهێنانی ئاڵوگۆڕ لە دامەزراوەکان و یاساکاندا تا ڕادەیەکی زۆر سەرکەوتوو بوو و تەنانەت توانی لە هێندێک بواردا لە پێکهێنانی ئاڵوگۆڕ لە بەستێنە کولتووری و زارەکیەکاندا سەرکەوتنیش وەدەست بێنێ.

شەپۆلی سێهەمی ئازادی ژنان کە لە دەیەی ٨٠دا سەریهەڵدا و ئیستاش هەروا بەردەوامە ئاکامی ئەو ئاڵوگۆڕە پێکهاتەییە ئابوریە_ سیاسی و کولتوورییەی ئەم دواییانەیە. کۆمەڵە ئاڵوگۆڕە پێکهاتەییەکانی دەیەی حەفتا تا نەوەدی ئەمەریکا هاوکات بووە لەگەڵ درێژەکێشانی هەڵاواردنی

رەگەزی بەنیسبەت ئەو ژنانەی کە بوونی خۆیان لە بە ستێنی گشتیدا سەلماندووە. لە هەمان کاتدا ئەم ئاڵوگۆڕانە بوونە هۆی زۆرتربوونی جیاوازییەکان لە نێوان ژناندا.

یەکێک لە تایبەتمەندییە گرنگەکانی شەپۆلی سێهەمی بزووتنەوەی ئازادی ژنان بەرەسمیی ناسینی فرەیی، و فرەچەشنی لەم بزوتنەوەدا بوو و هەروەها ئەوەی کە ژنان بەشێک لەچالاکی خۆیان بۆ بوارە هاوبەشەکان لەگەڵ بزووتنەوە کۆمەڵایەتیەکانی دیکەدا تەرخان بکەن و لە بواری تیۆریشەوە خۆیان پێ بگەیەنن.

## Ferralists

### فێرالیستەکان

لە کۆمەڵگا کۆمۆنیستەکاندا بە گرووپێک لە لایەنگرانی رۆژئاوا دەگوترێ کە خۆیان بە لایەنگری " شۆرشی فێوریە" (شوبات) دەزانن و " شۆرشی سۆسیالیستیٚ" و دەستکەوتەکانی رەت دەکەنەوە. لە ساڵی ١٩١٧دا، دوو ئاڵوگۆڕ لە رووسیادا روویاندا کەیەکیان "شۆرشی فێوریە" و ئەوی دیکەیان " شۆرشی ئۆکتۆبەر" بوو. کۆمۆنیستەکان شۆرشی فێوریەیان بە شۆرشی " بۆرژوا دێموکراتیک" دادەنا و بە شۆرشی ئوکتۆبەریان دەگووت " شورشی سۆسیالیستیٚ".

## Forcemajeure

### فۆرس ماژۆر

زاراوەیەکی فەرەنسیە، کە وێدەچێ یەکەمجار لە یاسای شارستانی (مدنی) (یاسای ناپلیۆن) فەرەنسەدا کەڵکی لێوەرگیرا بێ و پاشانیش لە وڵاتانی دیکەدا هەرئەم زاراوە ویان وەرگێردراوەکەی بۆتە باو. وڵاتانی ئینگلیزی زمان تەنانەت لە یاسای نێو دەوڵەتیەکانیشدا، هەر لەم زاراوە کەڵک وەردەگرن.

لە یاسای فەرەنسادا، فۆرس ماژۆر واتای تایبەتی و گشتی هەیە. فۆرس ماژۆر بەواتا گشتییەکەی بریتیە لە هەر کارەساتێکی دەرەکی (لە دەرەوەی دەسەڵاتی بەڵێندار) و پێشبینی نەکراو و کە پێشی پێ ناگیردرێ ودەبێتە کۆسپ لە بەردەم جێبەجێ کردنی بەڵێنی لایەنێکی رێککەوتننامە یان گرێبەستێک. فۆرس ماژۆر لەم واتایەدا کردەوەی کەسێکی سێهەم و کردەوەی بەڵێنداریش دەگرێتەوە، کە خاوەنی ئەم دوو تایبەتمەندییە بن. بەڵام فۆرس ماژۆر لە واتا تایبەتیەکەیدا، کارەساتێکە کە لە هێزە سروشتیەکانەوە سەرچاوەی گرتووە، پێش بینی ناکری و ناتوانین پێش بە روودانەکەی بگرین.

هێندێک لە یاساناسە فەرەنسیەکان لە نێوان فۆرس ماژۆر و کارەساتی پێشبینی نەکراودا(Fortuitons Event)، جیاوازی دادەنێن و دەڵێن کە کارەساتی پێشبینی نەکراو کارەساتێکی نێوخۆییەو پێوەندی بە بنکە یان بە بەڵێندرەوە هەیە . وەکوو ئاگرتێ بەربوون، شتومەکی نەقوستان، لادانی شەمەندەفەر لە سەرێ و مانگرتن لە هێندێک حاڵەتدا. لە حاڵێکدا کە فۆرس ماژۆر، کارەساتێکی دەرەکیە وەکوو لافاو، گەردەلوول و....هتد.

لە قامووسی چەمکە یاساییەکاندا کە لەژێر چاوەدێری دوو مامۆستای بەناوبانگی یاسادا نووسراوە، ئاوا پێناسەی فۆرس ماژۆر کراوە:

لە یاسای شارستانیدا بە مانای گشتیەکەی، فۆرس ماژۆر هەموو ئەو کارەساتانە دەگرێتەوە، کە پێش بینی ناکرێن و پێش بە رووداوەکەشیان ناگیرێ، و دەبنە کۆسپ لە بەردەم جێبەجێکردنی بەڵێنی بە لێندەر. فۆرس ماژۆر روونی دەکاتەوە کە ئەو لایەنە هیچ رۆڵێکی لەو کێشەدا نیە. فۆرس ماژۆر بە مانای تایبەتیەکەی بە پێچەوانەی کارەساتی پێشبینی نەکراوەو بریتیە لە کارەساتێکی دەرەکی، واتە کەسی بەڵێندەر هیچ رۆڵێکی لە رووداوی کارەساتەکەدا نیە. (کارەساتی سروشتی. دەوڵەت، کردەوەی کەسی سێهەم ).

روسۆ، مۆستای یاسای نێودەوڵەتیی سەبارەت بە فۆرس ماژۆر دەڵێ: فۆرس ماژۆر بریتیە لە کۆسپێک کە پێش بە رووداوەکەی ناگیردرێ و بە هۆی کارەساتێکی دەرەکی هاتۆتە ئاراوە کە پێش بە جێبەجێکردنی بەڵێنێک یان جێبەجێکردنی یاسایەکی نێودەوڵەتیی دەگرێ. هەموو سیستەمە یاساییە نێوخۆییەکان، بەرپرسیارەتیی جێبەجێکردنی بەڵێنێک بەهۆی هاتنەئارای هێزێکی دەرەکی کە کە پێوەندی بە لایەنی بەڵێندەر نیە، ناخەنە ئەستۆی کەسی بەڵێندەر. لە یاسا نێودەوڵەتیەکانیشدا، فۆرس ماژۆر دەبێتە هۆی ئەوەی کە دەوڵەتەکان بەرپرسیاری جێبەجێکردنی رێککەوتننامەکان نەبن.

***نموونەکانی فۆرس ماژۆر :*** شۆرش، مانگرتن و قەدەغەکردنی یاسایی لەو هۆکارانەن کە زیاترلە گرێبەستە ئابوورییە نێودەوڵەتیەکاندا وەکوو فۆرس ماژۆر ئاماژەیان پێدەکرێ.

***الف_ شۆرشە جەماوەرییەکان:*** لە هەڵسووکەوتی دەوڵەتەکان و سەربەستی دادی نێو دەوڵەتیدا، زۆرجاران شۆرش وەکوو فۆرس ماژۆر چاوی لێکراوەو دەوڵەتیش لەم حاڵەتانەدا سەبارەت بەو زیانانەی کە لە هاوولاتیانی بیانی کەوتوون بەرپرسیارنیە. لە راپۆرتی سکرتاریای نەتەوە

یەکگرتووەکان سەبارەت بە فۆرس ماژۆر، بەشێک بەناوی " شەڕە نێوخۆییەکان، شۆڕشەکان، توندوتیژی جەماوەری، ڕاپەرین و بشێوی و ئالۆزی" بەرچاو دەکەوێ. لەم بەشەدا ئاماژە بەو نووسراوە و بەڵگە جیاوازانە کراوە کە بە پێی ئەم بەڵگە ونووسراوانە، شۆڕش و ڕاپەڕینە جەماوەرییەکان وەکوو فۆرس ماژۆر، دەوڵەتەکان بە بەرپرسیاری زیانە گیانی و ماددییەکانی هاولاتیە بیانیەکان دانانێن. و لە هەمان ڕاپۆرتیشدا لە بەشی " بڕیارە نێو دەوڵەتیەکاندا" باس لە بیروڕای دادگاکانی هەڵسەنگاندن و کۆمیسیێونە تێکەڵاوەکان کراوە کە هێندێکیان پێوەندییان بەو مەسەلەوە هەیە کە دەوڵەتەکان بە بەرپرسیاری قەرەبوو کردنەوەی ئەو زیانانە دانانێن کە لە ئاکامی شۆڕش وڕاپەڕینە جەماوەرییەکان دێنە ئاراوە.

پرۆفسێور ڕۆسۆ بە پشت بەستن بە بیروبۆچوونە نێودەوڵەتیەکان و بە تایبەتی ئەم دوو بۆچوونەی دواییان، سێ جۆرە زیانی دیاری کردەوە کە لە ئاکامی شەڕی نێوخۆیی و شۆڕش دێنە ئاراوە:

١)_ ئەو زیانەی کە لە ئاکامی خوودی شەڕەکەدا دێتە ئاراوە:

بەگشتی ڕەوتی دادی نێودەوڵەتیی لەم حاڵەتەدا دەوڵەت بەبەرپرسیار نازانێ و بە تێوری فۆرس ماژۆر یان حاڵەتی نائاسایی پاساو بۆ بێ تاوانی دەوڵەت دەهێنیتەوە.

٢ )_ ئەو زیانانەی بە هۆی هەوڵەکانی دەوڵەتەوە دێتە ئاراوە: بە پێی وتەی روسۆ، ئەگەر کردەوەکانی دەوڵەت لە هێندێک بواری تایبەتیدا لە دژی بیانیەکان لە حاڵەتێکدا کە لە چوارچێوەی ئەو ئەرکانەی کە بۆ دەوڵەت دیاریکراون، تێپەڕێ، دەوڵەت بەرپرسیارە. و هەروها کەمتەرخەمی و چاوەدێری نەکردنی دەوڵەت بۆ پێشگرتن لە کردەوە زیانبارەکان یان دەستبەسەرکردنی تاوانباران، دەبێتەهۆی ئەوەی کە دەوڵەت بە بەرپرسیار دابنرێ.

٣)_ ئەو زیانەی لە ئاکامی هەوڵی شۆڕشگێرەکان دێتە ئاراوە:

لەم حاڵەتەدا، ڕەوتی دادی نێودەوڵەتیی لە نێوان ئەو شۆڕشگێڕانەی کە سەرنەکەوتوون و ئەوانەی کەسەرکەوتوون، جیاوازی دادەنێ. لەو حاڵەتانەدا کە شۆڕشگێڕەکان سەرنەکەوتبێتن، دەوڵەت بەرپرسیاری کردەوەکانیان نابێ. بەڵام هەر ئەوەندەی کە شۆڕشگێڕەکان سەرکەوتبن و بە دەسەڵات گەیشتبن، ڕەوتی نێودەوڵەتی داد، دەوڵەتی نۆی بە بەرپرسیار دادەنێ.

*ب: مانگرتن*

لە یاساکانی فەڕەنسادا، بە پێی بڕیاری دەسەڵاتی دادی ئەو وڵاتە، مانگرتن لە حاڵەتەکانی فۆرس ماژۆرە. بەو مەرجەی کە تارادەیەک گشتی وبەربڵاو بێ و هەروەها لە ناکاو وکتوپڕبێ و هەروەها بە هۆی کەمتەرخەمی خاوەنی دامەزراوەکە رووی نەدابێ.

### فۆرماسیۆنی کۆمەڵایەتی– ئابووری

### Socio_ Economic Formation

فۆرماسیۆن یان پێکهاتەی کۆمەڵایەتی_ ئابووری بریتیە لە سیستەمێکی ئابووری لە قۆناغێکی مێژوویدا کە سەرخان و ژێرخانی ئەم سیستەمە لەگەڵ یەکتردا دەگونجێن. بە پێی لێکدانەوەی مارکیسەکان، لە مێژووی مرۆڤایەتیدا پێنج فۆرماسیۆنی کومەڵایەتی _ ئابووری هەن کە بریتیین لە کۆمۆنی سەرەتایی، کوێلەداری، دەرەبەگایەتی، سەرمایەداری و کۆمۆنیزم.

هەرکام لە فۆرماسیۆنە کۆمەڵایەتی_ ئابوورییانە، بەپێی یاسای تایبەتی خۆیان سەرهەڵدەدەن و گەشە دەکەن. بەڵام لە کۆمەڵێک یاسای گشتیشدا هاوبەشن کە لە ناو هەموو فۆرماسیۆنە کۆمەڵایەتی _ ئابوورییەکاندا بەرچاو دەکەون.

### فۆرمالیزم — Formalism

فۆرمالیزم بەمانای ڕۆاڵەتگەری و بایەخدانی لە رادەبەدەر بە رواڵەت و فۆرمی دیاردەکانە. هەروەها بەبڕوایەکی قووڵ بە پاراستنی رواڵەت لە کاروباری ئایینی، سیاسی، کۆمەڵایەتی یان لە کاروبارە ئیدارییەکانیشدا دەگوترێ. فۆرمالیزم زیاتر بۆ ڕێوشوێنە ئاینیەکان و ژیانی کۆمەڵایەتی کەڵکی لێوەدەگیردرێ.

### فیزیۆکرات — Phisiocrate

ئەم ڕێبازە لە لایەن هێندێک لە زانایان و نووسەرانی سەدەی ١٨ لە فەڕەنسادا، دامەزرا. ئەم زانایانە لایەنگری ڕێبازی سروشتی بوون و پێیانوابوو کە سیستەمێکی سروشتی و هەمیشەیی لە هەموو لایەنەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و ئابووری مرۆڤدا هەیە و کەسە وردبین و تێگەیشتووەکان دەتوانن لە ڕێگای تۆژینەوە، ئەم یاسا سروشتییانە بدۆزنەوە و لە کاتی خۆی دا جێبەجێیان بکەن و بەم شێوە گەورەترین خزمەت بە کۆمەڵگای خۆیان بکەن. فیزیۆکراتەکان پێیانوابوو کە نابێ دەست

له سیستەمی سروشتی کۆمەڵگا و یاساکانی وەربدەین و دەیانگووت دەوڵەتەکان نابێ بە دەستێوەردان لە کاروباری ئابووریدا، ببنە کۆسپ لە بەرامبەر ئەم سیستەمە سروشتیەدا؛ چوونکە ئەو ڕێوشوێنانەی کە دەوڵەتەکان سەبارەت بە ئابووری دایدەڕێژن، ڕەنگە ببێتە هۆی ئەوەی کە یاسا سروشتیە بەردەوامەکان لە ڕێچکەی بێ هەڵەی خۆیان لابدەن و ئەمە بەزیانی کۆمەڵگادا بشکێتەوە. فیزیۆکراتەکان بەو ئاکامە گەیشتن کە دەوڵەتەکان نابێ بە هیچ شێوەیەک بە پێچەوانەی سیستەمی سروشتی، دەست لە کاروباری ئابووری و سات و سەودای نێو دەوڵەتی وەربدەن.

## *Air Hijacking*

**فرۆکە رفێنی**

فرۆکەرفێنی بە دەستبەسەر داگرتنی نایاسایی فرۆکەی لە حاڵی فریندا دەگوترێ، کە کەس یان کەسانێک لە بەر هۆکارێکی شەخسی یان سیاسی دەست دەدەنە ئەم کارە. یەکەمین هەنگاو بۆ بەرەنگاری کردنەوە لەگەڵ تاوانەکانی فرۆکەرفێنی، کۆنفانسیۆنی ١٩٦٣ی تورکیا سەبارەت بەتاوانەکان و هێندێک کاری لادەرانەی دیکە لە ناو فرۆکەدا بوو. ئەم کۆنفانسیۆنە بە شێوەیەکی سانا دەپرژێتە سەر فرۆکەرفێنەکان و و لەگەڵ فرۆکەرفێنەکاندا وەکوو تاوانبارەکانی دیکە دەجووڵێتەوە. لە ساڵی ١٩٧٠دا، کۆنفانسیۆنی فرۆکە رفێنیی لاهە، دەستبەسەر داگرتنی فرۆکەی بە تاوانێکی جیاواز لە تاوانەکانی دیکە دانا. لە ساڵی ١٩٧١دا کۆنفانسیۆنی مۆنترال لە دژی کاری تێکدەرانەی ئاسمانی، کردەوەکانی وەک دانانەوەی ماددە تەقینەوەییەکان لە ناو فرۆکە و کاری تێکدەرانەی هاوشێوە، لە کارخستنی فرۆکەی لە حاڵی فرین، زیان گەیاندن بەدامودەزگاکانی فرۆکەوانی، کردەوەی تووندتیژانە لە دژی ئەوانەی لە ناو فرۆکەدان، یان بە زۆری شت لێ ئەستاندن لە کەسەکانی ناو فرۆکە لەخۆ دەگرێ.

کاتێک کە لە دەیەی ١٩٦٠دا، کۆمەڵێک کردەوەی فرۆکەرفینی کەلەساڵی ١٩٦١دا بە رفاندنی فرۆکەیەکی ئەمەریکا بۆ کووبا دەستی پێکرد و حکومەتەکانی ناچار کرد کە لەمبارەوە کۆمەڵێک بریار دەربکەن، فرۆکەرفێنی بۆتە کێشەیەکی گەورە. دەوڵەتەکانیش زیاتر لەوە تێگەیشتوون کە مەترسیەکانی فرۆکەرفێنی و تاوانە هاوشێوەکانی نابێ بکەونە ژێر کاریگەری ئەو بەرژەوەندیە سیاسیە، راست یان چەوتانەی کە دەبنە هاندەرێک بۆ ئەم ئەم کارە. نە تەنیا وڵاتانی رۆژئاوایی، بەڵکوو یەکیەتیی سۆڤیەت و وڵاتە کۆمۆنیستیەکانی دیکەش، دوای ئەوەی لەو ئاگادار

بوون کە بۆخۆشیان مەترسی ئەم کردەوانەیان لە سەرە، دانیان بەم راستیە دانا. بەڵام هەر خێرا دەرکەوت کە رێککەوتننامە نێوەوڵەتیەکان بەتەنیایی و بەبێ هاوکاری تەواوەتیی وڵاتان لە بەرامبەر ئەم کردەوانەدا چەکێکی کاریگەر نین. بە تایبەتی ئەوەی کە هێندێک لە وڵاتان داڵدی فڕۆکەرفێنیەکان بدەن یان بە شێوازی دیکە بەڵێنە نێودەوڵەتیەکان پێشێل بکەن. ئەو پێشنیارانەی کە بەمەبەستی بە هێزکردنی جێبەجێکردنی رێوشوێنەکانی دژی فڕۆکەرفێنی لە چوارەچێوەی رێکخراوە نێودەوڵەتیە فڕۆکەوانیە ناسەربازیەکان (ئیکائۆ) و دامەزرە نێودەوڵەتیەکانی دیکە هاتوونە گۆڕێ، تا ئێستا نەکراونە رێسای جێبەجێکاری رەها و رێک و پێک بۆ بەرەنگاری کردنەوە لەگەڵ تاوانەکانی فڕۆکەرفێنیدا. لە ئاستی نێوخۆییدا یاسا پتەوەکانی دژی فڕۆکەرفێنی و چارەسەرییە ئاسایشیەکان بوونە هۆی کەمکردنەوەی رووداوەکانی فڕۆکە رفێنی هەتا دەیەی ١٩٧٠. هەروەها چەند حاڵەتی یەک لایەنانەی وڵاتان لە دژی فڕۆکەرفێنەکان لە ئارادا بووە وەکوو هێرشی ئەنتەبە لە ساڵی ١٩٧٦دا، کە مارینزەکانی ئیسرائیل موسافیرەکانی فڕۆکەی ئێرفرانسیان لە ئۆگاندا، سەرەڕای نارەزایەتیی ئەم وڵاتە رزگار کرد یان هێرشی موگادیشۆ لە ساڵی ١٩٧٧دا کە سەربازەکانی ئەڵمانیای رۆژئاوا بە پشتیوانی حکومەتی سووماڵی، دەستیان بە سەر فڕۆکەیەکی رفێنراوی لوفت هانزادا گرت. لە ئاستی وڵاتانیشدا چەند رێککەوتننامە گرێ دراون کەفڕۆکەرفێنەکان ناچار دەکرێن بگەڕەێندرێنەوە بۆ ئەو وڵاتەی فڕۆکەکەی لێ هەڵساوە یان فڕۆکەرفێنەکان لە وڵاتەی کە داڵدادە دراون، دادگایی بکرێن. رێککەوتننامەی ئەمەریکا و کوبا لە ساڵی ١٩٧٣ دا کە دوایە کوبا خۆی لە کێشایەوە نموونەیەکی ئەم حاڵەتەیە. (چوونکە کوبا پێیوابوو ئەمەریکا لە دژی فڕۆکەیەکی کوبا کاری تێکدەرانەی ئەنجام داوە). لە ئاستی ناوچەییشدا، وڵاتانی گەورەی پیشەسازی رۆژئاوا لە ساڵی ١٩٧٨دا لە هەوڵێکی یەکگرتوودا، لەسەر ڕاگرتنی فڕین بۆ ئەو وڵاتانەی کە ناتوانن فڕۆکەرفێنەکان و فڕۆکە رفێنراوەکە دەستبەجێ بگەیەننەوە ئەو شوێنەی فڕۆکەکەی لێ تۆمار کراوە رێککەوتن. (هەروەها فڕۆکەی ئەم وڵاتانەش نەیدەیتوانی لەو وڵاتە ئەوروپیەکان بنیشێتەوە). جگە لەم رێککەوتننامە ئاشکرایانە، وا پێ ناچێ یاسا نێودەوڵەتیە عورفیەکان یاسا و رێسایەکیان هێنابێتە ئاراوە کە وڵاتەکان ناچار بکا لە دژی فڕۆکەرفێنەکان شتێک بکەن. بەڵام سەرەڕای ئەمەش یاسا نێودەوڵەتیە عورفیەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە دەبێ هەم فڕۆکەی رفێنراو و هەم کەسەکانیش بگەڕێندرێنەوە بۆ ئەو وڵاتەی کە فڕۆکەکەی لێ هەڵساوە. لە

مێژووی فرۆکەوانیدا، هێچ رووداوێک ئەوەندی رووداوی فرۆکەرفێنی ١١ی سێپتەمبەری ٢٠٠١ی ئەمەریکا کارەساتبار نەبووە. لەم کارەساتەدا دوو فرۆکەی نەفەرهەڵگری ئەمەریکا خۆیان بە تاوەرە جمکەکانی ناوەندی بازرگانی جیهانیدا دا، کە نەتەنیا متمانەی خەڵکیان بە هەبوونی ئاسایشی فرۆکەوانی کەم کردەوە، بەڵکوو لە بواری ئابووریشەوە زەبرێکی کاریگەر لە بازرگانی ئاسمانی کەوت.

## Fanctionalism

### فۆنکسیۆنالیزم

بە پێی ئەم تێورە، یەکەی رێکخراوی زاڵ لە سیستەمی نێودەوڵەتیدا، واتە دەوڵەتی نەتەوەیی_(دەوڵەت _ نەتەوە) بە شێوەیەکی رووله زیاد رۆڵی خۆی لە دابینکردنی پێداویستیەکانی مرۆڤ لە دەست دەدا. چوونکە لە چوارچێوەی ولاتێکدا بەرتەسک کراوەتەوە، لە کاتێکدا کە پێداویستیە مرۆییەکان سنوورەکان دەبەزێنن. فۆنکسیۆنالیزم بە دوو شێوە ناکۆکی و گرژییە زاتیەکانی پێوەندییە نێودەوڵەتیەکان و لەوانە شەڕ لە ناودەبا: یەکیان بە پشت بستن بە خۆشگووزەرانی ئابووری و کۆمەلایەتی خەڵک بەزاندنی سنوورەکان وئەوەی دیکەشیان دامەزراندنی رێکخراوە نێودەوڵەتیەکانە کە بە هەوڵ و رۆڵی جیاوازی خۆیان پێداویستیە کۆمەلایەتی _ ئابوورییەکانی مرۆڤ دابین دەکەن. فۆنکسیۆنالیزم تەنیا تێوری نەبوو و دەرئەنجامی گەشەی خێرای رێکخراوە نێودەوڵەیەکان لە ناوەڕاستی سەدەی ١٩دا بوو.

## Multipolarity

### فرەجەمسەری

بە پێکهاتەی سیستەمێکی نێونەتەوەیی (جیهانی، ناوچەیی یان نیمچە ناوچەیی) دەگوترێ کە لەودا رێککەوتن و بەڵێنیەکانی نێوان دەوڵەتەکان لە دەوری سێ جەمسەر (بە بەراورد لەگەڵ سیستەمی یەک جەمسەری یان دووجەمسەری )دا دەخولێتەوە.

بە هۆی ئەوی کە سیستەمە دووجەمسەرییەکان دەبنە هۆی پەرەگرتنی سیستماتیکی کێشە و ناکۆکیەکان لە هەموو دنیادا، بیرمەندان لەسەر ئەو بروایەن کە سیستەمێکی فرەجەمسەری لە سیستەمێکی دووجەمسەری سەقامگرتووترە، بەو مەرجەکە لە هەنگاوی یەکەمدا دەبێ پێکهاتەی "هێژمۆنیی بەرگریی بەرامبەرانە" لە نێوان لایەنەکاندا پێک بێ.

## Abdication Crisis

## قەیرانی دەست لە کارکێشانەوە

لە مێژووی هاوچەرخی بەریتانیادا ئەم زاراوەیە بە وازهێنانی دڵخوازانەی ئیدواردی هەشتەم لە تەختی پاشایەتیی ئەو وڵاتە لە ساڵی ١٩٣٦دا دەگوترێ. پاشای بەریتانیا کە دەیویست لەگەڵ ژنێکی تەڵاقدراو بەناوی ڤالیس سیسمپسۆن دا ژیانی هاوبەش پێک بێنێ، دەبوایە پەرلەمانی ئەو وڵاتە و نوێنەرانی کۆلۆنیەکان مۆڵەتی مارەکردنیان بە پاشا بدایە. دەوڵەتی بەریتانیا و نوێنەرانی پەرلەمان بە توندی دژی ئیرادەی پاشا وەستانەوەو، ناوبراو بۆ گەیشتن بە ئامانجەکەی خۆی دەستی لەکار کێشایەوە و، وازی لە پاشایەتی هێنا. ئیدواردی هەشتەم لە وتارێکی رادیۆییدا ماڵئاوایی لە خەڵکی وڵاتەکەی کردو، بەم شێوەیە براکەی واتا دووک یۆرک، ناسراو بە جۆرجی شەشەم (باوکی ئەلیزابێتی دووهەمی شاژنی بەریتانیا) بەجێگای ناوبراو بوو بە پاشا.

## Annexation

## لکاندن

به لکاندنی ناوچەیەک، بە خاکی ولاتێک کە هی ولاتێکی ترە، یان خاوەنێکی تایبەتی نیە دەگوترێ. ئەم کارە زیاتر یەک لایەنەیەو، بە بێ رازیبوونی دڵخوازانەی خاوەنداری پێشووی ناوچەکە جێبەجێ دەبێ. ئەم دەوڵەتەی ئەوکارە دەکا، دەستبەجێ ماف و خاوەندارێتی و سەروەریی رەهای خۆی بەسەر ناوچەکەدا پیادە دەکا.

## Deviationism

## لادان

بەو بیروبۆچوونانە لەناو حیزبە کۆمۆنیستیەکاندا دەگوترێ کە ئامانجیان جیا بوونە لە رێبازی سەرەکی و رەسەنی حیزبە. ئەو بیروبۆچوونانە،بەپێی داکۆکی و لایەنگری کردن لە سیاسەتی توندتر یان نەرمتر، بە لادەری چەپ یان راست ناودەبرێن.

لادەری زیاتر نیشانەی دۆگماتیزمی (باوەڕێکی توند بە بەرهەمەکانی مارکسیزم) یان پێدا چوونەخوازی (پێشێلکردنی رۆحی تیۆری شۆڕشگێری)یە.

## لێک جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان Separation Of Powers

لێک جیاکردنەوەی دەسەڵاتی حکومەتە لە نێوان هێزەکانی یاسادارێژی، بەڕێوەبەری و داد دایە. بەپێی تیۆری لێک جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان، هیچ کام لەوسێ دەسەڵاتانە ناتوانن دەست لە کاروباری ئەویتر وەربدەن و ئەرکەکانی ئەویتر بەڕێوە ببەن. ئەم تیۆرە بۆ یەکەمین جار لە لایەن مۆنتسکیۆ، بیرمەندی فەڕەنسی کە پێیوابوو سەقامگرتوویی دەوڵەتی بەریتانیا لە جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکانەوە سەرچاوە دەگرێ، هاتە ئاراوە. لە چاخی نوێدا ئەو سێ دەسەڵاتە بەتەواوەتی لێک جیا ناکرێنەوە، بەڵام بەپێی توانا هەوڵ دراوە کە ئەم سێ دەسەڵاتە لێک جیا بکرێنەوە. لە بواری یاساییەوە، لێک جیاکردنەوەی هێزەکان بە دووشێوە بەڕێوە دەچێ: ڕەها و ڕێژەیی. لە سیستەمی ڕەهادا (وەک ئەمەریکا) هیچ کام لەو سێ دەسەڵاتە بە هیچ شێوەیەک دەست لە کاروباری یەکتر وەرنادەن لە سیستەمی ڕێژەییدا، جۆرێک لە هاوکاری نێوان ئەوسێ دەسەڵاتە لە ئارادایە ( وەک دەستووری زۆربەی وڵاتانی ئەورووپای ڕۆژئاوا) و هێندێک لە وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست.

## لۆبینگ *Lobbying*

زاراوەیەکی باوی ناو ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە کە تەشەنەی کردۆتەوە دەرەوەی ئەمریکاش. بەواتا دنەدان و هاندانی نوێنەرانی پارلەمانە بۆ پشتیوانیکردن یان پشتیوانی نەکردن لەگەڵاڵەیەک لە ڕێگای پێوەندییە تاکەکەسیەکان و بەتایبەتی لەو شوێنە گشتیانەی پەرلەماندا کەخەڵکی ئاسایی دەتوانن بچنە ئەو شوێنانە. ئەم زاراوە زیاتر بۆ ئاماژەکردن بە پاڵەپەستۆی گرووپەکانی فشار و هاوبەرژەوەندییەکان بۆ سەر ئەندامانی پەرلەمان کەڵکی لێ وەردەگیردرێ.

## لێگاسیۆن *Legations*

بەهەرێمەکانی بۆلۆنیا، فرارا و ڕۆمانیا دەگوترێ کە پاپ داوای ئەم هەرێمانەی دەکرد و لە کۆتاییشدا بەپێی ڕێککەوتننامەی ١٧٩٧ بەخشرانە فەڕەنسا.

**Latifundiste**

**لاتیفۆندیست**

لەسەرچاوەی لاتینی Latus بە واتای پان و بەرین و Fundns بەواتای زەوی وزار وەرگیراوە و لاتیفۆندیست بە کەسێک دەگوترێ کە خاوەنی زەوی و زاری گەورەو پان و بەرینە. لاتیفۆند یەکەمجار لە سەردەمی کۆیلەداریدا هاتە ئاراوە. لاتیفۆندەکانی سەردەمی کۆیلەداری، یەکەمجار لە رۆمی کۆندا سەریان هەڵدا. هۆی سەرهەڵدانی لاتیفۆندەکان داگیرکردنی زەی وزاری جووتیارەکان و هەروەها داگیرکردنی زەی وزاری دەوڵەت لە لایەن هێندێک لە خاوەن کۆیلەکانەوە بوو. لاتیفۆندەکان لە زەی وزارە پان و بەرینانەدا، کۆیلەکانیان دەچەوساندەوە و بەرەبەرە جووتیارەکانی دیکەشیان لە گۆرەپان وەدەرنا وزەی وزارەکانیان لێ داگیرکردن. لە پاش هەرەسهێنانی سیستەمی کۆیلەداری، جارێکی دیکە و بە شێوەیەکی دیکە لاتیفوندەکان لە سەردەمی دەرەبەگایەتیدا سەریان هەڵدایەوەو تائیستاش لە هێندێک لە وڵاتانی سەرمایەداری هەروا ماون.

لاتیفۆندەکان ئیستاکەش لە بەشێک لە ویلایەتەکانی باشووری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، ئیتالیا، و بە تایبەتی لە وڵاتە جیاوازەکانی ئەمەریکای لاتیندا هەر ماون. لاتیفۆندەکان لە حاڵێکدا کە پاشماوەی سیستەمی فیئودالی لە بواری بەرهەمهێنانی کشتوکاڵیدا دەپارێزن، بە جێگای ئەوەی لە جووتیارەکان وەکوو کرێکار کەڵک وەرگرن؛ دەیانکەنە خاوەن بەش (وەکوو بە ئیجارە کردن سێ بەیەکی و ئەمانە بە کەمی لە تەکنەلۆژیا کەڵک وەرگرن و درێژە بە شێوەی ئاغاورەعیەتی و شێوەکۆنەکانی بەرهەمهێنانی کشتووکاڵی دەدەن. کە واتە تایبەتمەندی زەق و بەرچاوی لاتیفۆندیستەکان، نیودەرەبەگیی، پاراستنی ئامرازە دواکەوتووەکانی بەرهەمهێنان، پشت بستن بە هێزی کاری مرۆیی و چەوسانەوەی نیمچە ئاغایانەی جووتیارانە؛ ئەگەرچی لە کرێکاریش کەڵک وەردەگرن. شایانی باسە کە هێندێک لە کۆمپانیا گەورەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا کە خاوەنی زەی وزاری گەورە لە وڵاتە جیاوازەکانی ئەمەریکای لاتین ن، ئەم بەشە لە هەوڵە ئابوورییەکانی خۆیان لە سەر بنەمای لاتیفۆندی دامەزراندووە. لەبنەڕەتدا لاتیفۆندیستەکان کۆنەپەرست ترین توێژی کۆلۆنیالیستەکانن.

### لەبنرزۆم / شوێنی ژیان Lebensruam

لەبنررۆم یان شوێنی ژیان، زاراوەیەکە کە لە بنەڕەتدا لە بایۆلۆجیدا کەڵکی لێ وەردەگرن و مەبەست لە لەبنرزیۆم شوێنییکە کە گیانلەبەری ( مرۆڤ، حەیوان، رووەک) تێدادژی.

ئەم زاراوە یەکەمجار لە سیاسەتدا لە ئەڵمانیا لە نێوان ساڵەکانی ۱۸۷۱ -۱۸۷۰دا لە لایەن هێندێک لە رۆژنامەنووسانی ئەم وڵاتەوە بۆ پاساوهێنانەوەی شەڕە داگیرکەرەکانی "رایخی سێهەم" کەڵکی لێ وەرگیردرا. لە نێوان دوو شەڕی گەورەی جیهانیدا؛ بۆ ئەڵمانیا و ژاپۆن شوێنی ژیان وەکوو پەرەپێدانی " تواناییە بنەڕەتیەکان" بەمەبەستی وەدەستهێنانی شوێنی ژیانێکی نوێ بوو کە بتوانێ وەڵامی زۆربی رێژەی دانیشتوانی ئەم دوو وڵاتە بداتەوە. دەوڵەتی ژاپۆن داگیرکردنی مەنچووری و دورگەکانی دیکەی ئۆقیانووسی ئارامی بەجۆرێک لە گەورەترکردنی شوێنی ژیان دەزانی و بەم بیانووەوە، سیاسەتی ئەمپریالیستی خۆی جێبەجێ دەکرد. هەروەها هیتلەر و نازییەکانی ئەڵمانیاش لە ساڵی ۱۹۳۳- ۱۹٤٥ داگیرکردنی رۆژهەڵاتی ئەورووپایان کردە بیانوویەک بۆ پەرەپێدانی شوێنی ژیان و، لەم رێگایەوە هەوڵیاندا سیاسەتی داگیرکارانەی خۆیان جێبەجێ بکەن.

### لێواری هەڵدێر Brinkmanship

ستراتیژیی بە ئاراستەدابردنی قەیران، بۆ لێواری هەلدێری شەڕە هەتا لەم ئاراستەوە لایەنی بەرامبەر پاشەکشە بکا. سەرکەوتنی ئەم ستراتیژییە لەوەدایە کە ئەو وڵاتەی کە پەنادەباتە بەر ئەم ستراتیژییە، بەبێ ئەوەی تووشی شەڕکردن بێ؛ بە ئامانجەکانی دەگا. قەیرانی مووشەکی کوبا (۱۹٦۲) لە نموونە بەرچاوەکانی ئەم سیاسەتەیە. سێ ئامانجی سەرەکیی دەبنە هۆی کەڵک وەرگرتن لەم ستراتیژییە:

۱ــ گێڕانەوەی دوژمن لە جێبەجێکردنی هەڕەشەکانی.

۲ــ ناچار کردنی دوژمن بەوەی کە هێندێک ئیمتیاز بدا.

۳ــ سەرشۆڕکردنی دوژمن.

## Legion D'Honneur

### لۆژیۆن دۆنۆر

زاراوەیەکی فەڕەنسیە و بە میدالیای شوالیەکانی فەڕەنسە دەگوترێ کە لە سالّی ۱۸۰۲دا لە لایەن ناپلیۆن بوناپارت؛ ئیمپراتۆریای فەڕەنسەوە داهێنرا. ئەگەرچی ئەم میدالیایە لە بنەڕەتدا بە کەسە سەربازییەکانی ئەم ولاّتە دەبەخشرا، بەلاّم ئێستاکە بەکەسە مەدەنیەکانیش دەبەخشرێ.

## Arab Legion

### لۆژیۆنی عەرەب

ئەم زاراوە سەبارەت بە هێزە تایبەتیەکانی ولاّتی ئۆردون کەلّکی لێ وەردەگیردرێ. لۆژیۆنی عەرەب لە نێوان سالّەکانی ۱۹۲۱ و ۱۹٤۰ تەنیا هێزێکی پاسەوان لە ناوچەی بیابانی ئۆردۆندا بوو کە ئەرکی ئەم هێزە پێش گرتن لە هێرشی هۆزەکان و سەرکوتکردنی سەرهەلّدان و ڕاپەڕینی دانیشتووانی بیابان بوو. بەلاّم لە شەڕی دووهەمی جیهانیدا ئەرکی پاراستنی دامەزراوەکانی بەریتانیای لە ناوچەکەدا وەئەستۆ گرت. لۆژیۆنی عەرەب کە لە لایەن ئەفسەرانی بەریتانیاوە ڕاهێنرابوو، لە شەڕی ٤۱ -۱۹٤۸ ی عەرەبەکان لەگەلّ ئیسرائیلدا وەکوو یەکەیەکی لێهاتووی سوپا بەشداری کرد.

لە دوای شکستی عەرەبەکان لە ئیسرایل لە شەڕی فەلەستیندا (۱۹٤۸)، لۆژیۆنی عەرەب گەورەتر بوو. ئۆردۆن بەشی ڕۆژئاوای لێواری چۆمی ئۆردۆنی داگیر کرد و ناچار بوو لە سنوورە دوورو درێژەکانی خۆی لە بەرامبەر هێرشی ئیسرایل، بەرگری بکا. لە دوای ئەوەی ژەنەراڵ گلۆپ، لەسەر داوای دەولّەتی ئۆردۆن ئەم ولاّتەی بەجێهێشت، سەرۆکی فەرماندەیی لۆژیۆن کەوتە دەست ئەفسەرە عەرەبەکان. لێهاتوویی ئەم یەکە لە شەڕی سالّی ۱۹٦۷ی عەرەبەکان و ئیسرایل ــ کە بوو بە هۆی شکستی قەرە بوونەکراوەی عەرەبەکان ــ بۆ ئاستێکی زۆر نزم دا بەزی.

## Condor Legion

### لۆژیۆنی دالّ

یەکە تایبەتیەکانی ئەلّمانیای نازی کە لە ۵۰ بۆمب هاوێژ، ۵۰ فرۆکەی ڕاوکەر و بە تالێونێکی بەرگری ئاسمانیی ویەکەی دژە زرێپۆش ( دەبابە) و دوو دەستەی زرێپۆش پێکهاتبوون و بە پێی بڕیاری هیتلەر لە شەڕی نێوخۆیی ئیسپانیادا (۱۹۳۹ -۱۹۳٦) یارمەتی ناسیۆنالیستەکانی ئەم

ولاتەیان کرد. (١٩٣٦). ژمارەی ئەم هێزانە ٦٥٠٠ کەس بوو. سەرجەم ١٦٠٠٠ هەزار کەس لە هێزەکانی ئەلمانیا بە هانای ناسیۆنالیستەکانی ئسپانیاوە چوون. ڕێژەی ئەلمانیەکان لە ئیتالیەکان کەمتر بوو کەنزیکەی سوپایەکی کراس ڕەشیان ناردە ئیسپانیا و نزیکەی ٥٠٠٠٠ کەس لە هێزەکانی ئیسپانیان ڕاهێنا. هێزەکانی ئەلمانیا لە مانگی ئایاری ١٩٣٩دا، کاتێک ئەم ولاتەیان بە جێهێشت کە تەکتیکەکانی نوێی شەڕیان لەم ولاتەدا تاقی کردبۆوە.

## لەسێز–فەیر *Laissez -Faire*

زاراوەیەکی فەرەنسیە بە واتای دەستێوەرنەدان و ئازادی ڕەهای ئابووریی کەلکی وەرگیراوە. لە سێزفەیر ناوێکی دیکەی گریمانە" ئابووری کلاسیک"ە کە پێیوایە ئەگەر دەولەت یان هەر دەسەلاتێکی دیکە دەست لە کاروباری ئابووری وەرنەدەن، کێشەکان بۆ خۆیان چارەسەر دەبن. ئەم گریمانە لە سەرەتای سەدەی حەڤدەهەمدا دارێژرا و گرووپێک لە ئابووریناسانی فەرەنسا بە ناوی فیزیۆکراتەکان پەرەیان پێدا.

## لێگالیزم *Legalism*

بە واتای گرنگی و بایەخدان بە یاسا و بنەما یاساییەکانە. ئەم ڕوانگەیە کە دەبێ پێوەندیی دەولەت لەگەڵ خەلکدا و خەلک لەگەڵ یەکتردا بە پێی ڕێوشوێنەکانی داد بێ، دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی دەولەتی ڕۆمی کۆن و لەو سەردەمەوە بۆتە بەشێک لە فەلسەفەی سیاسی. ئەمرۆکەش لە سیاسەت و عورفی نێودەولەتیدا، هەر ئەم لایەنە یاسایی و هەلومەرجەکەی لەبەرچاو دەگیردرێ نەک لایەن و هەلومەرجە ئەخلاقی و کۆمەلایەتیەکەی ( بەو شێوەی کە لە یۆنانی کۆندا باو بوو).

لێگالیزم هەموو پێوەندیە مرۆییەکان بە پێوەری یاسا و داد و ماف هەلدەسەنگێنێ ئەمە بەو واتایەیە کە دەولەت بەرهەمی یاسایە و نابێ بەچەمکە ئەخلاقی و کۆمەلناسانە، دەولەت، کۆمەلگا و ولات شی بکەینەوە، بەلکوو دەبێ سەلاحییەتی یاسایی (لێگال)ی دەولەت لەبەرچاوبگرین و ڕوونیشی بکەینەوە کە ئایا دەولەت لەمبارەوە، دەولەتێکی شیاوە یان نەشیاوە.

## Länder

**لەندێر**

لەندێر.
بە پێی دەستووری ساڵی ١٩١٩ی ئەڵمانیا، بە هەرێمەکانی ئەم وڵاتەیان دەگووت
کۆماری ڤەیمەر، کۆماری هەرێمە ئازادەکان (فری ئیشتاین) بوو، بۆئەوەی دەستووری ئەم کۆمارە
روون بکاتەوە. ئەم زاراوە لە دوای شەڕی دووهەمی جیهانیەوە بە هەرێمەکانی کۆماری ئەڵمانیای
فیدراڵ دەگوترێ.

## Leninism

**لنینیزم**

لنین، ڕێبەری شۆڕشی رووسیا و دامەزرێنەری فەلسەفەی لنینیزمە کە شێوازێکی تایبەتیی
فەلسەفەی مارکسیسزمە کە لە رووسیادا جێبەجێ کرا. ئەم ڕێبازە لە حاڵەتی پێویستدا بروای بە
چاکسازی لە فەلسەفەی مارکسدا هەیە، بەلاّم لە هەمان حاڵیشدا سەبارەت بە لادان و هەڵگەڕانەوە
لە مارکسیزم دەمارگرژە.

بنەماکانی لنینیزم بریتین لە:

١ـ گونجاندنی مارکسیزم لەگەڵ هەلومەرجی زۆر جیاوازی رووسیادا.

٢ـ پەرەپێدانی مارکسیزم لە سەربنەمای نێودەوڵەتی، هەرچەندە بەپێی خوێندنەوەیەکی یەک
لایەنانەش بێ.

٣ـ پەرەپێدانی تیۆری ئەزموونەکانی شۆڕش ١٩١٧ی رووسیا (گشتاندنی ئەم تیۆرانە).

لایەنە هاوبەشەکانی مارکسیزم و لنینیزم بریتین لە:
هەوڵدان لە پێناوی وەدیهێنانی بزووتنەوەی کرێکاری، دژایەتیکردن لەگەڵ سەرمایەداری
وزاڵبوون بەسەر ئەم سیستەمەدا لە ڕێگای وەرێخستنی شۆڕش، وەدیهێنانی کۆمەڵگایەکی
سۆسیالیستی. سەبارەت بە حیزب؛ لنین پێیوایە کە:" کرێکاران بەتەنیایی ناتوانن و شیاری سیاسییان
هەبێ، چ بگا بەوەی وشیاری مارکسییان هەبێ. هەروەها دەبێ حیزب پێکهاتەنەکی سانترالیستی
هەبێ و هەموو رۆل و ئەرکەکانی حیزب لە بەردەست ژمارەیەکی زۆر کەم لە شۆڕشگێڕە شارەزاو
لێهاتووەکان دابن". سەبارەت بە بەئەمپریالیزمیش لنین پێیوایە کە: " سەرمایەداری لە چواردەیەی

کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمەوە بەرەبەرە بۆتە سەرمایەداری پاوانخوازانە یان ئەمپریالیستی. ئەم وەرسووڕانە لە بواری ئابووریدا ٥ تایبەتمەندی هەیە:

یەکەم ئەوەی کە کێبەرکێی سەربەستانە جێگای خۆی ئەسپاردۆتە مۆنۆپۆلەکان. دووهەم ئەوەیە کە سەرمایەی پیشەسازی و بانکی کە هەرکامیان لە سەرمایەداری پێش[قۆناغی ] ئەمپریالیزمدا سەربەخۆ بوون، بە شێوەی سەرمایەی ماددی لە یەکتردا دەتوێنەوە. تایبەتمەندی سێهەم ئەوەیە کە هەناردنی شتوومەکەکان بۆ وڵاتە دواکەوتووەکان لە بواری ئابوورییەوە؛ جێگای خۆی ئەسپاردۆتە هەناردەی سەرمایەکان. چوارەم تایبەتمەندی ئەوەیە کە لە قۆناغی پەڕینەوە بۆ ئەمپریالیزم، یەکیەتیەک لە مۆنۆپۆلەکان دێتە ئاراوە کە جیهان لە نێو خۆیاندا دابەش دەکەن. پێنجەم ئەوەیە کە دابەشکردنی جیهان لە لایەن دەسەڵاتە گەورەکانی سەرمایەدارییەوە بە شێوازی کۆلۆنیەکان کۆتایی پێهاتووە.

ئاکام و دەرئەنجامی ئەم شتە ئەوەیە کە ئەگەر دژایەتیەک یان پارادۆکسێک لە شوێنێکی جیهاندا سەرهەڵبدا، لەسەر شوێنەکانی دیکە جیهانیشدا کاریگەری دادەنێ. " لە بواری سیاسییەوە لنین پێیوایەکە: " لە قۆناغی ئەمپریالیستیدا، سەرمایەداری وەکوو خۆرکەیەکی رزیوی لێ دێ ". لە پێوەندی لەگەڵ شەڕیشدا دەڵێ: " لە سەردەمی ئەمپریالیزمدا هێزە ئەمپریالیستەکان لەگەڵ یەکتردا تووشی ناکۆکی دەبن، بۆیە لە نێوانیاندا شەڕ هەڵ دەگیرسێ، جگە لەمە ئەمپریالیزم بە هۆی پەت کردنی نەتەوەکانی دیکە، دەبێتە هۆی هەڵایسانی شەڕی رزگایدەری نەتەوەیی. هەروەها ململانێ و ناکۆکیە نێوخۆییە رووله زیاد بووەکانیش بە شێوەی حەتمی دەبنە هۆی هەڵگیرسانی شەڕە نێوخۆییەکان".

بە بڕوای لنین" هەلومەرجی شۆڕشگێڕانە" بریتیە لە: " قەیران لە نێو توێژەکانی سەرەوەدا، زۆر بوونی لە رادەبەدەری ناکۆکیە کۆمەڵایەتیەکان لە نێوان چینی دەسەڵاتدار و جەماوەری ژێر دەستەو چوونەسەری خێرای ئامادەیی چینە شۆڕشگێڕەکان بۆ خەبات و تین دانی کردەوەی شۆڕشگێڕانە". لنین بەردەوام ئاماژە بەوە دەکا کە بۆ سەرهەڵدانی هەلومەرجێکی شۆڕشگێڕانە ئەم سێ تایبەتمەندییە پێویستن.

سەبارەت بە دیکتاتوری پرۆلتاریاش پێیوایە کە دیکتاتوری پرۆلتاریا بەگشتی کاکڵەی مارکسیزمە. بەڕای لنین؛ مارکس دیکتاتۆری پرۆلتاریا پەسند دەکا. چوونکە دیکتاتۆری پرۆلتاریا

سیستەمێکی سیاسی_ سەربازییە کە پەڕینەوە لە سەرمایەدارییەوە بۆ سۆسیالیزم مسۆگەردەکا.
سەبارەت بە "کۆمەڵگای بێ چینی کۆمۆنیستی داهاتوو"ش لە حاڵێکدا کە مارکس و ئەنگێلز
بەردەوام لەسەر "هاوکاری بەرهەم هێنە ئازادەکان"، " نەمانی بەرەبەرەی دەوڵەت" و "رزگاری
کەسایەتیی مرۆڤ "پێیان دادەگرت، لنین لە نێوان قۆناغی یەکەم واتە سۆسیالیزم و قۆناغی بەرزتر،
واتە کۆمۆنیزم جیاوازی دادەنێ و پێیوابوو دەوڵەت دەبێ بەرەبەرە بفەوتێ.

## Luftwffe

## لۆفت ڤافە / هێزی ئاسمانیی ئەڵمانیا

زاراوەیەکی ئەڵمانیە بە " هێزە ئاسمانیەکانی رایخی سێهەم" دەگوترێ. لۆفت ڤافە، ئامرازی
سەرەکیی رایخی سێهەم لە شەرە بەدەست و بردەکانی هیتلەر لە ماوەی شەڕی دووهەمی جیهانیدا
بوو. گەرچی ئەڵمانیا بە پێی رێککەوتننامەی ڤێرسای (١٩١٩) نەیدەتوانی فرۆکەی سەربازی
دروست بکا، بەڵام کۆماری ڤەیمەر لە دەرفەتە چکۆلەکان بۆ راهێنانی فرۆکەوان لە ئاستێکی
بەربڵاودا کەڵکی وەرگرت و بەشێوەی نهێنی خەریکی تاقیکردنەوەی فرۆکە راوکەرەکان بوو.
لۆفت ڤافە کە پاشای بێ هاوتای ئاسمانەکان بوو، رۆڵێکی زۆر کاریگەری لە شەڕە برووسک
ئاساکان، بۆمبارانکردنی شوێنەکانی دوژمن و دابەزاندنی هێزی پەرەشووتڤان لە بەرەی دوژمن دا؛
گێڕا.

لۆفت ڤافە لە شەڕی هەڵۆدا، زەبرێکی کاریگەری لە هێزەکانی بەریتانیا وەشاند. بەڵام
دەزگاکانی راداری بەریتانیا کاریگەری ئەم فرۆکانەی پووچەڵ کردەوە و ئەڵمانەکان ناچار چەند
ناوچەیەکی شاری لەندەنیان بۆمباران کرد. لەم قۆناغەی شەڕدا بوو کە هێزە ئاسمانیەکانی شانشینی
بەریتانیاش شارەکانی ئەڵمانی بۆمباران کرد. لەم کاتە ناسکەدا فەرماندەیی ئەڵمانیا بە هۆکارێکی
نادیار بڕیاری راگرتنی کردەوەی هەڵۆی راگەیاند.

لۆفت ڤافە لە بەرەی شەڕی رووسیادا هەم لە بواری رادی فرۆکە و هەم لە بواری
ژمارەی فرۆکەوان لە ئاستێکی زۆر بەرزدا بوو. زۆربەی قارەمانەکانی هێزی ئاسمانی ئەڵمانیا وەکوو
ئێریش هارتمان بە ٣٥٣ سەرکەوتنەوە، قارەمانی شەڕەکانی بەرەی روسیا بوون. ئەگەرچی لە
دواییدا رووسەکان هێزی بەرگری زەمینی خۆیان بۆ وەڵامدانەوەی هێرشە ئاسمانیەکان بەهێز کرد،
بەڵام لۆفت ڤافە تاساڵی ١٩٤٥ هەروا تا دوایین رۆژەکانی کۆتایی شەڕی دووهەمیی جیهانی بە

گروتین بوو. ئەمەش رەنگە لەبەر ئەوە بووبێ کە هێزی ئاسمانیی ئەڵمانیا وەکوو هێزی زەمینی رکابەرێکی وەکوو هێزەکانی S.S یان لەبەردەم دا نەبوو بێ.

### لۆمپەن پرۆڵتاریا *Lumpen Proletariat*

زاراوەیەکی ئەڵمانیە بە واتای کرێکاری چڵکنە. بەڵام کارڵ مارکس بە "خەڵکی ئاسایی و نەخوێندەوار" دەڵێ لۆمپەن پرۆڵتاریا. لە ئەدەبی مارکسیدا، لۆمپەن پرۆڵتاریا بەگشتی بەو توێژە بێزارانە دەگوترێ کە لە کۆمەڵگای سەرمایەداریدا و بەزۆری لە شارەکاندا دەژین، ئەمانە تووشی دارمان بوون و سەر بە هیچ چینێکی کۆمەڵگا نین. لە رەوتی ئاسایی ژیان دوور کەوتنەوە،کارێکی تایبەتی و بەکەڵکیان نیە و لە هەلومەرجێکی زۆر نالەباردا دەژین و خەرێکی زۆر کاری نەشیاو و نامرۆڤانە دەبن. دزەکان، بەرەڵاکان، چەقۆوەشێنەکان، لە شفرۆشەکان و تاوانبارانی تاوانە چکۆلەکان بە لۆمپەن پرۆڵتاریا دەژمێردرێن.

### مێریتۆکراسی *MeritoCracy*

مایکڵ یانگ. ئەم زاراوەی داهێناوە (لەکتێبی سەبارەت بە مێریتۆکراسی ۱۹۰۸) بە حکومەتی ئەو.کەسانە دەگوترێ کە بۆ بەرێوەبردن و راپەراندنی حکومەت لێهاتوو و لێوەشاوەن. [بەگشتی بە ئەسپاردنی ئەرک بەو کەسانە دەگوترێ کە لێهاتوو و شارەزا بن و بتوانن ئەرکەکان بەرێوە ببەن(شایستەسالاری) ].

### لیبرالیزم *Liberalism*

لە سەرچاوی لاتینیی Liber بە واتای ئازادی وەرگیراوە. لە قامووسی سیاسییدا تیۆرێکە کە داکۆکی لە پارستنی ئازادی لە بەرامبەر هەردامودەزگایەک دادەکا، کە هەرەشە لە ئازادی مرۆڤ دەکەن. لیبرالیزم لە بواری ئابووریدا، بە واتای بەرەنگاریکردن لەگەڵ دەستبەسەرداگرتنی ئابووری کۆمەڵگا لە لایەن دەوڵەت و بەرەنگاریکردن لەگەڵ هەرجۆرە پاوانکردن و دەستێوەردانێکی دەوڵەت لە کەرتی بەرهەمهێنان و دابەشکردنی سامان دایە.

زاراوەیەکی دیکە هەرلەم پێوەندییەدا؛ لیبرالیزمی ئایینیە کە واتای بڕوا هەبوون بە مافی هەر کەسێک، لە هەڵبژاردنی خواپەرستن یان خوانەپەرستن دایە.

لیبرالیزم لە لایەکەوە بەرەوتێکی سیاسی بۆرژوایی دەگوترێ کە لە سەردەمی پێشکەوتووبوونی بورژوازیدا ، واتە ئەو کاتەی کە سەرمایەداری پیشەسازی لە دژی ئاریستۆکراتی دەرەبەگایەتییدا شەڕی دەکرد و بەتەمای بەدەستەوەگرتنی دەسەڵات بوو، سەری هەڵداو گەشەی کرد. لیبراڵەکان لەو سەردەمەدا نوێنەری بەرژەوەندی ولایەنگری چینێکی لە حاڵی گەشەکردن و بەهێز بوون. داوای رزگاربوون لە کۆت و بەندە ئابووری و کۆمەڵایەتیەکانی سەردەمی دەرەبەگایەتیان دەکرد، دەیانەویست دەسەڵاتی رەهای پاشایەتیی بەرتەسک بکرێتەوە ، کەسە لیبراڵەکان بچنە ناو پەرلەمانەوە و مافی دەنگدانی سەربەستانە و مافەسیاسییەکانی دیکە بە پێی چوارچێوەی ئەو سەردەمەو و بە واتا بۆرژواییەکەی بەرەسمیی بناسرێن. لە قامووسی مارکسیزمدا واتای سیاسی لیبراڵیزم بە شێوازێکی بەمن چیەو دوورەپەرێزانەای ناو حیزبی چینی کرێکار سەبارەت بە دوژمنی چینایەتیی دەگوترێ. لەم واتایەدا لیبرالیزم یانی: پێکهاتنی ناعەقڵانی بە زیانی بنەماکانی بیروڕای مارکسیزم ــ لنینیزم، هەڵوێستی نابەجێ لە بەرامبەر هەڵەکان و پشتگوێ خستنی بنەماکان لەبەر هۆکاری روون و تایەتی. لیبراڵیزم بەم واتایە لە دیاردەکانی ئۆپۆرتۆرتینیزم و تاکایەتیە ( Individualism ) .

## نیۆ ـ لیبرالیزم
## *Neo – Liberalism*

نیۆلیبراڵیزم کۆمەڵێک بیروبۆچوونی نوێ لە بیری سیاسی و ئابووریی رۆژئاوادایە کە لە بنەڕەتدا لە بەرامبەر سەرهەڵدانی دەوڵەتی خۆشگوزەرانی رۆژئاوا و لە دوای قەیرانی قووڵی نێوان دووشەڕی گەورەی جیهانی (یەکەم و دووهەم ) و بەتایبەتیی لە دوای شەڕی دووهەمی جیهانیەوە هاتۆتە ئاراوە. نیۆلیبراڵیزم بواری هزری بۆ سیاسەتە ئابووری و کۆمەڵایەتیەکانی هێندێک لە وڵاتانی رۆژئاوای لە دژی پێکهاتەی دەوڵەتیی خۆشگووزەرانی و دەستێوردانەکانی دەوڵەت لە ئابووری و سۆسیالیزمی حیزب کرێکارییەکان و بۆچوونی کیتری لە سەرمایەداری رۆژئاوادا خۆش کردووە. ئەگەرچی لیبراڵیزم لە بواری هزرو بیروبۆچوونەوە دەچێتە ناوخانەی بزووتنەی هزری لیبراڵیزمی کلاسیکەوە، بەڵام لە هێندێک لایەن و بواردا، هزروبیرێکی هاوچەرخ و سەربەخۆیە کەبەرهەمی

هەلومەرجی ئابووری و سیاسی رۆژئاوای پاش شەڕی دووهەمی جیهانی و ئەزموونی دەوڵەتی خۆشگووزەرانی وەکوو دژکردەوەیەک سەبارەت بە قەیرانی سەرمایەدارییە.

نیۆلیبرالیزم لە گۆرەپانی بیری سیاسیدا هێرشی کردۆتە سەر پەرەگرتنی دەزگای حکومەتی و هێندێک لە ویستە پۆتۆپیاییەکانی لیبرالیزمی کلاسیکی سەبارەت بە بەرتەسک کردنەوەی هەوڵەکانی دەوڵەت زیندوو کردۆتەوە. تیۆری ئابووری نیۆلیبرالیزم تێکەڵاوێکە لە تیۆریی دراو و تیۆری نیۆ کلاسیک. ئەوانەی بڕوایان بەم تیۆرە هەیە، پێیانوایە دەبێ رێژەی نرخی دەوڵەت و Government Expenditure و Volume Of Moneyکەم بێتەوە، بۆ ئەوەی رادەی هەڵاوسان کەم بکەنەوە، تەنانەت ئەگەر ببێتە هۆی بەرزبوونەوەی بێکاریش. لە روانگەی ئەمانەوە هەڵاوسان، دوژمنی سەرەکیە.

بیروبۆچوونە نیۆلیبراڵیەکان لە رۆژئاوادا هێرشیان کردۆتە سەر دەستێوەردانی دەوڵەت لە ئابووری و کۆمەڵگادا و لەگەڵ ئەوەی کە لە سەر هێندێک لە لایەنەکانی لیبرالیزمی کلاسیک پێداگری دەکەن، بیری نوێشیان سەبارەت بە گۆڕینی رێکخراوی دەوڵەت ئاراستە کردووە. نیۆلیبراڵیەکان لەسەر ئازادی تاکەکەسی، کەمکردنەوەی رۆڵی دەوڵەت تا ئەوپەڕی خۆی و تەنانەت پێداچوونە لە رۆڵ و ئەرکەکانی حکوومەتیشدا پێدا گری دەکەن. بە بڕوای ئەوان کەرتی گشتی لە بنەڕەتدا کەرتێکی تایبەتیە و خێرو قازانجی گشتی لە بەرچاو ناگرێ. لە ناو بیرۆکراتی دەوڵەتیشدا وەکوو بازاڕ، کەسەکان بەدوای قازانج و بەرژەوەندی خۆیانەوەن. لە پاش شەڕی دووهەمیی جیهانی و بە دەسپێکردنی سەردەمی دەستێوەردانی دەوڵەت لە ئابووریدا و خۆماڵیکردنی ئابووری، ئەو گریمانە هاتە ئاراوە کە بەرپرسانی کەرتی دەوڵەتی (گشتی ) گۆڕاون و خزمەت بە بەرژەوەندییە گشتییەکان دەکەن. بەڵام بەپێی ئەم گریمانە، بورۆکراتی لە بەرامبەر سەرمایەداریدا رادەوەستا. بیرۆکراتەکانی دەوڵەتی خۆشگوزەرانی، بۆ بەرژەوەندییەکانی خۆیان، داوای چوونەسەری ئاستی Public Expenditureدەکەن. سەرجەم، دەوڵەت کۆمەڵێک بەرژەوەندی تایبەتیەو هیچی دیکە. ئەگەربیرۆکراتەکانیش بە جوانی بجووڵێنەوە، پاڵنەری تایبەتیی تاکەکەسیان هەیە و بەدوای زۆرترکردنی ئیمتیازە تایبەتیەکانی خۆیانەوەن، بەبڕوای نیۆلیبراڵەکان؛ کەرتی تایبەتیی خەرجێکی زیاتر لە کەرتی تایبەتی کە لەسەر بنەمای رکابەری راوەستاوە، دەخاتە سەرشانی حکومەت و لە هەمان کاتیشدا، دەبێتە هۆی دابەزینی ئاستی چۆنیەتی شتوومەک و

کەرەسە بەرهەم هاتووەکان. بۆیە ئەوان لایەنگری لە تایبەتی کردنی کەرتی دەوڵەتی (گشتی) یان لانیکەم لایەنگری لە کێبەرکێ لە کەرتی دەوڵەتیدادەکەن.

ئەگەر بازاڕ لە هێندێک بواردا وەلامدەرنیە، پێویست بەوە ناکا دەوڵەت جێگەی بازاڕ بگرێتەوە، ڕەنگە دەوڵەت بۆ خۆشی کەم و کووڕی هەبێ کە ئابووریناسەکانی لایەنگری دەڵەتی خوشگوزەرانی بایەخیان پێ نەداوە. بە بڕوای زۆربەی نیۆلیبراڵەکان لانیکەم دەبێ چوارچێوەی دەستێوەردانی دەوڵەت دیاری بکرێ و بەتایبەتیی دەبێ هەوڵێکی وا بدرێ کەرەوتی کەمیی بوودجە قەرەبوو بکرێتەوە و یاسای بوودجەی هاوسەنگ دابمەزرێ. کاتێک کە دەوڵەت دەست لە بوارەکانی دابەشکردنی سامان و دیاریکردنی بەرنامە ئابوورییەکان وەردەدا، گرووپە تایبەتیەکان دەسەڵاتی خۆیان لە دەست نادەن، بەڵکوو هەوڵ دەدەن کە دەوڵەت کۆنترۆڵ بکەن. لە ماوەی دەیەی هەشتادا بیروبۆچوونە نیو-لیبراڵیەکان لە ئاڵوگۆڕە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکانی هێندێک لە وڵاتانی ڕۆژئاوادا کاریگەریان هەبوو.

### *لیتیل بۆی / کوڕە چکۆڵەکە* — *Littele Boy*

ناوی ڕەمزیی یەکەمین بۆمبی ئەتۆمیی ئەمەریکایە کە لە ڕێکەوتی ٦ ئابی ١٩٤٥، فرێ درایە ناوشاری هێرۆشیما لە ژاپۆن. بە هۆی تەقینەوەی ئەم بۆمبە ٧٨/٠٠٠ کەس کوژران و ٩٠/٠٠٠ کەسی یکەش بریندار بوون.

### *لیدێر* — *Leader*

لیدێر لە سەرچاوەی Leadی ئینگلیزی وەرگیراوە و ئاماژە بە ڕێبەرو ڕێنوێنیکەر دەکا و بە واتای ڕێبەر، پێشەوا، سەرۆک، فەرماندە، ڕێنوێن، سەرکردە، سەرپەل و وەستا کەڵکی لێوەرگیراوە. لیدێر بە کەسایەتیەک دەگوترێ کە بە هۆی توانایی و لێهاتوویی و تایبەتیی خۆیەوە پلەی ڕێبەری و ڕێنوێنیکەر وەردەگرێ و ڕۆڵێکی گرنگ، ناسک و هەستیار لە ڕێنوێنی کردنی شوێنکەوتووانی خۆیدا دەگێڕێ.

لیدێر هەست بەرێکخستنی گشتی و ئاسۆیی گرووپ، تاقم یان کۆمەڵگای ژێردەستی خۆی دەکا و بە تێکەڵاوکردن و لێکدانی شارەزایی و توانایە تیۆری و کردەییەکانی ئەندامانی

شوێنکەوتووی خۆی، هەڵسووکەوتێکی نوێ دێنێتە ئاراوە و پێکهاتەیەکی هاوسەنگ لە ئاڵو گۆڕی بیروڕاکان لە پێناو ئامانجە تایبەتیەکانی خۆی دا پێک دێنێ. لە چوار قۆناغ دا بڕیاردەدا:

١ـ گەڵاڵە دارشتن
٢ـ رێکخستن
٣ـ رێبەرایەتی
٤ـ چاوەدێریکردن

هەرچەندە کە رێگاکانی ئەنجام دانی کارێک زیاتر بن، بڕیاردان ئەستەمتر دەبێ. بڕیاردانی بەردەوام و شێلگیرانە، کەڵک وەرگرتنی بە جێ لە ئەندامەکان، سەپاندنی هێزی خێرخوازانە لە کاتە پێویستەکان دا لە تایبەتمەندیکانی لیدێرن.

ژـ فرانسوا سیمۆن (١٨٩٦ـ ١٨١٤) ناسراو بە ژۆل، (وەزیری پەروەردەی گشتی بەرگری نیشتمانیی و پاشانیش سەرۆکی حکومەتی فەرەنسا لە ساڵی ١٨٧٦دا)، شارەزای بواری بەڕێوەبەری و کارگێری، لیدێر بە هاوواتای بەڕێوەبەر (کارگێڕ) دادەنێ و بۆ هەردووکیان، بڕیاردان، دیاریکردنی رێگاکانی جێبەجێکردن و هەڵبژاردنی رێگا باشترەکان بە پێویست دەزانی.

لایەنگرانی لیدێر دەبێ لە بواری هەست و سۆزیشەوە دان بە لیدێردا بنێن. لیدێر یان رێبەر بە دڵ ئاوەڵاییەوە دەڕوانێتە هەڵسەنگاندن و بیروڕای ئەندامەکانی. لە رابردوودا هێزی جەستەیی، توانایی راکێشانی خەڵک، زیرەکیی و نبوێری و نەترسی لە تایبەتمەندییە بەرچاوەکانی لیدێر بوون. ئەمڕۆکە تایبەتمەندییەکانی شارەزایی و زانستی، لێهاتوویی کارگێری و پاراستنی بەرژەوەندییەکانی ئەندامان و کەڵک وەرگرتنی بەجێ و شیاو لە تواناییەکان، لەو تایبەتمەندییە کۆنانە، گرنگترن.

## لێبوردنی گشتی — *Gfeneral Amnesty*

لێبوردنی گشتی کردەویەکە کە دەوڵەت لە کاتی بەخشێنی هەموو تاوانبارە سیاسی یان گشتییەکاندا بەڕێوەی دەبا. لەم حاڵەتەدا سزا دیاریکراوەکان بۆ ئەم کەسانەی کە ئەو بڕیارە دەیانگرێتەوە، هەڵدەوەشێنەوە و، ئەوکەسانەی کە لە بەندیخانە دان، ئازاد دەکرێن. لێبوردنی گشتی یەکێک لە رێگا باوەکان بۆ چارەسەری کێشە سیاسییەکانەوە، زیاتر لە دوای گۆڕانی رژێم، لەلایەن پاشا یان سەرۆک کۆماری دەردەچێ. لێبوردنی گشتی رەنگە سەرهەڵداوان و تیرۆریستەکان یان باج و کاروباری دارایی بگرێتەوە.

## The Right Of Self – Defence

## مافی بەرگریی ڕەوا

مافی بەرگریی ڕەوا، مافێکە کە تاکەکەس بەپێی ئەو مافە دەتوانێ بەرگری لە خۆیی و ئەندامانی خیزانەکەی و لە هێندێک بواریشدا لە سامانەکەی خۆی بکا، تەنانەت ئەگەر لەو پێناوەدا بشکوژرێ. بەرگری، دەبێ لە بەرامبەر کردەویەکی ئەوتۆدا بکرێ کە ئەگەر ئەم کردەوە بە ئاکام بگا، تاوانێکی گەورەی لێ بکەوێتەوە؛ دیارە دەبێ پێشتر بیر لە هەموو ڕێگاچارە عەقلأنیەکان بۆ پێشگیریکردن لە کوژران کرابێتەوە. قامووسی یاسایی بلاک Black، بەم شێوە باس لە مافی بەرگریی ڕەوا دەکا: " بەرگری لە خۆت و لە سامانی خۆت لە بەرامبەر زەبرێک کە لە لایەن کەسێکی ترەوە پێت دەکەوێ. ئەم مۆلەت پێدانە، کەلک وەرگرتن لەزۆر بەمەبەستی بەرگریکردن لە بەرامبەر هێرش، کوشتن، ولأمدانەوەی زۆر بە زۆر – تەنانەت ئەگەر کوشتنی بەدواوەبێ- لە خۆ، سامان و شوێنی نیشتەجێ بوون یان یەکیک لە ئەندامانی خێزان دادەنرێ".

لە یاسا نێودەوڵەتیەکاندا" مافی بەرگریی ڕەوا بە مافێک دەژمێردرێ کە دەوڵەتەکان بەپێی ئەم مافە دەتوانن لە بەرامبەر هێرشی چەکدارانەدا بەرگری لە خۆیان و لەو ولأتانەش بکەن کە پێوەندی سیاسی و ئاسایشیان لە گەڵیاندا هەیە.

بەپێی ڕای زانایانی یاسای سروشتی، مافی بەرگریی ڕەوا نێوەرۆکێکی بەتەواوەتی سروشتیانەی هەیە. بە ڕای گرۆسیۆس، سروشت، بەرگریی هەرکەسێکی بە خوودی خۆی

سپاردووە. هەروەها سووئاریز مافی بەرگریی رەوا بە دەرەنجامی غەریزەی پاراستنی گیان ومان دەزانێ. ئەگەرچی مافی بەرگریی رەوا سەرچاوەیەکی سروشتی هەیە، بەڵام عورفی نەتەوەکانیش بەرەسمی ناسیوەو، بەپێی تێپەربوونی کات سەبارەت بە سنوور و چوارچێوەکەی چەندین رێوشوێنی دارشتووە.

مافی بەرگریی رەوا جۆرێک لە رەوایی بە ئازادیی کردەوەی دەوڵەتان دەبەخشێ؛ واتە کردەوەیەک کە نایاسایی بێ، ئەگەر بۆ بەرگری لە مافی تایبەتیی پێویست ئەنجام درابێ ــ لە هەلومەرجێکی تایبەتیدا ــ بەرەوا دەژمێردرێ؛ هەروەها، بەپێی رێوشوێنی یاسا نێونەتەوەییە عورفیەکان، بۆ بەرگری لەهەر مافێک، رێگا بە کەڵک وەرگرتن لە مافی بەرگریی رەوا نادرێ، بەڵکوو تەنیا لەو کاتەدا کە پێوەندی بە ئاسایشی دەوڵەتەکانەوە هەبێ، پەنابردن بۆ ئەم مافە بە رەوا دادەنرێ.

مافەکانی وەک بەرگریی رەوا بریتین لە:

۱ ــ خوود هاوکاری (Self –help)

۲ ــ مافی پاراستنی گیان ( self –preservation)

۳ ــ پێویستی یان ناچاری (Necessity and force majeure)

کەڵک وەرگرتن لە مافی خوودهاوکاری (بەمەبەستی نەهێشتنی کێشە نێونەتەوەییەکان) هەتا ئەو جێگایەی کە لە هێز کەڵک وەرنەگیردرێ، و لەگەڵ شێوازە ئاشتیخوازانەکاندا یەک بگریتەوە، بەپێی رێوشوێنەکان، هیچ گرفتێک نیە.

مافی پاراستنی گیان : بەپێی ئەو پێناسەی کە مامۆستایانی یاسا نێونەتەوەییەکان لە مافی پاراستنی گیان کردوویانە، ئەو مافە لەگەڵ تیۆری پێویستی (Necessity)دا واتایەکی وەک یەکیان هەیەو، لە بواری نێوەرۆک و سرشتەوە جۆرێک لە ئازادیی رەهایە کە رێگا بە دەوڵەتەکان دەدا تاکوو بە پێچەوانەی رێوشوێنە نێونەتەوەییەکان بجوولێنەوە و، بەم شێوە مافی وڵاتانی دیکە پێشێل بکەن؛ بەڵام بەو مەرجە کە ئەو کارە بۆ پاراستنی کیانی ئەو دەوڵەتەی کە لەو مافە کەڵک وەردەگرێ، پێویست بێ. هەربۆیە بەپێی ئەو شیکردنەوەی کە لە مافی پاراستنی کیان دەکرێ، دەوڵەتەکان بە پشت بەستن بەو مافە دەتوانن بۆ پاراستنی خۆیان کەڵک لە هێز وەرگرن. هەروەها

دەوڵەتەکان بۆ نەهێشتنی خەسارێکی چاوەڕواننەکراو کە ڕەنگە زەربە لە بەرژەوەندییەکانی ئەوان بدا، دەتوانن بە پشت بەستن بە مافی پاراستنی کیان، هەموو ڕێوشوێنەکانی یاسا نێونەتەوەییەکان پێشێل بکەن و، بەم شێوە مافی دەوڵەتانی تر و بۆوێنە دەوڵەتە بێ تاوانەکان ـ تەنانەت ئەگەر مەترسیی هێرشێکی نایاسایی یان مەترسیی هێرشێکی چاوەڕواننەکراویش لە ئارادا نەبێ ـ پێشێل بکەن.

دەبێ سەرچاوەی مافی پاراستنی کیان لە تیۆرەکانی ماکیاڤێلیدا بدۆزینەوە. بە بڕوای ماکیاڤێلی شەڕێک بە ڕەوا دادەنرێ کە بۆ وڵات پێویست بێ.

هەربۆیە مافی پاراستنی کیان لە بواری کارەکانەوە بەرفراوانتر لە چوارچێوەی کاری مافی بەرگریی ڕەوا و تەنانەت مافی خوود هاوکارییەو؛ نەک تەنیا لە ڕوانگەی ڕێوشوێنەکانی جاڕنامەوە پەسند نیە، بەڵکوو یاسا نێونەتەوەییە گشتیەکانیش داکۆکی لێ ناکەن.

زانایانی یاسا نێونەتەوەییەکان گوتوویانە و پێیانوایە کە مافی پاراستنی کیان، تێکدەری هەرجۆرە نەزمێکی یاساییەو، لەگەڵ ئەوەی کە لەرابردوودا زۆرجار وەک چەکێک کەڵکی لێ وەرگیراوە، بەڵام لە سەردەمی ئێستادا ناکرێ بەکارێکی پەسند سەیر بکرێ.

"پێویستی یان ناچاری " لەگەڵ مافی پاراستنی کیاندا هاوواتان، دەبێ سەرچاوەکەیان لە تیۆرەکانی ماکیاڤێلیدا بدۆزرێتەوە. بە بڕوای ماکیاڤێلی کاتێک ئاسایشی وڵاتێک دەکەوێتە مەترسیەوە، دەبێ هەموو تێبینیەکانی تر وەلابنرێن و، دەبێ کارێک بکرێ و بڕیارێک بدرێ کە سەربەخۆیی وڵات بپارێزێ.

پێویستی یان ناچاری لەگەڵ مافی بەرگریی ڕەوادا جیاوازییەکی بەرچاوی هەیە. چوونکە پێویستی بە پێچەوانەی مافی بەرگریی ڕەوا کە لە بەرامبەر هێرشی چەکدارانەدا گرنگی هەیە، هەکاتێک کە پاراستنی ئاسایشی وڵات بخوازێ، پەنای بۆ دەبرێ. جیاوازی پێویستی و مافی پاراستنی کیان لەوەدایە کە لە پێویستیدا پەنابردن بۆ هێز و هەڕەشەی کەڵک وەرگرتن لە هێز، وەک حاڵەتێکی ناچاری هەست پێ دەکرێ، هەر بۆیە لە هێندێک بواردا لەلایەن هێندێک زاناوە ئەم مافە بەڕەوا زانراوە. بۆ وێنە باڤۆت کەڵک وەرگرتن لەم مافە کاتێک بەڕەوا دەزانێ کە دەوڵەتێک لە بەرامبەر هێرشی دەوڵەتێکی تردا، لە مافی بەرگریی ڕەوا کەڵک وەردەگرێ و، لە کەڵک وەرگرتن لە مافی بەرگریی ڕەوادا، ناچار دەبێ مافی دەوڵەتی سێهەم کە لەو ڕووداوەدا، بێ تاوان بووە، پێشێل

بکا. بەو مەرجە کە ئەو زەربەی کە لەو حاڵەتەدا بەر دەوڵەتی سێهەم دەکەوێ، بە بەراورد لەگەڵ ئەو زەربەی کەهەڕەشە لە دەوڵەتی بەکارهێنەری مافی بەرگریی دەکرد، کەمتر بێ.

بڕیارەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکان لە قەیرانی مووشەکیی کوبادا بەپێی گریمانەی پێویستی، بەڕێوە چوون. لە بارەی کردەوەکانی دەوڵەتی ناوبراو لە کاتی قەیرانی موشەکیی کوبادا، ڕاگەیەنرا کە ئەگەر بۆ بەربەرەکانی لەگەڵ جموجۆڵەکانی سۆڤیەتدا، ئەم کارانە نەکرابایە، زەربە لە ئازادیی ئەمەریکا ـ کە یەکسانە بەسەربەخۆیی ئەو وڵاتەـ دەدرا. بەپێی ئەم پاساوە، ئەمەریکا ناچار بووە بۆ وەدەرنانی موشەکان، هەڕەشە بکا کە لە هێز و زۆر کەڵک وەردەگرێ.

بە سەرنجدان بەوەی کە هەڕەشەو پەنابردن بۆ هێز لە پێوەندییە نێونەتەوەییەکاندا جگە لەکاتی بەرگریی ڕەوادا نەبێ لە، لایەن جاڕنامەی نەتەوەیەکگرتووەکانەوە قەدەغە کراوە، هەربۆیە پێویستی وفۆڕس ماژۆر بەهەر شێوەیەک بێ، لەگەڵ ڕێوشوێنەکانی جاڕنامەی نەتەوەیەکگرتووەکاندا یەک ناگرێتەوە. بە هۆی ئەوی کە هەڕەشەی ویلایەتەیەکگرتووەکان سەبارەت بە قەیرانی موشەکیی کوبا مەترسیی کەوتنەوەی شەڕێکی گەورەی پێکهێنا کە لەگەڵ ئامانجی سەرەکیی ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان کە پێشگرتن بە هەڵایسانی شەڕە، یەک ناگرێتەوە.

مەگەر ئەوەی کە بگوترێ کە کارەکەی سۆڤیەت و سەقامگیرکردنی چەندین موشەک لەکوبادا سەرەتا و دەسپێکی هێرشێکی چەکدارانە بە دژی ئەمەریکا بووە و، ئەم وڵاتە بەمەبەستی پێشگیری و بۆ بەرگریکردن لە هێرشێکی لەم چەشنە، ئەم هەڕەشەی کردووە. بەڵام ئەوەش لە حاڵێکدایە کە گوتراوە سەقامگیرکردنی موشەکەکانی سۆڤیەت لە کوبا لایەنی هێرشکارانەی نەبووە. (ناکرێ ئەمەش پاساوێکی گونجاوبێ.و.).

## مافی سیاسی — Political Rights

مافی سیاسی بەمافێک دەگوترێ کە لە یاسا گشتیە نێوخۆییەکاندا، تایبەت بە هاووڵاتیانی وڵاتێکە، بۆ ئەوەی ئەم مافە بە کەسێک ببڕێ،دەبێ ئەوکەسە مافی هاووڵاتیی ئەو وڵاتەی هەبێ. بەم پێیە، خەڵکی دەرەکی لەم مافە بێ بەشن، تاکوو نەتوانن دەست لە کاروباری نێوخۆیی وسیاسیی وڵاتێک وەربدەن یان نفووزێک پەیدا بکەن. تەنانەت هێندێک کەس لەسەر ئەو بڕوایەن کە کەڵک

وەرگرتنی خەڵکی بیانی لەو مافانە، بە پێشێلکردنی یاسا نێودەوڵەتیەکان دەژمێردرێ. چوونکە ڕەنگە لە هێندێک بواردا بەرژەوەندیی دەوڵەتی ئەو کەسە لەگەڵ ئەو ئەرکەی کە پێی ئەسپێردراوە، لە وڵاتی دووهەمدا لە دژایەتی دابێ. هەربۆیە بۆ پاراستنی ڕێزی یاسا نێونەتەوەییەکان، دەوڵەتەکان دەبێ بەر بەهاتنەپێشی ئەمجۆرە حاڵەتانە بگرن.

## میلیتاریزم *Militarism*

بیروبۆچوونێکە کە پێیوایە شەڕو ئامادە بوون بۆ شەڕ، گرنگترین ئەرکی زاتی نەتەوەیەک و بەرزترین شێوەی خزمەتگوزاریی گشتییە. میلیتاریزم بە زاڵبوون و کاریگەری هێزە سەربازییەکان بە سەر هەموو کەلێن و قوژبنەکانی وڵاتیشدا دەگوترێ

میلیتاریستەکان خزمەتی سەربازی بە پلەیەکی بەرز دەزانن و، بوێری و ئازایەتیی تاکەکەسی، وەفاداری بە کەسی سەرەوەتر، ڕاهێنانی جەستەیی ودسیپلنیێکی توندوتۆڵ بە بەرزترین تایبەتمەندییەکانی ئەم بوارە دەژمێرن و، ڕێز لە خزمەت و داب و نەریت و لایەنە باشەکانی سەربازی دەنێن. میلیتاریزم بە واتای چاوەدێرییەکی توند و بەرفراوانی سوپا بەسەر هەموو بوارەکانی کۆمەڵایەتیدا دێ و، هەروەها میلیتاریزم بەوە دەگوترێ کە هەموو تاکەکانی نێو کۆمەڵگا لە خزمەتی سوپا دابن.

لە قامووسی مارکسیزمدا، ڕۆزا لۆکزامبۆرگ پێیوایە کە میلیتاریزم لە ڕوانگەی چینە دەسەڵاتدارە زۆردارەکان لە سێ بواری پێوەندی حاشاهەڵنەگر کە دەبێ بێ ئەملاوئەولا جێبەجێ بکرێن، خۆی دەنوێنێ:

"١ــ وەک ئامرازێک بۆ پاراستنی بەرژەوندیی و ویستی سەرمایەدارانی نێوخۆیی کە لەگەڵ لەگەڵ گرووپە نەتەوەییەکانی وڵاتانی بیانیدا ڕکابەری دەکەن .

٢ــ وەک جۆرێک سەرمایەگوزاریی پێویست و سوودبەخش هەم بۆ سەرمایەی بانکی و هەم بۆ سەرمایەی پیشەسازی.

٣ــوەک ئامرازێک بۆ چینە داگیرکەرە دەسەڵاتدارەکان لە پێناوی سەرکوتی کۆمەڵە زەحمەتکێشەکان لە نێوخۆی وڵات دا."

لنین بەم شێوەیە میلیتاریزم پێناسە دەکا:

" سیاسەتی کۆنەپەرستانەی بەهێزکردنی بناغەی هێزی سەربازی لە لایەن چینی دەسەلاتداری داگیرکەر، کەبە دوو مەبەست بەڕێوە دەچێ:

١ــ بەمەبەستی بەرەنگاربوونەوە لەگەڵ بزووتنە دژە ئەمپریالیستیەکان و، سەرکوتکردنی زیاتری کۆمەلانی چەوساوە؛

٢ــ بەمەبەستی بەرگری لە سیستەمی سەرمایەداری و بەرژەوەندییەکانی سەرمایەدارە نێوخۆییەکان لە ریگای سازدانی و ئامادەکردنی شەرە داگیرکارییەکان.

بەبروای ناوبراو هەروەها میلیتاریزە کردنی کۆمەلگا بە واتای " چەکدارکردنی بورژوازی بە دژی پرۆلیتاریا"یە.

**بە گشتیی میلیتاریزم:**

**الف:** شەرنگێزی و شەڕخوازییە، کە لەو حالەتەدا دەولەت بە گرتنەبەری سیاسەتێکی داگیرکارانەی دەرەوە، بوار بۆ دەستێوەردان لە کاروباری نێوخۆیی ولاتانی هاوسێ یان ولاتانی دوور دەرەخسێنێ.

**ب:** چەکدارکردنی لایەنە جۆراوجۆرەکانی کۆمەلگا (ئەلمانیا لە سەردەمی شەرەکانی یەکەم ودووهەمی جیهانی)

**ج:** بەواتای هەژمۆنیی سوپا و ریکخراوی دەولەت و دەزگاکانی پێوەندیدار بە سوپا، کە لەو حالەتەدا هیچ سنوور و جیاوازییەک لە نێوان دەسەلاتی سەربازی و ریکخراو و ئۆرگانە ناسەربازییەکاندا نیە.

**د:** پێرەوی لەکەسی سەرەوەتر، دسیپلینێکی توندوتۆل ، کەلک وەرگرتن لە رەمزە سەربازییەکانی وەک ئالا، میدالیا، بەرێوەبردنی رێ و رەسمی سەربازی و پێکهێنانی ئەنجوومەنە نیمچە سەربازییەکان.

**هـ:** بەبروای زینگهاس (Senghas) وا باشترە کە بە جێگای میلیتاریزم کەلک لە زاراوەی کۆمەلگەی سەربازی ــ پیشەسازی وەربگیرێ کە بریتیە لە پێوەندییەکی بەردەوام و بەرژەوەندیخوازانە لە نێوان هەلبژاردەکانی بەشەکانی سیاسەت، ئابووری ، سوپا، زانستەکان و

تەکنەلۆژیا، کە بە هاوکاری و پشتیوانی یەکتر، پێگەی خۆیان بۆ دابینکردنی بەرژەوەندییە هاوبەشەکان لە دەوڵەت و کۆمەڵگادا بەردەوام بە هێز و سەقامگرتوو کردووە.

بەرچاوترین نموونەی میلیتاریزم لە مێژوودا، ڕایخی ئەڵمانیایە کە لە ساڵی ۱۸۷۱دا لە ئەنجامی یەکیەتیی پاشایەتیی پرۆس لەگەڵ وڵاتە ئەڵمانی زمانەکانی تر پێک هات. ئەم میلیتاریزمە بواری بۆ سەرهەڵدانی نازیسمی هیتلەری خۆش کرد.

### Strike
### مانگرتن

بە دەست لە کارکێشانەوەی کرێکاران، فەرمانبەران و گرووپەکانی تر دەگوترێ کە دەکرێ بەبڵاو و بەرتەسک، بۆ ماوەیەکی دیاریکراو یان نادیار بێ و، بەمەبەستی پەک خستنی کاروبارەکان جێبەجێ دەکرێ. مانگرتن یەکێک لە ئامرازەکانی خەبات لە دژی خاوەن کارەکان و سیستەمی دەسەڵاتدارەو و ئامانجیشی گەیشتن بە داخوازییە سیاسی، ئابووری و سینفیەکانە.

### Micro Politics
### میکرۆپۆلۆتیک

بەشێک لە سیاسەتە کە لە پێوەندی نێوان تاکەکان کە لە سەر بنەمای پێوەندی تاکەسیی ڕاوەستاوە، دەدوێ. ئەم زاراوەیە لە بەرامبەر ماکرۆ پۆلۆتیکدا کەڵکی لێ وەردەگیردرێ.

### Macro Politics
### ماکرۆپۆلۆتیک

ماکرۆ پۆلۆتیک سیاسەتێکە کە زیاتر لەسەر لێکۆڵینەوەی ژینگەی دەوروبەر یان ژینگە پێدادەگرێ و بایەخ بە لێکۆڵینەوەی سووژە یان ئەکتەرێکی تایبەتی نادا. بەم شێوە ماکرۆپۆلۆتیک لەگەڵ سیاسەتی جیهانیش دا کۆمەڵێک شتی هاوبەشی هەیە. بە پێچەوانەی سیاسەتی نێو دەوڵەتیی یان سیاسەتی جیهانیی، ماکرۆپۆلۆتیک زۆر خۆی بەوەوە نابەستێتەوە کە ئایا ئێستاش دەوڵەت گەورەترین ئەکتەری سیتەمی جیهانیە یان نا.

### Calvo Clanse
### مەرجی کالڤۆ

ئەم چەمکە لە ناوی کالڤۆ (Calvo) یاساناس و سیاسەتوانی ئەرژەنتینی(۱۹۰٦-۱۸۲٤) وەرگیراوە. لە هێندێک لەو ڕێککەوتننامە و گرێبەستانەی کە لە نێوان وڵاتانی ئەمەریکای

ناوەڕاست و باشوور لەگەڵ هاولاتیانی بیانیدا مۆر دەکرێن، کە بەپێی ئەم ڕێککەوتننامانە، ئەم ولاتانە ئیمتیاز بەو هاوولاتیە بیانیانە دەدەن، مەرجێک دەگونجێنن کە بە پێی ئەو مەرجە، ئەگەر هات و کێشەیەک هاتە ئاراوە، ئەو هاولاتیانە لە پشتیوانی سیاسی ولاتەکانی خۆیان، خۆدەبوێرن. بەپێی بنەما گشتیەکانی یاسای نێودەولەتی، مەرجی کالڤۆ هیچ پێگەیەکی یاسایی نیە، چوونکە پشتیوانی سیاسی بە پێی سەلاحیەتی شەخسی ولاتەو هاولاتیان ئەو مافەیان نیە کە خۆ لەم پشتیوانیە سیاسییە ببوێرن.

### *مەسەلەی خۆماڵیکردنی نەوتی ئێران*

***Anglo _ Iranianoil Co.Case***

کۆمپانیای بەریتانی بریتیش پیترۆلیۆم بە پێی ڕێککەوتننامەی ۱۹۰۹، ئیمتیازی هەڵێجنان و کەلک وەرگرتن لە بەشێکی زۆری سەرچاوە نەوتیەکانی ئێرانی وەدەستهێنا. ئەم کۆمپانیایە بۆ ماوەیەکی زۆر، سەرچاوە دەولەمەندە ژێرزەوییەکانی ئێرانی هەڵدەهێنجا و لەبەرامبەریشدا شتێکی زۆری کەمی بە ئێران دەدا. جگە لەمە بەرێوەبەرانی کۆمپانیاکە بۆبەرەوپێش بردنی ئامانجەکانیان هەولیاندا دەست لە کاروباری نێوخۆیی ئەم ولاتە وەربدەن.

دوای ماوەیەکی زۆر و دوای ئەوەی هەولەکانی دەولەتی ئەکات بۆ پاراستنی بەرژەوندییەکانی ئێران بێ ئاکام مایەوە، بە پێی یاسای خۆماڵیکردنی نەوتی ئێران(۱۷ی ئازاری ۱۹٤۰)، پیشەسازی نەوتی ئێران خۆماڵیکرا و دەولەتی ئێران هەربە پێی ئەم یاسایە ناچار کرا کە زیانەکانی خۆماڵیکردنی نەوت بۆ کۆمپانیا بەریتانیەکە قەرە بوو بکاتەوە.

لە دوای ئەم هەولە، دەولەتی بەریتانیا بۆ پشتیوانی لە کۆمپانیای بریتیش پیترۆلیۆم، سکاڵانامەیەکی ئاراستەی دیوانی دادی لاهە کرد و وێنەیەکیشی درایە دەولەتی ئێران. چوونکە ئێران خۆماڵیکردنی نەوتی بەشتێکی نیوخۆیی دادەنا کە پێوەندی بە خوودی دەسەلاتی ئێرانەوە هەیە، و ئێران حاشای لە سەلاحییەتی دیوانی لاهە بۆ بەدەواداچوونی سکاڵاکەی بەریتانیا کرد ولە نامەیەکدا بۆ دیوانی لاهە، ڕایگەیاند کە ئەم دادگایە ناتوانێ لەمبارەوە هیچ بریارێک بدا.

### مەسەلەی دوورگەی ئەبوموسا

ئەبوموسا دوورگەیەکی کەنداوی فارسە وەکوو هێلکەیەک وایە کە.... گەورەکەی ٥ کیلۆمەتر و .....چکۆلەکەشی ٤/٥ کیلۆمەترە. ئەبوموسا لەوپەڕی ڕۆژئاوای کەوانێک دایە کە دوایین ئاڵقەی زنجیری بەرگری ئێران پێکدێنێ.

بەندەری لەنگە و قەراغەکانی شارجەش ٦٧ کیلۆمەتر لەم دوورگەیە دوورن. ئەبوموسا لە سەر هێڵی ناوەڕاستی کەنداوی فارس بە نیسبەت هەر دوو لێوارەکە هەڵکەوتووە. سەرچاوەکانی ئۆکسیدی سووری ئاسنی ئەم دوورگەیە گرنگن و سەد ساڵ پێش، یەکەمین ئیمتیازی هەڵێجنانی ئەم سەرچاوانە لەلایەن شای ئەوکاتی قاجارەکان، درایە حاجی موعینەلتوجحاری بووشێهری. سەرچاوەی نەوتی موبارەکیش لە بەشی ڕۆژهەڵاتی دوورگەکەدا هەڵکەوتووە و مافی هەڵێنجانی لە لایەن شارجەوە دراوەتە کۆمپانیایەکی بیانی. بە پێی ڕێککەوتننامەی کانوونی یەکەمی ١٩٧١ دەبێ، داهاتی نەوتی ئەم دوورگەیە لە نێوان ئێران و شارجەدا دابەش بکرێ.

بە دوای لاواز بوونی دەسەلاتی سەفەویەکان لە ئێراندا، بشێوی و ئالۆزی ولاتی تەنیەوە، بەلام دوای هاتنە سەردەسەلاتی نادرشای ئەفشار و پەرەگرتنی دەسەلاتەکەی، ولات ئارام بۆوە و جارێکی تر دوورگەکان و لێوارەکانی باکوورو باشووری کەنداوی فارس گەڕانەوە ژێر دەسەلاتی ئێران. لە دوای کۆشتنی نادرشای ئەفشار، جارێکی تر بشێوی و ئالۆزی ئێرانی تەنیەوە و میرنشینەکان لەم دەرفەتە کەلکیان وەرگرت. یەکێک لەم کەسانە مەلاعەلی شابوو کە توانی وەکوو دەسەلاتداری هورمۆز، ئالای خوودموختاری هەلبدا و لە سالی ١٧٤٧دا باجی بە حکوومەتی ناوەندی نەدا، ئەو لە ڕێگەی ژن و ژنخوازیەوە لە شێخەکانی قاسمی لە رەئسولخەیمە(جلفار) نزیک بۆوە. لە سالی ١٨٨٤دا، دەولەتی ئێران دابەشبوونێکی نوێی جوگرافی لە ولاتدا کرد. بە پێی ئەو دابەشبوونە، ولات بەسەر ٢٧ پارێزگادا دابەش ببوو.بیست و شەشەمین پارێزگا یان ویلایەت،لێوارەکان و دوورگەکانی کەنداوی فارسیان دەگرتەوە. لەم سالەدا، شێخ یووسفەلقاسمی بەدەستی قوزەیب بن راشید کوژرا کە بۆ ماوەی شەش ساڵ بەسەر بەندەری لەنگەدا حوکمرانی دەکرد. شێخ قووزەیب بەبێ ئاگاداری حکومەتی ئێران، حکوومەتی قاسمیەکانی بەندەری لەنگەی کردە هیی خۆی و ئەمە بوو بە هۆی ئەوەی کە حکومەتی ئێران کۆتایی بە خودموختاری قاسمیەکان لە بەندەری لەنگەدا بێنێ.

دەولەتی ئێران بریاریدا بە کۆتاییهێنان بە خۆدموختاری قاسمیەکان، بەندەری لەنگەو شوێنەکانی سەر بەم بەندەرەش، بخاتە سەر بەندەرەکانی کەنداوی فارس.

## *گرنگترین رووداوەکان تاساڵی ١٩٧١*

١ـ لە ساڵی ١٨٨٧ دا شێخ قوزەیب بە تاوانی کوشتنی شێخ.یووسف دەستبەسەر کرا وزیندانی کرا و لە تاراندا مرد، بەم شێوە کۆتایی بە خودموختاری قاسمیەکان لە بەندەری لەنگەدا هات.

٢ـ لە ساڵی ١٩٠٢دا، بەریتانیا دورگەکانی سیری، تونب و ئەبوموسای دایە قاسمیەکانی شارجە. ئەم شێخانە لە راپەرینە نێوخۆییەکانی ئێران کەڵکیان وەرگرت و ئاڵای خۆیان لە دورگەکانی تونبی چکۆلەو گەورەو ئەبوموسادا هەڵدا.

٣ـ لە ساڵی ١٩٠٤ دا میسیۆودامبرین، سەرۆکی گومرکی ئێران بریاریدا، ئالای شارجە لەو دورگانە بێتە خوار و ئالأی ئێران هەڵبدرێ. ئەمە بوو بە هۆی توورەیی شێخی قاسمی و بەهەرەشەی بەریتانیا، دەولەتی ئێران ناچار کرا ئالأی خۆیان بێنێتە خوار و بریاری گەرانەوەی بەرێوەبەرە ئێرانیەکانی گومرک بدا. لەم ماوەدا، بەریتانیا بەرەسمی ئەم دوو دورگەی دایە شارجەو رەئسولخەیمە.

٤ـ لە شوباتی ١٩٣٥دا، چەند یەکەی هێزی دەریایی ئێران لە دورگەی تونب، دابەزین.

٥ـ لە ساڵی ١٩٣٠ دا ئێرانیەکان سەبارەت بە هەڵکردنی ئالأی بەریتانیا لە دوورگەکانی تونب و ئەبومووسا نارەزایەتیان دەربری، بەریتانیەکان لەگەڵ ئەوەدا کە حاشایان لەم مەسەلە کرد، بەڵێنیشیاندا تا دیاریکردنی مافی دەسەلأتدارەتیی ئەم دوورگانە؛ نەهێلن هیچ ئالأیەک لەم دوورگانەدا هەڵبدرێ.

٦ـ لە کۆتایی ساڵی ١٩٤٨دا، ئێران داوای کرانەوەی بەرێوەبەریەکی لە تونبی گەورە و ئەبومووسادا کرد.

٧ـ لە ساڵی ١٩٥٣ و لە کاتی سەرۆک وەزیری موسەددیق دا، دەنگۆی ئەوە بلأو بۆوە کە وەفدێکی ئێرانی خەریکی خۆئامادە کردنن کە بچنە دوورگەی ئەبومووسا.

بلاْوبوونەوەی ئەم دەنگۆیانە بوو بە هۆی هەڵستانی فرۆکە پشکێنەرەکانی پاشایەتی بەریتانیا.

۸_ لە ۸ی ئایاری ۱۹٦۱دا کۆپتەرێکی ئێرانی لە دورگەی تونبی گەورەدا نیشتەوە. هاتو چۆی زۆری [ئێرانیەکان] بووە هۆی نارەزایەتیی بەریتانیەکان و رۆژی ٥ ی ئەیلوولی ۱۹٦۱، بالۆێزخانەی بەریتانیا نووسراوەیەکی دایە وەزارەتی دەرەوەی ئێران کە بەریتانیا لەو نووسراوەدا بە نوێنەرایەتی لە شێخی رەئسولخەیمە، سەبارەت بە هەوڵەکانی ئێران نارەزایەتی دەربڕیبوو. رۆژی ۲۱ی ئەیلوول، دەوڵەتی ئێران بەم شێوە وەلاْمی نووسراوەکەی بەریتانیای دایەوە:

" دەوڵەتی پاشایەتیی ئێران هیچ کاتێک دانی بەوەدانەهێناوە کە دوورگەی تونب بەشێک لە رەئسولخەیمەیە یان ئەوەی حکوومەتێکی دیکە مافی دەسەلاْتدارەتیی بە سەر ئەم دورگەدا هەبێ. هەروەکوو چەندجار بەرەسمیی راگەیەنراوە کە دەوڵەتی پاشایەتی ئێران، دوورگەی تونب بە بەشێک لە خاکی خۆی دەزانێ، کە مافی دەسەلاْتدارەتیی بەسەر ئەو شوێنەدا هەیە. دەسەلاْتدارەیتی ئێران بەسەر دوورگەی تونب بە پێی بنەمای یاسا نێودەوڵەتیەکانە و دەوڵەتی ئێران هیچ کاتێک وازی لە مافی خۆی نەهێناوە".

۹_ بە دوای مەسەلەی بەحرەین لە ساڵی ۱۹٦۰دا، دەنگۆیەکی دیکە بلاْوبووە کە گوایە ئێران وازی لە داواکارییەکانی خۆی لە بەحرەیندا هێناوە، چونکە لە گەرووی هورمز و دوورگەکانی زارکی کەنداوی فارسدا بەدوای بەرژەوەندییەکانی خۆیدا دەگەڕێ.

۱۰_ لە ۸ی کانوونی یەکەمی ۱۹۱۷ دا، شارجە گەیشتن بەرێککەوتنێکی لەگەڵ ئێراندا بەم شێوە راگەیاند:

***دەقی رێککەوتننامەی ئێران و میرنیشینی شارجە:***

سەرەتا : نە ئێران و نە شارجەش واز لە داواکاری خۆیان لە سەر ئەبوموسا ناهێنن.

**الف_** هێزەکانی ئێران بە پێی نەخشە لە ئەبوموسادا دادەبەزن و بەشێکی داگیردەکەن .

ب_ ئێران لەو بەشەی کە داگیری کردووە، هەموو مافێکی هەیە و ئالاّکەی لەم بەشەدا هەڵدەدرێ.

ج_ میرنیشینی شارجەش لە بەشەکەی دیکەدا خاوەن ماف دەبێ و ئالاّکەش لە سەربنکەی پۆلیس هەڵدەدرێ.

د_ دوولایەن لە سەر دیاریکردنی بەشە ئاویش بە رادەی ۱۲ میلی دەریایی بۆهەر لایەنێک رێککەوتوون.

هـ_ کۆمپانیای " بۆتس گێس ئەند ئۆیل" بە پێی رێککەوتننامە، نەوتی ئەبومووسا هەڵدێنجێ. ئەم کۆمپانیایە نیوەی داهاتەکە دەداتە ئێران و نیوەکەی تریش دەداتە شارجە.

و_ رێککەوتنێکی ئابووری لە نێوان ئێران و شارجەدا گرێ دەدرێ. جێگەی باسە ئەم رێککەوتننامە نهێنی بوو و، بەریتانیا گەرەنتی دەکرد.

۱۱_ لە ۳۰ تشرینی دووهەمی ۱۹۷۱دا، هێزەکانی ئێران لە دوورگەکانی تونبی چکۆلە، تونبی گەورەو ئەبومووسا دابەزین.

## ماویزم *Maoism*

بە بیروبۆچوون و تیۆرە سیاسییەکان ماوتسێ دۆنگ دامەزرێنەر و رێبەری پێشووی چین دەگوترێ. ماویزم کە لە چیندا بەرەسمیی " مارکسیزم _ لێنینیزمی بیرۆکەکانی ماو "ی پێ دەڵێن، مارکسیزم —— لێنینیزم لەگەڵ نەریتەکانی چیندا، پێکەوە گرێ دەدا. ماویزم هەڵگری بیری گشتاندنی ئایدۆلۆژیای ئەزموونەکانی شۆرشی چین و هەروەها کۆمەڵە بیروبۆچوونێکی سیاسی بۆ ئاڵوگۆرەکانی ئەو وڵاتە لە پاش سەرکەوتنی شۆرشە. بە بروای ماو ئەرکی سەرەکیی شۆرشی چین ئەوە بوو کە رێبەرایەتیی شەری رزگاریدەری نیشتمانیی لە دژی داگیرکەرانی ژاپۆنی و ئەمپریالیستەبیانیەکان بکا و ئەم شەرە لەگەڵ، شۆرشێکی دیموکراتیانە لە دژی دەرەبەگە گەورەکان گرێ بدا. ماو بروای بە پێوەندییەکی نەپچراوە لە نێوان شێوازە سیاسی و سەربازییەکانی شۆرشی چیندا هەبوو و هێزی لە زاری چەکدا دەبینی. ئەو گوندەکانی بەبنکەو خەڵکی گوندیشی بە بناغەکانی شۆرشی دادەنا. یەکەمین دەسکەوتی گرنگی ماو، تیۆرەکەی ئەو سەبارەت بە "

ناکۆکیەکان لە سوسیالیزم" دایە. ئەو لە کۆتایی سالّی ١٩٥٦دا رایگەیاند کە " بە پێچەوانەی ئایدۆلۆژیای سۆڤیەت کەباس لە " یەکیەتیی ئەخلاقی ـ سیاسی" لە ناو سوسیالیزم دادەکا، دژایەتیی یاسایەکی گشتی گۆڕانەو و لە قۆناغی سۆسیالیتیشدا بەردەوام دەبێ". لەم نێوەدا دوو دژایەتیی لەیەکتر جیاوازن: یەکیان دژایەتیی لە بن نەهاتووی نێوان گەل و دوژمنەکانیەتی کە تەنیا بە کەلّک وەرگرتن لە هێزی زۆر چارەسەر دەبێ و ئەوی دیکەشیان دژایەتیی ئاشتیانە و گۆڕانە سۆسیالیستیەکانە". بەبڕوای ماو دژایەتیەکانی ناو سۆسیالیزم دەبێ بە وتارو باس وراوێژ چارەسەربکرێن. بۆ ئەم مەبەستەش ماو دروشمی " لێگەڕێن با بەجارێک سەد گولّ بپشکوێ"ی بە رێگایەکی شیاو بۆ چارەسەری ناکۆکیەکان دادەنا و هەروەها دەیگووت ئەوانەش کە بیروڕای چەوت و هەلّەیان هەیە دەبێ بە بەلّگەوە بە قەناعەت بگەیەنرێن. بنەمای " سیاسەتی سەدگولّ" لە ئایدۆلۆژی ماودا، گرنگیەکی تایبەتیی هەیە.

ماویزم بڕوای بە سەربەخۆیی و بەستراوە نەبوونی حیزبەکان هەیە. بە بڕوای ماو هیچ حیزبێک هەرچەندە بەدەسەلاّتیش بێ، بۆی نیە خۆی بەسەر حیزبەکانی دیکەدا زالّ بکا. ماویزم بڕوای بە هاوکاری نزیکی " بەرەی سۆسیالیستی " بە شێوەی کە لخووزی کرەملین نیە و خوازیاری یەکسانی مافەکان لە پێوەندییەکاندا لەسەر بنەمای رێزگرتن لەیەکپارچەیی ولاّت، سەرەوەری و سەربەخۆیی و دەست وەرنەدان لە کاروباری یەکتردا، لەناوهەموو ولاّتانی سۆسیالیستی دا هەیە.

بیروراکانی دیکەی ماو بریتین لە :

- تیۆری شەڕی پارتیزانی لە ولاّتانی ژێردەستی کۆلۆنیالیزم بە پشتیوانی جەماوەری جووتیارەکان.
- بڕوا بە " رێکخستنی سۆسیالیستی " لە چین، بە سەرنجدان بە ئازادی بەرتەسکی خەلّک
- ماو بە دیکتاتۆری پرۆلتاریا دەلّێ دیکتاتۆری دیموکراتیانەی گەل کە بە رێبەرایەتیی چینی کرێکار و پشتیوانیکردن لە یەکیەتیی نێوان کرێکاران و جووتیاران بەرەو پێشەوە دەڕوا.
- رەتکردنەوەی تیۆری رووسەکان سەبارەت بە " پێکەوە ژیانی ئاشتیانە" و شۆڕشی بەردەوام لە هەموو جیهاندا لە دژی بنکەکانی کاپیتالیزم.

ئەو ڕووداوانەی کە بوونە هۆی سەرهەڵدانی ماویزم لە چیندا، بریتین لە خەباتی لەمێژینەی ئەو وڵاتە کە لەو نێوەدا دەتوانین ئاماژە بەو ڕووداوانە بکەین: شەڕە نێوخۆییەکانی نێوان ساڵەکانی ١٩٢٨ تا ١٩٣٤، ڕێپێوانی مێژوویی ٣٥ _ ١٩٣٤، سەرهەڵدانەوەی دووبارەی شەڕی نێوخۆیی لە ساڵی ١٩٤٦ و سەرکەوتنی کۆمۆنیستیەکان لە ساڵی ١٩٤٩ دا.

لە گۆرانکارییە سیاسییەکانی ماویزم لە دوای ساڵی ١٩٤٩ دەتوانین ئاماژە بەو خاڵانە بکەین :

١_ بزاڤی سەدگوول (١٩٥٠)

٢_ گەڵاڵەی پێشکەوتنی گەورەو دامەزرانی کۆمۆنەکان (١٩٥٨)

٣_ شەڕی دەسەڵات لەگەڵ سۆڤیەتدا بۆ ڕێبەرایەتیکردنی جیهانی کۆمۆنیزم

٤_ شۆڕشی کولتووری (١٩٦٧)، و شەڕو کێشەی نێوان تەکنوکراتەکان لە لایەک و ئایدۆلۆگەکان (بەرێبەرایەتیی ماو) لەلایەکی دیکەوە.

### مەتریالیزمی سەرەتایی — *Primative Materialism*

مەتریالیزمی سەرەتایی، تیۆرێکە کە سەرچاوەی جیهان لەیەک یان چەند حاڵەتێکی دیاریکراوی ماددەدا دەبینێ. لە چینی کۆندا، تیۆری ٥ توخمەکانیان (مێشک، دار، ئاو، ئاگر و خاک )بە پێنج ماددەی بنەڕەیتی دادەنا کە جیهانیان پێکهیناوە. لە یۆنانی کۆنیشدا، توخمی سەرەتایی جیهانیان بە ئاو، ئاگر، ئەتوم و هەوا دادەنا. لە هیندی کۆنیشدا دونیایان بە پێکهاتەیەک لە ئاو، خاک، ئاگرو با دەزانی. ئەم تیۆرانە و تیۆرە هاشێوەکانیان، دەچنە ناو بازنەی مەتریالیزمی سەرەتاییەوە.

### مەتریالیزمی مێژوویی — *Historical Materialism*

دوکتورینێکی (تیۆری) مارکسیەکە کارڵ مارکس و فرێدرێک ئەنگێلز دایان مەزراندووە. ئەم تیۆرە لە قامووسی مارکسیدا وەکوو تیۆری زانستی یاسا گشتیەکانی گۆڕانی کۆمەڵایەتیی پێناسەدەکرێ. بەم پێیە کە مەتریالیزمی مێژوویی، بە پێچەوانەی مەتریالیزمی دیالکتیک، تەنیا باسی ڕەوتی مێژوو دەکا. نێوەڕۆکی مەتریالیزمی مێژوویی، یاساکانی کۆمەڵناسیە. مەتریالیزمی مێژوویی کاریگەری دوو لایەنەی ژێرخان و سەرخان تاوتوێ دەکا و لەم خاڵەوە دەست پێدەکا کە هیچ هێزێکی بان _

سروشتی (میتافیزیکی ) لە کۆمەڵگادا لە ئارادا نیە و مرۆڤەکان بۆ خۆیان، مێژووی خۆیان ساز دەکەن. مارکسیەکان پێیانوایە کە مەتریالیزمی مێژوویی ٤ ڕێکخستنی کۆمەلایەتی لێک دەداتەوە کە جارجارە فۆرماسیۆنی ئابووری _ کۆمەڵایەتیش پێ دەگوترێ. ئەم تیۆرە بڕوای بەوە هەیە کە گۆرانکارییە مێژووییەکان خاوەن یاسا و ڕێسان.

## مەتریالیزمی دیالکتیک — *Dialectical Materialism*

مەتریالیزمی دیالتیک ڕێبازێکە کە پشتی بە بنەمای تیۆری مێژوویی دیالکتیکی هیگڵ بەستووە. کارڵ مارکس و ئەنگێلز بناغەکەیان داناوە و زۆربەی بیریارەکانی جیهان بەربەرە شتی دیکەیان پێوە زیاد کردووەو ڕاڤەیان کردووە. لە قامووسی مارکسیسەکاندا، مەتریالیزمی دیالکتیک، زانستی یاسا گشتیەکانی گەشەسەندنی سروشتی، کۆمەڵگا و هزرو بیری مرۆڤە. ئەم تیۆرە لەگەڵ ئەوەدا کە هەبوونی هێزە بان _ سروشتییەکان ڕەت دەکاتەوە، پێیوایە کە لە سەر بنەمای جیهانی ماددی و واقعیەت (هەڵکەوت)دا ڕاوەستاوە. بە پێی بیروبڕوای ئەوان لە ڕوانگەی کۆسمۆلۆجیەوە، مەتریالیزم بەم مانایەیە کە ماددە، سردشت و جیهانی هەست پێکراوی دەرەوە لە خۆیدا ڕاستیەکی سەربەخۆیە و هەبوون و ڕاستیەکەشی پێوەندی بە هیچ هێزێکی بان_ سروشتیەوە نیە و هەروەها پێوەندیشی بە هزروبیرو زەینی مرۆڤەکانەوە نیە. بە بڕوای ئەوان لە ڕووی زانستیەوە، ماددە بناغەی هزرە، چ لە بواری ماددەی سروشتیەوە و چ لە بواری لۆژیکیشەوە. وشەی دیالکتیک ئاماژە بەوەدەکا کە شتەکان دەگۆڕێن و هەموو شتێکیش ئاکامی گۆڕانێکە.

## مەتریالیزمی میکانیکی — *Mechanical Materialism*

– بەرلەوەی فەلسەفەی زانستی سەرهەڵدا، مەتریالیزم زیاتر لایەنی میکانیکی هەبوو.

مەتریالیزمی میکانیکی لە بنەڕەتدا ئایدۆلۆژی و ئامرازی پاساوهێنانەوەی تیۆریی سەرمایەداری لە حاڵی گەشەکردندا بوو. ئەم ئایدۆلۆژییە لە بەرامبەر ئایدۆلۆژیای دەرەبەگایەتیدا سەری هەڵدا و گەشەی کرد. بە بڕوای ئەم مەتریالیستانە جیهان تەنیا لە کۆمەڵێک شتی وردیلە کە لەگەڵ یەکتردا پێوەندییەکی دوو لایەنەیان هەیە، پێک نەهاتووە و هەرشتیکی وردیش بۆ خۆی بوونێکی سەربەخۆو

جیاوازی لەگەڵ شتە وردەکانی دیکەدا هەیە. ئەم شتە وردانە جیهان پێکدێنن. تەواوەتیی هەموو رووداوەکانی جیهان لە تەواوەتیی پێوەندییەکانی شتەوردەکانەوە سەرچاوە دەگرێ و ئەم پێوەندییە دوولایەنانە، پێوەندییەکی میکانیکین کە لە کاریگەری دەرەکیی وردیلەکانی دیکەوە سەرچاوە دەگرێ. لەم روانگەیەوە هەر پرسیارێک کە سەبارەت بە شتێک لە سروشت دێتە گۆڕێ، وەکوو پرسیارێک وایە کە سەبارەت بە ماشین دەکرێ. ئەم ئایدۆلۆژیایە کەمەتریالیزمی میتافیزیکیشی پێ دەڵێن، یەکێک لە سێ قۆناغەکانی فەلسەفەی مەتریالیزمە. لە نوێنەرانی مەتریالیزمی میکانیکی دەتوانین ئاماژە بە هۆبزی بەریتانی و دلباکی فەڕەنسی بکەین.

بەو تیۆرە فەلسەفی، ئابووری، مێژوویی ، کۆمەڵایەتی و سیاسییانە دەگوترێ کە لە لایەن مارکس و ئەنگلێلزەوە داڕێژراون. ئەم دوو کەسە پێیانوایە مێژوو هەمووی خەباتی چینایەتیە و بڕوایان بە سەرکەوتنی کۆتایی پرۆلتاریا هەیە. مارکس مەتریالیزمی دیالکتیکی، لەبەرامبەر ئایدیالیزمی دیالکتیکی هیگلدا داڕشت. جیاوازی مەتریالیزمی دیالکتیک و ئایدیالیزمی دیالکتیک ئەوەیە کە مەتریالیزمی دیالکتیکی مارکس، هێزی ئابووری بە بناغەو بنەمای رووداوە مێژووییەکانی مرۆڤ دادەنێ. مارکس جگە لە فەلسەفەی هیگڵ، لە تیۆرە سۆسیالیستەکانی فەرەنسا و شۆرشی مەزنی ئەو وڵاتە و هەروەها لە تیۆرە ئابوورییەکانی ریکاردۆش کەڵکی وەرگرتووە، مارکس جگە لە بیرۆکە بنەڕەتیەکانی خۆی، لە تیۆرە جیاوازەکانی وەکوو مەتریالیزمی مێژوویی، مەتریالیزمی دیالکتیک و سۆسیالیزمی زانستیشدا خۆی دەنوێنێ. مارکسیزم دەوڵەت بە ئامرازی خەباتی چینایەتی دادەنێ و بڕوای بە فەوتانی کاپیتالیزم هەیە. بەپێی بۆچوونەکانی ئەو، شورشی چینی کرێکار، شۆڕشێکە کە ناتوانین لێی دەربازبین و سۆسیالیزم لە ژێر ئاڵای دیکتاتۆری پرۆلتاریادا دادەمەزرێ و دەبێتە هۆی پێکهێنانی کۆمەڵگایەکی بە بێ چین.

بە بڕوای لنین؛ مارکسیزم سیستەمی پەروەردە و تیۆرەکانی مارکسە". ئەو مارکسیزم بە سۆسیالیزمی زانستی دادەنێ، چوونکە پێیوایە کە:" حەتمی بوونی گۆڕانی کۆمەڵگا لە سەرمایەدارییەوە بۆ سۆسیالیزم، بە شێوەی گشتی ورەها بە هۆی یاسای ئابووری بزووتنەوەی نوێی کۆمەڵایەتی روودا".

سەبارەت بە مارکسیزم ئاندرێ پێی تێر پێیوایە کە: "قوتابخانەی مارکس لە بوارە فەلسەفی سیاسی و ئابوورییەکانەوە وەکوو گەورەترین شۆڕشی جیهانی مودێرن وابوو. ئەم ڕێبازە هاوچەرخە کوفراویی لە ماوەی کەمتر لە سێ دەیەدا، سێ یەکی جیهانی داگیر کرد و لە شوێنەکانی دیکەشدا حەزو خولیایەکی نیمچە عیرفانی پێکهێنا".

بەڵام لایەکی دیکەی دراوەکە ئەوە دەردەخا کە ئەزموون، تێزەکانی ئەم ڕێبازەی ڕەت کردۆتەوە. بە جێگەی ئەوەی سەرمایەداری، تێزەکانی مارکس ڕەت بکاتەوە، تاقیکردنەوە، تێزەکانی مارکسی ڕەت کردەوە. نە سەرمایەداری بەپێی پێش بینیەکان پەرەی گرت نە کۆمۆنیزمیش بەڵێنەکانی خۆی جێبەجێ کردن. لە یەکسانی نێوان حەقدەستە کانەوە بگرە تا لە ناوچوونی دەوڵەت، لە هەڵوەشانەوەی دابەشبوونی کارەوە بگرە تا سەر هەڵدانی مرۆڤی هاوچەرخ .

زۆرمان نەگوتووە ئەگەر بڵێین مارکس بۆ خۆشی گیرۆدەی ئەو چارەنووسە بوو کە گیرۆدەی مامۆستاکانی خۆی ببوو. بەو واتایە کە مارکسیزم تووشی سەفسەتە بوو و ڕێبازی مارکس بەرەتکردنەوەی خۆی گەشەی سەند".

## مارکسیزمی دۆگم و مارکسیزمی داهێنەر
## Dogmatic and Creative Marxism

ستالین مارکسیزمی بە سەر دوو شێوەدا دابەش کرد:

١ـ مارکسیزمی دۆگم : مەبەست لە مارکسیزمی دۆگم، مارکسیزمی سەرەتایی و دارێژراوی مارکسە کە دەبێ ئەو وردەکارییانەی مارکس ئاماژەی پێ کردوون، ڕەچاو بکرێن و (بەبێ لەبەرچاو گرتنی پێویستی سەردەم) نابێ گۆڕانکاری تێدا بکرێ.

٢ـ مارکسیزمی کریێاتیف (راهێنەر)، بەهۆی چاکسازی کردنی پێویست لە مارکسیزمدا بەپێی پێویستییەکانی سەردەم و ئەو گۆڕانکارییانەی کە دێتە ئاراوە، مارکسیزم هێزی داهێنەرانەی خۆی دەپارێزێ و پێش دەکەوێ و کۆن نابێ.

## Marxism - Leninism
## مارکسیزم- لنینیزم

مارکسیزم ـ لنینیزم بریتیە لە خوێندنەوەو شیکردنەوەکانی لنین لە مارکسیزم بۆ گونجاندنی مارکسیزم لەگەڵ بارودۆخی رووسیادا. ئەم ڕوانگەیە بڕوای بە دامەزراندنی دیکتاتۆری

پرۆلتاریا بۆ پەڕینەوە لە کاپیتالیزمەوە بۆ کۆمۆنیزم هەیە. لە روانگەی ستالینەوە:" مارکسیزم ـ لنینیزم دەربڕی زانستیانەی بەرژەوەندییە بنەڕەتیەکانی چینی کرێکارە. مارکسیزم تەنیا تیۆری سۆسیالیزم نیە، بەڵکوو تیۆرێکی گشتی پاراو و سیستەمێکی فەلسەفیە کە سۆسیالیزمی پرۆلتاریای مارکس لەوەوە سەرچاوە دەگرێ، ئەم سیستەمە فەلسەفیە، مەتریالیزمی دیالکتیکە". پێناسەی رەسمی مارکسیزم ـ لنینیزم لە سۆڤیەت بریتیە لەوەی کە ئەم روانگە "گرنگترین بەشەکانی پەروەردەی مارکس، ئەنگێلز و لنین لە سیستەمێکی رێکخراو لە روانگەکان پێکدێنێ و لەگەڵ سیستەمی روانگەکانی دیکە جیاوازییەکی متافیزیکی هەیە. ئەم روانگەیە بڕوای بە هیچ هێزێکی میتافیزیکی نیە و پێیوایە نەتەنیا سروشت، بەڵکوو گەشەسەندنی کۆمەڵگای مرۆڤایەتیش بە پێی یاسا عەینیەکان و بە شێوەیەکی سەربەخۆ لە ئیرادەی مرۆڤەکان روودەدا، بەم پێیە ئەم روانگەیە یاسایی بوونی بنەماکانی سروشت و کۆمەڵگا دەدۆزێتەوە". توخمەکانی مارکسیزم ـ لنینیزم بەپێی لێکدانەوەکانی تیۆری دارێژانی سۆڤیەت بریتیە لە : مەتریالیزمی دیالکتیک، مەتریالیزمی مێژوویی، ئابووریی سیاسی و کۆمۆنیزمی زانستی. هەر بەپێی ئەم لێکدانەوە مارکسیزم ـ لنینیزم، سیستەمێکی رێکخراوی روانگە فەلسەفی، ئابووری، کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانە کە هەموو توخمەکانی پێکەوە پێوەندییەکی ئۆرگانیان هەیە و تەنیا بەشە پێکهێنەرەکانی، بوار بۆ گۆڕانی شۆرشگێڕانە دەرەخسێنن.

### مارکسیزمی هاو چەرخ — *New Marxis*

"ژۆژ سورێل"ی فەرەنسی ئەم رێبازەی داهێنا که بە زۆری پشت بە دنەدانی بیروڕای زەحمەتکێشان دەبەستێ، بەڵام لە بواری فۆرمەوە زیاتر بەرەو سەندیکالیزم دەڕوا تا بۆلای مارکسیزم بچێ.

### مافیا — *Mafia*

رێکخراوەیکە کە لە تاوانباران و قاچاغیچیە نێو دەوڵەتیەکان پێکهاتووە. پاڵنەری پێکهێنانی مافیا کە لە سەرەتادا لە سیسل (ئیتالیا)دا پێکهات، مەسەلە سیاسییەکان بوون، بەڵام لە دواییدا گۆڕانی بەسەرداهات.

یەکەمجار لە ساڵەکانی کۆتایی سەدەی هەژدەدا، ئەوکاتەی کە دورگەی سیسیل لە لایەن هێزەکانی فەرەنسەوە، داگیرکرابوو، هێندێک لە خەڵکی نیشتمانپەروەری دورگەی سیسیل، رێکخستنی چکۆلەی بەرەنگاریان لە دژی داگیرکەرانی فەرەنسی پێکهێنا. بە دوای دامەزراندنی ئەم رێکخستنە چکۆلە، راپەرینی بەربلاو و جیاجیا ئەم دورگەیان تەنیوە، لەم کاتەدا بوو کە گرووپێکی نهێنی لەم رێکخستنە چکۆلانە پێکهات و " ئیتالیا هاواردەکا؛ نەمان بۆ فەرەنسیەکان" یان کردە دروشمی خۆیان. ئەم گرووپە نفووزێکی زۆری کردە ناو دانیشتوانی دورگەی سیسیل و بە دروشمی " داکۆکی لە زۆرلێکراو و بەرەنگاری لەگەڵ زۆردار " بوو بە هۆی ئەوەی لە لایەن جەماوەرەوە پشتیوانی لێ بکرێ. لە دوای وەدەرنانی هێزە بیانیەکانیش، بە هۆی ئەو نفووزەی کە ئەندامانی گرووپ لە ناو خەڵکدا هەیانبوو، هەموو پۆستە گرنگەکانی دورگەی سیسیل و شارەوانیان وەدست هێنا. بەرەبەرە لە دوای وەدەرنانی هێزە بیانیەکان، ئەم گرووپە لە هەموو ئیتالیادا رێکخستی پێکهێنا و بەوەرگرتنی پۆستە گرنگ و هەستیارەکان، نێورۆکی ئەم گرووپە گۆڕا، خاوەن زەوی و زارە گەورەکان بۆ جێبەجێکردنی ئامانجەکانی خۆیان، ئەندامانی ئەم گرووپانەیان لە لای خۆیان دادەمەزراندن و خستیانە گیان وماڵی خەڵکی سیسیل و ئیتالیاوە. پاشان ئەم گرووپانە خەریکی قاچاغی کردن و گواستنەوەی مادده سڕکەرەکان، کرین و فرۆشتنی چەک و چۆڵ، بەڕیوەبردنی قومارخانەگەورەکان، دزی و تالآن کردن و رارووتکردن بوون و تۆرێکی گەورەی لەم شێوەیان پێکهێنا. ژمارەیەکی زۆر لەم گرووپانە کۆچیان کرد بۆ ئەمەریکاو لەوێ خەریکی رێکخستنی ئیتالی وبە تایبەتیی سیسیلیەکان کۆچبەرەکان بوون و بەرەبەرە کۆنترۆلی زۆربەی بازارەکانی قاچاغی، فرۆشتنی چەک وچۆڵی نایاسایی، بەرێوە بردنی قومارخانەکان، باندەکانی دزی و تیرۆریان بەدەستەوە گرت. کۆچبەرەکان لە هەر ویلایەتێکی ئەمریکادا رێکخستنێکیان لە نزیکان و هاوکارانی خۆیان پێکدێنا کە بە "بنەماڵە" بەناوبانگ بوون. بە پەرەگرتنی "بنەماڵەکان" لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا، کێبەرکێ ورکابەری کەوتە نێوانیانەوە و بەرەبەرە کۆچبەرانی هاوولاتی یەکتر، بوونە دوژمنانی بێ بەزەیی یەکتر لە پانتایی کیشوەری ئەمەریکادا. ئەمڕۆکە دەستەودارەی مافیا زیاتر لە ئەمەریکادا خەریکی چالاکین تا لە ئیتالیا و شوێنەکانی دیکەدا.

**مافیا لە شەڕی دووهەمی جیهانیدا:**

لە ئیتالیادا، ناوەندی سەرەکیی مافیا، باند و دەستەودارەکان هەر لە سەرەتای پێکهاتنیانەوە کەوتنە دژایەتیکردن لەگەڵ حکومەتدا و دورگەی سیسیلیان خستە ژێر کۆنترۆلی خۆیانەوە.

پاش ئەوەی موسۆلینی دەسەڵاتی بەدەستەوە گرت، خەریکی سەرکوتکردنی ئەم گرووپانە بوو و ژمارەیەکی زۆری لێگرتن و ژمارەیەکیشی لێ کوشتن، بەڵام نەیتوانی بەتەواوەتیی لە ناویان ببا. بەهۆی سەرکوتی موسولینی لە ئیتالیا و ئازادی تێکۆشانی ئەم گرووپانە لە ئەمەریکا لە شەڕی دووهەمی جیهانیدا، مافیا چووە پاڵ هاوپەیمانەکانەوە و زۆریان یارمەتیی کردن. لە ساڵی ١٩٤٣دا " دۆن کارلۆ"، ڕێبەری بە ناوبانگی مافیا و سەرۆکی گرووپە تاوانبارەکان لە دورگەی سیسیل و ئیتالیادا، بە هۆی پشتیوانیکردن لە هێزەکانی ئەمەریکا و هاوپەیمانان، دورگەی سیسیلی لە دەست ئەڵمانی و ئیتالیەکان رزگار کرد. پاشان چوو بۆ ئەمەریکا و بوو بە ڕێبەری گەورەی تاوانبارەکان و "زڕباوکی" مافیا. بەپێی راپۆرتەکان و دان پێدانانەکانی ئەندامانی مافیا، ئەم ڕێکخراوە ڕێکخستنێکی زۆر بەربڵاوی لە هەموو ئەمەریکا و شوێنەکانی دیکەی جیهان و بە تایبەتی لە ئیتالیادا هەیە و خاوەنی یاساو ڕێسایەکی پتەو  تووندوتۆڵە. لە ئەمەریکاشدا، ئەندامانی مافیا ئیتالین. کەواتە ئیتالی بوون یەکێک لە مەرجەکانی بە ئەندامبوون لە مافیا دایە. چۆنیەتی بە ئەندام بوونیش خاوەنی یاسا و ڕێسای تایبەتیە. ئەندامانی نوێ لە دوای ناسین و لێکۆڵینەوەی وردو روون، لە ڕێورەسمێکی تایبەتیدا دەبێ سوێند بخۆن کە هەتاسەر بە مافیا وەفادار دەبن و نهێنیەکان نادرکێنن. هەرکەسێک خیانەت بە ئامانجەکانی گرووپ بکا و نهێنیەکان بدرکێنێ یان چیتر بەکەڵکی کارکردن نەیا، لە لایەن کەسەکانی دیکەوە و بە بڕیاری سەرۆکی خۆی دەکوژرێ.

مافیا لە ئەمەریکادا خاوەنی چەند بنەماڵەی جیاوازە. لە ئەمریکادا، ١٢ بنەماڵەی گەورە هەن کە هەرکامیان لە یەکێک لە ویلایەتەکانی ئەم ولاتەدان و لە نیۆیۆرکدا تەنیا ٥ بنەماڵەی بە ناوبانگ خەریکی چالاکین. ئەو بنەماڵانە نفوزێکی زۆریان لە ئەمەریکا و لە ناو سیاسەتمەدارەکاندا هەیە و هەرکامیان لە ناوچەی خۆیاندا خەریکی چالاکین. بنەماڵەکان پێوەندییەکی باشیان لەگەڵ یەکتردا هەیە، بەڵام هێندێک جار بە هۆی کێشەو دوژمنیەوە، شەڕ و کوشتاری گەورە لە ناویاندا  ڕوودەدا، بەناوبانگترین بنەماڵەکان لە نیۆیۆرک ، فلۆریدا،

نیۆئۆرلیئان، لۆس ئانجلێس، کانزاس سیتی، لاس ڤێگاس، شیکاگۆ، کلیولەند، فیلادلفیا، نیوئینگلەند و...هتد. دادەنیشن. "دۆن کارلۆگامینتۆ"، بەناوبانگترین رێبەری مافیا و زرباوکی بنەماڵەکانی نیویۆرک بوو کە لە ساڵی ١٩٧٦دا مرد. گامینتۆ چەندجار لە چنگی یاسا رای کرد و هەر لەو ساڵەدا فیلمێک لە سەر ژیانی ئەو بەناوی "زرباوک" دروستکرا.

مافیا لە ئەمریکادا کاری زۆر جیاواز دەکەن و لە چالاکیە گەورەکاندا بەشداری دەکەن. قاچاغی ماددە سڕکەرەکان لە هەموو جیهاندا لە پاوانی ئەم رێکخراوە دایە. هەرئێستاکە هەواڵی گواستنەوەو کڕین و فرۆشتن و قاچاغی ماددە سڕکەرەکان لەهەموو ئەوروپا و بەتایبەتی لە ئەمەریکا و ئیتالیادا بلاو دەبێتەوە. بنەماڵەکان، ئەندامان و بەکرێگیراوانی مافیا، دەستیان لە دزی و تالانە گەورە نێودەوڵەتیەکاندا هەیەو زۆربەی قومارخانە بەناوبانگەکانی ئەمەریکا و ئەوروپا لەلایەن ئەندامانی ئەم گرووپەوە هەڵدەسوورێن. مافیا لەگەڵ گەورەترین سیاسەتمەدارەکاندا لە پێوەندی دایە. لە هەڵبژاردنی کۆنگرەی ئەمەریکادا رۆلێکی گرنگیان هەیە و بە پارەی زۆر نوێنەرانی دڵخوازی خۆیان دەنێرنە پەرلەمان. لە بازارەکانی بورسدا دەستیان هەیە. لە ڤالسیتریتی ئەمەریکادا نفوزێکی زۆریان هەیە. کەسی دەسترۆیشتوویان لە فرۆکەخانە گرنگەکانی ئەمەریکا، لە بانکەکان، لە کۆمپانیاکان و کارتێلە گەورە ئابوورییەکان و لە ناو پۆلیسی فیدرالی ئەمریکادا هەیە و لە کاتی خۆیدا بۆ ناردنە دەرەوەی قاچاغ و گۆڕینەی دراو (دراوی بیانی)، بەشداریکردن لە بۆرس، رزگاربوون لە چنگی یاسا و کەوتنە زیندانەوە، لەم کەسانە کەڵک وەردەگرن. رۆڵی مافیا لە پشت زۆر لە رەوتە سیاسییەکانی ئەمەریکادا_ لە وانە وا تێرگیت _ ئاشکرا بووە بەسەرهاتی بەخشینی بەرتیلی زۆر بە سیاسەتمەدارە گەورەکانی ئەمەریکا دەنگی دایەوە. مافیا لە دەرەوەی ئەمەریکاشدا کۆنترۆلی قاچاغی ماددە سڕکەرەکانی لە بەردەست دایە و لە هێندێک لە کایە سیاسییەکانی جیهانیشدا بەشداری دەکا. لە ساڵی ١٩٦٩دا، رەوتی چالاکیەکانی مافیا لە هائیتی و رکابەرییەکانی لەگەڵ C.I.Aدا ئاشکرا بوو. مافیا چەک و چۆلی زۆری بە سەرۆک کۆماری ئەم دوڕگە چکۆلەیەی دەریای کارائیب دا و لە نێوان ساڵەکانی ١٩٦٣و١٩٦٩دا کە C.I.A دەیهەویست "فرانسوادووالیە"، سەرۆک کۆماری ئەم وڵاتە لەسەرکار لادا، مافیا یارمەتیی سەرۆک کۆماری هائیتیدا کە لە لەگەڵ C.I.A دا شەڕ بکا.

## ماکیاڤێلیزم *Machiavellism*

بە بیروبۆچوونە سیاسی، فەلسەفی و کۆمەڵایەتیەکانی نیکۆلۆ ماکیاڤێلی، سکرتێری حکومەتی کۆماری فلۆرانس دەگوترێ.

ماکیاڤێلیزم بۆ ماوەی چوار سەدە لە لای خەڵکی جیهان هاوواتای چەمکەکانی دزێوی و ستەم و خیانەت بووە. خاوەنی ئەم ڕێبازە، ڕەمزی سیاسەتمەدارێکی وردبین و فێڵ بازە کە فەلسەفەکەی بریتیە لە: " ئامانج، پاساو دەری ئامرازە". بەردی بناغە و سریوەی هرزی ئەم ڕێبازە یەکەمجار لە کتێبی "میر"دا لە لایەن ماکیاڤێلەوە دارێژرا. ئەم کتێبە کە نیشانەی بەتوانابوونی نووسەرەکەیەتیی، لە نیوەی دووهەمیی ساڵی ١٥١٣دا، تەواو بوو و پاش ماوەیەکی کەم نێردرایە دەرباری لۆرێنتسۆ. نووسەر سەبارەت بە هۆکاری پێشکەشکردنی ئەم کتێبە دەنووسێ:" دیارییەکی لەوە جوانترم پێ شک نەهات کە هەموو ئەو شتانەی کە لە ماوەیەکی دوورو درێژ و بە کوێرەوەری و مەترسی زۆرەوە فێریان بووم و تاقیم کردوونەوە، پێشکەشتانی بکەم تا لە ماوەیەکی کورتدا کەڵکی لێ وەرگرن". دەستنووسەکانی کتێبی "میر" لە ماوەی ژیانی ماکیاڤێلی و دوایی مەرگیشی لە ناو خەڵکدا بڵاوبۆوە. بڵاوبوونەوەی "میر" لە لایەن پاپ کلێمێنتی حەوتەم؛ واتە خزمی نزیکی ئەو میرەی کە کتێبەکەی پێشکەش کرابوو، پەسند کرا. ئەم کتێبە لە ماوەی ٢٥ ساڵدا ، ٢٥ جار چاپ کرا و گەردەلوولێکی وەرێخست". ئەنجوومەنیی ترێنت " بڕیاریدا بەرهەمەکانی ماکیاڤێل بفەوتێنێ، لە ڕۆمدا بە کوفر تاوانبارایان کرد. و نووسراوەکانی ماکیاڤێلیان لێرەولەوێ قەدەغە کرد؛ ژێزۆئیتەکان (گرووپێکی مەسیحی ) لە ئەڵمانیادا وێنەی لە کاگیراوی ئەویان دەسووتاند و کاتولیکەکان و پرۆتستانەکان ڕێککەوتن و ماکیاڤێلیان بەهەڵگەراوە لەقەڵەم دا. لە ساڵی ١٥٥٠دا، هەموو بەرهەمەکانی ماکیاڤێلی چوونە ناو خشتتەی کتێبە قەدەغە کراوەکانەوە و تا سەدەی نۆزدەهەم لەم قەیرانە ڕزگاریان نەبوو. بزووتنە شۆڕشگێرانەکانی ئەمەریکا، فەرەنسا، ئەڵمانیا و شوێنەکانی دیکە بوونە هۆی ئەوەی کە خەڵک، گرنگی و بایەخ بە جیاکردنەوەی حکومەت و کلیسا بدەن و دەوڵەت بخەنە ژێررکێفی یاسا دنیاییەکانەوە . خەباتی ڕزگاریدەری ئیتالیا کە لە ساڵی ١٨٧٠دا گەیشتە ترۆپکەی خۆی، لە نیشتمانپەروەری گەورەی خۆی، واتە ماکیاڤێلی ئیلهامی وەرگردەگرت.

دۆگلاس گریکۆری لە وتاریکی چرووپڕدا، باس لەوە دەکا کە ڕیبەری نەتەوەی ئیتالیا واتە کۆنت کاڤێر، بە پێڕەویکردن لە دەستوورەکانی ماکیاڤێل، توانی ئیتالیا یەکبخا و داگیرکەرەکان وەدەرنێ. ئەگەر کاڤێر ڕێگایەکی دیکەی هەڵبژاردایە، جگە لە شکست و ڕۆژرەشی هیچی دیکەی وەچنگ نەدەکەوت. هەڵبەت ناتوانین حاشا لەوە بکەین کە دەسەلاتدار و زۆردارەکان لە هەر قۆناغێکی مێژوودا، ئەو شتانەی کە بۆخۆیان پێیان خۆش بووە لەم کتێبەدا دۆزیویانەتەوە. خشتەی نیۆی ئەو کەسانەی کەئەم کتێبەیان بەتاسەوەخوێندۆتەوە؛ سەرنجڕاکێشە:

ئیمپراتۆر شارلی پێنجەم و کاترین دۆمدیچی، بەم بەرهەمەیان هەڵدەگووت. ئێلیڤێر کرامۆل، بەرگێکی ئەم کتێبەی پەیدا کرد و لە بنەماکانی ئەم کتێبە بۆ بەهێزکردنی حکومەتی هاوبەرژەوەندی بەریتانیا کەلکی وەرگرت. هانری سێهەم و هانری چوارەم، پاشای فەڕەنسا، کاتێک کە کوژران، بەرگێکی ئەم کتێبەیان لە ناودەست دا بوو. ئەم کتێبە یارمەتیەکی زۆری شازادە فریدریشی گەورەی بۆ پرژانە سەر سیاسەتەکانی پرۆس کرد، لۆئیی چواردەهەم وەکوو کلاوی خەوتن کەلکی وەردەگرت. بەرگێکی ئەم کتێبە کە پڕ لە نووسراوە و بیروبۆچوون بوو، لە کەژاوەی ناپلیۆن بوناپارت لە ئەو کاتەی لە ڤاتێرلۆ بوو دۆزرایەوە. بۆچوونەکانی ناپلیۆنی سێهەم سەبارەت بە حکومەت بە تەواوەتیی لەم کتێبە وەرگیراون؛ بیسمارک قوتابی بە ئەمەکی ڕێبازی ماکیاڤێلی بوو و لە سەدەی بیستەمیشدا، هیتلەر بەوتەی خۆی هەمیشە کتێبی "میری" لە تەنیشت جێگا خەوەکەی دادەنا تا بەردەوام بۆی ببێتە سەرچاوەی ئیلهام. بنیتۆ موسۆلینی دەڵێ: "بە بڕوای من کتێبەکەی ماکیاڤێلی باشترین ڕێنوێنە بۆ هەموو سیاسەتمەدارێک. ڕێبازەکەی ئەو ئیستاش هەرزیندووە، چونکە لە ماوەی چوارسەد ساڵدا، هیچ گۆڕانێکی قووڵ لە مێشکی نەتەوەکان یان لە ئاکاریاندا پێک نەهاتووە". (دوایی موسۆلینی بیروڕاکەی گۆڕی چوونکە لە ساڵی ١٩٣٩دا لە خشتەی ناوی ئەونووسەرانەی کە بە پێی بڕیاری حیزبی فاشیست نەدەبوایە بەرهەمەکانیان بلاو بکرایەوە، ئاماژە بە "میر"ی ماکیاڤێلیش کرابوو).

لەلایەکی دیکەوە هێندێک لە شیکەرەوە وردبینەکانی رووداوە مێژووییەکان دەریانخستووە کە زۆر دارانێکی وەکوو هیتلەر و موسۆلینی بۆیە تووشی ئەوچارەنووسە نگریسە بوون کە یان بایەخیان بە هێندێک لە بنەما بنەڕەتیەکانی ماکیاڤێلی نەدا یان بە هەڵە لە بۆچوونەکانی ئەو گەیشتوون. ئەوانەی کە سەبارەت بە ژیان و بەرهەمەکانی ماکیاڤێلی

لێکۆڵینەوەیان کردووە، پێیانوایە کە بۆ تێگەیشتن لە هەموو بیروبۆچوونەکانی ماکیاڤێل، پێویستە هەردوو بەرهەمەکەی ئەو بخوێنرێنەوە واتە "نامەکان" و "میر". "نامەکان" کە لە ماوەی ٥ساڵدا نووسراوەو مێژووی بڵاو کردنەوەکەشی هەر لەکاتی بڵاو بوونەوەی " میر" دایە، بەرهەمێکی دووردرێژە. جیاوازی بنەڕەتیی "نامەکان" لەوەدایە کە ماکیاڤێلی لەم کتێبەدا باس لە "لەوەی کە دەبێ ببێ" دەکاو لە "میر"دا باس لە "ئەوەی کەهەیە"دەکا. "میر"باس لەو میرنیشینانە دەکا کە هەرکامەیان ویلایەتێکیان بەدەستەوەیە. "نامەکان" باس لەو بنەمایانە دەکا کە کۆمارەکان دەبێ بیانکەنە نموونەی خۆیان .

لە هەڵسەنگاندنی ئەم دوو کتێبە لەگەڵ یەکتردا دەگەیەنە ئەم ئاکامە سەرسوورِ هێنەرە کە ماکیاڤێلی کۆماریخوازێکی بڕوادار بووە، حەزی لە سەرە ڕۆیی نەکردووە، شێوازی تێکەڵاوی حکومەتی پاشایەتیی و جەماوەری بە باشترین جۆری حکوومەت زانیوە و پێیوابووە کە هیچ دەسەڵاتدارێک بەبێ پشتیوانی گەلی خۆی لە ئاسایشدا نابێ. بە بڕوای ئەو جێگیرترین دەوڵەتەکان، ئەو دەوڵەتانەن کە لە لایەن ئەو دەسەڵاتدارانەوە بەڕێوە دەچن کە بەپێی دەستوور، دەسەڵاتەکەیان بەرتەسک کراوەتەوە. حکوومەتی نموونەیی ماکیاڤێل ؛ کۆماری ڕۆمی کۆن بوو کە لە "نامەکان"دا بەردەوام ئاماژەی پێدەکا.

کەواتە چۆن بوو ماکیاڤێلی کە حکومەتی کۆماری بۆ هەر گەلێکی سەربەست لە سەرەوەی هەمووشتەکان دادەنا: "میر"ی نووسی؟ ئەم کتێبە بۆ هەلومەرجێکی تایبەتیی نووسراوە. بێ گومان ماکیاڤێلی بۆی روون ببۆوە کە دامەزراندنی حکوومەتێکی کۆماری سەرکەوتوو لە ئیتالیای سەدەی شانزدەهەمدا سەرناگرێ. " میر" تەنیا بەو مەبەستە نووسرا کە بە یارمەتیی کەسێکی بەتوانا، نەتەوەی ئیتالیا لەو بارودۆخە بێ هیواو گەندەڵە رزگار بکا. ئیتالیا تووشی قەیرانێکی وا قووڵ ببۆوە کە دەرفەتی ئەوەی نەبوو چارەسەرێک بۆ دەربازبوون لەم قەیرانە بدۆزێتەوە.

تەوەری سەرەکیی "میر" ئەوەیە کە هەر کردەوەیەک کە بۆ باشترکردنی بارودۆخی وڵات بەڕێوە دەچێ؛ ڕەوایە و ڕێوشوێنە ئەخلاقیەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیی و ژیانی تایبەتی لەگەڵ یەکتردا جیاوازن. کەواتە بەپێی ئەم تیۆرە، سیاسەتمەدارەکان و ئەوانەی وڵات بەڕێوە دەبەن، دەتوانن لە پێناو بەرژەوەندییەگشتیەکاندا دەست بدەنە هەر هەوڵێکی توندوتیژو نادادپەروەرانە

و پەنابەرنە هەر فێل و تەڵەکەیەک کە لە ژیانی تایبەتیدا نەتەنیا قێزەونە، بەڵکوو بەتەواوەتیی تاوانیشە. لەراستیدا ماکیاڤێلی سیاسەتی لە ئەخلاق جیا دەکردەوە.

"میر" ڕێنوێنێکی میرەکانە (یان هێندێک دەڵێن دەستوورێکە بۆ زۆرداران) کە فێریان دەکا چۆن دەسەڵات بگرنەدەست و چۆن بیشی پارێزن(دەسەڵاتێک کە بۆ بەرژەوەندی دەسەڵاتدار نیە، بەڵکوو لە پێناوی بەرژەوەندی خەڵک دایە) کە دەوڵەتێکی سەقامگرتوو و جێگرتوو پێک بێ کە لە بەرامبەر شۆڕش و هێرشدا پارێزراو بێ. ئێستا دەبێ بزانین سەقامگرتوویی و ئاسایش چۆن مسۆگەردەبێ؟

ماکیاڤێلی بە کورتی لەسەر پاشایەتی پشتاوپەشتی دەدوێ، چوونکە وادانراوە کە سوڵتان یان پاشا خاوەنی وشیاری و زیرەکیەکی ئاساییە و دەتوانێ دەسەڵاتی خۆی بەسەر دەوڵەتدا بسەپێنێ. لە لایەکی دیکەوە کێشەکانی حکوومەتی پاشایەتیی ئاڵۆزترن. ئەگەر ئەو شوێنانەی کە تازە داگیر کراون، خاوەنی هەمان نەتەوە و زمانی وڵاتی داگیرکەر بکەن، حکومەتکردن بەسەر ئەمانەدا تارادەیەک سانایە. بە تایبەتیی ئەگەر ئەم دوو بنەمایە رەچاو بکرێن: یەکیان ئەوەی کە " رەگەزنامەی پاشا کۆنەکان لە ناوبچێ" و دووهەمیان ئەوەی کە " گۆرانکارییەک لە یاساکان و لە باجدا پێک نەیا". بەڵام کاتێک کەوڵاتە داگیرکراوەکان لە بواری زمان و داب و نەریت و یاساکان جیاوازییان لەگەڵ وڵاتی داگیرکەر هەبێ، " کێشەی پاراستنی دەسەڵات چەند هێندە دەبێتەوە و تەنیا بەخت و شانسی لەرادەبەدەر و لێهاتوویی دەتوانێ ئەم کێشانە چارەسەر بکا."

ماکیاڤێلی پیشنیار دەکا کە بۆ ئەم مەبەستە دەبێ دەسەڵاتدار یان پاشا بۆ خۆی بچێتە ئەو شوێنەو لەو نیشتەجێ بێ و هێندێک لە هاوڵاتیان بنێرێتە وڵاتانی لاوازی دراوسێ و لەوێ نیشتەجێیان بکا (کە زۆر لە هێشتنەوەی سوپا لەو وڵاتەدا باشترە) و لەگەڵ دراوسێ بێ هێزەکاندا بناغەی دۆستایەتیی دامەزرێنێ و لەهەمان کاتیشدا، هەوڵ بدا دراوسێ بەهێزەکان، لاوازبکا. لۆئیی دوازدەهەم بایەخێکی بەم رێنوێنییانە نەدا کە لە ئاکام دا داگیرکراوەکانی لە دەست دا و زیانی زۆریشی لێ کەوت.

سەبارەت بەوەی کە چۆن دەتوانرێ بەسەر داگیرکراوەکاندا حکومەت بکرێ، ماکیاڤێلی سێ شێواز پێشنیار دەکا کە بە هۆی ئەم سێ شێوازەوە دەتوانن پارێزگاری لەو وڵاتانە بکەن کە فێربوون لە ژێر [سێبەری] یاساکانی خۆیاندا بە سەربەستانە بژین. یەکەم شێواز ئەوەیە

کە حکومەتەکەیان بڕوخێنرێ، دووهەم شێواز ئەوەیە کە پاشا بۆ خۆی لەو ولاَتەدا نیشتەجێ بێ و سێهەم شێوازیش ئەوەیە، ئازادی بەو ولاَتانە بدا کە لە ژێر [سیبەری] یاساکانی خۆیاندا بژین، بەلاَم دەبێ باج بە حکومەت بدەن و حکوومەت بسپێردرێتە چەند کەس لە دانیشتوانی ئەو ولاَتە هەتا بتوانن ئەوانەی دیکەش بکەنە دۆست و هاوپەیمان". لە نێوان ئەم سێ هەڵبژاردەدا ، ماکیاڤێلی دوو هەلبژاردەی یەکەم بە باشتردادەنێ.

لە باسێکی دیکەی ماکیاڤێلی لە "میرنشینە نوێکان"دا، دەسەلاَتدار لەوە دەگێرێتەوە و دەڵێ: "دەبێ ئەوەمان لە بیر بێ کە خووخدەی خەڵک بگۆڕە، هەروەکوو چۆن هاندانی خەڵک سانایە، ڕاگرتنیان بەم پاڵنەرانە ئەستەمە، بۆیە ئەگەر گەلێک بڕوای بە حکومەتێ خۆی نەبوو، دەبێ بە زۆری بڕوای پێ بهێنرێ". بە بڕوای ماکیاڤێلی ئەو داگیرکەرەی کە ولاَتێک داگیر دەکا، دەبێ دەستبەجێ زەبرەێکی وا بوەشێنێ کە پێویست بەوە نەکا، هەموو ڕۆژێک زەبرەکان دووپات بینەوە، بەڵکوو بەکۆتایی هێنان بە زەبرەکان، خەڵکەکە دڵنیا بکەی و پاشان بیانکەیە دۆست. قازانج گەیاندن دەبێ بەرەبەرە بێ، تا چاکتر هەست بەچێژەکەی بکرێ".

ترساندنی خەڵک لە ڕێگای سزاوە، تەنیا یەکێک لەو ئامرازانەیە کە دەسەلاَتدار دەبێ بۆ کۆنترۆلکردنی هاولاَتیەکانی خوی کەڵکی لێ وەرگرێ. پێویستە میر یان پاشا دۆستایەتیی خۆی لەگەڵ گەلی خۆیدا بپارێزێ، دەنا لەرۆژی تەنگانەدا کەسی بەدەورەوە نابێ. سەبارەت بە مێرنیشینەکانی کلیسا، واتە ئەوانەی کە ڕاستەوخۆ لە ژێر دەسەلاَتدارەیێ کلیسادان، ماکیاڤێلی گاڵتەیان پێدەکا: .

" حکومەتیی ئەم میرنیشینانە ئاکامی شانس یان ئاکامی لێهاتوویی میرە، بەلاَم ئەو حکومەتە بە بێ ئەوانەش خۆی ڕادەگرێ ؛ چوونکە دەسەلاَتداری سەرەکیی، یاسا پیرۆزە ئایینیەکانن کە ئەوەندە کاریگەرن کە هەموو کردەکانی میر کۆنترۆل دەکەن و دەسەلاَتی خۆیان بە سەر میردا دەسەپێنن. ئەم میرانە ولاَتێکیان هەیە کە ناپارێزن و خەڵکێکیشان هەیە کە حکومەتیان بەسەردا ناکەن". هێرشە توندەکانی ماکیاڤێلی لێرەو لە شوێنەکانی دیکەشدا بۆ سەر کلیسای ڕۆما لە بەرئەوە بوو کە کلیسا، ئیتالیای لەبەرامبەر دوژمنە بیانیەکاندا یەکگرتوو نەکردبوو. پێشنیاری ماکیاڤێلی ئەوەیە کە دەبێ کلیسا و حکومەت لەیەکتر جیا بکرێنەوە.

چوونکه حکومەتێکی بەهێز، پێویستی بە سوپایەکی بەهێزە، ماکیاڤێلی کاروباری سەربازی لە پلەی یەکەم دادەنێ و بەشێکی زۆر لە باسەکەی خۆی بۆ ئەم بابەتە تەرخان کردووە. لە سەردەمی ماکیاڤێلیدا، زۆربەی ویلایەتەکان بۆ بەرگریکردن لە خۆیان، سەربازی بیانیان بەکرێ دەگرت.

ماکیاڤێلی دەڵێ ئەم سوپایە " بێ کەڵک و مەترسیدار"ە و سوپایەک کە کەسەکانی لە هاووڵاتیانی خۆی بێ دڵنیاترو کاریگەرترە. چونکە مانەوەی حکومەت بە هێزی سەربازییەوە بەستراوەتەوە، دەبێ میر بایەخێکی زۆر بەکاروباری سەربازی بدا. ماکیاڤێلی چەند بەش لە کتێبەکەی خۆی بۆ هەڵسوکەوتی میرەکان تەرخانکردووە. بە بڕوای ماکیاڤێلی میر نابێ گوێ بداتە ئەوەی کە بە بەرچاوتەنگی ناوبانگ دەرکا، چوونکە ئەو" ئەوشتەی کە دەیخوا یان هی خۆیەتی یان هی هاوڵاتیەکانیەتی یان هی کەسانی دیکەیە... زێدەڕۆیی کردن لە خواردنی ماڵی کەسانی دیکەدا ڕەوایە. چوونکە دەست ئاوەڵا بوون لە خواردنی ماڵی خەڵکی دیکەدا (کە بە هۆی داگیر کردنی سەربازییەوە وەدەست هاتووە) لە ناوبانگی میر کەم ناکاتەوە، بەڵکوو زیاتریشی دەکا. بەڵام ئەوەی دەبێتە هۆی زیان لێ کەوتن، ئەوەیە کە ماڵی خۆی بە خۆڕایی بە فیڕۆ بدا هیچ شتێک لە زێدەڕۆیی کردن زیانبارتر نیە، چوونکە لە کردەوەدا ئەو ئامرازەی کە زێدەڕۆیی پێ جێبەجێ دەکرێ، بەرەبەرە لە ناو دەچێ و ئەوکەسەی زێدەڕۆیی دەکا هەژار و بێزاراو دەبێ، یان بۆ پێشگرتن لە هەژاری چاوچنۆک دەبێ و دەبێزرێ".

میر دەبێ بێ بەزەیی بوون بەیەکێک لەو ئامرازانە بزانێ کە هاوڵاتیەکانی خۆی پێ ڕێک بخاو ملکە چیان بکا، "چوونکە ئەوکەسەی بێ سەرەوبەرەیی بە توندی لەنێو دەبا، لە کۆتاییدا دادپەروەرتر و بەبەزەییتر دەبێ لەو کەسەی کە بە هۆی کەمتەرخەمیەوە، شتەکان هەروابە جێ دێڵێ کە دەبێتە هۆی ڕاورووت و خوێن ڕشتن، چوونکە زیانەکەی وڵات و دەوڵەت دەگرێتەوە، بەڵام زەبروزەنگی میر تەنیا زیان بەکەسەکان دەگەیەنێ".

ماکیاڤێلی لە بەشێکی بەناوبانگی کتێبەکەیدا دەڵێ: " لێرەدا ئەو پرسیارە دێتە ئاراوە کە ئایا دڵی خەڵک ڕاگرتن باشترە یان ترس خستنە ناو دڵی خەڵک. ڕەنگە ئەم پرسیارە وا وەڵام بدرێتەوە کە ڕەنگە بتوانین بە نازێک هەردوکیان جێبەجێ بکەین. بەڵام بەو پێیەی کە خۆشەویستی و ترس لەگەڵ یەکتردا ناگونجێن، ئەگەر پێویست بێ یەکیان هەڵبژێرین، باشتروایە

که خەڵک سەبارەت بە ئیمە هیچ خۆشەویستیەکیان نەبێ و لێمان بترسن. چوونکە بە گشتی خەڵک بەبێ ئەمەگ، لەرزۆک، دووڕوو، دەست بەکڵاوگر، چاوچنۆک و قازانج ویستن و "گیانفیدای ئەو کەسەن کەشتێکیان لێی دەست دەکەوێ" و ئەو کاتەی کە هەڕەشەو مەترسیەک لە ئارادا نیە، ئامادەن گیانی خۆیان و بنەماڵەکانیان پێشکەش بکەن و کاتی پێویستیشدا پشتمان تێدەکەن و ڕوو وەردەگێرن.

هیچ کام لەبەشەکانی کتێبی"میر" بەقەد بەشی هەژدەهەم کە سەبارەت بە ئایینە، نەکەووتوونەتە بەر هێرش. ئەو خراپ تێگەیشتن و خوێندنەوە نابەجێیانەش کە سەبارەت بە ماکیاڤێلی لە ئارادان، زیاتر لە هەموو بە شەکانی نێو ئەم کتێبە، لەم بەشە سەرچاوەدەگرن. لێرەدا ماکیاڤێلی دان بەوەدا دەنێ کە بیروبڕوا شتێکی پیرۆزوبەجێیە، بەڵام فیل و تەڵەکە و دووڕوویی و شایەتی دانی بە درۆ و درۆ کردن بۆ پاراستنی دەسەڵاتی سیاسی پێویست و ڕەوان. ماکیاڤێلی پێیوایە مەرجی سەرەکیی ئەوەیە کە میر نەهێڵێ بکەوێتەوە بەر رق و تووڕەیی خەڵکەوە. ئەو باسی دوو هۆکار دەکا کە دەبێتە هۆی ئەوەی میر بکەوێتە بەر ڕق و بێزاری:

" یەکیان ئەوەی کە چاوچنۆک بێ، و ئەوی دیکەشیان ئەوەیە کە دەست درێژی بکاتە سەر گیانی و شەرەفی رەعیەتەکان... مێرێک کە واز وازی و ناپیاو و بێ ورە و لەرزۆک بێ، دەبێزرێ". ڕوانگەی ماکیاڤێلیزم کە ڕێگایەکی نوێی لە فەلسەفەی زانستیدا کردۆتەوە، ئێستاش لە پاش تێپەڕینی چەندە سەدە، بەلای شارەزایانی دونیای سیاسەتەوە، سەرنجڕاکێشە.

## مالتۆسیانیزم *Maltusianism*

مالتۆسیانیزم یان تیۆری دانیشتوانی مالتۆس، لە نێوی کەسایەتیەکی ئایینی مەسیحی بەریتانی بە نێوی مالتۆس وەرگیراوە کە لە کۆتاییەکانی سەدەی ١٨ و سەرەتاکانی سەدەی ١٩دا دەژیا. تۆماس رۆبێرت مالتۆس تیۆرەکەی خۆی لەوتارێکدا (کە ناوی نووسەری لە سەرنەبوو) لە ساڵی ١٧٨٩دا بلاّو کردەوە، پاشان لە ساڵی ١٨٠٢دا بە پێدا چوونەوەیەک بە نێورۆکی کتێبەکەدا، بە نێوی خۆی بلاّوی کردەوە. تیۆری مالتۆس لەسەر ئەم بنەمایە دامەزراوە: ڕێژەی دانیشتوانی مرۆڤ لەچاو پێداویستیەکانی ژیان خێراتر بەرز دەبێتەوە؛ ژمارەی دانیشتوان بە شیوەی دوو هێندە (دوو بەرامبەر) بەرز دەبێتەوە. ( ١و٢و٤و٨و١٦و٣٢و٩٦.........) لە حاڵێکدا کە پێداویستیەکانی ژیان بە

شێوەی یەک لە دوای یەک بەرزدەبنە (١و٢و٣و٤و٥و٦و٧)، بۆیە ئەگەر پێش بە بەرزبوونەوەی ڕێژەی دانیشتوان نەگرین، مرۆڤ تووشی ڕۆژڕەشی و بەش مەینەتی دەبێ. ئەگەر بە شێوەی سروشتی پێش بە بەرزبوونەوەی ڕێژەی دانیشتوان نەگرین، هۆکارەکانی برسیەتی، شەڕ و نەخۆشی دەبنە هۆی کەمبوونەوەی ڕێژەی دانیشتوان. ڕەخنەی سەرەکی تیۆری مالتۆس ڕوانگە ڕەش بینانەکەی ئەم تیۆرەیە کە بۆتە هۆی ئەوەی پێش بە ئاستی خۆشگوزەرانی تاکەکەسیی لە جیهانی سێهەمدا بگرێ. هەروەها تیۆری مالتۆس یەکێک لە هۆکارەکانی شەڕ سەبارەت بە شەڕ ناسیە.

## Manifest

### مانیفێست

مانیفێست لە زاراوەی لاتینی ManiFestus وەرگیراوە. مانیفێست لە واتا سیاسییەکەیدا، ڕاگەیەنراوێکە کە کۆمەڵەو ڕێکخراوەکان بۆ دەربڕینی بیروبۆچوون و هەڵوێستی سیاسی خۆیان بڵاوی دەکەنەوە. ڕاگەیەنراوی سەرۆکی وڵاتان یان کاربەدەستە پایە بەرزەکانی وڵات کە سەبارەت بە ڕووداوە گرنگە سیاسییەکانی وڵات و جیهان بێ و یان پێوەندی بە چاکسازییە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکانەوە بێ، مانیفێستی پێ دەگوترێ. یەکەمین بەرنامەی کۆمۆنیستیەکان کە لە لایەن کارڵ مارکس و ئەنگێلزەوە نووسراوە و لە ساڵی ١٨٤٨دا بڵاو بۆوە، مانیفێستی کۆمۆنیستیەکانی پێ دەگوترێ.

## Golden Crescent

### مانگی ئاڵتوونیی

بە ناوچەیەکی ئاسیا دەگوترێ کە بۆ ئاودیوکردنی ماددە سڕکەرەکان کەڵکی لێ وەردەگرن.

ناوچەی مانگی ئاڵتوونی بەشێک لە باکووری ڕۆژهەڵاتی ئێران، باشووری ڕۆژهەڵاتی ئەفغانستان و باکووری ڕۆژئاوای پاکستان دەگرێتەوە. ئەم ناوچەیە جێگەی " سێ کوچکەی ئاڵتوونی " گرتەوە.

## مووساد — *Mossad*

دەزگای هەواڵگری حکومەتی ئیسرائیلە. کورتکراوەی ئەم رستە ئینگلیزییە:
Ha Mossad Le Modeinve Tafkidim Meyuhadim
کە بە واتای دەزگای سیخوڕی و ئەرکە تایبەتیەکانە. ئەم دەزگایە وەکوو دەزگایەکی سیخوری چالاک و کاریگەر لە دونیادا بەناوبانگە و ئەم ناوبانگەش زیاتر رەنگدانەوەی کردەوە توندوتیژەکانی مووسادە. بە بەروارد لەگەڵ دەزگا سیخورییەکانی دیکەی رۆژئاوا، مووساد بە هۆی ئەو کاریگەرییە زۆرەی کە لە سەر سیاسەتی دەرەوەی ئیسرائیل هەیەتی، جیاوازە. لە دوای دامەزرانی ئیسرائیل لە ساڵی ١٩٤٨ و تەریک کەوتنەوەی هەرچی زیاتری ئەم حکومەتە، هەست بە هەبوونی رێکخراوێکی نهێنی دەکرا، بۆ ئەوەی حکومەتی ئیسرائیل بتوانێ پێوەندییە سیاسی و بازرگانیەکان، خولەکانی راهێنان و کاروباری سەربازی کۆنترۆڵ بکا. و رێبەرایەتیی کردەوەی بۆمب دانانەوە و تیرۆری نەیاران لەدەرەوەی وڵات بکا و سەبارت بە نەیارانیش زانیاری کۆ بکاتەوە. مووساد، تاپێش شەڕی دووهەمی جیهانی ـ ئەوکاتەی کە فەلەستین لە ژێر سەرپەرەستیاری بەریتانیادا بوو ـــ بەدزیەوە جولەکەکانی بۆ فەلەستین دەهینان. ئەو تۆڕانەی کەئەم رێکخراوە بۆ ئاسانکاری کۆچی جوولەکان لە سۆڤیەت و ئەورووپای رۆژهەڵاتدا پێکیهێنابوون، رژێمی ئیسرائیلیان خستەناو هەلومەرجێکی لە بار. مووساد تەنیا لەبەرامبەر سەرۆک وەزیر (دەیڤید بین گۆریون) وەڵامدەر بوو، ئامان (ریکخراوی هەواڵگری سوپا) شین بێت (ریکخراوی دژە هەوالگری کە ئیستا بە شاباک ناسراوە) لەم ماوەدا سەر بە مووساد بوون.

مووساد لە راکێشانی کەسە بە ئەزموونەکانی رێکخراوە زایۆنیستیەکان و تێرۆریستیەکانی ئیرگۆن و ئیشترێن و هەروەها لە باڵی هەواڵگری شای لە هاگانادا سەرکەوتوو بوو و خێرا بوو بە رێکخراوێکی تۆقێنەر وزۆری پێ نەچوو کە لەلایەن رێکخراوی دژە تیرۆریستی فەڕەنسا و C.I.A ئەمەریکاوە یارمەتی درا.

لە سەرەتای شەڕی سارد لە سەرەتاکانی دەیەی ١٩٥٠ەوە، مووساد پێوەندییەکی توندوتۆڵی لەگەڵ C.I.Aدا هەبوو. هەرچەندە لەو کاتەدا ئەمەریکا وەکوو "یەکێک لە پشتیوانانی رۆژئاوا لە نێو عەرەبەکان دا" چاوی لە جەمال عەبدوالناسر دەکرد. سیا و مووساد لە زۆر پیلانی

هاوبەشدا بەشداریان کرد. بۆ وێنە دامەزراندن و ڕاهێنانی پۆلیسیی نهێنی شای ئێران بە نێوی ساواک. ئەم دوو ڕێکخراوە لە سەر ئەوە ڕێککەوتبوون کە ئەو زانیاریانەی دەگەنە موساد، بگەیەنرێنە سیادا. ئەمەریکا بۆیە لەگەڵ موساد پێکهات، چوونکە ئەم ڕێکخراوە تۆڕێکی بەربڵاوی لە ئەورووپای ڕۆژهەڵاتدا هەبوو. ئەمەریکا بەتەمای سیاسەتی " ئاستەنگ نانەنەوە" لە بەرامبەر یەکیەتیی سۆڤیەت دابوو و سەرۆکەکانی ڕێکخستنە دژە زانیارییەکان، بە تایبەتی جیمز ئینگلتن دەیانەویست لەم تۆڕانە کەڵک وەرگرن.

ئینگلتن دیارترین کەسایەتیی موساد لە ناو سیادا بوو و لە دوای نەمانی ئەو لە ساڵی ۱۹٤۷دا، پێوەندی موساد و سیا سارد بۆوە. بەڵام هاوکارییە هەواڵگرییەکان لە ساڵەکانی ۱۹٦۰دا، بە قازانجی دوولایەن نەبوو. ڕووداوەکانی وەکوو هێرشکردنە سەرکارخانەکانی ئەمەریکا لە خاکی میسر و داگیرکردنی بیابانی سینا و هێڵی غەززە لە ماوەی شەڕەکانی ۱۹٥٦دا، تارادەیەک نیشانەی سەربەخۆیی کردەوەکانی ئیسرائیل بوون. بێ گومان ئەگەر سیا بەم بەرنامانەی مووسادی زانیبا، پێشی بەم بەرنامانە دەگرت. بەڵام پێوەندی نێوان سیا و مووساد هەروا بەردەوام بوو و ئیسرائیل لە ساڵەکانی ۱۹٦۰دا، نزیکەی ۸۰ میلیۆن دۆلاری لە سیا بۆ پیلان گێران لە ئەفریقیادا وەرگرت، چوونکە دەوڵەتی ئەمەریکا بۆ خۆی نەیدەتوانی بە شێوەی ڕاستەو خۆ یارمەتی ماددی بە ئیسرائیل بدا.

لە ساڵی ۱۹٦۳دا، ئیترهارێل ــ دارێژەری پلانی ڕفاندنی ئایشمەن لە ئەمەریکای باشوورــ دەستی لە کار کێشاوە و میر ئامێت بوو بە جێگری. هرێل لەگەڵ بۆن گۆریۆن سەبارەت بە تیرۆری زانا ئەڵمانیەکان لە لایەن ئیسرائیلەوە کە لە دروستکردنی مووشەکە دوورهاوێژەکانی میسردا کاریان دەکرد، لێی بوو بە کێشە. تا ئەو کاتە ئامێت سەرۆکی "ئامان" بوو و لە کاتی سەرۆکایەتیی ئەودا بەرنامەی مووساد گۆڕانی بە سەرداهات و زیاتر لە سەر تەکنەلۆژیا و هاوکاری پتەوتر لەگەڵ ڕێکخراوە هەواڵگرییەکانی دیکەدا پێداگری دەکرا. بەرپرسیارەتیەکی زیاتر بە ڕێکخراوی "ئامان" ئەسپێردرا و ئەرکی کۆکردنەوەی زانیاری سەبارەت بە سوپای میسر و بەرپرسانی هێزی ئەڵمانیا و کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر بنکە سەربازییەکان لە شەڕەکانی ۱۹٦۷دا بە هاوکاری مووساد خرایە ئەستۆی ئەم ڕێکخراوە. ئامیت چوو بۆ واشینگتۆن و پشتیوانی دەوڵەتی ئەمەریکای بۆ هێرشێکی لە ناکاو بوسەر میسر لە ساڵی ۱۹٦۷دا ڕاکێشا. سیا هاوکاری ئیسرائیلی کرد و پێشی

بە نارەزایەتیی دەوڵەتی ئەمریکاش سەبارەت بە داگیرکردنی بەشێکی زۆر لە خاکی ئوردون و سوریا گرت. ئامیتە ماوەیەکی کەم دوایی ئەم رووداوە دەستی لە کار کێشایەوەو بەرێوبردنی کۆمپانیایەکی گەورەی پیشەسازی و نێوەدۆڵەتی بە نێوی "کور"ی لە ئەستۆ گرت کە بە نهێنی لە کردەوەکانی مووسادددا بەشداری دەکرد. زێڤی زامیر، جێگری ئامیت بوو.

بە هۆی شەڕەکانی ساڵی ١٩٦٧ەوە، ئیسرائیل پێوەندییەکانی خۆی لە ئەفریقیادا لە دەست دا. زامیر پێوەندییەکی تووندوتۆڵی لەگەڵ ئەفەریقیای باشووردا دامەزراندو موساد خەریکی کردەوەی نهێنی سیاسی لە وڵاتە جیاوازەکانی ئەفریقیادا بوو. هاوکاریکردنی جیایی خوازانی باشوری سوودان لە لایەن مووسادەوە لە ساڵی ١٩٧٠دا، بوو بە هۆی رووخاندنی سەرۆک کۆماری ئانگۆلا، میلتۆن ئۆبوتە لەلایەن عەیدی ئەمنیە. سیاو دەزگای هەواڵگری بەریتانیا پشتیوانیان لەم پیلانە کرد. بەڵام لە ماوەی کەمتر لە چەند مانگدا ئەمنی پشتی لە پشتیوانەکانی کردو لەگەڵ وڵاتانی عەرەبیدا پێوەندی دامەزراند. ئەم هەنگاوەی ئەمنی بووە هۆی ئەوەی کە پێوەندی ئیسرائیل و ئەفریقیای باشوور گەرم و گۆڕتر بێ.بڕیاری دەوڵەتی ئیسرائیل لەسەر پەرپێدانی تەکنەلۆژیای ناوەکی، مووسادی زیاتر چالاکتر کرد. راسپێردراوەکانی مووساد لە ساڵی ١٩٦٨، فرۆکەیەکی بارهەڵگری یورانیۆمیان بۆ سووتەمەنیی رئاکتۆرەکانی ئیسرائیل لە دێمونا لە بیابانی "نفۆ"دا، رفاند. ئیسرائیل تەنانەت هەوڵی دا بەرنامەی ناوەکیی عەرەبەکان تێک بدا بۆ ئەوەی هیچ کام لە وڵاتانی عەرەبی . چەند ساڵ لەومەوپێش گرووپێکی مووساد هێرشیان کردە سەر کۆمپانیای T.N.A.M لە باشووری فەرەنسا و زیانیان بەو دوو رئاکتۆرە گەیاند کە کە خەریک بوو بۆ عێراق بەرێ بکرێن، کە بوو بە هۆی وەداوکەوتنی ناردنی ئەم دوو رئاکتورە بۆ عێراق.

مووساد لە بەرامبەر دوژمناندا، لە تیۆری "دوژمنی من، دۆستی منە" پێرەوی دەکرد. بۆ وێنە هەر لە دوای ئەوەی رژێمی پاشایەتیی عێراق بە هۆی کودەتای سەربازی ١٩٥٨ەوە رووخا، مووساد بە ناردنی راوێژکارە پایەبەرزەکان و ناردنی کەرەسە، هاوکاریی کوردەکانی عێراقی کرد و هێندێک لە کوردەکان لە فەلەستیندا مەشقیان پێ دەکرا. کوردەکان لە لایەن سیاو ساواکیشەوە یارمەتی دران، بەڵام کاتێک کە لە شوباتی ١٩٧٥دا، ئێران و عێراق لە سەر کێشەی سنووری لەگەڵ یەک رێککەوتن، مووساد و رێکخراوە سیخوڕییەکانی دیکە پشتیان لە کوردەکان کرد و شورشی کوردەکان زەبرێکی کاریگەری لێکەوت.

ئەگەرچی کڕین و فرۆشتنی چەک و چۆڵ لە ئاستی بەرفراواندا بە نهێنی نامێنێتەوە، بەڵام ئیسرائیل قازانجێکی بەرچاو لەم وتووێژە نهێنییانە وەدەست دێنێ. مووساد بەشێکی تایبەتیی لەم بوارەدا هەیە و پێشنیاری فرۆشی چەک وچۆڵ بە دەوڵەتەکان دەکا. ئەم رێکخراوە هەروەها کۆمەڵێک کەسیی لە ئاستی سەرەوەو لە پیشەسازییە فرۆکەوانی و سەربازییەکانی ئیسرائیلدا هەیە. نیۆیۆرک، لەندەن و برۆکسێل، کۆمپانیا یاریدەرەکانی پیشەسازی کور (تاتاریران، ئیسکوو تامکۆر) بنکەی "هەواڵگر"یان هەیە و بەشێکی زۆر لە چەک وچۆڵەکان ئاراستە دەکەن. بەڵام لە ناو هەموو کردەوە نهێنیەکانی مووساددا، بەناوبانگترینیان بەرەنگاریکردنەوە لەگەڵ بزووتنەوەی رزگاریدەری فەلەستین لە کۆتایی ساڵەکانی ١٩٧٠ دایە.

تیرۆری فەلەستینەیەکان یەکێک لە کردەوەکانی موسادە بە تایبەتی لە دوای کوشتنی وەرزشکارەکانی رژێمی ئیسرائیل لە ئۆلەمپێکی ١٩٧٢، کە دوازدە کەس لە رێبەرانی فەلەستین بە گەڵاڵە دارێژی ئەم کردەوە ناسران و ناویان چووە ناولیستی رەشی مەرگەوە. ئەگەر ئامانجەکە لە ئەورووپادا بوو، مووساد کۆمەڵێک کەسی بە شێوەی گرووپی ٥ کەسی رێکدەخست و ئەگەر ئامانجەکەش لە لوبناندا بوایە، هێندێک گرووپی تایبەتی دەناردن کە لەژێر چاوەدێری مووسادا، ئەرکەکانیان بەرێوە دەبردن.

چەندین کەس لە بەرپرسانی بزووتنەوەی رزگاریدەری فەلەستین بوونە قووربانیی و چەند کەسی دیکەش بە خۆیان و ترۆمبیلەکانیانەوە تەقانەوە. نووسینگەی بەرەی جەماوەری بۆ رزگاری فەلەستین لە بەیروتدا بەمەبەستی چەواشەکردنی بیروڕای گشتی درایە بەر هێرشی مووشەکەکانی رووسیا تا بێ متمانەی بکەن. دوازدەهەمین ئامانج، عەلی سەلامە لە ساڵی ١٩٧٩دا، لە دوای ئەوەی لەچەند پەلامار رزگاری بوو، کوژرا. مووساد جگە لە پووچەڵکردنەوەی چالاکی و تێکۆشانی فەلەستینیەکان ،ئەو دیپلۆماتە نێودەوڵەتیانەش ئازار دەدا کەمافی خودموختاریی فەلەستینییەکان بەرەسمیی دەناسن بۆ وێنە لە ساڵی ١٩٧٩دا، مووساد لە دژی ئەندرۆ یانگ، باڵوێزی ئەمەریکا لە un ، پیلانی دارشت، چوونکە یانگ بە نوێنەری رێکخراوی رزگاریدەری فەلەستینی گوتبوو کە حەزدەکا بە نهێنی لە میوانیەکدا کە لایەنێکی سێهەم وەریی خستبێ، بەشداری بکا.

قسەکانی تەلەفۆنی نوێنەرانی رزگاریدەری فەلەستین و ئەندرۆ یانگ گەیشتنە گۆڤاری نیوزڤیک. یانگ لە سەرکارلادرا و وتووێژکردن لەگەڵ بەرەی رزگاریدەری فەلەستین لە بیرکرا. یەکێکی دیکە لە تاکتیکەکانی بەرەنگاری مووساد لە دژی فەلەستینیەکان، رۆڵی ئەم رێکخراوە لە چەکدارکردنی میلیشیاکانی مەسیحی لوبنان لە لایەن ئیسرائیلدا بوو. لەو کاتەوە کەرێککەوتننامەی ئاشتی لە نێوان میسر و ئیسرائیلدا مۆر کراوە، هاوکاری نێوان دەزگای موخابەراتی میسر و مووساد گەرم بووە، بە تایبەت لە دژی فەلەستینیەکان. پێگەی مووساد لە ناو فەلەستیندا لە ساڵی ١٩٧٣ کە بە هۆی کێبەرکێکردن لەگەڵ دەزگا سیخوڕییەکانی دیکە نەیتوانی شەڕی تشرینی یەکەم پێش بینی بکا، زۆر دابەزیوە. هەموو دەزگا سیخوڕییەکانی ئیسرائیل چوونکە نەیانتوانیبوو راپۆرتی بێ هەڵە سەبارەت بە گەلاڵەکانی شەڕی میسر و سوریا بدەن، کەوتنە بەر رەخنە.

### مەک کارتیزم *Mc Carthyism*

لە ناوی ژوزێف مەک کارتی، سیناتۆری ئەمەریکی وەرگیراوە کە لە گەرمەی شەڕی سارددا، سەرۆکایەتیی کۆمیسیۆنی لقی لێکۆڵینەوەی دامەزراوە دەوڵەتیەکانی ئەمەریکای کە لە ساڵی ١٩٥١ دا دامەزرا بوو، لە ئەستۆدا بوو. مەک کارتی بە بیانووی دژایەتیکردن لەگەڵ کۆمۆنیزمدا، بە شێوەیەکی توندو تیژانە لایەنگرانی کۆمۆنیزم و رێکخراوە چەپەکانی سەرکوت دەکرد. لە سەرەتاکانی دەیەی ١٩٦٠دا کە شەڕی سارد نیشتەوە وبواری بۆ خۆش بوونی پێوەندییەکانی نێوان ئەمەریکا و سۆڤیەت رەخسا، سیاسەتەکانی مەک کارتیزمیش بەرەو نەمان رۆیشتین.

### نەتەوە *Nation*

دەوڵەتیی نەتەوەیی گرنگترین یەکەی ژیانی سیاسی لە جیهان دایە. لە رابردوودا، ئیمپراتۆرییەکان، هۆزەکان و دەوڵەت ـ شارەکان یەکە بنەڕەتیەکانی ژیانی سیاسی بوون. بەڵام نەتەوە لە چاو چەمکەکانی شار و هۆزدا وەکوو یەکەیەکی سیاسی، چەمکێکی ئاڵۆزترەو سەبارەت بە توخمە پێکهێنەرەکانی جیاوازی بیروبۆچوون هەیە. بە رای تیۆری داریژان، توخمە پێکهێنەرەکانی نەتەوە لەو فاکتەرانەپێکهاتوون: هەبوونی رێکخراوێکی سیاسی، کولتوور و زمانی

هاوبەش، رابردووی مێژوویی هاوبەش و...هتد. شۆڕشی فەرەنسا، سەرچاوەی یەکێک لە ڕوانگەکان سەبارەت بە توخمە پێکهێنەرەکانی نەتەوەیە. بەپێی نەریتی هزریی شۆڕشی فەرەنسا، تایبەتمەندی سەرەکی نەتەوە یەکیەتیی کولتووری، زمانی یان ئەتنی نیە، بەڵکوو تایبەتمەندیی سەرەکی، یەکیەتیی ڕێکخراوی سیاسییە. یەکێک لە شۆڕشگێڕەکانی فەرەنسا دەڵێ: " نەتەوە کۆمەڵێک کەسن کە لە ژێر دەسەڵاتی یاسایەکدا دەژین". کەواتە سەرهەڵدانی نەتەوە پێویستی بە سەرهەڵدانی دەوڵەت هەیە و چەمکی دەوڵەت و ڕێکخراوی سیاسی (دەوڵەت) هەم لە بواری لۆژیکی و هەم لە بواری مێژووییەوە، لە نەتەوە گرنگترن.

بەم پێیە هەموو ئەو کەسانەی کە لە ناو ڕێکخستنێکی سیاسی بانتر لە هۆز و ئەتنۆسدا دەژین، یەک نەتەوەن. بە هۆی ئەم ڕێکخستنەوە بەرژەوەندییەکی هاوبەش دێتە ئاراوە و، هەست کردن بە ئەرک و بەرپرسیاریەتیە نەتەوەییەکان (دەوڵەت _نەتەوەکان) ڕاستیی ئەم لێکدانەوە سیاسییە دەسەلمێنن. لانیکەم ڕێکخستنی سیاسی بەو ڕادەیە لە پێکهێنانی شوناسی نەتەوەییدا کاریگەرە کە ئەتنۆسیتە لە پێکهێنانی دەوڵەتدا هەیەتی. لێکدانەوەی دووهەم؛ خوێندنەوەیەکی کولتوورییە. هێندێک لە نووسەرانی ئەڵمانیا وەکوو نۆڤالیس و فیختە فاکتەری کولتوور و زمان بە هۆکاری سەرەکیی پێکهێنانی نەتەوە دادەنێن . بە ڕای ئەوان مرۆڤایەتیی بە پێی سروشت لە نێوان نەتەوەکاندا، دابەش بووە.

تایبەتمەندی سەرەکیی شوناسی نەتەوەیی، زمانە کە نەریت، ڕەمز، ئەفسانە، مێژوو و کلتووری هاوبەشی ئەتنۆسەکان لە خۆ دەگرێ. بە واتایەکی دیکە بەپێی ئەم لێکدانەوە شوناسی نەتەوەیی، سروشتی، زاتی و بەردەوامە. دیارە لێرەدا "نەتەوە" لەگەڵ "ئەتنۆس"دا تێکەڵاو بووە ورەنگە لە ناو دەوڵەتێکدا، چەند "نەتەوە" هەبن.

لێکدانەوەی سێهەم، خوێندنەوەیەکی تێر و تەسەلتری ئەم چەمکەیە. کە لە ئاستی دوو تێۆری سیاسی و کولتووریی تێدەپەڕێ و لە هەمان حاڵدا تایبەتمەندیی هەردووکیشیان پێکەوە دەپارێزێ. بە پێی لێکدانەوەی سێهەم تایبەتمەندی نەتەوە لە شوناسی ئەتنی و کولتوورییەکەیدا نیە، بۆ گەشەکردنی شوناسی ئەتنی، تایبەتمەندییە کولتوورییەکان پێویستن، بەڵام شوناسی نەتەوەیی شتێکی زیاتر لە شوناسی ئەتنی ـــ کولتوورییە و هەبوونی چەند ئەتنۆسیتەی جیاواز لە ناو دەوڵەتێکدا نابێ ببێتە ئاستەنگ لە بەرامبەر پێکهێنانی شوناسی نەتەوەییدا. لە لێکدانەوەی کولتووریی

نەتەوەکاندا زۆر لە فاکتەرە کاریگەرە مێژووییەکان لە پێکهێنانی نەتەوەکاندا لە بەر چاو ناگیردرێن. ئەرنێست رۆنان، نووسەری فەڕەنسی لەم روانگەوە؛ لێکدانەوەی ئەتنی ـ کولتووریی دەداتە بەر رەخنە. بەڕای ئەو هۆکاری پێکهێنانی شوناسی نەتەوەیی، مێژوویەکی هاوبەشی ژان و ئازارە گشتیەکان و بیرەوەرییە هاوبەشە مێژووییەکانە. کەواتە شوناسی نەتەوەیی تەنیا بە پێی، ئەتنۆسیتە، زمان، ولاّتی هاوبەش و دەوڵەت پێک نایا. لە لایەکی دیکەوە مەرجی بنەڕەتیی پێکهاتنی شوناسی نەتەوەیی سەرهەڵدانی ئیرادەی پێکەوە ژیان کردنە. ئەگەر مێژوو و بیرەوەرییە گشتیەکان و ئیرادەی هاوبەشی خەڵک لە ئارادا بێ، سەرەڕای جیاوازییە کولتووریی، ئەتنی و زمانیەکان، نەتەوەیەکی یەکگرتوو پێک دێ.

## مودێرنیزم Modernism

بە پرۆسەی رێکخستن و گونجاندنی دامودەزگا نەریتیەکان لەگەڵ پێشکەوتنی زانست و شاستانیەتدا دەگوترێ، بە بڕوای ژاک برێک، توێژەرێکی، فەڕەنسی "نەمودێرنیزمێکی بێ بنەما و بنچینە و نە نەریت و پاراستنی نەریتێک کە بەکەڵکی داهاتوو نایا".

## مودێرنیتە Modernity (Modernité)

دژایەتیی نێوان کۆن و نوێیە کە لە دوای سەدەکانی ناوەراست یان لە رێنێسانسەوە دەستی پێکردووە و لە بنەڕەتدا چەمکێکە کە لە زانست، تەکنەلۆجیا، فەلسەفە، هونەر، بیناسازی و بابەتی هاوشێوەی ئەمانەدا دەردەکەوێ. مودێرنیزم و مودێرنیتە جیاوازن. مودێرنیزم ئاسەواری دەرەوەی شارستانیەتی رۆژئاوایە، مودێرنیتە؛ توخمە دەروونیە هزری و فەلسەفیەکانی شارستانیەتی رۆژئاوایە و خاوەنی کۆمەڵێک چەمکی بنەڕەتیە کە پێوەندییان بەیەکەوە هەیە، بۆوێنە عەقل کە یاسا و دەوڵەتی مودێرنی پێ دارێژراوە.

## میترۆپۆل Métropole

میترۆپۆل لە زاراوەی یۆنانی Meter بە واتای دایک و Polis بە واتای شار وەرگیراوە. لە یۆنانی کۆندا، لە بەرامبەر شارە کۆلۆنیەکاندا، بەو شارانەی کە لە بنەڕەتدا، یۆنانی بوون، میترۆپۆل یان شاری دایکیان (دایکی شار) پێ دەگوترا. بۆ وێنە شاری ئەسینا لە بەرامبەر شارە کۆلۆنی نشینەکانی لێواری دەریای رەش، میترۆپۆل بوو. ئەم زاراوە هەروەها بە شارێک

دەگوترێ کە ناوەندی چالاکیەکی تایبەتی بێ یان ناوەندی قەشەی گەورە و دامودەزگا ئیدارییەکەی قەشە بێ. ئەمرۆکە لە زانستە کۆمەڵایەتیەکاندا، میترۆپۆل بەو شارانە دەگوترێ کە ڕێژەی دانیشتوانەکانیان دەگاتە زیاتر لە ٧میلیۆن کەس. لە قامووسی سیاسیدا میترۆپۆل بە وڵاتێکی ئەمپریالیستی دەگوترێ کە خاوەنی کۆلۆنیە. ئەم مۆنۆپۆلانە بە یارمەتیی هێزە دەوڵەمەندە ماددی و پیشەسازییەکان، قازانجێکی زۆر لە ڕاورووت و چەوسانەوەی کۆلۆنیەکان وەدەست دێنن. سەرمایە گوزاری میترۆپۆلەکان لە کۆلۆنیەکاندا بەهۆی هێزی کاری هەرزان، دەوڵەمەندیی سەرچاوە سروشتیەکان و هەرزان بوونی کەرەسە خاوەکان، قازانجێکی زۆر پاشەکەوت دەکا. بە هۆی تاڵانکردنی ئاشکرای ئەم وڵاتانە و سامانە نیشتمانیەکان، وڵاتانی کۆلۆنی دەبنە بەرهەمهێنی کەرەسە خاوەکانی میترۆپۆل.

## نیمچە دێموکراسی *Quasi - Dem'cracies*

نیمچەدێموکراسیەکان لە ولاَتانی لە حاڵی پەرەسەندن دا پێکهاتوون. لەم سیستەمانەدا ژیانی سیاسی نە بە تەواوەتیی دێموکراتیک و نەبە تەواوەتیی تۆتالیتێرە. ئەم ولاَتانە گیرۆدەی پرۆسەی مودێرنیزاسیۆن و پەرە پێدان و تێپەرین لە نەریتەوە بۆ مۆدێرنیتەن و دەرئەنجامەکانی کێشەی نێوان نەریت و مودێرنیتم پێشگیری لە دامەزراندنی دێموکراسی و تۆتالیتاریزم دەکا. هەروەها پێکهاتەی نەریتی کۆمەڵگا و کولتووری نەریتی هەڵوەشاوە و پرش وبلاَوبوو ناهێڵێ سیستەمێکی سیاسی تەواو مۆدێرن_ چ دێموکراسی و چ توتالیتێر_ دامەزرێ. ئەم ولاَتانە سێ شۆرشی مێژووییان کردۆتە نموونە بۆ رێکخستنی سیاسی و کۆمەلاَیەتی ولاَتەکانیان: شۆرشی فەرەنسە، شۆرشی پیشەسازی بەریتانیا و شۆرشی رووسیا یان رژێمی یەکیەتیی سۆڤیەت. لە نموونەی سیاسی فەرەنسادا، بیرۆکەی وەکوو: مەشرووتەخوازی، دەستوور، سەرەوەی نەتەوەیی، ناسیۆنالیزم و دێموکراسی وەرگیراوە. هەمووی ئەم چەمکانە لەگەڵ سیستەمە سیاسیە خۆجەیەکان (لۆکالی) لە دژایەتیدا بوون هەرچەندە هەرکام لەم سیستەمانە لە رووی ناچارییەوە هێندێک لەم بیرۆکانەیان وەرگرتن و لێکدانێکی سەیروسەمەرەی هزری و سیاسییان هێنایە ئاراوە.

شۆرشی پیشەسازی بۆتە نموونە بۆ رێکخستنی ئابووری زۆربەی وڵاَتان بۆ بە پیشەسازی بوون، گەشەی ئابووری و مودێرنیزاسیۆن. ئاشکرایە کە لێکدانی بارودۆخ و هەلومەرجی ئابووری

شۆرشی پیشەسازی و هەلومەرجی سیاسی شۆرشی فەرەنسا، لە بارودۆخی ولآتانی لە حالّی پەرەسەندن دا زۆر ئەستەمە. شۆرشی رووسیا بە پێداگرتن لەسەر دەولەتی بەهێزو قەبەو سانترالیست، بەپێچەوانەی شۆرشی فەرەنسا بوو. کێشەی سەرەکی زۆربەی ولآتانی لە حالّی پەرەسەندن دا، پێکهێنانی دەولەتی مۆدێرن ( رەها، بورۆکراتی ونوێخواز) بووە. هەرلەبەر ئەمەش نموونەی شۆرشی رووسیا لەم ولآتانەدا دانەدەمەزرا.

بە گشتی دامەزراندنی دیموکراسی لە ولآتانی لە حالّی پەرەسەندن دا، تووشی کۆسپ و ئاستەنگی گەورە دەبێتەوە. هێندێک لەو ئاستەنگانە بریتین لە: زالّبوونی گرووپە ئاریستۆکرات و کۆنەکان کە دیموکراسی بە دژی بەرژەوەندیەکان خۆیان دەزانن، زالّبوونی بەها رەها کۆنەکان و پتەو بوونی نەریتەکان، درێژەی دەسەلآتی دامەزراوە کۆنەکان کە دژی دیموکراسین وەکوو دەربارەکان، دامەزراوە ئاینیە بە هێزەکان و سوپاکان، سەرهەلّنەدانی چینی ناوەراستی بازرگانی و پیشەسازی کە ئەمانە زیاتر حەز لە ئاشتی و پێکەوە ژیان و دیموکراسی دەکەن. قوولّتر بوونی کەلێنە ئەتنی، ئایینی و کولتوورییەکان کە پیش بەریککەوتن و لێک تێگەیشتنی کۆمەلآیەتیی دەگرن، بەپیشەسازی بوون و ئەو پالّەپەستۆیانەی بەهۆی مۆدێرنیزاسیۆن هاتوونە ئاراوە. لە لایەکی دیکەوە بوار بۆ دامەزراندنی حکوومەتە دەسەلآتخوازەکانیش رەخساوە. لە ئاکامی تێکەلآوبوونی ئەم هۆکارانەدا، نیمچە دیموکراسی گەلێکی ناجێگیرتوو لە ولآتانی لە حالّی پەرە سەندن دا سەریان هەلّداوە کە لە نێوان ئوتوکراسی، ئۆرلیگاریشی، پۆپۆلیزم، دیموکراسی فۆرمالیتە یان نیمچە دیموکراسی دا لە هەلّبەزدابەز دان.

## نیمچە دەولّەتەکان *Quasi States*

بۆل (Boll) ڤاتسۆن لە کتێبی " پەرەسەندنی کۆمەلگای نێو دەولەتیی، ( The Expansion International Society، ١٩٨٤ ) لەم چەمکە کەلکی وەرگرت و پاشان روبێرت ئێچ.جەکسۆن( Robert.H.Jack Son ١٩٩٠) پەرەی بەم چەمکەدا. ئەم زاراوەیە ئاماژە بەو دەولّەتانەی ئاسیا، ئەفەریقیاو ئۆقیانوسیە دەکا کە لەەو بەپێش لە ژێر دەسەلآتی کۆلۆنیالیزمدا بوون و بەهۆی پرۆسەی دەرکردنی (سرینەوەی) کۆلۆنیالیزم، سەربەخۆییەکی یاساییان

وەرگرتووە، بەلاّم زۆر لە تایبەتمەندییەکانی سەربەخۆیی تاقیکراوەی دەولەتێکیان نیە. ئەم دەولەتانە خاوەنی هەموو تایبەتمەندییەکی دەولەتێکی سەربەخۆی خاوەن سەروەریین. بەتایبەت لە بواری ئەو ماف و بەرپرسیارەتیەی کە بەهۆی ئەندامەتیی لە نێو کۆمەلگای نێودەولەتییدا هەیانە، بەلاّم ئەم دەولەتانە خاوەنی ئیرادەی سیاسی، ئۆتۆریتەی رێکخراو و دەسەلاّتی رێکخراو بۆ پشتیوانیکردن لە مافی مرۆڤ یان بۆ پێکهێنانی خوشگوزەرانی ئابووری ــ کۆمەلاّیەتی.( Socio- Economic Welfare) نین. لە راستی دا نیمچەدەولەتەکان، تەنیا بە ناو دەولەتن. ئەم دەولەتانە سەرەرای ئەوەی بە پێی یاساورێساکانی "تەکووزی"ی نوێی نێودەولەتی کە لە دوای ١٩٤٥ەوە دامەزراوەن، نالێهاتوو، ناجێگیرو نامەشرووعن، دەتوانن درێژە بە مانەوەی خۆیان بدەن. ئەم دەولەتانە بە هۆی یاسا نێودەولەتیە نوێکانی وەکوو: یاساکانی دژە کۆلۆنیالیستی، مافی دیاریکردنی چارەنووس، دەولەتەکانی ژێردەسەلاّتی کۆلۆنیالیزمی پێشوو و سەروەری رەگەزی، تووشی چارەنووسی هەمیشەیی دەولەتە بێهێزە هەلوەشاوەکان نابنەوە.

## Protest

### *نارەزایەتی رەسمی*

راگەیانراوێکی رەسمی حکوومەتێک بە حکوومەتێکی دیکەیە کە ئەو دەولەتە لە رێگای ئەو راگەیەنراوەوە، نارەزایەتی خۆی بەرامبەر بە کردەوەیەک کە دەولەتی بەرامبەر ئەنجامی داوە یان دەیهەوێ ئەنجامی بدا، دەردەبرێ و، مل نەدانی خۆی لە بەرامبەر ئەو کردەوەو هەروەها ئامادەبوونی خۆی بۆ بەرەنگاربوونەوە لەگەلّ دەرئەنجامەکانی ئەو کردەوە رادەگەیەنێ، هەرجۆرە ئەگەری پێشێلکارییەکی مافەکانی خۆی لە لایەن دەولەتی بەرامبەرەوە بە نایاسایی دەزانێ.

ئامانجی نارەزایەتی رەسمی بەرەنگاربوونەوەی سیاسی لەگەلّ کردەویەک دایە کە لە لایەن دەولەتی هێرشبەرەوە ئەنجام دراوەو، مافەکانی ئەو دەولەتەی کە نارەزایەتی دەربریوە، پێشێل کردووە.

## New Deal

### *نیۆدیل*

زاراوەیەکە کە ئاماژە بە سیاسەتی فرانکلین رۆزڤەلت (سەرۆک کۆماری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە ١٩٣٣ــ ١٩٤٥) دەکا. رۆزڤەلت ئەم سیاسەتەی لە سالّی ١٩٣٣دا بۆ چارەسەری کێشە ئابوورییەکانی ولاّت دارشت. ئەو چارەسەرەییە ئابوورییانە تارادەیەک کاریگەری ئەو دابەزینە ئابوورییەی کە لە سالّی ١٩٢٩ەوە دەستی پێکردبوو، کەمکردەوە، بەلاّم بە

تەواوەتیی سەرکەوتوو نەبوو. بۆیە لە ئاکامدا لە ساڵی ١٩٤٠دا، ئابووری ئەمەریکا جارێکی دیکە وەکوو ئابووری سەردەمی شەڕی لێهاتەوە. ئەم چارەسەرییانە بووژانەوەی بواری پیشەسازی، یارمەتیدانی بواری کشتوکاڵ، نەهیشتنی ترس و نیگەرانی لە بێکاری راستەوخۆ، کۆنترۆلکردنی کۆمپانیا گەورەکانی قازانجی گشتی، خانەنشین کردنی پیرەکان و بیمەی بیکاری لە خۆدەگرت.

### نەهیلیزم — *Nihilism*

نەهیلیزم لە وشەی لاتینی Nihil بە واتای هیچ وەرگیراوە. ئەم وشە هاوواتای وشەی Rien لە زمانی فەرەنسی و Nothing لە زمانی ئینگلیزی دایە. نەهیلیزم بیروباوەرێکە کە ئەوشتانەی بەسەر بیرو هزری مرۆڤدا دەسەپێن رەت دەکاتەوە. ئەم رەتکردنەوە هەم لە بواری فەلسەفی واتە بۆ چیەکان و چۆنیەتەکان دانی پێدانراوە و هەم لەروانگە کۆمەڵایەتیەکانەوە وئەو رێککەوتننامە داسەپاوانە دەگرێتەوە کەلە بنەڕەت دا نەهیلیزم رەتیان دەکاتەوە.

فەلسەفەی نەهیلیزم لە یۆنانی کۆن و لە سەردەمی پێش لە سوقراتیشدا هەبووە و رەتکردنەوەی بوون و رۆح و سامان و یاسا و ماف و هەموو شتەکانی تری دەگرتەوە. بەڵام لە سەدە هاوچەرخەکاندا لە رووسیای تیزاریدا بوو بە نیوی رێبازێکی کۆمەڵایەتیی کە دەسەڵاتی دەوڵەت و نادەوڵەتیی رەت دەکردەوە و پاشان بوو بە بیرێکی شۆڕشگێرانە کە ئامانجەکەی دارماندنی هەموو دامودەزگا کۆمەڵایەتیەکانی وڵات بە دەوڵەت وشتەکانی دیکەشەوە بوو. نەهیلیزم بە واتا بەرفراوانەکەی هەموو ئەو کردەوە یان پروپاگەندانە دەگرێتەوە کە تێکەڵاوی تۆرەیی و سەرهەڵدان و توندوتیژین. لە رووسیای پاش ساڵی ١٨٧٨ ئەم زاراوە سەبارەت بە ئانارشی و تیرۆریستەکان کەڵکی لێ وەردەگیردراو هێندێک جاریش بەواتای لە خۆ بوردووی و بایەخ دان بە جیهانی ماددیش کەڵکی لێ وەردەگیردرێ. باکونین دامەزرێنەری نەهیلیزم لە رووسیادایە (١٨٧٦ـ ١٨١٤).

### نیپۆتیزم / خزم خزمێنە — *Nepotism*

لە وشەی ئیتالیNepotismo بە واتای "لایەنگری کردن لە ئامۆزاکان" وەرگیراوە. سەرچاوە کۆنترەکانی ئەم وشەیە دەگەڕێتەوە بۆ وشەی لاتینی Népos یانNepotis بەواتای "نەوە".

لە سیاسەتدا نیپۆتیزم بە واتای ئەوەیە کە حزم و نزیکانی خۆت دامەزرێنی و کاریان پێ بسپێری.
یان ئیمتیازیان پێ بدەی یان پشتیوانی لە حزم و کەسەکانت بکەی بۆ وەرگرتنی پۆستێکی سیاسی.

## Nasserism

### ناسریزم

ناسریزم، ئاماژە بە ڕێبازە حکومەتیەکانی جەمال عەبدولناسر، سەرۆک کۆماری پێشووی میسر دەکا. ناسریزم لایەنی جیاوازی هەن. بە لای دەوڵەتانی ڕۆژئاواوە، ناسریزم بریتیە لە ڕێبازێکی دژە چەوسانەوەی رادیکاڵ، شۆڕشێکی داگیرکارانە لە جیهانی عەرەب و ئەفریقیا و هەوڵێک بۆ پێکهێنانی ئیمپراتۆرییەکی عەرەبیە. بەلای هێزە کۆنەپەرستەکانی وڵاتە عەرەبیەکان، ناسریزم پیلانێکە بۆ ڕووخاندنی رژێمە عەرەبەکان و بۆ دامەزراندنی رژێمێکی سۆسیالیستی یان کۆمۆنیستی. بەلای هێزە عەربە شۆڕشگێرەکان، ناسریزم سەرچاوەی هیوایە، چوونکە ئەم هێزانە لەسەر ئەوە کۆکن کە ئەم ڕێبازە یەکێک لەو ڕێبازە دەگمەنانەیە کە ڕەسەنایەتیەکی شۆڕشگێرانەی هەیە و لە هێندێک بواردا سەرچاوەی سەرلێشواویشە، چوونکە پێیان وایە وەڵامی بەجێ بە داواکارییەکانیان ناداتەوە. هێندێک لە شارەزایانی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست، ناسریزم بە ئاراستەیەکی سەربازی و تەنانەت میلیتارسیتیشی دادەنێن.

لە بەرامبەردا، نەیارانی ئەم تیۆرە پێیانوایە کە لەساڵی ١٩٥٢ دا، ڕێکخراوێکی سیاسی بە نێوی کومیتەی ئەفسەرە ئازادەکان دەسەڵاتی گرتەدەست نەک سوپا. ئامانجی سەرەتایی ئەم کومیتەش بریتی بوو لە دامەزراندنی حکومەتێکی جەماوەری لە شێوەی کۆماری بەکەلک وەرگرتن لە هێزی شورشگێرانە و لە هەمان حاڵدا سڕینەوەی دەسەڵاتی ئابووری، سیاسی و کۆمەڵایەتیی دەرەبەگەکان و وەدەرنانی بەریتانیەکان لە خاکی میسر ئامانجی دوایی ئەم کومیتە بوو. ئەم دوو بەڵگە ئەو ڕەوتە دەردەخەن کە ناسریزم لە قۆناغی کردەوە هەتا قۆناغی ئایدۆلۆژی پێیاندا تێپەڕیوە:

١ـ نامیلکەی "فەلسەفەی شۆڕش " کە لە سەرەتاکانی شۆرش لە لایەن ناسرەوە نووسراوە .

٢ـ بەڵێننامەی نیشتمانی کە لە ٣٠ حوزیرانی ١٩٦٢ بەپێی گەڵاڵەی پێشنیاری ناسر، لە لایەن کۆنگرەی نیشتمانیی هێزە جەماوەرییەکانی کۆماری یەکگرتووی عەرەبی پەسند کراو ڕاگەیەنرا. ناسریزم لە بەرەنگاری کردنەوە لەگەڵ حیزبی بەعسدا، چەند قۆناغی جیاوازی لە هاوکاری سیاسییەوە بگرە هەتا مشتومڕی گرژو ئاڵۆزی تێپەڕاندووە:

بەعسی سووریا لە وتوویژەکانی ١٤ی ئازار تا ١٧ی نیسانی ١٩٦٣، لایەنگری ئەم بیروبۆچوونە بوو کە: " شۆڕشی میسر دەسکەوتی تاقمێکی هەڵبژاردە (ئیلیت)یە کە بیروبۆچوونەکانی خۆی سەپاندووە ولەسەرەتاشدا لە لایەن جەماوەرەوە پشتیوانی لێ نەکراوە و جگە لە کۆنەپەرستان، هیچ هێزێکی دیکە لە دژیان رانەوەستاوە. لە حاڵێکدا کە لە سووریادا هەموو شتێک لەگەلەوە سەرچاوە دەگرێ و هەر ئەمەش خاڵی جیاکەرەوەی نێوان دوو بزووتنەوەیە کەیەکیان لە سەرەوەڕا و ئەوی دیکەشیان لە خوارەوەڕا رێبەرایەتی دەکرێ کە بۆتە هۆی لێک تێ نەگەیشتن لە یەکتر، لە راستیدا بەعس لەوە دەترسا کە شۆڕشی عەرەب بچێتە ژێر کاریگەری ئیداری میسرەوە. لە بەرامبەردا ناسریزمیش پێیوابوو کە بەعس هیچ بنەمایەکی تیۆری گشتیی نیە کە ئایدۆلۆژی بەعس روون بکاتەوە و لە راستیدا بەعس شتێکی زیاتر لە دروشمێک نیە: یەکیەتیی، ئازادی و سۆسیالیزم.

## نازیسم *Nazism*

زاراوەیەکە کە زیاتر بۆ تیۆرەکان و شێوازی حکوومەتیی ئەڵمانیا لە سەردەمی ئادۆڵف هیتلەر کەڵکی لێ وەدەگیردرێ و، هێندێک جاریش بە هاوواتای فاشیزم و تیۆرە هاوشێوەکانی لە وڵاتانی دیکەی جیهان کەڵکی لێ وەردەگرن. زاراوەی نازی کورتکراوەی National ( Sozialialistische"Deutsche Arbeiter Partie ) (حیزبی ناسیۆنال سۆسیالیستی کرێکارانی ئەڵمانیا)یە. ئەم حیزبە کە لە دوای شەڕی یەکەمیی جیهانی دامەزرا، لە ساڵەکانی ١٩٣٣ تا ١٩٤٥ دەسەڵاتی ئەڵمانیای بەدەستەوە بوو.

فەلسەفەی نازیسم:

بنەما تیۆرییەکانی ئەم حیزبە تێکەڵاوێک لە فاشیزمی ئیتالیا، بیروڕای ناسیۆنالیستی کۆنی ئەڵمانیا و تیۆرییە رەگەزەییەکان و نەریتەکانی سەربازی پرۆس بوو. بەرنامەی ئەم بزاڤە پێکهێنانی ئەڵمانێکی بەهێزی میلیتاریستی بوو کە سنوورەکانی پەرە پێبدا و یەکیەتیی نیشتمانی ناوچە ئەڵمانی نشینەکان دابین بکا. شێوازی حکومەتی نازیسم دیکتاتۆری تۆتالیتاریزم و کەڵک وەرگرتن لە پروپاگەندە و

سەپاندنی زۆر بوو. ئەم حیزبە لە ساڵی ۱۹۲۰ لە میونیخدا دامەزرا. ئەم حیزبە لە ۲۵ شوباتی ۱۹۲۵دا، بەرنامە ۲۵ ماددەییەکەی خۆی بەم شێوە راگەیاند:

۱ــ ئێمە خوازیاری یەکیەتیی هەموو خەڵکی ئەڵمانیاین، بەمەبەستی پێکهێنانی ئەڵمانێکی مەزن لەسەر بنەمای خودموختاری نەتەوەکان.

۲ــ ئێمە خوازیاری مافی یەکسان بۆ نەتەوەی ئەڵمان و نەتەوەکانی دیکە لە بواری پێوەندی و سات و سەودای دوولایەنە و هەروەها هەڵوەشانەوەی رێککەوتننامەکانی ڤێرسای وسەن ژێرمەنین.

۳ــ ئیمە خوازیاری خاک و وڵاتێک لە پێناوی بەرێوە چوون و راهێنانی خەڵکی خۆمان و هەروەها شوێنێکیش بۆ نیشتەجێ کردنی دانیشتوانی نەتەوەی ئەڵمانیاین.

٤ــ هیچ کەسێک، جگە لەوانەی کە نەتەوەی ئەڵمانن، جگەلەوانەی کە خوێنی ئەڵمانی لە دەمارەکانیان دایە، بێ گوێدانە بیروبۆچوونەکانیان، هاوولاّتی ئەم ولاّتە نین. کەواتە هیچ جوولەکەیەک ناتوانێ ئەندامێکی ئەم نەتەوە بێ.

٥ــ هەموو ئەو کەسانەی کە بە هاوولاّتی ئەڵمانیا دانانرێن، دەتوانن وەکوو میوان لەم ولاّتەدا بمێننەوە. یاسای تایبەت بە بیانیەکان، سەبارەت بە مانە بەرێوە دەچێ.

٦ــ مافی دەنگدان بە یاساکان یان هەڵبژاردنی رێبەران، تەنیا بە هاوولاّتیانی ئەم ولاّتە دەدرێ. بۆیە لەم رێگایەوە داوا دەکەین هەموو ئەو کەسانەی کە لە شوێنە جیاوازەکان کاریان پێ دەسپێردرێ، چ لەرایخ و چ لە شوێنە چکۆلەکانی دیکەشدا، هاوولاّتی ئەڵمانیا بن، ئێمە لەگەڵ شێوازی هەڵەو گەندەڵیی پەرلەمان سەبارەت بە ئەسپاردنی پۆستەکان بە هەموو کەسەکان کە تەنیا لە روانگەی بەرژەوەندییە حیزبیەکان و بێ گوێدانە کەسایەتی و لێهاتوویی کەسەکانە، دژایەتی دەکەین .

۷ــ داوا دەکەین کە دەسەلاّتداران، خەریکی گرنگترین ئەرکی خۆیان کە بەهێزکردن و باشترکردنی پیشەسازییەکان و دابینکردنی بژێوی هاوولاّتیانی ئەم ولاّتەیە،بن. لە حاڵێکدا کە بژێوی ژیانی دانیشتوانی ئەم ولاّتە دابین نەکرێ، هاوولاّتیانی بیانی وەدەر دەنرێن.

۸ــ لەمە بەدواوە دەبێ پێش بە کۆچی هەموو کەسانی بیانی بۆ ناو خاکی ئەڵمانیا بگیردرێ. داوا دەکەین کە هەموو ئەوانەی خەڵکی ئەڵمانیا نین و لە رێکەوتی ۲ی مانگی ئابی ۱۹۱٤ەوە

هاتوونەتە ئەم وڵاتەوە، دەستبەجێ لەرایخی ئەڵمانیا وەدەربنرێن و خاکی ئەم وڵاتە بە جێ بێڵن.

٩ـ داوا دەکەین کە هەموو هاووڵاتیانی ئەم وڵاتە لە بواری ماف و ئەرکەوە، مافی یەکسانیان هەبێ.

١٠ـ کارکردن و تێکوشانی فیکری و جەستەیی، دەبێ یەکەمین ئەرکی هاووڵاتیانی ئەم وڵاتەبێ و دەبێ کار و تێکۆشانی کەسەکانیش لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی ئەڵمانیادا بگونجێ و لە پێناوی باشترکردن و خۆشگوزەرانی ژیانی ئەم نەتەوەدابێ.

١١ـ هەڵوەشانەوەی هەموو ئەو داهاتانەی کە لە رێگای کارو تێکۆشانەوە وەدەست نەهاتوون.

١٢ـ بەسەرنجدان بەوەی کە لە هەمووشەڕێکدا، ژمارەیەکی زۆر لە کەسەکانی نەتەوە دەبنە قوربانی شەڕ، پێش بە دەوڵەمەندبوونی کەسەکان لەکاتی شەڕدا دەگرین و ئەم کارە بە جینایەتێک لە دژی نەتەوە دادەنێین. داوادەکەین هەموو ئەو سامانانەی لەم رێگایەوە وەدەست هاتوون، بەبێ کەمترین بەزەیی پێداهاتنەوە، دەستیان بەسەردابگیردرێ.

١٣ـ ئیمە خوازیاری خۆماڵیکردنی هەموو ئەو شتانەین کە تائیستاش بە شێوەی تراست بەرێوە دەچن.

١٤ـ ئێمە خوازیاری دابەشکردنی قازانجی بازرگانیی لە ناو خەڵک داین.

١٥ـ ئێمە خوازیاری بەرنامەیەکی چروپڕ بۆ قۆناغی پیری هاووڵاتیانی ئەڵمانیانن.

١٦ـ ئێمە خوازیاری پێکهێنان و مانەوەی چینێکی خۆشگوزەران و تەندروست، بە سۆسیالیستی کردنی دەستبەجێی فرۆشگا گەورەکان و بە ئیجارەدانی ئەم فرۆشگایانە بەنرخێکی کەم بە بازرگانە مامناوەندییەکان و بە داواداچوون بە دوای ئەوکەسە مامناوەندییانە داین کە خۆراک بڵاو دەکەنەوە.

١٧ـ ئێمە خوازیاری چاکسازی لە زەوی وزار داین کە لەگەڵ پێویستیەکانی نەتەوەدا بگونجێ و هەروەها داوای پەسندکردنی یاسایەک سەبارەت بەدەستبەسەرداگرتنی خێرای ئەو زەوی و زارانە دەکەین، لە پێناوی بەرژەوەندی گشتیدا. خوازیاری هەڵوەشانەوەی قازانجی قەرزی زەوی وزار و خۆبواردن لەهەر لێکۆڵینەوەیەکی تیۆری لەسەر ئەو خاڵانەین.

١٨ـ ئیمە خوازیاری بەرەنگارییەکی شێلگیرانە لە دژی ئەو کەسانەین کە بە کردەوەکانیان زیان لە بەرژەوەندی گشتی دەدەن، هەموو ئەوانەی کە بە کردەوەکانیان بەرژەوەندییەکانی نەتەوە دەخەنە مەترسیەوە، رباخۆرەکان و هەلپەرەستەکان، ئەمانە دەبێ بەبێ سەرنجدانە رەگەز و هاوولاتی بوون، بە مەرگ مەحکووم بکرین.

١٩ـ ئێمە خوازیاری دامەزراندنی سیستەمێکی یاسای ئەلمانی لەولاٹ داین و دەبێ یاساکانی رۆم و ئایینی کاتولیکی هەلوەشێنەوە.

٢٠ـ بەمەبەستی گەشەکردنی توانایی و هەولەکانی هەر هاوولاتیەکی ئەلمانیا، دەبێ دەرفەت و بوار بۆ خوێندن لە ئاستی بالادا برەخستێ. لە سەر دەولەتە کە نوێکردنەوەی تەواوەتیی سیستەمی پەروەردەی نیشتمانی رەچاو بکا و قۆناغەکانی خوێندن لە هەموو دامەزراوە پەروەروەییەکان بەپێی پێداویستیەکان و ژیانی رۆژانەی خەلک دیاری بکا. داوا دەکەین کە منالە بەهرەدارەکانی بنەمالە هەژارەکان —— بێ سەرنجدانە چینی کۆمەلایەتی ـ لەسەر خەرجی دەولەت خەریکی خوێندن بن.

٢١ـ دەولەت دەبێ لە رێگای چاوەدێریکردنی دایکان و منالەکانیان، بە قەدەغەکردنی کار بۆ منالان، بە سەپاندنی بەزۆری ژیمناستیک و وەرزەشەکانی دیکە و پشتیوانی کردن لەو یانانەی کە لە بواری راهێنانی هێزی فکروجەستەی لاواندا تێدەکۆشن، رادەی سلامەتیی نەتەوە بباتە سەر.

٢٢ـئیمەخوازیاری هەلوەشانەوەی سوپای بەکرێگیراووپێکهێنانی سوپایەکی نەتەوەیین.

٢٣ـئێمە خوازیاری بەرەنگاریکردنەوەی یاسایی لەدژی بلاوکردنەوەی بە بەرنامەی سیاسی شتی درۆ و وتەشەنەکردنی لە ناو چاپەمەنیەکان داین. داوا دەکەین بە مەبەستی پێکهێنانی چاپەمەنیی نەتەوەیی،ئەم هەنگاوانە بنرێن:

الف ـهەموو سەرنووسەران و هاوکارەکانیان لە رۆژنامە ئەلمانی زمانەکاندا، دەبێ هاوولاتی ئەم ولاتە بن.

ب ـ هەر رۆژنامەیەک کە ئەلمانی نیە پێویستە، لە دەولەت داوای مۆلەتی بلاوکردنەوە بکا. ئەم رۆژنامانە نابێ بە زمانی ئەلمانی بلاو بکرێنەوە .

ج ـ یاسا دەبێ پێش بە دەستێوەردان و نفووزی ماددی ئەو کەسانەی کە ئەڵمانی نین، لە چاپەمەنیە ئەڵمانی زمانیەکاندا بگرێ. بە مەبەستی سزادانی سەرپێچی کەران، ئەم ڕۆژنامانە سەرکوت بکاو ئەوانەش کە ئەڵمانی نین وەدەریان نێ. دەبێ پێش بە بڵاوکردنەوەی ئەو بڵاوکراوانە بگیرێ کە خزمەت بە ئارامیی نیشتیمانی ناکەن. ئێمە خوازیاری بەداواداچوونی یاسایی بەدوای هەموو ئەو ڕێبازە هونەری و ئەدەبیانەین کە دەبنە هۆی دارمانی ژیانی ئەم نەتەوەو هەروەها ئەو دامودەزگایانەی کە لە دژی ئەم داواکاریانەی ئێمە رادەوەستن.

٢٤ ـ ئێمە خوازیاری ئازادیی هەموو گرووپە ئایینەکانی وڵاتین ـ بە مەرجێک کە نەبنە هەڕەشەو ڕاپەرین لە دژی ئەخلاقی رەگەزی ئەڵمانی ـ حیزب پشتیوانی لە مەسیحییەتی ڕاستەقینە دەکا. حیزب و نەتەوەی ئەڵمانیا، لەگەڵ ڕۆحی مەتریالیستی جوولەکەکاندا دژایەتی دەکەن.

٢٥ ـ بە مەبەستی جێبەجێکردنی ئەویاسایانەی کە لەم بەرنامەدا ئاماژەمان پێکردن، ئێمە خوازیاری پێکهێنانی بنکەیەکی بەهێز لە پەرلەمان و هەموو دامودەزگاکانی سەر بە ڕایخی ئەڵمانیاو هەروەها پێکهێنانی ئەنجوومەن بۆ چین و پیشە جیاوازەکانین.

ڕێبەرانی حیزب سوێند دەخۆن کە لە پێناو جێبەجێکردنی ئەم بەرنامەدا، هەموو هەوڵ و تواناییەکانیان وەگەڕ بخەن و ئەگەر پێویستیش بێ گیانی خۆیان بەخت بکەن ".

ئادۆڵف هیتلەر کە ڕێبەری حیزبی نازی بوو، لەساڵی ١٩٢٣دا لە دوای کودەتایەکی بێ ئەنجام کە بوو بە هۆی زیندانی کردنی هیتلەر، کتێبی "خەباتی من "ی لە بەندیخانەدا نووسی کە پاشان بوو بە کتێبی پیرۆزی نازییەکان. نازیسم کە بزوتنەوەیەک بوو بۆ ژیاندنەوەی گەورەیی ئەڵمانیاو سڕینەوەی ئاکامەکانی دۆڕانی ئەڵمانیا لە شەڕی یەکەمی جیهانیدا، لە خەباتی خۆی لە دژی کۆماری ڤەیمەر، سەربازەکانی پێشوو، ئەفسەرەکانی سوپا، چینە ناوەڕاستە زیان لێ کەووتوکانی هەڵاوسانی ئابووری ئەڵمانیاو ژمارەیەکی زۆر لە سەرمایەدارو خاوەن بانکەکانی بۆ لای خۆی ڕاکێشا. دروشمە ناسیۆنالیستیەکانی نازییەکان، هێزە بیانیەکان، کۆمونیستەکان، لیبراڵ دیموکراتەکان، کاتۆلیکەکان و بە تایبەتی جوولەکەکانی بە هۆکاری دۆڕانی ئەڵمانیا لە شەڕی یەکەمی جیهانی دادەناو ڕێککەوتننامەی "سووکایەتی پێکەری "ڤێرساوی و نەهامەتیەکانی ساڵەکانی ١٩٢٠ـ١٩٢٩ دادەنا.

حیزبی نازی تا هەڵبژاردنەکانی ١٩٣٠ گرنگیەکی ئەوتۆی نەبوو، بەڵام لە دوای سەرهەڵدانی قەیرانی ئابووری گەشەی کردو بوو بە گەورەترین، گەش بین ترین و دەمارگرژترین هێزی سیاسی ئەڵمانیا. لە دوای ئەوەی هیندینبۆرگ، سەرۆک کوماری ئەڵمانیا لە ساڵی ١٩٣٣دا، هیتلەری بە راوێژکاری ئەڵمانیا هەڵبژارد، هیتلەر لە ماوەی چەند مانگێکدا کۆماری ڤەیمەرو حیزبەکانی تری هەڵوەشاندەوەو حیزبی نازی بوو بە تاقانە حیزبی سیاسی ئەڵمانیا. رەخنەگرتن بە توندی قەدەغە کراو، نەیارەکان یان نێردرانە ئۆردوگاکانی کاری زۆرەملێ یان دوورخرانەوەو بەم شێوەیە تیۆرەکانی نازییەکان جێبەجێ کران.

سیاسەتی فرەخوازانەی نازییەکان بوو بە هۆی سەرهەڵدانی شەڕی دووهەمی جیهانی. حکومەتی نازی لە ساڵی ١٩٤٥ بە داگیرکردنی خاکی ئەڵمانیا لەلایەن هاوپەیمانەکانەوە رووخا و بەشێکی زۆر لە ئەندامانی سەرکردایەتیی ئەم حیزبە لە دادگای نۆرێنبێرگ بە تاوانی جینایەتی جەنگی و جینایەت لە دژی مرۆڤایەتیی دادگایی کران.

بنەما فەلسەفیەکانی نازیسم تێکەڵاوێک لەو تیۆرە جیاوازانەیە کە لە ماوەیەکی کەمدا پێکەوە گرێ دراون. گەورەترین بنەما کە نازیسم خستیە سەر فاشیزمی ئیتالیا، تیۆری زاڵبوونی رەگەزییە کە بەپێی ئەم تیۆرە رەگەزی ژێرمەن، رەگەزێکی بەرزەترەو دەبێ بە سەر رەگەزەکانی دیکەدا حکومەت بکاو هیتلەر بەمەی دەگووت "سیستەمی نوێی جیهانی". حیزبی سۆسیالیستی ئەڵمان لە راستیدا نە ناسیونالیست ونە سۆسیالیستیش بوو. چونکە لە روانگەی یەکەمدا بڕوای بە بەرزتربوونی رەگەزێک هەبوو، نەک بە بەرزتربوونی نەتەوەیەک و لە روانگەی دووهەمیشدا هیچ کات دەستی نەدایە خۆماڵیکردنی پیشەسازییەکان و تەنیا بە هۆی پێویستی سەربازی و شەڕەوە دەستی لەکاروباری ئابووری وەردەدا. ئایدۆلۆژی نازی، دەوڵەت بە دیاردەی سەربەخۆیی بەرزی دەسەڵاتی نیشتیمانی دەزانێ کە جیاوازە لە چاوەدێری و ئیرادەی تاکەکەسان . هیتلەر ئیرادەی بەرزی نەتەوەیی لە بڕیارەکانی "پێشەوا " دادەبینێتەوە کە خاوەنی دەسەڵاتی ئیرادە وبڕیاردان ولێهاتوویەکی بێ وێنەیە. بەم پێیە دیموکراسی لیبراڵیزم رەت دەکاتەوە و ئیرادەی تاک بە ئیرادەی دەوڵەتەوە دەبەستێتەوە. پەرە بە قارەمان پەروەری و پێداهەڵگوتن بە دەسەڵات و شەڕ و زاڵبوون دەدا و پێوەندی هەمەلایەنەی مرۆڤایەتی بە "شەڕی مانەوە" و "هەڵبژاردنی باشترینەکان" دەبەستێتەوە و ئاشتیی درێژخایەن بە هۆی گەندەڵیی دادەنێ. نازیسم بڕوای بە ناکۆکی چینایەتی نیە و نەتەوە بە

ئورگانیزمێکی یەکگرتوو دادەنێ کە لەگەڵ نەتەوە و ئەتنۆسەکانی دیکەدا لە شەڕ دایە. نازیسم کۆمۆنیزم بە دوژمنی پلە یەکی خۆی دادەنێ.

## ناسیۆنالیزمی عەرەب *Arab Nationalizm*

بە پێی ئەو لێکدانەوەی کە ئیسلام سەبارەت بە ناسیۆنالیزم هەیەتی،دەبی بڵێین کە ئەم چەمکە سیاسییە لەم یەک یان دوو سەدەی دواییدا هاتۆتە ناو وڵاتانی عەرەبییەوە. پێش سەرهەڵدانی ئیسلام، عەرەبەکان بە شێوەی هۆزە پەرتەوازەکان دەژیان و دوژمنی یەکتر بوون و خاوەن رۆحی یەکیەتیی وهەوڵی هاوبەش نەبوون وتەنیا سەرهەڵدانی ئیسلام بوو بە هۆی یەکیەتیی مەعنەوی ،ماددی وهزری لە ناو عەرەبەکاندا. لە ئیسلامدا نەتەوە لە سەر بنەمای هاوئاینییە، بۆیە شتێک بە نێوی ناسیۆنالیزمی عەرەب لە ئارادا نەبوو، بەڵکوو"امە"ی ئیسلامی هەبوو. هەڵبەت جارجارە هێندێک ئەتنۆسی سەر بەم ئایینە مەسەلەی نەتەوایەتیان هێناوەتە گورێ، بەڵام شتێکی ئەوتۆ نەبووەو لە چوارچێوەی ئایین نەترازاوە. بە هۆی لاوازی دەوڵەتی عوسمانیەوە (کە بە شێکی زۆری وڵاتانی عەرەبی سەر بەم ئیمپراتۆریە بوون ) رێگای دزەکردن و تەشەنە کردنی ئەورووپیەکان بۆ وڵاتانی عەرەبی خۆشتر بوو. یەکەمجار ناپلیۆن بوناپارت میسری داگیر کردو پاشانیش بەرەبەرە ناوچەی عەرەب نشینی رۆژهەڵاتی نێوەڕاست چووە ژێر کۆنترۆڵی بەریتانیاو فەڕەنسا. لە دوای شەڕی یەکەمی جیهانیەوە ئەم وڵاتانە لە نێوان بەریتانیاو فەڕەنسادا دابەش بوون. خەباتی سەربەخۆیی خوازانی عەرەب لەگەڵ داگیرکەرە بیانیەکان بۆ دامەزراندنی وڵاتە عەربیە سەربەخۆکان لەو کاتەوە دەستی پێکرد کە ناسیۆنالیزمی عەرەب، ناوی (سەرپەرستیاری عەرەبی) لە سەر دانرا.

جەمال عەبدولناسر، سەرۆک کۆماری میسر، دامەزرێنەری ناسیۆنالیزمی نوێی عەرەبیە. ناسر خوازیاری یەکیەتیی و رێککەوتنی هەموو وڵاتانی عەرەبی بۆ بەرەنگاریکردنەوە لەگەڵ ئیسرائیل و پشتیوانەکانی دابوو. هەوڵەکانی ناسر سەریان نەگرت، چوونکە یەکیەتیی دەوڵەتە عەرەبیەکان بەپێی ناسیۆنالیزم، چارەسەرێکی گونجاو نەبوو و لەم پێناوەدا یەکیەتی میسر و سوریا (کۆماری عەرەبی یەکگرتوو) دوو جار پێکهات و هەر دوو جارەکەش بە ئاکامێک نەگەیشت. هەوەها یەکیەتیی عەرەبەکان بە پێی ئایدۆلۆژی ئابووری و سیاسیش (حیزبی بەعس لە سووریا و لە عێراق دا)، هێچی لێ شین نەبۆوە.

## Mediation

### *نێوبژیوانی*

شێوەی چارەسەریی ئاشتیانەی کێشەیەکی نێودەوڵەتیی بە هۆی لایەنێکی سێهەمە کە بە تەئییدی لایەنەکانی کێشەکە، بە شێوەیەکی زیندوو و چالاک لە پرۆسەی وتووێژەکاندا بەشداری دەکا و سەبارەت بە مەرجەکانی چارەسەری کێشەکە، پێشنیار ئاراستە دەکا و بەگشتی هەوڵ دەدا کە کێشەی لایەنەکان چارەسەر بکا و دڵیان بداتەوە. نێوبژیوانی لەگەڵ" کەیخوایەتی"دا جیاوازی هەیە نێوبژیوانی نەک تەنیا دەبێتە هۆی پێوەندی لە نێوان لایەنەکاندا، بەڵکوو بە ئاراستەکردنی پێشنیاری راستەقینە ، چ لە کۆبوونەوە هاوبەشەکاندا و چ لە کۆبوونەو جیاجیاکاندا، راستەوخۆ هاوکاریان دەکا. لایەنەکان لە رووی یاساییەوە ناچار نین کە بریارەکانی نێوبژیوان جێبەجێ بکەن. نێوبژیوانی وەکوو کەیخوایەتی کردن نابێ بە هەوڵێکی نادۆستانە یان بە دەستێوردان لە کاروباری وڵاتێکی دیکە دابنرێ. نێوبژیوانی یاسایەکە کە لە کۆنفانسیۆنەکانی لاهە سەبارەت بە چارەسەری ئاشتیانەی کێشە نێودەوڵەتیەکان لە ساڵەکانی ١٨٩٩ و ١٩٠٧دا هاتە گۆڕێ. نێوبژیوانی دەکرێ وڵاتێکی سێهەم، کۆمەڵێک لە وڵاتان، ئۆرگان یان رێکخراوێکی نێودەوڵەتی یان تەنانەت کەسێک بێ.

پەنابردنە بەر نێوبژیوانی وەکوو چارەسەرێکی ئاشتیانەی کێشە نێودەوڵەتیەکان، کۆنفانسیۆنەکانی لاهە لە ساڵەکانی ١٨٩٩ و ١٩٠٧ دارێژرا و یاساکانی نێوبژیوانی کۆمەڵێک رێککەوتننامەی دیکەشی بەدواوە بووە، وەکوو: رێککەوتننامەی وڵاتانی ئەمەریکا سەبارەت بە کەیخوایەتی و نێوبژیوانی (١٩٣٦) و جارنامەی رێکخراوی وڵاتانی ئەمەریکی ( رێککەوتننامەی بوگۆتا ١٩٤٨). پێرەوپرۆگرامی نەتەوەیەکگرتووەکان، راشکاوانە ئاماژە بەنێوبژیوانی دەکا و وەکوو چارەسەرێکی ئاشتیانەی ئەوکێشانە سەیری نێوبژیوانی دەکا کە رەنگە تەنیا ئاشتی و ئاسایش نێودەوڵەتیی بخەنە مەترسیەوە. لە هێندێک حاڵەتدا نێوبژیوانی کۆتایی بەکێشەیەکی نێودەوڵەتیی هێناوە. لەم ساڵانەی دواییدا نێوبژیوانی تاشکەند لە کێشەی هیندوستان و پاکستاندا (١٩٦٦) و نێوبژیوانی کەمپ دەیڤید بۆ کۆتایی هێنان بە شەڕی نێوان میسر و ئیسرائیل (١٩٧٩) لەو حاڵەتە سەرکەوتووانەی نێوبژیوانی لەلایەن وڵاتیکەوە بوون.

بەڵام نێوبژیوانیش وەکوو کەیخوایەتی لە ژێر سەرنج و چاوەدێری رێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان یان رێکخراوە بان ـ ناوچەییەکاندا بەرێوە چووە. کاریگەریی نێوبژیوانی

ئارادەیەک نادیارە: ئەگەرچی لە هێندێک حاڵەتدا کێشەکەی چارەسەر کردووە، بەڵام لە هێندێک حاڵەتی دیکەدا ناسەرکەوتوو بووە. ئەم شکستانە هێندێک حاڵەتی هەستیاری وەکوو نێوبژیوانی ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان لە شەڕی ڤێتنامدا دەگرێتەوە. ڕاستە کە نێوبژیوانی بە دانی دەسەڵاتی ئاراستە کردنی پێشنیار؛ لە کەیخوایەتیکی ڕووت و تەنیا لە سەرەوەترە، بەڵام ئێستاش لە کێشە نێودەوڵەتیەکاندا، هەروەکوو دەستێوەردانی لایەنی سێهەم چاوی لێدە کرێ.

### ناوچەی بێ چەک و چۆڵی ناوەکی

### *Nuclear –Weapens –Free Zone (NWFZ)*

بەو کۆمەڵە هەوڵە سیاسییانەدەگوترێ کەوڵاتانی دراوسێ بەمەبەستی پێکهێنانی ناوچەیەکی جوگرافی بێ چەک و چۆڵی ناوەکی دەیدەن. مەبەست لە پێکهێنانی ئەم ناوچانە پێشگرتن لە پێشبڕکێی چەک و چۆڵ لە نێوان وڵاتان و دامەزراندنی سەقامگرتوویی لەو وڵاتانە دایە. یەکیەتیی سۆڤیەت بە پێچەوانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و زلهێزەکانی دیکەی ڕۆژئاوا، بەردەوام پشتیوانی لە پێکهێنانی ئەم ناوچانە دەکرد. بۆ پێکهێنانی ئەم ناوچانە دەبێ ڕەچاوی ئەم خاڵانە بکەین:

١ــ بەڵێنی ئەو دەوڵەتانەی کە خاوەنی چەک وچۆڵی ناوەکین سەبارەت بە دانەمەزراندن و تاقی نەکردنەوەی چەک و چۆڵە ناوەکیەکان یان فەوتاندنی ئەم چەک و چۆڵانە و، هەروەها ڕێگا بەو وڵاتانی دیکە نەدەن کە (ئەلبەت ئەو وڵاتانە بەمە ناچار نەکراون) کە ئەم چەک و چۆڵانە لە ناو خاکی ئەواندا، دامەزرێنن.

٢ــ "مسۆگەرکردنی ئاسایشی سەربەخۆ " لەلایەن هەرکام لە دەسەڵاتە ناوەکیەکانەوە سەبارەت بە کەڵک وەرنەگرتن لە چەک و چۆڵە ناوەکیەکان لەم ناوچانەدا لە هەر بارودۆخێک دا.

٣ــ سەپاندنی "چوارچێوە دەرەکی"ە جیاوازەکان لەلایەن دەسەڵاتە گەورەکانەوە کە ئەم وڵاتانە نابنە ئامانجی موشەکە ئەتۆمیەکانی ئەوان.

٤ــ پێکهێنانی بواری پێویست بۆ کونترۆڵکردنی ئەو مەرجانە.

له پێناو وەدیهاتنی ئەم ئامانجانه له ئەورووپای ناوەڕاستدا، چەندین گەلاّڵە هاتوونه ئاراوە: گەلاّڵەکانی ئەڵمانیا، گەلاّڵەی کۆمۆلگا، پێشنیاری کۆمیسیۆنی پاڵمە، گەلاّڵەی یارۆزلێسکی.

### *ناوچەی ئازادی بازرگانیی دەرەوەی ئاتلانتیک (تەفتا)*
### *Trans-Atlantic Free Trade Area (TAFTA)*

به دوای ئەو هەوڵە بەربلاّوانەی که بۆ پێکهێنانی یەکیەتیەکی ئابووریی له ئەورووپادا هاتنه ئاراوە، له ڕۆژی ۳۰ی کانوونی یەکەمی ۱۹۹۵، به مۆرکردنی ڕێککەوتننامەیەک له لایەن بێل کلینتۆن، سەرۆک کۆماری ئەمەریکا، فیلیپ گۆنزالێس، سەرۆک وەزیری ئیسپانیا و سەرۆکی ئەوکاتی یەکیەتیی ئەورووپا و ژاک سانتێ، سەرۆکی کۆمیسیۆنی ئەورووپا، له کۆشکی سەرۆک وەزیری ئیسپانیادا بڕیاردار که ناوچەی ئازادی دەرەوەی ئاتلانتیک پێک بێ. ئەم ڕێککەوتننامەبه ۱۲۰ گەلاّڵەی بەڕێوەبەری و له چوارچێوەی ٤۰ ئامانجی سەرەکیدا تێدە کۆشێ: ئەم ئامانجانه بریتین له :

١ـ بەرە و پێش بردنی ئاشتی و پەرەپێدانی دێموکراسی له پانتایی جیهان دا

٢ـ به هێزکردنی هاوکاریی بۆ بەرنگاری کردنەوە لەگەڵ تاوانه ڕێکخراوەکانی وەکوو قاچاغی ماددە سڕکەرەکان و تیرۆریزم.

٣ـ یارمەتیدانی پەرەپێدانی بازرگانی جیهانیی و هاوکاریی ئابووری.

٤ـ به هێزکردنی هاوکاری له نێوان کۆمەڵگا مەدنیەکاندا له بوارەکانی زانست، پەروەردەو کولتووردا.

هەروەها له سەر سووربوونی ئەندامانی ئەم ڕێککەوتننامه له بوارەکانی پێکهێنانی بازاڕێکی گەورەی نێوان ئاتلانتیک به مەبەستی پەرەپێدانی بازرگانی، سەرمایەگوزاری و دابینکردنی کار پێداگری کراوە.

## هاوپەیمانەتی بچووک — Little Entente

بەو یەکیەتیە سیاسی، ئابووری و سەربازییانە دەگوترێ کە لە ساڵەکانی ١٩٢٠ هەتا ١٩٢١ لە نێوان یوگوسلاڤیا، چیکسلۆڤاکیا و رۆمانیا گریدارن و فەرەنساش پشتیوانی لێ دەکردن.

هاوپەیمانەتی بچووک لە دەیەی ١٩٣٠دا بەرەو لاوازی چوو و، پاشان بە لکانی چیکسلۆڤاکیا بە ئەڵمانیای نازییەوە (١٩٣٨)، بە تەواوەتی لە بەریەک هەڵوەشایەوە.

## هاوپەیمانەتی سێ کوچکە — Tripl Entente

رێککەوتنێکی دیپلۆماتیک (سیاسی)ی نارەسمی بوو کە لە نێوان بەریتانیا، فەرەنسا و رووسیادا لە دژی یەکیەتیی سێ کوچکەی پێکهاتوو لە ئەڵمانیا، نەمسا، هەنگاریا و ئیتاڵیا(١٨٨٢)، پێکهات. ئەم " رهاوپەیمانەتیە"ە لە ساڵی ١٩٠٧ هەتا ١٩١٧ بەردەوام بوو. لە دوای شەڕی یەکەمی جیهانی، ناوی ئەو هاوپەیمانەتیە گۆرا بۆ " یەکیەتیی *سەربازی*".

## هاوپەیمانی

بەرێککەوتنی کاتیی حیزبەکان و گرووپە سیاسییەکان بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی هەڵبژاردنەکان و پەرلەمان دەگوترێ. لەو سیستەمە پەرلەمانیە فرە حیزبیانەدا کە هیچکام لە حیزبەکان بە تەنیا دەنگی پێویست بۆ بەدەستەوەگرتنی دەسەلاّت بەدەست ناهێنن، دوو یان چەند

حیزبێک بۆ گەیشتن بەو مەبەستە، هاوپەیمانەتیەک پێکدێنن. هاوپەیمانەتیی پەرلەمانی زیاتر بۆ هێشتنەوە یان هێنانە سەرکاری حکومەتێکی تایبەتی پێکدێ و، لەم بارەوە حیزبی گەورەتر لەگەڵ یەک یان چەند حیزبێکی بچووکتردا، هاوپەیمانەتی پێک دێنێ و، ئەو حیزبانە بەرادەی دەسەڵات و قەبارەیان، لە حکومەتدا بەشداری دەکەن. ڕەنگە هاوپەیمانەتیی، لایەنی "نێگەتیڤ"یشی هەبێ، واتە بەمەبەستی ڕوخاندنی حکومەتێک پێک بێ.

### هەواڵگری — *Intelligence*

کۆمەڵێک باتەتی نهێنیە کە دەوڵەتێک لەسەر ڕادەی توانایی، ئامانج و مەبەستەکانی دەوڵەتەکانی دیکە کۆیان دەکاتەوە. کۆکردنەوەی زانیاری نهێنی سەربازی یان ستراتیژی لە پێوەندی لەگەڵ هێزە زەمینی، ئاسمانی و دەریاوانیەکان، چەل وچۆڵە نوێکان، ورەی هێزە چەکدارەکان و ئامانجە ستراتیژی و تەکتیکیەکان، ڕێککەوتننامە و یەکیەتیە نهێنیەکان و ورەی تاکەکەسان لە نموونەی ئەو کۆمەڵە زانیاریانەن کە دەوڵەتەکان بە دوایانەوەن. یەکە دژە هەواڵگرییەکانیش لەگەڵ هەواڵگرە بێگانەکان و دەست و پێوەندە نێوخۆییەکان بۆ پێشگیریکردن لە دزەکردنی زانیاری نهێنی سەربازی و ناسەربازی و ناردنیان بۆ دەرەوە و گەیاندنی بە دەزگا سیخوڕییەکانی بێگانە هەوڵ دەدەن. لەم سەردەمەدا بەدەستهێنانی زانیاریی نهێنی لەسەر دەوڵەتە دۆست و هاوپەیمانەکان، بەقەد وڵاتە دوژمنەکان بەبایەخ و گرنگە.

### هەوڵی فەڕەنسا(١٨٩٨) — *Action Francaise*

ئەم زاراوەیە بە بزووتنەوەیەکی دەستەڕاستیی توندڕوی فەڕەنسا دەگوترێ کە لە ساڵی ١٨٩٨ دا لە لایەن شارڵ مۆرا دامەزرا. ئەو بزووتنەوە بیروبۆچوونێکی ناسیۆنالیستی و دژە سامی هەبوو و لایەنگری لە ڕژێمی پاشایەتی دەکرد. ئەو بزووتنەوەی ئەگەرچی بە ڕەسمی لە لایان کلیسای کاتۆلیکی ڕۆمەوە پشتیوانی لێدەکرا، بەڵام سیاسەتەکانی دوایی ئەو بزووتنەوە بوو بە هۆی ئەوەی لە ساڵی ١٩٢٦دا، پاپ گەرمارۆی بخاتە سەرو، پشتی تێ بکا. ئەم بزووتنەوەیە بە درێژایی شەڕی دووهەمی جیهانی بە شێوەیەکی زۆر چالاک پشتیوانی لە ڕژێمی بەکرێگیراوی ڤیشی

دەکردو، ئەم کارەش بووە بە هۆی هەڵوەشانەوەی ئەو بزووتنەوە لە دوای شەڕی دووهەمی جیهانیدا.

### هەوڵ وکردەوەی تۆڵە ئەستێنانە Reprisals

بە کردەوەیەکی توندوتیژانە بە مەبەستی تۆڵەکردنەوە لە وڵاتێکی دیکە دەگوترێ، بۆ ئەوەی ئەو وڵاتە ناچار بکا کە قەرەبووی ئەو زیانانە بکاتەوە کە لەو دەوڵەتە کەوتووە یان ئەو بەڵێنەی کە بەو دەوڵەتەی داوە، جێبەجێ بکا. کردەوەی تۆڵەستێنانە لە شەڕ کەمترە. کردەوەی تۆڵەئەستێنانە لەگەڵ کردەوەی بەرامبەرانەدا جیاوازەو، لە بوارەوە کە کردەی بەرامبەرانە قەرەبوو کردنەوەی زیانەکان لە ڕێگای یاسایەوەیە، کەچی کردەوەی تۆڵەئەستێنانە کردەوەیەکی نایاساییە.دەبێ لە نێوان کردەوەی تۆڵەئەستێنانە وەک کردەویەکی کەمتر لە شەڕ و کردەوەی تۆڵەئەستێنانە لە کاتی شەڕدا بەمەبەستی ناچار کردنی لایەنی بەرامبەر بە ڕەچاوکردنی یاساکانی شەڕ، جیاوازی دابنرێ. کردەوەی تۆڵەئەستێنانە دەکرێ بە شێوەی کردەویەکی ناسەربازییانە، یان بە شێوەیەی کردەویەکی سەربازییانە لەدژی وڵاتە جۆراوجۆرەکان بەرێوە بچێ. لە حاڵێکدا کە بەپێی یاسا نێودەوڵەتیە کۆنەکان، هەردوو شکڵ و شێوازی کردەی تۆڵە ئەستێنانە، لە هێندێک هەلومەرجدا یاسایی بوو، بەڵام کردەوەی تۆڵە ئەستێنانەی سەربازییانە بەپێی یاسا نێودەوڵەتیە هاوچەرخەکان، بە پێشێلکردنی بنەمای قەدەغەبوونی کەڵک وەرگرتن لە زۆر و هێزی نایاسایی، کە لە جارنامەی نەتەوەیەکگرتووەکاندا گونجێنراوە، دەژمێردرێ. ڕاگەیەنراوی ساڵی ١٩٧٠ سەبارەت بە پرەنسیپەکانی یاسا نێودەوڵەتیەکان لەبارەی پێوەندییە دۆستانەکان و هاوکاریی نێوان دەوڵەتەکان بەپێی جارنامەی ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان، کەڵک وەرگرتن لە کردەوەی تۆڵەئەستێنانەی سەربازی بە ئاشکرا قەدەغە کردووە. ئێستاش ڕێگا بە کردەوەی تۆڵەئەستێنانەوە بەبێ کەڵک وەرگرتن لە هێزی سەربازی دراوەو، دەتوانی شێوازی جۆراوجۆر بە خۆیەوە بگرێ. (بۆوێنە جێبەجێ نەکردنی بەڵێنەکانی ڕێککەوتننامە، دەستبەسەرداگرتنی سەرمایەی وڵاتی لادەر یان دەستبەسەرکردنی هاوڵاتیانی ئەو وڵاتە ). لە ڕابردوودا، لە کردەوەی تری وەک دەسبەسەرداگرتنی پاپۆڕەکانی وڵاتی لادەر لە ئاوەکانی ئەو وڵاتەی کەزیانی پێگەیشتووە، کەڵک وەردگیرا. دەستبەسەرداگرتنی پاپۆڕەکانی وڵاتی لادەر یان سامانەکانی لە دەریایی ئازاد داو، گەمارۆدانی دەریایی ئاشتیخوازانەش لە وێنەی ئەو کردەوە تۆڵە ئەستێنانەوە بوون کە لە ڕابردوودا کەڵکیان لێ

وەردەگیرا. هەروەها، لە رەوتێک کە بە " تۆڵەئەستێنانەوە تایبەتی" ناودەبرا، کەڵک وەردەگیرا. بەپێی تۆڵەئەستێنانەی تایبەتی، ولاتێک مۆڵەتی بە کەسێک دەدا تاکوو لە رێگای کردەوەی تۆڵەئەستێنانەوە لە دژی ولاتی لادەر یان هاوولاتیانی ئەو ولاتە، زیانەکە قەرەبوو بکاتەوە. ئەو شێوازە هەتا کۆتایی سەدەی هەژدەهەم باو بوو. بەر لەوی کە جاڕنامەی رێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان کەڵک وەرگرتن لە هێز قەدەغەبکا، کۆنڤانسیۆنی ژمارەی دووی لاهە(کۆنڤانسیۆنی پۆرتێر) تەنیا بەڵگەیەک بوو کە کەڵک وەرگرتن لە کردەوەی تۆڵەئەستێنانەی سەربازی بۆ وەرگرتنەوەی قەرزەکان قەدەغە دەکرد، مەگەر ئەوی کە ولاتی قەرزدار دادوەرییەکەی رەد دەکردەوە یان ملکەچی بڕیار دادوەر نەدەبوو. کردەوەی تۆڵەئەستێنانەی یاسایی پێویستی بەو سێ مەرجە هەیە:

١ــ دەبێ کردەویەکی نایاسایی لە لایەن ولاتی لادەرەوە رووی دا بێ.

٢ــ دەبێ داواکاریی قەربووکردنەوەکە بێ وەلام مابێتەوە.

٣ــ کردەوەی تۆڵەئەستێنانەوە دەبێ بە شێوەیەکی لۆژیکی لەگەڵ زیانەکەدا، بگونجێ.

### ***Electoral System*** ***هەڵبژاردنەکان***

سیستەمی هەڵبژاردنەکان بریتیە لە شێوازێک کە لەولاتێک بەپێی یاسا و رێوشوێنی تایبەت بە هەڵبژاردنەکان بۆ هەڵبژاردنی ئەو ئۆرگانانەی ولات کە دەبێ بە دەنگدان دیاری بکرێن و، هەروەها بۆ دیاریکردن و راگەیاندنی ئەنجامەکانی دەنگدانەکان دیاری کراوە.

### ***By- Election*** ***هەڵبژاردنە تەکمیلیەکان***

ئەم زاراوەیە بەو هەڵبژاردنە دەگوترێ کە دوای وازهێنان یان مردنی یەک یان چەند کەس لە نوێنەرانی پەرلەمان و بۆ پڕکردنەوەی کورسیی بەتاڵی پەرلەمان لە ماوەی خولی ئاسایی پەرلەماندا بەڕێوە دەچێ.

### **Discrimination** **هەلاواردن /جیاوازی دانان**

بەگشتی، هەلاواردن بەدانانی ئەو بەربەستانە دەگوترێ کە لە رێگای یاسا، داب و نەریت یان گرێبەستێکی نارەسمی لە دژ یان لەبەردەم گرووپێکی تایبەتی یان گرووپێکی ئایینی یان رەگەزی دادەنرێن.

## Aggression
## هێرشکردن

هەر کاتێک وڵاتێک بە کەڵک وەرگرتن لە هێزە چەکدارەکانی خۆی هەڵبوکێتە سەر وڵاتێکی تر و سەروەریی و یەکپارچەیی و سەربەخۆیی سیاسی ئەو وڵاتە پێشێل بکا، یان بەهەر شێوەیەکی کە لەگەڵ پێرەوپرۆگرامی نەتەوە یەکگرتووەکاندا نەگونجێ (ماددەی یەکی بریارنامەی پێناسەی هێرش کردنی کۆمەڵەی گشتیی نەتەوەیەکگرتووەکان)، بە هێرشکردن دادەنرێ. لەم پێناسەدا، وشەی وڵات، الف ) بەبێ سەرنجدان بەوەی ئەو وڵاتە لە لایەن رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان دان پێدا نرابێ، یان ئەوەی ئەو وڵاتە ئەندامی رێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکانە یان نا، کەڵکی لێ وەرگیراوە. ب) ئەگەر پێویست بکا بە واتای "کۆمەڵێک لە وڵاتان"ە.

## Indirect Aggression
## هێرشکردنی ناڕاستەوخۆ

کردەوەیەکی دوژمنکارانەیە کە وڵاتی هێرشبەر بە بێ ئەوەی کە خۆی بە شێوەیەکی راستەوخۆ لە شەڕەکەوە بگلێ، لە رێگای :

١ــ پێکهاتنی هێزە میلیشیا یان تاقمە چەکدارەکان (بۆ وێنە بەکرێگیراوان) هێرش بۆ نێو وڵاتێکی تر رێک دەخا، یان لایەنی تر هان دەدا کە هێرش بکەن.

٢ــ جموجۆڵە تێکدەر، تیرۆریستی یان چەکدارییەکان لە پێناوی رووخاندنی رژێمی وڵاتێکی تر رێک دەخا، یان هاوکاری و دابینیان دەکا، یان هانیان دەداو پاڵپشتیان دەکا، یان دەست لە کێشەی نێوخۆیی وڵاتێکی تر وەردەدا. بەپێی بۆچوونی کۆمەڵەی گشتیی رێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان، جۆری یەکەمی ئەم جموجۆڵانە، بە کەڵکی نایاسایی لە هێزی چەکداری و هێرش کردن دادەنرێن و، بەبێ ئەوەی کە باس لە "هێرش کردنی ناڕاستەو خۆ" بکا، بەپێی پێناسەی پەسندکراوی کۆمەڵەی گشتی لە ساڵی ١٩٧٤، بە کردەوەی هێرشکارانە دادەنرێ.

جموجۆڵی لە جۆری دووهەم، بەگشتی بە بنەمای قەدەغەبوونی دەست تێوەردان لە کاروباری نێوخۆیی وڵاتێکدا بەستراوەتەوە، بەڵام بە ئاماژەکردن بە هێرشکردنی ناڕاستەوخۆ"، (واتایەک کە بەڕای هێندێک لە وڵاتان و یاساناسان دەبێ کردەوەی لە جۆری پروپاگەندەو هێرشی دوژمنکارانە یان ئایدۆلۆژیانەش لەخۆ بگرێ)، پێناسە کراوە. ئەوەکە ئایا دەکرێ پاڵەپەستۆی ئابووری بۆ بێ بەش کردنی وڵاتێک لە توانایی ئابووری یان لە مەترسی خستنی بنەمای ئابووریی ئەم وڵاتە لە

چوارچێوەی ئەو پێناسەی هێرشکردندا بگونجێندرێ یان نا، باسێکی زۆر هەڵدەگرێ و، بەوە بەستراوەتەوە کە قەدەغە بوونی هێز لە جارنامەی نەتەوەیەکگرتووەکاندا تەنیا وەک هێزی چەکدارانە لێک بدرێتەوە، یان بەگشتی دەبێ شێوەکانی تری وەک فشار، بۆوێنە فشاری ئابووریش لەخۆ بگرێ.

## هێڵی ئۆدیرنیسە Oder – Neisse Line

لە دوای شەڕی دووهەمی جیهانی بۆ دیاریکردنی سنووری نێوان ئەڵمانیای رۆژهەڵات و پۆڵەندا کەڵک لە رووباری ئۆدیر کە دەڕژێتە نێو دەریای باڵتیک و، لقەکەی واتە نیسە کە لە چیکسلۆڤاکیا سەرچاوە دەگرێ، وەرگیرا بوو. ئەم سنوورە لە ڕێککەوتننامەی پۆتسدام (یەکەمی مانگی ئابی ١٩٤٥) دا لە لایەن ئەمەریکاو بەریتانیاو سۆڤیەتیشەوە پەسند کرا. ئەو ناوچە ئەڵمانیانەی کە لە رۆژهەڵاتی هێڵەکە دابوون بە شێوەیەکی کاتی کەوتنە ژێر دەسەڵاتی پۆڵەنداو، لە ژێر کۆنترۆڵ و بەڕێوەبەریی ئەنجوومەنی کۆنترۆڵی هاوپەیمانان لە بەرلیندا هاتە دەر. ئەو ناوچانە نزیک بە یەک لە پێنجی ئەڵمانیایان لە ساڵی ١٩٣٨دا پێکدێناو، هەروەها نزیک بەیەک لە چواری ناوچە بە پیتەکان و لە نێوان یەک لە شەش هەتا یەک لە حەوتی حەشیمەتی ئەڵمانیای لەخۆ دەگرت. باشترین ناوچەکانی چاندنی پەتاتە، گەنم و..... هتد کە لە سەردەمێکدا ئەڵمانیای رۆژئاوا لەبواری پەتاتەوە پشتی بەم ناوچە دەبەست، لەم بەشەدا هەڵەوتبوو. ئەگەرچی زلهێزەکان بڕیاری کۆتاییان سەبارەت بە سنوورەکانی رۆژئاوای پۆڵەنداوە بۆ دواتر هێشتبۆوە، بەڵام وڵاتی پۆڵەندا هێڵی ئۆدیرنیسەی بە سنووری رۆژئاوای وڵات لەقەڵەم داو، ژمارەیەکی زۆر لە ئەڵمانیەکانی کە نزیک بەیەک لە چواری دانیشتوانەکەی ئەڵمانی بوون، وەدەرنا. لە شەشی تەمموزی ١٩٥٠دا ڕێککەوتننامەیەک لە نێوان کۆماری دیمۆکراتیکی ئەڵمانیا و پۆڵەندا مۆرکرا کە هێڵی ئۆدیرنیسەی بە سنووری رۆژئاوای پۆڵەندا دادەنا. کۆماری فیدراڵی ئەڵمانیا، بەریتانیا و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ئەم ڕێککەوتننامەیان رەت کردەوە. لە شەشی تەمووزی ١٩٥٥دا ئەڵمانیای رۆژهەڵات و دەوڵەتی پۆڵەندا رایانگەیاند کە هێڵی ئۆدیرنیسە سنووری کۆتایی و هەمیشەیی ئەو دوو وڵاتەیە. بەریتانیا و ویلایەتە یەکگرتووەکان پێیان لەسەر ئەوەدا دەگرتەوە کە بەپێی ڕێککەوتننامەی پۆتسدام، دیاریکردنی سنووری نوێی ئەو وڵاتە بە بەڕێوەچوونی هەڵبژاردنێکی ئازاد لە پۆڵەندا بەستراوەتەوە. ڕێککەوتننامەی کۆتایی کاتێک ڕەوایە کە لەگەڵ حکومەتی ئەڵمانیا بە شێوەی

یەکپارچە ( حکومەتی یەکگرتووی هەموو ئەڵمان)دا ببەستریّ. دوای ساڵی ١٩٦٧، کۆماری فیدراڵی ئەڵمانیا، هەوڵێکی نوێی بۆ باشترکردنی پێوەندییەکانی لەگەڵ وڵاتانی ئەورووپای رۆژهەڵاتدا دەست پێکردو، لەم پێناوەشدا هێڵی ئۆدێرنیسەی وەک سنووری پۆڵەندا پەسند کرد.

## Maginot Line

### هێڵی ماژینۆ

بە کۆمەڵە بنکەو دامەزراوەی سەربازی دەگوتریّ کە لە لانگۆی (لەنزیک لۆکزامبۆرگ) هەتا سنووری سویسرا لە رۆژهەڵاتی فەرەنسا، دامەزرا، ئەم دامەزراوانە لە نێوان ساڵەکانی ١٩٢٩ هەتا ١٩٣٤ دامەزران، ناوی ئاندێریّ ماژینۆ (١٨٧٧-١٩٣٢)، وەزیری شەڕی ئەوکاتی دەوڵەتی فەرەنسا لەسەر دانرا. بە هۆی دژایەتیکردنی دەوڵەتی بەلژیکا، ئەو دامەزراوانە نەگەیشتوونەتە سنوورەکانی ئەو وڵاتە. بۆیە دەوڵەتی فەرەنسا لە کاتی قەیرانەکان بە ئەرکی خۆی نەدەزانی بەرگری لەو وڵاتە بکات.

لە مانگی مایسی ١٩٤٠دا شەڕی بروسک ئاسای ئەڵمانیا لە دژی بەلژیکا، لێکدانەوەو هەڵسەنگاندنی ئەفسەرانی فەرەنسای تێک و پێکداو، بە چوونە نێو خاکی بەلژیکا توانیان بە ئاسانی بەدەوری هێڵی ماژینۆدا بسوورێنەوە. گرنگتر لەمەش، فەرەنسا لە ٢٢ی حوزەیرانی ١٩٤٠دا بە کردەوە لە بەرامبەر دەوڵەتی ئەڵمانیای نازیدا خۆی بەدەستەوەدا.

## Mc. Mahon Line

### هێڵی مەک ماهۆن

سنووری نێوان هیندوستان و چین کە لە ساڵی ١٩١٤دا بە رێککەوتنی چین، تەببەت وبەریتانیا دیاری کرا. مەک ماهۆن ئەو کەسە بوو کە سەرۆکایەتی دەستەی نوێنەرایەتیی بەریتانیای لە رێککەوتننامەکانی سەبارەت بە دیاریکردنی ئەو سنوورانەی لەئەستۆدا بوو. هێڵی مەک ماهۆن و رێککەوتننامەکەی، دواتر لەلایەن وڵاتی چینەوە کە دەیگووت سی هەزار کیلۆمەتری دووجای لە خاکەکەی کەوتۆتە باکووری رۆژهەڵاتی ئەم هێڵەوە، رەت کرایەوە. سنووری نێوان دوو وڵاتی بێرمە وچین درێژەی هێڵی "مەک ماهۆن"ە و، چین لە ساڵی ١٩٦٠دا دانی پێدا ناوە.

### هۆکاری شەڕ *Cause Belli*

بریتین لەو هۆکارانەی کە دەوڵەتێک ئاماژەیان پێدەکا کە بۆچی لە دژی دەوڵەتێکی دیکە شەڕی ڕاگەیاندووە یان لە شەڕدا بەشداری کردووە.

### هێزی پشتیوان *Protecting Power*

هێزی پشتیوان بە وڵاتێکی بێلایەن دەگوترێ کە لە شەڕدا بەشدار نیە، بەڵام لە لایەن، لایەنێکی شەرەکەوە دیاری دەکرێ و لایەنی بەرامبەریش لەسەری کۆکە. ئەم وڵاتە بێلایەنە ئەرکی دیاریکردنی رەچاوکردن یان رەچاونەکردنی ریوشوێنەکانی کۆنفانسیۆنەکانی ساڵی ١٩٤٩ ی ژنیڤ، پرۆتۆ کۆلەکانی ژمارەیەک و ژمارە دووی ساڵی ١٩٧٧ و یاسا نێودەوڵەتیەکانی دیکەش لە ئەستۆ دەگرێ. رێکخراوێکی بێلایەنیش وەکوو کومیتەی نێودەوڵەتی مانگی سوور، دەتوانێ ئەم ئەرکە لە ئەستۆ بگرێ.

### هێزی رەش Black power

بە بزوتنەوەیەکی رەش پێستەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەدەیەی ١٩٦٠ دەگوترێ کە بەمەبەستی نارەزایەتی دەربڕینی خەڵکی رەش پێست، سەبارەت بە جیاوازیدانان لە کۆمەڵگای سپی پێستدا هاتە ئاراوە. ئەم بزووتنەوە لە سەر یەکسانی مافی رەش پێستەکان و سپی پێستەکان پێداگری دەکردو لە لە کوتاییەکانی دەیەی ٦٠ دا هەوڵەکانی خۆی بەرفراوانتر کرد. کۆمەڵگای سپی پێست بە هۆی ترس لە ڕوودانی گرژی و ئالۆزی رەگەزی، تارادەیەکی زۆر داواکارییەکانی رەش پێستەکانی جێبەجێ کرد.

### هەژموونی *Hegemony*

لە زاراوەی یۆنانی hegemonia بە واتای رێبەرایەتیکردن و زێدەخوازی وەرگیراوە. هەژموونی زاراوەیەکە کە بۆ زۆرترکردنی نفووز یان کۆنترۆلی توندوتۆلی دەزگایەکی رێبەری یان دەوڵەتێک بەسەر دەوڵەتێکی دیکەدا و یان بەسەر ناوچەیەکی دیکەدا کەڵکی لێ وەرگیراوە. ئەم سیاسەتە دەبێتە هۆی پێکهێنانی ناوچەی ژێر دەسەلاّت و دامەزراندنی پێوەندیی نایەکسان لە نێوان وڵاتی سەرەکی و ناوچەکانی ژێر دەسەلاّتدا. هەژموونی هێندێک جار لە لایەن رۆژئاواییەکانەوە بۆ

ئاماژەکردن بە سیاسەتە زێدەخوازانەکانی یەکیەتیی سۆڤیەت و ولاتانی دیکە (لە بەرامبەردا زاراوەی ئەمپریالیزم بۆ ئاماژەکردن بە سیاسەتەکانی رۆژئاوا لە لایەن یەکیەتیی سۆڤیەتەوە) کەلکی لێ وەردەگیردرا.

زالبوونی چینێک تەنیا بە پەنابردنە بەر زۆر و هێز مسۆگەر نابێ. هەر چینێک دەبێ لە سەرەتای بەدەستەوەگرتنی دەسەلاتدا، لەو رەوشە تایبەتی و قەیرانە بەردەوامانەدا کە کومەلگا گیرۆدەی خۆیان دەکەن، لێهاتوویی خۆی بۆ رێبەرایەتیکردن نیشان بدا و ببێتە جەمسەرێک کەرای گشتی خەلک بۆ لای خۆی راکێشێ و بەقەناعەتیان بگەیەنێ کە بە پێچەوانەی دەسەلاتدارانی رابردوو و ئیستاکە، دەتوانێ رێبەرایەتیی کۆمەلگا بگرێتە ئەستوو ـ نەتەنیا ئەوەی هەر حکومەت بکا و بەسەر کۆمەلگادا زال بێ، بەلکوو دەبێ لە هەموو بوارە کۆمەلایەتیەکاندا، لە زمانەوە بگرە هەتا کولتووری نەتەوەیی (نیشتمانی ) وەلامی پێداویستی و داواکارییەکانی کۆمەلگا بداتەوە.

ئەم چەمکە گرنگە، بەلای تیۆری دارێژی بەناوبانگی ئیتالی "ئانتۆنیۆ گرامێشی"، بەرێبەرایی چینایەتی بە ناوبانگە. ئەم چەمکە کە پرۆسەی راستەقینەی وەدەستهێنان و پاراستنی دەسەلاتی سیاسی شی دەکاتەوە، لەم سێ قۆناغە دا کورت دەکرێتەوە:

١ـ سەرهەلدانی هێزە کۆمەلایەتیە هاوچەرخەکان (بە پێی ئاستی گەشەی هێزە بەرهەمهێنەکان) و سەرهەلدانی بارودۆخی گۆرانکاری لە کۆمەلگادا.

٢ـ سەرهەلدانی ئالوگۆری گرنگ لە عەقل و هەست و ئایدۆلۆژی تاکەکاندا. عەقلی تاکەکەسەکان کە لە سەرەتادا بە شێوەی تاکە کەسیە (رکابەری لە نێوان تاکەکان دا)، بەرەبەرە دەگۆرێ بۆ حالەتی رێکخراوەیی و گرووپی و پاشان دەگۆرێ بۆ حالەتی چینایەتی و ئەمجارە مەسەلەی دەولەت دێنێتە گۆرێ و لە قۆناغی بە سیاسی بوونی دیاردەکاندا (کێشەکانی کۆمەلگا حالەتی سیاسی بە خۆوە دەگرن) دەولەت وەکوو ئامرازی دەسەلاتی چینێکی تایبەتی ـ کە لە خزمەتی بەرژەوەندییەکانی کۆمەلگادا نیە ـ دەردەکەوێ و بوار بۆ یەکیەتیی ئەم چینە کە زیاتر لە لایەنەکانی دیکە لە پێناو چارەسەرکردنی کێشەکانی خۆی و کۆمەلگادا هەول دەدا، لەگەل چینە ژێر دەسەلاتەکانی تردا دەرەخسێنێ.

٣ـ ئاشکرابوونی خەبات و بەرەنگاری سەربازی: ئەم قۆناغە، قۆناغێکی چارەنووس سازە.

ئەم پرۆسە لە زۆربەی شۆڕشەکان و بەتایبەتی لە شۆڕشەکانی ئەورووپادا دەبینرێ (کە لە سەردەمی ڕێنێسانسەوە دارێژراوە) و بوارە هزری و کومەلآیەتیەکانی دیکە بۆ وێنە لە بواری خەباتی کۆمەلآیەتی جوتیارەکان لە ئەلمانیا لە سەدەی دوازدەهەم بەملاوە، بە ناوی ئایینی پرۆستتان و دژایەتیکردن لەگەلّ دەسەلاّتی پاپدا دەرکەوێ و وەکوو دەیان بزووتنەوەی ئایینی دیکە (بزووتنە یەکسانیخوازەکانی رۆژهەلاّت) داوای گەڕانەوە بۆ مەسیحیەتی سەرەتایی و یەکسانی نێوان مرۆڤەکان دەکا، یان بۆتە هۆی بزووتنەوەی رۆشنگەری و عەقلاّنی لە ناو فەیلەسووفەکانی وەکوو دیکارت، ڤۆلتێر، رۆسۆ، دیدرۆ،دالامبێر و لامتری کە هەموو ئەمانە بنەما هزری و فکریەکانی شۆرشی بۆرژوایی لە رۆژئاوا دان. ئاشکرایە کەلەم پرۆسە کۆمەلآیەتیانەدا، رووناکبیرەکان، رۆلی سەرەکیی دەگێرن.

گرامێشی دەلێ: " رووناکبیرەکان رۆلی لاولاوەیەک دەگێرن کە ژێرخانی کۆمەلگا بەسەرخانی ئایدولۆژی کۆمەلگاوە دەبەستنەوە".

جێگۆرکێی رووناکبیران لە چینێکەوە بۆ چینێکی تر لەو بابەتە گرنگانەیە کە لەم بوارەدا دێتە گۆرێ و زۆر جاران رووناکبیرەکان بەپێی سەرچاوەو هەلوێستی چینایەتیی خۆیان دەچنە خزمەت ئەم یان ئەو چین. روونیشە کە هەرچەندە چینی دەسەلاّتدار یاسایی تر بێ و رەواییشی زۆرتر بێ، رووناکبیراەکان زیاتر بۆ لای دەچن و پێچەوانەی ئەم حالّەتەش دروستە. بەم پێیە چ لە قۆناغی پێش لە بەدەستەوە گرتنی دەسەلاّت و چ لە قۆناغی دوای بەدەستەوە گرتنی دەسەلاّتدا، لەلایەن یەک یان چەند چینێک، خەباتی ئایدۆلۆژی گرنگیەکی تایبەتی هەیە. ئەم گرنگیە بەتایبەت لە قۆناغە قەیراناوییە کاتیەکان یان قەیرانە ئۆرگانیکیەکاندا کە کێشەکانی کۆمەلگا لە هەموو رەهەندەکانیانەوە بە شێوەیەکی لە رادەبەدەر دێنە ئاراوە و چینی دەسەلاّتدار راشکاوانە ناتوانن کۆمەلگا بەرێوە ببەن و رووناکبیرانی ئەو چینە ناتوانن لەگەلّ ئایدۆلۆژی تازە بنیات و رووناکبیرەکانی لایەنگری ئەم ئایدۆلۆژییەدا بەرەنگاری بکەن، دوو هێندە دەبێتەوە.

**Heaet Land**

### هارتلەند/ دڵی زەوی

ئەم زاراوەیە لە لایەن هارفۆرد مەکیندێر، زانای ئینگلیزی (١٩٤٧-١٨٦١) داهێنراوە. لەراستیدا تیۆرێک بوو لەبەرامبەر تیۆری زانای ئەمەریکی ئالفرێد ماهان (١٩١٤ - ١٨٤٠). ماهان پێیوابوو کە بۆ زاڵبوون بەسەر وڵاتێکدا، هەبوونی هێزی دەریایی وزاڵبوون بە سەردەریاکاندا پێویستە. مەکیندێر بە پێچەوانەوە پێیوابوو کە لە پێناو بەدەست هێنانی هێزی جیهانی، ئەو کەسانە دەبیەنەوە کەبەسەر وشکاییەکانی زەویدا زاڵن. مەکیندێر لە ساڵی ١٩٠٤دا، لە وتارێکدا تیۆرە بەناوبانگەکەی خۆی بە نێوی هارتلەند شیکردەوە.

ئەم تیۆرە نەک تەنیا لەو سەردەمەدا، بەڵکوو پاش چەندین ساڵیش سەرنج و بیروڕای جوگرافی زان و سیاسەتمەدارەکانی بە خۆیەوە خەریک کردبوو و لێکیان دەدایەوە و رەخنەیان لێدەگرت. لەم ساڵانەی دواییشدا هێندێک لە جوگرافی زانەکان، جارێکی تر تیۆری مەکیندێریان بە هێندێک گۆڕانکارییەوە هێناوەتە گۆڕ و هەوڵیان داوە تا رادەیەکی زۆر لەگەڵ بارودۆخی نوێی ئێستای جیهاندا بیگونجێنن. بیروڕاکانی مەکیندێر ناراستەوخۆ لەسەر سیاسەتی سەربازی ئەڵمانیاشدا کاریگەرییان هەبووە و هێندێک لە سیاسەتمەدارەکان، پێیانوایە ئەڵمانیا بە هۆی پێڕەویکردن لە بیروبۆچوونەکانی مەکیندێر لە شەڕی ساڵی ١٩٤٠دا، سەرکەوت. پوختەیەک لە بیروڕاکانی مەکیندێر:

" کیشوەرەکانی ئەورووپا، ئاسیا، ئەفریقیا سەرجەم وشکاییەکی گەورە پێک دێنن کە بەشێکی زۆری ئەم وشکاییە بەئاو تەنراوە. لە ئەفریقیادا بیابانی گەورە بۆتە هۆی جیاکردنەوەی باکوور لەگەڵ باشووردا. دەتوانین بەو وشکاییە بڵێین "دورگەی جیهانی". پانتایی ئەم دورگە رێک بەقەد دوو لە سێی هەموو وەیشکاییەکانی جیهانە. لە حاڵێکدا کە هەموو وشکاییەکانی جیهان کە ئەمەریکای باشوورو باکوور، ئەفریقیای باشووری بیابان و ئوسترالیا دەگرێتەوە، سەرجەم دەکاتە یەک لە سێی. ناو جەرگەو ناوەندی گەورەی دورگەی جیهانی کە مەکیندێر " ناوچەی تەوەریان Pivot Areaی پێ دەڵی، ناوچەیەکی پان و بەرینە کە لە باکوورەوە دەگاتە ئۆقیانووسی بەستەڵەکی باکوورو لە رۆژئاواوە دەگاتە چۆمی ڤۆلگا، لە باشوورەوە دەگاتە کێوەکانی هیمالایا و

لە ڕۆژهەڵاتیشەوە دەگاتە سیبریا. بەم پێیە ناوچەی تەوەر بریتیە لە بەشێکی زۆر لە ڕووسیا، بەشی ڕۆژئاوای چین، بەشێک لە مەغولستان و ئێران.

لەروانگەی مەکیندێرەوە گرنگی ناوچەی تەوەر لەوەدایە کە هێزی دەریایی هیچ وڵاتێک ناتوانێ، بیخاتە مەترسیەوە، چوونکە ئاراستەی چۆمەکانی ئەم ناوچە بەرەو دەریا ئازادەکان نیە، هیچ پاپۆرێک ناتوانێ بچێتە ئەم ناوچەوە. ناوچەی تەوەر بەردەوام لە ڕەوتی مێژوودا ڕەوشێکی جیاوازی هەبووە و ئەو خەڵکەی لەم ناوچەدا ژیاون هێز و دەسەڵاتی خۆیان بەسەر خەڵکی دیکەدا سەپاندووە. لە نێوان سەدەکانی پێنجەم و شازدەهەمدا ناوچەی تەوەر، شوێنی سەرهەڵدانی هۆزەکۆچەر و سوارچاکە جیهانگرەکان بووە. ئەمانە زیاتر هێرشیان کردۆتە سەرلای ڕۆژئاوا بەکەڵک وەرگرتن لە دەروازەی نێوان کێوەکانی ئۆراڵ و دەریای خەزەر (کاسپی، قەزوین) چوونەت ە ئەورووپا و مێژووی ئەوێیان گۆڕیوە. ڕووسیا، ئێران، هیندوستان و چینیش بەش بەحاڵی خۆیان کەوتوونە بەر پەلاماری ئەم هۆزە کۆچەرانەوە.مەکیندێر وای دانا بوو کە ئەگەر تورک و تاتارەکان بە ئەسپ و وشتر توانیویانە ببنە ئەو هێزو دەسەڵاتە، بە دڵنیاییەوە خەڵکی ناوچەی تەوەریش بەکەڵک وەرگرتن لە هێڵە ئاسنەکان دەسەڵاتێکی زۆریان دەبێ. مەکیندێر پێیوابوو ئەگەر ئەڵمانەکان و ڕووسەکان یەک کەون یان چینیەکان بەرێبەرایەتیی ژاپۆنیەکان، ڕووسەکان لە ناوبەن و ناوچە تورک نشینەکان داگیر بکەن، هێزی گەورە پێک دێ.

لە کتێبێکدا کە مەکیندێر لە ساڵی ١٩١٩دا نووسی ناوی ناوچەی تەوەری گۆڕی و کردیە هارتلەند. هەڵبەت ئەمجارە مەکیندێر هێندێ شوێنی دیکەشی خستەسەر ئەو ناوچەی کە مەبەستی بوو کە بەشی ئەورووپای، ڕووسیا، تا دەریای باڵتیک، ئەو بەشانەی چۆمی دانوبی ناوەڕاست و خواروو کە بەکەڵکی هات و چۆی پاپۆرەکان دەهات، دەریای ڕەش، ئاسیای چکۆلە، ئەرمەنستان، ئێران، تەبەت و مەغولستانی دەگرتەوە. لە ساڵی ١٩٤٣دا مەکیندێر جارێکی دیکەش بەپێی هەلومەرج، گۆڕانکاری لە تیۆرەکانی خۆیدا پێکهێنا و ئەمجارە پانتایی هارتلەندی کەمتر کردەووە و لە بەرامبەر هارتلەندی ڕووسیادا، ناچەیەکی گرنگی سەربازیی دیکەی خستە سەر هاتلەند کە ئەقیانووسی ئەتلەسی باکوور، ڕۆژهەڵاتی ئەتازۆنی و ئەورووپای ڕۆژئاوای دەگرتەوە. زۆربەی پێش بینیەکانی مەکیندێر وەدی نەهاتن، چوونکە ئەو تیۆرەکانی خۆی بەپێی

رووداوە مێژوویی و بنەما جوگرافیەکان دارشتبوو، بەبێ ئەوەی بایەخ بە پێشکەوتنی تەکنەلۆژیاو زانستەکان، لە داهاتوودا بدا.

***هەبیتات / کۆنفرانسی نیشتەجێکردنی دانیشتوان***

هەبیتاتی (١) یان یەکەمین کۆنفرانسی نیشتەجێکردنی دانیشتوانی ڕێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان، لە ٣١ی ئایار هەتا ١١ی حوزیرانی ١٩٧٦ لە ڤەنکۆڤێری کەنەدا بەڕێوەچوو. یەکێک لە دەرئەنجامە گرنگەکانی ئەم کۆنفرانسە دان پێدانان بەم بابەتە بوو کە کێشەی نیشتەجێکردنی دانیشتوان، کێشەیەکی جیددییە و بۆ پەرەپێدانی ئابووری و کۆمەڵایەتی وەکوو ڕێگایەکی نێوانبڕ وایە. کۆنفرانس توانی بەرنامەی کار و ڕاگەیەنراوێکی کۆتایی دارێژێ. لە بەرنامەی کاری کۆنفرانسدا، ٦٤ پێشنیار سەبارەت بە گەڵاڵەکانی نیشتەجێکردن بەناوی "گەڵاڵەی هەنگاوی ڤەنکۆڤێر" ئامادەکرا.

هەبیتاتی (٢) یان دووهەمین کۆنفرانسی نیشتەجێکردنی دانیشتوانی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ڕێکەوتی ٣ هەتا ١٤ی حوزەیرانی ١٩٩٦ لە ئەستانبولی تورکیا و بە بەشداری ١٧٠ ولاتی جیهان و ٥٠ ڕێکخراوی نێودەوڵەتی بەرێوە چوو. ئەم کۆنفرانسە لەڕاستیدا بەمەبەستی هاوکاری نێودەوڵەتیی بۆ دارشتنی پلانەکانی پەرەپێدانی نیشتمانی و نێودەوڵەتی لە بواری شارنشیی، پەرەپێدانی شارنشینی، ئاوەدان کردنەوە، چاکترکردنی ڕەوشی نیشتەجێکردن و ژینگەی مرۆڤ و دیاریکردنی پێداویستیەکان، سەرمایە نانەوە لە بوارە بناغەیی و خزمەتگوزارییەکاندا، بەرێوە چوو. چۆنیەتی دابینکردنی شوێنی نیشتەجێ بوون بۆ هەمووان لە دونیای شارستانیدا، لە بابەتەسەرەکیەکانی ئەو کۆنفرانسە بوون.

## ***هاوسەنگیی هێزەکان*** — **Balance Of Power**

تیۆری هاوسەنگیی هێزەکان پێیوایە کە هێزی هەر کۆمەڵێک لە ولاتانی کیشوەری ئەورووپا، نابێ لە هێزی کۆمەڵەکانی دیکە زۆرتر بێ، تابەسەر یەکتردا زاڵ نەبن و ئاشتی مسۆگەر بێ. پاراستنی ئەم هاوسەنگیە بۆ ماوەیەکی زۆر بابەتیی سەرەکیی سیاسەتی دەرەوەی بەریتانیا بوو و قۆناغێکی درێژخایەنی ئاشتی لە ١٨٧١ تا ١٩١٤ بە هۆی ئەم سیاسەتەوە لە نێوان ولاتانی ئەڵمانیا، نەمسا، ئیتالیا (یەکیەتیی سێ کوچکە) و ولاتانی بەریتانیا، فەڕەنسا و رووسیا (هاوپەیمانەتی سێ

کوچکە)دامەزرا. لە دوای شەڕی یەکەمیی جیهانیەوە ، تیۆری هاوسەنگیی هێزەکان چووە ناو مێژووی دیپلۆماسیەوە (لە بیرکرا) و بەریتانیا هەتا ساڵی ١٩٣٩ لە بەرامبەر گەورەترین هێزی ئەوروپا، واتە لە بەرامبەر ئەڵمانیادا، سیاسەتی هێمنانەی گرتەبەر. لە دوای ساڵی ١٩٤٥ەوە بەریتانیا هەوڵێکی ئەوتۆی بۆ پاراستنی هاوسەنگیی هێزەکان نەداوە، بەڵام لە بەرامبەردا هەوڵ دراوە کە هێزی رۆژئاوا لە بەرامبەر هێزی رۆژهەڵاتدا زۆرتر بێ.

## هێڵی ٣٨° *Thirty -Eight Parallel*

ئەم زاراوە بە هێڵی ٣٨°ی نیوەگۆی باکووری دەگوترێ کە کۆریای باکوور لە کۆریای باشوور جیادەکاتەوە.

## Country / State

## وڵات

وڵات بە شوێنێکی جوگرافی دەگوترێ کە خەڵکی تێدا نیشتەجێیە، کە لە بواری سیاسیدا سنووری دیاریکراوی نێودەوڵەتی هەیە و لە لایەن دەستەیەک دەسەڵاتدارەوە بەڕێوە دەچێ. بوونی سێ فاکتەری " خاک" ، " دانیشتوان" و" ڕێکخراوی حکومەتی" بۆ پێکهێنانی وڵاتێک پێویستن. ئەگەر دەستەی دەسەڵاتداری وڵات لە بەڕێوەبردنی کارەکانی خۆیان و داڕشتنی سیاسەت و بڕیاردا ئازاد بن و سەربەستانە و بەبێ دەستێوەردانی ڕەسمی وڵاتێکی بیانی، وڵات بەڕێوە ببەن، و سەربەخۆیی ئەو وڵاتەش لە لایەن چەند وڵاتی سەربەخۆی دیکەوە بەرەسمی ناسرا بێ، ئەو وڵاتە سەربەخۆیە و دەنا وەکوو یەکێک لە شێوەکانی کۆلۆنی، لە ژێر سەرپەرەستیاری، وڵاتی کاتیی و ...هتد دەبێ.

## Neutralized State

## وڵاتی بێلایەن (هەمیشەیی)

وڵاتێکە چ لە کاتی ئاشتی و چ لە کاتی شەڕدا بێلایەن بێ و، ئەم بێلایەنیەش لە لایەن وڵاتانی دیکەوە بەرەسمیی ناسرا بێ. بە پێچەوانەی ئەو بێلایەنەی کە تەنیا لە کاتی شەڕی نێوان دوو وڵاتدا، لە لایەن وڵاتی سێهەمەوە رادەگەیەنرێ، راگەیاندنی " بێلانەی هەمیشەیی" یان بێلانەن بوون"، ئەو وڵاتە ناچار دەکا کە لە هەموو کاتەکاندا هەڵسوکەوتێکی بێلایەنانەی هەبێ.

دەسەڵاتە گەورەکان دەتوانن لە بەرامبەر بەڵێنی. لایەنگری نەکردن لە لایەنێک، بە شداری نەکردن لە هەر یەکیەتیەکدا لە لایەن وڵاتی بێلایەنی هەمیشەییەوە، داکۆکی لە بێلایەن بوونی ئەو وڵاتە بکەن و یەکپارچەیی وڵات و سەربەخۆییەکەی بپارێزن. دەبێ ئاماژە بەوە بکەین کە ئەو وڵاتانەی کە لایەنی رێککەوتننامەی بێلایەنی وڵاتێک نین، لە کاتێکدا کە هێرش کرابێتە سەرئەم وڵاتە، ناچار نین کە داکۆکی لە وڵاتی بێلایەن بکەن. ئەوەش روون نیە کە ئایا ئەو وڵاتەی رێککەوتننامەی بێلایەنی مۆر کردووە، لە حاڵێکدا کە نێوەرۆکی رێککەوتننامەکە لە لایەن وڵاتانی دیکەوە رەچاو نەکرێ، ئەو وڵاتە هەروا لەسەر بەڵێنەکەی سوور دەبێ یان نا؟

بەڵام بێلایەنی هەمیشەیی سویسرا ورەنگە بێلایەنی نەمساش بوون بە بە شێک لە یاسای نێودەوڵەتی و عورفی گشتی. دەبێ لە نێوان بارۆدوخی وڵاتێکی بێلایەنبوو و بێلایەنی هەمیشەیی و ئەو وڵاتانەش کە بە شێوەی دوو فاکتۆ(بە بێ هیچ بەڵێنێکی یاسایی) بێلایەنن وەکوو سوید و فینلەندا و زۆربەی وڵاتانی جیهانی سێهەمیش کە لە سیاسەتی بێلایەن بوون پێرەوی دەکەن، جیاوازی دابنێین. بە پێچەوانەی هەلومەرجی یاسایی بێلایەن ( بێلایەنی هەمیشەیی)، بارودۆخی بێلایەن بوون هیچ بنەمایەکی یاسای نێودەوڵەتی نیە.

### وڵاتی نێوان — *Buffer State*

هێندێک وڵات لە بواری کیان و جێگیری سیاسییەوە، قەرزداری بارودۆخی جوگرافی خۆیانن کە کەوتۆتە نێوان دوو وڵاتی بەهێزەوە. ئەم وڵاتانە بە وڵاتانی نێوان بە باوبانگن. وڵاتانی نێوان، بەزۆری لاواز و بێ هێزن کە بە زۆری بەمەبەستی پێشگرتن لە پێکهەڵپرژانی دوو وڵاتی بە هێز پێکهاتوون و یەکپارچەیی وڵات و سەربەخۆییەکەشیان لە لایەن دەسەڵاتە نێودەوڵەتیەکانەوە دەپارێزرێ.

وڵاتانی ئێران، ئەفغانستان و تایلەند لە ساڵەکانی سەرەتای سەدەی بیستەمدا لە وڵاتە نێوانەکان بوون. هەر سێ وڵاتە کە سەربەخۆیی خۆیان زیاتر بە پشتیوانی بەریتانیا و روو سیا دەزانی، تا ئەوەی بە هێز و توانایی خۆیان بزانن. وڵاتی ئەتیۆپیش لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا لە وڵاتە نێوانەکان بوو و بە پێی ئەو رێککەوتننامەی کە لە نێوان وڵاتانی بەریتانیا، فەرەنسا و ئیتالیادا مۆر کرا، وڵاتی ئەتیۆپی گەیشتە سەربەخۆیی. بە لام لە دوایيدا کە وڵاتانی بەریتانیا، فەرەنسا

و ئیتالیا چیدی ئاماده نەبوون بۆ پاراستنی سەربەخۆیی ئەتیۆپی شەڕ بکەن و ئیتالیاش پێوەندی دۆستانەی خۆی لەگەڵ ئەم دوو وڵاتەدا هەروا راگرت، ئەتیۆپی لە لایەن ئیتالیاوە داگیرکرا. ئەگەر وڵاتێکی نێوان ئەوەندە بەهێز بێ کە بۆ خۆی بە تەنیا بتوانێ پاریزگاری لە سنوورەکانی بکا، ئەو وڵاتە ئیدی وڵاتی نێوان نیە. بۆ وێنە سۆئیسرا ئەمرۆکە بە هۆی بوونی هەلومەرجی باشی جوگرافی و بەرگری سروشتی و خەڵکێک کە بڕوایان بە نەریتی ئازادی هەیە و ئابوورییەکی پێشکەوتوویان هەیە، ناتوانێ ناوی وڵاتی نێوان لە سەرخۆیدا بنێ. لە لایەکی دیکەوە باری جوگرافی ئەم وڵاتە لەورووەوە باشە کە چوار دراوسێی هەیە کە بەردەوام لەگەڵ یەکتردا رکابەری دەکەن. لە ساڵی ۱۹۳۸دا کاتێک کە ئەڵمانیا خاکی یەکێک لە دراوسێکانی خۆی ( نەمسا) داگیر کرد و دوو ساڵ دواتریش هێرشی کردە سەر فەڕەنسا، سویسرا ناچار بوو بێلایەنی خۆی رابگەیەنێ تابەم شێوە بتوانێ، سەربەخۆیی و یەکپارچەیی خۆی بپارێزێ. شتێک کە نابێ لەبیرمان بچێ ئەوەیە وڵاتێک کە دەبێتە نێوان، تەنیا بە هۆی هەڵکەوتی جوگرافیەکەیەوە نیە، بەڵکوو ویستی ئەو وڵاتەش بۆ سەربەخۆمانەوە لە تەنیشت دراوسێ بە هێزەکاندا زۆر گرنگە. فینلەندا کە سەرەڕای هەڵکەوتی تایبەتی خۆی لە نێوان دوو بەرەی رۆژهەڵات و رۆژئاوادا توانیویەتی سەربەخۆی خۆی بپارێزێ؛ باشترین وێنەیە بۆئەم حاڵەتە.

## وڵاتی دواکەوتوو — ***Backward Country***

ناوێکی دیکەیە بۆ وڵاتە پەرەنەگرتووەکان. نیشانەکانی وڵاتە دوا کەوتووەکان بریتین لە: نزمی ئاستی تەندروستی و خۆراک، نەخوێندەواری، وەرەزبوون و بێزاربوون، کەمبوونی سەرمایە، جیاوازی قووڵی چینایەتی، دووفاقە بوون یا چەند فاقەبوونی ئابووری، زاڵبوونی کەرتی کشتوکاڵ بە سەرکەرتی پیشەسازیدا، لاوازی سیستەمی دراوی، روونەکردنە بەشی سەرمایەگوزاری، کەمی ژمارەی خاوەن کارە ئابوورییەکان، نەبوونی شێوازی تەکنیکی پێشکەوتوو و نەبوونی رۆحی پەرەپێدان و گەشە سەندن.

زاراوەی وڵاتانی دواکەوتوو لە بەرامبەر وڵاتانی پێشکەوتوو دایە. زۆربەی وڵاتانی جیهانی سێهەم لە وڵاتە تازە سەربەخۆکانی جیهانی سێهەم و ئەو وڵاتانەی پێک دێن کە جاران بە شێوەی

ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ لە ژێر دەسەڵاتی سیاسی، ئابووری، سەربازی و کولتووری کۆلۆنیا لیستەکاندا بوون.

## ولاتی فیدراڵ Federal State

فیدراڵ بە تێکەڵاوبوون یان یەکیەتیی نێوان ئەو کیانە سیاسیانە لەناو ولاتێکدا دەگوترێ کە لە رابردوودا سەربەخۆ یان خودموختار بوون.

ولاتی فیدراڵ بە ئوتۆریتە و دەسەڵاتی راستەخۆ بە سەر هاولاتیەکانیدا، شوناسێکی یاسایی نێودەولەتی یەکگرتوو و تێکەلاو دێنیتە ئاراوە کە ئەندامەکانی ئەو شوناسە نێودەولەتیە تاکەکەسیەی کە جاران هەیانبوو، لە دەستی دەدەن. (ئەگەرچی شوناسی خۆیان لە یاسا نێو خۆییەکاندا دەپارێزن).

دەولەتی ناوەندیی ولاتی فیدراڵ، نوێنەری ولاتانی ئەندام لە بواری کاروباری دەرەوەدایە، سەرەرای ئەمە ولاتی فیدراڵ دەتوانێ رێگابە ولاتانی ئەندام بدا، رۆلێکی بەرتەسکیان لە کاروباری دەرەوەدا هەبێ. (نموونەی ئەم حالەتە لە سویسرا و کۆماری فیدرالی ئەلمان دادەبینرێ ). زەقترین و زۆرترین رادەی ئەم حالەتە، ئەندامەیتی دوو ولاتی ( واتە کۆمارەکانی بیلارۆس و ئوکراینا) یەکیەتی کۆمارەکانی سۆڤیەتی پێشوو لە رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکاندا بوو. ئەندامەتیی ئەم دوو ولاتە لە رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکاندا هۆکاری سیاسیی هەبوو.

## ولاتی بەستراوە (ناسەربەخۆ) Depen dent State

ئەندامێک لە کۆمەلەی نەتەوەکان کە خاوەنی رەوش و هەلومەرجێکی بەرتەسک یان مەرجدارە. پێوەندی نێوان ولاتی بەستراوە لەگەل ولاتێکی دیکەدا بە شێوەیەکە کە دەسەلاتدارەتی یان ئازادی کردەوەی سەربەخۆی ئەوان بە شێوەیەکی رەسمیی( بۆوێنە بە پێی رێککەوتننامە) بەرادەیەک بەرتەسک بۆتەوە کە جۆرە بەسترانەوەیەک بە لایەنێکی دیکە هەیە و پانتاییەکەی لە هاوکاریکردن لە کاروباری دەرەوە هەتا دامەزراندنی هەلومەرجێکی کۆلۆنیالیستی بەربلاوە. هەلومەرجی بەستراوەبوون نابێ لەگەل واقعیەتی سیاسی ئەو ولاتانەی کە لە ژێر پالەپەستۆی

دەرەکی و بەسترانەوەی دوولایەنەی جیهانیدان، تێکەڵاو بکرێ. بە وڵاتانی بەستراوە، وڵاتانی بەکرێگیراو، نیمچەسەربەخۆ و ژێرسەرپەرەستیاریش دەگوترێ.

**وڵاتانی کەمتر پەرەگرتوو**

## Less Developed Countries

وڵاتانی کەمترپەرەگرتوو، وڵاتە هەژارەکانی جیهانی سێهەم لە ئەفریقیا، ئاسیا و ئەمریکای لاتین لە خۆ دەگرێ. هێندێک لە خاوەنرایان پێیانوایە کە هەژارترین وڵاتەکان بە ناوی جیهانی چوارەم جیابکەنەوە. بۆ دیاریکردنی وڵاتێکی کەمترپەرەگرتوو، دەتوانین لەم پێوەرە ئابوورییانە کەڵک وەرگرین : رێژەی بەرهەمهێنانی نەپاڵاوتووی نێوخۆیی، رێژەی بەرهەمهێنانی سەرانەی نێوخۆیی، زۆرتربوونی بەشی تاک لە داهاتی گشتی وڵات. ئەم وڵاتانە یارمەتی ورگرن و یارمەتی نابەخشن و رۆڵێکی کەمیان لە بازرگانی جیهانیدا هەیە .

**وڵاتە سەر بەخۆ هاوبەرژەوەندەکان**

## Commonwealh Of Independent States (CIS)

ئەم زاراوەیە بە یەکیەتیی ژمارەیەک لە کۆمارەکانی سۆڤیەتی پێشوو دەگوترا کە بناغەی رێکخستنەکەی لە سەردەمی هەڵوەشانەوەی سۆڤیەت و لە کۆبوونەوەی ئاڵماتا، ناوەندی قەزاقستان لە ٢١ی کانوونی یەکەمی ١٩٩١دا دامەزرا. ئەو دوازدە کۆمارەی کە لەم دانیشتنەدا بەشدار بوون، بریتی بوون لە:

ئازەربایجان، ئەرمەنستان، ئوزبەکستان، ئۆکراینا، تاجیکستان، تورکەمەنستان، رووسیا، بیلارووس، قرقیزستان، قەزاقستان، گورجستان و مولداڤیا.

گورجستان بریارنامەی کۆتایی کۆبوونەوەکەی مۆر نەکرد. جێگای باسە کەسێ کۆماری دەریای باڵتیک واتە ئیستۆنی، لیتۆنی و لیتڤانیا لە پێش ئەم وڵاتانەدا بەتەواوەتیی سەربەخۆیی خۆیان لە یەکیەتیی کۆمارەکانی سۆڤیەت راگەیاند بوو( ٦ی ئەیلوولە ١٩٩١).

## Ministry of Foreign Affairs — وەزارەتی کاروباری دەرەوە

وەزارەتی کاروباری دەرەوە، ئۆرگانێکی دەوڵەتیە کە بەرپرسی بەرێوەبردنی پێوەندییەکانی دەرەوەی وڵات لەگەڵ وڵاتانی دیکەیە. لە هێندێک وڵات بەم ئۆرگانە دەڵێن

وەزارەتی پێوەندییەکانی دەرەوە. ئەرکەکانی وەزارەتی دەرەوە بریتین لە: وتوویژ، گرێدانی ڕێککەوتننامە لەگەڵ دەوڵەتە بیانیەکاندا، پشتیوانی لەو هاوولاتیانەی کە لە ولاتانی دەرەوەدا دەژین، ئالوگۆڕی نووسراوە لەگەڵ دەولەتەکاندا، ناردن و وەرگرتنی دیپلۆماتەکان، پاراستنی بەلگەی دیپلۆماتیک، پاراستنی بەرژەوندییەکانی ولات لە دەرەوە و جێبەجێکردنی سیاسەتی دەرەوە.

## *وەزیری کاروباری دەرەوە* — *Minister of Foreign Affairs*

یەکێک لە وەزیرەکانی دەوڵەتە کە ئەرکی بەڕێوەبردنی سیاسەتی دەرەوەی ولاتی لە ئەستۆدایەو و لەژێر چاوەدێری سەرۆکی ولات [سەرۆکی دەولەت] یان لە ژێر چاوەدێری پەرلەماندا ئەرکەکەی بەڕێوە دەبا. وەزیری دەرەوە، سەرۆکی وەزارەتی کاروباری دەرەوەیە. وەزارەتی کاروباری دەرەوەش وەکوو وەزارەتەکانی دیکە خاوەن دامووەدزگای ڕێک وپێک لە پایتەختی ولات دایە. بەلام جیاوازییەک کەلەگەڵ وەزارەتخانەکانی دیکەدا هەیەتی ئەوەیە کەئەم وەزارەتخانەیە، جیا لە دامووەزگای ناوەندی، نوێنەرایەتی سیاسی و کۆنسۆلیشی لە ولاتانی دیکەدا هەیە.

ئەمڕۆکە بە پەرەگرتنی پێوەندییە نێودەولەتیەکان و ئەو بایەخەی کە ولاتان بە سیاسەتی دەرەوەی خۆیان و دامەزراندنی پێوەندی لەگەڵ ولاتانی دیکەدا دەدەن، ڕۆڵی وەزارەتی کاروباری دەرەوە زیاتر بووە. بۆیە پلەو پایەیەکی تایبەتی لە حکومەت دا هەیە. و لە ئاکامیشدا وەزیری دەرەوە بەرزترین کاربەدەست لە هیرەمی دیپلۆماتی دایە. ئەرک و دەسەلاتەکانی وەزیری کاروباری دەرەوە بەپێی یاساکانی هەر ولاتێک دیاری دەکرێن کە بە گشتی بریتین:

١ــ بەڕێوەبردنی وەزارەتخانەکەی خۆی (وەکوو وەزیرەکانی دیکە)

٢ــ ناردن و وەرگرتنی دیپلۆماتەکان

٣ــ وتوویژو گرێدانی ڕێککەوتننامە نێودەولەتیەکان

٤ــ دەرکردنی بریاری پێویست بۆ ڕاسپاردە سیاسی و کۆنسولیەکان و فەرمانبەرانی نوێنەرایەتیە سیاسی و کۆنسولیەکانی دەرەوەی ولات

٥ــ پێوەندیی بەردەوام لەگەڵ ڕاسپاردە سیاسییەکانی دەولەتە بیانیەکانی نیشتەجێی ولات

٦_ بەشداریکردن لە کۆبوونەوەکانی سالآنەی کۆمەڵەی گشتی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان و کۆنفرانس و کۆنگرە گرنگە ناوچەیی و نێودەوڵەتیەکان

## Minister Counsellor

### وەزیری موختار

پلەی وەزیری موختار لە پلەی باڵوێز نزمترە. وەزیری موختار لە رابردوودا دەنێردرایە ولآتانی چکۆلە و کەم بایەخ، بەلآم ئەمرۆکە ئەم پۆستە ئاسەوارێکی نەماوە. لە هێندێک ولآتدا وەزیری موختار وەکوو کەسی دووهەم و لە دوای باڵوێز یان لەو کاتانەدا کە باڵوێز لەوێ نەبێ، ئەرکەکانی باڵوێز بەرێوەدەبا. و لە حاڵەتێکدا کە وەزیری موختار نازناوی "سەرۆکی راسپێردراو"ی هەبێ، دەبێ وەکوو باڵوێز رێورەسمەکانی ناساندن و پێشکەش کردنی بروانامە جێبەجێ بکا.

## Negotiation

### وتووێژ

شێوازێکی دیپلۆماسیە کە نوێنەرانی ولآتەکان، راستەوخۆ یان لە رێگای نووسینەوە سەبارەت بەو بابەتانەی کە بۆتە نیگەرانی بۆ هەر دوولایەن، باس و راوێژ دەکەن و بۆ چارەسەری ئەوکێشانەی کە هاتوونەتە بەردەم پێوەندییەکانیان هەوڵ دەدەن. وتووێژە دیپلۆماتیەکان، چ دوولایەنە بن و چ فرەلایەنە بن ، کۆنترین و باوترین شێوەکانی چارەسەری ئاشتیانەی کێشە نێودەوڵەتیەکانن. لەمێژە کە ولآتان بەرلەوەی پەنابەر بەر زۆر و هێز، ناچار کراون کە لەگەڵ یەکتردا وتووێژ بکەن و وتووێژ بۆتە یاسایەکی گشتی لە یاسا عورفیە نێودەوڵەتیەکاندا . ئەمرۆکە ئەم یاسایە لە زۆربەی ئەورێککەوتننامانەدا گونجێنراوە کە لەژێر چاوەدێری UN گرێ دەدرێن. بەندی ١ی ماددەی ٣٣ی پێرەوپرۆگرامی UN دیاریکردووە کە هەر کاتێک لە نێوان دوولایەندا، کێشە سەریهەڵدا (کە درێژە خایاندنی ئەم کێشانە رەنگە ببێتە مەترسیی بۆ سەر ئاسایش و ئاشتی نێودەوڵەتیی)، لایەنەکانی کێشەکە، دەبێ لە پلەی یەکەمدا، بەشێوەیەکی ئاشتیانە، کێشەکانیان چارەسەر بکەن. هەروەها لە زۆربەی ئەو رێککەوتننامانەی کە سەبارەت بە چارەسەری کێشەکان هاتوونە ئاراوە، بە شێوەی نارەسمی باس لەوە کراوە کە ولآتان بۆ چارەسەری کێشەکانیان، ناچارن کە لەگەڵ یەکتردا وتووێژ بکەن .

### وتوویژی دامبارتۆن ئۆکس (١٩٤٤) ***Dumbarton Oaks***

وتوویژەکانی دامبارتۆن ئۆکس کە لە ٢١ی مانگی ئاب تا ٧ی تشرینی یەکەمی ١٩٤٤ لە شاری واشینگتۆن لە نێوان نوێنەرانی ولاّتانی ئەمەریکا، بەریتانیا، یەکیەتیی سۆڤیەت و چیندا بەرێوە چوون، گەلاّلەیەک بوو لە ژێر ناوی پێشنیارەکانی دامبارتۆن ئۆکس بۆ دامەزراندنی رێکخراوێکی گشتی نێودەولەتی. ئەم گەلاّلە نێردرایە هەموو ولاّتانی هاوپەیمان تاکوو سەبارەت بە نێورۆکی ئەم گەلاّلە، بیروبۆچوونی خۆیان دەربرن. ئەم وتوویژانە لە کۆنفراسی ئیتالیا و پاشان لە کۆنفرانسی سەن فرەنسیسکۆشدا هاتنە بەرباس و بوونە هۆی پێکهێنانی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان UN.

### وتوویژی شارستانیەکان

### ***Dialogue Among Ciriliziation***

گەلاّلەیەک بوو لە بەرامبەر تیۆری " پێکدادانی شارستانیەتەکان". ئەم تیۆرە پێیوابوو بە جێگەی پێکدادان، دەولەتەکان دەتوانن لە رێگای دیالۆگەوە کێشەکانیان چارەسەر بکەن. پێشنیاری وتوویژی شارستانیەتەکان سەرەتا لە کۆبوونەوەی سەرۆکانی ولاّتانی ئەندامی رێکخراوی کۆنفرانسی ئیسلامی لە تاران (١٣٧٦) لە لایەن سەیدمحەممەدی خاتەمی، سەرۆک کۆماری ئیسلامی ئێران و پاشانیش لە دوازدەهەمین کۆبوونەوەی سەرۆکانی ولاّتانی بزووتنەوەی بێلایەنەکان لە دوربانی ئەفریقیای باشوور (١٩٩٨) و لە ئەیلوولی هەمان سالّدا لە کۆمەلّەی گشتی رێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان لە نیۆیۆرکدا هاتە گۆرێ. کومیتەی گشتی UN لە کۆبوونەوەی ٢٣ی تشرینی یەکەمی ١٩٩٨ بە تێکرای دەنگەکان، پێشنیاری ئێرانی خستنە ناو بەرنامەی کۆبوونەوەکە و لە ئاکامیش دا لە ٤ی تشرینی دووهەم و بەتێکرایی دەنگەکان ، سالّی ٢٠٠١ یان بە ناوی سالّی وتوویژی شارستانیەتەکان ناونا.

### ولاّتی ناخودموختار

### ***Non - Self - Gorerning Territoy***

زاراوەیەکە کە لە لایەن رێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکانەوە سەبارەت بە ولاّتێک کەلکی لێ وەردەگیردرێ کە بەبێ لەبەرچاو گرتنی ناوەکەی( ولاّتی بیانی، ولاّتی ئەودیوی ئاوەکان، ویلایەتی ئەودیوی ئاوەکان، بەستراوە، ولاّتی خودموختار، ناوچە یان تەنیا کۆلۆنی) لە ژێر

چاوەدێری دەسەڵاتێکی کولۆنیالسیتی دایە. ماددەی ٧٣ ی جاڕنامەی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان هەموو وڵاتانی ئەندام بەبەرپرسی بەڕێوبردن و چاوەدێریکردنی ئەم وڵاتانە بەمەبەستی بردنە سەری ئاستی بەختەوەری و خۆشگوزەرانی دانیشتوانی ئەم وڵاتانە دادەنی (لەوانە گەرەنتی کردنی پێشکەوتن لە بوارە سیاسی، کۆمەڵایەتی و ئابووری ، زانستیەکاندا )دا. کە بە شێوەیەک یارەمەتیان بدرێ کە بۆ خۆیان بتوانن پەرە بە دامەزراوەکانی خۆیان بدەن.

***Sub Cultural***

***وردە کولتوور***

بریتیە لەچوارچێوەیەک لە بیروبۆچوون، بەها، بڕوا و هەڵسوکەوتی هاوبەش لە نێوان ئەندامانی گرووپ یان توێژێکی تایبەتی لە نێوکۆمەڵگایەک دا کە ئەم چوارچێوە کولتووریە کاریگەریەکی قووڵ لەسەر ئەندامانی خۆی دادەنێ. وردە کولتوور، کولتووری کەمایەتیە.

## Alliance

### یەکیەتی

بریتیە لە بەڵێنی دوو یان چەند دەوڵەت لە بەرامبەر یەکتردا بۆ دابینکردنی پێداویستی و هاوکارییە سیاسی و سەربازییەکانی یەکتر لەکاتی شەڕ هەڵایساندا.

## Balkan Entente

### یەکیەتیی باڵکان (١٩٣٤)

یەکیەتی نێوان یۆگۆسلاڤیا، یۆنان رۆمانیا و تورکیا بوو، کە لە ساڵی ١٩٣٤دا لە دژی داواکارییەکانی بولگاریا پێک هات. بولگاریا داوای بەشێکی گەورە لەو ناوچانەی دەکرد کە لە دوای شەڕی یەکەمی جیهانی ببوون بەبەشێک لە خاکی ئەو وڵاتانەی ناو ئەو یەکیەتیە .

## Unity For Freedom

### یەکیەتی بۆ ئازادی

رێکخراوێکی سیاسی بوو کە لە ساڵەکانی ١٩٠٤ و ١٩٠٥دا لە رووسیا چالاکی دەکرد و لە شارە گەورەکانی وەک پترێزبۆرگ و خارکیفیشدا چەندین لقی هەبوو. ئەندامانی ئەو رێکخراوە خوازیاری بەڕێوەچوونی هەڵبژاردنی گشتیی سەربەخۆ و ئازاد، جێبەجێکردنی دەستوور،

پاراستنی بەرژەوەندییەکانی کرێکاران، مافی دیاریکردنی چارەنووسی گەلان و پێکهێنانی فیدراسیۆنی سەربەخۆ بوون.

### یەکیەتیی سۆڤیەت *The Soviet Union*

ئەم زاراوەیە کە ناوە تەواوەکەی " یەکیەتیی کۆمارەکانی سۆڤیەتی سۆسیالیستی "یە، بە وڵاتێک دەگوترێ کە لە دوای سەرکەوتنی شۆڕشی تشرینی یەکەمی ١٩١٧ لە سەر دەستی لنین دامەزراو، لە ڕێکەوتی ٢٥ی کانوونی یەکەمی ١٩٩١ بەڕەسمی هەڵوەشایەوەو، کۆمارەکانی بە سەر پازدە وڵاتی سەربەخۆدا دابەش بوون، یەکیەتیی سۆڤیەت کە بە سیستەمێکی کۆمۆنیستی ئیدارە دەکرا، جگە لە پازدە کۆماری یەکگرتوو، خاوەنی ٢٠ کۆماری؛ ٨ ناوچە و ١٠ بەشی خودموختاریش بوو. ئەو کۆمارانەی کە دوای هەڵوەشانەوەی یەکیەتیی سۆڤیەت سەربەخۆ بوون و، بوون بە ئەندامی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان، بریتین لە:

١ــ ئازەربایجان ٢ــ ئەرمەنستان ٣ــ ئوزبەکستان

٤ــ ستۆنیا ٥ــئۆکراینا ٦-تاجیکستان

٧ــ تورکەمەنستان ٨ــ [فیدراسیۆنی] ڕووسیا ٩ــ بیلا ڕووس

١٠ــ قرقیزستان ١١ــ قەزاقستان ١٢ــ گورجستان

١٣ــ قەزاقستان ١٤- لیتوانیا ١٥ ــ لیتۆنی

١٦ــمۆڵداڤی

سەرۆکەکانی سۆڤیەت لە کاتی دامەزرانی سۆڤیەت بریتین لە :

١ــ ڤلادیمیر لنین (١٩٢٤ــ ١٩١٧) ٢ ــ ژۆزێف ستالین (١٩٥٣ــ ١٩٢٤)

٣ــ نیکیتا خرۆشچۆف (١٩٦٤ــ ١٩٥٢) ٤ــ لئۆنید برژنێف (١٩٨٢ــ ١٩٦٤)

٥ــیۆری ئاندرۆ پۆف (١٩٨٤ــ ١٩٥٢) ٦ــکنستانتین چرنیکۆف (١٩٨٥ــ ١٩٨)

٧ــمیخائیل گۆرباچۆف (١٩٩١ــ ١٩٨٥)

### یەکیەتیی سێ کوچکە *Triple Alliance*

ئەم زاراوە سەبارەت بەو ڕێککەوتننامانە کەڵکی لێ وەردەگیردرێ:

١ــ یەکیەتیی نێوان بەریتانیا، سوید و هۆڵەندا لە دژی فەڕەنسا (١٦٦٨).

٢_ یەکیەتیی نێوان بەریتانیا، فەڕەنسا و هۆڵەندا (١٧١٧).
٣_ یەکیەتیی نێوان ئەڵمانیا، نەمسا _ هەنگاریا و ئیتاڵیا (١٨٨٢)

### یەکیەتیی دوولایەنە **Dual Alliance**

بە یەکیەتی یان ڕێککەوتنی دوولایەنەی نێوان ڕووسیای تیزاری و دەوڵەتی فەڕەنسا دەگوترێ. ئەم یەکیەتیە لە ساڵی ١٨٩٣ هەتا شۆڕشی کۆمۆنیستی ڕووسیا لە تشرینی یەکەمی١٩١٧دا، درێژەی هەبوو.

### یەکیەتیی پیرۆز (١٨١٥) **Holy Alliance**

لە کانوونی یەکەمی ١٨١٥دا، تیزار ئەلکساندەری یەکەمی شای ڕووسیا، فرانسێسی یەکەمی ئیمپراتۆری نەمسا و فریدریک ویلهێلمی سێهەمی شای پرووس پەیماننامەیەکیان مۆر کردو، بەپێی ئەوە، بناغەی "یەکیەتیی پیرۆز"یان داڕشت و، دواتر زۆربەی شاکانی ئەورووپا چوونە نێو ئەم یەکیەتیەوە. یەکیەتیی پیرۆز یەکیەتیی شاکانی ئەورووپا بۆ سەرکوتی جووڵانەوە ڕزگاریدەرە نەتەوەیی و بزووتنەوە شۆڕشگێرییەکان بوو. ئەم یەکیەتیە، کۆنەپەرسترین ڕێکخراوی نێونەتەوەیی بوو کە تاکوو ئەوکات لە جیهاندا دروست ببوو، تەنیا ئامانجیشی پێشگیریکردن، خاشەبڕکردن و تێکشکاندنی شۆڕشە شۆڕشگێرییەکان لە هەموو ناوچەکانی جیهاندا بوو.

هەموو هێزە کۆنەپەرستەکانی ئەورووپا پشتیوانیان لە یەکیەتیی پیرۆز دەکرد و، لەو یەکیەتیە بۆ بەربەرەکانی لەگەڵ هەرجۆرە " جیابیرییەک" کەڵک وەردەگیرا. لە کلیسا، بەتایبەتی کلیسای کاتۆلیک بە هەموو لق و پۆپەکان و دەست و پێوەندە شاراوەکانی، سیخووڕی، ڕاپۆرتچی، نامەی بەناو نیشان و لێکۆڵینەوە نهێنیەکان لە هەموو شوێنێک، بۆ خاشەبڕکردنی "داهێنانی شۆڕشگێری" کەڵک وەردەگیرا.

ئامانجی سیاسەتی کۆنەپەرستانەی پاشا فئوداڵەکان لە پلەی یەکەمدا بۆ دواوە گەڕاندنەوەی ئاراستەی مێژوو بوو، چوونکە بە بڕوای ئەوان، ئەوەی کە لە سەردەمی شۆڕشی فەڕەنسادا ڕووی دا بوو هیچکات لە مێژوودا نەبووە و، لە پلەی دووهەمیشدا دووبارە گەڕانەوە بۆ سیستەمی کۆنی بەر لە ڕووخانی باستیل بوو. بیرمەندانی کۆنەپەرست بە چاوی سووکەوە سەیری

ئەدەبیاتی سەردەمی رۆشنگەریان دەکرد و، هەوڵیان دەدا " بروای ئایینی رزگاریدەر"ی لە بەرامبەر دابنێن و، پروپاگەندە بۆ پیرەوی ملکەچانە لە دەسەڵاتە سەرەرۆکان بکەن. گابریەل بۆناڵد لە کتێبەکانیدا پێویستیی گەرانەوەی سیستەمی چینایەتی کۆن و دەسەڵاتی کەنیسەی دەسەلماند. لودڤیک هالەر بەتووندی خوازیاری پیرەوی بێ ئەملاوئەولا لە دەسەڵاتی رەهای پاشاکان بوو. ژۆزێف دوو میستەر، ستایشی رێکخراوی پشکنینی بیروراکانی وەک سەنگەری بەرگریی کۆمەڵگا دەکردو، زانستە سروشتیەکانی پرۆتستۆ دەکردو، پێشنیاری دەکرد کە بۆ پێشگیریکردن لە بڵاوبوونەوەی زانست لە نێو خەڵکی رەش و رووتدا چارەیەک بدۆزێتەوە.

بەڵام چالاکیی ئەوانە تەنیا لە زمان و نووسیندا کورت نەدەبۆوە. بۆربۆنەکان زۆر بێ بەزەییانە بەدوای کەسانی لێهاتوو و ناسراوی بزووتنەوەی شۆرشگێریی سەردەمی ناپلیۆنەوە بوون. زۆر لەو کەسانە بەبێ دادگایکردن لە سێدارە دران و، دادگا تایبەتیەکانیان هەزار کەسی دیکەیان بە زیندانیی درێژماوە مەحکووم کرد. لە ساڵی ١٨٢٥دا، لە سەردەمی پاشایەتیی شارڵی دەیەم (١٨٣٥-١٨٢٤) بەپێی یاسایەک، بریاردرا کە برێکی بەرچاو پارە بە کۆچەرانی پێشوو وەک قەرەبووکردنەوەی ئەو زەوی و زارانەی کە لە سەردەمی حکومەتی شۆرشگێردا دەستیان بە سەردا گیرابوو، بدرێ. هەر لەو ساڵەدا یاسایەکی تر پەسند کرا، کە بریاردرا سزای توونی بە سەر ئەو کەسانەدا.بسەپێ کە سووکایەتی بە پیرۆزییەکانی کلیسا دەکەن یان کاری پێچەوانەی رێ و شوێنی کلیسا ئەنجام دەدەن: لە هێندێک حاڵەتدا سزادان بە شێوەیەک بوو کە دوای برینی دەستی راستی تاوانبار، مەحکووم بە کوشتن بە گیوتین دەبوو. فرێدنیاندی حەوتەم (١٨٣٣-١٨١٤) لە ئیسپانیا دەستووری ساڵی ١٨١٢ی هەڵوەشاندو، سەرلەنوێ رژێمی ترسناکی سەرەرۆی دامەزراند. جارێکی تر ئیسپانیا کەوتە دەستی ئاریستۆکراتە فیۆدالەکان و گەورەکان کلیساوە، لەسەر بریاری دادگا، لەو کاتەوە سووتاندنی خەڵک ، بووبە کارێکی رۆژانە. لە هەرێمە جۆراوجۆرەکانی ئیتالیاش گۆرانکارییەکی لەم شێوەیە رووی دا. تەنانەت لە بەریتانیاش کە رێککەوتنامەی " یەکیەتیی پیرۆز"ی مۆر نەکردبوو و، بە پێشکەوتووترین وڵاتی ئەورووپا بەناوبانگ بوو، کۆنەپەرستی بەلوتکەی دەسەڵاتی خۆی گەیشت.

ئەم کۆنەپەرستیە بە هەموو دڕندایەتیەکەیەوە نەیدەتوانی ئاراستەی مێژوو بۆ پاشەوە بگێرێتەوە. ئەو گۆرانکارییە مەزنانەی کە پێکهاتەی کۆمەڵایەتیی وڵاتانی ئەورووپا و ئەمەریکای

گۆڕی، بوو بە هۆی بەهێزبوونی پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی بۆرژوازی و سەرهەڵدانی چینێکی گەورەتر و بەهێزبوونی هەستی نەتەوایەتی لە نێو گەلانی جیهاندا. تۆڵە ئەستاندنەوەی دڕندانەی کۆنەپەرستی فیۆدالی ـ کلیسا بوو بە هۆی ئەوەی ئەو هەستە خۆی بنوێنێ. ئەوکاتە کۆمەڵێک بزووتنە و راپەڕین لە نێوان ساڵەکانی ٢٩-١٨٢٠و ٣٩-١٨٣٠ روویاندا. دەرئەنجامی ئەو بزوتنەوە و راپەڕینانە زۆر جیاواز بوو و، زۆریشیان سەرکوت کران بەڵام بەوحاڵەش کاریگەری خۆیان لەسەر چارەنووسی ئەو خەڵکەی کە بۆ بەرگری لە ئازادیی خۆی راپەڕیبوون، جێهیشت.

## *Hashemite Union* — *یەکیەتیی هاشمی*

لایەنگرانی " جمال عەبدوالناسر" بە رێککەوتننامەی "یەکیەتیی عەرەب"یان دەگووت، چوونکە ئەو رێککەوتننامە، دووکەس لە ئەندامانی بنەماڵەی هاشمی واتە مەلەک فەیسەڵ و مەلەک حوسێنی سەرەڕای رکابەری سیاسی و کێشەی خێزانی، لە ژێر گوشاری لە رادەبەدەری ناسر، یەکگرتوو کرد و لە پاڵ یەکی دانان. دامەزرێنەرانی ئەو رێککەوتنە، پێیان ناخۆش بوو کەبەو رێککەوتنە بگوترێ، یەکیەتیی هاشمی. بەڵام ئەو ناوە زۆر بە خێرایی زیاتر لە ناوە راستەقینەکەی خۆی لە هەموو شوێنێکدا بڵاو بۆوە. بیرۆکەی دامەزراندنی ئەو رێککەوتننامە " نوری ئەلسەعید" سەرۆک وەزیرانی عێراق بوو و جێبەجێکارانیشی "برهان ئەلدین باش اعیان" ( وەزیری کاروباری دەرەوەی عێراق)، "سمیر ئەلرەفاعی" ( وەزیری کاروباری دەرەوەی ئۆردۆن) و هیتر، ( جێگری وەزیری کاروباری دەرەوەی بەریتانیا ) بوون. دامەزرانی یەکیەتیی عەرەبی لە رێکەوتی ١٤ ی شوباتی ١٩٥٨دا راگەیەنرا. گرێدانی رێککەوتنەکە هۆکاری جۆراوجۆری هەبوو. لەو سەردەمەدا نفووزی مەعنەویی " عبدولناسر" هەموو ناوچەی رۆژهەڵاتی نێوەڕاستی ـ بە تایبەتی وڵاتانی عەرەب_ خستبووە ژێر کاریگەریی خۆی. لە رێکەوتی یەکی شوباتی هەمان ساڵدا، پاش دووساڵ وتووێژ، بەڵگەنامەی یەکیەتیی میسر و سووریا لە نێوان "شوکری ئەلقوتلی " و "عبدولناسر "مۆر کراو، وڵاتێکی تازەی بە ناوی " کۆماری یەکگرتووی عەرەبی" لێکەوتەوە. لەو بەڵگەناویەدا بە ئاشکرا داوا لە هەموو نەتەوەکانی عەرەب کرابوو کە مەبەستی وەدیهێنانی ئایدیا نەتەوەییەکانی عەرەب، شەڕ لە گەڵ کۆلۆنیالیزم و سەهیۆنیزم و خاوێن کردنەوەی ناوچەکانی ژێر نفووزی ئەمپریالیزم، لەدەوری ئەو کۆمارە نوێیە کۆببنەوە و، دەوڵەتەکانی خۆیان ناچار بکەن، بێنە نێو ریزی

ئەم کۆمارە. لە وڵاتانی تونس، لوبنان، عێراق، ئۆردۆن و یەمەن خۆپیشاندانی بەرین بۆ پیشتیوانیکردن لە کۆماری یەکگرتووی عەرەبی وەڕێ خرا و، خەڵکی ئەم وڵاتانە خوازیاری چوونە نێو ئەم کۆمارە بوون.

لە لایەکی تر، هەتا ئەوکاتە هەوڵێکی زۆر بۆ بە ئەندامبوونی ئۆردۆن لە پەیمانی بەغدا درابوو کە هەموویان لەگەڵ ناکامی دا بەرەوڕوو ببوون. "عبدالناصر" زۆر بە توندی هەوڵی بۆ هەڵوەشاندنەوەی پەیمانی بەغدا، یان لانی کەم دەرهێنانی عێراق لەو پەیمانە، دەدا.

هەر ئەو رۆژە کە بەڵگەنامەی دامەزرانی کۆماری یەکگرتووی عەرەبی مۆر کرا، مەلەک حوسێنیش سەرکردەکانی عێراقی بۆ نێو یەکیەتیەکە بانگهێشت کرد. لە ڕێکەوتی ١١ی شوبات، مەلەکە فەیسەڵ لەگەڵ وەزیرانی کاروباری دەرەوە، دارایی، داد و راوێژکارانی ئابووری و سەربازی چووە پایتەختی ئۆردۆن و، سێ رۆژ دواتر، یەکیەتیی ئۆردۆن و عێراق لە لایەن مەلەک حوسێن و فەیسەڵ راگەیەنرا. بەشێک لە خاڵەکانی پێڕەوی یەکیەتیەکە بە کورتی بەم شێوەیە بوو:

عێراق و ئۆردۆن بەپێی سیستەمی پەروەردەی هاوبەش و پێکهێنانی سوپایەکی یەکگرتوو بە ناوی " سوپای عەرەبی"، یەک دەگرن و، بیرۆکراتیەتی ڤیزە و گومرگی نێوان ئەم دوو وڵاتە هەڵدەوەشێتەوە.

هەردوو وڵات کەسایەتیی نێونەتەوەیی، سیستەمی هەنووکەیی وسەربەخۆیی خۆیان دەپارێزن و، دەبن بە یەکیەتیەک؛ بەڵام لە داهاتوودا هەوڵ دەدەن لە بواری سیاسەتی دەرەوەشدا، سیاسەتێکی هاوبەشیان هەبێ و، هەروەها هەوڵ دەدەن ئابووری دوو وڵاتیش تێکەڵ بەیەکتر بکەن.

سەرۆکی یەکیەتیەکە، پاشای عێراق و، لە نەبوونی ئەویشدا پاشای ئۆردۆن، دەبێ بە سەرۆک. فیدراسیۆن خاوەنی پەڕلەمان و ئەنجومەنی وەزیرانی فیدڕاڵە. پەڕلەمانی فیدراڵ ٤٠ نۆینەری هەیە کە بە شێوەیەکی یەکسان لەهەر وڵاتێک، ٢٠ کەس هەڵدەبژێردرێن. پایتەختی یەکیەتیەکە ٦ مانگ لە عێراق و ٦ مانگیش لە ئۆردۆن دەبوو.

***یەکیەتیی حەوتەوانەی موجاهدینی ئەفغان***

ڕێککەوتنێکی نێوان ئەو حیزبە ئەفغانیانەیە کە لە ساڵی ١٩٨٦دا پێکهات:

١ــ حیزبی ئیسلامی ــ گولبەدین حیکمەتیار

٢ــ حیزبی ئیسلامی ــ یۆنس خالس

٣ـ کۆمەڵی ئیسلامی ـ بورهانەدین رەببانی
٤ـ بزوتنەوەی شۆڕشی ئیسلامی ـ مەولەوی محەمەد نەبی
٥ـ یەکیەتیی ئیسلامیی ئەفغانستان ـ عەبدولڕەسوڵ سەییاف
٦ـ بەرەی رزگاریی نەتەوەیی ـ سبغەتوڵلا مجددی ٧ـ برایەتی نەتەوەیی ئیسلامیی ئەفغانستان ـ پیرسەید ئەحمەد گەیلانی.

## یەکیەتیی ئەوروپا **European Union (EU)**

ڕێکخستنێکی نێوان وڵاتانی ئەوروپایە کە لە : کۆمەڵەی ئابووریی (بازاڕی هاوبەش)؛ کۆمەڵەی خەڵووز و پۆڵای ئەوروپاو؛ کۆمیسیۆنی وزەی ئەتۆمیی ئەوروپا پێکهاتووە. پێکهاتەی هەمیشەیی یەکیەتیی ئەوروپا، ئەنجوومەنی وەزیران، یەک کۆمیسیون، پەرلەمانی ئەوروپا و دیوانی داد لە خۆ دەگرێ. مەبەست لە پێکهێنانی یەکیەتیی ئەوروپا دەستەبەرکردنی یەکیەتیی ئابووری، گەشەی کۆمەڵایەتی و لە دەرئەنجامیشدا یەکیەتیی سیاسی لە نێوان وڵاتە دیمۆکراتیکەکانی ئەوروپا دایە. یاسا و ڕێساکانی ئەم یەکیەتیە لە ٣١ ی کانوونی یەکەمی ١٩٩٢ وە جێبەجێ دەکرێن.

بەپێی، پێرەوپرۆگرامی یەکیەتیی ئەوروپا، هیچ بەربەستێک ناخرێتە بەردەم ئاڵ وگۆڕی شتومەک، خزمەتگوزاری، سەرمایە، کرێکار و گەشتیاران. وڵاتانی ئەندام لە ماستریخت (هۆڵەندا)، چاویان پێک کەوت. ئەندامانی یەکیەتیی ئەوروپا، چەندین ڕێککەوتننامەیان لە سەر یەکەی پارە و یەکیەتیی سیاسی گرێ دراو، لە سەر ئەو پرۆتۆکۆلانەی خوارەوە ڕێک کەوتن:

ـ پێکهێنانی دراوێکی یەکگرتوو (ئەم دراوە لە ژێر ناوی " یۆرۆ" لە کانوونی دووهەمی ٢٠٠٢ وە وەگەڕ کەوت)
ـ پێکهێنانی سیاسەتێکی دەرەوەی یەکگرتوو بۆ ئەندامان.
ـ پێکهێنانی ڕێبازێکی بەرگریی هاوبەش لە ژێر فەرماندەیی یەکیەتیی ئەوروپا.
ـ یەکیەتیی ناوبراو پێشەنگی ڕێبازێکی کۆمەڵایەتی یەکگرتوو دەبێ.
ـ بردنەسەری ئاستی یارمەتیەکان بە هەژارترین ئەندامانی یەکیەتیەکە.
ـ زیاد کردنی دەسەلاتی پەرلەمانی ئەوروپا.

سەرۆکەکانی ولآتانی ئەندامی یەکیەتیی ئەوروپا لە کۆبوونەوەی ٢٠ی حوزیرانی ٢٠٠٣دا، رەشنووسی دەستووری ئەم یەکیەتیەیان کە لە لایەن دەستەیەک بە سەرۆکایەتی ڤالێری ژیسکاردیستێن دارێژرابوو، وەک بنەمای دەستووری داهاتووی ئەم یەکیەتیە ، پەسند کرد.

ژمارەی ئەندامانی یەکیەتیی ئەوروپا لە ساڵی ٢٠٠٤ دا لە ١٥ ئەندام بۆ ٢٥ ئەندام زیادی کرد کە بریتین لە :

ئەڵمانیا، نەمسا، ئیسپانیا، ستۆنیا، سلۆڤاکیا، سلۆڤانیا، ئیتاڵیا، ئیرلەندا بەریتانیا، بەلژیکا، پۆرتوگال، چیک، دانیمارک، سوید، فەڕەنسا، فینلەند، قوبروس، لیتۆنی، لۆکزامبۆرگ، لیتوانیا، پۆلەندا، مالت، هەنگاریا، هۆڵەندا و یۆنان.

### یەکیەتیی ئەوروپای رۆژئاوا(١٩٥٥)
### Western European Union (WEU)

ئەم زاراوەیە بە پێشنیارێک دەگوترێ کە لە رێکەوتی ٥ی مانگی ئایاری ساڵی ١٩٥٥ لە لایەن بەریتانیاوە ئاراستە کرا، تاکوو ئەڵمانیای رۆژئاوا بتوانێ لە چوارچێوەی رێکخراوێکی نێودەوڵەتی و لە ژێر کۆنترۆڵ و چاوەدێریی ئەم رێکخراوەدا جارێکی تر چەکدار بێتەوە. ئەم رێکخستنە لە راستیدا ئەو رێکخراوەیە کە بەپێی رێککەوتنامەی ١٩٨٤ ی برۆکسێل دامەزرا بوو، کە سەرلە نوێ ژیایەوە وە بەرهەمهێنانی چەکە ئەتۆمی، بایۆلۆجی و کیمیاییەکانی لەم ولآتەدا قەدەغە کرد.

### یەکیەتیی دیمۆکرات مەسیحیەکان
### Christlisch – Democratisch Union

ئەم ناوە بە حیزبێکی سیاسیی ئەڵمانیا دەگوترێ کە دوای شەڕی دووهەمی جیهانی لە لایەن کۆنراد ئادنائێر و لۆدڤیگ ئەرهارد دامەزرا. حیزبی دیموکرات مەسیحی خاوەنی بیروبۆچوونی راستی میانەڕۆ بوو، لە هێندێک بواریشدا کۆمەڵێک تایبەتمەندیی حیزبی میانڕوی کاتۆلیکی بە میرات وەرگرتبوو.

### یەکیەتیی هاو پێوەندیی ئەمریکای لاتین (١٩٨٠)
### *The Latin American Integration Association*

ئەم یەکیەتیە کە بە " ئالادی"
ALADI (Association Latinoamericana de Integracion) یش بەناوبانگە، لە ٣٠ی کانوونی یەکەمی ١٩٨٠دا بوو بە جێنیشنی ناوچەی ئازادی بازرگانی ئەمەریکای لاتین ــ لافتا. Latin American Free Trade Aream(LAFTA) کە لە ڕێکەوتی ٢ی حوزەیرانی ١٩٦١دا پێک هاتبوو تاکوو بە کەمکردنەوەی کۆت وبەندی بازرگانی لە نێوان ولاّتانی ناوچەکە، خزمەت بە باشترکردنی بارۆدۆخی ئابووری بکا. ئەندامانی یەکیەتیەکە بریتی بوون لە: ئەرژەنتین، بۆلیڤیا، بەرازیل، شیلی، کۆلۆمبیا، ئیکڤادۆر، مەکسیکۆ، پاراگوا، پیرۆ، ئورۆگووا و ڤەنزۆێلا. ناوەندی ڕێکخستنی ئەم یەکیەتیە لە مونتەڤیدیۆی ئورۆگووایە.

### یاسای کۆنسۆلی **Consular Law**

یاسای کۆنسۆلی هەروەک یاسای دیپلۆماتیک بە کۆی ئەو ڕێوشوێنانە دەگوترێ کە چاوەدێری بەسەر بەشێک لە پێوەندیەکانی دەرەوەی دەوڵەتێکدا دەکا، بەلاّم تارادەیەک لەگەڵ یاسای دیپلۆماتیکدا جیاوازی هەیە. یاسای دیپلۆماتیک لایەنی سیاسی هەیەو، بە واتایەکی تر، چاوەدێری بەسەر پێوەندییە سیاسیەکانی ولاّتێک لەگەڵ ولاّتانی تردا دەکا. یاسای کۆنسۆلی لایەنی ئیداری هەیەو، ئەرکەکەشی، پاراستنی بەرژەوەندیەکانی هاوولاتیانی دەوڵەتەکەی لە دەرەوەو؛ هەروەها بەڕێوەبردنی کاروباری ئەوانە کە بە ئەرکێکی ئیداری دەژمێردرێ. هەر بۆیە جیاوازییەکە ئەوەیە کە فەرمانبەری دیپلۆماتیک، فەرمانبەری سیاسیی دەوڵەتێکی ترە. کێشە لە سەر سەلاحییەت و ئیمتیازەکانی فەرمانبەرێکی دیپلۆماتیک لەگەڵ فەرمانبەرێکی کۆنسۆل لەوە سەرچاوە دەگرێ کە یەکەمیان تایبەتمەندی نوێنەرایەتیی سیاسیی دەوڵەتێکی هەیە، بەلاّم فەرمانبەری کۆنسۆل ئەم تایبەتمەندیەی نیە.

### یاداشتی لێک تێ گەیشتن **Agreed Minutes**

پوختەی وتووێژی ڕێککەوتنی دوولایەنە. مەبەست لە یاداشتی لێک تێ گەیشتن، پوختەیەکە کە لە وتووێژی دوولایەنەکان ئامادە کراوە و سەردێرەکانی تێدا دەگونجێنرین و ڕەنگە

لە دوای گرێدانی ڕێککەوتننامەیەک وێرای وتووێژە زارەکیەکان، پوختەیەک لە وتووێژەکان بخەنە سەر ڕێککەوتننامەی پێشوو و بەم شێوەیە ئالوگۆڕ لە نێوەرۆکی ڕێککەوتننامەکەدا پێک بێنن.

### یاداشتی زارەکی — *Verbal Note*

یادشتی زارەکی، نامەیەکە کە دەدرێتە نوێنەری سیاسی یان وەزارەتی دەرەوەی دەوڵەتی بەرامبەری یاداشت، بەڵام هەر پێی دەڵێن "زارەکی". ئەم یاداشتە بە مۆری دەوڵەت مۆر ناکرێ و لەراستیدا " یاداشتی زارەکی " ئامرازێکە بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو شتانە کە بەزار دەگوترێن و بە جێگەی وتووێژی زارەکیانە یان لەپاڵ ئەو وتووێژانەدا کەڵکیان لێ وەرگیردرێ. ئەم یاداشتە بە زۆری لە بوارە سیاسییە ناسەرەکی و ئاساییەکاندا و یان بە مەبەستی ڕوونکردنەوەی هێندێک وردە خاڵ دادەڕێژرێ، بەڵام هێندێک جاریش چوونکە بە ئاسانی دادەڕێژرێ، بۆ ئامادەکردنی پوختەیەک لە وتووێژە گرنگەکان و ئەو بەڵێنانەی کە بە پێی ڕێککەوتننامەکە پێکدێن، کەڵکی لێ وەردەگیردرێ. ئەمرۆکە یاداشتی زارەکیی بۆتە ئامرازێک لە پێوەندییە سیاسییەکاندا و زۆر کەڵکی لێ وەردەگرن.

### یاداشتە هاوشێوەکان — *Identic Notes*

مەبەست لەو یاداشتانەیە کە نێوەرۆکێکی وەکوو یەکتریان هەیە و لە لایەن چەند دەوڵەتەوە، دەدرێ بە دەوڵەتێکی دیکە. چوونکە هەرکام لەم یاداشتانە بە جیاواز دەدرێتە ئەو وڵاتە، کاری هەر دەوڵەتێک بەرواڵەت سەر بەخۆیانە دێتە بەرچاو. ئەم جۆرە یاداشتانە بە " هەنگاوێکی نادۆستانە" دادەنرێن. لە دیپلۆماسی بەریتانیادا لێکچوونی ناو بۆ ئەم یاداشتانە گرنگ نیە، بەڵکوو لێکچوونی نێوەرۆک و بابەت گرنگە. دەرکردنی " یاداشتی هاوشێوە " پشتیوانی کردنی سیاسی دەوڵەتەکان لە یەکترە، بەڵام کاریگەرییان لە " ڕاگەیەنراوای بەکۆمەڵ" زیاترە.

### یازدەی سێپتەمبەری ٢٠٠١ — ٢٠٠١/٦/١١

لە ئەدەبیاتی سیاسیدا بەو ڕووداوە دەگوترێ کە لە ئاکامی هێرشی دوو فڕۆکەی نەفەر هەڵگر بۆ سەر تاوەرە جمکەکانی ڕێکخراوەی بازرگانیی جیهانی، بوو بە هۆی کوژرانی سێ هەزار کەس لەوانەی لە ناو ئەم تاوەرانەدا کاریان دەکرد. فڕۆکەیەکی دیکەش خۆی بە پێنتاگۆندا داو

چەند سەد کەسی کوشت. لە دوای ئەم رووداوە دەوڵەتی ئەمەریکا رایگەیاند: " یان لەگەڵ ئێمەن یان دوژمنی ئێمەن". ئەم رووداوە خاڵی وەرچەر خانێک لە مێژوو ئەمەریکادا بوو. ئەم وڵاتە بە بیانووی شەڕ لەگەڵ تیرۆریزم لە تشرینی یەکەمی ٢٠٠١ هێرشی کردە سەر ئەفغانستان و پاشانیش لە ٢٠ی مارس ٢٠٠٣دا هێرشی کردە سەر عێراق . ئەم رووداوە لە سەرهەڵدانی دۆکترینی بۆشدا، رۆڵێکی بەرچاوی هەبوو.

## یەک لایەنەگەری — *Unliateralism*

بریتیە لە سیاسەتی پشت بەستن بەسەر سەرچاوە خۆییەکان لە پێناوی گەیشتن بە ئامانجەکانی سیاسەتی دەرەوە. یەک لایەنەگەری وەکوو دەرئەنجامێکی گرنگی سیستەمی ڤێستفالی، سەردەمێک لە بواری پێوەندییە نێودەوڵەتیەکاندا، زۆرترین لایەنگری هەبوو. چوونکە لە بواری رێکخستنی کاروبارەکاندا ئازادییەکی تەواوی بە دەوڵەتەکان دەدا و بە هیچ بەڵێن و رێککەوتن و یەکگرتنێک نەدەبەسرایەوە.

یەک لایەنەگەری چەند شێوازی هەیە، خۆتەریک کردنەوە، سیاسەتی بێلایەنی وسیاسەتی بێ بەڵێنی کە هەرکام لەم حاڵەتانە بە شێوەیەک لە شێوەکان بە مانای بەشداری نەکردن لە سیاسەتی جیهانیدایە. بەپێی نەریت، دەوڵەتە دوورگەییەکان (بەریتانیا و ژاپۆن) یان ئەو دەوڵەتانەی لە بواری لۆجستیکیەوە لە گۆرەپانی سیاسەتی جیهانی دوورن (ئەمەریکا و چین) لەو دەوڵەتانەن کە گەورەترین قازانجیان لەم سیاسەتە وەرگرتوە. بەڵام گۆڕانکارییە تەکنەلۆژییەکان لە سەدەکانی ١٩و ٢٠دا، ئەم سیاسەتەیان تەواو ئەستەم کردووە ئێستا کە زۆربەی دەوڵەتەکان کێشەو مەسەلە ئاسایش و سەربازییەکانی خۆیان لە رێگای یەکیەتیە ناوچەییە دوولایەنە یان چەند لایەنەکان چارەسەر دەکەن. ئەم زاراوەیە لە ئەدەبیاتی سیاسی هاوچەرخدا لە پێوەندی لەگەڵ چەک داماڵین و بەتایەتی سەبارەت بە چەک وچۆڵە ناوەکیەکان کەڵکی لێ وەردەگیردرێ. لەساڵی ٢٣-١٩٢٢دا، ئەفریقیای باشوور ئەم رێچکەیەی گرتەبەر. ئەم سیاسەتە سەرنجی زۆر کەسی بۆلای خۆی راکێشاوە. تێکووشەرانی بزووتنەوەی ئاشتی بایەخێکی تایەتی بەم سیاسەتە دەدەن.

بەڵگەی لایەنگرانی ئەم بزووتنەوە کۆمەڵێک هۆکاری سیاسی و ئەخلاقیە. ئەم سیاسەتە جگە لە چاوپۆشی کردن لە چەک و چۆڵە ناوەکیەکان لە لایەن دەوڵەتێکی تایبەتیەوە، دەبێتە نموونەی ئەخلاقی بۆ ولاتانی دیکە تا ئەوانیش چاو لەم ولاتە بکەن. جگە لەمە چوونکە هێندێک لە دەوڵەتەکان خانەخوێی بنکە و جبەخانەکانی دەوڵەتە بیانیەکان، بڕیاری هەڵگرتنەوەی ئەم چەک و چۆڵانەلە لایەن ئەوانەوە، جارێکی تر سەر بە خوێی بۆ ئەم ولاتانە دەگەڕێنێتەوە.

## یوتۆپیا — Utopia

زاراوەیەکی یۆنانیە، تۆماس مۆر کەڵکی لێ وەرگرتووە. سەر چاوەی ئەم زاراوە لە OU بە واتای "هیچ" و Topos بەمانای "جیگا" وەرگیراوە. بە کوردی کەسنەزانی پێ دەڵێن. یۆتۆپیا بە هۆی کتێبی "یۆتۆپیا"وە ناوبانگی دەرکرد و لە سەدەکانی دواییدا بووە پاڵنەری نووسینی کۆمەڵێک بەرهەم سەبارەت بە کۆمەڵگای نموونەیی.

### هەلومەرجی سەرهەڵدانی یۆتۆپیا

لە سەدەکانی پازدەو شازدەدا دوو بزووتنەوەی ڕێنێسانس و ریفۆرماسیۆن (بزووتنەی چاکسازی) ئەورووپای سەدەکانی ناوەڕاستیان هەڵتەکاند، بەتایبەتی کلیسا بە دامودەزگا ئیداری و رۆحانیە بەربلاو وبەرفراوانەکەی کە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا دامەزراوەیەکی سەرەکی ئەورووپا بوو، بە هۆی بزووتنەوەی چاکسازی داڕما و هیچ کاتێکیش خۆی نەگرتەوە و ئەو دەسەڵاتەی کە بەسەر ژیانی عەقڵی، کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووری ئەورووپادا هەیبوو، تێک شکا. بە دوای ئەمەدا کۆمەڵێک بیروبۆچوونی نوێ هاتنە ئاراوە و هێزو توانای شاراوەیان ئازاد کرا. گرنگترین دەسکەوتی ئەم گۆڕانکارییە، ژیانەوەی هزری عەقلانی و رەخنەگرانەی یۆنانی و هیوادار بوون بە توانایی ودەسکەوتەکانی عەقڵی مرۆڤ و بێ هیوا بوون لە بەهەشتی ئاسمانیی و چاوی هیوا برینە بەهشتی دونیایی و ژیانەوەی هزری دەوڵەتی نموونەیی و باس و راوێژ سەبارەت بەم دەوڵەتە بوو. لەو سەردەمەدا نەریتی کلاسیکی دەوڵەت شارەکانی یۆنان بە لاساییکردنەوە لە دەوڵەت شارەکانی ئیتاڵیا ژیایەوە. یۆتۆپیای تۆماس مور و شاری هەتاوی کامپانلا لێکدانەوە و باسکردنی ئەم ئایدیانەن.

کامپانلا (نوسەری ئیتالی ١٥٦٨-١٦٣٩) بۆ پێکهێنانی "کۆمەڵگای هاوبەرژەوەند" Common Wealth ی ئەوروپی پێکهاتەیەکی سیاسی_ ئایینی نوێی هێنانیە گۆڕێ کە دەبوایە جێگای حکومەتی مەسیحی و ئیمپراتۆری پیرۆزی رۆمی بگرتایەوە. زیندووکردنەوەی بەرهەمە کلاسیکەکان (بەرهەمەکانی رۆم و یوونان) یەکێک لە لایەنە گرنگەکانی رێنێسانس بوو کە ئاسەوارێکی ئاشکرای لە سەر کولتووری ئەو سەردەمەدا بەجێ هێشتبوو. بۆ خەڵکی سەدەکانی ١٥ و ١٦، بەرهەمە کلاسیکەکان نیشانەی شارستانیەتێکی دیکە بوون کە بە هۆی ئەم شارستانیەتیەتەوە دەیانتوانی چارەسەرێک بۆ کێشەکانی جیهانی سەدەکانی ناوەڕاست بدۆزنەوە کە لاسەنگ ببوو و خەرێکی دارمان بوو. شەڕی مەسیحیەکان و موسڵمانەکان لە سەدەکانی دوازدە و سێزدەدا بوو بە هۆی ئەوەی کە خەڵکی ئەوروپا نەتەوەکانی دیکە و داب و نەریت و کولتووری ئەوانیش بناسن. لە سەدەی پازدەشدا پەرەگرتنی پێشەسازی پاپۆر دروست کردن، بواری بۆ ئەو گەشتانە خۆش کرد کە ئامانجیان دۆزینەوە و گەڕان بە دوای شتدا بوو و هەروەها بوو بە هۆی پەرەگرتنی بازرگانی.

دۆزینەوەی وڵاتە نوێکان وێنەی جیهانیان لە بەر چاوی خەڵکدا گۆڕێ. بۆ وێنە ئەگەرچی بەرهەمەکانی جوگرافی زانە کۆنەکانی وەکوو بەتلیمووس لە کتێبخانەکاندا هەرما بوون، نەخشەی سەدەکانی ناوەڕاست، نەخشەیەکی رەمزی بوون کە لەبەر هۆکاری ئایینی، ئورشەلیم بە ناوەڕاستی جیهان دانرا بوو. لە روانگەی نەخشەکێشی سەدەکانی ناوەڕاستەوە، لێکدانەوەی فیزیای راستەقینەی نێوان شوێنەکان و یان وێنەی راستەقینەی جیهان لە پلەی دووهەمی گرنگیدا بوو.

لە سەدەی چواردەهەمدا پەتایەک ئەوروپای گرتەوە وزەبرێکی کاریگەری لە هێزی کاری کشتووکاڵیدا، بەرەبەرە بارودۆخی شارەکان و هاووڵاتیە "ئازاد"ەکان لە هەمبەر ئاریستۆکراتیی فیئۆدالدا باشتر بوو و کاری حەقدەستی (کرێکاری) سەری هەڵدا و گۆڕانکاری بەسەر پێوەندیی کاری فیئودالیدا هات.

زانایانی قوستەنتەنیە (ئیستانبولی ئیستا) _ کەلە ساڵی ١٤٥٦ ەوە کەوتبووە ژێردەسەڵاتی عوسمانیەکانەوە _ گرووپ گرووپ بەرەو رۆژئاوا کۆچیان کرد کە زۆربەی ئەم زانایانە یۆنانی بوون. ئەم زانایانە کۆمەڵێک فێرگە یان قوتابخانەیان کردەووە کە قوتابیەکانیان ئایینی و رۆحانی نەبوون. ئەم مامۆستایانە، بە بەرهەمە لاتینی و یۆنانیەکانیان دەگووت " هۆمانیستیکا" و هەر بۆیەش

بە قوتابیەکانیان کە پێشەنگی ڕێنێسانسیش بوون دەگووت "ئۆمانسیت"، واتە مامۆستایانی بەرهەمە کلاسیکەکان. بەڵام ئۆمانیست بەرەبەرە پەرەی گرت و تاک و تاکەگەرێتی، داهێنان و لێکۆڵینەوەی ئازاد و بایەخدانی زیاتر بە جیهانی هەست پێکراوی ماددی و ڕوو وەرگێران لە جیهانی ڕۆحانی سەدەکانی ناوەڕاستی ـــ کە پشتی بەدین و کلیسا بەستبوو ـــ لە خۆ دەگرت. ئۆمانیستیەکان ڕیبەرانێکی نوێی هزری بوون کە هیچ پێوەندییەکیان بە کلیساوە نەبوو و بازرگانە دەوڵەمەندەکان پشتیوانیان لێدەکردن و لە بواری هزری و ئابوورییەوە پێویستیان بە کلیسا نەبوو. هاتنە گۆرەپانی چاپ و کاغەزیش کارەساتێکی گەورە بوو و، زەبرێکی کاریگەری لە کلیسا وەشاند. ڕەخنەگرتن لە کلیسا بە هۆی گەندەڵی و سامان و زەی وزارە و پاوان کردنی تیۆری (زانستی) و بەرتەسک کردنەوەی ئینجیل تەنیا بەزمانی لاتینی و فێرکردنی بە تاقمێکی زۆر کەم، بەرز بۆوە. پێشەسازی چاپ بوو بە هۆی ئەوەی کە ئەم ڕەخنانە چوارچێوە نەتەوەییەکان ببەزێنن و مقۆمقۆی ناوچەیی ببێتە ڕاپەرینێکی نێودەوڵەتیی. لەم بارودۆخ و ڕەوشەدا، بیرۆکەی دەوڵەتی نموونەیی ژیایەوە. بە تایبەتیی تۆماس مۆر کتێبی یۆتۆپیای هەر لەم سەردەمەدا نووسی کە هەموو ئەم ڕێبازە بەم ناوە، ناوبانگی دەرکردووە.

فەلسەفەی یۆتۆپیا:

فەلسەفەی سیاسیی یۆتۆپیا لە لەو کاتەوە لە فەرەنسا بڵاو بۆتەوە، مقۆمقۆیەکی زۆری ناوەتەوە. لە ماوەی دوو ساڵدا، سێ جاری دیکە بە زمانی لاتینی (کە هەر بەو زمانەش نووسرا بوو) کە زمانی جیهانیی زانایان و کلیساش بوو، چاپ کرایەوە. ئاشکراش بوو کە ئەم کتێبە بۆ خەڵکی ئاسایی نەنووسرابوو، بۆیە مۆر هیچ هەوڵێکی نەدا کە ئەم کتێبە وەرگێردرێتە سەر زمانی ئینگلیزی یان لە بەریتانیادا بڵاو بکرێتەوە. ئەم کتێبە ١٥ساڵ پاش مەرگی مۆر و لەساڵی ١٥٥١دا بڵاو کرایەوە. مۆر لەم کتێبەدا هەموو هەوڵی خۆی خستەگەڕ تا وێنەیەکی تایبەتی بکاتەبەر ئەو کۆمەڵگا خیاڵییەی خۆی. مۆر بۆ ئەم مەبەستە باسی وردەکارییەکان و تەنانەت باسی نموونەی ڕێنووسی یۆتۆپیاشی کرد و نموونەیەک لە شێعری یۆتۆپیاشی لە کتێبەکەیدا چاپ کرد. یوتۆپیای مۆر بەهەشتی دنیایی نیە، بەڵکوو بیانوویەکە بۆ ڕەخنەگرتن لە کۆمەڵگا.

لە بەرگی یەکەمی یۆتۆپیادا، مۆر باس لە کۆمەڵگای ڕۆژگاری خۆی و سیستەمی دادپەروەری (و نایەکسانیە بنەڕەتیەکانی)دەکا و، لەبەرگی دووهەمیشدا، مۆر باس لە کۆمەڵگای

نموونەیی خۆی دەکا کە : " شێوەی ژیانی ئەو کۆمەڵگایە نەتەنیا بە خۆشترین بناغە بۆ کۆمەڵگای شارستانی دادەمەزرێنێ، بەڵکوو کۆمەڵگایەکیشە کە تا ئەو رۆژەی مرۆڤ هەیە، بەردەوام دەبێ".

ئەم کۆمەڵگایە لە دوورگەیەکدا هەڵکەوتووە کە دامەزرێنەرەکەی لە بنەڕەتدا لە کیشوەرێکی جیا کردۆتەوە، سیستەم و یاسا و رێسایەکی تەواو عەقلانی و وردبینانەی هەیە، بۆیە لەگەندەڵی و شەڕی کۆمەڵگاکانی دیکە پارێزراوە. مۆر بەوردی سیستەمی سیاسی و چۆنیەتی ژیانی کۆمەڵایەتی و چۆنیەتی خۆراک و جل و بەرگ و ژن و مێردایەتی و ئابووری و شەڕ کردنشیان شی دەکاتەوە. گرنگترین تایبەتمەندیی کۆمەڵگای یۆتۆپیا، کۆمۆنیزمە، واتە تووڕهەڵدانی خاوەندارێتی تایبەتی،. بۆیە کارڵ کائۆتێسکی، مۆر بە پێشەنگی بیرۆکەی کۆمۆنیزم دادەنێ. بەڵام کۆمەڵگای کۆمۆ نیستی مۆر سیمایەکی ئاینیی هەیە و بە پێچەوانەی زۆر لە یۆتۆپیا کۆمونیستیەکانی پێش خۆی، خێزان بە بناغەی کومەڵگا دادەنێ. خێزانی تاک هاوسەری، باوکسالارانە، بەربڵاو و بەرهەمهێن، بناغەی هیرەمی کۆمەڵایەتیی یۆتۆپیایە. مۆر هەر خێزانێک بە یەکەیەکەی ئابووری و بایۆلۆژی دادەنێ. یۆتۆپیاش پێش لەوەی ئامانجێکی پراکتیکی بێ، وەکوو کۆماری ئەفلاتوون، فەنتازیایەکی جێگەی تێڕامانە. واتە شوێنێکە بۆ تۆوی هزر و عەقڵ کە دەبێ هەڵبژێری و تاقی بکەیەوە. یۆتۆپیا زۆر لەو قسانەی لە خۆدا حەشارداوە کە پاشان لە شارستانیەتی ئەورووپیدا هاتنە گۆڕ، وەکوو: دابینکردنی ئامرازی مەرگی ئاسان بۆ ئەو نەخۆشانەی کە چارەسەر نابن، تاوان ناسی، رەگەزی بەرزتر، تەڵاق، ئاڵتوون وەکوو بناغە و پشتیوانی دراو، مافی ژنان، پەروەردەی دەوڵەتی، تلۆرانسی ئایینی، ژینگە و ...هتد. هەمووی ئەمانەی لەبەر چاو بووە و لێیان دواوە.

لێکدانەوەی جیاواز لەسەر یۆتۆپیا کراون. کائۆتێسکی، تیۆری دارێژی سۆسیالیستی ئەڵمانی، کۆمۆنیزمی تۆماس مۆری ئەوەندە بە جیددی گرتبوو کە بە مۆری دەگووت باوکی شۆرش رووسیا. مێژووناسەکان یۆتۆپیایان بە چوارچێوەیەک بۆ ئەمپریالیزمی بەریتانیا داناوە و ئۆمانیستەکانیش بە مانیفیستێک بۆ چاکسازی گشتی لە رێنسانسی مەسیحیان داناوە.

### یو ـــ ٢ *U-٢ Incident*

یو-٢ نێوی فرۆکەی سیخوڕی ئەمەریکایە کە لە دەیەی ١٩٥٠دا دروستکرا و کۆمەڵێک کێشەی سیاسی نایەوە. ئامانج لە دروستکردنی فرۆکەی یو-٢ ئەوە بوو کە ئەمەریکا بتوانێ لە دامەزراوە سەربازی و هێنیەکانی سۆڤیەت وێنە هەڵ بگرێتەوە. ئەم فرۆکەیە دەزگایەکی

ئەلەکترۆنی تایبەتی هەبوو کە دەیتوانی لەبەرزاییەکی دوورەوە، خۆی لە مەودای رادارەکان و ئاگری دژە ئاسمانیەکانی یەکیەتیی سۆڤیەت بپارێزێ. لە ساڵی ١٩٥٤دا، هەشت کەس لە فرۆکەوانانی ئەمەریکی لە بنکەکانی تورکیا و پاکستانەوە بۆ ماوەی چوار ساڵ بەرەو ئاسمانی سۆڤیەت فرین و ئەرکی سیخۆریان بەرێوە دەبرد. لە رۆژی ١ی ئایاری ساڵی ١٩٦٠دا، فرۆکەیەکی U-٢ کە خەریکی سیخوڕی کردن بوو، کەوتە بەر هێرشی موشەکەکانی سۆڤیەت، ئەم رووداوە لە رۆژئاوای مۆسکۆدا روویدا. کاپیتان گاری، فرۆکەوانی فرۆکەکە بە پەرەشووت خۆی رزگار کرد و لە خاکی سۆڤیەتدا نیشتەوە و دەستبەجێ لە لایەن پۆلیسەوە گیرا. دەوڵەتی سۆڤیەت ئەمەریکای تاوانبار کرد. بەڵام ئەمەریکا حاشای لەوە دەکرد کە سیخوڕی کرد بێ و سۆڤیەتی بەدرۆ خستەوە، بەڵام بە هۆی گیرانی پاورێز، ناچار بوو دان بە کارەکەی خۆیدا بنێ. ئەم رووداوە بووە هۆی داخستنی کۆنفرانسی رێبەران لە پاریس ( مانگی ئایاری ١٩٦٠) و، تێ گەیشتنی نێوان ئایزینهاڤێر و خرۆشچۆف، سەرۆک وەزیری سۆڤیەت کە بەهۆی وتووێژەکانی پێشووتر، وەدست هاتبوو، شۆرایەوە.

### یۆرۆ — *Euro*

ناوی دراوی هاوبەشی یەکیەتیی ئەوروپایە کە لە رۆژی ١٦ی کانوونی یەکەمی ١٩٩٥ لە لایەن وڵاتانی ئەندامی ئەم یەکیەتیەوە پەسند کرا. ئەم یەکەی دراوە لە یەکەمی کانوونی دووهەمی ساڵی ٢٠٠٢وە لە ئەورووپادا کەوتۆتە گەڕ.

### *یۆنسکۆ(رێکخراوی پەروەردەیی، زانستی و کولتووری نەتەوەیەکگرتووەکان)*

### UNESCO(United Nations Educational ، Scientific، And Cultural Organiziation*)*

پێکهێنانی رێکخراوێکی پەروەردەیی، زانستی و کولتووری لە کۆنفرانسی وەزیرانی پەروەردەی هاوپەیمانان کە لە ماوەی شەڕی دووهەمی جیهانیدا بەرێوە چوو، لە سەر پێشنیاری دەوڵەتی بەریتانیا دامەزرا. پاشان رێکخستنی ئەم رێکخراوە لە کۆنفرانسی سەن فرەنسیسکۆ کە

پێرەوپرۆگرامی UNی دادەڕشت، پێشنیارکرا. لە ئاکامدا لە ڕێکەوتی ٢تا ١٦ی تشرینی دووهەمی ١٩٤٥ کۆنفرانسێک بۆ ئەم مەبەستە لە لەندەن پێکهات.

گەڵاڵەی پێرۆپرۆگرامی یۆنسکۆ لە لایەن وەزیرانی پەروەردەی دەوڵەتە هاوپەیمانەکان کە بنەمای وتووێژەکانی کۆنفرانس بوو، دارێژرا. ئەم کۆنفرانسە کە بە بەشداری ٤٣ دەوڵەتی ئەندامی UN بەرێوەچوو، پێرەوپرۆگرامی رێکخراوی پەروەردەیی، زانستی و کولتووری نەتەوەیەکگرتووەکانیان (یۆنسکۆ)ی ئامادەکردو پەسندی کرد، ئەم پێرەوپرۆگرامە لە رێکەوتی ٤ی تشرینی دووهەمی ١٩٤٦ەوە بە ئاراستەکردنی بیستەمین بەڵگەی پەسندکردن، جێبەجێ دەکرێ. یۆنسکۆ لە ١٤ی کانوونی یەکەمەوە بە هۆی رێککەوتننامەیەک لەگەڵ UNدا بۆتە دامەزراوەیەکی پسپۆری UN. بە پێی ماددەی ١ی پێرەوپرۆگرامی یۆنسکۆ، ئامانجی یۆنسکۆ پەرەپێدانی ئاشتی لە جیهاندایە، لە رێگای پەرەپێدانی هەوڵە هاوبەشەکان لە نێوان نەتەوەکان، لە بواری فێر کردن و پەروەردە و زانست و کولتوور بەمەبەستی بەهێزکردنی رێزدانانی جیهانی بۆ یەکسانی، سەرەوەری یاسا، مافی مرۆڤ و ئازادییە بنەڕتیەکان کە لە لایەن نەتەوەیەکگرتووەکانەوە بۆ خەڵکی جیهان بە بێ جیاوازی لە بوار رەگەز، ژن و پیاو، زمان و ئایینەوە دانیان پێدانراوە. بەمەبەستی وەدیهاتنی ئەو ئامانجانە، یۆنسکۆ بەپێی بەندی ١٢ی ماددەی ١ی پێرەوپرۆگرام ئەم ئەرکانەی لە ئەستۆدایە:

**الف–** هەوڵی هاوبەش لە پێناوی بەرەوپێش بردنی وشیاری دوولایەنە و لێک تێ گەیشتنی خەڵک لەیەکتر بەهۆی راگەیەنە گشتییەکان. یۆنسکۆ بۆ گەیشتن بەم ئامانجە، پێشنیار دەکا کە رێککەوتننامەی نێودەوڵەتیی بۆ پەرەپێدانی رەوتی ئازادانەی بیرو هزر لە ریگای ئاخافتن و وێنە پێک بێ.

**ب–** پێکهێنانی جموجۆڵێکی نوێ لە بواری فێرکردن و پەروەردەی گشتی و بڵاوکردنەوەی کولتوور:

١_ لە رێگای هەوڵی هاوبەش لەگەڵ ئەندامەکاندا لە سەر داوای ئەوان بۆ چالاکیە فێرکاری و پەروەردیەکان.

٢_ لە ڕێگای پێکهێنانی هەوڵی هاوبەش لە نێوان نەتەوەکاندا بۆ بەرەپێش بردنی بیرۆکەی یەکسانی دەرفەتی خوێندن بە بێ سەرنجدانە ڕەگەز، نێرومێ بوون یان هەر جیاوازییەکی ئابووری یان کۆمەڵایەتی.

٣_ لە ڕێگای پێشنیارکردنی گونجاوترین شێوازەکانی پەروەردەکردن بۆ ئامادەکردنی منداڵانی جیهان، لە پێناو وەئەستۆ گرتنی سەربەستانەی بەرپرسیارەتیەکان.

چ_پاراستن، بردنەسەر و بڵاوکردنەوەی زانیارییەکان:

١_ لە ڕێگای گەرنتی کردن، پاراستن و پشتیوانیکردن لە میراتی جیهانیی کتێبەکان، بەرهەمە هونەرییەکان، و بیرەوەرییە مێژوویی و زانستیەکان و پێشنیاری کۆنڤانسیۆنی نێودەوڵەتیی پێویست بە نەتەوەکان بە هۆی هاندانی هاوکاری لە نێوان نەتەوەکاندا لە هەموو بوارە مەعنەوییەکاندا: وەکوو گۆڕینەوەی نێودەوڵەتیی هەڵسوڕان و تێکۆشەرانی بوارەکانی پەروەردە، زانست، کولتوور و گۆڕینەوەی بڵاوکراوەکان، بابەتە هونەری و زانستیەکان.

٢_ لە ڕێگای داهێنانی شێوازەکانی هاوکاری نێودەوڵەتیی لە پێناوی دەستڕاگەیشتنی خەڵکی هەموو وڵاتانی جیهان بە بابەتە چاپکراو و بڵاوکراوەکانی هەرکام لەم وڵاتانە.

***یۆنسکۆ سێ بناغەی هەیە:***

١_کۆنفرانسی گشتی

٢_ ئەنجوومەنی بەڕێوەبەری

٣_ سکرتاریا

کۆنفرانسی گشتی لە نوێنەرانی دەوڵەتانی ئەندامی یۆنسکۆ پێک دێ کە هەر دووساڵ جارێک بۆ بڕیاردان سەبارەت بە ڕێبازو بەرنامەو بوودجەی یۆنسکۆ پێکدێ. کۆنفرانس بەرزترین ئۆرگانی بڕیاردانی یۆنسکۆیە. ناوەندی یۆنسکۆ لە پاریسە.

**یانەی پاریس** **Paris Club**

ئەم زاراوە بە تاقمێک لە وڵاتانی وەک ئەمەریکا، بەریتانیا، کەنەدا، فەڕەنسا، سوید، هۆڵەندا، بەلژیکا، ئیتالیا وژاپۆن دەگوترێ. ئەندامانی ئەم یانەیە بەڵێنیان داوە کە ئەگەر سندووقی نێونەتەوەیی دراو، داوایان لێ بکا، قەرز بە سندووق دەدەن.

## The Low Of Ebb and Flow

### یاسای هەستان ونیشتنەوە

بە بڕوای ستالین؛" کێشەی نێوان بۆرژواو پرۆلتاریا بە شێوەیەکی ڕێک و پێک و هاوسەنگ بەرەو زۆربوون ناروا، بەڵکوو وەکوو هەستان و نیشتنەوەی ئاوی دەریا وایە. کاتێک کێشەکە دەگاتە ئەو پەڕی خۆی، سیستەمی کۆمەڵایەتیی، دەگاتە قۆناغی وەرێخستنی شۆرش. شۆڕشی ئۆکتۆبەری ١٩١٧ی رووسیا، شۆڕشی سەرەتا و سەرەکی بووە و لە وڵاتەکانی دیکەشدا پەیتاپەیتا زنجیری کاپیتالیزم (سەرمایەداری) دەپسێ و شۆڕش سەرهەڵدەدا و دەگاتە سۆسیالیزمێکی جیهانی. شۆڕشی ١٩١٧، سەرەتای قۆناغێکی نوێ لە مێژووی مرۆڤەیەتی دایە و ئەوە شۆڕشی پرۆلتاریا یان قۆناغی شۆڕشی جیهانیە". بە بڕوای ستالین، بزوتنەوەی شۆڕشگێرانە راستەرێ نیەو بە شێوەی هەستان و نیشتنەوەی ئاو یان بە شێوەی هەڵکشان و داکشانە.

## Nopoleonic Code

### یاسای ناپلیۆن

ئاماژە بە کۆمەڵێک رێوشوێن و یاسایە کە لایەن ناپلیۆن ئیمپراتۆریای فەڕەنسە داریژراون.

کۆی ئەو یاسایانەی کە لە ئازاری ١٨٠٣ تا ئازاری ١٨٠٤ داریژران، لەگەڵ ٦٣ یاسای پەسند کراوی دیکەدا، بە پێی یاسای ٢١ی ئازاری ١٨٠٤، کە سەرجەم ٢٢٨١ مادده بوون، یاسای شارستانی فەڕەنسایان پێکهێنا. ناوی رەسمیی ئەم یاسایە لە سەرەتادا یاسای شارستانی (مەدەنی) فەڕەنسیەکان بوو. یاسای سێهەمی ئەیلوولی ١٨٠٧، ئەم یاسایانەی ناونا، یاسای ناپلیۆن. لە دوای رووخانی ناپلیۆن ناوە سەرەتاییەکە کەڵکی لێ وەرگیردرا. بڕیاری ٢٧ی ئازاری ١٨٥٢، دیسانەوە ناوە دووهەمەکەی داناوە. بەڵام لە دوای ساڵی ١٨٧٠وە(لەگەڵ ئەوەی ناوە پێشووەکە نەگۆڕا ) بڕیاردرا کە تەنیا پێی بلێن یاسای شارستانی.

ئامادەکردنی ئەم یاسایە کە بنەماکانی لە یاساکانی رۆم و عورفی ژێرمەن وەرگیراون، چەند ساڵی خایاند. پەسندکردنی یاسای شارستانی فەڕەنسا تارادەیەکی زۆر قەرزداری ئیرادەی ناپلیۆن

بوناپارتە. بوناپارت لە دارشتنی یاسای شارستانی فەڕەنسادا کە لە لایەن مافناسەکانی ئەم وڵاتەوە هاتە ئاراوە؛ ڕۆڵێکی کاریگەری هەبوو و وەکوو کۆنسولی یەکەم، سەرۆکایەتیی ٥٧ دانیشتنی لە کۆی ١٠٢ دانیشتنی ئەنجوومەنی دەوڵەتی بۆباس وراوێژ لە سەر یاسای شارستانی وەئەستۆ گرت.

ناپلیۆن سەبارەت بە گشتی بوونی یاسا دەڵێ : " لێرەدا دەبێ هەموو کۆمەڵگا بەشداربن، بەشداری نەکردن، ئاکامی خراپی بەدواوە دەبێ".

ناپلیۆن دارشتنی یاسای ئەسپاردە مافناسە میانڕۆکان و نەیهێشت مافناسە شۆڕشگێڕکان لە دارشتنی یاساکاندا بەشداری بکەن . ناپلیۆن تەنیا لەم حاڵانەدا، دەستی لە دارشتنی یاساکان وەردا:

١ــ ماددەکانی ٩٣تا ٩٨ی یاسای شارستانی فەڕەنسا کە تایبەت بە هێزە سەربازییەکانە.

٢ــ بە هۆی دوژمنایەتی ناپلیۆن لەگەڵ بیانیەکاندا، یاسای شارستانی، بیانیەکان ناگرێتەوە. ناپلیۆن، میرات(ماددەی ٧٢٦) و یان مافی کەڵک وەرگرتن لە وەسیەت و ماڵی بەخشراوی لە بیانیەکان سەندەووە.

٣ــ ناپلیۆن هەروەها تەڵاق و ( لەسەر پێخۆشبوونی هەردوولا) و زڕمنالیشی بە هۆی هەڵەرجیتاکەکەسی خۆیەوە، لە یاسای شارستانیدا گونجاند.

ناپلیۆن لە دورگەی سێنت هێلێن وتبووی :

"شانازی راستەقینەی من ئەوە نیە کە لە ٤٠ شەڕدا سەرکەوتووم، ڤاتێرلو هەموو ئەم شانازیانە دەشواتەوە، ئەو شتەی کە هیچ شتێک ناتوانێ بیشواتەوە و بۆ هەمیشە دەمێنیتەوە؛ یاسای شارستانی منە".

## یەکەم باڵوێز — *Dean Of The Diplomatic*

یەکەم باڵوێز، کۆنترین باڵوێزی وڵاتێکە، کە بڕوانامەکە خۆی داوەتە بەرپرسان و لە ڕێوورەسمە رەسمیەکاندا یان ئەوکاتەی بەرژەوەندیی هاوبەشی دیپلۆماتەکان لەمەترسیدایە، باڵوێزی یەکەم سەرۆکایەتیی نوێنەرایەتیە سیاسییەکانی نیشتەجێی ئەو وڵاتەی لە ئەستۆ دایە. سەرۆکی باڵوێزە کانیشی پێ دەڵێن.

## Nuremberg Laws

## یاساکانی نۆرێنبێرگ

یاساکانی نورێنبێرگ، کۆمەڵە یاسایەکی دژە جوولەکەیە کە لە کۆبوونەوەی سەرکردایەتی حیزبی نازی ئەڵمانیا لە شەڕی نورێنبێرگدا( ئەیلوولی ١٩٣٥) دارێژران. ئەم یاسایانە دیاری دەکەن کە چ کەسانێک لە بواری یاساییەوە جوولەکەن. بە پێی یاسای" پشتیوانی لە خوێن و شەرەفی ئەڵمانیا"، پێوەندی سێکسی یان زەماوەندکردنی ئەڵمانیەک لەگەڵ جوولەکەیەکدا بە تاوان دادەنرا.